# رۆژمێری پێشمەرگەیەك

## ١٩٧٦ - ١٩٩٦

باسی (٢٠) ساڵ لەخەبات و رووداوەکانی
شۆرشی گەلەکەمان دەکات

محەمەد حاجی مەحمود

بەرگی چوار

١٩٩٢ - ١٩٩٦

# رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك

## باسی (٢٠) ساڵ لەرووداوەکانی خەبات و شۆڕشی نوێ ی گەلەکەمان دەکات

## ١٩٧٦ — ١٩٩٦

نوسینی

محەمەدحاجی مەحمود

بەرگی چوارەم

١٩٩٢-١٩٩٦

ناوی کتێب / ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەک .

نوسینی / محەمەد حاجی مەحمود .

کۆمپیوتەر / سالار محمد عزیز .

تیراژ / (۲۰۰۰) دانە .

چاپ / چاپی یەکەم – سلێمانی ۲۰۰۹ .

ژمارەی سپاردن / (٤٩٨) ی ساڵی ۲۰۰۷ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە .

چاپ / چاپخانە و ئۆفسێتی دیلان – شەقامی مەولەوی

ئەگەر سەیری بکەی ئەم پەرتوکە
چەندی ئەصڵە
لەخۆ گرتووە هەر چوار فەصڵە
هاوین و پایزو زستان و بەهارە
کۆتایی نیە ئەوە بەرگی چوارە
بۆ هەندێك هەزارو یەك شەوەیە
بۆ هەندێکیش زەهری مارە
ئەوە دیاریە
بۆ هەموو کەسێ گوڵە بەهارە

نوسەر

# پـۆزش

**بە پێویستم زانی چەند هەڵەیەك هەبوولەبەرگی (٣)دا راستی بکەمەوە .**

– کاك مستەفا چاورەش لەساڵی ١٩٧٣ نامەی بۆ کاك مسعودبارزانی ناردووە نەك ساڵی ١٩٧٧

– کاك جەباری حاجی فەتاحمان نارد بەتراکتۆرەوە بۆ هێنانەوەی کاك رزگار خانەقینی کەبریندارببوو لەگەنمەکانی بەری کانی ئاسکان و قاینجەدا چونکە من خۆم لەجادەی سەیدصادق هەڵەبجە دەبوو بەرۆژ بپەرمەوە بۆئەوەی دوژمن بەمن بزانن کەمن چومەتە ئەوبەری جادەو بەرەو قاجرو کشەدەری و تەپەسەرقولەو لەقەدەفەریەوە بۆمن بێن نەك بۆ جێگای شەرەکە برۆن و کاك رزگار بدۆزنەوە بەبریندارى .

–گەردەخانی خێزانم و مناڵەکانمان لەموانی میرزا بون لەماڵی کاك حاجی حسن و کاك ابراهیم کوری مناڵەکانی ئێمە دوای چوارجار گیران لەساڵی ١٩٨٧ بریاریاندا بێنە سەرسنور چونکە لە ساڵی ١٩٧٦ گیران بۆ ماوەی ١٦ مانگ لەناسریە بون پاشان لەهەڵەبجە چوار مانگ و لەخورماڵ چەند مانگێك گیران لەگوندی پارەزانیش ساڵی ١٩٧٩ (٢١) هەلیکۆپتەر هاتە پارەزان و دوای کۆکردنەوەی خەڵکی گوندەکە گەردەخان و مناڵەکان کەبریتی بون لە (عەتاو پشتیوان و عەتیەو کوێستان ) لەوێ بون گیران تەنها کوێستان دەربازبوو بۆیە ساڵی ١٩٨٧ پایزەکەی بەرێ کەوتن لەموانەوە بۆکەناروێ چونکە لەوێ قاچاخچی هەبوو بۆ پردی جەلال و بۆبوسکان و شیوەکەل و باری بچوك و گەورە و چەمەك و سپاك و بۆ قوسامینەو سیاگوێز و گۆڵێ و ئەو ناوە حاجی حسن و کاك ابراهیمی کوری مناڵەکانی ئێمەیان بردووە ماڵی حاجی عەلی

لەکەناروێ ، مناڵەکانی حاجی عەلی بە مناڵەکانی ئێمەیان وتبوو ئێستا تەسلیم بە رەبایەکانی بەعستان ئەکەین و پێلاوی مناڵەکانی ئێمەیان دراندبوو بەچەقۆ خەریك بوو حاجی حسن و کاك ابراهیمی کوریشی توش بن بەبۆنەی مناڵەکانی ئێمەوە پاشان حاجی حسن هاواری بردبوو بۆلای حاجی محمود ئەمین کەئەویش برای حاجی عەلی بوو ئەو بردینیەوە و ناردبوی پێڵاو بۆ مناڵەکانی ئێمە بهێنن و ولاخ داریان بۆ گرتبون بۆ چەم پاراو ماڵی صابری حاجی رەحیم لە چەم پاراو دوای ئەوەی کاك قادرچاوشێن بەرێ ی کردبون لەنەلسوو بوسکانەوە لەچەم پاراویشەوە کاك ئامانجی کاك شێخ محمد بردبونی بۆ قوسامینەو لەوێوە ناردنیان بۆ مەریوان و دزڵی کە بریتی بون لە (گەردە خان و عەتیەو کوێستان و عەتاو پشتیوان و شەرام) لەرێگاش گەردەخان لەولاخ کەتبوو سەروچاوی شکابوو .

لەگەڵ رێزمدا....

نووسەر

# دەسپێك

خوێنەرانی ئازیز ...

بەرگی (٤)ی رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك دەكەوێتە بەردەستی ئێوەی خۆشەویست پێشەكی ئەم بەرگە دووساڵ پێش ئێستا نوسراوە، گۆرانی زۆر لەناوچەكەو دنیادا روی داوە بۆ بنمونە لەئەمریكا هەڵبژاردنی ئۆباماو شۆرشێك لەو وڵاتەو بردنەوەی بزوتنەوەی حماس لەفەتح و شەری ئیسرائیل و حزب الله كەشەری ئەمریكاو ئێران بوو لەناوچەكەو سەركەوتنی مالكی لەهەڵبژاردنی پارێزگاكانداو سەركەوتنی پارتی گەشەپێدان و دادپەروەری و ئەردۆغان لەتوركیاو پەرەسەندنی شەری ئەفغانستان و گۆران لەتالیبان و سەركەوتنی دكتۆر محمودی ئەحمەدی نەژاد لەئێران و چەندین لیستی نوێ لەكوردستان بۆ هەڵبژادنەكانی پەرلەمانی كوردستان وجێ بەجێ نەكردنی مادەی (١٤٠)و كەوتنە قورگی شێرەوە لەناوچە دابراوەكانی كوردستان و بێزاری خەڵكی كوردستان لەسەر دەسەڵات و ئەزمەی ئابوری جیهانی و عێراق وەكو سێهەم دەوڵەتی فساد لەدویناو پێشلكردنی مافی مرۆڤ لەزێندانی سیاسی و چەوساندنەوەی ئافرەت و منالْ لەكوردستان و نەبونی شەفافیەت لەسەریاساكانی حەڵكی كوردستان و زۆر گۆرانی كەش چاوەروان دەكرێ لەسەرانسەری دونیاو لەناوچەكەو عێراق و كوردستاندا ، بۆیە لەپێشەكیەكەدا زۆر لەو مەسەلە گرنگانەی تێدا نیە پەیوەندی بەو مێژووەوە هەیە كە پێش دووساڵ ئامادە كراوەو نوسراوە، ئەوانە جگە لەوەی لە ساڵی ١٩٩٢ كە (١٧)ساڵە و پێشەكیەكەشی دووساڵ زیاترە بۆیە زۆری بابەتەكان پەیوەندیان بەو كاتەوە هەیە .

لەگەڵ رێزماندا

**نووسەر**

٢٠٠٩/٦/١٥

# پێشەكی

لەكاتێكدا بەرگی چوارەمی رۆژژمێری پێشمەرگەیەك دەكەوێتە بەر دەستی خوێنەرانی بەرێز گۆڕانی گەورە لە كوردستان و عێراق روی داوە، گۆڕانی چارەنوس ساز، صدام حسێن و رژێمی بەعس و تاوانبارانی گەل و نیشتمان ئەوانەی دەیانویست كورد لەسەر جوگرافیای خۆیان بسرنەوەو لەناوی بەرن ومیللەتێك بەكیمیاوی بخنكێنن بەئەنفال قڕ بكەن و بەزیندە بەچاڵ كۆتایی پێ بهێنن بەڵام گۆڕانە سیاسیەكان و سەربازییەكانی جیهان وای كرد ئەوەی كورد سودی لێ وەرنەگرت لەشەری یەكەم و دوهەمی جیهانی و لەشەری عێراق ئێران بەڵام هەڵوەشاندنەوەی سۆڤیەتی پێشوو یەك جەمسەری سیاسی لەجیهان و سەربەخۆیی زۆر وڵات لەڕوی ئاینی و مەزهەبی ونەتەوەیی زیاتر كۆمارەكانی سۆڤیەتی هەڵوەشاوە ١-ئوكرانیا ٢-لیتوانیا٣-قاقزازغستان ٤-داغستان٥-ئازربایجان٦-قەفقاز ٧چیچان و٨- ئۆزبەكستان ٩- تاجكستان و گورجستان نزیكەی ١٤حوكومەتی سەربەخۆیی لێ دامەزرا یۆگۆسلافیا وڵاتە بچكۆڵەیەكی وەكو تەیموری رۆژ هەڵات،لەئەندەنوسیاوممنگرو یاشاخەرەش لە یوگوسلایفای كۆن، پەلاماری عێراق بۆسەركوەیت واتە جەنگی كەنداوی دووەم و سیاسەتی نوێ ی جیهانی و كەوتنە خەتەری بەرژەوەندی رۆژئاواو ئەمریكا لەلایەك و لەلایەكی كەوە كوەیت و سعودیەش پارەی سپی بۆ رۆژی رەش هاتنی ئەمریكا بەسەركردایەتی ٣٣ دەوڵەتی دنیاو دەركردنی عێراق لەكوەیت و راپەرینی ١٩٩١/٢/٢٧ خواروری عێراق و ٥ی ئازاری ١٩٩١ی بەرەی كوردستانی كەلەرانیەوە سەری هەڵداو هەڵبژاردنی ١٩ای ئایاری ١٩٩٢ و ئیدارەی كوردی پێشترو بریاری ٦٨٨ ریكخراوی نەتەوە یكگرتوەكان بە پێشنیاری فرانسو میتران بۆپاراستنی كوردستان لە بنكەی ئەنجەرلیك لەتوركیاو mcc لەزاخۆ لە ١٩٩١ بۆ

٢٠٠٣/٤/٩ و شـــەڕی نـــاوخۆ و هێنـــانی لەشـــکری عێـــراق وئێـــران وتورکیـــا بۆسەرکوردستان و کـورد بۆگیـانی یـەکترو بـەفیرۆدانی کـات و وزەی کـورد بـە بەلاش و دیبلۆماسیەتی کوردی قۆناغێکی کە بـوو، لێدانی نیویـۆرک و واشتۆن و بنتـاگۆن لەلایـەن ڕێکخـراوی قاعیـدەوەو داچڵەکاندنی ئـەمریکاو ترسـی ڕۆژئـاوا بەگـشتی و پیاچـونەوەی سیاسـەتی دەرەوەو نـاوەی ئـەمریکا لەلایـەن بـۆش وئیـدارەی سـەرۆکی ئـەمریکاوە بـۆ لێـدانی ئەفغانـستان ودەرکردنـی تاڵیبـان و قاعیـدە و لێـدانی عێـراق و روخانـدنی ڕژێمـی صـدام حـسێن و بـەعس لـەدوای شەڕێک کورد لە ٢٠٠٣/٤/٩دا قۆنـاغێکی نـوێ و گـرنگ و سود بەخشی کوردستان بوو تائەو کاتەش یاکورد بەقەدەر باشی هێنا بە شەری ناوخۆ و هـەموو مەسـەلە سیاسـی و نـاو خـۆیی و ئـەقلیمی و نێـو دەوڵەتیەکـە یارمـەتی دایـن بـۆ یەکـەم جارخـەوێکی دێـرینی کـورد هاتـە دی هەرچـەندە بـە بەرنامـە نـەبوو بەرێکـەوتنی کوردو ئـەمریکا و کـوردو هاوپـەیمانان کـوردو تەنانـەت هێـزە بەرهەڵستکارەکانی عێـراقیش نـەبوو بـەڵام ئـەوەی کـورد لـەدوو شـەری یەکـەم ودووەمـی جیهـانی دەستی نەکـەوت یاپیێ ی سـەرکوت کـرا لەهەڵوەشاندنەوەی سـۆڤیەت وڵێـدانی ئـەمریکا لەلایـەن قاعیـدەو بریـاری ئـازادیی عێـراق لەئیـدارەی ئـەمریکا ئەوانـە ســەرکەوتن و قـــەرەبوی رابـــردو هـــەردوو شـــەرەکەو هـــەردوو غەدرەکـــەو هەردووزوڵمەکە لەشێخ محمودو شێخ سەعید و قازی محمـدو بارزانی و سـەید رەزا و راپەرینەکانی تـری ٦ ئـەیلول و ابـراهیم خان و جافر سوڵتان و ئـەوانی تـر کران لەکاتی ئەو روداوانەدا کوردیش حزبی سیاسی و هێزی چەکدارو ڕێکخستن و هەلومەرجەکەش یارمەتی داو بریاری ٦٨٨ و خەتی ٣٦ و بریـاری ٩٨٦ و زۆری تریش پشتیوانی مرۆڤایەتی سیاسی و تاسەربازیش توانی زۆر مەسـەلەی گـرنگ بۆ کورد ئاسان بکات، هەرچەندە کورد دوو مەسـەلەی گـرنگ یـا دوکـاتی گـرنگ

بانگیان بکەن کەوا لەکوردستان دیموکراتیەو ئەوەتا حزبی کەش هەیە کەئەوەش خۆیان زیانی لێ ئەکەن لەمەداری دوریش بێت ئەوان پێویستە مێژویان لەبیر نەچێ و کوردیش ئەمرۆ چاو کراوەو گوێ کراوەو ئاگای لەهەموو روداوەکان هەیەو روداوەکانی ئەم سەردەمەش مەسەلەی پێچەوانە قبوڵ یاپەسەند نیە لای بۆیە مانەوەی هەر هێزێکی سیاسی باوەربون بەمافی هەموو چین و توێژێ دیموکراتی سەرەتای ژیانی خەڵکە خەڵکەکەش ئەوە بە کێشەی نێوان یەکێتی و پارتی دەبێ بیر لەوە بکەنەوە یەک قبوڵ بکەن و باوەریان بەدیموکراتی بێت شەراکەتی وڵاتێک هەروا ئاسان نیە و دیموکراتی دەختکێنن ئەگەر ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵات یەک قبوڵ نەکەن کەئەوەش تائێستا نەکراوە هەرچەند لەدونیا دوولایەن بەشەر لەیەک جیابونەوە دەبێ بەشەر بگەرێنەوە یالایەک تەسلیم بەلاکەی کەبێت وەکو ئەڵمانیای رۆژهەڵاتی روخاولەبواری ئابوری وسیاسی و ..هتد تەسلیم بە ئەڵمانیای رۆژئاوا بووە.. وەکو یەمەنی شیمالی و یەمەنی جنوبی بەشەر گرتی.. وەکو حزبی دیموکرات کاک جلیل تەسلیم بەحزبی دیموکرات کاک مەلا عبدالە بووە.. وەکو زۆری ترو نمونەی کەش یاخود وەکو لەئەمریکاو بەریتانیاو ئەڵمانیا و یاتورکیا زۆر وڵات لەهەڵبژاردن لایەک دەبیاتەوە و لاکەی کەش دەبێتە ئۆپۆزسیون و تاهەڵبژاردنێکی دیکەش لەکوردستان ئەوە قبوڵ ناکرێ و نەیان کردووە تەنانەت بۆ ساڵ و رۆژ حیساب ئەکەن هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم بۆیەک خستنەوەی ماڵی کوردی شتێکی باشە بەڵام لەهەموو کوردستان بێت سەرۆکی هەرێم خۆی بەسەرۆکی هەمووی بزانێ من پشتیوانی لەهەر هەنگاوێک کەخزمەت بەگەل و نیشتمان بکات دەکەین و نزیک بونەوەو نەمانی کێشەی نێوان هەردوو حزبی دەسەڵاتدار بەهەنگاوی باش دەزانین بەڵام نەک لەسەر حیسابی میللەت وهێزە سیاسیەکانی کەش هەروەکو

خۆیان یەکیان قبولْ نیە لایەک دەسەلاتدار بێت و لایەک ئۆپۆزسیون بێت هەردووکیان هیچ لایەکی کەشیان قبولْ نیەو هەر حزبێک سەر هەڵبدات بەهەردوولایان دژی دەبن کەئەوەش نابێ وابێت، ئێستاش دەبێ بواری پەرلەمانی کوردستان بدرێ و هەردوو حزب ئەوەندە دەست نەخەنە کاروباری یا رێگر نەبن بەڵکو بوار بدەن ئاراستەی خۆی وەربگرێ، رۆژژمێری پێشمەرگەیەک خۆشبەختانە لەکاتێکدایە کورد دەسەلاتی لەکوردستان هەیەو لەعێراقیش جێگاورێگای هەیە هەرچەندە من خۆم باوەڕم بەو دەسەلاتەی بەغداد نیەو نە بەخزمەتی کوردی دەزانم و نە بەئەوەشی دەزانم ئومێدم پێی هەبێت بەڵکو بەرێ کردنی کاتەوکاتیش لەبەرژەوەندی ئێمە نابێت ئەو پێشەکیە درێژەم بۆیە نوسیوە لەبەر ئەو گۆرانانەی کەبە سەرکوردستان و عێراق و ناوچەکەدا هاتووە، دەربارەی بەرگەکانی پێشویش و داهاتووش ئەوانیش هێشتا زۆری کەش هەیە باسی لێوە بکەین چونکە لەداهاتوش رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەک بەردەوام دەبێ ئەگەر خوا یارمەتی داو مەرگ مەودای داین ئەوە درێژەی دەبێت و هەموو بەرگەکان بەتایبەتی ١و٢و٣و٤ کەرۆژانی سەخت و ناخۆش و خۆشی و ژێر کەوتن و سەرکەوتن و هەورازو نیشوی تێدا باس کراوە ئومێد دەکەم ببێتە کەرەستەیەکی سەرەتایی یاکەرەسەی خاوبێت بۆ ئەو کەسانەی مێژو دەنوسنەوە و ئەو قۆناغانەی ئەو روداوانە روی داوە سودی لێ وەربگیرێ واتە من لەو (٢٠) ساڵەدا کەرەسەیەکی خاو بەلام زیندو بەبێ ئەم لائەو لاو لای بەڵگە نامەکان خۆیان راستتگۆیانەم هاویشتەوەتە کتێبخانەی کوردی یا سەر خەرمانەی ئەدەبی کوردی بەدڵنیاییەوە هەر بەرهەم و نوسین واتە فەرهەنگ یا ئەدەب کەپێکهاتووە لەهەموو ئەم بابەتانەی پێ ی دەڵێن ئەدەب یا فەرهەنگ بێ کەم و کورتی نابێت بەتایبەتی هەر نوسەرێک بۆ

ئەوەی دەینوسێ خۆی راو بۆچونی خۆیەتی ئەگەر واش نەبێ رەخنەو رەخنە گرتن دروست نابێ، هیوادارم هەرکەس شتێکی هەبێت ئاگادارم بکاتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر وەخت هەبوو لەپیاچونەوە بەهەر چوار بەرگەکەدا کەم و کوڕیەکان دەست نیشان بکەین بەئومێدی داهاتوویەکی باشتر بۆ میللەتەکەم و هانی هەموو کەسیش ئەدەم ئەوەی دەیزانێ و هەیەتی بیخاتە سەر کاغەز بۆ ئەوەی مێژوەکەمان ون نەبێت و کلتورەکەمان دەوڵەمەند تر بکەین بەتایبەتی ئەوانەی لە شۆرش وریزی پارتە سیاسیەکاندان ئەوەی دەیزانن لە زیندە بە چاڵ رزگار بکرێت.

محەمەد حاجی مەحمود
گوڵەخانە

# سەرەتای قۆناغێکی نوێ

ساڵی ١٩٩١ ساڵێکی کامەران بوو بۆکورد، کوردلەژێر هەوای ئازادی و کوردستانی ئازادا دەژیاو دور لەچەکمەی رەشی داگیرکەران (٩) مانگی رێك بوو کورد بۆخۆی شت بوو عێراق ئیداراتی کشاندبووەوە، کورد بیری لەهەڵبژاردن و دروست کردنی پەرلەمان بۆ کوردستان دەکردەوە، کورد چاوەڕێی دروست کردنی حکومەتی خۆی بوو بۆدانانی بناغەیەك بۆکیانێکی کوردی داهاتوو، مەسەلەی رەوای کورد لەفایلی نێودەوڵەتی و وڵاتە دەسەڵاتدارەکاندا کەوتبووە سەرەوە مەسەلەکەی لەئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی تەرح کرابو، بریاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایش و بونی مەسەلەی کوردی لەسەر پێشنیاری فرانسۆمیتران لە دەوڵەتی فرنسدا و ئەمریکاوپشتیوانی ئێران و وڵاتانی گەورە باسی مەسەلەی کورد دەکەن و هێزی پاراستنی کورد لەدەست درێژی دامەزراوپۆلیسی (UN) لەکوردستان بونی هەیە، کورد دۆستی بۆزۆر بووەو دۆستەکانی دڵخۆش و دوژمنەکانی نیگەرانن بەڵام ئەوەی هەمیشە لێ ی دەترسین ئەو وەزعەمان لێ تێك بدات و لەباری بەرێ شەری ناوخۆوئاڵۆزی کوردستانە تموحی هەندێك لەحزبەکان لەسەر سنوورو هەندەران چەند بەرەزالەت ئامادەبون ئەگەر عێراق رێگایان بدات بەئەنجومەنی یاسا دانان و جێ بەجێ کردنی بەعس لەهەولێر رازی بون بەڵام رژێم پێیان رازی نەبوو ئەگەر بیرلەو رۆژانە بکەنەوە لەئاوارەیی و دەربەدەری خەڵکی کوردستان دەبێت لەسەر دەسەڵات و پارە خۆشیان و میللەتەکەش توش نەکەن بەڵام ئەو جۆرە قسەییەی ئێستاو سەرکردایەتی کوردی بەرەو کارەساتمان نەبات باشە، چاوەڕێی ئەو هەڵبژاردنەش دەکەین وئومێددەکەین سەرکردایەتی کوردی دەرسیان وەرگرتبێت لەرابردوو چارەسەری کێشەکانی خۆمان بکەین و نەگاتە شەروکوشتن و برین و پەنابۆ چەك ومالٔ وێرانی کوردە، کورد نەشەرو نەئاشتی نازانێ ئاشتی بەتێکەڵ

بون و ململانێی سیاسی وراگەیاندن بەشەر دەزانیٚ گویٚ لەرادیۆو تەلەفزیۆن بوو قسەوباسی کۆبونەوەی پێشیاندا بیٚ چەك دەرواتە بازار گویٚ لەتوندی رادیوو تەلەفزیون هەبوو چەك و مەخزەنەکانی شەو دەخاتە ژێر سەری و دەخەوێت ئەقلیەتی لە گەڵ خواروو ژووری قسەدایە نەك مشکیلەوچارەسەرەکەی لەپێش چاوی نەتەوەی خۆی خۆی بەکەمترنازانیٚ بەڵام بەرامبەر بێگانە هەمووی یازۆرخۆی بەکەم و بچوك دەزانیٚ، ئومێد دەکەین ساڵی ۱۹۹۲ ساڵێکی پرخۆشی و ئازادی یەکجاری گەلەکەمان بێت، دەفتەری رۆژانەی ساڵی ۱۹۹۲ م زۆرگۆڕانی بەسەرنەهاتووە جگە لەوەی کەهەیەو دەینوسمەوە (محمدحاجی محمود نازناو سەرباز ، کاوە، عەزین) پێشمەرگایەتی، شار کوردستان گەرەك یاپارێزگا سلێمانی، شەقام پێنجوێن/ سلێمانی، هەرئەوەی مانگی ۱۹۹۱/۱ نوسرابوو، تەلەفۆنی شاری سنەمان لەئێران ۳٦۹۹۵ جگە لەتەلەفۆنی سلێمانی ۲۰۳۷۳ زیاد بووە، ماڵ : سنە هەرلەجێگای خۆیەتی، سەیارە ۸۸۸٦ هەروەکو خۆیەتی کەمێك زیادی کردووە، جۆری خوێن (O+)، سەریٚ ساڵیٚ هەرساڵێك لەهەموو دنیاداو دنیای مەسیحیەت دەوروجێگای تایبەتی خۆی هەیە بەڵام لای من و لەکوردستان هیچ جیاوازیەکی لەرۆژەکانی کەنەبوو فەرقم پیٚ نەکرد هەرچەندە من لەشاری سلێمانی بووم و خەڵك و دۆست و برادەر کارتی پیرۆزبایی لەکوردستان و دەرەوە دەهات و لەشاریش خۆیان کۆکردەوە بۆسەرچنارو لەو جێگایەی کۆببنەوە منیش ئەوەشم نەبوو لەسلێمانی و لەماڵەوەو هەروەکو ئێوارەکانی کە دانشتبوین وئاسایی بوو لامان.

# ساڵی ١٩٩٢ و روداوەکانی

لە١٩٩٢/١/١ هەرخەریکی کاری ئاسایی خۆم بوم لەمەقەردا، لە١٩٩٢/١/٢ چوینە دەربەندیخان بۆپرسەیەك و گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٢/١/٣ کۆبونەوەی کۆمیتەی لقی سلێمانیمان هەبوو لەسەر رووداوەکان و بەرنامەی ساڵی تازەو تەسفیەی حیسابی ساڵی ١٩٩١ و دەست بەکاربوون لەرووی سیاسی و راگەیاندن و رێکخستن و جەماوەری و مەسەلەیەکی چارەنووس سازمان لەرێگادا بوو ئەویش هەڵبژاردن و پەرلەمان بوو چی بکەین و چۆن بەرنامەی بۆ دابنێن و دەبوو مانورێکی سەربازی گەورەش بکەین کەزیاتر لە هەزار پێشمەرگە بەشداری تێدا بکات و ئەوەش خەرجیەکی یەکجار زۆرمان بۆی کردبوو، لە١٩٩٢/١/٤ چوینە دوکان لەسەر داوای ئەندازیاران و سەردانی سەدەکەمان کرد هەندێك پێشمەرگەی پارتی و یەکێتی لەوێ بوون پێیان وتین مەمنوعە ئێوە سەیری بکەن و کامیراتان پێ بێت، ئەمری کاك نادرە قائیمقامی دوکانە وتمان برا خۆ ئێستا هەموو رۆژێ ئەندازیارەکان لەبەغدادەوە دێن سەیری دەکەن بۆ بۆئێمە قەدەغەیە پاشان سەیرمان کردو گەراینەوە بۆسلێمانی کۆبونەوەی لق مان هێشتا تەواو نەببوو بەردەوام بوین لەکۆبونەوەکە، لە١٩٩٢/١/٥ لەسلێمانیەوە بۆدوکان و بۆرانیە وچوینە مەکتەبی سیاسی لەوێ ماینەوە، لە١٩٩٢/١/٦ لەرانیەوە چوینە شەقڵاوەو بۆهەولێرو شەوگەراینەوە شەقڵاوە، لە١٩٩٢/١/٧ تانزیك ئاقوبان هاتین رێگانەبوو لەبەر بەفر گەڕاینەوە شەقڵاوە، لە١٩٩٢/١/٨ چوینە خەلیفان کۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی هەبوو لەسەر وەزعەکانی ساڵی تازەو بەرنامەی کارکردن و مەسەلەی هەڵبژاردن کاك د.محمود بوو یەکەم جار باسی هەڵبژاردنی رابەری کوردستانی پێشنیار کردو باس کراوئەویش کاك د.محمودپێشنیاری کردلەسەرنوسینی نامەیەکی کاك مسعودومام جەلال بۆ

وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، وتیان هەردووسەرۆك ئیمزای بکات وە بۆ لەسێدارەدانی چەند کەسێك لەدادگای بەرەی کوردستانی دەبو هەردوولا مام جەلال وکاك مسعود ئیمزای بکەن لەبەرئەم هۆیانە دکتۆر محمودپێشنیاری هەڵبژاردنی سەرۆکی کرد..کە دوای ئەو هەمووکێشەیەی لێ کەوتەوە باس کراولەگەڵ کێشەی رۆژانە پاشان گەراینەوە بۆرانیە، لە١٩٩٢/١/٩لەرانیەوە گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٢/١/١٠ لەسلێمانیەوە چوینە باریکەو هەڵەبجەو گەراینەوە، لە١٩٩٢/١/١١ لەسلێمانیەوە چومە بازیان و گەرامەوە بۆسلێمانی شەوهاتن وتیان کابرایەك هاتووە لەبەغدادەوەو پێویستە کەتۆ ببینێ و ئیشی زەروری هەیە منیش ووتم بابێت کابرا ناوی حەسەن شەمەری بو زۆرقسەی کردو قسەکانی هەموی لەراست نەدەچوو وتی کاتی خۆی مدیری پۆلیسی کەرکوك بوم و پەیوەندیم لەگەڵ بارزانی نەمر هەبووەو ئێستا نەم ویستووە برۆمە لای ئەوان مسەلەیەکی گرنگ هەیە ماوەیەك لەسەفارەتی عێراق لەئیتاڵیا بوومە هەروەها وتی ئێمە کۆمەڵێك ئەفسەرمان هەیە یەکێ لەوانە کەریم کەپاسەوانی شەخسی سەرۆکی عێراقەو هەندیك ئەفسەری خانە نشینشمان لە گەڵدایە لە جەیشی عێراقدا دەسەلاتیان هەبووە ئێستاش کاریگەریان لە ناو جەیشدا زۆرە زۆری کەش هەمووشت دەتوانین بەلام پێویستمان بەقومبەلەیە کەبەکۆنترۆڵ دەتەقێتەوە لەدوورەوە ئەویش بە (١٥)هەزار دۆلارەو (١٠) هەزاریشمان پێویست دەبێت بۆئیشوکاری رۆژانەو گواستنەوەی خەڵکی خۆیان و لەوبابەتە،داوای (١٠٠٠) دۆلاری کەی کرد گومانم لا دروست بووبەلام برادەران وتیان بابروات من ووتم باشە بەڵکو یەك دوو لەوئەفسەرانە بێن بییان بینین پاش ماوەیەك هێنانینی دوای ماوەیەك چاومان پێیان کەوت یەکێك لەوانە ناوی مقدەم خالید بوو ئێمەش ٢١ هەزار دولارمان دایە دوای ئەوەی ناردمان بۆلای کاك رەسول مامند لەگەڵ کاك رەشیدعارف ئەندامی

بکەن رێگا بدات جەیش بێتەوە کوڵەجۆ کێشەی سەدی دوکانیش عێراق داوای لە کاك مسعود بارزانی کرد کە رێگابدەن ئەندازیارەکانی سەدی دوکان لە بەغدادە وە بێن بۆ سەر سەدەکەی دوکان یەکێتی یش کاك جبار فەرمان رێگای نەئەدا ئەیانوت عێراق کارتی تۆربۆی سەدەکە ئەبەنەوە کارەبا هەموی ئەوەستێت یەکێتیش ئەوەبوو رێگایان نەدە داو قسە لەسەر ئەوە زۆرنەکرا كاك مەسعود ومام جەلال و کاك دکتۆریش لەوێ بون هەروەها مەسەلەی موچەی کارمەندو ئیداراتی کوردستان باسی کرا چی بکرێت و دەست بەکاربن و زیاتر خۆئامادە بکرێت لەگەڵ (UN) قسەبکرێت بۆئەوپێویستیانەی هەڵبژاردن وەکومەرەکەب و کاری کۆمپیوتەری ئەگەر کراو خۆشیان لەنزیکەوە یەکێکیان چاودێری وەزعەکە بکەن و لەرۆژی هەڵبژاردندا باسی ئەو تاوانبارانەی لەسەر کوشتن (قتل) گیراون اعدام بکرێن دەبوو مام جەلال وکاك مەسعود ئیمزای بکەن پێکەوە ئەوەمایەوە بۆئەوان، کۆبونەوەکە باسی زۆرشتی لێ کرا هەورەها باسی ئەوەش کرا کەخاڵی پشکنینەکان وردتربن و لەوکاتەدا تەقینەوەش هەبوو بۆئەوەی بوار نەدرێت بەو شێوەیە کۆتایی بەکۆبونەوەکە هات پارتی داوایان کرد بارەگای سەرکردایەتی سیاسی دوورە لەهەولێرو شارەکانەوە وتیان باشە بڕواتە هەولێر، برادەران وتیان هەولێر هێشتا بۆئەوە نابێت کۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی لێ بکرێت پاشان وتیان شەقڵاوە باشە دیسانەوە برادەران وتیان ئەوێش جێگا نیە پاشان کاك فرانسۆ ووتی ئەی لەصلاح الدین ئێمە جێگامان هەیەو هەرنەش بوو کۆبونەوە لەمەکتەبی سیاسی دەکەین واتە دەیانویست بارەگای بەرە کەگرنگییەتێکی تایبەتی هەیەو چۆن لەئێران داوایان کرد یاواپێویست بوو لەراژان بێت لەوێش داوایان دەکرد لەصلاح الدین بێت بۆئەوەی مەرکەزیەتی کورد لای پارتی و کلیلەکەشی لای کاك فرانسۆ و برادەرانی کەش وەکو فەرمانبەر بێن کاری تێدابکەن ئەوەش هەروەستا منیش

گەرامەوە بۆرانیە، لە١٩٩٢/١/١٣ داوایان کرد برۆمە بەرەی کوردستانی لەسلێمانی بۆئیشوکاری کەگیریان کردبوو لەوێ بۆچارەسەریان و رێکخستنیان لەسلێمانی پێش ئیشوکاری بەرە من هەڵم دەسوران زیاتر خاڵەحاجی نوێنەری حزب بوو لەکارگێری پارێزگای سلێمانی و کەرکوك بەرەی کوردستانی مەقەری لەسلێمانی بوو لەیەکێتی نیشتمانیش کاك عمری سیدعەلی بوو وەلەحزبی شیوعی کاك حمەشوان بوو وەلەپارتی کاك فائیق رەش و کاك دکتۆر رۆژ بوو جارجاریش وەلەپاسۆك کاك عبدالله ئاگرین بوو، لە١٩٩٢/١/١٤ لەباریکەونەسربوین وخەریکی ئیشوکاری خەڵکی و گیروگرفتەکانیان بوین لەوکاتەدا دەیان کێشەی عەشائیری وکۆن سەری هەڵدابووەو لەهەموولایەکەوە حزبەکانیش هۆکاری بون چونکە پێش حزبەکان جەماوەر هەموی پێکەوە راپەرین و بێ جیاوازی بیرورا بەلاَم حزبەکان گەرانەوەو هەریەکە لەکۆلانێك و گەرەکێك بارەگای داناو جەماوەر بەناوی بەرەوە قسەی دەکرد ئەوان بەجەماوەریان دەوت بەناوی حزبەوە پاشان بەرەوە دەستیان لەئیشی خەڵکی دەدا چونکە بوار زۆربوو وەبۆئەوەی خەڵکەکە بزانێ لێپرسینەوە لەگەڵ ناکرێت و بەپێچەوانەوە پشتیوانی لێ دەکرێت بەدوای تۆڵەی خۆیدا دەگەرێت و ئەوەی پێ ی بکرێت دەیکات ئەوەش سەری هەڵدابوو چارەسەری ئاسان نەبوو زۆرجار بە ئار.بی.جی. و دۆشکا عەشائیر لەیەکی دەداو هەرلایەکیش لایەك خۆی دەکردە خاوەنی و دەیپاراست، لە١٩٩٢/١/١٥ لەسلێمانیەوە چوینە پێجوێن وبۆ مریوان و کانی دینار چونکە ماڵمان لەوێ بوو، لە١٩٩٢/١/١٧ لەکانی دینارەوە بەرێ کەوتین بۆ سنەو لەوێ خەریکی کاری حزب بوین ئەوەی کرا کردمان هەندێ کەرەسەی راگەیاندنمان کری و(١٢٠٠) قات جلی سەربازیمان بەدورین دروست کرد بۆمانورە سەربازیەکە بەکلاَو نیتاقەوە سێ جۆر جل بوو مغاویری وخاکی و سەوز بوون لەبازارلای خەیات بەقوماش و کلاَوهەرقاتێك ئەو

کاتە (٢/٥٠٠) تومەنی تێچوو بەهەمویەوە نزیکەی (٣) ملیون تومەن بۆجل و بەرگ بەڵام پێڵاوەکەی یەك جۆربوو جگە لە ئاهەنگ و چەك وسەیارەو پێویستیەکانی کە لەیەك مانگدا حازری بکات و تەسلیمان بکات، لە١٩٩٢/١/٢٢ لەسنەوە گەراینەوە بۆمریوان، لە١٩٩٢/١/٢٥ لەمریوانەوە گەراینەوە دنیا زۆرساردبوو بەفربوو شەو گەیشتینە پێجوێن و لەوێ ماینەوە، لە١٩٩٢/١/٢٦لەپێنجوێنەوە گەراینەوە بۆ ناڵپارێزوبۆ سلێمانی، لە١٩٩٢/١/٢٧ دعوەت کراین کۆنگرەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەبوو لەسلێمانی لەهۆڵی رۆشنبیری خەڵکێکی زۆری لێبوو دەعوەت کرابوو کاك مەسعود بارزانی دەعوەت کرابوولەوێ بوو یەکێتی ئەوپەری گرنگی بەکاك مەسعود دابوو لەکۆنگرەکەداو ئەوەی لەریزی یەکەم بون کاك مەسعود وکاك جەوهەر نامق و دکتۆر رۆژ وکاك فاضل مطنی و زۆری کەش لەوێ بون وەلەحزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دکتۆر سعید شەرفکەندی و کۆمەڵێکی کەش وەلەحزبی شیوعی زۆرم نەدی و لەحزبی زەحمەتکێشان کاك قادرعزیز لەوێ بوو هیچ حزبێك نەمابوو لەوێ نەبن لەسۆسیالیست کاك رەسول و کاك دکتۆر محمودو من لەوێ بوین ئەوەی زۆر پەراوێز کرابوو وەفدی حزبی سۆسیالیست بوو هەتا کاك رەسول و کاك دکتۆر رێگایان نەبوو لەریزی پێشەوە دایان نێن یادانیشن لەدوای پەردەکەوە یامنەصەکەوە دووسێ کورسیان هێنابۆمان لەدووبەینەوە کورسیەکەی کاك رەسول و کاك دکتۆرم بردە بەینەکەوە هەرنەگەیشتە ریزی پێشەوە ئەوکاتە یەکێتی زۆر غرور بوون هەرچەندە خۆیان لەئەنجامی کۆنگرە ترسیان هەبوو بەڵام ئەوەی من دیم و وابوو سەرەتا یەکێتی وابزانم کاك محمد توفیق بوو بەخێرهاتنی هەموو لایەکی کردوپاشان پارتی و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و دووسێ یەك قسەی کردو ئەوکات کاك رەسول قسەی کردو نوێنەری ئێرانیان بانگ کردبوو بەلام لەوێدانەبووهەروەها نوێنەری سوریاش وابزانم محمد منصور لەوێ بوو نەك

لەریزەکان لەوناوەدابوو، نوێنەری زۆر ولآت و حزب و زۆری دەوروبەرو ڕێکخراوەکان لەویَ بوون قەرەباڵخەیەکی زۆربوو نازانم ئیسلامیەکا ن لەویَ بوون لەکوردستانی ئازاد لەوکاتەدا گرتنی کۆنگرە و بەسەرکەوتوی بۆیەکێتی نیشتمانی گرنگ بوو کارێکی ئاسان نەبوو ئەو هەموو بۆچونی جیاجیاو ئەقلیەتی لەیەك دوورو تەیاری جیاوازی ناو یەکێتی(کۆمەڵەو شۆرشگێران) هەموو بۆچونەکان پێکەوە گریَ بدات و لەیەکیان نزیك بخاتەوە لایەنگری کاك نەوشیروان کەدژی باڵەکانی کەی ناو یەکێتی دیاربون پێش ئەوەودوای ئەوەش دەیانویست لەکۆمەڵێك بدەن، کاك فەرەیدون عبدالقادر ئەندامی مەکتەبی سیاسی بوو لەکۆنگرەکە نەمان دی و دوای نیوەرۆیش بۆنان خواردن دەعوەتی وەفدەکان کرابوو بۆ ئوتێل ئەبوسەناو پاشان ئێمە خواحافیزیمان کرد، کۆنگرە (٤-٥)رۆژ درێژەی کێشاو وابزانم ١٩٩٢/١/٢٩ بوو کاك عمردەبابە کۆچی دوای کردوشەو جەنازەکەی لەمزگەوتی عەقاری بوو چوین بۆئەویَ، کاك عمردەبابە تێکۆشەرێکی ناسراوی کوردبوو کۆچی دوای کرد پاشان کۆنگرەکەیان گواستەوە بۆهەولێر لەوێش هەرپینەو پەرۆیەکیان کردوکۆمەڵەوشۆرشگێران حەل بون لەناویەکێتی دا وەکو خۆی و بەوشێوەی دەیانویست نەبوو بۆیان نەکراو پاشانیش کاك نەوشیروان بەجیَ ی هێشت و رۆیشتەوە دەرەوە جگە لەهەراو دەنگە دەنگ، لە١٩٩٢/١/٢٨ لەسلێمانی کۆبونەوەی لق و کادرەکان .هەبوو کاك رەسولیش لەسلێمانی بوو من و خاڵەحاجی لەویَ بوین لەوکاتەدا، لە١٩٩٢/١/٢٩ لەگەڵ کاك رەسول و خاڵەحاجی سەری هەرێمەکانمان دا بۆ مەرکەزی مەشقی پێشمەرگە و لەویَ پێشوازیان لیَ کردین ئەوکات کاك رەسول تێگەیشت کەلقی سلێمانی چیەوچی کردووە لەهەڵەبجەی تازە سیَ مەرکەز و لەسیَ جێگا مەشق دەکرا و لەعەربەت و چەند جێگایەکی کەش پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٢/١/٣٠ لەسلێمانی بوین خەریکی ئیشوکاری

بوین لەگەڵ کاك رەسول وخاڵەحاجی دا، لە١٩٩٢/١/٣١ سەردانی ماڵی شەهید عەلی عەسکەری و شەهید تاهیرعەلی والی و شەهید جمال حمەنوقڵە و چەند شەهیدێکی کە لەسلێمانی، لەرۆژانی ١و٢و٣و١٩٩٢/٢/٤ لەسلێمانی بوین، لە١٩٩٢/٢/٥ چوینە هەڵەبجەی شەهید بۆسەردانی چەند جێگاو بەرەی کوردستانی و گەراینەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ٦و١٩٩٢/٢/٧ لەسلێمانی بوین، لە١٩٩٢/٢/٨ چوینە رانیەو بۆ مەکتەبی سیاسی، لە١٩٩٢/٢/٩ هەرلەرانیە بوین لەمەکتەبی سیاسی و شەو لەگەڵ کاك رەسول ومامۆستا مەلاناصح وکاك شێخ محمد بوین شەوێکی ناخۆش نەبوو تاسەعات (٣)ی شەو قسە کراومامۆستا قسەی خۆش و نایابی بۆدەکردین لەمەکتەبی سیاسی، لە١٩٩٢/٢/١٠ گەراینەوە بۆسلێمانی بەفرێکی زۆر باری بوو لەسەررێگاکان لەپێنجوێن لەهەندێك جێگا (٢/٥)م باری بوو، لە١٩٩٢/٢/١١ لەسلێمانی دنیا زۆرساردبوو بەفرێکی زۆرباری بوو، لە١٩٩٢/٢/١٣ لەهەڵەدن لەبەرسەرماوبەفر(٥) کەس مردن خێزانی حمەسعید برای کاك صالح سورشی تێدابوو لەوسەرماو بەفرەدا کەس مشوری خەڵکی نەخواردبوو بۆ نەوت و سوتەمەنی خەڵکەکە داروچیلکەی کۆدەکردە بۆئاگر لەبەرسەرما داری تەریش دەبران، لەرۆژانی ١٤و١٩٩٢/٢/١٥ هەرلەسلێمانی بوین، لە١٩٩٢/٢/١٦ جەنازەی رەفیق توفیق کۆن پێشمەرگەی هەرێمی (٣) و لەرێکخستنی حزب کاری دەکرد لەکاتی کوشتنی دوو ئەفسەری ئستخبارات لەناو شاری سلێمانی تێکدانی ماڵی شەهیدان جەزاو وشیارمدحد کەبابچی لەسەردووسێ چالاکی ناوشار گیرابون ماڵی شەهید جەزاو وشیاری مەلاگورون هەموویان ئیبادە کرابوون وئیعدام کراون ئەویش هێنایانەوە بۆسلێمانی واتە رژێم هەرلەکاری خۆی و ئەقڵیەتی پێشوی وازی نەهێنابوو هەربەردەوام بوو لەسەری خەڵێکی زۆری هەواداری حزب لە١٩٩٢/٢/١٧ جەنازەکەیان لە گۆرستانی شەهیدان ناشت و پرسەیەکی گەورەشی هەبوو حزب

سەرپەرشتی دەکرد، لەرۆژانی ١٨و١٩/٢/١٩٩٢ هەرلەسلێمانی بوین، لە٢٠/٢/١٩٩٢ بەرێ کەوتم بۆرانیە کۆبونەوەمان هەبوو، لەرۆژانی ٢١و٢٢/٢/١٩٩٢ هەرلەرانیە بوین، لە٢٣/٢/١٩٩٢ گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٢٤/٢/١٩٩٢ لەسلێمانی خەریکی ئیشوکاربووم، لە٢٥/٢/١٩٩٢ هەرلەسلێمانی بوم زۆرماندو بوم چەند جارێك داوامان لەکاك رەسول کرد کەناورانیە بەکەڵکی مەکتەبی سیاسی نایەت بەتایبەتی شەخسی کاك رەسول هەرچەندە لەرانیە سۆسیالیست زۆر بوو وەناوچەکەش زۆری خزمی کاك رەسول بون و کەس نەیدەتوانی شەریکات بەڵام خزمەکانی کاك رەسول کێشەیان لەگەڵ زۆرکەس هەبوو زۆریش دژی یەکێتی نیشتمانی بون و یەکێتیش هەوڵی دەدا کێشەیان بۆدروست بکات و پارتیش لەوماوەیەدا ماڵی ئەنوەر بەگی بێتواتەیان هان دابوو بێنە سەر بارەگای کاك رەسول گوایە دوژمنێکیان یا یەکێ لەدژەکانی ئەوان پێشمەرگەیە لای سۆسیالیست بیکوژن کار گەیشتۆتە ئەوە لایەنە هاوپەیمانەکانی شاخ لەچەندین بەرەدا پێکەوە بوین ماڵی ئەنوەر بەگ کەتەمەنی لەچەکداری بۆعێراقدا سەرف کردبوو هانی بدەن لەهێزێکی شۆرشگێر هاتبون تەقەیان کردبوو کەئەوکەسە لەبەردەم بارەگای کاك رەسول دا پێشمەرگە تەقەی لێ کردبوون ولێ ی بریندار کردبون یەکێکیش لەو بەینەدا بریندار ببوو دوای بەناوی خۆپیشاندان و هاندانی کۆمیتەی یەکێتی لەرانیە هەندێك خەڵکیان کۆکردەوە بۆسەربارەگای کاك رەسول خۆپیشاندان بکەن و هەندێك چەکداریش لەدواوە حیمایەیان کردبوون پێشمەرگەی حزب بەوەی زانی زیاتر لە هەزار پێشمەرگە هاتە ناوشاری رانیەوتەواوی جادەو سەرکۆڵان و سەربانەکان گیران و تەقەش لەخۆپیشاندەرەکان کراو یەکێ کوژراو تەفروتونا کران و هەرشەویش کاك رەسولیان گواستەوە بۆفرقەکە لای چوارقورنە، لەبەرکوژرانی ئەو کەسە یەکێتی کردی بەهەرایەك لەسەری بەیان دەرکردن لەژێرناوی جۆراوجۆردا

بەڵام هاندانەکەی یەکێتی بون لەبنەڕەتدا، ئێمەش چوینە رانیە بەکاک رەسوڵمان ووت هێزەکانمان دەهێنین وتەمێی هەموو ئەوانە دەکەین کەئەوکارەیان کردووە وادیاربوو هەندێك عەشائیری ناوچەکە چوبونە لای کوێخا پیرۆت برای کاك رەسول پیاوێکی باش و ناسراوی ناوچەکەش بوو ئەوبریاری دابوو کەنەیەڵێت کاك رەسول کاردانەوەی هەبێت لەسەرئەوکارەساتە ئێمە بۆئەو مەسەلەیەو لەرۆژی ١٩٩٢/٢/١٧ چوینە رانیەو هەموو شار لەژێر کۆنترۆڵی سۆسیالیستدابوو وتیان کاك رەسول لەفرقەکەیە ئێمەش گەراینەوە لای کاك رەسول، کاك رەسول ووتی شتەکە کۆتایی پێ هاتووە من وتم کاکە ئەو مەسەلەیە عەشائیری نیەو ئەوان لەبەردەم بارەگای حزبدا تەقەیان کردووە، کاك رەسول وتی تەواوکۆتایی بەوکارەهات ئێمەش هەمان رۆژگەراینەوە سلێمانی، لە١٩٩٢/٢/٢٨ لەسلێمانی بوین، لە١٩٩٢/٢/٢٩ کۆبونەوەی عەشائیری ناوچەکە بوو لەبارەگای بەرەی کوردستانی لەسلێمانی بۆچارەسەری کێشەی نێوان گلاڵی و یوسوجانی لەشارەزوور کۆتایی پێ هات ئێمەش لەبەرە (٦٠)هەزار دینارمان بۆ سەرف کردن، لەشەوی ٢٩-١٩٩٢/٣/١ سەعات (٩)ی شەو تەقەکرا لەکاك عبدالملیك عەلی ئامرهێزی حزبی سۆسیالیست بوو لەگەڵ سائیقەکەی شەهیدیان کرد کەکارێکی خراپ بوودژی کوردو حزبی سۆسیالیست کرا وەحزبەکان کردیان لەسلێمانی، لە١٩٩٢/٣/١ بەشێوەیەکی باش و قەرباڵغیەکی زۆرەوە بەخاك سپێراو پرسەی بۆدانرا کەحزب سەرپەرشتی دەکرد کورێکی بریندار ببوو مناڵ بوو تەمەنی ٦ساڵ بوو ، بنەکەی مەشقی سلێمانی کە لەشەستیەکەبوو کرابەناوی شەهید عبدالملیك وە، لە١٩٩٢/٣/٣ لەسلێمانیەوە چومە رانیە بۆکۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی و گەرامەوە بۆسلێمانی وەخۆشمان ئامادە دەکرد بۆمانوەری سەربازی حزب بەبۆنەی رۆژی راپەرینی ١٩٩١/٣/٥ وە لەرانیەو پشدەر، لە١٩٩٢/٣/٤ لەسلێمانی بوین، لە١٩٩٢/٣/٥ بۆیەکەم جارمانوەری سەربازی

لەمێژوی کوردا کراو سلێمانی ئەورۆژەی بەخۆوە بینی و بەو شێوەیە جەماوەری سلێمانی و ناوچەکە هێزی سەربازی خۆی کوردبەجلی سەربازی و چەکی سوك و قورس و شێوەیەکی رێك و پێك کەجەیشێکی خاوەن ئیمکانیەتیش نەیدەتوانی هەنگاوی وابنێت و جەیشی وائامادە بکات ئەوانەی مەشق و سەرپەرشتیان دەکردن هەموی ئەفسەری دەرەجەداری عێراق بون و مامۆستاکانیش هەروا و (٣)مانگی تەواو بێ وەستان مەشق و راهێنانیان پێ کرابوو مغاویرو پیادەو تەنانەت ئافرەتانیش بەشداریان کرد لەو مانوەرە بە(١٠٠) ئافرەت بەجلی سەوزی سەربازیەوە وە(١٢٠٠) پێشمەرگەش بەجلی سەربازیەوە واتە(١٣٠٠) کەس بەشداری کرد بەچەند بەشی جیاجیا و هەربەشەش یان هەرمەرکەزێك ئیشی خۆی هەبوو وەهەر بەشێك بەناوی شەهیدێکەوە ناونرابوو وەکو شەهید تاهیرعەلی والی و شەهید ئەنوەرمجید سوڵتان و شەهید ملازم عوسمان سعیدوالی و شەهید ملازم جمال خۆشناووشەهید عبدالملیك و شەهید مولازم مەجید کاکەیی و بەوناوانەوە، لیژنەی سەرپەرشتی دەعوەتی هەموو لایەنەکان و ئەفسەرە کۆنەکانی سوپای عێراق و ئەوانەی لەناوشۆرشدابوون هەموو دام ودەزگاکانی بەرەی کوردستانی وجەماوەرونوێنەری ئێران هەرلەو مانۆڕەدا چەندین چالاکی کرا وەکو کۆنفۆو چەندین چالاکی کە وەلەو ئەفسەرە کۆنانەی ئامادە بوون کاك کەمال موفتی و هەموو ئەفسەرەکانی دوای ئەویش وەئەو بەرەوە رازابوەوە کاك نصرالدین عەلی عوسمان لەگەڵ کاك رسول مامند مانۆرەکەی پشکنی زۆر ئەفسەری تێدا بەشداربون ئافرەتان و خوێندکاران بەشێوەی جۆربەجۆر رەسمی سەیداو رەنگاو رەنگ لەئامادەیی پیشەسازییەوە دەستی پێکردو لەحسیب صاڵحەوە بۆسەرەوە کۆتایی پێهات پاش قسەکردنی لایەنەکان نمایشی چەك دەستی پێکرد هەرلەهاوانی ٦٠و٨١و١٢٠ی تێدابوو پاشان دۆشکای ١٢/٥و١٤/٥وچوارلولەو دوولولەی تێدابوو

پاشان تۆپی ۱۰٦و۱۲۲و۱۵۵ ی تێدابووجگەلەچەکی کەی جۆراوجۆر لەمانۆرەکەدا چەکی سوکیش هەموو پێشمەرگە پێی بوو بەگوڵ پێشوازیان لێ دەکرد خەڵك و کەسوکاری شەهیدان دڵخۆش بوون خەڵکی لەخۆشیدا دەگریا ئەوەی دۆست بوو پێی خۆشبوو وەناحەزیش پێی ناخۆشبوو چونکە ئەوهێزەی یابەشێك لەوهێزەی سۆسیالیست حەجم و قەبارەی حزبە بۆیە هەوڵی ئەوەیان دا یاکەوتنە خۆیان بۆبەرگری لەوگەشە کردنەی حزب و ئێرانیەکان وتیان ئێوە ئێستا دەتوانن هەموو گۆرانکاریەك بکەن لەکوردستان هێزوتوانای سۆسیالیست حسابی تایبەتی بۆدەکرا بۆهەموو لایەك، کاك کەمال موفتی وتی من وەکو ئەوەی بیرم کردەوە کاری باشتان کردووە بەراستی بنیادی سوپایەکی یەکگرتوی کوردی یاکاکڵەی ئەو سوپایە بێت کەکورد بەتەمایەتی لەکۆتایدا من قسەم لەسەرئەو سوپایە کردو ئەوە تەنها هی حزبی سۆسیالیست نیەو هی کوردەو بناغەی یاکاکڵەی سوپای کورد دەبێت لەداهاتوودا ئەوکات ئێمە تەلەفزیونمان نەبوو ئەوەی من هەوڵم بۆدابوو هێشتا نەمتوانی بوو سەرکەوتنی تێدا بەدەست بهێنم لەهەموو لایەنەکانی کوردستان تەنها یەکێتی نیشتمانی کوردستان تەلەفزیونی هەبوو ئەو هەواڵە گرنگەو ئەو خۆشییە مێژوییە داوامان لەپۆلیسیش کرد کەبەشداری بکات لەو مانۆرە پۆلیسی کورد لەبەرەی کوردستانی بە(۱۰۰) پۆلیس بەشداریان کرد وەلەمانۆرەکەدا لەپێشەوە ئاڵای کوردستان هەڵگیرابوو لەگەڵ رەسمی هەندێك لەسەرکردەکانی کوردی پێکەوە دروست کرابوون شێخ محمودی نەمرو شێخ سعیدپیران و قازی محمدو مەلامستەفاو سیداصاڵح و شەهید شێخ شەهاب بوون، بەڵام تەلەفزیونی یەکێتی یەك لەقتەی پۆلیسەکانی پیشانداو وتی ئەمرۆلەسلێمانی پۆلیس و سۆسیالیست مانوەرێکیان کردوە لەوە زیاتری باس نەکرد، بەڵام شەخسی مام جەلال هاتە سەردانی و پێی خۆشبوو(۱۰۰۰) قات جل پێشکەش کردبو بنکەکەی پێشمەرگە

دوای ئەوە یەکێتی و پارتی و لایەنەکانی کە بیریان لەوە کردەوە مەشق بەهێزیان بکەن و رێکیان بخەن تا ئە وکات کەس و هیچ لایەنێك بیری لەمەشق پێکردنی پێشمەرگە نەکردبوەوە من پێم وایە حزبی سۆسیالیست زۆر دەست پێشخەری کردووە لەمێژوی خەباتی هەمە لایەنەدا بۆنمونە یەکەم تەرحی ئاشتبونەوە لەساڵی ١٩٨٤ لەلایەن سۆسیالیستەوە ئەوکات لەرۆژنامەو گۆڤاری سورێن دا لەژمارە (١٣–١٤)دا بلاّوکراوەتەوە، سۆسیالیست لەساڵی ١٩٧٦ ولەمانگی(٦) دا شۆرشی دروست کردووەو مفرەزەی چەکداری دامەزراندووە، وەلەساڵی ١٩٨٦ یەکەم مەقالەی لەسەربەرەی کوردستانی کەزەروریە بۆهێزە کوردستانیەکان لەرۆژنامەی رێگای ئازادی حزبدا بلاّو کردەوەو لەکۆبونەوەی ١٩٨٦/٧/٢٣ هەردوو مەکتەبی سیاسی سۆسیالیست و یەکێتی لەیاخسەمەر هەردوولا لەسەری رێکەوتن ، بیرکردنەوە لەیەکەم سوپای کوردی هەرسۆسیالیست هەنگاوی بۆناوەو زۆر دەست پێشخەری کەی کرووە لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردستاندا، لەکاتی خۆیدا دەتوانین دەستیان لەسەر دابنێین وزیاتر ئاشکرایان بکەین لەهەلومەرجی لەباری خۆیدا، لە١٩٩٢/٣/٦ سەعات (٩)ی شەوسەیارەیەك لەنزیك جێگای مانۆرە سەبازیەکە تەقیەوە لەبەردەم ئوتێل ئاشتی لەسلێمانی چونکە وایان دەزانی ئێمە رۆژی ١٩٩٢/٣/٧ مانۆرەکە دەکەین کەرۆژی راپەرینی شاری سلێمانی دەکات بەلاّم ئێمە لە ١٩٩٢/٣/٥ مانۆرەکەمان کرد کەرۆژی راپەرینی کوردستان بوو لەرانیەوە دەستی پێکرد سەیارەکە ئامادە کرابوو بۆئەو رۆژە بەلاّم نەیانزانی بوو وەتەقینەوەکە بووە هۆی کوشتنی چەند کەسێك و برینداربونی (١٥) کەس ئێمە زووگەیشتینە جێگای روداوەکە و بەپەلە بریندارەکانیان گەیاندە نەخۆشخانە لەسلێمانی، لە١٩٩٢/٣/٧ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیمان هەبوو، لە١٩٩٢/٣/٨ لەسلێمانی بوین خەریکی ئیشوکاربوین لەبارەگای چوارباخ زۆر شتی سەیر بوو

لەپێنجوێن بارەگامان لەچورباخ بوو لەمریوانماڵمان لەچوارباخ بوولەسنەش چوارباخ هەبوو لەسلێمانیش بارەگامان هەرلە چوارباخ بوو، لەقەرەداغ بارەگامان لەبلکیان بوو لەپێنجوێن بارەگامان لەبلکیان بوو یابلکیان زۆرە وە(٣) کوڵکنی لەشارەزوور هەیە وەکوڵکنی لەئێران هەیە لای سەیتەرەی کرمانشان دا هەموی پێ دەچێت یەك عەشیرەت و یا لەو جێگایەوە چونەتە جێگایەکی کەوە، لە٩/٣/١٩٩٢ لەسلێمانیەوە چومە دەربەندیخان وسەردانی ناوچەی حزبمان کردو کۆبونەوەمان هەبوو، لەرۆژانی ١٠تا١٤/٣/١٩٩٢ هەرلەسلێمانی بوین و خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بووم ئەوکاتە لەبەرەی کوردستانیش دەوامم دەکرد بۆئیمزاکردنی هەندێك بریاری گرنگ، لە١٥/٣/١٩٩٢ بۆیەکەمجار لەدوای راپەرین بریار درا یادی هەڵەبجەلە١٦/٣ بەرەسمی بکرێتەوە، چومە هەڵەبجەو سەردانی بارەگای ناوچەو بەرەی کوردستانی و لیژنەی ئاهەنگی هەڵەبجەم کرد خەڵێکی زۆر هاتبون کەنیوملیون خەڵك بۆبەشداری لەیادی هەڵەبجەولەکاتی ئازادی دا کارێکی گرنگ بوو کورد لەهەموو لایەکەوە روی کردبوە هەڵەبجەو مام جەلال قسەی کردو دوای مام جەلال منیش بەناوی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانیەوە وتارێکم خوێندەوە دوای منیش کاك نێچرڤان بارزانی بەناوی پارتیەوە وتاری خوێندەوەو کاك نێچرڤان قسەکانی تەواو نەکرد کارەباو تەلی موکەبەرەکەیان بریوو دەنگ نەما پاشان موکەبەرەیەکی دەستیان بۆهێنا تائەوەهات زۆری خەڵکەکە دور کەوتنەوەو پاشان سەری گۆری شەهیدان دراو گوڵمان خستەسەری و دوای ئەوەش بەرنامەکان دەستی پێکردو ئەوە یەکەم جاربوو لەکوردستانی ئازادا یادی بکەینەوە چونکە لەساڵی ١٩٩١ نەهەڵەبجە ئاوەدان بوو وەنەفریای ئەوەش کەوتین لەسەر بەرنامەیەکی دیاری کراوئەو یادە بکرێتەوە لەهەڵەبجە بۆیە بەو قەبارە گەورەیەو نزیکەی (١٠٠)هەزار دینار لەبەرەی کوردستانی دانرابوو بۆئەویادە کە(٣) رۆژی

بمێنێت بۆناهانگەکە شانۆگەری و رۆژنامەی رۆژانەی ئەو (٣)رۆژە بەناوی هەڵەبجەوە ئێمە ئازوەقەو شتمان برد بۆهەڵەبجە نان بۆخەڵکی زۆر دروست کراو کۆمەڵێك خوێندکارانی سۆسیالیست لەسلێمانیەوە بۆهەڵەبجە بەپێ ڕۆیشتن بۆئەویادەو لەوێش چالاکی کۆنفۆیان پێشکەش کردو یادەکە زۆر بەباشی و سەرکەوتوبون ئێمەش ئیوارەی ئەورۆژە گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٢/٣/١٧ چوینە نەصروباریکەو سەردانی چەند ماڵە شەهیدێکمان کردومن هیچ جیاوازیم نەدەکرد سەردانی شەهیدی هەموو لایەنێکم دەکرد پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٢/٣/١٨ بەرێ کەوتین بۆرانیە خاڵەحاجی لەبەرەی کوردستانی و لەمەقەر ئیشوکارەکانی دەکرد ومن خەمی ئەوو سلێمانیم نەبوو لەوکاتەدا بەرەی کوردستانی بۆ یەکەمجار بریاری هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانی دا ،لە١٩٩٢/٣/١٩ لەرانیەوە چوینە هەولێر کۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی هەبوو لەسەر مەسەلەی هەڵبژاردن لەسەرئەومابوو کە ٧٪ بکرێت یانە پارتی پێ ی داگرت لەسەر ٧٪ نەبێت بەشدارنابێت برادەرانی ئێمەش وتیان بەعینادی کەپارتی وادەڵێت بابکرێت و ببرێتەوەو کۆتایی پێ بێت هەموولایەك رازی ببوو برادەران وتیان ئەوە گەل و حزبی شیوعی و ئەوان رازی بون بۆئێمەش رازی نەبین لەدوای کۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی من گەرامەوە بۆشەقلاوە، لە١٩٩٢/٣/٢٠ لەشەقلاوەوە گەرامەوە بۆسلێمانی، ئێوارەی رۆژی ٢٠-١٩٩٢/٣/٢١ ئاهانگێکی باش ئامادەکرابوو لەلقی سلێمانی بۆئەو پەیکەرەی کەلقی سلێمانی دروستی کردبوو لەلایەن پەیکەرتاش کاك سەلام پەیکەری کاوەی ئاسنگەر پەردەم لەسەر لاداو هەرلەوێش قسەم کرد لەسەرئەوەی کەلەمانگی ١٩٩٢/٥ هەڵبژاردنی پارلەمانی کوردستان دەکرێت و دەبێت هەمولایەك بەوپەری دڵسۆزیەوە هەوڵ بدات و بەتەنگەوە بێت و سەرکەوتوی بکات لەسەر ئەو شێوازەی قیادەی سیاسی بەرەی

کوردستانی بۆی دیاری دەکات من (١/٤٥) سەعاتێك و چل و پێنج دەقیقە قسەم کرد لەسەر پەیکەری کاوە و روداوەکانی کوردستان کەئێستا ئازادەو کاتی خۆی لەسەرەتای ١٩٨٠کاندا پەیکەری کاوەی ئاسنگەر لەلایەن کاك عەلی بۆسکانی پیاوی خێرخوازی شاری سلێمانیەوە دروست کرابوو رژێم روخاندی و کاك عەلیش توشی گیروگرفت کرد لەسەر ئەوە کاتیێ کەئێمە لەساڵی ١٩٩١ گەراینەوە بریارمان دا دروستی بکەینەوە ئیتر دەستیان پێکردو فریایان خست بۆئازاری ١٩٩٢ وەبەشێوەیەکی باش وجوانی و لەمەیدانی کاوە دانراوە لەتوی مەلیك وەلەساڵی ١٩٩٦ ئەوکاتە کاك سالارعزیز پارێزگاری سلێمانی بوو کەوتە گیانی هەرچی فلکەکانی ناوشاری سلێمانیە هەموی تێکداو هەموی روخان بیێ ئەوەی بەرنامەیەکی هەبێت بۆچاك کردنەوەی بەحساب شوێنەواری رژێم دەشواتەوە لە باتی گۆرینی بەرنامەی خوێندن بگۆرن نەك فلکە تێکدەن بەلاّم وای تێکداو وارەنگی شارەکەو جادەکانی تێکدا تائێستاش نەهاتووەتەوە سەرخۆی وەکو فلکەی دەستاپەکەو فلکەی زارەکەو فلکەی ئاسکەکەو دەیان فلکەو چەتری مرورەکانی تێکدا کەهاوین لەبەر گەرماو زستان لەبەر باران خۆیان لەژێریدا دەپاراست کەچی کاك سالار هەمووی وێران کردو تێکی داو لەرۆژنامەی کوردستانی نوێش زەمینەی خۆش دەکرد کەپەیکەری کاوەی ئاسنگەر جادەی ناشیرین کردووە برادەرانی ئێمەش وەلاّمێکیان بۆکوردستانی. نویێ نوسیبوولەسەر تێکدانی هەموو فلکەکان ومەیدانەکان کەهەمووی لەبەر لێفەکەی مەلابوو..مەلای مەشهور دەڵێت لەبەردەم ماڵدا بوو بەهەراو منیش سەرمام بوو چومە دەرەوە لێفەکەم لەسەرشانم کردبوو هەراو غەڵبە غەڵبێك بوو هەرلێفەکەی منیان لەوهەرایەدا بردو لێفەکە برا ئاوبەئاگراکراو هیچ نەما وادیاربوو ئەو پیلانە هەربۆ من بوو ئەوبراو ئاوبەگراکرا...
کۆمەڵێك ئەسپی جوان لەفلکەی سەرچناربوو ئەسپ لەهەموو دنیادا رەمزی هیزەو

لەسەرکەس ماڵ نیە ئەگەر ماڵیش بێت ئەوە رەمزی صلاح الدینی ئەیوبی یە
کەکوردە لەبەر ئەوەی کاك سالار رەسمەکەی مەلامستەفاو کاك ئیدریس لابات ئەو
ئەسپە جوانانەی کەرەنگی شاری جوان کردبوو لابردو تێکی دا بۆموبەریر کەوتە
هەموو فلکەکان وتێکدانی وادیارە کورد هەمیشە دژی شارستانی شتی جوان بێت
هەروەها فلکەی تۆپەکەی تێکدا وەلەسەر ئاسکەکان هەموو کانی ئاسکان
خۆپیشاندانیان کرد بۆیان هێنانەوە بەلآم لەتەختی زەویەکەدا دایان نا کەرۆژێك
سەیارە لێیان دەدات، کاك سالار بەتەمای لابردنی کاوەبوو ئێمە پێمان خۆشبوو
کاوەش لاببات خۆمان لامان دەبردو دەمانبردە سیدصادق یەکێ لەشارۆچکەکانی
بناری سورێن چونکە بەپێی زانیاری ئەوانەی کەبەدوای کۆنە شوێنەواردا دەگەران
منیش خۆم دیومەو کاك ئەمین نەقشبەندییش لەسەری نوسیوە لەشارەزوورو
شارەزووریەکان هەروەها کاك عبدالرقیب یوسف یش لەودوایەدا لەسەری نوسیوە
کەزوحاك لەگوندی نەوێ ی بناری سورێن ژیاوەو هەرلەوێش حوکمی کردووەو
کاوەش ئەو شۆرشەی کردووە بۆیە وتمان دەیبینەوە جێگای ئاسایی خۆی لەیەکێ
لەوشاروجێگایانەی شارەزوور وادیاربوو وەلآمەکەی ئێمە کوردستانی نوێ بلأوی
نەکردەوەو وازیان لەپەیکەرەکەی کاوە هێنا شەهیدی بکەن و کاك سالاریش
لەپارێزگاری سلێمانی لابرا یا وازی هێناهەر چە ندە دوای کاك حاکم
قادرپەیکەرەکەی کاوەی ئاسنگەری بە شۆفلێ تێکدا هەر لەبەر ئەوەی سۆسیالیست
کردبوی هەموی بۆ لابردنی وێنەی بارزانی بوو دوای کۆتای بەدەسەلأتی کاك
سالارعەزیزهات پێهاتەوە جارێکی کە لە١٩٩٢/٣/٢١لەسلێمانی بوین خەریکی ئیشی
ئاسایی رۆژانە بوم لەبارەگای چوارباخ، لە١٩٩٢/٣/٢٢چەندجارێك لەلایەن
مامۆستایانی پەیمانگای هونەری سلێمانیەوە سەردانیان کردین وتیان ئەگەرفریامان
نەکەون خوێندی ئەمسالّمان ئەفەوتێ کەس یارمەتیمان نادات وتویانە ئەگەربەعسی

نەبون چۆن بون بەعمیدی پەیمانگا ئێمەش وەعدمان دانێ خەرجی دەرچوانی ئەوساڵەیان بۆبکەین وەبۆمانکردن بۆئەوەی ئەوساڵە قوتابیانیان نەفەوتێ دەعوەت کراین لەلایەن مامۆستاعبدالرحمن محمد رەشید عەمیدی پەیمانگاوهەمووماmۆستایانی پەیمانگای هونەری سلێمانی ئاهانگی ساڵانەیان دەگێراو قرتاندنی بەشی کردنەوەیمان کردوسەیری هەموو بەشەکانمان کردو وەچەند دیاریەکمان دابەش کرد بۆزیاتر لەکارەکانیان سەرکەوتوببون وە (٤٠)هەزار دیناریش وەك دیاریەك بۆ پەیمانگاکە بۆ کەمو کوریان تەسلیم بەپەیمانگاکە کرد چونکە بەبێ موچە توانیان سەرکەوتوانە کارەکانیان ئەنجام بدەن،کە پێش تر هاتنە لامان کەس هاوکاری نەدەکردن تۆمەتی بەعسیان بەقسەی خۆیان دابوە پاڵیان ئەوانیش ئەیانوت ئێمەخزمەتی مناڵی کوردمان کردووەو ئەوەناکە ئێمە بەعسی بین من یارمەتیم دان لە١٩٩٢/٣/٢٦ لەسلێمانی بوین، لە١٩٩٢/٣/٢٧ چوین بۆرانیەو بۆمەکتەبی سیاسی، لە١٩٧٨/٣/٢٧ لەگوندی کولیتان لەشەردا بوین و (٤٠) کەسمان لێ بەدیل گرتن ئەوان هاتبونە سەر ناوچەکەمان، لە١٩٩٢/٣/٢٨ چوین بۆشەقڵاوە.

## خۆئامادەکردن بۆ هەڵبژاردن و سەرەتای یەکگرتن

لە١٩٩٢/٣/٢٩ چوین هەولێر کۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی هەبوو لەوێ پارتی پێی داگرت لەسەر رێژەی ٧٪ لەبەر ئەوە نەگەیشتینە ئەنجام لەکۆبونەوەکە ئێمەش شەو گەڕاینەوە بۆ شەقڵاوە ورانیە، لە١٩٩٢/٣/٣٠ لەرانیەوە گەراینەوە بۆهەولێر پارتی ئەو کۆسپەیان خستە سەر رێگاو ناچاربوین چوین بۆلای مام جەلال و لەگەڵ ئەو باسی بکەین ئەوکاتە مام جەلال لەراواندوز خەریکی ئیشوکاری و کۆبونەوەو بەرنامەی هەڵبژاردن بوو کاك رەسولیش ئەوکات داوای کرد و گەرایەوە بۆسەردانیماڵی خۆی لەلەندەن کەبەراستی سکرتێری حزب و ئەو

ئەركە مێژووییەی لەسەرشان بیت بەردەم بێت و كاك رەسول لەئەوروپاو بۆسەردانن لەلەندەن بوو لەوكاتەدا، من و نوێنەری حزبی شیوعی ولایەنێكی كەش چوین بۆراواندوز بۆلای مام جەلال لەماڵی كاك عبدالله حبیب بوو لەراواندوز باسمان كردبۆمام جەلال كەپارتی پێیان داگرتووە لە٧٪ كەمتر نابێت و كەئەوەش كێشەیەكە مام جەلال وتی بەنسبەت یەكێتیەوە دەردەچین ئێمە دەمانەوێت حزبەكانی كەش دەربچن هەموولایەك بەشداربێت ئەگەر ئێوە پێتان باشە منیش پێم باشە ئەگەرنا ئەوە قسەی لێ دەكەین من پێم باشە دائیری بێت وەپێم باشە ٤٪ بێت یاكەمتر چونكە ٧٪ بۆهەمومان زۆرەو بەلاّم هەوڵ بدەین پارتی قەناعەت بكات مام جەلال وتی ئێوە بەكام ئەنجام گەیشتن من لەگەڵی دام رێژەیی بێت و١٪ و ٧٪ بێت من لەگەڵی دام ئیتر ئێمەش شەو گەراینەوە شەقلاوە و رانیەو بۆمەكتەبی سیاسی كاك بەهادین نوری و كاك حسیب قەرەداغی سەردانیان كردین لەمەكتەبی سیاسی پێم خۆشبوو كاك حسیبم دی لەدەوەوە شیعروشتیم ئاگا لێبوو وەكو شاعیرێك یەكەم جاربوو، لە١٩٩٢/٤/١ لەسلێمانی بوین، لە١٩٩٢/٤/٢ بۆكۆبونەوە چومە هەولێرو هەمان رۆژگەرامەوە بۆسلێمانی كاك رەسول هەربەتەمای سەفەربوو، لە١٩٩٢/٤/٣ چەژنی رەمەزان بوولەسلێمانی بوین پێش چەند رۆژێك لەرانیە برادەرانی پاسۆك سەردانیان كردبوین و لەگەڵ كاك رەسولدا قسەیان كردبوو دەربارەی یەككرتن و قسەو قسەلۆك هەبوو بریار درابوو كاك شێخ محمد شاكەلی و كاك قادرجەباری لەگەڵ برادەرانی پاسۆك دانیشن و قسە بكەن لەسەر بنامای یەككرتن وادیاربوو پێشتر لەسەر زۆرشت رێكەوتبون تەنها لەسەر بەیاننامە مابونەوە كاك شێخ محمد شاكەلی تەلەفونی بۆمن كردو وتی شتێكی واهەیە و من بوارم نابێت تۆو كاك قادروكاك شیروان لەگەڵیاندا دانیشن وقسەبكەن ئێمەش چاوەرێمان كرد لەوێ برادەرانی پاسۆك تەلەفونیان كردو وتیان بریاربوو

لەبارەگای ئێمە کۆبونەوەی هەردوولا بکرێت لەسەر رۆشنایی کۆبونەوەی پێشوو لەرانیە کاك شێخ محمد شاکەلی وکاك رەسول ئامادەی بون واچاوەرێ دەکەین وتمان کاك شێخ محمد ئێمەش ئاگامان لێ نیە وادیاربوو خۆی لێ شاردبووە لەکۆبونەوەکە نەك لەبەر ئەوەی پێی خۆش نیە لەبەر ئەوەی دوایی نەڵێن ئەوکردی چونکە لەساڵی ١٩٨٤ ئەو فکرەیە لای کاك شێخ محمد وکاك ئازاد مستەفای پاسۆك هەبوو منیش بەشداربووم لەگەڵیاندا مەسەلەی یەکبون ونزیك لەیەك بەڵام دەمانوت کاتی ماوەو بابگەنە ئەنجام وتمان ئێمەش ئاگامان لێ هەیەو دێنە سەردانتان لەسەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی چوینە مەقەری پاسۆك لای ئەنفالە کۆنەکە لەسلێمانی لەگەرەکی بەختیارێ بوو رژێم ئەوەندە شانازی بەئەنفالەوە دەکرد ناوەندێکی داپڵۆسینیان ناونابوو ئەنفال کەبەشانازیەوە تائێستاش هەرناوی ئەنفالەکەیە یا ئەنفالە کۆنەکەیە، چوینە ئەوێ کاك ملازم کەریم و کاك ملازم شوان و کاك عبدالله ئاگرین و کاك کامیل ژیرو زۆرتری برادەرانی پاسۆك لەسەر مەسەلەکان قسەکرا بەڵام زۆر بەکاڵو کرچی قسەکرا و برادەرانی پاسۆك وتیان شتێك لەسەر ئەو دانیشتنە بڵاو بکەینەوە باشترەو ئەوان باسی ئەوە بکرێت چەند ئەندامی سەرکردایەتیان بدرێتێ لەسەری قسە بکەین (٣)سەعات ماینەوە لەکۆبونەوەکە من وتم ئێمە سبەینێ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندیمان هەیە قسەی لێ دەکەین و ئەوان حەزیان دەکرد وەکو هەواڵێك شتێك بڵاو بکرێتەوە کاك عبدالله ئاگرین حەزی لێ دەکردو شتێکی نوسیبوو بەناوی مەکتەبی سیاسی هەردوولاوەو ناوی خۆشی لەسەر نوسیبوو بڵاوی کردەوە،دوای ئەوەی بریاری لەسەربدرێ ، لە١٩٩٢/٤/٤ ئێمە نەکۆنفرانس وهەتالای هەندێك برادەرانی سەرکردایەتی ولقەکان باس نەکرا بوو وامان دانا ئەمرۆ کۆبونەوەیەك بووە لەنێوان سۆسیالیست و پاسۆك بۆمەسەلەی یەککگرتن هەنگاوی بۆنراوە بەڵام بڵاوکراوەکە لەوەزیاتری وتبوو

کەبریاری سەرکردایەتی هاوبەشی دراوە، لە۱۹۹۲/۳/۲۷یش لەمەکتەبی سیاسی هەندێك باسی سۆسیالیست و پاسۆك کرا لەسەر ئەویەکبونە، لە۱۹۹۲/٤/٥ هەندێك کۆبونەوەی سۆسیالیست وپاسۆك کران من رۆیشتم بۆراینە کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی هەبوو لەسەریەکگرتن لەگەڵ پاسۆك و لەسەر هەڵبژاردن قسەی لەسەر بکەین چونکە لەبەرەی کوردستانی دەبێت رۆژی هەڵبژاردن دیاری بکرێت تائەوەمان کرد دوای نیوەرۆیش برادەرانی پاسۆك هاتنە رانیەو لەوێش دانیشتین بۆکۆبونەوە بۆیەکەم جاربوو کاك ملازم کەریم و کاك ملازم شوان و کاك عبدالله ئاگرین بون من وکاك رەسول و کاك شیروان بوین بۆیەکەم جار لەژیانیدا کاك رەسول بلێیت بەیەکێ بلێ کۆبونەوەمان هەیەو بەجێمان بێڵن لەبەر چاوی ئەو برادەرانە وتم کاك رەسول بەمنت بوتایە باشتربوو چونکە من لام ئاسایی بوو من هەرلەوێ هەستم کرد کاك شیروان تێك چووە من بەدوایدا رۆیشتم ئەوبەراکردن....رۆژی پێشویش کاك شیروان بەشداربووە لەکۆبونەوەی سۆسیالیست و پاسۆك دا کاك شیروان بەقسەی ناشیرین و جنێوی لەبەر خۆیەوە دەداو بەتوندی دەرۆیشت و دەیوت ئەوانە ئەو لەگەڵیان دادەنشێت لەمستەوای ئەندامی ناوچەدان هەروەها دەیوت من ئەندامی سەرکردایەتی سۆسیالیست بووم کاك کەریم معاونی ئامرهەرێمی (۳)بوو جێگری کاك عوسمان قادر منەوەر بووە ئێستا رەسول مامند وابەمن دەڵێت... هەرچیم کرد کاك شیروان رازی نەبوو وتم پێکەوە دەگەرێینەوە بۆسلێمانی لەرێگای منیش نەوەستاو لەگەڵ پێشمەرگە سواربوو هەرجنێوی دەداو رۆیشت و بەجێ ی هێشتین ئەوە یەك لەچلان دوای کۆبونەوە منیش گەرامەوە بۆسلێمانی کاك شیروان چوبوو بۆکەلار نەوەستابوو لەوێش پاشان بریاردرا کۆمیتەی مەرکەزی هەردوولا لە ۱۹۹۲/٤/۱۰ کۆبونەوەیەك بکەین لەسەر یەکگرتنی سۆسیالیست و پاسۆك لەرانیە، لە۱۹۹۲/٤/۷ لەسلێمانیەوە

بەرێ کەوین بۆ مصیف صلاح الدین کۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی هەبوو لەبارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی دیمکراتی کوردستان لەمصیف صلاح الدین کۆبونەوەکە کرا هەرلەبەیانیەوە تائێوارە قسە کرا لەسەر هەڵبژاردن و شێوەی هەرتەواو نەبوو بۆرۆژی دوای واتا ١٩٩٢/٤/٨ دیسانەوە کۆبونەوە لەبەیانیەوە دەست پێکرایەوە قسەکردن تائێوارە کۆبونەوەکە سەرکەوتوانە کۆتایی پێهات لەسەر ئەوەش ناوی پەرلەمان بێت و ناو مجلیسی وەتەنی بێت و ناوی مجلیسی تەشریعی بێت مناقەشەی زۆری لەسەر کراو پارتی دەیوت ناوی پەرلەمان مجلیسی وتەنی لەسەر نەبێت وبە ناوی مجلیسی تشریعی وەبیت پاشان هەمومان لەسەر ئەوە رێکەوتن ناوی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق بێت و بریاریش درا لەرۆژی ١٩٩٢/٥/١٧ هەڵبژاردن بکرێت لەسەرانسەری کوردستان و مەرکەزی هەولێر بێت و حاکم (ئەمیر حەوێزی) سەرپەرشتی بکات و لەپارێزگاکانیش نوێنەری دادگای گشتی هەبێت و چاودێری بکرێت و(UN) وحاکم و پۆلیسی بەرەی کوردستانی هەموی دەست بەکاربێت و خۆئامادە بکەین دیاری کرا کەی دەست بە پروپاگەندەی هەڵبژاردن بکرێت و هەرلەوێش باسی ئەوەکرا لەدوای نیوەرۆی رۆژی ١٩٩٢/٤/٨ کەمەسەلەی حزبەکان ئەو کەسانەی نەخوێندەوارن رەنگێك یا شتێك دیاری بکرێت بۆی بۆئەوەی بزانێ، وابزانم کاك یعقوب ئاشوری بوو یا کاك محمد توفیق ی یەکێتی نیشتمانی وتیان لەئەوروپا حزبەکان سەری گاوسەری کەرو ئەسپ رەمزی حزبەکەیانە من وتم جابرا لەکوردستان بەیانی کاك دکتۆر محمود یابرادەرێکی کەمان سەری گایەك یا کەرێك بگرێتە سەر شانی و بەناو خەڵکیدا هەر شێتمان دەکەن ئەوە لێرەو لەگەڵ خەڵکی کوردستان و ناوئیسلامدا ناگونجێ بریاریان دا رەنگ دانێن لەکوێ وە دەست پێ بکەین پارتی وتیان ئێمە رەنگی خۆمان هەیەو دیارە زەردە، حزبی شیوعی وتیان

ئێمەش ڕەنگی خۆمان دیارەو لەکۆنەوە سورە، برادەرانی ئاشوریش وتیان ئێمەش دیارە مارۆنی یا قاوەیی ئێمەیەو دیارە لەوکۆبونەوەیەدا وابزانم بزوتنەوەی ئیسلامی لەبەرە نەبون بۆئاگاداربون لەهەڵبژاردنەکە بەشداربون مایەوە سەر ئێمەو یەکێتی من وکاك دکتۆر محمود وتمان سەوز بۆسۆسیالیست وشین بۆیەکێتی نیشتمانی وادیاربوو پێشتر یەکێتی لای خۆیان بریاریان دابوو سەوز بۆئەوان بێت کاك فواد زۆربەتوندی و زۆربەتورەیی وتی شتی وا نابێت سەوز بۆیەکێتی نیشتمانی کوردستانەو بریارمان داوە کەسەوز بۆئێمە بێت وتمان باشە برا جاهەرای بۆچیە لەسەر ڕەنگ هەرلەئێستاوە تێك بچین ئێمە شین هەڵدەگرین و من شەخسی حەزم لەشین بووبەڵام کاك دکتۆر دەیوت سەوزباشە کاتێ شین بوبەهی سۆسیالیست یەکسەر کاك دکتۆر وتی ئاسمان شینە دەریا شینە ئاشتی شینە (UN) شینەو لەوکاتە سەیارەیەك دیاربوو لەپەنجەرەکەوە وتی ئەو سەیارەیەش شینە و سۆسیالیستە ئیتر سەوزیش لەوێبوو بەهی یەکێتی نیشتمانی، پارتی گەل کاك سامی وتی ئێمە زەردو سور لەیەك ئەدەین پارتی زۆربەتوندی بەگژی کاك سامی دا چونەوە وتیان ئێمە رازی نابین زەرد بەهی کەسەوە بێت ودەتوانی ڕەنگێکی کە پەیدا بکەیت وتی بۆمنیش.گەل ناوی پارتی گەلەو وتیان رازی نابین کاك سامی سەوزوسوری وەرگرت و یەکێتی لایان ئاسایی بوو هەرلەوێ وتیان شتێك لەهەولێر بووە ناوی کسك و سوریان پێ دەوت تورە دەبوو بە بەرد بەردەبووە ئەو خەڵکە واکاك سامیش ئەو ڕەنگەی کسك و سوری هەولێری وەرگرتووە، زەحمەتکێشانیش سورو سپیان لەیەك دا ڕەنگ نەمابوو بزوتنەوەی ئیسلامیش سپی و سەوزیان لەیەك داو بەو شێوەیە ئەو ڕەنگانە دانراو بوو بەڕەنگ و ڕەمزی حزبەکان لەسەر مەقەرات و لەشایی و لەشیوەن و لەشەهید هەمووی بوو بەکفنی شەهیدانیش ئێستا هەرحزبێك بەوناوەو ڕەنگەوەوە ئەناسرێت ئەوەی کەماوە حزبەکان وەرۆژی

١٩٩٢/٥/١٧ دیاری کرا بۆرۆژی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان و هەر لەو کۆبونەوەیەداو پێشتریش باسی کرا کەپێویستە ئاشوری تێدابێت لەبەر دەرەوەو ئەمریکاوفەرەنساو ولاتانی دەرەوە، ئاشوری بەشداربن ئەگەر هەڵبژاردن بکەن ئەوان دەنگ ناهێنن و زۆریان بلاون لەکوردستان کەمن و زەروریشە ئەوانی تێدابێت ئەوکات وابوو گوێیان بۆتورکمان نەدەگرت کەچەند لەوان زیاتربون بەلام ئاشوری حزبی هەبوو لەشاخ و لەگەڵ شۆرشی کوردا بەشداربون دوای گفتوگۆی زۆر خۆشیان وتیان لەهەڵبژاردن دەرناچین و دەبێت بەرەی کوردستانی بریارێك بدات ئەوەبوو بەرە بریاری دا پەرلەمان لە (١٠٥)کەس پێك بهێنێ کە (١٠٠) کوردو (٥)ئاشوری بێت خەڵکی باشبن و خۆیان هەڵبژێرن حزبەکەیان دیاریان بکات بۆپەرلەمان بەوشێوەیە (٥)ئاشوری هاتە ناو پەرلەمان یەکێك لەوانە سەربەپارتی بوو، نەخۆیان ماندو بکەن ونە راکەراکەی هەڵبژاردنیان نەبوو، وادیاربوو ئەو یەك دووڕۆژەی کاك مەسعودو کاك رەسول یەکیان دیبوو لەسەر روداوەکان بەدوو قوڵی قسەیان کردبوو بریاریان دابوو هەردوو مەکتەبی سیاسی کۆببێتەوەو قسە بکەن ئەوکاتیش هەموو جارێك پارتی لەزۆر جێگا دەیانوت ئێوە لایەنی یەکێتی دەگرن زۆرجار لەگەڵ یەکێتی کێشەی زۆرو گیروگرفتی رۆژانەو خوا هەڵناگرێ یەکێتیش درێغی نەدەکرد لەئێمە بەهەموو شێویەك دژایەتی دەکردین پارتیش لەسەروی ئەوەوە هەردڵی لێمان بەگومان بوو چونکە نەدەچوین بلێین پارتی لەگەڵ ئێوەداین هەرواش بەیەکێتی مان نەدەوت لەگەڵ ئێوە داین بەلام تائەو روداوانەش هەموو سەرکردایەتی بەزۆری یەکێتی مان پێ باشترونزیك تربوو لەپارتی هەتاکاتێ یەکێتی شمشێری لێ هەڵکێشابوین و شەری دەکرین ئێمەش شەری ئەوانمان دەکرد هەریەکێتی لەنێوان پارتی و یەکێتی دا یەکێتی مان پێ باشتربوو نەك لەگەڵیان بین یەکێ لەکێشەکانی حزب و دروست کردنی مشکیلە بۆمان لای یەکێتی و پارتیەوە

ئەوەبوو ئێمە دۆست و ناحەزو دوژمنی خۆمانمان دیاری نەکردبوو لەبەرنامەی ئیشمان کەدۆستی دەرەجە (١و٢و٣و٤)و یاکێ ناحەزی دەرەجە (١و٢و٣و٤) یاکێ دوژمنی دەرەجە (١و٢و٣) زیاتر یەکێ بوو لەکێشەکانی ناو حزب تێکەل و پێکەڵ کردنی برادەرانمان و نەبونی خەتێکی راست هەروەکو ئەسپی ژێر عارەبانە چوارچێوەی بۆسەری کرابێت تەنها بەر پێ ی خۆی دەبینێ و یاسیاسەتی بەرنامەی ئاشکرای نەبوو چاوەرێ ی روداوەکانی دەکردو لەدوای روداوەوە بەپێ ی پەتی دەکەوت و خۆی دەیتوانی روداو دروست بکات، سۆسیالیست ئەگەر سەرکردایەتیەکەی جورئەتی هەبوایە هەتا ئەوکاتانەش پارتی بەگومان بوو یاکەلەگەڵیان نەبوین ئەوە دوژمنیان نین خەتی ناوەراستمان نەبوو هەرلەبەرئەوەش ئێمە نەدەچوین قسەیان بۆبکەین و شتیان پێ بڵێین چونکە ئیشمان پێیان نەبوو هەر ئەوەندە ئیشمان بەپارتی هەبوو شەرمان نەکەن یاشەر نەبێت زۆرئیشمان پێیان نەبوو وەلەخۆشمان بەشۆرشگێرترمان نەدەزانین هەتا لەناو یەکێتی نیشتمانیشدا هەندێك کادرمان بەهاوخەباتی خۆمان دەزانی نەك هەموو یەکێتی نیشتمانی چونکە زۆری ئەوانیش هەر نیشتبونەوە پێوە بەڵام کادرەکانی سۆسیالیست زۆری ئەوانە بون شۆرشیان دروست کردبوەوەو مفرەزەی سەرەتایی و خەڵکی باش و شۆرشگێربون ، بریاریان دابوو لە١٩٩٢/٤/٩ کۆبونەوەی هەردوو مەکتەبی سیاسی بکەین وادیاربوو کاك رەسول وتبوی ئێمە لەگەڵ سیاسەتی یەکێتی نین وکاك مسعودیش وتبوی باشە کەئێوە لەگەڵ سیاسەتی یەکێتی نەبن باهەردوو مەکتەبی سیاسی دانیشین و ئەوقسانەش لەوێ باس بکەین و هەردوولاش لەیەك تێبگەین باشترەو چارەسەری هەرگیروگرفتێك و هەردووحزبیش بۆپێشەوە بۆقۆناغی پەیوەندی نوێ بەرین، سەرلەبەیانی ١٩٩٢/٤/٩ کاك رەسول و کاك سەعدعبداللە و کاك سەیدکاکەو کاك عادل مراد و

کاك عمربۆتانی و من وەلەلایەن پارتیەوە کاك مسعودبارزانی و کاك عەلی عبداللەو کاك فاضل میرانی وکاك دکتۆر رۆژ نوری شاوەیس و کاك جرجیس حسن و کاك ملازم عەلی و کاك فرانسۆ حەریری و زۆری تر بەشداری کۆبونەوەکە بون نزیکەی (٣)سەعات قسەکراو وەختی هەڵسان بوو کاك فاضل وتی باشە ئەوهەموو قسە باشەمان کرد بۆنەیخەینە چوارچێوەی نوسین و ئامادەی بکەین لای هەردوولاش هەبێت وادیاربوو یەکسەر کاك مسعود وتی زۆرباشە وکاك رەسولیش هەرواو وتیان باکاك فاضل مطنی و کاك عادل مراد بینوسن و ئامادەی بکەن و حازریان کرد لەدوای یەك سەعات (١٢)خاڵی هاوکاری تێدابوو بۆهەردوولامان و کاك مسعودو کاك رەسول ئیمزایان کردو نوسخەی لای هەردوولا هەڵگیران و کۆبونەوەش کۆتایی پێهات هەرلەو کۆبونەوە هاوکاری ناو رێکەوتنەکەش هەر لەناو ئەو کاغەزەدا مایەوە پاشان ئێمە گەراینەوە بۆرانیە، لە١٠/٤/١٩٩٢ چاوەرێ ی برادەرانی پاسۆکمان دەکرد بۆکۆبونەوەی هاوبەشی نێوان سۆسیالیست و پاسۆك کاتێك هاتن برادەرانی پاسۆك قورئان بەحەقت هەندێك خەڵکیان لەگەڵ بوو لەهیچ بوارێکی سیاسی هەرناومان نەبیستبون ئەوەی قیادەی پاسۆك بون چەند کەسێکمان دەناسین وەکو کاك ملازم کەریم و کاك ملازم شوان و کاك پشکۆو کاك شەماڵ و کاك عبدالله ئاگرین لەدوای راپەرین و کاك کامیل ژیر ئەوە لەکۆبونەوە بوو ئەوانی کەمان نەدەناسی وادیاربوو لەوماوەیەدا کۆنگرەیان گرتبوو بۆراست کردنەوەیان و زۆری هەر کەسیان دەست کەوتبوو وتوبیان وەرن دەتانکەین بەئەندامی سەرکردایەتی لەوانەی هاتبون زۆریان چەند جارێك تقدیمی ئێمەیان کردبوو لەسەرداندا بەئەندامی رێکخراوو ناوچەو قوتابیان و لەوبابەتەو هەتا کاك عەلی بەگ رۆژێك کاك کەریم و برادەران وتیان دۆستێکمان هەیەو خزمی تۆیشە باسەری لێ بدەین چوین کاك عەلی بەگ بوو دۆستیان بوو لەقسەکانیشیدا هەروەکو هاوڵاتیەك

قسەی دەکرد ئەویش ئەو ڕۆژە سەرکردایەتی بوو کاك علی بەگ لەکۆنە تێکۆشەران بووەوپیاوێکی شارەزاو وریابوو، بەلاّم ئەوانی کەیان لەئوسوڵی سەرکردایەتیان نەدەزانی بەهەرحاڵ کۆبونەوە دەستی پێکرد و قسە لەسەر زۆر روداو کراو شێوەی تێکەڵ بون و کارکردن بەسەر کردنەوەو دانانی ژمارە تەنها ئەوان کاك رەسولیان بەسکرتێر قبوڵ بوو جارجاریش دەیانوت لەکۆنگرە دکتۆر محمود ببێتە سکرتێر باشترە تاکاك رەسول و ئەوقسانەشیان دەکرد ئەو ڕۆژە سەرکردایەتی هاوبەشی دروست کرا پاسۆك رازی بون (٥) کەسیان بێتە سەرکردایەتی حزبەوە بەلاّم برادەران باسی ژمارەیان نەدەکرد پاسۆك تێگەیشت وا وەکو خۆمان حسابیان بۆدەکەین بەپەلە کەوتنە کۆکردنەوەی ئەو کەسانە لەولاولا بۆهێنانیان ناویان دەنان سەرکردایەتی کاك بەرزانی سەعید گەوهەریش سەرکردایەتی بووپێشمەرگەی کۆن بوولەلای پاسۆك لەشەری ئالان وحاصل بەشداربوو پاشان لەیەکگرتنیش سەرکردایەتی بوو وەزۆری کەش ، لە١٠/٤/١٩٩٢ سەرکردایەتی هاوبەش دروست کرا لە (٥)پاسۆك و (٥) سۆسیالیست وەکاك رەسول زیاد لەسەرەوە ئەوە (١١) کەس و دەست بەکاربون ئەوانەی پاسۆك کاك کەریم و کاك شوان و کاك عبدالله ئاگرین و کاك کامیل و کاك مژدە تاهیر بون ئێمەش کاك رەسول و (٥)کەسی کەبون و دەوام لەرانیە دەکرێت و دەست بەکاربون و خۆشمان ئامادە بکەین بۆ هەڵبژاردنی داهاتوو ئەو ڕۆژەش بەیانێکمان بلاّو کردەوە لەسەر ئەو رێکەوتن و قیادەی هاوبەش دروست کردنە وەکۆبونەوەی مەقەرات بەرەو یەکگرتنی عەمەلی دەست پێ بکات بریاردرا کەهەندێك لەکادرەکانیان کۆبونەوە بکەن ئێمەش کۆبونەوەیەکی فراوانمان پێویست بوو بۆزیاتر رون کردنەوە لەسەر ئەو رێکەوتنەمان لەگەڵ پاسۆکدا، لە١١/٤/١٩٩٢ لەسلێمانی لەلق کۆبونەوەی کۆمیتەی لقی سلێمانیمان هەبوو هەتا لەسەر ناوەکەش کێشە نەبوو پاسۆك پێشتر پارتی

سۆسیالیست بون ئێمەش حزبی سۆسیالیست بوین ئەوان وتیان ناوەکە بکرێت بەپارتی سۆسیالیستی کوردستان هەروەکو خۆی حزبی سۆسیالیستی کوردستان یا زیاد کردنی ببێتە حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان لەسەر ئەوە رێك بوین، لە۱۹۹۲/٤/۱۲ هەرلەسلێمانی بوم، لە۱۹۹۲/٤/۱۳ چوم بۆرانیەو بۆهەولێر کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ برادەرانی خۆمان پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی لەگەڵ کاك دکتۆرمحمود دا بریاری جەولە بۆمەسەلەی هەڵبژاردن دەست بەکۆبونەوە بکەین، وەهەر لە۱۹۹۲/٤/۱۳ سەرۆکی فەرەنسا فرنسۆ میتران سەردانی تورکیای کردو بوو بەخاڵێك لەوخالأنە مەسەلەی کورد باسی بکات لەناوچەکەو تورکیادا، لە۱۹۹۲/٤/۱٤ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتین بۆ باریکەو نەصرو کۆبونەوە بوو پاشان گەراینەوە سلێمانی و کۆبونەوەی سەرکردایەتی هەبوو لەسلێمانی، لە۱۹۹۲/٤/۱٥ لەسلێمانی بوین کاك دکتۆر محمود گەرایەوە بۆهەولێر، لە۱۹۹۲/٤/۱٦ هەرلەسلێمانی بوین، لە۱۹۹۲/٤/۱۷ کۆتایی هات بەدەسەڵاتی نجم الله لەئەفغانستان و شۆرشگێرەکان سەرکەوتن، ئەو رۆژە ئێمە لە نەصرو باریکەو هەڵەبجەی تازە بوین بۆپرسەو سەرەخۆشی ئەو ناوە پاشان بۆئێوارەکەی گەراینەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ۱۹و۲۰و۲۱/٤/۱۹۹۲ لەسلێمانی خەریکی ئیشوکاربوین، لە۱۹۹۲/٤/۲۳ لەسلێمانیەوە چوینە هەولێرو گەراینەوە سلێمانی بریاردرا لەکۆبونەوە رۆژێ دیاری کرابوو هەڵبژاردنی سەرۆکیش بۆ کورد یا رابەر هەڵبژێرن و هەرپێکەوە دەنگ دەدات بۆحزبەکان رەنگ بوو تائەوکاتە مام جەلال وکاك مسعود باسی سەرۆکیان نەدەکرد لەکۆبونەوە ی خلێفان لەسەر قسەکەی کاك دکتۆر بوو، لە۱۹۹۲/٤/۲٤ لەسلێمانی بوین، لە۱۹۹۲/٤/۲٥ چوینە چەمچەماڵ کاك دکتۆر محمود لەمەلعەبەکە قسەی کرد بۆخەڵکی دوای چوینە ئۆردوگای شۆرش وپاشان گەراینەوە بۆ سلێمانی، لە۱۹۹۲/٤/۲۷ چوین بۆدەربەندیخان و باوەنورو

کەلار لەوێ کۆبونەوەی بەخەڵکی کەلار کرد وەخەڵکێکی زۆر پێشوازیان لێ کردین لەکەلارو پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٢٩/٤/١٩٩٢ لەسلێمانی کۆبونەوەمان هەبوو، لە٣٠/٤/١٩٩٢ هەرلەسلێمانی بوین خەریکی ئیشوکاربوین لەگەڵ کاک دکتۆر محمود لەهەڵەبجەو نەصرو باریکەو دەربەندیخان هەموی کۆبونەوەی جەماوەریمان بوو کاک دکتۆریش بریاری دابوو خۆی هەڵبژێرت بۆ سەرۆك لەکۆبونەوەیەکدا کاک رەسول تەرحی کرد ووتی ئەو چی کەمە لەکاک مەسعود و مام جەلال کاک مەلا عوسمان دکتۆرببێت بەسەرۆك باشەو کاک دکتۆر برا گەرەویەو دەشبێت خۆی هەڵبژێرێ، کاک دکتۆر خۆیشی سەرێکی ئەم لاولای کرد تۆزێك لوتی خوراندو باوێشکێکی داو وتی بزانین چۆن دەبێت من خۆم قەناعەتم وایە خەڵکی دەنگ بدات و بێزارن لەودوولایەنە، وتیان کاک دکتۆر رەئی خۆت چیە وتی ئەی نابینن قاتێك جلی شینم لەبەر کردوەو خۆم کردووە بەکۆترە شینە کاک رەسول رازی نەبوو کاک دکتۆر سەرۆکی حزبی سۆسیالیست بێت بۆئەوەی لەکۆڵی ببێتەوە حەزی دەکرد سەرۆکی کوردبێت کەس نەیوت بانەکرێت و بریاردراو ئەو بریارەش یەکێتی پێ ی خۆش نەبوو هەروەها خەبەرمان بیست کەمامۆستا مەلاعوسمان رابەری بزوتنەوەی ئیسلامیش خۆی هەڵدەبژێرت بۆرابەری کورد ژمارەیان گەیشتە چوارکەس من و خاڵەحاجی لەکۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی تەرحی ئەوەمان کردئەگەر بکرێت لەگەڵ یەکێتی بەیەك لیست دابەزین پێکەوە بەڵام برادەران وتیان بالەگەڵ پارتی و یەکێتی هەردوولا قسە بکرێت وتمان ئەگەر بکرێت و حەقی خۆمان بدەنێ لەگەڵ یەکێتی لەزۆرشت لەیەك نزیکین و ئەتوانین دوای دەربچین و کتلەی خۆمان دەبێت کەپێشتر لەسەری رێکەوتوین کاک قادرجەباری یان مامۆستا سەعد یەکێکیان بوو دیارە ئەوان پرسیاریان کردبوو یەکسەر وتیان پارتی لەگەڵ هیچ لایەنێك لیستی هاوبەش دانابەزێنێت و هەرخۆی بەتەنها دەچێتە هەڵبژاردن هەتا

ئەگەر هەموو لایەنەکانی کورد لەیەك لیستەدا بن ئەوان هەر خۆیان بەتەنها دادەبەزن برادەران وتیان ئەگەر وابێت بۆلەگەڵ ئەوان قسەبکەین لەگەڵ یەکێتیش نەکرێ باشترە لەسەر رۆشنایی ئەوکۆبونەوەیە من و خاڵەحاجی چوین بۆقەڵاچۆلان و سەردانی مام جەلالمان کرد کەسەرەتای مانگی چواربوو لەگەڵ مام جەلال باسی ئەوەمان کرد کەهەردوولا پێکەوە بەیەك لیست دابەزین بۆهەردوولاش هەنگاوێکی باشە لەو کاتەدا مام جەلال وتی من پێشتر باسم کردوەو بابزانم وە وتی بەشێخ عبدالکریم شەدەڵم وتووە باسی بکات ئێمە ئامادەین وزۆرمان پێ خۆشە بەڵام رەئی دکتۆر محمودو کاك رەسول چیە لەو رووەوە وتم وەڵا رەئیان خراپ نیە بەڵام پێمان خۆشە جەنابت سەردانێکی مەکتەبی سیاسی و کاك رەسول بکەیت بۆئەوەش قسەی لەسەر بکرێت شتێکی باشە چۆن و چی بکەین مام جەلال وتی قسەی لێ دەکەین وچۆنتان پێ باش بێت ئێمە لاریمان نیە یەکێ زیادو یەکێ کەم یائێوەش یەکێ زیاد بێت. هەرفەرقی نیە کاك عبدالکریم ووتی (١٢) ئەندامی پەرلەمان و سەرۆکی پەرلەمان یاسەرۆکی حکومەت بۆسۆسیالیست بێت کەکاك دکتۆر محمودە وا دیاربوو پێشتر ئەوان قسەیان کردبوو لای خۆیان ئێمەش وتمان (١٧) ئەندام پەرلەمان مام جەلال وتی لەنێوان (١٢و١٧) دا هەر رێك دەکەوین و ئەوە گرنگ نیە گرنگ ئەوەیە ماوەکەیە رێك دەکەوین بکەین یان نەیکەین ئەوەیان گرنگە هەروەها پاشان مام جەلال وتی من چەند رۆژێکی کە سەفەری رانیەو قەڵادزەم هەیەو دێم بۆسەردان حەزدەکەم ئێوەش لەوێ بن بۆسەردانەکەو قسەی لێ بکەین ئێمە گەراینەوە لەگەڵ برادەرانی خۆمان قسەمان کرد کاك شەوکەتی حاجی مشیریش پێش ئەوەی سەردانی مام جەلال بکەین و دوای ئەوەش چەند جارێك باسی دەکرد من پێم وت پێم باشەو حەزیش دەکەم لەگەڵ کادرەکانی سنوری لقی سلێمانی وەکو رەفیق لەگەڵیان کۆببیتەوەو قسە بکرێت و رەئیەکی

ئەوانیش وەربگیرێت خراپ نیە یائەوان داوا لەمن بکەن  نەك من بەئەوان بڵێم کاك شەوکەت لەماڵی کاك ئەحمەد قەدەفەری لەگەڵ زۆر لەکادرە کۆنەکانی سۆسیالیست قسەی کردبوو برادەرانی هاتن وتیان کاك شەوکەت داوای کۆبونەوەیەکی کردووەو وتویەتی باکەس نەزانێ قسە بکەین لەسەر پەرلەمان و لیستی هاوبەش بێت تۆ رەئت چیە من پێم وتن پێم باشە و بزانن رەئی چۆنە لێ ی تێبگەین خۆ شتی باش بکرێت بەهەموومان بکەین باشە لەناو کادرەکان تەنها کاك جەلال عەینەك و کاك مەلاهەژار رازی نەبون  بەوەی لەگەڵ یەکێتی لیستی هاوبەش هەبێت  ئیتر هەموویان رازی ببون و هاتن بۆلای من بەکۆمەڵ وتیان ئەوە بکرێت باشە من لەسەر ئەوەش لەگەڵ مام جەلال قسەمان کرد لەمەکتەبی سیاسیش پێشنیارمان کرد ئەو مەسەلەیە کاك شەوکەت هات ووتی  جگە لەمەلاهەژارو جەلال عەینەك هەموویان پێیان خۆشە ئەوان کەهاتنە لای من وتیان خۆشتێك بەرژەوەندی حزب و کوردبێت لاریمان نیە من لای مام جەلال ووتم کاك رەسول و برادەران رەئیان باشە بەلأم بەپێچەوانەوە کاك رەسول زۆردژی ئەوەبوو لەگەڵ یەکێتی بەیەك لیست دابەزین وەزۆریش دژی یەکێتی و مام جەلال بوو قسەی خراپیشی دەکرد و دەیوت ئەوە دەزانن دەرناچن بۆیە کەوتونەتە پەلەقاژەو هاوارهاوار چونکە پارتی کاری کردووە لەوماوەیەداو دەترسن بیدۆرێنن هەرچی لەگەڵ کاك رەسول هەوڵماندا رێگای نەدا لەرانیە بوین مام جەلال ئاگاداری کردین کەسەردانمان دەکات و نیوەرۆش لامان دەبێت و قسەش لەسەر لیستی هاوبەش و سیغەیەکی هاوبەش بکەین کاك رەسول پێش ئەوەی مام جەلال بێت وتی ئەوە ئێستازۆریان بۆهاتووە وادێنە لامان ئەگەر یەکێتی ئیشی نەبێت دژی هەموولایەکە من وتم کاك رەسول ئێمە خۆ نابینە یەکێتی ئێمە لەهەڵبژاردن پێکەوە بۆچەند رۆژێك لیستێکی هاوبەش دەکەین و دوای هەریەکە لەجێگای خۆمان ئەگەر بکرێت

باشه وتی بابێن بزانم بەلاَم ئەگەر خۆشم بەتەنها بوم هەر نایکەم سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی بوو مام جەلال وكاك دكتۆر فوئاد وكاك حەسەن كوێستانی و كاك كۆسرەت و كاك فرەیدون عبدالقادرو زۆری كەش بون هاتنە مەكتەبی سیاسی لەرانیە مام جەلال وتی كاك رەسول سۆسیالیست و یەكێتی هەردوولا لەزۆرشت هاوبەشیان هەیەو لەدروست كردنەوەی شۆرش و لەشەهیدی هاوبەش و كۆمەڵێك سەروەریمان پێكەوە هەیە ئێستاش پێمان باشە سەرۆكی پەرلەمان یا سەرۆكی حكومەتمان بەركەوت سۆسیالیست بێت و لەسەر ئەندامانیش قسە بكەین من جار جار دەموت چەندو چۆن دەبێت كاك رەسول وتی پێمان باشە بكرێت و هەنگاوی بۆبنێین مام جەلال وتی كاك رەسول قسە ناخوات ئەوەچەند رۆژێك ماوە بۆهەڵبژاردن مام جەلال قەڵەمەكەی دەرهێنا وتی بریار ئەدەن بابینوسین و ئێستا بەنوسین هەموو شتەكان دەبرینەوەو كۆتایی پێ دەهێنین، كاك رەسول یەك قسەی نەكرد هەرچی هەوڵمان دا خۆی بەقسەی ترەوە مەشغوڵ كرد ئەوانیش پەلەیان بوو جەولەو ئیشیان لەبەر دەست بوو ئەوكات كاك رەسول تازە گەرابوەوە لەلەندەن و چەند رۆژێك بوو هاتە دەرەوە كاك شێخ محمد و كاك سەیدكاكە و كاك سەعد عبداللەو نازانم كاك عادل لەوێ بوو یانا؟ منی بانگ كرد وتی ئەگەرنان پێ گەیوە بانان بخۆن و برۆن ئێمە لەگەڵ ئەمانە هیچ ناكەین هەرچی هەوڵم لەگەڵ دا لەژوورەكەی كە فائیدەی نەبوو دوای مام جەلال وبرادەران هەڵسان و بەرێمان كردن وتم مام جەلال تكا ئەكەم وازیان لێ مەهێنە و من ئەم ماوەیە هەوڵ ئەدەم ئەگەر جەنابت لەوناوە بویت سەرێك لەكاك رەسول بدەیتەوە باشە مام جەلال وتی دەچمە قەلاَدزە و دوای دەگەرێمەوە جارێكی كەش دێمەوە مەكتەبی سیاسی و قسە لەگەڵ كاك رەسول دەكەم وابزانم لە ١٩٩٢/٤/١٢ بوو پاش ئەوەی مام جەلال لەقەلاَدزە گەرایەوە جارێكی كە سەردانی كردین ئەم جارەش هەمان قسەكراو

زۆرشت باس کرا بەڵام کاك رەسول هەرقسەی نەکرد نەچاك و نەخراپ کاك دکتۆر فواد سەیرێکی کردو وتی مام جەلال بابرۆین و برادەرانیش بیری لیّ بکەنەوە لەم چەند رۆژەدا یەکێتی ئامادەبوو زیاتر لەبەر سۆسیالیست بەتەئکید هەردوولاش پێکەوە بونایە دەردەچون و زۆرینەی دەنگەکانیان دەهێنا بەڵام کاك رەسول نەیکرد، لەرۆژی ١٥/٤/١٩٩٢ بریاردرا کاك دکتۆر محمود بۆسەرۆك یا رابەری خۆی هەڵبژێریت، لەسەرەتای مانگی/٥ دا کاك عماد ئەحمەد خانەقینی کەئەندامی سەرکردایەتی حزبی زەحمەتکێشان بوو لەگەڵ کاك دکتۆر سەردار یا کاك بەهمەن بوو لەهەولێر هاتنە لامان داوای ئەوەیان کرد چەندجارێك لیستی هاوبەش دابەزێنین برادەران بریاریان دابوو بەمەرجێك بێنەوە ناو حزبی سۆسیالیست ئەوکات قبوڵ دەکەین ...کاك عماد ووتی ئێمە هاتوین لەگەڵ ئێوە پێکەوە دابەزین لەیەك لیستە ئەگەر دەیکەن باشە ئامادەین برادەرێکیان وتی ئێمە پێمان باشە لەگەڵ ئێوە پێکەوە بین خۆیەکێتی ئامادەیە ئێمە نەمانویست لەگەڵ ئەوان رێکەوین... کاك عماد ووتی وەلا ئەگەر سۆسیالیست نەیکات ئێمە لەگەڵ شەیتان دەیکەین و هەر دەبێت برۆینە پەرلەمانەوە قسەکەی کاك عمادم زۆرپیّ واقعی بوو هەرچەندە من لە کۆبونەوەکە (٢-٣) برادەری کە دیاری کرابوون منیش ئاگام لەقسەکان بوو لەسوچێکی ژورەکەدا بوم واتە سۆسیالیست زۆر بەغروری قسەیان لەهەڵبژاردن دەکرد بەڵام هیچ هەنگاوێکیان بۆنەنابون کەئیشی بۆبکەن وبەدڵسۆزی خۆیانی بۆ ماندو بکەن، لە١/٥/١٩٩٢ لەسلێمانی لەمەلعەبەکە ئاهەنگێك رێکخرابوو بەبۆنەی یەکی ئایار رۆژی کرێکارانی جیهان لەلایەن بەرەی کوردستانیەوە منیش لەجیاتی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی قسەم کرد لەوئاهەنگەدا، لەگەڵ دکتۆر محمود چوینە باریکەو نەصرو هەڵەبجەی تازەو زەرایەن ودەربەندیخان کۆبونەوەی جەماوەریمان هەبوو هەر لەورۆژانەشدا بریار درابوو(٢) ملیۆن دینار سەرف بکرێت

بۆحزب لەلایەن بەرەی کوردستانییەوە بۆ پروپاگەندەی هەڵبژاردن خاڵەحاجی پارەکەی وەرگرت بەنامەی کاك دکتۆر محمود زۆری سەرف کرا بۆکاری هەڵبژاردن و کرینی سەیارەو کۆکردنەوەی خەڵکی و لەو بابەتە، لەرۆژانی ٢و١٩٩٢/٥/٣ هەرمەشغوڵ بوین بەکاری پەرلەمانی و رەسم و ناوی (١٠٠)کەس و رەسمی (١٠٠)کەسمان بڵاو کردووە لەگەڵ پاسۆك کێشەبوو ئەوانیش ئەوەندەیان هێنابوو داوایان دەکرد وەکو یەك بێ ناوەکان شەوێك لەماڵی ئێمە لەسلێمانی لەسەر ئەوە کاك قادرجەباری و کاك ملازم کەریم تێکچون و خەریك بوونەکرێت دوای دیسان پێك هاتینەوە، کاك دکتۆر محمودیش لەو کاتەدا وایدەزانی کاك رەسول پاسۆکی لەدژی ئەوهێناوە ئەویش دەیوت وەڵا لەگەڵ سامی رێك کەوین خراپ نیەو ئەوانیش خەڵکیان هەیە لەدهۆك و بادینان باشە زەمینەی بۆ خۆش دەکرد وردە وردە بزانین بۆ کوێ وە. دەچێت چونکە من و خاڵەحاجی وکاك شیروان نارازی بوین کاك سەیدکاکەش نارازی بوو بەڵام ئەو قسەی نەدەکرد دەیوت چەندرۆژێك لەپێش هەڵبژاردن کاك رەسول کەمینی بۆدادەنا لەرێگای چوار قورنە ئێستا تێکەڵ دەبێت لەگەڵیدا، لە١٩٩٢/٥/٤ لەسلێمانی بوین، لە١٩٩٢/٥/٥ لەسلێمانییەوە بەرەو رانیە بەرێ کەوتین لەپیرەمەگرون کۆبونەوەیەکی جەماوەری گەورە کراو کاك دکتۆر محمود قسەی بۆکردن کە ناوچەی دوکان ئامادەی کردبوو هەروەها لەرێگای هیزۆپ پێشوازیەکی گەورە کراو بەگەرمی و زیاتر لەهەزاران کەس و سەدان سەیارە لەهیزۆپ وسێ رێیانی کۆیە پێشوازیان کرد پاشان چوینە چوارقورنەش هەرواو لەرانیەش هەرواو پاشان قەڵادزە و کۆبونەوەی جەماوەری کرا لەسەر هەڵبژاردن قسەکرا لەلایەن کاك دکتۆر محمودەوە پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٢/٥/٧ لەسلێمانی خەریکی ئیشوکاربوین، لە١٩٩٢/٥/٨ چوینە هەڵەبجەی تازەو کۆبونەوەی جەماوەری هەبوو لەقوتابخانەی ئەحمەد مختارجاف شەو لەهەڵەبجەی

تازە بوین و پاشان نەصرو باریکەو زەرایەن تا ١٩٩٢/٥/١١ هەر لەوسنورە بوین، لەرۆژانی ١٢و١٣و١٤/٥/١٩٩٢ لەسلێمانی وپێنجوێن وئەو ناوچانە بوین کۆبونەوەی جەماوەری بوو لەسەر بریاری بەرەی کوردستانی لەرۆژی ١٩٩٢/٥/١٥ پروپاگەندەی هەڵبژاردن کۆتایی پێهات، لە١٦/٥/١٩٩٢ کاك شەوکەت حاجی مشیر تەلەفونی کرد وتی لەگەڵ کاك ملازم عمردا دەمانەوێت سەردانی تۆبکەین بۆئەوەی قسە بکەین لەسەر ئیش و دوای ئەوەش لەگەڵ کاك دکتۆر محمود قسە بکەین وکێ لەوێ یە..وتم کاك قادرجەباری و کاك دکتۆرمحمود.. کاك شەوکەت وتی نامانەوێت لەگەڵ کاك قادر جباری قسە بکەین منیش پێم ناخۆش بوو وایوت وتم باشە ئێوە بفەرمون ئەوان هاتن وتیان کاك نەوشیروان خۆی بەتەمابوو بێت بەلاٌم نەخۆشەو فەقەراتێتی و ئێمەی ناردووە دەربارەی مەسەلەی کاك دکتۆر محمود قسە بکەین کاك دکتۆر لێرە بۆسەرۆك خۆی هەڵدەبژێ لەدەنگی مام جەلال کەم دەکاتەوە ئەوەش پارتی پێ بەهێز دەبێت کەبۆهەردوولامان خراپە و کاك دکتۆر هەرچۆن ببێت هەربەسەرۆکی پەرلەمان یاسەرۆکی حکومەت دەبێت ئێمە ئامادەین سەرۆکی پەرلەمانمان بەرکەوت یاسەرۆکی حکومەت بدەین بەدکتۆر محمودو حزبی سۆسیالیست وە بۆئەندامانی پەرلەمانیش لەسەر ژمارەیەك رێکەوین وابزانم پێشتریش مام جەلال هاتووەو باسی کراوەو ژمارەی هەردوولای باس کردووە لەیەکەوە نزیکین و لەسەری رێك دەکەوین ئێستا با لەسەر بنەماکان قسەبکەین هەردوولا پێکەوە بین ئەوەش رۆژێکی چارەنوس سازەو دەبێت ئەوانەی پێکەوەن لەناخۆشی و سەرەتای شۆرشدا پێکەوە بونە ئێستاش هەروا پێکەوە لەوکارە گرنگە کەبەرهەمی خەبات و ماندوبونی هەموولایەکەو بەتایبەتی سۆسیالیست و یەکێتی هەیانە، من وتم وەلاٌ من هەمویم پێ باشە و لەگەڵ ئەو رەئیەدام کەپێکەوە بگەینە سیغەیەکی هاوبەش کاك قادرجەباریشم بانگ کرد وتم بائەوان تێبگەن

کەکاك قادر دژی ئەوەیە وانیە دوای ئەوان وتیان باشە باڵەگەڵ کاك دکتۆریش قسە بکەین وتم کاك دکتۆر کاك ملازم عمرو کاك شەوکەت حاجی مشیر بۆشتێکی واهاتون لای کاك نەوشیروانەوە مام جەلالیش ئاگادارەو منیش پێم باشە قسەی لەسەر بکەین ..کاك دکتۆر محمود وتی مولازم عمر باشە ئەی شەوکەت چیە؟ منیش وتم پێشمەرگەی کۆنەو رەفیق و برادەری کۆنی منەو هەندێك خزمایەتیمان هەیە و کورێکی باشەولەمفرەزە سەرەتاییەکانی شۆرشەو پێشتر ئەندامی سەرکردایەتی حزبی سۆسیالیستی کوردستان بووەو خۆشت دەیناسیت پیێ دەچوو هەرئەوەی کۆنی لەدڵدا مابێت کەبو بەئەندامی سەرکردایەتی سۆسیالیست و دوای چوەوە لای یەکێتی نیشتمانی وتی باشە ئێستا ئەو میوانە هەڵسان دێمە ئەودیو، کاك دکتۆرو من و خاڵەحاجی وکاك ملازم عمرو کاك شەوکەت بوین هەمان قسەکانی کاك ملازم عمرم دووبارە کردەوە بۆ کاك دکتۆر... دکتۆر بێ دەنگ بوو وتی کاك نەوشیروان لێرەیە وتیان بەڵێ و نەخۆشە ئەگینا حەزدەکات بتبینێ لەوقسانەدا بوین کاك شەوکەت سێ چوار جار تەلەفونی کرد بۆکاك نەوشیروان نەتیجەی قسەکانی پێ دەوت و وادیاربوو ئەویش حەزی دەکرد لەنزیکەوە قسەبکات بریاردرا برۆین بۆماڵی کاك نەوشیروان لای خستەخانەیەکدا بوو لەبازاردا ئێمەش لای نادی مهندسین بوین من وکاك دکتۆر محمودوخاڵەحاجی وکاك مولازم عمرو کاك شەوکەت چوین بۆماڵی کاك نەوشیروان سەعات (٣٠ /٢)ی پاش نیوەرۆی رۆژی ١٩٩٢/٥/١٦ بوو کاك نەوشیروان وتی کاك دکتۆر ئێمە هەردوولا پێکەوە بوین و ئەوەی پێشتر باس کرا کاك نەوشیروانیش دووبارەی کردەوە کەزەروریەتی ئەوکاتە ئەوە دەخوازێ هەردوولا پێکەوە هاوبەشی بکەین و لەسەر یەك لیست دابەزین یاهاوکاری هەبێت بەلاّم کاك دکتۆر محمود خۆی هەڵنەبژێرێت بۆ سەرۆك یارابەری ووتی سەرۆك پەرلەمان یاسەرۆك حکومەت هەرکامیان بەری خۆمان کەوت یەکێتی واز

لەپشکی خۆی دەهێنێ بۆ دکتۆر محمود و سۆسیالیست وەلەوەزارەتەکانیش وەکو

ئەوەی هەردوولا لەسەری رازی بین دابەشی دەکەین وپەیمان دەدەین خۆتان

دابەشی بکەن چونکە دەرچونی پارتی بەزەرەری هەمومانەو ماڵی مەلامستەفا

دوژمنایەتی هەموومانیان کردوەو دەشیکەن تکایەکی برایانە دەکەین

ئەوەش فرسەتەو بالەدەستی نەدەین و بۆهەردوولاشمان باشەو من دڵنیام هەردوولا

پێکەوە دەبین وزۆرینە دەهێنین و سەرکەوتنی باش بۆکورد بەدەست دەهێنین

ئەگەر ماڵی مەلا مستەفا دەربچن ئەوە پارتە کۆنەکەو ئەو چەند ساڵە ئێمە وەکو

ئەوە وایە هیچمان نەکردبێت و رەنجی هەموومان ئەوان دەیخۆن لەوقسانەی دەکرد

من شەخسی قسەکانم واقعیانە هەڵدەسنگاند خاڵەحاجی لە پەنامدا بوو وتی کاك

دکتۆر ئێستا قسەیەك دەکات و هەموی تێك ئەدات کاك دکتۆریش هەرچی بەدڵ

نەبوایە باوێشکێکی ئەداو لوتی ئەخوراند ئەوە یەعنی بەدڵی نەبوو یاجامانەکەی

دەدایە دواوەو ملی دەخوراند ئەوە قەناعەتی پێ نەبوو ئەقڵی نەی دەبڕی تاکاك

نەوشیروان قسەکانی کرد دووسێ جار هەمان حەرە کەتی وای کرد بەلأم باش گوێ

ی گرتبوو بۆقسەکان پاشان کاك دکتۆر وتی ئەی نابێت هەموو لایەك رێکەوین و

مام جەلال و کاك مەسعود خۆیان هەڵنەبژێرن و بەرەئی منیش زۆر رەئیان بۆ

نادەن و من بێ لایەنم و ئەگەردەریش چوم لەحزب ئیستقالە دەکەم هەروەها وتی

کاك مەسعود ئاشبەتاڵیان هەیە لەکوردو مێژوی خۆیان وەمام جەلالیش ئەویش

هەرشتی هەیە لەسەری و هەردوکیان باخۆیان هەڵنەبژێرن و رەئی بۆمن بدەن

وەمنیش وەعد دەدەم هەموو توانام لەخزمەتی کوردو میللەتی کورد بێت کاك

نەوشیروان هەر سەیری دەکردو دووسێ جار خەریك بو قسەکەی پێ ببڕێ

هەرسەیری کردو وتی من ئەگەر دۆستیش بێت دۆستی یەکێتی نیشتمانیم وخۆتان

دەزانن رەئی من لەسەر ماڵی مەلا مستەفا چیە خاڵەحاجی وتی بەڵێ

لەکتێبەکەشدا باست کردووە..کاک دکتۆر قسەکانی تەواو کردو گوێ ی بۆ کاک نەوشیروان گرتبوو کاک نەوشیروانیش زۆر دەموچاوی تێك چوبوو لەقەسەکانی دکتۆر محمودو وتی کاک دکتۆر حەزدەکەم ئێمەش رەئی خۆمان بڵێین ئێمە دەمانەوێت یەکێتی نیشتمانی بەرامبەر بەپارتی سەربکەوێت و منیش لەوانەیە کێشەم هەبێت لەگەڵ یەکێتی و لەگەڵ مام جەلال بەلاّم کێشە بۆ پێشکەوتنی میللەتەکەمە من پێشکەوتنی میللەت لەسەرکەوتنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە دەبینم وەئێمەو ئێوەش شۆرشمان کرد بۆئەوەی مالّی مەلامستەفا نەیەنەوەو ببنە برابەشمان وەمن بۆ سەرکەوتنی یەکێتی و سەرکەوتنی مام جەلال هەموو توانای خۆم سەرف دەکەم ئێمە لەسلێمانیدا لە٨٠٪ی رەئی دەهێنین کەسلێمانی دەتوانێ حەسمی زۆر شت بکات...پارتی بابێن من لەرۆژهەلاّتی شارو ئەوانیش لەرۆژئاوای شار دەڵێن کێ پارتیەو کێش یەکێتی بێنە دەرەوە بزانن چەند کەس دەچێتە لای پارتی تۆ ئەگەر وابزانیت تۆ دەردەچیت و مام جەلال دەرناچێت ئەوە تۆ دەرناچیت و مام جەلال دەردەچێت وەئەگەر دەریش نەچێت هەر دەری دەچێنین بەزۆریش بێت هەر دەری دەچێنین و هەرئەبێت دەرچێت بەلاّم تۆ دەرناچیت و زەرەریش لەئێمە ئەدەیت و لەدەنگەکانی مام جەلال کەم دەکەیتەوە و خۆشت و حزبەکەشت توشی زەرەر دەکەیت من لەوانەیە دوای هەڵبژاردن نەبەتەمای مەسئولیات بم و نەهیچ بەلاّم نایەڵین بەرامبەر پارتی و مالّی مەلا مستەفا ومەسعود بارزانی دەستەوسان دانانیشین و ئیشی بۆدەکەین و سەریش دەکەوین و نایشی کەیت هەر مەیکەو بزانین کێ زەرەر دەکات ئێوە ئەوە بکەن لەسەر ئەندامی پەرلەمان لەسەر داهاتوی حکومەت و لەسەر سەرۆکی پەرلەمان یا سەرۆکی حکومەت ئێمە ئامادەین بەلاّم تۆش خۆت هەڵمەبژێرە و ئەگەر هەر دەشی کەیت ئەوە هەردوولا زەرەری لێ دەکەین و مالّی مەلامستەفا سودی لێ وەردەگرن

بەلاَم ئێمە وەکو یەکێتی مام جەلال هەردەبێت دەرچیٚ بەزۆر بێت وبەشەریش بێت دەری دەچێنین پاشان هەندێك بەبیٚ دەنگی وەستاین ئێمەش هەڵساین و هاتینەوە لەرێگا وتمان کاك دکتۆر دەبوو یاحەق بوو شتێکمان بکربایە کاك دکتۆر وتی نازۆر تەنگەتاون و دەرناچن وەمن هەر رەئی خۆم بهێنم تازە پەشیمان نابمەوە لیٚ ی یەکێتی لەوە رەدیان لەسەرمان توندو دژمان وەستانەوە دوایش پارتی ئاگای لەو سەردان و هاتوچۆیانە هەبوو ئەوانیش لەوە دەترسان لەگەڵ یەکێتی گەیشتبینە رێکەوتنێك لەسەر هەڵبژاردن وەپارتی بەشێوەیەکی کە یەکێتی بخاتە گومانەوە لەسۆسیالیست، لە١٩٩٢/٥/١٧ لەرانیە بوین وەفدێکی یەکێتیش لەویٚ بون لەسەر دوا کەوتنی مەرەکەبەکەی بۆ دەست رەنگ کردنی پەرلەمان برادەران وتیان خەلەلی تێدایە بۆیە دواکەوتووە وادیار بوو پارتی خەریکی شتێك بوو لەگەڵ مەرەکەبەکەدا کەلەئەڵمانیاوە هەموی بەسەر مۆری هاتبوو کەچی لەویٚ گۆرییبویان و دەست کاری کرابەقسەی یەکێتی ئەوەیان دەوت پارتیش دەیانوت هەرلە رێگاوەو لەویٚ هاتوە وابووە لەسەر ئەوە حاکمەکان بریاریاندا لەرۆژی ٥/١٧ هەڵبژاردنەکە دوابخرێت بۆرۆژی ١٩٩٢/٥/١٩ بکرێت، من لە١٩٩٢/٥/١٧ لەرانیەوە گەرامەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٢/٥/١٨ هەرلەسلێمانی بوین چاوەرێی هەڵبژاردن دەکراو خۆمان ئامادە دەکردبۆی، پاش نیوەرۆی ئەو رۆژە چوم بۆهەڵەبجەی تازەو لەویٚ مامەوە، لە سەعات (٨)ی سەرلەبەیانی رۆژی١٩٩٢/٥/١٥ هەموو پروپاگەندەیەکی هەڵبژاردن وەستاو چاوەرێی هەڵبژاردن بوین وەلەرۆژی ١٩٩٢/٥/١٧ هەرسەیارەمان دەبینی ئالاَی شین و زەرد تێکەڵ کراوە پێکەوە لەمەقەراتی پارتی و لەهەموولایەك نەمانزانی چیە بروسکە هات لەهەموو لقەکانەوە وتیان هیچمان لەگەڵ پارتی دا هەیە وائالاَی شێن و زەردیان تێکەڵ کردووە لەهەموو ناوچەکان و دەڵێن بوین بەیەك و پێکەوە رەئی دەدەین وەسۆسیالیست رەئی بۆکاك مەسعود دەدات وتمان

شـتي وامـان نەبيـستوەو شـتي واش نيـە بروسـكەمان كـرد لـەزاخۆوە تـاكفرى ئـەوكارەش پـارتي كردبـوى بۆئـەوەى يـەكێتي پـێ نارەحـەت بكـات يـەكێتي تەلەفونيان بۆكردم لەسەر ئەو وەزعە منـيش وتم شـتي وا نيـەو نـەش بـووە وتيـان ئەتواني لە تەلەفزيوني يەكێتي قسە بكەيت ئێمە دێين پرسيارت لێ دەكەين منـيش وتم بەڵێ من ئامادەم بابێن تەلەفزيوني يەكێتي هاتن و پرسياريان لێ كـردم منـيش لەوەلأمدا وتم ئێمە ئاگامـان لـێ نيـەو هـيچ رێكـەوتنێك لەسـەر هەڵبـژاردن لـەنێوان سۆسياليست و پارتي و يەكێتيشدا نيە و پێمان ناخۆشە پارتي ئـەوەى كـردوە بـێ ئاگاداري وابزانم قسەيان لەگەڵ مامۆسـتا سـەعديش كردبـوو يـەكێتي لەتەلـەفزيون قـسەى بـۆ puk tv كردبو،بـەلأم پـارتي لـەرێگاى رێكخستنەكانيەوە بەيـەكێتيان وتبوو ئێمە بەتەواوى لەگەڵ سۆسياليست رێكـەوتوين وە ئەگـەر بـاوەريش ناكـەن ئـەوە محـزەرى كۆبونـەوەى هاوبـەش كـە كـاك رەسـول و كـاك مەسـعود ئيمزايـان كـردووە لەسـەر (١٢)خـاڵ رێكـەوتون.... كۆبونەوەكـەى رۆژى ١٩٩٢/٤/٩ بـوو هەرچۆن ئيمـزا كرابـوو هـەروا مـابووەوەو هـيچ لايـەكمان هـەنگاومان بۆنـەنابوو پـێ دەچوو برادەرانمان بەقسەى پارتي پێشترباسي ليـستي هاوبەشـيان كردبێـت بـەلأم پارتي برياري دابوو لەگـەڵ كـەس دانەبـەزێت لەهەڵبـژاردن بەتـەنها ئـەبێت، پـارتي بەرواري رۆژى رێكەوتنەكەى كردبوەوەو فۆتۆكۆپى كردبوو كە مەحزەر بـوو بـۆبلأو كردنەوە نەبوو بەلأم پارتي ناراستەو خو ئاراستەى خۆى واى كردبوو هەموى بگاتە دەسـتي يـەكێتي... يـەكێتيش كەئـەو رێكەوتنـەيان بـيني وابـزانم خـاڵكى لەسـەر مەسەلەى هەڵبژاردن رون نەكرابوە ئەو خاڵـە يـەكێتي واى زانيبـوو لەسـەر حـسابى ئـەوان رێكـەوتوين لەگـەڵ پـارتي دژى يـەكێتي... لـەوە بـەدواوە يـەكێتي وازى لـەململانێ ى پـارتي هێنـاوو كەوتـە سـەنگەرى دژايەتيـەكي تونـدى سۆسياليـست بەتايبـەتي لـەرۆژاني هەڵبـژاردن و دواى هەڵبـژاردن پـارتيش هيـچيان نـەكردبوو

لەرێکەوتنەکە ئەوانیش دژایەتیان دەکردین بەشێوەیەکی کە ئەوان دەیانوت پارتی و سۆسیالیست رێکەوتون و سەرکردایەتی لەنێوان کاك رەسول و کاك مەسعود دەزانن خۆبەئێمە نالێن ئەوە وای کرد کەعەتفی هەندێك بۆ لای خۆیان رابکێشن وەیەکێتیش ئاگری گرتبوو لەئاستمان بەهەموو شێوەیەك، لە١٩/٥/١٩٩٢ رۆژێکی مێژوویی وچارەنوس سازبوو بۆگەلی کوردو بۆ حزبی سۆسیالیستی کوردستان و هەموو لایەك لەکۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی رۆژی ٧و٨/٤/١٩٩٢ بریاردرا هەرلایەنێك لە ٧٪ نەهێنێ بەشدارنابێت لەپەرلەمان بەلام دەتوانی لەحکومەت بەشداربێت و ئەو دەنگانەی هێناویتی نافەوتێ و دابەش دەکرێتەوە لەسەر ئەوانەی کەدەنگیان هێناوە هەر واشیان کرد یەکێتی وپارتی هەر یەکەی لە٤٤ ٪یان هێنا بو پارتی هەندێك دەنگی لەیەکێتی زیاتری هێنابو لە ١٢٪ی بزوتنەوەی ئیسلامی و حزبی سۆسیالیست وپاسوك حزبی شیوعی عێراقی و پارتی گەلی کوردستان دەنگە کانی ئەو حزبانەشیان لە سەر خۆیان دابەشکرد ئەو کات بون بە ٥٠-٥٠ جگە لە لیستی حزب ناوی لیستی سۆسیالیست واتە لیستی یەکگرتن ناونراو ئاشتی و دیموکراتی ومافی مرۆڤ شیعاری بوو جگە لەوان هەندێك خەڵکی کەش لەلیستی سۆسیالیست و پاسۆك بەشداربون لەوانە کاك هادی شاوێس و عەلی سنجاری و جەلیل فەیلی و عمر حاجی عینایەت و سەعداللە پەرۆش و عبدالرحمن گۆمە شینی و...هتد بەشداربون، سەرلەبەیانی رۆژی ١٩/٥/١٩٩٢ جەماوەری کوردستان لەزاخۆوە بۆکفری بەجارێك رژانە سەرجادەو روبەروی صندوقی دەنگدان دەچون دەنگەکان بەم شێوەیەبون : -

| ز | ناوی لیستەکان | دەنگ | ڕێژە |
|---|---|---|---|
| ١ | پارتی دیموکراتی کوردستان | ٤٣٧٨٧٩ | ٪٤٥,٥ |
| ٢ | یەکێتی نیشتمانی کوردستان | ٤٢٣٨٣٣ | ٪٤٣,٦١ |
| ٣ | بزوتنەوەی ئیسلامی | ٤٩١٠٨ | ٪٥,٥ |
| ٤ | سۆسیالیست وپاسۆك | ٢٤٨٨٢ | ٪٢,٥٦ |
| ٥ | حزبی شیوعی عێراق | ٢١١٢٣ | ٪٢,١٧ |
| ٦ | پارتی گەل | ٩٩٠٣ | ٪١,٢ |
| ٧ | دیموکراتە بێ لایەنەکان | ٥٠١ | ٪٠,٥ |
| ٨ | کۆی گشتی دەنگەکان | ٩٧١٩٥٣ | ٪١٠٠ |

## دەنگەکانی پارێزگای سلێمانی

| ز | ناوی لیستەکان | دەنگ | ڕێژە |
|---|---|---|---|
| ١ | یەکێتی نیشتمانی کوردستان | ٢٠٧١٦٨ | ٪٥٩,٩ |
| ٢ | پارتی دیموکراتی کوردستان | ٩٢٤٤٩ | ٪٢٦,٦ |
| ٣ | بزوتنەوەی ئیسلامی | ٢٩٣٣٤ | ٪٨,٤ |
| ٤ | حزبی سۆسیالیست | ١١٩٧٨ | ٪٣,٤ |
| ٥ | حزبی شیوعی | ٥٦٩٣ | ٪١,٦ |
| ٦ | پارتی گەل | ١١١٨ | ٪٠,٣ |
| ٧ | دیموکراتە بێ لایەنەکان | ٢١٣ | |

## دەنگەکانی پارێزگای هەولێر

| ز | ناوی لیستەکان | دەنگ | ڕێژە |
|---|---|---|---|
| ١ | پارتی دیموکراتی کوردستان | ١٥٢١٤٣ | ٪٤٥,٦ |
| ٢ | یەکێتی نیشتمانی کوردستان | ١٤٨٣٥٢ | ٪٤٤,٤ |
| ٣ | بزوتنەوەی ئیسلامی | ١١٠٩٢ | ٪٣,٣ |
| ٤ | حزبی سۆسیالیست | ٨٨٤٣ | ٪٢,٦ |
| ٥ | حزبی شیوعی | ١١٠٤٧ | ٪٣,٣ |
| ٦ | پارتی گەل | ٢١٠١ | ٪ ٠,٦ |
| ٧ | دیموکراتە بێ لایەنەکان | ١٨٤ | |

## دەنگەکانی پارێزگای دهۆك

| ز | ناوی لیستەکان | دەنگ | ڕێژە |
|---|---|---|---|
| ١ | پارتی دیموکراتی کوردستان | ١٦٨٦٨٣ | ٪٨٥,٥ |
| ٢ | یەکێتی نیشتمانی کوردستان | ١٥١٨٤ | ٪٧,٧ |
| ٣ | بزوتنەوەی ئیسلامی | ٣٨٧٤ | ٪٢,٠ |
| ٤ | حزبی سۆسیالیست | ١٩٨٣ | ٪٠,١٠ |
| ٥ | حزبی شیوعی | ١٥٤٦ | ٪٠,٠٧ |
| ٦ | پارتی گەل | ٦٣٣٠ | ٪٣,١ |
| ٧ | دیموکراتە بێ لایەنەکان | ٤٩ | |

### دەنگەکانی پارێزگای کەرکوك

| ز | ناوی لیستەکان | دەنگ | رێژە |
|---|---|---|---|
| ١ | یەکێتی نیشتمانی کوردستان | ٥٣١٢٩ | ٪٦٠,٣ |
| ٢ | پارتی دیموکراتی کوردستان | ٣٤٦٠٤ | ٪٢٧,٩ |
| ٣ | بزوتنەوەی ئیسلامی | ٤٨٠٨ | ٪٥,٥ |
| ٤ | حزبی سۆسیالیست | ٢٠٣٨ | ٪٢,٣ |
| ٥ | حزبی شیوعی | ٢٨٣٧ | ٪٣,٢ |
| ٦ | پارتی گەل | ٦٣٣ | ٪ ٠,٧ |
| ٧ | دیموکراتە بێ لایەنەکان | ٥٥ | |

### دەنگەکانی بۆ هەڵبژاردنی رابەر لەکوردستان

| ز | ناوەکان | دەنگ | رێژە |
|---|---|---|---|
| ١ | مسعود بارزانی | ٤٦٦٨١٩ | ٪٤٧,٥١ |
| ٢ | مام جەلال | ٤٤١٥٠٧ | ٪٤٤,٩٣ |
| ٣ | مەلا عوسمان | ٣٨٩٦٥ | ٪٣,٩٧ |
| ٤ | دکتۆر محمود | ٢٣٣٠٩ | ٪٢,٣٧ |

## ئاکامی هەڵبژاردنەکان و سەرهەڵدانی ناکۆکی

من لەهەڵەبجەی تازە بووم حاکمەکان یاسەرپەرشتیارەکانی سۆسیالیست هیچ نەبون بێ دەسەڵات بوون هەتا ئەوانەی پارتیش هەروابون جگە لەوەی یەکێتی هەندێك پێشمەرگەشیان لەپشتەوە دانابوو بەڵام برادەرانی ئێمە زۆر بێ تەجروبە و بێ خەبەر لەهەمووشتێك بوون هەتا زۆر لەوانە ناویان نوسرابوو کەخۆیان هەڵبژاردبوو لەلیستی پەرلەماندا خۆیان نەدەچون دەنگ بدەن وایان دەزانی

مسۆگەرەو دەردەچن، من بەریَ ی باریکەو نصرو هەڵەبجەی تازەوە بووم جەماوەری سۆسیالیست نەك هەرلە هەموویان زیاتربوو ئەوانەی سەربەیەکێتی بون لەسەر صندوقەکان دەیانوت هەمووی هەر سۆسیالیستەو دەچون لەخەڵکی نەخوێندەواریشان دەگۆری کەدەیگوت دەنگ بۆحسك دەدەم بەلاَم ئەوان پەنجەیان دەنا بەسەوزەکەدا لەگەڵ ئەوەشدا دەنگی سۆسیالیست بەتایبەتی ئەوانەی سەر صندوق و خۆمان حساباتی حزب لەشارەزوور وجێگاکانی کەش دەبوو ئێمەدەنگی باشمان بهێنایە وەلەهەولێرو قەلاَدزە ورانیەو زۆرجێگای کەش کەزانرا سۆسیالیست بەجارێك دەنگی زۆرەو یەکێتی خۆی پێ نەگیراو پێشمەرگەیان چوبونە سەرصندوقەکان و بەزۆر چەند جارێك لەو صندوق بۆئەو صندوق بەسەیارە دەچون خەڵکی واهەبوو دەیوت (١٦) جاردەنگم داوە وەزۆر کەم بوو لە(٤-٥) دابێت لەهەموو لایەك هەروابوو پارتیش دەستی پێکرد برادەرانی ئێمە هاتن وتیان ئەوە هەمووی تەزویر دەکات و ئەوە قبوڵ ناکەین چی دەڵێت باهەڵبژاردنی تر بکەینەوە من وتم بابەگیان کەس صندوق بەجیَ نەیەڵێت ئەوان چی دەکەن ئێوەش وابکەن بەجیَ هێشتنی صندوق خراپ تر دەبێت وادیاربوو کاك دکتۆر لەهەولێرەوە بروسکەی کردبوو دەڵێت لەبەرئەوەی تەوزێر دەکەن ئێوە صندوقەکان بەجیَ بێڵن و ئێمە ئیلتزام ناکەین پارتی و شیوعی ئەوانیش صندوقیان بەجیَ هێشتبوو.... لەدهۆك و بادینانیش ئەوە پارتی هەرخراپ تری کردبوولەیەکیَ لەقەزاکانی سەر بەدهۆك کەژمارەی دانیشتوانی بەگەورەو بچوکەوە (٣٠)هەزار کەسی تێدابوو بەلاَم (٣٥) هەزار دەنگی هێنابوو بەمناڵی یەك ساڵیشەوە بەوەشەوە نەوەستان و شەو هێزی پێشمەرگەی یە کێتی بەزۆر صندوقەکانیان بردبوو لەحاکمەکانیان سەندبوو ئەوان زۆریان سەربەیەکێتی بوون بەئارەزووی خۆیان ئەوەی هی سۆسیالیست بوو لایان بردبوو وەئەوەی

خۆيان هەيانبوو خستبويانە ناو صندوقەكانەوە وەيەكێتی لەگەڵ ئێران رێكەوتبوو ئەگەر دەربچێ پشتیوانی لەعێراق ناكات بەڵام سەرەراتی پارتی لەسەر حكومی زاتی و لەگەڵ عێراق دابوو وەیەكێتی وەرەقەی دەنگدانی ئیحتیاتی لەئێران مسۆگەر كردبوو هەروەها پارتیش زۆرشتی لەعێراق مسۆگەر كردبوو جگەلەوەش پارتی لەسەر ئەوئەساسەی دەنگی یەكەم دەهێنێ و لەگەڵ عێراق رێك دەكەوێت لەسەر ئەوە لەگەڵ عێراق رێكەوتبون عێراقیش تەوجیهاتی دابوو بەهەموو دۆستەكانی ئەوانەی كەلەكوردستان بوون دەنگ بدەن بەپارتی هەتا لەكەركوكەوە خەڵكیان دەنارد لەسەیتەرەكان پێیان دەوتن برۆن رەئی بدەن بەزەرد بۆپارتی جگە لەوەش هەرچی جاش و خەڵكی ناوچەیە هەبوون لەموصڵ یا كوردی ئەو ناوچەیە عێراق بەئیجباری ناردنی بۆ سەرصندوق و رەئی بۆپارتی بدەن هەتا خەڵكی سەربەرژێم لەناو لایەنەكانی كەشدا هەموی دەنگیان بۆپارتی و سەرۆكی پارتی دەدا عێراق بەهەموو تواناى راگەیاندن رادیۆی گەورەی بەپارتی داو بۆئەو هەڵبژاردنە جەماوەری سەر بەخۆی دەدانێ و پارەو چەك و شتی كەش بۆ تەمین كردن واتە پارتی مسۆگەری كردبوو كەئەكسەریەت دەهێنن و سەركەوتوو دەبێت و لەگەڵ عێراق رێك دەكەوێت پارتی ئەیوت ئاشتی لە بەرنامەیدا بوو یەكێتی نیشتمانیش سەر بە خۆی بو لەگەڵ ئێران زۆرشتی باس كردبوو بەڵام لەراگەیاندندا دەیوت سەر بكەوین دەوڵەتی كوردی دروست دەكەین لەكاتی هەڵبژاردندا كەس ئیسراحەت و خەوو وەستانی نەبوو رۆژی واهەبوو دەیان سەیارە بەناو بازاری سلێمانی دا دەسوڕایەوەو چەندین كۆرو كۆبونەوەو منازەرە لەسەر ئەو وەزعە دەگێران لەیەكێ لەمنازەرەكان پرسیاریان لەمن كرد وتیان ئەگەر یەكێ لەو حزبانە ئەو هەموو مەساریفە دەكات ودەرنەچێ دوای چی دەبێت منیش وتم دەكەوێتە ساجی عەلی لەدونیادا هەیە حزب دەرناچێ و بۆجارێكی كە خۆی ئامادە

دەكات بەڵام ئەم حزبانە هەرچیان هەیە سەرفیان كردوەو دەرنەچن خراپە یەكێ هاواری دەكرد مامە یەكێ هاواری دەكرد كاكە یەكێ هاواری دەكرد. حەزرەتی شێخ عوسمان هاواری دەكرد، رۆژێك لەناوشاردا جەماوەرێكی زۆر دەوری دكتۆر محمودیان دابووئەوەی كەش دەیوت و هاواریان دەكرد دكتۆر دكتۆر دكتۆر لەوكاتە كۆمەڵێك یەكێتی بۆسەر قەبران دەرۆیشتن وهات وهاوار ئێمەش لەبازار(٥٠٠)سەیارە دەبوین هات و هاوار ئەوان گوێیان لێ بوو دكتۆر..دكتۆر ئەوانیش دەیانگوت فریای خەستەخانەی بخەن هیلاكە (جاری واهەیە كەسێك نەخۆشە كە سێك لە گەڵدا بێت هاوار دەكات دكتۆر..دكتۆر) ئەوانیش دەیانوت فریای خەستەخانەی بخەن، كاك دكتۆرمحمودجارجار دەیوت من خەڵكی ئەم شارەم برادەران دەیانوت راستە خەڵكی ئەم شارەیە بەڵام مجامەلەكەی لەخەڵكی سلێمانی ناچێ بەڵام ئەوەی گرنگ بوو كەس هەرای نەدەكرد لەسەر ئەو وەزعەش هەبوو تەمەنی خەڵكی گەورە دەكرا بۆ رەئی دان دەیان تەسكەرە دروست دەكرا بۆتەزویر و ئەوەی كرا كرا لە دعایەی هەڵبژاردن پاشان صندوقەكان لەشەوی ١٩-٢٠/٥/١٩٩٢ وڕۆژی ٢١/٥/١٩٩٢ یەكە یەكە صندوقەكانیان دەهێنایەوە هەردەگەراین نەمان دەزانی لەكوێن برادەرانی یەكێتی نیشتمانی بردبونیان ماقول نەبوو لەشارەزوورو لەئۆردوگای نصرو باریكە هەریەكەی (١٥٠) دەنگی سۆسیالیست هەبێت یالەهەڵەبجەی تازە (١٧٠) دەنگی هەبێت ئێمە خۆشمان لەمام جەلال مان پرسی ئایا مام جەلال ئەوە حەجمی دەنگی ئێمە بوو مام جەلال وتی نەوەلاو زیاترتان هەبوە لەباینجان نەمانزانی كەشتی وامان هەیە لەصندوقی باینجان (٤٤٠٠) دەنگمان هەبوو دوای بەمام رۆستم ووت مام رۆستم چۆن ئەو صندوقەی بازیان یاباینجانتان دەست كاری نەكردبوو ئەو دەنگانەی تێدابوو مام رۆستم وتی باوەر بكەن نەمانزانی دوای زانیمان چونكە ئێمە زیاتر تەركیزمان

لەسەر صندوقەکانی شارەزوور کردبوو کەرێگا نەدەین سۆسیالیست لەوێ ئەکسەریەت بوو لەدەنگەکان وەلەدەربەندیخان و کەلارو چەمچەماڵ و هەموو لایەك کلك وگوێ ی صندوقەکانیان کردبوو وەدەنگەکانیان لێ دەرکردبوون تا ساڵی ١٩٩٦و ١٩٩٧ یش وایان دەزانی لەبیرمان چۆتەوە زۆری لەچەمچەماڵ ئەو وەرەقانەم هەبوو ئەوانەی لەو دواییە لەدائیرەکانی حکومەتی کوردستان شتیان لەسەر پشتەکەی دەنوسی هەرئەوکاتەش خۆمان هەندێکمان دەست کەوت و ئێستاش بەهەزارانی هەرلەوناوەیەو هەموو لایەك ئەو راستیانە باش دەزانن کەچ زوڵمێك لەحزبی سۆسیالیست کرا بەلام سەبەبی یەکەم سەرکردایەتی حزبی سۆسیالیست خۆی بوو چونکە بەرنامەی نەبوو وەسەری لەروداوەکان دەرنەئەکرد و کارەکانی لەسەر شتی عاتفی و بێ سەروبەر بوون وەسەبەبی دووەمیش یەکێتی نیشتمانی بوو وەسەبەبی سێ هەم پارتی بوو چونکە پارتی لەسنوری ئێمەدا دەسەڵاتی وای نەبوولەگەڵ ئەوە شدا پارتی هێمن ترولەسەرخۆتربون لەگەڵ ئێمەدا رۆژی ٥/١٩ شەوتا درەنگ دەنگ دان هەبوو وەلەسەر بروسکەی کاك مەسعود پارتی بریاری دابو ئیلتزام بەو هەڵبژاردنەوە نەکات و دەیویست لەگەڵ حزبەکانی کە بەتایبەتی سۆسیالیست و شیوعی کۆببنەوەو بریاری هەڵوەشاندنەوە بدەن یەکێتیش هەموو هێزی خۆی ئامادە کردبوو بۆشەرو پەلاماری پارتی بدات،بلام یەکیەتی بۆزەخت بولەسەر پارتی نەك بۆشەر من لەمەقەری خۆمان لەچوراباخ بوم کاك جەوهەر نامیق کەئەوکات مەسئولی هەردوو لقی سلێمانی و کەرکوکی پارتی ومەسئولی تەنسیق لەگەڵ عێراق بوو سەرپەرشتی دەکردن و کاك قادر قادر و کاك ئازادقەرەداغی مەسئولی هەردوولقی(٣و٤)ی پارتی بون لەو سنورەو هەندێکی کەیش هاتن بۆمەقەری ئێمە لەچواباغ من و خاڵەحاجی و برادەران لەوێ بوین و بروسکەش لەسەرەوە دەهات صندوق بەجێ بێڵن بەلام ئەوە من بەکارێکی خراپم

دەزانی ئەوان هاتن وتیان چی بکەین یەکێتی بەنیازی شەرە ئێوە رەئیتان چۆنەو چیە...من وتم یەکێتی ئەو هەموو خروقاتانەی کردوە هێشتا ئێمە بترسین لەشەر وادیاربوو پارتی زۆر دەترسان لەشەر لەمەقەراتی ئێمە دور نەدەکەوتنەوە، لە٢٠/٥/١٩٩٢ هەموومان کۆبوینەوە بەپارتی و شیوعی وگەل بەیانێکمان بەناوی ئەو حزبانە لەپارێزگای سلێمانی وکەرکوك دەرکرد دژی یەکێتی نیشتمانی کەتەزویری کردووەو صندوقەکانیان شاردۆتەوەو هەرچی لێ بووە دەریان کردوەو هی خۆیان بەباوەش هێناوەو کردویانەتە صندوقەکانەوە بۆیە ئێمە ئیلتزام بەو بریارەوە ناکەین ، شەوی ١٩-٢٠/٥/١٩٩٢ بروسکەیەکی دوورو درێژی کاك مەسعود بارزانی هات بۆهەموو لایەنە شۆرشگێرو دۆستەکان و هەموو دام و دەزگاکانی پارتی وبەرەی کوردستانی لەگەڵ چەند ئاگاداریەك کاك ئەحمەد سالاری هونەرمەند لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن پارتی لە سلێمانی خوێندیەوە و باسی ئەوە دەکات کەئەو هەڵبژاردنە تەزویرەو شەرعی نیەو بەهیچ شێوەیەك پارتی دیموکراتی کوردستان ئیلتزامی پێوە ناکات و ئەوە ئەنجامی پاك نیەو قبوڵ ناکرێت ئەو هەڵبژاردنە بەڵام رۆژی ١٩/٥/١٩٩٢ بەهەموو کەمو کوریەکانیەوە رۆژێکی گرنگ وچارەنوس سازبوو بۆ کوردو حزبەکان لەمێژوی کوردا بێ وێنە بووە، لەرۆژی ٢٠/٥/١٩٩٢ بەیانی ئەو حزبانە دەرکراو لە سەر ناشەرعی وتەزویری هەڵبژاردنەکە لە ٢١/٥/١٩٩٢ لەحاڵەتی شەردابووین و لەلەحزەی تەقینەوە دابوو لەهەمولایەکی کوردستان بروسکەهات کەرۆژی ٢٢/٥/١٩٩٢ لەسەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی کۆدەبینەوە و حاکمەکانیش هەروا بەردەوامن و نوێنەری ئەمریکاو ریکخراوی نەتەوە یکگرتوەکان UN ولآتانی هاوپەیمانی لەکوردستان داوایان کرد هەرچۆن بکرێت رێکەون و ئەنجامی قبوڵ بکرێت ئێمەش چوینە هەولێر بۆکارگێری بەرەو لەوێ کاك دکتۆر محمودو کاك سامی و کاك مەلاعەلی و شێخ محمد بەرزنجی

و کاك مەلائەحمەدی هێلآنپێ و مام جەلال و کاك مەسعود و قیادەی هـەردوولایان و سەرکردایەتی حزبی شیوعیش لەوێ بوون سـەرەتا مـام جـەلال قـسەی کـردو وتـی راستە لەهەڵبژاردنەکە خروقات هەبووە بەڵآم هەموو لایەك کردویەتی وادیاربوو مـام جـەلال و کـاك مەسـعود و ئەمریکیـەکان و حاکمـەکانیش کۆببونـەوە پێـشترو رێکەوتبون لەوەی چی بکەن ، هەروەها مـام جـەلال وتـی ئەمریکیـەکان و ئەوانـەی (UN) و هەموو دۆستەکانی کـورد لـەدەرەوەو لێـرەش لەکوردسـتان داوا دەکـەن کەئەوە تەجروبەیەکی باش بووە بۆکورد هەرچۆن بووە ئێستا نەتائجی قبوڵ بکەن و لەماوەیەکی کـەدا هەڵبـژاردن بکەنـەوە وە وتـی لێـرەش مـن و کـاك مەسـعودیان دیووەو لامان بوون و قـسەیان کـردووە مـن وکـاك مەسـعودیش داواکـەیانمان قبـوڵ کردووەو ئێمە رێکەوتوین مام جەلال زۆر زەوقی هەبوو تەزبیحێکی سەوزی گەورەی بەدەستەوە بوو چونکە یەکێتی لەدوولاوە سەرکەوتوبوو :

١-یەکێتی نیشتمانی شان بەشانی پارتی و بارزانی رەئی هێناوە چونکە یەکێتی لە چاو پـارتی دا رێکخراوێکـی نـوێ بـوو وەمـام جـەلالیش بەرامبـەر بـەکاك مەسـعود کـەکوری مەلامـستەفای بـارزان و قیـادەی هـەموو کـوردی کـردووە لەسەرانـسەری کوردستان بووە بەشەریك .

٢-تێکدانی بەرنامەی کاك مەسعودو پارتی و رێکەوتن لەگـەڵ عێـراق و بیرکردنـەوە لەهەر کارێکی لەو بابەتە و سـەلماندنی بـۆ هـەموو دنیـاش کـە دووحزبـی گـەورەی خاوەن جەماوەر و دوو سەرکردەی کورد هەیە لەکوردستانداو پارتی بـەبێ یـەکێتی نـاتوانێ نەشـەرو نەئاشـتی بکـات و (٤٠٠) هـەزار رەئـی هێنـاوە ئەوانـە هـەمووی سەرکەوتن بوون بۆ مام جەلال یابۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان و وەڵامێك بوو بـۆ پارتی کە دەبێت بەپێی بـەڕەی خۆتـان پـێ راکێـشن چـاوی عێـراق و پـارتی کـاڵ کردەوە پارتی لەگەڵ ئەوەی هەندێك دەنگی لەیەکێتی زیاتر هێنابو بەڵآم رازی بون

وەکویەکێتی (٤٤)بۆیەکێتی و(٤٤)بۆپارتی پاشان دەنگی حزبەکانی کەشیان لەبەینی خۆیان دابەشکرد سەرکەوتن بوبۆیەکێتی ، ئەمریکاو هاوپەیمانانیش داوایان لەکاك مەسعود کرد کەدەبێت ئەنجامی قبولّ بکات ئەوانە هەمووی سەرکەتنی یەکێتی بوون، حزبی زەحمەتکێشان لەگەلّ یەکێتیدا یەك لیستی دابەزان بەلاّم دوایی پێیان هێنانەوە، لەبەرەی کوردستانی مام جلال هاتە ژوورەوەو بەئەو کەسەی ووت کەلەویّ ئیشی دەکرد ئەوە بۆ ئەو گوڵدانە گوڵی سەوزی تێدانیە کابرایش ووتی وەلاّ من نازانم بەلاّم بنەکەی سەوزە مام جەلال سەیری کردو ووتی وایە ئەساسەکە سەوزە گرنگ نیە کاك مەسعود بەو قسەیە نارەحەت بوولەدلّدا بەلاّم هیچی نەوت مام جەلال وتی کاك مەسعود فەرموو قسە بکە کاك مەسعود وەستابوو مام جەلال وتی براینە ئێمە رێکەکەتوین لەگەلّ پارتی و کاك مەسعود دا وەکو یەکین پێمان باشە ئێوەش کەهەمووماں لەخەبات پێکەوە بوین لێرەش هەر پێکەوە بین و ئێوەش ئەو ژمارەیانەتان هێناوە سۆسیالیست(٢٥٨٨٢) دەنگ و بزوتنەوەی ئیسلامی (٤٩١٠٨) دەنگ و حزبی شیوعی (٢١١٣٢) دەنگ و پارتی گەل (٩٩٠٢) دەنگ، هەروەها وتی ئێستا بەختی خۆتان بزوتنەوەی ئیسلامی (٥)کەسی پەرلەمانی هەیەو سۆسیالیسنت (٣)کەس و حزبی شیوعی (٢)کەس و پارتی گەل (١)کەس وە ووتی (٢٠)کە بێت باشە واتە (٩) تری بۆ زیاد بکریّ واتە بزوتنەوە ببێت بە (٧) کەس و سۆسیالیست ببێت بە(٥) کەس و حزبی شیوعی ببێت بە(٣)کەس و پارتی گەل ببێت بە (٢) کەس و (٣) کەسی بیّ لایەن هەمووی دەبێتە (٢٠)کەس لەناو پەرلەمان و دەتوانن بریار بگۆرن لەگەلّ (٤٠)کەسی پارتی و (٤٠)کەسی یەکێتی و (٥) کەسی ئاشوری هەمووی دەبێتە (١٠٥) کەس لەپەرلەمان و من وام پیّ باشە پاشان کاك مەسعود ووتی بۆ (٢٤) نەبیّ حزبەکان وادیاربوو تەماح گرتبێتی بۆ (٢٤) بێت قسەکەی مام جەلالی کرد کاك مەسعودیش

بۆیه ئەوەی ووت نەك ئەو حزبانە بڵێن ئەو لەوانەیە پێ ی خۆش نەبێت من
رەئیەکەی مام جەلالم پێ باش بوو گرنگ نەبوو (٢٤یا٢٠) من پێم باش بوو سیانزە
کەسە کەش بەشداری بکەن لەپەرلەمان هەر سەرکەوتنی هەموو لایەك بوو من
پێشنیارە کەی مام جلال وکاك مسعودم پێ باش بو وە کەم تر لەوە ش، کاك
سامی وکاك دکتۆرمحمود هەردووکیان بەدوای یەکدا قەت رێك نەبوون لەوکاتەدا رێك
بوون وتیان کورد لەمێژوی سیا سی خۆی دا یەك یاسای داناوە ئێستا ئەم قانونەی
کورد تێك دەین شتێکی خراپەو خزمەتی کورد و خزمەتی حزبەکانیش ناکات ئێمە
قانون تێك نادەین و ئێوە هەردوولا پێکەوە بیکەن پیرۆزبایتان لێ دەکەین
هەردوولایان ئەو قسانەیان پێ خۆش بوو، من ووتم کاك دکتۆر قانون خۆمان دامان
ناوە چارە نووسی حزب و میللەت لەو قانونە گەورەترە کاك دکتۆر وتی لەناو کوردا
وایە قانون لەهەمووشت بالا دەست ترە ووتم راستە بەلام بۆ چارەنووس و بنیادی
کیانێك لەم حاڵەتەدا لەدنیادا شتی وابووە... مام جەلال وتی قانون خۆمان دامان
ناوەو من بەحاکمەکانم وتووە دەڵێن دەبێت دەست بەکاربێت و هەرئێستا
حاکمەکان بەفەقەرەیەك بریاری بۆ دەدەن و ئەم شەو بلاوی دەکەینەوە ئەو کات
بریار لەبەرەی کوردستانی بەکۆمەڵ واتە یەکێ نارازی بوایە کەس نەیدەتوانی
بریارەکە جێ بەجێ بکات، من زۆر لەگەڵ کاك دکتۆر و برادەرانی خۆمان قسەم
کرد کاك سامی لەپەنای من بوو وتی چاك کەوتینە ساجی عەلی قسەکەی من پێش
هەڵبژاردن باسم کرد ووتم ئەگەر ئێستا بەشدار نەبین خراپ ترمان بەسەر دێت بۆیە
ئەوە هەردوولا رێکەوتون بۆئێمەش رێك نەکەوین کاك سامی نەهاتە خوار لەقسەی
خۆی چونکە دەنگی کەم بوو( ٩٩٠٢ ) دەنگی هەبو یەك کورسی دەبو دکتۆر
محمودیش خۆی دەرنەچوبو حەزی دەکرد حزبیش بەشدارنەبێت وهاورێیانی حزبی
شیوعی هەر قسەیان بۆ نەدەهات هەرگیز تەوەقوعیان نەدەکرد کەحزبی شیوعی

جەباریش لیٚ ی نەدەهاتنە خوارەوە کاك سامیش لەولاوە، قیادەی سیاسی بریاری دا هەلّبـژاردن لـەنێوان کـاك مەسـعودو مـام جـەلال لەکوردسـتان بکرێتـەوە ئـەم هەلّبژاردنەی ئەنجومـەنی نیـشتمانی ئـەوکات نـەمان دەوێـرا بلّـێن پەرلـەمان لەبـەر پارتی شەرعی نیـە و لەبـەر رەئـی جیهـانی ئـیعلان بکرێـت ولـە رۆژی ١٩٩٢/١٠/٢٥ هەلّبژاردن بکرێتەوەو لەئێـستاوە هـەموو شـتی بـۆ ئامـادە بکرێـت بۆئـەو رۆژە مـن شەخسی دلّنیا بووم کە ناکرێتەوە بەلاّم وتم باشە با ئێمـەش بەشـداربین و ئـەوکات کرایەوە باشترو هەبەشدار دەبین بەلاّم کـاك سـامی و کـاك دکتـۆر محمـود سـەبەبی بوون چونکە ئەگەر ئەو (٢٠) کەسە یاهەر (١٢)کەسەکەش لەپەرلەمان بوایەو تـەنها هـی پـارتی و یـەکێتی نەبوایـە شـەر نـەدەبوو لەکوردسـتان و یـەکگرتن نـەدەبوو کێـشەوگیروگرفت روی لەهـەموو لایـەك نـەدەکرد بـەرای مـن ئـەوکات و ئێـستاش و داهاتوویش ئەوە رەئی منە، ئێمەش لەدوای کۆبونەوەی قیادەی سیاسی گەراینەوە بەرەو سلێمانی هـەرفێلّی یـەکێتی وپـارتی وبـیری تەسـکی حزبایـەتی و بیٚ بـەش کردنی حزبە هاوسەنگەرەکانیان تاکویٚ بر دەکات ، ئێوارەی ٢٢-١٩٩٢/٥/٢٣ کـاك نەوشیروان مستەفا خۆی چوبوو بۆ مەقەری لقی (٤)ی پارتی لەسلێمانی هـەموویان خۆیان شاردبووە وایان دەزانی شـەر دەبێـت کـاك عوسمـان قـادر منـەوەر بەتـەنها لەبارەگای لقی (٤) بوو کـاك نەوشـیروان خـۆی بـەدەنگی خـۆی لەتەلـەفزیۆن وتـی واپارتی و یـەکێتی رێکـەوتن وەکـو یـەك لەپەرلـەمان و حکومـەتی کوردسـتان هـیچ کامیـان لەهیـچیان زیـادی نیـەو مـام جـەلال و کـاك مەسـعودیش هـەروا بۆیـە داوا لەخەلّکی کوردستان دەکەم بەکوێرایی چاوی ناحەزان و ئـەو حزبانـەی دەرنەچـون برژێنـە سـەرجادەو شـایی بکـەن ئەوەشـی پـیٚ ی ناخۆشـە لـەداخا بتـەقیٚ کـاك نەوشیروان مستەفا لەتەلەفزیۆنی پارتی و تەلەفزیۆنی یـەکێتی ئـەو قـسانەی کـردو دوای ئـەوە لـەناو شـاربوو بەشـایی و تەقـەو هـەرا لەهـەموو لایەکـەوە ئـیتر ئـەو

پارتیانەی کەلەچواریاغ لای ئێمە بون نەمان بینینەوە لەدوای ئەوە پارتی و یەکێتی یەکی (٤٤) ی کەسیان بۆپەرلەمان دەرچوبوو بەپێ ی دەنگەکانیان کە(٩٧) هەزار دەنگ ئێمەو ئەو حزبانەی دەرنەچوبون یاپارتی هەرچی زیادبوو لەیەکێتی ئەو (١١)کەسەش دابەشیان کردبوو بەسەر خۆیاندا ببوو بە (٥١ بە٤٩) دوایی (٥٠ بە٥٠) ڕێکەوتن لەسەری و دابەشیان کرد رادیۆی و تەلەفزیونی پارتی لەگەڵ ئیعلانی ڕێکەوتن و نەتائجی هەڵبژاردن ئەو بروسکەی کاك مەسعودی خوێندەوە کەدەڵێ لە ٢٠ –تا – ١٩٩٢/١٠/٢٥ هەڵبژاردن دەکرێتەوەو تائەو کاتە ڕێکەوتوین و پەرلەمان هیچ شەرعیەتێکی نیەو نەماوە، قسەکانی کاك نەوشیروان هەتا خەڵکی خۆشیان پێ ی ناخۆش بوو چونکە حەقی نەبوو بکرایەو ئێستاش ئەوشتانە لەئەرشیف دا ماون، ئێمە گەراینەوە بۆسلێمانی ئەوەی سەر بەسۆسیالیست یا ئەو حزبانەی بەشدارنەبون نارەحەت بوون لەو وەزعە کەکرا، لە١٩٩٢/٥/٢٣ کەهەموو سەرگەرمی هەراو هەڵپەرین بووبەلاَم من خەریکی دانانی بەرنامەوخۆ ڕێکخستنەوە بۆزاڵبون بەسەرکۆسپەکاندا کۆبونەوەم بەلق کردو باسی تەواوی وەزعەکەمان کردو لەسەری قسەمان کرد ئەوەی لێرە نوسراوە هەموویم بۆ باس کردن ووتم ئێمە حزبین و دەبێت بەردەوام بین زیاتر لەجاران و بۆیەك دووساڵێکی کە بەرەئی من ئەگەر هەڵبژاردن کرا ئێمە خۆمان بۆ (٣)ساڵی کە ئامادە بکەین و ئێمە غەدرمان لێکراوەو هەر بەپێ ی لیستی ڕێکخستن بوایە یاهیچ نەبێت ژمارەی پێشمەرگە بوایە دەبوو زۆر لەوە زیاتر رەئی بهێنین بەلاَم ئەوە نابێت ساردمان بکاتەوە لەئیشوکاری خۆمان وە ئێمە معارەزەین و بەتەئکید ئەوان ناتوانن وەکو پێویست ئەو (٣) ساڵە بەرنە سەر وەئێمە پێمان باشە بیبەنە سەر لەهەموو دنیادا حزب هەیە هەریەکە بەسەرە لەحکوم دەبن یا جارێك دەرناچێ و جارێکی کە دەردەچێت بەلاَم جارێك هەردەبێت دەردەچێت دەبێت گورج و گۆڵ ترو ئیعادەی نەزەر لەهەموو ڕێکخستن

و پێشمەرگە هەموو بکرێتەوە ئەگەر ئەو دوولایەنە ئەو پەرلەمان و حکومەتەیان لەدژمان بەکارهێنا ئێمەش دەتوانین کێشەیان بۆ دروست بکەین بەلاَم دەبێت ماوەیەك بوەستین وچاوەڕێی ئەوان و مجالیا نبدە ین هاوکاریان بکەین و بزانین بۆکوێ ی دەبەن، کۆبونەوەی لقمان کردو کۆبونەوەشم بەمەسئولینی عەسکەری کردوو لەشکرمان هەبوو ئاگادارمان کردن لەرۆژی ١٩٩٢/٥/٢٧ هەموو پێشمەرگەی سنوری لقی سلێمانی لەشکر لەهەڵەبجەی تازە ئامادەیان بکەن ، لە١٩٩٢/٥/٢٤ چومە رانیە کاك رەسول و برادەرانم دی بەتەواوی ورەی خۆیان لەدەست دابوو من هەندێك قسەم کرد لەسەر ئەوەی نابێت ئێمە ئەوەندە بێ دەسەلاَتی خۆمان پیشان بدەین و هی وا هەیە ئێستا حزبی دروست دەکات ئێمە حزبین بۆ خۆمان سەر ژمێرێك دەکەین بزانین هێزو جەماوەری حزب چەندە بەلاَم وەزعیان باش نەبوو هەرهەمان رۆژ گەرامەوە چونکە بەپێچەوانەی هەموانەوە لەگەڵ خاڵەحاجی دا بەردەوام بوین لەکاری خۆمان و کۆبونەوە لەدوای کۆبونەوە هەر لەوکاتەدا، لە١٩٩٢/٥/٢٥ لەسلێمانی خەریکی ئیشوکاری ئاسایی خۆمان بوین، لە١٩٩٢/٥/٢٦ بەرێ کەوتین بۆرانیە کۆبونەوە هەبوو هەموو برادەران وەزعیان باش نەبوو کاك عدنان ووتی ئێمە دەبێت بەردەوام بین و شێوەی کارەکەمان بگۆرین وادیارە شێوەکەی هەڵەیە نەك خەباتەکەمان.. کاك ملازم کەریم لەبرادەرانی پاسۆك زۆر ورەی دابەزی بوو کاك شوان هەرخراپ بوو بەگشتی هەموو برادەران وەزعیان خراپ بوو بەلاَم کاك سەید کاکە باش بوو کاك رەسول زۆر موتەئەسیری پێوە دیاربوو کۆبونەوە کراو چاوەڕێ ی ئەو پەرلەمان و حکومەت بکەین بەلاَم هەموویان لەئوسوڵ وکاری ئەو چەند رۆژەی یەکێتی زۆر بێزار بوون بەحەدێك هەرئەوە مابوو ئەوکات خۆیان بکەن بەناو پارتی دا دژی یەکێتی بەلاَم ئێمە وتمان پێویستە خۆراگربین و ئەو شتانە تەئسیرمان تێ نەکات، من لەسلێمانی لەماڵەکەی خۆم بووم

کۆمیتەیەکی یەکێتی هەندێك منـاڵ و شـتی کۆکردبـوەو دەهـۆڵ وشـتیان هێنـابووە بەری مـاڵی ئێمـە کەئێمـە ئـەوکات لەبەرامبـەری نـادی مهندسـین بـوین لەسـلێمانی هەرێگای هەڵپەرین و شایی نەبوو حەرەسـەکان وتیـان میوانمـان هەیـەوئێرە ماڵـەو برۆنە ئەولا ترەوە ئەوانیش وتبویان بۆ پێتان ناخۆشە کورد پەرلەمان و حکومەتی هەیە لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە سەیرمان کردو گوێشمان نەدانێ هەموو ئەو ئیفتیـزازەی هەر لەقسەکانی کاك نەوشـیروانەوەو تائـەو منالانـەو تاکۆمیتەکـەو تـا صـندوقەکان هەمووی لای من ئاسایی بوون ئەگەر کەسێك سەیری یاداشت و رۆژانـەی مـن بکـات تـێ دەگـات مـن رەئـم چـی بـووەو نەتیجـەی روداوەکـان بـۆ کـوێ دەروات، لـە ١٩٩٢/٥/٢٧ کۆبونەوە کۆتایی پێهات و من گەرامـەوە لەگـەڵ کـاك مـلازم کـەریم دا بۆکۆبونـەوەی پێـشمەرگە لەهەڵەبجـەی تـازە لـەوێ (٢) سـەعات قـسەم بـۆکردن دەربارەی ئیشوکاری حزب وە ووتم ئەگەر پەرلـەمان و حکومـەتی هـەرێم رەچـاوی خەبات و تێکۆشانی ئێوە بکات بەهەموو تواناوە پشتیوانی لـێ دەکـەین وەئەگـەر نەیکات ئەوکات بریاری خۆمان دەدەیـن لەسـەری حـەقی ئێوەیـەو ناشـبێت حـەقی کەس بخورێـت نزیکـەی (٣٧٠٠ – ٤٠٠٠) پێـشمەرگە لەهەڵەبجـەی تـازە ئامـادەبون برادەرانی یەکێتیش متابەعەیان دەکرد کاك جەمیل هەورامی لەسوچـێکەوە لەگـەڵ هەندێك لەمەسئولەکانی یەکێتی لەدەرەوەی پێـشمەرگەی سۆسیالیـست لەبینایـەك بوون لەوکۆبونەوە تەوژمێکی بەپێشمەرگەداو هێزو تینێکـی بەبـەردا کـردەوە دوای کۆبونەوەکە هەرکەس گەرایەوە سەر هێزو بەتالیۆنی خۆیان ئەو هێـزە گەورەیـەش لەوکاتەدا خۆپیشان دانێك بوو دوای هەڵبژاردن، لە١٩٩٢/٥/٢٨ لەسلێمانی بوین لەو دووسێ رۆژەی کەئێمە مەشغوڵ بوین کاك دکتۆر و کاك عەدنان و کاك عادل مـراد و کاك سەعدعبداللە لەگەڵ کاك شمس الـدین مـوفتی کـاك سـامی داوای لـێ کردوبـون مەسەلەی یەکگرتن بکەن دوای ئەوە کاك دکتۆر و ئەوان دەیانوت کاك سامی داوای

کردووه کاك سامیش دەیوت کاك دکتۆرو ئەوان داوایان کردووه بەلأم من رەئم وابوو کاك دکتۆر داوای کردبێ و کاك سامیش قبولّی کردبێ کاك دکتۆر سەرۆکی یا سکرتێری حزب بێت چونکە کاك سامی ورەی لەدەست دابوو هەر خواخوای بوویچێتە ناو حزبەوه نەك یەکگرتن بێت، لەرۆژی ١٩٩٢/٥/٢٨ بروسکەمان بۆهات کەکۆبونەوەیەك بووه کاك دکتۆر محمود و کاك عدنان و کاك سامی و دکتۆر مجیدجعفر و کاك شمس الدین موفتیشی تێدابووه بۆمەسەلەی یەکگرتن لەگەلّ پارتی گەل دا وادیاربوو ئەو دووسێ رۆژه کاك سامی وپارتی گەل لەئەنجامی تێك شکانیان لەهەلّبژاردن هەروەها برادەرانی ئێمەش هەردوولا تێك شکابوین لەئەنجامی هەلّبژاردن ئەو پەلە پەلە بۆ پرکردنەوەی ئەو شکانانەو هەولّی ئەوەیان دابوو ئەو یەکگرتنە بکەن بەبروسکە من و خالّەحاجی و کاك شیروان وەلأمی کاك رەسولمان دایەوەو وتمان یەکگرتن لەگەلّ پارتی گەلدا دەبێت باسی بکەین ئێمە ناتوانین لەو کۆبونەوەیە بەشداربین ئەگەر ئەشیکەن لەپێشا (٣)ئەندامی سەرکردایەتی بۆ پاسۆك و (٤) یش بۆ گەل دەکاتە (٧) وە(١٤)ش بۆ سۆسیالیست ئەوه (٢١) بەو شێوەیە دەیکەن باشەو ناشیکەن ئێمە پێمان باش نیە... کاك رەسول بروسکەیەکی بۆ کردین و ئەلّێت ئێوه وادیاره ناتانەوێت یەکگرتن بکرێت ئێوه جێگای خۆتانتان لا گرنگە یاحزب و کورد ئەوه ئەزمونێکی نوێ یە لەکوردا گرنگ سەرکەوتنی ئەو پرۆسەیەیە خۆ هەموو سەرکردایەتی ئەوان بن قەبارەی سۆسیالیست دیارەو بەتوندی وەلأمی ئێمەی دابووه، یەکگرتنی سۆسیالیست و پاسۆك پێش هەلّبژاردن بوو هەرچەندە دوای ئەوه کاك عبداللە ئاگرین وتی کاك ملازم کەریم و کاك شوان بۆنارازین لەوەی یەکگرتنیان لەگەلّ سۆسیالیست کردووه دوای هەلّبژاردن لەیەك کۆبونەوه تەنها لقی سلێمانی (٤٠٠٠) پێشمەرگەی هەیە ئێستا کاك ملازم کەریم مەسئولی (٤٠٠٠)، هەموو رێکخستنی پاسۆك

کەمەرکەزی سلێمانی بووە تاراپەرین (٣٥) کەسمان لەهەموو پارێزگای سلێمانیدا هەبووە رێکخستنی گەلیش بەتەئکید ئەو قەبارەیەی نەبووە دەنگەکانیش دیاربوون لەهەڵبژاردن بەلاّم یەکگرتنی سۆسیالیست و گەل پاسۆك یا گەل و سۆسیالیست لەدوای تێك شکاندنی هەڵبژاردن بوو بۆیە پشتی پێ نەدەبەستراو هەمووی لێ ی نارازی بوو دیاربوو هێنانی گەل لەلایەن کاك دکتۆر محمودو هێنانی پاسۆك لەلایەن کاك رەسوڵ ئەویش دەگەرایەوە بۆکێشە بنەرەتیەکەی هەردوولایان و واتێگەیشتبون بەو شێوەیە لەیەك دەبەنەوە یاهەرلایەکیان یەك قوەت بکاتەوە هەرچەندە پاسۆك هەرکاك دکتۆریان پێ باش بوو رۆژێك پەیامنێرێکی بێگانە هات بۆ مقابەلەیەك کاك رەسوڵ خۆی ناساند سکرتێری سۆسیالیست و گەل یا سکرتێری قیادەی هاوبەشی سۆسیالیست و گەل پاسۆك پێان ناخۆش بوو بەلاّم قبوڵیشان کردبوو بەنیازی کۆنگرە و کاك دکتۆر محمود دەربچێت، لە ١٩٩٢/٥/٢٩ لەسلێمانیەوە چوینە رانیە کاك رەسول وتی کاك مەسعود بروسکەی کردووە سەری لێ بدەین، لە ١٩٩٢/٥/٣٠ لەرانیەوە بەرێ کەوتین بۆ شەقلاّوە و مصیف و بۆ مەکتەبی سیاسی پارتی لەگەڵ کاك رەسول و برادەران چوینە لای کاك مەسعود، کاك مەسعود وتی بۆیە حەزم کردوە بتانبینم کەمن پێم ناخۆش بووەو ئێوەش سەبر بکەن تائەو (٤-٥) مانگە و هەڵبژاردن بکرێتەوە هەروەها وتی من پێم باشە لەمەولا پەیوەندی هەردوولا باشتربێت لەجاران و توندوتۆڵ تری بکەین و لەوقسانە رەئیەکانی باش بوو پاشان ئێمە گەراینەوە بۆ شەقلاّوەو چوینە بارەگای لقی هەلێری حزب ئەوکات لەوێ بوو هەر ئەو رۆژە واتە ٥/٣٠ مام جەلالیش هاتە سەردانی لقی هەولێر و داوای کرد کەلە رۆژی ١٩٩٢/٥/٣١ لەشەقلاّوە کۆبونەوەیەکی هەردوو مەکتەبی سیاسی سۆسیالیست و یەکێتی بکەین لەشەقلاّوە و بریار وابوو کاك رەسول و کاك شێخ محمد و من پێکەوە برۆین مام جەلالیش

حەزی دەکرد کەم بین پیّ دەچوو قسەی هەبوو بیکات یەکێتی زانیبوی کاك مسعود بارزانی ناردویەتی بەدواماناکۆبوینەوەتەوە پیّ دەچو هەردولا ئاگایان لە شپرزەیەی سەرکردایەتی سۆسیالیستیان هەست پێکردبو هەرلایەك بۆلای خوی رامان کێشێت کاك رەسولیش لەگەلّ کاك شمس الدین موفتی باسی کرد کاك شمس الدین وای کرد لەجیاتی ئەو (٣)کەسە بوین بە (٨-٩) کەس و چوینە لای مام جەلال ئەو کورسی ومێزە دانرابوو بەشی نەکردو چوینە جێگایەکی ترو هەتا جۆری قسەکان گۆران واتە قسەی مەکتەبی سیاسی و(٢-٣) کە بوو بەو قەڵەباڵغیە بوو بەگلەیی و شتی نێوان کاك شمس الدین و مام جەلال شتی کۆنیان باس دەکرد مام جەلال گلەیی لیّ کردوو ووتی دەنگت بۆمن نەداوە من وام دەزانی دەنگ بۆمن ئەدەیت وەکو رەفیقی کۆن پێم ناخۆشبوو دەنگت نەداوە ئەویش کاك شمس الدین وتی ئێوە خەڵکتان هەبووە دکتۆر محمود فەقیر بووە بۆیە دەنگەکەم داوە بە دکتۆر محمود، پاشان گەراینەوە کاك شمس الدین وتی مام جەلال شەری پیّ دەفرۆشتم لەسەر ئەوە نەبوو دەنگم نەداوەتیّ، خۆشم نازانم لەسەرچی بوو منیش پێم ووت لەسەر ئەوەی ئەو کۆبونەوەی مام جەلال دەیویست تۆ لێت تێکداین و نەتهێشت ئەو هەموو خەڵکەت کۆکردەوە پێکەنی ووتی وایە لەسەر ئەوە بوو نەك لەسەر دەنگ، مام جەلال ئامادەیی خۆی و یەکێتی نیشتمانی دەربری بۆهەموو هاوکاریەك،بۆحزبی سوسیالیست لە١٩٩٢/٥/٣١ لەرانیەوە چوینە مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەشەقلاوە کۆبونەوەی هەردوو مەکتەبی سیاسی هەبوو مام جەلال و کاك رەسولیش بەشداربوون... یەکگرتنی سیّ حزب سۆسیالیست و پاسۆك و پارتی گەل لە١٩٩٢/٦/١ چاوپێکەوتنی تەلەفزیونیمان هەبوو لەسلێمانی، لە١٩٩٢/٦/٢ لەسلێمانی بوم بروسکە هات برۆم بۆرانیە من نارازی بوم لەسەر یەکگرتن لەگەلّ پارتی گەل دا، لە١٩٩٢/٦/٣ (١٣یا١٤) رۆژ دوای هەڵبژاردن

سەرکردایەتی هاوبەشی پاسۆك وسۆسیالیست لەگەڵ پارتی گەل ئەو ڕۆژەش بۆراست کردنەوەی سەرکردایەتی پاسۆك (١٢) کەسیان هێنابوو پارتی گەلیش هەرواو ئێمەش هەر ئەوانەی خۆمان بوین ئەو ژوورە گەورەی مەکتەبی سیاسی لەرانیە جێگامان نەدەبوەوە ئەوەندە زۆربوین کەهاتن هەر چوینە خوارەوە بۆ حەوشەکە بۆ پێشوازی کردن و بەخێرهاتنمان کردن مەسەلەی یەکگرتن وقسەکردن هاتە پێشەوە کاك رەسول و کاك دکتۆر محمودو هەموو سەرکردایەتی جگە لەکاك مەلا ناصیح لەکوردستان نەبوو تەئکید نەبووم چونکە لەدەفتەری بیرەوەری ڕۆژانەم ناوی مامۆستا نەنوسراوە پێ دەچێت ئەو لەوێ نەبووبێت لەو کاتەدا هەموو لایەك قسەی کرد پێش ئەوە لەکۆبونەوەی کۆمیتەی مەرکەزی خۆمان باسی یەکگرتنمان کرد کاك سەیدکاکە وتی من میسالێکم دێتەوە یاد لەئەم یەکگرتنەی کەلەگەڵ گەل دەکەین وا کاك رەسول و کاك دکتۆر دەیانەوێت بیکەن وتمان چۆنە... وتی هێشتا یەکگرتنی خۆمان و پاسۆك تەواو نەکردووە یەکگرتنی چی لەگەڵ پارتی گەل و سامی بکەین وتی کچ شوو دەکات لە(٧)ڕۆژەی باوکی کورەکە بەسواری ولاخ یان ماین دەیباتەوە سواری ولاخەکەی دەکات بوکەکە بایەکی لێ دەبێتەوە زۆر شەرم دەکات و تەریق دەبێتەوە مامەکەی یا خەزورەکەی باوکی کورە دەڵێت ڕۆڵەگیان گوێ مەدەرێ ئەوە نۆبەرەکەت کور دەبێت هەندێکی کە دەڕۆن دەڵێت چی بوو دەڵێت مامە بەخەزورەکەی حەز دەکەم سکی دووهەمیش هەر کوربێت کابرا پێ ی دەڵێت کچم جارێك ئەویانە بەدایك و باوکی گەورە بکەن ئەوکات بیر لەدووهەم بکەنەوە پاشان سەیدکاکە وتی کاك رەسول و کاك دکتۆر جارێك ئەو یەکگرتنەی پاسۆك و سۆسیالیست بەدایك و باوك تەواو بکەین ئەوکات بیر لەیەکگرتنێکی کە بکەینەوە، لە١٩٩٢/٦/٣ یەکەم کۆبونەوەی هەرسێ حزب و سەرکردایەتی هاوبەشی پاسۆك و سۆسیالیست و پارتی گەل لەرانیە لەمەکتەبی

سیاسی سۆسیالیست لەدوای نیوەرۆ دەستی پێکرد من لەوکۆبونەوەیە قسەم نەکرد کاك رەسول وکاك سامی و كاك مولازم کەریم هەموویان هەوڵیان داو پرسیاریان لێ کردم لەسەر ئەو خاڵانە باسیان دەکرد دەیانویست رەئی من وەربگرن لەسەری، ئەوڕۆژە مەبدەئی بریاردرا یەککگرتن بکرێت و بەهەمووان هەرسێ حزب یەك کۆنگرە بگرن و هەر بۆیەش گەل پەلەیان کرد کەفریای ئەو کۆنگرە بکەون چونکە نیازی کاك سامی لەگەڵ نیازی پاسۆك جیاوازبوو پاسۆك نەتیجەی شکان نەبوو بەڵکوپێش هەڵبژاردن بو بۆ ئەوەی پێکەوە دەنگی زیاتر بهینین نیازیان باش بوو بەلام کاك سامی من لەدوای ئەوە بۆم دەرکەوت لەئەنجامی شکان و باوەرلەدەست دان و نائومێدی بەرا دەیەك بوو بۆ پرۆژەیەك بو هەنگاوی بۆئەو رێکەوتنە دەناو پێ دەچوو لەگەڵ کاك دکتۆریش قسەیان کردبێت لەسەر کاك رەسول من دڵنیا بوم کاك سامی پێشتر لەگەڵ پارتی باسی کردبوو ئەو مەسەلەیە نەتیجە ئەو حزبە بەرەو دۆستایەتی یاشتێکی لەوبابەتەی کە کرا بۆپارتی چونکە مەسەلەکان بەرونی دیاربوون وەزعی بەرەو روخان دەچوو ئەو یەککگرتنەی کرد لەگەڵ سۆسیالیست و پاسۆك دا رۆڵی باشی نەبوو لەدوایدا هەرچەندە ئەسڵەکەی دەگەرێتەوە بۆ کاك رەسول و کاك دکتۆرمحمود ئەوان هەردووکیان حزبیان بەجێ هێشت کاك دکتۆر بەبیانوی ئەوەی کەکۆنگرە دواکەوتووەو کاك رەسولیش بەبیانوی ئەوەی رەفیقەکانی خۆی لەگەڵی راست نەبوون وکەم دەنگیان داوەتێ رێگیان فراوان کردبووبۆ کاك سامی کاك سامی پیاوێکی بەتوانابولەبواری سیاسی وپەیوەندیدا من گەرامەوە بۆسلێمانی دوای ئەو کۆبونەوەیە، لە١٩٩٢/٦/٥ لەسلێمانی بوین خاوەنی ئەو خانووەی کەتێیدا بوین لەبەغدادەوە کە سو کاری هاتبوەوەو داوای خانوەکەی دەکرد لەکاتی راپەرین کابرا رای کردبوو لەترسی پێشمەرگە بۆ بەغداد ئێمەش شوێنمان نەبوو ماڵی

ئێمەیان تێکردبوو خاوەنەکەی نەهات کەسوکاری دەهاتن وادیاربوو سەربەیەکێتی بون یەکێتی هانی ئەدان لەناوشار هەرچی هەوڵمان دا جێگامان نەبووماڵەکەی تێ دانێین خانوشمان دەست نەدەکەوت بەکرێ بەکەسوکاری خاوەن خانوەکەمان وت بەکرێ و کرێکەی چەندە دەتان دەینێ بەلام لەمەڵبەندی یەکێتیەوە چەند جار کردیانە سەرمان و تەلەفۆنیان کرد خانوەکەیان بۆچۆڵ بکەین ، لەدوای هەڵبژاردن و بونی یەکێتی لەپەرلەمان و حکومەت لەگەڵ شەخسی ماڵی خۆمان لەوێوە دەستی پێکرد لەسەر کابرایەك کەلەبەغداد بوو زەختیان کردە سەرماڵی من بۆچۆڵ کردن یەکەم هەنگاوی سەرەتای دژایەتی بوو جگەلەوەش رۆژانە لەسەیتەرەو ئەو ناوە کێشەیان بۆ دروست دەکردین خەڵکی زانیان چەند کەسێك هاتن وتیان خانوی خۆمان چۆڵ دەکەین ئێوەی تێبچن کاك دارایش هات خانویەکی داینێ بۆئەوەی تێیبچن بەلام ئێمە تێی نەچوین ئەولوتفی خۆی نواند ئێمەچوینە خانویەك کەبارەگای پێشمەرگەبوو بارەگای هێزی کاژاوبووخانوی کاك محمد محێدین ئەویش رای کردبو لە ترسی پێشمەرگە لە ئازاری ١٩٩١کە دوایش لە سەر داوای یەکێتی وکاك دکتور کەمال فوئاد چۆڵمان کرد دامانەوە کاك محمودجێشانەیی بارەگای بو ئێمە چوینە جێگای ئەوان پاشان لای خانوەکانی مەعمەلی جگەرە لەرزگاری مەقەرێکی جەیشی شەعبی لێبوو سوتابوو وێران کرابوو بەتالیۆنێکی پێشمەرگەی هێزی ئەزمرو محمود جێشانەیی لێبوو ئەوانمان لەوێ لابردوو تەعمیرمان کردو زۆری تێچو بەلام لە ١٩٩١وە لە مانگی ١٩٩١\٣وە جەیش شەعبیەکان لێ دەرکرا بە دەستی خۆمانەوەیە ئەمەیان هی بەعسە کەس خاوەنی نیە ئە گەر یەکێتی گێچەڵمان پێ نەکات جارێکی کە دوای ماوەیەك چوینە ئەو خانووە، لە ١٩٩٢/٦/٦ لەسلێمانی بوین بەگیریان هێنابوین بۆچۆڵ کردنی خانوو ئێمەش خانومان دەست نەدەکەوت، لە ١٩٩٢/٦/٧ لەسلێمانیەوە چوین بۆرانیەو

شەقلاوە و هەولێر شەولەوێ ماینەوە، لە١٩٩٢/٦/٨ لەشاری هەولێر لەبارەگای پارتی گەل کۆبونەوەی هەرسێ حزب و ئیعلان کردنی پارتی گەل بۆیەکگرتن لەگەڵ سۆسیالیست و پاسۆك بوو کاك رەسول و کاك شوان و کاك سامی هەرسێکیان وەکو یەکەمی هەرسێ حزب دیاری کران و قیادەیەکی هاوبەش دیاری کرا، لەسۆسیالیست کاك رەسول و کاك دکتۆرمحمودو محمدحاجی محمود وەلەپاسۆك کاك شوان و کاك ملازم کەریم و کاك عبدالله ئاگرین وەلە پارتی گەل کاك سامی و کاك دکتۆر مجیدو یەکێکی کە بون لەوێ هەریەکەش مقابەلەی تەلەفزیونیان کردو کاك رەسول زۆر ئامادەیی خۆی پیشان داو چەند جارێك وتی من خۆم بەسەربازێکی یەکگرتن دەزانم بەڵام لەوکاتەدا کاك دکتۆر محمود لەدوای ئەوە پەلەی دەکرد بۆکۆنگرەی یەکگرتن و لەوێ باسی ئەوەکرا هەرحزبێك کۆنفرانس یاپلینومی خۆی یاکۆنگرەی خۆی بگرێت و بریاری تەواو بۆ کۆنگرەی یەکگرتن وەربگرێت، هەریەکە لەئاستی خۆی خۆی ئامادە دەکرد بۆ کۆنگرە یا پلینومی خۆی پاسۆك ئەوکێشەیەیان نەبوو گەلیش هەرکاك سامی خۆی بوو زۆر کێشەی نەبوو ئەوەی کێشەی هەبوو ئێمە بوین واتە حزبی سۆسیالیست کە(١١)ساڵ بوو کۆنگرەی نەگرتبوو، (١١)ساڵ بوو کێشەکانی بەسەر یەکدا کەوتبون، (١١) ساڵ بوو لەبۆڵەو رەخنەو گلەیی هەموی کۆبونەوەی ئەوهەموشکیلە لەسەریك ناحەق نەبوو (١١) ساڵ چاوەرێ کردن و ئێستاش خۆ ئامادە کردن لەگەڵ (٢) جزبی کەدا یەك حزبن و کەچارەنوسی نازانرێت کاك رەسول هەوڵی دەدا کۆنگرەی هەر(٣) حزب بۆیەکگرتن تاخیربکات و دوای بخات تاکاك دکتۆر محمود دەرواتە دەرەوە، کاك دکتۆریش هەر پەلەی بووجار جار دەیوت ئەوە کەی کۆنگرەکە دەگرین کاك رەسولیش دەیوت دەیگرین و پەلەمان چیە باپلینومی خۆمان بگرین و بریاری بۆوەربگرین دەست پێدەکەین ئەو رۆژانە

چاوەروان بوین لەوماوەیەدا مامۆستا سەعد لەبەغدادبوولەگەڵ کاک مسعودبارزانی و کاک نەوشیروان وەفدی کوردی عەلی حسن مجیدی دیبو بەتەنها  داوای کردبوو پەیوەندی نێوان حزبی سۆسیالیست و حکومەتی عێراق هەبێت کاک سەعد باسی کردو ووتی پارتی پەیوەندیان هەیە وکاک سامی عبدالرحمن پەیوەندی هەیە و داوایان کردووە چەند جارێکی کەش پێش پەرلەمان داوایان کردبوو کاک رەسول و برادەران تەرحیان کرد لەکۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی داوایان کردبوو بۆ ئاخر جار کاک دکتۆرمحمود بروات بۆ بەغداد ئێمەش لەکۆمیتەی ناوەندی وتمان زۆرباشە بەلاًم لەگەڵ ئەوەش پەیوەندی خۆشمان و عێراقیش باس بکەچونکە بەرەی کوردستانی داوایان لەکاک دکتورمحمود کردبۆئیش بەرەش براتە بغدادولەویش ئیشە کەی حزب کوبونەوەکەی ماموستاسعد عبدولاوعلی حسن مجید جی بەجی بکات جگە لەکاری بەرەی کوردستانی و کورد کاک دکتۆرمحمود نەبۆئەوەی بەرەی کوردستانی نەبۆئەوەی حزب ئامادە نەبوو هەربروات بۆ بەغداد ووتی نارۆم ئەوەبوو بەرەداوای لە کاک سامی عبدولرحمن کرد کاک سامی لەجیاتی هەموو بەرەی کوردستانی رۆیشت بۆ بەغدادو لەجیاتی پەیوەندی کورد پەیوەندی خۆی دروست کردو پارەشی وەرگرت یەکێتی بریاریاندا کەمین بۆ کاک سامی دانێن ئەوپارەیەش وەری گرتوە لێی بسێنن ئاگاداری خاڵە سیدکاکەشیان کردبو ئەویش ئامادەی پیشاندابو کاک سامی قەناعەتی بەیەکێتی کردبو رێگایان لێ نەگرت سیدکاکەش ئاگادارنەکرایەوە کاک سامی گەیشتەوە هەولێر کەمێنی بۆ دابنێن و بگرین لەرێگا وادیاربوو ئاگاداری ئێمەشیان کرد یەکێتی وسەیدکاکەش خۆی حازرکرد لەولاوە بێتەوە حەقی هەکاریشی لێ دەکەمەوە بەلاًم هەرلەوێ یەکێتی رازی کردبوو ئیتر یەکێتی لێ ی بێ دەنگ بون و کۆتایی پێهات لەو سەفەرانەی کاک رەسول لەبەغدادو پاشان کاک دکتۆرکاتێ لەدەرەوە بوو دژی گفتوگۆ قسەی دەکرد

بەلآم کاتێ کەگەرایەوە بۆ کوردستان خۆی چوو بۆ بەغداد بۆ گفتوگۆ لەبەغداد سەرجەم هەموی بەکاك دکتۆرو کاك عدنان یەك ملیون دیناریان هێنابووەوە بۆحزب هێنایان لەشەقلاوە تەسلیم بەکاك رسول یان کرد شتێکی کەمی لێ سەرف کرابوو کاك رەسول بەنابەدڵەوە وەری گرت و ووتی کەمە بۆ هێناوتانە برادەران دەیانوت خۆی (٤٢) رۆژ لە بەغداد بووە جانتاکەی خۆشی لەبیرچووە هێشتا نارازیە بەیەك ملیون دینارمان هێناوەتەوە لەچاوی لایەنەکانی کە هیچ نەبوو وابزانم وەفدەکە هەموی دەمانچەو شتیان بەهەدیە دابونێ لەبەغداد دوای بیستم، لەمانگی ١٩٩٢/٦ دا عەلی حسن مجید نامەیەکی بەکاك سەعد دا بۆ کاك رەسول نوسیبوو داوای لێ کردبوو سەری بەغداد بدات و ئامادەیی هەموو هاوکاریەك ئەو ماوەیەش کاك رەسول لەبەغداد بووە وەکو پێویست قسەیان نەکردووە لەبەر جەنجاڵی ئیعتزار ی هێنابوەوە خۆی لەئەسلا کاك رەسول گوێی نەدابووە کۆبونەوەی حزب و ئەوانیش پێ دەچێت پشت گوێیان خستبوو چونکە یەکێتی و پارتی لەوێ بون و گوایە بریار لای ئەوانە کەیەکێتی و پارتی گەرانەوەو هەڵبژاردن کراو حکومەت دروست دەکەن و پەرلەمانیان هەیە و ئێمە دەرنەچوین وادیاربوو ئەوانیش ئیشیان بەئێمە هەبوو داوایان کردبوو نامەیەکی رەسمی بەناوی وەزیری بەرگری و سەرۆکی وەفدی حکومەت بۆگفتوگۆ لەگەڵ وەفدی بەرەی کوردستانی دا کاك رەسول خۆی دەیوت من نارۆم و برۆم لەم کاتەدا دەسوتێم و خراپە کاك دکتۆرمحمود داوامان لێ کرد وتی من نارۆم و کاغەز بۆ رەسول هاتووە خۆی بۆ ناروات من نارۆم و بایەکێکی کە یاشێخ محمد بروات، لە ١٩٩٢/٦/٩ لەهەولێر بوین لەگەڵ کاك رەسول کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتی سۆسیالیست کرا لەسەر مەسەلەکان و چی بکەین و هەنگاوەکان چۆن دەست پێ بکەین ئەو چەند رۆژە کاك شمس الدین لەنێوان گەل و سۆسیالیستدا بوو کاك رەسول بەبێ کاك شمس الدین

هەتازۆر جار لەسەفەریش هەر پێکەوە یاسەری لێ دەداو راوبۆچونی وەردەگرت، لە ١٩٩٢/٦/١٠ کاك رەسول باسی کردو نامەی پیشان دام دوای ئەوەی هەموو برادەران کەس نەچوبوو بۆ بەغداد لای من باسی کردو ووتی من پێم باشە ئەو پەیوەندیە هەبێت و لەنامەکەش دا ئیشارەتی دابوو کەلەساڵ رۆژی عیدمیلادی سەرۆك دا واتە صدام حسین کۆمەڵێك سەربازی عێراق سجن بووە کاك رەسول بەری دابون بەو بۆنەیەوە ئەوەش لای سەرۆك گرنگ بوو منیش ووتم باشە کاك رەسول تۆ نامەت ناردووە برۆ کەدەزانی من بەرێت دەکەم وتی لەم کاتەدا من وەکو بەرپرسی یەکەم چونم بۆ بەغداد مصلحەت نیە کاك دکتۆر ووتی پێم ووتوە ناروات ووتم کاك شێخ محمد و کاك سەعد و کاك عمر بۆتانی و کاك سەیدکاکە ئەوانە بابرۆن ووتی نارۆن ووتم چی دەڵێت ووتی تۆ بۆ نارۆیت ووتم کاك رەسول من نەعەرەبی دەزانم و نەلەسیاسەت زۆر سەر دەردەکەم.. ووتم سێ کەس ئاگریان دەکردەوە یەکێکیان لێوی کەل بوو پێیان دەوت فوو لەئاگرەکە بکە واتە بەلێو کەلەکە فویان دەکرد ئێوەش ئەو هەمووسەرکردایەتی رۆشنبیرو زمان زانە بۆ فوو بەمن دەکەن ووتم باشە من حزب چیم پێ بلێت دەیکەم بەلام باکۆبونەوە بریاری بدات چونکە ئەوە دەبێت تەرح بکرێت لەکۆمیتەی ناوەندی یائەوەی زەرورن لەوێ بریاری دا هەرکەسێك بروات بابروات ووتی باشە و لەسەر ئەوە قسە بکەین، لە١٩٩٢/٦/١١ هەرکۆبونەوە هەبوو لەسەر روداوەکان ئەوکات قسەمان کرد، پاشان من لەهەولێرەوە لەگەڵ کاك شێرزاد شەهید قادرمستەفاوکاك سەید عبدالله کەردزیو عەلی بچکۆڵ بەسەیارەکی سۆپەری سوور ی کاك عمری مام علی لەرێگای مخمورەوە لەسەعات (١٠)ی چوین بۆ بەغداد لەسەر داوای حکومەتی عێراق لەنزیك سەیتەرەکە برادەران گەرانەوە من و کاك عمر برای کاك نوری حمە عەلی و برادەری نێوانمان رۆیشتین و لەوێ هەموو مسئولینی کەرکوك و جەیش

لەوناوە فرقەو فەیلەق و مخابرات و ئەمن و استخبارات و ئیداری چاوەروانیان دەکرد ئێمەش چوینە لایان و بەرێ کەوتین بۆ کەرکوك و لەوێش لەپاش ئیسراحەتێکی کەم بەرێ کەوتین بۆ بەغداد لەوێش ئەبو محمد یا وەلید و مدیری شوعبەی ٣و موخابراتی گشتی ئەبو صالح ومدیری ئیستخباراتی عەسکەری عێراق و زۆری کە پێشوازیان کردین، لەسەعات (٢/٤٥) دەقیقەی رۆژی ١٩٩٢/٦/١٠ کۆبونەوەمان هەبوو لەوەزارەتی دیفاع لەگەڵ عەلی حسن مجید کەوەزیری دیفاع بوو وەئەبو صالح مدیری موخابرات و ئەبو ولید شعبەی ٣ و رائید ئەبو زید یازیاد هاتبوو بۆ پێشوازیەکە لەنزیك دیجلە لەسەر ئاوی دیجلە ئێمەیان لەخانوویەك دانا لەسەر دیجلەو وتیان پێشتریش وەفدەکەی بەرەی کوردستانی کاك رەسول و کاك دکتۆر محمود و پێشتریش مام جەلال و کاك مسعود بارزانی و ئەوان لێرە بون، لەرۆژی ١٩٩٢/٦/١١ لە سەعات (١٠/٤٥) دەقیقە لەوەزارەت و هەمان وەفد کۆبونەوەیەکی (٤-٥) سەعاتی کەش کرا لەسەر هەموو روداوەکان لەو کۆبونەوەیەدا زۆر دژی مام جەلال بوو، وتی جەلال تاڵەبانی خائینە منیش وتم مام جەلال خائین نیە ... وتی کورد خەڵکی خراپی زۆرتیایە.. ووتم عەرەبیش خەڵکی خراپی زۆر تێدایە ئێوە بەکیمیاوی و ئەنفال وجەیشی سودانی وکویتی تان چەکدار کردووە و میسریەکانتان چەکدارکرد و(٣٠٠) هەزار جاشی کوردیش بەهەمووچەك و ئیمکانەتان دژی کورد بەکارهێنا ئێوە دەوڵەتێکی گەورەن چۆن سودانی یا فەلەستینیەکان کەقوتابی بون لەزانکۆ کردبوتان بەجاسوس بەسەر کوردەوە کوردیش حەقی خۆیەتی پەنابەرێ بۆئێران و هەرکەسێ بەگوێ ی بکات دژتان بەکاری بهێنێ بەڵام خۆ کورد وەکو عەرەب لەسەر حیسابی خۆی بێگانەی نەهێناوەعێراقی پێ بکوژێت کەچی سعودیە لەسەر پارەی خۆی لەدوای شەری دووهەمی جیهانیەوە ئەمریکا دەستی لەکەنداو براوەو بەهەزاران ملیار دۆلاری

سەرف دەکرد تابگاتـەوە کەنداو بـەلاّم زۆر بەئاسـانی سـعودیە وهاوپەیمانـەکانی مصاریفی ڕێگایان بۆ کردن وباشترین باریان کەلەگەڵ ئاو هەوای ئەمریکادا بگونجێ وتەنانەت راقیسەیان بۆ هێناون بۆئەوەی بێ تاقـەت نـەبن و مێشکیان باش ئـیش بکات و شەر ئێوەو عێراقـی پـێ بکوژن لەسـەر حسابی خۆشـیان ئـەوەی عـەرەب کردویەتی دژی عەرەب کورد نەی کردووە ئێوە هەمیـشە زوڵمتـان لـەکورد کـردووە کوردیش حەقی خۆیەتی پـەنا بۆهەنـدێك شـت بـەرێ ئـەم قـسانەی مـن لای ئـەوان تەسجل کراوە ئەبو صالح و ئـەبو وەلیـدو مامۆسـتای نێـوان و هـەموویان تەنانـەت عەلی حسن مجیدیش شایەتی قسەکانی مـن و لەسـەر کـەرکوکیش زۆر قـسەم کـرد هـەروەها لەسـەر فیـدراڵیش قـسەم کـردووەو بەڵگـەم (موستەمـسەك)م هەیـە لەوبارەیەوە واتە ئەوەی شـتی بـاش بـوو باسـم کـرد وادیـاربوو ئـەویش قەناعـەتی بەقـسەکان و رەئیـەکانی مـن هـەبوو، ووتـی ئـەو وەفدانـەی بـەرەی کوردسـتانی (٨٤)رۆژ لێرە بون ئەو شتـانەیان بـاس نـەکردووە...منـیش وتم ئـەو قـسانەی مـن رەئی هەموو کوردەو من رەئی کـوردو خۆشـم لێـرە دەڵـێم و وەفـدیش لێـرە بـووە بەزمانێکی کـەی دیبلۆماسیەت باسـیان کردوبێـت مـن قـسەکانم کـرد بـەلاّم هەرلـە مدیری موخابرات و نێوانمان برادەرانی کەلەگەڵم بـون هـەمو ئەترسـان و هـەموییان لەرەدی ئەوان بەلاّم من بـێ منـەت بومم قـسەی خۆشـم کردوبەتونـدیش لـەوەلاّمی نامەیەکیان دا کردووە، لەشەوی ١٠-١٩٩٢/٦/١١ هـەر قسەو کۆبونـەوەمان هـەبوو (٣) سەعاتی خایاند، رۆژی ١٩٩٢/٦/١١ رۆژی جەژنی قوربان بوو من لەبەغداد بـوم ، لە١٩٩٢/٦/١٢ ئیسراحەت بوم، لە١٩٩٢/٦/١٣ لەبەغدادەوە بـۆ کـەرکوك و نـانی نیوەرۆمان خوارد سەیارەکەی خۆمان لەوێ جێ هێشتبوو هێنامان و لەگەڵ هـەمان وەفـددا بـەرێیان کـردین تاجێگـای خۆمـان و لـەوێ کـاك شـێرزادی شـەهیدقادر مستەفاچاوەرێی دەکـردین و ئـەو لێپرسـراوی ئـەو نـاوەبوو پاشـان گەراینـەوە بـۆ

هەولێرو کۆیەو رانیە بۆلای کاك رەسول جیهازێکی راکاڵیان ناردبووپەیوەندی ڕۆژانەمان و هەموو رۆژێك (٣) جار پەیوەندی هەبوو لەگەڵ کاك رەسول کورێك لەسەر جیهازەکە بوو خزمی کاك رەسول بوو ناوی کاك صابر بوو دوای ئەوە لەرانیەوە گەرامەوە بۆ سلێمانی، لە٧/٦/١٩٩٢ لەرانیە کۆبونەوە بوو کاك عمر بۆتانی و کاك شێخ محمد و کاك سەید کاکە و کاك سەعدیش بووکاك دکتۆر محمود وتی من نارۆم هەموو کۆمیتەی ناوەندی ئامادەبون کاك رەسول مەسەلەی تەرح کردو ووتی ئەوە نامە هاتووە و کێ دەروات بروات کاك شێخ محمد وتی من ماڵم لەئێرانە و هاتوچۆدەکەم و توشی کێشە دەبم کاك عمربۆتانی ووتی من ماڵم لەسوریایەو خۆشم لەبادینان و بەدەستی پارتی یاسوریا یەکێکیان لەناوم دەبەن کاك سەعدیش ووتی لەم کاتەدا یەکێتی و پارتی شەرمان پێ دەفرۆشن ئەوەش بزانن هەر تیا دەچین بەتایبەتی کوسرەت رەسول عەلی بزانێ دەمکوژێت و لەناوم دەبەن کاك رەسول ووتی خۆ منیش نارۆم و ئەگەر وابکەن وشتێك مصلەحەتی کوردی تێدا بێت نەیکەن من ئیستقالە دەکەم لەحزب پاشان رویان کردە من و وتیان ئەو بۆ ناروات ئەوان قەناعەتیان وابوو من لەبەر ئێران و یالەسەر قسەی ئێران نەبێت هیچ ناکەم و لەسەر زۆرشتی کە من هەرگیز روو لەبەغداد ناکەم بەوەی کەئەوان قەناعەتیان نەبووبەپێچەوانەوە من زۆر ئاسایی ووتم پێشمەرگەی حزبم منیش ماڵم لەئێرانەو وەئیلتزاماتی من لەهەمووتان زیاترە لەگەڵ ئێران زیاتر لە ٦٠٠ماڵی پێشمەرگەمان لەئێران بو لەسەر سنورەکان بون جگە وەکو حزب وەکو شەخسیش بەلام بریاری حزب لای من لەهەمووشت گەورەترو بەهێز ترەو من لەپێناوی حزبدا خۆم بەکوشت دەدەم ماڵ و مناڵ پەیوەندیەکیان هەیە دەگیرێن ناگیرێن سجن دەبن نابن لەسەر کوردو شۆرش ئاسایە لای من ئەگەر بریار بدەن هەرئێستا دەچم بۆ بەغداد وەهەرچی جێگای کەش دەڵێن لەوانەیە ئێوەو عێراقیش

تەوەقوعی ئەوە نەکات من برۆمە بەغدادو ئێرانیش تەوەقوع نەکات بەلاّم من لام ئاساییە چەند جارێك برۆم کاك رەسول بێ دەنگ بوو لەو قسانە دوای پێ ی ووتم زۆر سوپاست دەکەم لەوێ بۆیە باسم نەکردوە وابزانن جارێك هەموو وەستاوە پێم باشە باکەس نەزانێ سەفەر بکەیت و هەموو تەئمینی رێگا و ئەوانە کراوە سەعات و کات دیاری کراوە برۆیت لەبەغدادیش عەلی حسن مجید ووتی هەرگیز باوەرمان نەبوو تۆ بێتە بەغداد ئەوەندەت شت لەسەر وتراوەو نەشمازانیوە سەر لەسیاسەت وادەر دەکەیت منیش ووتم کەباسی کیمیاوی و ئەنفالیان کردووەو ئێستا لەقسەدا ئەوەندە نەرمو ونیان و لەسەرخۆو بێ بەوریانە قسە دەکەیت تەوەقوعم نەکردووە وابیت، لەئێوارەی ١٩٩٢/٦/١٣ من چومەوە بۆ سلێمانی، لە١٩٩٢/٦/١٤ لەسلێمانی بوم لەماڵەوە مێوانمان هەبوو، لەرۆژی ١٩٩٢/٦/١٥ برایەکی کاك مستەفا صالح کەریم یان کوشتبوو چوینە تەعزیەکەی زۆرم پێ ناخۆش بوو کاك مستەفا پیاوێکی باش و کورد پەروەرو دڵسۆزو نوسەرێکی بەتوانای کوردو پیاوێکی بەکەڵك بووە لەپێش چاپی دووەمی نامیلکەی شۆرش و پێشمەرگایەتی دا پێشەکی بۆ نوسیوم بەناوی (لاوك)ە وە لەوکاتە وابزانم کورەکەی لەبەغداد دەیخوێند بەناوی خۆیەوە نەی نوسیبوو یالەبەر هۆیەکی کە براکەی ناوی کاك قادر بووبەناحەق لەماڵی خۆی دابوو هەربەدەستی هێزە کوردییەکان دەسەلاّتدار کوشتبویان گوایە کاك قادر نامەو معلوماتی ناردووە بۆ عێراق من لە هەرهەنگاوێك دا بۆهەر ئیشێك لەهەموو ئەو کارانەی کردوومە هەمووسەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی حزبی سۆسیالیست ئاگادار بووەو هەتا کاك رەسول پێ ی ناخۆش بووە لای هەندێك لەبرادەران باسی بکەم من نەم شاردۆتەوە لەکەسیان و لەلای برادەرانی خۆم لەلقی سلێمانی ئەوەی پێویست بووبێت لێ ی ئاگادارم کردون چونکە هیچ شتی شەخسی نەبووە حزبیش کاك رەسول ئیشارەتی بەکاك مسعودومام جەلال داوە لەهەندێك دا لەسەر ئەوە

یەکێتی دژایەتی دەکردین من زۆرجار ئیشارەتم داوە بەمام جەلال نەك واتێ بگەن کەئێمە شت دەشارینەوە یالەپشتەوە دەیکەن وەکو حزبێکی خاوەن هەڵوێست لەسەر روداوەکان وەکو حزبێکی سەربەخۆ و خاوەن بریاری خۆمان هەر کارێك هانگاومان بۆ ناوەو کردومانە لەبەر ئەوەش بووە واتێ نەگەن من شەخسی ئەو شتانەم کردوە بەڵکو یەك نامەی عێراق هاتبێیت یاخود شتێکی گرنگ هبو بێت چ لەبەرەی کوردستانی وهەر بوارێکی کەدا لەهێزە سیاسیەکانمان نەشاردۆتەوە هەموو سەرکردایەتی حزب بینویەتی نامەی عەلی حسن مجید جگە لە برادەرانی خۆمان مام جەلال یش سەیری کرد وتی با ئە ونامانە نەفەوتی شتی مێژوی تێدایە خەڵکی نازانێ تۆ داوای فیدراڵیت کردووە کە ئەوکات زۆر کەس ناوی فیدراڵی نەبیستبو منیش وتم بانوسخەی لای جەنابیشت بێت هەر لە قەلاچوالان فۆتۆکوپی کرد بۆ مام جەلال وە هەرچیم لەگەڵ ولاتان کردبێت هەموو سەرکردایەتی ئاگادار بووە، لە ١٩٩٢/٦/١٦ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتین بۆ سەیدصادق ونالپارێز نزیکەی (٣)هەزار دیلمان لابوو لەنالپارێز بون ئێمە داوای ئەو (١٩) کەسمان دەکرد کەسجن بون لەئەبوغرێب کە حوکمی (٢٠) ساڵ درابون داوام کردن و موافەقەتیان کرد دوای کاك رەسول نەی هێشت داوای قائیمەو تاریخی گرتن و ناویان کرد بیان دەبینێ کاك رەسول پێ ی خۆش نەبوو بەربەست و تێ نەگەیشتم مەبەست ئەوەبوو ناوەکان بدەین کەشف دە بن زیاتر نەوەك ئیعدامیان بکەن یابەربونەکەیان ببێتە دەنگوباس یاهەرپێ ی خۆش نەبوو لێ ی تێنەگەیشتم هەرچەندە دوای ئەوە (٥)کەسیان ئیعدام کردخەڵکی قەرەتەپەی لای کفری و گوندەکانی دەوری لەیلان بون سەربەحزب بون ، ئێمە لەنالپارێزەوە چوینە پێنجوێن و بۆ چوارباخ و بۆ بلکیان و گەراینەوە نالپارێز پاشان چوینە زەنگی سەرو خەرنوك و سیامێوە بۆ ماڵی شەهید حاجی عبدالله سەردانی منالەکانی و خێزانە بەرێزەکەی ئامنەخان کرد

و گەراینەوە بۆسلێمانی، شەوی ١٦-١٧/٦/١٩٩٢ لەماڵی کاك توفیق بوین، لە١٧/٢/١٩٩٢ چومە رانیەوگەرامەوە بۆ سلێمانی لەسەر بروسکەی کاك رەسول بۆ ئیشوکاری حزب، لە١٩/٦/١٩٩٢ لەسلێمانیەوە چومە پێنجوین و باشماغ ومریوان و سنندج (سنە) بۆماڵەوە ماڵێکمان لەوێ بوو، لە٢٠/٦/١٩٩٢ هەر لەسنە بوم، لە٢٢/٦/١٩٩٢ لەسەر بروسکەی علاقات بۆ کرماشان چوم بۆکۆبونەوە لەگەڵ لێپرسراوانی ئێران و گەرامەوە بۆ سنە، لە٢٤/٦/١٩٩٢ لەسنەوە بەرێ کەوتم بۆ مریوان و پێنجوین و سلێمانی مناڵەکانیشم لەگەڵ خۆم هێنایەوە بۆ سەردان لەسلێمانی بوین، لەرۆژانی ٢٥و٢٦و٢٧/٦/١٩٩٢ هەر لەسلێمانی بوین دەوامی کاری ئاسایی خۆم دەکرد، لە٢٨/٦/١٩٩٢ لەسلێمانیەوە چوینە هەڵەبجەو گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٢٩/٦/١٩٩٢ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتم بۆ رانیە کۆبونەوەی هەر(٣) حزبی هاوبەش هەبوو، لە٣٠/٦/١٩٩٢ هەرکۆبونەوە بەردەوام بوو بەقەدەر حزبی شیوعی چینی ئەندامی کۆمیتەی مرکزیمان هەبوو ئێمە لەهەموویان سەرکردایەتیمان کەمتر بوو چونکە (١١)ساڵ بوو کۆنگرەمان نەگرتبوو وەزۆریان شەهید ببوون و هەندێکیان بەم لاولادا رۆیشتبون هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی سۆسیالیست (١١)کەس مابونەوە کە بریتی بوون لە(کاك رەسول ، سەیدکاکە، کاك عدنان، کاك عادل، کاك سەعد، کاك ئەمین، کاك قادر، کاك شیروان، کاك مەلاناصیح، محمد حاجی محمود، کاك شێخ محمد شاکەلی) لەکۆنگرە لەشاربوو بەلام وتیان برادەرمان هەیە لەشارە دەنگی بدەنێ وە ئەوانەشمان شەهید ببوون (سەیداصالح یوسفی، کاك شێرکۆی شێخ عەلی، کاك ئەحمەد فەقێ رەش، کاك قادر شۆرش) هەروەها ئەوانەشمان رۆیشتبون کاك محمد فاتیح (مامۆستاعمر) تەسلیم بەعێراق بوەوە مەسئولی لقی سلێمانی بوو لەدەرەوە وازی هێنا، کاك قادرعزیز جیابوەوە، کاك عبدالخالق زەنگەنەش جیابوەوە، کاك

حاجی حاجی ابراهیم خۆی هەڵنەبژاردبوو، کاك دکتۆر محمودیش لەکۆنگرە خۆی هەڵنەبژاردو دوای بەبریاری کۆمیتەی ناوەندی بون بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی دوای کاك حاجی چوە لای پارتی و پاشان بۆلای یەکێتی کاك دکتۆریش لەوێ بوو کاك عمربۆتانی و کاك نیزامەدین مان بەبریاری کۆمیتەی ناوەندی کرد بەئەندامی احتیاتی کۆمیتەی ناوەندی دوو برادەری کەشمان احتیات هەبون وازیان هێنا ئەوانیش کاك هوشیار ئێستا لە سویدەو کاك وریا هیوا بهجت پیاویکی باش ورۆشنبیر بوو ئێستا لەئەڵمانیایە بەڵام پارتی گەل زۆریان سەربازی فیرار بون جگە لەهەندێکان وکاك صالح وکاك رێکار ودکتۆرمجیدو کاك بروسك و کاك مجید رزگاری و کاك عادل وهەندێکی کە یان جگە لە کاك پالە وکاك عبدالله صالح و کەسانی باش وپێشمەرگەی کۆن بون ئەوانیان سەربازی فیرار بون کاك سامی کردبونی بەئەندامی سەرکردایەتی وەپاسۆك بۆ راست کردنەوەی تەوازن لەهەر جێگایەك کەسێکیان دەست کەوتبوو بەهەڵەداوان بەدوایدا و دەیان کرد بەئەندامی سەرکردایەتی هەرماوەیەك کەسێکیان دەهێناو نەمان دەناسی کێ یەو چۆن هاتووە، لە٣٠/٦/١٩٩٢ هەردوای کۆبونەوە گەرامەوە بۆسلێمانی، لە١/٧/١٩٩٢لەسلێمانیەوە چوینە هەڵەبجەی تازە بۆ پرسەی کاك تۆفیق فرج علیاوایی زۆرم پێ ناخۆش بووپیاوێکی باش و لەکاتی پێشمەرگەیەتیدا زۆری خزمەت کردبوین، لەساڵی ١٩٩٢ نوێنەری حزب لەسوئید لەبنیاتەکانی هەڵەبجە لەدەرەوەی وڵات بەشداربوو لەگەڵ کاك عادل مراددا و پاشان لەگەڵ سەندیکای کرێکاری ئیتاڵیاو سەرۆکی شارەوانی شاری مەرزەبۆتۆی ئەو وڵاتە رێکەوتبون پارە بدەن بەهەڵەبجە لەرێگەی نوێنەری حزب بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەك چوینە هەڵەبجەو لەوێ کاك دکتۆر محمود بەردی بناغەی داناو بە ناوی مەرزەبۆ تۆ وە منیش سەرپەرشتیم دەکرد لەگەڵ کاك کامیل و کاك اسماعیل حاجی ئەحمەد مهندس بون لەگەڵ کاك کامیل پێکەوە لەپارەکە

مەکتەبەکەیان تەواو کردو وتیان پارە ماوەتەوە بەلأم نوقسانی هەیە ئەگەر ئێوە جێ بەجێ ی بکەن ئەتوانین قوتابخانەی ناوەندنی کچانی هەڵەبجەشی پێ دروست بکەینەوە منیش وەعدم دا کەهەرچی نوقسانە من بۆیان جێ بەجێ بکەم چونکە هەڵەبجە حەقی لەسەر هەمووومان هەیەو پێش ئەوەش وەکو کۆمەك بۆ چاك کردنەوە سەیارەکم دا بەدائیرەی تەلەفۆنی هەڵەبجە و سەیارەکم بەدائیرەی کارەبای هەڵەبجەی تازەو ئاوی بێستان سوریشمان دووجار چاك کردەوە بۆهەڵەبجەو ئەو قوتابخانەیەش نوێنەرەکەمان پارەکەی هێنا نزیکەی (٣٧)هەزار دۆلار بوو لیژنەیەك لەهەڵەبجە دروست کرا کەسەرپەرشتی ئەوکارە بکات کاك شێخ نجم الدین سەرپەرشتی دەکرد، لە١٩٩٢/٧/٢ چوینە هەڵەبجەی شەهید بەئامادەبوونی کۆمەڵێك مامۆستای قوتابخانەو پیاوە ناسراو رۆشنبیرانی هەڵەبجەو لایەنەکان و لقی سلێمانی حزب و ناوچەی هەڵەبجەی حزب بەردی بناغەی قوتابخانەی ناوەندی کچانمان داناو لەسەر داوای سەندیکای کرێکارانی شاری مەرزەبۆتۆی ئیتالی ناومان نا قوتابخانەی ناوەندی کچانی مەرزەبۆتۆ کەیەکێکە لەو شارانەی وەکو ناکازاکی و هێروشیمای ژاپۆن هەڵەبجەیش، لەسەر دەستی نوێنەری حزبدا بوو بەدەستە خوشکی ئەو (٣) شارە جیهانیەو دیاری دەستە خوشکی ئیتالیا کاك عەلی حمە لیواشی شیعرێکی خوێندەوە کەکۆن شیعرێکی وتبوو

ئاواتی بەرزم کوردە سەرکەوێت...
سێبەری ئالأی سەر سەرم کەوێت
تەختوتاراجی سنوری دەست کرد
بەرزۆری بازوی گەلی کورد کەوێت.

من کاك عەلیم نەدیبوو ئەو رۆژە دیم زۆرم پێ خۆش بوو هەڵەبجە یەکێکە لە و شارانەی لەبواری ئەدەبدا دەوری دیاری هەبووەو چەندین کەسایەتی تێ هەڵکەوتووە وەکو نالی و مەولەوی و تاهیر بەگی جاف وسەیدی هەورامی و ئەحمەد موختار جاف و قانع و مەلا حەسەنی قازی و شێخ حەمە ئەمین (کاردۆخی) و حەمە صالح هەژار و عەلی حەمە لیواش و (بێوەی) شێخ ئەمین نەقشبەندی و عبدالله بەگ ( گۆران) ی داهێنەری شیعری نوێ بۆیە هەڵەبجە لە بواری ئەدەبی سیاسی رۆشنبیری ئاوەدانی کۆمەڵایەتی ئابوری جوگراف شۆرشگێری فیداکاری ئاو هەوا واتە هەڵەبجە مێژویەکی بۆ کورد دروستکردەوە لەوەزیاتری پێوستە باسی لەسەر بکەین زۆری شاعیرەکانی کەش سەر چاوەی شیعرە کانیان لە هەڵەبجەوە هەلگرتوە ئەگەر سەیری شیعرەکانی بێکەس بکەیت باسی سەرچاوەی زەڵم وزەردیان و شارەزوور ئەکەن شاکرفتاح و عەلی باپیر ئاغاومەلا ئەحمەدی قازی و زۆری کەی شاعیرەکانی ئەوکات ، پێنجوێن و دەربەندیخان سەر بە هەڵەبجە بوە کە دەیان شاعیری هەلکەوتو لە پێنجوێن و شوێنەکانی کە هەیە چەندین شاعیری میللی وەکو حسێن نادر خامۆش جگە لە چەندین شاعیری لاوی تازە پێ گەیشتووی سنوری هەڵەبجە وەك ئیسماعیل خورماڵی و...هتد، جگە لە پێنج هەزار شەهیدو بۆردومانی ٢٦/٤/١٩٧٥وگوللە بارانی ١٣ هاولاتی لە گردی جقلاوای لای خورماڵ ساڵی ١٩٦٣وگوللەباران کردنی ٣٥هاولاتی گوندی سیارەی لای عازەبانی شارەزور و سوتاندنی زۆربەی گوندە کانی شارەزور لە ١٩٦٣ومەفرەزە سەرەتایەکانی هەردووشۆرشی ئەیلول وشۆرشی حوزێران یاشۆرشی نوێی کوردستان ١٩٧٦ دوای ئەوە هەردوو ئەندازیارو لیژنەکە دەستیان بەکار کردو کەچەند جارێك کەمو کوری هەبوو جارێکیان (٦٠)هەزار دیناربوو بۆمان سەرف کردن و قوتابخانەکەیان کۆتایی پێ هێنا واتە پارەی یەك

قوتابخانه دوو قوتابخانەی پێ دروست کرایەوەو زۆری کەش پارە دەهات کەس نەیدەزانی چی لێ دێت ئاوی باوەکۆ چەکی هەڵەبجەمان چاك کردەوە پاشان ئێمە گەراینەوە بۆسلێمانی، لەرۆژی ۱۹۹۲/۷/۳ چوینە هەولێر کۆبونەوەی هەر(۳)حزب هەبوولەهەولێر کۆبونەوەکە بەردەوام بوو تارۆژی ۱۹۹۲/۷/٤ پاشان ئاگادار کراین کە خانم میتران دێت بۆ کوردستان و لەشەقلاوە دەنشێتەوە ئێمەش چوین بۆ پێشوازی کاك مەسعودو هەموو لایەنەکان هاتن وەحزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش لەوێ بوون وەخەڵکێکی زۆر لەشەقلاوە پێشوازێکی بێ سەروبەری لێ کراو کەس بەکەس نەبوو هەرکەسە رای دەکردە پێشەوە خانم میتران و مستەر کۆشنەر وەزیری تەندروستی و ئینسانی فەرەنسا لەوێ دابەزین و پاشان ئێمە گەرانیەوە بۆ سلێمانی و ئەوانیش لەوێ مانەوە لەهەولێر.

## ئامادەکاری بۆ یەکگرتن و قەیرانی ناوخۆی حزب

لە۱۹۹۲/۷/٥ لەسلێمانی هەموو لایەنەکان و مام جەلال پێشوازیەکی گەرمیان لەخانم میتران و مستەرکۆشنەر کرد لەدەروازەی سلێمانی پاشان بۆ ئوتێل ئەبوسەناو هەندێك قسەکراو ئێمە گەراینەوە لای خۆمان بەرەی کوردستانی داوایان لەمن کرد لەگەڵ خانم میتران وئەوان سەردانی هەڵەبجەو شارەزوور بکەم، لە۱۹۹۲/۷/٦ بریار وابوو زوو دەربچین و بەرێ بکەوین من ئەوکات جگە لەوەی ئەندامی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی بوم و سەرپەرشتی کارگێری بەرەی کوردستانی لەسلێمانیشم دەکرد و جارجار سەرم لێ دەدان بەلام خاڵەحاجی نوێنەری حزب بوو لەبەرەی کوردستانیدا لەسلێمانی لەئوتێل ئەبو سەناوە سەعات (۸/۳۰) بریاربوو بە رێ بکەوین نیوسەعات تاخیر بوون خانم میتران و مستەرکوشنەر لەسەیارەیەك بوون لەپێش ئێمەوە دووسێ سەیارەش حمایە بوون پیکابێکی دەبڵ کابینە پێشمەرگەی سۆسیالیست هەر لەهەولێرەوە

لەگەڵیان بـون گەیشتە لای هولوبـە وزێرینـوك هەرلـەوێ سـەیارەی ئـەوان تێپـەری پاسێکی (٢١) نەفەری یاکۆستەر سوتفەی ئەو ناوەی کرد لەگەڵ دەبڵ کابینەکەی سۆسیالیست لەهـەولێرەوە هـاتبوو سـەیارەی خـانم مـیتران تێپـەری سـەیارەکەی ئێمـەش نەگەیـشتبووە ئاسـتی بـەلام سـەیارەکان سـەریع بـوون ئێمـە ئەگـەر نەوەستایەین دەماندا لەو سەیارەی ئەوان لێیـان دابـوو لانـدکرۆزێکی کۆنی سـپی مودێل ١٩٧٩ لەدەستی راستی جادەکەوە لەسلێمانیەوە دەرۆیشت بۆهەڵەبجە لـە (١٠)مەتری جادەکەدا تەقیـەوەو بـەری پاسـەکە کـەوتبوو لەسـەیارەکەی حمایـەی مـیتران کەپێـشمەرگەی سۆسیالیـست بـون دووسـێ کـەس برینـدار ببـوون و لەپاسەکەش (٧-٨) کەس شەهید و (١٠-١٥) بریندار ببون و زەرەر لەسـەیارەکان کەوتبوون کامیرای ئێمە هەرلەوێ وێنەی روداوەکـەی گرتبـوو لـەنزیك خـانم مـیتران بـوو خـانم مـیتران دابـەزی زۆر ترسـان وتیـان چـیە وتمـان هـیچ نیـە و بـابرۆین و درێژەمان بەرۆیشتنەکەمان دا بـەرەو عەربـەت و لـەوێ خـەڵکی هـات بـۆ جـەنازەو شتەکانیان بردبوو بۆ خەسـتەخانەو ئێمـەش چـوینە عەربـەت و سەیدصـادق لـەوێ سەیری قوتابخانەیەکیان کرد کە رێکخراوەکەی خۆی خانم میتران کردبویان پاشـان بەرێ کەوتین بۆ گردەنازێ و بەردی بناغەی قوتابخانەی گردەنازێمان دانـاو پاشـان چوینە هەڵەبجە لەوێش خـەڵێکی زۆر هـاتن لەکەسـانی کیمیـاوی لێـدراو پێـشنیاری جۆربـەجۆری دانـاو سـەری لەدووسـێ قوتابخانـەی هەڵەبجـە داو وەعـدی هاوکـاری زیادی داو گەراینەوە سلێمانی بۆ ئێوارەکەی ئەو بـۆ خەسـتەخانە سـەر لەشـەهیدو بریندارەکانی روداوەکە بدات و ئێمەش گەراینـەوە لای ئیشوکاری خۆمـان ، خـانم میتران دڵـسۆزی گـەلی کـوردو هاوکـاری زۆری کـوردو خـەڵکی کوردسـتان لـەرووی سیاسـی و ئـابوری و مرۆڤایەتیـەوە کـردووە وەلـەرووی قوتابخانـەو نەخۆشـخانە یارمەتی زۆری داوەو دڵسۆزە بۆ گەلی کورد مام جەلال پەیکەری بۆ کرد لەهەڵەبجە

بەڵام بزوتنەوەی ئیسلامی پەیکەرەکەیان شکاندبوو لەحەقی چاکەی ئەو ئافرەتە بەرێزەدا بوو گەلی کورد دوو پێشمەرگەی شەهید بوو لەو رووداوەی تەقینەوەی سەیارەدا لە وڵوبەی لای سلێمانی، لە ١٩٩٢/٧/٧ لەگوڵەخانە بووین پاشان سەری قەرەداغمان داو چوینە سەرچاوەی تلەزەیت و شەهید گۆران ئێوارە گەراینەوە بۆ سلێمانی ئەوە یەکەم جاربوو ئەو (٤-٥) سەعاتە برادەران وتیان لەجیاتی ئەوەی کۆبونەوەو قسە لەسلێمانی دەکەین چەند جار پێمان دەبرن دەچینە لای قەرەداغ فێنکەو لەوێش قسە دەکەین و هەوایەکی پاك هەڵمژین بریاربوو لەرۆژی ١٩٩٢/٧/٨ پلینیۆم بگرین لەسلێمانی و بریار بدەین کەلەسەر یەکگرتنەکان بکرێت یانە خۆمان چی بکەین و بریاری کاری خۆمان بدەین من دەمویست پلینیۆم بکەین بەبریار هەرئەوەش بکرێت بەکۆنگرەی حزب کە(١١) ساڵە نەگیراوە وکاك دکتۆر محمود ببێت بەسەرۆك و کاك رەسول سکرتێر ئەگەر قبوڵی کرد باشەو نەشیکردئەوە قسەی لیبکەین ئەوە بریارەو پلینیۆم داویەتی و تەواولەلقی سلێمانی ئەوانەی خۆیان بەخاوەنی حزب و ماندوبوون لەگەڵ حزب و ئیشیان کردبوو لەگەڵ ئەوانەی ناوشارودوای راپەرین هاتبونە کارکردنی ئاشکرا دژایەتیەکی دروست کردبوو لەنێوانیاندا بیرکردنەوەکان خراپ بوون ئەوانەی شار رۆشنبیر ترو خۆیان بەرۆشنبیر تر دەزانی لەوانەی شاخ هەرچەندە ئەوانەی شاخ هەموویان خوێندەوارو شارەزاو قاڵبووی خەبات بوون ئەوانەی شاخ پێشمەرگە بون ئەوانەی شارایان بەهیچ دەزانی و دەبووگوێ رایەڵی ئەوان بن و هەرچی بریارە ئەوان بیدەن و لێپرساوی عەسکەری و سیاسی و راگەیاندن و پەیوەندیەکان هەرئەوان بن و باش تێ نەدەگەیشتن و هەندێك شارەزا نەبون وئیشی ئەوان نەبوو ئەوانەی شار باشتریان لێ دەزانی تائەوان لەهەندێك ئیشدا یائەوانەی شاخ شارەزاتر بوون لەهەندێك شت دا تائەوانەی شار بەڵام ئەوانەی شاریش هەر مل کەچی زۆر بریاری

ئەوانی دەرەوە بوون هەرچەندە مەسئولیاتی ئەوانەی شاخ زیاتر بووتا ئەوانەی شار یەکێ ئەندامی لق بوایە ئەوانەی شاخ بەکارگێری لق بوون ئەوان دەیانوت نابێت هەندێك لەوانەی شار بێنە پلینیۆم ئەوان چی لەحزب دەزانن ئێستا لەوێ کۆدەبنەوە لەخۆیانەوە دەنگ دەدەن بۆیەکێ هەر فری بەسەرحزبەوە نیەپلینیۆم دەتوانێ ئەندامی سەرکردایەتی ئیزافە بکات نەیدەتوانی لای بات زۆری برادەران رەئیان وابوو هەندێك لابەن کەبیر کردنەوەکەی ئەو برادەرانە ئەحمەد قەدەفەری سەرپەرشتی دەکردن هەڵە بون هەندێکیان باش بوو من هەوڵم لەگەڵدان نەهاتن بۆ پلینیۆمەکە وایان دەزانی هەموو شتی حزب لەسەر ئەوان دەوەستێت یا کاك رەسول و کاك دکتۆر و ئەندامانی سەرکردایەتی نان ناخۆن و کۆبونەوەکە ناکەن و پلینیۆمەکە دوا دەخەن لەبەر ئەوان نەك هەرلێیان نەپرسین هەر باسیان نەکردن تادوای کۆبونەوەش منیش گوێم نەدانێ هەمووکات نازم دەکێشان وایان زانی هەموو کەس وایە دوای بۆیان دەرکەوت وانەبوو هیچ بریارێکیش لەسەر ئەوان نەوەستا من و مامۆستا سەعد قسەمان کردبوو کەپێ داگرین لەسەر کۆنگرەو بکەین بەکۆنگرە چونکە (١١) ساڵ کۆنگرە نەبێت و برۆین بۆ یەککگرتنی (٣) حزب وتمان پێ دادەگرین لەسەر ئەوەی ببێتە کۆنگرە کاك رەسول نەیدەویست کۆنگرە بگیرێت دەیویست هەموو مشاکلی ئەو چەند ساڵە بکات بەناوی یەککگرتن داو خۆی لێ دەرباز بکات ئێمەش دەمانویست پلینیۆم بکەین بەکۆنگرەی حزب کاك دکتۆرمحمودیش هیچ بەرنامەیەکی نەبوو دوای ئەوەی شکستی خواردبوو لەسەرۆکی و رابەری و هەڵبژاردندا دەنگی نەهێنابو پێش ئەوە چەندجارێك سەرکردایەتی لەشەقڵاوە باسی ئەوەیان دەکرد کاك رەسول ناتوانێ سکرتێری حزب بێت و ئێستا قەبارەی حزب زۆر گەورە بووە باکاك رەسول ماوەیەك وازبهێنێ و کاك دکتۆر محمود ببێتە سەرۆکی حزب یاکاك رەسول (١١) ساڵە بادکتۆریش(٢)

سالێ بێت خۆ خوا بۆئەوی دروست نەکردوین هەر کاك رەسول مەسئولی و سکرتێری حزب بێت بەلاَم کەسیان نەیان دەویست لەروی کاك رەسول ئەو مەسەلەیە باس بکەن من رام جیاوازبوله هەموبرادەران من دەموت کاك رسول وکاك دکتورمحمودیشمان بۆحزب پێویستە کاك رەسول پیاوێکی تێکۆشەر ودلسۆزبوو بۆحزب لەرۆژانی ناخۆشیدا خۆراگربو لەسەر رێبازی حزب ململانێ ی دەکردو دیفاعی ئەکردوحزبی بەهی خۆی دەزانی دلسۆزبوو بۆحزب کاك دکتۆرمحمودیش پیاوێکی شارەزاو زمان زان وخوێندنەوەی روداووپێشبینی گورانکاریەکانی ئەکرد پێش ئەوەی روبدات ناسراوبو لەکوردستان وناوچەکەو ئەوروپاو ئەمریکا ولاَتانی عەرەبی شارەزای قسەکردن بوو ناتیق بو دەی توانی لەناو جەماوەردا قسە بکات بەلاَم حزبی پێویست بو بۆخۆی بەکاری بهێنێ زۆرجاردەیوت ئەگەرلەهەلبژاردن دەرچوم ئستیقالە لەحزب ئەکەم ململانێ ی لەسەر حزب پێ نەدەکرا لەکاتی ئاشتیدا لەگەلمان بولە کوردستان لەکاتی ناخۆشی وشەری ناوخۆدا هەڤالەکانی خۆی بە جێ دەهێشت قەت دیفاعی لەحزب نەدەکرد کاك دکتۆر محمود لە ژیانی سیاسیدا سەرکەوتونەبوو کەدەبودەوری هەبوایە لەگورانەسیاسیەکاندا بێسەلمینەوە رابەری حزبی خاوەن جەماوەری وەکوسۆسیالیست بکردبایەت لەراوبۆچون وگۆرانەکان دەوری هەبوایە نەك گۆشەگیر و چاوەرێ ی خەلکی کە بێت بۆمسئولیات بەلکوخەلکی کە داوای لەوبکردایە تائێوارەیەك لەشەقلاَوە برادەران ئاگاداری کاك رەسولیان کردبوو کەکۆبونەوەیەك بکەن لەسەر رووداوەکانی کوردستان و حزب کاك رەسول هاتبوو (١٠) سەیارەی لەگەلێ بوو هەرچی خزمەکانی بوو لەگەلێ خۆی هێنابون بۆشەقلاَوە کۆبونەوە دەستی پێکرد پێش ئەوە رێکەوتین لەسەر ئەوەی شتێکی مناسب دانێن کاك رەسول هەر سکرتێربێت و کاك دکتۆریش سەرۆکی حزب بێت و دەسەلاَتی هەبێت کەسەرۆك بوو

مەسئولی یەکەم دەبێت هەموو برادەرانی کومیتەی ناوەندی وتیان لی تەرحی بکات
لەگەڵ کاك رەسول دا بریاردرا کاك عادل باسی بکات چونکە کاك عادل مراد زۆر ڕێك بوو لەگەڵ کاك رەسول کاك رەسولیش دەیوت حزب هەر عادلی تێدایە و پیاوێکی دڵپاك و رۆشنبیر و دڵسۆزو زۆر مەدحی دەکرد بەلاّم کاك عادل وانەبوو لەسەر کاك رەسول رەئێکی کەی هەبوو باسی کۆنگرە کرا کاك رەسول وتی ئێستا لەبارنیەو باشە باهەر ماوەیەکی کە کۆنگرە بگرین دوای دەخست کاك عادل وتی من شتێك هەیە باسی بکەم و رەئی برادەرانیش هەروایە کاك رەسول وتی فەرموو.. ووتی کاك رەسول (١١) ساڵە جەنابت برا گەورەیت کاك عادل بەخانەقینانە لەجیاتی کاك عادل دووسێ جار هەربراگەورەی دوبارە دەکردەوە زۆر بە ئەحترامەوە تەرحی دەکرد برا گەورە وتی برا گەورەیت ئێستاش هەر براگەورەیت و کاك دکتۆریش هەر براگەورەیەو حزب ئێستا زۆر زیاد بووەوفراوانە بەتەنها بەجەنابت ناروات بەرێ وە کاك دکتۆر محمودیش زمانەکە دەزانێ و دەتوانێ کۆبونەوە بکات وە رۆشنبیرەو هەر یارمەتی جەنابت ئەدات ئیدارات هەموی لای خۆت دەبێت کاك رەسول تێگەیشت دەیەوێت قسەیەك بکات کاك دکتۆریش هەرخۆی مەشغوڵ کردبوو هەموو برادەرانیش سەیری کاك عادل و دەموچاوی کاك رەسولیان دەکرد کاك عادل هەرچۆن بوو وتی جەنابت هەرسکرتێری و کاك دکتۆرمحمودیش بابیێتە سەرۆکی حزب و بنەماکانی دیاری بکرێت کاك رەسول زۆربەتوندی و بەدەنگی بەرز وەلاّمی کاك عادلی دایەوەو ووتی ئەوقسانەچیە سەرۆك چیە خۆ ئێمە عەشائیری شۆرشی ئەیلول دروست ناکەینەوە هەرزانیم سەرتان کردووە بەیەکداو خەریکی موئامەرەن لەسەرمن دەتانەوێت حزب تێك بدەن ئێوە چیتان لەمن باشتر کردووە دیاربوو کاك عدنان موفتی دەیویست قسە بکات بەهەموومان وتمان کاك عادل قسە بکات و تەرحی بکات هێشتا کاك

رەسول قسەكانی تەواو نەكردبوو كاك دكتۆر محمود ووتی كاك رەسول من هەر ئاگام لیّ نیەو ئەوعادلەوئەوبرادەرانە لەخۆیانەوە قسەو تەرحی جۆربەجۆردەكەن و دەكات و تۆ هەر براگەورەیت و من ئەندامێكی ئەو حزبەم و ئیش دەكەم ئەوانە لەخۆیانەوە قسە دەكەن كاك دكتۆر هەڵساو چوو بۆسەرئاو خۆی مەشغولّ كرد تاكاك رەسول رۆیشت لەدەنگە دەنگی كاك رەسول خزمەكانی و حمایەكانی هەریەكە بەكلاشنكۆفێكەوەخۆیان كرد بەژورداو ئێمەش هەموو بیّ دەنگ و كاك رەسول بەتورەییەوە بەوانی ووت برۆن سەیارەكانتان حازر بكەن بابرۆینەوە ئیتر بیّ خواحافیزی هەڵساو منی بانگ كردو ووتی نایەیتەوە ووتم بۆ بەم شەوە بەیانی ووتم كاك رەسول باوەر ناكەم برادەران وكاك عادل مەبەستی تۆ بوبێت وتی نا هەمویان تۆیش دوو مانگ (٣) ملیۆن دینارت سەرف كرد بۆ دكتۆر محمود لەوشارو شار دەتگێراو كۆبونەوەت بۆساز دەكردو ئەو ئێستا پیّ ی دەڵێن دەزانیّ قسە بكات و من نازانم قسەبكەم هەروەها ووتی لەتۆ دڵم عاجز نابێت چونكە لێت تیّ دەگەم بەلاّم عادل هەمو خراپەیەكی دژی من كردە پاك نیە لەگەڵ مندا و هەرئەو هەمورۆژێك كاك دكتۆر ئەیوت من مسئول نیم بارەسول بیكات بەلاّم ئەو شەوە لەشقلاّوە لای كاك رەسول خۆی دەربازكردو تاوانەكەی خستە سەر ئێمە كاك رەسول وتی زۆرتان خەریكی ئەوەن وانیە لەحزبدا... ئەو سەعد وعەدنانەیش هەندێك شتیان كردووە، لە١٩٩٢/٧/٨ لەئەبوسەنا لەسەر حسابی لقی سلێمانی (٣٠٠)كادری حزب بەشدار بون لەپلینیۆمەكەدا سەرەتا بە وتاری كاك رەسول دەستی پێكرد كاك رەسول ووتی ئەم پلینیۆمە تەنها بۆئەوە یەكگرتن بكرێت و كۆنگرە بگرین لەگەڵ ئەو دوو حزبەدا بریاربوو مامۆستا سەعد قسەبكات ئەوە یەكێكە لەكارەكان مەسەلەی یەكگرتن كاری حزبی خۆمان هەیە لەو پلینیومە باسی بكەین كاك عدنان موفتیش قسەی كرد لەسەر رووداوەكان و لەسەر یەكگرتن وزۆری

مەسەلەکانی کە بەلاَم بەلای کۆنگرەی حزبدا نەچون و من دەمویست قسە بکەم لەسەر ئەوەی ئەو پلینیۆمە بکەین لەکۆنگرەو هەلبژاردن بکات و یەکگرتن هەرچی بۆ دانێین لەسەر ژمارەی بەشدابونی لایەنەکان و سەرکردایەتی و تا دوایی و ئەگەر نەش کرا وائێمە کۆنگرەی خۆمان بەستووە وکاری خۆمان درێژە پیَ دەدەین و بەتەئکید لەوکاتەدا رەئی دەدرایە دکتۆر محمود بۆ سکرتێری حزب و کاک رەسول هەرلەگەلّ حزب دەبویاکاك دکتۆربەسەرۆك و کاك رەسول بەسکرتێر دەمایەوەو شتی وای لەمەسەلەکە نەدەگۆری وبەسەرکەوتنی دەگەرایەوە بۆحزب ودەتوانرا ئەو(٣) حزبە هەر ئەو سەرکردایەتی هاوبەشەی هەبێت و شەرت نەبوو یەك حزب بێت من ئەوەم پیَ باشبوو بەلاَم ئەو رۆژە زوو تەواوبوو بۆرۆژی دوایی کاك دکتۆرمحمود قسەی کرد بەلاَم قسەکانی هەرئەوە بوون کەئەو خواحافیزی لەحزب و لەوبرادەرانە دەکات ودەروات بەبیَ ئەوەی مناسەبە هەبێت دابەزییە سەر لقی سلێمانی کە(٣) مانگ بوو ئیسراحەتمان نەبوو بەدەستیەوە لەوشار بۆ ئەوشارو مصاریف و هەرچی لقی سلێمانی هەیبوو سەرفمان کرد بۆئەو گەراندنە و رابەرییە خستینیە ساجی عەلی لەقەسەکانیدا وادەرکەوت کە لقی سلێمانی حزبێکی سەربەخۆیەو بۆخۆیی و بەئارەزووی خۆی لەگەلّ ئەم لاو ئەولاداو گومرکی تایبەتی ودزی و راوروت وخەلك کوشتن هەموی لەلقی سلێمانی دەکرێت و من لەحزبێکی وادا ئیش ناکەم چونکە درو جەردەو راوروتی تێدا بێت و پارەی حزب و حزب بەکار بهێنن بۆخۆیان کارێکی وای کرد هەر نەبێتەوە دوایی کاك عدنان پیَ ی ووتم ووتی کاك دکتۆر وای زانیووە تۆ پشتی کاك رەسول دەگریت وناتەوێت بێتە کۆنگرەوە کەکاك دکتۆر ئەو هەموو قسەی پیَ وتین منیش قسەم نەکرد هەربەپلینیۆم مایەوە بەلاَم وتیان یەکگرتن بکرێت باشە کاك دکتۆر رقی لەکاك رەسول بوو هەموو داخی خۆی بەسەر ئێمەدا رشت و زۆرمان لاسەیربوو هەرلەو کاتەشدا کاك رەسول

نامەیەکی نارد بۆسەد هەزار دینار ووتی ئێستا پێویستمە ئەوکات نامەی نارد هەموو مالیەی لقی سلێمانی پرسیارم لێ کردن (٥)هەزار دینارمان هەبوو لەوکاتەدا منیش ووتم باوەربکە ئێستا نیە بەلاَم بەمەسئول مالیەم ووت بۆی قەرز بکەن بەکاك رەسولم ووت دەنێرین قەرزی بکەن ئەویش وای زانی هەیەو نای دەین ئەویش خۆی عاجز کردو ووتی نامەوێت هەموویان بێ خواحافیزی ئەوشەوە چونەوە ژورەکانی خۆیان لەئوتێل، لەرۆژی ١٩٩٢/٧/١٠ کۆبونەوەی و پلینیۆم نەتیجەی نەبوو هەریەکە بەلایەکدا رۆیشت و کاك دکتۆروکاك عدنان و کاك عادل ئەچونە دەرەوەو رۆیشتن تائەو هەموو رووداوە روی دا نەهاتنەوە کاك عدنان نەبێت لەسەر نامەی مام جەلال لەکاتی کاك رەسول دا گەرایەوە بۆئەوەی مەسەلەی کاك رەسول و چونە ناویەکێتی نیشتمانی تەواو بکات هەرچەندە مام جەلال وتی من داوام نەکردووە لەکاك رەسول بەلَکو کاك رەسول داوای کردووە بێتە ناو یەکێتیەوە.. ئەو هەموو یەکگرتن و کێشەی بەنیوە ناتەواوی بۆبەجێ هێشتین و خۆیان بۆی دەرچون بەتایبەتی کاك دکتۆر سەبەبی زۆری کارەکان بوو لەوکاتەدا، لەرۆژانی ١١و١٢و١٣/٧/١٩٩٢ هەر لەسلێمانی خەریکی ئیشوکاری ئاسایی خۆمان بوین، لە١٩٩٢/٧/١٤ چوینە پێنجوێن کۆبونەوەی هێزو مەسئولە عەسکەریەکان و کۆبونەوەی ناوچەشمان هەبوو لەسەر بارودۆخی ئەوکاتەی ناوچەکەو حزب و شێوەی ئیشوکارەکان چۆن بکرێت، لە١٩٩٢/٧/١٥ لەسلێمانیەوە چوین بۆ هەلَبجە کۆبونەوە هەبوولەگەلَ هێزی زمناکۆ و مەسئولە عەسکەریەکان و ناوچەی هەلَبجەدا شەو لەهەلَبجەماینەوە و رۆژی١٩٩٢/٧/١٦ ش هەرکۆبونەوەی هێزو ناوچە هەبوو هەلَبژاردنی کۆمیتەی ناوچەش کرا لەهەلَبجە، لە١٩٩٢/٧/١٧ لەسلێمانیەو چوینە رانیە کۆبونەوەمان هەبوو لەگەلَ کاك رەسول داو گەرامەوە بۆ سلێمانی، لەرۆژانی ١٨و١٩و١٩٩٢/٧/٢٠ هەرلەسلێمانی بوین، لە١٩٩٢/٧/٢١ چومە

قەدەفەری و پەردەمان لەسەر وێنەی شەهید رەوف خەلیفەسەعید لادا لەقەدەفەری، لە٢٢/٧/١٩٩٢ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتین بۆهەولێر لەکارگێری بەرە لەوێ بەشداربوین و باسی ئەوە دەکرا لەمەولا دەبێت ئیدارات تەسلیم بە حکومەت وپەرلەمان بکرێت و بەرەی کوردستانی و دەزگاکانی نەمێنن و حەل بکرێت و چارەسەری کێشەی هەموو لایە ك حکومەت بیکات ئەوەش یەکەم هەنگاوبوو بۆ زیندە بەچاڵ کردنی بەرەی کوردستانی و بریاری بەکۆمەڵی بەرەی کوردستانی و تەسك کردنەوەی بۆ یەکێتي و پارتی ئێمە دژی حەل کردنی دام و دەزگاکان ی بەرەی کوردستانی بوین حزبی شیوعیش پشتیوانیان کرد بەلام زەعیف بوو زۆر بەهێز نەبوون لەسەر پێ داگرتن من گەرامەوە بۆسلێمانی لە ٢٣\٧\ ١٩٩٢ رۆژی دابەشکردنی خانو تەلەفونو قەنەفەی بارەگاکانی بەرەی کوردستانی بوو لە پاریزگاکان و قەزاکان هەر کەس ببوو بە دزی ماڵی خۆی دامەزراندنی بەرەی کوردستانی شەری ناوخۆ تەواوبو لە کوردستان هەر بە هەڵوەشاندنەوەی بەرەی کوردستانی لێدانی زەنگی شەری ناو خۆ بو کە (٥) ساڵی ماڵ وێرانی بۆ خەڵکی کوردستان لە لایە ن پارتی ویەکێتیە وە بەدیاری بۆ خەڵکی کوردستانیان هێنا و بە ئێستاشەوە شوێنە واری سارێژ نە بوە هەزاران ژن بێوە ژن کراو منالٌ بێ باوك کرا تائێستاش دەیان جەنازەی شەری ناوخۆ بێ سەرو شوێنە جەنازەکانیان نادەنەوە کەسوکاریان بونە قوربانی لە یەك دانی پێکی دانیشتنی شەوانی خۆشی دوای شەری (٥)ساڵەی هەردولای( ی. ن. ك) و( پ. د. ك) هەرلەدوای کۆبونەوەکە، لەرۆژانی ٢٣و٢٤و٢٥/٧/١٩٩٢ هەرلەسلێمانی خەریکی ئیشوکار بوین لەسەر رۆشنایی ئەو هەنگاوانەی پێشوو، لەرۆژی ٢٦/٧/١٩٩٢ سەردانی مەقەری پارتی گەلمان کرد لەسلێمانی بەبۆنەی دامەزراندنی حزبیانەوە، لە٢٧/٧/١٩٩٢ کۆبونەوەی هاوبەشی هەر(٣) حزب هەبوو لەئوتێل ئەبوسەنا کاك رەسول و کاك

سامی و کاک شوان بەشداربون لەکۆبونەوەکەدا، لە١٩٩٢/٧/٢٨ کۆبونەوەکە لەبارەگای لقی سلێمانی بەردەوام بوو کۆبونەوەیەکی دیاری کراوبوو هەرحزبەی دوو کەس من کامیرام هێنا رەسمی بگرن ووتم بەکاک رەسول وکاک سامی قسە بکەن لەسەر چۆنێتی یەکگرتن وتیان باوەرمان پیٚ ناکەیت پەشیمان ببینەوە ووتم بەلٚیٚ دور نیە پەشیمان ببنەوە خۆیان لەقسە لاداو هەردەیان وت بەکامیراکە تەواو نەبوو بروات هەندێکم تەسجیل کرد بەلاٚم زۆریان قسەکان دەرنەچوون ووتیان لەسەر مەسئولیاتی کیٚ تەسریح بدەین ئێمە چارە نوسی گەلێك لەئەستۆمانە هەردووکیان وتیان بەپێشمەرگایەتیش لەخزمەتی حزبی یەکگرتن دەبین بەلاٚم هەردووکیان وادەرنەچوون ولەکاتی خۆیدا قسەکانیانمان لیٚ دایەوە بەتایبەتی کاک رەسول مامند کەدەلٚێت من سەربازی یەکگرتنم کەچی بەئەندامی سەرۆکایەتیش هەر نەیکرد، لە١٩٩٢/٧/٢٩ لەسلێمانی بوم، لە١٩٩٢/٧/٣٠ لەسلێمانیەوە بەریٚ کەوتم بۆ پێنجوێن و مەریوان و بۆ شاری سندج(سنە) بۆ مالٚەوە، لەرۆژانی ٧/٣١و ١٩٩٢/٨/١ هەرلەسنە بوم، لە١٩٩٢/٨/٢ لەسەعات (٢/٣٠)ی پاش نیوەرۆ لەسەر بروسکەی بەپەلەی کاک رەسول لەسنەوە چومە مەریوان و بۆسلێمانی سەعات (٨)ی شەوی ٢-١٩٩٢/٨/٣ گەیشتینەوە واتە لەسنەوە بۆسلێمانی بە (٥/٣٠) گەیشتین، لە١٩٩٢/٨/٣ لەسلێمانیەوە بەریٚ کەوتم بۆرانیە بۆلای کاک رەسول لەویٚ پیٚ ی ووتم لەبەغدادەوە داوایان کردووە بە پەلە برۆیت بروسکەکەی هێنا پەیوەندی جیهازی نێوان رانیەو بەغداد بەردەوام بوو هەندیك لە حزبە کانی کە ش هە ر لەگەلٚ بەغدادبەردەام بون و لەوکاتەدا من سەیری بروسکەکەم کرد لەعەلی حسن مجیدەوە بۆ من هاتبوو دەلٚێت یەکیٚ بنێرە نەك خۆت بەلاٚم کاک رەسول زۆر ئینکاری کرد هەر دەبێت خۆت برۆیت و منیش بەراستی ئەو جارە رووگیری کاک رەسول بووم هەرکەسم بناردایە هەردەبوو بەپیٚ ی بروسکەکە ئەوانیش چاوەریٚ

نەبوون من برۆم چومە ماڵی کاك عقید عوسمان رەشاد موفتی کاك رەسول وتی لای برادەرانی سەرکردایەتی باسی مەکە کاك رەسول وتی برۆ ماڵی کاك عوسمان ، کاك عوسمان حەزی دەکرد لەگەڵ عێراق علاقات هەبێت بەڵام کاك عدنان موفتی پێ ی ناخۆشبوو وەدەیزانی کاك عوسمان حەز دەکات ، کاك عدنان موفتیش لەوێ بوو باسم نەکردو شەو لەماڵی موفتی مامۆستا رەشادموفتی بوین بەڵام لای کاك عوسمان باسم کردو کاك عوسمان پیاوێکی باش و شارەزاو خاوەن بۆچون و شتی پێبوو من زۆر سودم لێ وەرگرت لەزۆر رووەوە مێژوی زانیاریی گشتی لەماڵی کاك عوسمان نانمان خواردو شەو لەماڵی قازی بوین و لەرۆژی ١٩٩٢/٨/٤ لەهەولێرەوەو هەمان رێگای پێشوو ئەم جارەیان لەدیبەگە ئیسراحەتمان کرد وادیاربوو نەیانزانی بوو من دەرۆم تابروسکە گەیشتبوو لەوێ کۆمەڵێکی کەهات بەدەممانەوە جگە لەو(٦)سەیارەی یەکەم بەرێ کەوتین لەکەرکوك پێشویەکمان دا و بەرەو بەغداد بەرێ کەوتین لەرێگەی تکریتەوە چوینەوە خانووەکەی پێشوو لەسەر دیجلە و سائیقەکەمان کاك نوزادی شێخ ئەحمەد ئامۆزای شێخ توفیق بوو لەگەڵمان دا، مدیری ئیتسخباراتی گشتی ومخابرات هاتن وتیان وەزیر لەدەرەوەی بەغدادەو نەیزانیووە وەزیری شەباب دێت (فیصل نوری شاهر) ئەو سەری لێ داین و لەسەر وەزعەکان قسەمان کرد پێ دەچوو ئەو هەر بۆ موجامەلەی من بێت نەك شتێکی بەدەست بێت، لە ٨/٥ لەوەزارەتی دیفاع عەلی حسن مجیدمان بینی و لەسەر روداوەکانی ئە م رۆی کوردستان و عێراق قسەکراو ووتی ئێمە بریارمان داوە هەموو هاوکاریەکی سۆسیالیست دەکەین و پشتیوانی لێ دەکەین ئێوە جورئەتان هەیە یا خود وەکو پارتی پەشیمان ئە ببنەوە وتی لەگەڵ پارتی زور مەسەلەمان تەواو کردبو دوای پەشیمان بونەوە لەوقسانەی وە ووتی ئێمە ناگەرێینەوە کوردستان کوردیش داوابکات هەتا زروفی خۆمان لەبار نەبێت و هەمووکورد خۆی

داوا نەکات ئێمە ئێستا کۆمەڵێك کێشەمان لەکۆڵ بوەتەوە هەر لەوکاتەدا لەراگەیاندنی دەرەوە زۆرجار باسی ئەوەی دەکرد کەعێراق دەگەرێتەوە بۆ کوردستان کەشتی واهەر نەبوو خۆیان دەیانوت ناگەرێینەوە کوردستان و لای ئەو بریارم دا بگەرێینەوە بۆ جێگای خۆمان زۆر داوای کرد بۆبازار نەچووم و شەو نەبێت لەسەر ریگاکەمان گەراینەوە جیگای حەسانەوە مان هەندێك جێگای پیشان داین کەلەشەری کەنداوی دووهەمدا لێ درابوو چاکیان کردبونەوە، لە٦/٨/١٩٩٢ لەبەغدادیش بەرێ کەوتین نامەیەکی نارد ووتی هەدیەکی بچوکی سەرۆك صدام هەیە بۆ کاك رسول و سۆسیالیست بیبەیتەوە کارتۆنێك بوورانیم پارەیە وتم من بۆکاری سیاسی هاتوم باقسە بکەم لەگەڵ کاك رەسول قسەم کرد وتی باشە هەر ئەو رۆژە سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی بەرێ کەوتین و لەکەرکوك پشوویەکمان داو نانمان خواردومناقشەیەکی زۆرمان لەگەل مدیری ئەمن وئەوانی کەدا لە سەر کەرکوك ودەرکردنی کوردو هێنانی عەرەب بۆ کەرکوك  بە هەمان رێگا لەدیبەگەو مخمورو دەشتی کەندیناوەوە بۆ هەولێرو بۆکۆیە و بۆرانیە بۆلای کاك رەسول لەچوارقورنە بوین و ئەنجامی کۆبونەوەکەم بۆ باس کردو رەئیەکانی ئەوان وپەیوەندی کەش دروست کرا وە بەلاّم ئیتر من وازم لێ بهێنن و کێ ی کە دیاری دەکرێت بابکرێت ووتم هەندێك پارەمان هێناوە تەسلیمی بکەین ووتی چەندە ووتم (٣) ملیۆن دینارە وتی  زیاترە وتم نا هەر ئەویە ووتی جا ئەوە چیە دەبوو نەت هێنایە ئەوە هەر عەیبە وەرت گرتووە زۆرم پێ ناخۆش بوو ووتم باشە بەیانی زوو دەینێرمەوە ئێستا بروسکەیەك دەکەم بۆیان  بەیانی سەیارەیەکیان بێتە لای سەیتەرەکەو پارەکەیان بۆ دەنێرمەوە بەسائیقەکەدا دەبێ بینێرمەوە کاك رەسول زۆر لەو بارەیەوە قسەی کردو بۆڵەی بەسەرما کرد منیش ووتم کاك رەسول تۆو کاك دکتۆر وکاك سەعدعبداللە کاك عدنان مفتی (٨٤)رۆژ لەبەغداد بون یەك ملیۆن

دینارتان هێناوه من ئەوه پارەش و جیهازو پەیوەندی سێ بەرامبەر ئەوەی ئێوه پارەمان هێناوه هەر پێ ی نارازی من بەیانی دەینێرمەوه ئێستاش دەگەڕێمەوه سلێمانی زانی من عاجز بووم نەیهێشت بگەڕێمەوه شەو ووتی لەکوێ یە پارەکە ووتم لەسەیارەکەدایه ووتی باشه بابەسەیارەکەوه عبداللەی برازام بیبات بۆ حاجی ئاوا بەسائیقەکەم ووت لەوێ تەسلیمی بکات بردی بۆماڵی کوێخا پیرۆت لەوێ پارەکەی تەسلیم بەکاك عبداللەی کوێخا پیرۆت برازای کاك رەسول کرد، نیوەرۆی رۆژی ٨/٧ چوینه حاجی ئاواو پاشان بۆ رانیەو لەوێ ووتی یارمەتی مانگانەی لقی سلێمانی حزب بەرنەوه بۆ یەکێکی کە بێت ووتم مەسئولی ئیدارەو دارایی دێت ووتی پێویست ناکات سائقەکەمان پارەکەی لێ وەرگرتن لەوپارەیە بوو کەئێمە هێنابوومان لۆك بوون سائیقەکە تەسلیم بەئیدارەومالیەی لقی سلیمانی کرد کەمانگی/٧ درابوو، لە٨/٧ گەیشتینەوه سلێمانی، لە١٩٩٢/٨/٨ یادی دامەزراندنی ساڵرۆژی حزبی سۆسیالیست بوو خەڵێکی زۆرو ئاهەنگێکی جوانیان ئامادەکردبوو بۆیادی حزب لەهۆڵی رۆشنبیری سلێمانی منیش لەوێ ووتاری حزبم پێشکەش کرد، له رۆژانی٩ و١٠/٨ هەرلەسلێمانی بوین، لە١١/٨ لەسلێمانیەوەبەرێ کەوتین بۆرانیە کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیمان هەبوو لەسەر روداوەکانی کوردستان، لە١٢/٨ گەراینەوه بۆسلێمانی، لەرۆژانی ١٣و١٩٩٢/٨/١٤ هەرلەسلێمانی بوین سەرقاڵی ئیشوکاری رۆژانەی بوین و بەردەوام بونی کاری حزب، لە١٥/٨ لەسلێمانیەوه چوینه ناڵپارێزو پێنجوێن و گەراینەوه بۆسلێمانی دوای رێکخستنی ئیشوکارەکانمان ئاگاداری کاك سیەدقادرمان کرد لەناڵپارێز بوو کەهەندێك لەدیلەکان ئازاد بکات بەهۆی یادی ٨/٨ رۆژی دامەزراندنی حزبەوه کەبەنامەیەك داوایان لەحزب کردبوو لەرێگای خاچی سوری نێودەوڵەتیەوه بۆئازاد کردنیان، ٣٠٠ کەس ئازادکران لە١٦/٨ سەردانی لقی (٤)ی پارتی دیموکراتی کوردستانمان کرد

بەبۆنەی دامەزراندنی پارتیەوە، لە ٨/١٧ لەسلێمانی بوین لەوکاتەدا کاك دکتۆر محمودو برادەران چوبونەوە دەرەوەی وڵات گوایە کاك رەسول کۆنگرەی یەکگرتنی دواخستووە و نایکات کەئەوان رۆیشتن کاك رەسول ووتی بروسکەیان بۆ بکەن بگەرێنەوە بۆ کوردستان بۆکۆنگرەی یەکگرتن ئەوەش ئاسان نەبوو لەدەرەوە بۆ (٢)مانگ برۆن و بگەرێنەوە هەرچەندە کاك دکتۆر وارۆیشتبوو کە نەگەرێتەوە هەمووشیان دەخستە ئەستۆی کاك دکتۆر رێگای نادات بێنە وە کوردستان کاك رەسول کەوتە ئەوەی کۆنگرە بگرێت ووتی بروسکەش بکەن بۆ کاك دکتۆر و برادەران بروسکەمان کرد ئەوان وەڵامیان دایەوە کەفریاناکەون یا تاخیری بکەن کاك رەسول ووتی کێشەی میللەتێك و (٣)حزب چۆن رابگرین تائەوان ئیزن دەخوازن بێنەوە کوردستان کاك مەلا ناصیح یش لەبەریتانیاوە بروسکەی دەکرد لەگەڵ کاك سامی ویەکگرتن شتێکی خراپە و نەیکەن داواکەشی راست بوومامۆستا هەموو کەسێ بیرێکی هەبوو بۆئێمەش مامۆستا بوو بەراستی بۆچونەکانی زۆر بەراست ودروست دەردەچون لەدوای بروسکەی مەکتەبی سیاسی و ئاگادار کردنەوەمان بۆ کۆنگرە لەرۆژی ١٩٩٢/٨/١٨بەنیازی کۆنگرەی یەکگرتن بوین چوینە رانیە بۆلای کاك رەسول و پاشان بۆهەولێر کاك رەسول ووتی کاك شمس الدین موفتیش بەرین بۆ کۆنگرە و خۆشی هەڵبژێرێت و دەبێت ئەوی تێدا بێت ئەو حزبەو لەو کۆنگرەیەدا ژمارە ئەندام بۆ هەر ٣حزب وەکویەك بو بەڵام ئەوەش یەکێ لەهەڵەکان بوو بریار درابوو کۆمیتەی ناوەندی هەموو وەکو یەك بێت و هەر حزبێك(١١) ئەندام هەڵبژێرێت و مەکتەبی سیاسی لە(٩) کەس پێك بێت هەرحزبەی (٣)کەس بێت واتا پاسۆك و سۆسیالیست وگەل هەموویان وەکو یەك بن کەس شتی وای قبوڵ نەدەکرد هەریەکەش (٢٥٠) کەس نوێنەر لەکۆنگرە بەشداری بکات هەر(٣) حزب (٧٥٠)کەس بەشدار بێت کەزۆر زۆربوو گەل و پاسۆك لەسەر جادە

داوایان لەخەڵکی کردبوو هێنابویان بۆ کۆنگرە نەك ئەوەندە ئەندامی کۆنگرەیان نەبوو بەڵکو ئەوەندەش ئەندامی حزبیان نەبوو لەوکاتەدا،چونکە گەل٩٠٠٠هەزاردەنگی هێنابو زۆرجارخۆیان بەزۆر دەزانی، لە١٩٩٢/٨/١٩ دواین کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزبی سۆسیالیست کرا لەسەر دوا بریاری یەکگرتن بکەین یان نە هەموو برادەران بەحەماسەتەوە ئامادەییان پیشان دا کاك شیروان شێروەندی لەگەڵ کاك شێخ محمد و کاك رەسول ناکۆك بوون بەتایبەتی لەگەڵ کاك رەسوڵدا زۆر دژیان بوو ئەوانیش هەروا دژی کاك شیروان بون من لەدوا چرکەی کۆبونەوەکەدا ووتم کاك رەسول ئێستاش ئەگەر پێت خۆش نیەو شتێك لەدڵتا هەیە ئێستاش ناچینە ناو کۆنگرەکەو وازی لێ دەهێنین ووتیان دەبێ هەر(٣) لا پێکەوە دەبن و قیادەی هاوبەش و زۆر شتی هاوبەش هەیە بەلآم یەکگرتن ئاسان نیە لەبەردەم برادەران لەلقی هەولێر لەخانووی لای ئەمین عامەکان و لەبەردەم حەوشەکەو لەبەرەم کاك شیروان دا جارێکی کەش بەکاك رەسولم ووت ئێستاش بانەکرێت من حەزم دەکرد کاك رەسول بڵێت کۆنگرەی یەکگرتن ناکەین بەلآم کاك رەسول زۆر بە حە ماسەتەوە سوربوو لەسەر قسەی خۆی و هەمووی بریاریدا کەبچینە کۆنگرەی یەکگرتن، لە١٩٩٢/٨/٢٠ کۆنگرەی یەکگرتنی هەر(٣) حزبی سۆسیالیست و پاسۆك و گەل پێکەوە لەهۆڵی میدیا لەشاری هەولێرو بەئامادەبوونی (٧٥٠) ئەندامی کۆنگرە و زیاتر لە(٢٥٠) میوان و هەموو دام و دەزگاکانی بەرەی کوردستانی و حکومەت وپەرلەمانی کوردستان و سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی حکومەت و هەموو یازۆربەی سەرکردایەتی یەکێتی و پارتی هاتبون بۆ کۆنگرەکەو هەروەها حزبی شیوعی وزەحمەتکێشان و حزبە تورکمانیەکان و بزوتنەوەی ئاشوری و جەماوەرێکی زۆر هاتبون هەرهەمان رۆژ رۆژنامەی حزب هاتە هۆڵەکە لەگەڵ گۆڤاری سورێن بەلآم گۆڤاری سورێن کەمترو

ڕۆژنامەی حزب زۆر توندبوو لەسەر حکومەت و پەرلەمان زۆر دژیان نوسیبووی نازانم موناسەبەی چی بوو وابزانم کاك ڕەسول نوسیبووی چونکە لەبەردەم جەماوەرەکەشدا کاك ڕەسول پێش هەموو لایەك قسەی کرد لەسەر یەکگرتن و حکومەت و پەرلەمان و خەباتی ئەو حزبانە و سۆسیالیست قسەکانی کاك ڕەسول پڕبوون لەهەرەشە ئەو برادەرانەی پارتی و یەکێتی زۆر بێتاقەت کردبوو لەهۆڵەکەداو زۆر تەنگەتاوی کردبوون پێیان ناخۆش بوو موناسەبەش نەبوو تۆ میوان دەعوەت بکەیت و هێرش بکەیتە سەری لەبەر چاوی ئەوان ووتی من سەربازێکی حزبی یەکگرتن دەبم کاك شێرکۆ بێکەس شیعرێکی باشی خوێندەوە سێ جۆگەلە ئاو دەهاتە خوارەوە یەکیان گرت و وردە وردە بونە ڕوباریەك .. کاك دکتۆر عیزەئەلدین مستەفا ڕەسول وتاری نووسەرانی خوێندەوە کە لەدوای ووتارەکەی کاك ڕەسول میوانەکان هەڵسان بەڵام دیاربوو نارەحەت بون هەندێکیان لەکاتی بەرێ کردندا ووتیان ئەوە چیەوا ڕۆژنامەو خۆتان ئەوەندە گەرمن لەسەرمان پاشان کاك سامی و کاك شوان هەریەکە لەنۆرەی خۆیان قسەیان کرد لەسەر مەسەلەکان و کۆنگرەکەدا دوای نیوەڕۆو نان خواردن کاك ڕەسول داوای کرد دوای عەسر هەموو نوێنەرەکانی سۆسیالیست بێنەوە هۆڵەکە و کۆبونەوەیەکی تایبەتی خۆمان هەیە، سەرلەبەیانی ڕۆژی ٨/٢١ کۆبونەوەی دانیشتنی کۆنگرە دەست پێ دەکات و لەدوای نیوەڕۆش جارێکی کە چومەوە لای کاك ڕەسول و ووتم کاك ڕەسول ئێستاش دەتوانین نەچینەوە کۆنگرە بەڵام (٣) ئەقلیەتی جیاوازو و(٣) حزبی جیاوازوئایدیۆلۆژیای جیاواز پێکەوە ناکرێت لەئوتێل قصر زەهەبی کاك شێخ محمد شاکەلیش لامان بوو لەبەردەم لقی هەولێرش جارێکی کە پێم وتەوە هەرسوربوو لەسەر ڕەئی خۆی دوای نیوەڕۆ هەموو ئەندامانی کۆنگرە (٧٥٠)کەس بە حەرەس و پێشمەرگە دەبوو هەرسۆسیالیست لەوکاتەدا پێشمەرگەو حەرەس

بوون وتيان سەری وايەرێك لەئوتێل هەورامانەوە هاتووە بۆ ناو هۆڵەكە لەوكاتە ئەو وايەرە راكێشابوو ووتيان (T·N·T)يە (٤٧) كليۆيان لەژێر مەنەسەی هۆڵەكە دانابوو بۆكۆنگرەكە بەڵام لەبەر ئەوە حەرەسمان دانابوو لەچوار دەوری وەلەناو حەوشەی ئوتێل هەورامان چەند لەتە وايەرێك هاتبووە ناو هۆڵەكەوە بۆديوارەكە هەڵدرابوو واديار بوو مەجال نەبيوو سەری هەر دوو سيمەكە لەيەك بدەن پێشمەرگەكان لای سەری سيمەكە حەرەس بون واديار بو شەوروژ جوڵەيان نەكردبو بۆيە مەجالی ئەوانەيان نەدابو تا بيتەقێننەوە بەڵام ئەوەی لای من سەيربو چۆن ئەو هەمو(TNT )يەيان بردوەتە هۆڵی ميدياو حەرەسی هەبوە ئەو مەنەسە گەورەيەيان .لابردوە دوای (TNT) دانراوە دايان ناوەتەوە كە ٢٤سەعات ئاسايش حەرەسی بوە دۆزرايەوە ئەگينا هەر(٣)حزب بەشوفڵ كۆ ئەكرايەوە لەگەڵ هۆڵی ميديادا لەوەش رزگاربوين لەزيندە بەچاڵی هەر(٣)حزب رزگار بوين لەسەعات (٣) لەهۆڵی ميديا كۆبوينەوە ولەرۆژی ٨/٢٠ كاك رەسول قسەی كرد بۆخەڵكەكەو هەريەكە رەئی خۆی دەربری و هەمووی جياواز بوو لەسەر هەر(٣)حزب وەكو يەك بن ودەبێت جياوازی هەبێت بەڵام كاك رەسول قسەيەكی كرد كە كەس چاوەڕێ ی نەبوو باسی ئەهميەتی يەككرتن و سەركەوتنی كرد بەدورو درێژی هاتە سەرئەوە پێويستە ئەوكەسانەی هەڵدەبژێرن كەسانی لێهاتوو باش و ئەوانەی ماندوبون لەگەڵ حزب و ئەوانەی لە كوردستان و لەناخۆشيدا لەگەڵتان بوون و رەچاوی ماندوبون بكەن و جياوازی مەكەن لەنێوان لايەنەكان هەركەستان پێ باش بوو دەنگی بدەنێ بادەربچێت و خزمەت بكات وەهەركەس لەخۆيەوە هەڵنەبژێرت چونكە ئێمە لەسەر زۆرشتەكان رێكەوتوين وەدەربارەی برادەرانی دەرەوە كاك عادل خۆی چەند جارێك داوای كردووە بەشدار نابێت وخۆی هەڵنابژێرێ وەكاك عدنان پێم باشە وەكاك مەلا ناصيح تەمەن يارمەتی نادات و پێويست ناكات

یەکێکی گەنج و بەتواناتر هەڵبژێرن بەلام کاك دکتۆر محمود بروسکەمان بۆ کردووە نەهاتوەتەوە بۆیە پێشنیار دەکەم ئەویش هەڵنەبژێرن پێویست ناکات خۆی لێرە نیەو ئەگەر پێی خۆش بوایە لێرە دەبووبۆ لێرەوە هەڵیبژێرن لەسەر قەسەکانی کاك رەسول بوو بەهەرا لەهۆڵەکەداو ووتیان ئەی ئەوانە خۆیان هەڵنەبژێرن کێ سەرکردایەتی حزب دەکات و کێ هەڵبژێرین زۆری خەڵکی بەتەمابوو ئەو حزبە گەورەتر بێت و سێ حزب بەیەك حزب دەبێت دکتۆر سکرتێری بێت بەرێوە بەرێت و ئەو قسەی کاك رەسول نەك هەر بۆ هەموومان بۆشەخصی خۆی زۆر خراپ و ناخۆش و ناهەموار بوو زۆر لەرەئی کاك رەسول و شەخصیەتی کاك رەسولی هێنایە خوارەوە دەبوو ئەو پێشنیار بکات و بڵێ من پێشنیار دەکەم ناوی کاك دکتۆریش بنوسن لەسەر تەختەو رەئی بدەنێ پاشان کاك محسن بایز قسەی کردو بەرگری لە دکتۆر محمود کرد زۆری تر لەبرادەران قسەیان کرد هەروەها تامین خانیش هەڵساو ووتی ئێمە (١١) ساڵە کۆنگرەمان نەگرتووە و حزب رێگای هەموو شتی لێ براوەتەوەو ئێستاش کۆنگرەی زیندە بەچاڵ یافاتیحای حزب دەگرین کەچی شەرت و شروتمان لەسەر دادەنێن دکتۆر محمود پێویستە بۆ حزب و کاك رەسولیش پێویستە بۆ حزب هەردوولا هەر زەرورن بۆیە حەق نەبوو کاك رەسول شەرت دانێت دکتۆرو فلان و فلان هەڵنەبژێرن کەخۆیان لەکوردستان نین دەبوو خۆی پێشنیاری بکردایە بۆیان بەجارێك هەموو هۆڵەکە چەپڵەیان لێداو تەئیدی قسەکەی تامین خانیان کردو رەدی کاك رەسول زۆر بەتورەیەوە ووتی شەرت بێت هەر کوردایەتیش لەگەڵ ئەوانە نەکەم ئەوەندە بێ ویژدانن من و دکتۆرمحمود وەکو یەك حساب دەکەن کاك رەسول وایدەزانی من وتوومە هەڵسە قسە بکە بەهیچ شێوەیەك من نەهەڵم ساندووە خۆی هەڵساوەو قسەی کردووە من هەرنەمزانیوە چی دەڵێت و چی باس دەکات ئێستاش خۆ وەزعەکە رۆیشت بەلام بەهیچ

شێوەیەك من ئاگام لەو قسانە نەبووتامین خان كردبوی كاك دكتۆریش رۆیشتەوە

هەتا توانی قسەی بەلقی سلێمانی و ئێمە ووت لەپلینیومەكەدا كاك رەسول قسەی

نەكردو هەمووی لەدڵی خۆیدا كۆكردەوە و زۆری ئەو وەلأمانەی پێ ناخۆش بوو

بەلأم قسەكەی كاك رەسول لەجێگای خۆی نەبوو نەش دەبوو بیكات هەرئەوەش

وای كرد زۆری ئەو برادەرانەی خۆمان دەنگیان نەدایە كاك رەسول لەهەڵبژاردنی

كۆنگرەكە، لە١٩٩٢/٨/٢١ كۆنگرە دەستی بەكاری خۆی كردو لیژنەی سەرپەرشتی

هەڵبژێراو ئەولیژنانەی زەروری بوون هەموی ئامادە كراو ئەو رۆژەش تائێوارە

هەرمناقەشەو هەرابوو لەسەری قسەو قسەی زۆربەتاڵ و لاژەلاژو هەندێك ئەسڵەن

هەرئاگای لەسیاسەت نەبوو تائێوارە قسەكراو كاك رەسول قسەی كردوكاك سامی

وكاك ملازم كەریم وزۆری كەش من ئەو رۆژە قسەم نەكرد و سەیری وەزعەكەم

دەكرد، لە١٩٩٢/٨/٢٢هەر كۆنگرە بەردەوام بوو موناقەشەو زۆركەس هەر

بەئارەزوو قسەی دەكرد (٧٥٠) كەس هەریەكەی دوو قسەش بكات یا هەركەسێ

یەك دەقیقەش نزیكەی (١٢) سەعات دەكات بۆیە زۆری درێژە كێشاو ئەو ئێوارەیە

رۆژنامە هاتە ژوورەوە بۆ هۆڵەكە لەهەموو لایەكەوە بەتایبەتی ئەوەی

سۆسیالیست بوو رۆژنامەیان هەڵداو بوو بەقسەو هەرا ووتمان چیە و چی روی

داوە..! ووتیان رۆژنامەكە هەمووی وێنەی عبداللە ئاگرینەو پروپاگەندەی

هەڵبژاردنی خۆی دەكات و وێنەی پاسۆكی لێداوە ئەوە چۆن وادەبێت و چۆن شتی

وا دەگونجێ كاك رەسول هەڵساو هەندێك هێواشی كردنەوە كاك عەبدولاش لەسەر

مینبەرەكە یامەنەسەكە لەلیژنەی سەرپەرشتی بوو زەرد ببوو بەدەستیانەوە

ووتیان نابێت لەلیژنەش بێت ئەوەش دعایەی هەڵبژاردتانە هاتە خوارەوە ووتی

برایان هەر لەوێش نابم، برادەرانمان دەیانوت برادەرانی پاسۆك وازیان

لەچوارپارچەكە هێناوەو كۆتایی پێ هاتووەو لەناو سۆسیالیستدا دەتوێنەوە هێشتا

ڕۆژانی کۆنگرە بوو لەرۆژنامەکە بابەتێکم لەژێر ناوی سەربازدا نوسیبوو (یەك حکومەت بۆهەرچوار پارچەی کوردستان شتێکی خەیاڵییە) بۆرۆژی دوایی برادەرانی پاسۆك وەلاٌمیان دابوەوەگۆڤارێکیان هەبوو لەدهۆك دەردەچوو لەژێر ناوی (ئافرەتێك) دا بەلاٌم یەکێ لەئەندامانی سەرکردایەتیان نوسیبووی هێرش لەسەر بابەتەکەی من خۆشم کردبوو ئەوان دەیانزانی نوسینی سەربازە، لە١٩٩٢/٨/٢٣ زۆر موناقەشە لەسەر پرۆگرام و پەیرەوی حزب کرا و زۆر باسی کراو زۆر لەسەری رۆیشتن و پاشان چەند لیژنەیەك بۆ سیغەی پرۆگرام و پەیرەو بۆ هەموبابەتەکانی کە دیاری کراو ئەوەی باسی نەکرا مەسەلەی مالی بوو کەس بەلایدا نەچوو وەکەس حسابی نەدەکرد، لە١٩٩٢/٨/٢٤ کۆنگرە هەربەردەوام بوو هێشتا سیغەی پرۆگرام و پەیرەوەکە تەواو نەبوون ئەو رۆژەش هەروا بەردەوام بوون لەقسە کردن و لەسەر پەیوەندی وکاری دەرەوەو شتی لەوبابەتە، لە١٩٩٢/٨/٢٥ کۆنگرە هەردرێژەی کێشاو قسەی زۆر کرا، لەرۆژی سێ هەمی کۆنگرە واتا رۆژی ٨/٢٣ کاك شمس الدین موفتی بەپێ هاتبوو بۆ کۆنگرە لەرێگا کاك سامی چاوی لێ دەبێت لەسەیارەکەدا دەوەستێ و سواری دەکات و دەیهێنێ بۆ هۆڵی میدیا لەوکاتەدا خزمەکانی کاك رەسول چاویان لێ دەبێت دادەبەزێ لەسەیارەی کاك سامی ودێتە ژوورەوە بەکاك رەسول دەڵێن ئەمرۆ کاك شمس الدین لەگەڵ کاك سامی پێکەوە هاتن بۆهۆڵی کۆنگرە کاك رەسول ئەوەی زۆرپێ ناخۆش دەبێت دووسێ کەسی راسپاردبوو کاك شمس الدین لەکۆنگرە دەبێت دەربچێت و لەوێ نەبێت کاك شمس الدین گوێ ی نەدابوو هەر لەوێ مایەوە ئەو رۆژە کۆتایی هات و رۆژی دووهەم کاك شمس الدین هاتەوە کۆنگرەو کاك رەسول هەم ناردبوی پێ ی بلێن بابرواتە دەرەوەو نابێت لەناو کۆنگرە بێت ئەویش دانیشت و کاك رەسول تەداخولی موناقەشەی نەکردو ووتی هەتا کاك شمس الدین مفتی لێرە بێت

من قسه ناكەم و بەكۆنگرەشی نازانم كاك شمس الدین هەڵسا قسەی كردو دیفاعی لەخۆی كرد بۆ لەكۆنگرە بڕواتە دەرەوە كاك سامی قسەی نەكردو من هەستام و ووتم ئەوەی من ئاگام لێ بێت كاك شمس الدین نەدەهاتە كۆنگرەو لەبەر كاك رەسول بەزۆر روگیری ئەو بووە هاتووەتە كۆنگرە ئێستا تێ ناگەم بۆكاك رەسول دەڵێت بڕواتە دەرەوە باكاك رەسول قسە بكات لەبەر چاوی كۆنگرە تاوانەكانی چیە بۆئەوەی هەموومان بزانین و ئەویش بڕواتە دەرەوە هەموومان داوای لێ دەكەین ئیتر كاك رەسول هەندێك قسەی كرد و موبەرری نەبوو وادیار بوو ئەسڵەكەی نەوت لەسەر چیەو دانیشتەوە پاشان كاك شمس الدین هەڵساو هەندێك قسەی كردوو ووتی من دەرۆمە دەرەوە پێم خۆش نەبوو سەرەتا كاك رەسول خۆی زۆری لێكردم و ئێستاش بامشكیلە لەسەر من دروست نەبێت وەئومێدی سەركەوتنتان بۆ دەخوازم و وامن خواحافیز سەیر لەوەدابوو هەموو شەوێك كاك رەسول دەچووە ماڵی قازی ماڵی مامۆستا رەشاد موفتی برای كاك شمس الدین بوو لەوێش لەگەڵ ئەودا هەراوشەری بوو من بەش بەحاڵی خۆم ئەوەم بەناحەق زانی و حەق نەبوو كاك رەسول وای بكردایە بەڵكو چاوەرێ ی بكردایە باشتربوو، لە١٩٩٢/٨/٢٥ كۆنگرە هەربەردەوام بوو درێژەی بەكارەكانی خۆی دەداو دەرۆیشت، لە١٩٩٢/٨/٢٦ دەست كرا بەدەنگدان ونوسینی ناوەكان بەئامادە بوونی حاكم بەلام (٧٥٠)كەس دوورۆژی پێ چوو، لەرۆژی ١٩٩٢/٨/٢٧ سەعات (١١\٣٠) پێش نیوەرۆ كۆتایی پێهات شەوانە كاك قادرجەباری بەدیاری دەنگەكانەوە نانی لەوێ دەخوارد سەرەتا ناوی ئەوی كەم تێدابوودەیوت دەست كرا بە فەرزی دەنگەكان سەیدقادر لەدەنگەكانی من دەخوات هەروەها كاك رەسول و كاك سامی دەنگیان كەم هێنابوو بەلام كاك دكتۆرمحمود دەنگی زۆری هێناو كاك مولازم كەریم و كاك شوان دەنگیان زۆربوو كاك شێخ محمد شاكەلی وكاك شێروان شێروەندی

دەرنەچون لەجێ ی ئەوان کاك نیزامە الدین گلی و کاك عمربۆتانی دەرچون کاك شیروان تائەو سەعاتە دژی کاك رەسول و کاك شێخ محمد شاکەلی بوو یەکسەر چووە لایان و کاك شێخ محمد و کاك شیروان پێکەوە لەیەك جیانەدەبونەوە ئێمە لەهەولّی ئەوەدا بوین کەسیغەیەکیان بۆ بدۆزینەوە و چارەسەرێکی بکەین هەموومان پێمان ناخۆش بوو کاك رەسول کەم دەنگی هێناوەو ئەوانیشی هاتبووە سەر حازری هەرچەندە خەتای خۆی بو قسەی کۆبونەوەکە زەرەری لێدا زۆرمان پێ ناخۆش بوو هەندێك خەڵك دەرچون بەئەندامی حزبیش بەکار نەدەهاتن بەلاّم کاك شێخ محمد و کاك شیروان کە زوریش زەروربون دەرنەچوبون کاك نیزامە الدین هات ووتی لەجیاتی من باکاك شێخ محمد ببێتە کۆمیتەی ناوەندی بەلاّم کاك شێخ محمد قبولّی نەکرد کاك رەسول هەندێك پێشمەرگەی ناردبوو بۆناو هۆڵی میدیا لەکاتی تەواوبونا کاك رێبوارو کاك محسن بایز و هەندێك لەوانە تائەوکاتە دژی کاك رەسول بوون قسەیان کرد و ئەوە کۆنگرە نیەو من هەندێك لێیان عاجز بووم ئەوان زانیان من عاجز بوم لەقسەکانیان کردرۆیشتن کاك محسین بایز تائەوکاتەش دژی کاك رەسول بو لە کۆنگرەی (١) کاك محسین بایزو شەهید عەبدولّەسورو مام ئاراس و کاك عوسمان قادر منەوەرو کاك حاجی حاجی ابراهیم دژی کاك رەسول و لەگەلّ کاك دکتۆر محمودبون لەدۆلّە تو گەرانەوە من زۆر هەولّم دا هەتا لەدواجار هێشتا دەنگەکان فەرز نەکرابوو هەربەکاك رەسولم ووت ئێستاش ئەگەر شتێك هەیە بانەیکەین ئەگەر پێت ناخۆشە کاك قادرجباری لەماڵی ماموستا صادق جەباری خۆی شاردبوەوەو ناردیە لای من وتی ناتوانم بێم کاك رەسول سومعەم ئەشکێنێ بەحیمایەکانی وتووە لێم بدەن منیش پێشمەرگەم نیەو خۆم شەرم پێ ناکرێت من سەیارەکەی خۆم نارد کاك قادر جەبارییان هێنا بۆ هۆلّە کە لە٨/٢٧ کۆنگرەی یەکگرتن تەواوبوو گەراینەوە بۆ ئیسراحەت چوم بۆلای کاك رەسول و کاك شیروان

و كاك شێخ محمد قسەم زۆر لەگەڵ کردن وتم ئێستا ئێوە چۆن دەڵێن وادەکەین و دەتوانین بریار بدەین و بریار لەدەستی خۆمانە کاك رەسول ووتی من نایەمە ئەو حزبەوەو وائەو خەڵکەکە ئەوەندە بێ ویژدانە رەئیان واداوە من زۆر لەگەڵ کاك رەسول خۆم ماندوو کرد ووتم باشە بابرۆینەوە خۆئێستا هیچ مان تێکەڵ نەکردووەو هەرکەسە لەحزبی خۆمانین ووتی شتی واش ناکەم زۆر خۆمان لەگەڵدا ماندوو کرد وادیاربوو قسەیان کردبوو لەگەڵ کاك شیروان و کاك شێخ محمد چوبونەوە بۆ مەکتەبی سیاسی سۆسیالیست لەرانیە لەوکاتەوە رادیۆکەش باسی کۆنگرەی بەهیچ شێوەیەك نەدەکرد زۆرقسەمان لەگەڵ کاك رەسول کرد ووتی باشە بەلأم لەهەڵبژاردن بۆسکرتێر بەشدارنابم منیش ووتم کاك رەسول تۆ وەرە ئێمە فەرزی دەکەین کاك رەسول سکرتێر نەبێت نایکەین چیمان لەکیس دەچێت لەوکاتەدا کاك ملازم شوان هەندێك قسەیان کردبوو کەئەوان رەئی بەیەکێ ئەدەن کەدۆلاری هەبێت ئەوان وا تێ گەیشتبون کاك سامی هەموو دۆلاری خۆی دەهێنێ و سەرفی دەکات بۆ ئەوان کاك رەسول لەوە زۆر نارەحەت بوو، لە١٩٩٢/٨/٢٨ زۆر هەوڵماندا کەنەرواتەوە کاك شیروانیش قسەی شەری دەکرد نەك خێر تائەوکاتە ئەو سێ کەسە دانولەیان پێکەوە نەدەکولا نە کاك شێخ محمد و کاك رەسول وەنە کاك شیروان دژی یەك بوون و لەوێ یەکیان گرتەوە،بۆمن ناخۆش بو هەر سێکیان زۆر رێزیان هەبو لام زۆریش مەبەستم بون لە١٩٩٢/٨/٢٩ کۆبوینەوە بریار درا کەهەڵبژاردن بکرێت بۆ مەکتەبی سیاسی ودەستەی سەروکایەتی کاك رەسولیش هاتە ئەوێ و ووتی من ئیش دەکەم و هەڵبژاردن بابوەستێت کۆبونەوەی یەکەمی کۆمیتەی ناوەندی کرا بۆهەموو لایەك دەست بەکاربین وشێوەی کارکردن و پاشان چوینە صلاح الدین و بۆرانیەو لای برادەران کاك رەسول لەوێ مایەوە و منیش گەرامەوە بۆسلێمانی لەلق بوم، لە١٩٩٢/٨/٣١ خەریکی ئیشوکاری رۆژانەی

خۆمان بوین لەسلێمانی، لە١/٩/١٩٩٢ هەرلەسلێمانی بوین سەرقاڵی ئیشوکاربوین و کۆبونەوەی لقی سلێمانیمان هەبوو لەسەر ئەنجامی کۆنگرە و بەرەو کویێ دەروات ، لە٩/٢ چومە رانیە بۆلای کاك رەسول و گەرامەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ٣و٤ و٩/٥/١٩٩٢ هەرلەسلێمانی بوین خەریکی ئیشوکاری حزب بوین، لە٩/٦ چومە شەقلاوەو بریارماندا مەکتەبی سیاسی لەشەقلاوە بێت لەخانویەك ئێمە دەستمان کرد بەچاك کردن و تەعمیرات کردنی، لە٩/٧ لەشەقلاوە وە گەرامەوە بۆ رانیە بەدوای کاك رەسول دا کاك ملازم کەریمم برد بۆئەوێ گەراینەوە شەقلاوەش هەمان رۆژ لەگەڵ کاك رەسول دا کاك عبداللەو خزمەکانی کاك رەسول هاتن ووتیان کاك شێخ محمد وازی لێ ناهێنێ کاك رەسول ئامادەیە ئیش بکات، قەناعەت بە کاك شێخ محمد بکە لە٩/٨ لەگەڵ کاك رەسول سەری بارەگای مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانیمان دا لەشەقلاوە بۆ نەتائیجی کۆنگرەی یەکگرتن کاك رەسول بەدرێژی بۆی باس کردن کەتەجروبەیەکی نوێ یە لەخەباتی کورداو هەرحزبێك ئەبێت بەدوان ئەمە یەکەم جارە (٣) حزب ببێتە یەك و قسەی باشی کردو دوای هەڵساین و چوینە مصیف صلاح الدین من کاك رەسول و کاك مولازم کەریم و کاك شوان سەری مەکتەبی سیاسی پارتیمان داو کاك رەسول باسی ئەنجامی کۆنگرەی بۆ کاك مەسعود باس کرد کەسەرکەوتوو بووە و زۆرباشە و داوای هاوکاری و پشتیوانی لێ کردن لەداهاتوودا یەکێتی و پارتی و کاك مەسعود پیرۆزبایان لێ کردین و پێخۆشحاڵی خۆیان دەربری، لە٩/٩ کاك رەسول گەرایەوە و منیش چومە هەولێر و سەردانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانیمان لەهەولێر کرد من و کاك ملازم کەریم و کاك سامی و کاك شوان بوین لەوێش قسە کرا لەسەر کۆنگرە بەلاَم دیاربوو برادەرانی یەکێتی خۆشحاڵ نەبون و دەیانوت کێ وکێ لەگەڵ یەکگرتن دایەو کێ لەگەڵ دا نیە وەکو ئەوەی شتێکیان دەزانی کاك عومەر فەتاح ووتی

ئەگـەر ئێـوە واتـا بـەمنی ووت لقـی سـلێمانی لەگـەڵ ئـەو یەکگرتنـەن ئـەوە سۆسیالیست هەمووی لەگەڵ دایە وەئەگەر نا ئەوە سۆسیالیستی لەگەڵ نیە منیش ووتم لەگەڵ یەکگرتنم کاك رەسول خۆی داوای کردووە دوێنێ لەگەڵ کـاك رەسـول سەری بارەگای ئێوەمان دا لەشەقلاوە و سەری پارتی و کاك مەسعودمان دا، کـاك رەسـول مەسـەلەی نـەتائیجی کۆنگرەی وەکـو ئێمـە بۆتـان بـاس دەکـەین باسـی کردووە بۆیان هیوادارین ئێـوەش هـەروا هاوکاریمـان بکـەن بـەڵام یـەکێتی ووتیـان پێمان خۆشەو پێمان باشە لەگەڵ ئەوەش وانەبوو نەپێیان خۆش بـوو وەنـە پێیـان باش بوو ئاگاشیان لەهەندێك تەسەروفاتی کاك رەسول هەبوو لەوکاتەدا عـاجز بـون و دەرنەچـونی کـاك شـێخ محمـد و کـاك شـیروان و لەوبابەتانـە بـەڵام وادیـار بـوو برادەرانی پاسۆك لەگەڵ هەردوو حزبی سۆسیالیست و گەل دا رێکـەوتبون یـاوابڵێن هەردوو حزبی گەل و سۆسیالیست دەنگیـان بۆپاسـۆك و گـەل دابـوو یادەنگـەکانی کۆنگرە هەمووی درابوو بە پاسۆك بەڵام پاسۆك خۆیـان دەنگیـان بەکـەس نـەدابوو هەرلەناو کۆنگرە پاسۆك دیاربوو کاك مولازم شوان نزیکەی هـەر (٧٥٠) دەنگەکـەی هێناو کاك رەسول (٣٥٠) دەنگی هێنابوو کاك سامی هەر لەو بارەیە کەمی هێنـابوو هەنـدێك خـەڵکی نـاو پاسـۆك دەرچـوبون نەسیاسـی بـون نەپێـشمەرگە و نەکـەس دەیناسین لەسۆسیالیـست کـاك شـیروان شێروەندی و کـاك شـێخ محمـد شاکەلی دەرنەچوبون،کە لە خەبات وتێکوشان رادەی هوشـیاریان بـەراود نـەدەکرا لـە گـەڵ ئەوان واتە کاك شیخ محمد وکاك شیروان لەهەموکەس یازۆری ئەوانـە موستـەحەق تربون من زۆرم پێ ناخۆش بو کەدەرنەچوبون لە٩/٩ هەرلەهـەولێر بـوین، لـە٩/١٠ چوینە شەقلاوەو گەراینەوە بۆسـلێمانی، لـەرۆژانی ١١و١٩٩٢/٩/١٢ هەرلەسلێمانی بوین، لـە٩/١٣ چـومە دەربەنـدیخان و بـاوەنورو کـەلار سـەری کـاك شـیروانمان داو سەری بارەگـای ناوچـەکانی خانـەقین و کـەلارمان داو کۆبونـەوەمان لەگـەڵ کـردن

لەسەر کۆتایی کۆنگرەکەو پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٩/١٤ لەسلێمانیەوە چومە هەولێروورانیە و گەرامەوە لای کاك رەسول پێ دەچوو کاك رەسول رەئی گۆرابێت و پەشیمانیان کردبێتەوە، لە٩/١٥ یەکێتی سۆڤیەت لەدوای (٧٥)ساڵ ناوەکەی گۆراو بوو بەروسیاپێشتریش ناوی روسیا بووە، روسیای قەیسەری و پاشاکان و روسیای یەڵسن یاگۆرباشۆف، ئەو قسەیەم کەوتەوە بیر کەکاتی خۆی کادرێکی سۆسیالیست کاك رێبوار یاکاك ئاسو حسن لەدۆڵەتوو یا دەراوی دۆڵەتوو داوای فیشەکی کردبوو کاك قادرجەباری دەینوسی بۆ مەشجەب یاتەقەمەنی نوسیبوی (١٢٠) فیشەکی روسی بۆ کاك رێبوار و کاك ئاسۆ سەرف بکەن کاك رێبوار وتبوی، ئەوە ئیهانەیە بەملیونها پرۆلیتار هەر دانەمرکایەوە بەقسەی برادەران تاپێیان وتبوو کاکی برا روسی خۆی قەومێکە لەیەکێتی سۆڤێت ئەوان شانازی بەروسی خۆیانەوە ئەکەن لەروسیا دەژی و خۆی شانازی بەناوی خۆیەوە دەکات روسی خۆیان ناویان ناوەو خۆ ناتوانین بیگۆرین بلێ فیشەکی سۆڤیەتی شتی وانیە هەر لەوکاتانەدا پایزوسەرمابوو برادەرانمان خانوویان بۆزستان دەکرد بەقورو بەردو داری خواروخێچ کاك ئەنوەری سەعید بەگ تۆپەڵە قوری بەدەستی بەتوندی دەیدایە بەینی بەردەکان کەکونی تێدابوو بۆئەوەی سەرما نەرواتە ژوورەکەوەو لەبن پاسارەکەوە زۆر ماندوبوو ماوەیەك بوو قورکاری دەکرد مامۆستا سەعد ئەوکات کادربوولەراگەیاندن بەپەلە هات و ووتی براینە خەبەرێکی خۆش (١٥-٢٠) کەس لەپێشمەرگە و کادرەکان لەبەردەم مەقەرەکەدا وەستابون ئەو بەپەلە هەواڵی خۆش و کاك ئەنوەر وایزانی ئینقلاب بووە لەبەغداد یامەسەلەی کورد باس کراوە دەستی شل بوو وەستا و سەیری ئەو کۆمەڵەی دەکرد کاك سەعد عبداللە بۆی دەچوو مژدەی دەدانێ ووتیان چی بووە..! ووتی ئەمرۆلەسۆڤیەت کۆبونەوە هەیە لەسەر کاروژیانی پرۆلیتاریای جیهانی و کرێکاران بەگشتی کاك ئەنوەر

ناوچاوی دا بەیەکداو بەهەموو هێزی تۆپەڵە قورەی زۆری شێلابوو لەدەستی دابوو خۆی بردە دواوەو دای بەدیوارەکەداو لەگەڵ لێدانی قورەکەکە بەهێز ووتی هەر لەسۆڤیەت و پرۆلیتاریاو ... وابکەم ئێمە لێرە ئەوە حاڵمانەو ئەوە مژدەیە هەی ...هەی زۆر شتێکی شازبوو لەوکاتەدا ووتی، لە ٩/١٦ لەرانیەوە گەرامەوە بۆ هەولێر، لە ٩/١٧ لەهەولێرەوە گەرامەوە بۆسلێمانی، هەر لەم رۆژەدا دکتۆر سەعید شەرەف کەندی سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەبەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا شەهید کرا و هێشتا رون نیە بەڵام بەتەئکید ئێران ئاگای لێیەتی، دکتۆر سەعید برای هەژاری موکریانی شاعیرەو هەژاریش لەئێران دادەنیشێ و ئێران دەستکاری ناکات، دکتۆر سەعیدیش دوای دکتۆر قاسملۆ پیاوێکی بەتوانای ناو دیموکرات بوو پێم وانیە کەسێکیان هەبێت جێگای پربکاتەوە لەوانەیە ئەگەر لەگەڵ باڵەکەی دیموکرات یەك بگرنەوە ئەوان خەڵکی بەتواناو ناسراویان هەیە بەهەرحاڵ تیاچونی ئەو کەسانە زەرەرە بۆ کورد هەرچەندە حزبی دیموکرات باوەریان بەکوردستانی و باوەریان بەچوارپارچە و کەسی کە نیە جگە لەئەوەی خۆیان هەیانە واتە خودموختاری لەچوارچێوەی ئێراندا من ئەو سیاسەتەی ئەوان لەسەرمەسەلەی کورد بۆئەمرۆ بەگونجاو دەزانم بەردی گەورە هەلگرتن نیشانەی نەوەشاندنە یادوژمن زۆر کردن چونکە کورد لەهەر پارچەیەك دەتوانێ چارەسەری کێشەی خۆی بکات بێ دەست تێوەردانی ئەوی کە، لەرۆژانی ١٨و١٩و٩/٢٠ هەرلەسلێمانی بوین لەکۆبونەوەی دەزگا حزبیەکان و کاری سیاسی و سەردانی خەڵك و تەعزیەو زۆرشتی کەش من ئیشی جیاوازم بوو لەگەڵ زۆر لەمەسئولەکان هەتا حزبی خۆمان من ئیلتزاماتی جەماوەری و عەشائیری وکەسوکاری شەهید و کاری کۆمەلایەتی و سەردان دەبوو بەشێك لەوەختی خۆم بۆ ئەوکارانە تەرخان بکەم چونکە هەر خەڵکەکە رویان تێ دەکردم و هەم منیش خۆم بەبەرپرسیار

لەهەموو شەهیدێك و هەموو كێشەیەك دەزانی دەبوو باش بگەیشتایەت بەلاّم برادەرانمان وانەبوون باسم كردووە جارێك لەكەلار دایكی شەهیدێك هاتە رێگای سەیارەكەو ووتی من دایكی فلاّن شەهیدم و وەزعم خراپە و بەڵكو حزب پارەمان بداتیّ من هیچ پارەم پیّ نەبوو بەو برادەرانەی ناو سەیارەكەم ووت كیّ (١٥٠) دیناری پیّ یە تادەگەرێمەوە سلێمانی كاك قادر جەباری (١٥٠) دینارەكەی دا بەدایكی شەهیدەكەو ووتی من پارەم پیّ یە پاشان گەراینەوە سلێمانی خۆی دووجاری پیّ ووتم ئەو (١٥٠) دینارەش لەبیر نەچیّ كەدام بەدایكی شەهیدەكە لیّ ی سەندمەوە كاك قادر، لەبەرەی كوردستانی دەیان یاسەدان هەزار دیناری لەسەر حزب و كوردو شەهیدان كۆ كردبوەوە دووجار كاك سەعد عبداللەو كاك قادرجەباری پێیان ووتم تۆ ئێرانیەكان دەناسیت باكارێكی توجاری بكەین و كەس نەزانیّ واتیّ گەیشتبوون من پارەم زۆرە ئەوكات ئەوان پێیان وتبووم (٢٥٠) هەزار دینارم قەرزكردبوو بۆ مصاریفی رۆژانەی پێشمەرگە تاسەری مانگ حزب بەشی خۆی وەردەگرێت یالەو گومركانە بۆحزب من چەند جارێك هەرا یاشەرم بۆ كردن من نەشتی وام بۆدەكرا لەپشت حزبەوە نەشئەم كردو نەپارەشم هەبوو جارێكی كە كاك قادرو كاك سەعد باسیان كردو ووتیان یەكی (١٢) ملیون دەخەینە ئەوكارە توجاریەوە لەگەڵ دكتۆر فاضل گەنج عەلی قسە بكەین ئەو زۆر باشی لیّ دەزانیّ واتە ئەوان یەكی (١٢) ملیون دینارو منیش هەروا لەسەر ئەوەش (١٥٠) دینارەكەی لیّ سەندمەوە كەمن پێم نەبوو بەلاّم ئەوان لەخۆیانەوە سەیری منیان دەكرد من پارەم دەكەوتە دەست بەلاّم هەمووم بۆ حزب و خەڵك سەرف دەكرد ئەوەی لیّ ی بیّ بەری بوو ماڵ و مناڵ و كەسوكارو ئەوانەی لێمەوە نزیك بون واتە ئەو پێشمەرگانەی كەشەو رۆژ حەرەسیاتی منیان دەگرت پارەی جگەرەیان پیّ نەبوو هیچمان نەبوو یا هەتابرادەرانی سەركردایەتیش ئەوانەی والەمن نزیك بون زیاتر

دەمزانی بۆڵە ناکەن و لەسەرپارە هەراو نارەحەت نین ئەوانیش هەربێ بەری بون بەلأم هەرگیز خۆم واپیشان نەداووە کەپارە نەبووە و ئیمکانیەت نەبووە یانیە هەندێك کەسی کەم دەیزانی کەپارە نیە یاهەیە یاقەرز دەکەم یالەبازرا پارەم هێناوە لەرێگای خەڵکەکەوە بەفایزی دۆلار کەفایزەکەی بدەینێ بەلأم بۆیارمەتی پێشمەرگەو کەسوکاری شەهید بۆئەوەی هەست نەکەن هیچمان نیە زۆر لەبرادەرەکانی خۆم لەقیادەی حزب لەبواری جیاجیادا چاك لەو راستیانە ئاگادارن وخاوەنی قەرزەکانیش ئەگەر ئەو نوسینانە بخوێننەوە ئەوان پێش هەموو دەزانن لەخۆیانەو باسی چی دەکەم.

## کۆبونەوەی هێزە بەرهەڵستکارەکانی عێراقی لە کوردستان و کێشەی PKK

لە۱۹۹۲/۹/۲۱ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتین بۆ هەولێر، لە۹/۲۲ لەهەولێر بوین کۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی هەبوو لەمەکتەبی سیاسی پارتی لەمصیف صلاح الدین وەئەم بەرێزانە ئامادەی کۆبونەوەکە بوون (مام جەلال و کاك مەسعود و کاك عەزیزمحمد و کاك سامی و منیش لەوێ بووم) زۆر هەوڵمان دا کاك رەسول نەهات لەکۆبونەوەکە باسی مەسەلەی سەفەری ڤێناو دروست کردنی کۆنگرەی نیشتمانی یەکگرتوی عێراق( I.N.C )بوو لەسەر داوای ئەمریکاوئەوروپاو نوێنەری ئێمەش کاك رەسول بوو بۆ ڤێنا و مام جەلالیش داوای لێ کردبوو نەرۆیشت بۆ ڤێنا چونکە باوەری نەبو ئەمریکا صدام ورژێمی عێراق ئەروخێنێ بەلأم ئێمە هەوڵمان دا نوێنەرمان لەدەرەوە بەشداری بکات کاك جەمیل بریاربو کاك عادل مرادیش بەشداربێت بەمنیشی ووت لەو سەفەرەم بەعێراق بڵێم کاك رەسول ناروات وەکو هەڵوێستێك لەبەر ئەوانیش ناروات دژی عێراقە ئەو کۆنگرەیە بەلأم نوێنەری حزبی سۆسیالیست لەدەرەوە بەشداری کردبوو

لەکۆنگرەکەدا، کۆبونەوەی قیادەی سیاسی لەسەر ئەو سەفەرە قسەی کردوو وەلەسەر چۆنیەتی دروست بونی کۆنگرە بەرەی کوردستانی تائەو کاتەش رۆڵی سەرەکی هەبوو چۆن دەتوانێ یەکگرتوانە بەرامبەر هێزە بەرهەڵستکارەکان کاربکات وەئەو قەبارەی کورد هەیەتی و ئەو وەزعە بۆکورد خوڵقاوە ئێستا هەموو هێزی معارەزەی عێراق لەکوردستانە و ناچار بەشیمالی خۆشەویست ئێستا بەکوردستان دەڵێن و چاویان لەو حکومەت و پارلەمان و سەربەخۆییەی کوردە دەبێت بیپارێزن بەهەمووماں هەتا زۆر لەو معارەزانە ئەو وەزعەی کوردیان پێ خۆش نەبوو بەو شێوەیە کەهەیەو هەبوو واقعێك دروست بووەو ئیعترافی نێو دەوڵەتی پێ کراوە لەروی ئینسانیەوە ئاسان نەبوو بۆیان سەرکردایەتی سیاسی بریاری دا کەئەو مجلسی قیادەی عێراقە کاتی بەشداربێت واتە (٣) کەسی کە یەکێ شیعەی عەرەب و یەکێ سونی عەرەب و یەکێ کورد واتا (٣)کەس دەبن ئەوەش ئەگەر کرا مام جەلال و کاك مەسعود ئەگەرنا یەکێکیان بکەن وەلەمجلسی (تەنفیزی)دا واتا ئەنجومەنی جێ بەجێ کردندا کورد چەند ئامانەیەك یا جێگایەکی هەبێت وەیان حکومەتێك تەشکیل دەکرێت ئەویش سودی دەبێت لەو کەسانەی تائەو کاتە گەیشتون ئەوانە بوون ئێمە لەوێ چاومان پێیان کەوت بەریزان(محمد صالح بحر علوم و محمد ئالوسی و هانی فکیکی و دکتور احمد چەلەبی و حسن مستەفا نەقیب و ئەبو صلاح مهدی عوبیدی حزبی بەعس معارزو حزبی دەعوەی ئیسلامی و مونەزەمەی عەملی ئیسلامی و مجلسی ئەعلای ئیسلامی و بزوتنەوەی ئیسلامی لەکوردستان و ئەبو عوروبە ) و دەیان کەس لەمعارەزەی عێراق ئامادە بوون لەصلاح الدین جگە لەحزبی شیوعی عێراق و یەکێتی و پارتی و حزبی یەکگرتن تازە دامەزرا بوون هەموو لەوێ بون کاك مسعود بارزانی بە نوێنەری تەرەفی کوردو دکتۆر ئەحمەد چەلەبی ومحمد علی ناوێك لە مجلیس ئەعلا ومحمد

بحرعلوم دا ساخ نەبووە کامیانە محمدعلی دوای وازی لە مجلیس هێنا حسن مستەفا نەقیب بە نوێنەری سونەبون بۆ مەکتەبی تەنفیزی کاك سامی دانرا لە یەکێتی دکتۆر کمال فوئاد بو دەعوەتی معارەزەشمان کردبوو ئەو ئێوارەیە بەرەی کوردستانی دەعوەتی کردبوون، لە ١٩٩٢/٩/٢٣ لەهەولێر بوین کۆبونەوە کرا کەلەهەر حزبێك یەك کەس بەشدار دەبێت لەئێمە وتمان باکاك سامی بەشدار بێت لەدانیشتنی یەکەم زیاتر بەشدار دەبن کۆبونەوەی خۆمان لەو رووەوە کرد، لە ٩/٢٤ لەصلاح الدین بوین و دەعوەتی معارەزەمان کرد هەم مناوەرە و قسە لەسەر رووداوەکان و هەم سەرەتای کۆبونەوەش دەستی پێ کرد و لەوێ نوێنەری لایەنەکان و بەرنامەی ئیش (عمل) دیاری کراو ئێمەش گەراینەوە هەولێر، هەر ئەو رۆژە واتا ٩/٢٤ لەماڵی کاك رەشاد موفتی بوین بۆ سەردانی کاك عدنان موفتی کەلەدەرەوە گەرابوەوەو ئەویش هات و سەری صلاح الدین مان داو لەوێش زۆری رەفیق و ناسراوی ئەو بوون هاتبون بۆ صلاح الدین و پێ ی خۆش بوو، لە ٩/٢٥ لەهەولێرەوە بۆ سلێمانی بەرێ کەوتین، لە ٩/٢٦ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتین بۆ پێنجوین و گەراینەوە بۆ سلێمانی و دوای کۆبونەوە بەپێشمەرگە و بەناوچەی پێنجوێن وقسەکردن بۆیان لەسەر ئەنجامی کۆبونەوەو کۆنگرەی حزب دەست بەکاربوون لەسەر بەرنامەی نوێ ی حزب قسەمان بۆکردن، لە ٩/٢٧ لەسلێمانی بوین و کۆبونەوەو سەردانی دەزگا حزبیەکانمان دەکردلەسلێمانی، لە ٩/٢٨ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتین بۆهەولێر کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی یالیژنەی بالآ هەبوو هەر ئەو رۆژە چوم بۆلای کاك رەسول بۆ رانیە، من لە بواری رەفاقەتدا زۆر لام مەبەستە بەتایبەتی هاورێی خەبات کە کەسانی وەکو کاك رەسول بۆیە زۆر زۆر هەولێ وتکاولێی پارامەوە هەر من وکاك رسول بوین لەفرقەکە ی چوارقورنە پێم وت

---

کاك رسول دەستت ماچ ئەکەم بالەیەك دانە برێین لەبەر خەبات وتێکوشانی کاك

رسول کەجگە لەدایکوباوکی شەهید بەکسم نەوتوە دەستت ماچ ئەکەم بەلاّم کاك

رەسول لام مەبەست بوو لە٩/٢٩ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی هەبوو لەهەولێر بۆدانانی مەسئولی لقەکان و دابەش کردنی ئیشوکاری حزب، لە٩/٣٠ کۆبونەوە هەر بەردەوام بوو، لە١/١٠/١٩٩٢ کۆبونەوەمان هەبوو لەمەکتەبی سیاسی لەهەولێر پاشان گەراینەوە بۆ سلێمانی، لە١٠/٢ خەریکی تەلەفزیون بوین بۆ شارەزوور سەرقالّ بوم لەگەڵ ئەندازیار کاك فەتاح پاشان گەراینەوە سەیدصادق بۆپرسەو پاشان گەراینەوە بۆ سلێمانی، لە١٠/٣ رێژین خانی کچم لەتەمەنی (٥)سالّی چووە باخچەی ساوایان لەسلێمانی لەگەرەکی رزگاری، هەرلە ١٠/٣ چومە رانیە و قەلاّدزە بۆ تەشکیلاتی ناوچەکان و سەری کاك رەسولم دا بەلاّم وادیاربوو بریاری ئیش نەکردنی دابوو لەرۆژەکانی کە جیاوازبوو زۆرم قسە لەگەڵ کرد بێتە ناو ئیشەوەو هەر ئەویش لێپرسراوی یەکەم دەبێت و فەرزی دەکەین یائەوکات هەموومان پێکەوە نایکەین ئەورۆژە هیچ قسەی نەکرد و هیچی نەوت بەلاّم ئاگاداری ئەو کادرانەی کرد کە پەیوەندیان بەوەوە هەبوو لەتەشکیلات بەشداری بکەن لەناوچەکاندا، لە١٠/٤خەریکی تەشکیلاتی لقی سلێمانی بوین، لە١٠/٥ لەسلێمانی بوین و تەلەفزیونی شارەزوور دەستی بەئیشوکاری خۆی کرد بۆیەکەم جار لەشارەزوور کەزۆر لەگەلّی ماندو بووم، لە١٠/٦ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتم بۆ هەولێر کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی هەبوو لەگەڵ مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کاك رەسول ئیعلانی کردبوو کەلەگەڵ یەککگرتن نابێت کاك شێخ محمد و کاك شیروان لەرانیە کۆ کردبوەوە ئەو رۆژە برادەرانی یەکێتی شتێکیان دەزانی من و کاك کەریم و کاك شوان و کاك سامی چوینە سەردانیان و قسەمان کرد دەربارەی هاوکاری و یارمەتی و پشتیوانیمان کەئێمە دۆستی یەکین ئەوان دەمووچاویان دیاربوو پێیان خۆش نەبوو ووتیان هەر (٣) حزب بەکاملی پێکەوە یا

ئەو نارازی هەیە لێتان یائەو کاك رەسولی لەگەڵ نیەو کاك عمر فەتاح لەو کۆبونەوەیە روی لەمن کردو ووتی ئەگەر تۆ لەگەڵی بیت سۆسیالیست هەمووی یەکگرتنە وەئەگەر تۆی لەگەڵ نەبیت ئەوە سۆسیالیستی لەگەڵ نیە منیش ووتم سۆسیالیست بریتی نیە لەمن بەلاَم لەسەر داوای کاك رەسول من لەگەڵی بوم چونکە من نارازی بووم سەرەتا کاك رەسول بەزۆر قەناعەتی بەمن کرد بۆ یەککگرتن وەلە کۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی رۆژی ٩/٢٢ لەصلاح الدین لەگەڵ مام جەلال دووبەدوو لە پەراوێزی کوبونەوەی بەرەی کوردستانی دا قسەمان کرد کەهاوکاریمان بکەن سیاسەتێکی نوێ یان هەبێت لەگەڵمان برادەرانتان دژایەتیمان نەکەن ئێمەش دۆستان دەبین کاك سامیش وەستابوو هاتە ئەم لاوە ووتی بە من ئەوە قسە ی چی ئەکەیت لە گەڵ مام جلال وەلاَ تا سەر ئێسقان دژمان دەبن ووتم بۆ شەرت نیە ئەگەر ئێمە دژیان نەبین ووتی نا زۆر باش دەزانم دژمان دەبن کاك سامی زۆر رەش بین بوولەیەکێتی یاخۆی بریاری دابوو وابێت و ئەوانیش دژمان دەبن، لە١٩٩٢/١٠/٧ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی هەبوو بۆ سەفەری تورکیاو ئێران و پەیوەندی لەگەڵ ئەو دوووڵاتەو ئەنجامی کۆنگرەی حزب و بەیان و بلاَوکراوەکان لەسەر ئەو بنەمایە پەیوەندی بکرێت کاك سامی لەرێگای (MCC) هێزی هاوپەیمانی ئەمریکا لەزاخۆوژەنەراڵ ناب و ئەوانەوە لەگەڵ تورکیا خەریك بوون وەلەرێگای عیلاقاتی سۆسیالیست لەئەنقەرەوە دکتۆر خیراللە لەوێ بوو ئاگادارمان کردبوو منیش لەرێگای پەیوەندیەوە لەگەڵ ئێران قسەمان کردبوو واتە لە رێگا ی پەیوەندیەکانی کونی سۆسیالیست چونکە تا ئێستاش مەکتەبی تاران ومەریوان وکرماشان و ئەنقە رە و دیمشق هەر بە ناوی سۆسیالیستەوە کار ئە کەن ، لە١٠/٨ بریاربوو سەفەری تورکیا بکەین بەلاَم وەزیری دەرەوە ی تورکیا حکمت چەتین بوو کورد بو بە ئەسل لەسەفەر بوو

نەگەرابوەوە دوایانخستین ئێمەش گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٩/١٠ هەرلەسلێمانی خەریکی ئیشوکار بوین، لەرۆژانی ١٠و١٩٩٢/١٠/١١ هەرلەسلێمانی بوین خەریکی ئیشوکاربوین، لە١٠/١٢ لەسلێمانیەوە چومە ئۆردوگای باریکە بۆ سولْحی بەردەبەل رێکمان خستن پاشان ئێمە چوین بۆ پێنجوێن و مەریوان و سنە بۆ ماڵەوە تا ئەوساش هەر ماڵمان لە ئێران بو لە بەربێ جێگایی ماڵمان لە سنە بوو، لە١٠/١٣ چوینە کرماشان من وکاك مولازم کەریم و خاڵە حاجی و تامین خان بوین دەعوەتی کۆماری ئیسلامی ئێران بوین بۆ تەهران هەر ئەو رۆژە دوای کۆبونەوەیەك لەکرماشان بەرێ کەوتین بۆ تەهران سەعات (١٢)ی شەو گەیشتینە تەهران، هەر لەم رۆژە حکومەتی هەرێمی کوردستان داوایان لە لایەنەکان کردبوو کەکۆبونەوە هەیە لە١٠/١٣ هەموو لایەنەکان کۆبونەوە لەسەر ئەوەی لە(PKK) بدەن دوای ئەوەی رێکەوتن لەگەڵ تورکیا دەیانویست بەناوی بەرەی کوردستانی و لایەنە سیاسیەکانیش بەزۆر بکەن بەشەریکی خۆیان و داوایان دەکرد دەبێت پێشمەرگەی لایەنەکانیش بەشداری شەری (PKK) بکەن دژی کوردی تورکیا و هاوکاری لەگەڵ تورکیا برادەران پەیوەندیان بەمنەوە کرد کەچی وەڵام بدەنەوە من وەلامی مەکتەبی سیاسیم دایەوەو شەویش بەجیهاز لەگەڵ مامۆستا سەعد لەهەولێر قسەم کرد لەکرماشانەوە و پێم ووتن ئێوە بەشداربن لەکۆبونەوەکە بەلام بڵێن ئێمە نەلەشەر بەشداردەبین دژی (PKK)و نەبریاریش دەدەین و ئیمزای بکەین و شەرعیەت بەو شەرە بدەین کەبۆخاتری تورکیا دەیکەن برادەرانی ئێمەش لەکۆبونەوە بەو شێوەیە وەلامیان دابونەوە لەکۆبونەوەکە هەردوولا زۆر نارەحەت ببون لەهەڵوێستی حزبی ئێمە وتبویان ئێوە دژی حکومەتی هەرێمی کوردستانن بەبرادەرانی ئێمەشیان وتبو لێتان قبوڵ ناکەین من بەبرادەرانی خۆمانم ووت ئەوە هەڵوێستی ئێمەیەو ناشگۆرێین و چیان لەدەست دێت بیکەن واتێگەیشتبوون

بەدووسیَ رۆژ (PKK) تەواو دەکەن کەشەر دیژەی کێشا دەیانویست هەموولایەك وەکو رەغبەتی خۆیان بیَ حزبەکانی تر ئەوان چیان پیَ خۆش بێت هەموو حزبەکانیش وابکات،لە ١٩٩٢/١٠/١٤ لەتهران کۆبونەوەمان هەبوو لەگەلَ حاجی ئاغای محمدی لەسەر (٤)خالَ قسەمان کرد.

١-مەسەلەی کورد مەسەلەیەکی سیاسیە .

٢-وەزعی ئابوری و پشتیوانی کوردستان و ئاوەدان کردنەوەی (٤٥٠٠) گوندی کوردستان کەوێران بووە .

٣-وەزعی سەربازی حزب .

٤-راگەیاندنی حزب .

ئەو(٤)خالە لەسەری گەیشتینە ئەنجامێك لەگەلّیاندا، لە١٠/١٥ هەرکۆبونەوە مان هەبوو لەگەلَ دەزگا جۆربەجۆرو پەیوەندی دارەکارەکانی جمهوری ئیسلامی ئیران و ئێمەوە، لە١٠/١٦ هەرکۆبونەوەمان هەبوو لەتهران، لە١٠/١٧ هەرلەتهران بوم ئەو دووسیَ رۆژە رادیۆی یەکێتی دابەزیبووە سەر (PKK) و ئێران بیَ مناسەبەو بیَ ئەوەی بەدیلێك هەبێت کێشەی کورد چارەسەرکرا بێت قەسەی ناشیرین و توهمەت دانەپالّ (PKK) ودژی ئێران بەخەستی من ئەوکات چیم نوسیووە هەرئەوەش دەنوسمەوە یەکێتی نیشتمانی شەری لەگەلَ هەموولایەك کردووە ئەوسیاسەتەی خزمەت بەیەکێتی ناکات ئێستا یەکێتی پارتی لاگرنگە تاهەموو لایەك و دۆستەکانی خۆی دوارۆژ باجەکەی دەدات شەری کوردی تورکیاو(PKK) ئیشی یەکێتی نیە... یەکێتی ئێستا دژی ئێمەیە بیَ هۆ من یائێمە دژی ئەوانین چونکە بەهێزی شۆرشگێریان دەزانین لە زورلایەنی کە زیاترکەئێستا لەگەلَ پارتی دۆستایەتیمان باشترەلە یەکێتی بەلاّم پارتی ئەوقسانە لەیەکێتی ناکرێت ... یەکێتی شەری (PKK)دەکات بۆپارتی نەك بۆ خۆی (PKK)دژی پارتیە نەك

یەکێتی چونکە سنوریان پێکەوە نیە بەڵام پارتی بادینان بەموڵکی خۆی دەزانێ لەساڵی ١٩٨١ ئێمە بەرەی جودمان هەبوو لەگەڵ یەکێتیش لەشەر بوین پارتی رێگای نەداین بۆبادینان من شەخصی پێم ناخۆشە ئەو رەفتارانەی یەکێتی بەڵام برادەرانمان زۆریان لەوە زیاتر پێ خۆشە.. کاك ملازم کەریم دژی یەکێتی قسەی کرد گوێ ی لەوقسانەی یەکێتی بوو لەرادیۆ شەوی رابوردویش دکتۆر محمود قسەی کردبوو لە لەندەن یەکێتی و پارتی ئاگاداریان کردبون ئەوە رەئی ئێوەیە یا هی خۆیەتی دەبێت قسەکانی دکتۆر محمود بەدرۆ بخەنەوە زەختیان خستە سەر مەکتەبی سیاسی لەهەولێر. من تێ ناگەم ئەو حزبانە بۆ واخۆیان توش کردووە ولأتان بەکاریان دەهێنێ دژی یەکتر یادژی کورد شەریان پێ دەکات یائەوان خۆیان شەریان بکەن نەك شان بەشانی جەیشی تورکی لەپێناوی مانەوەی پارتی دا بەڵام بۆ یەکێتی پێم ناخۆشە پارتی بەرهەمی ئەوشەرە دەخوات و یەکێتی نیشتمانی زەرەری لێ دەکات... یەکێتی لەو ماوەیە شەری لەگەڵ ئەو لایەنانە کردووە ..یەکێتی رۆژێك دەبێت باجی ئەوهەمو شەر کردنەی دژی لایەنەکانی کە بدات یەکێتی شەری ئەم لایەنانەی کردوە:

١-شەری پارتی و یەکێتی لە ١٩٧٦ یا١٩٧٧ لەابراهیم عەزۆ وە دەستی پێ کردووە پارتی شەهیدی کردن

٢-شەری حسك و یەکێتی .

٣-شەری شیوعی و یەکێتی .

٤-شەری پاسۆك و یەکێتی .

٥-شەری لەشکری ئیسلامی و یەکێتی .

٦-شەری بزوتنەوەی ئیسلامی و یەکێتی .

٧-شەری پارتی و یەکێتی ١٩٩٢ دژی PKK .

٨-شەری (PKK) و یەکێتی ساڵی ١٩٩٤ .

٩-من تێناگەم ئەم دووحزبە بۆ بە شەر دەیانەوێ مەسەلە سیاسیە کان یەکلای بکەنەوەو بەرژەندیەکان لە شەردایە یا حەقە هەردولایان تەنها بیر لەخۆیان نەکەنەوەو ئاورێك لەخەڵکی کوردستان بدەنەوە .

لە١٩٩٢/١٠/٢ وە شەری (PKK) دەکەن ئەم شەرە تاوانێکی نەتەوەییەو کارێکی خراپە دژی کورد بکرێت چونکە (٢٠) ملیون کورد لە کوردستانی تورکیادا بەکورد نازانێ و پێیان دەڵێت تورکی شاخاوی دەبێت چی بۆ یەکێتی و پارتی بکات تورکیائیشی بەپارتی زیاترە یەکێتی بەناحەق خۆی گیرۆدەی شتی وا دەکات و دەیانەوێت ئێمەش توشی شەری کوردی تورکیا بکەن ئێمەش سیاسەتی (PKK)مان پێ خراپەو کاڵو کرچ و ئەقڵیەتی سەیریان هەیە بەرنامەی ئەوان خەت بەسەر هەموو حزبەکان دەهێنێ بەلاّم لەگەڵ ئەوەش نوێنەری گەورەترین پارچەی کوردن و هەوڵیان لەگەڵ بدرێت رێگایان پیشان بدرێت نەك توشی هەڵەیان بکەین نەدەبوویەکەم سوپای کوردی یایەکەم پەرلەمانی کوردی ببێتە جێگای بریاری شەری کوردبکات... نەدەبوو یەکەم حکومەتی کورد شەری کوردی پارچەیەکی کەی کوردستان بکات ئیشی ئەوان نیەو تەنها دوژمن سود لەو وەزعە وەردەگرێت و کوردیش زەرەرو باجەکەشی دەبێت کورد بیدات بەلاّم یەکێتی زۆرتر سورە پارتی و یەکێتی گەرمترن لەتورك بۆشەری (PKK) کەئەوەش لەدوا رۆژدا کاڵەك بەئەژنۆی خۆیان دەشکێنن بەهەر حاڵ ئێمە نەپارتین و نەیەکێتی و نە بریاری ئەوانیش لەسەرئێمە فەرزدەبێت شەرمان پێ بکەن هەرچەندە کاك سامی وکاك ملازم کەریم زۆر دەترسان و هەموو قسەی خۆی نەدەکرد دەیەوێت بیکات بەلاّم تائێستا حەزەری هەیەو نایکات وادەکەم قسەکەی بکات واتوشی بکەم

هەرچەندە خۆم تارادەیەك لێ ی تێ گەیشتوم كەزۆر دژی یەكێتی یە وەپارتیش زۆر دژی كاك سامی یە بەلاَم كاك سامی هەرپارتی و كاك مەسعودی پێ باشتربوو وەدژی كاك ئیدریس ی رەحمەتیش قسەی دەكرد دەلێت كاتی خۆشی ئەو لەكۆنگرە ڕێگای لەمن بەربەست كرد وادیاربوو كاك سامی ناچاریان كردبوو لەپارتی دەربچێت نەك بەقەناعەت بەهەرحالْ لەسەفەرەكە زیاتر لێ ی تێ دەگەم یاسەفەری توركیاو سەفەری ئێرانیشمان هەیە بزانین چۆن دەبێت ئەوانە رەئی خۆمن ئەگەر لەدوا رۆژدا هەر گۆرانێك بوو كەسێك هەر دەبێت لەداهاتوودا ئەو یاداشتەی من ببینێ وەئەگەر واش دەرنەچوو ئەوە قسەیەكەو كردومەو بابروات، لە١٩٩٢/١٠/١٦ لەتهران بوین وتارێكی رادیۆی یەكێتی باسی ئێران وكلكەكانی كرد كلكەكان دەبێت مەبەستی كێ بێت ئێستا ئێمە لەئێرانین و قسەكانیش بەئێمەیە، لەرۆژانی ١٧و١٨/١٠/١٩٩٢ هەرلەتهران بوین دووبارە لەرۆژی ١٨/١٠ رادیۆی یەكێتی ووتارەكانی لەسەر ئێران و(PKK) بوو وەقسەی زۆری بە(PKK) ووت، لە١٩/١٠ هەرلەتەهران بوین ووتارەكانی رادیۆی یەكێتی لەسەر(PKK)بوو قسەی زۆری بە(PKK) دەوت زۆری دور بوو لەراستیەوە.. كوشتنی كوردی توركیا خراپەو خیانەتی نەتەوەییە ئەوە دەقی ئەو قسانەیە لە١٨/١٠ لەیاداشتی خۆمدا لەتهران نوسیومە لەئوتێل مارلێك لەخیابانی ایران شهر لەتهران لەناو دەفتەرەكەم دەقەكەی ماوە، لە٢٢/١٠/١٩٩٢ كۆبونەوەكان تەواو بوو ئیشەكانمان كۆتایی پێ هات و ئێمەش گەراینەوە بۆكرماشان، لە٢٥/١٠ لەكرماشانەوە بەرێ كەوتین بۆ سنندج(سنە)، لە٢٦/١٠ لەسنەوە بەرێ كەوتین بۆ مەریوان و باشماغ و بۆ سلێمانی كۆبونەوەكانمان لەگەلْ لێپرسراوانی ئێرانی لەتەهران لەمجلسی شوراو سوپا لەقصری پیرۆزەو لەقودس و قەرارگەكانی كەو وەزارەتی دەرەوەو ناوخۆو زۆری كەش وەگەیشتینە هەندێك ئەنجام، لەرۆژانی ٢٧تا٣١/١٠/١٩٩٢ هەرلەسلێمانی بوین

و خەریکی ئیشوکارەکان بوین، لە۱۰/۳۰ لەسلێمانی یادی (۷۰)ساڵەی دروست بونی حکومەتی شێخ محمودمان کردەوە منیش بەشداربووم بەناوی حزبەوە لەوێ (۳) ووتار دانرابوو لەپێشا مام جەلال قسەی کرد و پاشان کاك دکتۆر رۆژنوری شاوەیس ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بوو دوای ئەویش من قسەم کرد لەجیاتی حزب مام جەلال لەقسەکانی دا زۆری دژی ئێمەبوو بەخوت و خۆرایی تێ نەدەگەیشتن مام جەلال بۆ ئەوەندە دژمان بێت من وانەبوم لەگەڵ ئەوان لەقسەکانی دا زۆرهێرشی کردە سەرئێران و کلکەکانی و بکوژانی قاسملۆ و شەرەف کەندی دەهێننە کوردستان و دەبێت گەل مەحکەمەیان بکات و حکومەت و پەرلەمان سنور دابنێن بۆئەوانەی دەیانەوێت حکومەت تێك بدەن من خۆم نەکردە خاوەنی قسەکان دوای مام جەلال کاك رۆژ قسەی کردوپاشان من قسەم کرد من هەستام بۆ قسەکردن مام جەلال هەڵساو رۆیشت من کەچوومە سەر مەنەسەکە بەپێچەوانەوە لەپێشا ووتم بەرێزان مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کە کەسێکی واشیان لەوێ نەمابوون پاشان ووتم مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان کاك دکتۆر رۆژ ودووسێ مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتیان لەوێ بوون ولەبەر وتارە کەی من کاك رۆژ و ئەوان دانیشتبون پاشانیش دکتۆر رۆژ لای ملازم کەریم و برادەرانیش گلەیی کردبوو ووتبوی مام جەلال قسەکانی هەمووی دژی ئێوە بوو ئەو لەپێشا ناوی مەکتەبی سیاسی یەکێتی هێنا و ئێمەش لەبەر ئەوەی ئێوە دژی ئێوە قسە کانی مام جلال بو هەڵنەساین کەچی ئێمەی خستە دواوە راستی کرد وابوو دەبوو ئەوان لەپێشەوە باس بکەم منیش قسەم کردو ووتم حکومەت و پەرلەمان بەخوێنی ئێمەو راپەرینی گەلی کورد هاتووەتە مەیدان و دروست بوون ئێمە خۆمان بەخاوەنی دەزانین و خۆشمان بەخاوەن ماڵ دەزانین ئەگەر پرس و رامان پێ نەکرێت لەهەر بریارێکدا بەشدار نەبین بریاری کەس قبوڵ ناکەین و

شۆرشمان کرد دژی رژێم ئیجازەمان لەکەس وەرنەگرتووە ئێستاش ئیجازە لەکەس وەرناگرین بەلاّم دەبێت هەمووومان پێکەوە چارەسەری کێشەکان بکەین ئەوەی بیر لەشەر بکاتەوە خۆی توشی هەلّە دەکات و ئێستاش نەشەرو نەئاشتی بەبێ ئێمە بریاردانی مەحالّەو ناش کرێت وەئەتوانین زۆرشت بکەین بەلاّم ئێمە وازمان لەهەموو ئیمتیازاتی خۆمان هێناوە و حکومەت و پەرلەمان و خەباتی دەیان سەلّەمان تەسلیم بەپارتی و یەکێتی کردووە ئەوە نەبێتە هەمو بریارێك هەرلای ئەوان بێت و ئێمەش خەلّکی ئەو ولاّتەین و دەبێت پرس و راشمان وەربگرێت پاشان لەسەر شێخ محمودو شۆرش قسەم کردو قسەکانی دژمان بەناحەق زانی بەلاّم نەمویست زۆر لەسەری برۆم، لە١/١١/١٩٩٢ لەسلێمانی بوین و سەردانی چەند مالّە شەهیدێکمان کرد، لەرۆژانی ٢و٣/١١/١٩٩٢ هەرلەسلێمانی بوین، لە٤/١١ بیل کلنتۆن بوو بەسەرۆکی ئەمریکا وسەرۆك بۆش بەلاوە نراو صدام حسێن قسەی کردو ووتی من سەرکەوتووبوم و من ماوم و بۆش و تاتچەر(سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا) لابران و نەماون لەخۆشیدا بەدەمانچە تەقەی کرد بەبۆنەی گۆرینی جۆرج بۆش، لە٥/١١چومە هەولێر برادەران ووتیان بەراستی زۆر باش بوو هاتی جاری پێشوو برادەران زۆر نارەحەت بوون پارتی و یەکێتی لەسەر دانانی گومرك هەرباشت کرد کەهاتی ئەمرۆش بروسکەمان بۆ کردبویت وادیار بوو بروسکەکە نەگەیشتبووە من ئەو رۆژە (٤٥) پێشمەرگە حیمایەم لەگەلّدا بوو بەلاّم هەموو پێشمەرگەی باش بوون ماوەیەك بوو یەکێتی بەتایبەتی و پارتیش بەگشتی گێچەلّیان پێ دەکردین و شەریان پێ دەفرۆشتین و لەوحصەی هەمان بوو لەمالیەی کوردستان پێشتر لەبەرەو دواتر لە حکومەت نەیان دەداینێ و دەیان بری لێمان یابەسێ مانگ جارێك دەیان داینێ ئێمەپێشمەرگەو حزبین تازەش سێ حزب بوین بەیەك پارتی تەرحی بریارەکانی دەکرد بەلاّم یەکێتی جێ بەجێ ی دەکرد یەکێتی بەحەق و ناحەق

هەردژی سۆسیالیست بوون و زۆریان زەحمەت دەداین لەکاتی یەکگرتنیش دا زیاتر لەکاتی شەری (PKK)شدا کەهاوکاریمان نەکردبون زیاتر لەسەرمان توندبوون سەرکەوتن بەسەر(PKK)دا زیاتر غرور بوون و شەریان پێ دەفرۆشتین لەسەر ئەوەی هەموو حەسارڕێکیان لەسەرمان دانابووحەساری ئابوریش ..مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندی کۆبونەوە پێشتر بریاربوو مانگی (٢)ملیون دیناربەحزب بدەن نەیان دا یاپارتی موافەقەتی نەدەکرد یا یەکێتی موافەقەتی نەدەکرد یاخود پارتی دەیکرد یەکێتی نەیدەکرد وەرسیان دەکردین ماندوشەکەتیان دەکردین... برسیان دەکردین لەسەیتەرەکان ئیهانەیان دەکردین...کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندیمان کرد و چارە چیە لەگەڵ یەکێ لەدەوڵەتەکانی ئەو ناوچەیەدا رێکەوین دژی ئەم حکومەت و پەرلەمانە یاخۆمان شەرێك بکەین بۆخۆمان یاملکەچی بکەین بۆبریارەکانیان یاتەسلیمیان بین کامیان هەڵدەبژێرین کاك سامی ومامۆستاسەعدو کاك قادرجەباری وهەندێکی کەیان ووتیان شەرمان پێ ناکرێت بێ دەوڵەتێك وەئەگەر دەوڵەتێك بهێنین و شەر بکەین دەڵێن پەرلەمان تێك دەدەن نەتیجە نەیان دەوێرا بڵێن بەلام رەئیەکەیان ئەوەبوو یەکێتی سەبەبی ئەوشەر پێ فرۆشتنەیەو پێویستە لەدژی ئەوان لەگەڵ پارتی یەکگرین و دژی یەکێتی تادەگاتە شەر و ئەوکات شەری یەکێتی لەبارتردەبێت خالەسەیدکاکەش دەیوت شەربکەین و زۆرمان پێ هات بۆ مخمور لەگەڵ عێراق برۆین من ووتم ئێمە ئێستالەگەڵ ئێران یاهەر کەسێکی کە چەك وەربگرن و بچین شەری یەکێتی و پارتی بکەین دەڵێن بۆ تێکدانی حکومەتەو پەرلەمانە من بەش بەحاڵی خۆم پەرلەمان و حکومەت بەهی خۆمانی دەزانم بەهی کوردی دەزانم و ناشمانەوێت شتێك خۆمان خەباتمان بۆ کردبێت و شەهیدمان بۆدابێت تێکی بدەین پارتی و یەکێتی خۆیان لەئەنجامدا تێکی ئەدەن بەلام بائێمە نەبینە هۆکاری

ئەوتێکدانە بەلآم پەیوەندیمان چاك بکەین لەگەڵ ئێران وەلەگەڵ تورکیاو دژی عێراقیش نابین هەمووئیحتمالەکانمان لەبەر دەست بێت ئێمەش هەرگیز دەست پێشخەری شەر نەبین خۆشمان لەشەرلابدەین بەلآم مەسەلەیەك هەیە دەڵێت (برسیەتی رەگی هاری پێوەیە) ئێمە ناتوانین دەستەوەستان بوەستین و ئەوان بەهەرناوێکەوە پارەی کوردستان کۆبکەنەوەو بیدەنە کۆنە جاش و ئێمەش ئەو هەموو پێشمەرگەی کوردستان ماندومالّ وێران نان نەبێ بیخۆین ئەوە شتێکەو قبولّ ناکرێت و غەدرەو ئێستا لێمان دەکەن ئێمە شەری عێراقمان کردوەو نەش ترساوین وەئێستاش دەتوانین لێیان تێك بدەین ئەگەر ئەوان مل بۆحەق رانەکێشن ئێمە بەقەدەر مەڵبەندێك یالقێکی ئەوانمان بدەنێ ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئێمە بەقەدەر سەرتیپ یا ئامر بەتالیونێکیان ئامر هێزێکی ئێمە بەقەدەر پێشمەرگەیەك حیسابی بۆ بکەن ئەگەر ئەوانە نەکەن ئێمە ناچارین گومرك دانێین لەکوردستان و هەموو جێگایەك بێ گوێدانە کەس لەسەر گومرك شەردەکەین و پێشمەرگەش بەکوشت دەدەین خۆ وازی لێ ناهێنین برادەران هەموویان پێیان باش بوو بەلآم دانانی گومرکیان پێ باش نەبوو ووتیان توشی شەر دەبین... ووتم لەبرسا پێشمەرگەتان دەمرێ خۆتان هیچتان نیە لەبارەگادا لقی دهۆك وکاك عومەربۆتانی ووتیان لای ئێمە ناتوانین چونکە پارتی هێزی زۆری هەیەو لێمان ئەدات کاك قادر جەباریش ووتی شتی وابکەین لەهەولێر دێنە سەر مەکتەبی سیاسی منیش ووتم بابێنە سەرمەکتەبی سیاسی خۆتان وەرن بۆ سورێن و بامەکتەبی سیاسی دووپێشمەرگەی لێ بێت و پێم خۆشە بچنەسەری وبیگرن ئەوکات قسەمان دەبێت و باشتر بۆئەوەی دیفاع بکەین لە خۆمان من خێر ئە کەم مقرێکمان بگرن کاك قادر وادیاربوو لەبەرەی کوردستانی ووتبوی ئەو گومرکە کەس رازی نەبووەو هەر فلآن خۆی دایناوە واتە (محمد حاجی محمود)چونکە لەقسەکانی پارتی و یەکێتی

دەردەکەوت و کاك سامیش ووتی من پێم باشە بەڵام باوەر ناکەم لەهەولێر بتوانین
داینێین کەس رازی نەبوو لەدهۆك و هەولێر گومرك دانێین منیش پێم ووتن بۆناچن
تەسلیمیان بىن وادیاربوو زۆریان رەئیان بەلای پارتی دا بوو من ووتم دوو رۆژی کە
دەوەستم برۆنە لای پارتی و یەکێتی داوا بکەن ئەگەر جێ بەجێیان نەکرد من
لەسنوری ئەو جێگای پەسەندبێت گومرك نەك هەر دادەنێم بەڵکو (١٠)مەتر لەپەنای
گومرك کەناویان ناوە حکومەتی هەرێم دادەنێم و ٢٥٪ وەردەگرین شەریش بکەن
سازو ئامادەین بۆشەرو بێ گوێدانە کەس و پێشمەرگەی شەریشمان هەیە هەمو
دونیا لە سەر گومرگ شەریەتی یەکێتی وپارتی چەند ساڵ شەریان بوو هەر لە
سەردەسەلات و پارە بوو ئێستا شەری هەردوو حزب یەکێتی وپارتی لە گەڵ pkk
لە سەر چیە ئەگەر لەسەر حاکمیەت و پارەو گومرگ نەبێت بۆ من شەر لە سەر
برینی نان وژیانی پێشمەرگەو حزب کە ئێستا بەستراوە بە گومرگە کانەوە ئەوان
دەستی بە سەر دا بگرن بیدەن بە جاش و کۆنە بەعسیەکان و ئێمە قوبوڵی
ناکەین چۆن بۆ ئەوان حەڵاڵە شەری لەسەر ئەکەن شەری کوردی پارچە کانی کە
ئە کەن و شان بە شانی سوپای داگیرکران بێ منە تانە کورد بە بەرچاوی جیهانەوە
دە کوژن بۆ حەڵاڵە بۆیان بۆیە منیش شەر لە سەر گومرگ و ژیانی رۆژانەی کادرو
خێزانی پێشمەر گەی حزب وکەسو کاری شە هیدان ئەو شەرە بە حەڵاڵ دە زانم
ودەشیکەم چیش دەبێت بابیبت بێمنەتیشم لێیان بۆیە دوورۆژم دانا بوو برادەرانی
مەکتەبی سیاسی خۆمان داوا لە یەکێتی وپارتی بکەنەوە جارێکی کەش وخۆشم بۆ
شەر ئامادە ئە کرد دوای (٥)رۆژ بروسکەیان بۆ کردم کەهیچ لایەکیان ئیجابی
نەبوون و وتبویان پەرلەمان و حکومەت بریار دەدات پەرلەمان وحوکومەت تەنها
هی پارتی ویەکێتیە ئیتر چۆن وبەچی دەنگێك ئیمە گوێ رایەڵی پەرلەمانێك بین
کەهەمویان کارمەندی پارتی ویەکێتی بن تەنها شایە تی ناحەق بۆ هەردوو حزب (ی

.ن . ك )و (پ . د . ك ) زیاتر شتێكیان له دەست نایەت قسەیەكیان پێ نیە جگە لەوەی قوڕمیش نەكرێن .

له١٩٩٢/١١/٢٥ لەباشماغەوە تاباخی بەختیاری و پیرەمەگرون و تاسەرتەك و شاربازێر و ماوەت و تەوێڵەوكێلە لای سەردەشت ودارەشمانەو ڕێگای بێخاڵ و ڕەواندوزوخەلیفان تەواوی خاڵەكانی گومرك لەپەنای (٥٠) مەتردا گومركی پارتی ویەكێتی دا گومرگمان داناو پێشمەرگەو كادری گومركیشمان داناو چادروفیشەك و دۆشكەش لەبەرزایەكی پەنادا داناو دەست بەكاربوین هەرچی هەوڵ و هەرایان كرد زۆرجار ئێمە هەرخاڵەكانی ئەوانیشمان داگیر دەكرد ئەو مانگە (٢)ملیۆن و (٢٥٠)هەزاردینار هەبوو بۆیارمەتی و مصارفی حزب یەك مانگی بەسەردا چوو كارەكان هەموو تەرتیب بوون دوای ئەوە هێزەكان خۆیان شەریان دەكرد لەسەر گومرك بێ ئەوەی حزب پێیان بڵێت ووتمان ئەوە نەبێت یارمەتی پێشمەرگە نیەو ژیان نیە هەركۆبونەوەو ڕۆژانە نامە نوسین گوێمان بۆكەس نەگرت هەردوولاش دەیانزانی هێزەكانی ئێمە كام هێزەن و شەریش دەكەن ئەوەش زیاتر وای كرد یەكێتی زیاتر شەرمان پێ بفرۆشێت ئێمە لەژێر فشاری سەركردایەتی خۆشمان بوین كەدەترسان لەهەولێر بڕۆنە سەریان من شەخصی قەناعەتم نەبوو شەرمان بكەن لەسەرچی ئێمەش حەقی ژیانمان هەیە و لەو وڵاتە بژین پێشمەرگەش بوین و حزب بوین هاوخەبات و هاوسەنگەریان بوین و حەق بوو خۆیان چارەسەری ئەوانەمان بۆبكەن و لەوكاتەش دا كاك ڕەسول مامند ئیعلانی كردو لەئێمە جیابوەوەو لەگەڵ یەكێتی دا پەیوەندی دروست كرد بەو ناوەی كەئەوان لایەنگری یەكێتی دەبن و یەكێتیش وەكو دووهەنگ لەدارێكدا بدۆزێتەوە بەپەلە كۆیان كردنەوەوكونگرە شیان بوگرێدان كاك قادری حاجی عەلی ئەندامی مەكتەبی سیاسی یەكێتی یان نارد لەكۆنگرەیاندا بەشداریان كردو قسەیان كرد گوایە حزبیان

هەیەو لەوبابەتە ئەوەش هاندەرێك بوو بۆ یەكێتی دژمان و كەوتنە گێچەڵ كردن

پێمان لەرانیەو قەڵادزەو كۆیەو شەقلاوەو كفری ئێمە چەندجار سەری یەكێتی مان

دا و قسەمان لەگەڵ كردن بەڵام من پێم وابوو لەوكاتەدا كاك سامی لەگەڵ كاك

قادرجەباری‌وكاك ملازم كریم ومامۆستاسەعد لەگەڵ پارتی شتێكیان بەگوێ یاندا

چرپاندبوو واتەلەپشتیی ئێمەوە كرابو دوایش دەركەوت ئەوانە هەمووی دژی ئێمە

بوون ودژی ئێمەش دەكران من گەیشتمە هەولێر و بروسكەیەك هات لەسلێمانیەوە

ووتیان ئەمرۆ بەیانی زوو لێپرسراوێكی ناویەكێتی ئاگاداری كردوین كە دۆست

وبرادەری كۆنی خۆتە... كاك(ح.غ) ووتبوی من ناتوانم بیگەمێ وپیلانێكی

خەتەریان بۆداناوە بۆلەناوبردنی فریای بكەون ئەمرۆ یەكێتی وپارتی بریاریان داوە

یابیگرن یابیكوژن ١٠٠٪ وایەو ئاگاداری بكەن جگە لەبروسكەكەش كاك عەلی

بچكۆڵ و قوەتێك لەسلێمانیەوە زۆر بەپەلە گەیشتنە هەولێر چونكە عەلی وتی كاك

حامید پێی وتم كەمەسەلەكەیان دەزانی من كەبروسكەكەم دی بەلێپرسراوی

پێشمەرگەكانی خۆم ووت لەگەڵ كاك سامی و كاك مولازم كەریم و چەند برادەرێكی

كەش ئەوانیش (٣٠) كەسیان لەگەڵدابوو منیش (٤٥)پێشمەرگەم لەگەڵدا بوو راست

چوم بۆبارەگای بەرەی كوردستانی كارگێر بەڵام هەرچیم كرد دەمانچەیەكم دەست

نەكەوت بریارم دابو ئەوەی قسەبكات دژم تەقەی لێ بكەم هەرچیش لە

كۆبونەوەكەدایە یا هەموی بكوژرێ یا كەس بەسەلامەتی لەو كۆبونەوەیە بە

سەلامەتی دەرنەچێت پێشم عەیب بوو كلاشنكۆف بەرمە ژوورەوە بەڵام

پێشمەرگەكانم لەسەر پەنجەرەكان دابەش كردبوون وتم هەرچی هەبوو نەیەڵن

كەسی لێ دەربچێت بەئار.بی.جی . بەمنیشەوە هەموی بە ئاربی جی بسوتێنن

بەڵام كەس دەرنەچێت (٣) كەسیش هاتبوونە بەردەم دەرگاكەوە من لەژوورەوە

بووم ووتیان لەدەرەوە بانگت دەكەن چوم وادیاربوو ئەو هێزەی سلێمانی

گەیشتبون لەگەڵ من داوایان کرد کۆبونەوە کە بەجێ بڵێم و لەوێ نەبم باشەر نەبێت من شتی وام قبوڵ نەکرد و ئەوانیش بەدەوری هێزەکەی کەدا دامەزران و هەمووسوچەکان گیرابوون هەز لەوکاتە دا ئاگام لێبو هەواڵیان بەکاك کۆسرەت دا لەدەرەوە سۆسیالیست هێزی کەیان هێناوە وتیان کاك کۆسرەت وتویەتی با دوودۆشکای کەش ئێستابێت بۆ سەری کۆڵانەکە  من شەخصی نەمدەزانی چیەو مەسەلە لەسەرچیە بۆ وامان لەگەڵ دەکەن هیچ جارێك بەرەی کوردستانی قیادەی سیاسی کۆدەبونەوە مام جەلال و کاك مەسعود پێکەوە نەدەهاتن بۆ کۆبونەوە هەمیشە یەکیان دوای ئەوی.کەیان دەهات بۆ لەشەنسی ئێمە ئەو رۆژە هەردووکیان پێکەوە هاتبون هەردوکیان پێش هەموو کەس هاتبون ئێمە چوین من لەخوارەوە دانیشتم وکاك سامی وکاك مەسعود ومام جەلال لەریزی سەرەوە وکاك عەزیزمحمدسکرتێری حزبی شیوعی عراقی و کاك کۆسرەت وکاك دکتۆرفوادسەرۆکی حکومەت بوو دکتۆر رۆژو هەموو مەکتەبی سیاسی هەردوولا لەوێ بوون کاك قادرجەباری رەنگی تێك چوبوو وادیار بوو شتێکی دەزانی وباسی نەدەکردو ئەوخۆی قورتار کردبوو ئەووەزعەیان هەموو بەسەرمندا دابوو کامێرا خۆی کرد بەزۆرداو رەسم گرتن دەستی پێکرد لەهەموو لایەکەوە مام جەلال وادیاربوو پەلەی بوو هەر ووتی تەواو نەبون تەواونەبوون کامێراکان.. وتی هەموو کامیراکان بچنە دەرەوە رۆیشتن ووتیان مەحزەری کۆبونەوەی قیادەی سیاسی پێشوو بهێنن ئەو کۆبونەوەی بریاری شەری (PKK)یان لێ دابوو من بروسکەم کردبوو ئێمە نەعەسکەری و نەسیاسی ونەراگەیاندن دژی (PKK) نین پارتی و یەکێتی خۆیان شەری بکەن سەرکەوتوو بون بەسەر(PKK) دا یەکێتی شەرەکەی کردو لەدواجار کاك کۆسرەت هێزی بردبوو (PKK)شکابوو کاك عوسمان ئۆچەلان ناچار کرا شەر بوەستێنێت کاك نەوشیروانیش لەوێ بووبەناوی ئاشتی بەلام قیادەی شەری دەکرد

لەبرادۆست ولای سیدەکان ومالّی کاك کەریم خان کاك قادر مەحزەرەکەی هێناو هەردەستی دەلەرزی و دووسیێ خالّی خوێندەوە خۆی لەوەی مام جەلال و کاك مەسعود دەیانویست خۆی لائەدا منیش جگە لەو هەوالانەی لەسلێمانیەوە پێم گەیشتبوو لەوماوەیەش راگەیاندنی یەکێتی تەرکیزی لەسەرمان کردبوو شتێکی کەمم لارون نەبوو مام جەلال ووتی خالّی یەکەم... خالّی یەکەم... وتی خالّی (PKK)یش کەبەرەی کوردستانی ئیتر بریار ئەدات بەره هەروەکو ناوەکە هەبێت و بوەستێت لەچالاکی و مەقەری پارێزگاکانی نەمێنیێ و دابەش بکرێت ئەشیاکانی چونکە ئیتر هەموو شەرعیەتێك دەگەرێتەوە بۆ پەرلەمان و حکومەت ئیتر سەیتەرەی ناشەرعی و گومرکەکانی ناشەرعی ئەوانەی حزبی یەکگرتن داینەوە هەموی کۆبکرێتەوەو حیسابیان لەگەلّ بکرێت و تەسلیم بەحکومەت و پەرلەمان بکرێن مام جەلال نەی هێشت کەس قسە بکات ووتی بەمن ئێوە دەتانەوێت حکومەت و پەرلەمان تێك بدەن ئێوە بەدەستی ئێران بکوژانی قاسملۆو شەرەف کەندی دەهێننە کوردستان ئێوە دەستتان لەگەلّ دوژمنانی کورد تێکەلّ کردووە دکتۆر محمود بەکاری سیاسی وتۆیش بەکاری عەسکەری دەتانەوێت حکومەت لەناو بەرن حاکم جەمالتان کوشت و دکتۆر نافیع تان کوشت و ژنێکی ووت کوشتوتانە و ئێوە ئەوەتان لیێ قبولّ ناکەم و مەقەرەکانتان دەگرم کاك سامی ویستی قسە بکات مام جەلال رێگای نەداو منیش چاوەریێ ی تەواو بونی قسەکانی بووم مام جەلال ووتی من هەر لەکۆبونەوەی وا دانانیشم ... مام جەلال تەواوی کردو کاك مەسعود سەیری منی کرد و ووتی ئەو قسانەی مام جەلال هەموی قسەی پارتی و رەئی من و قسەی منە دیفاعیشی لیێ دەکەین من ووتم ئەگەر شەر بێت ئێمە شەری عێراقمان کردووە ئەگەر بکوژی قاسملۆ و شەرەف کەندی مەبەست ئاغای جعفری بێت ئێستا میوانی خۆتانەو لەشەقلاوەیە لەوکاتەدا لەشەقلاوە بوو

ئەگەرحاجی مستەفەوی بێت ئەویش ئێستا لەهەولێرە ومیوانتانە هەندێکی ناوهێنا
من هەرناوم نەبیستبون جگە لە د نافیع ئاکریی نوسەربوو لە رادیۆو وتەلەفزیۆنی
کەرکوك لە ساڵی هەشتاکاندا جارجار لە تەلەفزیۆن ئەمانبینی هەر نەشم ئەناسی
خۆیان بەتایبەتی یەکێتی لە دوای گەرانەوەی هێزە کان لە ئازاری ١٩٩١دا کەوتنە
تۆڵە سەندنەوەو کوشتننی خەڵکی سەر بە لایەنەکان بە تایبە تی کادرە کانی
سۆسیالیست زۆری موستەشارەکان لە ترسی(ی .ن .ك) بونە پارتی وهەندێکیشیان
هەڵهاتن بۆ بەغدادو هەندێکیشیان لە ترسا بونە یەکێتی ئیتر بەحەوت ئاو شۆرانەوە
هیچیان لە سەر نەما منیش وتم حەق بێت ئێمەش حەقمان هەیە لەم وڵاتەو ئەگەر
بەقسەو گفتوگۆو برایانە بێت ئامادەین بەڵام ئەگەر بەزۆر بێت ئێمە باوەر ناکەم
قبوڵی زۆر بکەین مام جەلال قسەکەی پێ بریم و هەڵساو چووبۆ ژوورەکەی ئەودیوو
وە ووتم ئەگەر شەرمان پێ دەفرۆشن بفەرموون هێزەکانی هەردوولا بهێنن و
شەرمان بکەن وامنیش دەرۆمەوە بۆسلێمانی من هەڵسام کاك مەسعود هەڵساو
چووە لای مام جەلال و گەرایەوە بەپەلە پێشمەرگەی ئێمە چوار دەوریان گرتبوو
هەندێك هاتنە ژوورەوە دەست لەسەر تفەنگ کۆمەڵێك مەسئولی گەورە لەترسا
چوبونە ئاودەستەکە (توالێت) کاك مەسعود گەرایەوە ووتی تکا دەکەم مەرۆ
دەرەوە باقسە بکەین کاك کەریم و کاك سامی داوایان کرد من ووتم نەلێرە
دادەنیشم و نەلێرەش دەبم بەزۆر دایان نایەوە کاك دکتۆر فوئاد سەرۆکی
حکومەت بوو کاك دکتۆر پیاوێکی ناسکە لەشانسی مندا ئەویش شەری دەکرد
ووتی تاسەعات (١٢) نیوەرۆ دەبێت گومرك داخەن منیش ووتم تاسەعات (١٢)ی
نیوەرۆی یەك مانگی تر دای ناخەین کاك فرانسۆ ووتی ئێوە چەکتان لەئێران
وەرگرتووەو لەناڵپارێزەوە بردوتانە بۆمیری سور لەوکاتەدا (٧٠٠)پارچە چەکمان
لەئێران وەرگرتبوو لەگەڵ ئازوقەیەکی زۆروفیشەك ووتم ئێوە هەربۆتان نیە قسە

بکەن ئێوە کوردی ئێرانتان کوشتووە ووتی ئێمە خۆمان بەخاوەنی کورد
ئەزانین وکوردی خراپ تەمێ ئەکەین و سجنی ئەکەین ودەیکوژین لەوەلأمی قسەی
من بۆکاك دکتۆر فوئادوبۆ پارتی ویەکێتی هەمیشە دژی یەك بون لە دژی ئێمە
ئەوەندە سەیرە کاك فرانسۆ بەرگری لە یەکێتی بکات لەو هەرایەدا پێکەنینم
دەهات بەو سیناریووەیە و کاك کۆسرەت ووتی (PKK)یش نەی دەکرد یاملی
نەئەدا واتان لێ دەکەین وەکو(PKK) منیش ووتم سنوری تورکیا لەئێمە دوورە
دەبابەی تورکی تان لەگەڵدا بێت بۆسەرمان وەزۆریش لێتان بێ منەتین کاك
مەسعود چووە ئەو دیوو گەرایەوە من ووتم دەرۆم و حکومەت هی خۆتانە و هەر
بریارێك شتی وا ئەبێت جێ بەجێ ی ناکەین و قبوڵشی ناکەین کاك مەسعود
جارێکی کەو کاك کەریم داوایان کرد دانیشم و کاك مەسعود پێ دەچو هەوڵی دابێت
لەگەڵ مام جلال کەوەزعەکە لەیەك نەترازی هەستم کرد کاك مسعود قسەکەی خۆی
بە غەدر زانی لەسەر ئێمە بۆیە دەیویست هۆڵەکە هێورکاتەوکاك مسعود ووتی مام
جەلال کۆبونەوەی هەیەو داوای ئەوە دەکات کۆبونەوەکەی ئێرە هەر بەدەوام بێت
و من لێرەم منیش پێم ووتن مام جەلال بروات یەعنی کۆبونەوەکە کۆتایی هاتووەو
منیش دەرۆم لەحاڵەتی تەقەدا بوو هەرئێستایا کەمێکی کە کاك مەسعود
لەقەسەکانی خۆی یەکەم جار کردی پەشیمان بوەوە کەزانی وەزعەکە
لەتەقینەوەدایە یەکەم جارمن زۆر لەقسەکەی کاك مەسعود تورە بووم و پێم
ناخۆش بوو دیاربوو مام جەلال شەری پێ دەفرۆشتین بەلأم کاك مەسعود بەو
جۆرە نەبوو پێش ئەوە پشتیوانی لە ئێمە ئەکرد کاك مسعود لە بەر ئەوە چاوەرێی
ئەو هەڵوێستە نەبوم لەکاك مسعود قسەکەی کاك مسعودم لە قسەکانی مام جەلال
زۆرتر پێناخۆش بوو کاك مسعود داوای لەمن کرد نەرۆم و ئەو لەجیاتی مام
جەلالیش قسە ئەکات بۆچارەسەری کێشەکان کاك دکتۆر فوئاد ووتی تۆ چیت

دەوێت ووتم کاك دکتۆر من نازانم ئێوە چیتان لەئێمە دەوێت بۆشەرمان پێ دەفرۆشن کاك دکتۆر فوئاد ووتی ئێمە دەمانەوێت شتەکان رێك بخەین و حکومەت ئیشەکان بکات ووتم کاك دکتۆر ئێمە پێشمەرگە نەبوین... ووتی بەڵێ... ووتم حەقمان نیە لەم وڵاتە بۆدەرمان دەکەن و دەمانکوژن هەندێك بێ دەنگ بون و پاشان کاك مەسعود داوای کردقسە بکەین وچیمان دەوێت حکومەت بۆ ئێمەی بکات پێم ووتن ئێمە هیچمان لەئێوە ناوێت ئێمە حەقی خۆمانمان دەوێت ووتی باشە حەقی خۆتان چیە پێمان بڵێن ووتیان کۆبونەوەی کە ئارەزووی خۆتانە ئێمە گومرك لانابەین و شەری لەسەر دەکەین تاهەموو ئەوەی حەقی خۆمانە جێ بەجێ نەکەن ووتیان بڵێ منیش پێم ووتن :...

١-چوار هەزار پێشمەرگە لەسوپای کوردستان وەربگرێت بۆجەیشی یەکگرتوی کوردستان.

٢- لیوایەك کە لە ئامر لیواوە تا دوایی خۆمان دای دەنێین و مەقەری فەوجێك لەدهۆك و فەوجێك لەهەولێر و فەوجێك لە کەرکوك و دووفەوج لەسلێمانی و مەقەری لیوا لەسلێمانی بێت

٣-لەهەر چوار پارێزگاکە قیادەی عەسکەری (١٦) کەسمان هەبێت لەهەر پارێزگایەك و قیادەیەك (٤)کەسمان هەبێت .

٤-جێگری وەزیری پێشمەرگە بۆ ئێمە ووتیان کاك قادر قادر و هی پارتیە ووتمان سەرۆکی ئەرکان ووتیان کێ دادەنێن کاك ملازم کەریم لەپەنامابوو ووتم کاك کەریم دادەنێین، هەروەها ووتم دوو وەزیرو دووجێگر وەزیر لەجێگاکانی کەش وە(٤٠٠)پۆلیس بۆ حیمایەو حەرەسی مەقەرات لەگە ل ٢٥٠ فەرمانبەری گومرك و پۆلیسمان هەبێ لەحکومەت .

٥-مانگی (٣)ملیۆن دینار بۆحزب .

٦–هـەموو مەحزەرەکـەش بنوسـن ئـەوکات ئاگـاداری خاڵـە گومرکـەکان دەکـەین لـەجێگای خۆیـان راوەسـتن و گـومرك نەکـەن تـا ئاگاداریـان دەکەینـەوەو ببنـە کارمەندی گومرك و هەرلەوێش برۆنە خاڵەکان چونکە ئێمە چییان لێ بکەین ووتیان هەمووی باشەو موافەقەت دەکەین بـەلاّم هەریەکـە وەکـو کـاری ئوسـوڵی لـەرێگاو جێگای خۆیەوە بەلاّم وەزیـری عـدل تـان دەدەیـنێ و جێگـر وەزیـریش قـسەی لـێ دەکەین بۆ پارەکەش مانگی (٢)ملیۆن دوای مناقەشـەیەکی زۆر برادەرانـی خۆمـان رازی بوون ئەوان داوایان لەمن دەکرد قبوڵی بکەم واتە وەفـدە کـەی خۆمـان کـاك سامی وکاك ملازم کریم مامۆستا سەعد ئەوەیان بە زۆر دەزانی برادەرانی خۆشمان چـونە ریـزی یـەکێتی و پـارتی ئـەوانیش داوایـان لـەمن دە کـرد قوبـوڵی بکـەم بـۆ پێشمەرگەش (٣٧٠٠) پێشمەرگەیان بۆ کردین ئەویش هەر برادەرانی خۆمان داوایان لێ ئەکردم رازی بم هـەموی کـراو منـیش (١٤) رۆژ دوای ئـەو کۆبونەوەیـە ئاگـادارم کردن هەریەکە لەجێگای خۆی بێت بـەلاّم گـومرك نەکـەن ئـەو کۆبونەوەیـە ئـەوەی پەیوەندی بەکارەکەوە هەبوو سەرۆك و وەزیران د فوئاد معصوم ودکتۆر رۆژ نوری شاوەیس جێگرەکەیی و وەزیرەکان هەمووی لەوێ بون کۆبونەوەو هەموو شتەکان هەرلەوێ دەکران هەمان رۆژ مام جەلال هەڵسا بوو دەورەی کادرانیان هەبوولەوێش هەتاتوانی قسەی پێ وتین و رادیۆو تەلەفزیۆنیش هەربلاّوی دەکردەوە لەسەرمان، لە٦/١١/١٩٩٢ هەرلەهـەولێر بـوم بۆئـەوەی شـتەکان جـێ بـەجێ بکـەن بـەلاّم هـەر دوایان دەخست منیش ووتم یەك خاڵ دوا بخەن منیش گومرکەکـە هـەردوا دەخـەم وبەردەوام ئەبیت ٢ملیون دینارەکە هەرلەوێ کرا هێشتا من هەر لە کارگێڕی بەرەی کوردستانی بوم پـارە کـە یـان کـەمتر لەیـەك سـەعات جـێ بـەجێ کـرا کـاك رێکـار ئەحمەد لێپرسراوی مالی بوو ناردمـان بەسیارەکەی مـن بـە یـەك سـەعات پارەکـە وەرگیرا لەگەڵ کاك نەوزادی شێخ ئەحمەد کە جاران دوومانگ ئـە م سەروسـەریان

پـێ دەکـردین لـەرۆژانی ١١و١٢/١١/١٩٩٢ لەسلێمانی بـوین لەحاڵـەتی نەشـەرو نەئاشتی بوین و هێزی پارتی و یەکێتی ئامادە بون بۆسـەرمان بۆشـەر بـەڵام ئێمـە لەوان ئامادە تر لەهەموو رێگا ئەساسیەکانمان لەدەست بوو رێگای بێخاڵ و گـەلی عەلی بەگ و رێگای قەڵادزە کێلێ و رێگای پێنجوێن و هەڵەبجە و سـەید صـادق و باریکـەو عەربـەت و دۆڵەسـورو تەراتـەوەن و زۆر جێگـای کـەشمان بـەقائیمی دامەزرابوین لەسەرتەك وجێگاکانی کـەش لـە١١/١٣ هەرلەحاڵەتی نەشەرونەئاشتی بوین لەگەڵ یەکێتی و پارتی دا بەتایبەتی لەگەڵ یەکێتی کە بەئاشکرا شـەریان بـی دەفرۆشتین هەر لەو کاتەشدا کاك فرانسۆوهێزێکی پـارتی بـە (٩) لـۆری لـە سـەدی بێخمە باریان فرۆشتبو بە عمرئاغای سورچی یەکێتی وپارتی پێشمەرگەی ئێمـەش رێگای نە ئەدان بیبەن بۆ ئێران ئەوانیش دەیـان ویست بـە زۆر بیبـەن لـە خلیفـان پێشمەرگەی سۆسیالیست نە یان هێشت خەڵکی خـەلیفان رژانـە سـەر جادەو دارو بەردیان دانا کاك فرانسۆو هێزەکـە بەپەلـە دەرچـون لەدەسـتی خـەڵکی دوای کـاك فرانسۆ داوای نامەی لە من کرد بە ناوی کاك مسعودو مـام جەلالـەوە کـە رێگـا یـان بدەین منیش وتم نەدەبو ئەورۆژەی خەلیفان لـە خۆتانـەوە برۆیـشتایەن نامـەم بـۆ نوسی بۆ کاك ئەنوەر سەعید بەگی ناوەندی وکـاك مەلاکـەمال رەوانـدوزی رێگایـان دابون لەلایەن پارتیەوەئاگادار کراین کەشەوی ١٣-١٤/١١/١٩٩٢ هێزێکی هاوبەشی پـارتی و یـەکێتی دەچـنە سـەر مەقـەری پێنجـوێن وکـانی مانگـا(٤٢) سـەیارەن دۆشکەیان پێیە بەڵام پارتی شەری ئێـوە ناکـات هێزەکـەی پـارتی (٢١) سـەیارەن لـەدواوەن و نزیکـەی (٥٠٠) مـەتر بـەینیان لەگـەڵ سـەیارەکانی یـەکێتی دا هەیـە سەیارەیەکی لاندکرۆز خەتێکی سور لەناوەندی دایە هی مەسئولی هێزی پارتیە کـە کاك ئەنوەر حاجی عوسمانە لەدواوە دەبێت کاك ئەنوەر نوسیبوی لـەرێگای شـێخ تۆفیقـە وە کـە سـەیارەکەی ئـەو رەنگـی وایـە و خـەتی تێدایـە ئەگـەر تەقـەبوو

لەسەیارەکانی یەکێتی بدەن ئێوە تەقە لەوانی پێشەوە بکەن لەدەفتەرەکەمدا ئەو
ڕۆژە نوسیومە ئەمرۆ لەگەڵ یەکێتی لەحاڵەتی شەردا بوین، لە١٥/١١ هێزێکی چل
پەنجا سەیارە پێشمەرگەیان کۆکردەوە لەوە زیاتر بو پارتی بە ئێمە یان وتبو
هێزەکە بەقیادەی کاك نەوشیروان مستەفا ناردە سەر هێزەکانمان و خاڵە
گومرکەکانی ئێمە بەلام پارتی ئاگاداری کردین و هەندێکی دو ستەکانمان لە
ناویەکێتی شەو ئاگاداریان کردین هێزێك ئامادەکراوەو بریاری شەریان پێ یە
ئەورۆژە ئێمە لەرێگا بەرزنجە (٤)پێشمەرگەیان دانابووکەپرێکیان کردبوو
هەربۆچاودێری ئەوناوە کاك نەوشیروان رۆیشتبوو چوار کەسەکە خۆیان شاردبوەوە
پێشمەرگەی هێزە هاوبەشەکە لای کەپرەکە وەستابوون کاك نەوشیروان وتبوی
ئەوە بۆ وەستاون بیسوتێنن و خۆشیان بگرن بیانکوژن هەرلەوێ بەتانیە شرو
کەپرەکەیان لەبەرچاوی ئەو خەڵکە سوتاند بەقیادەی کاك نەوشیروان وادیاربوو
ماوەیەك بوو شەری ناوخۆی نەکردبوو ئەم جارەیان لەسەرمۆدێرن و بەناوی
حکومەت و پەرلەمانەوە شەڕی دەکردین ووتبوی تاپێنجوێن چیتان دەست کەوت
بیسوتێنن و بیانکوژن هەدیەتان دەدەمێ پێش ئەوەی بگەنە کانی مانگا پێشمەرگە
ی سوسیالیست ئەم دیوو ئەودیووی شاخەکەو جادەکەیان بەدێژایی (٣)کم گرتبوو
(بی.کەی.سی)یان لەسەر دانابوو هێزەکە کاتێك گەیشتبونە سەیتەرە لەپێشەوە
ئاگایان لەخۆیان نەبوو هەموو خۆیان بەسەیارە هەڵدابووە خوارو داوای چەك
دانانیان لەو (٣٠-٤٠) پێشمەرگەی سەیتەرەکە کردبوو بەدێژایی هێزەکە پێشمەرگە
لولەی چەکی خستبووە سەر سەیارەکانیان و پێیان وتبون راست برۆنەوە ناو
سەیارەکانتان لەجێگای خۆتان بجولێن هەرخۆتان دەزانن چیتان بەسەر دێت
هێزەکە زۆر ترسابوون و سواری سەیارەکان ببونەوە وتبویان کاك نەوشیروانمان
لەگەڵ دایە ئەوانیش وتبویان دەزانین و ئێمەش بۆ ئێوە دانیشتوین کەدێنە

سەرمان کاك نەوشیروان هاواری کرد بوو لەوانەی خۆیان کەس دانەبەزێ و داوای لەئەوانەی ئێمەش کردبووکەس تەقە نەکات و بامەسئولەکەتان بێت مەسئولەکەش وتبوی باشە من لێرە قسە ناکەم ئێوە برۆنە پێنجوێن و کاك عەتا سەراوی جاران لەگەڵ مەکتەبی سیاسی دانە ئە نیشتن چەندین جارئەمری گرتنی کاك عەتایان بۆگرتنی دەر کردبو بەڵام ناچاری کۆی کردنەوە وکاك مەلا فائیق لەوێن و لەوێ قسە بکەن کاك نەوشیروان چوبوە پێنجوێن و لەوێش هێزەکانمان دەوریان گرتبون و پاشان لەبارەگای هێزی ئازادی سوسیالیست کاك نەوشیروان و لێپرسراوەکان لەگەڵ کاك مەلا فایەق وکاك عەتا سەراوی و برادەرانی کەش ئێمەش لەگەڵیان دانیشتبون و هەندێك خالّی سەرەکیان باس کردبوو نەشیان زانیبوو کەپرەکەی رێگای چەناغ چیان بەرزنجە برادەرانی ئێمە پێیان وتبوو کاك نەوشیروان تۆ حەقە چارەسەری کێشەکان بکەیت نەك هێز بخەیتە دوای خۆت و بێیتە سەر پێشمەرگەی ئێمە ئەوە سەرکردایەتی ئێمەو حکومەت و پەرلەمان ومام جەلال و کاك مەسعود هەموو شتەکانیان بریوەتەوەو تەواو بووە بۆدوو رۆژی تر یادرەنگ تر شەر ببێت خۆ بریارەکان هەمووی درابوو کەجێ بەجێ بکرێت لەسەر وەزیر مابوو سەرکردە سەربازییەکانیان بەڵام یەکێتی بەگشتی و کاك نەوشیروان بەتایبەتی بۆئەوەی بڵێن من بەزۆر پێم لابردن و من چومە سەریان و چاوی خەڵکی ترمان پێ بترسێنن بەڵام ئەوە بەزەرەری خۆیان شکایەوە بۆیە ئەو هێزە هاوبەشە نەك نەیتوانی هیچ بکات بەڵکو ئەگەر پێشمەرگە بیویستایە نەمان دەهێشت کەس بگەرێتەوە بەڵام ئەوە لەبەرژەوەندی کەس نەبووکەهێزو توانای ئێمەیان دی دوای ئەوە بەدووسێ رۆژ هەموو ئەوەی داوامان کردبوو حەقی خۆمان جێ بەجێ کرا بێ گیروگرفت، لە١٤/١١/١٩٩٢ گومرکمان راگرت وئاگادارمان کردن کەگومرك نەکەن، لە١٦/١٢ پارتی و یەکێتی داوای کۆبونەوەیان کرد کەچارەسەری کێشەکان بکەین و من پێم

ووتـن ئێمـه لەكۆبونـەوەكانی كەشـدا باسمـان كـردووە سـەركردایەتی سیاسـی و
حكومـەت و پەرلـەمان و مـام جـەلال وكـاك مەسعود هـەموی دەزانـن و لێـرە كـاك
نەوشیروان هێز كۆدەكاتەوە. سەرئێمە ئەوە خزمەتی كـێ دەكـات لـەوێش تەئكیـدم
لەسەر ئەوە كردەوە دەبێت هـەموو بریارەكـانی كۆبونـەوەی ١٩٩٢/١١/٥ هـەمووی
جێ بەجێ بكرێت گومرك لانەبـەن ئـەوە بریـاری شـەرمان پێیـه ووتم جـائێوە كـەی
بریاری خێرتان پێ بووە ئەوكات وابزانم مامۆستا جەمال عبدول پارێزگاری سلێمانی
بوو ئێمه هەموومان مـه بەسـت بەكۆبونـەوەی قیـادەی سیاسـی رۆژی ١٩٩٢/١١/٥
وادیاربوو دەیانویست پێش ئەوە بەزۆر لامان بدەن و ئەوكات بریارەكان جێ بـەجێ
نەكـەن بـەئارەزووی خۆیـان بیكـەن و ئێمـەش هەرلەسـەر قسەی خۆمـان بـوین،
لـە١١/١٧ لـەرادیۆو تەلـەفزیون قـسەم كـرد لەسـەر حاڵـەتی نەشـەرو نەئاشـتی
كوردستان بەتایبەتی لەنێوان پارتی و یەكێتی لەگەڵ ئێمەدا قـسەم دژی هـەردوو لا
لەراسـتیدا یـەكێتی شـەری پێـدە فرۆشـتین ووتم كاتێـك ئێمـە شـۆرشمان كـردووە
لەكوردستان ئەوان لەرادیۆی بێگانەو رۆژنامە ئاگایان لەهەواڵەكانی كوردسـتان بـوو
دووسەعات قسەم كرد بەڵام لەهەولێر كاك سامی وبرادەران نەیان وێرابوو قـسەكانی
من بـڵاو بكەنەوە،لەبەریـەكێتی وپـارتی لـە١١/١٨لەسـلێمانیەوە چـومە شـارەزوور،
لـە١١/١٩ بـەرێ كـەوتم بـۆ پێنجوێن، لـە١١/٢٠ گەرامـەوە بـۆ سـلێمانی، لـە١١/٢١
لەسلێمانی سەرقاڵی ئیشوكار بووم، لە١١/٢٢ یادی گۆرانی شـاعیر بـوو لەسـلێمانی
لەهۆڵی رۆشنبیری كـاك محمـد رەسـول هـاوار كردیـەوە لەگـەڵ كۆمـەڵێك نووسـەرو
شاعیردا منیش دوای قسەم كرد وادیار بوو بریاریان دابوو پێـشتر پـارتی و یـەكێتی
كەمن رێگە نەدەن قسە بكەم ووتیان كەس قسە ناكات ووتم ئەگەر هیچ حزبێك قسە
ناكات و هەر نوسەران خۆیانن ئەوە باشەو پەخشانێكم لەسەری نوسـیبوو دامـنێ و
لەكۆرەكە بوین گـەمارۆی قسەكردنیـشان لەسـەرمان دانـابوو لـە سـاڵ یـادی كـاك

کامەران موکری وتیان نابێت هیچ حزبێك قسە بکا ت من وتم من وەکو نووسەرێك قسە ئەکەم ئەبو لە سەر فەرهەنگی کوردی زمانێکی یەکگرتوو بنوسین قسەم کرد دوای ئەوە نەیان دەهێشت بە ناوی یا لەبواری ئەدەبیشدا قسەبکەم ئەیانوت تۆ قسەت کرد مانای سۆسیالیست قسەی کردووە کە سی وا بە ناوی نوسەرەوە قسەی ئەکرد کتێبەکانی من لاپەرە کانی لە تەمەنی یا لە رۆژەکانی تەمەنی ئەو زیاتر بو من لە شاخ ئەندام بوم لە نووسەران لە جود لە زۆر کۆڕو کۆبونەوە ئەدەبیەکان بەشداربوم لە دوای ٩١یش هەرئەندامی نوسەران بوم تا ئەمرۆ( ٧)کتێب وناسیلکەم چاپکراوە جگە لە ٧ کتێب وبابەتی کەم ئامادەیە چاپە تەنها بەرگی ١و٢وناميلكەی شۆرش و پێشمەرگایەتیم (٢٠٠٠ ) لاپەرە زیاترە ، لە١١/٢٣ لەسلێمانیەوە چومە هەڵەبجە، لە١١/٢٤ چومە پێنجوێن و بناوەسوتەو گەرامەوە بۆ سلێمانی، لە١١/٢٥ لەشارەزوور چوم بۆراوە پۆر بەسەیارە لەو هەموو هەرایەدا فریای ئەوەش دەکەوتم... رۆژێك لەحاڵەتی شەر بوین وەلەگەڵ پارتی باش بووین چوبوم بۆ مەلعەبەکە بۆسەیری یاری کاك محمد دۆلاشی زۆر گەرابوو نەیدۆزیبومەوە دوای وتبویان چوە بۆ مەلعەبەکە بۆسەیری یاری هاتو ووتی شەری عێراق وئێران و کوردو عێراق و دونیایە بۆش چوبوو بۆراوەماسی وادیارە تۆیش وەکو ئەوت کردوە لەو هەرایەدا ئەمرۆش چوین بۆ راوە پۆرو دووپۆرمان کوشت ، لە١١/٢٦ لەسلێمانی بوم هەوا ساردبوو کارەبا نەبوو زۆرماندبووم خەڵکی وەزعی خراپ و هەردوو حزبی هاوپەیمانیش، لەجیاتی چاك کردنی وەزعی خەڵکی شەری (PKK) و شەربەئێمەیە دەفرۆشن و شەر بۆتورکیا دەکەن و شەربەئێران دەفرۆشن من تێ ناگەم لەو حزبانە سیاسەتیان چۆن کردووە، لە١١/٢٧ لەسلێمانیەوە چومە چەمچەماڵ کۆبونەوەیەکی گشتی هەبوو ئێوارەش گەرامەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ٢٨و١١/٢٩ هەرلەسلێمانی سەرقاڵی ئیشوکاری ئاسایی رۆژانە بوین، لە١١/٣٠ لەسلێمانیەوە

بەرێ کەوتم بۆ کۆیەو بۆهەولێر دوای ئەوەی نائومێد بوین لەکاک رەسول وئیعلانی حزبی کردو یەکێتی لەچەند جێگایەك مەقەریان بۆ کردەوە ئیتر ئێمەلەجیاتی سکرتێر کۆمیتەی سەرۆکایەتیمان هەڵبژارد لە(٣)کەس کاك سامی و کاك مولازم شوان و کاك دکتۆر محمود هەرلەگەڵ ئەو سێ کەسە بریاریان دا تا دکتۆر دەگەرێتەوە من لەجیاتی دکتۆر ئیشەکان بکەم کاك سامی و کاك شوان دا کەئەو سێ کەسە بریاری حزب بدات لەژوورەکەی مەکتەبی سیاسی (٣) کورسیان لەریزی یەك دانابوو بۆئەوەی هەرسێ کەسەکە لەسەری دانیشن لەجیاتی یەك کورسی ومێزێ کەبۆ مەسئولی یەکەمی هەر حزبێ دائیرەیەك دادەنرێت من قەت نەچومە سەر ئەو کورسیە هەرچی هەولیان دەدا بەخاڵە سەید کاکەم دەووت تۆلەوێ دانیشە یاچۆڵ بوو خوا زیادی کات کۆمیتەی مەرکەزی ئەوەندە زۆربوو جێگا نەدەبووەوە، لە١٩٩٢/١٢/١ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی بوو مام جەلال داوای کردبوو من ببینێ دوای ئەو هەموو هەرایەی پێ کردین و شەری پێ دەفرۆشتین منیش زۆرم پێ خۆشبوو چونکە مام جەلال بەناحەق ویاچۆن بۆوا لێمان تێ گەیشتبوو، لە١٢/٢ سەعات (٥)ی ئێوارە تا (٧/٣٠) لای مام جلال بوین و پێشوازیەکی گەرمی لێ کردین هەرچەندە رێگای حیمایەکانی منیان نەدا بێنە حەوشەکەیان و قسەیان پێ وتبوون بەلاَم کۆبونەوەکە زۆر باش بوو وەزۆر شتمان باس کردو زور شتمان بریەوەو پێم ووت مام جەلال ئەگەر زەخت بخەنە سەرمان بریارێك ئەدەین خۆشمان باوەرمان پێ ی نەبێت هەموو ئەوانەی لەحزبدان زۆریان بەرەو پارتین بەدوای بەهانەدا دەگەرێن و من تەنها کەسێکم رێگام لێ گرتوون لەوبارەیەوە زۆر قسەمان کرد لەو رووەوە (٢) (بی.کەی.سی)شم بەهەدیە بۆ دەستەکەی خۆی برد مام جەلال ووتی سبەینێ کۆبونەوەی سەرکردایەنی سیاسی و وەزیرەکانیش بانگ دەکەین و سەرۆك وەزەراو هەموو ئەوانەی باستان کردووە

من خۆم قسەم کردووە و هەموتان بۆجێ بەجێ دەکەین دڵنیابەو بەقسەی کەس دژمان مەبێ لەکۆبونەوە قسەی دۆستانەمان زۆر کردو گەرامەوە بۆ بارەگای مەکتەبی سیاسی لەسەر جادەی کەرکوك –قوشتەپە بوین لەپەنای زانکۆ ی صلاح الدین کۆبونەوەکە زۆرباش و سەرکەوتوو بوو، لە١٢/٣ کۆبونەوەی قیادەی سیاسی بەرە هەبوو حکومەتی هەرێمیش بەشداربوون ئەوانیش لەسەر جێ بەجێ کردنی ئیشوکارو خاڵەکانی ئێمە هەمووی موافەقەت کراو جێ بەجێ کران کۆبونەوەکە جەوێکی برایانەو باش و ئێمەش هەروا خۆمان ئامادەیشمان پیشان دا بۆ هاوکاریان و پشتیوانیان لەسەر ئەو ئەساسەی ئەوان ناحەقیمان پێ نەکەن و وازمان لێ بهێنن و بەمیوانمان نەزانن لەکوردستانداو خۆیان بەخاوەن ماڵ هاتینەوە برادەران ووتیان تۆ سەرت لەمام جەلال داوەو قسەکانی ئەو رۆژەت لە بەرەی کوردستانی هەندێك روی لەکاك مەسعود بووەو حەزیش دەکەین سەری کاك مەسعودبارزانی بدەیت و کاك سامی وبرادەران وەکو راست کردنەوەو پەنچا بەپەنجا ووتم سەری مام جەلالم داوە دەبێت سەری کاك مەسعودیش بدەم باکاك سامی لەجیاتی هەموومان سەری کاك مەسعود بدات پێ دەکەنی و خۆی دەیزانی من چی دەڵێم، لە١٢/٤ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیمان هەبوو لەهەولێر، لە١٢/٥ هەرلەهەولێر بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوین، لە١٢/٦ سەری مەکتەبی سیاسی پارتی و کاك مەسعودمان داو قسەمان کرد لەسەر هاوکاری ورووداوەکان بەلام پێش ئێمە کاك سامی بەتەنها چوبوو بۆلای کاك مەسعود و هەندێك قسەی کردبوو هەواڵەکەم پێ گەیشت ئەوانەی هەتا خزمی کاك سامی بون حەزیان نەدەکرد بەرەو پارتی زیاد برۆن و موافەقەتی ئەوانیش بەتایبەتی لەسەر ئەوچوار مەسئولە بۆقیادەی ناوچەکان کاك مەسعود ووتی لەپێشا ئەوانەی دهۆك بنێرن باتەرتیب بێت پاشان هەولێرو ئەوکات سلێمانی وکەرکوك بنێرن نەك یەکێتی کێشەتان بۆ دروست بکات لەوێش هەر کۆبونەوەکە

بەرێ کەوتم بۆ کۆیەو بۆهەولێر دوای ئەوەی نائومێد بوین لەکاك رەسول وئیعلانی حزبی کردو یەکێتی لەچەند جێگایەك مەقەریان بۆ کردەوە ئیتر ئێمەلەجیاتی سکرتێر کۆمیتەی سەرۆکایەتیمان هەڵبژارد لە(٣)کەس کاك سامی و کاك مولازم شوان و کاك دکتۆر محمود هەرلەگەڵ ئەو سێ کەسە بریاریان دا تا دکتۆر دەگەرێتەوە من لەجیاتی دکتۆر ئیشەکان بکەم کاك سامی و کاك شوان دا کەئەو سێ کەسە بریاری حزب بدات لەژوورەکەی مەکتەبی سیاسی (٣) کورسیان لەریزی یەك دانابوو بۆئەوەی هەرسێ کەسەکە لەسەری دانیشن لەجیاتی یەك کورسی ومێزێ کەبۆ مەسئولی یەکەمی هەر حزبێ دائیرەیەك دادەنرێت من قەت نەچومە سەر ئەو کورسیە هەرچی هەولیان دەدا بەخاڵە سەید کاکەم دەووت تۆلەوێ دانیشە یاچۆڵ بوو خوا زیادی کات کۆمیتەی مەرکەزی ئەوەندە زۆربوو جێگا نەدەبووەوە، لە١/١٢/١٩٩٢ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی بوو مام جەلال داوای کردبوو من ببینێ دوای ئەو هەموو هەرایەی پێ کردین و شەری پێ دەفرۆشتین منیش زۆرم پێ خۆشبوو چونکە مام جەلال بەناحەق ویاچۆن بۆوا لێمان تێ گەیشتبوو، لە٢/١٢ سەعات (٥)ی ئێوارە تا (٧/٣٠) لای مام جلال بوین و پێشوازیەکی گەرمی لێ کردین هەرچەندە رێگای حیمایەکانی منیان نەدا بێنە حەوشەکەیان و قسەیان پێ وتبوون بەلآم کۆبونەوەکە زۆر باش بوو وەزۆر شتمان باس کردو زور شتمان بریەوەو پێم ووت مام جەلال ئەگەر زەخت بخەنە سەرمان بریارێك ئەدەین خۆشمان باوەرمان پێ ی نەبێت هەموو ئەوانەی لەحزبدان زۆریان بەرەو پارتین بەدوای بەهانەدا دەگەرێن و من تەنها کەسێکم رێگام لێ گرتوون لەوبارەیەوە زۆر قسەمان کرد لەو رووەوە (٢) (بی.کەی.سی)شم بەهەدیە بۆ دەستەکەی خۆی برد مام جەلال ووتی سبەینێ کۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی و وەزیرەکانیش بانگ دەکەین و سەرۆك وەزەراو هەموو ئەوانەی باستان کردووە

من خۆم قسەم کردووە و هەموتان بۆجێ بەجێ دەکەین دڵنیابەو بەقسەی کەس دژمان مەبە لەکۆبونەوە قسەی دۆستانەمان زۆر کردو گەرامەوە بۆ بارەگای مەکتەبی سیاسی لەسەر جادەی کەرکوك –قوشتەپە بوین لەپەنای زانکۆ ی صلاح الدین کۆبونەوەکە زۆرباش و سەرکەوتوو بوو، لە١٢/٣ کۆبونەوەی قیادەی سیاسی بەرە هەبوو حکومەتی هەرێمیش بەشداربوون ئەوانیش لەسەر جێ بەجێ کردنی ئیشوکارو خاڵەکانی ئێمە هەمووی موافەقەت کراو جێ بەجێ کران کۆبونەوەکە جەوێکی برایانەو باش و ئێمەش هەروا خۆمان ئامادەیشمان پیشان دا بۆ هاوکاریان و پشتیوانیان لەسەر ئەو ئەساسەی ئەوان ناحەقیمان پێ نەکەن و وازمان لێ بهێنن و بەمیوانمان نەزانن لەکوردستانداو خۆیان بەخاوەن ماڵ هاتینەوە برادەران ووتیان تۆ سەرت لەمام جەلال داوەو قسەکانی ئەو رۆژەت لە بەرەی کوردستانی هەندێك روی لەکاك مەسعود بووەو حەزیش دەکەین سەری کاك مەسعودبارزانی بدەیت و کاك سامی وبرادەران وەکو راست کردنەوەو پەنچا بەپەنجا ووتم سەری مام جەلالم داوە دەبێت سەری کاك مەسعودیش بدەم باکاك سامی لەجیاتی هەمووبان سەری کاك مەسعود بدات پێ دەکەنی و خۆی دەیزانی من چی دەڵێم، لە١٢/٤ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیمان هەبوو لەهەولێر، لە١٢/٥ هەرلەهەولێر بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوین، لە١٢/٦ سەری مەکتەبی سیاسی پارتی و کاك مەسعودمان داو قسەمان کرد لەسەر هاوکاری ورووداوەکان بەلام پێش ئێمە کاك سامی بەتەنها چوبوو بۆلای کاك مەسعود و هەندێك قسەی کردبوو هەواڵەکەم پێ گەیشت ئەوانەی هەتا خزمی کاك سامی بون حەزیان نەدەکرد بەرەو پارتی زیاد برۆن و موافەقەتی ئەوانیش بەتایبەتی لەسەر ئەوچوار مەسئولە بۆقیادەی ناوچەکان کاك مەسعود ووتی لەپێشا ئەوانەی دهۆك بنێرن باتەرتیب بێت پاشان هەولێرو ئەوکات سلێمانی وکەرکوك بنێرن نەك یەکێتی کێشەتان بۆ دروست بکات لەوێش هەر کۆبونەوەکە

برایانەو دۆستانە بوو بەڵام هەرقسە کرا لەویێ، لە١٢/٧ هانیە موفتی کەلە لەندەن دادەنیشێ و ئەندامە لەڕێکخراوی مافی مرۆڤ و مەسئولی بەشی عێراق هاتبوو سەری لێدابن و لەماڵی کاك احسان موفتی یاماٶستا رشاد موفتی بوو لەهەولێر لەسەر زۆر شت قسەمان کرد لەوکاتەدا لەهەولێرەوە چوینە شەقلاوە و گەراینەوە بۆهەولێر لەوکاتانەدا زەختمان لەسەربوو زۆری برادەران رەئیان وابوو بۆلای خۆشناوەتی و ئەو ناوە مەقەرو پێشمەرگەی ئامادەمان هەبێت کاك سەید کاکەو هەندێکیان رەئیان وابوو لای برادۆست ومەلە کان و ئەوناوە هەبێت لە٢جێگا و منیش بۆم معلوم بوو سورێنم لەهەموو پێ باشتربوو چونکە سورێن کەس ناتوانێ روی تێ بکات لەهەموو حاڵەتێك و لەزۆر جێگاشەوە نزیکە بەڵام برادەران زەختی یەکێتی و پارتیان پێ باشتربوو لەوەی کەلەسورێن بن هەرکات بمانەوێ لەچەند رۆژێکدا نایەڵێن هیچ هێزێك لەسورێن هەبێت وەهەرکات ویستومانە عێراقمان لێ پاك کردوەتەوە... من سورێنم بەهێز کردبوو لەهەموو رویەکەوە لەوماوەیەدا هەندێك وەزعەکان ئارام بووەوە لەشەقلاوە خانوومان تەعمیر کرد کەهەوڵ بدەین بەشێکی مەکتەبی سیاسی لەشەقلاوە بێت یا (MCC) هاوپەیمانی پێشوازیان لێ بکەین منیش لەوکاتەدا قەرەباڵغ و ماڵ وبارەگا هەمووی واتێکەڵ ببوون ژیان و ئیسراحەت و بیرکردنەوەم زۆرکەم بوو وەکو لەیاداشتەکانی ساڵەکان و رۆژانەمدا هاتووە هەر سەعات و رۆژو مانگ و ساڵێك لەجێگای جیاجیاولەیەك شوێن نەبوم منداڵەکانمان(تامین خان وریێژین و ئارین) داوایان کرد بیان نێرمە دەرەوەی وڵات ئەوەش دەبوو بچن لەتورکیاوە پێش ئەوەش یەکێتی و پارتی و سۆسیالیست بارەگای لەتورکیا هەبوو ئێمەش بارەگاو نوێنەرمان هەبوو باش بوو ئیشی دەرۆیشت بەڵام کاری ناردنە دەرەوە دەبوو لەرێگای قاچاغچیەوە بینێرین ئەوەش بۆ من ئاسان نەبوو هەم لەروی وەخت و هەم لەروی ئەو پارەیەش وابزانن من

پارەم هەیەو داوای زیادیان دەکرد کۆمەڵێك مشکیلە ڕووبەڕوم بوەو یا کەسێك لایان بێت تابەرێیان دەکەم، لە۹/۱۲ لەمەکتەبی سیاسی لەهەولێر کۆبونەوەمان هەبوو لەسەر وەزعەکەو تەشکیلاتی کارەکانی حزب لەهەموو لایەك من لەهەولێر گەرامەوە بۆسلێمانی لەکۆیە لاماندا و چاوم بەبرادەران کەوت یەکێتی خانوەکانی داگیر کردبون بارەگایان لەناو بازار لەخانویەکی ناخۆشدا بەکرێ گرتبوو بۆ بارەگای حزب، کاك مەریوانی کەریم ئاغای نازەنین لێپرسراوی ناوچە بوو کوڕێکی باشبوو ئەویش یەکێتی شەری پێ دەفرۆشت، لەگەڵ کاك شیروانە سور پێشمەرگەیەکی ئازاو دڵسوزە ئەگەر یەکێتی وازیان لێ بهێنێت و شەریان پێ نەفرۆشی لە۱۱/۱۲ لەسلێمانی بوم، لە۱۲/۱۲ لەسلێمانیەوە چومە باریکەوهەڵەبجەی تازە کۆبونەوەمان بەناوچەو هێزەکان کران، لە۱۳/۱۲ لەسلێمانیەوە چومە هەڵەبجە و گەرامەوە بۆسەید صادق و بۆ میری سورو سورێن و سەری بارەگاکانمان داو پێشمەرگەمان بۆ زیاد کردو شەو لەوێ ماینەوە، لە۱٤/۱۲ چوینە شیرەمەرو بانی شارو خورماڵ و سیروان پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی، لە۱٥/۱۲ لەسلێمانیەوە چومە پێنجوێن و مەریوان وسنە لەگەڵ کاك دارا دا تا ۲۱/۱۲ هەر لەسنەبوین، لە۲۱/۱۲ چوینە کرماشان، لە۲۲/۱۲ لەکرماشان کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ لێپرساوانی ئەوێ شەو بەتەلەفۆن قسەم لەگەڵ کاك دکتۆر محمودو مامۆستا مەلاناصیح کرد لە لەندەن، لە۲۳/۱۲ لەکرماشانەوە گەراینەوە بۆ سنە، لە۲٤/۱۲ لەسنەوە بەرێ کەوتین بۆ مەریوان و پێنجوێن و سلێمانی دوای تەواو بوونی ئیشەکانمان سەرکەوتوانە گەراینەوە زۆر لەوانەی وەعدیان دابوو پێشتر جێ بەجێ یان کردبوو، لەرۆژانی ۲٥و۲٦/۱۲ هەرلەسلێمانی بوین، لە۲۷/۱۲ لەهەڵەبجە بووم، لە۲۸/۱۲ گەرامەوە بۆ سلێمانی، لەرۆژانی ۲۹و۳۰و۳۱/۱۲/۱۹۹۲ هەرلەسلێمانی خەریکی ئیشوکارەکان بوین...، ساڵی ۱۹۹۲مان بەرێ کرد ساڵێکی سەرکەوتن و ئازادی و خۆش بوو

ساڵی بێ بونی داگیرکەران بوو بەڵام خوائەزانێ یەکێتی و پارتی نەیان هێشت ئێمە چی وەکو حزب چی وەکو شەخصی من ئیسراحەت بکەم نەیان هێشت پێشمەرگەمان ئیسراحەت بکات هەمیشە چەك و تاقم و دۆشکاو لەسەنگەر هائێستا یاسەعاتێکی کە شەر دەبێت ئەوەی لەگەڵ ئێمە کردویانە لەگەڵ دوژمن نەیان کردووە زۆریان ماندو کردین بەڵام لەگەڵ ئەوەش کوردستان کوردی تێدایە ئێمە هەرپێمان خۆشە هەر هەوڵی سەرکەوتنی بۆ ئەدەین... ساڵێکی پر لەدەردە سەریمان بەرێ کرد بەهەر حاڵ باوەر بکەن لە بیر مان چوبو کوردستان ئازادە گرنگ ئەوەبو دورلە بەعس و رژێمی عێراق بوین پێمان نایە ساڵێکی کەوەو ساڵێکی نادیار هیوادارم ئەم ساڵ ساڵێکی باش و خێروخۆشی و ئازادی تەواوی کوردستان و ژیانێکی باش بۆ میللەتە هەژارەکەمان و ململانێ ی شەریفانە لەسەر خزمەت کردن بەگەلەکەمان بکەین و واز لەکاری نابەجێ و شەخصی و حزبی تەسك بهێنین بەڵام من زۆر لەبرادەرانی خۆمان دەترسم مەبەستم سەرکردایەتی حزبی یەکگرتن کەخۆیان بدەن بەدەم رەشە بای زەمانەوەو لولیان بدات و بیان هاوێژێتە ناو بەحرەوە چونکە زۆر حەز لە وەزیرو پارێزگاری و مەسئولیتی ئەو حکومەتەی هەمانە دەکەن یاراست حکومەتی پارتی و یەکێتی وائێمەش خۆمان پیاهەڵواسیورەیاچەمەلغ کردووە لێ ی چونکە ئێمە وەکو حەق خۆمان نین کاك سەعدو کاك قادر زۆر حەزیان لەوەزیر و پارێزگاری هەولێرو سلێمانیە کاك قادرمان لەکۆڵ بوەتەوەو دەیکەنە وەزیری عەدل بەڵام برادەرانی کە هەروان کاك عبداللە ئاگرین پیاوێکی رۆشنبیرونوسەرە هەرچەندە درەنگ هاتووە بەڵام بەهۆی یەکگرتنەکان و پاسۆکەوە گەیشتە سەرکردایەتی حزب بەڵام زۆری پەلەیە بۆ مەسئولیەت و زۆر حەز دەکات ببێتە وەزیری رۆشنبیری حکومەت من بوایەم لەجیاتی یەکێتی و پارتی دەم کردە وەزیری رۆشنبیری شەو رۆژ دەوامی دەکرد

لـەوەزارەت و ئیشەکانیـشی هـەموو بەباشـی دەکـرد توانـای هەیـەو زۆری حـەز لەتەفزیون و رادیۆیە و حەزی لەدەرکەوتنە جارێ لەگـەڵ کـاك عمر دەبابـە و کـاك شێخ محمد شاکەلی و بـرادەران دا چـوبون بۆسـوریا لای عبداللـه احمـر بـون داوای کردبوو ئەوە بۆ تەلەفزیون دیارنیە و نایەت عبدالله احمریش پێکەنی بـوو لەسـوریا جگە لەوەش کەس بـۆ معـارەزە تائەوکاتـە لەتەلـەفزیون دەرنەدەکـەوت کـاك عمـر دەبابە قسەی پیێ دەڵێت ودەڵێت نەمووت قـسە مەکـە پـێش ئـەوەش لـەرێگا پێـی وتبوو تۆ قسە مەکە لێی نازانی و شارەزا نین ئەو برادەرانە باسیان دەکرد... کـاك سـەید کاکـە بـاش بـوو بـەلاّم لەوکاتـەدا ئـەویش هـەر خـەریکی سـەیارە دەرکـردن بۆئێران و بژێوی ماڵومناڵ چارەسەریان بوو دەیویست تەعویزی ئەو چـەند سـاڵەی شاخ بکاتەوە سێ ماڵیـشی هـەبو منـاڵی زۆر بـوو حـزبیش وەکوپێویـست یارمـەتی نەئەدا ئەویش ناچار هـەوڵی خـۆی بـدات بۆمناڵـەکانی کەچەندسـاڵ بـو لـەئاوارەیی ودەربەدەری ونـەبونی دەژیـان وئـەوانیش حـەقی ژیانیـان هـەبو کـاك قادرجـەباری هەرخەریك بوو ئەو ماوەی بەرەی کوردستانی هەمووی کاری خۆی کردبوو لەهەولێر خانویەکی کڕی بوو خەریك کاری بازرگانی بوو... کاك سەعد کۆمەڵێك دوکانی کڕی بوو لەبازارەکان هەریەکـە خـەریکی شـتێك بـوون... کـاك مـلازم کـەریم وئـەوانیش لەسلێمانی هەندێك دەواجن و شتیان کڕی بوولای قولورە سی سەرچنار کاك سـامی یش یەك دیناری خـۆی سـەرف نـەدەکرد رۆژێـك وتیـان پارەمـان نیـە بـۆ یارمـەتی هەر(٣) حزب ووتم هەریەکـە (٦٠٠) هـەزار بهـێنێ مـن (٦٠٠)هەزارەکـەم هێنـا بـەلاّم ئەوان نەیان هێنا و ووتیان دوایی دەهێنین دوای پاسۆك شتێکیان هێنا کـاك سـامی سەفەری کردبوو بۆ دەرەوە ووتی من شـتی تەلـەفزیونم کریـوە بـەلاّم هـەر پـارەی حزب بوو کەس خۆی بەخاوەنی حزب نـەدەزانی و کـەس خـۆی بـەخاوەنی شـەهید نەدەزانی و کەس بەتەنگ هیچەوە نەبوو هەموو پارەکەیان بەسـەر منـدا خـستبوو

منیش بەتەنها بووم هاوکاریان نەدەکردم، هەر لە٢٨ ١٢/١٩٩٢ سەعات (٨/٣٠)ی سەرلەبەیانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان خەتی (٣٢) لەخواروی عێراق بریاریان دا کەفرۆکەی عێراق هەڵنەسێت ئەویش یەکێ لەگۆرانەکانی ئەوساڵە بوو بەلاَم ئەو بریارە جێ بەجێ نەکراو بەهەڵواسراوی مایەوە... ساڵی ١٩٩٢ش گۆرانی تێدا کراو یەکگرتنی (٣) حزب و هەموو مشاکیل و پەرلەمانی کوردستان هەڵبژێراو حکومەتی کورد دروست کرا بەلاَم باوەر بکەن کوری براینە یەکێتی و پارتی دەردێکیان بەئێمە دا نەمانزانی لەکوردستانی ئازادین..شەری (PKK)شیان کرد یەکێتی و پارتی کەئەوەش هەریەکێ بوو لەرووداوە سەیرەکانی دنیای کوردەواری و زۆری کەش... واپێمان نایە ساڵی ١٩٩٣ لەکوردستانی ئازاد دا بەلاَم خوا رەحم بکات لەکورد شتێك لەدەسەلاَتی مرۆڤ دابێت دەڵێت خۆم وام کردو خۆم فیداکاریم کرد لەدەستی دەرچوو چاری نەما و کەتنەکەی دا و دەڵێت خوا رەحم بکات پێش کەتنەکەی ئەوە بلێت هیچ رونادات بەهەرحاڵ چوینە ساڵێکی نادیارەوەو پر لەجەنجاڵی دنیا بەلاَم ئەگەر خۆمان هەبین باشترین رۆژە بۆگەلەکەمان کەبەخۆیەوە نەیدیووە تائێستا هەر ئەمرۆش رادیۆی لەندەن باسی شەری کەنداوی کرد کەعێراق و ئێران تاساڵی ١٩٨٨ زەرەری شەرەکە وەلەشەوی ٦\ ١٢ /١٩٩٢ دیسانەوە باسی کرد کەزەرەری مالی (٦٧٠)ملیارد دۆلار بووەو بەچەندیش چاك دەکرێتەوە جگە لەنزیکەی یەك ملیۆن مرۆڤ لەهەردوولا کوژراو بریندابون بووە کەشوێنەواری ئەو هەموشەرە ئاسان نیە بۆپرکردنەوەی بەئاسانی...والێرەوە دەست بەیاداشتی ساڵی ١٩٩٣دەکەم و خوایارمەتی بدات... ئەم ساڵمان بەرێ کرد لەتەمەنی پر دەردە سەری ژیان بەلاَم ساڵێکی ئازاد واتە دووهەم ساڵی ئازادی لەکوردستانی ئازاد دا بەلاَم رووبەرووی ململانێی ناشەریفانە بوینەوە لەگەڵ لایەنە سیاسیەکانی، سەرگۆرەپانی خەبات (یەکێتی و پارتی) پێمان نایە ساڵێکی کەوە

بەئومێدی ئازادی زیاترو دیموکراتی و پێکەوە ژیانی سیاسیانە لەکوردستاندا بەئومێدی ساڵی تازە سەرکەوتنی یەکجاری بێت... ناونیشانی یاداشتەکانم هەروەکو پێشو وایەو هەندێك گۆرانی بچوك.. ناو:محمد حاجی محمود...نازناوی نوسینەکانم سەرباز+ عەزیز+ کاوە...هتد، پێشمەرگایەتی بوەتەپیشەم.. شار: سنە و سلێمانی..گەرەك لەسلێمانی: خانوی معمل یارزگاری شەقامی گشتی سەرچنار..شەقام.. شەقامی گشتی سلێمانی کەرکوك یانزیك فلکەی سەرچنار... ژمارەی تەلەفۆن(٢٠٣٧٣) سلێمانی یا (٣٦٩٩٥) سنە... سەیارە هەندێك گۆرانی بەسەردا هاتووە...لێرە ئەوەی کەوتوەتە یادم لەساڵی ١٩٩٢ کاك عبداللە ئاگرین حەزی دەکرد لەسلێمانیش دەوام بکات و لەهەولێریش رۆژی دووجار دەچووە هەولێرو سلێمانی پێم ووت ئیشت بکردایە لەورێگایە تەکسی ئێستا حسابی خۆت نەدەزانی جارێك وەرگەرا خوا رەحمی پێکردوهەر جارەی دەعمێك یاوەردەگەرا زۆری پەلە بوو بەلاّم پیاوێکی ئیشکەر بوو لەبواری خۆیدا بەلاّم بۆراگەیاندن نە دەشیا چونکە ئەو ئەدیب بوو کردبوویان بەمەسئولی راگەیاندن ئەدیب شت بۆخۆی دەنوسێت و راگەیاندن یارۆژنامە بۆخەڵکی دەنوسێت جیاوازی ئەو دوو ئەقلیەتە زۆرە بەلاّم پیاوێکی دڵسۆز بوو لەئیشکردندا،

## ساڵی ١٩٩٣ و روداوەکانی

لە١/١/١٩٩٣ لەماڵەوە بوم لەسلێمانی کاك نیزامەدین گلیش لەژێر کارتێکردنی کاك شێخ محمد شاکەلی دا هاتوچۆی ئەوانی دەکردو بەتەمابوو برواتە لایان برادەران داوایان لەمن کرد لەماڵەوە سەردانی بکەم و قسەشی لەگەڵ بکەم بۆئەوەی زیاتر نەروات منیش چوم سەردانم کرد لەماڵەوەو هەوڵم لەگەڵدا بۆئەوەی لەوەزیاتر نەخلیسکێ و قەناعەتی کردو ئیشی وەرگرت و کردمان بەلێپرسراوی لقی کەرکوك بەلاّم نەدەیزانی و نەپێی دەکراو نەلەفروفێڵی ئەو خەڵکە سەری

دەردەکردوئەوپیاوێکی دڵپاك دڵسۆزبوو کەوتبوە ناو ئەوهەمو هەرایەوە بەئاسانی سەری دەرنەئەکرد (٣٥٠)هەزار دیناری هەبوومانگانە لقی کەرکوك نەیزانی بوو رێکیان بخات و ئیشەکانی چارەسەر بکات و پێی نەدەکرا دەبوو ئەو بەوەزیر دانێین حەزیشی لێ دەکرد کەچی کاك قادرجەباری ئەوەندە داوای کرد ناچار بوین کاك قادر بکەین بەوەزیری داد کاك نیزامەدین حقوقی تەواو کردبو ئەو بۆ وەزیری داد باش بوو..کاك قادر لەبەرەی کوردستانیش لەوێوە دژمان بو هیچ شتێکی لەترسی کاك فرانسۆ یاوای دەزانی لای دەبەن بۆ حزبی نەکرد تەنانەت یەك فەرمانبەری بۆ حزب دانەمەزراند تەنانەت دووکوری خۆشمان نارد دایان مەزرێنن دەری کردبون، لە٢/١/١٩٩٣ لەهۆڵی رۆشنبیری سلێمانی بوین ساڵرۆژی کۆمەڵەی دەرون پاکان و کۆن فۆ بوو سەربەحزب بون، لە١/٣ لەسلێمانی سەری ئافرەتانمان دا سەری ساڵ لەدنیای دەرەوە یائەوروپا یامەسیحیەت جەژنی بۆ دەگێرن بەلام ئێمە هەروەکو رۆژەکانی کە ئاسایی بوو لامان، لە١/٤ لەباریکە ئاهەنگێك هەبوو خوێندکاران و لاوان سازیان کردبوو سەرمان لێدان و چوینە هەڵەبجەی تازە و سەری قوتابخانەی ئەحمەد موختار و هەندێك قوتابخانەی کەمان کردو یارمەتیمان دان و وەکو قەمسەڵە بۆقوتابیان و دەفتەرو قەڵەم و پێویستی کە بۆهەرسێ قوتابخانەکە جگە لەیارمەتی بۆ مامۆستایان و کارمەندانی قوتابخانەکە، لە١/٥ سەری مزگەوتی گەورەو مەرقەدی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ مان دا لەسلێمانی بۆزیارەت کردنی لەگەڵ کاك قادرجەباری و کاك نیزامەدین گلی و تامین خان پاشان بەرێ کەوتین بۆ دەربەندیخان و کەلارو کفری و سەری چەند ماڵێکمان دا لەکفری ماڵی کاك فەقێ عەلی و ماڵی کاك محمود ناوێك (عقید محمود) وأبزانم بەلام قسەی کرد زانیم سەر بەپارتیە کاك نیزامەدین دەیوت دۆستی خۆمانە وادیاربوو پارتی لەوناوە دەسەلاتی نەبوو ئێمەی بۆ پاراستنی خۆی بەکار دەهێناو چوینە ماڵێکی

تورکمان شەخصیەتێکی شاری کفری بووناوی (تالب ئاغا)بوو پاشان گەراینەوە بۆ صمودو کەلارو شەو لەماڵی کاك کسرای حمە سەعید بەگ جاف بوین، لە١٩٩٣/١/٧ کۆبونەوەمان بە ناوچەی خانەقین کردکاك جمالە رەش لێپرسراوی ناوچەی خانەقین بوو پاشان سەردانی ناوچەی کەلارمان کردو پاشان سەردانی کۆمەڵێك خەڵکی شارمان کردو سەردانی کاك مستەفا بەگی جاف و کاك حاجی ابراهیم شاتری و کاك مستەفا حاجی قادرو زۆری کەشمان کرد، لە١/٨ سواری سەیارە بوین بۆگەرانەوە دایکی شەهیدێك دایکی شەهید مجید حسین کوردە خانە قینی هاتە رێگامان پارەم پێ نەبوو داوام لەسائیقەکە کرد، ، پاشان چوینە دەربەندیخان و لەناوچەی کۆبونەوەمان کردو پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١/٩ سەردانی منالأنی بێ سەرپەشتمان کرد لە سلیمانی یارمەتیم دان هەموویان لەدوێجێگا بوون زیاتر لە(١٥٠) منالّ بوون قەمسەڵەو یارەمەتیم دان و گەرامەوە بۆ ماڵەوە لەوکاتەدا ئێمە لەسلێمانی بوین بەتەمای سەفەر بوم بۆتورکیا و سەرقاڵی ئیشوکار بوین، لە١/١١ لەسلێمانیەوە چوینە دوکان و بۆ کۆیە سەردانی بارەگای حزبمان کرد و قسەمان بۆ کردن پاشان سەردانی بارەگای پارتیمان کرد لەکۆیە کاك گوڵەباخ لەوێبوو هەروەها سەردانی بارەگای یەکێتیمان کرد لەکۆیە چونکە بارەگاکەی ئێمەیان داگیر کردبوو هەروەها سەردانی ئاسایشمان کرد و پاشان چوینە هەولێر وەزیری دادمان وەرگرتبوو کاك قادر دەوامی دەکرد، لە١/١٢ لەهەولێر بوم کۆبونەوەمان هەبوو کاك عمربۆتانیش لەدەرەوەی وڵات گەرابوەوەو هاتبوو بۆ سەردانمانن لە١/١٣ ئاگاداری عێراق کرا زوو پەشیمان نەبێتەوە لەقسەکانی خۆی لەئان و سات دایە خوابکات هەرلەسەر ئەقڵی خۆی سوربێت بۆ لێدانی باری عێراق و هاویەیمانەکان وسەرکردایەتی ئەمریکا زۆر ئاڵۆز بوو پێ دەچوو لەعێراق بدەن کۆشکی سپی دەیوت لەلێدان و حاڵەتی شەردان لەگەڵ عێراق چونکە عێراق

هەركات بۆشاييەك دروست دەبوو دەيويست لەو بۆشاييە مناوەريەكى تێدا بكات بۆتاقى كردنەوەو بزانێ ئەمريكاو هاوپەيمانەكانى تاكەى لەسەر قسەى خۆيان سورن و دژيين ئێستا بۆش كوشكى سپى بەجێ هێشتو كلنتۆن هاتبووە سەرحكوم عێراق وا تێگەيشتبوو دووسياسەتى جياوازن و لەدووحزبى جياواز دەيويست لەهەندێك بريار پەشيمان ببێتەوە گوايە بيل كلنتۆن تازە هاتووەتە سەر حكوم و باوەر ناكات ئەوە وەكو بۆش بكات و شەر يان زۆر بەكار بهێنێ و شەربكات هەورەها هەوڵى كوشتنى بۆش لەلايەن عێراقەوە لەكوەيت ئەمريكا بلاوى كردەوە ئەوەش هەربۆ زەمينە خۆش كردن بووبۆلێدانى عێراق لە داهاتودا، لە١/١٤ لەهەولێرەوە بەرێ كەوتين بۆ صلاح الدين و پردى قەنديل و عەقرەو ئەتروش و دهۆك شەو لەدهۆك لەماڵى كاك عوسمان بوين براى كاك سامى عبدالرحمن زۆرى خزمەت كردين لەگەڵمان ماندبون، ماڵ و مناڵ وكورى پياوێكى باشە، لە١/١٥ لەگەڵ كاك فاضل جەلال چوينە زاخۆ و كۆميتەى باتوفەو بۆماڵى شەهيد صالح يوسفى و سەر قەبرى شەهيد و ماڵى كاك عمرو پاشان چوين بۆ ابراهيم خليل و سنورى توركيا لەوێ برادەران گەرانەوەوئێمە چوينە سلوپى جەزيرەو بوتان و قزلێ تەپە من و تامين خان و رێژين و ئارين و دكتۆر خيراللەو كاك فاضل جەلال لەسەرەتاى شۆرشەوە لەدەرەوە بوو ئەندامى قيادى قيادەى موەقەتە بوو لەساڵى ١٩٧٧ دا من سەفەرى توركيام كرد بۆ هێنانى چەك ئەو لەنۆكان بوو ناوى (عادل)بوو لێپرسراوى قيادەى موەقەتەبوو لەگەڵ كاك كەمال كەركوكى و محمد قادردا كاك كەريم حسامى دەڵێت كۆمەڵێك چەكدار لەزەمانى شا لەبازێرى لاى سەردەشت (بازێر) لەنێوان گوندى قەلەرەش و باوزێ دايە بارەگاى هەباس ئاغا ناوێكى لێبوو قيادە موەقەتە بوو خەڵكى بێ ترخەى لاى سەر تەنك بەرامبەر نورالدين بوون كاك فاضل جەلالى لەگەڵ بوو پێشتر و پاشان لەيەكگرتن و ئەو

رۆژەش لەگەڵ ئێمەدا بوو لەدهۆك ئەوكات شەو گەیشتینە ئۆرفە یا پارێزگای ئۆرفە لەوێ ماینەوە، لە١/١٦ بەرێ کەوتین بۆ غازی عەنتاب لەشارێکی بچوك نانمان خوارد ناوی ئەقران بوو لەتورکیا لەسەر رێگا بوو لە ئەدەنە، شەوی ١٦-١٩٩٣/١/١٧ گەیشتینە ئەنقەرە چوینە ماڵی دکتۆر خیرالله ئەوە یەکەم جاربوو لەئەنقەرە یائەدەنە وبەرەو دهۆك و زاخۆ هاتووچۆ بکەم، لە١/١٧ لەئەنقەرە بوین و چوینە شار، لەشەوی ١٧-١٩٩٣/١/١٨ ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لەبەغدادیان دا (٤٨) صارۆخیان لێداو کوژراو بریندار هەبوو جگە لەئەمریکا ئەوانی کە نارازی بون و عەرەبیش هەرایەکیان کرد لەسەری، لە١/١٧ لەوەزارەتی دەرەوەی تورکیا چاومان بەلێپرسراوی رۆژهەلاتی ناوەراست کەوت،ناوی ئوجاخ تەپە بوو لە ١/١٨ هەرلە ئەنقەرە بوین، شەوی ١٨-١/١٩ لەگەڵ ماڵەوەو دکتۆر خیرالله لەئەنقەرەوە بەرێ کەوتین بۆ ئەستەمبوڵ لەسەعات (٩)ی بەیانی رۆژی ١/١٩ گەیشتینە مەیدانی ئەستەمبول و بەتەکسیەك چوین بۆ ئوتێل هیدایەت لەرێگا سائیقەکە قسەی کرد بەهەزار فەلاکەت تێ دەگەیشتین لەیەك وتی خەڵکی کوێن وتمان کوردستانی عێراق ووتی باشوور ووتمان بەڵێ باشور ووتی جەلال یامەسعود ووتمان کەسیان ووتی بۆ شەری ئێمە دەکەن بۆ دەمان کوژن بۆ تورك دەهێننە سەرمان ئەوە خیانەتە کابرا نەیدەناسین و نەمان دەناسی و نەباوەری بەقسەکانیشمان هەبوو زۆریش رقی لێمان بوو بەهەموو هێزی دەیدا لەتاسەی جادەکەو خەریك بوو دەعم بکات ووتم بادابەزین لەداخی ئێمە خۆی دەکات بەژێر سەیارەیەکدا و توشی مشکیلەیەکمان دەکات تاگەیشتینە ئوتێل و لەوێ بەجێ ی هێشتین زۆر بەناحەزانە سەیری دەکردین پاشان چوینە ئوتێلێك ناوی دریان یا دریا بووچوین بۆ پەیدا کردنی کەسێك بەناوی امیری یا میدەرس لەئەستەمبوڵ فارس بوو من بەتەمای ئەو بووم منالەکان بۆ لەندەن بنێرم وادیاربوو بۆیان نەکراو ئەو رۆژە بازاری حمیدیە

لەئەستەمبولّ زۆر گەراین من پێشتر ناوی حمیدیە م بیستبو بازاری حمیدیە لە دیمەشق وسرارەی حمیدیە ش کە لە زەمانی سولّتان عبدوالحمید عوسمانی جاشی کوردبون شەریان بە ئەمری سولّتان ئە کردو پاشان سەعات (٨)ی شەو گەراینەوە بۆ ئەنقەرە، لەسەعات (٦)ی سەرلەبەیانی رۆژی ١/٢٠گەیشتینەوە ئەنقەرە، هەر لە١/٢٠ سەرۆك بۆش پیرۆزبایی لە سەرۆکی تازەی ئەمریکا بیل کلنتۆن کرد و ووتی من هاولاتیەکی ئەمریکام و هەرچی ئەمر بکەن جیّ بەجیّ ی دەکەم لەکۆشکی کۆماری خواحافیزی کردو کلنتۆن دەوامی دەست پیّ کرد، لە١/٢٧ لەئەنقەرەوە لەگەلّ کاك وەستا شەمالّ و کاك قادروکاك مریوان و تامین خان و منالّەکان بەریّ کەوتین بۆ ئەستەمبولّ، لە١/٢٨ لەئەستەمبولّ بوین زۆر گەراین لەجێگا ئاساریەکان نالی و ئەمین زەکی بەگ وئەوانەم دەکەوتە یاد کەباسی ناوشاری ئەستەمبولّیان دەکرد لەشیعرو نوسینەکانیان باسیان دەکرد لەیاداشتەکانی رەفیق حلمی و زۆری کەش دا لەدوای ئیشەکان لەئەستەمبولّەوە سەعات (٨)ی شەو بەریّ کەوتین بۆ ئەنقەرە بەسەیارەی گەورە ئیسراحەت بوو تەلەفزیۆن وشتی تیّدابوو سەعات (٦) ی بەیانی گەیشتینە ئەنقەرە، لە١/٣٠ لەبازار دەگەراین و ئێوارەکەی علاقات دەعوەتی کاك نێچیر بارزانی یان کردبوو منیش لەویّ بووم برادەرانیش هەموو لەویّ بون لەچێشتخانەی حاجی عارف لەتورکیا بەرامبەر مالّی سلیمان دەمیرلّ بوو (٦) پۆلیس حیمایەی مالّەکەی بوو کەچی لەکوردستان ئامر کەرتی واهەبوو (١٠) کەسی هەبوو یاسەرکردایەتی هەبوو (٥٠) کەس حەرەسی بوو، لە١/٣١ لەئەنقەرە بووم دنیا سارد بوو لەگەلّ منالّەکان چوین بۆگەران لەگەلّ تامین خان ورێژین و ئارین لەئەنقەرە بازارێکی شوشە هەبوو لەترسی سەرما چوین لەویّ دەگەراین، لە٢/١ هەرلەئەنقەرە بووم هەوا ساردبوو، لە٢/٢ سەردانی وەزارەتی دەرەوەمان کردو کۆبونەوەمان لەگەلّ مدیری ئیدارەی سیاسی و رۆژهەلاتی ناوەراست

لەوەزارەتی دەرەوەی تورکیا کردو چاومان بەدووکەسی کە کەوت ناوەکانیم باش لەبیر نیە وابزانم یەکێکیان ناوی وچاغ یا ئوچاغ تەبە بوو قسەمان لەسەر وەزعی کورد و تورکیا و ناوچەکە کرد و ئەوان هەرکێشەیان (PKK) بووشەری دەکەن یان پەیوەندی دووقۆڵیش هەمووی لەسەر لێدانی (PKK) وەستا بوون چاومان بەیەکێکی کەش کەوت لەجێگایەکی کەبوو ناوی جەم بوو (احمد جەم) یاشتی لەوبابەتە هاتبوو بۆ کوردستان لای کاك مەسعودبوو ماوەیەك لای مام جەلال و یەکێتی هەموو شوێنەکانی کوردستان شارەزابوو سەری لەئێمەش دا لەسلێمانی چەند رۆژێك مایەوە لامان لەوێ بەمنیان ووت هەم لەوەزارەتی دەرەوەو هەم لای ئەو جەم ناوە ووتیان ئێمە گلەیمان لەپارتی و یەکێتی هەیە ووتم بۆ خۆئەوەتا هێشتا هەڵمی لێ هەڵدەستێت شەری (PKK) یان بۆ کردون هێشتا جەنازەی (PKK) کۆنەکراونەتەوەو لەشەرەکان کەوتون ووتیان بەدڵ شەریان نەکردووە ئەگینا ئێستا تەواویان دەکردن هەروەها ووتیان چۆن رێکەوتنیان لەگەڵ مۆر کردون من لەبەرەی کوردستانی بووم لەقیادەی سیاسی و لەحزب پێشمەرگەی کۆن باسی ئەو رێکەوتنەی (PKK) و پارتی و یەکێتی یاحکومەتی هەرێمیان پێ نەوتبووم لەوێ وتیان چۆن قبوڵ دەکەن ئەوان رێگای (PKK) بدەن نامەیەکیان هێنا نوسرابوو بەناوی حکومەتی ئەقلیمی کوردستانەوە ئیمزای دکتۆر فواد معصوم سەرۆکی حکومەت و دکتۆر رۆژنوری شاوێس جێگری سەرۆك و عوسمان ئۆجەلان بەناوی فرهادەوە نوێنەری (PKK) لەکوردستان و کەئیلتزامات بەرێکەوتن و حکومەتەوە بکەن و ئیجازەی رۆژنامەو بارەگای راگەیاندن ورۆشنبیری و هاتووچۆ و دور لەسنوری تورکیاوە شەر نەکەن لەسنوری قەلادزە و زەڵێ و ئەوناوە بارەگایان هەبێت و کۆمەڵێك خاڵی تێدا بوو ووتیان لەسەر ئەوە داوامان کردووە لەپارتی و یەکێتی دەبێت دکتۆر فوئادو دکتۆر رۆژ لابەن منیش بەسوعبەتەوە ووتم

باوەر ناکەم داوا لەپارتی بکەن دکتۆر رۆژتان بۆلابات بەلاّم مەبەستان دکتۆر فوئادە لای بەن... کابرای تورك قەناعەتی کرد بەوقسەیە و وایزانی من لەپێش ئەو وەزارەتی دەرەوە بووم ئەوان بۆیان باس کردوم و من ووتم ئەو پارەیەش ئێوە سەرفی دەکەن یەکێتی و پارتی گلەیان هەیە وەکو پێویست سەرفتان نەکردووە کابرا فایلێك لای دەستیا بوو ووتی چۆن سەرفمان نەرکردووە ئێمە جل و پێلاّو و مەتارەو چەك وفیشەك و ئازوقەو بەتانی و هەموشتێ (١٠) هەزار کەسمان تەسلیم بەپارتی و یەکێتی کردووە و مانگی (٣٠٠)هەزار دۆلاریش هەرلایەك (١٥٠) هەزاریان ئەدەینێ ووتی ئەوە چوار مانگە رێك دەیان دەینێ هەروەها ووتی هێزی پارتی بەقەناعەت شەردەکات کاك مەسعود بەلاّم هێزەکانیان شەرکەرنین وە هێزی یەکێتی هێزەکانیان شەرکەرن بەلاّم بەقەناعەتەوە شەر ناکەن وە ووتی بارزانی داوای لێ کردوین کەئەو پارەو بەشەی یەکێتیش بدەین بەئەوان واتە پارتی ئەتوانێ هەموو سنورە کان لەجیاتی یەکێتیش جێگاکان بپارێزێت وە ووتی بارزانی وتویەتی خەڵکی ناوچەو گوندەکان هەمووی سەر بەپارتین و ئێمە چەکداریان دەکەین و یەکێتی لەسنوری بادینان کەسی نیەو جەماوەری نیە ئەو کاتە کەپێکەوە بوون پارتی رەئی وابووە لەسەر یەکێتی هەتا لەشەریشدا شەریك نەبێت کەسودی پارتی تێدابوو وە ووتی ئێمە وتوومانە باشە بەلاّم مصاریفەکە کەم دەکەینەوەو حصەی یەکێتی هەمووی نادەین و حصەی یەکێتی دەبرین و حصەی ئێوەش زیاد دەکەین بەپارتیمان وتووە دەست بەکاربن ئێستامەشروعێك لەبەر دەستە لەوسنورەدا (٩٥) پایگای سنوری بکەینەوە بۆپارتی و نەفەراتی تورکیش بەجیهازەوە لەومەرکەزە سنوریانەدا بن لە سنوری تورکیا سوریا بۆ سنوری ئێران تورکیا بەدرێژایی سنوری کوردستان (٩٥)پایگای سنوری لێ دروست بکرێ هێزی یەکێتی وپارتی هەرمەرکەزێك ٢ تا ٣ سەربازی تورکیای تێدابێت بە بێسیم وە بۆ چاودێری

هێزەکانی (ی. ن. ك)و( ب. د. ك) تورکیایش مقابل بەوە مەعاش وپێویستیەکانیی

هەردوو حزب جێ بە جێ بکات بەلأم بەقسەی لێپرسراوانی تورکیا پارتی رازی نیە بەیەکێتی و منیش پێم ووتن وادیارە باوەرتان بەپارتی ویەکێتی نیە ووتیان کورد هەرکوردە وەلأمی کابرا بوو بۆمن هەرچەندە بەسوعبەتەوە باسی کرد بەلأم قسەی دڵ بوو وادیاربوو دوورۆژیان دانابوو بۆمن و قسەکردن پاشان ووتی یەکێتی فێڵی لەئێمەو پارتیش کردووە ووتم بۆ ووتی شەری کردن و شتیان لێ وەرگرتین و ئێستاش (PKK) ی بردووەو بارەگاکانی خۆیانیان داونەتێ و ئاشتیان کردنەوە لەگەڵ خۆیان و چاوەرێ دەکەن ئەگەر رەئی ئێمە بگۆرێ لەگەڵیان ئەوە بەریان دەدەنەوە گیانمان وەئەگەر پارتیش دژیان بێت بەریان دەدەنە گیانی پارتیش ئەوە رەئی تورك بوو لەسەر یەکێتی ئەوکاتە لەوەزارەتی دەرەوەش و لەگەڵ کەسێك کەمەسئولی جەندرمە بوو کوژرا وەستابوو وابزانم ئەوانەی میت یش بەمنیان ووت لەگەڵ پارتی و یەکێتی رێکەوتنێکی وامان کردوە ئەگەر ئەوان رازی نەبن یارمەتی هیچ لایەنێکی کوردی نەدەین لەعێراق و یەکێك لە خاڵەکانمان ئەوەیە شەرت لەسەر دەوڵەتێك کەپەیوەندی لایەنەکان بێ ئاگاداری ئەوان وەهەر کەسێك شەری (PKK) دەکات بابێتە لای ئێمە واتە پارتی ویەکێتی یا حکومەتی کوردستان ئەوان قسەی لەگەڵ بکەن و معامەلەی لەگەڵ بکەن وشەری کوردی پێ بکەن ووتم ئێستا ئێمە بڵێن شەری (PKK) دەکەین بۆتان و سبەینێ (٥)هەزار پێشمەرگە دەنێرینە شەر ئێوە قبوڵ ناکەن لێمان ووتی ئێوە جیان و ئێمە لەگەڵ ئێوە قسە دەکەین.. ووتم ئێمە لەسەر ئەساسی دراوسێ ی و لەسەر ئەساسی کوردو تورك و حزب و تورکیا هاتوین و هاوکاری هەردوولا هەبێت وئێمە داوامان لەئێوە نەکردووە بێن و شەری عێراقمان بۆ بکەن ئێمە میللەتێکی هەژارین و ئێوە دەوڵەتێکن داوا لەئێمە دەکەن بێین و میللەتەکەی خۆتان بکوژین وەووتم ئێمە

شەری کەس بۆکەس ناکەین ئەوەی باوەرمان پێ ی نەبێت هەروەکو خۆی بمێنێ باشە و پەیوەندیمان نەسارد نەگەرمی بکەین و هەرسێ لاتان پیرۆزتان بێت ئەو هاوکاریە پر لەشەرت و شروتانەتان جارێکی کەش داوایان لەئێمە کردەوە ووتمان بەشدار نابین لەوشەرەدا و ناشی کەین ئێمە باسی حکومەتی هەرێم و پەرلەمانمان بۆکردن هەرباوەریان پێ نەبوو ووتیان وەکو سۆسیالیست و پارتی و یەکێتی قسەتان لەگەڵ دەکەین یاوەکو بەرەی کوردستانیش هەرزۆر مشکیلە نیە بەلام وەکو حکومەت و پەرلەمان هەرهیچ باوەرمان پێ نەبوو واتە تورکەکان باوەریان نە بەپارتی هەبوو نەیەکێتی و نەبەکەس ووتم ئەوان شەریان بۆدەکەن ئەوە رەئیانە لەسەریان دەبێت رەئیان لەسەر ئێمەچی بێت و چی بلێن و چی بکەن...

لەئەنقەرە بوین کاك شەماڵ و کاك قادر چون بۆ بولغاریا، لەرۆژانی ٧و١٩٩٣/٢/٨ هەرلەوێ بوین و هەوا زۆرساردبوو، لە٢/٩ محمد بدری سکرتێری حزبی کرێکاری سەری لێدان و قسەمان کرد لەسەر وەزعەکان، هەر لە٢/٩ سەردانی مەکتەبی سیاسی حزبی نیشتمانی تورکمانی مان کرد لەئەنقەرە و لەلایەن دکتۆر مظفر ارسلان و کاك یەشارو کاك حسن ئۆزلوچەند کەسێکی کەوە پێشوازی کراین و لەسەر پەیوەندی دووقۆلی و وەزعی کوردستان قسەمان لەسەر زۆر لەروداوەکان کرد، لە٢/١٠ هەر لەئەنقەرە بوم بەتەمای گەرانەوە بووم منالەکانمان زۆر نارەحەت بوون منیش هەروا چونکە لەگەڵ تامین خان لەساڵی ١٩٧٩ وەلەیەك دانەبراوین و ئاسان نەبوو بۆمان، لە٢/١١ لەئەنقەرە دوا خواحافیزی مان کرد منال هەرزۆر نارەحەت و دڵ تەنگ بوون منیش هەروەکو ئەوان زۆرناخۆشبوو منالەکانم بەجێ هێشت بۆدەرەوە برۆن شەو بەرێ کەوتین و چوینە ئەدەنە شەو رێگامان لێ تێك چوو چوینە ئەسکندەرونە نزیك بەرەوئەنتاکیاو گەراینەوە بۆغازی عەنتاب و بۆ عەسرەکەی گەیشتینە زاخۆ برادەران هاتبون بۆ پێشوازی لێمان لەزاخۆ بوین

برادەران لەسلێمانیەوە (١٠) سەیارەپێشمەرگە هاتبوون، لە٢/١٣ بەرێ کەوتین بۆ دهۆك و عەقرەو شەقلاوەو بۆهەولێر و بۆمەکتەبی سیاسی و لەوێ بوین، لە٢/١٤ پێشوازیمان کرد لەبزوتنەوەی ئیسلامی مامۆستا مەلا عەلی و وەفدێك هەروەها پێشوازیمان کرد لەحزبی نیشتمانی تورکمان کە دکتۆر مظفر ارسلان ئەوکاتە هاتبووە هەولێر، لە٢/١٥ چوینە صلاح الدین وسەری کاك مەسعوت بارزانی و مەکتەبی سیاسی پارتیمان دا وادیاربوو کاك سامی باسی کردبوو کەسەفەر دەکەین یالەبارەی یەککگرتنەوە قسەی لەگەڵ کاك مەسعود کردبوو بەقەناعەتی خۆم گەراینەوە بۆهەولێر و شەو لەوێماینەوە بریارمان دا لەرۆژی ٢/١٧ سەفەری تهران بکەین لەهەولێرەوە بۆسلێمانی و عەربەت و سەیدصادق و تەوێڵەو سەرسنوری شوشمێ لەخورماڵەوە چوین لەگردی چقلاوە وە تاناو خورماڵ گیرابوو ئەوبەرو بەری رێگا ئێمەش نەمانزانی بوو پارتی و بزوتنەوەی ئیسلامی شەریان بووەو دووپارتیان کوشتووە وایان زانیبوو ئێمە دەرۆین دەکەوینە بەینیان بەلام ئێمە نەوەستاین و نەشمانزانی مەسەلەکە چیە... گەیشتینە نەوسود هاتن بەپێشوازیمانەوە بۆپاوە ئاغای بەنی ئەحمەدلە پاوە بوو خزمەتی کردین ئاغای جەرموش زۆر ماندوبولەگەڵمان و پاشان چوینە کرماشان میوانی کۆماری ئیسلامی بوین کاك خلیل سەعید لێپرسراوی پەیوەندیەکان بوو ئەویش هاتبوو بەدەمانەوە بۆئەوێ شەو لەکرماشان بوین، لە٢/١٨ هەرلەکرماشان بوین، لە٢/١٩ بەرێ کەوتین بۆهەمەدان و بۆ تەهران لەئوتێل مارلێك میوان بوین، لە٢/٢٠ لەتەهران کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ حاجی ئاغای محمدی من و کاك مولازم کەریم و کاك سامی عبدالرحمن وکاك خلیل سەعید بوین، لە٢/٢١ هەر کۆبونەوەمان هەبوو لەسەر روداوەکان و پەیوەندی دووقۆڵی ئێرانیەکان تەئکیدیان کردەوە ئەوان ئەو برادەرانەی کە ناناسن و لەسەر ئەساسی دۆستایەتی سۆسیالیست و شەخصی من

یارمەتی دەدەن و هاوکاری دەکەن کاك سامی زۆر بێزار بوو بەلاَم پێ دەچوو بەپارتی وتوبێت لەبەر ئەو دەچمە ئێران ئەگەر ئێران هاوکاری نەکرد دەڵێم ئەوە نایکات و ناچار با یەکگرتن بکەین، لە۱۹۹۳/۲/۲۲ لە تەهران بوین مانگی رەمەزان بوو بەرۆژو بووم کۆمەڵێك لەمەسئولینی سوپا هاتن بۆلامان لەئوتێل ووتیان حەز دەکەین لەسەر چەند خاڵێ قسە بکەین بۆئەوەی لای ئێمەوە ئەو خاڵانە گەلاَڵە بکەین و لەچوارچێوەیەکدا رێکی بخەین کاك سامی زۆر لەوە تووڕە بوو ووتی چۆن شتی وا دەبێت ووتیان کاکە دەبوو پێش هاتنتان ئەوە لای هەردوولا بکرایە کاك سامی دەیویست خۆی عاجز بکات لەئێران و بگەرێتەوە بەلاَم هەرماینەوە، لە۲/۲۳ چاومان بەئاغای سەردار واحیدی کەوت لێپرسراوی قودسی سوپای پاسداران لەقصری پیرۆزە، هەرلە ۲/۲۳ دوای نیوەرۆ کۆبونەوەمان لەگەڵ سەید محمد باقر الحکیم دا هەبوو لەمجلیسی ئەعلای ئیسلامی، لە۲/۲٤ هەرلەتەهران کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ شێخ عاسفی دا مرشیدی حزبی دەعوەی ئیسلامی، لە۲/۲۵ هەر لەتەهران بوین و خەریکی کۆبونەوە بوین، لە۲/۲۷ لەتەهرانەوە گەراینەوە بۆ کرماشان بەلاَم لەرۆژی ۲/۲٤ بۆیەکەم جارکاك سامی وتی ئەگەر ئێران هاوکاریمان نەکات چی بکەین وایەکێتی شەرمان دەکات و هەموو شتمان لێ دەبرن هەروەها ووتی بیرێك بکەینەوە لەچارەسەری ئەو هەموو خەڵکەی هەمانە ووتم بزانین ئێران رەئی چیەو یەکێتی وپارتیش قسەیان لەگەڵ دەکەین بیرێك بکەینەوە ووتی باوەر بکە هیچمان بۆ ناکرێت ووتم کاك سامی بەرەئی تۆ چی بکەین باشە... ووتی وەلاَ لەگەڵ پارتی دا یەکگرتن بکەین و ئەمریکیەکان و بەریتانیەکان پێیان خۆشەوهەروەها تورکەکانیش پێیان خۆشە و بە مەرجێك ئەگەر تۆیشی تێدا بیت کاك مەسعود هەمووشتمان بۆ دەکات من بۆئەوەی زیاتر تێ بگەم ووتم ئەگەر پارتی نەیکات ووتی لەسەر من ووتم باست کردووە ووتی باسم کردووە بەلاَم کاك

مەسعود وتویەتی بیرێکتان لەوە نەکردوەتەوە سنورێك بۆئەو (٥٠ بە٥٠) یە دانێن و چارەسەری کێشەی کورد بکەن هەتا هەتایە ئەو هێزەی (MCC) لەکوردستان بەدیارمانەوە نامێنێ من تێ گەیشتم و لەسەری نەرۆیشتم لەرێگاش گەراینەوە کرماشان کاك سامی ووتی من گەرامەوە دەست پێ بکەم بۆئەوکارانە ووتم کاك سامی جارێ پەلە مەکەن تاقسەی لێ دەکەین ئێستا ئێمە وەزعەکەمان باشەو کێشەیەکی وامان نیە و هەولێش ئەدەین لەگەڵ یەکێتی دا قسە بکەین کاك سامی و کاك مولازم کەریم گەرانەوە لە٢/٢٨، من لە ٢/٢٨ گەرامەوە بۆ سنە بۆماڵەوە کاك عەلیش لەوێ بوو لەگەڵ کاك عەلی و منداڵەکان لەبازار زۆر گەراین لەسنە ئەو کاتە هەوا خۆش بوو بەرەو بەهار دەرۆیشت، لەرۆژانی ١و١٩٩٣/٣/٢ هەرلەسنە بوم، لە٣/٣ چوینە کرماشان و گەراینەوە بۆ سنە، لە٣/٤ لەسنەوە بەرێ کەوتین بۆ مەریوان و بۆ پێنجوێن لەباشماغ خاڵەحاجی ومامۆستا هادی و هەموو برادەران کاك شێخ جعفر شێخ مستەفاو قائیمقامی پێنجوێن هاتبون بۆ باشماغ بۆپێشوازی گەراینەوە بۆ سلێمانی، لە٣/٥ چومە باریکە بۆ پرسە و پاشان چومە هەڵەبجەی تازە هەر ئەورۆژە گەلاڵی لەناو خۆیاندا ببوو بەشەریان عەلی و صالح محمود حسن دووکەسیان کوشتبوو ئەوانیش کوژرابونەوە پێم ناخۆشبوو بەلام گەلاڵی ئەوماوەیە کەوتبونە گیانی یەك ریش سپی و پیاوەناسراوە کانیان و سەرۆکەکانیان هۆکاری کوشتنیان بون، لە٣/٦ چومە هەڵەبجەی تازەو دەربەندیخان و باوەنورو کەلار بۆپرسەی نەبەرد جاف برای کاك کیسرا جاف وەسەری کاك مستەفا بەگی جافمان دا و پاشان پرسەی کاك محمود لەهەڵەبجەی تازەش پێشوازیمان لەکۆمەڵێك پیاوە ناسراوەکانی هەڵەبجەی تازە کرد، لە٣/٧ کۆرێك گیرا لەهەڵەبجەی تازە بەو بۆنەیەوە بەناوی سەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانیەوە قسەم کرد لەهەڵەبجە بۆ کۆمەڵێك خەڵکی هەروەها چوینە چەندپرسەیەك لەگردەنازێ و

تەپەتۆڵەکـە و هـاوار و ئۆردوگـای عەنـەب لەهەڵەبجـەی شـەهید وەلـەوێ سـەری بارەگای هێزی زمناکۆکە کـاك نـوری حمـە عـەلی فەرمانـدەی هێـزی بـەو ناوچـەی هەڵەبجەمان دا وەلەگردی گۆش سەری ماڵی کاك ئەحمەد کوێخـا حمـە رەشـیدمان داو گەراینەوە هەڵەبجەی تازە و پاشان بەرێ کەوتین بۆ سلێمانی و کۆیـەو هـەولێر لـەوێ کۆبونـەوەی کۆمیتـەی ناوەنـدی هـەبوو، لـە٣/١٠ هەرکۆبونـەوەی کۆمیتـەی ناوەندی بەردەوام بوو، لە٣/١٣ کۆبونەوەکە کۆتایی هات و گەراینەوە بۆ سلێمانی، لە٣/١٤ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتین بۆباریکە بۆ پرسە پاشان چوین بۆ سەیدصادق و سیروان سەردانی قوتابخانەو نەخۆشـخانەمان کـرد و پاشـان چـوینە گوڵەخانـە و ریشێن و میری سورو گەراینەوە بۆ سلێمانی، لە٣/١٥ لەسـلێمانیەوە چـوینە کۆیـەو هەولێر علاقات لە تورکیا ئاگاداریان کردین هەندێك چاوپێکەوتنیان بۆ رێك خستوین لەتورکیا و لەرۆژی ٣/١٦ دەبێت لەشەقڵاوە ئامادە بن و هەلیکۆپتەری هاوپـەیمانی ئـەمریکا دێتـە ئـەوێ و دەمانبـات لەهـەولێرەوە لەگـەڵ بـرادەران هـاتن چـوینە فرۆکەخانەی شەقڵاوە و دوو هەلیکۆپتەر هاتن و لـەجیاتی جەنـەراڵ نـاب گۆرابـوو یەکێکی کە بوو نوێنەرانی بەریتانیاو فەرەنسا و تورکیا لەشەقڵاوە پێشوازیمان لـێ کـردن و لەگـەڵیان سـوار بـوین مـن و کـاك سـامی و کـاك مـلازم کـەریم و کـاك عمربۆتانیش هەر لەزاخۆوە لەگەڵیان هاتبوو بە (٤٣) دەقیقە چوینە زاخۆو لـەوێش دوای راوەستانێکی کورت سوار بونیـەوە بەیـەك سـەعات چوینە دیاربـەکر و لـەوێ پێشوازیەکی گەرم و رەسمیان کردو دوای وەستانێکی کورت لەدیاربەکر لەتشریفات علاقات تەیارەیان ئامادە کردبوو بەتەیارەش بەرێ کەوتین و بەیەك سـەعات و (١٠) دوقیقە چوینە ئەنقەرە و لـەوێش چاوەرێیان دەکـردین پاشـان کـاك سـامی و کـاك مولازم کەریم و کاك عمربۆتانی چونە ئوتێل منیش مناڵەکانمان لەئەنقەرە بـون مـن رۆیـشتم بـۆلای ئـەوان کەشـەوی ١٦-١٧/٣/١٩٩٣ بـوو، لـە٣/١٧ سـەعات (١١)ی

سەرلەبەیانی لەوەزارەتی دەرەوە پێشوازی کراین لەلایەن حیکمەت چەتین وەزیری دەرەوەی تورکیا (حیکمەت چەتین کوردە) من کاك مولازم کەریم و کاك سامی و دکتۆر خیراللە بوین لەسەر وەزعی کوردستان و عێراق و هاوکاری وپەیوەندی حزب و حکومەتی تورکیا باس کراو لەوکاتەدا بوو ئۆجەلان نامەیەکی نوسیبوو بۆ تورکیا و داوای گفتوگۆی کردبوو لەتورکیا حیکمەت چەتین پێ ی وتین وادیارە مامۆستای هەیە ئەو نامەیەیان بۆ نوسیوە ئەگینا ئەو شتی وا نانوسێ یانازانێ بینوسێ مەبەستی لە مام جەلال بوو بۆی نوسیبوو یا راسپاردبوو ئەو نامەیە بنوسێت دوای شەری (PKK) بوو لەلایەن پارتی و یەکێتی و تورکیاوە هەروەها ووتی دەربارەی ئێمەو پەیوەندیمان لەگەڵ حزبەکانی کوردستانی عێراق هەموویان مەرجمان هەیە ئەویش شەری سەربازی دژی (PKK) و زانیاری و ئەوان بەتیرۆرست بزانێ ئەوە هەر حزبێك قبوڵی نەکات ئێمە ناتوانین یارمەتی بدەین ئێمە بۆ حزبەکان لەو بوجەیە کە حکومەت و پەرلەمان دیاری کردووە بۆ جەندرمەو سوپا دژی (PKK) یائەو میزانیە بۆ سوپا و بۆئاسایشی وڵات دانراوە دەبێت لەوە یارمەتی بدەین ئەوەش شەرت ومەرجەکانی لەگەڵ جەندرمەو میت و ئەوانە هەیە دوای ئەوەی دەوڵەت بریاری گشتی لەسەر دەدات ئێوەش ئەگەر شەری (PKK) قبوڵ بکەن هەموو کارەکانی کە بێ وەستان میکانیکی دەروات ئەویش ئاماژەی بەوە دا کەیەکێتی و پارتی داوایان کردووە بێ ئاگاداری ئەوان لەگەڵ هیچ هێزێکی کوردی رێك نەکەون واتە(ی.ن.ك)و(پ .د .ك) نە بۆئاشتی نە بۆشەر تەنانەت لەگەڵ دۆست و دوژمنانی کوردیش دا گرێبەستیان کردبوو تەنها لەگەڵ ئەو دوو حزبە نە بێت نەکریت بوشەریش رازی نین بێ خۆیان کەسی کەبیکات ئەگەر ئەوانی تێدانەبێت یاپێشوازی نەکرین ئەو نەیووت ئێمە ئەو داوایەمان قبول کردووە.. ووتمان ئێمەش بەر دەکەوین ووتی نا کەئێوە بەرەسمی بارەگای مەکتەبتان هەیەو

وەئێستاش بەرەسمی و ئاگاداری لەلایەن حکومەتەوە داوا کراون بۆ ئەنقەرە قسە زۆرکرا لەو رووەوە مەسەلەی ئاسان کاری و تجاری و هاوکاری کرا بەلاّم هاوکاری سەربازی لە بواری تجاری بەستراوە (PKK) وە دووسەعات لەسەر زۆر خاڵ و مەسەلە قسەمان کردو پەیوەندی هەردوولا و زۆرشتی کەش باسی ئەوەمان کرد بیر لەچارەسەرێکی ئاشتیانە بکەنەوە باشترە ووتی ئاشتی یا گفتوگۆ لەگەڵ (PKK)نەءانی تورکیای ئێستایە چونکە ئەوان گفتوگۆ دان پێیا نان و هاتنەوەیان شەرعیەت پێ دان و جێگایەك بکەنەوەو زۆر شتی کەش دەکەن تائێستا بریارێکی وانیە پێ کەنی و ووتی ئێمە داوا دەکەین هاوکاریمان بکەن شەریان بکەن ئێوەش خەریکە دەبنە وەساتە لەنێوان دا زۆر قسەی کە کرا و ئامادەیی و مجامەلەش هەبوو لەوێ کۆتایی هات، هەرلە ٣/١٧ لەدوای نیوەرۆ سەفیری بەریتانیا لەئەنقەرە سەردانمان کرد زۆرقسە و لەسەر زۆر مەسەلەش کراو دوای ئەوان سەردانی سەفیری ئەمریکاشمان کرد لەئەنقەرە قسە زۆر لەسەر روداوەکان و ودزعی کورد و(MCC) و زۆرشتی کەش کرا ئەوکات وادیاربوو هەموویان رێکەوتبون لەسەر ئەوەی کوردی عێراق شەری (PKK) بکات و دەیانوت ئێوە چیتان کردو گەیشتنە کوێ لەگەڵ وەزیری دەرەوە زۆر تاقیبی ئەوەیان دەکرد ئێمە چیمان کردووە و زۆر بەگەرمی بوو داواشی کرد بۆرۆژی دوایی نیوەرۆ لایان بۆنان خواردن دەعوەت بین ئێمەش قبوڵمان کرد، لەنیوەرۆی رۆژی ١٩٩٣/٣/١٨ لەسەفارەتی ئەمریکا لەئەنقەرە دەعوەت بوین لەلای سەفیر و قسەی زیاترو زۆرتریش کرا ئەویش داوای کرد کەرۆژنامە نوسێکی ئەمریکی هەیە بەڵکو بینێرنەوە بۆ کوردستان بۆیان و بۆشیان بنێرینەوەبو ئەنقەرە بەلاّم دیاربوو هەر رۆژنامە نووس نەبوو بەئیشی کەش ناردبویان چونکە زۆریان لامەبەست بوو دوای نیوەرۆش کۆبونەوەیەکمان لەگەڵ لێپرسراوانی تورکیا هەبووپاشان لەگەڵ دکتۆرمظفر ارسلان

کۆبونەوەمان هەبوو لەسەر پەیوەندی هەردوولاو مەسەلەی کوردستان و عێراق وەقسەمان لەسەر زۆرشت کرد، لە۳/۱۹ پەرلەمانی تورکیا تەلەفونیان کردو ووتیان سەردانتان دەکەین لەدوای نیوەرۆ چوار پەرلەمانتار هاتن بۆ مەکتەبی حزب لەئەنقەرە کاك ئەحمەد تورك بوو لەگەڵ (۳) ئەندامی کەی پەرلەمان لەسەرزۆرشت قسەکرا بەکوردی قسەکان دەکران کوردبوو ناوی ئەحمەد تورك بوو وادیار بوو سەرۆکی کتلەیەکی پەرلەمان بوو یەکێکیان لەگەڵ بوناوی لەیلا زانا بوو وەکەسێکی کە ناوی زوبیرئایدەر یا رمزی قوتاك بو کاك سامی دژی (PKK) قسەی کردو ووتی (PKK) خراپەو تیرۆر دەکات دژی هەموو کەسێ ئەحمەد تورك زۆر مرۆڤێکی باش بوو ووتی بەکاك سامی (PKK) تیرۆریست نیە تورکیا و دەوڵەت تیرۆریستە دەوڵەت ئازادی بە کورد نادات دەوڵەت توندوتیژە بۆیە دەوڵەتێکی وا (PKK)ی پێویستە کاك سامی بێ دەنگ بوو دوای ئەوان رۆیشتن کاك سامی ووتی ئەگەر ئەوە پەرلەمانی تورکیا بێت و ئەوە رەئیان بێت حەقە (PKK) لەوە زیاتریش بکات ئەگەر وابێت تورکیا حاڵی باش دەبێت ئیشەکانی ئەندامانی پەرلەمان رەئیان وابێت دەروات زۆری لاسەیر بوو پەرلەمانی تورکی یاکەسانی ناو پەرلەمان رەئی وایان هەبێت، لە۳/۲۰ هەر لەتورکیا بوین پێشوازیمان لەهەندێك حزب و لایەن و میوان کرد، لە۳/۲۱ (PKK) بەئالای خۆیان و وێنەی ئاپۆوە مەسیرەیان کردو پۆلیس پاسەوانیان بوو لەهۆڵێکدا ئاهەنگێیان دەگێرا و قسەیان دژی تورکیاش دەکرد کەلەلای ئێمەو لەعێراق شتی وا نەبوو بەلام دوای تێکیان دابوو وابزانم ئالای دەوڵەتیان داگرتبووسوتاندبویان وئالای خۆیان بەرز کردبووەوە خۆ ئەگەر لەبازاریش لەچەند جێگایەك خۆپیشاندانیان دەکرد زرێ پۆش و ئەوانە کەوتنە ناوبازارەوە، هەر لە۳/۲۱ کاك مولازم کەریم و کاك عمربۆتانی گەرانەوە لەفرۆکەخانەوە بۆ دیاربەکر بریار بوودوای ئیشەکانیش کاك سامی سەفەری

دەرەوە بكات و منيش دواى بگەڕێمەوە بۆكوردستان، لە٣/٢٢ لەتوركيا سەرى سەفارەتى ئوستراليامان داو چاومان بەمستەر پرايس سەفيرو مستەر هيلْ سكرتێرى يەكەمى سەفارەت كەوت و لەسەركوردو حزب و وەزعەكان قسەمان كرد و هاوكارى مرۆڤايەتيان بۆكوردستان و وەرگرتنى كورد بۆ ولاتەكەيان پاشان سەردانى سەفارەتى سويسرامان كرد وادياربوو كاك سامى داواى كردبووسەرى سويسرا بدات لەو (٥-٦) رۆژەدا چەندين بروسكە لەكوردستانەوە هات كەمن بەپەلە بگەڕێمەوە بۆكوردستان و جارێكى كەش يەكێتى شەرمان پێ دەفرۆشن و كاك رەسولێان هانداوە بچنە سەر بارەگاكانمان لەرانيە و پەلامارى بارەگاكانيان داوەو داگيريان كردووە لەقەلادزە و كۆيەو تەق تەق ولەشەقلاوەش شەربووە وئەوان هەلهاتون وەلەزۆر جێگاى كە جموجۆلْ هەيە لە كفريش پەلامارى بارەگاو راديۆيەكى (FM) مان هەبوو پەلاماريان داوە يەكێتى چونەتە بارەگاكەو هەرزۆژەى لەلايەك كێشەيەكيان بۆ دروست دەكردين پێ دەچوو كاك سامى بروسكەى كردبوو بۆكاك مەسعود دواى ئەوەى نائومێدبوو كەتوركياش شتێكمان بۆناكات بێ ئەوەى شەرى(PKK)ى بۆنەكەين كەكاك مەسعود بەرگريمان لێ بكات لەوشەر پێ فرۆشتنەى يەكێتى گەرانەوە باسى يەككرتن قسەى لێ دەكەين و كۆبونەوە دەكەين لەوكاتەشدا چەند جارێك كاك سامى باسى كردو ووتى ئەوەتا مام جەلال نايەلێت رێگا نادات و شەرمان پێ دەفرۆشێت كاك مولازم كەريم و كاك عمربۆتانى هەردووكيان سەريان دەلەقاند ماناى وايە رازى بون بەو وەزعەو قسەكان دوايش لەگەلْ من لەئوتێلەكە باسى كرد گەرانەوە بەرەئى من كۆبونەوەى كۆميتەى ناوەندى بكەين لەسەر مەسەلەى يەككرتن لەگەلْ پارتى دا من ووتم كاك سامى پەلەى ناوێت گەرانەوە قسەش لەگەلْ يەكێتى دەكەين بوئەوەى چيكە شەرمان پێ نەفرۆشن وازمان لێ بهێنن لەوبارەيەوە وە ووتم ئەوە خۆت گوێت

لێبوو کەتورکیا دەڵێت ئەوەی شەری (PKK) نەکات یارمەتی نادەین ئێستا ئێمە هیچمان دەست نەکەوێت گرنگ ئەوەیە شەری کورد ناکەین و ئێستائەگەر یەکێتی یاپارتی بوایە ین دەبوو شەری کوردمان بکردایە ئێستا دەسەلاتمان هەبێت شەرەکە نەکەن... دەسەلاتمان هەیە خۆمان شەرنەکەین ووتی جائەو مانەوە حاڵە هەر رۆژەی لەلایەك کێشەمان بۆ دروست دەکەن وەلا بەرەئی من باشترین فرسەتەو دەتوانین هەندێك شتی خۆشمان فەرز بکەین لەسەر پارتی و رزگارمان لەوململانێیە ئەبێت و لەناو حزبێکی وەکو پارتی من دەزانم تۆ جێگای دووهەمت دەبێت یاجێگایەکی گەورەتر واتە پارێزگای سلێمانی و کەرکوك و بەحزبی خۆمان و پارتیشەوە وادیار بوو لەگەڵ هەموو برادەران قسەی کردبوو ئەمجارەیان لەوەی ئێران زیاترو ئاشکراتر قسەی کردو ئەویش لەداخی ئەوەی شەریان پێ فرۆشتین لەوێش فاکسمان کرد بۆکاك دکتۆرمحمودو قسەمان لەگەڵ برادەران کرد کاك دکتۆر وەلامی دایەوە کێن ئەوانە لەحزب ئیش دەکات و ئامادەشە ئیش بکات و دۆستی حزب دەبێت لەهەر حاڵەتێکدا دڵنیای ئەویش بوین هەربروسکە لەدوای بروسکە پەلاماری کوێ درا لەلایەن یەکێتیەوە ...وێنەی بروسکەیەکی کاك مەسعود لە ١٩٩٣/٣/٢٣ دا بۆیەکێتی لێدرابوو دەڵێت ئەگەر بارەگاکانی یەکگرتن لەرانیە چۆڵ نەکەن پارتی بۆ بەرگری کردن لەحەق دژی ناحەق ناچار دەبێت هێزی سەربازی بەکاربهێنێ یەکێتیش بێ وەستان بروسکەی کاك مەسعودیان جێ بەجێ کردوو وازیان لەمەقەراتی ئێمە هێنا لەرانیە من کەبروسکەی کاك مەسعودم دی زۆرم لاسەیربوو ئەو رۆژە لەبەرەی کوردستانی لەهەولێر هێشتا مام جەلال قسەکانی تەواو نەکردبوو سەیری منی کردو ووتی ئەوە رەئی پارتیەو من و حکومەتیش و قسەکانی مام جەلال هەمووی قسەی منەو بەرگری لێ دەکەین ئێستا ئەم بروسکەیە شەر لەسەر ئێمە بکات لەبەر چیە؟ یاهەریەکە بۆحەق و بەرگری لەحەقە

کەئێمە ئێستا زوڵمان لێ دەکرێت و شەرمان پێ دەفرۆشرێت بۆ ئەوەیە یابۆ ئەوەیە تەماحی لەحزب هەیە یاکاك سامی و برادەران وەعدیان داوەو ئەویش حزب و بارەگاکانی بەهی خۆی دەزانێ و ئەو بروسکەیەی کردووە زۆرم لاسەیربوو بەلاَم بریارم دا لەبەر بروسکەی برادەران هێشتا ماڵەوەمان بەرێ نەکرابوون بگەرێمەوە بۆ کوردستان لەسەفەری پێشوو لەئەنقەرە بووم لەکۆمپانیایەك داوای بەسێکی تەلەفزیۆنیم کردبوو ئامادە کرابووو تەلەفزیۆنێکی باشبوو لەکۆمپانیایەکی تورکی کریم بەلاَم ئاریاڵ و شتەکانی هێشتا تەواو نەببوو قسەشمان لەگەڵ کردبون کەخۆیان دابمەزرێنن لەکوردستان ئایدن بۆی دروستکردین لە(سلێمانی) بۆمان بە(١٤)هەزار دۆلار ئەوکاتە هەر ١٠٠دولار بە ٩هەزاردیناری سویسری بو من ئەو مانگە سەفەرم زۆربوو بەلاَم رەمەزان بوو ناخۆشبوو سەفەر بەرۆژوبووم لەلای منالەکان دەرچوین و نارەحەت بووم ئەو کچە ئەمریکیەش ناوی سۆزان بوو لەگەڵمان هات بەسەیارە بەرێ کەوتین لەگەڵ دکتۆر خیراللە و کچەکەش لەرۆژهەلاَتی ناوەراست کاری دەکرد وادیاربوو زمانی فارسی دەخوێندو کارەکەی لەوێ بوو فارسی دەزانی و لەسەر زۆرشت قسەمان کرد، لەسەعات (٤/٣٠) لەئەنقەرەوە بەرێ کەوتین و چوینە ئەدەنە و غازی عەنتاب سەعات (٢)ی شەو گەیشتینە ئۆرفە شەو لەئوتێل بوین ئۆرفە پارێزگایەکی کوردستانی تورکیایە لەنێوان غازی عەنتاب و ئۆرفە دا چیایەك هەبوو کەکوردستانی لەتورکیا جیا دەکردەوە ناوی چیاکەم نەزانی وەکو چۆن لای خۆمان چیای حمرین یامنصوریە نێوان کوردستان و عێراق جیادەکاتەوە .

لە١٩٩٣/٣/٢٤ لەئۆرفەوە بەرێکەوتین بۆقزڵ تەپە وسلوپی و جەزیرەی بۆتان و بۆسەر ئاوی دیجلە وابراهیم خلیل برادەران خروجیەیان لەپاسەپۆرتەکەدا چوینە سەر پردەکە بۆ گەرانەوەمان بۆکوردستان وهەرلەوێش نوێنەری یەکێتی نیشتمانی

(١٠) جار زیاتر داوای ئەو رۆژنامە نووسە ئەمریکیەی دەکرد بیان دەینێ چونکە نوێنەری یەکێتی ئەوکچەیان دیبوو لەئەنقەرە ناوی سۆزانە بوو لێیان پرسیبوو ئەویش وتبوی لەگەڵ سۆسیالیست دەرۆم وادیاربوو مەوعددەکەشی لێ وەرگرتن ئەوەندە هاتن ووتمان کاکە ئەوە میوانی ئێمە و لەگەڵ ئێمە هاتووە لەئەنقەرەوەو سەفیری ئەمریکا تەسلیم بەئێمەی کردووە هەروازیان نەهێناو بە نوێنەرەکەی ئێمە لەابراهیم خلیل وتبویان هەردەمانەوێت ودەبێت تەسلیمان بکەن وادیار بوو ئەوکات کاك بەکرفەتاح لەئەوناوەبوو بەمنیان ووت منیش ووتم باکاك بەکر ببینم دەیان دەینێ یا خودلەلق لەسلێمانی تەسلیمیان دەکەین وادیاربوو برادەران وکاك عمر بۆتانی و ئەوانیشیان بەگیر هێناون و ووتویان بۆ دووسەعات دەیبەین و دەیهێننەوە من سەرقاڵ بووم چونکە زۆر قەرەباڵغ بوو چوینەوە زاخۆ پرسیارم کردوتم ئەو کچە لەگەڵمان بو چیلێهات ووتیان وەلا یەکێتی ئەوەندە داوایان کرد ووتمان بابیبەن بەڵکو کێشەی کورد لەسەر ئەو رۆژنامە نوسە تەواو بکەن ووتیان کچەکەش لای سەیر بوو ئەو هەمووئیلحاحەی لێ دەکەن و داوای دەکەن چی مەبەستە کە ئەوەندە بەخیل بوون خۆمان هێنابومان و لەگەڵ ئێمە هاتبوون چاویان رێگای نەدەدا لەگەڵمان بێت جادەبێت ئەوەی لەگەڵ خۆیان دێت چۆن رێگا بدەن حزبێکی کە ببینێ شێوازەکە جوان نەبوو هەرچەندە من گوێم لەو شتانە نەبوو.. پاشان لەزاخۆوە بەرێ کەوتین بۆدهۆك و نانمان خواردو سەعات (٤)ی دوای نیوەرۆ لەدهۆك دەرچوین بۆ عەقرەو بۆسەرئاوی قەندیل و پردەکەو حەریرو لەباسرمەوە بۆ شەقلاوە و هیران و هیزۆپ و دوکان و پیرەمەگرون و بۆسلێمانی سەعات (١٢)ی شەو گەیشتینە سلێمانی لەگەڵ یەکێتی هەرحەساسیەت هەبوو، رۆژی ١٩٩٣/٣/٢٤ رۆژی جەژنی رەمەزان بوو ئێمەش بەرێگاوە بوین، لەرۆژانی ٢٥و٢٦و٣/٢٧ هەرلەسلێمانی بوین و سەرقاڵی ئیشوکار بوین، لە٣/٢٨ سەردانی

چەند ماڵە شەهیدێکمان کرد لەسلێمانی، لە۳/۲۹ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتین بۆ بەرزنجە سەری رێکخراو پێشمەرگەکانمان داو گەراینەوە بۆسلێمانی، لە۳/۳۰ هەرلەسلێمانی بوین، لە۳/۳۱ لەسلێمانیەوە چومە هەڵەبجەی تازەو لەبارەگای لەشکر بوین لەشکری یەك دەورو تەسلیمان لەگەڵ ئەندامانی لەشکری پێشوو کرد چونکە (۳۷۰۰) پێشمەرگە بوون بەسوپای یەکگرتوو کاك ملازم کەریم سەر لەشکربوو بو بەسەرۆکی هەیئەی ئەرکان وەزارەتی بەرگری وبووە سوپای یەکگرتووی کوردستان مەلا فائیق ئامرلیواو ئەحمەد کوێخاعمر جێگری ئامرلیواوکاك محمود وکاك محمەد صالح و ئامر فەوجەکان بون و کاك کەمالی کوێخا عمروکاك قادرچاوشین و ئەوانیش لەلیوا دانران وکاك ئەحمەد قەدەفەری و عەلی بچکۆل و نوری حمە علی و سەید عبداللە ی کەردزی و ابراهیم و چەند کادرێکی کەش لەقیادەی مەنتیقەکان دانران و لەشکر دامەزرایەوە دوای ئەوان، لە۳/۲۸ یەکێتی لەکفری قسەیان کردبوو لەگەڵ ئەو کەسەی ئێمە کەبەرپرسی رادیۆکەمان بوو ناوی قیس مەلامحمد بوو لەگەڵ چەند کەسێکی کە بەنهێنی پەیوەندی کردبوو بەهەرچی قەناعەتیان پێ کردبووکەرادیۆکەو بارەگاکەیان تەسلیم بکات و یەکێتیش ئەوکات دەڵێن ئەوە خۆیان هاتونەتە ناو یەکێتی و بریاریان داوەو سەرنگەریان گواستوەتەوەو هەر لەبارەگاکە بمێننەوە یەکێتی هێزتان بۆ دەنێرێت کەئەوەم بیست ئیتر زۆر نارەحەت بووم و بریارم دا لەسەر ئەوەشەر ئەبێت یانابێت کەفی خۆیەتی و خۆشم شەخصی دەچم بۆکفری هەرکەسی لێ بێت بەبێ وەستان لێیان دەدەین لەلەشکرەوە هێزێکی (۸۱) سەیارە پێشمەرگەم ئامادەکردو خۆم چوومە دەربەندیخان شەو مامەوەو ئیشم هەبوو کە رۆژی دوایی هێزەکەش بگات و برۆینە کەلار یەکێتی وئەوان هەوڵیان دەدا من نەرۆم و دوایی خۆیان چارەسەری بکەن تامن گەیشتمە دەربەندیخان ی — ن—ك ئەوان چەند سەفەرێکی کفری و

کەلاریان کردبوو بۆئەوەی  پێش من چارەسەری بکەن وادیاربوو یەکێتی ووتبویان باخۆی نەیەت خۆمان لێرە چارەسەری دەکەین ئەگەر من برۆمە کفری دەڵێن ئەوە بەزۆر چارەسەری کردو مەقەرو شتەکانی لێ وەرگرتنەوە هەرچیان کرد برادەرانی خۆمان ووتم وەلا هەردەرۆم هاتن و رۆیشتین وادیاربوو یەکێتی لەسەر قەڵاو لەپردی ابراهیم خان لەلای باوە شاسوار لەپێش چونە ناو کفری کەمین و هێزیان دانابوو هاتنەوە ووتیان  وەزعەکە حەساسەو ئەوان هێزیان کۆکردوەتەوە زۆرم پێ ناخۆشبوو ووتم هەرچی کوردە تیا بچێت هەردەرۆم وەبروسکەیەکم بۆ هەموو هێزەکان کردو ووتم لەسەر خەتی جیهاز بن ئەگەر لەکفری شەربوو لەهەموو لایەك دەستی پێ بکەن وەئاگاداری لیواو فەوجەکانیشم کرد لەسوپای یەکگرتوو پەلاماری هێزی یەکێتی بدات (٣٧٠٠) پێشمەرگەمان لەهێزی سوپا هەبوو...
یەکێتی ئەوانەی  لەسوپا بوون هێنابویانە دەوری کفری وادیاربوو پارتی و یەکێتیش هەریەکە لەئاستی خۆی  ئاگاداری سەروی خۆی کردبوو شەر ئەبێت و وەزعەکە حەساسە پارتیش لەسەر بروسکەی پێشویان پیشتیوانیان لەئێمە دەکرد فەوجێکمان هەبووسۆسیالیست لەکەلار ئەوانیش خۆیان  بەستبوو ووتبویان چیە ووتبویان ئێوە دەچن شەری ئێمە دەکەن و دەچنە سەر بارەگامان بۆئێمە لێرە دانیشین ئێمەش دەست بەسەر لیواکەدا دەگرین و پارتیش پشتیوانی لەئێمە دەکات، من لە١٩٩٣/٤/١ چومە باوەنورو بۆکەلاربەهێزێکی زۆرەوە ووتیان دابەزن و ئیسراحەت بکەن ووتم نایەکسەردەچینە کفری وادیاربوو یەکێتی تەنگەتاو ببوون شەر دەبێت وچۆن نەبێت بەپەلە ئاگاداری منیان کرد کە ئەو لێپرسراوانی لیواکە وادەکەن کەسەردانی من بکەن بۆبەخێرهاتن... من ووتم بالەکفری بگەرێمەوە وادیاربوو هێشتا قسەکانم تەواو نەکرد شێخ دانا ناوێك یازانا ئامر لیوای پارتی بوو لەگەڵ کاك اسماعیل ئەحمەد مەناف پێشتر دەمناسی پارتی لەلیواکەو کاك

نەبەردی حمەی مینا کەپێشتر دەمناسین و پێشمەرگەی کۆن و خزم و کورێکی باش و ئاقڵ بوو کۆمەڵێکی ترش هاتن و ناچار دانیشتین وادیاربوو بۆئەوە هاتبوون من تاخیر بکەن نێو سەعاتێك تا ئەو هێزانەی یەکێتی بۆئێمە دانیشتبوون لایان بەن لەرێگاکان من دوای تێگەیشتم لەهاتنەکە دوای یەکێ هات وئەوە بۆکاك نەبەرد هات ووتی ئەوە ئێمە هەمووومان لەخزمەتاین بۆ کوێ بڵێت و ئێمە ئەوانەی لێواکە لەپێشەوە دەرۆین و بارەگاو هەموو شت هی خۆتانە و عەلەمی شینی پێوەیەو رادیۆکەشیان هێناوەتەوەو تەسلیم بەبرادەرانتان لەکفری کراوە هەڵوێستی کاك نەبەرد محمد قادر ناسراوبەنەبەردی حمەی مینا زۆرم پێ خۆشبو کە ژیرانە لەگەڵ شێخ دانا کاك اسماعیل ئەحمەد مەناف بونە سەبەب شەرنەبێت ئێمەش بەرێ کەوتین بۆکفری وابوو هەموو شتەکان جگە لەخانووەکە تالان و پەنجەرەیان پێوە نەهێشتبوو بەلام هەرکەسەو شتیان لێدانابوو ئێمەش چوینە کفری و سەری بارەگامان داو سەری ماڵی فەقێ عەلی و سەری چەند جێگایەکی کە وادیاربوو یەکێتی هەڵەوناوەش دامەزرابوون لەسەربان و شوێنە بەرزەکان پێشمەرگەی ئێمەش بەهەموو شاردا بلاو بونەوە وادیاربوو ئەوانیش دژی یەکێتی قسەیان کردبوو دوای ئەوانە یەکێتی ناحەقیان پێ کردین بۆیە منیش بۆشەر چوم بۆکفری بەلام کەئەوان بارەگایان چۆڵ کردبوو کێشەکان تەواو ببوون ئێمەش نەمانویست شەر دروست بکەین دژی شەر بوین شەری ئەوکاتەش پارتی داخلی شەر دەبوو

مەسەلەی یەککرتن لەگەڵ پارتی بەنهێنی تەرح کرابوو جگە لەکاك سامی دووجار لەگەڵ من باسی کردبوو... پاشان لەکفریەوە گەراینەوە بۆ کەلارو شەو لەوێماینەوە، لە٢/٤/١٩٩٣ گەراینەوە بۆباوەنورو نیوەرۆ لەماڵی کاك صدیق بوین دەعوەت ئەو بوین پاشان گەراینەوە بۆ دەربەندیخان و هەڵەبجەی تازەو سلێمانی ئەوەش کێشەیە بوو یەکێتی بۆی دروست کردین، لە٣/٤ لەسلێمانی بوین و

سەرقاڵی ئیشوكاری ڕۆژانە بوین، لە٤/٤ لەسلێمانیەوە بەرێ كەوتین بۆ عەربەت و سەیدصادق وناڵپارێزو پێنجوێن سەردانی هێزی ئازادیمان كرد و پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی هەر لەو ڕۆژەنەدا یەكێتی ئامر كەرتێكیان كوشتین بەناوی كەریم لتیف خەڵكی راپەرین بوو لەناوشارلە سلیمانی كوشتیان گوایە كۆن جاش بووە و پێشمەرگەی شەهید كردووە كەئەوكات دەیانی وا لای خۆیان بوو كەدەیان پێشمەرگەی شەهیدو تەسلیم بەحكومەت كردبوو لایان بوو كەدوای ئەوەی عفووی گشتی بەرەی كوردستانی هەمو كەسی عفووكردبو یەكیەتی دەستیان كردبەكوشتن وتولەسەندنەوە نەك هەرلەوانەی جاش بوبون بەلكولە پیشمەرگەش بەتایبەتی سۆسیالیست ئێمەش چوینە تەعزیەكەی لەگەرەكی راپەرین یاقادسیە براكەشی عەزیز بریندار كرابوو پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی و چوینە سەیدصادق و گردەنازێ تەعزیەك هەبوو پاشان سەری گوڵەخانەمان داو گەراینەوە، لە٤/٦ لەسلێمانی سەرقاڵی ئیشوكار بوین، لە٤/٧ سەردانی چەند تەعزیەكمان دا لەهەڵەبجەی تازەو دەربەندیخان و زەرایەن پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی كاك برزۆی عەلی هەژار بروسكەی كردبوو بۆمن دەڵێت یادی شەهیدان عەلی هەژارو كاردۆگلاڵی یە و یەكێتی دەیانەوێت یادی بكەنەوە هۆڵی میدیای گرتووە و شیعاراتیان هەڵواسراوە و هەتا نەیان هێشتووە هۆڵی میدیاش بۆئێمە بێت كاك كۆسرەت سەری ماڵی عەلی هەژاری داوەو داوای لەكاك برزۆیش كردووە كەبەشداری بكەن ئەمەشیان شەر پێ فرۆشتنێكی ئاشكرای یەكێتی بوو پێمان هەتا شەهیدەكانمان بەئاشكرا بكەن بەهی خۆیان هەروەها وتبوی لەبەر ئەوەی ئێمە پێش بكەوێت لە٤/٨ یادەكە بكەین چونكە ئەوەی ئەوان لە٤/٩ دەستی پێ دەكەن وادیاربوو رووگیر ببوون یەكێ لەكچەكانیان ناردبوو بەشداربێت لەگەڵ ئەوان ٠ لەساڵەكانی ١٩٨٠كان دا لەزۆر بلاوكراوەكانیاندایەكیەتی هەمووی دژی عەلی

هەژاروکاردۆگـەلاّلی بوکەئـەو دژی یـەکێتی بـووەو زۆر شـتی لەوبابەتـە بـۆ ئێـستا
فرمێـسکی بـۆ دەرێـژن رۆژانێـك عـەلی هـەژارو کاردۆیـان دەسـت بکەوتایـە دەیـان
کوشتن یا بۆیان نەدەگیران کەسوکارو بنەماڵەکەیان ئێستاش دلگرانیان لە یـەکێتی
هەیە ، لە٤/٨ لەسلێمانیەوە بـەرێ کـەوتین بۆهـەولێر لـەدوای نیـوەرۆ هـەمووومان
چوین بۆهۆلّی رۆشـنبیری لەهـەولێر لـەدوای نیـوەرۆ کۆرەکـە دەسـتی پێکـردو مـن
قـسەم کـرد لەسـەر شـەهیدان بـەوردی و دەوری حزبـی سۆسیالیـست پاشـان کـاك
سـامی قـسەی کـرد کـاك سـامی بۆیەکـەم جـار باسـی دابـەش کردنـی (٥٠بە٥٠) ی
کوردستانی بەفیفتی بەفیفتی ناوهێنا لەکوردسـتان بـلاّو بـوەوە ئەوقـسەیە قـسەی
کـاك سـامی بووپاشـان باسـی غـەدری کـرد کەلـەحزب کـراوە لەوانـە سـەید کاکـەو
مستەفا نیرۆیی بەنمونە هێنایەوەو ئێمەش بێ دەنگ نابین منیش باسی ئەوەم کـرد
کەهەر بەبردنی یـادزینی کوردسـتان و حکومـەت و پەرلـەمان و گـومرك و پـارە واز
ناهێنن و واشەهیدەکانیشمان دەبەن و دەیدزن و ئەگەر ئەوکات شەهیدان یـەکێتی
و پارتیشیان دیبوو دەیان ناسین و ئاگایان لێیـان هـەبوو بۆئەوکاتـە نەبونـە پـارتی
یایەکێتی کاتی شەرەکانی ناوخۆش خۆئەگەر ئەو شـەهیدانەیان ددەسـت بکەوتایـە
دەیان جار شەهیدیان دەکردن بۆئێستا فرمێسکیان بـۆ دەرێـژن و باسـیان دەکـەن
زۆری شەهیدەکانمان لە شەری ناوخۆدا خۆیان کوشتونیان وئەیانکەن بە شـەهیدی
خۆیان ئەگەر زیندو ببێتەوە بزانـێ دوای ئـەوەی کوشـتویانەو ئێـستا کردویانـە بـە
شەهیدی خۆیان دووجـاری کـەش خـۆی بـە کوشـت ئەداتـەوە بـۆ ئـەوەی بـەناوی
خۆیانـەوە ئەوانـە کەسـانی شۆرشـگێرو ناسـراوی ناوچـەکەو کوردسـتانن ئەوانـە
ناوانرێت خۆیان لێ لابدرێت بەلاّم ئەمان دێن راستیەکی زەق دەشارنەوەو بـەناوی
حزبەکەوە باسی دەکەن خۆ ئەگەر شەهیدەکان لەگۆرەکانیان پرسیاریان لێ بکـەن
هەر سرودی سۆسیالیـست دەلێنـەوە دژی هـەر کەسـێکی کـەن لـەویادە زۆرکـەس

قسەی کرد لەوانە کاك کامەران شەهید قادرشۆرش بەڵام وادیاربوو دژی کاك رەسول قسە کردو قسەکەی راست بوو بووە سەبەبی ئەو کێشانە چونکە زۆری شەری ناوخۆ لەسەر کاك رەسول و مەسئولینی یەکەمی حزبەکانەبلام من ئەوروژە هەستم کرد کاك کامران ناوەرۆکی قسەکانی بەلای پارتی دایە هەروەها ماموستا سەعدعبدولا و کاك سەیدکاکەو زۆری کەش قسەیان کرد لەیادی ئەو دووشەهیدە نەمرەدا ئاهەنگێکی باش بوو، لە٤/٩ لەهەولێرەوە گەراینەوە بۆ هەرهەمان رۆژ یەکێتی لەهەولێر یادیان کردەوە لەهۆڵی میدیا گوایە لەسەر داوای کاك رەسول کەخۆی لەدەرەوەی وڵات بوو ئەوکات ئەوکارەی یەکێتی بەوە ئاشکرابوو بۆ خۆشیان وهەموو لایەك خراپ بوو نەك بۆسۆسیالیست بەڵام حزبی زەحمەتکێشان لەیادی ئێمەش وتاریان هەبوو لەویادەی بەتەزویر کرابوو یەکێتی وزەحمەتکێشان هەر وتاریان هەبوو، لە٤/١٠ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتین بۆ هەڵەبجەی تازە بۆتەشکیلاتی هێزی ئازادی و رێکخستنەوەی ئەو هێزە چونکە (٣٠٠٠) پێشمەرگەمان لەلەشکری یەك وەرگیرابوو دەبوو پری بکەینەوە جارێکی کە کاك عەتا سەراویمان کرد بەحەرەکاتی لیواو لێپرسراوی هێزی ئازادی فەرماندەی هێزش بوو ئەومان بەتەواوی گەرانەوە هێز، لە٤/١١ لەسلێمانی لەماڵەوە بووم زۆرماندوبوم ئەوەندە میوان زۆربوو ناچار سەعات (٢)ی شەو چومە باریکە بۆ حەسانەوە... باریکە لەسەر رێگای عەربەت دەربەندیخانەو ئۆردوگایە لەوکاتەدا لێپرسراوێکی باشمان هەبووجێگری هێزی شارەزووربوو وادیاربوو تەئسیریان تێکرد یازویریان کردبوو منیش چوم سەردانیم کرد لەسیروان پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٤/١٢ لەسلێمانی بوین، لە٤/١٣ دەعوەت کراین بۆ مەلعەبەکەی سلێمانی رێورۆیشتنی ساڵانەی قوتابخانەکان بوو دیاری بەسەریاندا دابەشکرا، لە٤/١٤ چوینە هەڵەبجەی تازە بۆپرسەی کاك غەریب حمە صالح برای شهد عمری حمەصالح(عمری خاوەر)

ئەوەی لەکیمیاوی هەڵەبجە شەهیدبوو مناڵەکەی بەباوەشەوە بوو...پاشان بەرێ کەوتین بۆپێنجوێن و باشماغ و مەریوان و بۆسنەبۆماڵی خۆمان، لە٤/١٥ لەسنەبووم، لە٤/١٦ چوینە سەر کوێستانەکەی لای سەبەتولوو نێوان رێگای سنەو قروە دنیا هەتاو بوو بەلاّم زۆرساردبوو بەفربوو ئەوناو کوێستانە، لە٤/١٧ چوینەمەریوان و شەولەماڵی کاك بارام بوین لەکانی دینار، لە لەکانی دینارەوە بەرێ کەوتین بۆ مەریوان و باشماغ و بۆپێنجوێن و گەراینەوە بۆسلێمانی میوانمان زۆربوو هەموو ژوورەکان پربوون وادیاربوو دەیانزانی گەراومەتەوە یائەو رۆژە دەگەرێمەوە من لەبەر ئەوەی لەشارەزوور ئیشی کەم هەبوو سەری چەند جێگایەکی کەم دابوو لەژوورەکەی خۆم بووم زۆرماندوو بوم قەرەباڵغیش بوو، لە٤/٢٠ هەرلەسلێمانی بوین، لە٤/٢١ بەرێ کەوتین بۆ دوکان و کۆیاو چوینە هەولێر پێشتریش کاك شەوکەت حاجی مشیر باسی کرد کەکاك کۆسرەت دەیەوێت چاوی پێم بکەوێت ئەوشەوە دەعوەتی بوین لەماڵی کاك کۆسرەت شەوی ٢١-١٩٩٣/٤/٢٢ بوو قسەی زۆرمان کردو زۆریش هەوڵیان دا بۆخواردنەوە بەلاّم من لەژیانمدا نەمخواردۆتەوە نەم خواردەوە بەلاّم قسەی زۆرمان کرد و باسی ئەوەشمان کرد کە ئەو سیاسەتەی یەکێتی هەڵەیە بەرامبەربە ئێمە وەلەژێر زەحمەت دا هیچ ناکەین و پێویستە یەکێتی دۆست بۆخۆی پەیدا بکات نەك دۆستەکانی بکات بەناحەز ئێمە دۆستی یەکێتین و یەکێتی بەشۆرشگێرو بەتێکۆشەرو بەکوردایەتی دەزانین کاك مولازم کەریم وکاك برزۆی عەلی هەژار لەکۆبونەوەکە بون بەلاّم پارتی هێمن ترو لەسەر خۆترە لەدۆستایەتی لەگەڵ دۆستەکانی خۆی وبەجێیان ناهێڵێ ئەوانە واقیعێکە بەلاّم سیاسەتی یەکێتی دژی (PKK) و دژی ئێران ودژی عێراق ودژی ئێمەش زەرەری تێدا دەکەن پارتی لەگەڵ ئەو کەموکوریانەدا هێمن ترو لەسەرخۆترو هەنگاوی پەیوەندیان سەرکەوتوو ترە بەلاّم یەکێتی لەپێناوی

دۆستایەتی پارتی دا دژی هەموو لایەکەو نەتیجە پارتی دەیباتەوە ویەکێتی
پارتی پێ قبولْ ناکرێت ئەگەر حزبەکان نەمێنن شەری یەکێتی و پارتی دەست پێ
دەکات و من لەو قسانەم زۆر کرد لەوکاتەدا یەکێتی و پارتی بریارێکیان لای
خۆیانەوە دابوو داوا لەهەموو حزبەکان بکەن برۆنە ناویەکێتی و پارتیەوەو خانەی
سێ هەم نەماوە و دووحزب هەیەو کورد بەسێتی و پێویست بەحزبی کە ناکاو
خانەیان چینایەتی یاسیاسی یاجەماوەریان نیەو لەکوردا هەرچەندە کاك کۆسرەت
خۆی پیاوێکی بەرێزبوو بەلاّم قسەکانی بۆنی ئەوەی لێ دەهات کەداوای ئەوە بکات
یەکگرتن یابرۆینە ناویان لەدانیشتوانی مجلیسەکە هەندێکیان رەفیق و برادەرم
بوون قسەکانیان وابوو منیش هەروام حساب کرد کەتێ نەگەیشتوم لەقسەکانی
وابزانم کاك مولازم کەریم یش بوو چونکە مناقەشەکە توند دەبوو من خاوم
دەکردەوە برادەرانی ئێمە هەموویان پربون لەیەکێتی زۆریان عەزیەت دەدان
لەکفری بارەگایان داگیر کردبوین وەلە ٤/٢١ دەعوەت بوین داوایان دەکرد برۆینە
ناویەکێتی ئەو شێوازە بەکەس قبولْ نەدەکرا من قەت لەژێر زەختدا هیچ شتێکم
قبولْ نەکردووە ئەگەر دەسەلاّتم نەبێت بێ دەنگ بوومە ئەو شەوە ووتم کاك
کۆسرەت زەخت لەسەر ئێمەیە و پارتی سودی لێ وەردەگرێت و پارتی دەتوانێ
ئیسفادە بکات من دۆستی ئێوەم بەلاّم قەناعەتم بەیەکێتی ونەبەپارتی نیە چونکە
قەناعەتم هەبێت لەناویان دەبم بۆیە لەنێوان پارتی و یەکێتی کامیان هاوکاری
بکەین کامیان بەحزبی پێشکەوتوو کامیان بە حزبی رۆشنبیر وکامیان بە حزبی
نیشتمانی یەکێتیم پێ باشە بەلاّم ئێستا حەز دەکەین دۆستی ئێوەش و پارتیش
بین و ئەگەر ئێوە وازمان لێ نەهێنن و زەختمان لێ بکەن و یارمەتیمان ببرن
ئەوکاتە زیاترلەیەکێتی دوردەکەوینەوە چونکە ئێمەلەژێرزەختدا نەك قوبولّی
ناکەین بەلّکو زیاتر دوردەکەوینەوە هەلومەرجەکە ئالّۆزتردەبێت ناچار دەبین

لەبرادەرانی پارتی نزیك تر ببینەوە لەگەڵ پارتی دا ئیمەئەگەرلەژیرزەختا هەرناچارمان بکەن پارتی هەلدەبژیرین بۆیکگرتن نە ك یەکیەتی هەتا بیر لەیەکگرتن بکەینەوە ئێستاش من جارێکی کە داوا دەکەم سیاسەتان لەسەرمان بگۆرن وچارەسەری کێشەکان بکەن برادەران ووتیان ئێوە یاتۆ دەبیتە پارتی ووتم من نابمە پارتی و ناشبمە یەکێتی بەلاّم ئێوە رێگامان لیّ بگرن لەگەڵ پارتی دا یەك دەگرین ووتیان چۆن..ووتم ئەو کاتەی کرا دەزانن ووتیان لەگەڵ ئێمەدا بۆنایکەن کاك شەوکەت بوو یاکاك کۆسرەت ووتم ئێوە ناوی یەکێتی دەگۆرن ووتی نا ووتم پارتی ئامادەیە ناوی پارتی بیگۆرێت یا گۆرانکاری بکات لەناوەکەیداو سیقەم بەقسەی پارتی زیاترە لەئێوە ئەو برادەرانە قەناعەتیان نەبوو منیش دۆستیان بووم ئەوشتانەم بۆباس دەکردن کاك کۆسرەت وتی راستە پارتی لەسەر هاوپەیمانی خۆی شەر ئەکات وادیاربوو کاك سامی داوای لەکاك مەسعود کردبوو من ببینیّ و قسەم لەگەڵ بکات لەسەر یەکگرتن یاخود هەر بەرنامەی پارتی و یەکێتی وابووە چونکە شەوی ٢١-٤/٢٢ دەعوەتی کاك کۆسرەت بوین ئەو مەسەلەی باسکردو لەرۆژی ٤/٢٢ کاك مەسعود داوای دانیشتنی دووقۆلّی لەمن کرد خۆ سوتفە نیە یاکاك سامی پێی وتووە.ئەو شەو لەلای کاك کۆسرەت بووەو دەعوەت بووە یا پارتی و یەکێتی پێکەوە بریاریان داوە چونکە لەزۆر جێگا شتی وا روی دەدا لەدەولّەتی ئێران بریارێك دەربارەی کورد دەدرا لەیەك حەفتەدا یایەك رۆژدا هەموو دەزگاکانی سەربەو دەولّەتە دەجولاّن و پەوەندیان دەکرد یاعێراق بریارێك یاشتێکی نهێنی لەسەر کورد بوایە هەموویان دەکەوتنە ئیشی پەیوەندی یاکۆبوەنەوەی لوتکەی یەکێتی وپارتی بریار درابوو یادەبێت شتێك بوبێت، لە٤/٢٢ کۆبونەوەی قیادەی سیاسی بەرەی کوردستانی بوو کۆبونەوەکە زۆری لەسەرکەم کردنەوەی دەسەلاّتی بەرەی کوردستانی وحزبەکان ونەخشەو کاروباری حکومەتی

هەرێمی کوردستان هەمووی لەسەر ئێمە بوو لەراستیدا لەوکۆبونەوەیە کاك مەسعود پشتیوانی لەبۆچونەکانی ئێمە دەکرد پارتی راکانی لەسەر حزبەکان بەتایبەتی ئێمە لەیەکێتی باشتربو لەم رۆژانەدا بەلاّم هەر هەڵوێست بوو پێش کۆبونەوەکە کاك مەسعود بەمنی ووت دوای کۆبوەنەوە ئەمەوێ من وجەنابت لێرە دووقۆلّی هەندێك قسە بکەین منیش ووتم باشە... لەدوای نیوەرۆ هەموو لایەنەکان بەرێ کەوتن من وکاك مەسعودبارزانی دانیشتین ووتم فەرموو ووتی وەلاّ ماوەیەکە دەمەوێت هەندێك قسە بکەین لەوماوەیەدا تۆ لەتورکیا بویت لێرە لەرێگای کاك رەسولەوە کێشەیەکیان دروست کرد بەلاّم من بروسکەم کردبۆیەکێتی و بۆهێزەکانی خۆمان ئەگەر مەقەرەکانی ئێوە چۆلّ نەکەن ئەوە هێز بەکار دەهێنین ووتی بەخوا بەکارمان دەهێنا بۆدڵنیا بونی من بەکارم دەهێناو شەردەبوو یانە چی دەبوو لەوەزیاتر ناحەقی قبولّ ناکەم...بۆ لەپێناوی چیدا پەلاماری حزبێکی هاوپەیمان بدرێت لەکوردستانداو لەسەر چی پاشان ووتی کاکە حەمە پێویستە سنورێك بۆیەکێتی دانێین و لەوەزیاتر قبولّ ناکرێت و گەورە ترین هەڵەی ئێمەی پارتی قبولّ کردنی زەخت و٥٠به٥٠ زۆرە کەنەدەبوو پارتی قبولّی بکات ئێستاش حکومەت (٥٠ به٥٠)یەو بەناوە (٧٥)ی حکومەت یەکێتی هەڵی دەسورێنێ و (٢٥) پارتی یە وەلەزاخۆو ئاکرێش دەستیان خستوەتە ناوچەکەو لەرێگای کۆنەجاش و کۆنە موستەشارەوە ووتم کاك مەسعود ناترسیت لەوەی لەگەلّ ئەندام پەرلەمانەکان هەولّیان دابێت و لەکۆبونەوەی پەرلەمان لەسەر هەندێك بریاری گرنگ رەئی لەگەلّ یەکێتی دا بدەن.. ووتی هەرئەندام پەرلەمانێ کاری وابکات دەیکوژین ئەوە یەکەم جاربوو لەوقسەیە لەکاك مەسعود ببیستم ووتم بەرەئی ئێوە هەڵبژاردن بکەین ووتی نەیان هێشت هەڵبژاردن بکەینەوە ئێستاش دەبێت بیرێك لەوە بکرێتەوە هێزەشۆرشگێرەکان هێزە ئەساسیەکان ئەو هێزانەی لەیەکەوە

نزیکن...ووتی تۆ لەشۆرشی ئەیلول پێشمەرگە بویت ووتم نەوەلا ئەوە کاك حەمەی
حاجی محمود هاورنی سەرۆك عەشیرەتەو کۆن جێگری سەر لق بوو یاناوی
لێپرسراوی سەربازی لق بو کاك ئاری دیاری بەگی حامید بەگی مەجید بەگی جاف
لەشۆرشی ئەیلول من ئەوکاتە من پێشمەرگە نەبووم هەروەها ووتی پێویستە ئەو
هێزانە لەیەکەوە نزیك بکەونەوەو هەوڵ بدەن تەرازوی هێز لەکوردستان بگۆری
ئەوەش بەیەکگرتن دەبێت تۆ بیرت لەوە کردوەتەوە ئێوەو پارتی عەمەلیەکی
وابکەن..ووتم وەلا کاك مەسعود تائێستا هەست دەکەم باسی کرابێت بەلام وەکو
شتێکی جدی باسمان نەکردووە ئەوەش پێویستی بەکات وقسە کردن هەیە ئەوە
ئیشێکی ئاسان نیە ئێمە سێ حزبی جیاواز بوین و یەکمان گرتووە ووتی کاکە
حەمە ئێمە یەککگرتن بکەین ئامادەین هەموشت بکەین یەکگرتن لەگەڵ شەخصی تۆ
دەکەین و لەگەڵ سۆسیالیست دەکەین و حەزدەکەم دڵنیا بیت لەوە ئەگەر من
یەککگرتن لەگەڵ سامی بکەم بەناوچەی هەولێر دەڵێم قسەی لەگەڵ بکات بەلام من
لەگەڵ تۆ یەککگرتن دەکەم واتە پارتی و سۆسیالیست یەکگرتن دەکات ووتم
سوپاست دەکەم بەلام ئەوانە هەمووی وەختی پێویستە و کۆبونەوەو پرس وراو
وتی تۆ چیت دەوێت من ئامادەم بیکەم بێ ئەوەی بچکوك ترین گیروگرفتی بێتە
رێگا من ووتم کاك مەسعود پێت باشە شتێك بکەین سەرکەوتبو نەبێت ووتی
ئینشاالله هەر سەرکەوتوو دەبێت و ئەوە کاری خێرە وەسنورێك بۆیەکێتی دادەنێن
و زۆربەی جەماوەری کوردستان یەك دەگرێتەوە ئێستا دهۆك مسۆگەرەو
هەولێریش لەهەڵبژاردن لەسەر ئەو هەموو تەزویرەش هەر رەئی پارتی زیاد بوو
ئەگەر ئێوەشی بێتە سەر ئەوە مەسەلەکان سیاسی و سەربازی یەك لایی
دەبێتەوە..من ووتم دوایی قسە دەکەین کاتی هەڵسان ووتی من دڵنیام سەرکەوتوو
دەبێت پاشان من گەرامەوە هەر گەیشتمەوە مەکتەبی سیاسی هەموو برادەران

بەزەوقێکی زۆرەوە پێکەنین و بەخێرهاتنەوەیان کردم و وتیان ئینشائاللە خێرە ئەوکۆبونەوە دووقۆڵیەت لەگەڵ کاك مەسعوددا بۆم دەرکەوت ئەم برادەرانە هەمویان قسەیان کردووەو بەس بەتەنها لەسەر من ماوە وادیارە پارتیش بەوانی وتووە کەقسە لەگەڵ ئەو بکرێت ئەوانیش لەوانەیە داوایان لەکاك مەسعود کردبێت لەگەڵ من قسەبکات هەر چیان ووت لەسەرچی بوو قسەکان ووتم کێشەی نێوان حزب و یەکێتی و سوپاسم کرد کەئەوکاتە پشتیوانی لیٚ کردوین وتیان ئەوەش نیە من هەستام و گەرامەوە بۆسلێمانی وئەو برادەرانەی کۆن سۆسیالیستم لەهەموو جێگاکان ئاگادار کرد کەجگە لەکاری یەککگرتن کاری سۆسیالیست بکەن بەنهێنی هەڵبژاردنی لق و ناوچەو رێکخراوەکان هەمووی بکەن چونکە پاسۆك وگەل کەسیان دەرنەچوون و لەهەرناوچەیەك پێیان باش بوو یەك یادوو بادەربچێت لەو هەڵبژاردنەدا کەسی پاسۆك و گەل دەرنەچوون لقی دهۆك و هەولێرو سلێمانی و کەرکوك هەمووی سۆسیالیست بوون لەناوچەکانیش هەندێك ناوچە نەبێ یەکێکیان دەرچوبوو ئەوە یەکەم هەنگاو بوو من لەو رووەوە نام لەسەرئەو کارەی ئەوان دەیانکرد ئیشی رۆژانەی لق و ناوچەکان و رێکخراوەکان رووبەرووی برادەرانی سۆسیالیست دەکرد ئەوە ئەوان نەکاك قادرو نەکاك سەیدکاکە کەسیان تاقەتیان نەبوو لەگەڵ خەڵکی قسە بکەن جارجاریٚ کەسوکاری شەهیدان پێشمەرگەی کۆن دەچونە لای خاڵە سەید کاکە قسەی لەگەلدەکردن بلام هەتا لەوەزارەت کاك قادر کەسوکاری شەهیدو مەسئولەکانیشی نەدەدی یاواپێشوازی لیٚ نەدەکردن کەجارێکی تر نەدەچوون بۆلای منیش رۆژانە دەموت برۆنە لای کاك قادر یامەکتەبی سیاسی کەس ئیشی بۆنەدەکردن هەرگوێشیان نەدەدانیٚ زۆر لەکادرەکان دژی سۆسیالیستە کۆنەکان بوو هەروەها دژی پاسۆك وگەل بون لەرۆژانی ٢٤و٢٥/٤/١٩٩٣ لەسلێمانی بووم، لە٤/٢٦ چومە هەڵەبجە و پەردەم

لەسەر رەسمی شەهید تاهیر عەلی والی لادا پاشان چوین بۆ کردنەوەی قوتابخانەی مەرزەبۆتۆ و دواناوەندی کچانی هەڵەبجە کەخۆمان کردبومانەوەودروستمان کردبو مامۆستا جەمال عبدولیش هاتبوو ئەوکاتە پارێزگاری سلێمانی بوو باران دەباری کاك جەمال هات و سەلامی نەکرد وادیاربوو ئەو برادەرانە واتێیان گەیاندبوو ئەگەر زوو نەگات لەوانەیە من ئیفتتاحی بکەم کاك جەمال زۆر بەشڵەژاوی هات هەرچەندە ئێمە وەستابوین و چاوەرێی ئەومان دەکرد کاك جەمال هەرگەیشت یەکسەرمەقەسەکەی بەپەلە هەڵگرت ئێمە هەموو وەستابوین قسەی نەکردو مەرحەبای نەکردین زوو قرتێلەکەی قرتاند نازانم کێشەی هەبوو ئێمە وامان دی ئێشارەتیش بەوە نەکرا کەکێ ئەوقوتابخانەی دروست کردووەو پارەکەی لە کۆێوەو کێ مێناویەتی و کێ نوقسانیەکانی تەواو کردووە.. رەسمی کاك تاهیریش هەرلای قوتابخانەکە دابوو پەردەم لادا لەسەر شەهیدەکان و قسەم بۆجەماوەرەکە کرد نەك لەسەر قوتابخانەکە بەهەرحاڵ دوای سەیر کردن و کردنەوەی قسەکراو منیش هەندێك قسەم کرد لەسەر ئەوەی کەئەو قوتابخانەیە لەرێگای حزبی ئێمەوە کراوە و دورقوتابخانەیەو ئەو هەموو پارەیە وەردەگیرێت بەذاوی هەڵەبجەوە حکومەتی هەرێم تائێستا شتێکی بۆهەڵەبجە نەکردووەو زۆر لەوقسانەم کرد و مەسەلەکانم رون کردەوە چونکە دووقوتابخانەی مەرزەبۆتۆ کرابوو سۆسیالیست کردبوی پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ٢٧و١٩٩٣/٤/٢٨ هەرلەسلێمانی بوین و سەرقاڵی ئیشوکاری حزب بوین سەردانی چادرگای سالآنەی قوتابخانەکانمان کردو هەموو بەشەکانیان یارمەتیمان داو قسەشمان بۆکردن پاشان چوینە بەکرەجۆ بۆسەردانی بارەگای حزب و گەراینەوە ئەو رۆژە هەندێك ناوشار گەرام بەسەیارە، لە١٩٩٣/٥/١ ئاهەنگێکی گەورەی هەموو لایەنەکان سازکرا لەمەلعەبەکەی سلێمانی بەبۆنەی ١/ی ئایار رۆژی کرێکارانی جیهانەوە هەموو لایەك

قسەی کردو داوایان لەمن کرد بەناوی قیادەی سیاسی بەرەی کوردستانیەوە قسە بکەم منیش لەسەر ئەوە قسەم کردو پێم ووتن دەبوو حزبی شیوعی قسەی بکردایە، لە٥/٢ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتم بۆ دوکان و کۆیە و هەولێر، لە٥/٣ لەمەکتەبی سیاسی بوم لەهەولێر لەبینای پەنای زانکۆی صلاح الدین خەریکی ئیشوکاری حزب بوم هەرئەو رۆژە چومە کۆیە بۆپرسەی کاک سەعید بارکی شەهید دکتۆرخالید پاشان گەرامەوە بۆمەکتەبی سیاسی لە هەولێر لەورۆژەدا بووبەهەراو خۆشی لەناوشارو لەزۆرجێگا وتمان چیە ووتیان کاک کۆسرەت دەبێتە سەرۆکی حکومەت و کاک دکتۆر فوئادمعصوم لادەبەن ماڵی کاک سامی لەئەمین عامەکان بوو یاماڵی پەرلەمانتارو وەزیرەکان پێکەوە بوون کاک سامی هات و ووتی بووە بەهەرا کێ شتی وای دیووە دووئەندامی مەکتەبی سیاسی یەك حزب پێکەوە یەکێکیان بۆسەرۆکی وەزەرا ئەوی کەیان دەگۆرن شایی بۆبکەن ئەوە داوایان کردووە کەکاک دکتۆرفوئادمعصوم خانووەکەی تێ ی دا یە چۆڵی بکات بۆکاك کۆسرەت ئەویش چۆڵی نەکردووە بەزۆرپێشمەرگە چووە شتەکانی دکتۆرفواد لابەن و ماڵی کاک کۆسرەتی تێ بەرن ئەوە لەیەك حزب دایە دەبێت لەحزبێکی کە چۆن رەفتاری لەگەڵ بکەن ..کاک سامی دەگەرا بچوکترین شتی یەکێتی دەبینی و دەهاتەوە بەتایبەتی بۆمن باسی دەکرد منیش زۆر لەسەرخۆوبەخۆین ساردیوە وەرم دەگرت و دەمووت بزیارەو دەبێ بریارەکە جێ بەجێ بکرێت، لە٥/٦ چوم بۆئەنجومەنی وەزیران و سەردانی کاک کۆسرەتم کرد بەبۆنەی ئەوەی کەببوو بەسەرۆك وەزیران لەساڵی ١٩٩٣وە حکومەت و پەرلەمان لە ١٩٩٢وە دامەزراوە لەسەر رەفتاری نارێك وپێکی کاربە دەستان نەچوومە هیچ لایەکیان بۆیەکەم جاربوو سەری کاک کۆسرەتم دا من شەخصی ئەوەی لەلێپرسراویەتی یابوارە جیاجیاکان خۆی پێ گەورە بووە یاخۆی لاگرنگ بووە من زۆر نزیك نەکەوتووم ئەگەر زەوورەنێك یاتەعزیەك

یاشتێکی لەڕبابەتە نەبوایە جگە لەوەش ڕۆژانە بەناوی پەرلەمان و حکومەتەوە دژایەتیان ددکردین من تائێستاش نەچومە پەرلەمان وەتا ئاخری ١٩٩٧یش کاك کۆسرەت خۆ هیچ شتێکی بۆ نەدەکردین و نەشیکرد بەلأم کاك کۆسرەت جیاوازی هەبوو لەکارکردندا هەرچەندە لەکۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانی ڕۆژی ١٩٩٣/١٢/١٠ بەبروسکەی کاك کۆسرەت موافەقەتی کرد و شەرعیەتی بەپارتی دا لەحزبی سۆسیالیست بدات بەلأم هەرجیاوازیەك هەبوو ماوەیەك بوو یەکێتی دەیانوت دکتۆرفوئاد معصوم پیاوێکی نەرمە بەرامبەر بەپارتی هیچ بۆیەکێتی نەکراوە زوڵمی زۆر لەیەکێتی دەکرێت لەحکومەتدا بۆیە پێویستەکاك کۆسرەت بێت باشترە بۆیەکێتی نیشتمانی بەلأم ئەوەی کەدەبێت لەسەر ڕێکەوتنی کاك عوسمان ئۆچەلان وحکومەتی هەرێم دکتۆر فوئادو دکتۆر ڕۆژ بگۆڕن ئەوەبوو یەکێتی دکتۆر فوئادی گۆری بەلأم پارتی دکتۆر ڕۆژی نەیگۆری لای من زۆر رون و ئاشکرابوو ئەوەبوو وەزیری دەرەوەی تورکیاو لێپرسراوانی تورك بەمنیان ووت لەئەنقەرە وباسیان کرد پارتی و کاك سامی زۆریان پێ ناخۆشبوو دەیانوت کۆسرەت چی دەزانێ بیکەن بەسەرۆکی وزەرا خەڵکی بکوژێ چۆن وەکو دکتۆرفوئاد دەبێت کەسیان بۆنەکوژێ پارتیش هەر کاك دکتۆر فوئادیان پێ باشتربو هیچ نەبێت شەهادەی هەیە و لەسەر خۆیە وکەس ناکوژێ کاك کۆسرەت ئێستا خەڵك ئەکوژێ دەسەلأتی حکومەتی هەبێت خەتەرە بۆپارتی لە٥/٦ بۆ پیرۆزبایی کاك کۆسرەت چوم وگەرامەوە مەکتەبی سیاسی پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی بروسکەیان کردبوو بگەرێمەوە دەست کاری ژوورەکەی من و صندوقێکی حزبی لێبوو دەستکاریان کردبوو لەسەر ئەوە بروسکەیان کردبوو بگەرێمەوە بۆسلێمانی، شەوی ٦-١٩٩٣/٥/٧ گەیشتمەوە سلێمانی و لەماڵەوە ئیسراحەتم کرد، لە٥/٧ کاك جەمالی حەلاو شەهیدکرا لە سلێمانی ،

هەرئەورۆژەسەردانی کۆمەڵەی دەرون پاکان و کۆنفۆم کردوپاشان چومە باریکەو گەرامەوە بۆسلێمانی،لە ١٩٩٣/٥/٨ تەرمی شەهید جەمالمان ناشت بەئامادەبونی جەماوەرێکی زۆر، لەرۆژانی ٨و٩و١٠و١١و١٩٩٣/٥/١٢ هەرلەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانە و دەوامی ئاسایم دەکردو رۆژانە رووبەروی چەندین کێشە دەبومەوە لەناوحزبدا، لە٥/١٣ چومە هەڵەبجەی تازە لەوێ یادی راپەرینی ١٩٨٧/٥/١٣ دەکرایەوە ئاهەنگێیان گێرابوولەوێ قسەم کرد چونکە ئەورۆژە حزبی سۆسیالیست راپەرینی ١٣-٥-١٩٨٧ی شارەزوری کرد پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی تا ٥/١٨ هەر لەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوم بەلام یەکێتی لەو رۆژانەدا بیانوی پێ دەگرتین و داوای کۆمەڵێك لەکادرەکانی ئێمەیان دەکردبە ناوی حوکومەتەوە بیدەن بەدادگاویاسای بەعس لەسەر پێشمەرگەی سۆسیالیست تاقی بکەنەوە وەکو رەوف زەرایەنی و تاهیر گرێزەیی و عەتا سەراوی و ئەحمەدکوێخاعمر و محمود بناوەسوتەیی وصالح ریشەو دەیان کادری کەی حزب گوایە دزی و راورت ئەکەن وسەر بە عێراقن و هەندێکیان سەربەئێرانن وسەیارە بۆئێران دەبن وازیان لێ نەدەهێنان خۆئەگەر برۆنە لای یەکێتی ئیتر دەبنە قارەمان وبە حەوت ئاو دەشۆرینەوە ودەبنە شۆرشگێر ... ئێمە کۆمەڵێك پێشمەرگەمان هەبوو لەچەوتان ئەوانیش هەیانبوو لەچەوتان هەردوولایان خزمی یەکبون بەلام دوژ منایەتیان هەبوو لەیەکیان کوشتبوو یەکێتی دەچوو. پشتیوانی لەوەی خۆیانی دەکرد و دەچووە گوندەکەو بەپشتیوانی یەکێتی زەویەکانی داگیر کردبوو دوای ئەوەش شکاتیان لێ کردوبوون دەچونە دادگایان دەگرت بۆئەوەی حکومەت چارەسەری بکات ئێمە هەوڵماندا چارەسەری کێشەکەیان بکەین پێ ی رازی نەبوون چەند جارێك داوایان کرد تەسلیمیان بکەین بێ ئاگاداری ئێمە هەرچی پۆلیس و ئاسایشی حکومەتی پارتی و یەکێتی هەبوو لەسلێمانی و دەوروبەری

کۆیان کردنەوە لەگەڵ دووفەوجی پاراستنی ناوشاریان هەبوو یەکێکیان هی یەکێتی بوو کە کاك حەمە مۆریاسی ئامرفەوج بووکە پێشتریش ئامرفەوجی خەفیفە بوو لای عێراق ئەویان هی پارتی بوو کاك حەمەی حەمە سەعید ناسراو بە حەمەی ئامینە تەوێڵەیی ئامر فەوجی بووپێشمەرگەی کۆن بوو بەسەرپەرشتی بەرێوەبەری پۆلیس و ئاسایشی سلێمانی لە٢٠/٥ وادیاربوو بەهۆی یادی پەرلەمانەوە بوو لەسەعات (٥)ی بەیانی هەموو دەوری ئۆردوگایان گرتبوهەروەها دەوری ئەو ماڵانەشیان گرتبوو لەهەموو لایەکەوە هاوانیان دامەزراندبوو پارێزگاری سلێمانی خۆی سەرپەرشتی دەکرد بێ ئەوەی ئێمە ئاگادار بکەن ئەوەیان کردبوو ئێمەش ئاگاداری هەموو پێشمەرگەمان کردبوو ئەوەی پێشمەرگەی ئێمە بێت نابێت بێ ئەوەی حزب ئاگاداربێت نەبۆ دادگا و بنکەکانی پۆلیسی هەردوحزب نەرواٺ بەقسەی حکومەت تاخۆمان ئاگاداری دەکەین چونکە لەراستیدا هەردووحزب بەناوی حکومەتەوە شتێکیان بۆخۆیان درۆستکردبو بۆدانی شەرعیەتی زیاترسەرکوتی خەڵك وحزبەکانی پێ بکەن پارتی ویەکێتی بون لەسەرەوە بۆ خوارەوە لەسوپا ئێمە وهەندێك حزبیان بەشدارکردبو بۆئەوەی قسەنەکەن یانارازی نەبن بەلاٚم هیچیان بە دەست نەبو بەیانی چوبون لەبەرماڵی شێخ حسێن وشێخەکانی چەوتان لەبەر دوژمن داری حەرەسیان هەبوو کورەکەیان ناوی حاجی دەبێت لەبەر ماڵی خۆیان دەیکوژن لەئوردوگای باریکە براو شتەکانی لەژوورەکەدا دەبن دەڵێن ئێوەش تەسلیم ببن ئەوان لەژوورەوەو براکەیان لەقاپیەکە کوشتووەو ئەوە دوژمنەکانی خۆشیان بردوەتە سەریان لەپێشەوە تەقەیان کردبوولەماڵی شێخ حسێن کوروخزمەکانی کەبەناحەق لەسەعات (٥)ی بەیانی لەبەردەم ماڵی خۆیدا بکوژن ئەوانیش تەقەیان لەحکومەتی هەردوحزب کرد تاپێشمەرگەی سۆسیالیست بۆ بەرگری لەخەڵکی گەیشتن و هێزەکەیان تەفروتوناکرد مەگەر هەرخۆیان وخەڵکی

باریکه بزانن چیان بەسەرهاتوە بەکوژراوبریندارەوە هەڵهاتن لەگەڵ حکومەت ببو
بەتەقـە هەنـدێك پێشمەرگەی سۆسیالیسـت لـەوناوە تەقـەیان کردبـوو ئاگـاداری
لەشکری یەکی حزبیـان کردبـوو لەهەڵەبجـەی تـازە کەشـتێکی وا ڕوی داوە منـیش
ئاگادارم کردن ئەوەی لەحکومەتی هەرێمە هی خۆمانە کـەس نـەڕوات بـەلاّم هێزێك
بنێرن بۆهاوکاریان ئەگەر شـەرەکەش درێژەی کێشا ئـەوە ئێمـەش ناچار دەبین
هێـزی گـەورە بنێـرین بـەلاّم (٥٠)پێـشمەرگەی بـاش بنێـرن زوو بگەنـە ماڵـەکان و
ئاگاداریان بکەن زۆر بەرەنگاری بکەن تادەیانگەنێ ئەو کاتە ڕەوف زەرایەنی ئـامر
بەتالیون بوو کۆمەڵێك پێشمەرگەی لەگەڵ خۆی و تاهیرگرێزەیی و صـالح ریشەوو
هەنـدێکی کـەیان بردبـوو لەهێزەکـەی حکومـەتیان داو شـکاندیان و هـەڵهاتن
(٤)کوژراوو (٢٠)برینـدارو زۆریـان جلـەکانیان جـل وکلاّوی عەسکەری فـڕێ دابـوو
بەجلی شەخصی و مەدەنیەوە خۆیان دەرباز کردبوو تانزیك عەربەت راویان نابوون
ئەوانیش لەدورەوە بەتۆپی (١٠٦)ملـم و هـاوان لەماڵـەکان و ئۆردوگایـان دابـوو بـێ
دەست پاراستن لەهەمویان دابووخەڵکی زۆری ئۆردگاشـیان بەناحـەق بزینـدارکردبو
بەلاّم ئامر فـەوجی ئـەوان حەمەمۆریاسـی بریندـاربوو بەفەلاکـەت دەرچـون وێنـەی
جێگای تـۆپ بارانەکـە و هەڵهاتنەکـەو تەعـداکردن لەخـەڵکی ئۆردوگـا و دەسـتیان
نەپاراسـتووە هـەمومان بەدووسـێ جـار لەتەلـەفزیۆنی سـلێمانی و شـارەزوور
بلاّوکردووە کەچۆن تەعدا دەکەن..حکومەت چرکەی لێ برا کەکوشـتارو برینـداریان
هەبووە لەسلێمانی تەلەفونیان کرد لە پارێزگاوە فریا بکەوە ووتم هەرچیتان لەئێمە
کوشت گەرنتان ئازابێت و هەرچـیش لـەئێوە کـوژراوە خۆتـان هۆکـارن باپێشتر
ئاگـاداری ئێمـەتان بکردایـە لاریمـان نـەبوو هـەردوولا بێنـە محکەمـە بـەلاّم ئێـوە
حکومەتێك خاوەنی ئەو ئەقڵیەتە بێت لەوەباشـتری بەسـەرنایەت ، لـە٥/٢١ چـەند
جارێك داوایان کرد کەلەپارێزگا کۆببنەوەو چارەسەرێکی ئەوکێشەیە بکـەین منـیش

چومە پارێزگا وتیان ئەوانە خەڵکیان کوشتووەو ئەوانە دەبێت تەسلیم بکرێن منیش ووتم پێش ئەوشەرو هەرایە دەبوو قسە بکەن کەس نەدەکوژراو چارەسەرمان دەکرد بەڵام ئێستا نەکەستان تەسلیم دەکەین وەنەپەیوەندیشی بەحزبەوە هەیە ئێوە بەرپرسیارن ووتیان ئەی ئەوانەی کوژراون ماڵ ومناڵان هەیە..ووتم ئەوانە حکومەتان بەکوشتیان دەدات باماڵ ومناڵیان بەخێو بکات هەروەها ووتم باعەشائیری رێکەون ئەوکات حکومەتیش واز لەکێشەکەیان بهێنێ کۆتایی پێ هات پاشان چون صوڵحیان بۆکراو ئاشتیان بوەوە کەزانیان بەوەش هیچیان بۆنەکراوە.. ئەوەحکومەتی پارتی و یەکێتی بوو دژی ئێمە لەلایەك قسەیان لەگەڵ دەکردین بۆیەکگرتن و لەلایەك هێزیان دەنارد پەلوپۆمان لێ بکەنەوە ئەو سیاسەتە هەڵەیە توشی ئەو هەموو ماڵوێرانیەی کردین بۆشەری ناوخۆ یائەوەی لەگەڵیان نەبێت دوژمنیانەو بەئەقلیەتی چەك و کوشتن و بڕین، لە٥/٢٢ لەسلێمانیەوە چومە گوڵەخانە و گەرامەوە، لە٥/٢٣ لەسلێمانی کۆڕی چلەی کاك عەزیز خۆشناو هەبوو کەبەرێوەبەری کارگەی جگەرەبوو لەسلێمانی خێزانەکەشی خۆشکی دکتۆر محمود عەلی عوسمان بوو کوشتبویان و داوایان کرد بۆ چلەکەی بەشدار بوین بنەماڵەکەی داوایان لەمن کرد قسە بکەم لەیادەکەیدا هەندێك قسەم کرد کەئەوە کوشتنی ترساندن و لەناوبردنە کەهەردوو حزبەکە لە حکومەتەکەیان لێی بەرپرسیارن و پێویستە ئەو تەقلیەتە بەلاوە نێن و بیرلەپاراستنی سەروماڵی خەڵکی بکەنەوە نەك بردنی سەروماڵی خەڵك ئەوە زەرەر لەهەمومان دەدات و چارەسەری ئاسان نابێت ئەوە شوێنەوارێکی خراپ لەروی سیاسی، و عەشائیری و دوژمنایەتی و کۆمەلایەتی بەجێ دەهێڵێت و تەنها دوژمن سودی لێ وەر دەگرێت،عەزیز خۆشناو خوشکی دکتۆرمحمود خێزانی بو بەڵام سەر بە پارتی بو بەرێوبەری کارگەی جگەرەی سلێمانی بو لەپێش راپەرین یەکێتی لایان برد دوایش

هەربەدەستی کوردوحزبی سیاسی دەستەڵاتدار کوژرا بەناحەق لەدوای لێبوردنی گشتی لەبەرەی کوردستانی وە لە٢٤/٥ چومە هەڵەبجەی تازە بۆسەردانی لەشکر و چوینە چەند ماڵێك لەهەڵەبجە، لە٢٥/٥ چومە هەولێرو گەرامەوە بۆسلێمانی ، چەندین کەسیان لەسلێمانی بەو شێوەیە کوشت وەکو عەزیزخۆشناوعەلی بۆسکانی خێرخواز برای کاك مستەفاصالح کەریم جگە لەخاڵە حاجی وجەمالی حەلاو و عبدوالمليك عەلی عوسمان وکەریم لەتیف لە ئوردوگای راپەرین (قادسیە) ، لە٢٦/٥ لەسلێمانیەوە چومە دەربەندیخان و کەلار بۆ پرسەوگەرامەوە بۆ سلێمانی، لە٢٧/٥ چومە هەولێرو گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٢٨/٥ چومە چەمچەماڵ و گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٢٩/٥ چومە سەید صادق و شانەدەری و ناڵپارێزو پێنجوێن و باشماغ و چومە مەریوان وبۆکانی دینار لەماڵی کاك بارام مەلاعبدالله برای شەهید عەلی مەلاعبداللە لەشیرەمەر لەگەڵ مامۆستا دڵشاددا شەهیدبو کەلێپرسراوی پەیوەندییەکانی مەریوان بوو لە٣٠/٥ چوینە شاری سنە و هەندێك گەراین لەناوشاردا پاشان سەردانی ماڵی مامۆستا مەلاعەلی جێگری رابەری بزوتنەوەی ئیسلامیمان کرد لەسنە قسەمان لەسەر روداوەکان ووەزعەکە کرد، رۆژانی ٣٠و٣١/٥ جەژنی قوربان بوو لەماڵەوە بوم لەسنە لەسەر دەعوەتی ئێران چوبوم لەگەڵ کاك خلیل سەعید لێپرسراوی پەیوەندییەکانی حزب لە کۆماری ئیسلامی ئێران، لە١/٦/١٩٩٣ لەسنەوە بەرێ کەوتین سەعات (٢/٣٠)ی شەو گەیشتینە تەهران بەسەیارەی خۆیان لەئوتێل ئیستقلال لەتەهران پێشوازی کراین ئەمرۆ بەتایبەتی ئەم ساڵ یەکێتی وپارتی دژی ئێران بوون ئەوانیش زیاتر لەجاران لەگەڵ ئێمەدا هاوکاربوون، یاگرنگیان زیاتر ئە دا لە٢/٦ چاومان بەئاغای خامنەئی رابەری کۆماری ئیسلامی ئێران کەوت باسی کوردی کرد کەگۆران لای ئەوان نەبووە... لەسەعات (٥)ی ئێوارەی هەمان رۆژ چاومان کەوت بەئەحمەد خومەینی بەبۆنەی

سالڕۆژی کۆچی ئیمام خومینی وه ئێوارەش کاك بارام گەیشت و سەیارەکەی بۆ هێنایین، لە٦/٣ سەعات (١٠)ی سەر لەبەیانی لەکۆشکی سەرۆکایەتی کۆماری چاوم بە ئاغای رەفسنجانی سەرۆکی کۆماری ئیسلامی ئێران کەوت و دەربارەی کوردو هاوکاری و پەیوەندی حزب و کۆماری ئیسلامی بەنامەیەکش هەر دەربارەی کورد نوسیبووم ودامیٚ و دووقۆلی قسەم لەگەڵ کرد زیاتر لەسەرئەو گەمارۆئابوریانەی لەسەر کوردستانی عێراق هەیەو ئەوکێشانەی کەکورد روبەروی بووەتەوەو ئاوەدانی لەسنوری هەڵەبجە ئێران و کورد هەردووکیان قەرزاری ئەو ناوچەیەن و پێویستە هاوکاری بکەن بۆ ئاوەدانی کوردستان و لەوبابەتەوە هەردوولا بەگشتی حزب و ئێرانم بۆباس کردن و رۆژانەش ئەوکاتە هەواڵەکانمان دەنارد بۆ مەکتەبی سیاسی وبۆسلێمانیش بۆبلاوکردنەوەی لەرادیۆی تەلەفزیون و بلاو دەکرانەوە بەلام لەمەکتەبی سیاسی لەهەولێر نەیانوێرابوو لەترسی حکومەتی هەرێم دژی ئێرانەو ئێستا بزانن من وا پێشوازیم لیٚ دەکرێت ترسابون نەوەك کێشەیان بۆدروست بکەن بەلام کاك عمربۆتانی لەتەفزیونی دهۆك بلاوی کردبووە و لەشارەزوورو سلێمانیش هەروا بلاوکرایەوە وەلەتەفزیۆنی ئێرانیش زۆری بلاوکرایەوە، لە٦/٣ هەرلەتەهران چاوم بەناتیق نوری سەرۆکی مجلسی شورا یا پەرلەمانی ئێران کەوت و لەسەربارودۆخی گشتی قسەمان کرد بەلام لەچاوپێکەوتنەکەدا خەڵکی کەش هەبوو لەدانیشتنەکە هەر لەهەمان رۆژ لەگەڵ وەزیری ناوخۆی کۆماریٚ ئیسلامی کۆبوینەوە لەسەر بارودۆخی ژیانی ئاوارەکان واتە ئەو کوردە عێراقیانەی کەلەئێرانن قسەمان کرد، لە٦/٤ بەکۆمەڵ ئێمەوسەرۆك وەزیران و وەزیرەکان پێکەوە چوین بۆ بەهەشتی الزهرا و سەرمەرقەدی ئیمام خومەینی لەبەر قەرەباڵغی ئێمەیان بەهەلیکۆپتەر بردە مەرقەدەکە بۆ زیارەت هەموو مەسئولینی کۆماری ئیسلامی ئێران لەویٚ بوون هەرلەویٚ ئاغای خامنئی قسەی کردو باسی میللەتی

عێراق و مەزڵومیەتی کوردی کرد بەرێزان مامۆستا مەلاعەلی هەڵەبجەیی و شێخ محمد خالیدی بارزانیش لەوێ بوون، سەرلەبەیانی رۆژی ٦/٦ بەکۆمەڵ چاومان کەوت بە محمدی یەزدی سەرۆکی قوەی قەزائی کۆماری ئیسلامی ئێران لەسەر زۆرشت قسەمان کردو وەعدی دا کەئەو ئەفسەرو سەربازە کوردانەی لەشەری عێراق ئێران گیراون وەکو ئیمتیازێکی کۆماری ئیسلامی بۆکورد کەدۆستی بووە بەربدەن وەعدی دا بەلام دوایش نەکرا، دوای نیوەرۆی رۆژی ٦/٦ چاومان بەئاغای مهاجریانی معاونی سەرۆك کۆماری ئیسلامی لەپەرلەمان یامعاونی پەرلەمان کەوت ولەسەر زۆر مەسەلەی کورد وئۆردوگاکانی کوردی عێراق لەوماوەیە بەتەما بوون بەزۆر بیان نێرنەوە وازیان لێ هێناو وەزعی ئابوری لەکوردستانی عێراق باس کراو کەپێویستە هاوکاری کورد بکەن ..لەوسەفەرەدا سەرکەوتوو بوین وهەنگاوی باش نرا بەگشتی بۆکورد قسەمان کرد وەبۆ نێوان حزب و کۆماری ئیسلامی قسەمان کرد لەگەڵ زۆری کەناڵەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران ئەوەش جگە لەهەنگاوەکانی کە هەنگاوێکی سیاسی وئیعلامی باش بوو بۆحزب و بۆکوردیش، لە٦/٧ بەسەیارەی ئێران و سەیارەکەی خۆشمان کەلەگەڵمان بوو گەراینەوە بۆهەمەدان و بۆسنە، لە٦/٨ لەسنەوە بەرێ کەوتین بۆ سەقزو بۆکان و مهاباد و نەغەدەو خانە لەماڵی کاك عبدالرحمن بوین پاشان بۆ پیران شەهر لەسەر بروسکەی دکتۆر ئازاد لێپرسراوی پەیوەندییەکانی خانە بۆ کۆبونەوە لەگەڵ قەراگای رەمەزان درەنگ رۆیشتین و سەعات (٢)ی شەو گەیشتینە خانە من و کاك خلیل و کاك بارام لەسەرجادە شەو بەتایبەتی لەمهابات و محمدیار نەغەدە پربوو لەژێژك جادەکە جۆرەهابالندەو ئاژەڵ بەشەو دەهاتنە سەر جادەکە، لە٦/٩ چوینە نەغەدەو مەقەری قەرارگا و کۆبونەوە کرا لەسەر هاوکاری وداواشیان کرد یەك کەسیان بێتە بارەگای خۆمان یازۆرێکیان هەبێت لەسلێمانی و بیانپارێزین ووتم هێشتا مشکیلەی

پێنجوێن مان ماوە سلێمانیشی بێتە سەر هەرلەوکاتەدا من لەوێ نەبوم لەکوردستان رۆژێك کۆبونەوەی پارتی و یەکێتی دەبێت لەگەڵ حزبی یەکگرتن لەیارەگای مەکتەبی سیاسی یامالّی مام جەلال دەبێت کاك مەسعود زۆر ئیهانەی کاك سامی دەکات لەکۆبونەوەکەو زۆر قسەی پێ دەڵێت وکاك سامیش دەچێتە دەرەوە بەعاجزی دوای ئیهانەیەکی زۆر لێی تێك دەچێت وسواری سەیارەیەك دەبێت و دوای دووسێ دەقیقە هەرناروات کاك سامی دەڵێت بەسائیقەکە بۆ ناڕۆیت سائیقەکەش دەڵێت کاك سامی ئەوە سەیارەی کاك کۆسرەتە باکاك کوسرەتیش بێت دەرۆین لەوانەیە لێت گۆرابێت کەسەیری دەکات دادەبەزێ سائیتەکەی کاك سامی برازای خۆی بوو وا لێی گۆرابوو برازاکەی خۆشی نەناسی بوە نەك هەر سەیارەکە کاك سامی سەیارەیەکی مارسیدیس مودیل٨٢ی رەنگ شینی هەبو وادیاربو سەیارەکەی کاك کوسرەتیش هەروەکو ئەوبوە، مامۆستا سەعدیش لەگەڵ کاك سامی بو لەکۆبونەوەکە ووتی هەڵوێستی کاك مەسعود زۆر خراپ بوو دژمان قسەی ناشیرینی بەکاك سامی ووت کاك سامی بە بەپەلە هاتەدەردوە سەیارەکەی خۆی وکاك کۆسرەت هەردووکیان مارسدیسی شین بون لێ گۆرابوو دوای هاتینەوە لەرێگاش قسەی بەمام جەلال دەوت دەیوت ئیهانەمان دە کەن ووتم خۆ کاك مەسعود قسەی کرد یا مام جەلال مامۆستا سەعدعبدالله ووتی مام جلال هەڵوێستی باش بووکاك سامی ووتی نا هەمووی خەتای مام جەلال بوو کاك مەسعود تاوانی نیە دوای هاتمەوە کاك سامی باسی کرد مام جەلال چۆن قسەی وتووە وچۆن هەرەشەی کردووە من ووتم وەلاچاوم بەمام جەلال کەوت گلەیی لێ دەکەم وپێ ی دەڵێم بۆدژی، ئێمەیە کاك سەعد ووتی دوای مام جەلال رەئی باش بوو کاك مەسعود قسەی کردوەوقسەو شتی بەکاك سامی وتووە نەك مام جەلال دوای ووتم کاك سامی کاك مەسعود ئیهانەی کردوی بۆدەڵێت مام جەلال من گلەیم لەمام جەلال دەکرد

بەلاّم كاك مەسعود نالّیم بۆ وات وتووە من بەحەقی دەزانم ئەگەر شتێكی ناحەق بوو گلەیی لەمام جەلال بكەم ووتی ناهەر خەتای مام جەلالە ووتم هیچ وانیە تۆ كاك مەسعود قسەت پیّ بلّێت و بلّیّ ی خەتای مام جەلالە تائەو حەدە وابیری دەكردەوە مام جەلالیش وایدەزانی دووهەنگی لەدارێكدا دۆزیوەنەوە لەقیادەی موەقەتە یاكۆنگرەی (٩)ی پارتی دەرنەچوبون كاك سامی بالّی ماركسی ناو قیادەی موەئەقەتە ١-كاك سامی ٢-كاك جەوهەر نامیق ٣ -كاك كەریم سنجاری ٤-كاك عبدالله صالح ٥-كاك مولازم عمر عوسمان ٦-كاك حەمید فەنی ٧-كاك عەریف یاسین ٨- كاك هاشم رەمەزان ٩- كاك نادر هەورامی ١٠- كاك دكتۆركەمال كەركوكی ١١- كاك فازل جەلال وزۆری كەش بون مام جەلال كاك سامی دەبرد بۆلیبیاو دەیگەران و هاتوچۆی پیّ دەكردو پارەشی بۆ ودرئەگرت بۆ سوریاو بۆزۆرجێگای كەش بەلاّم لەناو پارتی كاك سامی زیاتر دژی یەكێتی و شەخصی مام جەلال بوو بەمنیشی دەوت لەناو پارتی وەتۆش بیت پێكەوە هەرچی داخیان بردوەتە دلّمانەوە پێیان برێژین تۆلّەی ئەوهەموو زەحمەت،یان داوین لێیان بكەینەوە تایەكێتی دە ست ....،ماچ نەكەن شەریان لەگەلّ ناوەستێنین لە ئەفغانستان چیان بە حكمەتیار كردزیاتریان پیّ ئەكەین، لە ٦/٩ لەدوای كۆبونەوە لەنەغەدە گەراینەوە بۆمهاباد و سەقزوسنە ، لەرۆژانی ١٠و٦/١١ هەرلەسنە بوین لەسەر داوای كۆماری ئیسلامی ئێران ئەوبریارانەو قسانەی لەتەهران كرابوو لەویّ جیّ بەجیّ بكەین، لە٦/١٢ لەسنەوە چوینە كرماشان كۆبونەوەمان هەبوو لەگەلّ لێپرسراوانی ئەویّ لەسەرباروددۆخی كوردستان و خۆمان قسەمان كردو گەراینەوە بۆسنە، لە٦/١٣ لەمالّەوە بوم لەسنە، لە٦/١٤ خاتووچیلەر لەتوركیا هەلّبژێرا بەسەرۆك وەزیرانی توركیا بۆیەكەم جار بوو لەمێژوی توركیادا ئافرەت پۆستی سەرۆك وەزیران وەربگرێت وەهەر لەهەمان رۆژدا سلێمان دەمیرل هەلّبژێرا لەلایەن

پەرلەمانەوە بۆ سەرۆك كۆماری توركیا، وەهەر لەوۆرژەدا ئافرەتێكی كەش ناوی چیناموبیل (٤٦) ساڵە پۆستی سەرۆك وەزیرانی كەنەدای وەرگرت.. ئەو شتە بەنسبەت تورکیاوە گرنگە چونکە ولاتێکی ئیسلامیەو مێژویەکی دیکتاتۆرانەشیان هەیە لەحکومەتەکەیاندا، لە٦/١٥ هەرلەسنە بوین و خەریکی ئیشوکاری بوین، لە٦/١٦ چوینە کرماشان و گەراینەوە بۆ سنە، لە٦/١٧ لەماڵەوە بوم لەسنە کاك محمد دۆلاشی و کاك سەیدقادر جەباری و کاك رەمەزان هاتن بۆ سنە بۆ سەردانی من زۆرم پێ چوبوو لەوسەفەرەدا، لە٦/١٨ زۆرباسی غاری عەلی یان دەکردبۆیە بەکۆمەڵ بریارماندا بۆسەردانی غاری عەلی برۆین چوینە قروە نزیك هەمەدان رێگای کرماشان –سنە– هەمەدان (٦٠)کم لاماندا بۆنێوان جادەی تەهران و هەمەدان چوینە ئەو جێگایە ناوی غاری عەلی یە نزکەی (٧٠) ساڵێکە دۆزراوەتەوەو ئێستا چاکیان کردووە ئێمەش چوینە بەردەمی یەك ئەشکەوتەو قاپیەکی ئاسایی وەکو ئەوەی برۆیتە ناو قەیسەریەکی کۆن هەموو قاپیەکەی نەخشی سورو هیلالی هاتبووەوە دەر ئەوەندە لەو قاپیە دەچیتە ژورەوە ئێمە چوین هەلاوی ساردی دەهاتە دەرەوە گازینۆیەکی لەبەردەمدا بوو پێش ئەوە بگەیتە ناو ئاوەکە لەورۆژەدا هیتەرم دی داگیرسابوو لەبەر سەرما ئێمە بە(٤) بەلەمی ئاو یاقەیاغی بچوکەکان ئەوەی راوە ماسی پێ دەکرێت لەدوکان و دەربەندیخان نزیکەی (٢٠٠) قەیاغی وای لێ یە لەژوورەوە زۆرشوێنی تاریکەو کارەبای تێو بەو قەیاغانە دەگەرێت بەناو ئاوەکەدا نوسراوە لەو راستە ئاوەکە (١٢)مەتر قوڵە و لەولا زیاتر بەپێ ی جێگاکان نوسراوە لەشوێنەکان سەهمی بۆکراوە بۆئەوەی رێگات لێ تێك نەچێت لەناوە شاخێك یاچیایەکی لێبوو ئێمە دابەزین بەپێ لەزۆرجێگا قادرمەی ئاسنی بۆکراوە کە(٧٠ –٧٥) پلەی قادرمە لەزۆرجێگا بۆچیاکە کراوە بۆئەوەی سەرکەویت و بگەرێتەوە وەکو ئەوە وایە لەچیایەك چۆڵ دەگەرێیت بەلام هەتاو

لێت نادات چیاکەش هەرلەناو ئەو ئەشکەوتەدایە زۆر گەورەیە لەناوەوە ئێمە لەبەر ئەوەی پەلەمان بوو دەبوو ئێوارەش بگەڕێینەوە بەقەیاغ ڕۆیشتین و زوو گەڕاینەوە هەموی (٣) سەعات لەو دەریاچەی ژێر زەوی یاناو ئەشکەوتە گەڕاین بەراستی جێگایەکی خۆش و فێنك بوو سەرمامان بوو کەوتینە بەر هەتاوەکە کەدووشتی لەیەك جیاوازبوون ئەوەی خۆی نەیبینێ و تیا نەگەڕێت هەرکەسێ باسی بکات لەراست ناچێت لە٦/١٨ و من شتی وام بویەکەم جار دیوەو کاتی خۆی باسیان دەکرد قەناعەتم نەبوو بەو شێوەیە بێت کەخۆم دیم پاشان گەڕاینەوە بۆ قروەوسنندج، لەرۆژانی ١٩و٢٠و٦/٢١ هەرلەسنە بوین خەریکی ئیشوکارەکان بوین، لە٦/٢٢ چوینە کرماشان ئیشەکانمان جێ بەجێ بون و پاشان گەڕاینەوە بۆ سنە، لە٦/٢٣ لەسنەوە بەرێ کەوتین بۆ مەریوان و پێنجوێن و سەیدصادق و بۆسلێمانی، لەرۆژانی ٢٤و٦/٢٥ لەسلێمانی بوم، لە٦/٢٧ چومە هەڵەبجە، لە٦/٢٨ لەدوای کۆبونەوەو ئیشوکارەکان گەڕامەوە بۆسلێمانی، لە٦/٢٩ چومەوە بۆهەڵەبجەو گەڕامەوە بۆسلێمانی، لە٦/٣٠ چومە باریکە بۆچلەی ماڵی شێخ حسێن چەوتانی وئەوان حاجی شیخ ئەحمەد کەکورەکەیان حکومەتی هەرێم لە١٩٩٣/٥/٢٠ چونە سەریان و کوشتیان، لە١٩٩٣/٧/١ لەهەڵەبجەی تازەو زەرایەن و نصر بوم و گەڕامەوە بۆ سلێمانی، لە٧/٢ چومە باریکە بۆصوڵحی چەوتانیەکان دوای ئەو هەموو هەرایە ناچاربۆ صوڵح ملیان دا کە(١١) کەسیان لەیەك کوشتبوو چارە سەرکراو کۆتایی پێهات، لە٧/٣ لەسلێمانیەوە چومە خورماڵ بۆمەسەلەی صوڵح بوو سەردانمان کردن بە قەدەر یاقەزاوقەدەر پێشمەرگەیەکی سۆسیالیست یەکێکی بزوتنەوەی کوشتبوو دوای ئەوە چومە پرسەی کوری کاك محمود سلێمان لەبەکرئاوا لەبیناکاندا بوو بۆپرسەی کاك محمدی هەواس (حمەی هەواس) پەناغی پیاوێکی باش بوو لەسەر ئاوی سیروان لەکوساواوە دەچێت بۆگوندی، لەوپیگە

کۆچی دوای کردبوولەسالآنی ١٩٦٢و١٩٦٣ پێشمەرگە بوومەسئول بوو سەرەتای شۆرش ناسراوی ناوچەکەبوو زۆر دژی حزبی شیوعی بوو دەچووە شیرەمەر کەزۆریان شیوعی بون دەیوت ئەگەر شیوعی ئەوە خورۆشوف ئەگەر جاشن ئەوە عماش ئەگەر کوردی ئەوە حمەی هەواس خوالێخۆشبوو پیاوێکی باش و کوردپەروەر بوو حەزی بەخزمەتی خەلك ئەکرد هەروەها سەری مالّی شەهید مەلانوری مان دا لەباریکە، هەرئەو رۆژە چوینە مالّێك لەهانەی قولّ کەکورەکەیان کوژرابوو پاشان چوینە دێکۆن، لە٤/٧ لەسلێمانی بوم زۆر سەرقالّی ئیشوکار بوم، لە٥/٧ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتم بۆدوکان ونانی نیوەرۆمان لە چنارۆك خوارد زۆرفێنك بوو پاشان بۆکۆیەو هەولێر، لە٦/٧ لەهەولێر بووم داوای کۆبونەوەیەك کرا ووتیان سەرکردایەتی ومەکتەبی سیاسی پارتی کاك جەوهەر نامق و کۆمەلێکیان هاتون دەربارەی یەکگرتن قسەمان کردووە چاوەرێ ی ئۆمان کردووە چونکە دەیانەوێت بۆ ١٦/ی ئاب ئێمە حازر بین لەجیاتی دووکۆنگرە هەریەك کۆنگرەیەك بگرێت و ناوی لێ بنێت یەك کۆنگرەی یەکگرتن لەوبابەتە دەگرین من لام سەیر بوو ئەوەندە پەلەیان بوو هەرئەو رۆژەش لەمالّەکەی کاك سامی کابرای ئەمریکی هات ئەوەی وتاریشی خوێندەوە لەکۆنگرەی پارتی یەکگرتن داوای کرد یەك بریاری سیاسی هەبێت لەکوردستان مەبەست دوودەسەلاتەکەی ( ی. ن. ك) و ( پ. د. ك) بوو لەدوای کۆنگرەیە یەك بریاری سیاسی هەبێت بەومانایە لەدەستی پارتی بێت ئەوەش دووسەعات دانیشتین کاك سامی ووتی پرسمان پێ کردووە رەئی ئەمریکاشە ئێمە رێکەوین جارێکی کەش یەکێکی بەریتانی هات ووتی ئەوەش هەر رەئی وایە یەك بگرن کابرای ئەمریکی ئەوەبوو لەکۆنگرەی یەکگرتنی پارتی و یەکگرتن دا قسەی کردوو وتی پێویستە کوردستان ببێتە خاوەنی یەك بریاری سیاسی دوو سەعات لەگەلّ من قسەی کردو کاك سامی ووتی بۆ ئەمریکا یارمەتی

کوەیتی داو یارمەتی دەوڵەتێکی گەورەی وەکو میسر نادات بۆ شەر لەسەر کوەیت دەکات دەوڵەتێکی بچوکەو ئامادەنیە یارمەتی یەمەن و سودان وسوریاولیبیا بدات چونکە دەزانێ دوای ئەمیری کوەیت کێ دەبێتە ئەمیر و دوای ئەمیری قەتەر کێ دەکرێتە ئەمیر بەلاّم نازانێ دوای حوسنی موبارەك کێ دەبێتە سەرۆکی میسر یادوای عەلی عبداللە صالح کێ دەبێت دوای حافزئەسدو سەرۆك قەزافی کێ دەبێتە سەرۆکی سوریاولیبیا وەنازانێ دوای مام جەلال کێ دەبێتە سەرۆکی یەکێتی بەلاّم دەزانێ دوای کاك مسعود کێ دەبێتە سەرۆکی پارتی ئەمریکا لەسەر سیاسەتی نەگۆر کار ئەکات نەك لەسەر شتی رۆژانەو مەزاجی ئەوانە قسەی کابرای ئەمریکی بوو زەعیفێکی درێژ بووناوی روبرت بوو کەلەکۆنگرەی یەگکرتن قسەی ئەکرد وەکاك سامی تەرجومەی ئەکرد من زۆرکەم لێی تێ ئەگەیشتم بەریتانیش هەمان قسەی کرد کاك سامی وتی ئەوە رەئی ئەمریکاوبەریتانیایە ئەمرۆش دابەشکردنی دونیا بەدەستی ئەودوو ولاّتەیە دەیویست وامن تێگەیەنێ لەسەر مەسەلە سیاسیەکانی دوا رۆژ هەرپارتی دەمێنێتەوە و یەکێتی دەبێتە حزبی دووهەم وە ووتی سیاسەتی پارتی لەلای غەرب مەقبولەو پشتیوانی لێ دەکەن و هێزێکی سیاسی وەکویەکێتی لای غەریبە رەغبەتی نیەو هەرۆژە و سەعاتێك لەسەر رەئیەکەو لەسەر قسەیەکە سەبارەت بەدۆستی مام جەلال قسەی ئەو سیاسەتی یەکێتیە نەك سیاسەتی یەکێتی لەداهاتووە سیاسەتێکی سەرکەوتوو نابێت لەداهاتودا وادەکەن پارتی ببێتە حزبی قائید وکاك مەسعودیش بەقیادەی یەکەمی کورد ئەم دادەنرێت جا ئەگەر ئێمەش لەگەڵ پارتی بین لەهەڵبژاردندا لە٨٠٪ دەیبینەوە ویەکێتی ناچار دەبن مل بدەن کاك سامی تاسەرئێسقان دژی یەکێتی بوهەر چەندە یەکێتی ئەوەندە عەزیەتی منیان دابو ئەوەندە بەقەدەر من عەزیەتی کاك سامی یان نەدابو زۆر لەوقسانەی دەکرد هەرکات مەجالی هەبوایە جگە لەکاك

رێکار ئەحمەدقسەی نەدەکردکاك عبدالله صالح جار جار لای من دەیوت سامیش بروات من نارۆمە ناوپارتی ئەوەندە دژیان بو ئەیوت پارتی هەردەمکوژن چونکە بۆ یەکەم جار بەناو کاك سامی بو من هێزێکی هەشتاکەسیم لەسوریاوە هێنایەوە بادینان ئەوەبو هێزی زۆرو عەشایەریان لەسەرمان کۆکردەوەو توشی ئەو وەزعەیان کردین بەڵام گرنگ ئەوە بو من توانیم ئەوە بکەم وتی من لەگەڵ تۆدا دەمێنمەوە کاك عبدالله صالح پیاوێکی وشیاربوو بەتاڵ نیە شتی پێیە کاك قادر جەباری دەیوت تاکەی چاوەڕێ بکەین و ئەو پیرێژن و دایکی شەهیدو شەورۆژ کابرا برای شەهیدەو ئیتر شۆرش تەواو بوو هەموو ئەوانە نیوەی ئێمەش خەباتیان نەکردووە ئێستا هەموویان وەزیرو پارێزگارن ئێمە تازە پیرەژن دێت بەسەرما دەگرێ بەراستی بەسەو تاقەتی ئەوەمان نەماوە خۆمان دەکەین بەناو پارتی دا بەحزبێکی گەورەیە و کێ تواتی باڵە مەلەی تێدا دەکات منیش دەموت باوەرناکەم ئێوە لەدەریایەدا مەلەتان پێ بکرێت غەرق دەبن ودەخنکێن لەگەڵ یەکێتی بۆ یەکگرتن ناکەن ئەوەندە گرنگە.. ووتی فەرق لەنێوان یەکێتی و پارتی دا هەیە یەکێتی کادرەکانیان مەیدانین و لەناو خەڵکدان بەلام پارتی کادرەکانیان فەرمانبەرن وقیادەی کاك مەسعود لەکادرەکانی خۆیان بێزارە وکادریان نیە پارتی حزبێکی رۆشنبیر نیە بەلام یەکێتی لێزانە ئێمە لای پارتی دەتوانین دەست بەسەر پارتی دا بگرین هەموو کادرەکانی سۆسیالیست و یەکگرتن بەگشتی لای یەکێتی ئەو مەجالەمان نادەن ئەوە رەئی هەموو سەرکردایەتی یەکگرتن بوو کەپارتی حزبێکی رۆشنبیرو شارەزانیەویەکێتی لێزانە و ئەو مەجالەیان نادات بەلام پارتی هەردڵی کاك مەسعود رازی بێت ئیتر کەس هیچ نیە ئەمە ئەو راستیانەیە چەند جارێك ملازم کەریم و کاك شوان و کاك قادرو کاك سەعد و هەموویان ئەوە رەئیان بوو بۆیەکگرتن لەگەڵ پارتی نەك یەکێتی وەدەیانوت یەکێتی زۆری زەحمەت داوین

دەتوانین لای پارتیەوە تۆڵەی خۆمانیان لێ بکەینەوە ئەو وەزعەی هەیە بالێیان تێك بدەین بەتایبەتی کاك سامی بوو لەسەرکردایەتی و هەموشیان تەحلیلاتی جۆربەجۆریان دەکرد بۆئەوەی من قەناعەت بکەم رۆژێك ئەوەندە بێزاربوم لە قسەی بێ سەروبەرەی ئەوبرادەرە روخاوانە لەقوتوی هیچ عەتارێکدا نەبوو یالەقاموسدا نەبولە مەکتەبی سیاسی دا ئەندامانی سەرکردایەتی بۆ قەناعەتی من دەیانوت تۆبۆئەوەندە پێداەگری لەسەرگۆرینی ناوی پارتی ناگۆریت چونکە لەکۆمپیوتەر ناوی پارتی جێگیربوە نیودەولەتین ناگۆریت خۆم ئەوکات شارەزایم هەبوو لە کۆمپیوتەر پارتی خۆیان ئەوەندە هەولیان نەئەدا من رام لەسەر هەردوو لایەن جیابو پارتیم بەحزبێکی شارەزاو خاوەن دامەزراوە دەزانی ویەکێتی مۆدێرن وبێ دامەزراوە وبێ دراسات لەسەر بریاردان کە پارتی مونەزەم تربون لەزۆرمەسەلەی جیاجیادا وەیەکێتی چۆن لەبریاری خۆی زوو دەگۆری وپەشیمان دە بێتەوە هەرواش لە پارتی ئاسانترئەتوانێ لەگەلیان رێك بکەوێت. من رام لەگەل یەکگرتن نەلەگەل (ب. د. ك) ونەلەگەل ( ی. ن. ك) هەبوو دۆستیان بین باشترە بۆدیمکراتی یش هەرواباشە ئەوەش وابوایەت ئەسان نەبو شەری هەردوولا ببوایەت ، لە١٩٩٣/٧/٦ لەسەر ئەو وەزعانە قسەکرا...من ووتم نایەم و ئێوە برۆن وتیان نابێت و چۆن ، لە٧/٧ دوای هاتنی وەفدی پارتی بەسەرۆکایەتی کاك جەوهەرنامیق بۆ مەکتەبی سیاسی ئێمەو بەئاشکرا باس کرا ئێمەش یەکەم وەفدبوو کەبەئاشکرا باسی بکرێت چوین بۆصلاح الدین و مەکتەبی سیاسی پارتی، لەکۆبونەوەکە کاك مەسعود و هەموو مەکتەبی سیاسی و زۆری کۆمیتەی ناوەندی پارتی بەشداربون ئێمەش لەسۆسیالیستی کۆن سەیدکاکەو کاك قادرجەباری و منیش بەشداربوین و پاسۆك چوارکەس و گەلیش کاك سامی و دووسێ کەسی کەیان بەشداربون تائەو کاتەش هەروەکو سێ حزب بوین واتە وەفدەکەش هەر (٤)ی هی حزبێکی پێشوو

بوو ئەو رۆژە قسەی زۆرکرا لەسەر روداوەکان و لەسـەر یەکگرتن و چۆن ئیشەکە دەست پیێ بکات و فریای ١٦ی ئاب بکەوێت و لەسەر ژمارەی ئەندامانی کۆمیتـەی ناوەندی و ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و ناوی حزب و رەنگی حـزب قـسەکرا بـەلام نەگەیشتینە هیچ ئەنجامێك هەتا کاك مەسعود هەر تەئکیدی کردەوە تـۆیش رەئـت چیە؟ دەبێت یانابێـت واتـا بـەمنی ووت.. منـیش ووتم لای ئێوەیـە ئەگـەر ئێـوە ئەوەی داوای، ئێمەیە جێ بەجێ ی بکەن ئـەبێت... لەگـەڵ ووتم ئـەبێت کـاك قـادر جەباری دەستی کرد بەچەپڵە لێدان و ئەوانیش خەریك بوو دەستی پـێ بکـەن کـاك مەسعود ووتی کاکە جـارێ راوەسـتن قـسەی نـەکردوەو دەڵێـت ئەگـەر گەیـشتینە ئەنجامێك یا ئەگەری تێدایە بۆ ئەوان چـەپڵەکەیان راگـرت زۆرناخۆشـبوو ئـەو رۆژە گەراینەوە من رەئیم وابوو:

ناوی پارتی دیموکراتی یەکگرتوی کوردستان و ئـالای شـین لای ئـالای حـزب بێـت و(١٠) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەبێت و پارتیش (١٥) ئەندام واتا هەمووی (٢٥) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بێت وەسێ ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی هـەبێت لەگـەڵ جێگری سەرۆك بۆئێمە و وردەکاری کەش بەلام پـارتی جگـە لەناوەکـە هـەموویانی قبوڵ کرد بۆ ناوی پـارتی وتیـان پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان – یـەکگرتوو..مـن ئەوەم رەد کردەوە ووتیان شتەکانی کە هەمووی قبوڵـەو نـاوی پـارتی بـەکوردی و عەرەبی یەکگرتوو بێت بەلام بە ئینگلیـزی هـەرپارتی بێـت و نابێـت دەسـت کـاری بکەین لەسەر ئەوانە نەگەیشتینە ئەنجام و گەراینەوە هەموو برادەران رازی بون بـۆ ئەو یەکگرتنە بەبێ شەرت و شروت هەریەکسەر بۆناو پـارتی هـەموویان قبـوڵ بـوو هەندێکی لەدژی یەکێتی وهەندێکیش هەر لەئەسڵدا لایەنگری پارتی بوو هەنـدێکیش هەر روخابون هەر چۆن بێت نـەجاتیان ببێـت بەشـێکی کـەمیش زیـاد کردنـی یـەك کەس بۆ پارتی دژی یـەکێتی بەخـەبات وهـەنگاوێکی نیشتمانی ونەتـەوەی ئـەزانی

واتە ئەو٣حربە هەریەکە ببوو بەدزی ماڵی خۆی ئەوماوەیە من هەوڵم دەدا و پێش ئەوەش بۆ تاخیر کردنی تاسەرچاوەیەك پەیدا بکەین ئەو ماوەیە لەئێران بوین ئێرانیەکان دەیانوت یارمەتیتیتان دەدەین بەڵام ئەو یارمەتیە نەبوو کێشە ی حزبی پێ چارەسەر بکرێت وادیاربوو پارتی لای ئێران باسی کردبوو لەئێران پشتیوانی لەیەککگرتنەکە ئەکرد ئیتلاعات پێ ی خۆشبوو ئەوانیش دژی یەکێتی و پارتینیان با باشتر دەزانی سوپا ی پاسداران حەزی دەکرد هەرلە جێگای خۆمان بین هەریەکە بەڵام ئەوەی ئیتلاعات لەوێ زیاتر دەسەڵاتی بریاری هەبوو ئەوان پشتیوانیان لەپارتی یا ئەو یەککگرتنە دەکرد، لە٧/٧ گەراینەوە وتیان ئەوە ماوەیەکە ئێران جگە لەئازوقە شتێکی وایان نەداوەو ئەوەش تورکیا هیچان نەکرد وئەوەش حکومەتی هەرێم بەدەستی خۆیانە هەر رۆژەش یەکێتی شەرێکمان پێ دەفرۆشێت.. راستیان دەکرد یەکێتی لەو ماوەیەدا سێ چوار جار شەریان پێ فرۆشتین لەکۆیە دووکەس کاك سامی گرتبونی لەرووداوێکدا مام جەلال تەلەفۆنی کردبوو بۆکاك سامی هەرەشەی کردبوو قسەی بەکاك سامی وتبوو لە تەلەفۆندا هەرئێستا بەریان نەدەن دێمە سەرتان و مەقەرەکەتان دەگرم..ئەوە کاك سامی زۆر ترساندبووهەرئەو رۆژە گیراوەکانی بەردابوو شیروانە سور ومەریوانی کریم ئاغا گرتبونی من بەکاك سامیم وت بۆ بەرت داون پێم ناخۆش بوو وتم بتان وتایە لای محمد حاجی محمودە کاك سامی وتی بەخوا ئەهاتە سەرمان وادیاربو مام جلال لە وتەلەفونەکە دا کاك سامی زۆر ترساندبو هەم زیاتر هانی دەدان بۆلای پارتی بروات وەلەلایەکی ترەوە شەری باریکە و هەر رۆژە گێچەڵێکمان پێ دەگرێن لەهەردوولاشەوە پارتی و یەکێتی پێکەوە رێك کەوتبون یەك هەڵوێستان لەسەر حزبەکان کردوبیان دژمان ئەوەی راست بێت هەموو سەرکردایەتی یەکگرتن بەهەموو شتی خۆیەوە حازربوو بۆلای پارتی بروات من سەردانی تورکیام کردبوو

هیچیان نەکرد و سەردانی ئێرانم کردبوو ئازووقەی (٦)مانگی حزبیان دا بەلآم هەر
لەئاستی حزب و ئەوکارەنەبوو قسەکەی غفور دەرەشیشیم وەبیر هاتەوە دەیوت
شاخی سورێن برۆخێ دەوەستێتەوە بەلآم مرۆڤ روخا ناوەستێتەوە..بەراستی
هەموویان روخابوون هەر دەرۆیشتن هەرچیمان بکردایە بەلآم ئەوەبوو هەرچۆن
بووە هەوڵێك بدەم ئەگەر سەرچاوەیەکی ژیانی حزب هەبوایە هەنگاومان بۆدەناو
ئێمە نەدەرۆیشتین و سەرکەوتوو دەبوین یەکێتیش تائەوکاتەبەردەوام دژایەتیان
بەردەوام دەکردین و دژایەتیان دەکردین یاداوایان دەکرد برۆینە لایان لەسەر ئەوە
مناقەشە بوو، هەر لەناوسەرکردایە تیە روخاوەکەی یەکگرتندا بەلآم هزروتوانای
حزب زۆربوولە خوارەوەوناو جەماوەرکەیدا بەلآم قیادەکەی روخابو لەسەرەوە
حزب روخابو، لە٧/٧ پاش گەرانەوەمان لەصلاح الدین وەفدەکە سەردانی مام
جەلالمان کرد و باسی ئەو کێشانە کرا من لەوێش ووتم مام جەلال شتەکانمان
بۆبکەن ئەگینا بریارێك دەدەین خۆشمان باوەرمان پێ نەبێت و بەو برادەرانەی
یەکێتیم ووت کەدانیشتبون ووتم ئەوە ئەمرۆ کۆبونەوەکان نەگەلّ پارتی هەبوو
دەربارەی یەکگرتن رجا دەکەم کێشەمان بۆ دروست مەکەن ئاگاداری وەزیری
مالیەش بکەن ئەوە (٣) مانگە یارمەتی و حصەی حزبیان بریووە لێمان
بماندنەوەوە ..مام جەلال ووتی ئاگاداریان دەکەم هەمووتان بۆ بکەن بەلآم شەو
تەلەفزیۆنی پارتی و ئێمەش بلآوی کردەوە کەهەردوو مەکتەبی سیاسی
کۆبونەتەوە بەئامادە بونی کاك مەسعود بارزانی دەربارەی یەکگرتن قسەکراو
نەتیجەی باشی هەبووە لەوەوە یەکێتی کەوتنە خۆیان هەتا لەکۆبونەوەکە وتیان
زۆر باس نەکرێت بۆئەوەی پیلان دروست نەکرێت و ببێتە کێشەیەك بەلآم لەرادیۆ
بلآو کرایەوە وەزعەکە بەشێوەیەکی کە و پارتی دەستە سەردان و هەموو
کارەکان بە ئاسای دەرۆیشتن لای پارتی و یەکێتی بەپێچەوانەوە لەسەری بێ

هەنگاو داوا کردن بۆلای یەکێتی و زەختی زیاتربوو لەسەرمان کاك عدنان موفتیم دی و باسم کردو ووتی مام جەلالت نەدیووە ووتم دیم بەلاَم باسی ئەوانەم نەکرد باسی شتی گشتی کردو لەگەڵ کاك کۆسرەتش دوومانگ پێشتر باسم کردووە کەنیازی واهیەو مەجالیش نەماوە سیقەم نیە یەکێتی پەشیمان دەبێتەوە لەبریاری خۆیان مەسەلەی حزبیش پێویستی بەمیزانیە هەیەو پشتیوانیمان لێ بکرێت کاك عدنان ووتی من باسی دەکەم لەگەڵ مام جەلال وتم باشە ئەگەریش کرا تۆیش دەبێت ئیش بکەیت ووتی واز لە من بهێنن بەلاَم من ئامادەم هەموو هاوکاریەکت بکەم لەهەولێرەوە گەرامەوە بۆسلێمانی و باسی ئەو هەلوێستە دژ بەحزبەی سەرکردایەتیم کرد بۆ برادەرانی لق وئەوانەی لەوێ بون، لە٧/٨ هەر لەهەولێر بوین برادەران دەیانوت بەبێ ئەوەی کۆمیتەی ناوەندی و کۆنگرەو کۆنفرانس بکرێت هەرلەوێ بریار بدرێت بەلاَم من پێم داگرت لەسەر ئەوەی دەبێت کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی بکرێت وەکۆنفرانسات بکرێت وەکۆنگرەش دوا بریار بدات بکرێت یانە ئەوان هەمووی دژی ئەوەبوون بەتایبەتی کاك سامی و کاك سەعد و کاك شوان وکاك عبداللە و هەموویان جارێك دەترسان کێشەیەکی تیا بکەوێت و نەکرێت یاکەمتر خەلکیان لەگەلدا بروات، لە٧/٩ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی لەمەکتەبی سیاسی لەهەولێر دەستی پێکرد و هەموو لەسەریەکگرتن و هیچی کەیان باس نەدەکرد.. کاك عمربۆتانی هات بۆلای من و وتی من ئەو یەکگرتنەم پێ خراپە بەلاَم من چارم نیەو لەژێر دەسەلاَتی پارتی دام نەیکەم دەمکوژن بەوە قەناعەتی کرد،لە٩١و٩٢ئەوکاتە کاك فەرەیدون عبدوالقادر لە بادینان بو هاتەلام پێ ی وتم عمر بۆتانی پارتیە وتی من چەندە سۆسیالیستبم عمریش هەر ئەوەندە سۆسیالیستە من بە کاك رەسولم وت ئەو وتی یەکێتی وئەوانە ناناسی گۆمان بخەنە ناومان، لە٧/١٠ هەرکۆبونەوە بەردەوام بوو تائێوارە بەبێ ئەوەی بگەینە ئەنجامێك

بەلام هەموویان بریاری خۆیان دابوو جگە لەوەی من مابومەوە لەکۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی وتیان کێ رازی یە دەست بەرزبکاتەوە...ئێوارە کاك سامی هەرەشەی لەکاك رێکار کردبوو خۆی بکات بەنەخۆش و نەیەتە کۆبونەوەوە...کاك عبدالله صالح‌ش دەستی هەڵبری پێ دەچوو کاك سامی ئەو شەوە شتێکی لە گەڵ باس کردبێت وقەناعەتی پێکردبوو هەمویان دەستیان بەرزکردەوە کاك بروسك نوری شاوەیس چەپڵەی لێداو وتی تەواو رەئی ئەکسەریەتە ووتم کاکە ئەکسەریەت ئەوە (٢٥) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیە هی وا هەیە رەئی تەنها خۆی هەیە ئەکسەریەت کامەیە ، لە٧/١٢ گەرامەوە بۆسلێمانی و بریارمان دا لە٧/١٤ کۆبونەوەیەکی فراوان بکەین وباسی ئەومەسەلەیە بکەین، لە٧/١٣ هەرلەسلێمانی سەرقاڵی ئیشوکار بووم، لە٧/١٤ لەهۆڵی ژووری بازرگانی لەسلێمانی نزیکەی (٣٥٠) کادری رێکخستن و پێشمەرگانە کۆبوینەوەو بەدوورودرێژی لەسەر یەکگرتن قسەکراو هەمووئەو پێشنیارەی من کردبوم قبوڵ کرا لەپێشا کۆنفرانس پاشان کۆنگرە بریار بدات یەکگرتن بکەین یانەیکەین زۆر هەر رازی نەبوو باس بکرێت بەلام ئێمە (٣) حزب بێ چارە بوین ئاسان نەبوو دەبوو بەشێوەیەك قسەبکەین چارەسەری بۆ بدۆزینەوە نەوەك خراپی بکەین لەوێ هەموو بریاری دا کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی بۆی نیە هیچ بریارێك بدات بەبێ کۆنفرانس و پاشان کۆنگرەش بریاری کۆتایی لێ بدات بەلام ئەو ماوەیەش نەوەستام ئەوە قسەیەی کاك بروسك ٢٥ ئەندامە کەی کۆمیتەی ناوەندی زۆر یا جگەلەرەئی خۆیان نە لە ناوحزب ونە لەناو جەماوەرشدا کەسیان لەگەڵ نەبوە لەهەموو لایەك هەوڵم دەدا بەدیلێك پەیدا بکەم بۆئەوەی دوای ئەوان ئێمە چی بکەین بەلام برادەران زۆر زەختیان دەخستە سەرمان هەتا جاری وابوو هەرچی کەسوکاری شەهید بوو دەیان هێنا یاقورئانیان دەهێناو زۆرنارەحەتیان دەکردین لەولاشەوە سیقەمان بەیەکێتی نەبوو تاکەی

پـشتیوانیمان دەکـات و لـەنیوەی رێگـا بـەجێمان نایـەڵێت..کۆبونـەوەی ژووری بازرگـانی سـلێمانی باشـبوو لەوکاتـەدا، لـە١٥/٧/١٩٩٣ وەفـدێکی ئێـران هـاتبون لەشەقلاوە میوانی حکومەتی هەرێم ویەکێتی بوون ناردیان سەریان لیٚ بدەم وچـوم و چاوم پێیان کەوت کاك عدنانیش هات ووتی حەزدەکەم مام جـەلالیش ببـینی مـن رۆیشتم و پاشان لەگەڵ مام جـەلال وکـاك کۆسـرەت دانیـشتین و لەسـەر یـەکگرتن قسەکراو ووتیان چۆن شتی وا بووە,, ووتم ئەوە چەند مانگەو پێش تـریش لەگـەڵ ئێوە باسم کردووە بەلاٚم ئێوە زەختان خستوە سـەرمان و ئێمـەش ناچـار بـوین و برادەرانمان دەیانەوێت برۆنە لای پارتی و لەوێوە تۆڵەی خۆیان لەیەکێتی بکەنـەوە وەپێم ووتن سەیری من مەکەن من رەئی تایبەتیم هەیە بـەلاٚم مـن حـەز بـەزەرەری یەکێتی ومام جەلال ناکەم بەلاٚم ئێوە خۆتان دوژمن بۆخۆتان زیاد دەکـەن..مـانگی (٢)ملیۆن دینار بۆحزبێك هەرهیچ نیە بـەلاٚم ئێـوە گیروگـرفتی بـۆ دروسـت دەکـەن بەقەدەر تـەعمیری خـانووی وەزیرەکـان ناکـات..خـانووی واهەیـە نیومنیـۆن دینـار دانراوە بۆتەعمیر کردنی وەئێوە رۆژانە مەشاکیلمان بۆدروست دەکـەن مـام جـەلال ووتی با کاك عدنانیش لەبەیندا بێت بۆشاهیدی ئێمە ئامادەین هەموو هاوکاریەکتان بکەین پاشان کاك کۆسرەت ووتی با سامی بروات.. ووتم هەمویان دەرۆن بەلاٚم مـن چۆن سەدلە سەد لەئێوە دڵ نیانیم لەوەی ئێـوە یارمـەتی و هاوکـاری لـەداهاتودا یائەو کاتەی پارتی شەرمان دەکات ئـەوکات ئێـوە نیـوەی حکومـەتن بۆیـان ئیمـزا ئەکـەن کەپـەلامارمان بـدەن وشـەرەکە بکـەن و شـەرعیەت بـدەن بـەپارتی بـەلاٚم شتێکی ئەوتۆکراو قسەش هەروا دەروات من دڵنیا نەبووم لێیان ئەوەی راستی بێت دڵنیا بوایەم لەیەکێتی ئەوەی دەمتوانی دەمکرد هەرلەوکاتەدا عەلی بـچکۆل ووتـی کـاك شـەوکـەت وتویـەتی برادەرانـی سـەرکردایەتی گلـەییان لـەمام جـەلال کـردووە کەزۆر لەسنور زیاد بەدەمی محمدی حاجی محمودەوە دەروات و هاوکاری دەکات و

یارمەتی دەدات..مام جەلال وتویەتی ئێوە وازم لێ بهێنن من بۆئەوەیە دەستی لەپارتی و لەو وەزعە ببرم دوای توشی گەورە ترین مشکیلە دەبێت ئیتر نازانم کاك عەلی خۆی وای پێ خۆشبوو من لەوەزیاتر نەرۆم لەگەل یەکگرتن برۆم یاخود وابوە یا کاك شەوکەت پێ ی خۆشبوو ئەو قسەیەی کردووە یا مام جەلال ئەوەی لەکۆبونەوە باس کردووە تائەو کاتە یەکێتی لەزۆرشت پەشیمان بوەوە و چەندجار بریاری خۆی جێ بەجێ نەدەکرد ئەوەش ئاسان نەبوو بۆمن لەوکاتەدا رووبەرووی غروریەتی پارتی و ئەو وەزعە ببمەوە پاشان من گەرامەوە بۆسلێمانی، لە۷/۱٦ لەسلێمانی لەگەلێ کاك عبداللە ئاگرین و دووسێ برادەری کەو خالەحاجی چوین بۆکۆیە بۆپرسەی باوکی مام جەلال لەرێگا لای خەلەکان توشی کاك سامی و هەموو برادەرانی سەرکردایەتی بوین دەهاتن بۆسلێمانی کەکۆبونەوەی فراوان بکەین لەسەر یەکگرتن رەئی وەریگرێت وواز لەکۆنگرە بهێنن پێم ووتن ئێوە برۆن بۆسلێمانی وئێمەش دەرۆینە پرسەکەودەگەرێینەوە مام جەلال شەو لەرادیۆو تەلەفزیۆن بلاوی کردووە ووتی وەفدێکی حزبی یەکگرتن بەسەرۆکایەتی محمدحاجی محمود هاتون بۆ پرسەکەوکەو وەفدی پارتی بەسەرۆکایەتی کاك مەسعود پاشان مام جەلال ووتی کاك عەلی عبداللە گلەیی کردووەو وتویەتی ئێمە یەکگرتنمان کردوە بۆناوی ئەویان بلاو کردوەتەوە دوای بەکاك عەلی عبداللەم ووت ئەیوت شتی وام نەوتووە، شەوی ۱٦-۷/۱۷ لەسلێمانی بووم هەرچیان ووت من ووتم ئەوەبریارەو کۆنفرانس بکەین سبەینێ لەکۆنفرانس وپاشان بریاری کۆنگرە بدەین ئەوکات بریاری یەکگرتن بدەین زۆریان ئیزعاج کردم وزۆریان لەگەلم ووت و زۆرقسەیان کرد بەلام ئەو کەسانەی پێیان خۆش نەبوو رێگایان نەدەدا من بیانبینم لەسەرکردایەتی تەنهاکاك رێکار بوو وەلەکادرەکان و کاك محمد دۆلاشی وکاك خلیل سەعیدوچەند کادرێکی کەش کەم بوون ئەو یەکگرتنەیان پێ خۆش

نەبوو بەلاّم هەموی پیّ ی خۆشبوو نەیان دەزانی لەبەرچی پێیان خۆشەو بۆ هەریەکەش بۆچونێکی تایبەتی خۆی هەبوو لەو یەکگرتنەدا سەرکردایەتی بەگشتی دەیانوت زەختی یەکێتیمان لەسەرە بەلاّم ئێمە زەختی پارتی و یەکێتیمان لەسەر بوو هەردوولایان پێك هاتبوون لەسەر ئەوەی حزبەکانی کە لاواز وناچار بۆناوخۆیان برۆن ئەوە واقیع بوو نەدەبوو ئێمە لەبەر ئەو زەختە خۆمان بکەین بەناویاندا..کاك رەسول رێچکەی شکاندبوو یایەکێتی وەعدیان دابوو هاوکاری کاك رەسول بکەن پاشان بەقسەی ئەو برادەرانە خۆیان یارمەتیەکەیان برین وکاك رەسول ناچاربوو چووەناو یەکێتی بەلاّم مام جەلال ووتی کاك رەسول خۆی داوای لەکاك عدنان کردووە کەقسە لەگەلّ یەکێتی بکات و کاك رەسول بڕواتە ناویەکێتی نەك یەکێتی زەختی خستبێتە سەری لەهەمان کاتیشدا حزبی وەحمەتکێشان لەپەرلەمان لەگەلّ یەکێتی دابەزیبوون یەك لیستیان هەبوو دوای ئالاّی شۆرش چووەناو زەحمەتکێشان پاشان یەکێتی داوایان لەزەحمەتکێشان کرد کەبرۆنە ناویەکێتی بەلاّم زەحمەتکێشان قبولّیان نەکرد بەلاّم یەکێتی ئینشقاقی پێکردن کاك سالارو کاك مەلابەختیارو کاك عماد ئەحمدیان هێنایەوە ناویەکێتی لەگەلّ بەشێك لەکادرەکانیان لەسەرئەوە کاك قادر عەزیز وەزیری کشتوکالّ بوو لایان برد لەوەزیری وەکو زەختێك لەسەری وەلەگەلّ ئێمەش دا چەندین کۆبونەوەو بریاری هاوبەش بەلاّم لێی پەشیمان ببوونەوە یەکێتی دەیانوت زەحمەتکێشان وەعدیان داوەو نەهاتوون بۆیە لەسەریان رەدفعلمان هەبووە موبەریر بووبۆئەو زەختەی خستبویانە سەریان منیش لەوانە دەترسام رۆژانەش برادەرانی خۆم داوایان دەکرد کەیەکێتی دژمانە بەلاّم کاك سامی بەتەمای مەسئولی یەکەمی حزب بوو بەتایبەتی دوای ئەوەی کاك رەسول چووە ناویەکێتی و کاك دکتۆریش لەدەرەوە بوو بریاری دابوو ئیش نەکات کاك سامی بەتەمای لێپرسراوی یەکەم بوو ئێمە شەرقبولّمان

نەکرد لەناو قەواعیدی حزب و هەتا کادرەکانی خۆشیدا پییان خۆش نەبوو ئەویش گەمارۆیەکی لەسەر دانابوین بۆئەوەی زۆرتر ناچاربین بۆلای پارتی برۆین وئەوپارەی خۆی سەرف نەکات و دژی یەکێتیش بوو لەناو پارتیەوە رقوکینەی خۆی دژی یەکێتی و لەبرادەرانی تریش بەتایبەتی کۆنە حسکەکان ..کاك سامی دەوڵەمەند بوو بەلام زۆربەی کادروسەرکردایەتی پارەیەکی زۆر ومالّ وخانوو هەموو شتیان کۆکردبوەوە تائامرهێزەکانیش زۆرجار پێم دەوتن بۆنارازین خۆ ئەگەر لەتەمەنی یەك مانگیشەوە ئیشتان کردبێت و رۆژی (١٠٠) هەزار دینارتان هەبووبێت تائێستا ئەگەر ٣٠٠ساڵ تەمەنتان بوبێت ئەوەندەتان پەیدا نەدەکرد واتە تەعویزی ئەو ماوەی لەشاخ بوون کردبوەوە هەموویان یازۆریان من هەموو کەموکوریەکانم بۆجێ بەجێ کردبوون مشکیلەیان نەمابوو دەیانویست ئەوپارەیەیان سەرف نەکەن ولای پارتیش ئەو بەرژەوەندیەیان بپارێزن وجێ بەجێ ی بکەن و خۆیان بەکوشت نەدەن و شەری پارتی و یەکێتیش کۆتایی پێ هاتووەو ئەوە لەوانەیە هەردوولایان ببنە یەك حزب و هەندێك بۆئەوەی ببێتە وەزیر و پارێزگار و مەسئولیات وەربگرێت کەنەمابوو بەناوی وەفای حزب و کەسوکاری شەهید و بونی حزبێك بۆچارەسەری کێشە ناوخۆیی و دەرەکیەکان مەسەلەیەکی بەناوی مەسەلەی کوردو ئەوانە هەموی پشتگوێ خرابون و کێ زووبگاتە پارتی و هەندێك دەیویست چالە کۆنی خۆی بروانەوە کاك سامیش دەیویست بەو شێوەیە خۆی ئاشت بکاتەوە لەگەڵ پارتی دا لەدوای بەدیل سوریەکەی دەیوت یا وتبوی من بەتەنها رۆیشتوم ئێستا (٣) حزبم هێناوەتەوە پارتی چی دەوێت لەمن واش بوو برادەرانی پاسۆك وەکو پێشتریش باسم کرد رێکخراوێکی گەورە نەبوون وهەمیشەش لەناو خۆیان شەرو هەرایان هەبوو دوای کاك ئازاد سکرتێریان نەبوو رێك نەکەوتن لەسەری و پێشتریش لەناو خۆیان کێشەیان هەبوو لەسالآنی ١٩٨٢ و١٩٨٣ لەمیری سور بون و

له۱۹۸٤ لەبانی شار وئەوکات لەگەڵ کاك (عبدالله) کاك جواد مەلادا کێشەیان هەبوو لە ماڵی کاك شێخ محمدهەرسین لەکەرەج کاك عبداللەیا کاك جواد مەلا بەدەمانچە تەقەی لێ کردن لەخانووەکەوە خۆیان خستە خواردوە کاك ئازاد وکاك کەریم وکاك ئاراس وەلی بریندار بو کاك کەریم وئەوان دەربازبوون ..کاك عبدالله ئاگرینیش دەیوت پێش راپەرین ۳۰یا ۳۲ ئەندامی پاسۆك بووە لەهەموو رێکخستن دا لەسلێمانی کەکانگای پاسۆك بووە..کاك کامیل ژیریش یەکێ بوو لەهاندەرەکان بۆیەکگرتن بەلام دەیوت ئەوە مێژوی گەورەو خزمەتی کورد دەکات لەپاشە رۆژدا بەلام من خۆمی تیا نابم و من ئیشی کەم هەیەو خەریکی کاری شیعرو چاپ و محامیەتی خۆم و ئەوشتانە دەبم بەلام دەوری یەکەمی یادورهەمی لەنار پاسۆك دا لەسەرکردایەتی دا هەبوو بۆیەکگرتن هەریەکێ مەبەستێکی هەبوو..بۆمەبەستەکەی خۆی کاری دەکردو دەشیانووت ئەوەی لای پارتی دەتوانین بیکەین لای یەکێتی بۆمان ناکرێت یانایکەن ، لە۷/۱۷ لەهۆڵی رۆشنبیری سلێمانی کۆبونەوەکە دەستی پێکرد ولەو کۆبونەوەیە زۆرقسەکرا کاك سەیدکاکە ووتی بۆمان ناکرێت لەوێش کاك بروسك قسەی کرد کەسەرکردایەتی ئەکسەریەتەو بریاری داوە کۆمەڵێك لەکادرەکان هەڵسانەوەو وتیان بریار لای ئێمەیەو لای ئێوە نیە مناقەشە زۆر کراو نەگەیشتینە نەتیجە منیش ئەو رۆژە هەمویان میوان بوون لەسلێمانی میوانیش بون لەماڵەوە بۆیە نەم دەویست زۆر عاجزیان بکەم بەلام ووتم ئێوە رەئی حزب نین و رەئی حزب لای ئێمەیە و سۆسیالیست بریار دەدات و بریارێك وەرگیرا کەکۆنگرە بگیرێت و لەکۆنگرە بریاری یەکگرتن بدەین بەلام جێگایان دیاری نەکردبوو بۆکۆبونەوە کە بۆئەوەی ئەگەر نەکرا خۆیانی لێ دەباز بکەن دوای کۆبونەوەکە نیوەرۆ گەیشتەوە ماڵەوە لەسەرەتای دانیشتن کاك سامی ووتی من نان ناخۆم تاوەعد نەدەیت ویابریاری یەکگرتن نەدەیت وتم کاك سامی ئەوە نان خواردنە چی

پەیوەندی بەوەوە هەیە وادیارە لەناو عەرەبدا ئەوە باوە کەسێك ئیشێکی هەبێت دەچێتە ماڵێك دەڵێت قاوە ناخۆم یا نان ناخۆم تاوەعدی ئیشەکەم نەدەنێ ئێوە نان بخۆن و خوا گەورەیە قسەی لێ دەکەین تائەوان دوای نیوەڕۆ گەڕانەوە بۆهەولێر کۆبونەوەکە زۆربەی دژی یەکگرتن بوون، لە٧/١٨ خەریکی ئیشوکارم بووم و دوای نیوەڕۆ چومە پرسەی شێخ محمد صالح برای شێخ عبدالکریم کربچنە، لە٧/١٩ لەسلێمانی بوم سەرقاڵی ئیشوکاری ڕۆژانەو سەری چەند پرسەیەکی ناوشارم دا، لە٧/٢٠ لەسلێمانی بوم سەردانی لقی سلێمانیم کردوقسەم لەگەڵ کردن وەرۆژانە کۆنە سۆسیالیستەکانمان ئامادە دەکرد کەیەك ڕەئیان هەبێت..لەورۆژانەدا یەکێتی قسەیان خۆش ببوو ڕەئیان باش ببوو ئیشوکاریان بۆ دەکردین و رایان نەدەگرت کەمەسەلەکە گەیشتە ئەوەی کار نەکار بترازێ، وەکو کورد ئەڵێت ئەقڵی دوای ڕوداوی کورد لە٧/٢١ کۆبونەوەیەك و ئاهەنگێك سازکرابوو بەبۆنەی ساڵرۆژی شەهید بونی کاك ڕەوف خەلیفە سەعیدەوە هەموو لایەنەکان بەشدار بوون یەکێتیش زۆر بەقەڵەباڵغی بەشداریان کردو وتاریان زۆر دۆستانە بوو کاك شەوکەت حاجی مشیر قسەی کردو قسەی باش ودۆستانە پاشان گەڕاینەوە بۆسلێمانی، هەرلە ٧/٢١ کاك مەسعود بارزانی بروسکەیەکی کردبوو بۆم تیایە دەڵێ پێم خۆشە سەردانم بکەیت لە٧/٢٢ وادیاربوو کاك سامی و برادەران گەڕابونەوە وچوبونە لای کاك مەسعود کەمن ڕازی نەبوم و کاك مەسعود خۆی قسەم لەگەڵ بکات منیش لەبەر دەعوەتەکە ڕۆیشتم بۆلای کاك مەسعود کەداوای کردبوو وەکو ڕێز بۆ بروسکەکەی، لە٧/٢٢ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتم بۆ دوکان و کۆیەو هەولێرو بۆ صلاح الدین و بۆسەری ڕەش ماڵی خۆیان یابارەگای تایبەتی خۆی بەلام پێم ناخۆشبوو چونکە هەموی ئیحراجی بوو ڕووبەڕوی بوین هێشتا هەرقسەمان نەکردبوو کاك مەسعود زۆر موجامەلەی کردم هەرلەو کاتەدا دکتۆر ئەحمەد

چەلەبی هات و زیاتر لەدووسەعات ئەوان قسەیان کرد من هەرتاقەتم نەبوو قسە بکەم جارجاریش سەیری منیان دەکرد من نەم دەویست برۆمە ناو مەسەلەکانەوەو دورم گرت پاشان دکتۆر ئەحمەد رۆیشت دووسیێ قسەی کرد کاك مەسعود ووتم وەلا کاك مەسعود هەرچی بلێم لەوانەیە خۆم بخەڵەتێنم ئێوە پێتان خۆشە من دۆستان بم یائەو دۆستایەتیەش هەیە نەمێنێ ووتی نا ئینشاالله سەرکەوتوو دەبێت من بۆیە پێم ناخۆش بو بە راستی کاك مسعود ریزی زۆری هەیەلام بە پیاوێکی تێکۆشەرو دڵسۆزو بە ئیحترامی دەزانم حەز ناکەم دڵی لەمن عاجز ببێت هەربۆیە حەزم نەدەکرد لەو مەسەلانەدا قسە نەکەین چونکە دڵی ئەوم لاگرنگ بوو لەوێش تەئکیدی کردەوەو ووتی وەلا ئەگەر لەگەڵ سامی یەکگرتنم بکردایە من قەت لەگەڵی دانەدەنیشتم و بەناوچەی هەولێرم دەوت لەگەڵی دانیشتن بکەن ئێمە یەکگرتن لەخۆشی شەخصی تۆو سۆسیالیست دەکەین نەك سامی..برادەرانی پاسۆك ئەو دووسێ کەسەیان کوری باش بوون بەلام ئەوانیش ئەو قەبارەیان نیەو ئێمە دەمانەوێت گۆرانی بنەرەتی بکەین لەکوردستاندا ئەوەش بەهیمەتی تۆ دەکرێت و تۆیش دەتوانی بیکەیت منیش ئەوەی لەدەستم بێت دەیکەین و دوای یەکگرتن من حزب تەسلیم بەتۆ دەکەم لە سلیمانی و کەرکوك من دەزانم ئینشاالله سەرکەوتوو دەبیت من هیچ قسەیەکم نەکرد ووتم ئەو دۆستایەتیە هەبێت باشترە نەوەك خراپ تربێت مەسەلەی یەکگرتن هێشتائەوەی ئێمە وتومانە..ووتی هەرچی تۆ بلێیت دەبکەین پاشان من گەرامەوە بۆهەولێر بەلام من قسەم نەکردو ئەو ووتی، لە٧/٢٣ هەرلەهەولێر بوم دانیشتبوین کاك قادرجەباری ووتی ئەرە چای نیە..؟ خانووەکە دووقات بوو تاچایچی سەردەکەوت وەختی پێ دەچوو کاك قادر هەر رۆیشتوو هاتەوەو ووتی کاکە چایچیەکەش بەگوێمان ناکات حزبێك وای لێهات چایچی لەگوێت نەکات بۆخۆمانی پێ وەرس بکەین نارازی بوو لەوەی من نەم

دەویست یەکگرتن هەبێت دووسێ جار هەموو گوێ ی لێبوو چاپچیەکەش بەگوێمان ناکات بابرۆین لەکۆڵی ئەو وەزعە ببینەوە لەوێ کەس بەکەس نیە و نەجاتمان لەپروپیرەژن وکەسوکاری شەهید دەبێت چەندجارێك ئەو ماودیە دەیانوت ئاوی سارد یاچایەك زۆر دەچوە بەری قاپی ژورەکەی مەکتەبی سیاسی و دەگەرایەوە دەیوت کەس لەگوێمان ناکات رۆژێك حیمایەکانی خۆشمان دەمان کوژێت، لە٧/٢٤ هەرلەهەولێر بوین بەلاَم زۆریان عەزیەت دام نەئیسراحەت و نەدەیان هێشت دەقیقەیەك پشوو بدەم، لەشەوی ٢٥-١٩٩٣/٧/٢٦ لەماڵی خاڵەسەید کاکە من و خاڵەسەید کاکەو کاك قادر جەباری و کاك سەعد کۆبوینەوە کەچی بکەین وتیان دوا بریار چی بکەین باشە وتم وەلاَ ئەوەی باسی دەکەن چونە ناوپارتی من ناتوانم چونە ناوپارتی قبولێ بکەم وەئەگەر ناوی بگۆرن زۆرباشە..کاك سەعد دەیوت یەکگرتن دەبێت لەئاخر شت برادەران دەیانوت هەرباشە پێم ووتن پارتی دیموکراتی یەکگرتوی کوردستان یەکگرتن ئەوان ئامادەن ئیزافەی بکەن ئەوانیش زۆر هاتن بەبالاَی یەکگرتن و قسەی پارتی و لەوبابەتەو ئەوەش هەروا مایەوە چونکە هەمویان بریاریان دابووبرۆنە ناو پارتیەوە بەیانێکی هاوبەشیان نوسیبوو (١٠) جار پێم گۆرین هەردەچون تەبعیان دەکردەوو دەهاتنەوە بەلاَم ئەوەی من دەموت نەیان دەنوسی زۆر مێشکیان هیلاك کردم ووتیان ئوتێل گیراوەو هەمووشت ئامادە کراوە کەلەرۆژی ١٩٩٣/٧/٢٦ ئیعلان بکرێت لەصلاح الدین و خەڵك دەعوەت دەکرێت، لەرۆژی ٧/٢٦ من نەرۆیشتم بۆ ئیعلانەکەو گەرامەوە بۆسلێمانی ئەوان هەموو رۆیشتن ولەوێ کردیان بەلاَم کەمن لەوێ نەبووم لەرادیۆ و تەلەفزیۆن ئیعلانیان نەکرد وتیان ئەگەر ئەوی تێدا نەبێت ئەو بەیانە دەگۆرن چونکە سۆسیالیست وئێمەی لەگەڵ نەبوایەین پارتی چاوی بە رێکەوتنەکەدا دەخشانەوە هەندێك شتم تێکردبوو وەهەر کەس نەیزانی جگە لەخۆیان ، لە٧/٢٧

هەرلەسلێمانی بووم ئەوەندەیان خەڵك هێنایە سەرم قورئان و خێزانی شەهیدان و ئەوەندەیان ماندوکردم بێزاربوم بەتەواوی تارۆژ بووەوە بەدیارمەوە دانیشتن کاك محی الدین رەحیم و دەرۆیش ئاغا گریان بۆ بریار نادەیت سەدان دەست ماچ کردن پارانەوە زۆریان عەزیەت دام کاك شەوکەت حاجی مشیر سەری لێدابن بە ناوی مام جلالەوە بەلام شتێکی وای پێ نەبوو کەهەنگاوێکی وا من پشتی پێ ببەستم زۆر حەساس بوو وەزعەکە، لە٧/٢٨ هەرزۆر ماندویان کردم هێشتا ئیعلانی صلاح الدین نەکرابوو بەحساب بەدیاری منەوە وەستابون هاتن بۆمەقەری چوارباخ دوای قسەیەکی زۆر شەرت وشوروت و تحەفوزی من لەسەر بەیان وخاڵەکان لەگەڵیان بەرێ کەوتم باپێ لە لقی سلێمانی سۆسیالیستەوە لەچوارباخە وە بۆلقی ٤ی پارتی دروشمێکیان دەوتەوە لام قورس بو بەناوبازارا زەردوشینی ئاسمانی کاکە حەمەوبارزانی لەفلکەی کاوەی ئاسنگەر لەوێوە بەپێ بەشەقامەکەدا بۆبارەگای لقی (٤)لەتوی مەلیك بوو لەوێ ئیعلان بکرێت پێش دەست پێکردنی بەیانەکە وتم من تحەفوزم هەیە لەسەر خاڵەکان بۆیە ئەمە بەیانی کۆتایی نیە لەدوای نیرەرۆی رۆژی ٧/٢٨ ئەو بەیانە هاوبەشە بخوێندرێتەوە هەرلەوێوە دەستیان پێکرد بەوتنەوەی شیعارات لەسەر یەکگرتن و لەسەرەز یەکەم جاربوو گوێم لێ بێت دەیانوت زەردو شینی ئاسمانی کاکە حمەو بارزانی.. ناوی من لەپێش ناوی بارزانیەوە بووئەوەی توانیان کردیان بۆئێمە لەسەرانسەری کوردستان ئەو شیعارەو لەتەفزیۆن ورادیۆبەهەمو شێوەیەك دەیان خوێندەوەوبلاویان دەکردەوە من خۆم هەموو ئەو شیعاراتانەم پێ شەرم بوو بەبالا هەڵدان زۆر شتێکی ناخۆشبوو من زۆر ناموتاح بووم چوینە لقی (٤) پێش ئەوەی بەیانەکە بخوێنمەوە ووتم تەحەفوزم هەیە لەسەر ناوی حزب ورەنگی حزب و کۆمەڵێك لەبریارەکان ئەو بەیانە هەموو شتێك کۆتایی پێ نەهاتووە ئەوە زۆری ماوە ئەوە ئەو فایمانە ئێستاش

هەرماوە بوویەچەپڵەو هەرایەکی زۆر بەلآم پارتی بەوهەمو ڕێزەوە منیان قەرزارکرد قەت ئەو ڕێزو ئیحترامەی جەنابی کاك مسعودبارزانی وپارتیم لەبیرناچێ ئەوە لەوە ناگۆرێت دوای ئەوە شەریان کردم لە۷/۲۹ کاك مەسعودبارزانی نامەیەکی بۆ نوسیبوم و دەڵێت دڵی هەموو کوردت گەشاندەوەو هەموو کورد ئەو هەنگاوەی تۆ بەهەنگاوێکی چارەنوس سازبۆ کورد دەزانێ تۆ مێژوی بزوتنەوەی کوردت گۆری..نامەکە زۆر شتی تێدا بوو، لەرۆژانی ۲۹و۳۰و۱۹۹۳/۷/۳۱ هەرلەسلێمانی بوم و زۆر بێزار ببوم هەرئەوەبوو مرۆڤ زۆرجار توشی شتی وا دەبێت ناچاریشە چی بکات لەکۆنەو نوێ وجەماوەرێکی یەکجار زۆر روی تێدەکردین و ئەنواعی خەڵکی سەر بەپارتی رویان تێ دەکردین وەکو تحسین شاوەیس و زۆری کەش، لەرۆژانی ۱و۲و۱۹۹۳/۸/۳ هەرلەسلێمانی بوین رێگای هاتوچۆ نەبوو وتیان وێنەی شەهید مولازم تاهیروشەهید سالارجاف و شەهید عوسمان کاکە رەش پێویستە پەردەی لەسەر لابەم لەدەربەندیخان بەیانی بوو ناوچەی دەربەندیخان هیچیان نەنوسیبوو هەرسۆسیالیست من چووم پەردەم لەسەر لاداو قسەم کرد لەسەر شەهیدەکان و باسی کەسی کەم نەکرد بەلآم پێشوازیەکی گەرم کاك مەسعود ساڵەیی وزۆر زۆر رێزی لێ گرتین لەخۆشی دا خۆی لەسەر موکەبەرەکە کەمەسئول لق بوو وەسفی دەکرد پارتی ئەوەندەیان ئێمە لا مەبەست بوو لەگۆرانی و قسە کردن دا شتی زۆریان تێکەڵ دەکرد من گوێم لێبوو لەوکاتە تحسین شاوەیس هات لەوێ بوو دەیانوت هەڵۆکەی گەرمیان لەوەوە نیازی پارتی زیاتر ئاشکرا دەبوو لقی (۳)یان دەیانوت تائێستا نەمان وێراوە لەترسی یەکێتی هیچ بڵێن واتۆ ئەو وەزعەت دروست کردووەو نەجاتمان بدە لەو وەزعە ناخۆشە ئەوەی تحسین جاشێکی پیس وخراپ بووە جگە لەکوشتنی پێشمەرگە شتێکی کەی نەکردووە پێ ی بڵێت هەڵۆی گەرمیان ئەوە دژی یەکێتی و هەموولایەك ئەو قسەیە... هەڵۆی گەرمیان یەکێتی

بەمامەریشە یاپێشمەرگەی خۆیان کاك نەوشیروان لەشەری پشت ئاشان بەکاری هێنا بازەکانی گەرمیان و هەڵۆکانی کوێستان ئەوە زۆرم پێ ناخۆش بورئازاری دڵی ئەدام کاك عەلی بچکۆل هات ووتی بەتحسین شاوەیس دڵێن هەاڵوی یابازی گەرمیان ووتم ئێوە خۆتان پێتان خۆشە لەگەڵ تحسین شاوەیس لەیەك سەنگەردابن پاشان شەو لەدەربەندیخان نانمان خواردلە ماڵی مامۆستا غەریب و گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٥/٨ چومە نصرو باریکەو هەڵەبجەی تازەو زەرایەن و سەید صادق و هەڵەبجەی شەهید چوینە چەند پرسەیەك و گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٦/٨ لەماڵەوە لەسلێمانی پێشوازیم لەخەڵکێکی زۆرکرد زۆرماندوبوم و مێشکم زۆرهیلاك بوو ئەو بریارو قسەو قسەکردنە هەموی لەشەری رەبایە پێ ناخۆشتر بوو شەرم پێ خۆشبوو لەو قسەو چاوپێکەتنی ئەو جۆرە خەڵکانەی ئەدەهاتنە لام و چاریش نەبوو دەرکەوت کەئێمە چەند تەئسیرمان لەسەر ساحەی کوردستان هەیە زۆرکەس دەبوت تائێستا نەم وێراوە بڵێم پارتیم و لەلیستی پارتیش نەم وێراوە ناوی نهێنی خۆشم بنوسم مەگەر لەمەودوا بەبۆنەی تۆوە بڵێم پارتیم سەدانی وادەهات و قسەیان دەکرد لای من یەکێتیش وەکو ئەوەی ئاسابون وایان لێ هاتبوو گەورە ترین خەتەر لەسەر یەکێتی بوو...یەکێتی دەبوو بەرشالاوی شەرێك بکەوێت چونکە ئەو قسەو بۆچونانە کەهێشتا ئێمە یەکمان نەگرتبوو ئەوقسانەیان لامان دەکرد چی لەگەڵ یەکێتی بکەین زۆری ئەو وەزعەش هەڵەی یەکێتی خۆی بوو لەسەر روداوەکان تابگاتە ئەو رادەیەی کەهەمووی بەرەو پارتی بروات، لە٦/٨ هەرچی موستەشار هەبوون لەسنوری پارێزگای سلێمانی و کەرکوك هەموویان لەماڵی کاك شێخ محمد باساکی کۆببونەوە و داوایان کرد کەمنیش سەریان لێ بدەم کەچوم زۆرم لاسەیر بوو ئەو خەڵکە لەوێیەوقسەکرا لەسەرزۆرشت لەمەبەستیان تێ نەدەگەیشتم پێ دەچوو ئەوانە هەموویان ئامادەن بەهەموو

شێوەیەك لەگەڵ مندا بن وئەوان سیقەیان بەپارتی نیەو پارتی، نانوانێ لای یەکێتی دیفاعیان لێ بکات بەلاٌم من دیفاعیان لێ بکەم وئەوانیش بەخوێنی خۆیان ئامادەن بۆهەموو شتێك زیاتر شەری یەکێتی و نەهێشتنی یەکێتی لەسنوری سلێمانی وکەرکوك گەورەترین سەرکەوتنە بۆکورد تحسین وچەندکەسێکان وتیان ئێمە واماندەزانی پارتی بەرگری لەئێمە ئەکات کەچی ئێمە بەرگری لە پارتی ئەکەین وئەیپارێزین، لە ٨/٧ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتم بۆ دوکان و کۆیەو هەولێر بۆمەکتەبی سیاسی کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی هەبوو کەوا کۆنگرە نزیك بوەتەوەو (٦)رۆژی ماوەو ئێمە چی بکەین منیش بەتەمای دوێن هەوڵ سەری ئێران بدەم وئەوان یارمەتیم بدەن ئەوەئێمە بریارێکی کە ئەدەین لەبارەی یەکگرتنەکەوە.. کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی وەختی زۆر قسەکراوە لەگەڵ پارتی کە(٧٥٠) کەس بەشدار دەبێت ماوە لەسەر ئەوەی ئەو بەشداریونە کێ وکێ دەبن ئەوە خۆمان بریاری لێ دەدەین و دووڕۆژیش بمێنێ گرنگ نیە و دەیکەین ئاگاداریان دەکەین من بروسکەیەکم بۆکرماشان کردبوو بۆ مەوعدێك چەند سەعاتێك و وەلاٌمی بەپەلەش، و دوا وەلاٌمم دەوێت هاوکاری یانە ئەوانیش دەیانوت بۆتەهران منیش نەمدەویست تەهران هەم دوا دەخراو هەم دەبووە دەنگوباس گوایە ئێران ریگا نادات ەن داوام لەئێران کردبو نەك ئێران داواله من بکات بەکگرتن بکەم خۆ ئەوەی بەیانەکەش هەربلاٌو بوەوە گوایە ئێران نایەلٌێت من برۆمە ناویەکگرتنەوە ووتیان دەبێت بێیتە کرماشان ولەوێ قسە بکەیت و بگەرێیتەوە نەوکاتەدا، لە٨/٨ بەبرادەرانم ووت لەسلێمانی یادی حزب بکەنەوە یادی حزبیان کردبووەوە جگە لەوتاری یەکگرتن وتاری سۆسیالیستیان خوێندەوە لەسلێمانی ئەوەش وەلاٌم دانەوەیەك بوو لەوکاتەدا ئەوانەی دەچونەناو پارتیەوە.. من لەهەولێرەوە بەرێ کەوتم بۆ کۆبەو دوکان و سلێمانی و عەربەت و سەیدصادق و خورماڵ ئەو رۆژەش

شتێك روی دابوو لەخورماڵ لەنێوان بزوتنەوەی ئیسلامی و پارتی و یەكێتی پاشان ئێمە چوینە بیارەو تەوێڵە سەیارەكان هەرلەرێكخراوی تەوێڵە مانەوە ئێمەش بۆ شوشمیێ و نەوسود وئەغمای بەنی ئەحمەدوئاغای چەرمی خزمەتی كردین كاك خلیل هاتبون بۆپایەو بۆكرماشان خۆیان هاتبون بۆسەر سنور بۆ پێشوازییمان بۆبارەگای قەرارگا وپاشان بۆ تەشریفات تاقوسان ولەوێ ئاغای جەعفەری و هەموو مەسئولینی قەرارگام دی و بەدورودرێژی قسەمان كرد ئەوان دەیانوت مانەوەتان باشترە وەكویەككگرتن منیش ووتم مانەوە باشترە بەلاَم ئێوە یارمەتیمان دەدەن لەروی سیاسی و راگەیاندن ومالی و زۆرشتی تر ئەوە منیش لەسەر بریاری ئێوە دەستی پێ دەكەم ئەگەرنا ئەوە بریارێكی كە دەدەین ئەوان وتیان ئێمە یارمەتی و هاوكاری تۆ دەكەین لەپارتی و لەیەكێتی و لەیەككگرتن و لەسۆسیالیست و بیت و ئەوەی لەتواناماندا هەبێت دەیكەین ووتم ئێمە (٧) رۆژمان ماوە بۆكۆنگرە قسەی ئێوە و فەردا‌و باسی فەردا قبول ناكات ئێستا دەڵێن مانگانە سالآنە فلاَن شت دەكەین ئەوە منیش پشتی پێ دەبەستم بەلاَم بەو قسانە نابەستم ئەوان سوپا رەئی باشبوو حەزیان نەدەكرد بەلاَم دەترسان ئەوان قسەیەك بكەن ودوای لەسەریان ببێتە ماڵ ئیتلاَعات بەكەمی چەند دەقیقەیەك لەگەڵ پەیوەندییەكان زانیبویان كەی من دەگەرێمەوە (١٠) دەقیقە ئیتلاَعاتمان بینی ئەوان دەیانوت بیكەن باشترە و هەوڵیان دەدا یەككگرتن بكرێت و لەوێش من بەپەلەو ئەوان لەسەرخۆ منیش گەرامەوەو نەگەیشتینە نەتیجەیەك ئیتلاَعات بەهەموو هێزی هەوڵی ئەدا من لەگەڵ پارتی رێكەوم و بگەینە نەتیجە سوپاش دوو دڵ بوو واتە ئێران رای وابوو بكرێ لەدەرەوە دەیانوت ئێران نایەڵێ بگەنە رێكەوتن یا یەككگرتن منیش نەمدەویست شتێك بكەین نەكرێ و دوای پارتی وابزانێ بۆدژی ئەوانە من باوەرم بەیەككگرتنەكە نەبوو لەسەرەوە بۆ خوارەوە هەتا ناوی پارتیش

بگورایه هەرپێم باش نەبوو من پێم باشبوو دۆستی پارتی بین و هاوکاریان بکەین چونکە پارتی لەیەکێتی هێمن ترو لەسەرقسەی خۆشیان نەگۆر تربون واتە پارتی لەدوای قسەو وەعدی خۆیان زیاتر لەیەکێتی دەچون و بەرگری لە دۆستەکانی خۆیان ئەکەن یەکێتی نەدوستی هەمیشەییەو نە دوژمنی هەمیشەییە واتە هیچیان ناباتە سەر هەرئەوەشە هەمیشە دۆستەکانی خۆی لە رێگادا بەجێ دە هێڵێت دۆستەکانیشی هەمیشە دەستیان لە سەر دڵیانە لەکوێ دا یەکێتی بەجێیان دەهێڵێت من ئەو قسەیەم بە کاك کۆسرەتم وت ... وتی زۆر راستە پارتی لە سەر دۆستەکانی خۆی شەردەکات وتم ئەوە ئەزانن بۆ لەگەڵ ئێمە وان سەیری کردم وتی بڵێم چی واتا ئەوراستیە خۆشیان ئە زانن بەلاَم شەخسی کاك کۆسرەت چەند جارێك هەڵوێستی باشی لەسەر ئێمە هەبوە لە بیریشی ناکەین لە بواری تردا باسی ئەکەین کە نازانم یەکێتی چۆن ماندو نەدەبو ئەو هەموو کێشەو ئینشقاقانەی لە ناو دۆستەکانی یا حزبەکانی دۆستی خۆیان دروست ئەکردبۆچەند کەسێك یاشتێکی کاتی دۆستەکانی خۆیان دەرەنجاند یەکێتی ئەگەر هەر کەسیان دەست نەکەوتایە شەری بکەن یاکێشەی بۆ دروست بکەن یا ئینشقاقی پێ بکەن لە ناو خۆیان دەست پێ ئەکەن ودەکەونە گیانی یەکترەوە تا کەسێکی کەیان دەست دەکەوێت کێشەی بۆ دروست بکەن بەخۆیانەوە مەشغوڵ دەبن لەسەر ئەو ئەساسە دامەزراوە بۆیە زۆر بە ئاسانی دۆستایەتی یەکێتیت دەست ئەکەویت بەلاَم نابێت پشت بەو دۆستایەتیە ببەستیت چونکە زۆر بەئاسانیش یەکێتی دۆستایەتیەکەیان دەگۆرن بۆ دوژمنایەتی ئەوەش خزمەتی بە یەکێتی نەکردوە نمونە زۆرە لە سەر ئەو بۆ چونەی من هەر لە حزبی سۆسیالیست وحزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران وحزبی زحمەتکێشان و .pkk وحزبی شیوعی وتەنانەت کەسەکانی ناو یەکێتی خۆشیان لە سەرەتاوە هەمویان نەك هەر دۆستی یەکێتی بون بەڵکو

هاوسەنگەریشان بون بۆ یەکێتی بەلاّم ئێستا زۆر لە دۆستەکانیان لە خۆیان دور خستوەتەوە یازۆرکەمیان ماون ئەوانیش هەر چەند ئێستا لە سەنگەری یەکێتی ولە شەریش بەشداری دەکەن بەلاّم هەمیشە چاوەروانی ئەوەن کێشەیان بۆ دروست بکەن ئێمە خۆمان و من شەخسی کە دۆستی یەکێتی ومام جلالم ئەوە رەئیمە یاخوا هەڵەبم ووانە بێت یاهەر من رام وابێت لە سەریەکێتی بەلاّم تا یەکێتی خاوەنی ئەو سیاسەتە بێت ودۆست و ناحەزو دوژمنی خۆی لە یەك جیانەکاتەوە سیاسەتێکی جێگیری نەبێت ئیستراتیژی خۆی دیاری نەکات هەمیشە ئیستراتیژی لە خزمەتی تاکێك بێت دۆست و دوژمنی خۆی بۆ جیا ناکرێتەوە رۆژبەرۆژ دۆستەکانی لێ دوردەکەوێتەوە یاسقەی کەم دەبێتەوە لایان ئەگەر پارتی لەو سیاسەتە هەڵەیەی ئێستا گۆران بکەن بەرامبەر جەماوەر ولایەنە سیاسیەکان لە داهاتودا زۆری حزبەکان لە پارتی نزیك دەبنەوە هەر چەند، ئێمە ئێستا لە شەردابن لەگەڵ پارتی دا ئەوەش رای خۆمە .

لە٩/٨/١٩٩٣ لەکرماشانەوە گەرامەوە بۆ پاوەو نەوسودو تەوێلە سەیارەکان هەرلەوێ لەسەر سنوربرون پاشان بەرێ کەوتین بۆبیارەوخورماڵ و سەیدصادق و بۆسلێمانی ئەو هەوڵەش کەدوا هەوڵ بوو سەرکەوتوو نەبوین لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران نەگیشتینە ئەنجام، لە١٠/٨بەبۆنەی یەکگرتنەوە لەچەمچەماڵ ئاهەنگێکیان رێك خستبوو داوایان کرد منیش برۆم و سەریان لێ بدەم ئێمەش لەدوای نیوەرۆ چوینە چەمچەماڵ خەڵێکی زۆر کۆببونەوەدو لەوێ قسەم کرد بۆجەماوەرکە پاشان سەردانی چەند ماڵە شەهیدێکی کۆنی سۆسیالیستم کرد لەچەمچەماڵ ماڵی شەهید شوانە وشەهید عبداللەوچەند شەهیدی کەش و گەرامەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ١١و٨/١٢ لەسلێمانی بوم حاڵێکی خراپم هەبوو بەدەستی خەڵکی پارتی وخەڵکی خۆمان ئەوانەی یەکگرتن داوایان دەکرد بۆ یەکگرتن

شەویش تابەیانی لامان مانەوەو زۆر عەزیەتیان داین و زۆریان بێزار کردین، لە٨/١٣
چومە دوکان وکۆیەو بۆهەولێر، لە٨/١٤ لەهەولێر بوم کاك نێچرڤان بارزانی چەند
جارێك داوای کرد و کاك محی الدین رەحیم وکاك دەرۆیش ئاغای نارد نیوەرۆی ئەو
رۆژە دەعوەت بین لای بەرێزیان ئێمەش چوین بۆمالّی کاك نێچرڤان بارزانی
لەسەری رەش بوین کاك مەسعودبارزانی هات وئەویش لەوێ بوو قسەمان زۆرکرد
لەسەر مەسەلەی یەکگرتن وناوی حزب و رەنگی حزب بەقسە گەیشتینە نەتیجەیەك
بەلاّم هێشتا هەرزۆر شت مابوو نەبرابووەوە..بەوانم ووت هێشتا کۆنگرەمان لەبەر
دەستەو لەوێ بریار دەدەین ئێستا ناتوانم بریار بدەم دووسەعات زیاتر هەولّیاندا
بەلاّم من هەرلەسەر قسەی خۆم بووم جگە لەوەش دوای کاك دەرۆیش ئاغا وکاك
محی الدین رەحیم هاتن و ئەوانیش لەبەرچاوی کاك مەسعودو کاك نێچیرڤان
دەیانویست من ئیحراج بکەن بۆئەوەی منیش قسەیەك بکەم و بێتە مالّ لەسەرم
و دوای نیوەرۆ هەلّسام و چومەوە بارەگای مەکتەبی سیاسی لەهەولێر لەوێ زۆر
قسەم بەو سەرکردە نابوتانەی خۆمان ووت سۆسیالیستەکان بەراستی خەلّکی
گەندەلّ بون خەلّکی بۆئەوانە خۆی بەکوشت داوە ئەوانە کەهیچ نین ئەوەی ئەو
رۆژە نوسیومە لە یاداشتەکانمدا چۆن بووە هەرواش نوسیومە ئەوان زیاتر منیان
توشی ئەو کۆبونەوانە دەکرد لەوکاتەدا، لە٥/١٥ کۆنگرەیەکی بێ سەروبەر گیرابوو
ئەوەی بریار بدات بروات ناوپارتی و هەولّیان ئەدا کەس نەرواتە ناو کۆنگرەکەوە
لەهۆلّی جەماوەری لەهەولێر کراو ئەو رۆژە شتێکیان نوسی و راپۆرتێ بۆکۆنگرە
دەیانویست هەرئەوسن بەخەلّکەکە هەلّبرن و شەرعیەت بەخۆیان بدەن بۆناو
کۆنگرەی پارتی من قسەم کردو ووتم ئەو قسانەی ئێوە کردتان هەمەوی دوربوو
لەراستی و ئەوراپۆرتەش خوێندتانەوە زیاتر لەپەخشان دەچوو لەوەی راپۆرتی
حزبێك بێت وەمن ئەو شتانەی ئێوە هەموی بەترسنوك و هەلّهاتن لەراستیەکان

دەزانم کێتان پێتان ناکرێت برۆن بۆناوپارتی زانیان من لێیان توندم ترسان هەندێك پێشمەرگە بە(بی .کەی. سی)و چەکەوە هاتنە هۆڵەکەوەو حەرەسێکی کاك سامی لەبەر دەرگای هۆڵەکە چەکەکەیان لێ سەندبوو چاوەڕێی ئەوەبوون بڵێم بیان گرن خاڵە سەید کاکە چەکەکەی لەپێشمەرگەکانی من بۆحیمایەکەی کاك سامی وەرگرتەوە من ئاگام لەوهەرایە نەببوو خاڵە سەید پێی وتم من لەگەڵ زەحمەت و زۆر نەبوم..پاشان من ووتم ئێوە حەقی بریارتان نیە و ئێوە ناتوانن چارەنوسی حزب دەست نیشان بکەن مامۆستا سەلام و زۆری کەش قسەیان کرد ڕۆژی کاك سامی وکاك سەعد و برادەرانی، کە ..کاك سامی بۆ خاو کردنەوەی بارە گرژەکەی ناو کۆنگرە قسەی کرد هەرلەوکاتەشدا چەند جارێك کاك کۆسرەت ناردی چیتان پێویستە ئەسایش بۆتان بنیرین کێشتان دەوێت بیگرین بە کاك بڕو چەند کەسی کەدا منیش سوپاسم کرد کاك کۆسرەت مەبەستی کاك سامی بو وتم پێویستمان نیە لەناوکۆنگرە دابوین کاك سامی وتی کاك فلان هەر برا گەورەیەو هەرچی ئەو بریاری نەدات نایکەین مەبەستی من بوو کاك سامی وتی ئێوە چۆن دەڵێن وادەکەین باکۆبونەوەکەو کۆنگرە بریاری کۆتایی بۆ سبەینێ بمێنێتەوە و سبەینێ بریاری لێ دەدەین ئەو شەوەش مایناوە کاك سامی خۆی دەربار کرد بەیانیەکەی سەرکردایەتی ووتبویان نایەنەوە دوێنێ لەمردن رزگار بوین ئیتر نایەینەوە بۆکۆنگرە وئێمە دەچینە ناوپارتی بەبێ شەرت تاچەند رۆژێك پێش ئەوە کاك مولازم شوان و کاك سامی نارێك بون لەسەر ئەوەی ناوی کاك شوانیان هەمیشە وەکو مقەستەکەی بەشیرمشیر بوو لەرۆژنامەو تەلەفزیۆن دەیان بری و نەیاز ...هێشت ئەویش جنێوی بەکاك عبدالله ئاگرین دەداو جنێوی بەکاك سامی و بەگێری هێنابون بەلام لەسەر یەکگرتن لەگەڵ پارتی ئاشتیان بوەوەورێك بوون لەسەری، شەوی ١٥- ٨/١٦ هەمویان مەکتەبی سیاسی سۆسیالیستیان چۆڵ کردمەتا پێشمەرگەی لای

كاك سامی شەو ڕۆیشتنەوە ماڵەکەی کاك سامی بەیانی زوو، لە٨/١٦ کاك جمیل گەیشتە هەولێر لەدەرەوە گەڕابوەوە لەسوئیدبوو وە برادەران کاك نوری حمە عەلی وشێخ توفیق و ابراهیم قاجری ڕێگایان گرتبوو ئەگەر قسەی وات پێ یە کەکۆنگرە بگیرێ وبرۆینە ناوپارتی ئەوە باشە ئەگەرنا ئەوە ڕێگات نادەین برۆیتەلای ئەویش وتبوی وەلا پەیامی دکتۆر محمودم پێ یە بۆ محمدحاجی محمود و بۆمەسەلەی کۆنگرە ئەم شەولە سوئیدوتورکیاوە هاتوم دکتۆرمحمود پەیامی داومەتێ بۆ محمدی حاجی محمود یەککگرتن بکات وبرواتە ناوکۆنگرە هەمومان پشتیوانی لێ ئەکەین دووحەفتەبوو بروسکەی نێوان ئێمەو کاك دکتۆرمحمود لەڕێگای کاك خلیل سەعیدەوە هەر بەردەوام بوو کاك خلیل دەیوت کاك دکتۆر محمود وتویەتی یککگرتن نەکات ئێمەش دەگەڕێینەوەو چارەسەری کێشەکان دەکەین هەر بمێنێتەوە سامی وکێ دەروات بابروات شتێکی رویان پێ نەداین، لە٧/١٣ لەگەڵ کاك عمر بۆتانی لەصلاح الدین بەیەکەوە تەلەفونمان بۆکرد ٧هەزاردینارزیاتر بۆیەك دەقیقە لە نێوان ٧بۆ١٤دۆلاربو ووتی زۆر باشەو بیکەن و شتێکی چاکتان کردوە لەتەلەفۆنی کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی بەپارە نەك تەلەفۆنی پارتی بێت وەهەر هەمان رۆژ لای مام جەلالەوە لەهەولێر لەگەڵ کاك عدنان موفتی قسەم لەگەڵ کرد هەر ووتی نەکرێ باشەو بیرێکی لێ بکەنەوە و وای ووت من تێ نەدەگەیشتم لەمەبەستی چیەو بۆ وادەڵێت..کاك جەمیل ی ناردبوەوە بەپەلە برۆن پچر پچر نەبن و پێکەوە برۆنە کۆنگرەو شتێکی باشەر منیش دێمەوە بەشداردەبم و قسەشم لەگەڵ کاك مەسعود کردووەو تەلەفۆنی بۆ کردوم لەو رووەوە..کاك جەمیل بەیانی زووهات پێش کۆنگرەی پارتی وئەوەی خۆشمان هێشتاهەرمابوو دەستی پێ بکات کاك جمیل گەیشت من ووتم کاك جەمیل لەگەڵ کاك برزو برۆن لەنزیکەوە قسە بکەن بەفاکس و دەست خەتی کاك دکتۆر خۆی

رۆیشتن و بروسکەیەك یافاکسێکی کاك دکتۆریان هێنا دەڵێت زۆرم پێ باشەو پیرۆزبایتان لێ دەکەم و بەشداربن ئێمە ئاخر بریار لەسەر رۆشنایی قسەی کاك دکتۆر و کاك جەمیل لای کاك دکتۆرەوە هاتبووەوە من چومە ناو کۆنگرەو لەسەر فاکس و راوبۆچونی ئەوان بووە کاك جەمیل ئەو راستیەی چەند جارێك باس کردووە..هەرلەو رۆژانەدا کاك سلێمان قصاب سەری لێدام لای کردەوە کاك عوسمان قادر منەوەر دەیوت باوەر بەقسەی مەکە بەئیشارەت لەدواوە کاك سلێمان پێ ی زانی لەدرایەوە قسەش دەکات، لە١٥/٨ کەس نەهاتەوە بۆ کۆنگرە لەوانەی سەرکردایەتی ناردم بەدوای خاڵە سەید کاکە و هەندێکیان ووتم وەرن وتیان وەعد نەدەیت کەس قسە نەکات نایەین ووتم وەرن ئێرە قسە دەکەین گەیشتنی کاك جەمیل محمدقادر لەسوئیدو هێنانی پەیام و دواجار فاکسی کاك دکتۆر محمود ئەوانە وای کرد کەمنیش برۆمە کۆنگرە کەزۆربەی نابەدڵی و لەژێر زەختی برادەرەکانی خۆمدا بەڵام بۆئەوەی تاکەی لەپارتی بم بەڵکو بەدیقەتێك یامجالێك چونکە هیچ مەجالیان بۆم نەهێشتبوە لەوکاتەدا تەنها یەکێتی هەبوو ئەویش سیقەم نەبوو کاك کۆسرەت جوابی ناردبوو ئێمە پشتیوانی لێ دەکەین لەکۆنگرەکە سامی بگرێت بەلام شتێکی کەی بەدواوە نەبوو نەتیجە بۆ کوێ دەروات وتیان ئامادەین پشتیوانی بکەین هەرلەورۆژانەدا هەندێ پارەشیان بۆ سەرف کردین یەکێتی وشەخسی کاك کوسرەت (٥٠٠)هەزاربو کاك رێکارو نەوزادی شێخ ئەحمەدم نارد لەبانك هێنایان لەبانق بەلام شتی کە ئەساسی نەبوو کەلەسەری قسە یارێکەرین ئێمەش دڵنیا بین سیقەم نەبوو کەیەکێتی پشتیوانی دەکەن هەربەبێ بریاری کۆنگرەش تەواو نەبوو کۆنگرەی یەکگرتن کەبریار بدات و چوین بۆکۆنگرە بەلام من هەروەکو ئەو خەڵکە رۆشتمە کۆنگرە نەدەعوەت کرابون بۆسەرکۆنگرە کەچومە کۆنگرە خۆم زۆر بەرەزەیل دەزانی چونکە بریارم نەدابو

فاكسەكەی كاك دكتۆرمحمود دامان بەكاك مسعودبارزانی لەرادیووتەلەفزیونی پارتیه وه له شەوی ١٦-١٩٩٣/٨/١٧بلاوكرایەوه یەكێتی كەوتنە بە دواداچون كاك كۆسرەت داوای لەكاك عەدنان موفتی كردبو كاك عەدنانیش ناردبوی بەدوای كاك برزۆ وكاك جەمیل دا وتبوی بۆ واتان كردوه كاك كۆسرەت قسەی لەگەڵ دكتۆر كردوەو دەڵێ وام نەوتوەو جەمیل خۆی سەر بەپارتیەو ئەوقسەیەی دروست كردوه منیش گومانم بە دی كرد كاك برزۆم لەگەڵ كاك جەمیل نارد لە مصیف صلاح الدین فاكسی دەست نەەتی كاك دمحمودیان هێنا بوو بۆمن برۆنە ناو كونگرە كاك عەدنان وئەوبرادەرانە بە كاك دكتۆریان وتبو محمدی حاجی محمودوعمر بۆتانی تەلەفونیان بۆكردوەیت تۆیش وتوتە پێم باشەو پیرۆزەو بیكەن كاك دكتۆرمحمود وتبوی حەمە لە تەلەفونی مسعودوە لە صلاح الدینەوە قسەم لەگەڵ ئەكات هەردەبێت ناچارم بڵێم پیرۆزەو بیكەن ئێمە لەتەفۆنمان لە مەكتەبی (I-N-C) وە واتە لە لەتەفۆنی دكتۆرئەحمەدچەلەبیەوە قسەمان كردوە نەهی پارتی بوەو نەهی كاك مسعود بارزانی لە ئەو كۆنگرەیە هەرچەندە یەكەم جەلسەبوو بۆهەموو كەسێك هەبوو كەدەعوەت كرابوو لەوێ بێت، سەرلەبەیانی رۆژی ٨/١٦ كەدەكاتە ساڵرۆژی دامەزراندنی پارتی چوینە كۆنگرەی بەناوی كونگرەی (١١)ی یەكگرتن لەهۆڵی زەردی پارتی لەشاری هەولێر حەشاماتێكی زۆری بانگ كرابوو نمایشێكی جەماوەری بوو زۆرتر لەوەی كۆنگرەی حزبێك بێت من وەكو ئەی خەڵكە دانیشتبوم یەكێ هات و ووتی ئێرە چۆڵ بكەن بۆ میوانەكان وتمان بەڵێ باشە هەموو لایەك هات و كاك سامی لەخۆیەوە بەناوی یەكگرتن لەدوای كاك مەسعودەوە قسەی كرد بێ ئەوەی كەس بەو بڵێت قسەكانی هیچی بەسەر هیچەوە نەبوو هەندێك هەرەشەی بۆسەر یەكێتی تێدابوو ئەگەر لێ ی تێگەیشتبون كابرای ئەمریكایی لە ماڵی كاك سامی زیاتر لەدووسەعات كۆبونەوەمان هەبولەسەر وەزعی ناوچەكە

وعێراق وكوردستان یەك بریاری سیاسی هەبێ لەكوردستاندا قسەی كرد داوای یەك بریاری سیاسی لە لەكوردستاندا كردبو لەكەگۆنگرە قسەی كرد هەمان قسەی دوپات كردەوە و هیوای خواست پارتی و ئەو یەككگرتنە ببێتە خاوەنی ئەو بریارە مام جەلال وەمەكتەبی سیاسی یەكێتی هاتن و لەوێ بون مام جەلال دیاربوو زۆر مورتاح نەبوو لەونمایشە یاهەرچی كەبوو مام جەلال قسەی كرد باسی ئاشتی كوردو وەزعی ئەوئاتەی كرد پاشان كاك مەلا عەلی عبدولعزیز قسەی كرد سەرەتای قسەكانی ماموستا مەلا عەلی وتی كاك مەسعود ومام جەلال شاگردی مەلامستەفابوون مەبەستی مام جەلال قوتابی مەلا مستەفا بوو مام جەلال پێ ی ئیحراج بوو لەوقسانە خۆی مەشغولێ كردبوو بەجەنتاكەیەوە دوسێ جار كردیەوەودایخست برادەرانی یەكێتی هەموو زۆربەوردی دیقەتیان دەدا من لەو حاڵەتەدا زۆر لەدڵدا دژی یەكێتی بوم ئەوانم بەسەبەب دەزانی منیش توشی ئەو وەزعەو حزب توشی ئەو وەزعە ببوو چونكە زۆرجار لەگەڵ ئەوان هاواری ئەوەم كرد وازمان لێ بهێنن بابریاری خراپ و خەتەرو شەركەر نەدەین ئەو كۆنگرەیە كۆنگرەی سەرەتای شەربوو لەكوردستان ئەو كۆنگرەیەو پاشان جەنازەی بارزانی نەمر وكاك ئیدریس رەحمەتی تەزاورەی جەماوەری و (٣) حزب بۆناو پارتی وجگە لە كاك عەلی سنجاری و كاك جەلیل فەیلی و خەڵكێكی كەی عاجز لەپارتی گەرانەوە ئەوانەی لە ١٩٧٥وە رۆیشتبونەوە بەغداد وەكوكاك حەبیب محمد كریم وكاك اسماعیل مەلا عەزیزو لەوبابەتە و زۆری كەش كۆنگرە و حەقدی هەندێك لەوانەی ناویەككگرتن لەسەر یەكێتی ئەوانە هەموی دروست كەری شەری ناوخۆ بون لەكوردستاندا من لەزۆر شت تێ گەیشتم لەوماوەیەدا بەلام یەكێتی هەر لە گوێ ی گادا خەوتبوو دۆستی نەهیشتبۆوە بۆخۆی نە لە ولاتانی دراوچەكە ونەلەناو كوردستاندا دۆستەكانی خۆشی لەخۆی دورخستبوەوە و پارتی لەهەوڵی پەیوەندی

لەگەڵ عێراق و ئێران و تورکیاش بەقسەی کاك مەسعود دەبویست لەپەیرەو پرۆگرام دژی (PKK)یش قسە بکرێت و بەهێزێکی تیرۆریست لەقەڵەم درا لەو کۆنگرەیەدا بۆ رازی کردنی دڵی تورکەکان قسەکانی نوێنەری ئەمریکا ئاشکرابوو پارتی هاندەدا بۆ بیر کردنەوە لە حزبی یەکەم واتە حزبی قائید لەکوردستاندا ئەوەش بەبێ شەڕنەدەکرا لەکوردستاندا سەرانی پارتی سەیری یەکیان دەکرد دوو شت بە ئاشکرا لەدەموچاویان دیاربوو یەکێ لە ئەوەی ئەو حزبەی یەککرتن جێگایان پێ لیژبکات لەناو پارتی ئەوی کەشیان دەرنەچون لەوکۆنگرەیە بەڵام ئەوەی دڵخۆشی خۆیان پێ دەدایەوە پارتی بووە بەپارتیەکەی ساڵی ١٩٧٠ هەرلەزاخۆ تاخانەقین و جەلالیەکان ناچارن یابێنە ناوپارتی یاخود ناچار ببێت پارتی وەکو حزبی یەکەم قبوڵ بکات یەکێتیش حزبی دووهەم کاربکات یابرۆنەوە ئەم جارەیان لەجیاتی کەلار بۆ جەلەولا دەیان نێرینەوە ئەوە قسەی زۆریانە رۆژانە گوێم لێ دەبوو زۆرم لاسەیربوو ئەو بیرکردنەوەیە بەو شێوەیە بووە دانیشتنی یەکەم تەواو بوو منیش رۆیشتمەوە بارەگاو دوای نیوەڕۆ نەرۆیشتمەوە بۆ کۆنگرەکە من بەتەمای چونی کۆنگرە نەبوم وادیاربوو کۆمەڵێکی زۆر لەسەرکردایەتی یەککرتن هاتن ووتم پێیان ئێوە رۆیشتون بەس پێویست ناکات بێنەوە ئێرە و خەریکی دابەش کردنی مەسئولەکانی سۆسیالیست بووم پێشتر ئامادەم کردبوو بگەرینەوە سنورەکانی خۆیان لەوکاتەدا کاك نێچیرڤان بارزانی و کاك فاضل میرانی هاتن چەند سەعات دانیشتن ووتم دۆستان بین باشترە چونکە من نایەمە ناوپارتی و ناشیەم بۆ کۆنگرە وەکو لایەنەکانی کەش هاتوم زۆر قسەیان کردو زۆرشتیان باسکرد ئاگام لێ نەبوو گوایە ئەو رۆژە دووسێ جار مام جەلال لەو جادەیەوە تێ پەریوە بۆ سەردان بۆلای کێ رۆیشتوە یائیشی خۆی هەبووە پارتی و یەککرتن وایان زانیوە مام جەلال بۆلای من دێت لەوکاتەدا وەکو من ئاگام لەهیچ

نەبوو لەوانەیە مام جەلالیش ئاگای لیّ نەبوبیّت ئەوان لەخۆیانەوە ئەو قسەیان دروست کردبیّت دوای ئەوان هەروا دانیشتبوین کاك مەسعود بارزانی خۆشی کۆنگرەکەی بەجیّ هیّشت و هات داوای کرد بەلام ئەوەی من نارەحەت دەکرد هەندیّك لەوناوەدا بوون لەیەکگرتن کاك مسعود زور قسەی کرد رۆری کەش لەویّ بون زۆر تکایان کرد هەر عەیبە کاك مەسعود دووهەزار کەسی بەجیّ هیّشتووە زۆرم پیّ ناخۆشبوو کاك مەسعودیش زۆر تەکلیفی کردو زۆرتکای کرد زیاتر لەیەك سەعات قسەمان کرد ووتی لەبەر ئەوەی من هاتوم تکا دەکەم وەرەوە ووتم بەمەرجیّك کەسبەینیّ نەهاتمەوە دلّت عاجز نەبیّت لەبەر ئیحترامی کاك مەسعود و پیّشتری کاك نیّچرڤان بارزانی وکاك فازل میرانی ریّزوئیحترام و بەروگیری وناچاری لەگەلّیدا رۆیشتم پیّکەوەش لەیەك سەیارەدا چوین.. بەلام بۆرۆژی دوایی واتە ١٧و٨/١٨ لەعەینکاوە بوم زۆریان ماندو کردم و زۆریان عەزیەت دام و قورئانیان هیّنا خالە حاجی وحمە رەشید محمودیان نارد رۆژیّك لەبەردەم هۆلّی زەرد دا وتیان ئیّستا رەئت چیە ووتم ئیّستاش هەمان رەئی جارانم هەبە زۆرم پیّ ناخۆش و نارەحەت بوم بەلام ئەوانەی تازە دروست بوبون هەر وازیان لیّ نەدەهیّنام و زۆریشیان لەبەر خۆیان بوو کەمن لەویّ بم ئەوان زیاتر بۆماوییەك ئیحترامیان لیّ بگیریّت هیچی کە نەبوو، لە٨/١٨ کۆنگرە گۆرا بەشیّوەیەکی کەو گرنگی دان بەیەکگرتن و کاك مەسعود قسەی کردو داوایان کرد منیش هەندیّك قسەم کرد لەکۆنگرەکەدا زۆرشت گۆرا (٢٠٠٠)نویّنەر لەکۆنگرەدا بوون نزیکەی (٥٠٠) کەس لەیەکگرتن بوو دەبوو (٧٥٠) کەس لەیەکگرتن بیّت هەرلەیەکەم رۆژەوە پەشیمانی دیاربوو لەو بریارو قسانەی کەکرابوون ئەو رۆژە هەستم بە هەلومەرجیّکی خراب دەکردکەروبە روی ببمەوە نەك بەروگیری وهاوریّیەتی هاوریّی روخاو لەدەستدانی زۆرلە بەها مرۆڤایەتیەکان چونکە مرۆڤ لەهەلّویّست خۆراگریدا رووبەروو بونەوەدا

دەردەکەویّ من پیّم وایە مرۆڤ نابیّت بترسیّت بۆ ژیانی و بەهاکان لەدەست بدات بەکالّو کرچی ئەو یەکگرتنەم بکردایە ئەو نوسینە لە ٨/١٨ لەناو کۆنگرە لەیاداشتی رۆژانەم نوسیوومە، لە٨/١٩ ئیسراحەت بوم لەعەینکاوەی نزیک هەولیّر بەلاّم ئەوبرادەرانە وازیان لیّ نەدەهیّنام یەکگرتنەکان و سەرکردایەتی بیّ شەخصیەت بوون هەروەکو خەلّکی سیاسی نەهاتنە بەرچاوم ئیتر لەهەموو شت دەچون جگە لەشەخسی هەندیّکان ناچاربون جیان دەکەمەوە ئەوکات و پیّشتر و ئیّستاش چونکە شەهامەتیان تیّدابوو لەویّش، لە٨/٢٠ کۆنگرە بەردەوام بوو لەهەولیّر من لیّ رازی نەبروم زۆریش نارەحەت بووم جیّگایەکی کەشیان لەپەنای کاك مەسعود دانابوو برۆمە ئەویّ من چەند جاریّك خۆم دەدزیەوە لەدواوە بەلاّم مەجالیان نەدەدام و ئەو جیّگایەش ئیحراج بوو ئەوان هەمووی هەر چەپلّە لیّدان و ناوی پارتی هەرچی دەهات چەپلّەیان لیّدایە منیش بریارم دا چەپلّە لیّنەدەم چونکە شتیّك باوەرم پیّ نەبیّت یا ئەو کۆنگرەیە من باوەرم پیّ نەبوو چۆن چەپلّەی تیّدا لیّ بدەم هەرلەکۆنگرە زۆر نارەحەت وبیّزار بوم برادەران نەیان دەهیّشت خالّەکان باس بکەم و یەکە یەکە دەست نیشانی بکەم بۆئەوەی بەروتی بگەینە ئەنجامیّك لەگەلّ پارتی زۆریان پەلەبوو سەرکردایەتی یەکگرتنم مەبەستە هاوارم یاهاوریّکانم لەیەکگرتن زۆر بیّ ویژدان بون ئەمەی دەینوسم لەیاداشتی رۆژانەمدا نوسراوە بۆیە وای دەنوسمەوە هاوبیر یاهاوریّکانم زۆر بیّ ویژدان بون لەگەلّ مندا زۆریان عەزیەت دام من چاکەی زۆرم لەگەلّ کردن ئەوان بیّ سیقەو بیّ وەفا بون بەلاّم ئەوانە خۆیان هیچ نین هەربۆیەش سەرکردایەتیان پیّ ناکریّ فیّربون هەمیشە ئەمریان پیّبکەن نەك ئەمر بکەن نەك خزمەتی کەسو کاری شەهیدان یان پیّناکریّ خزمەتی خۆشیان پیّناکری وەلەگەل کۆمەلّیّك خەلّکی تیّکەلّ وپیّکەلّ وهەمەجۆر بون و کاك سامیش هەندیّك شتی لەدلدا بوو باسی نەدەکرد دەیهیّشتەوە و پیاویّکی شارەزاو

سیاسی بوو ئەوانەی ناو پاسۆك كۆن هەندێكیان لەپیاوی سیاسی نەدەچوون لە خۆ بەزلزان و هیچ لەباردا نەبوو زۆریش كێشەیان دروست دەكرد. داوای چوارپێنج پارچەی كوردستانیان دەكرد كەچی خۆیان دەكردبە ناو پارتیدا زۆریش بێسەروبەرە وكەسیان لەگوێ ی كەسیانی نەدەكرد لەدوای كاك ئازاد نەیان توانی مسئولی یەكەم بۆ خۆیان دانێن بەسەر فرسەتی خۆیان تیَ نەدەپەڕین لەخۆیان زیاتر قسەیان دەكرد شتیان لەبیر دەچو بون من چەند ساڵ لەشاخ دەم پاراستن هەموو حزبەكان دەری دەكردن من پەنام دان ئەوانەی شاریان ئەوەیان نەدەزانی شتی خراپیان دە كرد جگە لە ئە وانە ی شاخ هە ندێك لەوانەی دوای راپەرین هاتبونە ناو پاسوك لەوانەی خۆشمان كاك قادرجەباری پیاوێكی سەر راست نەبو لەگەڵ برادەرەكانی خۆیدا هەمیشە زەمی برادەرە كانی ئەكرد لای هەمو كەس... كاك سەعدئەیوت مصلەحەتی ئێمە لەگەڵ پارتیدایە نەك جەلالی مامۆستا سەعد پیاوێكی شارەزاو بەتوانا یە رادەی وشیاری زۆر باشە لە شاخ خۆی فێری زمانی ئنگلیزی كرد نوسەرێكی باشە بەناوی گۆرانەوە دەینوسی نامیلكە ی ئایارلە بناری قەندیل دا لەسەر هێرشی یەكێتی بۆ سەر بارەگاكانی حزبی سۆسیالیست لە قرناقاو پشت ئاشان وئاشقولكە سەرحزبی شیوعی عێراقی بەلام زۆر پابەندی دۆست وكەس نەبو كاك رەسول دژی بوو..كاك ئەمین پیاوێكی باش بوو هیچی لەدەست نەدەهات چونكە توشی نەخۆشی ببوو بەهەرحاڵ من دەمتوانی عەزیەتیان بدەم بەلام ویژدانم قبوڵی نەدەكرد خالەحاجی پیاوێكی باش و زۆر دڵسۆز بوو لەگەڵ من بەلام زۆر عاتفی و باوەری بەهەمو قسەیەك دەكرد لەو یەكگرتنەدا زۆر منی ماندوكرد بە دڵسۆزی، حەزی نەدەكرد من توشی مشكیلە ببم بۆیە زۆری عەزیەت دام بەبێ بەرنامە و بێ ئەوەی بزانێ من بۆكوێ دەبات برادەرە كۆنەكانی سنوری لقی سلێمانی زۆریان عەزیەت دام ئەوانیش لەدڵسۆزیەوە بوو بەلام بێ تەجروبەو بێ

بەرنامە بون ئاگایان لەهیچ نەبوو منیش لەبەر ئەوەی زۆرم خۆش، دەویستن نەم دەتوانی دڵیان بشکێنم. هەر چەندە وادەمزانی بۆ مردن دەچم ئەو،ی من دەمزانی وەکو رێکەوتنێکی دووحزب لەگەڵ پارتی دا ئەوان لەژێر عاتیفەو زەختی یەکێتی دا زۆرشتیان لەدەستی من دەرکرد چونکە نتیجەی ئەو یەکگرتنە زۆر لەوانەی یەکگرتن دەبێت باجەکەی بدات و دەبنە هۆی غروری پارتی بۆشەر لەگەڵ یەکێتی دا کەئێمەش بەشێك لەو هۆکارەی شەر دەبین.. من ناتوانم لەوە زیاتر درێژە بەو ماندوبونەم بدەم کە سێکی دلسۆز نەبو بۆحزب شەهیدورێبارە کە یان..رۆژی هەڵبژاردن هات لەکاتی هەڵبژاردندا نوسینی ناوەکان بۆ کۆمیتەی ناوەندی لەلیستی یەکگرتن ناوی منیان لەسەرەوە نوسی بووکاك محمد دۆلاشی لەایئنەکە بوو کاك سامی لەبەر ئەوە کۆنگرەی بەجێ هێشت کاك نێچیرڤان و کاك فاضل میرانی چون بەدوایداو هێنایانەوە، لە ٨/٢٧ دوائەنجامی کۆنگرە دەرچوو (٣٢) ئەندامی سەرکردایەتی بون و (٦) یان ئیحتیات بوون رێگا لەکۆمەڵێك گیرا خۆیان هەڵبژێرن لەوانەکاك خورشید شێرەوکاك فەلەکەدین کاکەیی وکاك ئەکبەر حیدەر هەندێکیش نەیانهێشت دەرچن لەکۆنگرە کاك محی الدين رەحیم وخالە حاجی وزۆری کەش هەرچی هەوڵیان دا ووتیان نابێت چەند کەسێکی کەش بوون هەرلەکۆبونەوەدا کاك مەسعودو کاك عەلی عبدالله بەجێگری سەرۆك هەڵبژارد یەکێ بوو لەخاڵەکانی باس کردن بۆ یەکگرتن منیش پیرۆزبایم لێکرد، لە ٨/٢٦ لەماڵی کاك عقید عوسمان بوین من وکاك جەمیل حمە بەگ و کاك شەماڵ قادرمنەوەرو کاك برزۆی عەلی هەژار قسەمان کردو ئاگادارم کردن بەناوی سۆسیالیستەوە ئیش دەکەین ئەوان دەست بەکاربن و بەیانێکم ئامادە کرد بیبەمەوە لەسلێمانی کاك سالار محمد عزیز چاپی بکات وکاك برزویش بارەگا دانێت بەناوی سۆسیالیستەوە چوم بۆلای کاك عدنان موفتیش باسم کرد ئەو ووتی باشە بەڵام من پێم باشە بڕوێتە کۆبونەوەی

کۆمیتەی ناوەندی و ئیش وەربگریت بۆئەوەی نەڵێن لەسەر ئەوە بووە ئیشمان پێ نەداوە یالەبەر مەسئولیات بووە قسەیەکی لەوبابەتە بکرێت بەلاّم بەگشتی بریارەکانت باشەو هەولّیش بدە لەسەرکردایەتی کۆن یەکێك دیان هەبێت هەروەها ووتی مامۆستا مەلا ناصیح مسۆگەرەو لێرەش خاڵە حاجی پێکەوەبن بەتەئکید لەیەك دانابرێن، لە٨/٢٧دوای ئەو بریارانە گەرامەوە بۆسلێمانی بەلاّم لەو یەك دوورۆژەدا زۆر گەرام ناردم بەدوای کاك رێکارو مامۆستا سەلام گۆمەشینی دا دەستم نەکەوتن و وایان زانیبوو دەنێرم بیان گرن بەلاّم من دەمویست ئەوان بێن و لەگەڵ کاك برزودا بارەگا دانێن لە ١٩٩٣/٩/٦ بەیانێکمان دەرکرد بۆ رێکخستنەوەی سۆسیالیست یەکەم بەیان بولەدوای یکگرتن وکۆنگرە وئەوهەمو کێشەیە و لەماڵی باوکی کاك عدنان داوای خانویەکمان لێ کردن لای مەحکەمەدا پێیان داین لەوێ جەکم دا بەکاك برزو و بارەگای دانا بەناوی لقی هەولێری حزبەوە کاك ئەحمەد تەقاوت و کۆمەڵێك کادری هەولێر لەوێ بون لە١٠/٩/١٩٩٣ ، لە٨/٢٨ لەسلێمانی بوم وچومە سەیدصادق و تەپی سەفابۆ پرسەی ماڵی سەید کەریم پاشان چومە تەپەتۆڵەکە بۆپرسەی ماڵی کاك ئیبراهیمە رەش و کاك محمدعەزیز پاشان چومە گردەنازێ بۆ پرسەو بۆ باریکە پرسەی حاجی رەشید رەزنە و پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی بروسکەم بۆهاتبوو کەکۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی هەیە منیش بەرێ کەوتم بۆ شەقلاوەو صلاح الدین، لە٨/٢٩ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی بوو بۆدابەش کردنی ئیشوکار، لە٨/٣٠ لەصلاح الدین هەڵبژاردن هەبوو بۆمەکتەبی سیاسی بەم شێوەیە (کاك مەسعود سەرۆك و کاك عەلی عبداللە جێگر وزەعیم عەلی و دکتۆر رۆژو جەوهەر نامق و ئازاد بەرواری و نێچیرڤان بارزانی و مولازم کەریم و سامی عبدالرحمن و محمد حاجی محمود) ئەندامی مەکتەبی سیاسی وەبەپێی گەورە بونی قەبارەی پارتی (٣) لق زیاد کرا بۆپارتی وەکو لقی (٩) ی

ئاکریێ و شێخان و بەردەرەش وەلقی (١٠)ی مێرگەسور و رەواندەزو خەلیفان و سۆران وەلقی (١١)ی قەلادزەو رانیەو خەلەکان، لە٨/٣١ دابەش کردنی ئیشوکاربوو کاك مەسعود زۆر بەئیحترامەوە ووتی تۆ سەرپەرشتی هەردوو لقی سلێمانی و کەرکوك بکە..من ووتم کاك مەسعود بۆم ناکرێت و من مەسئولیەت وەرناگرم..ووتی نابێت و تۆبرای من و کوردستان چوار پارێزگایە دووی بۆ تۆو تۆیش سەرپەرشتی بکەو ئەو کات قسەی کەش دەکەین و تۆ برای ئێمەیت و زۆر تەکلیفی کردبەرێزیەکی زۆرەوە و دوای قسە دەکەم لەکۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی بەو شێوەیە ئیشوکار دابەش کران بەم شێوەیە.. کاك فاضل میرانی بۆ لقی(١)ی دهۆك وکاك عمربۆتانی جێگری.. زەعیم عەلی بۆ لقی (٩) زیرەڤان جێگری پارتی گەل بوو.. مامۆستا سەعد بۆ لقی (٢)ی هەولێر وکاك محمود محمد جێگری لق... کاك عمر عوسمان بۆ لقی (١٠) و مامۆستا ئەمین جێگری سۆسیالیست بوو... ملازم کەریم بۆ لقی(٤)ی سلێمانی و کاك کەمال حسن جێگری.. کاك مەسعود سالەیی بۆ لقی (٣)ی کەرکوك وکاك نوری حمە عەلی جێگری کاك نوری هات و وتی بەلکو تۆ رازی بیت وپێیان بلێت دەنگم بۆبدەن لە کۆنگرە دووسێ جار سوێندی خوارد لەکۆنگرە ددیوت ئەگەر بەئیحتیاتیش دەرچم هەر باشەو تۆ لەهەر جێگایە بیت هەر لەگەلێ تۆدام بەلام دوای وادەرنەچوو هەر مەبەستی کاك نوری ئەوەبوو من بلێم دەنگی بۆ بدەن من داوام کرد دەنگ بدەن، من جگە لەمەکتەبی سیاسی سەرپەرشتی دووپارێزگای سلێمانی و کەرکوکیان خستە ئەستۆم و سەرپەرشتی لقی (٣و٤) یان دانا بۆمن بەلام من یەك سەعات دەوام نەکرد بریار درا چی بکرێت من نەم کرد، لە١٩٩٢/٩/١ لەهەولێربوم برادەرانی کۆنی سۆسیالیست قسەم بۆکردن و ئامادەم کردن، لە٩/٢ بریاردرا مەکتەبی سیاسی تازە سەردانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بکات بۆمالی مام جەلال و ئەنجامی کۆبونەوە هەرچی هەولم دا من

نەرۆم چونکە یەکێتی زۆریان ئازار دام کاك مەسعود زۆر داوای کرد منیش بۆئەو سەردانە برۆم من رۆیشتم و پێشوازیەکی گەرم کراین بەلاّم مام جەلال زۆر موجامەلەی کاك سامی کرد لەهۆلّەکە پێم ناخۆشبوو چونکە من دەمزانی کاك سامی رەئی لەسەر شەخسی مام جەلال ویەکێتی چیەو فرسەتێکی دەست کەوێت هەموو رقوکینەی دەرێژێتە سەر یەکێتی لەناو پارتیەوە..پێم خۆش نەبوو ئەو موجامەلەی کاك سامی بەلاّم وادیار بو کاك سامی باشتر یەکێتی دەناسی بۆیە وا مامەلەی لەگەلّ دەکردن ...یەکێتی خۆشیان مستەحەقی ئەوە بون لەکاتی نان خواردندا لەسەرەوە سێ کورسی دانرابوو کاك مەسعودو مام جەلال بون ..مام جەلال زۆر ئیسراری کرد من برۆمە ئەوێ من چومە لای دوای نیوەرۆ گەراینەوە لەرێگا کاك فاضل و کاك جەوهەرو کاك رۆژ تەعلیقیان لەسەریەکێتی ومام جەلال هەبوو دەیان ووت ئێستا حەزیان دەکرد خۆیان نەبوایە ئەو رۆژەیان نەدیایە کەپارتی و یەکگرتن بووەو پارتی بووە بەو هێزە گەورەو سیاسی و عەسکەریەی ئێستا پاشان من گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٩/٣ من لەسلێمانی بوم چومە پرسەی کاك حاجی مەلا حمە کەریم نەوێ باوکی کاك حمەسعید دوای نیوەرۆ گەراینەوە بۆسلێمانی و پاشان چوینە یەك دوو پرسە لەناوشارو دووکەس لەلای کناروێ کوژرابون خزمی خالّە حاجی بون چوینە پرسەی ئەوانیش، لە٩/٤ لەصلاح الدینەوە بروسکە هات کەبرۆمە ئەوێ کۆبونەوە لەگەلّ یەکێتیدا هەیە منیش بەرێ کەوتم بەرەو شەقلاّوەو صلاح الدین لەوێ وەفدێکی یەکێتی بەسەرکردایەتی مام جەلال هاتن بۆ مصیف صلاح الدین و پێشوازی کران و لەپێشا مام جەلال و کاك مەسعود (١٠)دەقیقە پێکەوە دانیشتن کاك رەسول مامندیش لەناو وەفدی یەکێتی دابوو کاك سامی یایەکێ لەبرادەرانی یەکێتی کاك مولازم عمر یا مولازم کەریم بوو ووتی کاکە حمە ئەوەش کاك رەسولەو منیش سەیریم کردو ووتم بەلّێ هەموومان پێستەکەی

خۆمان لەدەبەخانە دۆزیەوە و دەستم بۆ مولازم کەریم وکاك سامی راکێشا هەموویان قسەکەیان لاسەیربوو بەلام بەنسبەت ئێمەوە هەمووومان ئەوانەی سۆسیالیست بەتایبەتی، پێستەی خۆمان بوون لەدەبەخانە بەکەوڵ کراوی و خۆشە کراوی دۆزیەوە دانیشتین کاك سامی ووتی بەخێرهاتنی برادەران و فلان وفلان دەکەم و بەخێرهاتنەوەکەم درێژ دەکەمەوە لەگەڵ قسەکەشدا دەستی بۆ چوار دەوری مێزەکە رادەکێشا و دەسوران ووتی تادەگاتە لای کاك رەسولیش یەعنی کاك رەسول تۆیش سەبەبی بویت کاك رەسول لەولا زۆر نارەحەت بوو بەلام من باسی پێستەکەم کرد کاك رەسول بێ قسە بەسەرو چاو ووتی وایە سەیری منی کرد یاعنی تۆیش هۆکاری بویت هەموو برادەرانی کۆنی پارتی و یەکێتی لەوێ بوون ئەگەر قسەکانیان لەبیر مابێت کۆبونەوە کرا مام جەلال زۆر موجامەلەی کاك مەسعود و پارتی کرد لەسنور بەدەرو هەتا برادەرانی خۆی پێیان ناخۆشبوو دەموچاویان تێك چوبوو و لەدڵی خۆم ووتم تاوانی خۆتان بوو ئەگینا توشی ئەو موجامەلەیە نەدەبون کەباوەرتان پێ ی نیەو دەیکەین پاشان مام جەلال خەنجەرێکی بەدیاری بۆ کاك مەسعود هێنابوو مشتکەکەی زەردبوو دوای کەئەوان رۆیشتن تەعلیقیان دەدا کاك مەسعود ووتی دەبێت لەکوێ ئەم زەردەی پێدا کردبێت کاك سامی یاکاك دکتۆر رۆژبوودرۆژ کە ووتی ئەو خەنجەرەی هێناوە بەشکو خۆمانی پێ ی بکوژین مەسەلەیەك هەیە دەڵێ خەنجەری لەپشتەوە لێ دا لەوقسانەیان دەکرد و زۆرم لاسەیربوو ئەو هەموو موجامەلەی مام جەلالیان بەلاوازی دەزانی نەك پەیوەندی ودۆستایەتی ودڵسۆزی لەکۆبونەوەکە قسە زۆر کرا لەسەر روداوەکان بەلام قەناعەتم نەبوو هەردوولا باوەریان بەو قسانەی خۆیان هەیە چونکە هەم لەناخیان دیاربوو هەم دڵیانم دەخوێندەوە وابزانم کاك دکتۆر فوئاد و کاك کۆسرەت و کاك عمرفەتاح وکاك مولازم عمر لەوێ بوون. کاك مولازم عمر ووتی

ئەوە کاك رەسولە منیش ووتم بەڵێ پێستەکەمان لەدەبەخانە دۆزیەوە بۆ جاری دووهەم هەر لەوێ پارتی هیچ باوەریان بەو قسانەو موجامەلەی یەکێتی نەبوو هەموو ئەو شتانەم نوسیوە لەیاداشتی خۆم ئەگەر ئێوە واتە یەکێتی ئەوەندە دژی ئێمە نەبونایە واتە سۆسیالیست و یەکگرتن ئێستا توشی ئەو موجامەلەیە نەدەبون کەباوەرتان پێ ی نیە.

## ئیعلان کردن و رێکخستنەوەی حزبی سۆسیالیست
## پاش یەکگرتنی لەگەڵ پارتی دا

لە٩/٥ گەرامەوە بۆسلێمانی سەعات دووی شەو دوای ئەوەی برادەرانم ئامادە کرد و بەیانەکەشم ئامادە کرد بۆ سلێمانی، لە٩/٦ لەسلێمانی بوم یادی رۆژی رەشی (٦)ی ئەیلول بوو لەبەردەکی سەراو کوشتنی عەولە سیس وزۆری کەش هاتن بەدواما بۆ لابردنی پەردە لەسەر وێنەی شەهیدکاك قادر حەمە صالح هەروەها یادی شەهید تاریق بوو لەزەرایەن چوم وپەردەم لەسەر لادا خەڵکێکی زۆریش لەوێ بوون کاك مستەفا چاررەش پارێزگاری کەرکوك بوو ئەویش لەوێ بوو قسەی کردبەڵام موجامەلەکەی زۆربوو کاك مستەفاش هۆکاری تەواوی شەری رانیەوقەڵادزە بوو شەری ناوخۆ یابراکوژی ..کاك مستەفا نەئەوەندە موجامەلەو نەئەوەندەش شەر پاشان من گەرامەوە بۆسلێمانی و سەری مەقەری کۆنی سۆسیالیستم دا لەچوارباغ لەو ماوەیەش زۆر قەرەباڵغ بوومەجالی قسەکردنیشم نەبوو زۆر ماندوبوم.. لە١٩٩٣/٩/٦ بەیانێك بەناوی حزبی سۆسیالیستەوە کۆمیتەی ئامادەی رێکخستنەوەی حزبی سۆسیالیست بەیانەکە کاك سالار چاپی کردو برادەران بلاویان کردەوە ناردمان بۆ کاك برزو و بۆکاك شەماڵ قالە منەوەر ئەوان دەستیان کرد بەبلاو کردنەوەی بەیانی ٩/٦ بۆ هەموو لقەکانی سنوری پارێزگاکانی کوردستانیان نارد، لە٩/١٠ بارەگای سۆسیالیست کاك برزوی عەلی هەژار لەهەولێر

دایناو بەیان گەیشتە هەموو ناوچەکانی کوردستان لەماوەی یەك حەفتەدا بێ ئەوەی بزانن بەیانەکە لەکوێوە دەرچوە وەبەیانێك بەناوی لقی سلێمانی و بەیانێك بەناوی لقی هەولێر بەیانێك بەناوی لقی کەرکوك وەبەیانێك بەناوی لقی دهۆك بەعەرەبی دەرچون وەبەیانێك لەرانیە بەناوی لقی راپەرین وەلەچوارقورنە بەناوی رێکخراوەوە دەرچون و پشتیوانی و ئامادەیی خۆیان لەبەیانی سۆسیالیست راگەیاندولەزۆرجێگای کوردستان بلاو کرایەوە بەیانەکەش هێرشی لەسەر یەکێتی تێدابوو کەیەکێتی هۆکار بوو بۆ زەخت لەسەر حزب و سەرکردەکانی حزبیش کەهیچ نەبون و بودەڵە بون ئەو بەیانە هەرچەندە هێرشی تێدابوو بۆ سەریەکێتی بەلام لەبەر ئەوەی دژی پارتی یاهەلوەشاندنەوەی یەکگرتنەکا بوو هەر پێیان خۆش بوو بەیانەکە خۆم نوسیبوم وەلە ٩/٢٢ بەیانێکی ترو وەلامی ئەو بەیانانەی لقەکانمان دایەوەو داوامان کرد هەرکەسێ لەسنوری خۆی بەنهێنی لق تەشکیلات بکات و ناوچەکان و رێکخراوەکان دەست بەکاربن و پەیوەندی بەبارەگای هەولێرەوە بکەن تا ئاگادارتان دەکەین بۆ دانانی بارەگاکان و دەست بەکاربونتان مامۆستا سەلام و کاك رێکار بۆچونیان باشبوو بەلام ترسابون خۆیان شاردبوەوە نەم دۆزینەوە ناردم بەدوایاندا وایان زانیبوو بۆ گرتنیان ناردومانە دوای حزبیان دروست کرد ،ئەو بەیانەی ٩/٦و لەوماوەیەدا چەند بەیانێك دەرچوو تەکانێکی بەحزب داو حزب کەوتە جموجوڵێکی تەواو لەجاران زیاتر و هەمو لایەك دەهات بۆلای من و ئەو بەیانانە تۆ ئاگات لێیەتی من دەموت من ئاگام لێیەتی و برۆن پەیوەندیان پێوە بکەن و ئیش بکەن و دەست بەکاربن تا ئاگادار دەکرێنەوە..پارتی هەرچەندە دەیانزانی بەلام نەیان دەویست خۆیان تێ بگەیەنن و واپیشانی بدەن کە شتێك وا یاگەورەی نەکەن، لە٩/٧ خەلکی دەهات پرسیاری ئەوەیان دەکرد کێ یەو چۆن و لەوبابەتانە و زۆر خەلکی هاتبون زۆرماندویان

کردبوم، له٩/٨ هەرلەسلێمانی بوم لەماڵەوە، له٩/٩ بروسکه هات برۆم بۆ مصیف صلاح الدین کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی هەبوو بەرێ کەوتم بۆ ئەوێ کاك مەسعود و کاك نێچیرڤان بەتەنها دانیشتبون ودوای هەندێك قسه کردن لەسەر زۆر بابەت کاك مسعودو من وکاك نێچیری بەجێ هێشت ئێمه لەسەر زۆر بابەت قسەمان کرد وکاك مسعود هاتەوەلامن باسی ئەوەی کرد بەرنامەی داهاتوو چی بکەین وچۆن دەتوانین سەرکەوتوو بین لەوسنورەدا و رەئیان وابوو هەتا هەوڵ بدرێت (UN) و (MCC) تەداخل نەکەن باعێراق ئەو ناوچانەی سلێمانی و ئەو ناوە بگرێتەوە واته لەدەستی عێراق بێت باشتره نەك یەکێتی یاهەردوولایشی تێدابێت پارتی ئەوەی خۆشی دەکات بەخێر لەسلێمانی لەرقی یەکێتی لەو سنرره بەلام بەراستی پارتی یەکێتی باش دەناسی وەکو خۆیان واته یەکێتی پارتی پێویسته بۆ ئەوە بە ئارەزوی خۆی سیاسەت ئەوەی ناخی خۆی جێ بە جێ نەکات پارتیش پێویستی به یەکێتی هەیه بۆ هەمان مەبەست واته سودی میللەتی تێدایه ئەگەر هەر یەکێکیان بن دەبێت ئەو خەڵکه چی به سەربێت لەوەش گرنگتر بونی حزبی که له نێوان پارتی ویا کێتی دا بۆ خزمەتی دیموکراتی زۆر زەروە یەکێتی غورور ببوو ئەویش پارتی بە شەریکی خۆی قوبوڵ نەبو هەروەکو پارتیش قوبوڵی نەبو شەریکی یەکێتی بکات لایەکی کوردستان بەدەسەتەوە بێت بۆیە من زۆر وەزعەکه خراب ئەبینم هەردوو حزبی یەکێتی وپارتی له بەرنامەو قەناعەتیان یەکیان قبوڵ نەبو من پێم وایه دەبێت بە شەر یەك لای بکەنەوە ئەوەی من هەست دەکەم هەردولا بۆ شەر خۆیان ئامادە ئەکەن و دەبێت ئێمەش شەرێك بکەین باوەرمان پێ نیەو دەشبینه هۆکارێك بۆ شەرەکه هەردوولا هەوڵ ئەدات ئەوی بەرامبەری دەسەلاتی نەمێنێ ووتیان بەرنامەیەك دابنێین (١٧)هەزار چەك بۆ ئێوه لەو سنوره دابەش بکرێت و برێك پارە دابنرێت لەژێر دەست بۆ ئەو نیشانەی ئەو سنوره

بالقەکان ئیشی حۆیان بکەن و ئاگاتان لێیان بێت لەو ماوەیەدا یالەمانگی (١٠) کاك مەسعود دێتە سلێمانی و یەك مانگ دەمێنێتەوە بۆچاوپێکەوتنی، خەڵك و پەیوەندی کردن بەعەشائیر و خەڵکی وە ئێوەش هەوڵ بدەن پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکان بکەن بە یەکێتیشەوە وەهەوڵ بدەن توشی شەر نەبن، تاجەماوەرەکەو هەندێك لەلێپرسراوانی یەکێتی دور دەخەینەوە وپەیمانیلێپرسراوی و چارەسەری گیروگرفتی ماڵ و ئەوانە هەمووی بدەن دەیکەین تامانگی (١٠) تۆ لەوێ بارەگای تایبەتی خۆت بەرابەر حسیب صالح دامەزرێنەو چەك و پارە و ئەوەی زەروربێت ئامادە دەکرێت و پاشان کاك مەسعودیش دێتە سلێمانی ئەو مانگە لەوێ دەبێت و ئیشی باش بکەن و ئەو ماوەیە بەقەناعەتی ئێمە زیاتر بە هێز دەبین خەڵکی یەکێتیش دێتە لامان و پاشان من گەرامەوە وادیار بوو لەگەڵ مرلازم کەریم هەندێك باس کرابوو هات و ووتی بروسکە هاتووە بابڕۆین و شتەکان بهێنین و خانوەکەی کاك جەمال ئەوەی لە دەروازەی شارە لای باخی بەختیاری نزیك رەسمەکەی شێخ محمود خانوو باخێکە ئەو خانووە بگرین بۆ دروماڵ بۆ کاك مەسعود و چووین سەیری خانووەکەمان کردبووگەراینەوە هەندێك تەعمیراتی پێویست بوو.. لەکۆبوونەوە دەیانوت نا بێت دووبرا پێکەوە ببێتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی خاڵەحاجی هات وتی ئەوەمن قەینا بەلام محی الدین دەرنەچو وادیارە دووبراکە هەرلەسەرماڵی رەحیمی نەگبەت جێ بە جێ کرا ئەوە کاك دکتۆررۆژ وکاك بروسك ی برایان دەرچاندومن و کاك محی الدین یان رێگا نەدا دەربچێن زۆرم پێ ناخۆش بوو بەتایبەتی بۆ خاڵەحاجی کەدەرنەچوو من و کاك نێچیرڤان قسەکانمان تەواوبو زۆر باشبوو بە دڵنیایەوە قسەی لەگەڵم دەکرد بەپیاوێکی راست و باش هاتە بەرچاوم... کاك مەسعود ووتی لەگەڵ کاك نێچیرڤان گەیشتینە نەتیجە ووتم پێ دەچێت .. ووتی زۆرباشە منیش ئەو چەند رۆژە ئیشەکان تەواو دەکەم و دێمە

سلێمانی و لەوێ پێکەوە دەست بەکار دەبین و ئینشاالله باشترین ئیش دەکەین و یەکێتیش تێ بگات ئیتر (٥٠بە٥٠) قبول ناکەین و خۆیان کردووە بەشەریکمان لەکوردستاندا ئەو ماوەیە من هەرلەسلێمانی بووم کاک ملازم کەریم دەیوت کەس وای بۆ رێك نەکەوتووە ئەو چەك و شتە بهێنە دەیدەین بەپاسۆك وحسکە کۆنەکان و هەرکات بمانەوێت وازیان لێ دەهێنین.. ووتم کاك کەریم من پارەو چەك وەربگرم خۆم ئەخەڵەتێنم ودەبێت شەریان بۆ بکەم چونکە من ناچم پارەو چەك لەکاك مەسعود وەربگرم و هەروا دانیشم لەبەر ئەوە نامەوێت شەربکەم و وەری ناگرم لێیان بۆ پاسۆك و حسکی کۆن و ناشمەوێت بڵێن شتەکانی وەرگرت و وازی هێنا ووتی تۆ واز دەهێنی ووتم بەڵێ من ناتوانم ئیش بکەم ووتی جیاوازی نیەو بەیان بڵاودەکرێتەوەو ئەوە کۆبونەوە بە ئاشکرا بەناوی سۆسیالیستەوە دەکرێت ئەوە جەلال سودی لێ وەردەگرێت و دڵنیام دوا رۆژ تۆیش دەکوژن جەلالیەکان وتیادەچیت خۆناگەر شەریش بو تۆ بە تەنها یەکێتیت بەگیر هێناوە ئێستا ئەو هەموو هێزەی پارتیت لەبەر دەستە یەکێتی تەفروتونا ئەکەین منیش وتم کاك کەریم دەزانم بەلام نامەوێت ئەوشەرە بکەم لەوبابەتانە، لە٩/٩ گەرامەوە هەولێرو ئەو شەوەش کۆبونەوەو بەیانەکەشمان زوو برد بۆیان و کاك شەماڵی قادر منەوەر لەهەولێر دەست بەکار بوو برادەرانی دهۆك هاتبون ئەوانیش هەر لەوێ بەیانات و راسپاردەیان پێ درابوو چی بکەن، لە٩/١٠ بەیانی زوو لەهەولێر لەماڵی کاك عدنان دەرچوم ونانی بەیانیمان لەچنارۆك خوارد پاشان بەرێ کەوتم بۆ سلێمانی، لە٩/١١ بروسکە هات بڕۆم بۆ صلاح الدین و ئەو شەوە کۆبونەوەم بەلیژنەی تەحزیری کرد کەبریتی بون لە ( خاڵەحاجی و سەیدقادر جەباری و محمد دۆڵاشی و عبدالخالق هەورامی و برزۆ عەلی هەژار) وەمامۆستا مەلا ناصیح لەدەرەوە بوو وە تاکۆنگرەو لەگەڵ مندا ئەو شەوە قسە کرا ئەوان دەست بەکار

بن خەریکی پرۆژەیەك و پرۆگرام و پەیرەو بوم لەسەر سۆسیال دیموکرات نوسیبوم کاك عەدنان سەیدی کراو دامان بەکاك شێرزاد شێخانی بۆ ئەوەی رێکی بخات بەتەواوی، لە١١/٩ چومە شەقلاوەو مصیف صلاح الدين و بۆ هەولێر لەوێش چاوم بەبرادەرانی خۆمان کەوت، لە٩/١٢ گەرامەوە بۆ صلاح الدين لەکۆبونەوەی رۆژی پێشوو بریار درا هەموو وەزیرەکان و جێگرەکانیان بانگ بکرێن بۆ موحاسەبە و ئیتر لەمەودوا قبول نەکرێت یەکێتی بەئارەزووی خۆی قسە بکات وئیشوکار بکات و هەرکەسێ پێی نەکرێ لایبەن و یەکێکی کە دانین لەناوجێگرەکان کاك دکتۆر کەمال کەرکوکی یەکەم کەس موحاسەبە کرا لەو یەك دوو رۆژە دەرکەوت کێشەی نێوان کاك دکتۆر رۆژو کاك جەوهەر هەیە و خەریك بوو پەلاماری یەکبان دەدا تا کاك مەسعود بێ دەنگی کردن دەیانوت دەست دەخەنە ئیشوکاری یەکترەوە ئەوانەی هاتبون کاك مولازم یونس وەزیری ناوخۆو کاك قادر جەباری وەزیری داد و دکتۆر ئیدریس وەزیری گەیاندن و ئەمین مولود وەزیری پیشەسازی و دکتۆر ناصیح وەزیری پەروەردەو جێگری وەزیرەکان لەهەموویان زیاتر کاك مەسعود محاسەبەی دکتۆر کەمال کەرکوکی کرد کە بەئیشەکەی هەڵناسێت کەئەو هەموو ئیمکانیەتەی دێتە پێش هەموو یەکێتی دەیبات وەئەمین مولود بەرنەکەوت و ئەوانی کەش هەریەکە لەئاستی خۆیان محاسەبەی توندو ئینزار کران ئەو رۆژەش موناسەبەیەکی یەکێتی بووخەڵکی زۆریان هێنابووە سەرجادە لەهەولێر نەمزانی بۆنەکە چی بوو یادی شەهیدو جەنازەی شەهید بوو شتێکی لەوبابەتە بوو ئاگادار کران کەیەك شت لەیەکێتی قبولْ نەکەن کاك فرانسۆ ووتی بەدکتۆر رۆژ تۆ جێگری سەرۆك وەزەرا نیت تۆ سەرۆك وەزارای پارتیت و دەبێت بزانی تۆ چیت و لەکوێ ئیش دەکەیت.. کاك جەوهەر ووتی ئەگەر من دەبوم لەجێگای دکتۆر رۆژ دەمزانی چی دەکەم هەر پرسم نەدەکرد هەمو شتم دەکردو هەموو بریار خۆم دەمدا

...دکتۆر رۆژ بەتورە بون وبەتوندو تیژی ووتی ئێوە دەستی منتان بەستۆتەوە تۆ بریارەکان دەردەکەیت لەپەرلەمان خۆلای ئێمە دەست کاری ناکرێت تۆ سەرت لەمن تێك داوە ئێمە لەگەڵ یەکێتی پێکەوە حکومەتمان دامەزراندوەو پێویستە دۆست بین ئەگەر شەر دەکەین شەر لەئەنجومەنی وەزیران ناکرێت یاشەر ئەو چەك و ئەوە بریار بدەین شەر دەکەین لەلایەك حکومەتی هاوبەش هەبێت و لەلایەك شەر شتی وانیەو من جێگری سەرۆك وەزەرام لەقانون و لەدنیادا ناتوانین بریاری سەرۆك وەزەرا رەد بکەمەوە ئەوە یەعنی شەر لەسەر ئەوانە موناقەشەی زۆر کرا قسە کانی دکتۆررۆژ زۆر راست واقیعانەبو بریار درا بوو هەندێك لەوەزیرو جێگرەکانیان لابرن ئەو موحاسەبەیە ئینزاربوو بەلاَم ئینزارو موحاسەبەی توندوتیژی دکتۆر ناصیح کراو قسەی پیَ وترا لەسەر ئەوەی ئیشوکاری وەکو پێویست نەکردوەو مامۆستایان لیَ ی نارازین مامۆستایانی پارتی پاش ئەوانە من گەرامەوە سلێمانی، لە٩/١٣ چومە سەیدصادق و گوڵەخانەو مەلاوەیسەوریشێن و گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٩/١٤ چومە شارەزوور رێکخراوو ناوچەکانم بینی بۆئەوەی دەست بەکاربن، لە٩/١٥ هەرلەسلێمانی بوم بەیانێکمان چاپ کرد بۆبلاَوکردنەوە لەسەر وەلاَمی بەیانەکانی لقەکان دوای ئەوانە چوم بۆ ئێران بۆسەردانی ماڵ و بۆپێشودان ئیشوکاری حزب وخۆم وپەیوەندی کردن بەبرادەرانمان لەدەرەوەی ولاَت ، لە٩/١٦ لەسلێمانیەوە بەریَ کەوتم بۆ سەیدصادق و ناڵپارێزو پێنجوێن و باشماغ و مەریوان بۆ سنە، لە٩/١٧ هەرلەسنەبووم خاڵەجوتیار وکاك شمس الدین موفتیش لەویَ بون و قسەمان زۆر کرد لەسەر ئەو مەسەلانە کاك شمس الدین دەیوت خراپت کردووە دەبوو هەر چۆن بێت نەپارتی و نەیەکێتی و سۆسیالیست بمایەتەوەو ئێستاش هەرئەوەم پیَ باشە کاك شمس الدین ئاگای لەهەموو هەبوو لەبەیانی یەکەم و دووهەم زۆر قسەمان کردبوو لەسەری رەئی زۆرباش بو من سودم لەراو بۆچونەکانی

وەرگرد کاك شمس ئەلدین تجروبەیەکی زوری هەبو، لە٩/١٩ هەر لەسنە بوم لەماڵەوە، لە٩/٢٠ هەرلەسنە بوم بەلاَم ئەو چەند رۆژە لێپرسراوانی ئێران دەهاتن بۆلام ووتیان بیستومانە لەگەڵ پارتی نابیت و تۆئێستا دوو پارێزگات لەدەستەو هێزی پارتی ئەوە باشە بۆخۆت و بۆئێمەش تۆ لەوێ تەئسیرت هەیەو شتی وانەکەیت وئەوە ترسناکە.. ووتم وەلاَناتوانم لەوێ ئیش بکەم و بەزۆر نیەو پێم ناکرێت بۆشم ناکری ناشمەویت دژی پارتی بم دەمەویت دۆستی کاك مسعودوپارتی بم، هەر ئەو رۆژە سوپا داوایان کردبوو برۆم بۆ کرماشان منیش چوم ووتیان چی دەکەیت ووتم چی بکەم ئەوە پارتیم و دانیشتوم وتیان هەروا بێدەنگ دادەنشیت ووتم بەڵێ وتیان ئەوە بەیان دەرچووە بەناوی سۆسیالیست و دروست دەکرێتەوە وتم ئاگام لێ ی نیە ووتیان ئاگات لێیەتی و ئێمەش پێمان خۆشە هەرچەندە تۆ لەهەرجێگایەك بیت ئێمە ئامادەین بۆ هاوکاریتان بەلاَم تۆ هەر ناتوانی سەر بەخۆ وخاوەنی بریاربیت وادیاربوو ئەوان هاوکاریان دەکرد و پێیان خۆش بوو کەوتمە قسە کردن لەگەڵیان رەئیان لەگەڵ ئیتلاَعات جیاوازبوو پاشان من گەرامەوە بۆسنە، لە٩/٢٣ هەرلەسنە بوم، لە٩/٢٤ لەناو شاری سنە زۆر گەرام و هەندێك کتێبخانەو جێگای کەش گەرام و هەندێك کتێبی کوردیم پەیدا کرد، لە٩/٢٥ هەر خەریکی ئیشوکار وئامادە کردنی بەیان و بلاَوکراوەی ناو خۆ بوم، لە٩/٢٦ لەسنەوە بەرێ کەوتم بۆ سلێمانی لەماڵەوە بریارم دابوو نەرۆم بۆ کۆبونەوە چونکە حەوسەڵەم نەبوو لەگەڵ ئەو کۆبونەوانەدا دەیانوت نابێت موناقەشە بکەن کاك فاضل و کاك دکتۆر رۆژ دەیانوت لێرە موناقەشە نیەو لێرە دەبێت کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی شتی گشتی و دوایی دەڵێن بۆ مەکتەبی سیاسی بەجێ بهێڵین لەکۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیش دەڵێن بەجێ ی بهێڵین بۆ کاك مەسعود هەندێك رێنمایی و نەسیحەتیان کردم کەچۆن ئیش بکەم منیش هەر گوێم بۆگرتن قسەم

نەكرد زۆرسودم لێ وەرگرتن لەو رۆژانەدا كاك حامیدوكاك مولازم عمریش سەردانیان كردم و لەكۆبونەوەی خۆمان بریارمان دابوو قسەلەگەڵ مام جەلال بكەین لەسەر ئەوەی كەئەوان دژمان نەبن من لەوێ بەبرادەرێكم ووت لەسلێمانی كاك مەسعود بروسكەی كردووە برۆم بۆ كۆبونەوە منیش بەتەمای ئەوە نیم برۆم و بریاریشمانداوە ئیش نەكەم لەگەڵ پارتیدا برادەرێ كە٣٠ ساڵە جار جار پێكەوە خەباتمان كردووە زۆری بۆباسكردم كەنەرۆم بۆكوبونەوەكە وتی من ترسی ئەوەم هەیە بتكوژن من خۆم دەمزانی زورئاسایە پارتی شتی وای نەدەكرد بەلاّم رای ئەوبرادەرە وابوو حەزی دەكرد من نەرۆم بۆكوبونەوەكە ئەو برادەرەم ئەوە بخوێنێتەوە خۆی دەزانێ ، لە١٩٩٣/١٠/١٥ بەرادیۆ و تەلەفزیۆن بانگەشەی رێكخستنەوەو درێژە دان بەحزبی سۆسیالیست بكەین وبدەین ئەو برادەرەش ووتی بەرەئی من ئێستا كاك مەسعود زانیویەتی بەو بەیان و هاتوچۆو كۆبونەوەو دانانی بارەگا لەهەولێر لەم كاتەدا برۆیت ئەوە لەوێ شتێكیان لەگەڵ كردی تۆلەوێ لەناو مەكتەبی سیاسی ئەوان چی دەكەیت بۆیە زۆر بە پێداگرتنەوەی وتی مەرۆ باشترە من بریارم دا كەنەخۆشم و نارۆم و وەلاّمی بروسكەكەشم دایەوە كەنەخۆشم ئەوان هەر داوایان دەكرد، كاك مولازم عمر لە٩/٢٧ سەردانی كردم و ووتی دەتەوێت مام جەلال ببینی ووتم بەڵێ عەسربوو چوین بۆلای مام جەلال كاك عمری سەید عەلی و كاك مولازم عمرو مام جەلال و برادەرانی كەش بەجێیان هێشتین قسەمان كرد لەسەر ئەو خالاّنەی خوارەوە پێم ووت مام جەلال ئێمە بۆ دووسێ شت هاتوین بۆ لای تۆ .

١-ئێمە ناتوانین لەگەڵ پارتی دا بین .

٢-بەیانمان دەكردووەو حزبی سۆسیالیست رێك دەخرێتەوە و لیژنەی ئامادەیمان دامەزراندووە و پەیوەندمان بەهەموو رێكخستنەكانی سۆسیالیستەوە كردووە هەر

لەدهۆك تاكفری هەموی ئامادەیەو بەیانیان دەكردووە لەسەرتەئیدی بەیانی حزب ، ئێمە جەماوەری خۆمان ماوە بەڵام سەركردایەتیمان هەموی چوەتە لای پارتی جگە لەو(٣) كەسە ماوین من و خاڵە حاجی و مامۆستا مەلا ناصح مام جەلال لەسەرەتادا ووتی ئێمە پێمان خۆشە تۆ لەناو پارتی بمێنیتەوەو دۆستمان بیت وەیەك داوام هەیە لەناو پارتیەوە شەری ئێمە نەكەیت و تۆنەبیتە هۆكاری ئەوەش باشترە..ووتم مام جەلال ئێمە بریاری خۆمانە لەبەر خاتری ئێوە نیە لەناو پارتی بین یانەبین قەناعەتی خۆمان وایە ناتوانین لەناو ئەو تەشكیلاتە بین وەمن لەناو پارتی دا بم دۆستی ئێوە نابم و شەرتان دەكەین وەپارتی شەری یەكێتی و ئێوە دەكات..ئیوە تەسلیمیان بن هەر شەرتان دەكەن من یا حزبی سۆسیالیست وئەوكادرانە نامانەوێت لەناو پارتیەوە شەری یەكێتی بكەین من پێم ناكرێ شەری مولازم عمر بكەم كەچەند ساڵە پێكەوە بوین بۆ پارتی شەری بكەم بۆخۆمانی دەكەم شەرمان بۆیەكێتی نەكردووە ونەشەری پارتی ئەكەین بۆ یەكێتی و نەشەری یەكێتی بۆپارتی بكەین شەریش بۆپارتی ناكەین ئەوە بریاری خۆمانە من لەناو پارتی شەری ئێوە دەكەم لەوانەیە ئێستا ئێوە بەشێوەیەكی كە ئەو قسانەی من لەیەك بدەنەوە بۆئەوەی ئێمە سود لەو نێوانە وەربگرین ئەو قسانەم بۆئەوە نیە ئێستا قەناعەتان هەرچۆن هەیەو یانە شەری ئێوەو پارتی دەبێت ئێستا یا هەركات ببێت بەستراوە بەوەختی ئەوانەوە من درێژی مەسەلەكەم باس نەكرد بەڵام بەدڵنیایەوە ووتم شەرهەر دەبێت چونكە هەردوولا خۆیان بۆ شەر ئامادە دەكرد ئەوكات یەكێتی هەرباوەریان بەو قسانەی منیش نەكردبێت بەڵام من مەبەستم نەبوو ئەوان باوەر دەكەن یانە من وەكو شتێكی مێژویی قسەی خۆم كردو دوایش كاك مەسعود لەئورمیە پێ ی ووتم كەتۆ حەق نەبوو ئەو قسانەت لای مام جەلال بكردایە..من ووتم قسەم نەكردووە لای مام جەلال من هیچ ئەو

تەفاصیلەم باس نەکرد هەر ئەوەندەم ووت شەردەبێت کاك مسعود وتی هەندێك لەقسەکانی خۆم ناسیوەتەوە مام جلال بۆی باسکردوم من بەمام جەلالم وتووە تەنها شەرئەبێت مام جەلال کەلای کاك مەسعود باسی کردووەو خۆی تەحلیلی کردوە ئەوە شتێکی کەبووە یالەقسەکانی من هەموی تیّ گەیشتووە من هەر ئەوەندەم ووت مام جەلال زۆر بەحەزەوە قسەی دەکردو وای زانی پارتی منی ناردووە ئەو قسانە بکەم دڵنیاش بوم لە تەسفیەی حزبەکان یابچنە ناو یەکێتی وپارتی یا خۆیان هەڵوەشێننەوە چونکە حزبەکان خانەی چینایەتیان نەماوە لەناوکۆمەڵگادا کە یەکێتی وپارتی دایان نابو بە قسەی لێپرسراوانی یەکێتی دیاربوو شەری پارتی ئەکەن دوریانزیك بێت وەهەردوولا خۆیان بۆ ئەو شەرە ئامادە دەکردو بەشەر یەك لایی بکەنەوە ئەوە دەبێتە شەرێکی ماڵ وێرانکەر پاشان من گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٩/٢٨ لەسلێمانی بەزۆر بردمیان بۆلای دکتۆر نەخۆشیەکەم بوو بەراست دکتۆر بەپەلە پشکنین و تەختیتی دڵ و ئەوانەیان کردو حەب و دەرمانیان هێناولەماڵەوە بووم، لە٩/٢٩ هەربەراستی نەخۆش بووم وتیان تەشەنوجی سنگ و شەرەیان و دڵت بچوك بوەتەوە ناحەق نەبوو من شەووڕۆژ ئیسراحەتم نەبوو لەهیچ جێگایەك جارجار خاڵەحاجی پیّ ی دەوتم شەوێك بەلادا دەکەوی و کەس پێت نازانیّ ئەوەندە خۆت عەزیەت دەدەیت،لە٩/٣٠ هەرلەنەخۆش بووم بەلاّم ناچار پێشمەرگەیەکمان بەقەدەر فیشەك لەدەستی دەرچوو بوو لەیەکێکی دابوو کوشتبووی چوم بۆپرسەکەی بۆپێنجوێن وبناوەسوتە و گەرامەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٣/١٠/١ هەرلەسلێمانی بوم تا ١٠/٤ هەر لەماڵەوە بوم، لە١٠/٥ کاك نێچیرڤان بارزانی وکاك جەوهەر نامق هاتن بۆماڵەوە سەردانیان کردم و پاشان وتیان دەچین بۆ پێنجوێن بۆ هێنانەوەی تەرمی بارزانی وکاك ئیدریس بارزانی منیش ووتم دێم بۆئەویّ ووتیان سبەینیّ دەرۆین، لە٩/٦ چوم بۆپێنجوێن و باشماغ

بەڵام بەتەنها ڕۆیشتم و لەوێش بەتەنها لەلایەك دانیشتم عەشاماتێکی یەکجار زۆر هاتبوو وادیاربوو مام جەلال و هەموو یەکێتی هاتبون جگە لەوەش ئاگاداری هەموو ڕێکخستنەکانی یەکێتی کرابوو ن بێنە سەر ڕێگای تەرمی بارزانی.. من ناساغ بوم بەڵام دەبوو بڕۆم چونکە هەر لەبەر هێنانەوەی تەرمەکان و هەم لەبەر کاك نێچیرڤان وکاك جەوهەر هاتنە ماڵەوە و هەم لەبەر کاك مەسعودیش لەباشماغ ئەو خەڵکە لەو دەشتەو لەناو خۆڵ و تۆزو بەبێ نان وئاو چاوەڕێ ی هێنانی تەرمەکان بوون مام جەلالیش دەهاتوو دەچوو.کاك نێچیرڤان لەبن دارێك دانیشتبوو منیش لەدەشتەکە بووم لەبەری جادە واتە لێرەوە دەڕۆیت دەستی چەپ و مام جەلال لەبەری دەستی ڕاستەوە بوو ئاگام لێبوو مام جەلال برادەران وتیان تاقیبی تۆ دەکات وتبوی لەکوێ دانیشتووە دەچم بۆلای پێشمەرگەکانی ئێمەش هەمووی قوماشی شین وبەچەکەکانیانەوە بوومام جلال کەهات هەر لەدورەوە پرسیاری کردو ئێمەش هەستاین و چوین بەدەمیەوەو دانیشت و هەندێك قسەی گشتیمان کردو ووتی بۆ لەو دەشتە دانیشتویت ئێستا پێیان ووتوم و هاتوم بۆلات من زۆر مەمنونی بوم و ووتی برادەران لەکوێیە ووتم کاك نێچیر لەبن ئەودارە دایە کاك نێچیر دانیشت بو مام جەلال هات بۆلای من چایان هێناو مام جەلال وتی ئەو خەڵکە هەموی برسیەتی ئەگەر بەمنیان بوتایە وا دوادەکەوێت دەمناردپێشتر شتیان بهێنایەتە ئێرە وە ووتی وادیارە هەرکۆی دەکەنەوە با لقی٤ سلێمانیان ئەو کارەی بکردایە..مام جەلال هەڵساو ڕۆیشت هەرلەو کاتەی مام جەلال لەوێ بوو کاك نێچیر ناردی ووتی وەرە ئەو سێبەری ئەو دارەو لێرە دانیشین دووسێ جاری کە هەرناردی دوای مام جەلال منیش هەستان و چۆم بۆ بن دارەکە لای کاك نێچیر ووتی بۆیە لێرە دانیشتوم لای ئەو منالأنە دەمەوێت لەئێستاوە قسەیان لەگەڵدا بکەم وامام جەلال و کاك مەسعود پیربوون وئەوان دەڕۆن من پێویستم بەئەم

منالأنه بۆرەئی ئێوەش هەروایە دەبێت لەوێ دانیشتین و برادەرانمان چاوشتیان پەیدا کردبوو. چوین بۆلایان تاعەسرێکی درەنگ ماینەوە ئەوکات جەنازەی بارزانی نەمر و کاك ئیدریس ی رەحمەتی کۆماری ئیسلامی ئێران بەئیحترامەوە بەدووهەلیکۆپتەر هێنایانەوە ئاغای محمدی جعفری وئاغای مجیدی و هەموو قەرارگا بووکۆمەڵێك لەلێپرسراوانی ئێرانی لەگەڵدا بوون بە سەلامی سەربازیەوە تە سلیمان کردینەوە لەگوندی هەرگینە ئاشی شێخ قاسم لەسنوری باشماغ کاك مەسعود نەهاتبوو بەدەم جەنازەکەوە هێنانەوەی جەنازەکەش تەواوکەری ئەو نمایشەی کۆنگرەی یەکگرتن بوو بۆ دەرکەوتنی قەبارەی پارتی لەناوچەکانی ژێر دەسەلآتی یەکێتی...جەنازەکە عەسرێکی درەنگ گەیشتە پێنجوێن وپێشوازیەکی گەرمی لێکراو هەموو لایەنەکان و یەکێتی زیاتر هاتنە سەرجادەکەوە ئەو رۆژەش مەلا عمری بانی بنۆك لەوێ بوو هات ووتی دەڵێن سۆسیالیست دەست بەکاری خۆی دەکاتەوەو بەیانی دەرکردووە ئەگەر شتی واهەبوو منیش ئامادەم بۆمردن لەگەڵتابم زۆرهاوکاری پیشان دا دوای بەخێر هاتنی ئێرانیەکان وبەمنیان ووت چی دەکەیت دوای بتبینین ووتم باشە ئیتر گەراینەوە و جەنازەکەش بەشێوەی رەسمی جەنازەکان پێشبوازیان لێکرا لەباشماغ پاشان بۆ پێنجوێن و ناڵپارێزو سەیدصادق هەمان پێشوازی گەرم پاشان بۆ عەربەت هەروا پێشوازی گەرم سەیارەیەکی پارتی کەمال مەلا عمری بانی بنۆك کەوتبوە پێش سەیارەی کاك دەرۆیش ئاغا لەعەربەت کوری شەهید ئەبوبەکری لەگەڵدابوو لەسەر ئەوە دابەزی بوون زۆریان لێدابوون واتە لەکوری مەلا عومەرو کوری شەهید ئەبوبەکریان دابوو قسەیان پێ وتبوون لەعەربەت هەر لەسەر رێگا کاك مەلاعمر ووتی ئەوە دەرۆیش ئاغا کارێکی وای کردووە لەگەڵ ئێمەدا کەوەختێك مەلاعمر لێپرسراو بوو لەقیادەی موەقەتە کەس لەناوپارتی هیچ نەبوو دەیانوت لەسەیتەرە بە هەرکەسیان دەوت بەچەی کاك

مەلاعمریت لەپاسگەی ئیران رای نەدەگرت ئەوەندە دەسەلاتی هەبوو لەپارتی دا لەسلێمانیش هەروا پێشوازی گەرم کراو جەنازەکان بران بۆمزگەوتی گەورە و مەرقەدی حاجی کاك ئەحمەدی شێخ مام جەلال ووتی شەو دەمێنێتەوە ووتم دوای دێمەوە وتی باشە منیش شەودەمێنمەوە مام جەلال شەومایەوە لای لەمزگەوتی گەورە لێرەدا مەبەستی یەکێتی ومام جەلال نازانم چی بوو لەسەر ئەو پێشوازیە خۆ ئەگەر مەسەلە سیاسی نەبوایە یەکێتی باوەری پێ بوایە ئەوەکارێکی ئاسایی بوو ئەو پێشوازیە لەبارزانی وەکو تێکۆشەرێکی کورد بکرێت وزیاتریش حەقە بۆبارزانی بکرێت بەلام ئەوە پێ دەچوو یەکێتی بەقەناعەتەوە ئەو کارە بکات زۆر باشەوپیرۆزە بەلام مەلا مستەفای بارزانی تامابو مام جەلال دژی بوو شەری کردوو نەی دەهێشت ئیسراحەت بکات ئێستا چی لەمەسەلەکە گۆراوە یەکێتی بووە بەهێزێکی گەورە لەجیاتی بارزانی کاك مەسعودە بۆپرکردنەوەو سارێژ کردنی ئەو برینە کۆنانەی هەبوون ئەوە دەکرێت یارازی کردنی دلّی کاك مەسعودوبارزانیەکان ئەگەر وابێت من پێم وایە هەرچی کرابێت پارتی وکاك مەسعود وایان زانیوە ئەو خەلّکە واجبی خۆی بەجێ هێناوەو کەسیش بەتەمای پاداشت نەبێ یان ئەوە لەوانەیە یەکێتی ویستیان ئەم جەنازەیە بێتەوە خەلّکێکی زۆر پێشوازی لێ دەکات ئەگەر یەکێتی خۆی نەکا بەخاوەنی ئەوجەماوەرە ئەوکات جەماوەر وادەزانن جەماوەری پارتیە بەلام ئەگەر یەکێتی خۆی تێدابێت هەموکەسێ دەزانێ جەماوەری یەکێتی و یەکێتی ئەوکارەی کردووە چونکە ئالای سەوزی یەکێتی وجەماوەری یەکێتی واجادەکانیان گرتبو کەس جەماوەری پارتی بۆ جیا نەدەکرایەوە واتە یەکێتی نەی هێشت کەس بزانی هەردەیانوت خۆ یەکێتی لەپارتی زۆر تری ئالای سەوزبو نەك زەردو پارتی هەرلەورێگایەشەوە دۆستایەتی دووپات دەکاتەوە بۆپارتی و شەخصی بارزانی ومالّی بارزانی لەورێگاوە تەئسیری لەسەر

کاك مەسعودیش دەبێت و بەجەماوەرو لایەنەکان پیشان دەدەین کەپارتی ویەکێتی دۆستن و یەکێتی چۆن دۆستایەتی پارتی دەپارێزێت و بەهەموو بۆچونەکان یەکێتی بەقەناعەتەوە ئەیوت فێڵی لەخۆی کردووەو باوەری بەو هەرایە نەبووە لەگەڵ ئەوەش خەڵکی ناو یەکێتی نارازی بون لەوەی مام جەلال خۆی هاتبوو یابەو شێوەیە (٣) رۆژ ئیسراحەتی نەکردبووریشی هاتبوو ، لە١٠/٧ جەنازەکان لەسلێمانیەوە بەرێ کران بۆ دوکان و کۆیەو هەولێرو بۆپەرلەمان بەلاًم ئەوەی لەسلێمانی بۆی کرا لەهیچ لایەك بۆکەس نەکرابوو بارزانی رەحمەتی وکاك ئیدر یس ی خوا لێ خۆشبو ئەوە رەئی خۆمەو ئەورۆژە نوسیومە لەجێگاکانی کە پێشوازی گەرم کرا لەباشماغ تاهەولێر بەلاًم ئەوەی لەسلێمانی بۆی کرا لەهیچ کوێ نەکرا مام جەلال هەڵسوکەوتێکی باشی هەبوو زۆرم پێ خۆش بوو لەوبەشداریە مام جلال لە هێنانەوەی جەنازەی بارزانی وکاك ئیدریس ئەو بەشداریەی کرد چونکە هەم بۆبارزانی شیاوی ئەوەبوو هەم مام جەلال بۆ خۆشی باشبوو لەهەموو رویەکەوە ئەو رۆژە لەپەرلەمان کاك مەسعود قسە کرد و زۆرسوپاسی مام جەلاڵ کرد و هی خەڵکی سلێمانی و شوێنەکانی کەش ووتی من ومام جەلال براین و من و مام جەلال پێکەوە نایەڵین هیچ کێشەیەك روبدات و ئەم هێنانەوەی جەنازەیەش دەبێتە خێروخۆشی هەروەکو بارزانی لەژیاندا خێروخۆشی بوو بۆکورد ئێستاش هەروا دەبێت..کاك مەسعود لەپەرلەمان پێشوازی کرد لەجەنازەکان مام جەلالیش قسەی کرد هەروەکو ئەوەی قەت لەگەڵ بارزانی کێشەی نەبووەو قسەکانی زۆرباش بوو لەوکاتەدا من تائەوکاتە بەلای پەرلەمانیش دا تێ نەپەریبوم ئەورۆژە ناچاربووم بۆ بینایەی پەرلەمان بەلاًم لەدەرەوە لەوێ لەوژورانەی دانرابوون بۆ دانیشتن زۆر موجامەلە ی من کرا کاك قادر عەزیزیش قسەی کرد ئەو رۆژە، شەوی ٧-١٠/٨ چومە ماڵی کاك عدنان موفتی قسەی خۆمان کرد لەسەرئەوە کەی ئیعلانی بکەین و

بارەگا لەهەموو جێگایەك دانێین كاك مەسعود چەندجاربوو بروسكەی كردبوو سەری لێ بدەم نامەشی ناردبو ووتم پێویست ناكات و من توانای ئیش كردنم نیە، لە٨/١٠گەرامەوە هەولێر و ئەو خەڵكەش ملی جادەوبانی گرت و بۆصلاح الدین وشەقلاوە و لەهەموو رێگاكان خەڵكی وەستابون بۆ حەریرو‌خلیفان و گەلی عەلی بەگ و رێگای سۆران ئەو خەڵكە وەستابون ئەو خەڵكەی سۆسیالیست منیان دەدی خۆشحاڵ بون لەسارداو بۆمێرگەسور لەمێرگەسور كەس نەهاتبووە سەرجادەو وادیاربوو شێخ محمد خالیدیش نەهاتبوو وەرێگاشی نەدابوو جەنازەكان لای شێخ ئەحمەی بارزان بنێژن بە قسەی ئەو پارتیانەی لەوێ بون و لەوبەری چیاكە واتە بەرامبەری ئەوان ناشتیان من یەكەم جاربوو بۆبارزان رێگا دورودرێژە بڕۆم تاگەیشتین قەرەباڵغ بوو زۆركەس تێبینی ئێمەیان دەكرد چوینە بارزان گوندێكی بچوك و لەو بەرچەم و ئاوەكە بوو گۆرستانەكە لەولاتربوو هەندێك خانو بانی تازەی لێ كرابونەوە یەكێتی بەقوماشی سەوزەوە هەرچی خەڵكی خۆی هەبوو هێنابویە سەرجادە چونكە خەڵكی هەردەهاتە سەرجادە بۆ ئەوەی نەڵێن جەماوەری پارتیە یەكێتی هەموی هاتبوە پێشوازی جەنازەكان نەك لەبەر پارتی بێت، بارزانی نەمر مافی هەبوو لەوە زیاتری بۆ بكرێ بارزانی دوای خۆی تەنها كفنەكەی بەركەوت نەماڵ و نەقەصرو نەشتێكی وای لێ جێ نەما بەلام شۆرش و مێژو خەبات و تێكۆشانی لێ بەجێ ما، ئەوەی من تێبینیم كرد لە كەڵەكێن و مێرگەسور كەس نەهاتبوە سەر جادە هەرلە ٨/١٠ جەنازەی بارزانی و كاك ئیدریس بەشێوەیەكی زۆرجوان نێژران ئەورێزلێنانە شیاوی خۆیان بوو یەكەم جاربوو چوبومە بارزان لەكاتی ناشتنیاندا دایان گرتن بۆگۆرەكە زۆردڵم تەنگ بوو بۆیان بەلام مادەم سەركردە جەماوەر لەباوەش بگرێت دڵخۆش بووم بەو ئیحترامەوە گەرانەوە بۆكوردستانەی كەخۆیان خەباتیان بۆكردوە ئازادیان نەدی بەلام ئەمرۆ جەنازەكان

یان لەکوردستانی ئازادا بەخاك دەسپێرێ جەماوەر لەباوەشی دەگرێت لەوێ مام جەلال قسەی کرد زۆر لەسەربارزانی و کاك ئیدریس زۆر باسی کردن لەدڵی خۆمدا ووتم باشە بارزانی ئەوهەمووچاکەی هەبووبەسەرمانەوە ئەی بۆئەو هەموو شەرەت لەگەڵدا کرد کامیرەکان هەوڵیان دەدا لەسەرمن تەرکیز بکەن خۆم لادا بەزۆری بەکامیرای خۆمانم ووت هەموو قسەکانی کاك مەسعود ومام جەلال بگرن بۆ رۆژانی داهاتوو وەختی شەریان بەکاردێت هێشتا جەنازەکان تەواو نەببون کاك مەسعود دووسێ جار داوای کرد من برۆمە نزیکیان من و کاك مەسعود ومام جەلال لەسەر گۆرەکە وەستابوین کاك مەسعود ووتی حەز دەکەم ئێوارە بێنەوە لام ووتم نەخۆشم ناتوانم ووتی بەیانی کۆبونەوەمان هەیە.. ووتم مەجالم نابێت چونکە ئیشم هەیە کاك مولازم عمر نزیکمان بوو وابزانم ئاگای لەوەبوو کاك مەسعود هەر جەختی دەکرد من برۆمە صلاح الدین و ئیشی زەروری هەیە و منیش هەروەعدم نەدا و جارێك دەستی گرتم و داوای لێکردم ..من چونکە لەبەر هیچ نەبوو لەبەرئەوە بوو من بریارم دابوو ئیش نەکەم ئیتر برۆم و نەرۆم هەروەکویەك وایەو توشی ئیحراجی دەبوم نەرۆیشتم و شەوگەرامەوە صلاح الدین ولەلای کاك شمس الدین موفتی میوان بوین و قسەمان کرد لەسەر ئەوەی لە ١٩٩٣/١٠/١٥ ئیعلانی درێژەدان بەخەباتی سۆسیالیست دەکەین هەموو تەشکیلات و هەمووشتمان تەواوکردبوو ئەوکات هەندێك پارەم ئیحتیات کردبوو لەگومرك (٣-٤) مانگە دامان نابوو لەکاتی یەکگرتن دا بۆدەست بەکار بونەوەی حزب و بۆرێکخستنەوەی حزب، لە١٠/٩ گەرامەوە هەولێرو چومەماڵی کاك عدنان موفتی ووتم دوێنێ کاك مەسعود داوای کرد برۆم بۆلای بەلام من نەرۆیشتم و بریارم داوە ئیش نەکەم و حەزیشم نەکرد کاك مەسعودم لێ عاجزبێت دوای سبەینێ نامەیەکی بۆدەنوسم و بۆی دەنێرم، لە١٩٩٣/١٠/١٥ ئیعلانی درێژەدان بەرێکخستنەوەو رێبازی حزب دەکەین و هەر لەو

ماوەیەش جەنازەی بارزانی ئێوارەیەك لەگەڵ مام ڕۆستم و کاك مولازم عمرو کاك شێخ جەعفەر دا سەری مام جەلالمان دا لەرێگا مام ڕۆستم ووتی کاکە حمە باوەربکە دائیم دڵم لات بووە ووتم مام ڕۆستم دڵت بۆ لامان بووە تاقیبتان کردوم یا لەدڵسۆزی ووتی کورە نەوەڵا دژم بون یا منتان خۆشویستووە کەئەو کاتە یەکێتی دژم بون ووتی نەوەڵا ئەوان لای مام جەلال بوون هەر هەندێك قسەی کەشمان کرد لەسەرقسەکانی ئێمە مام جەلال ووتی شەرتان لەسەردەکەم ووتم نامانەوێت شەرمان لەسەر بکەن بەڵام شەرعیەت بەپارتی مەدەن شەرمان بکات مام جەلال بەحەزەرەوە قسەی دەکردو نامەشی دەنوسی بەکاك عدنان موفتیش دا هەندێك پارەی بۆناردم مام جەلال زۆریش سوپاسم کرد لەوە.. مام جەلال زۆری من قەرزار کردووە لەوەو هاوکاری زۆری کردین لەروی مالیەوە هەرگیز پاداشتی مان بۆ نادرێتەوە من پارەکەم بۆ ناردەوە...لە٩/١٠لەماڵی کاك عدنان بوین کاك عدنان ووتی پێم خۆشە سەرێکی مام جەلال بدەن تەلەفۆنمان کرد بۆمام جەلال ووتی بابفەرمون ئێمەش چوینە لای مام جەلال وباسی وەرزعەکەمان کردو ووتم مام جەلال ئێمە بریارەو دەستمان پیێ کردوە حەز دەکەم لەپشتیوانی و یارمەتی یەکێتی ومام جەلال تیێ بگەم ئەوکات ئێران بەتایبەتی ئیتلاعات حەزی دەکرد لەگەڵ پارتی دا بمێنینەوە بۆئەوەش وەفدێکیان هاتبوو لەتەهران و سنە لەماڵی ئێمە بون لەسلێمانی داوایان دەکرد کەئەو هەنگاوەی من دەینێم زۆر ترسناکە و زۆرقورسە و پارتی و یەکێتی هەردوولا دۆستن و لێتان دەدەن و تۆیش زەرەر دەکەیت... لەگەڵ کاك عدنان چوینە لای مام جەلال و پێشوازیەکی گەرمی کرد هەردووبەدوو رۆیشتین یەکەم جاربوو کاك عدنان ببینم بۆسائیقی ووتم کاکە تۆ دادەنشیت زۆر خاووخلیچك و ئەوەی بەڵام هەرگیز باوەرم نەدەکرد لەسائیقی کاك عدنان تەکسی هێنابو ئەوەندەگورج و گۆڵ و توندوتۆڵ بێت ووتی زۆرکەس وام پێ

دەڵێت چوینە لای مام جەلال هەمان شتەکانی پێشوم باس کردەوە بەلاّم مام جەلال ئەمجارە رونتر قسەی کرد ووتی ئێمە هەموو هاوکاریەکت دەکەین ووتم مام جەلال ئێستا ئێمە خۆمان دەزانین ئیمکانیاتی خۆمان چەندە ئەگەر هەرخۆمان بین بەپێی بەرەی خۆمان پێ رادەکێشین وزیاتر ناتوانین و باری زۆر قورس هەڵناگرین لەجیاتی بارەگای زۆربارەگای کەم دەکەینەوە و خۆمان قەبە ناکەین و دوایی ببێتە ململانێمان مام جەلال ووتی هاوکاری تەواو دەکەین لەو کاتە دابراین هەندێك لەبرادەرانی سۆسیالیستی کۆن پێیان خۆش نەبوو پارتیش شتێکی ئاساییە پێ ی خۆش نیەو زۆرکەس کاك رەسول و ئەوانیش تەئسیریان هەبوو ئەوان خۆیان بەسۆسیالیست دەزانی دوای ئەوە گەرا مەوە بۆسلێمانی لەوکاتانەدا چەندجارێك کاك مولازم کەریم هات و داوای کرد بڕۆم بۆ صلاح الدین بەلاّم من نەچوم کەهاتمەوە بۆسلێمانی وەفدێکی (٦) کەسی لەئیتلاّعاتی ئێران هاتبون بۆسلێمانی بۆماڵی ئێمە بۆ سەردان ئاغای حاجی ئەحمەدی ئەمیری و ئاغای حاجی حەسەنی عەربیان حاجی فازیل حاجی رەزا وحاجی ها شم چەند کەسی کەش ئەوماوەیە زۆر لەگەڵ من هەوڵیاندا کەئەو بریارەی حزب نەدەین ووتیان ئێمە ناتوانین یارمەتیت بدەین تۆ دۆستمانی و هاوکاریت دەکەین بەلاّم دەبێت تۆیش لەگوێ ی ئێمەبکەیت و لەیەکگرتن بمێنیتەوە و ئێمەش لای پارتی پشتیوانیت لێ دەکەین و تۆ دووهەم کەس دەبێت لەپارتیداو ئێستاش ئەوە حەساس ترین جێگای کوردستان بەهەموو رویەکەوە عەسکەری و سیاسی و ئیداری لەبن دەستی تۆیە زۆر نارەحەتیان کردم ئەوان لەقاتی سەرەوە بون لە لە ماڵەوە ئەیانوت تۆ بەردێکی ئاشت لە کوڵناوە لە سەر پشتت بێت دەپروکێت دانیشیت لاقی خۆت دەشکێنێت بۆیە نابێت وبەرای ئێمە لەگەڵ یەکگرتندا بمێنەوە منیش وتم بریارم داوە تەنها خۆشم بم لە بریاری خۆم نەك پە شیمان نا بمەوە دەبێت سۆسیالست

ڕێکخەمەوە ١٢ڕۆژ لام مانەوە خاڵەحاجی یش جارجار پشتیوانی لە ئێرانیەکان ئەکرد بەلاّم بەمنی دەوت بۆ مردنیش بێت هەر لەگەلّ تۆدام هەر واش بو بۆ مردن و بریاری خۆی بردەجێ لە قاتی خواریشەوە هەموو ژورەکان پڕببون لەیەکگرتن و پارتی و سۆسیالیست هەریەکە لەلایەك قسەم بکردایە بەلاّم عێراق پێی خۆش نەبوو یەککگرتن لەگەلّ پارتیدا لەوکاتەدا هەموو کەس دەیوت ئێران نایەلّێت لەگەلّ پارتی ڕێکەوێت هەموو شتەکان بەپێچەوانەوە بوون چونە ناو یەکگرتنەکەوە حزبمان ڕێکخستەوە ئەو چەندرۆژە زۆر ماندو بوم لەلایەك ئێرانیەکان زۆرهەوڵیان لەگەلّ مندا بۆئەوەی لەگەلّ پارتیدا بمێنمەوە بەلاّم من پێم وتن من ئامادجێکم هەیە لەخەباتدا تاماوم خەبات بۆئامانجێ کە تێکوشانم بۆکردوە بەردەوام دەبم حزبی سۆسیالیستی کوردستانیش ئەورێبازەیەکە ئامانجەکانی شەهیدان بەدی بهێنم دوای ئەوەی ئێرانیە کان زانیان من بریاری خوم داوە یەکێتی ومام جەلال ولەلایەك خەڵکی یەککگرتن و پارتی گەل وسۆسیالیست و هەریەکەش قسەو بۆچونی جیاواز دەکران.. هۆلّی ژوری بازرگانیمان گرت هەربۆچەند کەسێك لەکادرەکان (٢٠٠-٣٠٠) کادرێك کۆببینەوە بۆ ئیعلانەکە بۆ رۆژنامەو تەلەفزیۆن و ئیتر قەرەباڵغی نەبێت بەلاّم زۆری کادر هەر لەزاخۆوە تاکفری هاتبون و نزیکەی (٣٥٠) کادرێك کۆبونەوە، لە١٢/١٠ چوم بۆهەولێر و لەوێش کۆبونەوەم کرد بەکادرەکان نزیکەی(٥٠) کادر کۆبونەوەو قسەم بۆ کردن لەحەوشەکەدا لە١٣/١٠ چاوم بەمام جەلال کەوت و قسەمان لەسەر روداوەکان و بریاری کۆتایی خۆمان کرد، لە١٥/١٠ ڕێکخستنەکانی حزب بەئاشکراتر بارگامان داناو دەست بەکار بوون مام جەلال تەئکیدی کردەوە لەسەر هاوکاری و ووتی تۆ حەقت لەسەرمان هەیە و لەسەر کورد هەیە پێشمەرگەی کۆنیت و لەهەکاری گەراویتەوەو مەفرەزەی سەرەتایت منیش سوپاسم کردو بیانە کە بۆ ١٠\١٥حازرکرابو بردم بۆلای کاك عدنان موفتی وتی بەیانە کە باشە بەلاّم پێم

باشه پێدا بچمەوە کاك عدنان بەیانەکەی زۆر باش ریکخستبو ناوی ٢ئەندامی مەکتەبی سیاسی بو زیاد کردبو لە ٨٥ئنشقاقیان لەحزب کردبوزۆر گۆرانی لە بەیانە کەدا کردبو واتە بەیانی ١٥\١٠کاك عدنان پێداچوەوەو سیغەی کۆتای تەواوکرد پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی، لە١٤/١٠ جارێکی کە کاك مولازم کەریم هاتەوە ئێرانیەکان هەرلەمالّ بون زۆرپێیان داگرت وتیان هەرچیت بەسەربێت ئێمە پەیوەندیمان نیەو خەتەرەو پێمان ناخۆشه وپارتی مشاوەره بەئێمه دەکات ئێستا خۆمان هاتوین و تۆ لەگوێمان ناکەیت..ووتم من پێم ناکرێت وسوپاسی ئێوەش دەکەم هاوکاریم دەکەن سوپاس و ناشیکەن هەرسوپاس هەر لەو ماوەیەدابوو کێشەیەك لەئاکرێ دروست بوو لەنێوان عەشیرەتی گۆران و هەرکی دا هێز کۆدەکرایەوەو هەرایەکی زۆری لەسەربوو شەربوو وەزعەکە ترسناکەو شەو بوو سەعات (١٢)ی شەو کاك عەلی توفیق ئەندامی لقی (٤) و مەسئولی جیهازوکاك مولازم کەریم هاتن هەڵیانساندم لەخەو وتم چیه ووتی دەفتەرەکە بهێن چەند بروسکە هاتووه ئامادەی شەربین چونکه یەکێتی لەئاکرێ کێشەی بۆ پارتی دروست کردووه و بروسکە هاتبوو کەئەگەر لەئاکرێ شەردەستی پێ کرد لەسلێمانیش شەر دەست پێ بکات و کاك کەریم وتی ئەوه بروسکەی کاك مەسعود هاتووه وه وتی بافەوجی کاك حەمەی حەمه سەعید بێته لای مالّی ئێوه چونکه شەر دەبێ لەگەلّ یەکێتی من وتم پێشمەرگه هەیەو کەسم ناوێ کاك کەریم داوای کرد برۆمه بارەگای لقی (٤) و سەردانیان بکەم مەبەست لەوەبوو من گەیشتمه لق ئەوان تەقه دەست پێ بکەن و ئیتر من دەبێ لەلقی (٤) بچمه ناو شەرو بەرگری لە لق بکەم و شەر دەست پێ بکات بەلاّم من نەچوم بۆ لقی٤ (ئێرانیەکان ١٢)رۆژ لەوێ مانەوه خالّەحاجی دەیوت بۆ ناوئاگر برۆیت من دێم بەلاّم ئەوه ئێرانەو دۆستمانه پێیان خۆشه مانەوه له گەلّ پارتی دا ئاغای ئەمیری و کاك حاجی هاشم

حاجی حەسەنی عەرەبیان زۆری کەش ئاغای پەناهی نەك ئەو بریارە خەتەرە بدات لەیەکێ لەکۆبونەوەکان تەئکیدم کردەوە لەمام جەلال ئەگەر وەکو حزب هاوکاریمان دەکەن و پشتیوانیمان دەکەن ئەوەباشە وئێمەئامادەین یەکێتی دۆستی نزیکمان بێت وجەنابتمان قبوڵە برای گەورە بیت بەلاّم ئەگەر بیر لەرە بکەنەوە بۆناویەکێتی وەکو کاك رەسول لەپێشا هاوکاری وپاشان ناچار بوو یاوەکو کاك قادرعەزیز دوای وەزارەکەتان لێ سەندەوە ئەگەر وا بکەن بەتەنها خۆشم بم ئەچمە شاخی سورێن و نایەمە ناویەکێتی حەزیش ناکەم بەو نەفەسە قسەم لەگەڵ بکەن بەهیچ شێوەیەك..مام جەلال وتی شتی وانیەو ئێمە هاوکاری وپشتیوانی تەواوت لێ دەکەین و شەرت لەسەر دەکەین ووتم شەرم لەسەر مەکەن بەلاّم شەرعیەت بەپارتی مەدەن شەرمان بکات من ئەو هەموو تەئکیدەم لەمام جەلال وتی کاك رسول قەت یەکێتی داوای لێ نەکردوە کاك رەسول خۆی کاك عدنان موفتی ناردوە کە یە کێتی وەری بگرێ بۆ ئەوە بوو بارێکی قورس بوو یەکێ لەئێرانیەکان ووتی ئەوەی تۆ دەیکەیت وەکو ئەوە وایە کێوێك بگریت بەکۆڵەوە ئاسان نیەو نەیکەیت باشە ووتم تەنها خۆشم بم هەردەیکەم، لە١٠/١٤ لەسلێمانی بوم سەرقاڵی ئیشوکار بوم و مسوەدەی بەیانەکەم نوسیبوو لەرۆژی ١٠/١٥ خوێندنەوەی پیشانی کاك عدنانم دا ووتی من پێیا دەچمەوە کاك عدنان بەیانەکەی زۆری گۆری و نوسی و زۆر گۆران و دەست کاری کرد وناوی کاك قادرعزیزو کاك عبدالخالق زەنگەنەی زیاد کردبوو کە ئینشقاقیان کردووە لەناوەراستی ١٩٨٠ کان، هێنامانەوە لەسلێمانی چاپ کرا و لەسەعات (٢)ی پاش نیوەرۆی رۆژی ١٠/١٥ لەهۆڵی ژوری بازرگانی سلێمانی نزیکەی (٣٥٠) کادری حزب کۆبونەوەو زۆری کەسوکاری شەهیدانی حزب بون ولیژنەی ئامادەییش هەمووی لەوێ بوون و خەڵکی زۆری پێ خۆشبوو زۆری چاوەرێ ی ئەوەیان دەکرد هەواڵی خۆشی و زۆریان

لەخۆشیدا فرمێسکیان دەرشت من هەندێك قسەم بۆکردو پاشان بەیانەکەم خوێندەوەو بەگەرمی پێشوازی لێ کرا پاشان خاڵەحاجی قسەی کرد هەرلەسەر مەسەلەی حزب بۆهەموولایەك ئەوەش لەزۆربەی رادیۆ و تەلەفزیۆنەکان بلاوکرایەوە لەتەلەفزیۆنی سۆسیالیست ورادیۆ تەواوی وتارەکان بلاو کرایەوە لەرۆژنامەش بەجارێك جەماوەری سۆسیالیست لەهەموو لایەکەوە روی تێ کردین و حزب ولایەنە سیاسیەکان بۆپیرۆزبایی هاتن بەتایبەیت حزبی شیوعی و مامۆستا کەریم ئەحمەد و دەزگاکانی یەکێتی نیشتمانی و زۆر لایەنی کەش هاتنە سەردان و ئامادەیی خۆیان پیشان دا بۆهاوکاری ،رۆژی ١٠/١٥ رۆژێکی مێژویی بوو لەژیانی سیاسی وجەماوەری رکخستن دا حزبی سۆسیالیست و بوژاندنەوەی حزب بوو وە١٠/١٥ کەمتر نەبوو لە١٩٧٩/٨/٨ ، هەروەها رۆژی ١٩٩٣/١٠/١٥ کەمتر نەبوو لەرۆژی ١٩٧٦/٥/١٢ وەکەمتر نەبوو لە رۆژی ١٩٧٦/٦/٢٧ هەروەها کەمترنەبوو لەرۆژی ١٩٧٦/٨/٨ ، رۆژەکانی سەرکەوتنی سۆسیالیست زۆرە بەلام ١٩٩٣/١٠/١٥ لەو رۆژانە کەمترنەبوو کەهەزاران خەڵکی ناوچەکە لەحزب کۆدەبونەوە هەمان رۆژ لەسلێمانی رادیۆو تەلەفزیۆن بەناوی سۆسیالیستەوە کەوتەوە کارو رادیۆی (FM) کانی سلێمانی وشارەزوورو هەولێر بەکار کەوتن و بەجارێك جەماوەریان راتەکاندو خەڵێکی زۆریش بەرەو حزب هات بەجارێك دڵی جەماوەری کوردستان بەگشتی و جەماوەری حزب بەتایبەتی لەهەموو لایەك شایی دەکرد لەخۆشی دا کەسوکاری شەهیدانی کوردستان وەکو ئەوەی شتێکی گەورەی لێ ون ببوت چونکە ئاسان نەبوو خەباتی (١٧) ساڵی حزبی سۆسیالیست ئاسان نەبوو هەروا بەئاسانی زیندە بەچاڵ بکرێت سەدان کادری لێ کۆبونەوە، لە١٠/١٦ لەسلێمانی بوین ئیمکانیەتمان زۆر نەبوو بەلام بۆئەو کاتەش کەم نەبوو، لە١٠/١٧ بەهەزاران کەس روی تێ کردین بۆریزی حزب و بۆپیرۆزبایی جەماوەری شارو ناوچە جیاجیاکان جگە لەپارتی

هەمووی هاتە سەردانمان لەماوەیەکی کەمدا مەقەری رانیەو قەلادزەو کۆیەو تەق تەق وشێنێ و دوکان وپیرەمەگرون و نالپارێز وپێنجوێن وهەڵەبجەی کۆن و هەڵەبجەی تازە و سەیدصادق و دەربەندیخان وکەلارو کفری هەر هەبون تەنها ئالاشینەکەی لەسەر بوو لەسەر قەلاو چەمچەماڵ و تەکیەو بازیان و لەناوشاری سلێمانی مەکتەبی سیاسی و لق و هەموو رێکخراوەکان و لەهەولێریش ناوچەو لق بارەگایان هەبوو لەرەواندزو خورماڵ وسیروان مەقەرمان دانا جگە لەقەدەفەری و عەربەت و شانەدەری و زۆرجێگای کەش بەگشتی لەهەموو کوردستان جگە لەدهۆك کەپارتی رێگای نەدەدا مەقەرمان لەهەموو جێگایەك دانا کەس یارمەتی نەدابوین هەر ئەو پارەی کە حزب پاشە کەوتی کردبوو لەکۆنەوە کەئەگەر بڵێم دەمزانی ئەو وەزعانە رودەدات راستە چونکە لەرادیۆو تەلەفزیۆن وتایپ و زۆر شت چەك وجگە لەوەی کەئەم جارە هێزوپێشمەرگەمان دروست کرد یەکەم بۆ پاسەوانی بارەگاکان ئەمجا زەردو شینی ئاسمانی کاکە حەمەو بارزانی بۆکوێ دەچێت بۆ چ لایەك دەروات دزو جەردەو جاسوس و دەیان شتی کەی لەو بابەتە لەرۆژنامەکانی جیهانی و ناوخۆیی و ناوچەکە لەسەر ئێمەو حزبی سۆسیالیست لەسەرۆکی پارتیەوە تادەگاتە سەرکردەکانی پارتی وتیانە بەشێوەیە کەلای پارتی چەرخاو بۆلای کەسیان برد، لەرۆژانی ١٦و١٧/١٠/١٩٩٣ جەماوەرێکی یەکجار زۆر روی تێ کردین ئێمە بەناوی حزبی سۆسیالیستی کوردستانەوە دەست بەکار بوین ورۆژنامەی رێگای ئازادی و گۆڤاری سورێن دەردەچوو تائەو رۆژانەش ئێرانیەکان بەنارەزایی گەرانەوە ئەو ماوەیە سەرقاڵی ئیشوکار بوم، لەرۆژانی ٢١و٢٢و٢٣/١٠/١٩٩٣ جەماوەرێکی زۆر رۆژانە رویان تێ دەکردین ، لەشەوی ٢٣-٢٤/١٠ وەزعی بزوتنەوەی ئیسلامی و یەکێتی ئالۆزبوو زۆر توندبوو لە دوای ئەوەی یەکێتی لە سەیتەرەی کفری لەرۆژی ١٨/ ١٠/ ٩٩٣ کەمینێکیان دانابو بۆبزوتنەوەی ئیسلامی

٢تا٣کەسیان لێ کوشتبون گوایە لەسەیتەرە نەوەستاون، لە٢٤/١٠/١٩٩٣ سەرلەبەیانی شەر دەستی پێ کرد لەنێوانیان لەسلێمانی و لەزۆرجێگای کە لەکوردستان مامۆستا مەلا عەلی تەلەفۆنی بۆمن کرد هەروەها یەکێتیش هەر تەلەفۆنیان بۆمن کرد لەوبارەیەوە قسەیان کرد وادیاربوو هەردوولا پێیان خۆش بوو چارەسەری کێشەکەیان بکرێت من بەتەلەفۆن قسەم لەگەڵ کاک کۆسرەت کردو قسەم لەگەڵ مام جەلال کرد پێم وتن ئەگەر پێتان باشە دەکەومە بەینەوە وتیان باشەو باشەر نەبێت.. کاک مەسعودبارزانی لەوکاتەدا لەسەر ئەوبریارەی کاتی خۆی بریاربوو بێتە سلێمانی بۆکارەکانی لەوکاتەدا لەسلێمانی بوو دووڕۆژ هەوڵی دا ئەیویست شەرەکە رابگرێت و هەتا هێزی لەگەڵ هێزەکانی یەکێتی نارد بۆسەر بارەگاکانیان بۆ چەمچەماڵ بەهێزی هاوبەشی چون بزوتنەرە ئیتر بێ هیوا بون لەکاک مەسعود ئەوکات هاواریان بۆمن هێناو لەشار دامەزرابون من حەزم نەدەکرد شەرەکە روبدات کاک مەسعود بارزانی لەئوتێل ئەبوسەنا بوو سەرقاڵی ئەو بەرنامەیە بوو کەبۆی هاتبوو بەلاّم ئەم جارەیان بۆی نە دەکرا بێ ئەوەی ئێمەشی لەگەڵ نەبوین سەری قەلاّدزەو کۆیەو زۆرجێگای دابوو ئالاّی شین و بارەگاکانی سۆسیالیستی دی بووئەوانەی کۆنی سۆسیالیست باسی کردبوو کەئەگەر ئەوان سۆسیالیست بن قبوڵ ناکەن سۆسیالیست پارتی وارسێتی وادیارە ئەوان وارسی هەموولایەکن وخۆیان کردبوو بەناوپارتی دا وازیشیان لە ئێمە نەدە هێنا لە٢٠/١٠ ناردمانە لای پارتی کە وەفدێکی حزب سەردانی کاک مەسعود بکات بۆبەخێر هاتنی بۆسلێمانی وادیاربوو وەلاّمیان نەدایەوە نەبەئا ونەبەنا، لە٢٤/١٠ دوای قسەکردن لەگەڵ مام جەلال و کاک کۆسرەت قسەم لەگەڵ مامۆستا مەلا عەلی کردو کاک مەسعودیش ئەو(٤-٥) رۆژە لەسلێمانی زۆر خۆی ماندو نەکرد بۆراگرتنی شەرەکە لەچەمچەماڵ و زۆرجێگای کەش من چومە ناو مەسەلەکەوە چوم سەردانی

بارەگای مامۆستا مەلا عەلی و بزوتنەوەی ئیسلامیم کردلە هەوارە بەرزەی شاری سلیمانی و کاك مەلا کرێکاریش لەوێ بوو ئەم دەناسی مخزەنەنی لەخۆی بەستبوو هەر هاتووچۆی بوو مامۆستا مەلاعەلی دەینارد بۆسەردانی پێشمەرگە دامەزراندن ئەوهاتە ژوورەوە باسی ئەوەمان کرد شەرنەبێت کاك مەلاکرێکار ووتی بەڵێ نجیب الله لەئەفغانستان دەیوت دەبێت فلآن ناوچە چۆڵ بکات ئەگینا تۆرابۆرایان پێ چۆڵ ئەکەم من بۆ یەکەم جاربو ناوی تۆرابۆرام گوێ لێ بێت لەموجاهیدە ئەفغانیەکان جەلال تاڵەبانیش والەگەڵ ئێمە دەکات من ئەوم نەناسی و نەشمزانی دوایی پرسیارم کرد وتیان کاك مەلا کرێکارە و قسەم لەگەڵ مامۆستادا کردو ووتم پێم باشە سەری مام جەلال بدەیت و لەوێ چارەسەری کێشەکە بکەن باکۆتایی پێ بێت باشترە تا لەدورەوە بروسکەو بروسکەکاری شەر دەبێت ووتی باشە تۆلەگەڵمان بیت ووتم حازرم بەلآم باشەر لەچەمچەماڵ بوەستێ و قوەتەکانیان بگەرێنەوە ئاگاداری کاك مولازم عمرمان کرد والەسەر داوای مام جەلال ئێمە دەرۆین بۆهەولێر بۆلای مام جەلال وئێوەش هێزەکان بگەرێنەوەو شەریش لەچەمچەماڵ بوەستێت ئەوانیش وادیاربوو ئاگادار کرابوون شەر وەستا بەلآم هێز هەرمابوو بەسەیارەکانی ئێمە مامۆستاش پێکەوە مەلا کرێکارو ئەوان چوینە هەولێر لەمەکتەبی سیاسی یەکێتی پێشوازی کراین و چارەسەری کێشەی نێوان بزوتنەوەو یەکێتی کرا و شەر راگیراو مام جەلال ومامۆستا مەلا عەلی هەندێك گلەییان لەیەك کردو قسەکراو گلەییان لەمەلاکرێکار کرد مام جەلال بەیانێکی هاوبەش دەرکردو ئیمزامان کردو لەسەرچەند خاڵێك رێکەوتن لەتەلەفزیۆن ورادیۆ بلآوکرایەوەو مام جلال وکاك ملا کرێکار ئەوەندە موجامەلەی یەکیان دەکرد وەکو ئەوەی قەت کێشەیان نەبوبێت هەمان رۆژ چوینە سەردانی مەقەری بزوتنەوە لەهەولێر و مامۆستا عبدالرحمن نەورەسیش بوو لەسەفەرەکەدا و شەو لەبارەگای

بزوتنەوە بوین ورۆژی دوایی گەراینەوە بۆسلێمانی، لە۱۰/۲٥ چوینە هەڵەبجەی تازە لەسەر داوای کاك حسێن خەلیفە چاومان پێیان کەوت لەماڵی مام نوری بریاری دا لە ناو حزبی سۆسیالیست بەکۆمەڵێك خەڵکەوە ئیش بکات هەر لەورۆژەشدا کاك مەلا عمری بانی بنۆك ئەویش بریاری هاتنە ریزی حزبی دا ئەوانە تازەبون بۆحزب، تا ۱۰/۲۸ کاك مەسعود بارزانی سەفەرەکەی بەتەواوی نەکراو (۸) رۆژ مایەوە و گەرایەوە بۆهەولێر من هەرلەسلێمانی بوم رۆژانە هەزاران خەڵکی دەهات بەهەموو جۆرێك، لە۱۰/۳۰ کاك حسێن خەلیفە هاتە لام ، ئەو رۆژە لەسلێمانی بوم زۆرماندوبووم قەرەباڵغ بوو، تا ۱۹۹۳/۱۱/۳ هەرلەسلێمانی بوم سەرقاڵی ئیشوکاربوم، لە۱۱/٤ لەسلێمانیەوە چومە سەیدصادق و قەدەفەری وگوڵەخانە وریشێن و مەلاوەیسەو میری سور و قاینجە و ناڵپارێز سەری ئەو ناوەمان دا بارەگای حزبی لێبوو وپاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە۱۱/٥ لەسلێمانیەوە چوم بۆهەولێر بۆسەردانی بارەگای لقی هەولێر و بۆماڵی مام جەلال لەوێ قسەمان کردو ووتی کۆبونەوەش دەکەین وادیاربوو نارەزایی هەبوو بەتایبەتی لای کاك رەسول وە دژی سۆسیالیست چاومان بەچەند رۆژنامەنوسی فەرەنسی کەوت لای مام جەلال تەقدیمی کردین کەسۆسیالیستین وادیاربوو ئەوکاتە نێوان پارتی و یەکێتی زۆر رێك نەبوو لەدژی یەکگرتنەکەش لەسلێمانی یەکێتی هەندێك خەڵکیان کۆکردەوە بەناوی چەپەکان مامۆستا گۆران وکەسانی کەش و شتی واوە هەرایەکیان بۆ کردن لەمەلعەبەکە بەناوی یەکگرتنەوە لەریزەکانی یەکێتی و پێشتریش بۆ حزبی سۆسیالیست یابۆ کاك رەسول بەناوی سۆسیالیستەوە هەرایەکیان بۆساز کردبوو لەماڵی مام جەلال بوین کاك کۆسرەت دەعوەتی کردین بۆنیوەرۆ لای ئەو لەماڵەوە من پێش رۆیشتم میوانی کەشیان هەبوو لەوێ کاك جەلیل گادانی و کاك عبداللەی مهتەدی سکرتێری کۆمۆنیستی ئێران..کاك جەلیل

سکرتێری حزبی دیموکراتی رابەرایەتی شۆرشگێر بوو دوای نیوەرۆ هەربەماڵی کاك کۆسرەت کۆبونەودیەکمان لەگەڵ مەکتەبی سیاسی یەکێتی دا کرد لەسەر زۆرشت قسەمان کرد وادیاربوو مام جەلال ویستبوی من دڵنیا بکات هەم پیشانم بدات کاك رەسولیش وەکو ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی، لەگەڵتا دانیشتووە سۆسیالیستی قبوڵەو لەسیاسەتی یەکێتی دەرناچێت بەرەسمی دادەنشین کاك عمرفەتاح وکاك دکتۆر فواد و کاك کۆسرەت و کاك مولازم عمروکاك رەسول بوون کاك کۆسرەت ووتی سبەینێش بەرەسمی لەئەنجومەنی وەزیران پێشوازیت لێ دەکەین وەکو حزب رۆژنامەش دەربکەن کۆبونەوەی لەگەڵ سەکتەبی سیاسی یەکێتی بەئامادەبونی مام جەلال زیاتر لەیەك سەعاتی خایاند، لە١١/٦ سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی، سەردانی ئەنجومەنی وەزیرانم کرد، چاوم کەوت بەکاك کۆسرەت سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران کاك مولازم یونس لەوێ بوو من چوم وقسەکرا لەسەر هاوکاریمان لەلایەن حکومەت و پشتیوانیمان لێ بکرێت بلاویان کردەوە لە راگەیاندنی خۆیاندا لەلای خۆیان وئێمەش هەروا لەسەعات (٣)ی پاش نیوەرۆ کۆبونەوەی فراوانمان کرد لەگەڵ کادرەکانی سنوری لقی هەولێر لە بارەگای لق کە خانوی ماڵی کاك عدنان موفتی بو پێیان دابوین پاشان سەردانی مەکتەبی سیاسی پارتی پارێزگارانمان کردو گەراینەوە بۆ بارەگای لق ئەوکاتە بارەگا لای ئوتێل هێرش بوو لەپەنای بارەگای قەرارگادابوو ناردیان شەو سەردانمان بکەن شەو ئاغای جوادی جعفری وشیهلائی و هەندێك لەو برادەرانەی ئەوێ هاتن بۆلامان و هەندێك دیاری دراوسێتیان هێنابوو بۆ بارەگاکەمان تازە کرابوەوە حزبیش توشی ئەو هەموو گیروگرفتە بوو توانای دارایی باش نەبوو ئەو هەموو بارەگایە دانرابوو بەلأم پێشمەرگەی وامان نەبوو وەکو هێزی رێك وپێك قسەمان کرد لەگەڵ قەرارگاو ووتیان حەز دەکەین دەعوەتت بکەین بۆ ئێران و لەوێش قسە دەکەین وهاوکاریتان

دەکەین، ١١/٧ هەرلەهەولێر بووم سەرقاڵی کۆبونەوە بووم کاك بـرزۆ سـەرقاڵ بـوو لەهەولێر، لە١١/٨ گەرامەوە بۆسلێمانی ئـەوکات خاڵـەحاجی لـەوێ بـوو ئیشەکانی رادەپەران دوای نیوەرۆ چومە پرسەی حەمە ئەمین بەگ عـەباس بـەگ لەمزگـەوتی عبدالله لوتفی لەسلێمانی پاشان چومە بارەگا زۆر قـەرەباڵغ بـوو رێگـای هاتوچۆ نـەبوو، لـە١١/٩ چـومە سەیدصـادق و ناڵپـارێز و پێنجـوێن و باشمـاغ ومـەریوان و بۆسنە بۆ ماڵەوە ئەو کاتە ماڵمـان لـەوێ بـوو کـاك داراشـم ئەگـەڵ بـوو بـەهادین و توفیـق و مـام کـەریم لەسـنە بـون، لـە١١/١٠ لەماڵـەوە بـوم لەسـنندج، لـە١١/١١ مەسئولینی قەرارگای رەمەزان هاتن لەکرماشانەوە بۆلامان لەسنندج بـۆ سـەردان و قسە کردن لەسەر درێـژە دان بـەحزبی سۆسیالیـست باسـم کـرد زۆر دڵگـران بـوون لەوەی بەناوی حزبی سۆسیالیست و بەناوی حزبی یەکگرتنەوە نەبووە وتیان ئێمـە بەئیهانەی دەزانین سۆسیالیـست لـەدنیادا نـەماوەو ئێـوە بـەناوی سۆسیالیـستەوە ئـیش دەکـەن حـزب درێـژە پـێ دەدەن منـیش باسـم کـرد سۆسیالیـست حزبێکـە مێژویەو جەماوەری خۆی هەیـە و سـیمای لـەناو حـەڵکی کوردسـتان کۆکردنـەوەی جەماوەری حزب نـەك دژی کۆمـاری ئیـسلامی زۆر قـسەی لـەو بابـەتـەمان کـردووتم ئێستا ئێمە توشی کۆمەڵێك رەخنەی جیا جیـا بـوین بـەلام هـەمویان یـەك رەئیـان لەسەر ئێمە هەیە ووتی چیە ووتم پارتی دەڵێت نابێت بـەناوی یـەکگرتن بێـت ئێمـە وارسین ئەوەی سۆسیالیستی کۆن ناو پارتی قەناعـەتیان بـەپارتی کـردووە نابێـت نـاوی سۆسیالیـست بێـت ووتم کـاك رەسـول لـەناو یـەکێتی قەناعـەتی بـە یـەکێتی کردووە نابێت ناویسۆسیالیست بێت ئێستا هاوارمان بۆئێوە هێناوە ئێوەش پێمـان دەڵێن ئیهانەی جمهوری ئسلامیە و ئیسلامە کەسۆسیالیـست لـەدنیا نـەماوە ئێـوە لەپەناماندا دروستی دەکەنەوە لێرە هەمووتان یەك رەئیتان هەیە لەسەر ئێمە خـوا لەهـەمووتان گـەورەترەو ئێمـەش بریارێکـەو داومانـەو لـێ ی پەشیمان نابینـەوەو

رەنگی شینیش کفنمان دەبێت ئەگەر یارمەتیمان دەدەن سوپاستان دەکەین و ناشی دەن هەر سوپاستان دەکەین ووتیان ئێمە هاوکاری تێ دەکەین لەهەرحزبێ حسك و هەرناوێك هەبێت نوسراویان کرد بۆ نەغەدە و مەریوان وکرماشان وتەهران لەهەر سێ چوارلا بارەگامان هەبوو وەکو سۆسیالیست تەعامل بکەن بەمۆری سۆسیالیست ئیشوکاریان بۆبکەن ئەوەش کێشەیەکمانی چارەسەرکرد لەساڵی ١٩٧٩ وەتا ١٩٨٩ ئەوە کێشەیە وەلە ١٩٩٣یش لەگەڵ ئێمە بەلاّم لەچەند لاوە هەڵی دایەوە یەکێ لەسۆسیالیستە کۆنەکان کەخزمی کاك رەسول بوو هات بۆلام ...عەلی بچکۆلیش دوایی لای پارتیەوە چوبووە لای یەکێتی ولای کاك رەسول ... کاك رەسول پێ ی وتبون من خەمی (محمدحاجی محمود)ە کە رۆژێك یەکێتی و پارتی چۆن رێك دەکەون هەردولا پێکەوە دەچنە سەری ولێی ئەدەن عەلی وتی بە کاك رەسولم وت شتی واهەیە وتی بەڵێ هەر لەو ماوەیەدا ووتی باسی ئێوەی کردووە کاك رەسول وتویەتی بەزەیم بەو رۆژەدا دێتەوە کەپارتی و یەکێتی چۆن هەردووکیان رێك دەکەون وبریاری لێدانیان دەدەن بۆشتی وا دەبێت کاك رەسول وتویەتی بەڵێ رۆژێك هەردوولا لەسەر لێدانی ئەوان رێك دەکەون.. ئەو برادەرە هات پێ ی ووتم کاك عەلی بچکۆلیش وەستا بوو بۆ شاهیدی کاك رەسول لەوەبوو ئاگای لەشتێك هەبوو ئەو قسەیە بۆ دەکات، لەشەوی ١٢-١٣/١١/١٩٩٣ بەتەلەفۆن ئاگاداری ئەو برادەرانەی دەرەوەی ولاّتم کردو وەزعەکانم بۆ باس کردن لەسەر درێژەدان بەرێبازی حزبی سۆسیالیست ئاگادار کردن و ئەوەی دەکرێت وئەوەی ئیش دەکات بیکات جگەلەوەش ئاگاداری دۆست وبرادەرانی کەشم کرد، لە١٢/١١ لەدوای نیوەرۆ لە ئوستانداری سنە لەگەڵ ئاغای رەحیمی ئوستانداری سنە کۆبونەوەمان هەبوو لەسەر وەزعی کوردستان وعێراق و هاوکاری کوردو کۆماری ئیسلامی ئێران زۆر قسەمان کرد وەهەولّم دا بۆچاك کردنی نێوان کۆماری ئیسلامی

و حکومەتی هەرێمی کوردستان وئامادەیی خۆیان پیشان دا هەروەها نێوان یەکێتی و ئێران وەپێم وتن کەپێویستە کۆماری ئیسلامی یارمەتی کورد بدات چونکە چەند رێکخراوو کەنیسە لەئەوروپاوە دێت لەپێنجوێن قوتابخانەو نەخۆشخانە دەکاتەوە کە (٧-١٠) هەزارکیلۆمەتر دەبرن لەئەمریکاوە دێن بەلاّم ئێوە هەزار مەتر کەمترە لەتەوێلەوە دورن یا هەزار مەتر لەبیارەوە دورن نایەن مزگەوتێك بکەنەوە لەوەکاتەدا کورد ئیشی نەبوو ئێوە دەهاتنە کوردستان چەك و فیشەك و لوغمتان دەدانا بەلاّم ئێستا پێویستمان بەژیان و نان و ئاو کارەباو جادە و میللەتێك لەبرسا دەمرێت و ئێوە هەموو شتان لێ بریون و ئەوان ئامادەی خۆیان پیشان داو نامەیەکم لێ وەرگرتن بۆ ئالۆزی نێوان ئەوان بۆمام جلال بۆ چارە سەری کێشەکان و مام جەلال و پاشانیش کۆبونەوەش وابزانم کراو لەوکاتەش پارتی ئاگاداری ئێرانی کردبوو هاوکاری ئێمە نەکەن بەتورکیاشیان وتبوو هەمویان خۆیان پێیان ووتم منیش هەولّم بۆ هەموان دەدا پارێزگاری سنە بریاری دا یارمەتی حزب بدات لەجیاتی وجل و پێلاّو ئازوقەی داینێ (٩) لۆری لەوکاتەدا بۆئێمە زۆربوو ئازوقەی داینێ و هەمووشتەکان کەزیاتر لە هەزار فەردە ئاردی تێدابوو وەزیاتر لە (١٥٠٠) فەردە برنجی تێدابوو ئێمە زۆر سوپاسمان کردن و ئامادەی پیشان دا یارمەتی هەموو کوردیش بدات و لەگەلّ حکومەتی هەرێم دانیشتن و ئالۆگۆری بازرگانی بکەنەوە بەلاّم لەوکاتەدا هەمووی بەرەو تورکیاو ئەمریکا بون هەتا دژی ئێمەش بوون دەچوینە ئێران، لە١١/١٤ هەر لەسنە بووم ، لە١١/١٥ هەر لەسنە بوم لەوەزارەتی ناوخۆو پارێزگاری سنەوە هاتن بۆ سەردانم لەمالّەوە، لەرۆژانی ١٦ تا٢٠/١١/١٩٩٣ هەر لەسنە بوم زۆر لەبازار گەراین، لە٣/٢١ چوینە قەرارگا لەمەریوان کۆبونەوەمان هەبوو لەگەلّ قەرارگاو گەرامەوە بۆسنە، لە٣/٢١ لەسنەوە چومە کرماشان بۆ کۆبونەوە لەسەر پەیوەندی دووقۆلّی ئەوانیش

بریاریاندا لەروی چەك و فیشەك و ئازوقەشەوە یارمەتیمان بدەن و هاوکاریمان بکەن و مام جەلالیش یارمەتی داین هەر لەوماوەیەدا نەك یەکێتی بەڵکو شەخسی هاوکاری کرابین، لەرۆژانی ۲۲و۱۱/۲۳ هەرلەسنە بوم، لە۱۱/۲٤ لەسنەوە چومە مەریوان لەماڵی حاجی رەحمان بوین لەمەریوان شەو چوینە وە ماڵی کاك بەختیاری یار ئەحمەد بەگ مەسئولی علاقاتی پارتی بوو لەمەریوان بەڵام کوری باش و پیاوی، باش و دۆستی ئێمەش بوو دایکی خزمان بو خیزانەکەی کچی کاك بورهانی عەبدوالله خانی محمود خانی دزلّی بو لە مانگی ۱۹٦۳/۷من میوانی عەبدوالله خان بوم لە گەڵ کاك ئەرکان محمود ئیلان پێ ئەوروژە کچی حمەی سەرتیپ یان هێنا بۆ کاك بورهان کەدایکی خێزانی کاك بەختیاری، دەکرد ئاگاداری پێشمەرگەمان کرد کەبێنە باشماغ بەدەم سەیارەکانەوە هەر بەسەیارەی ئێران تانالپاریز و هەندێك بۆمیری سور ئازوقەیەکی یەکجار زۆربوو بەشی دوو ساڵی حزبی دەکرد لەوکاتەدا بۆ بارەگاکان جگە لەفەرش و شتی کەش، لە۱۱/۲٥ خۆمان گەراینەوە بۆباشماغ و پێنجوێن ونالپاریز وسەیدصادق و سلێمانی، لە۱۱/۲٦ چوینە سەید صادق بۆ پرسەی برای ئەحمەد بچکۆل و بۆ پرسەی عمر بالآبەرز پاشان چوینە هەڵەبجە بۆ پرسەی حەسەن حاجی تۆفیق ئەمانە هەسوی پێشمەرگە بوون و دوژمنایەتیان هەبوو لەو کاتەی کەس بەکەس نەبوو فرسەتیان لەیەك دەهێنا و یەکیان دەکوشتەوە، لە۲۷و۱۱/۲۸ هەلەسلێمانی بوم، لە۱۱/۲۹ چومە مەریوان بۆ پرسەی عەزیزی کەریم فەتالی، لە۱۱/۳۰ لەسلێمانی بوم، لە۱۹۹۳/۱۲/۱ لەسلێمانی بوم وخاڵەحاجی داوای دەکرد لەسەر داوای (PKK) سەردانیان بکەین منیش بەراستی دەمزانی چیان باس کردوە خاڵەحاجی و (PKK) ئەوان چەند جارێك هاتن بۆلای ئێمە ئەوکات ماهر یاشتێکی لەوناوانە بوو مەسئولیان بوو لەکوردستان داوایان کرد سەردانیان بکەین منیش بەتەمای ئەوە بوم سەردانی لای قەلادزە و

ئەو ناوە بکەم ولەوێشەوە سەردانی ئەوان دەکەین لەوکاتەش دا هەندێك هەواڵم بۆهاتبوو کەئەبزوتنەوەی ئیسلامیش بدرێت ولەسۆسیالیست بدرێت نازانم چەندی راست بوو من بەنەمای ئەوەبووم ئیحتیات بکەین و هەندێك خۆمان کۆبکەینەوە نەك بەو پەلەپەلە چونکە پێشمەرگەی وامان نەبوو جگە لەبارەگاکاکان (٤-٥) کەس بۆ حەرەسیات بەلأم سورێن پێشمەرگەی لێبوو لەگەڵ شارەزوور منیش دەمویست لەگەڵ بزوتنەوە قسە بکەم و سەردانی (PKK) و سەری مەقەراتی خۆشمان بدەم بەلأم لەو باوەرەدا نەبوم کەکورد و حکومەتی کورد و سوپای کوردوپەرلەمانی کورد بریاری ئەوە بدەن لەحزبی کوردی هاوسەنگەری رۆژانی ناخۆشی کوردایەتی لەو پەرلەمان و حکومەتەوە بریاری لێدانی بدەن کەخۆمان خەباتمان بۆ کردووە و هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە چۆن دوای ئەو هەموو شەری ناوخۆی کوردستان لەشاخ وئێستا بەرەی کوردستانی وپاشان حکومەت و پەرلەمان و راپەرین و کۆچی (٣) ملیۆنی ئەوانە ئاسان نیە کەهەروا بکرێت شەر بریاری شەر بدرێت لەو کوردستانە ئازادەدا هەرچەندە تازە یا شەری (PKK)یان کردبوو کوردبوون و هی پارچەیەکی کەی کوردستان دوریش نیە شەری ئێمەش بکرێت هەر خەریك تۆوتۆی ئەوەبوین، لە١٢/٢ چومە دوکان و بۆرانیە سەری بارەگاکانماندا و پاشان چوم بۆ قەلأدزەو سەردانی بارەگای سۆسیالیستم کرد لەوێ پاشان بەرێ کەوتم بۆ سونێ و بۆ شێنێ و سەری رێکخراوی شێنێ مان داو هەروەها سەری (PKK)مان دا ماهر لەوێ بوو لەگەڵیان کۆبرینەوەو قسەمان لەسەر روداوەکان و پەیوەندی هەردوولا کردو گەراینەوە بۆ شێنێ و شەولەماڵی کوێخا عبداللەی شێنێ بوین کە(١٣) ساڵ بوو نەمان دیبوو هەرشەو گەراینەوە بۆقەلأدزە لەماڵی کاك بایز بوین پاشان سەری ناوچەو بۆناوچەی رنیە و بۆ بێتواتە سەری بزوتنەوەی ئیسلامی مان دا بۆئەوەی قسە بکەین ئەوانیش پێشتر باسیان

کردبوو کە رێکەوتن بکەین ئێمەش کاك سەیدقادر وخاڵەحاجی وکاك محمددۆلاشی و ئەوبرادەرانە بوین لەسەفەرەکەدا نیوەرۆ لای مەقەری بزوتنەوە بوین کەچوینە بێتواتە ئەوانیش (٣-٤) سەیتەرەیان هەبوو لەرێگادا لەشکارتەوە تاچوینە سەر مامۆستا مەلا عوسمان و کاك عەلی باپیرو کاك شەریف، و کۆمەڵێکی کەش لەمەسئولەکانیان لەوێ بون باسی وەزعەکەمان کردو قسەکرا باسی ئەوەش کرا کەسۆسیالیست و بزوتنەوە رێکەوتنیان هەیە کاك عەلی باپیر ووتی رەلا بەشتی رەسمی باس نەکراوە بەلأم باسی ئەوەکراوە کەکاك مەلا عەلی هەڵەبجە شەخسی لەگەڵ ئێوە شتێکی کردووە ووتم چۆن شەخصی ووتی ئێمە لێ ی ئاگادار نین ئەوە شەخصی یە .. ووتیان ئێمە ئێستا ناتوانین قسە بکەین لەسەر مەسەلەی عێراق وعیلاقات ووەزعی کوردستان چونکە ئێوە ئێستا لەگەڵ پارتی کێشەتان هەیە و ئەوە چۆنە من قسە بکەم لەوانەیە کاك نێچیروان ببینم بۆئەوەی پێك بێین..ووتم مامۆستا ئێمە بۆئەوە نەهاتوین ئێوەو ئێمەش هەدەفین بۆ ێدان و شەر پێ فرۆشتن ئەگەر پێتان باشە هەردوولا پێکەوە بین شەرمان ناکەن ئەگەرنا شەرمان دەکەن کاك عەلی باپیر وتی پارتی شەری ئێمە ناکات جەلالیش شەرمان دەکات بەساروخ ئەو مەکتەب سیاسیەیان لەهەولێر هەڵدەگێرینەوە ووتم کاك مەلا عەلی باوەر ناکەم بۆتان هەڵگێرێتەوە هەروەها ووتم مامۆستا مەلا عوسمان ئێوە توشی شەر دەبن بارەگای سەرکردایەتیان مامۆستا بەپێکەنینەوە ووتی ئەم ناوە زۆر خۆش و هاوین میوەی باشی هەیە و خەڵکەکەشی الحمدالله هەموی موسڵمانەو زۆری چەکی بزوتنەوەی لایەو جگە لەوەی تۆ ئەیبینی دووسیێ ئەوەندەی نایبینی چەکی لایەو لەکاتی پێویستدا هەموی دێت ووتم مامۆستا پشتان دۆڵە رەقەیەو ئێرەش خۆشناوەتیە و دورن لەسنوری رانیەوە بۆنارۆنە لای قەندیل یاپشتی قەلادزە ودارەشمانەیاهەڵەبجە مامۆستا مەلا عوسمان ووتی وەگیانی باوکت ئێرە

زۆرباشه تێ گەیشتم پارتی پێ ی وتون بۆ لەگەڵ سۆسیالیست رێکەوتن ئەوانیش رێکەوتن نەکەن ووتویانە ئەوەش شەخصی لەگەڵ کاك مەلا عەلی هەڵەبجە بووەو ئەو ئێوارەیە کاك نێچیروان سەردانی دەکردن بۆ رێکەوتنێك چونکە چەند رۆژێك پێش ئەوە پارتی تەرحی کردبوو لە پەرلەمان سنورێك بۆ بزوتنەوەی ئیسلامی دانێن و بۆ سۆسیالیست هەمان شێوە من تێ گەیشتم لێیان خوا حافیزیمان کرد لێیان و دور نەکەوتمەوە ووتم برادەران کورینە پێستەیان لەدەبەخانە دەبینمەوە هێشتا لەبێتراتە دەرنەچوبوین ئەقلیەتێکی سەیربوون ئێمە (٢٠) سەیارەیەك بوین شەو چوینە مالّی کاك سوارە ئاغا لەسەرکەپکان و شەو لەوێ ماینەوە، لە١٢/٣ چوینە رانیەو سەری بارەگامان داو پاشان چوینە کۆیەو هەونێر و چوینە بارەگاو شەو کاك کۆسرەت سەردانی کردین، لە١٢/٤ سەردانی مام جەلال و کاك کۆسرەت مان کرد لەگەڵ پارتیش ناکۆك بوین بەلاّم هەرلەصلاح الدینەوە رۆیشتین کاك کۆسرەت دەیوست پیشانی پارتی بدات کەئەوان بیستویانە سەردانی بزوتنەوەیان کردووە ئێمەش بەرامبەرم بەوەی بزوتنەوە پارتی پێ ئازار بدات قەناعەتی خۆم بوو ئەوکاتە، لە١٢/٤ چوینە پرسەی خێزانی کاك صلاح شوانی لەهەولێر، لە١٢/٥ لەهەولێر بوین نوسەران سەردانیان کردین کەبریتی بون لەکاك ( سعدالله پەرۆش و مستەفا صالّح کریم و رەوف بێگەردو محمد موکری و صلاح شوان و رەشاد حسێن و بورهان) قسەمان لەسەر زۆر مەسەلە کرد.

## چەك کردنی لیوای (٢٤) و هەڵوێستی حکومەتی هەرێم بەرامبەر بەحزب ؟

لە١٢/٦ لەگەڵ کاك کۆسرەت چوین بۆ سەردان و پرسەی شێخ حسێن بوسکێن لەلای رانیە و بۆماڵی کاك ئاکۆی عەباس ئاغا تازە ببوو بەیەکێتی لای پارتی بوو سەری ماڵی کاك سوارە ئاغامان دا لەسەرکەپکان بۆپرسەی برای یاخزمی حەمەی کاك هەمزەی دۆڵی شاوڕلّی و سەری کۆمیتەی یەکێتی لەرانیە داو گەراینەوە

شەقلاوە سەری مام جەلالمان دا کەمێك نەخۆش بوو پاشان گەراینەوە بۆ هەولێر و بۆ مەقەری خۆمان لەوێ باسی ئەوەم کرد کەپارتی دەیانەوێت ئەو لیوای ئێمە پێشمەرگەکان دەربکەن و دەستی بەسەردا بگرن وتیان وەلاوەکو حکومەت هەردوولامان لە حکومەت شەریکین ناتوانین بەلام خۆت هەرچی بکەیت ئێمە پشتیوانیت لێ دەکەین ووتم کاك کۆسرەت تۆ سەرۆکی حکومەتی من دەتوانم لیوایەك چەك بکەم و هەر نەبێت چەکەکانی حزبمان وەربگرینەوە بەلام ئەوان شەرمان دەکەن ئێوە ئیمزای ناکەن تۆ وەکو سەرۆکی حکومەت پشتیوانیان لێ ناکەیت ووتی، حەزدەکەم لیوای پارتیە هەموشیان سجن بکەیت ووتم چەکی بکەم ووتی بەلێ لەسەیارەکە پێم ووت و لەشەقلاوەش پێم ووت هەروەها لەئەنجومەنی وەزیران و لەماڵی خۆشیان پێم ووت مام جەلال ووتی ئێمە ناتوانین شتێکی کە بکەین ئەوانەی ئێوە بەناوی لیوایەکی خۆمانەوە بیان کەین بەلام پێشمەرگەی ئێوەن هەرکات وەزعەکە گۆرا ئەوە ئارەزویان هەبوو دێنەوە لاتان هەر ئەوەندە بێت لەسەر میلاکی یەکێتی بێت ئەو لیوایە فەوجێکمان وای کردو دوایی گەرانەوە لامان من لەسەر قسەی کاك کۆسرەت ناردم بۆ مەسەلەی لیواکە: لە١٢/٧/ سەری مەقەری حزبی شیوعی مان دا لەهەولێر کاك عمری عەلی شێخ و کاك مەلا حەسەن لەوێ بون قسەمان لەسەر روداوەکان کردو ئەوفشارەرانەی لەسەر حزبەکان لەلایەن هەردوولاوە دەکرێت وباس کران ، لە١٢/٨ پێشوازیمان کرد لەبزوتنەوەی دیموکراتی نیشتمانی لەبارەگای خۆمان عەقید احمد جبوری ئەمین عام یان بوو بارەگایان لەهەولێر بوو هەمان رۆژ دوای نیوەرۆ مەلبەندی میزوپۆتامیاش سەردانیان کردین لە هەولێر، لە١٢/٩ گەرامەوە بۆسلێمانی ووتیان ئەوە برادەران کۆیان کردونەتەوە ئەوەی وتویەتی سۆسیالیستم هەموویان دەکردووەو هەندێکیان نەیانوێراوە بڵێن سۆسیالیستین هەتا لە فەوجی(٢) لەسەر دەریاچەی دەربەندیخان

بوو نەیان هێشتبوو نانی نیوەڕۆش بخۆن و هەموویان بێ چەك دەرکرابوو پێیان وتبوون نانەکەشتان پێ حەرامەو دەبێت بڕۆن گەرامەوە بینیم(٤-٥)کەس لەئەفسەرو ئامرفەوج و قائیدی مەنتیقەوە بە بەتانیەکی ڕەشەوە هاتونەتەوە بەباران و لێزمەو قور لەو مەعەسکەرانەوە دەریان کردون بەراستی زۆرم پێ ناخۆش بوو چونکە ئەوانە دەردەکرێت و کێ لەجێگای دادەنێن کۆنە جاش پێشمەرگەی (١٥) ساڵە لەشاخەوە دەربکرێت ئەمانەم بەئیهانەو شتێکی خراپ زانیو پێم ووتن دەتوانن چەکەکانی خۆتان بهێننەوە ووتیان بەڵێ دەتوانین خۆشم تاتەتم نەگرت و چومە سەیتەرەکەی سلێمانی ئەوان چون چەکەکان و هەر لیوکەشیان بارکردو هێنایان هەموویمان نارد بۆ عەربەت و هەڵەبجەی تازەو ئەویش هەر فەوجی (١و٢)یش دەستی بەسەرداگیراو چەکەکانمان نارد لەجێگەك دامانناان جگە لەدوو فەوجەکە کەچەکی خۆیان پێ بوونزیکەی (٤٠٠) چەکی قورس و سوکی لیواکەش کەچەکی سۆسیالیست بون کۆیان کردەوەو بردیان لەمیری سور دایان ناو لەبارەگای فەوجەکان مانەوە خۆشم سەری هەڵەبجەی تازەم دا ئەوەکراو ئێوارەش لەتەلەفزیۆن بلاَوکراوە بەك بەیان لەسەر ئەو ڕەفتارانەی پارتی و حکومەتی هەرێم کە پارتی بەکاری دەهێنا دژی سۆسیالیست باس کرد بەلاَم کاك سەیدمحسین ی تاوگۆزی کەخۆی بەلایەنگری پارتی دەزانی دەورێکی خراپی هەبو بۆ هاندانی خەڵکی دژی سۆسیالیست ئێمە ئەگەر چاکەمان نەبوبێت بۆیان شتێکی کەمان نەبوە بۆیە ئێمە ڕووبەڕووی زۆر کێشە دەبوینەوە بەلاَم هەموی غەدر بو لە ئێمە دەکرا هەردوو حزب دژی هەموو حزبەکان بون خۆشیان بۆ شەڕی یەکتر ئامادە دەکرد بەرای ئیمە ئێستا هەندێك خۆراگربین بەسەرهەموکێشەکاندا سەردەکەوین چونکە ئێمە نە دژی کەس ولایەنین هەولی دۆستایەتی لەگەڵ هەمولایەنەکان ئەدەین بەلاَم غەدرمان لێ ئەکەن ناحەقیمان پێ ئەکەن بەلاَم ئێمە دڵنیان

سەردەکەوین چونکە لەسەر حەقین حەقیش سەرکەوتودەبێت هەرچی سەیری روداوەکان ئەکەین ززوفەکە یارمەتی ئێمە ئەدات سۆسیالیست لەگەڵ ئاشتی و پێکەوە ژیانی سیاسیانە خزمەت بەگەلەکەمان کەین بەلام ئەوئەقلیەتەی هەردووحزبی دەسەلاتدار هەیانە شمشێریان لێ هەلکێشاوە ئاسان نیە هەروا بلێین کورد بەسەلامەتی لێی دەرباز ببێت

لە۱۹۹۳/۱۲/۱۰ ئەنجومەنی وەزیران کۆبونەوەو ئەوکارەی ئێمەیان یا هێنانەوەی چەکەکانی خۆمانیان بەشکاندنی حکومەتی هەرێم ودەست دریژی بۆسەرحوکومەت دەزانی وباسی ئەوەیان نەکرد ئەوان (۲۷۰۰)پێشمەرگەی ئێمە دەربکەن لەحکومەتەکەی ئەوان کەزۆربەیان تەقەیان بۆکورد نەکردوەو ئەوپێشمەرگانەش کە(۱۸) ساڵ بوو بێ وچان لەخەباتدا دەربکەن گواستنەوە هەبوو تەجمید هەیە موچە برین هەیە زبندانی هەیە تۆ لەڕانیە مقدەمێك بەسەرو بەتانیەکی رەشەوە دەری بکەیت ئەوە کارێکی زۆر دوربوو لەهەموو شتێك لەهەموو رەوشتێکی نیشتیمانی وئەخلاقی و کوردایەتیشەوە ئەوانیش هەرچۆن بوایە چەکەکانی خۆیان بهێننەوە ئەوە دەرکران چەند ساڵ بەشانیانەوە بووە لەوشاخە بیفرۆشن بۆماڵ ومناڵیان خۆ کوتاڵیان بەکۆڵ بفرۆشتایە (۲-۳) ئەوەندەیان بۆ خۆیان و ماڵ و مناڵیان پیدا دەکرد ئەو بریارەش بەبریارێکی جەیشی عێراق ساڵی ۱۹٦۹و۱۹۷٦ کەچۆن کەسێکی سەر بەشۆرش یاشتێکی لێ بوایە لەجەیش سزار دەردەکرا ئیشارەتیان بەو بریارانەی رژێمی عێراق دابوو بەرەسمی دەرین کردبون کاك دەرۆیش ئاغا ئەو بریارانەی دەدا لەگەڵ کاك قادرقادر ئەئەویش کردبویان بەجێگری وەزیری پێشمەرگە شەری تەپە سەرقولەی لەبیرچوبوو لەماڵمە یەکێتی دەوریان گرت تائێمە فریایان کەوتین هەمویان لەبیر چوبوو ئێمە بارەگاکانی کەمان هێشتا نەپێشمەرگەو نەکەسمان بۆ نەناردبوو هەر ئەو پێشمەرگانەی هەمان

بوو دابوومان بەجەیشی کوردستان چونکە بەجەیشی کوردمان زانی نەمانزانی ئەو جەیشە کوردە بێشەری ئێمەی دەهێنن لەرادیۆو تەلەفزیۆنی پارتی شەوی ٩-١٢/١٠و ١٠-١١/١٢/١٩٩٣ لەزەردو شینی ئاسمانی بوو بەزو جەردەو ڕێگرو سەر بەئیتلاعات و موخابرات و میت کاك مەسعود خۆشی لەرۆژنامەی الحیات وشرق الاوسط دەڵێت سەر بەئێران و تورکیاو عێراقە کە هەر لەئەوان دەمێنێتەوە لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازیانەی پێکەوە گرێ بدات و تەلەفزیۆنی ئێمەش وەڵامی ئەوانی دایەوە بە بەیانێك و رون کردنەوەیەك لە سەر وەزعەکان رون کردنەوەیەکمان دەرکرد بەڵام لەکۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیران بەگشتی و ئیمزای سەرۆك وەزیرانەوە کاك کۆسرەت بروسکەی کاك جەبار فرمان وەزیری پێشمەرگەو بروسکەی کاك کۆسرەت و بروسکەی مام جەلال هەمووی لەرۆژی ٩٣/١٢/١٦ پارتی لەرۆژنامەی برایەتی بڵاوی کردەوە بروسکەی هەموو بۆ لێدانی ئێمەو بڕیار لێدانمان درابوو ئێمە بەوەمان نەزانی ووتمان لەوانەیە پارتی یەکێتی ئیحراج کردبێت وئەوانیش وتویانە برۆن شەریان بکەن بارەگای لقی هەولێر(٣) قوتابی زانکۆ دەیانخوێند ئەوانی لێبوو هەر پێشمەرگەشی لێ نەبوو لەگەڵ ئەرانەی لق ئەوانیش بێ چەك بون و کاك برزۆیش لەو کاتەدا لەوێ نەببوو سەیارەکەی لەوێ بوو سوتاندبویان ئەنجومەنی وەزیران و یەکێتی شەرعیەتیان بەپارتی دابوو بۆلێدانی ئێمە چونکە پارتی هەر شەری دەکردین بەڵام ئەوەی من چەندجار لای مام جەلال و سەرکردایەتی یەکێتی بەتایبەتی لای کاك کۆسرەت باسم کرد ئەوان ئەوەیان کرد، لەرۆژی ١٢/١٠ ئێمە پێشمەرگەمان هێنایە ناوشار وسەری حسیب صالح و بەلەدیەکەو لای ماڵی ئێمە ڕێگای کەرکوك سلێمانی و غلکەی سەرچنارو لای مەعرەزەکان ولای شەستیەکە و مەکتەبی عەسکەریمان لەوێ بوو هەرچەندە مەکتەبی عەسکەری کۆن بوو چونکە پێشمەرگەمان ناردبوو بۆ جەیش نزیکەی

(٨٠)پێشمەرگەیەکی لێبوو هەروەها سەری زانکۆو ئیزاعەکەمان گرت و ڕێگای هولۆبەمان گرت وجادەی سلێمانی وعەربەت و لەعەربەتیش مەرکەزەکەو هەڵەبجەی تازەو ئەوانەمان گرت بەڵام ئەو شتانەی هێنابومان لەئێران ڕۆری لەبارەگای ناڵپارێز بوون وادیاربوو پارتیش دەیزانی و باسی ناڵپارێز کرابوو مام ڕۆستەم وەڵامی بۆ ناردم ووتی پێشمەرگە بنێرن بائەو شتانەی ناڵپارێز لابەن چونکە دەچنە سەری هەندێك لەسۆسیالیستە کۆنەکان وتبویان گرنگ ناڵپارێزە بۆتاڵان کردن وتبویان ناڵپارێز بگرێت ئیتر هیچیان بۆناکرێت، هەموو جێگاکانمان گرتبووبەباشی لەرۆژی ١٠/١٢\٩٣ لەحەڵەتی شەر بوین من لەسلێمانی بوم بەڵام بەردەوام ئەو رۆژە پارتی جاش و موستەشار و خەڵکیان کۆ دەکردەوە بۆسلێمانیان دەهێنا وئێمەش هەر چاوەرێ بوین بەتەمای شەڕ نەبوین، لە١١/١٢ سەعات (٢)ی پاش نیوەرۆ لەهەولێر کەدوو بارەگامان هەبوو بەکێکیان (٣)چەکی لێبووئەوی تریان (٢)چەکی لێبوودووسێ خوێنکاری زانکۆبوون بەڵام پارتی هەرچی مەسئولین و هێزی خۆیان هەبوو هەرلە عەلی قەلاب و مامند قەشقەوتحسین شاویس و لیوای تایبەتی کاك مەسعود بەقیادەی وەزیری ناوخۆو کاك مولازم یونس رۆژبیانی هەموو پەلاماری بارەگایان دابوو سوتاندبویان و کاغەزی چوار مانگی رۆژنامەی حەفتانەو تابیعەو جیهازی بێ تەلی راکاڵ دوو دانەو دوو رادیۆی(FM) یەکێکی ئیحتیاتی لێبوو ئازووقەی (٣) مانگی لقیان سوتاندن بارەگاکەو سەیارەی کاك برزو لەدوای نەبونی شەری ناخۆ بۆماوەیەکی زۆر لەدوای ١٩٨٧ ورێکەوتنی لایەنەکان پاشان بەرەی کوردستانی وراپەرین و کۆچی(٣) ملیۆنی و هەڵبژاردنی پەرلەمان و حکومەتی کوردی کێ لەو باوەرەدایە بریاری خەتەری شەر دەدرێت ئێمە خۆ دور نەبوین لەحاڵەتێکدا ئێمە هەڵەمان کردبێت یاهەڵەکە لای ئێمە بوبێت هەرچەندە هەرگیز ئێمە خۆمان بەهەڵە نازانین هەرکەس بیەوێت غەدرمان لێبکات

بەرگری لەخۆمان ئەکەین چۆن لەرابوردو ئێستاش وداهاتوش بەپێی توانای خۆمان ئەگەر ئەوان وابیر بکەنەوە بەسەر pkk دا سەرکەوتون چۆن سۆسیالیست دژی ئەوانبێت ئەوەبو شەری ناوخۆی لێ کەوتەوە (٥)ساڵ هەزاران کەسی تێدابوە قوربانی کەلەلێدانی سۆسیالیستەوە لەلایەن پارتیەوە دەستی پێکرد تائێستاش شوێنەوارەکەی ماوە کەئەوان خۆیان دەست پێشخەربون نەدەبوو یەکێ بنێرن نەدەبوو بپرسێ ئەوکارەی ئێوە بۆکردتان نەدەبوو ئەو حکومەت و پەرلەمانە حزبیش نەبین (٢-٣) کەس نین نابێت لێمان بپرسن بۆ ئێمە لیوایەکمان چەك کردووە بۆ ئەوە ناوشارمان گرتووە بۆ لەحاڵەتی شەردابین دەبوو حکومەت خۆی چارەسەری بکردایە یاکاك کۆسرەت سەرۆکی حکومەت بوو بیوتایە من دەچم و چارەسەری دەکەم و چەکەکانیش وەردەگرمەوە و ئەوپێشمەرگانەی ئەوانیش پێشمەرگە بین و کورد بوون و حەقیانە خەباتیان کردوە بۆ ژیانی ماڵ ومناڵیان ببرین یاخود لەخۆوە برۆین بەچاوی خۆیان نەبینن و بالەسەر ایستی یەکێتی بن ئەگەر بۆئێوە قورسە تاچارەسەرێکی کەی بۆ دەدۆزینەوە ئەو حکومەت و پەرلەمانەی خۆمان خەباتمان بۆ کردبوو دانیشین و بریاری لێدان ولەناوبردنی ئەو خەڵکە شۆرشگێرەیان داو بێ ویژدانانە و دور لەهەموو رەوشتێکی نیشتمانی و سیاسی و کۆمەلایەتی و کوردایەتی هەرلەرۆژی ١٩٩٣/١٢/١١ یەکەم فیشەکی شەری ناوخۆ و چەخماخەی شەری ناوخۆ لەکوردستان پارتی لەهەولێری پایتەختی حکومەت و پەرلەمان لێداو بەرۆژی نیوەرۆ ئاگریان لەبارەگای حزب کەخانوی خەڵکی بووبەکرێ گیرابوو بەرداو چەقە دوکەڵی ئەو ئاگرە لەسەر تەلاری پەرلەمانی کوردەوەو ئەنجومەنی وەزیرانەوە تێ دەپەری کەسێك نقەی لێوەنەهات حزبەکانیش کەس دەنگی لێوە نەهات کەس نقەی نەکرد ئەوەسەرەتای هەمویان بێت و لێدانی زەنگی شەری ناوخۆ لەلێدانی حزبی سۆسیالیستەوە لەلایەن پارتی و

بریاری حکومەت وپەرلەمان دەستی پێکردکە(٧)ساڵ بوشەڕی براکوژی یاشەری ناوخۆلەکوردستان وەستابولەئێران بەتایبەتی لەناوەراستی ساڵی ١٩٨٨وەلەدوای ئەنفال وکیمیاوی شکاندنی هێزەکوردوستانیەکان لەبواری سەربازی بۆئێران وسەرسنورەکان جگەلەهەندێك مەفرەزەی بچوکی یەکێتی وحزبی شیوعی وسۆسیالیست کەس لەکوردستان نەمابو بارەگاکانیش جگەلەحزبی سۆسیالیست لەسورێن هیچ حزبێکی کوردستانی لەعێراق نەمابوبەلآم دوای گەرانەکان وپیلانانەی دژی حزبی سۆسیالیست دارێژرا لە کاتێکدا بەشێك لەسەرکردەکانی سۆسیالیست هەڵهاتن و حزبەکەیان بۆمشتێك پارەو مەسئولیاتێکی قەڵب خۆیان کرد بەناو ئەوحزبانەی کەدوژمنیان بون وسەدان لەهاوسەنگەرەکانیان شەهیدکردو بەچاوی شۆرەوە چونەلایان هەندێکشیان بۆدەروەی وڵات کەسوکاری شەهیدانیان بەجێ هێشت بێ بیرکردنەوە لە خەباتی حزب وتێکوشانی ١٠یان ساڵەی حزبی سۆسیالیست کەئەوەشر رێخۆش کەربوو بۆپارتی ویەکێتی ئەوەی لە شاخ ١٥ساڵ پێیان نەکرا سۆسیالیست لەناوبەرن یائەوەی لەشاخ پێیان نەکرا لەئەمرۆدا جێ بەجێی بکەن بەشەری پشت ئاشانیشەوە بەلآم ئێمە دڵنیای هەمولایەك ئەکەینەوە حزبی سۆسیالیست زۆرلەو پیلان وشەرفرۆش وتەماحبازوهەڵهاتوانە گەورەتروبەهێزترەومێژوی پرلەخەباتی خوێناوی لەپێناوی گەل ونیشتماندا ئامانجی وسەرکەوتنی دوارۆژهەربۆحزبی سۆسیالیست وکەسوکاری سەربەرزی شەهیدانەو هەواڵی شەری یاسوتاندنی بارەگای هەولێرمان پێ گەیشت هێزمان هێنایە ناوشارو تەواوی شارەزووریشمان دەست بەسەردا گرت وهەتا عەشائیروناوچەکان چونە سەرجادە گشتیەکان سەیارەیان تەفتیش دەکرد بەدوای پارتیدا دەگەران خەڵکی کوڵکنی و گێڵەك و گردی گۆ کاك ئەحمەدحمە رەشید وکاك کەریم حسێن وکاك موسا لە کوڵکنی وزۆری خەڵك وعەشائیری ناوچەکەو خەڵکی

تەپەرێزینەو زۆربەی دێهاتەکان بەچەکی خۆیانەوە کەحزبی نەبون ئامادەبون بۆپاراستنی ناوچەکان هەمووسەرجادەکانیان گرتبوو لەقەدەفەری و گردەنازێ و تەپەرێزینەو زۆر شوێنی کەش هەموو شوێنەکان گیران واتە جادەی سلێمانی هەڵەبجە و ناو شاری سلێمانیش بەهەمان شێوە و لەوهێزانەی هێنابویانە سلێمانی، لە١٢/١٢ پەلاماری بارەگای نالپارێزیان دابوو بەهێزەکانی جەیشی کوردستان (٤-٥) لیوایان بردبووە سەریان ئەوانیش کەم بون نزیکەی (١٥) پێشمەرگەبون (٣) سەعات شەریان کردبوو تا لێپرسراوەکەیان کاك ئەحمەد تۆفیق سەنگاوی شەهیدبوو خەڵکی چەمچەماڵ لای سەنگاو بوو کورێکی ئازاو دلێرزو پێشمەرگەی کۆنیش بوو ئەو هێزە یەکێتیشی تێکەڵ بوو هەردوولا پێکەوە برن چونکە لەوێ ئازوقەو شتی لێبوو یەکێ لەلێپرسراوەکانیان بریندار بوو لەجایشی یەکگرتووی کوردستان کوری کاك سەرحەدی خەلیفە یونس روخزایی بوو جێگر فەوج بوو لەلیوا لەسەر میلاکی یەکێتی بوو بریندار بوو لەوێ بەجیهازو موەلیدەو قوماش وئازوقەی هەمە جۆرەی دووسالی حزب و وەسائیلی کارەبا و سەیارەو بەنزینخانە بایی(٣)ملیۆن دینار ئەشیای حزبی لێبوو جگە لەبەلگەنامەوئەوەی لەکەرکوك دەستمان کەوتبوو کەمن هێنابووم ئەرشیفی کوردوحزب و زۆرشتی کەش تەنها تەعمیری مەرکەزەکە (٣٠٠) هەزار دیناری تێ چوبوو (٤٨) ژووردوو سالۆنی گەورە هەمووی ئەشیای تێدابوو دەستیان بەسەردا گرت وبردیان، هەرلە ١٢/١٢ پەلاماری بارەگای تەق تەق وکۆیەو رانیەو قەلادزەیان دابوو و گرتبویان و سوتاندبویان و دەوری بارەگای هەڵەبجەی کۆنیان دابوو بەلام لەوێ شەرکرابوو نەیانتوانی بچنە سەریان وەلەدەربەندیخان دەوریان دابوون هەروەها لەکەلارو دەیدان و سەرقەلا بارەگاکانیان داگیر کرابوو لەکەلار عەشائیر چاوەروانیان کردبوو پارتی هێزی کۆکردەوەو یەکێتیش لەپێشەوە دەچون دەیانوت واهێزی پارتی هاتووە تائەوان

نەهاتوون و شەرنەبووە وتیا بچن ئێوە وەرنە لای ئێمەو ئالآی سەوز بکەن بەبارەگاکەدا و بلێن یەکێتین ئەوە کاکە حەمە بریاری داوەو بووە بەیەکێتی لەزۆرناوچە رایان کردبوو،هەر لە١٢/١٢ (١٨) سەیارە بەدۆشکاو بەهاوان گرتمان لە تحسین شاوەیس و سەید تاهیر جەباری و دەرویش ئاغا هەمویمان گرت و دەستمان بەسەر زۆر ناوچەی کەش دا گرت، لە١٢/١٢ کاك مولازم عمرو کاك شەوکەت حاجی مشیر وکاك شێخ جعفروکاك حامیدوکاك محمود سەنگاوی هاتن بەکۆمەڵ وبەجیا سەردانیان کردین و ووتیان کاکە لێدانی ئێوە بریارە و بریاری هەردوو سەرکردایەتی یەکێتی و پارتیە و بریاری حکومەتی هەرێمی کوردسنانە ئێمەش دەبوو لەشەر بین دژی ئێوە بەلآم ئێمە ناچین لەسەنگەری تحسین شاوەیس وئەو جاشانە شەری تۆبکەین تۆ رەفیق و برای ئێمەیت و حەزناکەین توشی زەرەر ببیت دووحاڵەت هەیە یاشار چۆڵ بکە برۆ دەرەوە یا ئەو شوێن وبینایەی ئێستا پێشمەرگەی ئێوەی تێدایە تەسلیم بەحکومەتی هەرێمی بکەن وئەو سەیارەو چەکانەی پارتی لاتانە تەسلیم بە پارێزگاری بکەنەوەو ئێمەش چارەسەری کێشەکە دەکەین بالەناوشار شەر نەبێت منیش پێم ووتم ئێمە شوێن چۆڵ بکەین دوای دەیگرن شوێنەکە ئێستا ئێمە هەموی لەدەستمانە چەندجار چون خاڵەحاجی یان لەپارێزگا قەناعەت پێکردبوو کەوا ئێمە ئەو جێگایانە چۆڵ بکەین ئەویش هاتەوە لەگەڵ من باسی کردو ئێوارەکەی کاك شێخ جعفر هاتەوە لەگەڵ کاك حامید دا ووتیان ئەگەر بەقسەی ئێمە دەکەیت دەبێت ئەو جێگایانە چۆڵ بکەیت و سەیارەکانیش بدەیتەوە مامۆستا جەمال عەبدول کەپارێزگاری سلێمانی بوو لەسەعاتێکدا دەجار داوای سەیارەی تحسین شاوەیس و موستەشارەکان و سەیارەی دەرویش ئاغای لێ دەکردین بەری بدەین دواجار کاك شێخ جعفروکاك حامید قسەی نەکرد بەلآم کاك شێخ جعفرباسی چۆڵ کردنی کردەوەوبرادەرانی

کەش هەرلەویٚ بوون ووتم ئەگەر ئێمە ئەوجێگایانەی ناوشار چۆڵ نەکەین،،ووتی ئێمەش لێتان ئەدەین چونکە ئەمری سەروی خۆمانە وتویانە نابێت بەتەواوی ناوشار چەکداریان هەبێت و شار لەژێر کۆنترۆڵی ئێوە بێت حکومەت نیەو قبوڵی ناکەین و بریارە من پێم خۆش نیە بەلاٚم ئێستا هاتوین وەکو رەفیق هاتوین.. ووتم ئەگەر پارتی گرتی دوای چۆڵ کردنی ئێمە وتیان نا ئێمە تێی دەچین ونایەڵین پارتی ئەوشوێنانەبگرێت.. ووتم ئەگەر پارتی تێی رۆیشت و زاڵە بەسەر بارەگاکانی ئێمە و تەلەفزیۆن و لق و شوێنەکانی کەمان ئەوکات هەڵوێستی ئێوە چۆن دەبێت وتیان ئێمە بیٚ لایەنین لەشەرەکە..ووتم کەبیٚ لایەنن ئێستاش بیٚ لایەن بن و ئێمە ئەو شوێنانەمان لەدەستە وتیان ئێستا بێلایەن نابین بریاری شەرمان پێیە لەگەڵ پارتی لەئێوە بدەین بەلاٚم ئێمە نامانەویٚ لەسەنگەری تحسین شاوەیسەوە شەری ئێوە بکەین بریاری حکومەت و سەرکردایەتی هەردوولایە لێرە دەرکەوت پەیمانەکانی یەکێتی نیشتمانی بۆئێمە هەروابوو خۆمان تەوەقوعمان دەکرد یەکێتی جارێکی کەش پەیمانی خۆی تاسەر نەبرد شکانی خاڵەحاجی هاتەوە ووتی من بەبریاری خۆم حەسیب صاڵحم چۆڵ کردووە لەسەر بریاری هەموو حزبەکان هەروەها لەپارێزگا ئێمە هەموسەیارەو چەکەکان کەگیراون تەسلیم دەکەینەوە بەئامادەبونی هەموحزبەکان ئەم شەویش بەیانی هاوبەشی هەموو حزبەکان بلاٚو دەکرێتەوە لەتەفزیۆنی هەموو لایەنەکان کەشەری پارتی و سۆسیالیست راگیراوەو سبەینیٚ لیژنەی هاوبەشی پارێزگاوکاک عمری سەیدعەلی و خاڵەحاجی دەچنە شارەزورو زۆر شوێنەکانی کەو چارەسەری دەکەن ووتم شتی وانابێت وئێمە زەرەری لیٚ دەکەین خاڵەحاجی زۆر دڵنیابوو وادەبێت من دڵنیابوم کە ئەوپەیمانانە هەروەعدەو جیٚ بەجیٚ ناکریٚ هەرواش دەرچو سەعات(١)ی شەوکاک سەیدتاهیرجەباری ئەوکات ئامربەتالیون بوولای پارتی کورەکەی نارد ووتی

سەعات(١٢/٣٠)ی شەوی ١٢-١٩٩٢/١٢/١٣ بروسکەی کاك مەسعود هاتووە دەڵێت دەبێت هێرشیان بۆبکەن و لەناویان بەرن و کەسیان نەمێنێ و هەموویان بەدیل بهێنن بۆم، هیچ جۆرە رێکەوتنێك لەگەڵ سۆسیالیست ناکەن ئەوەشی کراوە هەڵوەشێتەوە یەکێکی کەش لەپارتی تەلەفۆنی کردو ووتی وائێستا جەنابی قادر قادر جێگری، وەزیری پێشمەرگە لەگەڵ هێزی رانیەو قەلادزەو هەونێرو کۆیەی پارتی دا گەیشتن و ئەم شەو هێرش دەکەن بەرەو زەرایەن بۆلێکدانەوەی جادەی نێوان سلێمانی دەربەندیخان وپاشان پەلاماری ناوشاریش دەدەن و هەرئێوەش حەسیب صاڵحتان چۆڵ کرد پارتی تێ چوو پۆلیسی پارتی جوامێر ناوێك لەپۆلیس لەگەڵ بەکرحاجی فەرەج ناوێك چونە سەر حەسیب صاڵح و قوەتێکی بۆلای بەلەدیەکە ناردووە وەبۆ (٦٠)مەتریەکەش قوەتیان ناردووە مەرجێگایەك سۆسیالیست چۆڵی کردووە لەسەر بریاری حزبەکان وحوکومەت ئەوان بۆی چون بەخاڵەحاجیم ووت ئەوە من زانیم ئەو جێگایانە دەگرن ..خاڵەحاجی تەلەفۆنی بۆمامۆستا جەمال کرد ئەویش هەر دەیوت سەبر بگرن وچارەسەر دەکرێت وادیاربوو دەسەلاتی نەبوو جگە لەوەی دەسەلاتی بەسەر ئێمەدابوو (١٨) سەیارەی لاندکرۆز وپیکابی تحسین شاوەیس و ئەو جاشانەی لێ وەرگرتینەوە سەیارەیەکی دەرۆیش ئاغا مابوو سەعات (١)ی شەو خۆی حیمایەی نارد لەماڵەوە دامانەوەو بردیەوە بەپاڵ بردیان چونکە دەیانزانی شەر دەست پێ دەکات و سەیارەکانیان دەفەوتێ، شەوی ١٢-١٢/١٣ چەند جارێك ئەو بەیانە خوێندرایەوە کەهەموو لایەنەکانی تێدا بەشداربوون و شەرکۆتایی پێ هات و لیژنە دامەزراو سبەینێ چارەسەری کێشەکان دەکەن سەعات(١٢/٣٠)ی شەو..بروسکەی کاك مەسعود دەڵێت پاکیان بکەنەوە ئەوانە خائینن و بەکرێ گیراون و جاسوس و قسەی لەوبابەتە ئەوبروسکەیەش لەوکاتە نەگەیشتبووە دەستمان یەکێتی یش وادیاربوو

چاوەڕێ ی ئەوە بوو بڵێم یەکێتین و ئیتر کێشەکە کۆتایی پێ بێت ، سەرلەبەیانی ڕۆژی١٩٩٣/١٢/١٣ سەعات (٣) بەیانی هێزیان نارد بۆسەر عەربەت ئاگاداری مامۆستا جەمالمان کرد واهێزیان نارد بۆ سەر برادەرانمان ئەویش قسەی لەگەڵ قادر قادر و دەرۆیش ئاغا وئەوان کردبوو وتوبویان هێزێکی لقی (٣) مان لێرە بوون و گەراونەتەوە بۆ لقی (٣) لەدەربەندیخان واحسك ڕێگای لێ گرتون لەعەربەت وئێمە ناچاریشن هێز بنێرین بۆ کردنەوەی ڕێگامان لەوکاتەشدا عەشائیرو خەڵکیان دەنارده لای لێپرسراوەکانی ئێمەو پرس و رایان پێ بکەن وبیان ترسێنن وڕێگایان بۆچۆڵ بکەن یا تەسلیمیان ببێت لەوانە کاك سەرحەدخەلیفە یونس و جەوهەرحمە صیدیق خان و زۆری کەیان نامەیان بۆ برادەرانی ئێمە نوسیبوو کەخۆیان بەکوشت نەدەن وباجاف بەکوشت نەدریت باتەسلیم بن هەندێك یەکێتیش چون بۆ هەڵەبجەو سەیدصادق وتبوویان تەسلیم بن و ئاڵای سەوز بکەن بەسەبارەکانتان و بارەگاکانتاندا ئەو ڕۆژە برادەرانمان نامەیەکیان ناردبوو دەڵێت لێرە برادەرانی یەکێتی دەڵێن گوایە ئێوەش ئاڵای سەوزتان هەڵکرتووە ئەو دەڵێت شتی وا نەکەن هەرچەندە باوەرم نیە خەمی ئێمەشتان نەبێت لێرە ئێمە هەموو ڕێگاکانمان گرتووە نامەیەکی بەهیمەتانە بوو لەوکاتەدا.. بارەگای کفری بەرەنگاریان کردبوولەهەندێك جێگای کەش وەبارەگای تری حزب نەیانتوانی بوو برۆنەسەری وەبارەگای کەلار بەعەشائیرو قسەی خۆش وقائیمقام سەرتیپ حمە ئەمین بەگ چوبوو کەلەسەرپارتی حیساب بووهەرقائیمقامی زەمانی رژێمی بەعس بو هەرلەسەر بۆستەکەی مایەوە ئەو زەحمتی لێ کردبون وەبارەگای باوەنور هەرلەجێگای خۆی بوو پێشمەرگەکانیشی زۆریان لەسلێمانی بوون ئێمەش زۆری هێزمان ناردەوە شارەزوورو دڵنیا بوین لەوەی شەر نابێت لەسلێمانی.. سەعات (٨)ی سەر لەبەیانی زانییان کەهەمووشوێنەکان ئێمە چۆڵمان کردبوو یەکێتی کەسی تێ

نەچوبوو بەڵکو هەموی تەسلیم بەپارتی کرابو چەکداری پارتی تیَ چوبوون و شوێنەکانیان گرتبوو لەتاسلۆجەش موستەشارەکان چوبونە سەربارەگاکە کەرێکخراوی لیَ ببوو لەسەعات (٨) بەیانی هێزی ئێمە زۆری لەویَ نەمابوو پەلاماری بارەگاکانی چوارباخیاندا و بەرەنگاری تێدا نەبوویازۆرکەم چونکە حەسیب صاڵح موسەیتەربوولەسەر بارەگاکانی سۆسیالیست کەیەکێتی بەناوی حوکومەتەوە بەئێمەیان چۆڵکردوتەسلیم بەپارتیان کرد گرتبویان سەیارەیەکمان لەگەراج دابوو بەجیهازەکەیەوە گرتبویان وبارەگاکان شتی زۆری تێبوو وەکو فۆتۆکۆپی و رۆنیۆو فۆتۆ ئستێنسلَ و تابیعە و زۆری شتی راگەیاندن چونکە لە١٩٩١ وە بارەگا بوو هەروەها کارگەی خەیاتە کەرێکخراوێکی فەرەنسایی بۆ شەهیدانی حزب دابینابوو کەسوکاری شەهیدان ئیشیان لیَ دەکرد ئەوبارەگایەی قەرارگایش کەهەمیشە کێشەمان لەسەری هەبوو ئەویش هەرلەویَ گیران و بارەگای لقمان لەگەلَ بارەگای یەکێتی لای سەهۆڵەکە پێکەوە بون لەوێش هاتنە سەریان پێشمەرگەیەکیان شەهید کردبوو بەناوی جەمال محمود وەپێشمەرگەیەك بریندار بوو ئێمە وتمان دەچینە سەر بارەگای چوارباخ یەکێتی وتیان ئێوە ئێستا بێن شەر دەست پیَ دەکاتەوە ئێمە وەری دەگرینەوە بەناوی ئاسایشەوە زوو چۆڵی دەکەین بۆخۆتان و کارگەکەوشتی زۆریمان هێناوە لە ئینزبات خانەکەیە دەتان دەینەوە کەهەر ئەوەبوو قسەش بوو نەدرایەوە خانوەکانیش یەکێتی تێی چون و چۆڵیان نەکرد هەتا کورسیە شکاوەکانی تێدا نەمابون هەرهەمان رۆژ پرس وراکرابوو لەدەوری بارەگای لق لەدەربەندیخان گیرابوون ئەوانیش تەسلیم یەکێتی و ئاڵای سەوزیان پیاکردبو کاك عەتاسەراوی و ئەوانیش چوبونە مەقەری یەکێتی خۆیان شاردوەوە کاك عەتا هەتا وەعدی دابوو ببێتە یەکێتی و نامەیەکی بۆ من نوسیبوو کەدوای دەرکەوت ئەوەی بەویان وتووە وانیە کاك عەتا گەرایەوە لامان وتی

چاوراویان لەمن کردوە ناچاربوم چومەتە مەقەری یەکێتی پەیوەندی جهاز نەمابوو لەگەڵ هێرش بۆسەرچوارباخ وسەهۆڵەکە و هێرش بۆسەر مەقەری مەکتەبی عەسکەری بەرامبەر شەستیەکەو مەعرەزەکان و بۆسەرماڵی ئێمەش دەستی پێکرد لەماڵەوە هەر حەرەسەکەکانی خۆم وعبداللەو محمدویاسین مستەفا وەرتێی و هێمن وەرتێی وکاك عەزیزلە تەقتەق وزۆرنەبون (١٠)پێشمەرگەی کەش هاتبون دامەزرابون هەرچەندە زیاتر لە (٣)هەزار چەکداری پارتی بەهاوان وتۆپ و دۆشکا وئار.بی.جی لێیان دەدایین بەلأم نەیان دەتوانی بێنە سەرمان پێشمەرگەکان شەری باشیان کردو خۆشم چومە سەربان نەیان هێشت هاتن وتیان زەخت کەوتۆتە سەر مەکتەبی عەسکەری کاك کەمال کوێخا عمروجەبارو نادرو زۆری کەش نزیکەی (١٠٠) کەسێك لەوێ کۆببونەوە ووتیان زەختیان لەسەرە ئێمە وتمان سەرێکیان لێ بدەین کاك عەتا باشکی سەیارەی هێناعومەری حاجی عبداللەیش پارتی بو هەرئەوسەعاتە هانەوە بەرێ کەوتین بۆ مەکتەبی عەسکەری تەقەمان لێکراو کەوتین بەسەردوو پێشمەرگەی برینداردا وتیان ئەوانە حەرەسی ماڵی کاك محمود سەنگاوین بەبۆنەی ئێمەوە برینداربون ئێمەش دابەزین هەڵیان گرین یەکێ بانگی کرد ووتی بەڵکو بیان هێننە ئێرە سەیرمان کرد ماڵی کاك محمود بوو بریندارەکانمان کۆ کردەوە پیاوێك لەوێ بوو ووتی وەرن سوتفە گەیشتین تەقەکان لەئێمە کرا دای لەقاچی پێشمەرگەیەك واتە دووپێشمەرگە برینداربوو لای ماڵی کاك محمود ئەوان و کاك محمود تا سەرقاڵی ئەوە بوون دوو پێشمەرگە لەمەکتەبی عەسکەریەوە هاتن یەکێکان کاك حەمەی رمەزان بوو ووتی لای ئێمە نەیان توانیوە بێنە پێشەوە هەر لەوکاتەش ناردیان بۆ هاوان و فیشەك منیش ناردم لای کاك مولازم عمر هاوانی (٦٠)ملم ی بۆ ناردم وەبۆفیشەك ناردم بۆلای کاك ئەحمەد قەدەفەری دوو سندوق فیشەکی بۆ ناردم منیش ناردم بۆماڵەوە وەسندوقێ لەکاك

خەلیل سەرکانی بەقەرز لێ وەرگرت پێویستمان پێی بوو ئێمە زۆر سەرقاڵ بوین کاك محمود گەرایەوە لەوکاتەدا خاڵە حاجییش لەسەر بریاری ئێوارە چوبون لەگەڵ برادەرانی یەکێتی برۆنە پارێزگا وەلەوێ بۆ شارەزوور کەدەگەنە لای ئاسایش تەقە دەبێت دەزانن شەر دەستی پێکرد لەگەڵ کاك مولازم عمر پێکەوە دەبن دەگەرێنەوە دەچنە مەڵبەندی یەکێتی بەسوتفە چوبووە ئەوێ کاك محمود گەرایەوە ووتی تازە نیوەرۆیە باشتێك بخۆین و ئەوکات تۆ پێویست ناکات وئێمە دەرۆینە لای برادەرانتان ئەگەر پێویستی کرد لەوکاتەدا ئەکەرەم بریندار بوو شەهیدمام والی قاجری بریندار بوو دوایی شەهیدبوو کورێکی کەشمان بریندرابووکاك یاسین باقی هەرلەماڵی ئێمەدا لەو دەوروبەرەدا تانانێکمان خوارد لەماڵی کاك محمود سنگاوی وکاك کەمالی کوێخا عمر هات بۆ فیشەك وتی مەکتەبی عەسکەری وهەموو جێگاکانی لەدەستی خۆمانە گەراینەوە بۆ سەرگردەکە پارتی شکان نەماڵی ئێمەو نەمەکتەبی عەسکەری نەیانتوانی لەگەڵ زۆری هێزەکەیان و چەك و خۆئامادە کردنداو توپ و هاوان دۆشکاو جاش وموستەشار تحسین شاوەیس وسەید تاهیرجەباری وعومەرە بچکۆڵ وعوسمان هوکل وهەرچی موستەشاری سلێمانی وکەرکوك دەکان ورانیە وچەمچەماڵی سەربەپارتی لەگەڵ جەیشی یەککرتوی کوردستاندا لەگەڵ ئامادە نەبونی ئێمەشدابو شەربەکامیرای ڤیدیۆ رەسمی شەرەکە گیرابوو ماڵی ئێمە زۆر گولەتۆپ وهاوانی بەرکەوتبوو بەڵام جەماوەری شاری سلێمانی رابەرین و هاتنە سەر جادەو بەجارێك بەرەو پارێزگاو بەرەو ماڵی ئێمەو جگە لەوەش کۆمەڵێك لەپیاوە ناسراوەکانی ناوشاری سلێمانی لەپیاوی ئاینی و کۆمەلایەتی و سیاسی هەمووی هاتنە لای ئێمەو ئەوان دوای ئەوەی هەرچی هەولیاندا بۆیان نەکراو شکانەوە بەلام دوای ئەوە زۆر لەلێپرسراوەکانی یەکێتی و کادرەکانی یلە دوو هاتن و سەردانیان کردین، کاك برزو مام رۆستەم و ئەوان

لەهەولێرەوە بۆیان هێنانیەوە سلێمانی و ئەورۆژەش تەلەفزیون و رادیۆ هەرایان کردوو خاڵەحاجی شتەکانی دەدانێ و کاك محی الدین رەحیم هاوکاری کردین بۆ هەندێك زانیاری لەسەر پارتی قسە بکەین و ئەوەی راگەیاندنی ئێمە دەورێکی گرنگی هەبوو هەمان رۆژ هێرشیان بۆ هەڵەبجەی تازە کردبوو چەند جارێك شکابونەوە و سەید محسین تاوگۆزی لەزەرایەنەوە عەشائیری کۆکردبووەوە گوایە لەپێش تحسین شاوەیس وئەوانەوە بروات و لەدواوە هێرش بکەن بەلاًم تەقەبوو نەیان وێرابوو برۆنە پێشەوە هێزی پارتی لێبوو ئەوەی لەوێ پارتی بوو بارەگا لەپارتی گیرابوو دابویانەوە یەکێتی و ئاڵای سەوزیان پیاکردبوو یەکێتی تێ چوبون کاك حسێن خەلیفە و زۆری لێبوو پێشمەرگەو جەماوەری هەڵەبجەش هەولیان زۆردابوو بەتەلەفزیون لەشارەزوور بەنامە نوسین و قسەی لەوبابەتە نەیان توانی برۆنە هەڵەبجە و مقاوەمە کرا لەوێ لەسەعات (٢)ی پاش نیوەرۆ هێرشی جەماوەر دژی پارتی وشەروەستاو تەلەفزیۆنی سۆسیالیست لەخرۆشاندنی جەماوەر دەورێکی گرنگ وباشی هەبوو جەماوەر پەلاماری سەیارەکانی دەرۆیش ئاغاوقادرقادرو لێپرسراوەکانی پارتیان دا لەپارێزگا سەیارەکانیان شکاندو هەرچی لەناو سەیارەکان بوو بەچەك و جانتاو شتی کەوە جەماوەر بردی و خۆیان لەپارێزگادا شاردبوەوە وتەقەیان لەخەڵکەکە کردو برینداریان کرد جەماوەر پەلاماری دان کاك مولازم عمر لەسەیارەکەی خۆیدا لەدەستی جەماوەرەکە لەدەرگای پشتەوەی پارێزگاوە بەسەیارەکەی خۆی دەرباز کردبون و مولازم کەریم کەلێپرسراوی لق بوو ئەویش دەوری خراپی هەبوو لەماڵی ئەوانیشەوە تەقە لەئێمە دەکرا جەنازەی مام والی لەنەخۆشخانە بوو داوامان کرد بیبەنە مزگەوتی حاجی مەلا حەسەن لای ماڵی خۆمان بوو بۆئەوەی رۆژی ١٩٩٣/١٢/١٤ داوامان لەجەماوەر کردوکاك مولازم عدرعبداللەیش دەوری زورباشی هەبو بەلاًم وەکوخۆی زیاتر لەوەی

که ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی بێت یەکێتیش هاوکاری کردین و هەمو ڕێکخستنەکانی خۆی ئاگادار کرد کەلە١٢/١٤ ئامادەبن ئێمەش داوامان کرد ئەو ڕۆژە خۆپیشاندان دژی جاشەکان ومستەشارە بەشداربووەکان ودژی پارتی بکەن وئەو تاوانەی دژی حزبی سۆسیالیست کردویانە بەلام کاك مولازم عمر دەورێکی باش ودلسۆزانەی هەبو بوخۆپیشاندانەکە وەهەر لە١٢/١٣ لەپێنجوێن پارتی هێزیان نەبوو بەلام یەکێتی چویونە لای برادەرانی ئێمەو وتبویان ئەوە بارەگاتان لەهیچ لایەك نەماوە ئێوەش تەسلیم بەئێمەی بکەن ئێمەش چاودێری دەکەین وئالایەکی سەوزیان پیاکرد وهەرچی تیابوو تالانیان کردو بارەگای هێزەکەیان بلۆك وداروشتەکەشیان بردو فرۆشتیان دوو موەلیدەی کارەبای گەورەشی تیابوو بارەگای بەرزنجەشیان پەلامار دابوو نەگیرابو زۆری بارەگاکانمان لای یەکێتی بون بارەگای دەربەندیخانیان دوای یەك سال داینەوە ئەویش نیوەی و نیوەکەی کەیان نەدانیەوە پارتی بەئاشکرا شەریان ئەکردین بەلام یەکێتی لەژێر پەردەی دۆستایەتیەوە دەستیان بەسەر بارەگاکان وکەل وپەلی حزبی سۆسیالیستدا دەگرت بەلام هەلوێستی جەماوەری شاری سلێمانی بۆ هەموو لایەکی رون کردەوە کەدژی زولم و زۆرن وپشتیوانی لەحەق دەکەن بارەگای لقمان هەر یەکێتی ئالای سەوزی پێیاکرد لەسەهۆلەکە لەو شەرەدا ئێمە (٣) شەهیدمان هەبوو لەگەل (٢٥) بریندار وەلەجەماوەر (٩) شەهیدو (٧٢) بریندار بەپێی راپۆرتی نەخۆشخانە پارتیش نزیکەی (١٥) برینداریان هەبوو لەوانە برایەکی شەهیدەدنان کەمال لقی (٣)یان بریندار ببوو لەعەربەت لای تحسین شاوەیس بوو کۆنە پەکگرتنەکان دەوری خراپیان هەبوو هەرلە١٢/١٣ عەلی بچکۆل وازی لەپارتی هێناو هاتەوە لەگەل چەند کەسێکی کەشدا بەلام ئەحمەد قەدەفەری یەکێتی بوو هات و رەئی باش بوو هەتا ئامادەیی تێدابوو لەکاتی پێویستا شەر بکات زۆر لەلێپرسراوەکانی یەکێتی ئەو

ئامادەیەی خۆیان پیشان داین سوپاسیان دەکەین بەلاّم لەسەر وەعدی حزبەکان بەگشتی و بەکێتی بەتایبەتی هێزمان لەجێگا حەساسەکان وناوشار کۆکردەوەو پارتی فرسەتی لەوە هێنا پەلاماری داین لەناو شارو لەجێگاکانی کەش وایان دەزانی هەموومان گیراوین هەندێك مەعنەویاتیان روخابون بزوتنەوەی ئیسلامی هیچ دەورێکیان نەبوو هەتا بۆ ناوبژی کردنشیان پیّ نەکرا کاك شێخ محمد بەرزنجی تەلەفۆنێکی کرد بەلاّم ئەویش گەیشتە قایمی شتێکی وای نەکرد وپاشە کشەیان کرد لەناوبژیوانیش ئێمە خۆمان ئامادە نەکردبوو بۆشەر و هەر باوەریشمان نەبوو شەر دەبێت یادێنە سەرمان و شەرمان دەکەن لەکوردستانی ئازاد دا یابەقسەی خۆیان تەجروبە نویّ یەدا هێزی نیزامیمان نەبوو ئێمە چاوەریّ ی شەر نەبوین ئەوان (٣٠٠٠) کەسیان بەناوی سوپای یەکگرتووی کوردستانەوە ئامادە بوون و حازربوون جگە لەوهەموو کۆنە جاشەی پارتی کۆیان کردنەوە سەرمان وهێزی ناوچەکانی کەیان بۆهێنابوین.. ئەوان بریاری خۆیان دابوو وخوێنمان حەلاڵ کرابوو تائەوکاتە حکومەت و پەرلەمان دووبریاری مێژویان دابوو دوو شەریشیان شەری مێژوویان بەسوپاکەیان کردبوو یەکیّ لێدانی پەکەکە کوردی تورکیاو دووهەم لێدانی سۆسیالیست هێزێکی هاوپەیمانی خۆیان بوو، لە١٢/١٣ خاڵەحاجی هەر لەمەڵبەندەوە بروسکەیەکی کردبوو بۆمام جەلال و وتبوی بۆ واتان لەگەڵ کردین و شەرعیەتان دا بەپارتی شەرمان بکات ئێوە وەعدتان دابوو مام جەلال وەلاّمی دابوەوە و وتبوی ئێوە خروقاتان کردوە و ئێوە دەست درێژیتان بۆسەر حکومەتی هەرێم کردووە بۆ سەر لیوایەکی سوپای یەکگرتوی کوردستان واتە وەلاّمەکەی تەئیدی لێدانەکەی ئێمەو پشتیوانی لەپارتی بوو.. بێزاری جەماوەر گەیشتە ئەوپەری لوتکە دژی پارتی و ئەوشەرە بەناحەق بە سۆسیالیست کرا بەلاّم ئەوەی خاوەنی هەڵوێست بومامۆستا بەهادین نوری دیموکراتی خوازان و ئەنجومەنی شار

یا شوراکانی شار بەیانیان دەرکرد دژی ئەوکارەو پارتیان ئیدانە کرد ئیتر هیچ حزب ولایەنی سیاسی هەڵویستیان نەبو، خوێندکاران ولاوان هاتبون وداوای رومانەیان کردبوو خۆیان بتەقێننەوە لەلقی (٤)ی پارتی و لە (UN) (١٢) رومانەیان بردبوو خاڵەحاجی پێی زانین و چوبوو لێی وەرگرتبونەوە من نەمزانی بوو بەو کارە بەراستی جەماوەری حزبیش زۆریان بەناحەق دەزانی لیمان کراوە، سەرلەبەیانی ١٢/١٤ لەبەردەرکی سەرای کۆن زیاتر لە(٢٥٠) هەزار کەس خەڵکی سلێمانی و دەوروبەری کۆبوەوە یەکێتیش توانای خۆی سەرف کرد بۆئەو خۆپیشاندانە بەئالأی شین و سەوزو سورەوە جەماوەر نارەزایی خۆی دژی شەری ناوخۆ دەردەبری و راگەیاندنی سۆسیالیست دەوری خۆی هەبووجەماوەر بەرەو لقی (٤) بەرێ کەوتن ئەوانیش تەقەیان لێ دەکردن لەهەموو لایەکەوە جەماوەر هێرشی کردو هەندێك نارنجۆکیان هەڵدا بۆیان کاك شێخ محمد بەرزنجی کەوتە نێوان جەماوەرو بارەگای پارتیەوە وادیاربوو لەبارەگای پارتی بوو ئەو کاتە تەقەیان لەجەماوەر دەکرد جەنازەی مام والیش لەناو جەماوەرەکەدا برو جەماوەر گوڵ بارانی جەنازەکەیان دەکرد وپارتیش تەقەیان لێ دەکرد چەند کەسێك شەهید وبریندار بوون لەخەڵکی بێ تاوانی شاری سلێمانی خەڵکەکە دەیانوت دەبێت جاشەکان تەسلیم بکەن ئەو پێشمەرگانەی بێ چەك بون سۆسیالیست هەندێکیان گیرابوون بەری بدەن هەرلەوێ پێشمەرگەکانیان بەرداو لقی چواری پارتی بەردباران کرا و قسەی ناشیرینیان پێ وتن ئەگەر تەقە کردن لەجەماورەکە نەبوایە و داوای پارێزگاری سلێمانیش پەیتا پەیتا هەموو دام و دەزگاکانی پارتیان دەپێچایەوە جەماوەری کوردستان بەتایبەتی شاری سلێمانی پشتیوانی خۆیان بۆسۆسیالیست دوپات کردەوە و تف و نەعلەت و سوکایەتیشیان بەپارتی کردو قیادەکانیان خۆیان شاردبوەوە و قیادەیان دەکردکاك مولازم کەریم وکاك

قادرقادرو كاك دەرۆيش ئاغا و هەندێكی كەش بوون من پێش راپەرینەكەوكۆبونەوە جەماوەرەكە چومە سەرجەنازەی مام والی لەمزگەوت لەخۆپیشاندانەكەدا نەیان هێشت من برۆم خاڵەحاجی رۆیشت وبرادەران هەمویان ویەكێتیش كاك مولازم عمر و كاك شەوكەت و دەیانی كەیان لەپەرلەمان و سەركردایەتی بەشداربوون بەلاّم تا بەردەركی سەراو دوای قسەكانی پارێزگار گەرابونەوە ئێمە زەرەرمان كرد بەلاّم ئەوەش سەركەوتنێكی سیاسی و جەماوەری گەورە بوو بۆحزب لەوكاتەدا، لە١٢/١٥ رۆژنامەی كوردستانی نوێ ی یەكێتی رودأوەكانی رۆژی ١١و١٢و١٣و١٢/١٤بلاّوی كردەوە بەوردی باسی هەموو راپەڕین دژی پارتی كرد بەلاّم بەناوی حزبی سۆسیالیستەوە باسی نەكرد لەهەموو رگەیاندنی یەكێتی ئێمەی حزب ناونەدەهێنا بەجەماعەتی محمد حاجی محمود ناو دەبرد وادیاربوو لەگەڵ پارتی وارێكەوتبون وەكوحزب لەگەڵ ئێمە یاناومان نەبەن هەموی بلاّوكرایەوە، شەوی ١٤-١٢/١٥ من لەسەرئەو روداوە قسەم كرد لەتەلەفزیۆن ورادیۆ بەوردی قسەم كرد تائەوكاتەش یەكێتی چاوەرێ بوون بۆینە ناویان من پێشترولەكاتی بریاردانی رێكخستنەوەی حزب دا لەگەڵ مام جەلاڵ باسم كردبوو خۆشم تەنها بم لەكوردستان هەر درێژە بەسۆسیالیست دەدەم قسەم لەسەركردو سوپاسی جەماوەری شارو ئەو لایەنانەی هاوكاریان كردوە بۆ راگرتنی شەرەكەو خەڵكی شار دوپاتیان كردەوە لەرۆژی رەشی (٦)ی ئەیلول پەلاماری دەزگاكانی رژێم دران دەستریژی مەترە لۆز و دەیان كەس شەهید بوو ئەمرۆش پەلاماری بارەگای پارتی و ئەو پاشماوەیەیان داو بەردەستریژی بی .كەی .سی . كەوتن و شەهیدو بریندایان دا و رێكخستنەكانی حزبی سۆسیالیست سوپاسمان كردن و وتمان ئێمە نامانەوێت لەناو شار شەر ببێت وەكو خۆتان بەچاوی خۆتان دیتان و لەپێشوازی پیاوانی شاری سلێمانی لەرۆژی ١٢/١٤ جارێكی كەش دووپاتمان

کردەوە ئێمە گوێ رایەڵی جەماوەرین و ئێستا پێمان بڵێن هەر ئەم شەو هەموو شار چۆڵ دەکەین و دەرۆین بۆئەوەی کەسێك بەبۆنەی ئێمەوە توشی زەرەر نەبێت و ئێمە رێبازێکمان هەیە و جەماوەرو رێکخستنەکانی حزب دڵنیا دەکەینەوە کەسورین لەسەر رێبازی حزب تادوا هەناسەمان و رەنگی شین کفنمان دەبێت هەموو لایەك دڵنیا بێت ئەو قسەی ئەو شەوە کردمان تەئسیری خۆی هەبوو ئێمە شەری رژێمان کردوەو لەکەس ناترسین شەرمان پێ بفرۆشن بەرگری لەخۆمان دەکەین بەلاّم پەرلەمان و حکومەت نەدەبوو بریاری شەر دژی سۆسیالیست بدات و ئەوە سەرەتای شەری ناوخۆ و براکوژی دەبێت و کوردستان بەرەو ئەوە دەچێت وەکو لوبنانی پێشوی بەسەر بێت ئێمە دەتوانین زۆر شت بکەین وامان زانی سوپای کوردستان دەمان پارێزێت نەك بێتە سەرمان و وامانزانی پۆلیسی کوردستان بۆخزمەتی گەلەو ئێمەش بەر دەکەوین نەمانزانی دێنە سەرمان وامانزانی (١٥) ساڵی شاخ ئەوەش دووساڵە لەکوردستان پاداشتی شۆرشگێرەکان دەدرێتەوە نەك هێنانی کۆنە جاش و موستەشارەکان بۆ سەرماڵ ومناڵ و بارەگاکان و پێشمەرگەی دەیان ساڵە، لەشەوی ١٤-١٢/١٥ رادیۆی لەندەن و کوێت وعێراق و بەشی عەرەبی ئەمریکاو مۆتیکارلۆ هەموویان باسی روداوەکانی شەری نێوان حزبی سۆسالیست و پارتی کرد لە هەموو لایەك زۆربەی رۆژنامەکانی حەیات و شەرق ئەوسەت و بیانیەکان باسی کرد کاك عادل مرادیش لەوکاتە لەلەندەن دەوری هەبوو بۆ بلاّو کردنەوەی قسەی کردبوو لەگەڵ رۆژنامەکان و تەلەفزیۆنەکان رادیۆو رۆژنامەکانی عێراق رۆژانە بەدورو درێژی باسی روداوەکەیان دەکرد بەناوی سۆسیالیست و پارتی و بەناوی بارزانی و هارونیەوە رۆژانە بلاّو دەکرایەوەوەو باسی شەرەکان و کۆنترۆڵی جادەی هەڵەبجەو کوشتاری خەڵك و ناوشاری سلێمانی بەردەوام بوو رۆژنامەنوسەکان کاك مەسعودیان بەگیرهێنابرو باسی شەرەکەیان

لیٚ پرسیبوو کەجەنابت دەڵێت سۆسیالیست نیە و محمدحاجی محمود جاسوسی ئێران و عێراق و تورکیایەو بۆ تەخریب و تێکدانی حکومەت و پەرلەمان چەك وەردەگرن و شەرمان دەکات و لەوقسانە هەمان ڕۆژنامە پرسیاری لەمام جەلال دەکات بزانیٚ لەوکاتەدا لەدەرەوە بوو مام جەلال قسەکانی کاك مەسعودی راست کردبووە و بەپێچەوانەوە قسەی کردبوو پارتی بەقیادەی مەسعود بارزانی هێرشیان بۆسەر سۆسیالیست کردووە و هێزەکانی یەکێتی کەوتونەتە نێوان و دوو بارەگای سۆسیالیست گیراوە بەڵام یەکێتی کەوتوەتە نێوان شەرەکەوە و وەستاوە تاوانەکەی هێرشی دابووە پالٚ پارتی و قسەکانی مام جەلال زۆرباش بوو بۆئێمە لەسەر ئەو هەرایەو کەشف کردنی مەسەلەکان کەیەکێتی دەیوت ئێمە ئاگامان لیٚ ی نیە بەڵام ئێمە هەموو سەعاتێك بروسکەکانی قیادەی مەنتیقەی سلێمانیمان وەردەگرت و دەمانزانی بریارەکان چۆنە یەکێتی وپارتی پێکەوە بروسکە دەنێرن بۆلێدانی سۆسیالیست رۆژنامەی برایەتی پارتی لە رۆژی ١٩٩٣/١٢/١٦ هەمووی لەسەر روداوەکان بوو هەموو کۆبونەوەکانی سەرکردایەتی یەکێتی و پارتی و بروسکەکانی سەرکردایەتی یەکێتی و وەزارەتی پێشمەرگەو سەرۆکی حکومەت وهەرچی هەبوو بلاوی کردبوەوە بەدورو درێژی کەچۆن هەمویان رێك بوون یاچۆن یەکێتی بۆرازی کردنی دلی پارتی قبولی لێدانی سۆسیالیست ئێمە کەدۆستیان بوین قبولٚ کردووە ئەوەش هەموی کەم کردنەوەی باوەڕیبوولە نێران یەکێتی ودۆستەکانی بەتایبەتی سۆسیالیست ،ئێوارەی ١٢/١٦ خالەحاجی رۆژنامەی خەباتی هێناو ووتی وەرە ئەوە چۆن ماوین ووتم بۆووتی بروسکەی هەموو سەرکردایەتی یەکێتی و کاك کۆسرەت سەروکی وەزیران و کاك جەبارفەرمان وەزیری بەرگری یاپێشمەرگە و مام جەلال و کاك مەسعودو هەموو مەکتەبی سیاسیەکانیان هەموی بۆ لەناو بردن و نەهێشتنی ئێمە بووە ووتم جائەوە مانە

کەماوین... بەهەرحاڵ نەدەبوو یەکێتی وامان لەگەڵ بکەن لای من پارتی هەرچی بکات بریاری دژمان دەدەن و پێم ناخۆش نیە بەلاَم بۆیەکێتی پێم ناخۆشە چونکە دۆستمانەو لەژێر ناوی دۆستایەتیدا وامان لەگەڵ دەکات گرنگ نیە و هەرشاریشیان بۆ بەجێ دەهێڵین ئەوچەند رۆژە خانوی گوڵەخانە نوقسانی هەیە چارە سەر بکرێت وئیشەکانی رێك بخەین، لە١٢/١٥ داوایان کرد کۆبونەوەیەك بکرێت کەلەرێگای هەڵەبجەو سەیدصادق پارتی ناتوانێ هاتوچۆ بکات ئێمە هێزە ئەساسیەکانمان لەسورێن لەشارەزووربوون بەتەواوی سورێنیان گرتبوو تاسەرجادە بۆ هەڵەبجەی تازەش وەلەهەڵەبجەی کۆن پارتی چوبونە سەریان بەلاَم نەیانتوانی بوو شەریان کردبوو لەتیف ناوێك لەپارتی کوژرا و محمد مەلا حمە کەریم کۆکۆیی لەسۆسیالیست بریندار بوو، شەوی ١٣-١٢/١٤ عومەرە بچکۆل یاعومەر چاوشین کەپارتی بوو کەمێنکیان دانابوو بۆسۆسیالیست بەلاَم کاك شێخ جعفرو پاسەوانەکانی تێکەوت و(٥) پێشمەرگەی باشیان شەهید بوون ئەوەش حەساسیەتی دروست کردبوو هەرچەندە پارتی ترسان بەلاَم یەکێتی زۆر بەخوێن سادری وەریان گرت وکاردانەوەیان نەبوو لەسەر ئەو تاوانە هەرچەندە داوایان لەپارتی کرد دوای کەشف بوو عومەر چاوشینیان تەسلیم بکەن بەلاَم پارتی وتیان یەکێتی چووەتە سەر عومەرو رای کردووە ناردبویان بۆ بێتواتە بۆ بارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی لەبێتواتە حەشاریان دابوو بەو بۆنەیەوە من لە ١٢/١٥ چوم بۆ سەردانی مەڵبەندی یەکێتی لەسلێمانی بۆسەرەخۆشی ئەو شەهیدانەو هەڵوێستی زۆری کادرەکانی یەکێتی و سوپاسیانم کردن کەلەروی راگەیاندنەوە شتەکانیان رون کردوەتەوە بۆئەوە چوم ئەوانیش داوایان کرد رێگای پارتی لە شارەزوور نەگرین منیش ووتم بائەو دووسێ رۆژە لەگەڵ سەیارەکانی یەکێتی ئەگەر ئیشی زەروری هەبوو پارتی هاتوچۆ بکەن و پاشان وتیان ئێوە سەیارەی ناقانونیتان

لەقەدەفەری داناوە ووتم دەرکەوت ئەوەی پێمان دەوت حکومەت وادەرنەچوو هی پارتی ویەکێتیە بۆپارتی حەلاڵە شەری سۆسیالیست بکات خەڵکی بەناحەق بکوژێ ناقانونی نیە بۆسیتەرەی سۆسیالیست ناقانونیە لەوبابەتە پێم ووتن سەیتەرە لادەبەین بەلام پارتی باجارێ هاتوچۆ نەکات ئەوماوەیە لەرێگای یەکێتی وە هاتوچۆیان دەکرد پاشان من گەرامەوە ماڵەوە لەسلێمانی، لە١٢/١٦ هەرلەسلێمانی بوم لەحاڵەتی شەردا بوین و وەزعەکە ئاڵۆز بوو کەچوم بۆبارەگای یەکێتی جەماوەرێکی زۆرلەسەرجادەکەبوو بەچەپڵەیەکی گەرم پێشوازیان لێ دەکردین، لە١٢/١٧ لەسلێمانی بوم هەرلەحاڵەتی شەردا بوین مەلا ئەحمەدی خانەقا زۆرقسەی خراپی کرد هەرچەندە دوایی وتبووی من مەبەستم یەکێتی بووە نەك ئێوە وسۆسیالیست بەلام قسەی بەئێمە وتبوو، کادرەکانی یەکێتی زۆریان هەڵوێستان دۆستانەبو کاك مولازم عمرو مام رۆستەم و کاك شەوکەت حاجی موشیرو کاك محمود سەنگاوی وکاك مجید حاجی عەلی شارباژێرو کاك خەلیل سەرکانی و کاك عەبە رەق وکاك حامیدحاجی غالی و کاك مەلا ئەحمەدی دیسکەرە بەکاك محمود سنگاوی وتبو لەدژی پارتی هاوکاری سۆسیالست نەکەین بەلام کاك محمود وتبوی فیشەك و هەرچیان پێویستە بۆیان بکەن هەموو ناوی کادرەکانی یە کێتیم نەنوسیوە داوای لێبوردن دەکەم وە هەندێك لە کادرەکانی پارتی هاوکاری هەمەجۆرەیان کردین بە هەواڵ و فیشەك وگولە هاوان وزۆری کەش،لە١٢/١٨هەرلەسلێمانی بوم جەماوەربەکۆمەڵ سەردانی دەکردین وپشتیوانی خۆیان دووپات دەکردەوە بۆ حزب و کەسوکاری شەهیدان زیاتر خۆیان بۆ حزب ماندو دەکرد ئەوکاتەکاك فائیق قەساب کۆچی دوای کردبو کەپیاوێکی باش و ناسراوی شاری سلێمانی بوو جەماوەرێکی زۆر لەگەڵ جەنازەکەی چونە سەرقەبران، لە١٢/١٨ لەسەیتەرەی کفری کەلەدەستی یەکێتی، بو شەرێك بوو

لەکفری لەنێوان یەکێتی و بزوتنەوە چەند کەسێك کوژرابوو لەهەردوولا بریاریان دابووبکوژەکان تەسلیم بکەن و کێشەکە کۆتایی پێ بهێنن بەلاّم بەهاندانی پارتی وبالّی بزوتنەوەی سەربەپارتی لەناوبزوتنەوەدا کاك عەلی باپیر سەرپەرشتی دەکرد شەرەکەیان لەسنوری رانیە گەورەکردوبەقسەی یەکێتی خۆیان جەنازەیان بردبوو بۆ سەرقەبران لەبەردەم مەلّبەندی یەکێتی وە پەلاماری مەلّبەندی یەکێتی یان لەرانیە دابوو مەقەرەکەیان گرت و سوتاندیان و محمد سولّتان ئەندامی مەلّبەندبوو شەهید ببوو هەندێکی کەشیان کوشتبویان واتە رۆژێ دوای ئەوەی کفری روی دا لێرەدا قسەکانی من لەگەلّ بزوتنەوەی ئیسلامی ولەگەلّ پەکەکەو لەگەلّ سەرکردایەتی خۆمان چۆن تەوقیتەکان هەموو پێکەوە بوون لەوێ نوێنەری پارتی و یەکێتی وبزوتنەوە چونە ئەو ناوە بۆراگرتنی شەرەکە، لەشەوی ١٨–١٢/١٩ کاك جەبارفرمان بەناوی وەزیری پێشمەرگەو کاك یونس رۆژبەیانی بەناوی وەزیری ناوخۆوە لەسلێمانی لەتەلەفزیۆن دەرکەوتن و قسەیان لەسەر روداوەکانی کوردستان و سلێمانی کردو کاك یونس رۆژبەیانی زۆر قسەی ناشیرینی دژی حزبی سۆسیالیست کرد لە دوای هەوالّەکانی پارتی ولەتەلەفزیۆنی یەکێتی دابەزی کاك جەبارقسەکانی باشبوو نەك زۆر بەلاّم کاك یونس رۆژبەیانی قسەکانی زۆر خراپ بوو هەرئەویش کەوەزیری ناوخۆبوو چوبوە سەر بارەگای ئێمە لەهەولێر سوتاندبونی لەگەلّ جاشەکانی عەلی قەلاب و مامند قەشقەو زۆری کە ئەوانە پێکەوە چوبون خالّەحاجی هەندێك ناساغ بوو ئەوئێوارەیە ووتی ئەو قسانەی یونس رۆژبەیانی وەلاّم نەدەمەوە ئەوەندەی کەش نەخۆشم دەخات بەسەیارەکان چون بۆتەلەفزیون و هەر دوای قسەکانی خالّەحاجی قسەی کردوو وتی ئەو قسانەی یونس رۆژبەیانی کردی ئەوە قسەی وەزیری ناوخۆی حکومەتی هەرێم نیە بۆیە یونیس رۆژبەیانی وەزیری ناوخۆ پارتی خۆی لەراستیەکان لادەدات.. کاك جەبار قسەی کرد وەکو

وەزیری پێشمەرگە قسەکانی لەجێگای خۆی بوو بەلاّم یونس رۆژبەیانی قسەکانی لەهی سەرجادە دەچوو ئەوە هیچ نیەو حزبی سۆسیالیست بریاری خۆی دەدات لەسەر ئەو تەسەروفاتانەی پارتی کەلەژیانیان دەیان کاری نابەجێی وای کردووە خاڵەحاجی قسەکانی زۆر توندولەجێگای خۆی بوو پاشان خاڵەحاجی گەرایەوە ماڵی ئێمەو چەند جارێك لەتەلەفزیۆن دابەزی هەموشارو دەورو بەری قسەکانیان گویّ لێبوو ئەوکات کاك محی الدین رەحیم لابرابوو لەلقی پارتی و هەرئیشی دەکرد دوای (١٠) دەقیقە تەلەفۆنی بۆخاڵەحاجی کرد خۆزگە هەردووکیان بمایەن و ئەوراستیانە زیاتر رون دەبوەوە چونکە قسەی دوای مردو لەوانەیە بەشێوەیەکی کە باس بکرێت بەلاّم من هەرچم نوسیووە هەموی وەکو خۆی مەگەر شتێك کەم یازیاد لەبیر چوبێت بەلاّم لەناوەرۆك دا هەمووی وەکو خۆی و بیّ ئەوەی هیچ لەناوەرۆك گۆرابێت لەتەلەفۆنەکە بەخاڵەحاجی ووت خاڵەحاجی قسەکانی بەمن دەوت تۆ بۆدەتەوێت بەخوت و خۆرایی خۆت بەکوشت بدەیت تۆ دژی ماڵی بارزانی کفر دەکەیت و بۆ وەلاّمی قسەت داوەتەوە ئەوقسەت بەکاك یونس رۆژبەیانی ووتوە وادیاربوو ئەوان کاك محی الدین یان بەگیرهێنابوو ئەویش تەلەفۆنی بۆخاڵەحاجی پیّ ی وتبوو لەقسەکانی خۆت پەشیمان بەرەوە ئەگەر لەتەفزیۆنی خۆشتان بلاّوی ناکەنەوە ئەوە لەلای پارتی ئێستا بلاّوی دەکەنەوە بەلیّ لەحاڵەتی تورەییدا بوو قسەکان وانیە وئەوە وەزیری حکومەتی هەرێمەو ماڵی مەلا مستەفاش هەر براگەورەو قیادەی کوردن خاڵەحاجی زۆر پیاوانە ووتی حەزدەکەم ئەوە بزانی پەشیمان بونەوە هەرلای کەسانی بودەڵەیەو من بۆ یەك بوتلّ خوێن لەکەس ناپارێمەوە وکەسیش دروست نەبووە من لێی بترسم و زۆریش بیّ منەتم .. ووتی ئاخر بریاری کوشتنت دەدەن تائەو نیوسەعاتە پەشیمان نەبیتەوە.. خاڵەحاجی ووتی تامن ماوم پەشیمان نابمەوە و لەگەلّ ئەوەش کۆمەڵێك قسەی کەی بەپارتی

و ماڵی بارزانی ووت هەروەها ووتی زۆر بێ منەتم لەکوشتن زیاتر ئەوان هیچیان لەدەست نایەت قسەکانی خاڵەحاجی ئەوەندە توندبون من نەم نوسیونەتەوە کاك محی الدین خۆی باش دەزانێ ئەوە نوسینی ئەو کاتەیە بەڵام بەداخەوە کاك محی الدین نەماوە کە کەچۆن نیو سەعات زیاتر قسەیان کرد کاك محی الدین ووتی ئەتکوژن خاڵەحاجی هەردووکیان بەرەحمەت بن ووتی هەتیو کەی من لەمردن ترساوم یەك جوملە جنێوی دا خاڵەحاجی ووتی هەرچی لەدەستیان دێت بابیکەن کاك محی الدین پێی ووت ئەگەرکوشتیان نایەمە سەر جەنازەکەت خاڵەحاجی پێی ووت نەیەیتە سەرجەنازەم براشم نیت و تەلەفۆنەکەی داخست و ووتی ئاگات لێبوو ووتم بەڵێ دوای ئەوە بە نیوسەعات وتارێك هاتە سەر تەلەفزیۆنی پارتی و قسەی کرد دژی خاڵەحاجی و ووتی ئێستا پێش کەمێك قسەی ناشیرین بەخاڵەحاجی و بەعاباوە بردیان جەلالیەکان وای دەزانی یەکێتی هاتوچۆمان دەکات و دیت وای لێ بکەن یەکێتی هاتووچۆمان پێ دەکات بردیان بۆلای تەلەفزیۆنە دزراوەکە ئەو تەلەفزیۆنە بوو کەلەتورکیا کری بووم ووتی قسەی کردوە لەسەر بەرێز وەزیری ناوخۆ وادیاربوو قسەکان زۆری نارەحەتی کردبون وتارێك بەقسەی ناشیرین دژی شەخسی خاڵەحاجی وحزب هەرچی بەدەمی دا هات ووتی لەوکاتەوە پارتی بریاری کوشتنی هەمومانیان دابوو بەڵام خاڵەحاجی بەتایبەتی و لەسەر ئەو قسانە ئەوان پێشمەرگەی ئێمەو کوری خەڵکیان شەهید کردبوو بەڵام بەقسەی ئێمە نارەحەت دەبوون، لەرۆژانی ١٧و١٨و١٩/١٢/١٩٩٣ یەکێتی دەهاتنە لای ئێمەو دەیانوت پارتی دێنە سەرتان و ئێوە بۆئێرە چۆڵ ناکەن لەشاخ باشتر دەتوانن دەستیان لێ بوەشێنن و بۆ لقی (٤) ناگرن وبرۆن ئەوە کاك حامید وئەوان بەڵام رەئی یەکێتی بوو دەیانوت پێمان خۆشبوو لەشار نەبن نەك بێنە سەرتان وزەرەربکەن بەڵام لە راستیدا دەیانویست بەبەردیك دونیشان بپێکن بزوتنەوەی ئیسلامی ویەکێتی

زۆردژی یەك بون بەرامبەر بە بزوتنەوە كە لەگەڵ پارتی نزیك بون دژی یەكێتی سۆسیالیستیش لەسەنگەری یەكێتی بن دژی پارتی ودڵی سۆسیالیستە كۆنەكان بدەنەوە كەیەكێتی پشتیوانی سۆسیالست ناكات ئەو هەموو خانوو بارەگا زۆرانەی شارەكان تەسلیم بە یەكێتی بكەین دوایش نەمان دەنەوە وەكو خانوی سەهۆڵەكەیان نەداینەوەوبۆ خۆیان داگیریان كرد بە ئێستاشەوە بارەگا سیروانیان داگیر كرد جار جاریش ئەیانەوێ ئێمە بترسێنن ئەگەر هاوكاری بزوتنەوەیان كرد، لە١٢/٢١ لەسلێمانی بوین شەری نێوان بزوتنەوەو یەكێتی بەردەوام بوو بزوتنەوە دەستیان بەسەر رانیەدا گرت لەگەڵ ئەوەش هەركەوتبونە نێوانیان پارتی بۆزیاترو بۆ راگرتنی شەرەكە بەردەوام بوو بەلأم بزوتنەوەی ئیسلامی رازی نەدەبوو مەرجی هەبوو لەسەر راگرتنی شەر، لە١٢/٢٢ شەر لەرانیەو دەوروبەری گەرم تربوو بزوتنەوە دەستی بەسەر مەقەری یەكێتی لەچوارقورنەش دا گرت و شەر گەرمتربوو، لە١٢/٢٣ لەزۆربەی كوردستان شەردەستی پێ كردبوویەكێتی كەوتە خۆی و كۆكردنەوەی هێز بەرەو رانیە و حاجی ئاوا، لە١٢/٢٤ هێزی یەكێتی گەیشتە ناوچەكەو شەرلەحاجی ئاوا ورانیە وچوارقورنە بەگەرمی دەستی پێكرد، لە١٢/٢٥ بزوتنەوە لەسلێمانی پەلاماری مەقەری كۆمەلأیەتی یەكێتی دا و مەقەری شێخ بابە تاهیر وكاك شێخ داراو ئەوانی كەش بوو لەتووی مەلیك گرتیان وئەوەش باری شاری سلێمانی بەرەو شەر بردو لەخورماڵیش شەر دەستی پێ كرد شەر لەهەمو لایەك گەرم بوو، لەرۆژانی ٢٤و١٢/٢٥ شەر بەرەوحاجی ئاواو سەروچاوە دەرۆیشت ئێمەش لەناوشار بوین بەردەوام بوین شتەكانمان بەرەو سورێن و گوڵەخانەو میری سور بەرێ دەكرد ئەشیای تەلەفزیون و رادیۆو تەلەفزیۆنی شارەزوورمان بەرەو گوڵەخانە دەنارد هەر لەو رۆژانەدا مەقەراتمان چۆڵ دەكرد وەبارەگای لقی سلێمانیمان وەرگیرایەوە بەلأم یەكێتی و كاك عمری سەیدعەلی

داگیریان کردبۆخۆیان کە دووپێشمەرگەی سۆسیالیست و دوو پۆلیسی یەکێتی لێبوو کاك عمرسەیدعەلی وتبوی چۆڵی بکەن ئێمە پێویستمانە ئەوانەی ئێمەش هەرلەوێ بوون نەدەرۆیشتن کاك عمر خۆی پێشمەرگەی بردبووە سەریان وتبوی هەر ئێستا نەرۆن سجنتان دەکەم کەپێشمەرگەکان لەکاتی رۆیشتن لەخانوی لای سەهۆڵەکە پێی وتبوون ئێوە پیاوی ئەوەن بەشەق دەرتان بکەن کاك عمر پێشمەرگەکانی دەرکردبوو بەناوی ئەوەی ئەوحکومەتەو دەسەلاتیان هەیە ئەو قسەی کاك عمرمان لەشەرەکەی پارتی زیاتر پێ ناخۆشبوو چونکە ئەوان خۆیان بەدۆست دەزانی لەگەڵ ئێمەدا من ناردبوم بۆ گوڵەخانە زوو بەبلۆك و گەچ خانوویەك بۆ تەلەفزیۆنی شارەزوور بکەنەوە لەو رۆژانە تەلەفزیون دەست بەکاربکات و (FM) لەسلێمانی و تەلەفزیۆنی سلێمانی بەرینە سورێن بەلام ئیشی پێ نەکەن وشتێکی وا لەسلێمانی نەیەڵن هەموو رۆژێك یەکێتی دەیانوت ئاگاتان لەخۆتان بێ پارتی دێنە سەرتان مولازم کەریم تەلەفۆنی دەکرد دەیوت شتی وا بلاو بوەتەوە ئاگامان لێ نیە لەو ماوەیەدا خاڵەحاجی لەژێر زەختی کاك محی الدین دا نامەیەکی بۆ کاك مەسعود نوسیبوو کەبۆ ئەو غەدرەیان لێ کردوین دوای ئەوەی دووجار وەفدی پارتی هات وکاك مەسعود وەلامی کاك محی الدین ی دابوەوەو دەڵێت من وەلامی نامەی حاجی بێ وەفا نادەمەوە ئێمە خۆمان ئامادە کردبوو بۆئەوەی لەسلێمانی دەربچین و بۆئەوەی هەم خۆمان لەسورێنەوە ئامادە بکەین و هەم جێگای دەست کردنەوەی زیاترمان هەبێت وبێ منەت بین یەکێتیش بەرای ئێمە مەبەستیان ئەوەبوو کەزەختی سۆسیالیست لای یەکێتی وئەوانەی ناویەکێتی وئەوانەی شیان حەزیان لەئێمە نەدەکرد لەناو شار دوربکەوینەوە زەخت لەسەرمان بێت ولەشاخ بین کەبزوتنەوەی ئیسلامی بروا بۆشاخ کێشە بۆئەوان دروست دەکات ئێمەش هەمان کێشە بۆپارتی دروست بکەین وەهەندێك حەزیان لەبیناکان و

خانوبارەگاکانی ئێمەئەکرد هەندێکیش رەنگەپێیان ناخۆش بو بەناوی سۆسیالیستەوە ئیشمان دەکرد هەرپێیان ناخۆش بوو بەناوی سۆسیالیستەوە هەبێت دووسێ جار هەرتەلەفۆنیان دەکرد یەکێتی کەی دەرۆن کاك حامیدو هەندێك لە لێپرسراوەکانی کەیان هاتن کاك حامید وتی لقی چواربگرن وبرۆن بۆسورێن تۆڵەی خۆتان لە پارتی بکەنەوە شاخ بۆ ئێوە باشترە ئێمەش لەگەڵتان دێین نەك لەرێگا توشی شەرببن لەگەڵ پارتی دا، لە١٢/٢٦ دوای وەستاندنی کەمێك شەر لەسەعات (٣)ی پاش نیوەرۆ شەر دەستی پێکردەوە لەنێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی لەسلێمانی یەکێتی دۆشکەیەکیان بردبووە لای مەکتەبی عەسکەری ئێمە هەر تاوێك ناتاوێك تەلەفۆنی دەکرد بزوتنەوە دەیانوت لەبارەگای ئێوەوە تەقەمان لێ دەکرێت ئێمە بەیەکێتیمان دەووت کەمێك دوری بخەنەوە بەلأم ئەوان دوریان نەخستەوە و بزوتنەوەش وایدەزانی لای بارەگای ئێمەوە تەقەیان لێ دەکرێت شەر لەم جێگایانە هەبوو (سلێمانی و رەواندوزو حەریرو شەقلاوەو کۆیەو کەلارو دەربەندیخان و هەولێر و چوارقورنە و سەنگەسەرو قەلأدزەو خورماڵ و هەڵەبجە و عەربەت) بەلأم لەسەعات (٤)ی پاش نیوەرۆی ١٢/٢٦ بێتواتەو سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی بزوتنەوە گیراو هەموو سەرکردایەتیان تەسلیم بوون بەمامۆستا مەلا عوسمانیش رابەری گشتی بزوتنەوەی ئیسلامی لەناو دیلەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی دایە هەموو بارەگاکانی بزوتنەوەی ئیسلامی لەکوردستان گیران لەبێتواتەوە بەرەو دۆڵەڕەقە رایانکردبو لەدۆڵی شاورودۆڵەڕەقە هەموسەرکردایەتی بزوتنەوەی ئیسلامی بەمامۆستا ملاعوسمانیشەوەگیران وزۆریان خۆیان بەناو پارتیدا کردو زۆریان پارتی چوونە بارەگاکانی بزوتنەوەو ئالأی زەردیان هەڵکرد لەبارەگاکانی بزوتنەوەی ئیسلامی دا کوشتار لەهەردوولا هەبوو زۆر لەسەرکردەکانی بزوتنەوە برانە هەولێر، شەوی ٢٦-١٢/٢٧ لەتەلەفزیۆن پیشان

دران ومامۆستا مەلاعوسمان کۆمەڵێك قسەی کرد لەقسەی ئەو نەدەچوو لەشاشەی تەلەفزیۆنی یەکێتی کەدیل بوو لایان دەرکەوتن ئەو بەدیل گیرانەی زیاتر بزوتنەوە روخان و لەهەموو لایەك تەسلیم بوون لەسلێمانیش پارتی دەیویست بروات بارەگای بزوتنەوەو دەست بەسەریدا بگرێت بزوتنەوە حاجی محمد قەرەداغی وئەوانەی لەویٚ بون تەلەفۆنیان بۆمن کرد کەمن هەر لە بەیانیەوە بۆ هەواڵ پرسین تەلەفۆنم بۆ کردن کەلەناوشار شەرنەبێت وچاوەڕێی سەرەوە بکەن بریاری ئەولا جیٚ بەجیٚ بکەن بالەناو شاردا شەر روونەدات ئەوان ووتیان ئێمە تەسلیم بەیەکێتی نابین تۆ وەرە بەشەرتێك نەمان کوژن تەسلیم دەبین و سەیارەکانمان و شتەکانمان نەبەن منیش قسەم لەگەڵ کاك مولازم عمر کردو ووتی زۆر باشەو تۆچۆن دەڵێیت وادەکەین وئێستا حسن حمە خالید خزمی کاك نەوشیروانەو لێپرسراوی پەوەندی بزوتنەوەی ئیسلامیە لێرەیە و دەیەوێت وابکەیت و لەسەر قسەی تۆ شەرەکە رابگیرێت پاشان قسەم لەگەڵ برادەرانی بزوتنەوە کرد ووتیان خۆت نەیەیت باوەر ناکەین بەکەس و دەمانکوژن بۆیە تەسلیم نابین من خۆم رۆشتم لەلای بارەگای پارتیەوە برادەرانی یەکێتیش لەلای توی مەلیك وئەوناوە بوون کاك مولازم عمرو کاك بەکری حاجی سەفەرو کۆمەڵێکی کەش من و کاك عەتا سەراوی و برادەرانمان ناردو چونە لایان و تەلەفۆنی کردو وتی لەوێن لەگەڵ کاك عمر و برادەران چوین و ئیحترامیان لیٚ گیراو سەیارەی ئیڤاو شتەکان ئەوانەی ماڵی خۆیان لەویٚ بون بۆماڵ و ئەوانیشیان (١٦) کەس بوون خەڵکی رانیە لەگەڵ خۆم بردم بو ماڵی خۆمان ووتم دەرۆنەوە بۆلای مامۆستا مەلا عەلی لەخورماڵ وئەو ناوەتان دەنێرمەوە یان بۆماڵی خۆتان دەتانێرمەوە پیٚ دەکەنین دەموت دەتانێرمەوە لای بزوتنەوە نازانم قەناعەتیان نەدەکرد یاچی بوو وتیان دەرۆینەوە ماڵی خۆمان و ماندوین وئیسراحەت دەکەین، لە١٢/٢٧ ناردمانەوە رانیەو شەوگەرامەوە ماڵەوە ناخۆشبوو

شەرەکە ئەوکاتە مام جەلال لەدەرەوەی کوردستان بوو کاک مەسعود قیادەی
کوردی دەکرد بروسکەیەکی کردبووبۆکاک جەبارفرمان و لەگەڵ بروسکەی دا دەڵێت
کەی بریاربوو بچنە سەر سەرکردایەتی بزوتنەوەی ئیسلامی و مەکتەبی سیاسیان
لێرە بەئاشکرا دەری دەخات کەپێکەوە بریاری شەرەکە دراوە بەڵام یەکێتی چونە
سەرکردایەتی بزوتنەوەو هەمووی لەبەر یەك هەڵوەشایەوە نەچونایەتە سەریان
شەریان دەکرد قەواعدی بزوتنەوە، قسەکانی مامۆستا مەلاعوسمان لەقسەکانی
رۆژی ١٢/٢ دەچوو لەبێتواتە کەوتی ئەم ناوە بۆهاوێن زۆرخۆشەو میوەی هەیەو
خۆشی رۆیشتبوو لەدۆڵی شاورێ دۆلە رەقە گرتبونیان ولەوێش عمر چاوشین
کەپێشمەرگەکانی یەکێتی شەهید کردبوو ئەویش لەوێ گیراو کوژرایەوە کاك عەلی
باپیریش کە مەکتەبی سیاسی یەکێتی هەڵدەگێراوە بەرەو قەڵادزەوئەوناوە
رۆیشتبوو دوای مامۆستا مەلاعەلی هەڵەبجە دەیوت دەمانچەکەی خۆشی فرۆشتبوو
بێ چەك هاتوەتەوە بۆلای هەڵەبجە بەڵام ئەگەر مامۆستا عەلی باپیر لە ناوچەی
قەڵادزەو دارەشمانە بوایەت توشی ئەو زەرەرە زۆرە نەدەبون لەکەلارو ئەو ناوەش
مەلا ئیبراهیم و زۆری کەیان گیران و بزوتنەوەی ئیسلامی لەخوت و خۆرایی خۆی
توشی ئەو شەرە کردو بەهاندانی پارتی و تەشجیع کردنی ووتارەکانی کاك
مەلاعەلی باپیروکاك مەلا کرێکارو لێپرسراوانی بزوتنەوەی ئیسلامی غروری خۆشیان
لەهەموو لایەك شکان بۆئێران و چونە وشکەناو و سەرگەت ونەوسود تاکۆماری
ئیسلامی هەندێك فریایان کەوت تاشەری پارتی و یەکێتی دەستی پێکرد هیچیان
بۆنەکرا، لە١٢/٢٧ هەرلەسلێمانی بوین و شەری بزوتنەوەو یەکێتی هەر بەردەوام
بون من ئاگاداری یەکێتیم کرد کەئێمە زۆری بارەگاکانمان گواستۆتەوە بۆ سورێن و
شارەزوورو خۆشم دەچمە شارەزوور وسورێن وتەنها رادیۆی (FM) و هەندێك
پێشمەرگە لەوێ دەبن لەجێگای ئیزاعەکە داوای مەقەری مەکتەبی عەسکەریان کرد

هێشتا لە سلێمانی بوین خۆمان مابوین میراتیەکەیان داوا ئەکردین ئەوە (٣٠) ماڵە شەهیدمان جێگای نەبوو ئەوانمان تێ نارد وخانوەکەی خۆشم تەسلیم بەکاك حامیدی حاجی غالی شەخسی ووتم هەرکات داوام کرد تەسلیم بکەنەوە چونکە یەکێتی بەتەمابوون پێشمەرگەی خۆیان هات ووتی ئەمرۆ باسیان کردووە خانوەکەی تۆ بکەن بەبارەگای لەشکرودوایی نایدەنەوە کاك حامید دووسێ پێشمەرگە یاپۆلیس یائەوانەی لای کاك حامید لەوێ بوون بۆچاودێری خانووەکە چوار پێشمەرگەی خۆشمان لەوێ دانابوو بۆچاودێری کاك شێخ جعفر وتبوی بە کاك حامید کەماڵەکەی خۆم لە رزگاری بکەنە بارەگای لەشکرکاك شێخ جعفر زۆر باسی کردبو بۆیە منیش تەسلیمی یەکێتیم نەکرد پارتی بیات نەك یەکێتی لەژێر ناوی دۆستایەتیدا بۆیە تەسلمی شەخسی کاك حامیدم کردو وتم هەرکات بۆت نەکرا ئاگادارم بکەرەوە سەیارەکان و تەلەفزیونی شارەزوورووهەمومان شتی تەلەفزیۆنی هەڵەبجەی تازەمان ناردە گوڵەخانە و بێ وەستان دەستی بەئیش کردەوە وپێشمەرگەو هێزمان وردە وردە کۆکردەوەو لەهەموو جێگاکان بارەگا دانراوهەموو گردەکان دۆشکاو سەیتەرەو رەبایە دانران بۆپاراستنی ناوچەکە و بریارمان دا خاڵەحاجی بۆ سەرپەرشتی ئیشوکارەکانی ناوشارو رێکخستن وئەوانە لەناو شاربێت بەنهێنی لەجێگایە بێت و زۆری ناوچەو کادری لق هەرلەناوشاردابن و دەست بەکاربن لەولاش خۆئامادە بکەن لەوماوەیەدا پارتی زۆر هەوڵیان دەدا ئێمە نەگەینە سورێن چونکە سورێنمان لەدەست بوو زۆری شارەزوورمان لەدەست بوو رێگای هەڵەبجە سەیدصادق لەژێر دەستی ئێمە بوو ئێوارەکەی برادەرانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی هاتن بۆلامان لەماڵەوە ووتیان حەقی ئێرەتان نەبێت لەوماوەیەدا برادەرانی یەکێتی پێیان خۆشبوو زووتر ئێمە برۆینە دەرەوە لەشار برادەرانمان لەهەولێروجێگاکانی کەش بەیانیان دژی پارتی دەرکردبوو لەزۆرجێگاش دەچونە

سەریان و چەندجاریش لەسلێمانی و لەرانیەو چوارقورنە و زۆرجێگا چونە سەریان و ئار.بی.جی یان لێدابون، لەشەوی ٢٨-١٢/٢٩ برادەرانی یەکێتی کاك مولازم عمر وکاك عومەری سەیدعەلی یاکاك عومەر فەتاح ببون هاتنە لامان وقسەمان کرد لەسەر روداوەکان من ووتم ئێمە دەچینە سورێن و شارەزوور بەنیازی شەر نارۆین بەلاَم بێنە سەرمان ناچارین بەرگری بکەین لەخۆمان وتیان سەیتەرە دامەنێن ووتم سەیتەرە دانانێن بەلاَم رەبایە دادەنێن دەشپرسین لەخەلَك لەهاتوچۆو ناوچەکە هەر ئێمەی لێین زۆری هێزەکانمان بەرەو سورێن وئەو ناوە بەرێ کرد، لەشەوی ٢٨-١٢/٢٩ لەسەعات (١٢)ی شەو بارەگای خۆشم برد لەسلێمانیەوە چوینە گولَەخانە ئێمە زەحتمان لەسەرنەبو شارمان بەجێ هێشت لەسەر ئەو پەیمانەی بە خەلَکی سلێمانیم دابو لە کاتی شەردا کە ئێمە لەشاردا شەر ناکەین وهەم بۆ خۆئامادە کردن بۆ ئەو گۆرانانەی چاوەرێ دەکرێ کە کوردستان وەکۆ لوبنانی لێبێت کەشەرەکە لەدوای سالَی ١٩٨٧ولە١٩٨٨/٥/٧کە بەرەی کوردستانی دامەزرا بۆ یەکەم جار بو لەدوای راپەرینی ئازاری ٩١وە شەری ناوخۆ لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوەو حکومەتی کوردستانەوە لە پایتەختی کوردستان بەیەکەم ئار.بی.جی پارتی شەری ناوخۆی هەلَگیرساندەوە پاشان یەکێتی وبزوتنەوە ... پارتی و یەکێتی ،پەکەکەوپارتی...پەکەکەو یەکێتی واتە یەکێتی وپارتی وایاندەزانی سۆسیالیست ولایەنەکانی کەیان بە ئاسانی بۆ تەسفیە دەکرێ و دوایی خۆیان وەکو حزبی دیموکرات وحزبی کۆماری لە ئەمریکا یا محافزین وکرێکاران لە بەریتانیا هەربۆ خۆیان دەبێت بەلاَم ئەو شەرە مالَوێران کەرەی لێ کەو تەوە هەزاران کەس بونە قوربانی سیاسەتی چەوتوچێلَی هەردووحزب کەتا ئیستاش هەندێك لە جەنازەکانی شەری ناوخۆ بە کەسوکاریان نەدراوەتەوە نزیکەی (١٤)سالَە، لە١٢/٢٩ لەگولَەخانە بوین شەربوو لەنێوان بزوتنەوەو یەکێتی ئێمەش

لەگەڵ پارتی لەحاڵەتی شەردابوین..چونی ئێمە بۆسورێن بروسکەیانیان دوای دەستمان کەوت زۆری نارەحەتی کردبون، لە١٢/٣٠ لەگوڵەخانە بوین، لە١٩٩٣/١٢/٣١ هەرلەگوڵەخانە بوین سەری ساڵ بوو بزوتنەوە لەهەمو لایەك شکابون شەو تەلەفزیۆنی شارەزوور لەگوڵەخانە ئیشی دەکرد، ئەم ساڵەش هەروەکو سەڵەکانی کە وابوو...ساڵی ١٩٩٣ مان بەرێ کرد ساڵێکی پر لەناخۆشی و کارەسات و شەروشۆربوو بۆمان پێمان نایە ساڵێکی کەی پر مەینەتی وژیان و دەردەسەری و ساڵێکی نادیارو سەرەتای سەری ساڵێك ١٩٩٣ یش پێ ی نایە ساڵی ١٩٩٤ بەلاّم نابێت مرۆڤ بێ هیواوبێ بی ئومێد بێت بەئومێدی ساڵێکی باش بێت بۆگەلی کورد هەرچەندە لەکوردا دەڵێت هەوای باران دیارە یادەڵێت ساڵەکەی ساڵی مەیمونە ئەمە ئەوەڵیەتی ئاخری چۆنە بەلاّم لەکوردستان دا ساڵ بەساڵ خۆزەگە ئەخوازیت بەپارساڵ.

## ساڵی ١٩٩٤ و روداوەکانی

سەری ساڵ ١٩٩٤ لای دنیا خێروخۆشی و پیرۆزبایی و سەردان وئاهەنگ گێران و رازاندنەوەی شارو گوندو جادە گشتیەکانە، لەشەوی ١٩٩٤/١/١ دەیان جەنازە لەسەرانسەری کوردستان کەوتوەو کەم ماڵ هەیە جەنازەی بۆنەبرابێتەوەو تەعزیە لەکوردستان دا روی نەدابێت لەجیاتی پیرۆزبایی گولەتۆپ و دۆشکا بۆیەك دەنێرن..لەجیاتی ئاهەنگ وخۆشی جەنازە وشیوەن و گریان.. لەجیاتی لاوانەی منالاّنی بێ باوك وژن بێ هاوسەرو خۆشك بێ براو دایك بێ کور باوك پشت دەشکێنن..لەسەری ساڵ لای کوردوکاربەدەستانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و پەرلەمان ئەوشوێنەوارە ترسناکەمان بۆبەجێ دەهێڵن ..شەری نێوان بزوتنەوەو یەکێتی بەرەو لاوازی دەرۆیشت و بزوتنەوە شکان لەهەڵەبجە و تەوێڵەو بیارە و خورماڵ دەرکران بۆپشتی سەرگەت و وشکەناو، لە١٩٩٤/١/١ لەگوڵەخانە بوم

بۆئەوەی کەم کەم خۆمان کۆبکەینەوە لەسەر گردی ریشێن و گردی مەلاوەیسەو گردی مەتاوگردی شیرەمەرولەسەر سێ تەپان وجگە لەمیری سوروقەدەفەری و زۆر جێگای کە دۆشکاو رەبایەمان دانا وەلەقەدەفەری سەیتەرەش دانرا ئیزاعەو تەلەفزیۆن وەکار کەوت و هێزی باشمان لەوناوە کۆکردەوە..ئێمە لەناوشارەکان ئیشوکارمان دەکرا لەهەولێرو سلێمانی و شوێنەکانی کەش بەلاَم شکاندی بزوتنەوەی ئیسلامی بەشێوەیەك بوو تا ئێران جگە لەهەندێکیان لەسەرگەت و وشکەناو خۆیان بۆ نەگیراو هەموو بەرەو سەرسنور رۆیشتن مامۆستا مەلاعوسمان بەدیل گیرابوو پارتی داوای کرد بەری بدەن و بڕواتە صلاح الدین لای پارتی.. یەکێتی و پارتی پێکەوە جەولەیان دەکردو دەیانوت بۆئێوە مەقەرتان لەشیرەمەر داناوە ئەوکات کاك عەلی بچکۆل لای یەکێتی بوو کاك شەوکەت پیێ ی وتبوو کاکە حمە خەریکی چیە تازە حزب ناتوانێ هەبێت ئەوە بزوتنەوەمان تەواو کرد ئەو مەجالە بۆئەویشنەماوە بۆحزب باشتروایە بۆئەویش بۆئەوەی هەیەتی تەسلیم بەیەکێتی ناکات و بڕواتە خارج چی دەکات لەو سەریەشەی بۆخۆی دروستی کردووە تازە پارتی رێگای ئەوان نادات.. مەسەلەکان وردە وردە ئاشکرا دەبون چۆن رێکەوتبون لەسەر لێدانی ئێمەو بزوتنەوە هەر لایەك دەنگ نەکات و لەبروسکەی شەوی ٢٦-١٩٩٣/١٢/٢٧ کاك مەسعود بارزانی بۆ کاك جەبارفرمان دەلێت کەی بریاربوو بۆسەر مەکتەبی سیاسیان واتە بزوتنەوەی ئیسلامی.. کاك عەلی بچکۆل هاتو ووتی رەئیان باش نیە لەسەرتان خۆت لەمیری سور بیت باشترە کاك ئەحمەد قەدەفەریش بوو بەلاَم کاك ئەحمەد قسەی نەکرد وادیاربوو وارێکەوتبون کاك عەلی قسە بکات منیش ووتم نەبزوتنەوە تەواو دەبێت و نەئێمەش تەواو دەبین وەشەری نێوان پارتی و یەکێتیش دەستی پێ کرد ئەوکات قسەیەکی لێ دەکەین واتە هێشتا مەعلوم نەببوو یەکێتی بەسێ رۆژ موسەیتەربوو بەسەر

بزوتنەوەدا سەر کەوتنێکی کاتییان دەست هێنابو هەرە شەیان لەئێمە دەکرد کە دۆستیان بوین لەگەڵ پارتیشدا لەشەردابوین وە ئەمە چی ناوێکی لێ دەنێت ئەوە بۆ خوێنەر بەجێ دەهێلین، لە١٩٩٤/١/٢ هەرلەگوڵەخانەبوم، لە١/٣ جەماوەرێکی زۆر هاتنە سەردانمان و پشتیوانی خۆیان دەربری بۆحزب، لە١/٤ هەرلە گوڵەخانە بوم سەدان کەس رۆژانە رویان تێ دەکردین، لە١/٥ هەرلەگوڵەخانە بوین هەندێك لەبرادەرانی بزوتنەوە رێگایان برابوو نەیانتوانی دەربازبن لەزەرایەن هێنامانن لای ئێمە مانەوە لەژوورێك دامان نابون تابەرێمان کردن ، لە١/٦لەدوای ئەو هەموو هەراو شەرە بۆ یەکەم جار لەدوای چەند راسپاردنێك پارتی ناردیان بۆگفتوگو وچارەسەری کێشەکان وچاویان بەمن بکەوێت و قسەبکەین من ووتم باشە باخاڵەحاجی و برادەران برۆن ئەوان پێیان داگرتبوو هەر من ببینن ولێرەو لەوێ لەسەراوی سوبحان ئاغاو ماڵی کاك عەتا سەراوی مان داناو ئەوان دەرۆیش ئاغا و کاك محی الدین بون من پێم خۆش نەبوو بەڵام ناچار برادەران داوایان کرد منیش ووتم نەرۆم دەڵێن ئاشتی رەد دەکاتەوە یا نەی وێرا بروات بۆیە بریارم دا برۆم، لە١/٧ جەماوەرێکی زۆریش لەگوڵەخانە بوون بەڵام هێزی (١٥٠)پێشمەرگەمان لەگەڵ خۆمان برد و هەرچەندە سەراو هەموی سۆسیالیست بوون مەقەری لەشکری پارتی لەوناوە بون دەرۆیش ئاغا وکاك محی الدین هاتن و من و خاڵەحاجی چوین و کاك عەتایش لەوێ بوو وتیان کاك مەسعود داوای کردووە تۆ ببینێ و قسە بکەین و ئێوە چیتان دەوێت من سەیری دەموچاویانم کرد کاك محی الدین هەربۆ ئاشتی هاتبوو چارەسەری بکات بەڵام کاك دەرۆیش ئاغایان بۆئەوە ناردبوو وایانزانی بوو ئێمە ئاشتی ناکەین یائەتوانین بریار بدەین کەمین زۆرین چی دەڵێن یابەقسەی یەکێتی دەکەین بەڵام هێزەکەی ئێمەو قسەی ئێمەیان دی و ووتمان شەرتان کردوین و خەڵکتان شەهیدکردوین و مەقەراتان گرتوین ئەوانەمان بۆ رەد بکەنەوە

ئەوکات قسەی کەش دەکەین وادیاربوو ئەوان زۆر نارەحەت ونامرتاح بون بەبونی خاڵەحاجی لەگەڵ من ئەویش تەئسیری هەبوو بەلاَم ئەوەی ئەوان من تیَ گەیشتم نەشەرو نەئاشتی ئەگەر عەمەلیاتەکەیان پیَ نەکرا بۆلەناو بردنمان بۆئەوەی ئیٚمە لەشاخەوە دژیان نەبین یاریٚگای هاتوچۆیان بدەین لەوناوەوە زۆر بەنامرتاحی گەرانەوە زیاتر دەترسان لەوەی بۆی هاتبون و پێیان نەکرا ئیٚمە دەمانتوانی ئەوان بگرین و بیان هیٚنین بەلاَم بەرنامەیەکی وامان نەبووهەرچەندە زۆری برادەران مان زۆریان رایان وابو بگرین بە خاڵە حاجی یشەوە دەیوت با محیدالدین ماوەیەك ئیسراحەت بکات بەلاَم من هەرگیز ئەو شتانەم قوبوڵ نەدەکرد هەتا لەگەڵ عیٚراقدا قوبولّم نەکردوە پاشان گەراینەوە بۆگولّەخانە، لەرۆژانی ٨و٩و١/١٠ هەرلەگولّەخانە بوین وئیشوکاری رۆژانەمان دەکرد هەرکەسیَ ئیشوکاری خۆی دەکرد وپەیوەندی کاری ریٚکخستن لەناو شارەکان بەنهیٚنی دەکران زیاتر ئەوە نەبیَ نەمان دەتوانی برۆینە شارو شویٚنەکان بەلّکو خۆمان هاتبوینە دەرەوەی شار بۆ راهاتن لەسەر کارەکانی ریٚکخستنی ناو شارو دەرەوە، لە١/١١ هەر لەگولّەخانە بوم، لە١/١٢ لەگولّەخانە بوم جەماوەریٚکی یەکجار زۆر هاتبون تاسەعات (٣)ی شەو هەرنەمتوانی هەموی ببینم هاتبون ئامادەیی خۆیان پیشان دەدا بۆهاوکاری حزب، لە١/١٣ چومە سەیدصادق و باریکەو نصرو زەرایەن وهەلّەبجەی تازە بۆ سەردانی مالّی شەهید مام والی پاشان گەراینەوە بۆگولّەخانە لەو ماوەیە مامۆستا مەلاناصیح یش هاتەوە بۆ کوردستان، لەرۆژانی ١٤و١/١٥ هەرلەگولّەخانە بوین خەریکی ئیشوکاری حزب بوین، لە١/١٦ جاریٚکی کە پارتی داوای کۆبونەوەو چاوپیَ کەوتنی منیان کردبوو ئەم جارە مولازم کەریم بوو نامەشی ناردبوو کەبریاری کاك مەسعودبارزانیەو کۆببینەوەو چارەسەری کیٚشەکان بکریٚت کۆبونەوەمان کرد مامۆستا مەلا ناصیح لەویَ بوو ئەویش پیَ ی باشبوو منیش لەگەڵ کاك محمد

دۆلآشی و خالەحاجی مەوعیدەکە لەباریکە دانرا و داوایان کردبوو لەرۆژی ١/١٧ دوای نیوەرۆ بریار درا من و خالەحاجی و کاك محمد دۆلآشی رۆیشتین لەمالێك لەباریکە دۆستی ئێمە بوون ئەم جارە بە(٨٥) سەیارە پێشمەرگە رۆیشتین بەقەرەبالغ تر لەجاری پێشوو کاك مولازم کەریم و کاك محمود (خالەنەبەز) بوو قسەمان کردو ووتی ئێمە دەمانەوێت لەو حەدە راوەستین و چارەسەری بۆ بدۆزینەوە کاك مەسعود وتویەتی دۆستایەتی مان زۆرتر بووە تائەو (٤–٥) رۆژە شەربووە ئێمە ئامادەین رەئی ئێوە چیە وادیاربوو ئەوان هەرقسەیان هێنابوو هەروەکو شەخسی وپارتی هیچ بریاریان بەدەست نەبوو هێنانی قسەو بردنەوەی قسە بوون یەك سەعات قسەکرا وادیاربوو ئەوان دەیانویست ئێمە لەوەزیاتر دژایەتیان نەکەین و راوەستین لەو ئاستە نەشەرو نەئاشتیش بکەین و هەورا بیهێلینەوە من لێیان تیَ گەیشتم..ئێمە لەوحالەتەدا هەم لەشار ئیشەکانمان دەرۆیشت و هەم لەشاخدا و ناوچەی تایبەتی خۆمان و کەسی لیَ نەبوو واتە ئەو هەنگاوەی ئێمە هەم پارتی حسابێکی کەی ئەکردو هەم کاروباری خۆشمان دەرۆیشت لەهەردوولا شاخ وشار، بەلآم ئەو دەست پێشخەرانەی کاك مەسعود ناردونی و ئەو وەفدانە من بەهەنگاوێکی ئیجابی و باشم زانیوو ز زۆریش بەگەرمی پێشوازیم لیَ کردو حەزم کرد لەوەدا بوەستیَ و بەرەو چاك بونەوەش برواو پێم خۆش بوو لەگەلَ پارتی توشی کێشە نەبین چونکە نە بەرنامەمان بوو نە لەبەرنامەشماندا شتی واهەبوو تەنها دۆستایەتی لەگەلَ پارتی لەبەرنامەی ئێمەدا هەبوو هەربۆیەش پێمان وتن جگە لەبەرگری شتێکی کە نەکەین و ئاگاداری ئەو هێزانەشم کرد کەدانرابون بۆ سەرمالەکانیان راوەستن تاناگاداریان دەکەینەوە واتە هەردوو وەفدی پارتی بە دەست پێشخەری کاك مسعود بارزانی بە ئیجابی هەلمان سەنگاند بریارماندا تا پارتی دەست پێشخەرنەبێت دژمان ئێمە تەنها بەرگری

لەخۆمان بکەین پارتییش چەند هاتە پێشەوە بۆ ئاشتی ئێمەیش برۆینە پێشەوە بۆئاشتی بەو نیەتە ئیشمان ئەکردوحەزمان دەکرد کێشەمان لەگەڵ کەس ولایەن نەبێت بەتایبەتی پارتی وحزبی سۆسیالیست دژی هەموو شەرێکی ناوخۆیە لە ئەساسدا بۆ شەری دژی رژێمی عێراق ومافی رەوای کوردستان دامەزراوە بۆیە لە دوای ئەو غدرەش لێمان کرا هەر بەدەنگی ئاشتیەوە دەچوین بەلاَم گرنگ ئەوەبو هەموپێش بینیەکانی ئێمە کەچۆن یەکێتی وپارتی پێکەوە بریاریان داوە لەسۆسیالیست وبزوتنەوەی ئیسلامی بدەن لەنێوان خۆیاندا بەشی بکەن بۆئەوەی هەرلایەك بواتە ژێر باڵی لایەکیان چونکە ئەودوولایەنە بێ لایەنی خۆیان دەپاراست وهەڵوێستیان لەسەررووداوەکان هەبوو بەلاَم حزبی سۆسیالیست وەکو حزبێکی نەتەوەیی ونیشتمانی کێشەیەکی نەبو ئەگەر لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی وەکوهێزێکی ئیسلامی بەخەتەرلەسەرخۆیان حیسابی بکەن دژی خۆیان داینێن بەلاَم ئەی بۆئێمەیان خستوەتە خانەی دژایەتیەوە بەلاَم هەردوولا لەو سیاسەتە هەڵەیە زەرەری لێ ئەکەن ئێمەش بەبەشێکی زۆری ئەوئامانجەی هەمانە دەگەین رۆژانی داهاتوش دەری دەخات.

لە ١/١٤ چوین بۆراوە پۆر بەلاَم سەیارەکەمان چەقی ئێمەش راومان نەکردو گەراینەوە، لە ١/١٥ هەرلەگوڵەخانە بوین، لە ١/١٦ کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ مامۆستا مەلاناصیح و برادەران دەربارەی داوای پارتی بۆکۆبونەوە، لە ١/١٧ لەگەڵ خاڵەحاجی و کاك محمد دۆلاَشی دا بەباشمان زانی لە سەرسێ خاڵ قسەبکەین لەگەڵ پارتیدا بە سەیارەیەکی زۆر چوینە سەیدصادق و عەربەت و برایەتی و باریکە بۆماڵی کاك عمر و پاشان کۆبونەوەمان لەگەڵ مولازم کەریم وکاك نەبەزو ئەوان کردو وتیان کاك مەسعودبارزانی ناردوینی ئەوەی رویدا نەدەبو رو بدات بەلاَم پەیوەندی دۆستایەتی پارتی وسۆسیالیست زۆر گەورە ترە لە ٥/٤ زۆر گیرۆگرفت

هـەبو وتيـان حەزدەكـەين لێـرەدا بوەوسـتێت تـا هـەولێ چارەسـەری بدەینـەوەو ڕاگەیاندن ڕابگیرێ تاقیبی لایەنگرانی یەك نەكرێت وئێمەش پێشنیارەكەمان قبـوڵ كرد وەزەعە ئاڵۆزەكە لەدوای ئەوكۆبونەوەیە بەرەو هێمنی دەرۆیشت لـەماڵی كـاك محی الدین محمد حسن پاشان گەراینەوە گوڵەخانە (٨٥) سـەیارە بـوین، لـەرۆژانی ١٨و١٩و٢٠و٢١و٢٢/١/١٩٩٤ هەرلەگوڵەخانە خەریكی ئیشوكاری ڕۆژانـەو خۆئامـادە كردن وخانووكردن لەسورێن و كۆكردنەوەی پێشمەرگەو هێزو بەقەدەر ئەو هێزانەی هەمان بوو پێشمەرگە ئامـادە بكـەین، لـە١/٢٣ ناوچـەو لقـی سـلێمانی و مەكتـەبی عەسكەری بۆیادی شەهیدان مام والی و ئەحمەد تۆفیق و ڕەوف محمود لەسـلێمانی لەهۆڵی ڕۆشنبیری كۆڕێك ئامادە بكەن بۆچلەی شـەهیدان پـارتی زۆر نـارازی بـوو هەولێ دابـوو هۆڵەكـەمان نـەدەنێ بـەلآم یـەكێتی هاوكاریـان كـردین كـەرۆژی ١/٢٥ چلەی شەهیدان بوو، لە١/٢٣/١٩٩٤ كاك خورشید هورمزیـار لەهـەولێرەوە هـات بـۆ سەردانمان و بۆهەواڵ پرسینی وەزعەكەو وەزعەكەی بـینی ووتـی مـن بۆیـە هـاتوم بەراسـتی بەغـەدرێكی گـەورەم زانـی لەسۆسیالیـست كـراوەو تائێـستاش ئیـشم نەكردوەو ئێستا حەز دەكەم ئیشم بۆدیاری بكەن و منیش هەندێك ئیشوكارم هەیـە بـلآوە ڕێكـی دەخەمـەوە و بۆكـوێیش بلـێن ئامـادەم ئێمـەش سـوپاسمان كـرد لەوهەلوێستەی ووتمان بگەڕێتەوە هەولێرو قسە لەگەڵ برادەران لەوێ ئەو خەتانەی هەیە هەمووی پێكەوە ببەستینەوە لەوێ بە تاكاتی پێویست لەسەر ئەوە بریارمان داو ئەویش ئیش بكات، لە١/٢٤ برادەرانمان لەسۆران و ڕەواندوزەوە كاك حەمەحمید مستەفا وەرتـێ وهـێمن وصـابر ماویلـەو ئـەوان هـاتبون لـەو ماوەیـەدا ئێرانیـەكان داوایان كرد برۆم بۆئێران و سـەردان بكـەم، لـە١/٢٥ كـۆڕی شـەهیدان مـام والـی و ئەحمـەد توفیـق و ڕەووف محمـود بـوو لـەهۆڵی ڕۆشـنبیری سـلێمانی منیش خـۆم ڕۆیشتم و جەماوەرێكی یەكجار زۆر هاتبوو جگە لەپارتی هەموو لایەنەكان هـاتبوون

کاك ئەحمەد صالح وتاری یەکێتی خوێندەوە نەیووت حزبی سۆسیالیست ئامادە بوان بنەماڵە و هەڤالانی شەهید کەحەق نەبوو هەڵوێستیان وابێت لەسەرمان من قسەم کرد سەعاتێك باسی ئەو هەموو تاوانەم کرد کەدژی حزب کراوە و بنەماڵەی شەهیدان قسەیان کردو کۆتایی بەکۆرەکە هات و من گەرامەوە بۆ گوڵەخانە، لە١/٢٦ لەگوڵەخانەوە چومە سەیدصادق وپێنجوێن و مەریوان وسنە بۆماڵەوە کەلەسنە بوین دوای ئەو هەموو روداوەی کوردستان، لە١/٢٧ لەماڵەوە بوم لەسنە برادەرانی لێپرسراوانی لەسنە سەردانیان کردم، لەرۆژانی ٢٨و٢٩و٣٠و١٩٩٤/١/٣١ هەرلەسنە بوم خەریکی تەلەفۆن وپەیوەندی کردن بوین بۆ دەرەوەو لەسوریاوئێرانەوە، لە١٩٩٤/٢/١ هەرلەسنە بوم، لە٢/٢ هەرلەسنە بوم، لە٢/٣ بیل کلنتۆن سەرۆکی ئەمریکا راپۆرتێکی دا بەکۆنگریسی ئەمریکی لەسەرعێراق و کوردو ووتی نابێت عێراق دابەش بکرێت وادیاربوو لەئەنجامی شەرەکانی ناوخۆبوو تورکیاو ئێران و سوریایش هەر خەریك هەندێك کۆبونەوە بون لەو بابەتە، لە٢/٤ هەرلەماڵەوە بوم لەسنە، لە٢/٥ هەرسێ وەزیری تورکیاو سوریاو ئێران لەئەستەمبوڵ کۆبونەوە ولەدوای کۆبونەوەکە لەبەیانێك دا ووتیان نابێت عێراق دابەش بکرێت و کوردیش حکومەتی سەر بەخۆی هەبێت وەکو ئەوەی وارسمان بن، لەرۆژی ٢/٦ هەرلەسنە بوم و لەناوشار گەراین، لە٢/٨ چوینە کرماشان کۆبونەوەمان هەبوو لەوێ ووتیان تۆ پەلەتەو ئێمەش سەرقاڵی یادی (١٥) ساڵەی گەرانەوەی ئیمامین ئێستا بکەوێتە رەسمیاتەوە زۆری پێ دەچێت بەلام بەپێی دەسەلاتی ئێمە هەندێك یارمەتیتان ئەدەین بەپێی ئیمکان لەئازوقەو بەتانی راخەرو پێویستی ژیانی رۆژانە چەك و پێوستی سەربازی بەرگری لەخۆمان و ئازوقەتان بۆجێ بەجێ بکەین لەمەریوان ئامادەیەو ناردیان گەلابەی خۆمان و سێ لاندکرۆزی کەی خۆمان هەموی بارکرا، لە٢/١١ برادەرانیش بە(١٠) سەیارە هاتن بۆسەر

مەرزەکەو بەدەممانەوە لەپێنجوێن و ناڵپارێز و سەیدصادق و گوڵەخانە و ناردمانە میری سور ئەوە زۆرباش بوو لەوکاتەداهەرچەندە کەم بوو بەلام لەروی سیاسی و مەعنەویەوە زۆرباش بوو پارتیش مشەوەش ببوو کەدوای بروسکەکانیانمان دەست کەوت چۆن مەشغوڵی سەیارەو بارو فیشەك و چەك و شتانە ببوون ، لە٢/١٢ چومە سلێمانی و گەرامەوە گوڵەخانە یەکێتی بەفرسەتیان زانیبو دەست بەسەر زۆرلە بارەگاکانماندا گیرابو تماحیان لە ماڵەکەی خۆشم کردبو لەجیاتی ئەوەی بیپارێزن بۆم فەرماندەیی یەکێتی چوبون سەیری خانوو ماڵی ئێمەیان کردبوو لەسلێمانی داوایان لەکاك حامید کردبوو تەسلیمی یەکێتی بکات وبکەین بە بارەگای فەرماندەیی یەکێتی کاك حامیدیش بەپەلە وەلامی بۆمن نارد کەزووپێشمەرگە بنێرم خانوەکە وەربگرمەوە لە کاك حامیدی حاجی غالی وتی با توشی عەیبە نەبم لای تۆ لە منی وەربگرەوە بۆئەوەی نەیگرن بەلام هیچی پێوە نەمابوو واتە یەکێتی هاوپەیمانەکەمان کە شەری لەسەرئەکردین جگە لە زۆری بارەگاکانمانیان داگیر کردبو دەیانویست ماڵەکەی خۆشم داگیربکەن تا کاك حامیدی حاجی غالی وەکو رەفیق وخزم ئاگاداری کردم ناردم لێم وەرگرتنەوە، لە٢/١٣ لەگوڵەخانە بوین، لە٢/١٤ چومە هەڵەبجەی تازەوبۆسلێمانی، لە٢/١٥ لەسلێمانی بوم و مەشغوڵی ئیشوکاربوین خەڵکی داوای تەلەفزیونەکەیان دەکرد لەسلێمانی بکەوێتەوە ئیش، لە٢/١٦ تەلەفزیۆنی سلێمانی دەستی بەکارکرد هەر ئەو رۆژە جەنازەی کاك دلاوەر جەباری کەبەزەماڵە نێنرابوو بۆ سۆڤیەتی پێشوو بۆ خوێندن لەوێوەوە چوبووە سوئید جەنازەکەی لەوێوەوە لەلایەن رێکخراوی حزبەوە ناردیانەوەو گەیشتەوە کوردستان و سلێمانی منیش چوم بۆسەر تەرمەکەی خاڵەحاجی و برادەران منیان گەراندەوە و خۆیان بردیان و ناشتیان خاڵەحاجی لەسەر جەنازەکەی قسەی کرد.. خاڵەحاجی زۆری ئەو ماوەیە هەر لەشاربوو ماوەیەکش لەماڵی کاك حامید حاجی

غالی بوو لەوێ ژوورێکیان دابویە و ئیشوکارو جێ گۆرکێیشی لەشاردا دەکرد، لە۲/۱۷ لەسلێمانیەوە چومە ئۆردوگای نەصر بۆپرسە و سەردان پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی، لەشەوی ۱۷-۱۸/۲/۱۹۹٤ لەتەفزیۆنی پارتی رێکەوتنی نێوان یەکێتی و بزوتنەوە بلاوکرایەوە لەدوای لێدانی حزبی سۆسیالیست کەلەوکاتەشدا چەندین مەقالە لەنێوانیان لەلایەن پارتی کاك فەلەکەدین و کاك فرانسۆ هەریریەوە دەنوسرا کەپێویستە پارتی و یەکێتی ببێتە یەك حزب و هەموو ئەو ئامێرانە ئێستا هەیەو لەبارەو بوونی دووحزبی جیا زەرەرە...ئەوکات برادەرانی کۆمیتەی ئامادەیی حزبی سۆسیالیست زۆر سەخلەت بون و داوای کۆبونەوەیان کردبوو رۆژنامەی برایەتی و خەبات و هەندێك کێشمە کێش و دەمەتەقەی رۆژنامەگەری لێ پەیدابووبەلام ئەوە سەرەتابوو بۆپارتی و یەکێتی وبۆیەك حزب و سەرەتای شەرو تموحی پارتی بوو برادەرانی ئێمە وزۆر خەلکی کەش وتیان ئەوە مەترسیەو ئێمەش روو بەروی دەبینەوەو مەجال بۆئێمە نەماوە من لەو کاتە باسی ئەوەم کردبۆیان کەئەوە پارتی ئێستا تاکە حزب و خەوی پێوە دەبینێ و لەبەرنامەیان هەیە و ئەوە قسەیەکەو دەیکەن بزانن یەکێتی کاردانەوەی چیە بەلام بەرای ئەوان هەرسەرۆکی ئەو حزبە لەپارتی بێت و تموحی یەکێتی یان هەیە ئەوە سەرەتای شەری نێوانیان دەست پێ دەکاتەوە کاك فەلەکەدین و کاك فرانسۆش لەسەر بەرنامە ئەو وتارانە دەنوسن بەو مەعنایەی پارتی بریاری دا پێکەوە یەکێتیش بگەرێتەوە ناو پارتی سکرتێرو مەکتەبی سیاسی هەموی یەکێتی بێت لای ئەوان گرنگ نیە بەس سەرۆك پارتی بێت واتە سەرۆکی حزب یاسەرۆکی کوردستان، لەرۆژانی ۲۰و۲۱و۲۲و۲۳و۲/۲٤ چەندین کۆبونەوە کران بۆ دروست کردنی لیژنەی سەرۆکایەتی هەرێم و بریاری سیاسی بگرێتەوە بۆئەوانە چونکە تائەوکاتە هەموبریارێك لەپەرلەمان وحکومەت دەدران و دەگەرایەوە دەبوو هەردوو مەکتەبی

سیاسی بریاری لێ بدەن واتە سەرۆکی هەردوو فراکسیۆنی سەوزوزەرد کەدەبوو لەمەکتەبی سیاسی پارتی و یەکێتیەوە بریار بهێنن و پەرلەمانیش دەستی بۆ بەرز بکاتەوە وەکو شتێکی کارتۆنی نەك بریاری پەرلەمان...حکومەتیش هەرچی لەمەکتەبی سیاسیەکان بریاری لەسەر نەدایە نەی دەکردونەش دەکران لیژنەی سەرۆکایەتیان پێشنیارکردبوو لەنێوان هەردوولادا هەریەکەی (٤)کەس بێت بەلاّم بۆ ئەو لیژنەیە دروست کرا..؟ لەبەر ئەوەی پەرلەمان و حکومەت گەیشتنە بن بەست و کارەکانیان هەمووی راوەستان و جوڵەی لێ بران چونکە دەبوو رابەر هەبێت و هەموو بریارێك حەسم بکات بەلاّم رابەر نەبوو هەڵنەبژێراو ئەمانە لەکۆتایی ١٩٩٣ بەلاّم لەبریاری لێدانی سۆسیالیستەوە زیاتر هەنگاوی بۆنراو لیژنەیە بۆ شکاندنی بن بەست ئیشەکان دامەزرا وەهەندێك بریار هەبوو پێویستی بەئیمزا کردن هەبوو لەپەرلەمان و لەحکومەت بەتایبەتی مەسەلەی دادگا و ئیعدامات و بریاری کوشتن گرنگ ئەوەش دەبوو رابەر سەرۆکی جمهور دەسەلاّتی هەیە نەبوو رابەریش نەبوو دەبوومام جەلال و کاك مەسعود هەردووکیان ئیمزای بکەن بەلاّم کاك مەسعود نەی دەکرد مەرجی هەبوو بیکات ناوی رابەر بنوسێت و بەناوی رابەرەوە ئیمزای بکات یەکێتیش ئەوەی قبولّ نەدەکرد و دەیوت هەردوو سەرۆك ئیمزای بکەن واتە ئیمزای کاك مەسعودو مام جەلال وەکو دوو سەرۆك پێکەوە بۆ ئیعدامی یەك کەس چوە سەر کاغەز واتە دوو سەرۆك لەکوردستان هەیە پارتی سەروەریەکانی لەدەست دەدات نابێ لەکوردستان باوەریان وابێ کەسێکی کەهەیە شەریکی ئەوانە بۆیە کاك مەسعود شتی وای نەدەکرد و شەریکی بۆخۆی قەرار نەدەدا و شەریك بریاردان بۆ کاك مەسعود ویەکێ بۆ هاوشانی خۆیان پەیدا بکەن یاقبولّ بکەن لەدەست دانی ماڵی بارزانی و پارتی دەبێت و شتی وانابێت قبولّ بکرێت ئەوە وای کرد لیژنەیەکی (٤)کەسی تەشکیل بکەن چونکە ئەو لیژنەیە مشکیلەنیە و ناوی

رابەر نیەو ناوی دوو سەرۆك نیە بۆیە ئەو لیژنەیە لە رۆژانی ٢٤و١٩٩٣/١٢/٢٥ دامەزرا برادەرانی ئێمەش سەخڵەت بون من ووتم ئەوەش بر ناکات و ئەوە وەکو ئەوە وایە مرۆڤ پێویستی بەعەمەلیات هەبێت و ئەوان حەبی ئازاری بۆماوەیەك موسەکنی بدەنێ وئەوە چارەسەریان ناکات ئەوەی بۆئێمە زەرەری هەبێت لەلیژنەی پارتی کاك سامی دانراوە دژی ئێمەو لەلیژنەی یەکێتیش کاك رەسول بوو سۆسیالیست دەبێت بەتەئکید هەردووکیان لەگەڵ ئێمە سلبین و ئەوان کێشەمان بۆدروست بکەن.. ئەو (٤) کەسە مام جەلال و کاك رەسول و کاك مەسعود وکاك سامی بون لەوێش (٥٠ بە٥٠) بوو مادام کاك رەسولی تێدایە دەبێت کاك سامی تێدابێت ئەگەر مام جەلال یاکاك مەسعود هەرکامیان لەکوردستان بون ئەوە مەسئولی یەکەم دەبێت و ئەویان لەدەرەوە مەسئولی یەکەم دەبێت بۆئەوەش مام جەلال لەو کاتەدا بۆ یەکەم مەسئولیات بەری کاك مەسعود بکەوێت سەفەری دەرەوەی ولاتی کرد و لەکوردستان نەبووله ناولایەنە سیاسیەکاندا جگە لە یەکێتی وپارتی تەنها من هەمیشە پێم خۆشبوە ئەو ٢حزبە ئاشتو تەباو برابن کێشەیان نەبێت من بە پێچەوانەی هەموو حزبەکانەوە رام وابوە هەرچەند هەردوولا پارتی ویەکێتی رێکبن ئەوەنە بۆ خەڵکو حزبەکان و بۆ هەردوو حزبی ناکۆکیش باشە وخزمەت دەکات کاك مەسعود بروسکەی دا بەکاك جەبارفرمان و دەڵێت بریارنەبوو لەسەرکردایەتی بزوتنەوە و مەکتەبی سیاسیان بدرێت یاکەی بریاروابوو لەمەکتەبی سیاسیان بدەیت یالەبروسکەیەکی کەدا دەڵێت پێم شەرمە من سەرۆکی لیژنەی سەرۆکایەتی هەرێم دەکەم و لەگوێم ناکەن و شەردەکەن..لیژنەی سەرۆکایەتی تاکەی بر دەکات لەکۆبونەوەکانی رۆژانی ٢٠تا١٩٩٤/٢/٢٤ یەکێتی و پارتی بریاری نهێنی یان لەنێوان خۆیاندا دابوو وەمۆریان کردبوو تاساڵی (٢٠٠٠) کاری لەسەر بکەن واتە تاساڵی (٢٠٠٠) رێگای هیچ حزبێکی سیاسی کوردی نەدەن لەحکومەت و

پەرلەمان وەکو برا لەسەری ڕێکەوتبون ئەگەر برادەرانی خۆمان تێبینی بکەن یاداشتەکانی ڕۆژانەی من بەوردی دەست نیشانی ئەوەم کردووە کەپارتی و یەکێتی سەرچاوەیان هەڵگرتووە بۆکوێ دەکات من لەکۆبونەوەکانی خۆمان باسم دەکرد چونکە ئەوەی بەمێشکی پارتی و ئەوەش لای یەکێتی بوو دووشتی جیاواز بوون یەکێتی ناچاربوو خۆی بەهێزی کاریگەروماندوبوو خاوەن شەهیدو سەرساحەی خەبات دەزانی و پارتی بەحزبێکی گێل و بێ تواناى سەربازی و ئیداری هاتوەتە سەر حازری و هیچی بۆ کورد نەکردووە ١٤سال خەباتی کوردی لە١٩٦١وەبۆ١٩٧٥ بەفیرۆداوە پارتیش یەکێتی بەحزبێکی کاتی و لەبۆشایەکی سیاسی یائەو کات پارتی توشی نەکسەبوو لە١٩٧٥ ئەوان دروست بون و خەڵکەکەیان هەر پارتین و دەبێت بەخۆشی و ناخۆشی مل بدەنە قبوڵ کردنی قیادەی کاك مەسعود و حزبی قائد پارتی بێت بۆئەوەش لەهێناوەی جەنازەی بارزانی رەحمەتی و لەکۆنگرەی (١١)ی یەکگرتن ئەو دوو دیاردەیە بەئاشکرا دیاربوو وەنوسینەکانی کاك فەلەکەدین و کاك فرانسۆ و ئەوانی کەیان باسی تاکە حزبیان دەکرد یەکێتیش زۆر باش لێ ی تێگەیشتبوو بەڵام بۆخۆیان لێ لائەدا یان خۆیان دەپاراست بەقەناعەتی من دوو خاڵی تێدابوو یەکەمیان یەکێتی باوەری وابوو ئەو وەزعە تێك نەچێت لەساڵحی یەکێتی و خۆی بەهێز دەکات بەتایبەتی لەبادینان، دووەمیان شەر وەزعەکە بەگشتی لەهەموو کورد تێك دەدات ئەو وەزعەش بۆپارتی هەروا ئاسان نەبوو داهاتی کوردستان لەژێر دەستی یەکێتی بێت وەکو خۆیان دەیانوت حکومەت ٧٥٪ یەکێتی و ٢٥٪ پارتیە بەلام پارتی دەستەوسان دانەنیشتبوو پارتی پەیوەندی لەگەڵ ئێران توند دەکرد و پەیوەندی لەگەڵ تورکیا باشتر دەکردو لەگەڵ عێراق و سوریاش بەردەوام بوو هەنگاوی بۆدەنا و یەکگرتنی کردبوو هەچەندە گەرانەوەی سۆسیالیست ئەو یەکگرتنەی تێك داو بەرنامەکە تێکچوو

کەدایان نابوو بەڵام یەکێتی بەپێچەوانەوە ئێرانی کرد بەدوژمنی خۆی و عێراق هەرزۆر هەراسان کردبوو هەموو هێلکەکانی خستبوە زەمیلەی تورکیاوە و بەباریکیش لەگەڵ سوریا مابوو لەناوەش هەموو لایەکی کردبووە دژی خۆی بەزەحمەتکێشانیشەوە ئێمە دۆستی بوین ئیمزایان کردبوو بۆ لێدانمان بریاری پارتی لەپەرلەمان بۆ لێدانی بزوتنەوەی ئیسلامی یەکێتی جێ بەجێ ی کردو شەرگەرم بوو لەنێوانیان ئەمانە هەموی هەنگاوی عەمەلی پارتی بون یالەبەرژەوەندی پارتی بوون...دژایەتی ئێران لەلایەن یەکێتیەوە فرسەت بۆئێران رێکەوت کەتۆڵەی خۆی بەئاسانی لەیەکێتی بکاتەوە، لە۲/۲۰ چومە هەڵەبجەی شەهید سەردانی ناوچەم کردو گەرامەوە بۆ گوڵەخانە هەر لەو رۆژانەدابوو یەکێتی سەرکەوتنیان بەدەست هێنابوو دەیانوت سۆسیالیست خەریکی چیە وادیاربوو کاک شەوکەت ئەو قسانەی کردبوو... هەرلەوماوەیە ئێران چەك و راجیمەی دا بەبزوتنەوەو تەقویەی کردو هێزی باشی دانێ لای سنوری چیای شەرام و سەرگەت و ئەوناوە هەندێك سەیارە لەوناوە بوون کاك شەوکەت بەتەمای ئەو سەیارانە بوو بییان هێننەوە لای سەرگەت ئەوکاتە رەمەزان بوو من بەرۆژوبوم، لە۲/۲۱ لەگوڵەخانە بوم رۆژێکی خۆش وەتاو گەرم بوو برادەرانی یەکێتی جوابیان نارد سەردانمان دەکەن من ئەو رۆژە چومە هەڵەبجە بۆ پرسەی حاجی عنایەت باوکی کاك عمر پاشان گەرامەوە بۆگوڵەخانە، لە۲/۲۲ کاك مولازم عمرو برادەرانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی وکاك شێخ جعفرو مام رۆستەم و کاك حامیدوکاك سالار عەزیز هێشتا نەببوو بەپارێزگاری سلێمانی دووسێ رۆژپێش ئەوە هاتنە سەردانمان و لەوێ زۆر قسەمان کرد لەسەر هەلومەرجی ئەوکاتە، لەرۆژانی ۲۳و۲/۲٤ کاك جەباروکاك دەرۆیش ئاغا سەری ئەو ناوچەیان دابوو کاك جەبار وتبوی بامحمود سەنگاوی یارۆژێك هێزێك بەرین و سەرکەوین بۆ بزوتنەوە بۆ وشکەناوو سەرەوە

کاک دەرۆیش ئاغاش وتبوی زۆر باشە بەمەرجێك ئەوانمان تەواو کرد لەشیرەمەریشەوە دەست بەحسك بکەین و ئەوانیش تەواو بکەین بەلاًم یەکێتی ئامادە نەبوو ئەوەیان لەگەڵ بکات هەرچەندە لەناو یەکێتی دا بەتەنها مام جەلال بوو یارمەتیمان بدات و هاوکاریمان بکات کەسیان نەیان دەکرد، لە١٩٩٤/٢/٢٤ لەسلێمانی بوم، لە٢/٢٥ هەرلەسلێمانی بوم لەو ماوەیە لایەنەکان سەردانیان دەکردین بەتایبەتی حزبی شیوعی چەند جارێك سەردانیان کردین کاك حەیدەر فەیلی ومامۆستا عەلی زەنگنە وهاوڕێیانی کەیان بۆ گوڵەخانەش دووجار سەردانیان کردین لەسلێمانی، لە٢/٢٦ سەردانی مەقەری حزبی شیوعیمان کرد لەسلێمانی، لە٢/٢٧ سەردانی بارەگای حزبی زەحمەتکێشانمان کرد ئەوکات یەکێتی بەگیریان هێنابوین زانکۆ چۆڵ بکەین چونکە تەلەفزیونی ئێمەی لێبوو کاك سەعدی ئەحمەد پیرە بەجدی ئەو کارەی بۆ کردین و یەکەم کەسیش بوو لەهەولێرەوە لەو سەردانەی بۆ سلێمانی سەر لەئێمە بدات دوای ئەو هەموو شەروهەرایە کەیەخەی پێ گرتبوین کەپەیوەندیەکی واشمان نەبوو جگە لەچەند جارێك یەکمان دی بووکاك سەعدی قەرزاری کردین، لە٢/٢٨ سەعات (١١)ی سەرلەبەیانی پارتی کەسێکی ناردبوو بەناوی خەلیل بەبرێك (TNT)وە بۆتەلەفزیونی ئێمە لەشریتی ڤیدیۆدا ئەویش لەناو سەتڵی خۆڵ دابنابوو فریانەکەوتبوو ترسابووکابرا پاشان تەقیەوەو هەندێك زەرەری لەبیناکەو (FM)داو دووسێ کەسی بریندار کرد یەکێك لەوانە سۆزان شەهید حمەتاتە بوو ئەوکاتە لەوی ئیشی ئەکرد تەلەفزیۆنەکەمان لەناوبینای کۆنی چۆڵی زانکۆی سلێمانی بوو، هەرلە ٢/٢٨ سەردانی مەڵبەندی سلێمانی یەکێتیمان کرد کاك مولازم عمرو برادەران لەوێ بون لەسەر هەلومەرجی ئەوڕۆژەی کوردستان قسەمان کرد، لە١٩٩٤/٣/١ کاك مولازم عمرو برادەرانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی سەردانیان کردین و پاشان حزبی زەحمەتکێشان

سەردانیان کردین لەوکاتەدا خاڵەحاجی بەتەمای سەردانەوە بوو بۆماڵەوە لەدەرەوەی وڵات هەربەهۆی ئیشوکارەوە دوا کەوت، لەشەوی ١-٣/٢ خاڵەحاجی زۆری لێ کردم سەعاتم پێ بێت من لەسەرەتای شەستەکانەوە یەکجار سەعاتم لەدەست کردبوو حەزم لێ نەبوو سەعات هەڵگرم بەزۆر سەعاتێکی لەدەست کردم لەبەر دڵی ئەو وەرم گرت، لە٣/٣ لەسلێمانیەوە چومە گوڵەخانە خاڵەحاجی ووتی ناردومەوە وەرەقەو شتم بۆ بکەن سەیارەکە دەفرۆشم و لەمەریوان تاقیبی وەرەقەی من بکەو زوو بۆم بنێرەوە تۆیش مەیەرەوە تامن دێم لەوێوە دەرۆمە دەرەوە، لە٣/٤ چاوەروانم کرد نەهات شەو بروسکەیەکی کرد ووتی تۆ برۆ من ئیشێکم هەیەو نامەم بۆ کاك کۆسرەت نوسیوە چاوەرێ ی وەلآم دەکەم لە هەولێر، لە ٣/٥ من لەگوڵەخانەوە بەرێ کەوتم بۆ هێلآن پێ بەفر زۆربوو لەملەخوردەوە گەرامەوە بۆ پێنجوێن و باشماغ و بۆ مەریوان، لە ٣/٦ چومە سنە رێگا باش نەبوو، لە٣/٧ هەرلەسنە بوم لەماڵەوە پێشتر تەلەفۆنمان زۆر کردبوو لەو بێ پارەیەدا (٢٧٠) هەزار تمەن پارەی تەلەفۆنمان هاتبوەوە کورەکان چون تەسلیمیان کرد بۆ ئەوەی نەیبرن ئینزار کرابوین(١١٢) هەزار دیناری عێراقی دەکرد بۆئێمە زۆر زۆر بوو وەزعی مالیمان زۆر خراپ بوو هەتا تاخیر بونی خاڵەحاجی هەندێك لەبەر بێ پارەیی بوو زۆر کەسیش وایدەزانی ئێمە پارەمان هەیە پارە هەبوو بەلآم ئەو هەموو وەزعەی بەسەر ئێمەدا هات سەرف کراو پارتی و حکومەتی هەرێم دەستی بەسەر زۆریدا گرت، لە٣/١٠ هەرلەسنە بوم لەماڵەوە خاڵەحاجی بروسکەی کرد کەسبەینێ دێتە مەریوان واتە ٣/١١ چاوەرێی پێشمەرگەکانی دەکات دووانیان لەهەولێرە بگەرێنەوە دێتە لای ئێمە نامەیان بۆکاك کۆسرەت بردووە کاك کامران محمدئەمین وکاك سامان مەلا بایز ...کاك کامران حمە ئەمین کامران عەزە لات نامەکەی پێدا ناردبون بۆمەکتەبی سیاسی یەکێتی وکاك کۆسرەت رەسول عەلی

سەرۆکی حکومەتی هەرێم بۆدووهەزار دۆلار بۆسەفەری خاڵەحاجی بنێرن بەمنی
نەوتبو خاڵەحاجی دوای ئەوە زانیم نامەی ناردوە بۆسەرۆکی حکومەت بۆ دووهەزار
دولار پارەکە هەر نەگەیشت و دواکەوت دووهەزار دۆلارەکە بوو بەهۆی شەهید بونی
خاڵەحاجی و لەوێ بەپێشمەرگەکانیان وتبوو برۆنەوە سلێمانی خۆمان جوابی
نامەکەی خالەحاجی ئەدەینەوە  ئەوان زانیبویان خاڵەحاجی شەهید بووە، شەوی
١١-١٩٩٤/٣/١٢ سەعات (٨/٣٠)ی شەو لەدوولاوە  هەواڵی ناخۆش و جەرگ برو پر
لەناسۆریان دامێ بەجیهاز بروسکەیان دامێ کەخاڵەحاجی لەسەعات (٧/٣٠) تەقەی
لێ کراوە لەدور ئەمن بریندارەو لەخەستەخانەیە زۆر نارەحەت بوم پاشان لەرێگای
جیهازی یەکێتی شەوە پرسیارم کرد جیهازی خۆمان لەسەعات (٩)ی شەو وەلامی
دایەوە کەشەهیدبووە لەسەعات (٩/٣٠) یەکێتی وەلامیان دایەوە شەهید بووە هەر
شەو لەگەڵ برادەرانی دەرەوە  قسەم کرد کەلەوێ پرسەی بۆ دانێن لەدانیمارك
... شەو دەرچوم لەسنە بۆ گەرانەوە بەلام رێگا نەبوو بەیانی زوو دەرچوم
لەمەریوانەوە سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی گەیشتمە مزگەوتی ئاشتی  لەسلێمانی
بۆسەر جەنازەی خاڵەحاجی بەراستی قەت ئەوەندە نارەحەت نەببوم بەو شێوە
بەلام زۆر دەرم نەبری کاك محی الدين لەوێ بوو پارتی و یەکێتی هاتبون برادەرانی
خۆمان رایان گرتبوو ووتم نەی نێژن تادێمەوە رەنگی شینیان لەسەر تەرمەکەی
دابوو قسەکانی خۆم وەبیر هاتەوە کەرەنگی شین دەبێت کفنمان بێت ..کاتی خۆی
لەشەوی ١٤-١٩٩٣/١٢/١٥ پارتی و هەموو لایەك گوێی لەقسەکانی من بوو وا
ئەمرۆش لە١٩٩٤/٣/١٢ دیسان شین کفنمانە شەهید بونی خاڵەحاجی زەرەرێکی
گەورەبوو لەکوردو بزوتنەوەکەی و زەرەربوو لەحزبی سۆسیالیست وبۆشایەکی
یەکجار گەورەی دروست کردو زەرەر بوو لەشەخسی من و لایەکیان چۆڵ کردم
چونکە خاڵەحاجی پیاوێکی بەتواناو لێهاتووئازاوچاونەترس و دڵسۆزو خۆنەویست

بوو هەمیشە وەکو مۆم وابوو خۆی دەسوتان بۆ رۆشنایی هەڤاڵەکانی بەلاّم هاورێکانی زۆر بێ وەفابون بەرامبەری بوختانیان بۆدەکردو دژی بون، خاڵەحاجی توانای لەسنور بەدەربوو ماندوبونی نەدەزانی وحەزی بەسەرکەوتنی کوردو حزب و شەخسی منیش زۆر دەکرد بەلاّم سەد مخابن بەدەستی کوردوحزبە دەست رۆیشتوەکان شەهیدبوو ئەوان لێی بەرپرسیارن بەتایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان هەرەشەکانیان وە لەسەردواکەوتنی وەلاّمی نامەکەی کاك کۆسرەت بۆخاڵەحاجی هەر بۆدووهەزاردۆلار لەسەرۆکی حکومەت بەقەرزیش هەردەستمان نەکەوت پاشان پێشمەرگەکان بۆسەرجەنازەکەی گەرانەوە، شەهیدبونی خاڵەحاجی لەرۆژنامەکانی کوردستان و عێراق و دەرەوەش باس کران و زۆر لەبروسکەکانی یەکێتیش زۆر ناوی حزبیان نەدەهێنا بەڵێ خاڵەحاجی لەچیای سورێن گرنگ تربوو بۆحزب لە ١٩٩٤/٣/١٢ حزبی سۆسیالیست سەرکردەیەکی گەورەو کادرێکی لێهاتوی سیاسی و مەیدانی گەورەی لەدەست دا... دەیان هەزار کەس و سەدان سەیارەو لافیتە لەگەڵ جەنازەکەی بۆسەر قەبران هاتن و تەنانەت پارتیش نەیتوانی نەیەت و خۆی لەو جەماوەرە زۆرو زەبەندەی حزب و شەهید جیا بکاتەوە لەسەر گۆری شەهیدان من قسەم کرد بەلاّم دانم بەخۆمدا گرت و قسەکانم کرد هەرچەندە زۆر نارەحەت بوم بەلاّم قسەکانم روی لەهەردوو حزب و بەتایبەتی حکومەتی هەرێم بوو پاشان پارێزگار قسەی کردو یەکێتیش قسەیان کرد وپارتیش قسەیان کرد بەلاّم ئەوان بەناوی بنەماڵەی خاڵەحاجی وە پاشان حزبی زەحمەتکێشان و حزبی شیوعی کاك جەلال دەباغ قسەی کردو قسەکانی زۆرباش بووقسەکانی نیشانەی وەفای حزبی شیوعی و هەموو هاورێیانیان بۆ حزبی سۆسیالیست و بۆشەهید خاڵەحاجی بوو قسەکانی ئەوان و جەماوەری زۆرو زەبەندی ئامادەبوو وەلاّمێکی راستەوخۆی پارتی بوو ئەو رۆژە بۆمن زۆرناخۆشبوو

هەستم بەدڵ تەنگی دەکرد من لەهەر کاتێکی ناخۆشی و خۆشی دا وەکو یەك بوە هەمیشە وەك یەك یازۆر جیاواز نەبووە بەلاّم ئەم جارە زۆر نارەحەت بوم بۆئەو تاوانە گەورەیە لەکاتێکدا کورد شۆرشی دەکردو پێشمەرگە لەسەنگەر شەهید دەبوو یا بۆ ئیعدام و گوللەباران لەپێناوی کوردو شۆرش و ئازادی دا بەلاّم لەکوردستانی ئازاد پیاوێك تەمەنی خۆی لەپێناو ئازادی و کوردو شۆرش دا سەرف کردبێت بۆ بیکوژن بۆکێ و لەپێناوی چی بەراستی ئەوە وەلاّمەکەی لای پارتی و یەکێتیە من ئەو رۆژە ئەو قسانەم کرد دەمزانی چی دەلّێم و بۆکێشی دەلّێم...
دوای ناشتن و قسەکردن گەراینەوە بۆ مزگەوتی سەلیم بەگ وپرسەی بۆ دانرا ئەوەی بۆ خالّەحاجی کرا بۆکەس نەکرا چونکە دەیانزانی ناحەقیە جەماوەری زۆروزەبەند بەشداری کرد لەپرسەکەیدا ، لەشەوی ١١-١٢/٣/١٩٩٤ شەهید کراو لەرۆژی ١٢/٣/١٩٩٤ لەسلێمانی ولەگۆرستانی شەهیدان ناشتمان، رۆژی ١٣/٣ رۆژی جەژنی رەمەزان بوو لەماڵی خۆمان لەسلێمانی پرسەیەکمان دانا پاشان لەرۆژانی ١٤و١٥/٣ هەر پرسەکە لەماڵەوە بوو بەلاّم یەکەم رۆژ پارتی هاتن لەمزگەوت بۆماڵەوە نەهاتن بەلاّم یەکێتی هەموو چەند جارێك و حزبی شیوعی و زەحمەتکێشان و زۆری کەش هاتبون، برادەرانی یەکێتی کاك عومەر فتاح بۆ پرسەکە مەبلەغێك پارەی ناردبوو خۆ ئەگەر دووهەزاردۆلارەکە خالّە حاجی داوای لە سەرۆکی حکومەت کردبو بۆ گەرانەوەی دوانەکەوتایەت تیا نەدەچو فریای ئەوە بکەون ئەودەستەی لێ بوەشێنن بە ناحەق شەهیدی بکەن بۆدووهەزاردۆلارەکەیان وپێشمەرگەکانیان دواخست جێگای پرسیارە هاوکاریان کردبوین هەندێك کەسی سەربەپارتی هاتن بەلاّم لەبەر کاك محی الدین دەهاتن رەفیقی بون کۆماری ئیسلامی بەشداری پرسەکەیان نەکرد کەلامان سەیر بو بەلاّم بەنامە هەرچەندە پێیان ناخۆشبوو بەلاّم ئەوەی باس دەکرا دۆستایەتیان هەبێت ئەوان زۆر پێی

نارەحەت نەبون ئەوەی سەرنجی رادەکێشام ئەوکات حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران نەیان وێرا بێنە پرسەکە ناردیان کەشەو بێن و رەسمیان نەگرین بۆتەلەفزیون ورادیۆ هەروەها لەکاتی ئیعلان کردنی حزبیشدا هەمان شێوە بۆپیرۆزبایی بەشەو هاتن خاڵەحاجی پیێ ی ووتن وادیارە لەپارتی یالەعێراق دەترسن چونکە خاڵەحاجی زۆر چاکەی بەسەر حزبی دیموکراتەوە هەبوو بەلاّم رابەرایەتی شۆرشگێر بۆدرێژە دان بەخەباتی حزب هاتن و بۆ پرسەی شەهید خاڵەحاجیش هاتن و لەتەلەفزیونیش بلاّوکرایەوە بەلاّم ئەوان لەبەر پارتی بوو یاعێراق من پێم وایە هەردوکیان بووچونکە پارتی وسوپای پاسداران لە گوندی زێوکەو ماشکان لای زنێوو شنۆوخانە هاتنە سەر بارەگاکانمان کاك مولازم بابەکر زێباری بەهێزیەکەوە لەگەڵ هێزەکەی ئێران کێومالّیان دەکرد بەدوای حزبی دیموکراتدا لەگەڵ هێزەکەی ئێراندا زەرەریان لیێ دااین کاك ئاسۆحسن بریندار بو یەکیێ لە خاڵەکان کاك ئەحمەد فەقیێ رەش وخاڵە حاجی برینداری حزبی دیموکراتیان چاکردوەتەوە لە٣/١٦ شەشەمین ساڵرۆژی کیمیابارانی هەڵەبجە بوو پرسەش بوو بۆ بەشداربون چوم پارتیش هاتبون کاك دکتۆر رۆژ و مولازم کەریم وزۆری کەیان هەروەها یەکێتیش هاتبون بەلاّم ئەوان بەسەیارە یەکسەر بۆ سەر قائیمقامیەت یاسەر قەبران من چومە بارەگای خۆمان خەڵکی زۆر بوین هەموو جەماوەرەکەش کۆبونەوە لەلای پەیکەری شەهید عومەری خاوەردا داوایان کرد منیش برۆم خەڵکەکە پێیان ناخۆش بوو بەرپرسەکان خەریك بوو بەسەیارە بییان کەن بەژێرەوەو بەرەو سەرەوە رۆیشتن وجەماوەرەکە وتیان کیێ وتویەتی لایەنەکان بێنە هەڵەبجە و ئەوانە لەرۆژی کیمیاویدا دێن ئیتر روو لەهەڵەبجە ناکەنەوە تا٣/١٦ی ساڵێکی کە ئەوان چیان کردووە جادەکانی ناوبازار هەمووی روخاوەو تەپیوە من چومە ناو جەماوەرەکەو بەپیێ سەرکەوتین بەناو بازاردا بۆسەراو بۆ سەرگۆری شەهیدان و

ئەوان زانیان کەسی لێ نیە وەستان تائێمە چوین و پێکەوە رۆیشتین بۆ ئەوەی من قسە نەکەم وتیان نابێت هیچ حزبێك قسەبکات تەنها حکومەت قسە بکات یا پارێزگاری سلێمانی یا قائیمقامی هەڵەبجە یا سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران من ووتم ئێمە لەحکومەت نین قسە دەکەین زۆر هەوڵیان دا پێکەوە ئێمەو حکومەت گوڵەکەمان دانا شەو لەبەر ئەوەی من دەرنەچم تەلەفزیۆنی پارتی دکتۆر رۆژشی پیشان نەدا بەلام بروسکەی حزبی سۆسیالیست لەوێ خوێندرایەوە چاریان نەما یاقسە دەکەین بابروسکە جەماوەرەکەش هەموی بەلای ئێمەدا بون داواشیان دەکرد من قسە بکەم...پارتی نیازی ئەوەی هەبوو کەلە ١٢/١٥ خۆپیشاندان بکەن دژی ئێمە لەهەموو کوردستان هەرلەدهۆك تا کفری بەلام هەموی بەزەرەری خۆیان گەرایەوە ئەو شەوە یائەو رۆژە دکتۆر رۆژ لەپەرلەمان قسەی کردبۆئەو خەڵکە کەکۆکرابونەوە دژی سۆسیالیست کەبەتێکدەرو دزو جەردە و لەوبابەتە ناویان دەبردین دکتۆر رۆژ خۆی تەنگەتاو کردبوو هاواری دەکرد بەلام ئەو رۆژەی کەهات بۆهەڵەبجە مەرحەبایی منی کرد پێم وابوو کاك مولازم کەریم پێ ی وتبوو ئەوە فلانەو لەوێ وەستاوە ئەو سەفەرەیان یادەکە بۆجەماوەرو ئێمەش زۆرباش بوو پاشان گەراینەوە سەیدصادق و بۆباریکەو شەو لەماڵی کاك محمد دۆلاشی بوین، لە٣/١٧/چوینە سلێمانی لەماڵەوە پرسەی خاڵەحاجی هەبوو، لە٣/١٨ لەسلێمانی بوین زۆر قەرەباڵغ بوو زۆریش ماندوو بوم بێ خاڵەحاجیم بەتەواوی پێوە دیاربوو دەبوو سەری بارەگاکان و لایەنەکان و ئەو کەسانەش بدەم کەبەشداریان لەپرسەکەدا کردبوو، لە٣/١٩ سەردانی حزبی زەحمەتکێشانم کردو سوپاسم کردن بۆبەشداریان، لە٣/٢٠ هەرلەسلێمانی بوم، لە٣/٢١ هەرلەسلێمانی بوم سەری ماڵی خاڵەجوتیارو شەهید ئەحمەد تۆفیقم دا لەبەکرە جۆ هەروەها سەری ماڵی شەهید رەوف محمودمان دا لەکارێزەوشك کە لەشەری رۆژانی ١١تا١٩٩٢/١٢/١٥ شەهید

ببون بەدەستی پارتی، لە٢٥/٣/١٩٩٤ سەعات (١/٣٠) پاش نیوەڕۆ سەردانی کاك سالار عەزیز پارێزگاری سلێمانیم کرد هەربەبۆنەی بەشداربونیەوە لەپرسەی خاڵەحاجی وە سەعات(٤)ی ئێوارەی هەمان ڕۆژ سەردانی مەڵبەندی ڕێکخستنی یەکێتیم کرد بۆسوپاس و بەشداربون و ماندبونیان لەمەراسیمی شەهید خاڵەحاجی دا کاك کۆسرەت و کاك جەبارو کاك مولازم عمرو کاك عمری سەید عەلی و زۆری کەیان لەویٚ بون پێشوازیان لێکردین و ئێمەش سوپاسمان کردن بۆ بەشداری کردنیان لەمەراسیمەکە، خاڵەحاجی لەسەعات (٦/٤٠)دەقیقەی ئێوارە تەقەیان لێکردبوو پێش ئەوە لەدوکانەکان گەیشتبوو بەکاك مولازم عمر و پیٚ ی وتبوو بۆبەتەنها دەگەرێت باپێشمەرگەت لەگەڵ بێت بەلاَم خاڵەحاجی قبوڵی نەکردبوو دوای شەهیدبوونی سەیارەی پۆلیس کاك صلاح چاوشین گەیشتبووە سەری و بردبویانە نەخۆشخانە زۆر هەوڵماندا بۆئاشکرابونی و دەیان شتی جۆربەجۆرباس دەکرێت ئێمە بەدوای بەڵگە دابوین و هەرواش بەردەوام دەبین لەسەری وەدەشزانین شەهیدکردنی چۆنەو دامان ناوە بۆکاتی خۆی، لە٢٢/٣ چومە سەیدصادق و گوڵەخانەو ریشێن بۆچارەسەری کێشەی ریشێن و دەرەگولاَن سوڵحمان بۆ کردن ماڵی عوسمان حەمەنەجم و ماڵی ئەحمەدحاجی کەریم بە(٣٠)هەزار دینار بۆ بریندارەکەو ئیبراهیم، لە٢٣/٣ چومە کانی پانکە بۆچارەسەری کێشەی نێوان مەلانوری و تاهیر گرێزەیی کاك شێخ داراش هاتبوو (٣)کەس کوژرابوو ئەویش تارادەیەك چارەسەر کراو لەدوای نیوەرۆ چومە قەلاَچولان و بۆ مەکتەبی سیاسی یەکێتی و بۆلای مام جەلال کاك مولازم عمرو کاك عمری سەیدعەلی لەویٚ بوون خانوەکان داوامان کردەوە هەرنەیان دابوینەوە و هەر دوای ئەوەش دوایان خست کاك جومعە یاکاك جەمیل بایك لێپرسراوی (PKK) لەکوردستان لەویٚ بوولەقەلاَچوالان هەندێك قسەمان کرد وادیاربوو کێشەیان هەبوو،

له٣/٢٤ (١١)جەنازەی شەهیدی یەکێتی لەداستانی رزگاریدا لەگەڵ ئێران هێرشی هاوبەشی یەکێتی وئێران لەلای ماوەت شەهید ببوو لەساڵی ١٩٨٧ دۆزرانەوە لەچاڵە بون جەنازەکانیان برد بۆ سەرقەبران بۆ رێزلێنانی لەشەهیدەکان منیش رۆیشتم بەپێ بۆشەهیدان و گەراینەوە لەمەڵبەندەوە بۆشەهیدان، لە٣/٢٥ لەسلێمانی بوم میوان و خەڵکێکی یەکجار زۆر هاتبون بۆ سەردانمان، لە٣/٢٦ هەرلە سلێمانی بوم وخەریکی ئیشوکاری ئاسایی رۆژانە بوم، لە٣/٢٧ هەرلەسلێمانی بوم و پێشوازیمان کرد لەخەڵك و پارتی یەکسانی کوردستان کەهاتبون هەرئەورۆژە چومە دوکان بۆپرسەی کوری کوێخا سمایلی تەلان و گەرامەوە کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ لقی سلێمانی، لەرۆژانی ٢٨و٣/٢٩ هەربەردەوام بوین لەئیشوکاری رۆژانە، لە٣/٣٠ لەسلێمانیەوە چومە سەیدصادق و گردەنازێ بۆپرسەی کوری حاجی ئەحمەدی قوڵخورد لەتراکتۆر وەرگەرابوو پاشان چومە قەدەفەری و شەو چومە گوڵەخانە، لە٣/٣١ چومە سەیدصادق و هەڵەبجەی تازە بۆپرسەو پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٤/٤/١ چومە تەعزیەی اسماعیل ئاغای برای بابەکرئاغای پشدەر پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی زۆرماندبووم، لە٤/٢ هەرلەسلێمانی خەریکی ئیشوکاربوین، لە٤/٣ کۆبونەوەیەکی گشتی مان هەبوو لەسلێمانی لەگەڵ لقەکانی سلێمانی و هەولێرو کەرکوك و دهۆك وەدوای ئەوانە کۆبونەوەی تایبەتمان هەبوو لەگەڵ لقی هەولێردا لەسەر روداوەکان وەزعەکان بۆئێمە لەبارترو مەجال باشتربوو یەکێتیش کەزانیان جەماوەرو هێزی خۆمان هەیە زیاتر هاوکاریان دەکردین یامەجالیان دەدایێ و دەمانتوانی زیاتر کارەکانی خۆمان هەڵسورێنین لەکوردستاندا، لە٤/٤ هەرلەسلێمانی خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوین و رێکخستنەکانی حزبیش زیاتر ئەو ناحەقیەی پارتی شەری پێ فرۆشتین و پاشان شەهید بونی خاڵەحاجی ئەوانە هەموی زیاتر رێکخستنەکان و جەماوەری حزب

هاندا بەهاوکاری و خۆماندوکردنی زیاتر لەگەڵ حزبدا، لە٤/٥ بەشداربوین لەجەنازەی خاتوو لیسی دا کەدۆستێکی کوردو ئیشی بۆکورد دەکردو خۆی شەوڕۆژ ماندوو دەکرد وە دۆستی حزبی سۆسیالیست بوو کەلەرۆژی ٤/٤ لای عەربەت کوشتیان بەناحەق بەرێمان کردو (UN) بردیانەوە بۆ ئەڵمانیا، لە٤/٦ کەدوای لەدادگای سلێمانی کەشف بوو بکوژەکە بەناوی زەکی خەڵکی کەرکوك و حمایەی کاك عەتا سەراوی بووئیعدام کراو تاوانبارانیش دادگایی کران لەدادگای سلێمانی من لەسلێمانی بوم، لە٤/٧چومە شارەزورو بۆ گوڵەخانە، لە٤/٨هەرلەگوڵەخانە بوم سەرقاڵی ئیشوکاری حزب بوم، لە٤/٩ گەرامەوە بۆسلێمانی، لە ٤/١٠ گەرامەوە بۆ گوڵەخانەوپاشان چومە شیرەمەرو ئێلاّن پێ و وشکەناوو ملەخوردو دزلّی و مەریوان شەو لەماڵی کاك بارام بوم لەکانی دینار، لە٤/١١ لەمەریوان بوم وسەردانی بارەگای بزوتنەوەم کرد لەوێ کاك مەلا عەلی و کاك مەلائەحمەد و برادەران لەوێ بوون نیوەرۆیش نەیان هێشت برۆین پاشان بەرێ کەوتم بۆ سنە، لەئێوارەی ١١-١٩٩٤/٤/١٢ کاك رەسول مامند لەلەنەدەن کۆچی دوایی کرد یەك مانگ دوای خاڵەخاجی زۆرم پێ ناخۆش بوو هەرچەندە ئەو نەچوبووە پرسەکەی خاڵەحاجی لەلەندەن سەرەتا وەکو پێویست بەلاّم کاك رەسول بەرپرسمان بوو(١٧)ساڵ پێکەوە بوین و هیچ کێشەیەکمان نەبووئێمە وەفدێکمان نارد بۆسەرقەبران لەبەردەشان بەلاّم یەکێتی رێگایان نەدابوو برادەرانی ئێمە قسە بکەن لەسەر قەبران لەبەرپارتی کاك سامی عبدالرحمن قسەی کردبوو وەمن پێم ناخۆش بوو کۆچی دوای کرد لەوکاتەدا هەرچەندە هەندێك دوژمن و ناحەزپێیان خۆش بوو شەویش کاك بەرزانی برای شەهید خاڵەحاجی تەلەفۆنی کردو ئەویش هەر خەبەری دامێ و منیش تەلەفۆنم کرد لەگەڵ ماڵەوەیان فاتمەخان بۆسەرخۆشی کردن وبەشداربون لەناخۆشیان، لەرۆژانی١٢تا٤/١٦ هەرلەسنندج بوم

بەردەوام خەریکی پەیوەندی بوم بەدەرەوە، لە٤/١٧ چوینە کرماشان بۆکۆبونەوەو گەراینەوە بۆ سنندج و لەویێ بوم تا رۆژی ٤/٢٢، لەرۆژی ٤/٢٣ نیکسون سەرۆك کۆماری پێشوی ئەمریکا کۆچی دوایی کرد ناوبراو دەوری گرنگی هەبووە لەبیسەتاکان (عصبە الامم) ولایەتی موصل خرایە سەرعێراق ولەولایەتی بەسرەو ولایەتی بەغدادو ولایەتی موصلیش کەدەکاتە کوردستانی عێراق لەوسێ ولایەتە لەسەر وەعدووعود مافی کوردپارێزراوبێت وعێراقیان لیێ دروستکرد و هەروەها پشتیوانی لەکورد دەکرد کلنتۆن یەك رۆژ پرسەی راگەیاند، لە٤/٢٤ لەسنە بوم رۆژی بۆمبابارانی شاری قەلآدزە بوو لەلایەن عێراقەوە لەسالی ١٩٧٤، لە ٤/٢٥ هەرلەسنەبوم، لە٤/٢٦ تەیارەیەکی تایوانی لەیابان کەوتە خوارەوە کە(٢٦٣) کەسی تێدا مرد، هەروەها ئەمرۆ یادی بۆردومانی هەڵەبجەیە لەلایەن عێراقەوە لەسالی ١٩٧٤ کە(٣٥)هاولآتی شەهیدبوو لەگەلّ (١٣٢) بریندار و روخاندنی لایەك لەشارەکەش، لە٤/٢٧ جەنازەی نیکسۆن لەئەمریکا نێژرا بەئامادەبونی سەرۆك کۆمارە کۆنەکانی ئەمریکا وەکو کارتەرو بۆش و رێگن و کلنتۆن، لە٤/٢٨ بارانێکی زۆر بوو لەماڵەوە بوم لەسنە، لە٤/٢٩ هەرلەسنە بوم سەرقالی کۆبونەوە بوم،، لە٤/٣٠ هەر لەسنە بوم، لە١/٥/١٩٩٤ هێزێکی پارتی لەلیوای تایبەتی سەرۆکی پارتی لەصلاح الدینەوە رۆیشتن بۆ قەلآدزە بەقیادەی کاك عەلی حەسومیرخان ژاژۆکی کەباوکی لەشەری یەکێتی شەهیدببوو لەکونەکۆتر لەسەرچیای لەقەندیل لەسالی ١٩٨٣،لەبەرەی جود لەگەلّ هێزەکانی جودا شەهیدبو لەشۆرشی ئەیلولدا حەسومیرخان ئامرهێزی پارتی بوو لەناوچەی پشدەرو بکوژوبڕ خۆی بوو بارزانی ئازادی کردبوو لەوناوچەیە ئەویش کچێکی لەقەلآدزە بۆخۆی مارە بری بوو دوای هەرەس ئەوە خێزانی بوو ئەو کورەی عەلی لەو ژنەی قەلآدزە بوو کاتی خۆی شەهیدحەسو لەقەلآدزە زەوی بۆخۆی تاپۆ کردبوو زەویەکانی کردبون بەدوکان

دوای نـەمانی شـۆرش هەرکـەس چـوبوە سـەرزەوی خـۆی بـەلآم لـەدوای راپـەرین کردبویانەوە بەدوکان بۆخۆیان پارتیش هەر بەنەفەسـی کـۆن بەتـەمای ئـەوە بـون خەڵکەکە دەربکەن و بۆخۆیان بمێنێتەوە کەعەلی حەسۆمیرخان هـاتبوو خەڵکەکـە وتبویان ئێمە زەوی خۆمان بووە کاتی خۆی زەویەکانی ئێمەش بەزۆر براوەو ئێمـە ئێـستا زەوی خۆمـان وەرگرتوەتـەوە ئـەویش تەقـەی لـێ کردبـون کەسـێکی لـێ کوشتبون و ئەوانی کـەش سـجن و لێدان وبردبـونی بـۆ بارەگا لەقـەلآدزە خـەڵکی لەسەر ئەوە موزاهـەرەیان کـردوو شـەربوو لـەناو قـەلآدزە لـەنێوان خـەڵك و هێـزی پـارتی شـەر روی داو کـوژراویش هـەبوو پاشـان لیژنەیـەك دروسـت کـرا لـەپارتی و یـەکێتی هـەردوولای حکومەتەکـەیان بـۆ چارەسـەری کێـشەکان پێـشتر یـەکێك لـە لێپرسراوەکانی یـەکێتی کوژرابـوو کـە سێك بـەناوی مـستەفاپیرۆت سـەر بـەرژێمی عێراق بو بۆخۆشکردنی شەرەکە کەپێشتر لەگەڵ حزبی بەعس لە کـەرکوك بـەدوای فرسەتێکدا لە نێوان پارتی ویەکێتی دا ئامادەکرابو کە نامەکە بـۆ عێراقـی نوسـیوە کاك عەلی نەبی نوێنەری یەکێتی بوو قسەی کردبوو کەچـۆن شـەر روی دا پـارتیش تەقەی لەعەلی نەبی کردو کوشتیان کەئەوە کرا یەکێتیش چـووە نـاو شـەرەکەوەو دایان لەپارتی و بارەگایان لەقەلادزە گیراو عەلی حەسوو (٢٥) کەسیان لـێ کـوژراو لەسەر عـەلی نـەبی هەنـدێکیان سـوتاندبون کەسوکاری... عـەلی نـەبی کـورێکی ئازارو لێهاتبوو لەو ناوچەیە پـێ دەچێت عەلی حەسۆیش عەلی نەبی یەکێتی لەوانـە زانـی بێـت لەچـیای کونـەکۆتر دەسـتی لەکوشـتنی بـاوکی دا هـەبوبێت واتـە چەخماخەی شەری ناوخۆ پارتی لێی دا بـەلآم لـەرۆژی ٢و١٩٩٤/٥/٣ کـاك مـستەفا چاورەش لێپرسراوی یەکێتی بوو لەرانیـە و خـەڵکیان هانـدا پـەلاماری لقـی (١١)ی پارتی داو گرتیان لەوێ کوژراو هەبوو لەقەلآدزە ئەحمـەد حمەصـاڵح بـەگ ناوێـك هەرکوژرا پارتی بوون سوتاندنی لقی پارتی لەلایەن یەکێتیەوەو گـیراو بـووە هـۆی

درێژە دانی شەرەکە لەسنوری قەلادزەو رانیە یەکێتی دەیوت خەڵکی بووە بەلام خەڵکی پێ هاندان کاك مستەفا چاورەش دوای عەلی حەسۆمیرخان هۆکاری شەرەکەبوون بۆدرێژە پێدانی مام جەلال لەدەرەوە بروسکەی دەکرد و شەرەکە راوەستێت و کاك مەسعود وەکیلی منەو بۆ راگرتنی کاك مەسعودیش لەلیژنەی سەرۆکایەتی بوو بەلام کەس لەگوێی نەدەکرد، لە٢/٥شەر گەرم بوو پارتی لەدهۆك پەلاماری بارەگاکانی یەکێتی داو دەستی بەسەردا گرتن و لەزۆرجێگای کەش هەروەها یەکێتیش لەسلێمانی چوە سەرلقی (٤)و دەوری گرتن لەسەعات(٣)ی پاش نیوەرۆجێگری وەزیری پێشمەرگە کاك قادرقادرو کاك دەروێش ئاغا قائدی مەنتیقەی سلێمانی و کاك کەمال حسن چاومار و زۆری کەش لەئەندامانی سەرکردایەتی پارتی لەناو لقی (٤) چوبونە ژورێك جگە لەوەی تەلەفۆنیان کردبوو تکاو رجا کەدەوریان گیرابووئەوبەرپرس و قارەمانانەی کەلە١٩٩٣/١٢/١٤ تەقەیان لەژن و منالّ و خەڵکی هەژاری شاری سلێمانی دەکرد لەترسا نەیان دەوێرا تەقەبکەن چونکە خۆیان لەخەتەردابون لەژورێکدا کەیەك پەنجەرەی بچوکی تێدا بوو هاواریان دەکرد تەسلیم تەسلیم یەکێتیش هەرلە دەرەوە تەقەیان دەکردو گوێیان لێ نەبوو هاوار دەکەن تەسلیم بانگیان دەکرد دە پێشمەرگە ئەو موکەبەرەمان بۆ بهێنن موکەبەری بچوك هەبوو بەباتری ئیشی دەکرد بۆیان هێنابون هەمو ئەوانەی سەرکردایەتی لەناو ژورە بچوکەکەدا هاواریان دەکرد برادەرانی یەکێتی تەقەمەکەن من قادر قادرم تەسلیم دەبم وەرن لێرەین دەروێش ئاغاو هەمویان بەنۆرە بانگیان دەکرد بەموکەبەرەکە لەژورەکەدا دەنگی دەدایەوە لەگولەکە خراپ تربوو خەریك بوو مێشکیان دەتەقی لەوێ خۆیان تەسلیم کردو هەموو گیرانو هەندێکیان وەکو کاك عوسمان قادرمنەوەر خۆی تەسلیم نەکردبوو تەقەشیان کردبوو دەرباز بوبوو لەگەڵ نوری حمەعەلی وحمەخان حمەکەریم و

کۆمەڵکیان یەکیان گرتبوو (٣٠) کەسیان بەرەو شارەزوور نەیان وێرابوو بۆلای قاینجە رۆیشتبون برادەرانی ئێمە لەریشێن بەدۆشکا تەقەی لێ کردبون بەرەودەشتایی نەوێ رایان کردبوو دوای خەڵکیان ناردبوو بۆلای برادەرانی ئێمە رێگایان بدەن لەوێوە برۆن بۆوشکە ناو لای بزوتنەوەی ئیسلامی من پەلەم کردولەسنەوە گەرامەوە مامۆستا مەلاعەلی ببینم بۆئەوەی ئەوان نەچنە ناوشەرەکەوەو لەگەڵ مام جەلال قسەم کرد لەئیتاڵیابوو رێکەوتن لەگەڵ بزوتنەوەدا هەوڵشیان بۆبدەم لەگەڵ ئێران بۆرێکەوتنیان تامن گەیشتمە وشکەناو بزوتنەوە چوبونە ناوشەرەکەوەو پەلاماری خورماڵیان دابوو لەوێ شەربوو من لەگەڵ مامۆستاعەلی قسەم کرد ووتی وەڵا ئێمە حەزمان پێ نەکردوە ئەوە (٣-٤) مانگە چاوەرێ دەکەین ئەوان هیچ هەنگاوێکیان نەناوە ئێستاش ئەوان دووچاری شەربون لەگەڵ پارتی وئێمەش تۆڵەی خۆمانیان لێ دەکەینەوە کاك مەسعود بروسکەی کردووە بۆمان پێکەوە لەشەرو ئاشتی دەبین..من ووتم مامۆستا کاری خراپتان کردووە دەبو سەیر بکەن دوای پارتی ئاشتی دەکات لەگەڵ یەکێتی دا بێ پرسی ئێوە شەرەکە بۆئێوە دەمێنێتەوە ئێمەش لەگەڵ پارتی لەحاڵەتی شەرداین بەڵام ناچینە شەرەوە دژی پارتی کەئێستا باشترین فرسەتە بۆئێمە تۆڵەی خۆمان بکەینەوە وەمن ئێستا پەلەمە بۆئەوەی برادەرانی ئێمە نەرۆنە ناوشەرەکەوە بەڵام لەسلێمانی لەرۆژی ٣/٥ شەربوبوو مەفرەزەکەی من بۆهێنانەوەی ئەو سەیارەی کەبەجیهازەکەوە بردبویان پارتی لەگەڵ تەلەفزیونی هەولێرو رادیۆی (FM)کان چوبون سەیارەکەیان هێنابوەوە دەرەوە لەلقی (٤) زانیبویان تەلەفزیونەکەشیان لەپشتی سەیارەك دانابوو ئەویشیان هێنابووە دەرەوە کاك جەبارفرمان و کاك جەمیل هەورامی هەردوو سەیارەکەیان لێ سەندبونەوە کەسەیارەی خۆمان بوو کاك جەبار بردبوی بۆحیمایەکانی خۆی کەشۆفرلێت بوو ئەو سەیارە جیهازەکانی

تێدابوو ئەویش بردبوی وتبویان دوای ئەتان دەینەوە بەلاّم هەر نەیان دایەوە هەروەها کارگەی خەیاتیەکەش مولازم سیف اللە بردبوی لای موقیع و هەرداوای نامەیان دەکرد ئەویشیان نەداینەوە تائەوکاتەش بارەگاکانی خۆشمانیان نەدابوینەوە واتە پارتی لەشەر شتی ئێمەیان گرتبوو دەست کارییان نەکردبوو دایان نابوو بمان دەنەوە برادەرانی خۆمان هێنایانەوە بەلاّم یەکێتی لێی سەندبونەوەو دابەشیان کردبوو لەنێوان خۆیاندا، کاك جەبارسەیارەکەی منی بۆ خۆی بۆیاخ کردبو لەگەڵ جیهازی راکاڵ کە پارتی لە شەردا بردبویان دایاننابو تادەماندەنەوە بۆئەوەی تایەی سیارەکە خراپ نەبێت لەسەربەرد دایان نابو بەلاّم یەکێتی دۆستە هاوسەنگەرەکەمان کاك جبار فەرمان وکاك جمیل هەورامی لەبرادەرەکانی خۆمانی سەندبوەوە بۆخۆیان بردبو بزوتنەوە بریاری شەریان دا لەگەڵ یەکێتی و شەرلەهەموو لایەك دەستی پیێ کرد... من ئێوارە گەیشتمەوە گوڵەخانەو پێشمەرگەیەکی زۆری لێبوو دوشکاکانیش جار جارتەقەیان دەکرد کاك محمد دۆلاّشی و برادەران لەویێ بون وتیان شتێکمان کردووە ووتم چیە... وتیان پارتی شکابون و (٣٠) کەسێکیان بەرەو سورێن هاتبون ناردبویان رێگایان بدەین لەلای ریشێن و شیرەمەرەوە تێپەرن بۆ وشکەناو ئێمەش وتومانە ئاگاداری هێزەکان دەکەین بڕۆن وتبویان خۆتان لەگەڵمان نەبن و سەیارەکانی خۆتان نەیەن لەگەڵمان بەسەیارەی سۆسیالیست نەبێت ناڕۆین ولێمان دەدەن ووتیان لەبەر ئەوە نەڵێن سۆسیالیست بەدوای تۆڵەدا دەگەرێن (٣-٤) سەیارەی خۆشمان ناردووەو سوارمان کردون تانزیك بانی شار بەرێمان کردون کەپێشمەرگەی خۆمان جارجار تەقەیان دەکرد لەمیری سورو رەبایەکانەوە خۆیان دەکرد بەژێر سەیارەکاندا زۆر ترسابون هەمووبارەگاکانیان گیرابوو.. پێم وتن باشتان کردوە بەرێتان کردون و گەیاندبویانە لای وشکەناو بارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی زۆر

لەپارتی خۆیان کردبوویە بارەگاکانی ئێمەدا بۆئەوەی پەنایان هێناوە نابێ قەت بەدوای فرسەت وتۆڵە بگەرێین دەستتان خۆش بێت، لە٥/٣ کاک جەلال حاجی حسێن کەوتبووە نێوان پارتی و یەکێتی بۆئەوەی شەرنەبێت تەقەیان لێ کردبوو شەهیدیان کردبوو زۆرم پێ ناخۆشبووکاک جەلال پێشمەرگەی کۆن و پیاوێکی ئازاو ماندبوو لەشۆرش دا پیاوێکی هەڵکەوتبوو، لە٥/٤ چومە سەیدصادق و بۆسلێمانی وفریاکەوتم پێش ناشتنی کاک کۆسرەت و کاک مولازم عمرو زۆری برادەرانی یەکێتی لەوێ بون من قسەم کرد لەسەر گۆرەکەی وهەڵوێستی کاک جەلال لەکۆنەوە باشبو لە سەر روداوەکان رای خۆی وتووە بەلاٚم کاک جەلال لە بەر ئەوەی لە حزبێك نەبو بەئاسانی وناحەق تێیاچو کەس لە سەری نەهاتەوەلاٚم یەکێتی بە پارتی ئەزانی و پارتییش لە بەر هەڵوێستی ساڵەکانی ٧٠کان بە یەکێتی دەزانی لە راستیدا بێ لایەن بو هەرئەو رۆژە چومە پرسەی خێزانی کاک عبدالخالق هەورامی لەسابون کەران، لە٥/٥ لەسلێمانی بوم لەزۆرلاوە برادەرانی ئێمە خەریکی ئەوە بون کەبەشداربن لەشەرەکەوتۆڵەی خۆیان بکەنەوە لە پارتی لەهەندێك جێگاش پێشمەرگە بێ پرس بەشداری کردبوو بەلاٚم دوای ئاگادارمان کردن بێ لایەن بن بەتایبەتی کاردانەوەی برادەرانی یەکێتی لەسەر ئەو برادەرانەی ئێمە لەناوشار ئەوانەمان چوبون بۆسەیارەکانی خۆمان رێگایان نەدابون و لێیان سەندبونەوە، لە٥/٦ خێزانی خاڵەحاجی ئامینەخان هات ووتی محی الدین لێرەیەو دەترسێت بیگرن بەڵکو لەبەرخاتری خاڵەحاجی کارێك بکەیت نەیگرن خۆی هەوڵی داوە قسە لەگەڵ مولازم عومەربکات بۆئەوەی رێگای بدەن بڕواتە هەولێر کاک مولازم عمر تەلەفۆنی کردو ووتی محی الدین لەکوێیە حەزناکەم توشی شتێك ببێت لەبەرخاڵەحاجی من ووتم لەماڵی ئێمەیە و ئەگەر ئەتەوێت چاوت پێ بکەوێت لێرە وتی باشە بۆئەوەی نەیگرن لەماڵی ئێمەش نەبوو نەشم دیبوو لەبەر ئەوەی برای

خاڵەحاجیەو خێزانی خاڵەحاجی داوای کرد توش نەبێت دوای چاوم پـیٚ کـەوت زۆر دەترسا ووتی ئەگەر برۆمە ئێرانیش ئەوە لەویٚ دادەنیشم ووتم کاك محی الـدین تـۆ ئەو قسانە بۆکیٚ دەکەیت من دەتگەیەنمە سورێن بۆئێران دەرۆیت بۆلای بزوتنەوە دەرۆیت بۆ لای هێزە پەرتەوازەکانی خۆتان دەرۆیت و کۆیان دەکەیتەوە بۆ صـلاح الدین دەرۆیت ئەوە کەیفی خۆتە من بەکاك مولازم عمریـشم ووتـوە لـەماڵی ئێمەیـە هەرچەندە نەمئەزانی لەکۆیە لەسلێمانی دانیشێت کـەس پەیوەنـدی بـەتۆوە نیـە لەئێــستاوە ئەگــەر دەڵێــت دات دەنــێین و پێــشمەرگەی خۆشمــان دەکــەم بەپاسـەوانتان... ووتـی تـۆ بمگەیەنـە گوڵەخانـە و لەوێـشەوە تاسـورێن یـابۆلای مامۆستا مەلاعەلی و ئەوان پێم ووت زۆرباشەو دەتنێرم بۆگوڵەخانـە ووتـی ئەگـەر خۆت نەیەت نـارۆم لـەدوای نیـوەرۆی رۆژی١٩٩٤/٥/٧ لەگـەڵ خـۆم بـردم بـە سـیٚ سەیارەی خۆشیەوە دەوری ١٥پێشمەرگەشی لەگـەڵ بـو پـێم وایـە کـاك عبـدالرزاق عەلی یش بو لە سلیمانیەوە بـۆ گوڵەخانـە جامانـە سـورەکەی لابـرد ووتم مەترسـە حەزدەکـەیت دەچـینە لای برادەرانـی یـەکێتی و ئـەوکات دەرۆیـن لێـرە وانیـە وەکوئەوەی ئێوە تەسەوری دەکەن و ئێـستا خـەڵکتان بـچێتە لای یـەکێتی بـەریان دەدەن ئەو رۆژە بردمە گوڵەخانـە، لـە٥/٨ مـن گەرامـەوە بۆسلێمانی و هـەوڵ دان بۆئـەوەی شـەر رابگیرێـت ئەوانـەی پـارتی کەشکابون لای مەقـەرەکانی ئێمـەوە رۆیشتبون یەکسەر بۆئێران و ئەوناوە وەهەنـدێك مـەفرەزەی پـارتیش چـوبونە لای بزوتنەوە لەدەوری سەرگەت و ئەوناوە، هەرلەرۆژی ٥/٨ نامەم بۆ مام جەلال و کاك مەسعودومامۆسـتا مـەلا عوسمـان نـاردو داوای وەسـتاندنی شـەرم کـرد لـەرادیۆو تەلەفزیۆنیش بلاٚوکرایـەوە جگەلـەپارتی، لـە٥/٩ هـەوڵێکی کـەم دا بـۆ وەسـتاندنی شەری نێوان بزوتنـەوەو یەکێتی ئێمە بیٚ لایەن بـوین لەشـەرەکە لـەو کاتـەدا ئێـران یارمـەتی بزوتنـەوەی دا کەهەنـدێك جێگـا لەدەسـتی یـەکێتی بگـرن و هـەوڵیان دا

بۆکۆکردنــەوەی ئــەو چــەکدارە پەراگەندانــەی پــارتی پەرتــەوازە بوبــون کۆیــان بکەنەوەو لەسنوری هەڵەبجە لەگەڵ بزوتنەوەدا بونە هێزێك وبزوتنەوەش چادرێکی دا بەپارتی و مامۆستامەلاعەلی ووتی هەندێك کەمپوتیان بدەنیٚ بالەبرسا نـەمرن و یانەرۆن بۆئێران کۆیان بکەنەوە ئەورۆژە من لە وشکەناو بـوم مامۆسـتا مەلاعـەلی ناردی بەدوای برادەرانی پارتی هاتن کەمێك شەرمیان ئەکرد شەری ئێمەیان کردبوو وەئێمەش لە جیاتی تۆڵە سەندنەوە هاوکاریمان کردبون کاك نـوری وکـاك عوسمـان قادر منــەوەر بـو کـاك حەمـە خـانی حـاجی داراو کـاك حمـەکریم ئـەو ماوەیـە واتـا لە٤/٥/١٩٩٤ لەکفری تاهەولێر پارتی پاك کرابووەو کەسی لیٚ نـەمابوو، هەرلـە ٥/٨ کۆبونەوەمان لەگەڵ لایەنەکان کرد بۆوەستاندنی شەرەکە بـەلاٚم هەربـەردەوام بـوو لەوکاتەدا، لە٥/٩ لەسلێمانی بوم کاك کۆسرەت ودکتۆر ئەحمەد چەلەبی و ئەوانیش لەهەولێر هەرخەریك بون بۆ راگرتنی شەرەکە، لە٥/١٠ برادەران داوایان کرد بـا بـە سۆسیالیستە کۆنەکان بڵێن بگەرێنەوە بۆناو حزب و تیانەچـن منـیش پـێم باشـبوو ووتم پێیان بڵێن تا(٥)ساڵی کەش وەکو (٥)رۆژ پێش ئێستای لـیٚ نایەتـەوە پـارتی لەخانەقین بۆزاخۆ بابگەرێنەوە لە ٥/٥ بـوو بـەمنیان ووت لـە٥/١٠ چومە بارەگـای یەکێتی لەسلێمانی قسەم لەگەڵ کردن و پێم وتن ئێوە رازیـن مـن بکەومـە بـەینتان ئەگەرکرا بۆوەستاندنی شەر ووتیان پێمان باشەو لەگەڵ بزوتنەوە و لەگەڵ پارتیش ووتم پارتی تائێستاش هـەر ئێمـە دەنـگ ناکـەین ئـەوان هـەروا دژی ئێمـەن بـەلاٚم لەگەڵ بزوتنەوەدا هەوڵ ئەدەم چومە گوڵەخانەو شیرەمەرو ئێلاٚن پـیٚ و وشـکەناو کەس لەویٚ نەبوو لەسەربانی سورە سیۆ بوو چاوم بەکاك مەلا ئەحمەدی ئێلاٚن پـیٚ کەوت ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزوتنەوە بوو قسـەم لەگـەڵ کردوادیـاربوو بریـاری شەریان دابوو جارجار سەیری لای شەرام و سـەرگەت و گـوڵپی دەکـرد کـەی تەقـە دەست پیٚ دەکات ووتی ئەگەر کاك عەلی باپیریش لەبپلەکەیـە بیبیـنی خـراپ نیـە

ووتم وەلاّ پـێم باشـەو منـیش هەربۆئیـشی خێـرو وەسـتاندنی شـەرهاتوم چـومە سەرەوە لـەجێگای بارەگا کۆنەکـەی سۆسیالیـست پرسـیمان و دابـەزین مامۆسـتا مەلاعـەلی بـاپیرو کـاك مـەلا محمـدی رازی و مەلائەبوبـەکر و مـەلا محمـدی مامۆستامەلاعمرو زۆر لەمامۆستایان لەوێ بون دوای قسە کردن و هەولّدانی ئاشـتی وادیاربوو ئەوان بریاری شەربەفرسەتێکی زێرینیان دەزانی دەستیان کـەوتووە ووتم خۆ ئێستا ئێمەش لەگەلّ پارتی دا لەحالّەتی شـەردایـن بـەلاّم دەمانـەوێت کێشەکە زوتر کۆتایی پێ بێت وچارەسەر بکرێت و نەچینە ناوشەرەکەوە وتیان ئەوە چـەند مانگە یەکێتی لێمان ناپرسێت و لەم شاخەین ئەگـەر راستیان دەکـرد یـەکێتی ئـەو هەولّەی ئەو دووسێ رۆژە دەیدا دەیتوانی ئەو دووسێ مانگە بیـدەن و چارەسـەری بکەن لەوێ قسەم کردو من وتم ئێمە فرسەتی باشمان دەست کـەوتوە بـۆ لێـدانی پـارتی بـەلاّم بریارمـان داوە بـە دوای تۆلّـەدا ناگـەرین مـن شەخـسی لـە زۆربـەی شەرەکاندا ئەوەندەی مەجال بوبێت لەپێشدا تەقە دەست پێبکات یانامە یاکەسێکم ناردووە ئێمە فلاّن هێز فلاّن کەسم بۆ شـەر هـاتوم یـاخود مـن لێـرەم لـە پریـسی سەرو بوم سالّی١٩٧٧موختاری ئاوایم نارد بۆهەلّەبجە حکومەت ئاگادار بکەن کەمن لێرەم بابێن چەندین جاری کەش زۆر جار برادەرەکانم پێیان دەوتم بەلّگـە ئـەدەیت بەدەستی دوژمنەوە پێش قسەکە تەواو بکەم کاك مـەلا ئەحمـەد ئێلاّنپـێ لـە سـەر بەردێك شانی دادابو لەگەلّ قسەکەی مندا راپەری وتی بۆ شەری پـارتی ئەکـەن وتم ئێمە بریارمانداوە بەدوای تۆلّەدا نەگەرین وهاتوین ئێوەش بە دوای تۆلّە دا نەگەرین یەکێ لە مامۆستاکان حەدیسێکی هێنایەوە کە ئەوفرسەتە زێرینە لە دەست بـدەین لە بەردەم خواو شەهیدەکاندا موحاسەبە ئەکرین بۆئەوان حەلاّلّە یـەکێتی چـاوەرێ ی ئەوە نەبولەگەلّ پارتی توشی شەرێکی وادەبێت هەرلەسەربیروباوەری پێشویان بـون کـاك محـی الـدین رەحـیم یـشمان لەگەلّـدا بـوو هێنامانـە وشـکەناو بـۆلای

برادەرەکانی خۆی بەلاّم بزوتنەوە ئامادەی وەستاندنی شەرنەبوومن هەولّی زۆرمدا بەلاّم بزوتنەوە راستیان دەکرد ئەگەرشەری پارتی نەبوایەت هەرگیز یەکێتی ئامادە نەبو لەگەلّ بزوتنەوە شەربوەستێنیّ منیش گەرامەوە وەشکەناوو بۆگولّەخانە، لەشەوی ١٠-١١/٥/١٩٩٤ راجیمەو تۆپ و هێزی ئێرانیش لەگەلّ بزوتنەوە هەێرشیان کردو یەکێتی شکا لەوناوە بزوتنەوە هەندێك هاتنە پێشەوە بۆلای گولّپ و باخەکۆن و نارنجەلّە لەرۆژی ١١/٥ بزوتنەوە هاتبونە ئەوناوە من زۆر هەولّم دا بۆوەستاندنی شەرەکە بەلاّم نەکرا هەردوولا بەردەوام بزوتنەوەو پارتی لەلایەك و یەکێتیش لەلایەك ئێمەش بیّ لایەن بوین لەوشەرە بەلاّم پێمان خۆش نەبو یەکێتی بەرامبەر پارتی بشکیّ چونکە پارتی لەئێمەشی دەدا لە١١/٥ لەگولّەخانەوە چومە سلێمانی هەربەردەوام بوم نوێنەری سوپای ئێرانیش ئاغای ئاسیابانی لە وشکەناو لەگەلّ هێزەکانی بزوتنەوەدابون و پێویستیەکانی شەریان بۆجیّ بەجیّ دەکردن، لە١٢/٥ لەبارەگای حزبی زەحمەتکێشان کۆبونەوەیەك کرا لەنێوان سۆسیالیست و زەحمەتکێشان و شیوعی کەچی بکەین وچۆن هەولّ بدەین بۆوەستاندنی شەر پێکەوە قسەمان کرد، لە١٣/٥ سالّرۆژی راپەرینی شاری هەلّەبجەبوو لەسالّی ١٩٨٧ واتە ئەو رۆژەش بزوتنەوە یا مامۆستایانی هەلّەبجە لەهەلّەبجە دەرچون بەرەو ئێران و لەلایەن سۆسیالیستەوە دەست بەسەر خورمالّ و ئەحمەدئاوا و گردی گۆو سیروان و زۆرجێگای کەشدا گیرابوو.. لەسلێمانیەوە چومە گولّەخانە وتیان بەبروسکە وەرە من چوم کاك شەوکەت حاجی مشیر و کاك حامیدحاجی غالی وزۆر لەبەرپرسەکانی یەکێتی لەگولّەخانە بون وادیاربوو شەولەدەوری گولّپ شکابون و زەرەرشیان لیّ کەوتبوو(٤٥) جەنازەیان جێمابو یەکێتی ئەوەش یەکەم شەری سەرکەوتنی بزوتنەوەی ئیسلامی دژی یەکێتی بە پشتیوانی تۆپ وراجیمەی ئێران هەرلەرۆژی شەرەکانی بزوتنەوە ویەکێتی لەسەری سالّ لەرۆژانی ١٨تا٢٠/٥/١٩٩٤

رادیۆیەکیان لەسنە بۆدانان بۆهەواڵەکانی بزوتنەوە بلاوبکاتەوە وە(١٠)پێشمەرگەی پارتیش لەسلێمانیەوە دەریان کردبون لەوێ لەبارەگای ئێمە بون کاک دیاری حسێن بەگ لێپرسراوی ناوچەی پارتی بوو وە(٨) کەسی بزوتنەوەش هەرلەوێ بون یەکێتیش نزیکەی (٥٠)کەسی لەوێ بون کاک حامید ووتی ئەو ژورانەی ئێوە قەڵەباڵغەو کەس ناچێتە ژوورەوە یادەرەوە ووتم بۆ ووتی وەلا هەرپرسیار دەکەم ووتم ئەو ژووره پارتی لێیەو ئەوژوورەش بزوتنەوەو ئەو دوو ژوورەش ئێوەی لێیەو ئۆمەتی محمد تەوحیدە بەشەرەوە وەلابێ خەم لێ ی دەخەوم.. لەبزوتنەوە مامۆستا مەلا صدیق براى مامۆستا مەلاعەلی ومامۆستا مەلا ناصیح مەلا صالح بامۆکی بەلام کاک شەوکەت وبرادەرانی یەکێتی رەئیەکەی پێشویان کەبزوتنەوەی ئسلامیان شکاندبو زۆر گۆرابو بە ئەحمەد قەدەفەریم وت ئێستا لەسەر رەئیەکەی ئەوجارماون کە مەجالی حزبی کە نەماوە تەسلیمتان کەم و بڕۆم بۆ خارج وتی خوائەکات ئەوان داوا ناکەن تە سلیمی تۆی بکەن و زۆری کەش بون کاک حامیدووتی وەلا حەزدەکەم پارتیەکان ببینم بەلام بزوتنەوە ناناسم دیاری لێرەیە چاوی بە کاك دیاری حسێن بەگ و وا بزانم کاك ئاراسی حەمەکەش بو کەوت و قسەیان کرد نیوەرۆ یەکێتی وپارتی و بزوتنەوە پێکەوە نانیان دەخوارد و هەرکەس دوای دەچووە ژوری خۆی وابون تا بەرێمان دەکردن بۆئێوارەکەشی دەعوەت بوین و شەو گەرامەوە گوڵەخانە، لە١٤/٥ لەگوڵەخانەوە چومە شیرمەرو ئێلانپێ و وشکەناو بۆچارەسەری شەرەکان چاوم بەمامۆستا مەلاعەلی و کاك مەلامحمدی رازی کەوت کاك محمد دۆلاشی و کاك عەتام لەگەڵ بون زۆر هەوڵم دا بۆراگرتنی شەرەکە بەلام وادیاربووپارتی وەعدی دابوو شەرلەگەڵ یەکێتی رانەگرێت بۆیە بزوتنەوەش هەمان رایان هەبوو بەلام دوای قسەی زۆر وتیان ئامادەین بەلام چەند رۆژێکی کە وادیاربوو خۆیان ئامادە دەکرد هەندێك شوێن لە دەستی یەکێتی

وەربگرن ئەوكات شەر رابگرن من پێم خۆش بوو شەرنەبێت و كەس زەرەر نەكات مامۆستا مەلاعەلی دۆستی كۆنم بوو حەزم لەزەرەری نەدەكرد پێم خۆش بووشەر لەگەڵ یەكێتی بوەستێت چونكە پارتی ویەكێتی شەریان بوەستایە پرسی بزوتنەوەی نەدەكردپارتی پاشان چومە مڵەخوردو بۆمەریوان و شەو لەكانی دینار بوم وادیاربووقەرارگاو ئێرانیەكان مەشغوڵ بون لەوناوە لەمەریوان چاوم بەفەرماندار كەوت و پاشان چوم بۆ سنە... ئەمرۆ لەهەولێر شەر ببو لەنێوان پارتی و یەكێتی دا لەهەولێر (٦)كوژراو هەبوو شەرەكە وەستابوو، لە٥/١٦ شەرلەخورماڵ و بەرەو هەڵەبجە رۆیشت و یەكێتی لەپاشەكشەدا بوون، لە٩٤/٥/١٧ یەكێتی هەڵەبجەی چۆڵ كرد و بزوتنەوەش چونە ناو هەڵەبجەوەو مەفرەزە پەراگەندەكانی پارتی كەئێمە زۆریانمان دەركردبون و لەگەڵ هێزەكەی بزوتنەوە چوبونە هەڵەبجەو لەوێ پەلاماری بارەگای ئێمەیان دابوو شەر ببوو كاك محمدمەلاحمە كەریم كۆكۆیی بریندارببوو لەوانەش لەتیف ناوێك كوژراو چەند بریندارێكیان هەبوو دوای بزوتنەوە كەوتبووە بەینیان و پارتی خۆشیان ئاگاداریان كردبون سۆسیالیست هاوكاری ئەوانی كردووەو خەڵكی لەدەستی یەكێتی بۆ بەرداون و رزگاركردووە هەرهەمان رۆژچوبونە سەربارەگای تەوێڵەمان و لەوێش دووپێشمەرگەی لێبوو چەكیان كردبون پارتی بەكاك مەلاعەلی مان ووت ئەویش بەوانی ووت ئەورۆژەی كەپارتیەكان هاتنە لامان لای مامۆستامەلا عەلی بوین لەوشكەناو شەرمەزار بون لەوەی ئەوماوەیە دژی ئێمە كردبویان هەرلە ٥/١٧ بزوتنەوە بەهاوكاری كۆماری ئیسلامی ئێران چوە هەڵەبجەو لەحاجی عمران و رایاتیش حزبلای كاك شێخ ئەدهەم بارزانی بەپشتیوانی تۆپی ئێران و پارتی كەمنێكیان داناوكاك حسن كوێستانیان شەهیدكرد وچەندكەسێكیان كوشتبو لەسەر قسەی تەلەفزیون ورادیۆی یەكێتی لەوناوچەیەدا، هەر لە٥/١٧ برادەرانمان لەسوئید

رادیۆیەکیان بۆ کرین و بەرێیان کردو گەیشتە تەهران، لە١٨/٥ شەری یەکێتی و پارتی و بزوتنەوەو حزبلاّ هەمویان لەلایەك و یەکێتیش لەلایەك شەر بوو یەکێتی باجی هەڵەکانی وسیاسەتی غەڵەتی خۆی ئەدا هەمان رۆژ(١٩)تەیارەو بەهاوکاری هەلیکۆپتەریش ئەگەر پێویست بوو بنشێتەوە لەمبارەگای (PKK) لەزەڵێ دراو تورکیاش بەهەلی زانی لەوکاتەدا سیخورمەی خۆی بوەشێنێت و کەس دژی قسە ناکات و هەموو لایەك لەشەردایە و ئێمەش بێ لایەن و هەوڵی چارەسەری شەرەکەمان دەدا بۆ وەستاندنی...زەڵێ لەناوچەی قەلاّدزەیە لەکوردستانی عێراق، لە١٨/٥ هێزی (٥)ی نەتەوەیەکگرتوەکان لەبنکەی ئەنجەرلیك کشانەوە وادیاربوو ئەوکشانەوەیە هەرپەیوەندی بەشەری ناوخۆوە هەبووئەوان هاتبون کورد لەعێراق بپارێزن کورد خۆی کەوتووەتە گیانی یەکتر ئیتر پاراستنی ئەنجەرلیك و جەیشی ئامادەی بۆچیە خۆی چەکوشی گیانی یەکترن لە١٧/٥ بەشی کوردی رادیۆی ئەمریکا پەیامنێرکاك حەیدەر کەریم گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ من کرد لەسەر شەرەکانی کوردستان قسەمان کرد وەهەر هەمان رۆژ یەکێ لەرادیۆیەکانی سوئید موقابەلەی کردم و قسەم لەگەڵ کردن لەسەر شەرەکان، لە١٩/٥ رادیۆی بزوتنەوەی ئیسلامی موقابەلەیەکی منیان کرد لەسەر شەرەکان وەهەر هەمان رۆژ یەکێتی پارتی شکاند لەکۆیەو پارتی بەرەو دێگەڵە رۆیشتن و یەکێتی دەستی گرت بەسەر کۆیەدا و بەتەواوی سەرچیای سەفین و شەقلاوەش لە پارتی وەرگیرایەوە لە لایەن یەکێتی وە رێکەوتنێك و هەوڵێ هەبوو لەصلاح الدین بەلاّم نەیتوانی وەزعەکە رابگرێت ئەوەبوو کاك مەسعود لە٤/٥ بەبروسکە و نامە داوای کۆبونەوەی بەرەی کوردستانی کرد بۆراگرتنی شەرەکە ئەو بەرەی کوردستانیە کەخۆیان تێکیان داو وتیان نابێت هەبێت و بەرە لەدەسەلاّتی حکومەت کەم دەکاتەوە خۆی لەئەسڵەدا لەدەسەلاّتی پارتی و یەکێتی کەم دەکردەوە بەڵکو بەرە هەموو

حزبەکانی تێدا بەشداربون و کەشەر نەبێت و بریاری شەری نەدەدا بەرە دەیتوانی زۆرشت چارەسەربکات ئەوکات ئێمە هاواریمان دەکرد مانەوەی بەرە زەرورییە بەلاَم ئەوان بەرچاویان زۆر تاریك بوو لەسەرهەموو حزبەکان و داهاتوی خۆشیان بەلاَم لە٤/٥ بەرەی کوردستانی کۆبونەوە کە دوولایەنی لەشەردابون ئەویش پارتی و یەکێتی مابوەوە زەحمەتکێشان و ئاشوری و حزبی شیوعی ئەوانیش هیچیان پێ نەدەکرا لەنێوان ئەوان و کارلەکارترازابوو لەوکاتەدا وەرێگای سۆسیالیستیان نەدا بەشداربێ وەك ئەندامی بەرەی کوردستانی پەرلەمانی کوردستان هەرلە ١٩/٥ ژووری عەمەلیاتی ئاشتی دروست کرا لەصلاح الدین لەنێوان یەکێتی و پارتی و (INC) و بزوتنەوەی ئیسلامیش کەداخل شەربوو ئەویش چووە ناوژووری عەمەلیاتەوە بەپاڵە پەستۆی پارتی لەوکات شتمان لەسەرئەوە نووسی عەرلایەنێك داخل شەر نەبێت گوێ بۆقسەی ناگیرێت و ناچێتە ژووری عەمەلیاتی ئاشتیەوە، لە٢٠/٥ لەصلاح الدین ژووری عەمەلیات کۆبونەوە لەپەرلەمانی تورکیاش وابزانم لەیلازاناو ئەحمەد تورك لەوکاتە لەوێ بون بەشداربون لەو کۆبونەوەیەدا وە کاك کۆسرەت و کاك مەسعودیش بەشداربون، هەرلە٢٠/٥ بریاری راگرتنی شەردراو یەکێتی پارتی پاك کردەوە لەسنوری و دەوروبەری کۆیەدا و لەشەقلاَوەش شەربوو وەسەفین پاك کرابووە لەپارتی کاك مەسعود زۆرغەمی بوو کەپەلاماری سەری رەش بدەن، لە٢٠/٥ لەگەڵ مام جەلال قسەم کرد ووتی ئەمرۆشەر وەستاوەو دەیوەستێنین، لە٢١/٥ من لەسنە بوم لەماڵەوە بێ لایەن بوین لەشەرەکەدا گەلە کۆمەکی پارتی و بزوتنەوەو حزبلاَو ئێران لەیەکێتی بوو ئەوەی من پێشترباسم کردبوو لەگەڵ برادەرانی خۆمان دەهاتە دی یەکێتی بەرگری دەکردو زۆرجێگای دەست بەسەرداگرت جگە لەسەر سنورەکان ئێران نەی دەهێشت ...رۆژی چەژنی قوربان بوو من لە سنە بوم لەماڵەوە وەزعەکە ناخۆش بوو لەکوردستان شەر

بەردەوام بوو جێگای نیگەرانی هەموولایەك بوو سۆسیالیست بێ لایەن بوو لەو شەرانەدا لەگەڵ پارتی شتێکی وامان نەبوو پارتی هەروەکو دوژمن سەیری ئێمەیان دەکرد بزوتنەوەی ئیسلامی ئامانجی بۆشەر دروست نەبووە ئەونابێت ببێتە لایەنێ لەشەردا بەڵکو دەبێت سەیری هەموو لایەك وەکو یەك بکات و ئەو دەوری ناوبژیوانی ببینێ کەچی هەرلەئێمە بەگومان بون چونکە زۆریان سەربەپارتی بون وایان سەیری ئێمەش دەکرد کەئێمە سەربەیەکێتین لەوانەی هەمیشە قسەی خێرمان بۆبزوتنەوە لای یەکێتی و مام جەلال کردووەو بەتایبەتی دەمانویست قەناعەت بەمام جەلال ویەکێتی بکەین کەمامۆستامەلاعەلی عبدالعزیز دەسەڵاتی هەیەو بزوتنەوەیە بەڵام یەکێتی کاك مەلاعەلی باپیریان بەخاوەن دەسەڵاتی ناو بزوتنەوە دەزانی وادیاربوو قەناعەتی بەکاك کۆسرەت کردبوو کاك عەلی باپیر...
لەراستی دا مامۆستامەلاعەلی باپیر زۆردژی یەکێتی و لایەنگری پارتی بووبەئاشکرا ئەوەش هەڵەیەکی یەکێتی بوو نەیدەزانی یانەی دەویست بزانێ کێ دەسەڵاتی ناو بزوتنەوەیە چونکە کاك مەلاعەلی باپیرو کاك مەلا کرێکاروکاك شێخ محمد بەرزنجی هەریەکە تموحی خۆیان هەبوو لەناو بزوتنەوەداو جێگاورێگای خۆشیان هەبوو بەڵام لەروی دینی هەموی وەکو فەقێ ی مامۆستامەلاعوسمان وابون مامۆستامەلا عەلی باپیرومامۆستا شێخ محمد بەرزنجی خۆشیان نکوڵیان لێ نەدەکرد من مەلاکرێکارم دی وامزانی پێشمەرگەی حیمایەی مامۆستا مەلاعەلی عبدالعزیزە هەروەها کاك شێخ محمد بەرزنجی هەرگیز قسەی نەدەکرد لەروی مامۆستا مەلاعوسمان دا یالەقسەی دا بەڵام پیاوێکی ئاقڵ و شارەزاو دیبلۆماسیە کاتی خۆشی خۆی وازی لەرابەری بزوتنەوەی ئیسلامی کەناوێکی کەی(رابیتە)ی هەبوو هێنا بۆمامۆستامەلا عوسمان... کاك مەلاعەلی باپیر لەسنوری پشدەر نەیتوانی مقاوەمە بکات مەرکەزیەتی لاواز کرد هاتووە سنوری هەڵەبجە بەڵام مامۆستامەلاعەلی عبدالعزیز

خۆی لەشەرەکان بەشدار دەبوو ماموستا عەلی باپیر پیاوێکی نوسەروشارەزاو ناتق وراست گۆلەگەڵ خۆی وبرادەرەکانی ئەوەی من لێ تێگەیشتبم، لە١٩٩٤/٥/٢٢ عەلی صالح ئەنجومەنی دەولەتێکی راگەیاند لەیەمەن بەناوی یەمەنی دیموکراتی لەیەمەنی خوارو یاخواروی یەمەنیا باشوری یەمەن پەرلەمانێکی دامەزراند کەماوەیەك بوون حزبی سۆسیالیست بوو باسی دەکرا ئەوە مارکسین لەگەڵ عەلی عبدالله صالح دا ماوەیەك پێکەوە بون دەولەتیان یەك یەمەنیان دامەزراندبوو جگە سەرۆك عەلی عبدالله صالح بوو هەردوو عەلی تێك چون عەلی عبدالله صالح هەولی ئەدا بەشەر کۆتایی پێ بهێنێ کێشەکەیان بەلام ئەوانیش خۆیان ئامادە کردبوو بۆشەر پێ.دەچێت سعودیەش دەستی لەهاندانی دا هەبێت یەمەنی خوارویش خۆیان بۆشەر ئامادە دەکردو چاوەرێ ی شەرێکی گەورە لەنێوان هەردوو یەمەن دا دەکرێت و عەلی عبدالله صالح دۆستی عێراقەو عێراق هاوکاری دەکات کەباسی یەمەن و یەمەنیەکان دەکرێت هەرلە عبدالفتاح و کێ وە من لام ئاشنابوو غەریب نەبوو چونکە ئەوەندە باس کرابوو لەلایەن هاورێیانی حزبی شیوعیەوەو پاشان کۆمەڵەو مارکسیەکان و سۆسیالیست چونکە یەمەن نمونەی شیوعیەت بوولەدنیادا کەچی لەودوایەدا دەرکەوت تائێستاش دواکەوتوترین میللەتی ئەو ناوچەیە عەشائیری و قەبیلەچێتی لەناوئەوان دا زۆر بەهێزەو هەتا وەزارەتەکان و دامەزراندنی حکومەت و پەرلەمان لەیەمەن لەسەر ئەساسی عەشیرەت بووە عەلی عبدالله ئەبیەزو عەلی عبداللەصالح و عبداللەیەکی کەشیان هەبوو هەموی لەسەر ژمارەی عەشیرەت وەزارەتیان داناوە چۆن لەلوبنان فلان ئەدیان وەزیری هەبێت واتە سەرۆك کۆمار مەسیحی ومارۆنی و سەرۆك پەرلەمان موسلمان وشیعە وسەرۆك وەزەرا موسلمان و سونی دورزی وکاتۆلیك چەند وەزیری هەبێت بەلام لەیەمەن وەزارەت لەسەر عەشیرەت دابەش کراوە کەلەئێمەیان کردبوو بەشامی

شەریف(لینینگراد) ئەوەش دەبوو سێ کەسیان یەکیان بەزەوی چۆك بۆ ئەویکە دا بدات و بزانن کامیان تاکەی بەرگری شەر دەگرێت بەلاّم دەڵێن یەمەنی دیموکراتی یاخوارو عەشیرەتەکانیان بەهێزترو تەجروبەی شەریان هەیە، لە٥/٢٣ لەسنە بوم چومە مەریوان سەیارەکەمان شکابوو شەو لەکانی دینار ماینەوە چاوەرێ ی چاك کردنی سەیارەکەبوین ئەوماوەیە بەردەوام لەگەڵ مام جەلال قسەم دەکرد بەتەلەفۆن چونکە ئەو لەئیتالیاو ئیسپانیابوو هەروەها لەگەڵ لێپرسراوانی ئێران قسەم دەکردو توانیم رایەڵەیەك دروست بکەم لەنێوانیاندا ئەوەبوو لەشەوی ١٨-١٩٩٤/٥/١٩ تەلەفۆنی هەردوولامان گەیاند بەیەك مام جەلال و ئاغای جعفری بەتەلەفۆن قسەیان کردپێکەوە بۆچارەسەری نێوانیان جگە لەوەش من هەرهەولّم دابوو بۆیان لای حاجی ئاغای محمدی بەلاّم یەکێتی نەیان دەویست بیکات دوای ئەو ماوەیە ناکۆیکان و قسەکردن پێکەوە سەرەتایەك بوو بۆ پەیوەندیان من ئەو شەوانە قسەم لەگەڵ کاك نەوشیروانیش کرد ئەوان وتیان هەرچی بکەیت ئێمە پێ ی رازین هەربۆئاشتی بێت، لە٥/٢٠ لەسنە بوم شەو لەگەڵ مام جەلال قسەم کرد بۆراگرتنی شەرەکە مام جەلال گەرابوەوە سوریاو داوای کرد شەرەکە رابگرن مام جەلال بەرادیوی وتەلەفزیون داوای ئەکرد داوا هیزەکانی یەکیەتی ئەکەم سلامەتی و گیانی کاك مەسعود بارزانی پارێزراوبێت ئەوکاتە راگرتنی شەرەکە بۆیەکێتی خراپ بوو دەیانتوانی سەری رەش و صلاح الدین بگرن و هەر لەبەر ئەوەش دائیم کاك مەسعود هەولّی دەدا کاك کۆسرەت لەصلاح الدین شەو بمێنێتەوە نەك هێرش بکەنە سەریان مامۆستا مەلاعەلی ووتی کاك مەسعود پێشمەرگەیان نەماوە هاتووە داوای هێزی لەئێمە کردووە بۆپاراستنی سەری رەش (٧٠) کەسمان لەوێ بووە ناردومانە بۆ دەوری سەری رەش باوەری بەهێزەکانی خۆیان نەمابوو ئێمە هێزمان بۆپاراستنی ماڵی کاك مەسعود ناردووە کاتێ شەریان وەستاند بێ پرسی، بزوتنەوە،

له٥/٢١ چەژنی قوربان بوو لەماڵەوە بوم لەئێران، له٥/٢٤ لەمەریوانەوە چومە دزڵی و ملەخوردو وشکەناو بۆگوڵەخانە، له٥/٢٥ چەند لیژنەیەك دروست بون کەنوێنەری ئێمەشی تیادابوو، له٥/٢٦لەسلێمانی بوم ئەوماوەیە زۆرهیلاك بوم بۆچارەسەری کێشەکان هەوڵم دابوو بەلاّم هێشتا هەر مابون لەکاتی گەرانەوەم لەملەخورد هەندێ پارتی لەوێ بون لەوانە هەندێکیان کۆنە سۆسیالیستەکان بون کەقسەیان بەسۆسیالیست دەوت و دەیانوت سۆسیالیست سەربەئێرانەو ئێران دوژمنی کوردەو دەیانەوێت حکومەت و پەرلەمان تێك بدەن بەپارەو چەکی ئێران ئێمە لۆریەك ئاردمان ناردبوە ملەخورد و لەوێوە بینێرینەوە ئێمە بەنرخی دەوڵەت کریبومان ئاردەکە کەچومە ملەخورد سەیر دەکەم فیشەك و کلاّشنکۆف صینی و بەتانی و ئاردو برنج و چادر لەپەستابەلۆری دێت و ئەوانیش باری دەکەن و دەینێرنە وشکەناو کاك نوری و هەندێکیان لەوێ بون زۆر لەبەرپرسەکانی پارتی و قەرارگاو ئیتلاّعات کەمن چومە سەرەوە هاتن بەدەمی منەوە ووتم ئێوە یائەو کەسەی دەیەوێت چەك و پارەو بەتانی لەئێران وەربگرێت بۆتێکدانی حکومەتی کوردو پەرلەمان و ئەزمونەکەی ئەوانە کێن و ئەوە ئێران دوژمنی میللەتی کوردو چەك و پارەی بۆتێکدانی کوردە پارتیەکان پێ دەکەنین و وتیان سیاسەتە وتم بۆئێمە سیاسەت نەبوو بەفارسی بەئێرانیەکانم ووت بائەوان تێبگەن ووتیان ئەوە کاتی خۆی وایان بەئێوە دەوت ووتم بەڵێ ئێستا ئێمە وا بەئەوان دەڵێین و دوو سەیارەش راجیمەی لەسەربوو وەستابون چاوەرێ ی هێرش بون تەنانەت پارتی لە سلێمانی زۆریان بە بیجامەوە دەرچوبون لەوێ دەستە دەستە چەکداریان دەکردن وەکو فەوجە خەفیفەکان دەیان ناردنەوە وشکەناو و خورماڵ من لەئێرانەوە گەرامەوە لەوێ بزوتنەوەی ئیسلامی وتیان لەگەڵتان دێین ئێوە چەکتان پێ نیەو پارتیش لەوێ وتیان ئێمەش بەرێت دەکەین پێم ووتن چەکم بۆچیە ئەگەر

ئێوە نەمکوژن کەس نامکوژێ وتیان ئێوە چەك وەرناگرن ووتم خۆ ئێمە نامانەوێت حکومەت و پەرلەمان بەدەستی ئێران و ئاخوندەکان تێك بدەین ئێرانیەکان زۆریان لاسەیر بوو چونکە پێشتر پارتی و یەکێتی وایان بەئێمە دەوت پارتی لەرۆژنامەو رادیۆ بەئێمەیان دەوت ئیتلاعات و پاسدارانی ئێران هانیان دەدەن و پەیوەندیان بەتورکیاو عێراقیشەوە هەیە، لە٥/٢٧ چومە دوکان بەرامبەر هیزۆپ و بۆهیران کاك جەبارفرمان و کاك شەوکەت لەوێ بون بزوتنەوە پەیمانیان دابوو هێرش نەکەن دوای من هێرشیان کردبوو تالای قەدەفەری، لە١٩٩٤/٥/٢٦ من بەنیازی رێگا چارەیەك بەتەمابوم سەری شەقلاوە بدەم و کاك مەسعودو کاك کۆسرەت ببینم بۆمەبەستی راگرتنی شەرەکە کاك شێردڵ حەوێزی لەوێ بوو پاش نیوەرۆی ٥/٢٧ کۆبونەوەیەك کرا لەهیران دکتۆر ئەحمەد چەلەبی هات و برادەرانی یەکێتی لەسەر راگرتنی بریارم دابوو بچمە شەقلاوە وتیان پارتی لێ نەماوەو کاك مەسعودیش لەوێ نیە رۆیشتون دکتۆر ئەحمەد چەلەبی گەرایەوەو ئێمە درەنگ بوو من بەتەمای سەردانی ئەوناوە بوم شەو لەتەکیەی شێخ هیران ماینەوە پیاوێکی باش و شارەزاش برو کورێکی ئەندامی پەرلەمان بوو لەسەر لیستی یەکێتی...لەهیرانەوە چوینە سەرەچاوەو دۆڵی بالیسان و سەرمان لەکاك محمود سەنگاوی دا پاشان چوینە کلاوقاسم و کەپکی حەمەدئاغاوبۆبینی ناوچەکەو شارەزابون زیاتر بۆ داهاتو شتێکی لەسەر بنوسم بۆ کاتی ئاشتی یەکێتی وپارتی بەکاردێت ئەمرۆ بخەمەوە بیریان گەرابنەوە رانیە و چوینە مەڵبەند لای کاك مستەفا چاورەش پارتی ئەو هەواڵەنەیان پێ گەیشتبوو کەمن چومە پەلاماری سەری رەش و صلاح الدین بدەم وادیاربوو هەواڵیان واپێ دابون دوای کاك نێچرڤان لەکرماشان پێی ووتم وتی باوەرمان نەدەکرد شتی وابکەیت واهەواڵیان بەئێمە دەدا، لە٥/٢٨ لەدۆڵی بالیسان و رانیەوە چوینە کۆیەو بۆدێگەڵە بۆلای کاك شێخ جعفر و برادەران چوین سەیرێکی

ئەو ناوەو ریگای قوشتەپەمان داو شەو لەدێگەڵە بوین میوان بوین لایان لەوێش
بارەگاکەی ئێمەیان گرتبوو خانوەکەش یەکێتی تێدابوو قسەی زۆرمان کرد کەچۆن
چارەسەری کێشەکان دەکرێت وەوڵی بۆبدەین، لە٥/٢٩ گەراینەوە بۆکۆیەو
لەمەڵبەندی یەکێتی بوین داوایان کرد مقابەلەیەکی تەلەفزیۆنیان لەگەڵ بکەین
مقابەلەکەمان کردو قسەمان لەسەر شەرەکان و هەوڵ بۆراگرتنی شەرو بێ لایەنی
سۆسیالیست لەسەری قسەمان کرد، لە٥/٢٩ گەراینەوە بۆسلێمانی و ئێوارە هاتن
وتیان یەکێتی بەتەمای هێرشە ئەم شەوەغریب بوو...من ووتم ئێستا دەچم و
سەری مەڵبەند دەدەم و قسەشیان لەگەڵ دەکەم بەڵکو هێرشەکەیان پێ دوابخەم
وەشەر نەبێت پێم وایە یەکێتی سەرکەوتوونابێت لەشەرەکەدا لەوکاتەدا چومە
مەڵبەند زۆربەی بەرپرسەکان وەکو کاك سالارو زۆری کە لەوێ بون یەکێکیان
نەبێت وابزانم کاك دلێری سەید مجید بوو هەندێك قسەی کردو ووتی وەزعەکە چۆن
دەبینیت و چی بکەین نان و پەتاتەو خەیاریان لەسەر هێزەکە دابەش دەکرد یەك
کەس لەمنی نەپرسی ئیشی هەبوو بۆچی هاتویت قسەیەك شەربکەین ئەو هێرشە
بکەین نەیکەین سەرکەوتو دەبین...نابین وابزانم کاك وەهاب بوو ووتی کاکە حەمە
هیچ نەقەوماوە ووتم وەلا لەوەزیاتر چی بقەومێت ووتی رەنگی تۆ تئاسایی نیە
راستی دەکرد من زۆرپێم ناخۆش بوو ئەوشەرە یەکێتی شەو هێرشیان کردبوو
بۆگردی گۆو گێڵەك و چوبونە ناو گێڵەك و گردی گۆ شکابونەوە کاك جەلال حمەی
محەش شەهید ببوو بەجێش مابوو لەگەڵ چەند پێشمەرگەی کە برادەرانی ئێمە
جەنازەکەیان هێنابونەوە بزوتنەوە داوایان کردبوو دەیانبەنە شیرەمەر
دۆشکەیەکمان کەتبوە نێوان شەرەکەوە لایەن نەك بکەوێتە نێوان هەردوولاوە
بەلأم لەراستی دا لێ ی بەگومان بون وتبویان تەقەیان کردوە کەهەر دۆشکەکەیان
شکابوو بزوننەوە بردیانە بانی شار پاشان مامۆستا عەلی پابیر ناردبویەوە دەرزی

تێدا نەبوو کەوتبونە بەینی هەردوولا برادەرانی ئێمە ئاگاداریان کردن کەچۆڵی بکەن هەتا رەبایەکەیان بەجێ هێشتبوو..بزوتنەوە هێرشیان کردبوو راجیمەیان دابوو لەرەبایەی گردی حمەی حمەئەمین و لەدەوری گوڵەخانەش پێشمەرگە کەوتبووە بەینی هەردوولاو نابێت تەقە لەکەسیان بکات دورکەوتنەوە لەرەبایەکە بۆئەوەی تۆپیان بەر نەکەوێت بزوتنەوە چوبونە رەبایەکەو دۆشکەکەی ئێمەیان بارکردبوو بردبویان هەرچی داوایان کردبووە وتبویان ئێوە و جەلالی فەرقتان نیەو دۆشکای شیرەمەریشیان بردبوو هەرچی داوا کرایەوە دۆشکای شیرەمەرماموستا عەلی باپیرناردیەوە بەلاّم ئەوەی گردەکەیان نەدابنەوەو تائێستاش دەستیان بەسەردا گرت واتە ئەوەی کاك عەلی باپیر ناردیەوە بەلاّم ئەوەی لای مامۆستا مەلا عەلی بوو نەیناردەوە جگە لەوەش بزتنەوە بەراجیمە لەگوڵەخانەیان دابوو پەنجەرەو شتی بەرکەوتبوو پێشمەرگەیەك بریندابوو، لەشەوی ٣٠-١٩٩٤/٥/٣١ کاك جەلال ر جەماعەتەکەی لەگێڵەك کەوتبونە کەمینەوەو هەموویان شەهید ببون، زۆرم پێ ناخۆشبو بۆ کاك جەلال چونکە پێشمەرگەی کۆن وبرادەرم بو لە٥/٣١ لەسلێمانی بوم برادەرانی ئێمە جەنازەکانیان هێنابوەوە بۆیەکێتی پارتیش وردە وردە دەبوژانەوە بەبۆنەی بزوتنەوەوە لەسنوری هەڵەبجەدا..پارتی ناردبویان کەمن ببینن و دڵنیاشمان بکەن ئەوان دژمان نابن و شەرمان ناکەن و ئاشتیش دەکەن لەگەڵمان وسوپاسمان بکەن بۆئەوەی بەدوای تۆڵەدا نەگەراین و پەنای ئەوانمان داوەو هەندێکمان لەسجن بۆبەرداون لای یەکێتی و ئعتزار بۆئەوەی چونە سەربارەگای هەڵەبجە بریاری پارتی نەبووە لەتەوێڵەو چەکەکان دەدەنەوەو لەوقسانە، لە١٩٩٤/٦/١ لەسلێمانیەوە گەرامەوە بۆگوڵەخانەو شەو کاك نادر هەورامی و کاك نوری و دووسێ برادەری کەشیان هاتن و ئەو قسانەیان کردو منیش پێم ووتن ئێمە بێ لایەنین و ئەوەی کاری خێرو چاکە پێمان بکرێت بۆهەردولا

دەیکەین ئەوەش نەکرێت ئەوە دەسەلاَت نیەو خۆمانی لیَ دور دەگرین وەپێمان ووتن راجیمە بۆلای ئێمە هاتووە ووتیان وەلاَ تائێستا هەربرادەرانی بزوتنەوە تەقاندومانە بەلاَم ئەوە دووڕۆژە ئێستا ئێرانیەکان خۆیان لەسەر راجیمەکانن و دەیتەقێنن ئەوان کەنەیان دەزانی و سەرو کورتی کردووە ئێستا ئەوان زۆر دەقیق دەیتەقێنن تەنها بۆسەنگەری یەکێتی وهێزی ئەوان وەپێمان ووتون بۆئێرەوە نایەت، کاك نوری وتی هەستیان پیَ نەکردوە دووڕۆژ چەند دەقیق دەی تە قێنن ئێستا برادەرانی پاسداران خۆیانی لەسەرە، لە٦/٢ چوینە سەراو پاشان بۆسلێمانی مام جەلال و کاك نەوشیروان بەهەلیکۆپتەری تورکی لەسوریاوە گەرانەوە بۆسنوری تورکیا-سوریاو پاشان بۆهەولێر گەرانەوە، لە٦/٣ لەسلێمانی بوم یەکێتی یەك لایەنە شەری راگرت و کشانەوەی هێزەکانی کەئەوە دەست پێشخەری مام جەلال و یەکێتی بوو بەلاَم فرسەتێك بوو لە دەستی خۆیاندا ئەوکات دەیانتوانی زۆرشت حەسم بکەن٠، لەرۆژانی ١و٦/٢ هێزەکانی پارتی و هەندێك بزوتنەوە لەمەریوانەوە واتە لەدزلیَ و مەریوان بۆلای پێنجوین بەنیازی گرتنی پێنجوین و گومرکی ئەوناوە لەیەکێتی هێرشیان دەست پێکرد پێنجوێنیان گرت وناڵپارێزو بەتەمای لەیەکدانەوەی لەگەلَ سەید صادق دابون رادیۆی پارتی هاواری دەکرد بەتەمای گومرکی ئیبراهیم خلیل بون وا گومرکی باشماخ یشان لەدەست چو وناڵپارێزشیان لەدەست دەرچوو دەبێت پەلاماری دووهەم بۆسەرقەلاَچۆلان بێت من زۆر هەولَی راگرتنی شەرەکەم دا زۆریش ماندوبوم زۆریش پارتیم لەدەست یەکێتی ئازاد کردو یەکێتی هاوکاری زۆریان کردم و داوای هەرکەس پارتیم دەکرد تەسلیمیان دەکردم پارتی لەناو سلێمانی تادەگەیشتنە سنوری ناوچەی سۆسیالیستی لێبوو زۆر وەزعیان شربوو جامانەکانیان دەشاردەوە قسەیان نەدەکرد کە دەگەیشتنە سنوری سۆسیالیست و بەرێمان دەکردن بۆ هەورامان و سورێن یەکسەر رەئیان

دەگۆراو قسەیان دەگۆرا جامانە رەشەکەیان لائەبردوجامانە سورەکەیان قنج دەبەستەوە خۆ لەگەڵ ئێمە بوایەن کەس رێگای لێ نەئەگرتن لەخۆرایی ئەترسان مامۆستا محمدی بەرزنجی وکاك حمە شوانی حزبی شیوعی وئاغای پەناهی وەزارەتی ئیتلاعاتی کۆماری ئیسلامی ئێران دا لە هەوڵەکان دا بەشداربون واتە ئێران لەنێوان هەر(٣) لایەنی شەرکەردا خەریکی راگرتنی شەربو بەلاَم بەعەمەلی پشتیوانی لە پارتی و وبزوتنەوەی ئیسلامی ئەکرد بۆ ئەوەی زەخت لە سەر یەکێتی بکات ناچاری بکات لەگەڵ ئێران رێکەون ئەوەی یەکێتی سودی هەبو بۆ جمهوری ئیسلامی بەپێ ی هێزوتواناوقەبارەی لایەنەکانی کە بۆی نەدەکرا هەر بۆیە ئێران هەمیشە هەوڵی دۆستایەتی یەکێتی ئەدا ولای گرنگ بو ئێران حەزی ئەکرد یەکێتی پێویستی بکەوێتە ئەوان بۆئەوەی رێکەون لەگەڵ یەکێتیدا بۆ ئێران رێکەوت ٣١ئاب ١٩٩٦بۆئەوهاوپەیمانیەی نێوان یەکێتی وئێران کە فرسەتێکی باش دەستی ئێران کەوت

لە٣/٦/١٩٩٤: داوایان کردبووتەئیدی ولایەتی موصلّ بکەم بۆحزب و بۆکوردیش باشەومەسەلەی ولایەتی موصلّ داستانێکە بۆخۆی وەختێك وبابەتێکی تایبەتی ئەوێت باس بکرێت ناوی کولر بو بەریتانیا لەبەرهەر هۆیەك بێت دەیەوێت، مەسەلەی ولایەتی موسلّ لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا ببوژێنێتەوە بۆئەومەبەستەش کەسێکی بەریتانی لەرێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بەناوی کولەر یا کولردانەوە پەیوەندی بە عشایروحزبە کوردستانیەکان بە بێ پارتی و یەکێتی وە بکات بەلاَم نازانم هەر مناوەرەیە بۆ ترساندنی تورکیاو عەرەبە یا بۆهەندێك ئیمتیازات لەولاَتانەیە یاشتێکی جدی بەباوەڕەوە ئیشی بۆئەکات هەرلەمانگی ٦دا بوو لولەی غاز بۆهەموو ماڵێك لەشاری سنە لەهەمەدانەوە هێنایان و گەیشت واتە هەمو ماڵێك بەلوعەی غاز هاتەماڵەکانیان لە شاری سنەی کوردستانی ئێران ئەوە شتێکی باش

بووئێمەش ساڵمان لەسنە بوو...هەروەها ئەو هەنگاوەی مام جەلال بۆراگرتنی شەرو کشانەوەی هێزکارێکی باشبوو بەلاَم بەرامبەرەکەی شتی واقبوڵ دەکات، لەرۆژانی ٤و٥و٦/٦ لەسلێمانی بوم سەرقاڵی ئیشوکاربوین، لەسەعات (١١)ی سەرلەبەیانی رۆژی ٦/٧ بەهاوکاری تۆپخانەی ئێران بزوتنەوەی ئسلاەی و پارتی قەلاَدزەیان گرت و خەڵکی عەشائیر کوژرا دوای نیوەرۆکەی یەکێتی هێرشی کردو لێی سەندنەوە لەهەولێرسەردانی مام جەلالم کرد کاك نەوشیروانیش لەوێ بوو بۆئێوارەکەی دەعوەتی کاك کۆسرەت بوین کاك سەیدقادروکاك محمد دۆلاَشی و کاك محمد حاجی محمودهارونی و عەلی بچکۆل و کاك دارای حاجی محمد لەگەڵ هەندێك لەو برادەرانە ناوم هێنان بۆ شەر هاتبون دژی پارتی بە ناوی جۆربەجۆرەوە بۆ پاراستنی هەولێر لە پارتی وادیاربوو کاك کۆسرەت دەیویست خولکی ئێمە بکات بۆناو یەکێتی و بەسوعبەتیشەوە نیوەی دەوت من پێکەنیم هیچم نەوت بەو رەئیەی کاك کۆسرەت حەق نەبوو شتی وا لەگەڵ من باس بکات ئیمە دەعوەتی بوین لەماڵی خۆیان وادیاربوو لای کاك عەلی و ئەوانیش هەرباسی کردبوو، لەرۆژی ٦/٨سەرلەبەیانیەکەی سەردانی بارەگای حزبی زەحمەتکێشانم کردو بۆدوای نیوەرۆکەی چومە مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی ئەوە یەکەم جاربوو دوای کۆبونەوەکەی کەبلاَویان نەکردەوە لەماڵی کاك کۆسرەت بەرەسمی لەگەڵمان دانیشتن ئەوان کاك نەوشیروان و کاك دکتۆرفوئادو کاك حازم یوسفی پەیوەندییەکان بون ئێمەش من و کاك محمد دۆلاَشی وکاك برزوعەلی هەژار بوین لەسەر پەیوەندی دووقۆڵی قسەمان کرد ئەوە یەکەم جاربوو بەوشێوەیە بەرەسمی دانیشتن بکەین..هەرهەمان رۆژ سەعات (٧)ی ئێوارە سەردانی حزبی شیوعیمان کرد لەهەولێر لەگەڵ هاورێیان مامۆستا کەریم ئەحمەدو کاك ئەبو سیروان و کاك کەمال شاکر پێشوازی کراین لەسەر وەزعی کوردستان وئەو بارودۆخەی ئیستا

قسەمان کردو زۆر تەقدیری هەڵوێستی ئێمەیان کرد کەوەکو بزوتنەوە نەچوین بەدوای تۆڵە سەندنەوە چونە ناوشەڕەکەو گەورە کردنی شەڕەکە، هەرهەمان ڕۆژ لەماڵی مام جەلال لەگەڵ دکتۆر ئەحمەد چەلەبی کۆبونەوە کراو سەعات (٨)ی شەو لەگەڵ کاك قادر عەزیزو کاك کەمال خۆشناو چەند برادەرێکی کە یەکمان بینی و قسەمان لەسەر ڕوداوەکانی کوردستان و هەلومەرجەکە کردو چۆن هەنگاوی ئاشتی بنێین و ئیشی بۆبکەین، لە٦/٧ سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی سەردانی بارەگای پارتی کاری سەربەخۆمان کرد لەهەولێر لەوێ پێشوازی کراین لەلایەن کاك ئەبو حکمەت و کاك ڕەوەندو برادەرانی کەوە لەوێش قسە لەسەر هەلومەرجەکە کرا...هەرهەمان ڕۆژ لەبارەگای لقی هەولێری حزبی سۆسیالیست کۆبونەوەیەك کرا لەسەرئەو وەزعانەی هەبون پاشان لەگەڵ یەکێتی خوێندکاران و لاوانی سۆسیالیست لقی هەولێر کۆبوینەوە و پاشان لەگەڵ کۆمیتەی زانکۆی سۆسیالیست زانکۆی صلاح الدین کۆبوینەوەو قسەمانکردو هەڵوێستێکی باشیان هەبوو لەکاتی ڕووداوەکان و پەلاماری پارتی بۆسەرمان پاشان لەڕێگای قوشتەپەوە بۆکۆیەو دوکان و سلێمانی، لە٦/٩ لەسلێمانی بوم، لە٦/١٠ هەرلەسلێمانی بوم زۆر ماندوبوم و خەریکی ئیشوکاربوین، لە٦/١١ لەسلێمانی چومە پرسەی حەمەی شێخ بەکرو چەند پرسەیەکی کەش، لەڕۆژانی ٨و٩و٦/١٠ یەکێتی هێرشی کردوپارتی لەپێنجوێن شکان و تاسەر سنور ی ئێران و مامۆستا حەسەن حسێن و کاك عوسمان قادر منەوەر شەهید بون زۆرم پێ ناخۆشبوو بۆکاك عوسمان چونکەکاك عوسمان جگە لەوەی برادەرو ڕەفیقمان بو پێشمەرگەیەکی کۆن وماندو لێهاتو بو بەڕاستی پربەدڵ پێم ناخۆشبو بەتایبەتی لەشەڕی ناوخۆدا شەهید ببێت هەرچی ئەکەم قەناعەت بە خۆم ناکەم کاك عوسمان شەهید بوە ومامۆستا حسن وزۆریان برادەرم بون وە زۆرتریش وەکو کاك نەوزاد نەوڕۆڵی وکاك شەریف (شەفە کەچەڵ) و ئەوانی

کەش لای یەکێتیش کاك جەلالی حەمەی محە زۆرم پێ ناخۆشبوو پارتی زۆرخراپ شکان و بەرەو مەریوان ولەلای ناڵپارێزیش بەرەو سیامێوەو ئەو ناوە شکان کاك سوارئاغای برای شەهیدان فتاح ئاغاو کاك عبداللەئاغا بریندار ببوو، لە ٦/١٢ کاك شەوکەت حاجی مشیر وکاك شیروان شیروەندی هاتنە لامان بۆ سەیدصادق و پرسەی کوری حەمەی مام دێوانە لەگردەنازێ گولەی وێڵی پارتی و بزوتنەوەی بەرکەوتبوو پێشمەرگەی ئێمەش بوو شەهید ببوو لەسەریان سەیری کردبوو لەگردەنازێ پاشان ئێمە چوینە گوڵەخانە و بۆ میری سور بۆپرسەی نوری حاجی عارف گردەنازێی پێشمەرگەی پارتی بوو لەوشەرانەدا شەهیدببوو پرسەکەیان هێنابووە گردەنازێ پاشان گەراینەوە بۆ گردەنازێ بۆپرسەکەیی و شەو چوینە گوڵەخانە ئەو شەوە باش بوو کەمێك ئیسراحەتمان کرد، لە٦/١٣ گەرامەوە بۆسلێمانی ئەو رۆژە جەنازەی کاك عوسمان قادرمنەوەریان هێنابوەوە بۆسلێمانی شەر لەلەسەعات (١٢)ی شەوەوە وەستابوو کاك جەوهەر نامق و هەندێك لەبەرپرسەکانی پارتی هاتبون لەگەڵ (INC) بۆراگرتنی شەرەکە ئەو رۆژە لەسلێمانی بون، لە٦/١٢ گەرامەوە بۆگوڵەخانە، لە٦/١٣ لەگوڵەخانەوە گەرامەوە بۆسلێمانی پارتی هەوڵی دابوو لەگەڵ جەنازەکەی کاك عوسمان قادرمنەوەردا خۆپیشاندان بکەن دژی یەکێتی و دەیانویست پەلاماری بارەگای یەکێتی بدەن بەبۆنەی جەنازەکەوە ئەوکاتە لقی (٤)ی پارتی گیرابوولەسلێمانی خۆپیشاندانەکە بوە هۆی کوژرانی زیاتر لە(٢٠)کەس و چەندین کەس بریندار بون وەلەیەکێتیش کوژراوو بریندارهەبوو واتە تەقە کرا لەخۆپیشاندانەکە هەندیك گولە بەر جەنازەکەی کاك عوسمان کەوتبو بەقسەی راگەیاندنی پارتی شەری نێوانیان گەیشتە سنورێك هیچ نەما بەیەکی بڵێن تەقە لە جەنازەش کرا، لە٦/١٤ مامۆستا عەلی باپیر هاتبوو بۆگوڵەخانە و داوای کردبوو چاوی بەمن بکەوێت لە٦/١٥ بەجیهاز بانی شارمان

دەست نیشان کرد، لە٦/١٥لەسلێمانیەوە چومە گوڵەخانەو پاشان بۆبانی شارو لەوێش چومە پرسەیەك لەگەڵ كاك عەلی باپیر قسەمان کرد لەسەر مەسەلە هەنوکەیەکان وادیاربووزۆر قەلەق بون لەسەر ڕێکەوتنی پارتی و یەکێتی کەپارتی پرسی بە بەبزوتنەوە نەکردبوو مامۆستا مەلا عەلی عبدالعزیز وتی پارتی ئێمە بەتالیۆنێکی خۆیان دەزانیٚ فەرمان بدات شەربکەین و شەربوەستێت ئێمەش لەمەولا دەزانین چی دەکەین ئەو ڕۆژەش كاك عەلی باپیر نارەحەت و نیگەران بوو کەهەردوولایان ڕێکەوتون و ئەوان بەجیٚ بێڵن دوای قسەکان من گەرامەوە بۆگوڵەخانەو بۆسلێمانی و دوای ئەو هەوڵە دابومان نوێنەری کۆماری ئیسلامی هاتبون وتیان لەگەڵ یەکێتی حەز دەکەین قسە بکەین و ئێمە ئامادەین بۆ ڕێکەوتن لەگەڵیان منیش ئاگاداری مام جەلال و یەکێتیم کرد كاك جەبار فرمان و كاك فەرەیدون عبدالقادریان ناردو لەماڵی ئێمە کۆبونەوەیان کرد وادیاربوو بەینیان زۆر بوو هەردوولا رەئی یەکیان وەرگرت بەلاٚم درێژەی هەبوو کۆبونەوەکان..ئێرانیەکان دەیانوت یەکێتی ڕێگای دیموکرات دەدات کێشەمان بۆ دروست دەکات ئێمەش پارتی و ئەوە بزوتنەوە ئەگەر ئەوانیش نەبن حزبێکی کە دروست دەکەین و پشتگیری دەکەین دژی یەکێتی ئەگەر یەکێتی واز بهێنیٚ ئەوە ئێمەش واز دەهێنین وڕێگا نادەین پارتی و بزوتنەوە لەسنوری ئێمەوە هێرشیان بۆبکریٚ ئەوکات هێزی پارتی و بزوتنەوە لەهەڵەبجەوە بۆمەریوان و پێنجوێن و گەرانەوەش دەگوازرانەوە لەهەڵەبجەوە بۆ سەردەشت و قەلادزەو کێڵیٚ و لەوێشەوە بۆهەڵەبجەو لەحاجی عمرانەوە بۆ سەردەشت و لەهەڵەبجەوە بۆحاجی عمران و صلاح الدین و سەری رەشیان دەبردن جگە لەشەری ڕۆژانەو راجیمەو هاوان و چەك و فیشەك بۆپارتی و بزوتنەوەو ئازوقەو کەرەسەی شەریان دەدانیٚ و هاتوچۆو هێنان و بردنیان بەردەوام بوو، لەشەوی ١٥-٦/١٦ لەدوای ئەو ماوەیەی کەکێشەی نێوان ئێران و

یەکێتی و ئەو کۆبونەوەی روبەروبونەوەیان بوو پێکەوە کردیان، لە٦/١٦ سەردانی کاك نەوشیروانمان کردو لەسەر وەزعەکان قسەمان کرد بۆئەوەی چارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە.. لەسەعات (٧)ی ئێوارەی هەمان رۆژ وەفدێکی (PKK) سەردانیان کردین وداوای پەیوەندی دووقۆڵی وهاوکاریان کرد، لە٦/١٧ وەفدێکی پارتی کاری سەربەخۆ سەردانیان کردین و قسە لەسەرباری ئەوکاتەی کوردستان کرا، ئەوماوەیە لەسلێمانی بوین تا٦/٢٣ خەریکی ئیشوکاری حزب بوین، لە٦/٢٤ کۆبونەوەی لقی کەرکوکمان هەبوو لەسەر روداوەکان و شێوەی کارکردنیان لەگەڵ هەلومەرجەکاندا..هەرئەمرۆ کاك شەوکەوت و کاك شێخ جعفرو کاك جەمیل هەورامی سەردانیان کردین، لە٦/٢٥ یادی سەیدای نەمرو (١٣) ئەندامی سەرکردایەتی بوولەهۆڵی رۆشنبیری سلێمانی رۆژی شەهیدانی حزب بوو، هەرلە٦/٢٥ سەردانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی و مام جەلال مان کرد لەقەڵاچۆلان و قسەمان لەسەر روداوەکان کرد، لە٦/٢٦ لەسلێمانیەوە چومە گوڵەخانە و شەو لەوێ بوین، لە٦/٢٧ لەگوڵەخانە بوم کاك مەلائەحمەدی ئێلاَن پێ هات بۆسەردانمان بۆئەوێ قسەمان لەسەر روداوەکان کرد ئەویش قەلەق بوو لەو رێکەوتنەی پارتی و یەکێتی کەبێ پرسی ئەوان کرابوو، لە٦/٢٨ لەگوڵەخانەوە چومە شیرەمەرو ئێلاَن پێ و وشکەناوو ملەخوردو دزڵی و بۆمەریوان و سنندج بۆماڵەوە، لە٦/٢٩ لەماڵەوە بوم لەسنندج خەریکی پەیوەندی کردن بوم بەدەرەوەی وڵات بەتەلەفۆن و فاکس پرۆژەیەکمان بۆحزب وبۆ کۆنگرە ئامادە کردبوو لەمانگی ١٩٩٤/١وە بۆ کۆنگرەی حزب فاکسمان کردبوو بۆ برادەران لەدەرەوەی وڵات بۆئامادەبون بەتەما بون ئەگەر شەر فرسەت بدات لەوماوەیە تاکۆتایی ساڵی ١٩٩٤ کۆنگرەی حزب بگرین لەوماوەیەدا، لە٦/٣٠ لەدوای دوومانگ شەرو پێکادان لەنێوانیان و پەك کەوتنی حکومەت و پەرلەمان هەموی ئەمرۆ لەپەرلەمان کۆبونەوە بەئامادەبونی مام جەلال و کاك مەسعودبارزانی

و دکتۆر ئەحمەد چەلەبی و لیوا حەسەن نەقیب و دکتۆر نجم الدین کەریم لەئەمریکاوە هاتبووەوەو کۆمەڵێك کورد لەئەمریکاو یاسەرۆکی ئەنیستیتۆی کورد لەفەرەنساکاك کندالنزان و کاك کۆسرەت سەرۆکی حکومەت و کاك جەوهەر نامق سەرۆکی پەرلەمان قسەی کردو دوای ئەویش جێگرەکەی کاك نەجات ئەحمەد عزیز ئاغا قسەی کردو پاشان کاك مەسعودبارزانی قسەی کردو دوای ئەویش مام جەلال قسەی کرد و قسەکان بەگشتی باش بون قسەکانی کاك کۆسرەت باشتربوو لەدواتر بارە ئاڵۆزەکە بەرەو خاوبونەوە دەچوو وەپێشنیاری زۆر کرا ئەگەر رەفتاری پێ بکرێت بەلأم پەرلەمان (١٩) خاڵی پێشکەش کرد ئەوەی ئەسڵی مەسەلەکە بوو بەلایدا نەرۆشت وباسی نەکرد بۆشەری سۆسیالیستیان کرد وەشەری بزوتنەوەی ئیسلامیان بۆ کرد بەلایدا نەچون پەرلەمان نەبوو بەراستی ٢شەرلەگەل ٢حزب کراوە خەڵکی زۆر کوژراوەو ماڵوێران بوە سەرەتای شەری ناوخۆ لەلێدانی سۆسیالیستە وە لەلایەن پارتیەوە پاشان شەری یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی ئەم پەرلەمانەی هەردوو حزب بەراستی هی هەردووحزب... نەبوئەندام پەرلەمانێك قسەیەك بکات وباسی دووشەری (٤-٥) مانگ پێش ئێستابکات کەلەوماوەیەدا پەرلەمان کۆنەبوەتەوە، لە١/٧/١٩٩٤ لەسنە بوم لەماڵەوە، لە٢/٧ یاسر عەرەفات سەرۆکی فەلەستین سەردانی ناوچەی غەزەی کردو چووە فەلەستین کەزۆر گرنگ بوو بۆی، لە٣/٧ یاسر عەرەفات لەدوای (٢٧) ساڵ گەرایەوە ئەرزی داگیر کراو بەدرێژایی (٤٠) کم پێشوازیان لێ کرد جەماوەرەکە، لەرۆژانی ٤و٥و٦/٧/١٩٩٤ هەرلەسنەج بوم و لەمەقەری علاقات لای کاك جەلیل و لەماڵەوە سەرقاڵی ئیشوکاربوین، لە٧/٧ دوای شەرێکی قورس و کوشتاری زۆرو وێرانکاری حکومەتی یەمەنی خواروحزبی ئیشتراکی تێك شکاو عەلی صالح وسەرکردەکانی هەڵهاتن عەلی صالح خۆی چوە ولاتی سلتەنەی شانشینی عەمان و عەلی عبدالله صالح سەرکەوت

و عەدەنی پایتەختی جنوبی گرت، لە٧/٨ سـەری ڕێگـای لای کرماشـان یـابلوارم دا ڕۆژی هەینی بوو ئێمەش چوین بۆ بەنزین لەبەنزیخانە خەڵکێکی زۆرم دی لەسەیران و سەفا بـون ولاتێکـی ئـاوەدان و جێگـای یـاری منـالان و حەسـانەوە بـوو ئێمـەش کوردی عێراق هەلێکی باشمان بـۆ ڕەخسـاوە بـەلام بەداخـەوە لـەجیاتی ئـاوەدانی وێرانی دەکـەین و نـەمانتوانی سـود لەوفرسـەتە زێرینـە وەربگـرین جێگـای داخـەو مێژویش لێمان قبولْ ناکات، لە٧/١٠ لەسنە بوم، لە٧/١١ سەری مامۆستا مەلا عەلی عبـدالعزیزم دا لـەمالی خۆیـان لەسـنە لەسـەر زۆرشـت قسەمان کـرد، لـەڕۆژانی ١١تا٧/١٤ هەرلەسنە بوم... لە١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ شۆرش کـرا دژی حکومـەتی پاشایەتی عێراق، عبدولکریم قاسم مەلیکی کوشت نیزامی مەلیکی گـۆڕی بـۆنیزامی کۆماری لەبیرمە پیرێژنەکان ئەگریان پیاوی بەتەمەن ئەیان وت سـەیدیان کوشـتوە تازە لەعراقدا خـۆین ناوەسـتێتەوە ئـەولادی پیغمـەریان کوشـتوەو(د.خ) لـەڕۆژانی ٧/١٧/١٦ هەر لەسنە بوم، لەشەوی ١٦-٧/١٧ لەیاری کاسی جیهانی سوئید(٤)بە سفر لەبولغاریای بردەوە وەهەر هەمان شەو کۆتـایی بـەیاری جـامی جیهـانی نێـوان بەرازیل و ئیتالیا هـات، لـە٧/١٨ لەسـەر داوای کۆمـاری ئیـسلامی ئێـران لەسنەوە چـومە بۆبارەگـای پەیوەندییـەکان لای کـاك خـەلیل لەکرماشـان داوایـان کـرد کۆبونەوەیـەکی هـەردوولا سۆسیالیـست و پـارتی بـەئامادەبونی کۆمـاری ئیـسلامی بکرێـت لەسـەعات (٦)ی ئێـوارە بـۆ (٩)ی شـەو کۆبونەوەیـەك لـەنێوان هـەردوو مەکتـەبی سیاسـی سۆسیالیـست و پارتیـدا بـەئامادەبونی لێپرسـراوانی کۆمـاری ئیـسلامی ئێـران لەقـەرارگای مەرکـەزی لەکرماشـان کـرا لەلایـەن پارتیـەوە کـاك نێچیرڤان بارزانی و کاك ئازاد بەرواری وەلەلایەن سۆسیالیستەوە من و کاك خـەلیل سەعید بەپرسی پەیوەندییەکان لەئێران بوین زۆر مەسەلە باس کراو زۆرشت کەوتە ڕوو ئەوان وتیان ئێمە دەچینەوە لەمەکتەبی سیاسی خۆمان باسی دەکەین لەسـەر

هـەموو خاڵـەکان رێکـین و ئامـادەین کـاك نێـچیرڤان دووجـار سوپاسـی کـردین کەبرادەرایانمان لەبارەگاکانی خۆمـان حەشـار داوەو داواشمـان لەیـەکێتی کـردووە کەسـانێکی زۆرمـان بـۆ بـەرداون و نەشـچونە نـاو شـەرەکەوە ئـەو ووتـی هـەموو سەرکردایەتی پارتی رەئیان وابوو هەریەکەم رۆژ ئێـوە لەگـەڵ یـەکێتی دژی پـارتی دەچـنە ناوشـەرەکەوە بەهـەر حـاڵ ئـەوە هاوکـاری ئێرانیـشی تیابووبـەلام ئـەو کۆبونەوەیە بۆ حزبی سۆسیالیست شـتێکی گـرنگ بـوو گـەورە بـوو بوبـەرەسمی و لەسـەر داوایِ کۆمـاری ئیـسلامی ئێـران لـەنێوانمان دا بێـت بـۆ پـارتییش باشبو کەزەمانەتێك لەئێمە وەربگرن کەناچینە ناوشەرەکەوە لەگەڵ یەکێتی دژی پارتی و پارتی دوای ئەو هەموو شەرو هەراو قسەی ناشیرین بەحزب لەرادیۆو رۆژنامە نابێـت ئـەوەش بـەخۆراگری کەسوکاری شـەهیدان و پێـشمەرگەو ئەنـدامان و جـەماوەری حـزب تـوانی ئـەو سـەرکەوتنانە بەدەسـت بهـێنێ ئەوانـەش بـاس کـران وبەشـداری لەکۆنگرەی حزب رێگای حزب لەسنوری دهـۆك و بارەگاکـان و چـالاکی سیاسـی و رێکخستن و جەماوەری خۆی بکات مایەوە بۆ کۆبونەوەی داهاتوو شەو لەماڵی کـاك خەلیل بوین دوای نـانی ئێـوارە لەسـەر دەعـوەتی کۆمـاری ئیـسلامی ئێـران یـەکێ لەدانیشتوانی سەرمێزەکە لەئێرانیەکان ووتـی ئـەوە بۆکـەس قـسە ناکـات لای مـام جەلال نان دەخـۆین ئـەوەنـدە بەخۆشـی نانەکـەمان دەداتـێ حـەز دەکـەین زیـاتر بخۆین لای کاك مەسعود قـسەناکات تاقـەتمان نیـە کـەس نـان بخـوات وەجامەلـەی دەکردین و قسەی دەکرد پاشان سوپاسی کۆمار ئیسلامیمان کـردو کـاك نێـچرڤان بارزانی قسەکانی زۆر باش و دۆستانە بو گەراینـەوە، لـە١٩/٧ لەسـنەم بـوم ئـەمرۆ بەرپرسـەکانی ئێرانـی ئـەو رادیۆیـەی کەلەسـوئیدەوە بۆمـان هـاتبوو لـەگومرکی فرۆکەخانەی تەهران وەریـان گرتبـوەوەو خۆیـان بۆیـان هێنایـنەوە ماڵـەوە کـەزۆر سوپاسمان کردن زەحمەتیان بۆ کێـشابوین هەرئـەمرۆ وەزیـری دەرەوەی ئـەمریکا

کریستۆڤەر سەردانی سوریای کرد و کۆبونەوەی لەگەڵ سەرۆکی سوریا حافز ئەسد کردو پاشان چاوی بە ئیسحاق رابین سەرۆك وەزەرای ئیسرائیل کەوت بۆ رێکەوتنی نێوانیان بەردەوام بوو، لە٧/٢٠ لەسنە بوم.. هەرئەمرۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لەسوریاوە رۆیشتە ئەردەن و لەگەڵ مەلیك حسێن شای ئەردەن کۆبونەوەو بریاریان دا لە ٧/٢٥ لەواشنتۆن کۆبونەوەی ئەردەن و ئیسرائیل بکرێت بەئامادە بونی کلنتۆن... ساڵی ١٩٧٩ ئەنوەر سادات لەگەڵ ئیسرائیل رێکەوت کامدێڤد وچووە قودسی داگیرکراو هەموو عەرەب دژی بون کوردیش لەعەرەب عەرەب تربون لەدژی ئیسرائیل هەموو عەرەب شیعاراتیان لەناوبردنی ئیسرائیل هەڵگرتبوو(١٥)ساڵ شەرو کوشتار و بەدەستەوە دانی زەوی فەلەستین دوای ئەوە بەحکومی زاتی ناتەواو رازی بون وا ئەردەنیش شانی دایە بەری و سوریاش هەندێك خۆی گوشیوە واخۆی پیشان دەدات پێ دادەگرێت بەڵام ئەویش لەچاو شارکێیەو وەعدیشی بەئەمریکا داوەو دەیەوێت هەندێك ئیمتیازاتی زیاتر وەربگرێت بەتایبەتی مەسەلەی جۆلان ئەوەش عەرەبەو خۆراگری (٢٥٠)ملیۆن بەرامبەر ئیسرائیل یاسێ ملیۆن کەمترن، لە٧/٢١ لەسنە بوم لەماڵەوە، لە٧/٢٢ هەرلەسنە بوم سەرقاڵی ئیشوکاربوین، لە٧/٢٣ هەرلەسنەبوم سەرقاڵی هەولۆتەقەلای ئاشتی بوین بەتایبەتی نێوان ئێران و یەکێتی، لە٧/٢٤ لەسنە بوم ..ئەورۆژە حوسنی مبارك چوە سوریا بۆمەسەلەی ئاشتی عەرەب ئیسرائیل لەگەڵ سەرۆکی سوریا حافظ الاسد کۆبونەوە، لە٧/٢٥ مەلیك حسێن و ئیسحاق رابین سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل بەئامادەبونی بیل کلنتۆن سەرۆکی ئەمریکا هەرسێ لایان دوای (٢٦) ساڵ شەرو هەرای عەرەب ئیسرائیل و ئەردەن وئیسرائیل رێکەوتنامەیەکیان مۆرکرد و کۆتایان بەشەرو هەرای هەردوولا هێنا ئەوە بەهەنگاوێکی مێژویی لەقەڵەم درا، لەشەوی ٢٥-٧/٢٦ تەلەفۆنم کرد بۆفەرەنسا مام جەلال و کاك نەوشیروان

لەوێ بون قسەمان کرد دەربارەی ڕێکەوتنەکەیان لەگەڵ پارتی و پێمان باشبوو ئەگەرسەر بگرێت لەسەر مەسەلەی ئێرانیش قسەکراو من هەوڵیان لەگەڵ بدەم بۆ هەنگاوی زیاتری ئاشتی... هەرلە ٧/٢٥ سلێمان دیمرل سەرۆکی تورکیا گەیشتە تەهران و لەلایەن ئاغای رەفسنجانیەوە پێشوازی کراو بۆچارەسەری کێشەکان بەتایبەتی مەسەلەی (PKK) هاتوە بۆ تەهران و بۆکاری بازرگانی، لە٧/٢٦ هەرلەسنەبوم..ئەو ڕۆژە مەلیك حسێن و ئیسحاق رابین لەبەردەم کۆنگریسی ئەمریکی قسەیان کرد لەواشنتۆن کۆنگریس داوای لێ کرد لە (٧٥٠) ملیۆن دۆلارەی ئەردەن قەرزارە عەفو بکرێت لەلایەن ئەمریکاوە هەر ئەو ڕۆژە مامۆستا جەمال عبدول سوێنی یاسایی خوارد لەهەولێر بۆ وەزیری رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان یەکێتی نیشتمانی کوردستان وەهەر ڕۆژە سەرۆکی تورکی و ئێرانی لەسەر مەسەلەی بۆسنەو هەرزەگۆڤین و سنوری تورکیاو ئێران و کوردستانی عێراق باسەکانیان بوو..ئەوە (١٨) ساڵ ویەك مانگ بوو من بریارم داو بوم بەپێشمەرگەو یەکەم مەفرەزەی کوردستان بوم و ئەو بریارەش ئاسان نەبوو بریارێکی سەخت و قورس و ترسناك و یاری بەمەرگ و سەدان هەزاران مەرگ بوو بەڵام بریارێکی بەجورئەتانەش بوو یەکەم پێشمەرگە و یەکەم مەفرەزەو یەکەم فیشەك تەقاندن لەدوژمن زۆر یەکەمی کەش لەناو شۆرشدا هەنگاومان نا ئەمرۆش ئێمە هەر لەزەحمەتە بوین (١٩)ساڵ پێش ئێستابوو من و شەهید رەووف و کاك شەوکەت و کاك حامید حاجی غالی و کاك عەلی شیعەو کاك دکتۆر رەزا و کاك رۆستەم و کاك محمد حاجی صابروکاك توفیق و کاك شێخ عەلی و لەوانەی پێکەوە بوین کاك رەوف و کاك عەلی و کاك دکتۆر رەزا شەهید بون خەڵکی زۆری باش و قارەمانمان شەهید بون بەڵام باشبوو سەربەرز بوین هەرچەندە تائێستاش رەفتاری بەعس لەگەڵ ئێمە دەکرێت...ئەمرۆحکمەت چەتین وەزیری دەرەوەی تورکیا

ئیستقالەی کرد هەروەها ئەمرۆش حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان کۆنگرەی دووهەمی خۆیان گرت، لە٧/٢٨ لەسنە بوم ئازوقەو پێداویستیمان بەرێ کردەوە بۆ کوردستان بۆبارەگاکانی حزب، لە٧/٢٩هەرلەسنەبوم ..شەروهەرابوو رۆژانە سەدار کەس لەروانڈا دەکوژرێت و یەك ملیۆن هاولاتی ولاتی خۆیان بەجێ دێلن و بەرەو ولاتی دراوسێیان دەرۆن شەری بۆسنەو هەرزەگۆڤینی نێوان موسلمانەکان و سربەکان هەروا بەردەوامەو سربەکان مل نادەنە ئاشتی ئەمریکا هێزەکانی نیزیك هایتی کردۆتەوە ئەگەر سەرۆکی حکومەتی پێشو نەهێننەوەو حکومەتی کرواتی واز نەهێنێ پەلاماری ئەدات چۆن پەنەمای داگیرکرد.. لەکوردستانیش هەروا شەروکوشتار بەردەوامەو باس ناکرێت و لەئەفغانستانیش هەروا بەردەوامەو لەزۆر جێگای تری دنیا شەر هەیە بەلام لەکوردستان خەتەر ترە چونکە جوگرافیای سیاسیمان نیەو کیانێکی دەولەتیمان نیە بۆیە بۆکورد شەری ناوخۆ زۆرخەتەرە لەکوردستان، لە٧/٣٠ هەرلەسنە بوم لەمالەوە... ئەوەبوو لەسالی ١٩٩٠ هەموو لایەنە سیاسیەکان و سەرکردەکانیان توشی یائس بوبون و روخابون بەلام حزبی سۆسیالیست خۆی کۆ دەکردەوەو گورزی کاریگەری لەدوژمن دەوەشاندو شەری دەکرد چونکە ئەو رۆژە پێویست بوو شەربکرێت لایەنەکان نەیان دەکرد بەلام ئەوکاتەی پێویست نەبوو ئەوان شەریان دەکرد، لەشەوی ٣١-١/٨/١٩٩٠ لەناوچەی شلێر لەگوندەکانی لارەدەرو بالکەدەرو هۆبەسوتەو ئەو گوندانە پێشمەرگەی سۆسیالیست هێرشی کردو (١٢) رەبایەو دوومەقەر سریەو (٥٢) کەسی لەدوژمن کوژراو (١٢) دیل گیران گەورە ترین سەرکەوتن بوو ئەوکاتە بۆکوردو حزب و هەموو لایەکی بەئاگاهێنایەوە هەرلەوکاتەدا بوو رژێم هێرشی کردبووە سەر دەولەتی کۆیت رۆژێ دوای ئەو هێرشەی سۆسیالیست بوو شەر لەوکاتەدا ئاسان نەبوو تەنها سۆسیالیست بوو هەنگاوی شۆرشگێرانەی دەنا، لە١/٨/١٩٩٤ لەسنە بوم لەشەوی

١-٢/٨/١٩٩٠ بوو عێراق پەلاماری کوێتی داو داگیری کرد کوێت بەدەیان ملیارد دۆلاری بۆعێراق سەرف کردبوو دژی کوردولەشەری عێراق – ئێراندا وە ئەو کوێتیانەی لەعێراق بون ئەوانیش دەوری جاشیان بۆعێراق دەبینی ..کوێت هەموو هاوکاریەکی عێراقی کرد عێراقیش پاداشتی دایەوە بەلام کوێتیش موسنەحەق بوو واتە کوێت هاوکاری عێراقی کرد دژی ئێران ودژی کورد ئەگەر ئەمریکاو هاوپەیمانەکان بەهاواری کوێتەوە نەچونایە کوێت لەسەر نەخشە سرابوەوە ، لەرۆژانی ٢و٣و٨/٤ هەرلەسنە بوم، لە٨/٥ کاك سلێمان قەساب گەرایەوە بۆ کوردستان لەئەوروپاوە هاتە لام، لە٨/٦ شەربوو لەقەلادزە پارتی و بزوتنەوەی ئیسلامی لەلایەك بەهاوکاری تۆپخانەی ئێران بۆپشتیوانی لە پارتی و بزوتنەوە تۆپ بارانی قەلادزە کراو ژن و منال کوژران(٢٣)برینداروو (٢٢)کەس کوژران چەندین مال و جێگا،وێران کران شەری ناوخۆی حزبەکانی کوردستان هەربەخۆیان رازی نابن کورد بکوژن جەیش وتۆپخانە وتەیارەی ئەم دەولەت و ئەو ولاتیش دەهێننە سەر ئەم میللەتە هەژارە قەلادزەو هەلەبجە هەروا هاتووە هەمیشە بەرهێرش وپەلامارو تۆپ باران بکەوێت جگە لە ٢٤و٢٦/٤/١٩٧٥...

لەسالی١٩١٥و١٩١٦لەشەری یەکەمی جیهانی هێزەکانی روسیای قەیسەری هەلەبجەوقەلادزە بەر تۆپباران و٧٩سال دوای ئەو روداوە جارێکی کە دوبارەبوەوە جیاوازی ئەوە بوو ئەم جارەیان کورد خۆی هۆکار بوو هەرلە رۆژی ٨/٦ وتارێکم تۆمارکردبەڤیدیۆو ناردمەوە بۆ کوردستان بەبۆنەی یادی سالرۆژی حزبەوە لەسلێمانی و لەهەولێر لێ ی بدەن و بلاوی بکەنەوە چونکە من ئیشەکانم لەئێران تەواو نەببوو هەروەها داواشیان کردبوو سەردانی تەهران بکەم بۆ کۆبونەوە، لە٧/٧ هەرلەسنە بوم شەر کەم کەم هەبوو لای قەلادزە پارتی و بزوتنەوە شکابون تاسەردەشت نەوەستابون و وەزعیان خراپ بوو لای قەلادزە هەمویان گەرابونەوە

بۆلای حاجی عمران و هەڵەبجە، لە٨/٨ کە(١٩)ساڵ بەسەرخەبات و تێکۆشانی حزبی سۆسیالیست دا تێدەپەرێت و ئەمرۆ لەهۆڵی رۆشنبیری سلێمانی لەسەعات (٣\٣٠) پاش نیوەرۆ یادی حزب کرایەوە منیش وتارێکم بۆ ناردنەوە .. ئەورۆژەش من لەگەڵ کاك بارام بەرپرسی پەیوەندییەکانی حزب لەمەریوان دەعوەت کرابوین بۆ تەهران لەسەعات (٣/٣٠) سەرلەبەیانی لەسنەوە بەرێ کەوتین بۆ کرماشان و لەسەعات (١٠) سەرلەبەیانی من و کاك خەلیل سەعید لەگەڵ (٣) کەس لەبەرپرسانی ئێران لەکرماشانەوە بەفرۆکە بەرێ کەوتین بەرەو تەهران بە(٥٥) دەقیقە گەیشتینە تەهران دوای پێشوازی لەئوتێل ٧ مارلیك لەخیابانی دکتۆر فتیح دابەزین، لە٩/٨ لەقصری پیرۆزەی تەهران کۆبونەوەیەکمان هەبوو لەگەڵ سوپادا بەرپرس قەرارگای رەمەزان وبەرپرسی سوپای پاسداران و جێگری فەرماندەی گشتی سوپا و چەندین بەرپرسی کەش ئامادە بون لەکۆبونەوەکە کەزۆرشت باس کراو لەسەر چەند خاڵێك پێك هاتین گرنگ ترینیان کردنەوەی سنورەکان بۆ بازرگانی و کاری رۆژانەی خەڵکی ناوچەکانی کوردستان، لە١٠/٨ لەسەعات (٣)ی پاش نیوەرۆ لەتهران کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ حاجی ئاغای محمدی باسی روداوەکانی جیهان و ناوچەکەو کوردستان و پەیوەندی نێوان ئێران و یەکێتی بەشێکی باسەکە بوو هەروەها من زۆرپێم داگرت لەسەر چاك بونی پەیوەندنی یەکێتی و ئێران وەزۆر پێوە ماندوبوم کاك خەلیل وتی سەروچاوت ئەوەندە ماندوبوە ئەلەرزیت ئەوان دژی یەکێتی قسەیان دەکردو منیش راستم دەکردەوە واقیعی کوردستان و هێزە سیاسیەکان و پەیوەندی دووقۆڵی نێوان کۆماری ئیسلامی و حزبی سۆسیالیست خاڵە هاوبەشەکانی هەردوولا بوو کۆبونەوەکە تاسەعات (٦)ی ئێوارەی خایاند زۆر ماندو بوم (٣) سەعات بێ وەستان قسە کردن و راست کردنەوەی ئەو هەموو پێچ و پەناو گیروگرفتانە لەگەڵی دا و زۆر شتی

کەش، لە ٨/١١ هەرلەتهران بوین و دەعوەتی حاجی ئاغای محمدی بوین لەمەکتەبی سەرۆکی کۆماری ئێران ئاغای رەفسەنجانی و ئەمرۆش (٣) سەعاتی تر جگە لەکاتی نان خواردن قسەمان کردو لەسەر بریار دان و لەسەر قسەکانی رۆژی پێشوو قسەمان کرد هەروەها لەسەر مەسەلەی کورد لەکوردستانی عێراق و هاوکاری نێوان کۆماری ئیسلامی و حزبی سۆسیالیستی کوردستان هاوکاری هەبێت، لە٨/١٢ هەرلەتەهران بوین داوایان کرد سەردانی ماڵی شای ئێران بکەین و مۆزەخانەکانیان سەیرمان کرد و شتی گرنگی تێدابوو بەتایبەتی مۆزەخانەی سەربازی شتی مێژویی تێدابوو دەرکەوت ئەو میللەتانە بەتەنگ خۆیانەوە هەن و مێژوو کەلتورو شتی خۆیان دەپارێزن و پاراستوشیانە لەو پاشا گەردانیەی ئێراندا هەموی پارێزراوە پاشان سەری مەرقەدی ئیمام خمینی مان داو تاجە گوڵینەمان لەسەری دانا بەرەسمی و گەراینەوە جێگای ئیسراحەتی خۆمان، لە٨/١٣ هەرلەتەهران بوین چوینە بازارو هەندێك گەراین لەدوای رێکخستنەوەو درێژەدان بەخەباتی حزبی سۆسیالیست لەمێژوی دا و بەتایبەتی لەیەك ساڵی رادبوردودا یەکەم جاربوو لەگەڵ کۆماری ئیسلامی بەوشێوەیەو لەسەر بنەمایەك هەردوولا بگەینە رێکەوتنی واو ئەمەش هەنگاوێکی باش بوو لەروی سیاسی و مەعنەویەوە... هەر ئەمرۆش قسەم لەگەڵ مامۆستا مەلاناصح کرد بەتەلەفۆن بۆ ئەوەی بۆ کۆنگرە بگەرێتەوە دوو فیزەی بۆنێرا بۆکاتی کۆنگرە، لە٨/١٤ هەرلە تەهران بوین ئیشوکارەکانمان تەواوبوو بەتەمای گەرانەوە بوین بۆکرماشان، لە٨/١٥ لەفرۆکەخانەی تەهرانەوە بەفرۆکە گەراینەوە بۆ کرماشان بە(٤٥)دەقیقە لەگەڵ هەمان کەسانی پێشوو کەپێکەوە چوبوین دیسان لەکرماشان کۆبونەوە کرا لەسەرجێ بەجێ کردنی بریارەکان، لە٨/١٦ لەکرماشانەوە گەرامەوە بۆ سنە، لە رۆژانی١٧و٨/١٨ لەسنە بوم، لە٨/١٩ یادی لەدایك بونی پێغەمبەر بوو(د.خ)،

له٢٠/٨ لەسنەوە گەرامەوە بۆ مەریوان و دزلّی و ملّەخوردو ئێلّان پێ و شیرەمەرو گولّەخانە ئیزاعەیەکی (SW) یش کەلەسوئید کرابوو ناردیانەوە لەگەلّ خۆمان هێنامانەوە بۆ کوردستان تازە بوو بەناوی رادیۆی کوردستان دەنگی حزبی سۆسیالیست کاری دەکرد لەسالّی ١٩٨٣ وە رادیۆمان دانابوو، له٢١/٨ لەگولّەخانە بوم میوانمان زۆربوو قەرەبالّغ بوین مەجالم کەم بوو، له٢٢/٨ سەعات (٤)ی سەرلەبەیانی پارتی و بزوتنەوەی ئیسلامی هێرشیان کردبۆ سەیدصادق و شانەدەری و بۆسەراوی سوبحان ئاغاوتا گرێزە پارتی گرتی هەر گەیشتبونە سەراو رەسمی شەهیدانی سۆسیالیست کاك عەلی عەسکەری و دکتۆر خالیدو کاك تاهیر و کاك شێرکۆی شێخ عەلی یان سوتاندبوو کوژراو لەهەردوولا هەبوو پارتی ناسراویان جەلال حاجی حسێن دەرەقیسەر لەیەکێتیش عمری حاجی محمد کولّکنی بوو کەپێشمەرگەی کۆن بوون، لەشەوی ٢٣-٢٤/٨ یەکێتی هێرشی کردەوەوهێزی پارتی و بزوتنەوە خراپ شکان و تاگردەنازیان گرتەوە یەکێتی لەقەلاّدزەش پارتی و بزوتنەوە شکابون واتە ئەو ماوەیە ماراسۆن بوو لەنێوان پارتی و یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی دا، له٢٤/٨ مام جەلال بروسکەی کردبوو کەنیوەرۆکەی لای بین شەریش بوو لەنێوان رێگاکەدا چوینە قەدەفەری بزوتنەوەی لێبوو سەیارەمان ناردە لای یەکێتی لەگردەنازێ خەتی تەماس بون کەمتر له(٢)کم بەینیان بوو ئێمە بەرێ کەوتین بۆسەیدصادق... لەسەیدصادق خەلّکیان کوشتبوو عەشائیرو مالّیان تالاّن کردبوو خەلّکی بێزار بون چوینە سلێمانی و بۆقەلاّچۆلان بۆلای مام جەلال و ئێوارەش گەراینەوە بۆسلێمانی، له٢٥/٨ چومە مالّی شەهید جەمالی حەلاو بۆپرسەی پورە حەلاو دایکی شەهید جەمال وعومەر کە لە ١٩٦٤/٨/٦ کۆچی دوایی کردبوو پورە حەلاو ئافرەتێکی تێکۆشەروئازاولێهاتودلّسۆزی حزب بوو، له٢٦/٨ میوانمان زۆربوو زۆریش قەرەبالّغ بوو، لەرۆژانی ٢٧و٢٨/٨ کۆبونەوەی

سەرکردایەتیمان هەبوو لەدوای سەفەرەکەو وەزعەکان و کۆبونەوە لەگەڵ ئێران وپارتی و ئەنجامەکانی سەرەفەرەکەو زۆرشتی کەش، لە٨/٢٩ لەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوین، لە٨/٣٠ هەرلەسلێمانی بوم، لە٨/٣١ هەرلەسلێمانی بوم، لە١٩٩٤/٩/١ هەرلەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوین، لە٩/٢ هەرلەسلێمانی بوم سەرقاڵی ئیشوکارەکان بوم ، لە٩/٣ چومە گوڵەخانەو گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٩/٤ لەسلێمانیەوە چومە دوکان و کۆیەو قوشتەپەو دەولێر و بۆ مەکتەبی سیاسی حزب پاش نیوەرۆکەی سەردانی مەکتەبی سیاسی حزبی زەحمەتکێشانمان کرد لەگەڵ کاك محمد دۆلآشی و کاك برزو لەوێش کاك قادر عەزیزو برادەران و قسەمان لەسەر روداوەکانی ئەم رۆی کوردستان کرد، لە٩/٥ سەردانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی مان کرد لەهەولێر لەلایەن مام جەلال و کاك دکتۆر فوئادمعصومەوە پێشوازی کراین و کۆبونەوەیەك لەسەر هەلومەرجەکان کرا، لە٩/٦ یەك ساڵ تێدەپەری بەسەر بەیانەکەی حزب کەلە ١٩٩٣/٩/٦ دەرچوو یەك ساڵی تەواومان پر لەدەردەسەری و پرمەینەتی بەرێ کرد، هەرلە ٩/٦ یەکگرتوی ئیسلامی سەردانیان کردین... وەهەر هەمان رۆژ ئێمەش سەردانی پارتی کارو پارتی پارێزگارانمان کرد بۆگۆرینەوەی بیرورا لەسەر روداوەکان، لە٩/٧ هەرلەهەولێر بوم سەرقاڵی ئیشوکاری حزب بوین، لە٩/٨ لەهەولێربوم سەردانی کاك کۆسرەت مان کرد لەئەنجومەنی وەزیران، لە٩/٩ نوسەران سەردانیان کردین لەهەولێر کەبریتی بون لەبەرێزان کاك(سعدالله پەرۆش وکاك جەوهەر کرمانج وکاك جەلال بەرزنجی وکاك قوبادی جەلی زادەوکاك خالید جوتیاروکاك محسین ئاوارەوکاك بابەکر مسعودوکاك محسین کەریم وکاك کەریم دەشتی وکاك اسماعیل بەرزنجی وکاك هاشم سەراج) قسەلەسەر مەسەلەی ئەدەب و سیاسی و کۆمەلآیەتی کوردستان لەم رۆژە دا کرا، لە٩/١٠ لەهەولێر بوم خەریکی کاری ئاسایی خۆمان

بوین، له٩/١١ لەهەولێر بوم لەمەکتەبی سیاسی خەریکی کاری رۆژانەی خۆمان بوین کاك ئەبوحکمەت و کاك جەمشیدحەیدەری و کاك محمد حەلاق وکاك لەشکری لەپارتی کار سەردانیان کردین و لەسەر مەسەلەکانی ئەوکاتەی کوردستان قسەمان کرد ئەوماوەیە هەر لەهەولێر بوم تا ٩/١٤، لە ٩/١٥ گەرامەوە بۆسلێمانی و خەریکی ئیشوکاربوین، له٩/٢١ نزیکەی (٥٠) کەسێك بەکۆمەڵ هاتنە ناو حزبی سۆسیالیسنەوە لەرۆژەکانی شەردا لەشارەزوور خەڵکەکە بەگشتی رویان دەکردە بارەگاکانی سۆسیالیست لەقەدەفەری و گوڵەخانەو ریشێن تۆپ و کاتیۆشای هەردوولاش تەقەی دەکرد رۆژێك راجیمەی یەکێتی لە سیدصادقەوە تەقەی کردبوو دووپێشمەرگەی سۆسیالیست چاویان لێبوبو تۆپەکان بۆلای گوڵەخانەو ریشێن دەروات مام رۆستەم لەسەر جیهاز دەبێت دەڵێت زۆر باشە لێی دەن کابرا راجیمە دەڵێت دای لەبارەگای حسك لەگوڵەخانە وتبوی جیاوازی نیە ئەوانیش هەروەکو ئەوانن پاسدارو ئیسلامی و پارتی جیاوازییان نیە تا دووپێشمەرگەی ئێمە عمرو محمد لە سەیدصادق ئەبن چوبون وتبویان مام رۆستەم ئێمە سۆسیالیستین کاکە دوژمنتان نین بۆتۆپ لەبارەگاکانمان ومالەکان دەدەن ئەو کات دەستیان گواستەوەو لەئەنجامی ئەو راجیمانەی یەکێتی (٩)کەس کوژران منالی.(٣) سالان تاپیاوی (٥٠) ساڵە نامیق مامە رەشە گوڵەخانەیی و ژنێکیان تێدابوو لەولا بزوتنەوەو پارتی دەیانوت جیاوازیان نیە لەگەڵ یەکێتی لەم لاش یەکێتی وای لەگەڵمان دەکردو تۆپیان لەمەقەرکانمان دەداو دۆست و لایەنگری حزبیان شەهید دەکرد، له٩/٢٢ چومە قانیجەو ریشێن بۆپرسەی نامیق وئەوانەی تۆپ وراجیمەی یەکێتی کوشتبونی..نامیق (١١) منالی هەبوو پاشان چوینە قەدەفەری و گردەنازێ کەئەو رۆژە لەگوڵەخانە کوژرابون چومە پرسەکەیان کەبەتۆپی یەکێتی کوژرابون، لەرۆژانی ٢٣ تا ٩/٣٠ هەرلەسلێمانی بوم، له١/١٠/١٩٩٤ لەسلێمانی بوم خەریکی

ئیشوکاری رۆژانەی خۆمان بوین ئەوماوەیە هەر لەسلێمانی بوین، لە١٠/٣ یەکێتی هێرشی کردبوو بۆهەڵەبجەو گرتیان و پاشان شکانەوە، لە١٠/٤ چوینە مەقەری سەیدصادق و بۆسەرقەبران کاك حمە رەشید عەلی شەرەیف گولخە کۆچی دوایی کردبوو زۆرم پێ ناخۆش بوو جگە لەئەوەی خۆی پیاوێکی باش و کوردپەروەرو رەفیق و هاورێیەکی شەخسیم بوو پاشان چوینە قەدەفەری و بۆ گوڵەخانە و بۆ وملەخوردو دزڵی و کانی دینار و مەریوان و بۆشاری سنە، لە١٠/٥ لەسنەبوم کاك دکتۆرئەحمەد خوشکەزای مامۆستا مەلا ناصیح لەوێ بوو، لە١٠/٧ لەسنەوە لەگەڵ عەتاو پشتیوان و کاك بارام هاتینە مەریوان فیشەکمان وەرگرت لەکۆماری ئیسلامی و بەسەیارە ناردمانەوە سەر ملەخورد(٥٠٠)هەزار فیشەکی هەمە جۆرە بوو بەملەخوردەوە بەرێمان کرد بۆگوڵەخانە ومیری سور بەبۆنەی شەری ناوخۆوە خەڵکی زۆر ژن ومناڵ وخەڵکی هەژار ئاوارە بون و سەریان لێ تێك چوبوو نیوەی لەکوردستانەوە بۆ ئێران و نیوەی لەئێرانەوە بۆ کوردستان لەسەر ئەو شاخانەی ملەخورد لەبەر سەرماو باران بون ئێمەش نەماندەتوانی هیچیان بۆ بکەین بەلام لەتەهران باسمان کردبوو پاشان گەراینەوە کانی دینار بەلام ئەو شەوە بیرم لای ئەوخەڵکە بوو لە رەزالەتە دا کەکورد خۆی توشی کردبون وئاوارەی دەستی کوردبون، لە١٠/٨ گەراینەوە بۆسنە، لە١٠/٩ بەرێ کەوتم بۆ تەهران، لە١٠/١٠ لەتەهران بوم عێراق هێزی کۆکردبوەوە لەسەر سنوری کوێت و عێراق و ئەمریکاش ئەوەندەی کەش کوێتەیەکانی ترساندبوو دەیانوت هێزی عێراقی ئەتوانی کوێت و سعودیەش داگیربکات وادیاربوو ماوەیەك بوو کوێتیەکان پارەیان بەپنتاگۆن وئەمریکا نەدابوو ئەوانیش چرایەکی سەوزیان بەعێراق دابوو لەولاشەوە فرۆشتیانەوە بەکوێت و سعودیەیان پێ دەترسان و کوێتیەکان هەڵدەهاتن و وڵاتەکەی خۆیان بەجێ دەهێشت ودەردەچون و بەپەلە داوایان لەئەمریکا کرد

بۆهێزو کەشتیەکان بەرەو کەنداو بەرێ کەوتن و بانقەکانی سعودیەو کوێت کرایەوە بۆئەمریکا بەناوی مصاریفی ئەو سوپایەوە چەند ملیارد دۆلاریان بۆ سەرف کردن و عێراقییەکانشیان گەرانەوە دواوە ، لە١٠/١١ لەتەهران بوم دوای کۆبونەوەمان لەگەڵ بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی گەراینەوە بۆ سنە و چومەماڵەوە لەوێ کۆمەڵێك لەبەرپرسانی کۆماری ئیسلامی سەردانیان کردین لەوانە ئاغای سەردار ئەحمەدی کەریمی کەلەشەری عێراق ئێران بون بەدۆست و ناسراومان ئێستا بەرپرسی سەربازی قەرارگای قودسە وزۆری کەشیان، لە١٠/١٣ لەسنە بوم لەسەعات (١٠) ی سەرلەبەیانی کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ ئاغای رەحیمی وئوستانداری کوردستان لەسنە پاریزگاری سنە بۆ کردنەوەی سنورەکان وهاوکاری بۆ کوردستانی عێراق رێگای ئازوقەو پێداویستی بۆ خەڵکی کوردستان بدات و لەکۆبونەوەی تەهران داوایان لەمن کرد لەگەڵ پارتی ئاشتی بکەین و کاك مەسعود بارزانیش لەتەهران بوو قسەیان کردو منیش پێم باش بوو گەرامەوە، لە ١٠/١٥ چومە کرماشان ، لە١٠/١٦ لەکرماشان کۆبونەوەمان هەبوو لەقەرارگا پاشان چوینە تەشریفات مامۆستا مەلا عوسمان و مامۆستامەلا عەلی وکاك مەلا عەلی باپیروبرادەرانی کەی بزوتنەوەی ئیسلامی لەوێ بون مامۆستایان برد بۆتەهران بۆ کۆبونەوە لەگەڵ کاك مەسعود بارزانی ئێمەش لەتەهران کاك نێچرڤان بارزانی و کاك ئازاد بەرواریمان دی وکۆبونەوەمان کردو ئەوان داوایان دەکرد بزوتنەوەو پارتی و سۆسیالیست پێکەوە جەبهەیەك بکەنەوە دژی یەکێتی ئێمە وتمان دژی یەکێتی شەر ناکەین و دژی ئێوەش شەرناکەین و شەری هەرلایەکتان بکەین بۆ خۆمانی دەکەین نە بۆئێوە وەهەر لایەکتان دژمان بون و بریاری شەرتان داین ئەوە ناحەقیتان پێ کردین ئەوکات شەربۆ خۆمان دەکەین کاك نێچیرڤان ووتی لەحاجی عمرانەوە هەر بەجلە قوراویەکانەوە هێناومیان بۆ ئورمیە و بەتەیارەش بۆئەم

کۆبونـەوەیان هێنـاوم بەئێرانیـەکانیان وتبـوو کەئـەوکات رێـك دەکـەون لەگـەڵ سۆسیالیست بەشداری شـەر بکـەن دژی یـەکێتی جەبهەیـەك پـارتی وسۆسیالیـست وبزوتنەوەی ئیسلامی دروست بکـەین ئێمـە نـەمان کـرد، بـەلأم ئامـادەیی خۆمـان نیشاندا لەگەڵ پارتی ئاشتی ورێکەوتن بکـەین ودۆسـتایەتی پارتیمـان پـێ خۆشـە، لە١٠/١٧ گەڕاینەوە بۆ سنە، لە١٠/١٨ لەسنەوە چومە ئورمیە لەسەر داوای کۆماری ئیسلامی بۆ کۆبونەوە لەگەڵ پارتی و چارەسەری کێشەکانمان منـیش بەسـەیارەی برادەرانی کۆمـاری ئیـسلامی بـەرێ کـەوتم وسـەعات (٨/٣٠)ی ئێـوارە گەیـشتین و چوینە ئوتێل دەریا لەخیابانی ئیمام لە ئورمیە و شەو لەوێ بوین، لە١٠/١٩ چـوینە مهمان سەرای ئورمیە کاك مەسعود بارزانی لەوێ بوو لەگـەڵ کـاك ئـازاد بـەرواری و کـاك فەلەکـەدین کاکـەیی و کـاك مـلازم عـەلی لەگـەڵ نوێنـەری کۆمـاری ئیـسلامی کەئێمە چوین پێشوازیان لێ کردین و چـوینە ژوورێـك وادیـاربوو ئامـادە کرابـوو بـۆ کۆبونەوەکـە نوێنـەراینی ئێـران لەرەزایـە وتیـان ئێمـە ئەوەنـدەمان لەسـەربوو هەردوولاتانمان گەیاندە یەك و ئێوە دەست بەقـسەی خۆتـان بکـەن و ئێمـە داوای سەرکەوتنتان بۆ ئەکەین و بەجێیان هێشتین پاشان برادەرانـی پـارتیش هـەمویان بەجێیان هێشتین و من وکاك مەسعود هەردوو بەدوو لەوێ بوین کەوتینە قسە کردن من وتم لەکوێوە دەست پێدەکەین کەشەر بووە یـالێرەوە کەپەیوەنـدی باشـە کـاك مەسـعود ووتـی مـن حـەزم نـەکرد وای لێهـات و ئێـستاش دۆسـتایەتی و هاوکـاری هەردوولامان لەکۆنەوە زیاترە (٤—٥) رۆژ شەربوبێت دەشـتوانین لەسـەر بناغەیـەك باسی کارەکان بکەین..ووتم کاك مەسعود ئێمەش نەمانویست وای لێ بێـت وئێـستا دەتوانین لەسەر ئەساسی هەردوولا وەکو حزب دۆستی یەك بین لەسەعات (٤ بـۆ٦) قسەمان لەسەر مەسەلەکان کرد ئەو گلەیی کرد گوایە من هەنـدێك شتم بەمام جەلال وتووە کەکانی یەککگرتن هەر خۆمان باسمان کردووەو مام جەلال بـەکاك مەسـعودی

وتووه وتم من نەموتووه بەلآم من وتومه شەردەبێت لەنێوانتان من بەسام جەلالم وت.. مام جەلال پێی وتم بۆلەگەڵ پارتی نامێنی ووتم مام جەلال من پارتی بم دەبێت شەری ئێوه بکەم و من شەرناکەم بۆکەس شەربکەم بۆ خۆمانی دەکەم کاك مەسعود ووتی من قسەکانی خۆم ناسیوەتەوه لەسەر ئەو خالآنه قسەی لەسەر کرا کاك مەسعود ووتی چەك کردنی لیواکه ئیهانەی پارتی بووقسەدژی پارتی کراوه بەناوی حزب وەکۆنگرەی حزب لەسەر ئەو (٤) خالّه قسەکرا رێکەوتین لەسەر ئەوەی لەئێستا بەدواوه هەنگاوی دۆستانه بنێین و کێشەی کۆن کۆتایی هات و لەماوەی چەند رۆژی کەدا هەردوو مەکتەبی سیاسی کۆبیێتەوه ئەوانه قسەی کاك مەسعود بو قسەکانی کاك مەسعود هەمووی دۆستانەو برایانه بون لەدوایشدا کاك ئازاد بەرواری هاته ژوورەوەو ئەویش (٤–٥) قسەی کردو کاك مەسعود وتی ئێمه هەموی تەواومان کردوەو گەیشتینه نەتیجەو واش بکەن ئەوان کۆنگره دەگرن و کۆبونەوەی هەردوو مەکتەبی سیاسی بکرێت و ئەگەر مەجال بوو بەشداری کۆنگره دەکەم و ئەگەر مەجال نەبوو نوێنەری پارتی و شەخسی خۆم دەنێرم پاشان کاك ئازاد ووتی ناوی حزب بگۆرن و ناوی کۆنگره چونکه ئەوه بۆئێمه خراپه منیش ووتم ئێوه لەگەڵ حزبی یەکگرتن یەکگرتنتان کردووه واتا پارتی و یەکگرتن نەك پارتی و سۆسیالیست ..وتیان ناوی سۆسیالیست بێت ئەی ئەوانەی یەکگرتن بون ئێمه خۆمان (١١)مانگ پێش ئەوه پرۆژەی پرۆگرام و پەیرەویەکمان دانابوو بەناوی حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستانەوه خۆمان بریارمان دابوو ئەوە کێشەی ناوی بۆئاسان دەکردین دوای قسەکان نوێنەرەکانی ئێران هاتن و ووتیان چیتان کرد کاك مەسعود ووتی گەیشتینه ئەنجام و لەمەولا دووحزبی برا دەبین و کۆبونەوەی کەش دەکەین و لەکۆنگرەش بەشدار دەبین ئەوانیش پیرۆزباییان لێ کردین من کەسم لەگەڵ خۆم نەبردبوو سائیقی ئەو سەیارەی من پێی رۆیشتم

کوردبوو خەڵکی کرماشان بوو بەلاّم کوردیەکی باش فێربوبوو وەکو ئەوەی خەڵکی کفری یاکەلار بێت قسەی دەکرد وجلی کوردی لەبەربوو جامانەی بەسەرەوە بوو کاتێك ئێمە لەگەڵ کاك مەسعود لەژوورەوە بوین ئەوان لەهۆڵەکە دانیشتبون ئەو برادەرانەی باسم کرد قسەیان دەکردو خەتای کێ بوو حەق نەبوو ئێوە لیواکەتان چەك بکردایە ئەو برادەرەش وادیاربوو شارەزایی هەبوو وتبوی ئێوە پێشمەرگەتان دەرکردووە لەسوپای یەککگرتوی کوردستان کاك فەلەکەدین وتی ئەم برادەرە لەوانەیە شارەزایی نەبێت چونکە لەهجەکەی لەدەوری کفری و خوارەوە دەچێت و دور بووە لەوەزعەکانەوە ووتی نەیاندەزانی ئەوە ئێرانیە دوای لەرێگا بۆی باس کردم ئەو دوسەعاتە ئێمە لەژوورەوە بوین ئەوانیش هەر مناقەشەیان کردبوو لەژوورەوە کوردەکە ناوی عبداللە بوو لەدوای کۆبونەوەکان ئێمە گەراینەوە جێگای خۆمان بۆ ئۆتێل شەویش بەرپرسانی ئێرانی سەردانیان کردین و قسەمان لەسەر روداوەکان و وەزعی ئەو کاتەی کوردستان کرد و ئەو کۆبونەوەیە بۆئێمە هەنگاوێکی گرنگ بوو سەرکەوتنش بوو بۆپارتی پێش ئەوەش لەوکاتەدا مام جەلال وکاك مەسعرد پێکەوە بون بەمام جەلالم ووت باسی بکات لەگەڵ کاك مەسعود..

مام جەلال روتی دووسێ جار باسم کردووەو قبوڵی ناکەن ئێوە وەکو حزب هەبن و تەعامولتان لەگەڵ ناکەن من بە مام جلالم وت کاك مسعود خۆی وای پێ وتی مام جلال وتی بەڵێ بەلاّم دوای ئەوەی مام جەلال پێ ی وتم کاك مسعود بارزانی بە مام جەلالی وتوە لەگەڵ سۆسیالیست رێك ناکەوم کۆماری ئیسلامی کۆبونەوەی سێ جار پێ کردین جارێك لەکرماشان لەگەل کاك نێچرڤان بارزانی وکاك ئازاد بەرواری لە کرماشان و جارێك لەتەهران هەر لەگەڵ کاك نێچرڤان وکاك ئازاد بەرواری وئەوجارەش لەگەڵ کاك مەسعودبارزانی لەئورمیە کاك مەسعود بارزانی زۆر بەدڵێکی فراوان و باش و بەقەناعەتەوە قسەکانی دەکرد و زۆرم پێ خۆشبوو دوای

ئەو شەرو کێشانە گەیشتینە ئەنجامێکی باش وبۆیە بریارم دا بەهەموو توانامەوە هەوڵ بدەم بۆ دۆستایەتیەکی باشی پارتی و بەتایبەتی کاك مەسعود بریارم دا لەگەڵ برادەران قسە بکەم لەسەر ناوی رۆژنامەو شتەکان لەگەڵ پارتی لیّ ی نەوەستین نەیکەینە کێشە دۆستایەتیەکەی پارتی هەڵبژێرین واتە قسەکانی کاك مەسعود ئەوەندە دۆستانە بوو بۆیە منیش هەولّم دا هەرچی لەدەستم بێت بۆ ئاشتی و دۆستایەتی پارتی و کاك مەسعود بیکەم پیشتریش کاك نێچرڤان راوبۆچونەکانی زور باش بو هەر ئەوەش زەمینەی خۆشکرد بۆکوبونەوەی لەگەڵ کاك مسعود بارزانی دا قسەکانی مام جەلال یش زۆرتر هانی دام بەلاّم بەداخەوە دوای برادەرانی یەکگرتن ئەو کەسانەی لەدەوری کاك مەسعودبون تێکیان دایەوە، لە١٠/٢٠ لەئورمیەوە گەراینەوە مهابادو سەقزو سنە سائیقەکەمان سەریع بوو لەرێگا ووتم ئەگەر وابروات من داوای روخسەتی لیّ دەکەم و بە تەکسی دێمەوە چونکە زۆر سەریع بوو لەوسەرەوە بە(٨) سەعات گەیشتین رێگا بەفربوو لەم لاوە بە(٥) سەعات رۆیشتین ماوەکە (٤٧٥)کم بوو ئەوانەش هەموی هاوکاری کۆماری ئیسلامی بوو یەکێ لەخالّەکان باسمان کرد بارەگاکانی سۆسیالیست لەناوچەی بادینان لەدهۆك و جێگاکانی کەش هەبێت، لە١٠/٢١ لەسنە بوم تا ١٠/٢٤ چومە مەریوان، لە١٠/٢٥ لەمەریوانەوە چومە کانی دینارو گەرامەوە بۆمەریوان ، لە١٠/٢٨ لەمەریوانەوە گەرامەوە بۆ دزلّی و ملەخوردو وشکەناو وگولّەخانە، لە١٠/٣٠ چومە سلێمانی و لەوێوەو چومە قەلاّچۆلان بۆلای مام جەلال باسی سەفەرەکەم بۆ کرد بەلاّم ووتم لەگەڵ پارتی گەیشتینە هەندێك بریار بەلاّم بۆ ئێمە قورسە ناوی کۆنگرەو ناوی حزب و ئەوانە مام جەلال وتی براگیان هیچ قورس نیە ئێوە ناویش بگۆرن ناوی کۆنگرەش ئەو حەساسیەتە نامێنێ لە کونگرەیەکی کەدا و وەکو خۆی لیّ دەکەنەوە بۆئێوە گرنگ پارتی یە بەشداری کۆنگرەکەتان بکەن گرنگە تکایە

هەرچی دەڵێن بیکەن زەرەرناکەن مام جەلال زۆر روی خۆشبوو ووتی خۆناو ئێوە پرۆژەتان هەیە بەناوی سۆسیال دیموکرات ئەوەکێشەیەکتان حەل بووە هەروەها ووتی بەگوێ ی من بکەن هەرچی پارتی دەڵێت ئەو شتانە ئاشتیان لەگەڵ بکەن قسەکانی مام جەلال دۆستانە بوو لەگەڵماندا مام جلال جاران زۆر حەساس بو لە نزیك بونەودی سۆسیالیست لە پارتی بەلاَم ئەم جارە جیاوازبو هاتمەوە باسی رەئیە باشەکانی مام جلال لە سەر رێکەوتنی سۆسیالیست و پارتی برادەرێك وتی مام جەلال وتویەتی خۆ ئەوان هەر رێك کەوتون بامن وا قسە بکەم بەلاَم من زۆر ممنون وسوپاسی مام جلال م کرد بۆ هەلۆێستە دۆستانەکەی ئەمرۆی لەگەڵ مندا، لە١٠/٣١ هەرلەسلێمانی بوم، لە١٩٩٤/١١/١ لەسلێمانی بوم چومە مزگەوتی خانەقا بۆپرسەی کوری نجم الدین حسن کەکاك خالید رەزا برازای کاك نەوشیروان مستەفا قائیمقامی قەزای مەرکەزی سلێمانی بوو کوشتبوی نجم الدین حەسەن کۆن لەشۆرشی ئەیلول سەرلق بوو لای چەمچەماڵ و دوای لەشۆرشی نوێش لەگەڵ سۆسیالیست بوو لەکاتی یەککرتن دا بووبەیەکێتی و لەوێش وایان لەگەڵ کردبوو، لە١٩٩٤/١١/١ لەشیوەسوری لای بازیان کەمینێکیان دانابوو کاك عیماد ئەحمەد بەرپرسی مەلبەندی سلێمانی یەکێتی و کاك شالاَوی عەلی عەسکەری تێکەوتبوو بریندار ببون و شەویش سەردانمان کردن لەنەخۆشخانە،

### خۆئامادە کردن بۆ کۆنگرەی ( ٢ )ی رێکخستنەوەی حزبی سۆسیالیست

لە١١/٢ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتم بۆ کۆیەو هەولێر بۆ مەکتەبی سیاسی پاشان چوین بۆ عەینکاوا خانویەکمان بۆ ئیسراحەت گرتبوو، لە١١/٣ لەمەکتەبی سیاسی بوین لەهەولێر سەعات (٦)ی ئێوارە سەردانی کاك کۆسرەت مان کرد و هاوکاری و یارمەتی کۆنگرەکە ئەوەبوو پێش ئەوە مام جەلال یارمەتی داین و ئێرانیەکانیش ئازوقەو هەندێك یارمەتیان داین بۆ کۆنگرە بریاربوو حکومەتی هەرێمیش

یارمەتیمان بدات و کاك کۆسرەت و لایەنی پارتی هەردوولا لەسەری ڕێکەوتبون کاك مسعود بارزانی خوی داوای کرد کە یارمەتی کۆنگرەی سۆسیالیست حکومەت بیدات رای سپارد کارئاسانیمان بۆ بکەن کە(٧٥٠) هەزار دیناربۆ کۆنگرە سەرف بکەن و چەکیان بۆ کردین (٢٥٠) هەزاردیناریان سەرف کردو دوای (٥٠٠)هەزارەکەی کاك کۆسرەت نەی هێشت سەرف بکەن ئێمەش پێشا باسمان کردو چەند یارمەتیمان دەدەن بەو پێیە مصاریفی خۆمان دەکەین ئێمە حسابی (٧٥٠) هەزارمان کرد و ئەوان (٢٥٠) هەزاریان داینێ بۆیە تائێستاش پارەی ئوتێلەکانی هەولێرمان لاماوە نازانم ئەنجامی کۆنگرەی پێ باش نەبوو یا کاك سلێمان قەساب خۆی دەرنەچوو ئەویش قسەیەك خێری کردبوو وادیاربو کاك کۆسرەت تەئسیری کاك سلێمان کە خۆی دەرنەچوبو چونکە کاك کۆسرەت یەك دووجارداوای کرد کاك سلێمان قەصاب بکەینە ئەندامی مەکتەبی سیاسی هەرچەندە زۆری کۆنگرە رازی نەبون کاك سلێمان هەر ئەندامی حزبی سۆسیالیستیش بێت وەکو برادەر داوای کرد کەچی کاك سلێمان بۆ کۆمیتەی ناوەندیش دەنگی نەهێناو پارەکەشیان نەداینەوە کاك کۆسرەت سەرۆکی حکومە ت بو جیهازیان کرد لەسنە ماڵەوەمان لەسنەبو گەردەخان کورێکان بووە ناویان ناوە ئاریان لە رۆژی ١٩٩٤/١١/٣ ، لە١١/٤ لەهەولێربوین گەرامەوە بۆ سلێمانی، لە١١/٥ گەرامەوە بۆ هەولێر کۆمەڵێك نوسەر سەردانیان کردین، لە١١/٦ هەرلەهەولێر بوم چومە پرسەی خزمێکی کاك عوسمان موفتی لەمزگەوتی رەشاد موفتی، لە١١/٧ گەرامەوە بۆسلێمانی، لە١١/٨ لەسلێمانی بوم سەردانی بزوتنەوەی ئیسلامیم کرد لەسلێمانی سەرقاڵی خۆئامادەکردن بوین بۆ کۆنگرەی (٤)ی حزب و ئاشتی لەگەڵ پارتیدا، لە١١/١١ لەسلێمانیەوە بەرەو هەولێر نزیکەی (٧٠) پێشمەرگەشمان لەگەڵ خۆمان برد بۆ حەرەسیاتی هۆڵەکە، لە١١/١٤ سەرقاڵی کۆنگرە بوین لەهەولێر بەیەك مانگ

کۆنفراساتی هەموو لقەکان گیرا جگە لەلقی دهۆك ئەوان بریار درا لەکۆمیتەی ناوندی دیاری بکرێت چەند کەس بەشدار دەبن چونکە تائەوکاتەش نەیان دەتوانی بەئاشکرا کۆنفرانس بگرن(٦٥٢) ئەندام بۆ کۆنگرە هەڵبژێرا لەکۆنفرانسەکان و ئامادەکران بەلاّم کۆبونەوەی هەردولا پارتی و سۆسیالیست پارتی هەردوای دەخست بۆکاتێك کەهیچ مەجال نەمێنێ و هەرچیان وت ئێمە قبوڵی بکەین لەدوای کێشەو شەرو پێکادان لەرۆژەکانی ١٠تا١٩٩٣/١٢/١٥ هەر خەریکی خۆ ئامادەکردن بوین بۆ کۆنگرە..ئێمە لە١٩٩٤/١١/١٣ بەرێ کەوتین بۆ صلاح الدین و سەردانی پارتی وکاك مسعود بارزانی بەلاّم ئێمە رێگاکەمان گۆری لەجیاتی ئەوەی لەهەولێرەوە بۆ شاوەیس ئێمە لەهەولێرەوە چوینە کەس نەزان و گۆمەسپان و بۆلای بەستۆرەدو مصیف سەرکەوتین یەك سەعات لەمەوعید دوا کەوتین کەچوین برادەرانی پارتی وتیان غەم مان بووە نەوەك بزانن دێنە ئێرەو کەمینتان بۆ دابنێن و لەسەر ئێمە بکەوێت مەبەستیان لەیەکێتی بوو کەمینمان بۆ دابنێن وەفدی ئێمە پێکهاتبوین لە من و کاك مەلا ناصیح وکاك محمد دۆلاشی و کاك برزو عەلی هەژارو کاك خورشید بوین وەفدی پارتیش بریتی بون لە کاك مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی و کاك عەلی عبداللەو کاك دکتۆر رۆژ نوری شاوەیس و کاك محسین دزەیی و کاك زەعیم عەلی و کاك فرانسۆ حەریری و کاك ملازم یونس رۆژبەیانی و کاك سامی عبدالرحمن و کاك عبدالله ئاگرین لەوێ پێشوازیان لێ کردین و کۆبونەوەش دەستی پێ کردو قسە کرا لەسەر مەسەلەکان ئەوان وتیان لەگەڵ یەکێتیش قسەمان کردووە کە (٧٥٠) هەزار دینار بۆ کۆنگرەکەتان سەرف دەکەین ئێمەش سوپاسمان کردن من قسەم کردو کاك مەسعودقسەی کردوئەوانیش هەریەکە بەجیا قسەی کردکاك فرانسۆ ووتی ئێمە مەرجمان هەیە ..

١-ناوی حزبی سۆسیالیست بگۆرن .

٢-كۆنگره کەتان بکەن بەکۆنگرەی یەکەم و تازە دروست بوە چونکە قەواعیدی سۆسیالیست لەپارتی دەگەڕێنەوە لای سۆسیالیست هەروەها ناوی رۆژنامەش بگۆرن بەراستی هەموی قورس بوو بۆئێمە مناقەشەی لەسەرکرا کاك مەسعود قسەی نەکرد من وتم چی بکەین کاك مەسعود ووتی ئەوە بریاری برایەتیمان داوەو پێویست ناکات ئەوەندە شتەکان قسەی لێ بکەینەوە کاك فرانسۆ هەریری وئەوانی تر وتیان ئەگەر ئەوانەی ئەیلێن نەیکەن هەروەها وتیان دژتان نابین و بەشداریش ناکەین لەکۆنگرە هەمویان بەشداربون لەقسەکان جگە لەکاك مەسعودوکاك محسین نەبێ ئێمە کاتمان نەمابوو هیچ مەجالی مناقەشە و ئەوە نەمابوو ئەگەر هەڵبسابن ئەوە ئیتر دەبووە ئەوەی هیچ نەکرابێت وتێك دەچو ئێمەش مەبەستمان بوولەگەڵ پارتی کێشەکانمان کۆتایی پێ بێت نەماندەویست ببینە تەرەف بەتایبەتی لەنێوان یەکێتی و پارتی دا ووتمان بەنسبەت ناوی حزب ئێمە پرۆژەمان هەیە و دیموکراتیەکی بۆزیاد دەکەین وەناوی کۆنگرەش یەکێتی و ئەوانەی چونەتە ناویەکێتی ئەوانیش دەڵێن دەبێت کۆنگرەی (٣)بێت چونکە کۆنگرەیان گرتووە ئێوەش دەڵێن کۆنگرەی یەك بێت ئێران یش ئەڵێت بەناوی یکگرتن وە بێت لە ساڵی ١٩٧٩وە لەگەڵ ئێران ئەوکێشەیەمان هەبو دەیانوت ناوی حزبی سۆسیالیست بگۆرن سۆڤێت نەماوە کۆمۆنیستی هەرەسی هێناوە لەجیهان دا ئێوە زیندوی ئەکەنەوە ئێمەش خاوەنی ئەسڵی مەسەلەکەین دەڵێن وخاوەن ماڵین کۆنگرەی (٢) بێت لەنێوان هەموان دەڵێن کۆنگرەی رێکخستنەوەی حزب با ناوی (١و٢و٣) لەسەرنەبێت و لەکۆنگرەیەکی کە جارێکی کە بۆ خۆمانی راست دەکەینەوە لەسەر ئەوە رێکەوتین ناوی حزب ئەوە لەکۆنگرە باسی دەکەین و ئێمە خۆمان کۆنگرەکە بە ناوی کۆنگرەی ٢ی رێکخستنەوەی حزبی سۆسیالیستەوە تا کۆنگرەیەکی، کە راستی دەکەینەوە پارتی وکاك مسعود یش پێیان باشبوو

بەشداری کۆنگرەشیان کردو دوای کۆنگرەش پەیوەندیمان باشبوو تا ٣١ی ئاب ١٩٩٦پارتی هاتنە سەر بارەگاکانمان وئیعلانی شەریان کرد لەگەڵمان لە کۆنگرە ناوی حزب بوو بە حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان ئەمانەمان هەموو قبولڵ کرد بۆ رازی بونی دڵی پارتی وچارەسەری کێشەکان ر وتمان هەولڵ دەدەین بۆ ناوی رۆژنامەش زۆر قسەمان لەسەر کرد وتمان لەکۆنگرە باسی دەکەین لەسەر ئەوخالآنە رێکەوتین بەلآم ناوی کۆنگرە کۆنگرەی ٢ی رێکخستنەوەی حزب بێ نەگۆرێ لەداهاتوودا تەسەسولەکەی وەك خۆی لێ دەکەینەوە کاك مەسعود ووتی هەولڵ دەدەم خۆم بێم و ئەگەریش نەکرا ئەوە جگە لەنوێنەری پارتی نوێنەری تایبەتی خۆم دەنێرم پاشان ئێمە گەراینەوە درەنگ بوو ئەوانیش دووسێ سەیارەیان لەگەڵ ناردین تالەشاوێس بۆهەولێر رەدبوین و گەرانەوە قسەکانیان زۆرباش و دۆستانە بوو، لە١٩٩٤/١١/١٤ کاك قادرعەزیز سەردانی کردین بۆمەسەلەی کۆنگرە قسەمان کرد پاشان کاك مەلا یاسین سکرتێری مام جەلال تەلەفۆنی کرد ووتی مام جەلال بەیانی بەشدار دەبێت لەکۆنگرەکەتاندا ئێمەش زۆرمان پێ خۆش بوو، لە٩٤/١١/١٥ سەعات (٩)ی سەرلەبەیانی بەچەند ئایەتێك لەقورئانی پیرۆز کۆنگرە کرایەوەو پاشان من بەخێرهاتنی میوانەکان رمام جەلال وکاك مسعود ساڵەیی نوێنەری کاك مەسعودبارزانی وکاك عبداللە ئاگرین نوێنەری پارتی و هەموو حزبەکان و سەرۆکی حکومەتی هەرێم کاك کۆسرەت رەسول عەلی و وەزیرەکانم کرد و پاشان لیژنەی ئامادەیی سەرپەرشتی کۆنگرەش بەخێرهاتن و وتاری کۆنفرانس و کۆنگرەی کردو دوای ئەو مام جەلال قسەی کرد لەیەك سەعات زیاتر قسەی کرد بەلآم هەموی قسەی باش و لەخزمەتی کۆنگرەو کوردو هەموو لایەك بوو وەئیشارەتی بەخەباتی (١٩) ساڵەی حزب و خەباتی هاوبەشی لەگەڵ یەکێتیدا لەسەر وەزعە سیاسیەکانی ئەمرۆی کوردستان وعێراق

وناوچەکەووەفدێکی کۆماری ئیسلامی ئێران لەکۆنگرەکەبوو یەکێتیش بەتەمای ئاشتبونە وەبون لەگەڵ ئێران مام جەلال ناراستەوخۆ وەسفێکی ئێرانی کرد وداوای هاوکاری بۆخەڵکی کوردستان وعێراق دوای ئەوکاك مەسعودسالّەیی نوێنەری شەخسی کاك مەسعود بارزانی قسەی کردبەناوی کاك مسعود بارزانی وە داوای کردحزبی سۆسیالیست لە چوار چێوەی بەرەی کوردستانی دا دەست بەچالاکیەکانی خۆی بکاتەوە بەرەی کوردستانی جێگای ئاسایی حزبی سۆسیالیستە وپاشان نوێنەری حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان قسەی کرد و دوای ئەوە وتاری حزبی شیوعی کوردستان کاك مەلا حسن خوێندیەوە بەراستی وتارەکەیان لەجێگای خۆی و وتارێکی زۆرباش و دۆستانەوپر پێست بوو پاشان یەکگرتوی ئیسلامی وتاری خوێندەوەو پاشان کاك کۆسرەت سەرۆکی حکومەت قسەی کردو هەروەها زۆر لەلایەنەکان قسەیان کردو وتاری کۆماری ئیسلامی ئێران لەدوای وتاری پارتی سێ هەم وتاربوو قسەی باش و ئیشارەتی بەخەباتی حزبی سۆسیالیست و فیداکاری و ئەو هەموو گیروگرفتەی هاتە رێگای سۆسیالیست بهاتایە رێگای هەر حزبێکی کە هەرگیز نەیدەتوانی بێتەوە سەر پێ ی خۆی و بتوانێ جەماوەر کۆبکاتەوە دەعوەتی زیاترلە(٣٠٠) کەس کرابوو لەسەرۆك عەشیرەت وپیاویناسراوو رۆشنبیرانی کورد هەروەها کاك عزەالدین مستەفا رەسول وتاری نوسەرانی خوێندەوە هەورەها حزبە تورکمانیەکان و حزبە عەرەبیەکان زۆری بەشداربون بەڵام بزوتنەوەی ئاشوری بەشدار نەبون لەترسی پارتی وایانزانی پارتی نایاتە کۆنگرەکەوە هەروەها پارتی کاری سەربەخۆو حزبی رزگاری وتاریان هەبوو نان خواردن بۆمیوانەکان لەئوتێل هەورامان ئامادە کرابوو (٦٠٢) ئەندام کۆنگرەش لەوێ بون لەگەڵ (٣٠) کەسی ئاسایش هاتبو بون بۆپاراستنی هۆڵەکە لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە وە (٧٠) پێشمەرگەش لە فەرماندەی

سۆسیالیست هاتبو بۆ پاراستنی هۆڵەکە جگە لەپاسەوانی بەرپرسەکان هاتبون و لەوێ بون دوای نیوەرۆش من تەقریری سیاسی حزبم بۆکۆنگرە خوێندەوە لەکۆنگرەی یەکەوە تائەو کاتە چی بەسەر حزب هاتبوو گێروگرفتەکان لەلایەن کۆنگرەوە قبولْ کرا بەتێکرای دەنگ پاشان لیژنەکان دروست کران، لە١١/١٦ نەتیجەی لیژنەکان هاتەوە لامان زۆربەرودی مناقەشە کران و شیکرانەوە بەتێروتەسەلی لەسەر هەموو روداوەکان لەکەشو هەوایەکی زۆر دیموکراتیانەدا هەموو لایەك زۆر دڵسۆزانە کارەکاینان بەرێوە دەبرد، لە١١/١٧ هەروا بەردەوام بوو زۆر دڵسۆزانە مناقەشە دەکران تائێوارە هەموو مەسەلەکان کۆتایی پێ هات ، لە١١/١٨ ناوەکان نوسران بۆخۆ هەڵبژاردن نزیکەی (٥٣) کەس بۆ (١٩) ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی خۆی نوسیبوو نەیان هێشت من خۆم هەڵبژێرم بەجارێك کۆنگرە دەنگی دا و مامۆستا مەلاناصح هەروا کۆنگرە دەنگی دایەو ئەوانی کەش ناویان نوسی من شەخسی حەزم دەکرد ناوبنوسن و لەوێ رەئی وەربگرم وادیاربوو کۆنگرە نەی هێشت..رەئی دان تەواو بوو دووحاکم هاتبون لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە چەندجار داوامان کرد کاك قادر جەباری کەخۆمان کردمان بەوەزیر حاکمی نەداینێ بۆچاودێری کۆنگرە پاشان داوامان لەسەرۆکی وەزەرا کرد کاك کۆسرەت ئەو داینێ دووحاکمی نارد بۆمان لەدوای نیوەرۆ دەست کرا بەفەرزی ناوەکان، لە١١/١٩ کۆتایی هات بەئایەتێك لەقورئانی پیرۆز و ئەوناوانە دەرچون بەم شێوەیە (محمد حاجی محمود، حسێن خەلیفە، محمد دۆلاشی، عەتا سەراوی، سەیدقادر جەباری، جمیل محمد قادر، خاتوومنیرە، رەمەزان بەکر، صابر فەقێیانی، خورشیدصادق ، هوشیارحسن، هەڵو ئەحمەدکوردە، عینایەت نامیق، سەلام رەوف (سلامەسور)و مامۆستا مەلا ناصیح ) وەئەمانەش بەئیحتیات دەرچون (برزوعەلی هەژار، خلیل سعید ،بەکر کوێخا عمر،محمد غفور) بریارماندا

مامۆستا سەلام دەنگی یەکەم بولەدوای ئەحتیاتەکانەود واتە مامۆستاسەلام دەرنەچوبو کاك خلیل وکاك برزومان بەدوای یەکدا هێنایە پێشەوەبۆئەوەی بەهەرشێوەیەك بێت مامۆستاسەلام واتە مامۆستاسەلام مان کەدەرنەچوبو وامانکرد ببێتە ئحتیات و موستەحەق بوو هێنامانە پێشەوە هەروەها کاك خلیل وکاك برزوش بۆ کۆمیتەی ناوەندی، لە١١/١٩ لەدوای نیوەرۆ ئەنجامی دەرچوو لەئوتێل برج ئەربیل یەکەم کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی تازەمان کرد، لە١١/٢٠ لەمەکتەبی سیاسی لەهەولێر کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی بەردەوام لەوێ مەکتەبی سیاسی هەڵبژێرا بەم شێوەیە ( محمد حاجی محمود، مامۆستا مەلا ناصح ، محمد دۆلاشی، سەیدقادر جەباری، جمیل محمد قادر، هەڵو ئەحمەد) ئەو کۆنگرەیەش بەهەنگاوێکی باش و گرنگ و نوێ بوو لەژیانی حزبداو لەمێژوی حزب.. کۆنگرە بەناوی کۆنگرەی دووی رێکخستنەوەی حزبی سۆسیالیست ناونراو ناوی حزب لەسۆسیالیستەوە بوو بەحزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان، لە١١/١٧ ئیجازەی حزب لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە درا بریارێك دەرچو هەمووحزبەکانی کوردستان داوای ئیجازە بکەن وەك شتێکی رەمزی چونکە سۆسیالیست شۆرشی کرد کەس نەبوو ئیجازەی لێ وەربگرن وەناوی رۆژنامەی حزب لەرێگای ئازادی گۆرا بۆ رێبازی ئازادی واتە ناوی رۆژنامەو کۆنگرەمان لەبەرئاشتی لەگەڵ پارتیدا گۆری وەبۆ ناوی حزب داوایان کرد بەلاَم ئێمە خۆمان بریارمان دابوو ببێتە حزبی سۆسیال دیموکرات لەروی ئایدلۆژیشەوە بیروباوەری سۆسیال دیموکرات سود وەربگرین و چونکە دامەزراندنی حزب هەرلە بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانەوەبە ناوی بزوتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستانەود دامەزراوە بەلاَم لەگفتوگۆی بزوتنەوەو کومەڵەی مارکسی لینینی وخەتی گشتی داوایان لەبزوتنەوە کرد کە دیموکراتەکەی لێ بکەنەوە چونکە :

١–سۆسیال دیموکرات باوەری بەچەکداری نیە

٢–هەمو حزبە سۆسیال دیموکراتەکانی جیهان ئەمپریالیزمی دووهەمن ئەمریکا یەکەم و سۆسیال دیموکرات دووهەمە لەهەموودنیادا یەك سۆسیالیستیە بەقیادەی قەلای سۆسیالیستەکانی جیهانە ئەویش یەکێتی سۆڤیەتە کردویانە بەمەرج لەبزوتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستانەوە گۆرابە بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان، لەسەرداوای کومەلەومام جەلال لە سالی ١٩٧٦و١٩٧٧/٧/٢٢، ئەو سیاسەتە پیادە بکەین و ئەستێرەمان کرد بەگوڵ لەناوئارمەکەدا و ئاشتی و دیموکراتی ومافی مرۆڤ کردنەوەی کۆنگرەکە بوو مافی چارەنووس، لەرۆژانی ٢٠و١١/٢١ هەر لەهەولێربوم لەمەکتەبی سیاسی خەریکی ئیشوکاررەکان بوین و کۆبونەوەش هەروا بەردەوام بوو کۆنگرەکە زۆرسەرکەوتوبو زۆریش باش، بوو دیموکراتیانە باسی زۆر مەسەلە کرا ئەوەندە دلسۆزانە قسە دەکرا کە دەگەیشتە مەسەلەیەك باسێك لایەك وازی لەپێ داگرتن دەهێنا، یا بەکێکی کە تەداخولی دەکردو چارەسەر دەکراو نەدەگەیشتە مریشکە رەشە دەبوو لەدوای کۆنگرە سەردانی ئەوحزبانەش بکەین کەسەردان و بەشداری کۆنگرە بون، لە١١/٢١ پارتی پارێزگاران و حزبی رزگاری و کۆمەلەی نەنەوەیی سەردانیان کردین، لە١١/٢٢ هەرلەمەکتەبی سیاسی بوم لەهەولێر، لە١١/٢٣ حزبی زەحمەتکێشان سەردانیان کردین، لە١١/٢٤ حزبی ئەخای تورکمانی سەردانیان کردین هەروەها ئێمەش رەدی سەردانی پارتی کارمان کرد، لە١١/٢٥ سەردانی مام جەلال مان کردو سوپاسمان کرد بۆبەشدار بونیان هەروەها قسەش لەپەیوەندی دووقۆلیش کراو زۆربەی وەزیرەکان بەشداربون لەکۆنگرە لەبەر قەلەبالغی کاك سلێمان دانرابوو جێگا دیاری کراوەکان نەگۆرێ ئەویش وادیاربوو بەمامۆستا جەمال عبدولی وتبوو لەوێ دانیشە کاك ئەحمەد شەریف لەسەر ئەوە نارەحەت بوو

هەرەشەی لیّ دەکردین دەیوت کۆنگرەکەتان لیّ تێك دەدەم ئەوکات جێگری وەزیری ناوخۆ بوو کاك خورشید شێرەش پارێزگار بوو وادیاربوو لەپێشەوە دانیشتبوو لەسەر ئەوە لێمان عاجزبوون چۆن وەزیر لەدواوەو پارێزگار لەپێشەوە بەهۆی قەرەباڵغیەوە وای لێهاتبوو کاك شمس الدین مفتی و کاك صاڵح یا مام صاڵح شێرەش هاتن لەسەر دانیشتن ئەوانیش هەندێك زویر بون جگە لەوانە شتێکی کە روی نەداو یەکێتی نیشتمانی زۆربەی سەرکردایەتی و وەزیرەکان و مەکتەبی سیاسیان بەشداربون، لە١١/٢٦ لەمەکتەبی سیاسی بوم لەهەولێرسەعات(١٠)ی سەرلەبەیانی سەردانی کاك قادرعەزیزو حزبی زەحمەتکێشان و دوای نیورۆیش سەردانی کاك عمرئاغاو پارتی پارێزگاررانمان کرد ئەنجامی کۆنگرەو سوپاسمان کردن بۆ بەشداربون، لە١١/٢٧ سەردانی حزبی شیوعی و یەکگرتوی ئیسلامیمان کردو سوپاسی بەشداربون و ئەنجامی کۆنگرەمان پیّ ووتن، لەرۆژانی ٢٩و١١/٣٠ هەر لەهەولێر بوم، لە١٩٩٤/١٢/١ لەهەولێرەوە گەرامەوە بۆ سلێمانی بریاربوو کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی لەسلێمانی تەواو بکەین چونکە لەهەولێر لەبەر زۆر ی ئیشوکارەکان مەجال نەبوو، لە١٢/٢ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی دەستی پێکرد بۆدابەش کردنی ئیشوکارەکان لەسەر برادەرانی سەرکردایەتی بەم شێوەیە بوو کاك حسێن خەلیفە بۆ مەسئولی لقی سلێمانی و کاك محمد غفور جێگری لق، کاك سەلام رەوف بۆ مەسئولی لقی کەرکوك، کاك خورشید هورمزیار بۆ مەسئولی لقی هەولێر، کاك هوشیار بامرنی بۆ مەسئولی لقی دهۆك، لە١٢/٣ کۆبونەوەو دابەش کردنی برادەران تەواو بوو، لە١٢/٤ چومە گوڵەخانەو گەرامەوە بۆسلێمانی بەفر دەباری، لە١٢/٥ لەسلێمانی بوم بەفرێکی زۆر باری و دنیاسارد بوو هەموو کوردستانی گرتبوو هێشتا زستان نەبو ئێران و سوریاو لوبنان و ئەردەن و ئیسرائیلی بەفر گرتبوی هەواکەش زۆرسارد بوو نەوت کەم بوو سوتەمەنی بۆخەڵك

نەبوو.. لەکۆنگرە سەرفیاتێکی زۆرمان کردبوو وەزعی مالیمان باش نەبوو ئەو (٥٠٠)هەزار دینارەش حکومەت نەی داینێ و چەکیشیان داینێ دوای لە سەر داوای کاك سلیمان قەساب ورەزامەندی کاك کۆسرەت نەیان داینێ تائیدارەو مالیەی خۆمان ناردیان لەبازار پارەیان قەرز کرد کەسودیان بدەنێ(٢٥٠) هەزاریان قەرزکردبو چونکە مسارفێکی زۆرمان کردبو بۆ کۆنگرە کەموکوریەکان نەمانتوانی یارمەتی بدەین هەربارەگای (٥) هەزار دینار نەسریەمان دانێ حکومەت ئەو هەمو پارەیەی هەبوو ئێمەش خەریك بوو لەبازار پارە قەرز بکەین و بەو وەزعە ناخۆشە بزانن بەلام ئێمە بریارمان دابوو هەروا بەردەوام بین لەکاری خۆمان بەهەر شێوەیەك بووە ، لەسەعات (١٢)ی رۆژی ١٢/٦ زیاتر لە (٥٠)کەس لەپارێزەرو ماف پەروەرو خەلکی رۆشنبیری شاری سلێمانی هاتنە سەردانمان و قسە زۆر کرا لەسەر وەزعی کوردو میللەتەکەمان و ئەو بارودۆخەی تێدا بوین لە (٢)ی پاش نیوەرۆ بەرێ کەوتین بۆ دوکان و لەچنارۆك سەعات (٤) نانی نیوەرۆمان خوارد و بەرێکەوتین بۆ هەولێر لەگەل مامۆستا مەلا ناصح پێکەوە بوین لەو سەفەرەدا شەو لەهەولێربوین، لە١٢/٧ سەردانی کاك خورشید شێرە پارێزگاری هەولێرمان کرد، لە١٢/٨ هەرلەهەولێر بوم، لە١٢/٩ لەهەولێر بوم یەك سال بەسەر بریاری حکومەت و پەرلەمان بۆلێدانی سۆسیالیست تێپەری و ئێمەش سەرکەوتنی باشمان بەدەست هێناو هەمووشیان لەکۆنگرە بەشداربون و قسەی باشیان کرد لەهەموو رویەکەوە واتا بۆچونەکانی ئێمە راست دەرچون بۆیەش سەرکەوتین لەکارە سیاسیەکانی حزبدا، لە١٢/١٠ لەهەولێر بوم چەند کەسێك لەعەشیرەتی هەرکی هاتنە لامان یەکێکیان ناوی جەوهەر هەرکی بوو، لە١٢/١١ لەهەولێربوم حزبی نیشتمانی تورکمانی سەردانی مەکتەبی سیاسیان کرد پەیامێکی دکتۆر موزەفەر ئەرسەلانیان هێناو دەعوەتی حکومەتی تورکیاش بۆمان، لە١٢/١٢ کۆبونەوەی هەردوو مەکتەبی

سیاسی سۆسیالیست و یەکێتی هەبوو لەهەولێر کاك دکتۆر فوئاد معصوم و کاك دکتۆر کەمال فوئادو کاك مولازم عمرو کاك چەتۆ حەوێزی وکاك عمر فەتاح بون زۆر قسەکرا لەسەر پەیوەندی نێوان هەردوولاو هاوکاری ودۆستایەتی لەوکاتەدا کاك کۆسرەت سەفەری بۆ دهۆك کردبوو لەسەرنامەی کاك مەسعودبارزانی بۆ گەرانەوەی پارە بۆ حکومەتی هەرێم وتیان بەرای ئێوە ئەو پارەیە هەموی تەسلیم دەکاتەوە پارتی منیش ووتم نیوەشی تەسلیم ناکاتەوە ئەگەریش بیکاتەوە ئەوەندە دەدات بەشی مەعاش بکات یاهەر نایدات ئەقلیان قسەکەی منی نەدەبری وتیان تۆبلێت ئەو ئاشتیەو کابینەی سێهەمی حکومەت جێگر ببێت من وتم ئاشتی نابێت و شەریش دەبێتەوە ئەوەشیان هەرپێ خۆش نەبوو وادیاربوو ئەوماوەیە هەندێك کۆبونەوەو قسەکرابوو قەناعەتیان کردبوو ئەوەبو بەکاك کۆسرەت یان وتبو لە دهۆك پارە نەماوەو هەموی سەرف کراوە ١ملیون پارەی ئاسن وردە ماوە کاك کۆسرەت نەی هێنابو گەرابوەو دوای قسەو ئەوانە وتمان ئەوە لەو کۆبونەوانەی نێوان ئێوەو پارتی و بریاریش دراوە زۆری حزبەکان بەشداری بکەن لەحکومەت و ئەوەش پارتی پێ ی داگرتووە لەسەر بزوتنەوەی ئیسلامی کەدۆستێتی واتە دوستی پارتیە ئەی ئێوە بۆئێمە چیتان کردووە قسەتان کردوە و باستان کردووە بۆبەشداری ئێمەکاك مولازم عمروکاك عمری سیدعلی هەمو برادەران وتیان قابیلە سۆسیالیست بەجێ بێڵین سۆسیالیستی هەرتێدا ئەبێت و کاك دکتۆر کەمال فوئاد دەستی راکێشا بۆ برادەرانی مەکتەبی سیاسی خۆیان و وتی ئەومەسەلەیە پەیوەندی بە منەوە هەیە من بەرپرسی پەیوەندیەکانم من لەگەڵ برایانی پارتی قسەم کردەوە پارتی نارازی بون بۆسۆسیالیست خۆئێمەش ناکرێت پرۆسەکە رابگرین وەلامی دایەوەو زۆرلەسەرخۆ وەکو مرۆڤێکی ئەوروپی زۆر راست گۆیانە ووتی ئەوەی راست بێت ئێمەو پارتی واتە یەکێتی وپارتی لەسەرئەوە پێك هاتین

لەکابینەی سێهەمی حکومەت دا حزبی سۆسیالیست بەشدار نەبێت تورەش بولەبرادەرانی خۆیان وتی بۆلەخۆتانەوە وەلاّم ئەدەنەوە ئێمە وسۆسیالیست دۆستین بۆراسیەکانیان پیٚ نەلّین و هەرلەسەرئەوە رێکەوتین لەم کابینەی سێهەمدا سۆسیالیست بەشدار نەبێت برادەرانمان وەلاّمەکەیان لاسەیر بوو منیش ووتم زۆر مەمنون دەبین کاك کەمال بۆئەوەی راستیەکەیت پیٚ وتین وبۆئەوەی چاوەریٚ نەبین حسابی خۆمان بزانین برادەرانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی سەیرێکی یەکیان کردو وەکوئەوەی کاك دکتۆر کەمال ئەم قسیەی بۆ ئاشکراکرد برادەرانی خۆمان وتیان باشە ئیتر دۆستایەتیمان بۆ کەیی و بۆچی کەئێمە ئەوەندە هاوکاری ودۆستایەتی یەکێتیمان جێگا نەگرێت هەرهیچ نەبوایە تەرحیان بکردایە بۆبەشداربون خۆئێستا کێشەمان لەگەلّ پارتی تەواو بووە چۆن ئەوان لەسەردۆستی خۆیان پیٚ دادەگرن بائەمانیش لەسەرئێمە پێیان داگرتایە بەهەرحالّ وەلاّمی خۆمان وەرگرت و وتمان شەرت نیە هەر لەحکومەت بالەبوارەکانی کەدا بەشداربین و هاوکاری بکرێین کۆتایمان بەکۆبونەوەکە هێنا، لە١٢/١٣ هەر لەهەولێربوم، لە١٢/١٤ لەسەر داوای حزبی زەحمەتکێشان کۆبونەوەیەك کرا لەمەکتەبی سیاسی حزبی زەحمەتکێشان لەهەولێر هەولّدان بۆچەسپاندنی ئاشتی وترساندن لەوکۆبونەوە دووقۆلّیانەی پارتی و یەکێتی لەسەر حسابی حزبەکانی کەو بێبەری زۆریان لەوکابینەی سێهەمدا وەجبەیەکی کەی شەری ناوخۆی یەکێتی و پارتی، لە١٢/١٥ لەهەولێرەوە گەرامەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ١٦و١٢/١٧ هەرلەسلێمانی بوم سەرقالّی ئیشوکاربوین، لە١٢/١٨ لەسەر بروسکەی کاك مەسعودبارزانی رۆیشتمە هەولێرو بۆصلاح الدین بەوەفدێك سەردانی مەکتەبی سیاسی پارتیمان کردو کۆبونەوەیەکی دووقۆلّی من وکاك مەسعونکراولەسەر روداوەکان قسەمان کردو پاشان هەردوو مەکتەبی سیاسی مەسەلەی دۆستایەتی و

هاوکاری و گەرانەوەی بارەگاکانی ئێمەش بۆسنوری دهۆك وئێمە هەموو ئامادەیەکی خۆمان پیشان دا بۆهاوکاری تەواو لەگەڵ پارتی و دۆستایەتی وبرایەتیمان پیشان داو ئەوانیش هەروا ئامادەیی خۆیان پیشان دا هەر لە١٢/١٨ وەزعەکە زۆر ئالۆز بوو من زۆر قسەم لەگەڵ کاك مەسعود کرد لەورووەوە کاك مەسعود دەیوت ئەم جارە خۆم دەچمە شەرەوە وە ووتی صدام حسێن و هەموو کەس قبولْ دەکەم بەلاَم جەلال قبولْ ناکەم من زۆر قسەم لەگەڵدا کرد کەشەرەکە گەورە دەبێت و لەدەست دەردەچێت ووتی کەرامەتی پارتی شکاوە لەکەلارو کفری ودەربەندیخان ئالاَی پارتی یان دا گرتوە و خستویانەتە ژێر پێوە کورد چیە من سەرکەوتنی کورد لەپارتیەوە دەبینم کە هەزاران شەهیدی داوە زۆرنارەحەت بوو بەتایبەتی یەکێتی لەسەرشەقلاوەش دەستیان بەسەرداگرتبو کاك مسعود زیاتر لە شەقلاوە کە رێگای هاتوچۆی پارتی گرتبو دووجار وتی ئەم جارە خۆم ئەچمە شەرەوە وئەوناحەقیە قبولْ ناکەم پاشان من گەرامەوە برادەرانی یەکێتی وتیان سەردانت کردووە وادیاربوو رادیۆ باسی کردبوو ووتم بەلْێ وتیان رەئی کاك مەسعود ووتم وەلاَ باشەو ئامادەیە بۆ رێکەوتن وئامادەیە کێشەکان چارەسەربکەن وقسەکانی هەموی دۆستانەو باش بوو، لە١٢/١٩ لەهەولێرەوە گەرامەوە بۆسلێمانی وشەودرەنگ گەیشتمە سلێمانی.. هەرلە١٢/١٩ پارتی پەلاماری شەقلاوەی داو گرتی بارەگاومالْی مام جەلال و بارەگای یەکێتی سوتان و کوژراو هەبرو پێدەچو کاك مسعود خۆی سەربەرشتی ئەوشەرەو گرتنی شەقلاوەی کردبێت، لە١٢/٢٠ لەسلێمانی بوم، لە١٢/٢١ لەسلێمانیەوە چومە دەربەندیخان بۆچارەسەری کێشەی پارتی و یەکێتی هەموو بارەگاکانی پارتی لەکەلارو کفری و باوەنور گیرابوو بەلاَم لەدەربەندیخان خۆیان چۆلْیان کردبوو زۆریان چوبونە بارەگاکانی یەکێتی و زۆریان خۆیان شاردبووەوە ئێمەش چوین هەندێك هەولْماندا بۆچارەسەری کێشەکان لای

پارێزگار و ئەوانەی لەوێ بون لەولاشەوە پارتی هێزێکبان لەمەڵەبجەی تازە ئامادەکردبۆشەر، لە١٢/٢١ چوینە دەربەندیخان بۆپرسەی عبدالقادر عبدالکریم وپاشان چوینە پارێزگاو چاومان بەکاك ئەبوشەهابی پارێزگار کەوت و کاك عیماد ئەحمەد بەرپرسی مەڵبەندبوو بارەگاکانی پارتی لەدەربەندیخان و کەلارو کفری هەموی گیرابوو لەسەر شەقلاوە پارتیش بەتەمای پەلاماری هەولێربوو لەدوای شەقلاوە لەتوڵەی ئەو ناوچانەی کەدا ئێمە هەموو ئەو پارتیانەی گیرابون لەدەربەندیخان داوامان لەیەکێتی کرد هەرچی گیرابو بۆیان بەردابن سەید عبداللەی کەردزی کۆن سۆسیالیست بووبەرپرس بولای پارتی سەری لێدام و بەکاك صابرفقیانی دا وەلامی ناردبو کە ئاگایان لەخۆیان بێت لە ١و٢شەودا پارتی دەست بەسەر هەولێردا ئەگرێت لەوێ لەهەولێر پێیان وتم قەڵەبالغ بو لای کاك ئەبو شهاب یش یەك دووکەس باسی کرد کاك ئەبو شەهاب لەمنی پرسی وتم شتێکی وا باس کراوە کاك ئەبو شەهاب وتی وەلا خۆشمان معلوماتێکی وامان هەیە رای تۆ چیە وتم باوەر ناکەم شتی واهەبێت وتی من خۆشم شتێکم بیستوە ئەوە حەتەرە و ئێستا ئەرۆم بۆلای مام جەلال وتم تۆ ئەو پارتیانەی ئێرەم بۆ بەردە کەگیراون لەگەڵ کاك عیماد ئەحمەددا وتیان هەرچی لە کەلاروکفری وباوەنور گیراوە هەر ئێستا هەموی بەرئەدەین بەلام لەدەربەندیخان کەسمان نەگرتوە خۆیان لە ترسا بارەگایان چۆڵ کردوەوهاتونەتە بارەگاکانی یەکێتی وتومانە بۆ بارەگاتان چۆڵ کردوە وتویانە ئەزانین هەر دێنە سەرمان وتومانە باکەس نەکوژرێت خۆمان چۆڵی بکەین و رۆیشتن منیش گەرامەوە بۆ سلێمانی وەزعەکە ئاڵۆز بوو نزیکەی (٨٠٠)پێشمەرگەی پارتی لەناوسلێمانیدا بون، لە١٢/٢٢ وەزعەکە بەرەو شەرێکی گەورەتر دەرۆیشت ئێمە هەر لەهەولوتەقالادا بوین کاك عارف تەیفور بەرپرسی هەردوولقی سلێمانی و کەرکوکی پارتی بوو لەماڵێك بولای مەجیدبەگ یەکێتی دەوریان دابوو تەقەیان

لەماڵەکە کردببوو تەلەفۆنی بۆمن کردو زۆریش تەلەفۆنیان کرد منیش کاك حسێن خەلیفەم نارد و تەقەیان لەسەیارەکەی کاك حسێن خەلیفەیش کردبو پاشان کاك حسێن تەلەفۆنی کرد وتی وەزعەکە خەتەرەو کاك عارف ووتی ئەگەر خۆت نەیەت ناتوانم دەربچم من لەگەڵ سەیارەکانی خۆم برادەرانی یەکێتی دەیان ناسی چوینە ماڵەکە ماڵی سلێمان ئاغا یاکاك بارام ئاغا بوو من ووتم دەگەرێمەوە ووتی، تۆ برۆیت دێنە سەرمان من بگەیەنەوە لقی (٤) کاك عارف و ئەو برادەرانەی لەگەڵیدا بون بردنمەوە بۆ لقی (٤) کەرۆیشت لقی چواریش تەقەی لێ کرابوو من چومە لقی چوارو هەموو هێزەکەی پارتی رەنگیان گەشایەوەو تکایان دەکرد رێگا نەدەم شەر ببێت تەلەفۆنم بۆمام جەلال کرد سێ جار کەنەچنە سەریان لەلقی چوار من ووتم دەچمە ماڵەوە بە کاك عارفم وت یالەگەڵ من وەرە یاهەرچی هەبوو ئاگادارم بکە لەوکاتەشدا کاك شێخ محمد بەرزنجی هات و لەوێ قسەمان کرد کاك عمری سەیدعەلی دووسێ جار تەلەفۆنی کرد بۆمن ووتی برۆرەوە ماڵەوە ئیسراحەت بکەو سەعات (٤) لەپارێزگا کۆدەبینەوە وکاك عارف و ئەوانیش بێن چارەسەری کێشەکان بکەین کاك عارف و کاك نەبەز وئەوانی کە وتیان ئەوە بۆ ئەوە وادەلێن تۆ برۆیتە دەرەوەو پەلاماری لق بدەن دووسێ سەعات دانیشتم بەدیاری کاك عارف و لقی چوارەوە بۆئەوەی یەکێتی نەیەتە سەریان پاشان کاك عارف وتی لێرە بەجێم مەیەڵن وتیان بۆ کوێ ووتم وەرە ماڵی ئێمە وادیاربوو کاك عارف پێی خۆش نەبوو یاماوەیەك پێش ئەوە پارتی شەریان کردوین وتی بابچینە ماڵی کاك شێخ محمد بەرزنجی کاك شێخ محمد بەمنی ووت ئێمە کەسمان لێرەنیەو ئەگەر تۆ نەیەت ئەم پیاوە لەماڵی ئێمە بیگرن ووتم باوەر ناکەم یەکێتی شتی وا بکەن بەڵام دەچینە ماڵی ئێمە پاشان چوینە لای ماڵی کاك شێخ محمدو لەوێ ماینەوەو پاشان برادەرانی یەکێتی هاتن و تەلەفۆنم بۆمام جەلال کرد لەسەر وەزعەکەو کاك عارف

لەگەڵ مام جەلال قسەی کرد هەموو لایەنەکان کۆبوینەوە لە١٢/٢١ لەماڵی کاك شێخ محمد بەرزنجی دا، لەرۆژانی ٢٢و٢٣و٢٤و١٢/٢٥ نەوەستاین بۆنێوبژیوانی دوای نیوەرۆ یەکێتی هێرشی بۆسەرلقی (٤) کرد من تەلەفۆنم لەگەڵ مام جەلال کرد رای وەستان پارتی هێزێکی گەورەیان لەشاردا بون بەلاَم زۆر دەترسان دوای نیوەرۆی ١٢/٢٣ دکتۆر ئەحمەد چەلەبی و کاك جەوهەر نامیق وکاك کەمال فوئاد کە سەرۆك و جێگری پەرلەمان بون هەردووکیان هاتنە سلێمانی و سەری لای ئێمەیان داو چون بۆلای مام جەلال کاك عارف لەگەڵ ئەوان رۆیشت بۆقەلاچۆلان وئێمەش زیاتر لە(١٠٠)جار لەلقی چوارەوە تەلەفۆنیان بۆ من دەکرد دەبووبرۆم بۆئەوەی یەکێتی وازیان لێ بهێنێ زۆرماندوو بوین کاك نەبەز لەلقی چوار داوایان کرد کەئاگاداری یەکێتی بکەین نەچنە سەریان، لە١٢/٢٤ لایەنەکان هێزێکی هاوبەشمان دروست کرد بۆنێوان پارتی و یەکێتی لەناوشار پارتی لەلای ئازادی و توی مەلیك وسەرەوە بون و دامەزرابون یەکێتیش دەوری دابون لەناوشاردا تائێوارە دەیان جار تەلەفۆنیان کرد کەئەو خروقات دەکات هەردوولا توش ببون و هەردوولایەنیش حەزیان نەدەکرد شەربکەن لەناوشاردا بەلاَم سەرکردایەتی پارتی بروسکەکانیان دەیانوت شەربکەن چونکە یەکێتی پەلاماری بارەگاکانی ئەوانی داوە لەهەولێر پارتیەکان هەتا تەلەفزیونەکەیان باسی ئاشتی و هاوپەیمانی یەکێتی دەکردلەسلێمانی و لەسەرەوەش رادیۆکەیان جنێوی دەدا، لە١٢/٢٥ یەکێتی پەلاماری هێزەکەی پارتی دا لەهەڵەبجەی تازەو شکاو کوژراوی هەبوو هەڵهاتن بەپەلە پروزە بەرەو هەڵەبجەو سەیدصادق لەورۆژانە زۆرماندوو بوم کەشەر نەبێت لەناوشاردا هەرچەندە (١١)کوژراو (٤٦)بریندار ببون بەپێی راپۆرتی دکتۆرەکانی نەخۆشخانەکان لە سلێمانی هەرباشبوو کەشەر نەبێت زۆری خەڵك ئاسایی بوون لیژنەیەکمان لەهەمو حزبەکان ناردبوو بۆهەڵەبجەی تازە کاك حسێن خەلیفە لەسۆسیالیست وکاك مەلا

عمر ئەحمەد لەبزوتنەوەو کاك حمە شوان لەحزبی شیوعی و کاك شەوکەت حاجی مشیرلە یەکێتی چوبونە ماڵی کاك رەسول وکاك رۆبیتەن لەزەرایان حەیوانێکیان سەربری بوو وتبوبیان تازە عەیبە نان نەخۆن کاك شەوکەت حاجی مشیر وتبوی ئەوماڵە نانیان دروستکردوە دوای نان خواردن ئەرۆین وچارە سەری ئەکەین تائەوان حەیوانەکەیان خوارد یەکێتی پارتی لەهەڵەبجەی تازە پاك کردەوەوپارتی (٧)کوژراوی هەبوو چەند کەسێك لەیەکێتی کوژراو هەبوو هاتنەوە ونیان تائێمە چوین شەرەکە تەواو ببوو ووتم بابەگیان ئێوە هەربۆ ئەوەچون دەعوەت بون و ئەجەلی ئەومەڕەی کاك رەسول هاتبووخۆ ئێوەش خۆشتان دەتانزانی مەشغوڵ کراون تاشەرەکەو نان خواردنەکە پێکەوە تەواو بون ودوای لەهەڵەبجە بێ پارتیان پیشان دابون، لە١٢/٢٦ هەموو حزبەکان بەپارتی و یەکێتیشەوە لەماڵی ئێمە دانیشتین چی بکەین باشە لەکۆبونەوەی رۆژی ١٢/٢٧ یەکێتی (٣) خاڵیان دانا بۆپارتی بەم شێوەیە: ١-پارتی شاری سلێمانی چۆڵ بکەن. ٢-یائەوانەی لەسلێمانین بڵێن لەماڵی خۆمانین و حزبێکی سیاسی یاپارتی نین. ٣-باپەلاماریان دەدەن و بەشەردەریان دەکەن و شاریان پێ چۆڵ دەکەن. هەردوولا ترسیان لەشەرهەبوو یەکێتی پێیان ناخۆش بوو شەربکەن لەناوشاردا و لەناوسلێمانی پارتی بەرەنگاری بکات و یەکێتی لەدهۆك نەی توانیوە بەرەنگاری بکات پارتیش دەترسان لەشار دەرنەچن و هەموویان و هێزەکە لەبەر یەك هەڵوەشێ و سەرکردایەتی پارتیش دەیویست لەسلێمانی پارتی یەکێتی مەشغوڵ بکات تائەوانیش پەلاماری هەولێر بدەن یەکێتیش ئاگای لەوەی پارتی بوو بۆهەولێر و پێشتر بۆشیەقلاوە دەترسان لەسلێمانی مەشغوڵی شەرببن و هەولێریان لەدەست دەربچێت ، لە١٢/٢٧ لیژنەیەکمان نارد بۆلای سەیدصادق بۆنێوان یەکێتی و پارتی هێزیکی پارتی کاك نادر هەورامی و کاك نوری حمەعلی لەدوای شکانی هێزەکەیان

له هەڵەبجەی تازە رۆشتبوە لای کاک نادروئەوانەی هەڵەبجەی کۆن و هێرشێکان کردبو تادەوری گرێزەو کانی پانکە هاتبون کاک عارف تەیفوریش ووتی بامنیش برۆم بۆلای برادەران و پێیان بڵێم شەر نەکەن ئێمە زانیمان خوا خوایەتی خۆی دەرباز بکات ئەویشمان نارد لەگەڵ کاک حسێن خەلیفەو هەندێك لەئەندام لقەکان هەرگەیشتنە لای کاک نادرو هێزەکەی ئەوان کاک عارف گۆراو قسەی دەکرد دەیوت سلێمانی دەگرم و قەلاچۆلان دەگرم و وادەکەم و بەهەرحاڵ هێزەکەی لێرە بەجێ ماوخۆی گەیشتەوە ناوچەی دورلە ئابلۆقەی یەکێتی لەکۆبونەوەی رۆژی ١٢/٢٧ (٣) خاڵ دیاری کرابوو بۆیان و پارتی قبوڵیان کردلەشاردەرچن و لەشاربازێرەوە (٨٠٠) کەس بەچەکەوە نزیکەی (١٠٠) سەیارەشیان پێ بوو دوای هاتنەوە لای من و پەشیمان بونەوەو وتیان لەرێگا سبەینێ کەمینمان بۆ دادەنێن و سەروماڵ تیادەچێ باشە چی بکەین وتیان بەسەیارە لەجادەوە بەمەرجێك تۆ لەگەڵمان بیت شەو لەگەڵ یەکێتی و لایەنەکان کۆبوینەوە کاک مولازم عمرو کاک عمری سەیدعەلی و زۆری کەش هاتنە ماڵی ئێمە بابەسەیارە برۆین و بیان گەیەنین پارتی دەترسان یەکێتی کەمینیان بۆدانێ ویەکێتیش دەترسان لەناوسەیدصادق یاعەربەت دابەزن و نەرۆن داوای هێزەکانی کەشیان بکەن لەهەڵەبجەو بێن بەدەمیانەوە کاک عمرسەیدعەلی ووتی باشە بابەسەیارە برۆن بەلاّم بە دوووەجبە و دەبێت دەرزی تفەنگەکانیان دەربهێنن و لەوێ بیان دەنەوە بەراستی پێکەنینم دەهات ووتم کاک عمر ئێمە چۆن دەتوانین ئەو هەموو دەرزیە دەربکەین و لەوێ هەموی دەگۆرێ شتی واکەی هەیە یەك ودوان نیە (٨٠٠) کەسە واتە (٨٠٠) دەرزی تفەنگمان چۆن بۆ دەردەچێت قسەی واخۆش و عەنتیکەم نەدیوو نەبیستبوو تائەوکاتە دەکرێت یەك و یادوو کەس بەلاّم ئەو هێزە گەورەیە چۆن دەبێت پارتی ئامادە بوو هەموو دەرزیەکان دەربکەن وتیان ئەوە ئیهانەیە بەلاّم بۆئەوەی خوێن نەرژێت ئەوەش

دەکەین پارتی وتیان لۆریمان بۆبهێنن کاك سوارە ئاغای برای کاك فەتاح ئاغا لۆریمان بۆ بهێنێ و چادری بەسەردا بدەن باکەس نەمان بینێ منیش ووتم بەکۆستەرو ئێمەش لەگەڵتان دەبین و ئالآی شین دەکەین بەسەیارەکانتانەوەو دەتان بەین پارتی لەسەعات (١٢)ی شەوی ٢٧-١٢/٢٨ بریاریان دا کەداوای یەکێتی قبولٚ بکەن و شاربەبێ تەقە چۆلٚ بکەن بەمەرجێك ئێمەشیان لەگەڵدا بین بۆ دەرکردنیان پارتی هەموو جامانەی سوریان لابردبوو زۆریان قوماشی شینیان بەچەکەکانیان و سەیارەکانیانەوە بەستبوو بە (٢٢) پاص لەگەڵ سەیارەکانی خۆیان و یەك دوو لۆریش بەیانی هەندێکیان بە تایبەتی کاك ئەنوەری حاجی عسمانی قەریلە دەیانوت گابار ناکەن لەلۆری دا قسەیان بەسەرکردایەتی پارتی دەوت ئێمەش وتمان لەسەر داوای خۆتانە نارۆن ئارەزوتانە من دەرۆمەوە هەرمنیش بەجێم بهێشتایەن شەرەکە دروست دەبوو من جارێ لەپێشەوە ودواوەو لەناوەراست و دوای لەدواوە مەسئولەکانیان لەناو سەیارەی پێشمەرگەی دەستەی خۆمدا پیکابەکان سوارببون لەسەیارەی خۆم هەمویان پربون تاگوندی قەدەفەری لەگەڵیان رۆیشتم و برادەرانی حزبی شیوعی و کاك شێخ محمد بەرزنجی یش لەگەڵیان بوو لەو سەفەرەدا لەچەند جێگایەك یەکێتی پێشمەرگەیان دانابوو بەلآم چاویان بەمن دەکەوت دەچونە دواوەو رێگاکانیان چۆلٚ دەکرد واتە پارتی ناچار کرا سەرلەبەیانی ١٢/٢٨ ئەوبریارەی یەکێتی قبولٚ بکات و شاری سلێمانی چۆلٚ بکەن بەرەو هەڵەبجە بەرێمان کردن بەناو خەڵکی ناوچەکاندا پارتی زۆر بێ دەسەلآت بون وزۆرداماو بون و زۆریش دەترسان ئێمە ئەوەی لەدەستمان هات کردمان کاری چاکەو هەنگاوی باش بۆچارەسەری کێشەکان یاخوێن نەرژێت ئەوەی شەرنەبوو لەناوشاری سلێمانی دا بۆیەکێتی و پارتی و خەڵکی شارو کوردیش باشبوو من لای خۆمەوە مورتاح بوم هەرچەندە دوای ئەوە پارتی زۆر دژایەتیان

کردین هەر رۆژەی گێچەڵێکیان پێ دەکردین، بەڵام خوا ئەزانێ من بومایەوئەو(٨٠٠)پێشمەرگە شەرکەری وەکو ئەو هێزەم لابوایە خۆشم تیابچومایە شاری سلێمانیم چۆڵ نەئەکرد لەرۆژی ١٢/٢٨ لەهەولێر تاحاجی عمران شەربەردەوام بوو لەناو شاری هەولێر یەکێتی موسەیتەر بون و پارتی وەزعیان خراپ بوو، لە١٢/٢٩ بزوتنەوەی ئیسلامی ناردیان سەری هەڵەبجە بدەم و لەوێش سەری بارەگای پارتیم داو(١٠) کەسی پارتی خزمەکانی وحمایەکانی کاك عارف تەیفور وکاك سەرحەد یاشێخ محمد بەرپرسی ناوچەی دوکانیان لەگەڵمان هاتن یەکی کۆڵێ پەرۆی شینیان بەستبوو بەتفەنگەکان و سەیارەکەیانەوە تاهەڵەبجە پاشان شەو گەرامەوە بۆسلێمانی، لە١٢/٣٠ لەسلێمانی بوم چومە دوکان و بۆکۆیە لەوێ سەردانی مام جەلالم کرد پاشان بەرەو هەولێر بەرێ کەوتم لەرێگای قوشتەپەوە هەموو لایەنەکان بوین لەو سەردانەدا، لە١٢/٣١ دوا رۆژی ساڵی ١٩٩٤ لەمەکتەبی سیاسی بووم لەهەولێر یەکگرتوی ئیسلامی سەردانیان کرین پاشان ئێمە گەراینەوە بۆسلێمانی لەرێگای گەرانەوە لەکۆیە لامان دا بۆلای مام جەلال و لەسەر وەزعەکان قسەمان کردو شەو گەراینەوە بۆ سلێمانی شەری برا کوژی لەهەموو ناوچەکانی کوردستان بەگەرمی بەردەوام بوو کوشتار زۆر بوو وەزعەکە یەکجار ناخۆش بوو چونکە ئەوشەرە لەداهاتودا هەموو لایەك دەگرێتەوە ئەگەر وابروات...یەکێتی لەکەرکوك و سلێمانی و هەولێر سەیتەرەی کردبوو پارتیش شەری پێ نەدەکراو پارتی شارەکانی چۆڵ ئەکرد مام جەلال خۆی چوبوە شاری کۆی سنجاق لەنزیکەوە سەربەرشتی شەرە کانی ئەکرد رۆژانە حزب ولایەنی سیاسی شەخسیات و کۆمەڵەی جۆربەجۆرو رۆشنبیرو هونەرمەند هەموو چینو تیۆژێکی ناو کۆمەڵگادا وولاتان و خێر خوازان رویان لە مام جەلال ئەکرد ئەگەر تەنها یەك کەسیش بوایە مام جەلال دەیوت کاغەزی سپیتان بۆ ئیمزا ئەکەم بۆ

وەستاندنی شەر ئامادەی خۆی پیشان ئەدا تا دانیشتەکە تەواو دەبو لەگەڵ وەفدی ئاشتی خوازدا دووسێ جار دەچوە ژورەکەی ئەودیو بۆ هەواڵی بەرەکانی شەرو سەیرکردنی بروسکەی جیهازەکان وەلأمی ئەدانەوە تەوجیهاتی ئەدانێ ولەکوێوە هێرش بکەن گەر لە جەبهەیەك بشکایەن لێیان تورە دەبو قسەی پێ دەوتن دەبێت جێگاکانی خۆیان بگرنەوە ئەگینا تەجمیدودەرکردن بوو لە دوای ئەو هەموو شەروهەرایە سوپاسی سەرکەوتوەکانی دەکرد هەموی لە ماوەی ٣تا ٤دەقیقەدا بە پێکەنینەوە دەگەرایەوە ژورەکەی لای میوانەکان هەر چی ئێوە ئەڵێن بۆ وەستاندنی شەر یەکێتی نیشتمانی ئامادەیە بەلأم برۆن قەناعەت بە کاك مسعودو پارتی بکەن شەر رابگرن بەلأم کاك مسعود بە پێچەوانەی مام جەلال بوو دەیوت شەر راناگرین یەکێتی هەولێریان داگیر کردوە چۆڵی نەکەن شەر ناوەستێنین بەلأم من رام وابو شەرەکە بە قسەی حزب وخەڵکی کوردستان وکەسو کاری شەهیدان ئەگەر هەموشی خۆی بنێتە قور باکیان لێ نیەو شەر ناوەستێنن تاخۆ یان ماندو نەبن ودەستی ولأتانی دراوسێ ی عێراق وکوردستان نەیەتە شەرەکەو ببێتە شەری ئێران وعێراق وتورکیا وتەداخولی نێو دەوڵەتی نەبێت ئەوکات بەرژەوەندی ئەو ولأتانە لەعێراق وناوچەکە کەوتە خەتەرەوە شەرەکە گەورە تربو لەئێستا رائەگرێت کاتێك لە١٩٩٥ئێران بە ئاشکرا هاتە ناو شەرەکەوەولە ٣١ی ئابی ١٩٩٦عێراق بەئاشکرا هاتە ناوشەرەکەوە وکاتێك تورکیا لە١٩٩٧بە ئاشکراهاتە ناو شەرەکەوە هەردوولایەنی شەرکەریش زانیان لەبەینی ئەوسێ دەوڵەتە عێراق وئێران وتورکیا شەریان پێ ناکرێ و ماراسۆنەکانی ٩٦و٩٧سەنگی مەحەك بون و پارتیش هەدەفی ئەسلێ شاری هەولێری بەتەوازنی سیاسی وئیداری وئابوری و کومەلایەتی و جەماوەری وجوغرافی دەزانی بەدەستی هێنابوە لە ٣١\ئاب بۆیە ئێستا کاتی وەستاندنی شەرهاتەوە جەماوەری کوردستان

وحزبە سیاسیەکان و کەسوکاری شەهیدانیش داوابکات شەربکەن تازە نایکەن ، بەردەوامی شەروگەورەبونی لەسالی ١٩٩٥ و بزوتنەوەی ئیسلامیش هاتە شەرەکەوەو حزب اللەو پارتی ویەکێتی ودەست تێوەوردانی ولاتان.

## سالی ١٩٩٥ و روداوەکانی

سەری سالی تازە یاداشتەکانم هەروەکوجاران گورانی بەسەردا نەهاتووە بەلام چەند خالێکی کەمو ورد نەبێت، لە١٩٩٥/١/١ هەموو سالێك ئاهەنگ و خۆشی بەلام وادووسالە لەکوردستان شەرو هەراو کوشتن و برین هەیە پارتی هێرشیان کردبوو تاکانی پانکەیان گرتبوو یەکێتی بۆیان چون و کاك نەوشیروان مستەفا قیادەی دەکرد پارتی شکا ئەکەرەم عەلی هولەسمتی کەقائیمقامی هەلەبجە بوو لەشەرەکەدا کوژرا لەکانی پانکە لەکاتی قائیمقامی دا چەند کەسێکی کوشتبوو لەناو سەیارە تەقەی لێ دەکردن خەلکی زۆر ئازاردەدا لەوناوچەیە بەلام پێم ناخۆشبوو لەشەری ناوخۆدا شەهیدبێ ، پارتی لەهەولێرو سەیدصادق و هەموو لایەك شکان بزوتنەوە وپارتی لەهێرشی سەر سەیدصادق پێکەوە بون لەوشەرەدا لای تەپە رەش قادرکۆکۆیی کوژرا...قادر کۆکۆیی یەکێ بوو لەجەلالیە کۆنەکانی ١٩٦٣ و پیاوێکی زۆر ئازا بوو لەجەلالی کۆن ئامر بەتالیون بوو ئەتوانم بلێم ئازا ترین کەسی، سەردەمی خۆی بوو وەحمەی کوێخا کەریم کۆکۆیش هەریەکێك بوو لەئازاکان بەلام قادر هەمیشە سەرکەوتبوو لەشەرەکاندا وەپیاوێکی بەشەخسیەتی ناوچەکەش بوو تەمەنی زۆر بوو بەلام هەر لەشەرەکان وەکو گەنجێك بەشدار دەبوو چاوی چەند جارێك بریندار ببوو یا رومانەی خۆی پیا تەقیەوە کاك قادر لەهەلەبجەو سنورەکە خەلکی زۆری پێوە دەنیشتەوە کادرێکی بەتواناو لێهاتبوو پێم ناخۆش بۆ کاك قادر من بۆ هەموو کەسێکی ئازا پێم ناخۆشە تیابچێت ئەگەر دوژمنی کوردو حزبە کەشم بێت بەتایبە تی پیاوێکی ئازای وەکوقادر کۆکۆیی

لەکارەساتی شەری ناوخۆی کورد کوژرا، ساڵی ١٩٩٥ مان بەشەر کردەوە وەکو ساڵی ١٩٩٣ و ١٩٩٤ کەهەلومەرجەکەی یەکجار ناخۆش کردبوو، لەرۆژانی ٢و١٩٩٥/١/٣ لەسلێمانی بوم، لە١/٤ وەفدێکی ئێران لامان بوون داوایان کرد بیان نێرین بۆهەولێر بەرێمان کردن بۆئاشتی نێوان یەکێتی و پارتی هاتبون، لە١/٥ لەسلێمانیەوە چومە گوڵەخانە پارتی داوای چاوپێکەوتنیان کردبوو کاك محی الدين رەحیم هات و وتی لەسەر داوای کاك مەسعود هاتوم بۆئەوەی هاوکاری نێوانمان زیاتر بێت، لە١/٦ مامۆستا مەلاعەلی عبدالعزیز وکاك مەلا ئەحمەد ئێلاَن پێ و چەند کەسێکی کەی سەرکردایەتیان و وەفدێکی ئێران سەردانیان کردبن و لەسەر وەزعەکان قسەمان کردو دۆستایەتی هەردوولاو داوایان دەکرد هاوکاری نێوان بزوتنەوەو سۆسیالیست زیاترو پتەو تربێت.. هەمان رۆژ کاك شێخ کامیل شێخ عبدالقادری چوێسەش سەردانی کردین، هەر لە١/٦ یاهەموو ساڵێك رۆژی دامەزراندنی سوپای عێراقە بەلاَم سوپای عێراق هەمیشە میللەتەکەی خۆی سەرکوت کردووە لەبەر ئەوە کەس زۆر رێز لەورۆژە ناگرێت، لە١/٧ لەگوڵەخانە بوم ، لە١/٨ چوینە تەپەتۆڵەکە بۆپرسەی کاك محمود حسێن..کاك محمود کورێکی هەبوو خۆی ئامێری مۆسیقای دروست کردبوو لەلادێ و لەناو چوار دیواری قوردا کەمانجەو هەموو ئامێرەکانی دروست کردبوو هەموو ئەندامانی ماڵەکەی فێری ئەو ئامێرانە کردبوو لەو گوندەدا باشترین مۆسیقار هەبوو ئێواران هەمویان دەستیان پێ دەکرد و گوندەکەیان راهێنابوو کاتی خۆشی مقابەلەی تەلەفزیۆنی کران پاش پرسەکە گەراینەوە بۆگوڵەخانەو پاشان بۆسلێمانی، لە١/٩ هەرلەسلێمانی بوم شەری نێوان پارتی و یەکێتی هەربەردەوام بوو کۆماری ئیسلامی ئێران داوای دوو وەفدی یەکێتی وپارتی کردبوو بۆئێران بۆ راگرتنی شەرەکە کاك نێچیرڤان بارزانی لەئورمیە بوو بریاریش بوو کاك نەوشیروان مستەفا بروات بەلاَم ئێرانیەکان مەرجیان

لەسەر یەکێتی هەبوو ئەویش داخستنی رادیۆی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەکۆیە بوو ئەگەر دانەخرێت ئەوە ئێران رێگای وەفدی یەکێتی نادات بۆئێران ئەوەش لەوکاتەدا زۆر قورس بوو بۆیەکێتی هەرچەندە چەند جارێك داوایان کردبوو حزبی دیموکرات داواکەی رەد کردبوەوە، لەرۆژانی ١٠و١/١١ لەسلێمانی بوم، لە١/١٢ لەسلێمانیەوە چومە سەیدصادق و گوڵەخانەو خورماڵ و بیارەو تەوێڵە و شوشمێ و نەوسودو پاوەو بۆ کرماشان تاهیری حاجی فەرەج کەپارتی بریندراری کردبوو لەدەربەندیخان عمودی فەقەری بەرکەوتبوو ئەویشمان لەگەڵ خۆمان بردبوو چوینە ماڵی کاك خەلیل مەسئولی علاقات لەکرماشان دوای کۆبونەوە لەگەڵ ئێرانیەکان لە١/١٣ چوینە سنە بۆماڵەوە تاهیرمان لە نەخۆشخانە خەواند...شەری پارتی و یەکێتی هەربەردەوام بوو لەهەولێر،

### نەفیر عام لەلایەن مام جەلالەوە

لە١/١٤ شەرەبەگەرمی لەدەوروبەری هەولێر بەردەوام بوو لق و تەلەفزیۆنی پارتی لەهەولێر دەوری گیرا بوو تەنها لەدوو بینادا مابونەوە، لە١/١٥ دوای ئەوەی پارتی شەریان نەوەستاند مام جەلال پەیامێکی دا بەرادیۆ لەسەر راگرتنی شەر ئەوەش راگەیاندنی شەر بوو بەرەسمی چونکە ووتی ناچارین رەدیان بدەینەوە ئیتر دەست گیرا بەسەر لقی دووی پارتیداو بارەگاکەی تەخت کراو شیراتۆن گیرا تەلەفزیۆنی گوڵانی پارتی دا تێدابوو نزیکەی (٣٠٠) کەسی پارتی کەوتە بەر دەستی یەکێتی و (١٠تا١٢) ئەندامی سەرکردایەتی تێدا بوو وەکو مامۆستا سەعدو کاك قادرجەباری و کاك ئازاد قەرداغی و زۆری کەیان لەبارەگای حزبی شیوعی و زەحمەتکێشان وسۆسیالیست وپارتی کاری سەربەخۆش تەلەفزیۆن و سەیارەکانیان بۆ دەرکردن زۆریشیان گیران و راونران بەتەواوی پارتی لەناوشاری هەولێر نەمان، لە١/١٦ لەسنە بوم لەو رۆژانەدا یەکێتی هەندێك داوایان کاك دکتۆر فوئاد و زۆری کەشیان

وتوبیان بۆسۆسیالیست هەڵوێستی نیە و بۆقسە ناکات لەسەر روداوەکان بۆهەندێك شت ناڵێن و بۆبەشداری شەر ناکات و بۆهەڵوێستی رون وەرناگرن ئەوکاتە شەر لەدەوروبەری هەولێر هەروا بەردەوام بوو ئەم داوایانەی یەکێتی ناحەق بون چونکە یەکێتی هەرکات توشی کێشەیەك بوبێت دۆستەکانی دەکەوێتەوە یاد ئێمە خۆمان بەدۆستی یەکێتی دەزانین بەڵام یەکێتی کەحزبی فەرمان رەوایەو لەگەڵ پارتی دا هیچ بەئێمە رانابینن تەنانەت لەوچەند رۆژەی پێشووش لەحکومەت و کابینەی سێهەم ئێمەیان باس نەکردوە یاوەکو کاك کەمال فوئاد وتی لەگەڵ پارتی پێك هاتین ئێوە بەشدار نەبن ئێمەیان هەرباس نەکردوە کەچارەنوس سازە بۆئێمە ئەمرۆش باسی ناکەن و لەداهاتوشدا کەهەولێروسلێمانی و کەرکوکیان لەدەستە تەنانەت بارەگاکانی خۆمان کەپارتی داگیری کردبوو ئەمانیش لەپارتیان وەرگرتەوەو نەیان داینەوە ئەوەی سەهۆڵەکەو زۆری کەش هەوڵ وتەقالاکانی ئێمەش بچوك دەکەنەوە لەزۆرجێگاو هەتا لەراگەیاندنی خۆیان و لەناو حزبەکانی کەدا ئێمە کەم دەکەنەوە و جگە لەوانەش بروامان نیە بەقسە تاسەر لەسەر قسەکان گۆران نەبێت لەبەر ئەوانە ناحەقی دەکەن داوا لەئێمە بکەن بۆناوشەر جگە لەشەخسی مام جەلال کەسیان یارمەتی ئێمەیان نەداوە یاوەکو دوو حزبی سیاسی شتێکیان نەکردووە لەگەڵمان، لە١/١٧ لەسنە بوم شەری پارتی و یەکێتی گەرم بوو بەڵام ئەم جارەیان بەئاشکرا پارتی شەری دروست کردەوەو شەری دەست پێکردەوە لەکوردستان و پەلاماری شەقلاوەی داو ماڵی مام جەلال و بارەگاکانی یەکێتیان سوتاندو دەستیان پێکرد پارتی لەشەری پێشوو خۆی بەغەدرلێکراو دەزانی ویەکێتشی بەزاڵم و بەناحەق پەلاماری پارتی داوە ئەوە وایکرد لەپارتی کەدەست بەکۆکردنەوەی هێزەکانی بکات و خۆی ئامادە بکات بۆ شەرێکی کەو دەست بەسەر زۆرجێگای یەکێتی دا بگرێت بەتایبەتی لەپارێزگای

سلێمانی چونکە هەولێر بەهی خۆی دەزانێ بەلام ئەم جارەشیان پارتی هەولێرشی
لەدەست داو لەدەستی چوو چونکە هێزەکانی پارتی هێزی شەرنین و مەسئولی
مەیدانیان نیەو هەوالی ناراست بەسەرکردایەتی خۆیان دەدەن، لە١/١٨ لەسنە بوم
بەرەو کرماشان بەرێ کەوتم بۆقەرارگا کۆبونەوەمان هەبوو لەگەلیان لەسەر
روداوەکانی کوردستان و لەسەر پەیوەندی دووقۆلی و باسی ئەوەمان دەکرد بۆ
یەکێتی رادیۆی دیموکرات داناخات وەپێیان ناخۆش بوو ئێرانیەکان کەیەکێتی
هەولێرو سلێمانی و کەرکوك دەستی بەسەردا گرتووەو حەزیان دەکرد پارتی
سەرکەوێت قەناعەتی ئێران وابوو سەرەتایش شەردەست پێ بکات پارتی لەشەر
دەیباتەوە وادیاربوو پارتی خۆشی هەمان بۆچونی هەبوو بەلام وادەرنەچوو..
ئێرانیەکان نارەحەت بون بزوتنەوەش هاوکاری پارتی دەکردو هەولیان دەدا
ئێمەش هاوکاری پارتی بکەین تەوازنی هێز بەلای یەکێتی دا شکابوەوە ماوەیەك
ئێران داوای لەیەکێتی دەکرد رادیۆی دیموکرات دابخات بەچەند مەرجێك دوای ئەوە
ئەوان هاوکاری یەکێتی دەکەن یاشەرەکە رادەگرن ئەمەش ماوەتەوە بۆیەکێتی
بەلام زۆریش قورسە ئەم شەرە نارەوایە لەپێناوی دەسەلات دایە لەکوردستاندا کار
گەیشتە ئەوەی مەرجیان لەسەر دانێنن لەسەر حسابی کورد ئەم لاو ئەولا من لەوە
دەترسم جلەوی ئەو شەرە لەدەستی پارتی ویەکێتی نەمێنێ و بەرەو هەلدرێمان
بەرێ و هەرئەو دوو حزبە زەرەر ناکەن بەلکو کورد هەموی زەرەر دەکات
بەئێمەشەوە واتە حزبەکانی کەش هەموویان لەناو گەشتیەکدا غەرق بوو کەس
دەربازی نابێت و ئەو هەلومەرجەمان لەدەست بچێت کورد بەئاسانی نایەتەوە
سەرخۆی، لە١/١٩ لەمالەوە بوم لەسنە (٨) مانگ بوو هەوالی منالەکانمان
لەئەلمانیا نەدەزانی، لە١/١٩ بەتەلەفۆن قسەم لەگەل دایکی رێژین وئارین کردو
لەگەل رێژین وئارینیش قسەم کرد ئەوماوەیە بێ خەبەر بوم لەبەر وەزعە ئالۆزەکە

مەجال نەبوو، لە١/٢٠ لەسنە بوم شەر گەرم بوو لەکوردستانی عێراق لەنێوان پارتی و یەکێتی... ئەمرۆ مهدی بازرگان یەکەم سەرۆك وەزیرانی ئێران لەتەمەنی (٨٨) ساڵی دا لەسوئید کۆچی دوای کرد، لە١/٢١ پارتی بەپشتیوانی تۆپ و راجیمەی ئێران و هاوکاری بزوتنەوە هێرشیان کرد بۆ سەیدصادق وگردی حاجی عبدالله و شانەدەری لەلای گامێش تەپە نزیکەی (٥٢) کەسیان کوژراو (١٢) کەسیان بەدیل گیران وئەوانی کەشیان بەپەلە پروزە لای خرنوك وکاك نادر هەورامیش لای گردی حاجی عبدالله وناوگردان بەهەزار فەلاکەت تائێواره دەبازبوون پارتی شکان و گەرانەوە ئەوانەی لەسەرجادە بون هەمەوەندەکان بون کاك فاروق کەریم ئاغا لەوهێزەی پارتی دا، لە١/٢٢ لەسنە بوم شەرهەربەگەرمی بەردەوام بوو، لە١/٢٣ هەرلەسنە بوم، لە١/٢٤ نوسەری گەورەی کوردی تورکیا یەشار کەمال لەسەر ئەوەی کوردە درایە دادگا بەبێ تاوان، لە١/٢٥ لەسنە بوم وەفدێکی هاوبەشی ئەمریکی و تورکی سەردانی صلاح الدین و هەولێرو کۆیەیان کردو کاك مەسعودبارزانیان بینی پاشان چونە لای مام جەلال بۆ راگرتنی شەر هاتبون بەلاّم پارتی داوای چۆڵ کردنی هەولێری دەکرد ئەوکات شەر رادەگرێت وەزعەکە خراپ بوو بارەکە ئاڵۆزبوو لەهەموو لایەکەوە دۆستەکانی کورد ساردببونەوەو کوردو جەماوەرەکەشی بێزار بون، لە١/٢٦ لەسنەوە چومە کرماشان پاشان کۆبونەوەو قسەکردن گەرامەوە بۆ سنە شەرو هەرا لەکوردستان بەردەوام بوو بەرای من رێگای کە زۆر بوو بۆئەوەی چارەسەری کێشەی پێ بکرێت وشەر نەبێت گفتوگۆ بکرایەو لەورێگایەوە دەتوانرا جێ بەجێ بکرێت بەبێ شەر، لە١/٢٧ دووجار وەفدی ئەمریکاو تورکیا مام جەلال و کاك مەسعودیان بینی و لەمەسلەحەت دایە شەر رابگرن و قسەیان کردو توندوتیژی هەردوولا قسەیان دەکرد وەزعەکە هەروا ئاڵۆز بوو... ئێمەیان دەعوەت کرد بۆتهران بۆیادی (٢٢)ی بەهمەن یادی سەرکەوتنی

شۆرشی ئیسلامی ئێران بوو یاشۆرشی گەلانی ئێران بوو، لە١/٢٨ لەسنەوە چومە کرماشان و شەو لەماڵی کاك خەلیلماینەوە چونکە ئەو رۆژە برادەری بەرپرسی وەرەقە کردن لەوێ نەبوو لەئێران ئەگەر بەرپرسی دائیرەکە لەوێ نەبوو ئەوە کلیل لەگیرفانی خۆی دادەنێ و کەس لەجێگای نیە، لە١/٢٩ لەکرماشانەوە گەرامەوە بۆ رەوانسەرو پاوەو نەوسودو شوشمێ و بۆسەر مەرزی تەوێڵەش هەر خۆم و یەك کەسم لەگەڵ بوو بێ چەك بەلاندکرۆز خۆم سائیق بوم ئەوناوەش هەموی بەفر بوو حەزم نەکرد پێشمەرگە بەوسەرماو بەفرە بێت بۆ تەوێڵە پاشان بۆ بیارەو خورماڵ و بۆ گوڵەخانە، لە١/٣٠ لەگوڵەخانەوە گەرامەوە بۆسلێمانی، لە١٩٩٥/٢/١ یەکی رەمەزان بوو بەرۆژوبوم بەلام بەداخەوە لەمانگی رەمەزانیش هەروا شەر بەردەوام بوو هەرچەندە ئێمە داوامان لەهەردوولا کرد بەناوی مانگی رەمەزانی پیرۆزەوە ئەو مانگە شەر رابگرن بەلام سودی نەبوو هەر بەردەوام مام جەلال داوای کرد لەگەڵ ئەو خالانەی لەکۆبونەوە ١٩٩٤/١٢/١٩ کران بەلام کەس تەئیدی داواکەی نەکرد ئێمەش لەبەر ئەوەی دووخاڵی تێدابوو کەپارتی و یەکێتی لەنێوان خۆیان کردبویان پەیوەندیەکیان بەئێمەوە نەبو ئەویان بەکوردەوە هەبوون ئەگەر ئەو دووخاڵەی تێدا بوایە ئێمە پشتیوانیمان لێ دەکرد ئەو دووخاڵەش بریتی بون لە (کابینەی سێ هەم سۆسیالیست بەشدار بوایە... وەابراهیم خلیل لەدەستی (INC) و حزبە کوردستانیەکان بوایە) چونکە حزبە کوردستانیەکانی تێدا نەبرن لەبەر ئەوە ئێمەش بێ دەنگ بوین لەئاستیدا، لە٢/٢ بارەگاکەیان لەچوارباخ داینەوە کەلە ١٩٩٣/١٢/١٣ داگیر کرابووخۆ ئەگەر شەر نەبوایە ئەوەشیان هەر نەئەداینەوە بەلام بارەگای لقیان هەر نەداینەوە کەلەژێر دەستی یەکێتیش بوو کەدۆستمان بوون داوای بەشداربونی شەریشیان دەکرد و هەڵوێست وەربگرین سەردانی بارەگام کرد هیچی تێدا نەمابوو لەپەنجەرەو قاپی و هەتا تەلی کارەبایان دەرهێنابوو وەکو

کەلاوەیان لیّ کردبوو، لە٢/٤ چومە هەڵەبجەی تازە بۆ پرسەی عەلی حاجی عارف پارتی بوو خۆیان کوشتبویان شەری یەکێتی و پارتی هەربەدەوام بوو، لە٢/٥ چومە ماڵی کاك شێخ رەوف هەنجیرە بۆ پرسەیەکی کۆنیان هەبوو نەرۆیشتبوم، لە٢/٦ چومە دوکانی سەروو بۆ پرسەی برای مام کوێخا سمایلی تەلان و گەرامەوە، لە٢/٧ لەسلێمانیەوە بەریّ کەوتم بۆ گوڵەخانە لەگەلّ برادەرانی مەکتەبی سیاسی دا چونکە لە٢/٨ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسیمان هەبوولەگوڵەخانە ، لە٢/٩ لەسەردەعوەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگوڵەخانەوە بەریّ کەوتم بۆ خورماڵ وبیارەو تەوێڵە و بۆ نەوسودو پاوە لەشوشمیّ پێشوازیان کردین لەسەرسنور من وماموستا مەلا ناصح وکاك برزۆو کاك هەڵۆ ئەحمەدکوردە بوین چوینە سنە، لە٢/١٠ مقابەلەیەکی تەلەفزیۆنی کراین لەسنە لەسەر روداوەکانی کوردستان و عێراق وناوچەکەو زۆرشتی کە پەیوەندی بەحزبی سۆسیالیست و کۆماری ئیسلامی ئێران وچاوپێکەوتنەکەوە هەبوو لەچەند لایەك بلاّوکرایەوە، لە٢/١١ لەشاری سنە بەشداریمان کرد لەریّ پێوان و خۆپیشاندانی یادی ساڵرۆژی کۆماری ئیسلامی ئێران کردو چاومان بەئاغای رەحیمی ئوستانداروِ مشاوری سەرۆکی کۆمار لەکاروباری سنە ئاغای مەولەوی مەدەنی و ئاغای موسەوی نوێنەری رابەرو لەسەرمەسەلەکان قسەکران، لە٢/١٣ کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەریمان لەسنە هەبوو کەهەموو رۆژنامەو رادیۆیەکان بەشداربون کەبەفارسی و عەرەبی و ئنگلیزی و هەروەها رۆژنامەکانی ئیتلاّعات و ریسالەت و سەلام و جمهوری و زۆری کەش بلاّویان کردەوە، هەرلە ٢/١٣ لەسنەوە بەریّ کەوتین بۆ تەهران و لەئوتێل ئیستقلالی تەهران میوان بوین، لە٢/١٤ لەوەزارەتی ئیتلاّعات چاومان کەوت بەبەرپرسی ناوچەی کەنداو ئەوبرادەرەی لەگەڵمان بوو ئێمەی تەقدیم کرد لەسەر وەزعی کوردستان و شەرو باری ئابوری و هاوکاری کوردو ئێران و حزب و ئێران

قسه كران و زوكو هەموو جارێ باسی سنوورڕێگا كردنەوەو هەوأى سیاسی بۆچارەسەری كێشەكان و شەری ناوخۆ بكەن ئێوە دەولەتێكی گەورەی ناوچەكەن و دەوروتان لەئاشتی و ئاوەدانی لەكوردستانی عێراق هەبێت و یائەڵێن تەنها گولە تۆپ و باروت و شەر بۆ كوردستان بەرێ دەكەن و ئازوقەو سوتەمەنی و كەرەسەی ژیان رێگا نادەن وزۆر بەسەراحەت قسەمان كرد لەگەڵیاندا لەهەموو روینەكەوەو زۆر قسەی كەش كران، لە٢/١٥ چوینە وەزارەتی دەرەوەو لەوێش پێشوازی كراین لەلایەن بەرێوەبەری گشتی وەزارەتی دەرەوە جیگری وەزیرئاغای صادق و چەند بەرپرسێكی كەوە لەوێش قسەمان دەربارەی پەیوەندی حزب و كۆماری ئیسلامی ئێران وهاوكاری كورد بەگشتی و مەسەلەكانی ئەمرۆی كوردستان و ناوچەكەو دونیا بوو دووسەعات قسەمان كرد لەسەر روداوەكان هەر هەمان رۆژ دوای نیوەرۆ سەردانی تەلەفزیۆن و رادیۆی كۆماری ئیسلامی ئێرانمان كرد لەتەهران و لەلایەن جێگری وەزیرەوە پێشوازی كراین و ئاغای سەرفراز بەرپرسی راگەیاندنی كۆماری ئیسلامی لەدەرەوەی ئێران واتە (بیرون مەرزی) سەیری هەموو بەشەكانی رادیۆو تەلەفزیۆنمان كردو پاشان قسە لەسەر زۆر مەسەلە وهاوكاری ئیعلامی هەردوولا كراو وەعدی زۆریش درا بەلأم هیچ نەكرا و مقابەیەكی رادیۆی تەهران و تەلەفزیۆنی عەرەبی كراین، لە٢/١٦ سەردانی مجلیسی ئەعلای ئیسلامیمان كردو ئاغای سەید عبدالعزیز حەكیم برای سەید محمدباقر حەكیم لەوێ بوو ئەوكاتە محمد باقر حەكیم لەسەفەربوو لەبەریتانیاو كوێت وەسەید صالح كەپێشتر لەساڵی ١٩٨١ لەسورێن لەگەڵ ئێمە بوو دەمناسی لەقیادەی مجلیسی ئەعلا بو قسەمان لەسەر پەیوەندی دووقۆڵی مجلیسی ئەعلاو حزب و معارەزەی عێراقیش كرا لەزۆر رووەوە، لە٢/١٧ دەعوەت بوین لەماڵی ئاغا مراد زاوای كاك عادل مراد لەتەهران زۆر خزمەتی كردین لەماڵەوە، لە٢/١٨ كاك نێچیرڤان بارزانی و كاك ئازاد بەرواری سەردانیان كردین

لەئوتێل ئیستقلال لەجێگای ئیسراحەتی خۆمان و دووسەعات قسەکرا لەسەر زۆر لەروداوەکانی کوردستان وناوچەکە و لەسەر پەیوەندی دووقۆڵی و چارەسەری بۆراگرتنی شەڕەکان قسەمان کردو قسەکان دۆستانە و برایانە بوون ئەوان حەزیان دەکرد ئێمەش بچینە ناوشەڕەکەوە راستەو خۆ بەخۆمانیان نەوت بەڵام جارێك لەرێگای بزوتنەوەی ئیسلامی و دووجار لەرێگای ئێرانەوە داوایان کردبوو ئێمە رەدمان کردەوە ئەوان کۆبونەوەیان لەگەڵ ئێران و بزوتنەوەش هەبوو هێزیان لەحاجی عمران و هەڵەبجەوە کۆدەکردەوە بەتەمای هێرش بون لەپێنجوێنەوە کۆبونەوەکەی ئێمە لەکەشوهەوایەکی برایانەدا بوو من ومامۆستا مەلا ناصح وکاك خەلیل و کاك هەڵۆ بوین کاك هەڵۆ لەو سەفەرە ویستبوی لەژێرەوە پەیوەندی لەگەڵ ئێرانیەکان بکات و وەعدی هەندێك شتی دابونێ کاك هەڵۆ بەنهێنی قسەی کردبوو دوایی کاك ئازاد حاجی حسێن کەشفی کردبوو وە ئێرانیەکان پێیان وتمەوە کاك هەڵۆ تازە هاتبووە ناو سۆسیالیست و ئێمەش ئیهتمامان دایە بەڵام وادیاربوو خۆی لێی نەزانی وسەری لێ دەرنەدەکرد و پەلەش بوو لەسیاسەت وکاردا لەگەڵ مام جەلالیش هەر قسەی کردبوویەکێتی بەجیا موچەی بۆخۆی و پێشمەرگەکانی بڕیبوەوە بێ ئاگاداری ئێمەش لەسەر ئەوە دوای چەند مانگ تەجمید کراو هەموو شتێکی لێ وەگیرایەوەو سەفەری دەرەوەی کرد مام جەلالیش پێی وتبوو ئێمە نامانەوێت کێشە بۆسۆسیالیست یالەپشتی سۆسیالیست هاوکاری تۆ بکەین جگە لەوانەش پاش ماوەیەك نامەی بۆکاك نێچیروان بارزانی بێ ئاگاداری ئێمە ناردبوو هەندێك هەوڵی پاکانەی لای پارتی کردبوو لەرێگای پاراستنەوە کەبەیانێك دەرچوبوو لەمەکتەبی سیاسی سۆسیالیستەوە وتبوی ئەو بەیانە من ئاگام لێ نیەو دەستوخەتەکەشتان بۆ دەنێرم چەند جارێك داوای لەو برادەرە کردبوو کەبەیانەکەی تەبع کردووە دەستو خەتەکەی بداتێ بۆ ئەوەی بۆ پاکانە بینرێت

بۆپارتی، له۲/۱۹ لەتەهرانەوە گەراینەوە بۆ قەزوین و تاکستان و هەمەدان و قروەو رۆژومان شکان واتە بەربانگمان کردو شەو چوینەوە بۆ مهمان سرای سنە و من چومە ماڵەوە بەڵام مامۆستا مەلا ناصح لەتەهران مایەوە بەنیازی سەفەربوو بۆ دەرەوە.. دونیا زستان بوو زۆرسارد، له۲/۲۰ لەسنە بوین بەتەلەفۆن قسەمان لەگەڵ برادەران دەکرد لەدەرەوەی وڵات، له۲/۲۱ لەسنە بوین بەرۆژو برم هەندێك چومە بازار، له۲/۲۲ هەرلەسنە بوین شەر لەدەوروبەری هەولێر گەرم بوو لەنێوان پارتی و یەکێتی دا لەکەس نەزان و جێگاکانی کە (٦٠)کوژراو هەبوو لەنێوان هەردوولاداو بریندارى زۆر هەبوو لەهەردوولا پارتی لەپێنجوێنەوە هێرشی کردبوو تادەورو بەری ناڵپارێزی گرتبوو هەرەشەی قەلاچۆلانی دەکردو دەیانوت هەڵەبجە و پێنجوێن و سەیدصادق لەیەك بدەنەوەو مەبەست گومرکی باشماخ بوو ئێران هێزەکانی بۆ دەگواستنەوە و راجیمەو چەك وفیشەکی دەدا بەپارتی نزیکەی (۲۰) کەس لەهەردوولا لەپێنجوێن کوژرابون کاك ئەنوەری حاجی عوسمان برینداربوو مەسئولێکی پارتی بووخەڵکێکی زۆرشۆرشگێرو دڵسۆزی کورد بونە سوتەمەنی ئەو شەرە نارەوایە..قەرارگای حەمزە چەند جارێك بوو داوایان لێ کردم بەتایبەتی ئەو کاتەی پارتی لێ ی داین و ئەو کاتەی حکومەتی هەرێم و پارتی و یەکێتی رێکبون سەردار کازمی بەپرس بوو داوای چاوپێکەوتنی کردو وتی هەرچی چەك و ئیمکانیەت پێویستە دەیدەین و بەهەلیکۆپتەر هەموی لەکوێ دەڵێت تەسلیمی دەکەین بەمەرجێك هاوکاریان بکەین من دەمزانی قەرارگای حەمزە بۆکاری ناوخۆی ئێرانە ئەگەر سودێکی خۆی تێدا نەبێت نایکەن و ئەگەر مەبەستێکی تایبەتی نەبێت ئەو هەموو هاوکاریە ناکات خۆم لێ دەبوارد بەلام لە رۆژی ۲/۲۳ داوایان کردو لەگەڵیان کۆبوینەوەو قسەکراو نەگەیشتینە ئەنجامێك شەری پارتی و یەکێتی بەخەستی بەردەوام بوو ئایندەیەکی رەش بۆ کورد چاوەروان ئەکرێت هەر ئەمرۆش

چاومان بەلێپرسراوی دەرەوە یا پەناهەندەکان لەپارێزگاری، سنە کەوت و ئاغای بیگی لەگەڵ ئەویش قسەکرا لەسەر ئەو کوردانەی لەئۆردوگاکان بون ئەوان وتیان ئێمە ئەمساڵ یادی کیمیابارانی هەڵەبجە لەهەموو شارەکانی ئێران بەتایبەتی سنندج و تهران دەکەینەوە و لەهەڵەبجەش حەزدەکەین بەشداری بکەین و هەموو پێویستیەکانی لەسەرکۆماری ئیسلامی ئێران و قسەکرا لەوبارەیەشەوە..هەر لە٢/٢٤ برادەران گەرانەوە بۆ کوردستان و من مامەوە بۆ ئیشو کارەکان و بریندارمان هەبوو لەویّ بون، لە٢/٢٥ لەسنە بوم لەماڵەوە، لە٢/٢٦ لەسنەوە چومە کرماشان و لەماڵی کاك خەلیل سەعید بوین، لە٢/٢٧ پاش، ئەوەی کۆبونەوەمان لەگەڵ سوپاوقەرارگای رەمەزاندا هەبوو بەڵام زۆریان پیّ ناخۆشبوو کەبەدەعوەتی وەزارەتی ئەمنی ئێران چوبوین بۆ تەهران و سنە و چاوپێکەوتنی رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆن چونکە قەرارگا خۆی بە بەرپرسی معارەزەی کوردی وعێراق دەزانی ئێمە وەکو سۆسیالیست تائەم جارە هیچ پەیوەندیەکمان بە وەزارتی ئەمنی وە یا ئیتلاعات و دەزگاکانی کەوە نەبوو بەڵام لە هەموو جیهانی ئەمرۆدا پەیوەندی دەوڵەتان یاحزب وحزب یاحزب ودەوڵەت یاددوڵەت ودەوڵەت لەرێگای هەواڵگری یاموخابەراتەوە دەست پیّ ئەکات پاشان دەگوازێتەوە بۆ کەناڵەکانی کە بەڵام هەر رێکەوتنێك لە بواری ئەمنی واتە رێکەوتنی ئەمنی یاهەواڵگری ئەم دەعوەتە بوو بە مارەکەی شێخ هۆمەرو لەملمان ئالا سوپاو قەرارگا کەشتی ئیجرائی لەدەستی ئەوان بو هەموو پەیوەندیەکیان لیّ برین وئاگاداری کاك خەلیلیان کرد کەبەرپرسی پەیوەندییەکانی حزب بووبارەگای پەیوەندییەکانی حزب چۆڵ بکات و نرواتەوە بۆ عێراق و هیچ ئیشێك بۆئێمە ناکەن ئیتلاعات ئەو دەسەڵاتەی نەبوو لەدیوی عێراق هەتا سەرمەرزیش بۆهاتووچۆ دەسەڵاتی نەبوو واتە لەم رووەوە پەیوەندی ئێمەو قەرارگا تێك چوو کەلە ١٩٨٠ یا١٩٨١ وە بەردەوام بوو وەکو ئەوەی لای دوژمن

دەعوەت کرابین وابوو لایان ، لە٢/٢٨ پاشان لەکرماشانەوە چومە رەوانسەرو پاوەو لەبارەگای پەیوەندییەکانی حزب بوین مامۆستا بەکر کۆکۆیی بەرپرسی پەیوەندیەکانی حزب لەپاوە لەوێ بو... هەر ئەمرۆ سەیارەیەك لەزاخۆ تەقییەوەو بەپێ ی هەواڵ(٨٥)کەس شەهیدو (٢٥٠) بریندار هەبوو پارتی ئەوەی خستە سەر یەکێتی لە٢/٢٨ لەپاوەوە بۆ نەوسودو شوشمێ و بۆ تەوێڵەو بیارەو خورماڵ و بۆ گوڵەخانە، نە١/٣/١٩٩٥ لەگوڵەخانەوە گەرامەوە بۆ سلێمانی شەری ناوخۆ هەر بەردەوام بوو کارەساتی زاخۆیش کارێکی خراپی کردبوە سەر خەڵکی کوردستان، لە٣/٣/١٩٩٥؛ لەسلێمانی بوم خەریکی کۆکردنەوەی هێزبوین دژی رژێمی عێراق، لە٣/٤ هێزێکی زۆرمان بردە چەمچەماڵ و خۆشمان چوینە سەنگاو مام جەلال لەوێ بوو من خۆم شەرم پێ باش نەبوو بەڵام بۆسارد کردنەوەی شەری ناوخۆودژی عێراق ئەمریکا دەیەوێت بەشدار بێت وقسەی لەوبابەتە و هاوپەیمانیەك یادۆستایەتیەکمان لەگەڵ یەکێتی دا هەبووئەوانیش داوایان کرد دژی عێراق هاوکاریان بکەین من شەو گەرامەوە بۆ تەکیە نزیکەی (٦٥) پێشمەرگەمان ناردە چەمچەماڵ هێشتا شەر نەببوو هەرواش پێشمەرگە هەر بەرێگاوە بون، لە٣/٥ هێزمان نارد بۆناوچەی شوان وخاصەو هێزێکمان نارد بۆ قەرەوەیس و ئۆردوگای شۆرش رژێم داینە بەر تۆپ و پێشمەرگەیەکمان شەهید بوو بەناوی رەوف سابیرعەزیز خەڵکی وڵوبە بوو وە(٧) پێشمەرگەش بریندار بوون و سەیارەکەش زیانی لێ کەوت خۆشم تانزیك تەکیەوجانی لای جەباری رۆیشتم، لە٣/٦هێزەکانی سۆسیالیست لەهەموو لایەکەوە دەهاتن (٩٠٠ تا١٠٠٠) پێشمەرگە گەیشتە چەمچەماڵ و سەرجەبهەکان ئێمەش کۆبونەوەمان هەبوو کابرایەکی ئەمریکیش هاتە لامان و وتی پارتیش بەشدار دەبێت بۆموصڵ ولێرەش بۆ کەرکوك شەرەکە زۆر درێژ نابێت و عێراق هەرچی بکات لێ ی دەدەین، لە٣/٧ لەچەمچەماڵ بوین

ئەبو فاروق کاك عمر عەلی شێخ و کاك عەلی زەنگەنەو چەند برادەری کەی شیوعی هاتن و ئەوانیش بریاری بەشداربونیان دا لەشەرەکاندا، لە٣/٨ لەکوڵەجرو جەبارەو لای هەولێرو لەشوان و لەقەرەدەوەیس شەرهەبوو لەهەموو لایەك حکومەت هیچی نەدەکرد تانەچوینایەتە سەری بەرگری نەدەکرد ئێمە شەرمان پێ دەفرۆشت هەر بەزۆری زۆرداری پارتی لەخۆشناوەتی و ناوچەکانی کەوە ددهاتە پێشەوەو بەفرسەتی دەزانی هێزی یەکێتی بەرەو جەبهەکانی عێراق ڕۆیشتون رادیۆکەشیان رادیۆی پارتی دەیوت یەکێتی لەبەر ئەوەی لەشەری پارتی مقاوەمەی پێ ناکرێت ئەم وەزعەی دروست کردووە بۆئەوەی لەوشەرە رزگاری ببێت و بەپێچەوانەی یەکێتیەوە قسەی دەکرد دەیوت بە ئاگاداری ئەمریکا و لە رێگای ئەمریکاوە تەنسیقمان لەگەڵ پارتی هەیەو پارتی بۆ موسڵ وئێمەش بۆکەرکوك ئەم جولاندنە دەبێتە هۆی ئاشتی یەکێتی وپارتی ئێمە لەکوڵەجۆیش بریندارو شەهیدمان هەبوو یەکەم شەهیدیش لەو شەرانە سۆسیالیست بوو هەروەها لەبانی مەقانیش دا، لە٣/٩ بەهێزی هاوبەشی سۆسیالیست و یەکێتی لەکوڵەجۆو لای گەرمیان شەریان کردبوون و چەندین سەربازی عێراقیان بە دیل گرتبوو، لە٣/١٠ لەچەمپەماڵ بوین خەریکی دانانی بەرنامەیەکی تازە بوین بۆشەرەکان هێزی یەکێتی کشانەوەو ئێمەش سەردانی سەنگاومان کرد لای مام جەلال ئێرانیەکان لەوێ بون و ئەمریکیەکانیش لەوێ بون شەو چوینە چەمچەماڵ ولەماڵی کاك حاجی بوین لەئۆردوگای شۆرش لەسەرجەم شەرەکان ئێمە (٣) شەهیدمان هەبوو لەهەولێرو چەمچەماڵ و گەرمیان و لای کفری لەگەڵ (١٢) بریندارە یەکێتیش یەك شەهیدو (١١) برینداری هەبوو، هەر لە٣/١٠ کۆمەڵێك لەپیاو ناسراوەکانی هەمەوەند هاتنە سەردانمان، لە٣/١١ گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٣/١٢ بەتەمای ناردنی هێزێك بوین بۆ هەولێر لەسلێمانیەوە چومە نەخۆشخانە بۆ سەردانی بریندارەکان، لە٣/١٣

هەرلەسلێمانی خەریکی ناردنی هێز بوین بۆ کەلاروشوان و چەمچەماڵ و هەولێر، لە۳/۱٤ (۱۰۰) پێشمەرگەمان نارد بۆ هەولێر، لە۳/۱٥ چومە هەولێر بۆبرسەی ئەو شەهیدانەی کە رۆژانی شەردا شەهید ببون لە سۆسیالیست ماڵی شەهید نەبەزو شەهید سەرحەد پیرداود، لە۳/۱٦ لەهەولێر بوم لەحالەتی شەردا بوین لەگەڵ عێراق لەهەموو ناوچەکان لەهەولێر تالای کفری و خانەقین یەکێتی هەرایەکی دروستکردبو بۆ ئەوەی شەری پارتی لەکۆڵ ببێتەوە بەلام پارنی ئەیوت ئێمە ئاگادارنین وبەشداریش نابین لە شەری دژی عێراق وە ئەمریکاش ئاگای لەم شەرە نیە یەکێتی بۆ ئەوە شەری پارتی پێ ناکرێت دەیەوێت بەم شێوەیە خۆی لە شەری پارتی نەجاتی ببێت هەر ئەمرۆ ساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجە بوو هێزەکانمان لەدەشتی هەولێر و لای پردێ و ئەوناوە بون، لە۳/۱۷ سەید ئەحمەد خومەینی کوری رابەری کۆماری ئیسلامی ئێران کۆچی دوای کرد لەئێران، لە۳/۱۸ لەهەولێربوم لەسەر داوای برادەرانی پارتی سەردانی کاك مەسعود بارزانیم کرد قسە کرا لەسەر ئەوەی بۆئێمە بەشداریمان کردووە لەوشەرە لەگەڵ یەکێتی داو پەیوەندی هەردوولاو هەرچەندە تائەوکاتە رێگای ئێمەیان نەئەدا بۆدهۆك و ئەوناو رادیۆو تەلەفزیۆنی پارتی زۆر بەخەستی ئەو کۆبونەوەی سۆسیالیست وپارتی من وکاك مسعودیان بلاو کردەوە یەکێتی شەو گوێیان لەوەبوو رۆژیش (٤۰) دیلمان گرتووبولەشەردژی رژیم لەناوچەی شوان ،لەشەوی ۱۸-۱۹/۳/۱۹۹٥ هێزێکی هاوبەشی سەربەمەکتەبی عەسکەری بەسەرپەرشتی و بەشداری کاك کەمال کوێخا عمر هێرشیان کرد بۆناو شوان و قەرەهەنجیرو ئەو سنورە لەشەرێکی قارەمانانەدا (۲۸) رەبایەی و یەك مەقەری فەوج و (٤) مەقەر سریەی عێراقیان گرت و دەستکەوت یەك هاوانی ٦۰ملم و یەك قەناسەو (٦۰) کلاشنکۆف و(۳٦) سەرباز بەدیل گیران کەدوانیان ئەفسەر بون ئەوە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ حزب

کەسەدان پێشمەرگەی لەکفری و کوڵەجۆو لەهەولێرو دەشتی هەولێرو لەناوشوان و لەبەرەکانی شەربون لەدوای ئەو هەموو ناخۆشی و گیروگرفتەی کەوتە رێگای حزب توانی ئەو سەرکەوتنە گەورانە بەدەست بهێنێ ئەو شەوەش یەکێتی هێرشیان کردبوو هەر لەسنوری ئەو هێزەی ئێمە شتێکی وایان نەکردبوو کەسیان بۆنەگیرابوو گەرابونەوە بەرپرسەکانیان داوایان لەبرادەرانی ئێمە کردبوو ئەو دیلانە تەسلیم بکەن برادەرانی ئێمەش وتبویان بۆ تەسلیمی بکەین ئەوانیش وتبویان بەرپرسی میحوەر داوای دەکات برادەرانی ئێمەش وتبویان خۆبەرپرسی میحوەری ئێمە نیەو ئێمە پێشمەرگەی حزبێکی کەین و راستە پێکەوەین ئێستا لەشەرداین بۆ ئێمە جەندرمەی ئێوەین دیل بگرین و تەسلیم بەئێوەی بکەین ؟ وادیاربوو بەرپرسی میحوەر ئاگاداری مام جەلالی کردبوو کەمیحوەرەکەی دیلیان گرتووە و ئەویش داوای کردبوو دیلەکان بەرن بۆی بۆ تەکیە برادەرانی ئێمەش نەیان دابوو مام جەلالیش رەمەزانی بانگ کردبوو وتبوی لەبەر فلاّن کەس نەبێت سجنت دەکەم ئەویش وتبوی من مەسئولم هەیەو ئاگاداری بکەن من دیلەکانتان تەسلیم دەکەم یەکێتی هێزی ناردبووە سەر بارەگای ئێمەو داوای دیلەکانیان کردبور بەدۆشکە تەقەیان کردبوو سەیتەرەیان بۆدانابون برادەرانیشمان دیلەکانیان بەرێ کردبوو بۆ سورێن و من بروسکەم بۆ مام جەلال کرد لەهەولێرەوە وازیان لێ هێنابون وداوایان کردبوو بارەگا لەچەمچەماڵ نەبێت و دەریان کەن لەسەر ئەوە گێچەڵیان پێ دەکردین بەلاّم خەڵکی چەمچەماڵ زۆریان پێ ناخۆش بوو یەکێتی هاتە سەر بارەگای حزب و تەقە کردن لەکاتێکدا ئێمە هاوسەنگەرو هاوکاری ئەوان بوین و بەخوت و خۆرایی شەریان پێ دەفروشتین، لە۳/۱۸ یەکێتی رادیۆی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان لەکۆیە داخست، لە۳/۱۹ دەعوەتی کاك کۆسرەت بوین کاك دکتۆر محمودیش لەوێ بوولەهەولێر، لە۳/۲۰ لەهەولێربوم ئەمرۆ یادی

ساڵرۆژی گرتنی شاری کەرکوك وئازاد کردنی بوو بەلاّم ئەورەفتارەی یەکێتی لەگەڵ حزبی سۆسیالیست وتەقە کردن و ئیهانە کردنی هێزێکی دۆستی خۆیان کەدیل لەعێراق بگرێت و بەزۆر لێیان بسێنن یاداوای بکەن بەزۆر بیبەن و تەقە لەبارەگا بکەن ئەو هەڵویستەی یەکێتی زەرەری خۆیانە هەرچی بکەن دژی ئێمەی سۆسیالیست ئێمە دۆستانین و دۆستایەتی هەموو لایەکیش دەکەین نازانین هۆی چیە یەکێتی بەهێزی سۆسیالیست حەساسیەتی هەیە، هەر لە٣/٢٠ (٥) هەزار سوپای تورکی هاتە کوردستانی عێراقەوە و سنوری کوردستانی وعێراقی بەزاند بەدرێژایی (١٢٠)کم و بەقولأیی (٤٠)کم ئازاری خەڵکی زاخۆو ناوچەکانیان زۆرداوە ولایەنە سیاسیەکان بەحکومەتیشەوە نەی وێرا باسی ئەوە دەست درێژیەی تورکیا بکات لەترسی تورك و ئەمریکا، لە٣/٢١ لەشاری هەولێر بوم هێزەکانمان ناردەوە بۆسلێمانی سەری بارەگای زەحمەتکێشانمان داو گەراینەوە، خانوەکەمان لەعەینکاوا بوین بۆ ئیسراحەت کاك رەمەزان هاتبوو بۆلامان لەو کارەی یەکێتی زۆر بێزاربوو، هەر لە٣/٢١ پارتی بەفرسەتی زانی لەپێنجوێنەوە هێرشی کردو تانالّپارێزی گرت هێزی یەکێتی زۆری لەشەر بون وایان دەزانی دژی عێراق بن ئەمریکا یائێران رێگای پارتی نادەن هێرش بکات بەلاّم پارتی ئەوەی یەکێتی بەسیناریۆ ناودەبرد ئەو شەرانەی بە خۆرایش نەدەکردن شەری پارتی و یەکێتی خەست بوو لەرەواندوزیش هەروا شەربوو، لە٣/٢٢لەهەولێر بوم یەکێتی زۆر خراب شکان پارتی ئەوناوچەیەی لەیەکێتی پاکردەوە تانالّپارێز ئەوندە زەرەر لەهەردولاهەبوکاك عوسمان قادرمنەوەر ومامستاحەسەن حسین وکاك شریف کەچەڵ وکاك نەوزادعبدالرحمن نەورۆلی وکاك حەمەسعید عەلی محمودو کاك عبداللەحمەئەمین لەپارتی بونە قوربانی کاك ئەنوەری حاجی عوسمانیش

بریندارببوو پەنجەی دەستی پەریبوو لەیەکێتی یش زەرەریان هەبو جگە لەناوچەکەیان لەدەست دابوو

لە۱۹۹٥/۳/۲۳ کۆبونەوەمان هەبو لە مەکتەبی سیاسی سۆسیالیست لەگەڵ حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان کە بریتی بون لەکاك قادرعەزیزوکاك عبدالخالق زەنگەنەو کاك دکتۆر سەردار دووقۆڵی باسی هەندێ مەسەلە کرا پەیوەندی بەوەزعی گشتی و هەردوولاوە هەبوو بۆ یەکەم جار تەرحی یەکگرتنی حزبی سۆسیالیست وزەحمەتکێشانیان کرد لەلایەن حزبی زەحمەتکێشانەوە، لە۳/۲۳ پارتی پارێزگاران سەردانیان کردین و باسی هاتنی سوپای تورکی بۆزاخۆوچیای گاراو سمێلڵ و شوێنەکانی کەش کران و دوای ئەوەی یەکێتی دژایەتیان کردین لەچەمچەماڵ و تەقەیان لەمەقەرەمان کردو ئینزاری مەقەرمان کراو دەریان کردن کاك شێخ جعفرتەوسیەی کردبون رێگەی بۆدانابون بالێیان دەن و بەزۆر دەریان دەکەن من ئاگادارم کردن خۆلەسەر بارەگایەك شەرناکەین و چۆڵی بکەن و ئێستاش ئەم شتانە یاداشتە دەنوسم بارەگاکەمان نەیان داینەوەو جیهازە راکاڵەکەشیان لەبرادەرانمان لەرەواندوز سەندەوەو لەحمەحمید وصابر ماوێلەیی گێچەڵیان پێکردبون بەناوی ئەوەی هاتو چوی پارتی ئەکەن ئەشیان بردو نەیان داینەوە...لەم رۆژانەدا مام جەلال دووجار بروسکەی کردو دەعوەتی کردم بۆ رۆژەکانی داهاتوو لەبروسکەکەیدا ئیشارەتی بەوە داوە کەوەزعەکان هەندێك ئاڵۆزکاون و پێویستە قسەی لەسەر بکەین هەر لەوکاتەنەدا پارتی هەرەشەی لەقەلاچۆلان دەکرد، لە۳/۲۳ لەهەولێر بوم مقابەلەیەکی تەلەفزیۆنی زەحمەتکێشانمان هەبوو، لە۳/۲٤ هەرلەهەولێر بوم برادەرانمان لەدهۆکەوە هاتن زۆر خراپ باسی سوپای تورك و بێزاری جەماوەریان دەکرد شەو بەتەلفۆن قسەم لەگەڵ مامۆستا مەلا ناصح کرد لەلەندەن بوو لەسەر وەزعەکانی کوردستان،

لــه ٣/٢٥ لەهــەولێرەوە گەرامــەوە بۆسـلێمانی و خــەریکی ئیــشوکاربوین،
لە٣/٢٦دەعوەت بوم لای مام جەلال و کۆبونەوەش هەبوو شەرگەرم بوو لەپێنجوێن
پارتی شکان تادیوی ئێران هەڵهاتن هەروەهاداوای وەفدی یـەکێتی بـۆئێران کرابـوو
هەرکات لایەکیان پارتی یایەکێتی هەندێك لاساری بکردایە دژی ئێران پـارتی بوایـە
یەکێتی لێهان ئەدا یەکێتی بوایە پارتی لێهان ئە دا ئێرانیش ئە وسنورەی لەپارتی
گرتو بەپەلە پروزە دەربازبوون، لە٣/٢٧ پارتی هێرشی کرد بۆهـەولێرو بـەونیازەی
لەپێنجوێن بەکێتی مەشغوڵە بەودەبابانەشەوە لەعێرایقان وەرگرتبوو لەوێش شکان
و نزیکەی (٣٠٠) کەسیان لێ کوژرا وەلەیەکێتیش نزیکەی (٧٠) کەس کوژرا..پارتی
(٢٥٠) جەنازەیان جێ مـابوو لەمەیدانی شـەردا لەتەلـەفزیون ورادیـۆی یـەکێتی وە
بلاوکرایەوە هەر لەوێ عـەلی شـەعبان بـارزانی شـەهید بـووە زۆری کـەش کـوژراو
مولازم عمر دوڵەمەری شەهید بو چەندی کەش کوژرا کەهەردووکیان لەگەڵ بـارزانی
نەمر لەمهابادو روسیاش بون دووپیاوی تێکوشەربون لەو هەموودەردی سەری ودەر
بەدەریە پەرینەوە لەئاوی ئاراس تیانەچون لەشەری نـاوخۆدا تیاچـون لەیـەکێتیش
فاقە مەخموری شەهید بو چەندینی کەش کوژرا پیاوێکی ئازابرمام جەلال وادیاربوو
دەیزانی من دڵم عاجز بووە لەوەی چەمچەماڵ، بە ناحەق تە قە یـان لـە مەقـەرمان
کردبو داوای ئەو٤٠دیلـەی لـەعێراق مـان گرتبـو لـە ناوچـەی شـوان وقـەرە هـەنجیر
لـەرۆژانی ٢٨و٣/٢٩ لەسـلێمانی بـوم، لـە٣/٣٠ لەسـلێمانیەوە چـومە هەڵەبجـە
بۆتەعزیەی حمە سەعید و عبدالله حمە ئەمین هەردوکیان لەشەری یەکێتی و پارتی
شەهید بوبون زۆری کەش کوژرابون لای پێنجوێن هەردووکیان کۆن پێشمەرگە بون
لەگەڵ مندا وخزمیـشم بـون هـەر لەهەڵەبجە سـەردانی مەقـەری بزوتنـەوەم کـرد و
پاشان چومە سیروان و گەرامەوە بۆ گوڵەخانە، لـە٣/٣١ لەگوڵەخانـەوە گەرامـەوە
بۆسلێمانی، لە١/٤/١٩٩٥ لەسلێمانی بـوم سـەرقاڵی ئیشوکاری حـزب بـوم، لـە٢/٤

لەسلێمانی بوم لەبارەگای چوارباخ پێشوازیمان کردلەدکتۆر ئەحمەد چەلەبی و چاویان بەسەربازە دیلەعێراقیەکانیش کەوت لە ناوچەی شوان گیرابون یەکێتی چوبونە سەر بارەگای حزبمان لە چەمچەماڵ، لە٣/٤ لەسلێمانی بوم کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی مان هەبوو بریاری دامەزراندنی لقی شارەزوور درا لەبەر زۆری و گەورە بونی قەبارەی حزب لەلقی سلێمانی، لە٤/٤ یادی خوێندکاران ولاوانی سۆسیالیست بوو منیش سەرم لێدان و هەندێك قسەشم بۆ کردن بەبۆنەی (١٢) ساڵەی دامەزراندنیانەوە، لەرۆژانی ٥و٤/٦ هەر لەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاری حزب بوین، لە٤/٧ هەرلە سلێمانی بوم، لە٤/٨ لەسلێمانیەوە چومە قەلاچۆلان بۆکۆبونەوە لەسەر وەزعەکانی کوردستان و عێراق ئەو حزبانەی بەشدار بون لەشەر دژی عێراق یەکێتی و زەحمەتکێشان و شیوعی و پارتی کارو سۆسیالیست بون پارتی بەشداری نەکرد ئەمریکاش ئاگای لەو وەزعە نەبوو نازانم یەکێتی بۆچی دەیان کرد، کاك حمەی بەکر هەبوو لەسلێمانی وتبوی ئەو هێزانە ئەیانەوی کەرکوك بگرن چی دەخۆن وتبویان ناوساجی ئەویش وتبوی ناوساجی رەمەزانی پێ ئەگیرێ وکەرکوك بەناوساجی ناگیرێ کەرکوك بەقوتوی موعەلەباتی ئەمریکی ئەگیرێ نەك ناوساجی، لە٤/٩دوای نیوەرۆش کۆبونەوەکە کۆتایی پێهات و بلاوکراوەیەکی هاوبەش لەنەتیجەی دەکراو بەلام درێژەی نەبوو، لە٤/١٠ لەسلێمانی بوم سەردانی چەند ماڵە شەهیدێکمان کرد لەسلێمانی وەبارانێکی زۆربووئەو رۆژە، لە ٤/١١ هەرلەسلێمانی بوم، لە٤/١٢ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی دەستی پێکردلەسەرئەو وەزعانەی ئەو ماوەیەو هەڵسەنگاندنی بارو دۆخەکەو گەیشتین بەئەنجامێك لەوبابەتەو روداوەکانی چەند مانگی رابردوو چاك وخراپی بۆحزب هەر لە٤/١٢ پەرلەمانی کورد لەدەرەوەی ولات لەهۆڵەندا ئیعلان کراو تەلەفزیۆنی مید پیشانی داو ئێمەش لەسلێمانی وجێگاکانی کەی هەولێرو

شارەزوور لەهەر(٣) کەناڵەکەدا رامان گەیاند وبلاومان کردەوە، لەسەعات (١٠)ی شەوی ١٤-٤/١٥ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی کۆتایی بەکارەکانی خۆی هێنا، لەرۆژانی ١٥تا٤/١٩ هەرلەسلێمانی بوم، لە٤/١٩ ئەبوحەیدەر بەرپرسی نوسینگەی سلێمانی (INC) سەردانی کردین هەرئەمرۆ لەبانی خێلآن لەشەری عەشائیری دوو کەس کوژران یەکێکیان برای کاك محمدحاجی محمود هارونی یە، لە٤/٢٠ چومە دەربەندیخان بۆپرسە و نیوەرۆ لەماڵی کاك عەلی تۆفیق بوین، لەرۆژانی ٢١تا٤/٢٥ هەرلەسلێمانی بوم، لە٤/٢٥ چومە دەربەندیخان بۆلای سەرۆك عەشیرەتەکان و سەردانی پارێزگارمان کرد و سولحەکەیان لەبانی خێلآن کۆتایی پێهات پاشان گەرامەوە بۆ سلێمانی، لەرۆژانی ٢٦تا٤/٢٨ هەرلەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاری ئاسایی بوم، لە٤/٢٩ بروسکەیان بۆ کردم کەکۆبونەوەی (٧) حزبەکە هەیە لەبارەگای حزبی زەحمەتکێشان، لە٤/٣٠ سەردانی کاك کۆسرەت مان کرد لەهەولێر لەدوای نیوەرۆش مامۆستایان عەلی عبدالعزیزو کاك شێخ محمد بەرزنجی ومامۆستا عبدالرحمن نەورەسی ومەلاقادری برایەتی و مەلا سەلمان سەردانیان کردین وەبۆ نیوەرۆکەی لەماڵی مامۆستا عەلی محمد زەمەقی ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکگرتووی ئیسلامی بوین مامۆستا صلاح الدین محمد بەهادینیش لەوێ بوو قسەی زۆری دۆستانەو برایانەمان کرد لەسەر کۆبونەوەکەو وەزعی یەکگرتوو دەیانویست هەندێك پرسیار لە من بکەن لەسەر مەسەلە سیاسیە ئاڵۆزکاوەکان منیش بەپێی توانای خۆم وەلآمم دانەوە ئەوەی خزمەتیش بە ئەوان بکات لەئەزمونی رۆژانی خەباتی هەمەلایەنەی خۆم، لە١٩٩٥/٥/١ لەبارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی کۆبونەوەکان درێژەی هەبوو، لە١٩٩٥/٥/٢مام جەلال وکاك شێخ محمد شاکەلی و مامۆستا چەتۆ سەردانیان کردین لەهەولێر بۆماوەی یەك سەعات قسە لەسەر روداوەکان بەگشتی و هاوکاری دووقۆڵی هەردوولا کرا بۆ دوا نیوەرۆکەی کاك

قادرعەزیز سەردانی کردین و قسەمان لەسەر روداوەکان کرد؛ لە٥/٣ لەهەولێر بوم لەبارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی لەهەولێر رێکەوتنامەیەکمان مۆر کرد لەنێوان هەردوولادا لەلایەن بزوتنەوە ماماموستا مەلا عەلی هەڵەبجەو ماموستا عەلی باپیرو ماموستا شێخ محمد بەرزنجی و زۆری کەیان ئیمزایان کرد وەلەلایەن ئێمەشەوە من و برادەرانی مەکتەبی سیاسی لەوێ بوین بزوتنەوە هەرسێ بۆلە جیاکەی ئیمزایان کرد چونکە لە١٩٩٣/١٢/٣ لەبارەگای بێتواتە ماموستا عەلی باپیر وتی شەخسی ماموستا مەلاعەلی هەڵەبجە رێکەوتنی لەگەڵ ئێوە کردوە بەڵام ئەو رۆژە هەمویان ئیمزایان کرد..لەو دووسێ رۆژەدا دەمویست کۆبونەوەیەك دروست بکەم لەنێوان ماموستا مەلا عەلی هەڵەبجەو مام جەلال دا بەڵام مام جەلال نەی دەکرد و هەندێك لە بەرپرسانی بزوتنەوە بەمام جەلال ویەکێتیان دەوت ماموستا مەلا عەلی هەڵەبجە هیچی بەدەست نیەو هەموو شت بەدەستی باڵەکانی کەی ناوبزوتنەوەیە بەتایبەتی ماموستاعەلی باپیر.. مام جەلال و کاك کۆسرەت قەناعەتیان وابوو کاك مەلا عەلی هەڵەبجە هیچی پێ ناکرێت لەو ماوەیە مام جەلال سەردانی هەموو بارەگاکانی کردبوو بەڵام سەردانی بارەگای بزوتنەوەی نەکردبوو کاك شێخ محمد بەرزنجی تەلەفۆنی کرد بۆمن ووتی بەڵکو بەمام جەلال بڵێت سەردانی ئێمەش بکات وماموستامەلاعەلی عبدولعزیزیش لێرەیەو ببینێ منیش تەلەفۆنم کرد بۆمام جەلال و داوام لێکرد سەردانی بارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی بکات پاشان وەڵامی دامەوەو وتی باشەو لەبەرنامەشم هەبوو پاشان سەردانی کردبون وادیاربوو پێشوازیەکەی هەندێك ساردبوو تا ماموستا مەلا عەلی هەر لەژوورەکەی خۆی بوو نەهاتبووە خوارەوە شتێکی وادیاربوو مام جەلال دڵگران بوو دوای هەندێك قسە کردن هەڵسابون من هەوڵمدا کۆبونەوەیەکیان پێ بکەم مەوعیدیشم وەرگرت لێ ی ، لە٥/٤ سەردانی کاك مەسعود بارزانیمان کرد لەسەری رەش من و کاك محمد

دۆلآشی و کاك برزۆ دوای کۆبونەوەو قسەکردن لەسەر چاردسەری شەروئاشتی و کۆبونەوەی پەرلەمانیش لەئارادابوو بۆیەکەم جار گوێم لێبوو کاك فرانسۆهەریری وتی ئێمە هەرباوەرمان بەو پەرلەمانە نیە و شیاوی ئەوەیە لەمەیدانی حەیوان لەنێوان هەولێرو کەس نەزان کۆببینەوە هەر لەکۆبونەوەی ١٩٩٥/١١/١٣ کاك فرانسۆ هەریری بەکاك مەسعودی ووت سرودی تەلەفزیۆنیان دەلێت سۆسیالیستم ناتوێمەوە ئەوەش دژی پارتیە کاك فرانسۆ بەکاك مەسعودی وت کاك مەسعودیش بەپێکەنینەوە وتی جائەوە شیعاری خۆیانە ناتوێنەوە چییان لیّ بکەین بەزۆر بیان توێنینەوە ئەو رۆژەش مەیدانی حەیوانم گویّ لێبوو زۆرم لاسەیربوو. بیری ئەو رۆژەم دەکردەوە کەئەو هەموژن و خەلّکی پیرو پەککەوتەو کەسوکاری شەهید بەرەو سەندوقی دەنگدان و هەمو موقەدەساتی کورد لەو پەرلەمانەو هەموو شەهید و بەروبومی سەدان سالّەی کوردو مالّ وێرانی واسوکایەتی بکرێت و لەمەیدانی حەیوان کۆ بکرێتەوە کاك فرانسۆ لە کۆبونەوەکە لەبەر چاوی کاك مەسعودوئێمە سیّ چوارجار دووبارەی کردەوە بەهەرحالّ دوای کۆبونەوەکە گەراینەوە بۆ هەولێرو پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٥/٥ لەسلێمانی بوم لەمالّەوە میوان زۆربوو، لەرۆژانی ٦تا٩/٥ هەرلەسلێمانی بوم، رۆژانی ٩و١٠/٥رۆژی جەژنی قوربان بوو جەماوەرێکی زۆر سەردانی کردین، لە١٣/٥ سەردانی مالّی کاك دارای حاجی ابراهیم چەرمەگامان کرد..کاك دارا لەکاتی شەری پارتی لە مانگی ١٢/١٩٩٣یارمەتی ئێمەی دا کۆمەلّێك لەخزم و کەسوکاری خۆی نارد بۆهاوکاریمان بیّ ئەوەی کەس ئاگای لیّ بێت بەراستی ئەوهەلّوێستەی کاك داراوخزمەکانی لەبیرناکریّ و لای ئێمەگرنگ بی کەجێگای سوپاس و برایەتی بوو بۆمان ،لە١٤/٥ هەر لەسلێمانی بوین ، لە١٥/٥ هەرلەسلێمانی بوم لە١٦/٥ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی هەبوو هەمان رۆژ سەعات (٥)ی دوای نیوەرۆ سەردانی مام جەلال مان کرد لەقەلاچۆلان و

گەراینەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ١٧بۆ٢٢/٥ هەرلەسلێمانی بوم، لە٢٣/٥ لەگەڵ کاك شێخ محمد بەرزنجی رۆیشتینە گوڵەخانە و بۆ هەڵەبجە کۆبونەوەمان هەبوو لەگوڵەخانە، لە٢٤/٥ چوینە هەڵەبجەی شەهید لەوێش کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ مامۆستا مەلا عوسمان وبرادەرانی بزوتنەوەدا لەدوای نیوەرۆی هەمان رۆژ کاك محی الدین رەحیم وکاك نادر هەورامی سەردانیان کردین لەگوڵەخانە قسەی دۆستانە کرا، لە٢٥/٥ لەگوڵەخانەوە چومە سەیدصادق بۆ بارەگای لقی شارەزوور تازە کرابوەوە پاشان گەرامەوە بۆ سلێمانی، لە٢٦/٥ لەسلێمانی چومە پرسەی قادرئاغای حاجی سەعید ئاغا تەمەنی (١٠٤)ساڵ بوو کۆچی دوای کردبوو، بریار بوو لە٢٧/٥ کۆبونەوەی پەرلەمان بۆتازە بونەوە بکرێت لەسەرجێگای کۆبونەوە پارتی ویەکێتی رێك نەکەوتن پارتی دەیوت هەولێر داگیر کراوە کاك فرانسۆ مەیدانی حەیوانی پێشنیار کردبوو بریاردراو رێکەوتن بەناوبژیوانی (٧) حزبەکە لەگوندی دارەبەندی نێوان عەینکاواو بەحرکە بکرێت و یەك ساڵ تازەی بکەنەوە داوای پێشمەرگەی بێ لایەن کرا ئێمە کاك هیواو (٥٠) پێشمەرگەمان نارده لایان بۆ پاسەوانی لەدارەبەندو هەولێرو ئەو جێگای پێویستە نوێنەریشمان لەوێ بوو بەشداربون کۆبونەوەی پەرلەمان لەمزگەوتی دارەبەن لەسەر کورسی و مێزی کەنیسەی عەینکاوا هەموو کۆبونەوەکەش (١١) دەقیقەی پێ چوو هەمو بلاوەی لێ کردو هەریەکە بۆجێگای خۆی واتە ئەندام پەرلەمانەکان چەکەکانیان لە ناو سەیارەکانیان بو چەکی خۆیان لێ هەلگرتەوە وچونەوە بۆ سەنگەرەکانیان وبۆ شەری براکوژی یاشەری ناوخۆو بەراستی ئەوەش هەر تەجروبەیەکی نوێ بوو لەدونیادا لەهۆڵی پەرلەمان کۆبونەوە نەکرێت پەرلەمان هەر لەسەرەتاش شەرعیەتی نەمابوو یەك ساڵێکیان بۆتازە کردەوە لەراستی دا پارتی باوەری بەپەرلەمان و حکومەت نەبوو یەکێتیش زۆر باوەری پێ نەبوو ئێمە دەمانوت

بریاری پەرلەمانە یاحکومەت ئەوان بچوکیان دەکردەوەو دەیانوت تا ئەوە بریاری یەکێتیەو لەسەیتەرەی حکومەتی هەرێم ئالآی سەوز یازەردیان هەڵدەواسی من جارێك لای مام جەلال و جارێك لای کاك کۆسرەت باسم کرد ئەگەر حکومەت بێت هەموی قبوڵیەتی لەسەیدصادق تاهەولێر بەناوی حکومەتی کوردستانەوە خەڵکی ئامادەیە لەسەیتەرەکان بوەستێت و بپشکێنن بەلآم کەئالآ سەوزەکە دەبینێ بەسەیتەرەی یەکێتی دەزانێ و ناوەستێ و ئەویش تەقە دەکات و کێشە دروست دەبێت بۆ خۆشتان باشترە بەناوی حکومەتەوە معامەلە بکەن لەگەڵ خەڵکەو لایەنە سیاسیەکان تابەناوی یەکێتیەوە بێت دەمانزانی بریارەکان هەمووی لەمەکتەبی سیاسی و لەمەڵبەندەکان و لەرێکخستنەکان بۆ حکومەت دەر دەچێت و مەسئولی مەڵبەند بەتەلەفۆنێك پارێزگار لادەبات یائیشەکەی رادەگرێت هەروا لای پارتیش بەهەمان شێوەیە بەلآم لەگەڵ ئەوەش دا دەبێت چوارچێوەیەکی گەورەتر هەبێت بۆ ئیداراتی خەڵکی کوردستان جەماوەر هەموی یەکێتی یاپارتی نیەو هەیە بێ لایەنە وەکو حزب بەلآم لەکوردایەتی دا بێ لایەن نیەو حزبەکانی نارێ بریاری یەکێتی و پارتی بەبێ چوارچێوەیەکی سیاسی و بریاری سیاسی جێ بەجێ بکەن ئەوان ئەگەر پارتی و یەکێتیان قبوڵ بوایە دروست نەدەبون و هەر لەناو ئەو حزبانە دەبون..بەرەی کوردستانی سیغەیەك بوو بۆ پێکەوە ژیانی سیاسیانەو ئێستاش حکومەتی هەرێم بووە بەدوو بەشەوەو دووناوچەی جیاواز باهەرلایەك بەتایبەتی یەکێتی رەچاوی هەندێك شت بکات دەتوانێ لەسنوری خۆی حکومەت فراوان بکات و دەتوانێ لەهەندێك کاری ئیجرائاتی یائەمنی شارەکان هەموو لایەك بەشداربن تێداو مجلیسی پارێزگا یا ئەمنی شار پارێزگاو مرورو پۆلیس و پەروەردەو شارەوانی و ئاسایش ئەوانەی کەئەو مجلیسی ئەمینی پێك دەهێنن ئەوانیش بریار دەدەن بەلآم حکومەتی کێ یە هەر یەکێتیەو دژەکەی دەڵێت کارگە

فرۆشراوەو دەڵێت دزی کراوەو دەڵێت شەریکی هەموو بەنزیخانەکانن و دەڵێت شەریك یازیادە لەهەموو دوکانەکان وەردەگرن و حزبەکانی کە نایەن شاهیدی بدەن و بلێن وانیە یابریار بدەن کەس بەچەکەوە نەگەرێت حزبەکانی کە ئەو بریارە بەهی پارتی یایەکێتی دەزانن ئێمە خۆمان بریاری خۆمانی تێدا نەبێ ئاسان نیە جێ بەجێ ی بکەین ئەگەر لایەنەکانی کەشی تێدابێت پارتی قسەیەك دەکات یامقابیلەکەشی حزبی شیوعی یازەحمەتکێشان یاسۆسیالیست یەکێ لەوانە وەلامی بداتەوە ئێمە لەلیژنەی ئەمنی شار بین و ئاگامان لەشتی وا نیەو یانەبووە پارتیش لەسنوری خۆی هەروا من چەند جارێك ئەو مەسەلەیەم لەگەڵ یەکێتی باس کرد بەلام یەکێتی دەیەوێت هەموو بریار هەرخۆی بەتەنها بیدات هەرچی ئەکات بە ئارەزوی خۆی کەس ئاگای لێ نەبێت ئەگەر پارتیش باسی کرد یەکێتی فلانە شتی ئاودیو کردبۆ ئێران یا خوروقاتی کرد دەبێت حزبەکان شاهیدی ناحەق بدەن بۆیان ئەوەش ئاسان نیە بۆ ئێمە ئەو حزبانەی خۆیان دروستیان کردون ئەوە شتێکی کەیە هەرکات دوکانەکانیان پێ بکەنەوە یا دایخەن لەورووەوە زۆر شتم پێشنیار کردووە دوای یەك یادووساڵ ئەوان هەنگاویان بۆناوە کەوەختەکەی بەسەر چووە چونکە زەمەن یاکات زۆر گرنگە لەسەر روداوەکان زەمەن وەکو تیغ وایە نەیبریت ئەو تۆ دەبرێت.. لەوکاتە پەرلەمان لەودەشتە یائەو گوندە بەکورسی و مێزی کەنیسەی عەینکاوا لەمزگەوتی دارەبەند و بەپاسەوانی پێشمەرگەی سۆسیالیست و حزبەکان بە (١١) دەقیقە ساڵێك خرایە سەر تەمەنی هەڵبژێراوی پەرلەمان درێژکرایەوە و دامانەوە بەدەستیانەوە، لەرۆژانی ٢٨تا٥/٣١ لەسلێمانی بوم لەو رۆژانەدا هەمیشە بارانێکی زۆر دەباری کەوەختی باران نەبوو ئەویش وەکو پەرلەمانەکە بارانەکەش زەرەری لەجوتیاران و باخ و بێستان و دانەوێڵەی خەڵکی دەدا، لە١٩٩٥/٦/١ لەسلێمانی بوم سەرقاڵی ئیشوکاری حزب بوم، لە٦/٢ پارتی

دوای ئەو هەموو هاوکاریەی کردمان چوبونە سەردۆست و لایەنگرانی سۆسیالیست لەسیروان و هەڵەبجەو خورماڵ و تەپی سەفاو مەلاوەیسەو ریشێن عەزیەتیان دابون لقی شارەزوری حزب بەیانیان لەسەر ئەو تەسەروفاتەی پارتی دەکردبوو لەو رۆژانە لەدەزگای راگەیاندنەکان بلاوکرایەوەو پاشان پارتی داوای ئەوەیان کردکەبارەگرژەکە و هەڵەکە لەلای خۆیانە واتە پارتی خاوی بکەنەوەو بارە گرژەکە چارەسەر بکرێت بەلام لق خاڵ بەخاڵ دەست نیشانی چەکداری پارتی لەگەڵ جەماوەری ناوچەکە کردبوو، لە٦/٣ لەسلێمانی بوم وەفدێکی کۆماری ئیسلامی ئێران هاتبونە سەردانمان لەئەنجامی ئەو کۆبونەوانەی پێشتر کرابوون لەسەر روداوە تازەکان و شەری گەرمی ناوخۆو بەردەوام بونی شەرەکەو دور خستنەوەی بزوتنەوەش لەپارتی کەتائەو کاتە سەنگەری بزوتنەوەو پارتی یەك سەنگەربوو ئەمرۆش ماوەی پەرلەمان کۆتایی دێت چونکە لە١٩٩٢/٦/٤ یەکەم کۆبونەوەی پەرلەمان کراوە لەهەولێر بۆماوەی (٣)ساڵ بووە بەلام بریاربوو لە١٩٩٢/١٠/١٩ هەلبژاردن بکرێتەوە بەلام نەکرایەوە لەساڵی ١٩٩٥ کۆتای بەتەمەنی دێت بەلام حەلی شەرعیان بۆکرد لەنێوان هێزی هەردوولایاندا کۆبونەوەیەك کراو یەك ساڵی بۆتازە کرایەوە..ئێمە لەسلێمانی بوین بارانێکی زۆربوو لەسلێمانیەوە باران بوو تاسنە، لەرۆژانی٥و٦/٦ لەسلێمانی بوم یارمەتی پێشمەرگە واقەکانمان دا هەندێك باش بوو بۆپێشمەرگە چونکە (٤) مانگ بوو یارمەتی وەرنەگرتبوو، لەرۆژانی ٧تا٦/١٢ هەرلەسلێمانی بوم، لە٦/١٢ سەردانی مام جەلال مان کردو کاك شێخ محمد بەرزنجی دووسێ جار ووتی سەردانی بکەین لەوماوەیەدا نوێنەری (٧) حزبەکە سەردانی مام جەلالیان کردبوو پێشتر بەیانێکیان دەکردبوو لەسەر ئەوەی بۆیەکێتی لەسەر داوای ئێران بەیانیان دەرکردبوو لەسەر ئەوەی رادیۆی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بۆ داخراوە وادیاربوو نوێنەری ئێمەشی تێدابوو بەلام

هەمو ئەو ئیمزای کردبوو ئەو ڕۆژەش لای مام جەلال نوێنەری سۆسیالیستی تێدابوو مام جەلال پێ ی وتن ئەوە ئێمە چەند ساڵە هاوکاری دیموکرات دەکەین ویارەگاو هانوچۆو شەریشمان بۆ کردون ئێستاش ئێوە ئەوەندە خەم خۆرن با پارتی پارێزگاران رادیۆکەیان بباتە کەڵەکین یابزوتنەوەش بۆیان بەرێتە هەڵەبجە یاحزبی شیوعی ببیباتە قەرەداغ بۆیان دابنێنن ئێمە ناتوانین لەوەزیاتر ئەوانیش دەبێت مراعاتی ئێمە بکەن مام جەلال کارێکی کرد بەحزبەکان دوای هاتنەوە ووتم وەزعتان چۆن بوو وتیان مام جەلال زۆر رێزی لێ گرتین ووتم بابە هیچ ما پێتان بکات کاك شێخ محمدیش هەردەیوت بابرۆین وادیاربوو خۆیان کێشەیان بوو دەیویست منیش توشی ئەو هەرایە بکات .. کاك شێخ محمد هەرچی ئەندام مەڵبەندی بزوتنەوەی سلێمانی بوو هەموویانی کۆکردبوەوە بۆلای مام جەلال هەمویان سێ ئەوەندەشیان لێ پەیدا بون مام جلال لە دژی ئێران حەزی لە بزوتنەوەی ئیسلامیش نەدەکرد کەچی مامۆستا شێخ محمدی بەرزنجی ١٠-١٥ ئەندام مەڵبەندی هێنابو هەموی ریش و جامانەو جلی کوردی و ئەدیداسی ئێرانی وە کاك شێخ محمد و کاك عەلی باپیر دەچون بۆلای مام جەلال یەکی (١٠-١٢) کەسیان لەگەڵ خۆیان دەبردو دەیانوت ئەوە هەموویان رەئیان لەگەڵ ئێمەدایە لەوکاتەی بریاربوو مامۆستا مەلاعەلی ومام جەلال یەك ببینن مام جەلال وتی کاك عەلی باپیر هاتووە هەموو ئەندام مەڵبەندو هەموو لێپرسراوانی مەڵبەدەکانی لەگەڵ بووەو مەلا عەلی هەڵەبجە شتێکی وای بەدەست نەماوە، لە١٢/٦ کاك شێخ محمد بەرزنجی بەهەمان شێوە بوو مام جەلال خەریك بوو وەکو نوێنەری (٧) حزبەکە لەگەڵی قسەبکات باش بوو پێش ئەوەی من قسە بکەم مام جەلال خۆی ووتی هەڵوێستی سۆسیالیست جیایە لەبزوتنەوە کەمێك بۆی تەخفیف کردین و دوای ووتم کاك شێخ محمد ئەم سەردانە بۆ منت هێنا هەوڵەکانی مامۆستا شێخ محمد

بۆچارەسەری کێشەکان بو لەرێگای گفتوگۆوە لەنێوان بزوتنەوەویەکێتی دا، لە٦/١٣ لەسلێمانیەوە چومە گوڵەخانە لەسەیدصادق کۆبونەوەمان لەگەڵ لقی شارەزوور هەبوو، لە٦/١٤ لەگوڵەخانە بوم پارتی سەردانیان کردین کاك عارف تەیفورو کاك محی الدین رەحیم و کاك نوری وکاك فەرەیدون جوانرۆیی قیادەی مەیدانی سلێمانی کەرکوکی پارتی بون سەردانیان کردین قسەی دۆستانە کراو سوپاسیان کردین کەئێمە زۆر لەبرادەرانی ئەوانمان بەرداوە لای یەکێتی و بەشداری شەرنەبوین دژیان و زۆر شتی کەش بۆئەوە ودۆستایەتی سەردانیان کردبوین پارتی چەند جارێك داوای چەکیان لێ کردبوین چەکی قورس وەکو تۆپی (١٠٦)و(SBG) دۆشکاو وتمان کاکی برا ئەوە شتی وانیەو ئاشتی بێت وچەك لەناوەوە بدەین بەئێوە حەق بوو خۆیان داوای وا لەئێمە نەکەن، لە٦/١٥ چوینە سیروان بۆپرسەی عبداللەی حاجی محمد بارام دوانزائیمام پێش دووڕۆژ بزوتنەوەو پارتی لەسیروان شەریان ببوو لەمەلای سیروانیان دابوو سجنیان کردبوو سەروریشیان تاشی بوو هەرلەبەرئەوەی کاك مەلائەحمەد بزوتنەوە نەبو لەگەڵیان نەبوو هەر کەسێ کەسێکی لەگەڵ نەبێت بەوشێوە وادیاربوو هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات بەروتی نەیان هێشتبو هیچ لەگەڵ خۆی لەماڵەکەی دەربکات، کاك مەلا ئەحمەدیان دەرکردبو پاشان سەری چەند ماڵێکمان دا، لە٦/١٦ لەسەید صادق چوینە پرسەی وەستا حسن فەتاح قەویلەیی و پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٦/١٧ لەسلێمانیەوە چومە دوکان و بۆکۆیەو بۆهەولێر، لە٦/١٨ لەهەولێر بوم لەمەکتەبی سیاسی خەریکی ئیشوکاربوین بۆ ئێوارەکەی دەعوەتی کاك حاکم قادر بوین لەعەینکاوا، لە٧/٢٠ سەعات (١٠) سەرلەبەیانی کۆبونەوەمان هەبوو لەمەکتەبی سیاسی یەکێتی لەهەولێر ئێوارەش لەماڵی کاك شێردڵ حەوێزی بوین لەعەینکاوا، لە٢١/ ٦ \١٩٩٥سەردانی وەزارەتی ناوخۆمان کرد کاك جەبار فرمان

بەوەکالەت لەویٚ بوو کاك ئەحمەد شەریف جێگربوو هەر لە٦/٢١ لەسەر بڕیاری مام جەلال پۆستی قائیمقامی هەڵەبجەی تازەیان دا بەسۆسیالیست و کاك فرهاد محمد رەسول بو بەقائیمقامی هەڵەبجە و دەست بەکاردەبێت واتە بەیەك قائیمقام بەشدار بوین بەڵام وەعدی کەیان دابوو بەوەش بەشداریمان کرد، لە٦/٢٢ لەهەولێرەوە گەرامەوە بۆسلێمانی بڕیاربوو (٣٠) کەسمان لەئاسایش بۆ دامەزرێنن پاشان وتیان ئاسایش تەنها یەکێتی دەبێت و نابێت هیچ لایەنێکی تێدا بێت منیش ووتم باشە چۆن بڵێین ئاسایش هی میللەتە یاهیچ ئەمە هەر هی یەکێتیەو هیچ لایەکی تیا نەبێت پێشتریش لەگەڵ پارتی دا وابڕیاردرابوو ئاسایش تەنها پارتی ویەکێتی زیاتر کەسی کەو هیچ لایەنێکی تێدا نەبێت سەرەتا (٤٠) کەسمان هەبوو کەحکومەت دامەزرا دەچون دڵ خۆشیان دەکردن ببنە یەکێتی یاببنە پارتی یادەریان دەکەن ئاخری دەریان کردن، لە٦/٢٣ مام جەلال و کاك عمری سەید عەلی و کاك مولازم عمرو کاك مستەفا چاورەش و کاك دانا ئەحمەد مەجید سەردانیان کردین و مام جەلال برایەتی و هاوکاری یەکێتی بۆحزبی سۆسیالیست دووپات کردەوەو سەردانەکە برایانەو دۆستانە بوو لەبارەگای تایبەتی خۆم بوو، لە٦/٢٥ لەسلێمانی بوین کۆبونەوە بڕیاری دا کە رۆژی ٦/٢٥ هەمووساڵێك رۆژی شەهید بونی سەیدا صالح یوسفی لەسەر راسپاردەی کۆنگرە بکرێت بەرۆژی شەهیدانی حزب، هەروەها رۆژی ٨/٨ ی هەموو ساڵێك رۆژی دامەزراندنی حزب بێت، لەرۆژانی ٢٦تا٦/٢٨ لەسلێمانی بوین مەشغوڵی کاری رۆژانە بوین، لە٦/٢٩ کاك شێخ محمدبەرزنجی هاتە لای من باسی هەڵوێستی بزوتنەوەی کردو وتی بزوتنەوە چونەتە ژێر تەئسیری پارتی وئێستا وەکو بزوتنەوەی ئیسلامی نیەو وەکو لایەنێکی کوردی و لەسەنگەری پارتیەوە شەر دەکات لەسودی پارتی و پارتیش کەدانیشت لەگەڵ یەکێتیدا پرسی بزوتنەوەی نەکرد تۆیش دۆستایەت هەیە لەگەڵیان و تەئسیرت لەگەڵ مامۆستا مەلا

عوسمان ومامۆستا مەلا عەلی هەیەو برۆین قسەیان لەگەڵ بکەین بزوتنەوەی ئیسلامی خۆی نەئالێنێ بەو شەرەوە منیش ووتم وەلا هەرچی بکرێت کاری باش من ئامادەم پێم باشە تۆ لەگەڵ مام جەلال قسە بکەیت چونکە ئەوانیش داواوشتیان هەیە لەیەکێتی ئەگەر قسە لەگەڵ یەکێتی بکەیت باشترە تاچ زوو ئێمە قەول بەوان بدەین و رێك بکەوین و وازلەشەری یالەشەری بزوتنەوەو یەکێتی کۆتایی بێ بێت و لەشەری یەکەم مامۆستا شێخ محمد لەماڵی خۆی ئەسلێمانی دانیشتبوو لەناو بزوتنەوە کاك شێخ پێیان دەوت جەلالیە یاسەر بەیەکێتیەو زۆرشتیان لێ دەشاردەوە سەرەرای ئەوەی ئەندامی مەکتەبی سیاسی و مەسئولی علاقاتی گشتی بزوتنەوەش بوو بەلام دەسەلاتی لەناو بزوتنەوەدا لاوازبوو لێرە دا سەیرەکە لەوەدا بو مامۆستا شێخ محمد بەرزنجی ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزوتنەوەی ئیسلامی وبەرپرسی پەیوەندی گشتی بزوتنەوەبو داوای لە من دەکرد داوا لە مامۆستامەلاعوسمان بکەم بۆچارەسەری کێشەکانیان لە ناو یەکێتی ولەناو پارتی یشدا بە ئێستاشەوە نامە بۆ مام جەلال وبۆ کاك مسعودو مەسئولەکانی هەردوولا دەنوسم کەسانی حزبەکانی خۆیان دێنە لام بە حوکمی دۆستایەتی وخەباتی کۆن زۆر جار ئەلێم مەگەر بلێم بۆ نیشانی ئیشەکانی خۆمتان نەکرد ئەو ئیشەی فلان بکەن مامۆستا شێخ محمد هەندێك خەلكی خزمی هەبوو لەناویان بەلام تەئسیریان نەبوو رۆیشتینە گوڵەخانەو هەوالمان زانی لەسەرگەتن سەرکردایەتی بزوتنەوە لەوێ بون مامۆستا مەلا عوسمان تازە دوومانگ بوو ژنی هێنابوو جاران باڵیان دەگرت هەڵدەسا بەلام ئەم جارەیان گورج وگۆڵ و توندو ریشی رێك خستبوو دەمی بەپێکەنین زۆر گۆرابوو کاك شێخ محمد وتی مامۆستا لەوەتەی ئەو ژنەی هێناوە لەهەموو رویەکەوە کراوەتەوە لەگەڵمان جاران تاقەتی کۆبونەوەی نەبوو دەیوت خۆتان برۆن بۆ کۆبونەوە لەوکاتەوە لەکۆبونەوەکان

بەشدارەو قسەی تێدا دەكات بەراستی واشبوو پاشان چوینە خورماڵ ولەوێیشەوە بۆ سەرگەت... سەرگەت لەساڵانی ١٩٧٦و١٩٧٧ زۆر لێی بوم لەسەرەتای هەشتاكانیشدا بەشەو سەدان جار لێوە هاتوچۆم كردووەو هەرلەو جێگایەش بوو بزوتنەوە خانویان كردبووە چوینە سەردانیان لەوێ كۆبونەوەیان هەبوو ئەوانەی لەوێ بون من و كاك محمد دۆلاشی بوین مامۆستا مەلا عوسمان ومامۆستا مەلاعەلی و مامۆستا مەلا ئەحمەد كاكە محمودو كاك مەلا عبدالرحمن نەورۆسی و زۆری كەش لەمامۆستایان لەوێ بون مامۆستا مەلا عوسمان رەئی باش بوو وتی هەرچۆن بێت لەو شەرە دووربكەوینەوە بەلآم ئەوان كوری منداڵ دوومنداڵیان گیرابوو كوژراویان دیارنین... مامۆستامەلاعەلی لەهەمویان رەئی باشتربوو لەسەر یەكێتی بەلآم مامۆستایان لە كۆبونەوە كە دەیانوت كاك عەلی باپیر لەلای یەكێتی تێكی داوە پەیوەندی توندو تۆڵ لەنێوان كاك كۆسرەت و كاك عەلی باپیر هەبوو دەیوت دەسەلآت لای منە بەلآم كاك مەلا ئەحمەدی ئێلآن پێ لایەنی پارتی پێ باشبوو زۆرقسەمان كرد لەسەر روداوەكان ئەوان وتیان بایەكێتی چارەنوسی گیراوەكان و تەعویزی زیانەكان و بارەگاكانمان بۆبكەن ئێمەش بەشداری شەر نابین لەگەڵ پارتی دا خۆ ئێمە بەشێكی پارتی نین و ئێمە لەگەڵ یەكێتی دا لەیەكەوە نزیكین پاشان من گەرامەوە بۆ گوڵەخانە، لە١/٧/١٩٩٥ لەگوڵەخانە بوم ئاگادار كراین بەشداری لەسوڵحی عەشائیری بكەین لەهەڵەبجە لەنێوان شەمێرانی و نەرورۆڵی دا خەڵكی ناوچەكان یاعەشائیرەكان بەهۆی شەری ناوخۆوە لەساڵی ١٩٦٤وە تێك چوبون نەرورۆڵی و كۆكۆیی حسێن عارف كەڵور عارف حمە چەق لەساڵی ١٩٦٤ لەگەڵ عبدالوهاب ئەتروشی هێرشیان كردبوو بۆسەر دێ ی باوەكۆچەك كۆكۆیی بۆسەرقادركۆكۆیی و حسێن عارف كوژابوو ئەوانیش گوندەكەیان سوتاندو چەند كەسیان كوشتبوو بۆیە دوژمنایەتی نەرورۆڵی و كۆكۆیی وئەوان..

ئەحمەدحمەئەمین یەکێ بوو لەپیاوە ناسراوەکانی عەشیرەتی نەوروڵی لەپرێس لەماڵی خۆی بووکاك حمە شەمێرانی بەهێزکەوە چوە سەری لێی دا (٥-٦) سەعات شەری کردو ئەحمەد حمە ئەمینی کوشت وژن وکوری وخزمی ئەوانیش کوژرا بەناوی ئەوەی سەربەجەلالیەو لەپرێس بوو لەماڵی خۆیدا ئەوەش بوە هۆی ئەوەی دوژمنایەتیەکی گەورە لەنێوانیاندا، لەساڵی ۱۹۷٦ کورێکی ئەحمەدحمە ئەمین کاك حمە شەمێرانی لەهەڵەبجە کوشتەوەو دوای ماوەیەك کوری ئەحمەد حمە ئەمین مەلا عبداللەش کوژرایەوە مەجید مەلاحامید و چەند کەسێکی کەش هەر کوژران لەنێوانیاندا ئێمەش چوینە ئەو سولحەو بۆچارەسەری مامۆستا مەلا عەلی عبدالعزیزیش هات پارتیش هاتبون دەیانویست بەناوی خۆیانەوە بیکەن هەڵسان پێش مامۆستا مەلاعەلی قسەیان کرد مامۆستا عاجزبوو خەریك بوو هەڵسێت و کۆبونەوەکە بەجێ بهێڵێت تاکاك عارف تەیفور هەڵسا قسەی کردو داوای لێبوردنی لەمامۆستا کرد ئەوسولحە کەماوەیەك زۆربوو هەبوو رێکەوتن و کۆتایی بەشەروهەراو کوشتاری نێوانیان هێنا کە(۲۸)ساڵ بوو ئەو ناکۆکیە هەبوو لەنێوانیان لەمزگەوتی گولان لەشاری هەڵەبجە کۆبونەوەکە زیاتر لە(۲۰۰)کەس بەشداربون هەموو لایەکمان کردمنیش قسەم کرد لەسەر ئاشتیەکەیان پاشان گەراینەوە بۆگوڵەخانە، لە۷/۲ لەگوڵەخانەوە گەرامەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ۳و٤و۷/٥ هەر لەسلێمانی بوم؛ لە۷/٥ لەسلێمانیەوە چومە دەربەندیخان وکەلارو کفری بۆتەعزیەی یەکێ لەپیاوە ناسراوەکانی عەشیرەتی روخزایی فەقێ عەلی بەراستی پیاوێکی باش و خزمەت گوزاری ناوچەکەو کورد پەروەربوو کورو برازاو خزمی لەشۆرشدا شەهید بوبون لەگەرانەوەش لەدەربەندیخان کۆبونەوەی لقی کەرکوکمان کرد کاك سەلام رەوف (سلامە سور) بەرپرسی لق بوو .. کاك سەلام پێشمەرگەی کۆنە کادرێکی دڵسۆزی حزبە لەسەرەتای هەشتاکان

بەبریندارى لە شەردا لەلاى قەرەجەتان گیرا لە ئیعدام رزگارى بو ... پاشان گەراینەوە بۆسلێمانى، لەرۆژانى ٦تا٧/٨ هەرلەسلێمانى بوم سەرقاڵى ئیشوكارى حزب بوین، لەشەوى ٨-٧/٩ شەر لەنێوان پارتى و یەكێتى لەدۆڵى سماقولى وزیارەت و دۆڵى بالیسان ورەواندوز دەستى پێ كردەوە پارتى هەموو ئاشتیەكى رەد دەكردەوەو ملى نەئەدایە ئاشتى یەك یەكێتى تێدا سەركەوتو بێت و یەكێتیش ئەمجارە هێرشى كردە سەر پارتى لەو سنورانە بەلاّم پارتى لەرەواندزەوە هێرشى كرد شەرى مالۆێران كەرو زۆرگەرم بوو بەلاّم یەكێتى نزیك سەرى رەش بوبووەوەو شكان وراویان نابون لەو شكاندنەدا یەكێتى زەرەریان زۆر هەبوو، لە٧/١٠ لەگەلّ كاك شێخ محمد بەرزنجى سەرى گوڵەخانەمان داو لەرێگا لاى چەناخچیان سەرى لەشكرى یەكێتى مان دا مام رۆستەم لەوێ بوو پاشان چوینە سەیدصادق بۆ لقى شارەزوورى سۆسیالیست و پاشان بۆگوڵەخانە، لە٧/١١ لەگوڵەخانە بوین شەرى پارتى و یەكێتى گەرم بوو لەدواى هەوڵێكى زۆریش بۆ نەبونى شەر لەوسنورە، لە٧/١٢ گەرامەوە بۆسلێمانى، لەرۆژانى١٣و٧/١٤ لەسلێمانى بوم، لە٧/١٥ وەفدێكى بەرزى ئێران هاتبون بۆنێوان یەكێتى و پارتى ئێمەشیان بینى و قسەمان كرد هەوڵى ئاشتى بدەین لەناوچەكەو قسەى زۆر كرا لەو بارەیەوە ئەوان مام جەلال و كاك مەسعودو ئێمەشیان بینیبوو وتیان پارتى ئاشتى ناكات بەلاّم نابێت یەكێتیش زۆر زەخت بخاتە سەرى ئێمە لەسەر ئەو شەرانە بەیانێكى مەكتەبى سیاسیمان دەركرد دژى شەرەكەو زۆر بەراستى باسى وەزعەكەمان كردو پارتى نەمەكتەبى سیاسیانەوە دوو بروسكەیان كردبۆ ئێمە لەسەر ئەوەى هەڵوێستى ئێمە لەسەرچى گۆراوەو ئەو بەیانە یەكێتى نوسیویێتى یاخۆتان ئێمەش وەلاّمان دانەوە كەئەو بەیانە خۆمان نوسیومانەو هەردوولا داواى هەڵوێستى رون دەكات ئێمە وتومانە پارتى هۆكارى شەرەكەیەو درێژەى پێ دەدات ئەگەرنا بائاشتى بكرێت و شەر

کۆتایی پێ بێت وتومانه پارتی ئاشتی ناکات ویەکێتیش هێرشی کردەوەو شەر دەستی پێ کردەوە واتەئەم جارە یەکێتی دەست پێشخەربولەشەرەکەدا، لەرۆژانی ١٦تا٧/١٨ ‌عەر لەسلێمانی بوین لەهەولۆتەقەلادا بوین بۆراگرتنی شەرەکە، لە٧/١٩ لەسلێمانیەوە چومە دوکان و کۆیەو بۆهەولێر، لە٧/٢٠ لەهەولێر بوم سەردانی مەکتەبی سیاسی یەکگرتووی ئیسلامیان کردو لەگەڵ مامۆستا صلاح الدین بەهادین و مامۆستاعەلی و برادەرانی کە قسەمان کرد لەسەر وەزعەکان و هەوڵی (٧) حزبەکە بۆچارەسەری دراو قسەی لێ کرا، لە٧/٢٢ ساڵرۆژی شەهید بونی کاك رەوف خەلیفە سەعید بوو..هەر ئەمرۆ سەردانی علاقاتی یەکێتی مان کرد، لە٧/٢٣سەردانی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی کوردستانمان کرد لەهەولێر لەوێش لەگەڵ کاك کەریم ئەحمەدو کاك ئەبوسیروان قسە لەسەر رۆداوەکانی ئەوکاتەی کراو چی بکەین و کۆبونەوەیەکی (٧) حزبەکەش بکرێت و دەست بەچالاکی کەبکاتەوەو پاشان سەردانی بارەگای مەکتەبی سیاسی حزبی زەحمەتکێشانمان کردو لەگەڵ کاك قادرعەزیزو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی قسەمان لەسەر روداوەکان کردو رەئی ئێمەو ئەوان نزیك بوو لەسەر روداوەکان لەوکاتە خەریکی تەعمیر کردنی خانوبوین بۆ مەکتەبی سیاسی لەهەولێرە گەورەیە خانومان بەکرێ گرتبوو مانگانە بۆ مەکتەبی سیاسی حزب کەیەکێتی دۆستمان بوو ئەو هەموو خانوەی هەولێریش هەبوو خانویەکیان بەئێمە نەدەدا پاشان خانویەکی کۆن بەهەزار تکاورجاو نامەی مام جەلال وپارتی دایانێ کەهەر تەعمیرەکەی پارەی دووخانوی تێ چوبوو، لە٧/٢٤ هەرخەریکی تەعمیر بوین، لە٧/٢٥ گەرامەوە بۆسلێمانی کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی لەسلێمانی ئەم جارە بزوتنەوە لەشەر بەشدار نەبون.. هەرلە ٧/٢٧ چوینە قەلاچۆلان بۆلای مام جەلال، لە٧/٢٨ لەسلێمانی بوم، لە٧/٢٩ چومە گوڵەخانە، لە٧/٣٠ لەگوڵەخانە بوم،

له٧/٣١ هەرلەگوڵەخانە بوم کۆبونەوەی فراوانمان لەگەڵ کادرەکانی سنوری لقی شارەزوردا هەبوو..هەرئەمرۆ ئەحمەد محمد رۆستم گەلاڵی بە(٣٥) کەسەوە هاتە ریزی حزبی سۆسیالیستەوە ، لە١/٨/١٩٩٥ گەراینەوە بۆسلێمانی هەواڵی بریندار بونی کاك مولازم کەریم هات کەلەزیارەت بریندار بووەو دەنگی واهەبوو پارتی خۆیان لەدواوە لێیان داوەو شەرنەبووە پارتیش وتبویان گوللەی دۆشکە بووە بەری کەوتووە لەودوو بۆچونە ساغ نەبوەوە لەصلاح الدینەوە بردیان بۆ ئورمیە لەئێران پێم ناخۆش بوو بەلام لەودوایە زۆر دژی یەکێتی بوو کردبویان بەبەرپرسی میحوەر دەیویست ئیسپاتی بکات لەپارتی پارتی ترە، لەرۆژانی ٢و٨/٣ هەرلەسلێمانی بوم، لە٨/٤ رادیۆی پارتی هەواڵی شەهید بونی کاك مولازم کەریمی بلاو کردەوە کەلەئورمیە مردووە دوای (٤) رۆژ برینداری..مولازم کەریم ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بوو بەلام پارتی دژی بون لەبروسکەیەکی وەلامی کاك نادر هەورامی بۆکاك مەسعودبارزانی دەڵێت مولازم کەریم کەس ئیعتبار بۆقسەی نەکات و گوێ ی مەدەنێ و هیچ نیە دوای ئەوەش خۆی بەکوشت دا بۆ پارتی، بەلام زۆرم پێ ناخۆشبو پیاوێکی تێکۆشەرو ماندو بەرەزالەت پێشمەرگە بو لە ناوو لەدەرەوە لەناو پاسوك دا، لە٨/٥ لەسلێمانی بوم ، لە٨/٦لای مام جەلال بوین لەقەلاچۆلان کۆبونەوەمان هەبوو کاك فاروقی مەلامستەفاش لەوێ بوو، لە٨/٧ لەسلێمانیەوە چومە گوڵەخانە کۆبونەوەمان هەبوو وەفدێکی بزوتنەوەی ئیسلامی سەردانیان کردین کەپێك هاتبون لە مامۆستامەلاعەلی عبدالعزیزو کاك مەلائەحمەدی ئێلان پێ وکاك کامیل حاجی عەلی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بزوتنەوەو چەندکەسێکی کە کۆبونەوەکە تەئکیدی لەسەر بێ لایەنی کرایەوە لەشەری پارتی ویەکێتی پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٨/٨ یادی ساڵرۆژی حزب بوو لەسلێمانی لەهۆڵی رۆشنبیری ئاهەنگی بۆئامادە کرابوو جەماوەرێکی زۆر بەشداری کرد یادی

(٢٠)ساڵەی حزب بوو نوێنەری هەموو لایەنەکان بەشداربون و وتاریان هەبوو مام جەلال مقابەلەیەکی تەلەفزیۆنی لەسەر حزب هەبوو زیاتر لەیەك سەعات لەسەر مێژوی حزب و خەباتی حزب قسەی کرد زۆرباش بوو هەروەها کاك دکتۆر محمودیش ئەو رۆژە لەسلێمانی بوو دەعوەتمان کردبوو سەری دا لەهۆڵەکەو هات دانیشت بەمنی ووت ئەوە مام جەلال لێرەیە ووتم نا نوێنەری یەکێتی هاتووە ووتی زۆر قەرەباڵغە وادیاربووکاك دکتۆر باوەری نەدەکرد سۆسیالیست خۆی ئەوەندە خەڵك کۆبکاتەوە کاك دکتۆر لەوکاتەدا هاتبودوە بۆ کوردستان بۆئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی لەوکات باسی ئەوە هەبوو کەسەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی حکومەت بێ لایەن بێت یایەکێتی و پارتی نەبن وادیاربوو یەکێتی وتبویان ئەگەر پارتی قبوڵ بکات وائامادەن سەرۆکی حکومەت بێ لایەنێك بێت ناوی کاك دکتۆریان هێنابوو گوایە پارتیش باسی کاك عەزیز محمدیان کردبوو بۆ سەرۆکی پەرلەمان ئەوە بڵاو بوو دوای چەند سەفەری کاك دکتۆر محمود لەنێوان صلاح الدین و قەلاچۆلان دا دووسێ کەسیش ژنێکی بەرپرسی مافی مرۆڤ لەئەمریکا کارتین یاکاترین و کاك بەختیار ئەمین لە فەرەنساو یەکێکی کە لەبەریتانیا و کاك عادل مراد و کاك عدنان موفتی لەگەڵ بوو لەقامیشلی و دیمەشق بۆ کوردستان کاك مەسعود رێگای نەدابوو کاك عادل مرادوکاك عدنان موفتی بێن و ناچار ئەوان گەرابونەوەو کاك دکتۆرو کاك هیوای کوری و ئەوژنەش کارتین مسئولی مافی مروف لەئەمریکا هاتبون لەرێگاش زۆررایان گرتبون تاگەیشتبونە صلاح الدین و کاك مەسعودیان دیبوو پاشان بۆ هەولێر و سلێمانی و بۆ قەلاچۆلان لای مام جەلال کاك دکتۆر تاخیر بوبوو ژنەکەش گەرابوەوە وتمان بە کاك دمحمود بۆ کاك مسعود بارزانی بۆ رێگای کاك عادل و کاك عدنانیان نەداوە کاك دکتور محمود ووتی ئەو عادلە لەخۆیەوە نامە دەنوسێ بۆیادی یەکێتی و دەنوسێ ئاشبەتاڵ ئەو عدنانەش

(٢٤) سەعات لەگەڵ یەکێتی دایە چۆن ڕێگایان دەدەن .. وتمان کاك دکتۆر هەرچیان کردبێت بەقەدەر کتێبەکەی جەنابتیان نەوتووە ووتی ئەوە کۆن بووە یەکێتی ئێستا وازی لێ ناهێنن هەربلاوی دەکاتەوە..هەرلەهۆڵی ڕۆشنبیری بوین ووتم کاك دکتۆر ئێستا ٨/٨ یادی دامەزراندنی حزبە کەخۆتی تیابووە هەروەها یادی مولود نەبەوی بوو وە لە٨/٨ لەعێراق حەفلەیە بۆراوەستاندنی شەری عێراق ئێران ئەو موناسەبانەی تێدابوو ووتم ئەمڕۆ لەبەرچاوی ئەو جەماوەرە زۆرەو هەموو لایەنەکان ئێستا جەنابت هەوڵی ئاشتی ئەدەیت ئەگەر حزبێکت لەگەڵ نەبێت کەس گوێت بۆ ناگرێت بەقوەتی حزبەکەوە قسە بکرێت زیاتر گوێت لێ دەگیرێت ودێن بەدەنگ داواکەتەوە ئێستا من لەبەردەم خەڵکەدا قسە دەکەم لەکۆنگرەش باس کراوەو جێگای ئێوە ماوەتەوە دەڵێم ئەوە کاك دکتۆر لەسەر داوای کۆنگرەو داوای کەسوکاری شەهیدان و داوای سەرکردایەتی حزب بریاری دا لەحزب ئیش بکات و حزب داوا دەکات کەسکرتێری حزب وەربگرێت وداواش لەجەماوەرەکە دەکەم و یەك چەپڵە هەمووی کۆتایی پێ دەهێنن و باشترین هەنگاوی مێژوییە کاك حمە شوانی حزبی شیوعی و کاك هیوای کوری لەلەپەنامان بوون یائاگایان لەقسەکان بوو منیش رەکو پێشمەرگەیەك و ئەندامی حزب لەگەڵتان دەبم هەندێك بێ دەنگ بوو سەیری کردو وتی من ئێستا بۆئاشتی نێوان ئەودوو برادەرە هاتوم واتا مام جەلال و کاك مەسعود ئەگەرشتی وابکەم لەوانەیەئەوئیشەی کە سارد ببێتەوەو نەکرێت ووتم بەپێچەوانەوە باشتر دەکرێت ووتی سبەینێ زوو وەرە بۆهەولێر لەماڵی کاك ئیحسان قسەدەکەین وبریاری کۆتایی لێ ئەدەین لەوێ .. ووتی قسە ئەکەیت ووتم من دەمەوێ تۆ قسە بکەیت وتی کەس نیە منافەسەت بکات و قسەی خۆت بەئارەزووی خۆت بکە ووتم کاتی خۆی من مشکیلەم نەبوو بەبۆنەی تۆو کاك رەسول منیش توشی کێشە بوبوم ئێوە لەسەر قسە مشکیلەتان هەبوو کەی من

مشکیلەم هەبوو پاشان من هەڵسام هەندێك قسەم کرد لەسەر وەزعەکان و وتم وەختی ئەوە هاتووە لەسەر ئەوشەرە قسە بکەین کەهەر لایەك ئاشتی ناکات بڵێن فلأن لایەنە پاشان لایەنەکان قسەیان کردو شانۆگەریەك پێشکەش کرا ..کاك حمەشوان وتی کاك دکتۆر سۆسیالیست دەتوانێ لەسلێمانی خەڵك کۆبکاتەوەو دەوریان هەیەو خاوەن شەهیدین و جەماوەری خۆیانن کاك دکتۆر قسەی کرد پاشان پارێزگار قسەی کرد، لە٨/٩ لەسلێمانی بوین لایەنە سیاسیەکان سەردانیان کردین حزبی شیوعی و زەحمەتکێشان و مەڵبەندی سلێمانی یەکێتی و زۆری کەش هەر لە٨/٩ پارتی ویەکێتی لە دبلن لەژێر چاودێری ئەمریکا کۆبونەوەیان بۆماوەی (٣)رۆژ هەبوو لە٨/١٠ هەربەبۆنەی یادی حزبەوە جەماوەرو لایەنەکان سەردانی بارەگای حزبیان دەکرد، لە٨/١١ لەسەر مەوعیدی پێشتر دامان نابوو لەگەڵ کاك دکتۆر محمود رۆیشتین بۆ هەولێر لەوی چوینە ماڵی کاك احسان موفتی وادیاربوو میوانی هەبوو ئێمەش چاوەرێمان کرد تامیوانەکە رۆیشت من وکاك برزۆو کاك سلێمان قەساب بوین من رۆیشتمە لای وتی خێر بوو بەم بەیانیە زووە ووتم وەڵا نازانم ئێمە لە٨/٨ هەندێك قسەمان کرد وادیاربوو وەزعی تەواو نەبوو زۆر گۆرابوو لەگەڵ ئەو رۆژەدا یەکێتی وتبویان پارتی قبوڵ بکات کاك عەزیز بێت وایە کەسێکی بێ لایەن پارتی قبوڵی نەکردبوو سەرۆکی پەرلەمان هی پارتیە بۆبیدەن بەیەکێکی کە وادیاربوو یەکێتیش وتبویان پارتی نەیکات ئێمەش نایکەین و ئاشتیەکەش سەری نەگرتبوو بۆیان زۆرتەواو نەبوو وەزعی نەفسی هەرلەبیریشی نەمابوو لەسلێمانی چیمان باس کردووە وتی وەڵا من حزبایەتیم پێ ناکرێت و ناتوانم ئەگەر ئیشێك پەیوەندی بەهەموو کوردەوە هەبێت دەیکەم ئەگەرنەش بێت بۆم ناکرێت مەبەستی لەحکومەتی هەرێم و پەرلەمان و ئاشتی هەردوولاو ئەوکات بەموافەقەتی هەمووان شتێکی وادەکات هەروەها وتی تاقەتی ئەو ململانێیەم نیە بەراستی..ووتی

من دەرۆم بۆلای کاك کۆسرەت وتمان لەگەڵت دێین و تابەرێت دەکەین بۆلای سەیتەرەکەی پارتی لای رێگای مەلا هۆمەرو ئەوناوە سەیارەیەکی بەئامانەت پێبوو منالەکانیشی لەگەڵ بوو بۆسەردان هێنابوینەوە جێگاشتان نابێتەوە و هەرواش بۆتۆو بۆ ئێمەش باشە بەرێت بکەین ووتی نەوەلا پێویست ناکات ووتمان بۆلای کاك کۆسرەت بابرۆین و ئێوە قسەی خۆتان بکەن لەوێ هەر حەزمان دەکرد لەگەڵیدا بین چوینە لای کاك کۆسرەت وادیاربوو تەلەفۆنی دەرەوەی هەبوو چو بۆتەلەفۆن کردن وپاشان دانیشتین چاوەڕێمان کرد لەبازار تاخیر ببون کاك ئەرسەلان بایز داوای لێکرد مقابەلەیەکی تەلەفزیۆنی بکات لەسەر سەفەرەکەی کەچی کردووە لەم هەوڵەی بۆئاشتی و ئەنجامی چی بوو دەگەرێتەوە کاك دکتۆر وتی مەجالم نیەو بۆم ناکرێت چونکە کاتم کەمە وتیان (٣-٤) دەقیقە وتی مەجالم نیە کاك ئەرسەلان پێشتر بەمنی وتبوو بۆ مقابەلەیەکی وا کاك سلێمان قساب جارێکی کە پێمان وتەوە بۆ ئیش ناکەیت ئەوە حزبی خۆتەو ئیش بکە لەناو قەرەباڵغیەکە ووتی من هەر کوردایەتیش ناکەم وادیاربوو لەقسەکانی کاك سلێمان عاجزبوو زۆریش بێ تاقەت بوو کاك کۆسرەت ووتی ئەوە سەیارەیە ببیەن لەبەر ئەوەش بەئێمەی وتبوو سەیارەمان ناوێت سەیارەی کاك کۆسرەتیشی وەرنەگرت هەمومان لەدەرەوە (٢٠) دەقیقە وەستاین چاوەرێ ی ئەوسەیارەمان دەکرد ئەوان چاوەرێ بون تورەببوو دەیوت هەرسواری سەیارەی هیچ حزبێك نابم کاك سلێمان هەر قسەی دەکرد وتی خۆئێمە پێویستمان نیە بەڵام حەزدەکەین جەنابت ئیشێکت لەکوردستان هەبێت و بۆشایەك پر بکەیتەوە قسەکەی کاك سلێمان خراپ بوو من پێم ناخۆش بوو.. من و کاك دکتۆر هەندێك دوربوین لەوان سەیرێکی منی کردو وتی ئەمە دائیم لەگەڵتایە ووتم بەڵێ زۆرجار وتی خوا هیدایەتت بدات لەوێ کاك دکتۆر رۆیشت و تایەی سەیارەکەی پەنچەربوو تاخیر ببون کاك عەلی عبداللەش لەصلاح الدین وتبوی

بـۆدوا کـەوتووە ئـەوانیش وتبویـان لەوانەیـە یـەکێتی کـەمینی بۆدانابنێـت و کوشتبێتیان کاك عەلی هاتووچۆی دەکردو دەیوت بەراستی پیاوێکی باشبوو دکتۆر محمود بۆ وای بەسەرهات وتبویان خۆ نەمردووە دەڵێت پیـاوێکی بـاش بـوو.. کـاك دکتۆر رۆژ لەسەر ٥٠ بە٥٠ کە قسەی دەکردوبەسوعبەت وتی بۆکاك سامی نامرێـت وتبویان بۆ بمرێ وتبی لەگەڵ یەکێتی (٥٠بە٥٠) ین و کاك رەسول چوە ناویەکێتی و کاك سامی بۆناوپارتی.. کاك رەسول بۆلیژنەی سەرۆکایەتی و کاك سامی بۆلیژنەی سەرۆکایەتی.. کاك رەسول کارگێرو ئەمیش کـارگێر کـاك رەسول مـردوەو دەبێـت کـاك سـامیش بمرێـت کـاك دکتـۆر محمـود شـەو لەتەلـەفزیۆنی پـارتی دەرکـەوت و مقابەلەی کرد لەسـەر سـەفەرەکەی وتـی وەکـو کوردێـك لەکوردسـتان حکومـەت و کورد هەرشتێکم بۆدیـاری بکـات ئامـادەم وەری بگـرم و ئـیش بکـەم کـاك سلێمان تەلـەفۆنی کـردو وتـی کـاك دکتـۆر لەتـەفزیۆنی پـارتی قـسەدەکات و ئامادەیـە بۆهەرئیـشوکارێك لای ئێمـەش دەیـوت کوردایـەتیش ناکـەم ووتم حەقیـەتی لەسـەر قسەکانی تۆ وای وتوەوە پاشان گەراینەوە بۆ بارەگای مەکتـەبی سیاسـی کـەتازە تەعمیر کرابوو شتیان بۆی دەکری، لە٨/١٢ لەهەولێربوم خەریکی ئیشوکاری حزب بـوین، لـە٨/١٣ لەهـەولێر بـوین سـەردانی حزبـی زەحمەتکێـشان و بزوتنـەوەی ئیـسلامیان کـردو لەسـەر وەزع و روداوەکـان قـسەمان کـرد، لـە٨/١٤ سـەردانی مەکتەبی سیاسی یەکێتیمان کرد لەهەولێر، لە لـە٨/١٥ مەکتـەبی سیاسـی یـەکێتی سەردانیان کردین لەهـەولێر، لـە٨/١٦ لەهـەولێرەوە گەراینـەوە بۆسـلێمانی پـارتی داوای کۆبونەوەی لێ کردین لەصلاح الدین وادیاربوو داواش لەبزوتنەوەی ئیسلامی کرابـوو، رۆژانـی ١٧و٨/١٨ دانـا بۆئیـسراحەت وسـەیری ئـەو نامـەو شـتانەی لـەو ماوەیەدا بـۆم هتـابون و رێکخستنیان، لـە٨/١٩ لەسـلێمانیەوە چـوم بـۆ سـەردانی کوێخا سمایلی تەلان و گەرامەوە بۆسلێمانی مام کوێخا لەکاتی یـەکگرتنمان لەگـەڵ

پارتی زۆری پێ خۆش بوورۆرجار سەردانی دەکردین بەلاَم دوای ئەوە ئیتر زۆر سەری لێ نەدابن وادیاربوو ئەویش عاجزببوو لەگەلّ پارتی ئاشت بوینەوە بەلاَم هێشتا مام کوێخا لەگەلّمان ئاشت نەببوەوە لەسەرپارتی من هەر سەردانم دەکرد هەرکات بۆم بکرایە، لەرۆژانی ٢٠و٨/٢١ هەرلەسلێمانی بوم، لە٨/٢٢ لەسلێمانیەوە چومە هەولێر کۆبونەوەمان هەبوو لەمەکتەبی سیاسی، لە٨/٢٣ لەهەولێر بوین لەمەکتەبی سیاسی پێشوازیمان کرد لەکۆمەلّەی رۆشنبیرانی کەرکوك تازە دامەزرابون کاك سوارەوخاتووکەژالّ ئەحمەدو زۆری کە بون لەسەر روداوەکانی ئەوکاتەو کاری ئەدەبی قسە کران هەر هەمان رۆژ گەرامەوە بۆسلێمانی، لەشەوی ٢٥-١٩٩٥/٨/٢٦ (PKK) لە(١٥) جێگاوە پەلاماری مەقەراتی پارتی دا لەبامەرنی وزاخۆو مێرگەسورو بارزان وئامێدی و زۆرجێگای کە وەزۆر جێگای لێ گرتن پارتی وەزعیان شربوو لە٨/٢٥ کاك جمعە لای پارتی بوو کەمەسئولی (PKK)بوو لەکوردستان بەحساب ئاگای لێ نەبووە هێرش دەستی پێ کردوە هەردوولا ئیعلانی شەریان کردبوو یەکێتیش لەوکاتەدا خۆیان دەپاراست لەشەر منیش هەرلەگەلّ مام جەلال دا قسەم کرد ئەگەر ئاشتی بکەن ئێوە تێکەلّی شەری (PKK) وپارتی نەبن باشە ئەگەر نا ئەوەشتێکی کەیە، لە٨/٢٩ کۆمەلێك لەسەرۆك عەشیرەتەکان سەردانیان کردین و وتیان ئەو شەرانە هەموی کوردو کەسوکاری ئێمە دەکوژرێت بەلّکو هەولێك بدەن بۆراگرتنی شەرەکە مام کوێخا سمایلی تەلان وکاك محمدحاجی محمود هارونی و کاك حاجی جەزاحمە تالیب و کاك عمر دەمرکانی وکاك شێخ ئاشتی لەرانیەو زۆری کە لەسەر ئەوە قسەکرا سەردانی مام جەلال و کاك مەسعود بکەن و ئەرشتانە هەموی تەرح بکەن لای ئەوان و بگەنە چارەسەرێکی بنەرەتی..هەمان رۆژ کۆبونەوەی هەردوو مەکتەبی سیاسی سۆسیالیست و بزوتنەوەی ئیسلامی هەبوو لەسەر رێکەوتنی نێوان سۆسیالیست و پارتی و

سۆسیالیست و بزوتنەوەو پارتی هەرسێ لا پێکەوە کەهەردوولامان بەرنامەیەکی هاوبەشمان هەبێت لەسەر روداوەکان وەفدی بزوتنەوە بریتی بوون لە مامۆستامەلا عەلی عبدالعزیزوماموستا مەلائەحمەدی ئێلان پێ و کاك شێخ محمد بەرزنجی و کاك کامیل حاجی عەلی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بزوتنەوە بون وە وەفدی سۆسیالیست من و کاك محمد دۆلاشی و کاك سەیدقادر بەشدار بوین لەمەقەری تایبەتی من بوو لەسلێمانی هەرهەمان رۆژ وەفدێکی ئێران سەردانی کردین و لەگەڵ ئەوانیش کۆبوینەوەو لەسەر روداوەکان قسەمان کرد وادیاربوو ئەوان پشتیوانیان لە (PKK) دەکرد بەقەسەکانیاندا، لە٨/٢٧ سەعات (٦)ی سەرلەبەیانی دەرچوین بۆ هەولێرو بۆمەکتەبی سیاسی پاشان بەرەو مصیف صلاح الدین بەرێ کەوتین بۆمەکتەبی سیاسی پارتی و لەلایەن کاك مەسعودبارزانی پێشوازی کراین و کۆبونەوەیەکی دووقۆلیمان هەبوو پاشان هەردوو وەفد لەگەڵ وەفدی بزوتنەوەی ئیسلامی کۆبوینەوەو هەرسێ لا زۆرشتمان باس کردو بریاردرا رێگای سۆسیالیست بدرێت مەقەرات لەسنوری دهۆك و هەموو ناوچەکانی بادینان وسۆران بکاتەوەو هاوکاری هەبێت هەتا لەمیزانیەکە چۆن بەحزبەکانی کەش دەدرێت با سۆسیالیست پشکی هەبێت بەڵام پارتی زۆر دەترسان لەوهێرشەی (PKK) کاك مەسعود هەر تەئکیدی دکردەوە بڵێت یەکێتیش بەشدار نەبن لەم شەرە وەئەگەر بەشدار بون ئەوە کێشە بۆئێمە دروست دەکەن مەبەستی ئەوە بوو من بڵێم بەشدار نابن منیش ووتم باوەر ناکەم بەشداربن و ئەگەر تۆپێت باش بێت من قسەش لەگەڵ مام جەلال دەکەم بۆ ئەو مەبەستە وتی باشەو چاوەرێ ی وەڵامەکەش دەکەم ئەگەر وابێت هێزەکانی ئێمە زەمانەتمان هەبێت یەکێتی بەشداری شەرناکات بو هاوکاری pkk ئەوە ئێمە هێزە کانمان بۆ بۆئەولا دەبەین ووتم وەلا ئەوەیان خۆتان دەزانن بەڵام ئێمە هەوڵ دەدەین کەئاشتی بکرێت کاك مەسعود وتی ئەگەر یەکێتی ئاشتی بوێت

لەم شەرە بەشدار نابێت لەگەڵ (PKK)دا داوایان کرد بلاوکراوەیەکی هاوبەش بکرێت لەسەر هێرشی(PKK) من ووتم وەکو هەواڵێك لەبلاوکراوەو رادیۆ بلاو بکرێتەوە کەهێرشی (PKK) بۆسەرپارتی کارێکی خراپەو شەرەکە قوڵتر دەکاتەوە پەکەکە خۆشیان دووبەلاغیان دەکردبوو کەهێرشیان دەست پێ کردووە بۆسەرپارتی و لەناویان دەبەن بلاوکراوەیەکان زۆرشتێکی خراپ بوو بۆ پەکەکە شەو لەصلاح الدين لەمەقەری بزوتنەوەی ئیسلامی بوین ئەو شەوەش قسەکرا، لە٨/٢٨ لەصلاح الدينەوە گەرامەوە بۆهەولێرو ئێوارەکەی کۆبونەوەی هەمو حزبەکان هەبوو داوایان کرد کە بەرەیەك لەگەڵ پەکەکە بکرێتەوە لەگەڵ حزبەکانی کوردستان چەند رۆژێك بوو پێش ئەوەش هەروا بەردەوام بوو ئەوکۆبونەوانە ئێوارە لەبارەگای زەحمەتکێشان کۆبونەوەکە هەبوو لایەنەکان بە پەکەکەشەوە بەشدار بون جگە لەیەکێتی، لە٨/٢٩ لەمەکتەبی سیاسی بوین لەهەولێر وەفدێکی پارتی پارێزگاران بەسەرۆکایەتی کاك عمرئاغای سورچی سەردانی کردین دوای نیوەرۆی ئەو رۆژە سەردانی مەکتەبی سیاسی بزوتنەوەمان کرد بۆ کۆبونەوە لەسەر ئەنجامی کۆبونەوەی صلاح الدين دوای عەسریش سەردانی کاك کۆسرەتمان کرد لەسەر مەسەلە تازەکان قسەمان کرد، لە٨/٣٠ گەرامەوە بۆسلێمانی بۆ ئەوئیشو کارانە ، لە٨/٣١ لەسلێمانی بوم کۆبونەوەمان هەبوو، لە١٩٩٥/٩/١ لەسلێمانی بوم مام جەلال بەتەمای سەفری دەرەوە بوو داوای کۆبونەوەیەکی کردبوو لەحزبەکان سۆسیالیست و زەحمەتکێشان و ئاشوری و بزوتنەوەو پارتی کار لەوێش راسپاردەکەی کاك مەسعودم پێ ووت مام جلال ووتی سبەینێ وەلامت لێ دەگێرمەوە وادیاربوو کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی هەبوو. دوای نیوەرۆی رۆژی ٩/١ لەهۆڵی رۆشنبیری سلێمانی فیستڤاڵی هونەری هونەرمەندانی یەکگرتوی کوردستان هەبوو کارێکی باش و نایابیان پێشکەش کرد ئێمەش لەوێ بوین، لە٩/٢

نامەیەکم بۆکاك مەسعودبارزانی نوسی و کەدڵنیابێت یەکێتی شەرتان ناکەن دوای ئەوەی مام جەلال وەلامی داینەوە یەکێتی ئامادەیە بۆئاشتی و کۆبونەوەی هەردوولا نەك شەرتان بکات کاك مەسعود لەبارزان بوو لەوێ وتبویان نامەکەی بۆ دەبەین و وەلامتان لێ دەگێرینەوە، لەشەوی ٢-٣/٩ کاك سالارعەزیز تەلەفۆنی کرد وتی ئاگاداری پارتی بکە ئێمە هەموو هاوکاریەکیان دەکەین و ڕێگایان دەدەین ئەو هێزانەی پارتی لەهەڵەبجە بەناوی سوسیالیستەوە ئێوە یاخۆیان شەو هەموی بەرن بۆ صلاح الدین بۆشەری پەکەکە کاك سالار ئەوکات پارێزگاری سلێمانی بوو منیش ووتم باشە پێیان دەڵێم وتم من چی پەیوەندیەکم بەوە هەیە هێن بەرم من داوام لە یەکێتی کردوە هاوکاری pkkنەکات دژی پارتی بۆ ئەوەی شەرەکە زیاترقوڵ نەبێتەوە زۆرم لاسەیربوو لەلایەك دژی پارتی و لەلایەك مەجالی هێزەکانی پارتی لەهەڵەبجەوە بەناو یەکێتی دا برۆن یابۆیان رەوانە بکەن بۆ صلاح الدین زۆرگەرم بون من بەسیاسەتێکی غەڵەتم زانی رۆژی پێشو تامن فریاکەوتم بەتەمای بەشداری شەربون بۆهاوکاری pkk دژی پارتی بەلام ئەم هاوکاری پارتی دژی pkk ئەوە یەکێتی کە زورجاردۆستەکانی سقەیان کەم دەبێتەوە پێیان چونکە یەکێتی نە شەری شەرەو نەئاشتی ئاشتیە بەوشێوەیە من ئەوەم نەوت بەپارتی تاوەختی بەسەرچوو پارتی خۆشیان نەیان دەکرد بەلام زیاتر بریاری بەپەلەی یەکێتی پیشان دەدا کەچەند ئامادەن بۆهاوکاری پارتی خەت بەسەر هەموو کەس و دۆستی خۆیان بهێنن چونکە پەکەکە تائەوکاتە دۆستی یەکێتی بوون هەرچەند پێش ئەوەی من قسە لەگەڵ مام جەلال بکەم یەکێتی کۆبونەوە بەشداری شەر بکەن من قسەکانم کرد مام جەلال قەناعەتی کرد، لە٢/٩ لەگەڵ کاك محمد دۆلاشی چومە شارەزوور بۆ هەندێك پرسەو کێشەی عەشائیری ناوچەکەش هەبوو پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٣/٩ لەسلێمانی بوم لقی سلێمانی ئاگاداری

کردم کەهەموناوچەکانی سنوری لق کۆبونەتەوەو چاوەروانی من دەکەن منیش بەشداری کۆبونەوەکەیان بکەم سەردانم کردن (١٠٠)کادرێك دەبون کۆبونەوەکە (٤) سەعاتی خایاند لەسەرهەموو مەسەلەکانی حزب و دەوری و شێوەی کارکردن قسەم بۆکردن، لە٩/٥ هەموو حزبەکان بەپەکەکەشەوە کۆبونەوەمان هەبوو لەمەکتەبی سیاسی سۆسیالیست بۆ مەسەلەی بەرەیەك لەگەڵ پەکەکەدا قسەیەکی زۆرکرا لەهەموو رویەکەوە بەڵام چی قسەکرابوو لەکۆبونەوەکە هەموی گەیشتبووە پارتی نازانین کێ گەیاندبوی شکمان لەحزبێك هەبوو وادیاربوو گەیشتبون لەوکۆبونەوەیەدا کاك قادرعەزیز بوو وتی ئێمە بەقسەی پەکەکە باوەر ناکەین و چی هەیە دەبێت لەپێشەوە بکرێت ئەگەر وانەبێت ئێمە هیچ ناکەین لەگەڵیان و قسەکانی کاك قادریش راست بوو پەکەکە هیچی نەدەکرد و تەنها پێویستی بەوە بوو هەندێك دەنگ بۆخۆی کۆبکاتەوەو هەموو لایەکیش بەپارتی و یەکێتیەوە بەبچوك وبەبرا بچوکی خۆی دەزانێ و خۆشی بەکوێخای هەموو کورد دەزانێ بەئەقڵیەتێکی سەیرەوە بیریان دەکردەوە، هەرلە٩/٥ وەڵامی کاك مەسعود هاتەوەو زۆر مەمنون بوو لەهەوڵەکەی من و داوای دڵنیایی زیاتری کردبوو لەورۆژەش مام جەلال سەفەری دەرەوەی کردبوو ئێوارە تەلەفۆنم بۆکاك کۆسرەت کردو ووتی ئاگام لێ هەیەو بەیانی قسەی لێ دەکەین ئەم شەو میوانم هەیە، لە٩/٧لەسەعات (٩/٥٠)ی سەرلەبەیانی لەرێگای کاك کۆسرەت بۆئەنجومەنی وەزیران لەشاری هەولێر ساروخ و تی ئێن تی یان دانابوو لەگەڵ تەقەش تەقیەوەو کاك کۆسرەت بەسوتفە لەسەیارەکەی ئەوی نەدابوو لەسەیارەی حیمایەکانی دووکەس بەرکەوتبوو لەوکاتەش دا سەیارە سەریع ببون لەیەکیان دابوو لەوێ (٦) کەسیان شەهید بون دووانیان خزمی بون زیانیش لەسەیارەکانیان کەوتبوو ئێمەش هەرلەوکاتەدا گەیشتینە ئەنجومەنی وەزیران وادیاربوو لەرێگای مەلاقادری برایەتی

و یەکێکی بزوتنـەوەوە دانرابـوو بزوتنەوەکـەیان گرتبوولەعەشـیرەتی سـورکی بـوو لەگەڵ کاك کەریم سنجاری وجەماعەتی پـارتی پێکـەوە ئـەوەیان کردبـوو کەچوین کاك کۆسرەت وتی ئەوەتا لەولاوە لای ئێوەوە هەوڵ دەدەن بۆئەوەی ئێمە نەچینە شـەر لـەم لاشـەوە دەمـان کـوژن مـن ئـەوەم بـاس نـەکرد کـەئێوارە پـێم وت هەرئەوەندەم وت زوو بریار مەدەن تـەحقیق بکـەن ئـەوکات بریـار بـدەن وادیـاربوو پارتی و بزوتنەوە ئەوباڵەی لای پارتی نزیك بـون ئـەوەیان کردبـوو لەهـەمان کاتـدا ئەگەر عەمەلیەکە سەرکەوتوبوو پەلاماری هەولێر بدەن بزوتنەوە نەناوشارو پـارتی لەدەرەوەی شار ئەوکات نەیانزانی کەپەکەکە هێرشیان بۆ دەکات و ئەو وەزعـەیان تێك دەچێت دوای ئەوەش کاك مەلا غەنی ومەلاقادری برایەتی کەزانیان ئیعترافیـان لەسەر کراوەو راسـت بـووە ئـەوەیان کـرد بـەهاوکاری پاداشـتی پـارتی نەچـونەوە شاری هەولێرو هەتا ئـەو رۆژەی دەبابـە وپـارتی نەچـونە هـەولێر لەترسی یـەکێتی بارەگاشیان لەهەولێر هەبوو واتا تـا٣١/٨/١٩٩٦، لـە٨/٩ لەمەکتـەبی سیاسـی بـوم لەهــەولێر خــەریکی ئیـشوکاری رۆژانــەی خۆمــان بـوین، لـە٩/٩ لەهــەولێر بـوم خۆپیـشاندان دژی ئــەوکارەی بەرامبــەر کــاك کۆســرەت کــرا جــەماوەرێکی زۆر کۆبونەوەو منیش قسەم کرد بۆجەماوەرەکە لەسەر ئەو هەوڵانـە کەناگەنـە ئـەنجام کەمن پێم وایە ئـەوەرژێم دەیکـات نـەك لایەنـەکان زیـاتر روبـەروی رژێمـم کـردەوە بۆخاو کردنەوەی وەزعەکە دەشمزانی کەچۆن کـراوە بۆکـاك کۆسـرەت دانـراوە لـە پارێزگـا قـسەمان کـرد بۆجـەماوەر کەلـەوێ کۆبوبونـەوە، لـە١٠/٩ لەهـەولێرەوە گەرامەوە بۆسلێمانی، لە١١/٩چومە سەیدصادق و بۆگوڵەخانە کۆبونەوەمان هـەبوو لەگــەڵ بزوتنــەوەی ئیـسلامی، لــە١٢/٩ وەفـدێکی بزوتنــەوە هاتنــە گوڵەخانــە کەمامۆستامەلاعەلی عبدالعزیزو کاك کامیل حاجی عەلی بون و کاك محمد دۆلاشیش لـەوێ بـوو لەسـەر هاوکـاری هـەردوولاو یەکخـستنی هێـزو داوای ئەوەشـیان کـرد

کەلەرۆژی تەقینەوەکە دووژن گیراوە کەسەر بەبزوتنەوەن گیراون بەکێتی بەناحەق گرتونی بەریان بدات من ووتم مامۆستا حەقە ئێوە ئەگەر ئاگاتان لێ نیە خۆتان نەکەنە خاوەنی چونکە ئەو تەقینەوەیە ئەوان کردویانە مەلا قادری برایەتی و ئەوان بەشدارن ئەگەرئێوە هەم وەکو بزوتنەوە کردوتانە ئەوە شتێکی کەیەو ئەگەر واش نیە ئەوەخۆتان مەکەن بەخاوەنی یالەپشتی تۆوە شتی واکرابێت ئیترباسی ئەوەنەکرا کۆبونەوەش کۆتایی پێهات و ئەوان گەرانەوە، لە٩/١٣ گەرامەوە بۆسلێمانی لەورۆژانەشدا لەرانیە یەکێتی بارەگاکەیان داینەوە دوای تەعمیرمان کردەوەو بەتەمای کردنەوەی بوین بەهەزار ئەم لاوئەولاو ناوی خوا بارەگاکەیان داینەوە لەدوای ئەوەی پارتی گرتبوی یەکێ لەکۆنە سۆسیالیستەکان حاجی ابراهیم رۆستەم وتبوی حەز دەکەین بیدەنەوە بەجاش و موستەشارەکان چونکە کاتی خۆی موستەشاری تێدا بوو بەلام نەدرێتەوە بە سۆسیالیست ئەمەمان نەدەزانی بۆ وابیر بکەنەوە، لە٩/١٤ چومە دوکان و بۆچوارقورنەو رانیە بۆکردنەوەی بارەگای رانیە لەوێش لایەنەکان سەردانیان کردین کاك مستەفا چاورەش بەرپرسی مەلبەندی یەکێتی بوو کاك مستەفا سەید قادر وکاك مستەفا سەلیم سێ کەس لەرانیە بەرپرس بون و هەرسێکیان ناویان مستەفا بوو.. بزوتنەوەی ئیسلامی و یەکگرتوی ئیسلامی و حزبی شیوعی کوردستان و پەرلەمانتارەکان لەوێ بون پاشان کۆبونەوەمان بەناوچەی رانیە کردو رەدی زیارەتی ئەو حزبانەشمان دایەوەو زۆریش لەخزمەکانی کاك رەسول سەردانیان کردین لەبارەگای حزب زۆرمان پێخۆشبوو بۆ نیوەرۆکەی چوینە ماڵی کاك حەسەن ئاغا لەسەرچاوە برای شەهید ئەحمەدخان پاشان بەرێ کەوتین بۆ هەولێر، لە٩/١٥ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزب دەستی پێکرد لەسەرهەلومەرجی کوردستان و روداو چالاکیەکانی ئەو ماوەی نێوان دووکۆبونەوەی حزب منیش

بەتەمای سەفەری سوریاو دەرەوە بوم کۆبونەوە بەردەوام بوو تا ٩/١٨ کۆمەڵێك گۆرانمان کرد لەدەزگاکانی حزب و لق و ناوچەکان دا کاك بەکر بۆ لقی کەرکوك و کاك عینایەت بۆرانیەو قەلآدزەو پاشان کرا بەمیحوەر کاك هەلۆیش لەسەر تەکەتولاتی خۆی چەند جارێك ئاگادار کرابوو تەجمید کراو لەمەکتەبی سیاسی لابرا بۆماوەی دوومانگ هەروەها کاك سلێمان قەساب بۆماوەی (٢) مانگ تەجمید کرا لەسەر ئەوەی شەروهەرای کردبوولەگەڵ کاك محمد غەفوردا، لە٩/١٩ کۆبونەوەمان بەخوێندکاران و لاوان کرد لەمەکتەبی سیاسی هەرلە٩/١٩ بەلاغی کۆمیتەی ناوەندی دەرچوو لەسەر ئەنجامی کۆبونەوەکە، لە٩/٢٠ لەماڵی کاك قادرعەزیز بوین نیوەرۆ کاك جمعەی پەکەکەش لەوێ بوو دکتۆرعەلی ومریم خانیش لەوێبون لەهەولێر قسەکرا لەسەر روداوەکانی کوردستان وناوچەکە، هەرلە ٩/٢٠ کاك کۆسرەت سەردانی کردین لە مەکتەبی سیاسی و باسی ئەوەشی کردکە جوابەکەی من بەپارتی بڵێن ئێمە وەکویەکێتی نیشتمانی کوردستان بەشدار نابین لەشەر لەگەڵ پەکەکەدا دژی پارتی وەمن پارتی دڵنیابکەم، لە٩/٢١ هەرلەهەولێر بوم، لەرۆژانی ٢٢و٩/٢٣ لەهەولێربوم، لە ٩/٢٤ لەهەولێر سەردانی ماڵی کاك شێخ لەتیف بەرزنجی مان کردو دوای نیوەرۆیش کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەهەولێر، لە٩/٢٥ لەهەولێرەوە گەرامەوە بۆسلێمانی، لە٩/٢٦ لەسلێمانی بوم میوانمان زۆربوو زۆریش هیلاك بوم مەوعیدەکان تێکەڵ بوبون لەوەماوەیە لەوێ نەبوم و دەشیان زانی سەفەر دەکەم زۆرتر هاتبون لەسەعات (٥)ی سەرلەبەیانی بەنیازی سەفەری سوریا بوم لەسلێمانیەوە دەرچوین بۆهەولێرو پاشان بۆصلاح الدین وئاکرێ لەگەڵ پارتی کاك فرانسۆ هەریری ئامادە کردبوو بۆئەوەی لەگەڵمان بێت لەسەفەرەکە چوینە ئاکرێ و ئەتروش و لەزاوێتە برادەرانی خۆمان پێشوازیان لێ کردین و بەرێ کەوتین بۆدهۆك لەقصر دهۆك کاك عبدالعزیز

تەیب وکاك شەوکەت شێخ یەزدین و کاك فرانسۆش پێش ئێمە لەوێ بوو پێشوازی کراین جگە لەبرادەران لەوێ خۆمان (١٥) سەیارە و(١٠٠)پێشمەرگەمان لەگەڵدا بووئەو چەند رۆژەی لەدهۆك بوین بەرنامەی جەولەمان لەلایەن برادەرانی پارتیەوە بۆ دانرابوو خۆمان داوای چاوپێکەوتنمان دەکرد بۆکوێ برۆین و سەرلەکوێ بدەین میوانی برادەرانی پارتی بوین سەرلەبەیانی رۆژی ٩/٢٨ ،سەری کاك نێچیرڤان بارزانیمان دا کاك محمددۆلاشیم لەگەڵ بوو دوای نیوەرۆی ٩/٢٨ سەردانی چەند حزبێکمان کرد لەوێ وەکو بزوتنەوەی ئاشوری و بزوتنەوەی ئیسلامی و حزبی زەحمەتکێشان و یەکگرتوی ئیسلامی و حزبی شیوعی کوردستان و لقی یەکی پارتی بەلاَم هەموویان لەژووری عەمەلیات بون لەبارەگای سوپای یەك بون چوینە لایان لەوێ پاشان چوین بۆ پرسەی برای کاك کەریم سنجاری کەلەدهۆك بەروداوی سەیارە مردبوو ئەوانە هەمووی بەتەلەفزیۆن ورادیۆی پارتی لە دهۆك بلاَوکرایەوە بەلاَم زۆرکەمی بەرادیۆی مەرکەزی بلاَویان نەکردەوە لەگەڵ ئەو حزبانە هەموویان قسەمان کرد جگە لەبزوتنەوەی ئیسلامی کەسیان لەپارتی رازی نەبون و زۆرخەڵکی سەربەیەکێتیش دەهاتن سەردانیان دەکردین لەجێگای ئیسراحەتی خۆمان لەدهۆك، هەرلە٩/٢٩ نیوەرۆ دەعوەتی کاك نێچیرڤان بوین لەبارەگای خۆی لەدهۆك وەلەسەعات (٣)ی عەسریش کۆبونەوەی هەردوو مەکتەبی سیاسی پارتی و سۆسیالیست هەبوو بەئامادە بونی دەزگا حکومیەکانی دهۆك بۆهاوکاری سۆسیالیست لەلایەن پارتی کاك نێچیرڤان و کاك عبدالعزیز تەیب پارێزگاری دهۆك و کاك شەوکەت شێخ یەزدین و کاك شەوکەت بامەرنی و کاك کاروان ئاکرەیی نوێنەری لق وکاك شوکری نێرویی نوێنەری لق و نوێنەری پۆلیس و کاك فرانسۆ نوێنەری کاك مسعودبارزانی وەلەلایەن سۆسیالیست من و کاك محمد دۆلاَشی وکاك برزو کاك هوشیارحسن بەشداربوین لەلایەن کاك مەسعودەوە بریاردرا کەبارەگای

سۆسیالیست لەدهۆك و زاخۆو ئاكرێ بكرێتەوەو بارەگا كۆنەكانمان بۆ بگێرنەوەو مصارفی دانانی لق لەسەر ئەوان بێت وكاتی خۆی بارەگای لای ئەوانەوە پۆلیسمان بۆدابمەزرێنن بۆ پاسەوانی بارەگاكان و هەندێك خەڵكمان بۆدابمەزرێنن لەدائیرەكان بەتایبەتی ئەوانەی دەركراون میزانیەش بۆ حزب دانێن و هاوكاری تەواومان بكەن لەناوچەكەدا رێگامان لێ نەگرن لەبردنی نەوت و بەنزین و ئازوقە بۆسلێمانی بەوەرەقەی سۆسیالیست ئەوەش یەكجار رێگایان داو بەلاّم ئەوانەی باس كرا زۆری هەرنەكرا ئیتر نەیان هێشت بەلاّم بارەگایان بۆ كردینەوەو كارئاسانی تەواویان بۆكردین و هەندێك پارەیان سەرف كردبوو بۆچاك كردن و رێكخستنی بارەگاكانی حزب لەدهۆك ئەوچەند رۆژەش میوانی ئەوان بوین و زۆرهاوكاریان كردین ئێمەش سوپاسمان كردن، لە٩/٣٠ كاك شوكری نێرویی یان لەگەڵ ناردین وەك رێگا پیشاندەروخاوەن ماڵ بۆزاخۆ لەرێگا پێمان ووت بەسوعبەتەوە تۆ هەمیشە لەپێش سوپای توركەوە دەبیت تەسلیم بەتوركیامان نەكەیت لەرێگاوە چوینە قائیمقامیەتی زاخۆ كاك محمد ناوێكی لێبوو پێشوازی لێ كردین بەگەرمی و پاشان بۆناوشارو جێگای تەقینەوەكەی زاخۆیان پیشان داین ئێمە وتمان ئەوە دەستی رژێمە یا بەدەستی ولاّتێكی كە كراوە بەلاّم ئەوان حەزیان دەكرد بلّێن یەكێتیە پاشان بردیان بۆسەرقەبران ئەو تەقینەوەیە بەكۆمەڵ كرابونە قەبرەوەو سەرمان لێ دان و فاتیحامان خوێندو قسەم كردهەرلەوێش مقابەلەیەكی رادیۆییان كرد لەسەر تەقینەوەكەو قسەی خۆم كرد لەوبارەیەوە و پاشان چوینە سەرگۆری سەیداصالح یوسفی و بۆماڵی سەیدا رۆیشتین خێزانی سەیدا و كچێكی لەوێ بون خێزانی سەیدا زۆر بێزاری دەربری لەدەستی پارتی و پارتیشمان لەگەڵ بوون قائیمقام و كاك شوكری نێرویی و زۆری كەش لەبەرپرسانی پارتی و برادەرانی كۆنی سۆسیالیست لای پارتی و برادەرانی خۆشمان بەراستی وەزعیان خراپ بوو

هەندێك یارمەتیمان دان داواشمان کرد مانگانەیان بۆ ببڕێتەوە هەرئەوێش قسەمان لەگەڵ پارتی کرد کە تەلەفۆنەکەیان (٣)مانگ بوو برابوو تەلەفۆنەکەیان پارتی بڕیبوی هەر لەوێ قائیمقام تەلەفۆنی کرد بۆیان بەستنەو زۆر گلەیمان لەپارتی کرد بۆ بەو شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ ماڵی سەیدا دەکەن بڕینی تەلەفۆن کارێکی خراپە بۆپارتی خۆی پاشان سەردانی ناوچەی پارتیمان کرد و هەمان ڕۆژ سەردانی هاوپەیمانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی (MCC) مان کرد لەزاخۆو لەگەڵ نوێنەری ئەمریکا و فەرەنساو بەریتانیاو تورکیا بەدورو درێژی قسەم کردو ڕوم لەهەر چواریان کرد بەگشتی و یەکەم بەئەمریکایەکە کەناوی کوردستانم هێنا یەکسەر تورکەکە بەئەمریکیەکەی وت کوردستان مەبەستی کۆیە ووتم کوردستانی عێراق و هەموو کوردستان وتی نەتوت عێراق لەبەر چاوی ئێمەش و ئەو بە وڵاتەکەی کەچی خۆی بۆنەگیران ئەوەندە ڕەگەز پەرست ودژی ناوی کوردستان بون و داوایان کرد لەوە بەدواوە پەیوەندی هەبێت و وتیان تائێستا هەریەکێتی و پارتیمان دیوەو حەزدەکەین گوێمان لەحزبی کەش بێت و ئەوشتانەی تۆباست کرد شتی تازەن پێمان وتن ئێو پێویستە حزبی کەش ببینن جگەلەیەکێتی وپارتی واتە ڕای جیاواز هەیە چونکە هەردوو حزبی دەستەلآتدار تەنها شتە باشەکانی خۆیان باس ئەکەن هەردوولا بەدووبۆچونی جیاوازەوە ئێوە پێوستە گوێتان لەحزبەکانی کەش بێت راو بۆچونی جیاواز وەربگرن پاشان گەراینەوە جێگای خۆمان لەدهۆك و ئێوارەش سەعات (٦) کاك نێچیرڤان بارزانی و هەموو لێپرسراوانی دهۆك سەردانیان کردین لەئوتێل قصر دهۆك نیوەڕۆکەشی دەعوەتی پارێزگار بوین لەدهۆك کاك عەلی سنجاری و کۆمەڵێك لەوێ بون، لە١/١٠/١٩٩٥ لەدهۆکەوە بەرێ کەوتین بۆ فیشخابوڕ سەرئاوی دیجلە بۆسەرسنوری سوریا کاك نێچرڤان بەکاك سەربازهەورامی دا هەندێك پارەی بۆناردبووین منیش لەبەر ئەوەی یەکەم جاربوو

یاتەوەقوع نەکات لەبەر شتێك یاهۆیەکە گلمان دایەوە گرنك ئەوەبو کەنیەتی کاك نێچیرڤان بارزانی وپارتی باش بێت لەئاوەکە بەبەلەم و تەباغی بچوك چوینە ئەوبەری ئاوەکە برادەرانی پارتی کاك شوکری نێرویی وکاك ئەبو گۆڤان لەوێ بون زۆرهاوکاریان کردین و پێمانەوە ماندو بون من وکاك محمد دۆلاشی و کاك برزوعەلی هەژار رۆیشتین پاشان چوینە ئەوبەری ئاوەکە برادەرانی یەکێتی بەتەوجیهی مام جەلال کاك محمود عیدۆ بەرپرس وکاك ئەبوعەلی جێگری بەرپرس دووسەیارەیان هێنابوو لەگەڵ برادەرێکی کەشیان لەگەڵدابوو برادەرانی پارتیش سەیارەکەیان ناردبوو دابەش بوین بۆهەرسێ سەیارەکەو پاشان چوینە بارەگای یەکێتی و شەو چوینە ئوتێل مەدینە شباب میوانی برادەرانی یەکێتی بوین زۆرماندو بون لەگەڵماندا شەویش کاك محمد منصور بەرپرسی مخابراتی قامیشلی چاومان پێکەوت و قسەمان لەسەر هاوکاری نێوان سۆسیالیست و حکومەت کراو دەربارەی کارەکانی عیلاقات لەوسنورەو لەسوریاش قسەمان کرد، محمد منصورە حەزی دەکرد هاوکاری بکات له ١٩٧٨-١٩٧٩ هەر لەقامیشلی ببوو ئەوسەفەرە برادەرانی پارتی زۆر خۆیان لە گەڵماندا ماندوکرد هاوکاریان کردین هەستمان کرد کەسەرکردایەتی پارتی لەگەڵ حەزەردا دەیانەوێت دۆستایەتی سۆسیالیست بکەن بەلام کۆنە سۆسیالیستەکان ویەکگرتنەکان هەولیان ئەدا سەرنەگرێ ئێمەش بەراستی دەمانویست لەگەڵ پارتیدا بناغەیەکی باشی دۆستایەتی وهاوکاری داریژین بۆ داهاتویەکی دور هەرئەوەش بەرنامەمانە ،

لە١٩٩٥/١٠/٢ جارێ لەگەڵیان کۆبوینەوەو قسەکرا لەسەر روداوەکان وپاشان سەری کاك حەمیدحاجی دەروێشمان دا لەپارتی دیموکراتی پێشکەوتوو خوازبرادەرانی کەش سەردانیان کردین و قسە کرا لەسەر پەیوەندی هەردوولا، لەشەوی

٢-١٠/٣ لەسوریابوم لەقامیشلیەوە بەپاس بەرێ کەوتین بۆدیمەشق و لەحەلەب هەندێك لامان دا شارێکی خۆشبوو دیاربوو لەکۆنەوە ناوی حەلەبمان بیستبوو ئەو رۆژە چوینە مەکتەبی یەکێتی وپاشان بۆمەکتەبی خۆمان مام جەلال لەسوریا بوو تەلەفۆنی بۆ کردین و بۆنیوەرۆ لای ئەو بوین لەماڵەکەی خۆی وەغیق سامەرائی و عەقیدصلاح و ئەبوعمر و کاك محمد خێریش لەوێ بون چاومان پێیان کەوت و پاشان چوینەوە بۆبارەگای سۆسیالیست کاك لوقمان وبرادەرانی کەی پارتی سەردانیان کردین کەهاتن وتمان بەپارتی لەوانەیە پەکەکە ببینین شتێکتان هەبێت ئێمە بەکاك مەسعود بڵێن قسەیان لەگەڵدا دەکەم من وکاك محمد دۆلاشی و کاك برزولەوێ بوین، لە١٠/٤ سەردانی مەکتەبی عەمەلی نیشتمانیمان کرد لای کاك ئەبوصلاح ودکتۆر ئەحمەد موسەوی دووسەعات قسەمان کرد لەسەر روداوەکان و پەیوەندی هەردوولا لەسوریا بەهۆی ئەوەی لە١٩٧٦ و پاشان لە١٩٧٩ مەکتەب و مەسئولەکانی حزب لەسوریا بون بەتایبەتی کاك عدنان موفتی لەسۆسیالیست ناسراوبوو لای لایەنەکان ولای حکومەتیش، لە١٠/٥ کاك عبدالخالق زەنگەنە سەردانی کردین بۆئێوارەکەی ئێمەش سەردانی حزبی شیوعیمان کرد وەلەسەعات (٨/٣٠)ی ئێوارەش وەفدێکی هاوبەشی حزبی الاشتراکی و ویفاق وەتەنی سەردانیان کردین کەحاتم السعد ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی الاشتراکی عێراق و کاك ستارالبیر لەویفاقی وەتەنی باسی وەزعەکەو پەیوەندی نێوانمان کرا، لە١٠/٦ دەعوەتی مام جەلال بوین لەماڵی خۆی لەسوریا (دیمەشق)من و کاك محمد دۆلاشی و کاك برزۆ بوین لەسەر روداوەکانی کوردستان و عێراق قسەمان کرد... هەر ئەمرۆ واتە ١٠/٦ هێزێکی تورکیا هاتە ناوسنوری کوردستانەوە لە کانی ماسی و بەرواری بالاو ئیبراهیم خەلیلەوە بەناوی شەری پەکەکەوە و کەسیش دەنگی نەکرد، لە١٠/٧ سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی سەردانی سەفارەتی کۆماری

ئیسلامیمان کرد لەدیمەشق لەگەڵ ئاغای ئەختری سەفیری کۆماری ئیسلامی ئێران لە سوریا قسەمان لەسەر روداوەکان کرد وەلەسەر داوای مەکتەبی عەمەلی وەتەنی سەعات (٥)ی ئێوارە کۆبونەوەمان هەبوو لەمەکتەبی عەمەل لەگەڵ لیژنەی تەنسیقی قەومی لەدیمەشق کەنوێنەرانی ئەم حزبانەی تێدا بەشداربوو( نوێنەری مجلیسی ئەعلای ئیسلامی عێراق کاك بیان جبر و نوێنەری حزبی دەعوەی عێراق کاك ئەبو ئیسرای مالکی و نوێنەری کوتلەی ئیسلامی و سۆسیالیست و زەحمەتکێشان) بەشداری کۆبونەوە بوین و بریاردرا کۆبونەوەیەکی کەش بکرێت و بەیانێکی هاوبەش دەربکەین سەبارەت بە هاتنە ژوورەوەی سوپای تورکیا بۆکوردستانی عێراق باس بکەین کۆبونەوەکە (٣) سەعات درێژەی کێشاو لەهەموو رویەکەوە قسەمان کرد لەزۆرخاڵ جیاواز بوین... لەسەعات (٧)ی رۆژی ١٠/٧ دەعوەت بوین لای کاك عبداللە ئۆجەلان داوای چاوپێکەوتنی لێ کردین ئێمەش ئێوارە لەکاتی دیاری کراوەرۆیشتین مامۆستا کەریم ئەحمەدوکاك ئەبوسیروان لەوێ بون هەندێك ئیحراج بون ئەوانیش بەئارەزوو مەوعیدەکەیان دانابوو کەلای ئەوان یەك ببینین وادیاربو حزبە کان زۆریان بە نەهێنی سەردانی ئۆجەلانیان دەکرد زۆر قسە کرا لەسەر مەسەلەکان پێم ووتن هەڵە بوو ئێوە پەلاماری پارتیتان داوە چونکە ئیشی ئێوە شەری پارتی و یەکێتی یاهەردوولا نیە وەکو پەلامارتان دا چۆن بەیان دەردەکەن دەڵێن ئێمە هێرشمان بۆ کردن ئەو شەرە ئێوە دەستان پێ کردووەو حەقیش نەبوو پارتی لەهەموو جارەکانی کەهەرچی کردبێت هەروەها پێم وتن ئەم جارە خەتا لای ئێوەوە بوە جەماوەریش دەزانێ ئێوە لەخۆرایی خۆتان توشی ئەو شەرە کردووە وپارتی لەماڵی خۆی لە وڵاتی خۆی ئێوە چونەتە سەریان ئاپۆ وخلیل ئاتاش قسەکانیان پێ ناخۆشبوو بەڵام من قسەی خۆم کرد چونکە pkk بەئاشکرا و بە ناحەق شەری بە پارتی دەفرۆشت نەك لەبەر پارتی یاهەر

لایـەك ئـەوە پەکەکـە شـەری هەڵگیرسـاندووە دەبێـت بەخۆشـیان بڵـێم هـەر رۆژنامەیـەکیش پرسـیاری لـێ کـردم هـەرواش وەڵام دایـەوە وەپـێم وت لەگـەڵ ئەوەش من ئامادەم بەکاك مەسعودبارزانی بڵێم دەربارەی راگرتنی شەر کەئێوە دەست پێشخەرن رای بگرن و بگەنە ئەنجامێك کاك عبداللەش پێی خۆشبوو منیش وەعدم دایەو وادیاربوو مامۆستا کەریم هەربۆ ئەوە هاتبوو پاشان خۆشیان لەگەڵیان شتێکیان کردبوواتە حزبی شیوعی وPKK رێکەوتنیان کردبوو، لە ١٠/٨ هەرلەدیمەشق بوین کاك عبدالخالق زەنگەنەش سەردانی کردین و پاش نیوەرۆیش دوای ماوەیەکی زۆر بەتەلەفۆن لەگەڵ ماڵەوە قسەم کرد لەئەڵمانیا کەماوەی سێ ساڵ و نیو بوو رۆیشتبون... هەر ئەو رۆژە لەسەعات (٦)ی ئێوارە سەردانی بارەگای پارتیمان کرد لەدیمەشق کاك عمربۆتانی لەوێ بوو پێم ووت ئاگاداری کاك مەسعود بکە ئەگەر پێتان باشە من قسەم لەگەڵ کاك عبداللە ئۆجەلان کردووە بۆ راگرتنی شەرەکە و ئەوەش قسەکانی ئەوە، حەزیش دەکەین رەئی ئەویش کاك مسعود بارزانی بزانین ئەگەر پێتان باشە کاك عمربۆتانی دوای چەند رۆژێك سەردانی کردین و وتی وەڵامی بروسکەی کاك مەسعود گەراوەتەوەو زۆری پێخۆش بووەو ئەوەش خاڵەکانیەتی ١- ئەوان جێگایان کوردستانی تورکیایە نەك کوردستانی عێراق. ٢- وەئەوان شەریان هەڵگیرساندووەو هاتونەتە سەر ئێمە نەك ئێمە بۆسەرئەوان. ٣- با ئەوان شەر رابگرن و بکشێنەوە. ٤- تەداخول نەکەن لەئیشوکاری ناوخۆی ئێمەدا ئەوکات ئێمەش لەجێگای خۆمانین و شەر رادەگرین ٥-دەبێت ئەوان شەر رابگرن، لە١٠/٩ سەردانی مەکتەبی مجلیسی ئەعلای ئیسلامی عێراقمان کرد لەدیمەشق و لەلایەن کاك بیان جبرو برادەرانی کەیان پێشوازی کراین قسە دەربارەی معارەزەی عێراق و مجلیسی ئەعلاو حزب کرا پاشان لەسەعات (١٢)ی هەمان رۆژ سەردانی قیادەی قەومی مان کرد

لەدیمەشق لەلایەن ئەندامی قیادەی قەومی حزبی بەعس و ئەمیز سری قیادەی قوتری عێراق لەسوریا پێشوازی کراین و باسی پەیوەندی نێوان حزبی سۆسیالیست و حزبی بەعس و حکومەت کرا ئەو وتی ئێوە خۆتان دووساڵە لێرە نین بەلام حزبی سۆسیالیست لێرەجێگای خۆی هەیەو لە ١٩٧٧ و ١٩٧٩ وە بارەگای هەیەو ئێستاش زورمان پێ خۆشبوو وەزۆر ئاسایی ئیشوکاری ئێوە دەروات و هیچ کێشەیەکی تێدا نیە و ئەگەر هەشبوو ئاگادارمان بکەنەوە بۆچارەسەری وەباسی وەزعی عێراق و کوردستان و هاتنی سوپای تورك و زۆری کە کرا هەروەها باسی پەیوەندی دووقۆڵی هەردوولاش کران لەدوای ئەوان سەردانی بارەگای بزوتنەوەی ئاشوریمان کرد لە لایەن کاك ولیم ۆردە و خێزانەکەی باسکالەوە پێشوازی کراین، لە١٠/١٠ سەردانی هەندێك جێگای شارمان کرد و لەسەعات (٥)ی ئێوارەش وەفدێکی حزبی الاشتراکی الناسری سەردانیان کردین و پاشان چوینە بازاروهەندێك گەراین لەبەناو شاردا، لە١٠/١١ چاومان بەمام جەلال کەوت لەبارەگای خۆی، لە١٠/١٢ کاك عمر بۆتانی سەردانی کردین و داوای وەلامی کاك عبدالله ئۆجەلانی بۆ کاك مەسعود دەکرد ئێمە هەرلەنێوان پارتی و پەکەکەدا بەردەوام بوین بۆئاشتی وەلەدوای نیوەرۆ کاك عبدالخالق سەردانی کردین وەلەسەعات (٣)ی پاش نیوەرۆ چوینە سەر قەبری صلاح الدین ئەیوبی کەکوردەو خەڵکی شاری تکریتەو لەئەسلا رەواندوزیە قیادەی ئیسلامی لەدنیادا کردووەو گۆرەکەی لەشامەو لێ ی نوسراوە صلاح الدین کوردی پاشان چوینە سەر قەبری حەزرەتی حسێن و مزگەتی ئەمەوی بۆ حمیدیە کەبازارێکی کۆنی شامەو زەمانی تورکی عوسمانی بوە بەناوی سوڵتان عبدالحمیدەوە لەئەستەمبوڵ هەیە ناو نراوەو هەر وەکو ئەو بازارەش وایەو بەناوی سوڵتان عبدالحمیدی عوسمانیەوە ناونراوەو بازاری حمیدیە جێگای ئاساری زۆری تێدایە پاشان سەردانی فندق شامان کرد لەصالحیەی شام، لە١٠/١٢سەردانی

ڕێکخراوی شەعبیمان کردو کاك حکمت عەزاوی پێشوازی لێ کردین و لەوێش قسەمان لەسەر ڕوداوەکانی ئەوکاتە کردو پاشان سەردانی حەمام نورەالدینمان کرد کەجێگایەکی ئاساری کۆنە لەدیمەشق، لە١٠/١٣ لەحەلەب بوین زۆرماندوبوین ئەو ڕۆژە، لە١٠/١٤ ندا الرافدین ڕۆژنامەی مجلیسی ئەعلای ئیسلامی لەدیمەشق دەردەچوو مقابەلەیەکی من کرد لەسەر زۆر ڕوداوی کوردستان و عێراق وناوچەکە..هەر هەمان ڕۆژ سەعات (٤)ی پاش نیوەڕۆ لەمەکتەبی حزبی شیوعی بوین کۆبونەوەیەکی هاوبەش هەبوولەحزبی شیوعی مامۆستاکەریم ئەحمەدو ئەبوسیروان و دکتۆر حامید وەلە حزبی زەحمەتکێشان کاك عبدالخالق زەنگەنە و لەبزوتنەوەی ئاشوری کاك ولیم وردەر وە لەسۆسیالیست محمدحاجی محمود و لەگەڵ بەرپرسی مەکتەبی پەیوەندیەکانی حزب لەسوریا بەشداربون پاشان لەسەعات (٧/٣٠)ی ئێوارەی هەمان ڕۆژ سەردانی ئەبو عمر(محمد خیر)مان کرد لەئەمنی دەرەوە باسی پەیوەندی دووقۆڵی هەردوولاو ئیشوکاری ڕۆژانە کرا، لە١٠/١٥کاك بیان جبر وبەرپرسی مەکتەبی مجلیسی ئەعلار کاك محمد حەریری بەرپرسی ڕاگەیاندنیان سەردانیان کردین لەمەکتەبی حزب لەدیمەشق کاك محمد دۆلاشی وکاك برزویش لەوێ بون قسە لەسەر زۆر ڕوداو پەیوەندی هەردوولاوکراو سەردانەکەیان دۆستانەبوو لەوچەندە ڕۆژە هەر هەوڵی ئەوەمان دەدا بۆ ڕاگرتنی شەری پارتی و پەکەکە زۆر هەوڵمان لەگەڵدان و هەندێك خاوبونەوەو پەکەکەش لەسەر داوای ئێمە یەك لایەنە شەری ڕاگرت بەلام وادیاربوو پارتی ڕای نەدەگرت پەکەکە هەوڵی دەدا ئێمەش برۆینە ناوشەرەکەوە داوای بەیانی هاوبەش و داوای پرۆتۆکۆلیان چەند جارێك لێ کردین ئێمەش شتێکمان لەگەڵ کردن بەیانێك دژی تورکیا دەربکەن بەلام ئەوان وایان بلاو کردەوە کەپارەیان داوە بەسۆسیالیست ورێکەوتون دژی پارتی کەشتی وانەبوو دوایش لەتەلەفزیون ئەوانە بلاویان

کردبوەوە کە داوای ئەوپارەیە دەکەن داویانە بەو حزبانە لەسەر ئەوەش ئێمە رون کردنەوەو دژی ئەو قسانەش بوین نەپارەمان وەرگرتبوو نەبریاری شەڕی شمان دژی پارتی دابوو شتی وامان هەرباس نەکردبوو... هەرلە ١٠/١٥ وەرگرتنی دەنگ رەئی لەسەر صدام حسێن لەعێراق کراو ئەنجامی رەئی لە٩٩٪ ٤لە١٠ی دەنگی خەڵکی عێراقی هێنابوو کەئەوەش خۆیان کردبویان بەبێ کوردستان کرابوو،سیناریۆیە بو دروستیان کردبو لە١٠/١٦ سەردانی بازارمان کردولای ئوتێل شام و زۆر جێگا گەراین و ئێوارەش سەعات (٧) سەردانی عەقید صلاح مان کرد لەدیمەشق و قسەکرا و بیرورا ئالوگۆرکرا لەنێوان هەردوولاداو وەزعەکانی ئەرۆی کوردستان جێگای باس بوو، لەرۆژانی ١٠/٧ تا١٠/١٧ ئێمە هەرخەریکی هەوڵ و تەقەلا بوین لەنێوان پارتی و پەکەکەدا بۆچارەسەری ئاشتی هەموو قسەکانیش وەکو خۆی بێ دەست کاری دەمان گەیاندە یەك (٤) بروسکەی کاك مەسعود بارزانی و سێ جاریش کاك عبدالله ئۆجەلانم بینی بۆئەو مەبەستە قسەمان لەگەڵ کردن و ئەوەی کرا دوای بیستمەوە پارتی نارازی بوبون منیش وەستاندم و ئەو مەسەلەیەم بەجێ هێشت چونکە من بەبێ ئەوەی بەلای کەسیان دای شکێنم و باپێچەوانەشەوە بەرگریم لەپارتی دەکرد لە ١٩٩٥/١٠/١٦کاك صلاح خرسان نوسەرێکی عەرەبی عێراقی بو کتێبی ئەنوسی لەسەر عێراق وکوردیش چاو پێکەوتنێکی ١٥تا٢٠سەعاتی کردین، لە١٠/١٧ هەربەردەوام بوین لەنێوان پارتی و پەکەکە کاك عبدالله ئۆجەلان ئەمرۆ رەئیەکانی زۆرباش بوو لەرۆژەکانی کەو ووتی ئەمرۆ یەك لایەنە من شەر رادەگرم... هەرئەمرۆ کاك محمد دۆلاشی و کاك برزو گەرانەوە بۆکوردستان.. هەر ئەمرۆ ئەبو جعفر نوێنەری رێکخراوی عمل ئیسلامی لەدیمەشق سەردانی کردین ئەبو جعفر لەساڵی ١٩٨١ لەسورێن بون لای ئێمە و چالاکیشیان هەبوو ، هەرلە ١٠/١٧ چوینە سەر گۆری مەولاناخالید نەقشبەندی لەتیرەی

میکائیلی وعەشیرەتی جاف کەگۆرەکەی لەشامە خزمەتی زۆر دینی ئیسلامی کردووە وەکو کوردێکش جێگای رێزە بۆکورد لەو ولاَتەدا بەلای گۆری خالید بەگتاشەوە هاتینە خوارێ خالیدبەگتاش کوردەو سکرتێری حزبی شیوعی سوری و پیاوێکی ناسراوی سوریاو دنیا بووە بەلاَم هیچ سودێکی بۆ کورد نەبووەو زۆرجار پیێ ی عەیب بووە بلێت کوردم وزۆرجار وتبوی من ئەگەر کورد نەبومایە ئێستا زیاتر دەبوم لەدنیادا واتە هیچ سودێکی بۆکورد نەبوە لەسالی ١٩١٢ لەدایك بووەو لە١٩٩٥ کۆچی دوای کردووە، لە١٠/١٨ وەلامی کاك مەسعود بارزانی گەرایەوە دەربارەی هەولەکانی ئێمە بۆپارتی و پەکەکە کاك عمر بۆتانی بۆی هێنایەوە وەلامی پارتی ئەم جارە زۆر جیاوازبوو لەرۆژانی کە ئەمرۆ وەلامەکەیان سلبی بوو وادیاربوو گۆرانێك روی دابوو لەصالحی پارتی بوبێت لەسەعات (٨)ی ئێوارەی هەمان رۆژ کاك دانا ئەحمەد مەجید نوێنەری یەکێتی لەدیمەشق سەردانی کردین پاشان لەگەلێ کاك عبدالخالق زەنگەنە دەعوەتی مجلیسی ئەعلای ئیسلامی بوین لای کاك بیان جبر،بۆنانی ئیوارە لە١٠/١٩ زۆر گەراین لەدیمەشق و شام و جێگا ئاساریەکان، لە١٠/٢٠ لەمالی کاك عبدالخالق زەنگەنە بوین لەدیمەشق بەپێش چوینە ئەو ناوچانەی کەکوردی لێبوو لای روکنەالدین و ئەوناوە، لە١٠/٢١ دەعوەتی کاك عمربۆتانی بوین لەشیراتۆن، لە١٠/٢٢ هەرلەدیمەشق بوم، لە١٠/٢٢لەگەل کاك دانا ئەحمەد مەجید چوین بۆلوبنان و شاری بیروت لەشتورەوبیروت و شوێنەواری شەری لوبنانمان بینی خەریك ئاوەدان کردنەوە بون پاشان چوینە سەر دەریای سپی ناوەراست و چوینە شارع حمراوچێشتخانەی التمولی و زۆر گران بوو یاگرانی بوو لەلوبنان پاشان چوینە سەردانی شێخ وەهاچ شێخ موسی سەرۆکی مجلیسی عیان کوردی لوبنانی کەپیاوێکی کوردپەروەرو باش بوو خزمەتی کردبوو گۆڤاری هەبوو شتێکیان بۆکورد کردبوو لەلوبنان خۆی کوردی نەدەزانی هەروەها زۆر

جێگای کەش گەراین لەلوبنان.. بیروت وێران کرابوو خەریکی تەعمیر کردنی بون سەری مەکتەبی حزبی رزگاری لای کاك رەشید مەلاو کاك محمود پاشان گەراینەوە بۆشام و چوینە سەرچیای قاسیون و سەیری دیمەشق یاشام مان کرد زۆرجوان بوو لەسەر قاسیونەوە کە سەرکەوتین وەکو لەسورێنەوە سەیری شارەزوور بکەیت یالە ئەزمرەوە سەیری سلێمانی بکەیت یالەکێوە رەشەوە سەیری رانیە بکەیت پاشان گەراینەوە مەکتەب، لە٢٤/١٠ لەسەر داوای سەرەفاتی ئەرەنسا لەدیمەشق سەردانمان کردو قسە لەسەر مەسەلەکان کراو زۆرشت باس کرا و کە پەیوەندی بەکوردو عێراق و ناوچەکەوە هەبوو، لە٢٥/١٠ لەماڵەوە بوم زۆر ماندو بوم ئەو رۆژە دەرنەچوم، لە٢٦/١٠ کاك ئیبراهیم حاجی ملو دهۆکی سەردانی کردین لەمەکتەبی پەیوەندیەکانی حزب لەدیمەشق پێشتر ناویم بیستبوو بەلاّم نەم دیبوو تائەو رۆژە پیاوێکی باشبوو.. هەرئەمرۆ برادەرانی پەکەکە هاتنە سەردانمان و داوایان کرد بەشداری شەربکەین دژی پارتی زۆرسادەبون والەئێمە تێگەیشتبون وەکو ئەو حزبانەی کەچوبونە لایان لەوێش هاتبونە لایان ئێمە دژی هەموو شەرێکین شەربۆبکەین بۆکێ و لەپێناوی چیدا ئێمە هیچ ئیلتزاماتێکمان نیە لەگەڵیان تابەشداری شەر بکەین بەبێ بەرنامە دژی کەس شەرناکەین و بۆکەس شەرناکەین ئەگەر لایەك شەرمان پێ بفرۆشێ ئەوکات بۆخۆمان شەری دەکەین نەك بۆکەسێکی کە یابەو شێوەیەی ئەوان بیر دەکەنەوە... نیوەرۆی ئەمرۆ چوینە باخچەی تشرین و چوینە چێشخانەی سەلام ناخۆش نەبووکبابی مریشکیان هەبی ئەوجێگایانە، لەرۆژانی ٢٥و٢٦/١٠ یادی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی رێکخراوی نەتەوە یەککگرتوەکان بوو (١٨٥) ولاّت کۆبونەوەو قسەیان کرد سەرۆکی ئەمریکی کلنتۆن و جاك شیراك سەرۆکی فەرەنسا بەشداربون هەر ئەمرۆکۆنگریس ئەمریکی بریاری دا سەفارەتەکەی لەتەلئەبیبە وە بباتە قودس کەئەوەش گەورە ترین ئیهانەی

عەرەبی و ئیسلامی بوو لەلایەن ئەمریکاوە، لە١٠/٢٨ لەدیمەشق بوم کاك عبداللە ئۆجەلان سەرۆکی پەکەکە ناردی بەدوامانداو منیش رۆیشتم کاك عبدالخالق زەنگەنەش مات پێکەوە چوین لەوێ قسەی زۆرکرا بەراستی کاك عبدالخالق قسەی باشی کردو دڵسۆزانە بووقسەکانی بۆکورد پاشان قسەی زۆرکرا کەشەر خراپەو نەدەبوو ئەوان هێرش بکەنە سەرپارتی و من پێم وت قەت ئەوقسانەم قبوڵ نیە و بەمنیش ناێ، سەلمێنن کەئەو شەرو هێرشەتان شتێکی باشە بۆسەر پارتی یاهەر کەسێکی کەش بێت دوای داوای کرد بەتەنها پێکەوە قسە بکەین چوینە ژورێکی کەوە تەرجومەمان هەبوو کاك خەلیل ئاتاش لەوێ بو لەبەر ئەوەی باش لەیەك تێ نەدەگەیشتین من لێ ی تێ گەیشتم بۆ دوو مەبەست بوو ئەو کۆبونەوەیە ئەویش بەشداری شەر دژی پارتی بکەین و هاوکاری پەکەکە ئەویش ئامادەیە هەموو یارمەتیەکی بدات و هەموو شت هەرئێستا بکات بەشداری شەر پارمەتی بدات وەیان لەگەڵ یەکێتی و سۆسیالیست و پەکەکە پێکەوە لەپارتی بدەن من قسەم بۆکرد کەس بەشەر تەواو نابێت وبیر کردنەوە لەشەر هەڵەیەو کێشەکان گەورە تردەکات وە وڵاتانی ناوچەکەش نایەڵن نەپارتی و نەپەکەکە و نەیەکێتی لەناو بچێت و کۆمەڵێك نمونەم بۆهێنایەوە کەپارتی لاواز دەبوو لەشەرو دەشکا ئێران لەحاجی عمران و لەهەڵەبجەوە دەی بردن بۆپێنجوێن و قەڵادزەو بزێنەوەشی دەناردە هاوکاریان کەپارتی لەشەرێك سەردەکەوت ئێران ئەوانی رێگانەدەداوهاوکاری یەکێتی دەکردوپارتی دە شکاند و پارتی بەهێز دەبێت ئێوە واتە PKK لێیان دەدەن و ئێوە بەهێز دەبن پارتی لێیان دەدەن تەوازنەکە رادەگیرێت و زۆرقسەم بۆکرد لەوبارەیەوە هەتا نمونەی پاسۆکم بۆهێنایەوە کە (٤-٥)ساڵ شەری لەگەڵ یەکێتی هەبوو لەیەکێتیشی دەکوشت و کەمیش بون هەر تەواویش نەبون و یەکێتی ناچار لەگەڵیان رێکەوت هەروەها باسی شەری یەکێتی و سۆسیالیست کەچۆن

چونە سەر بارەگای سەکردایەتیمان لەئاشقولکەو قرناقان هەرماوین و ئێستاش هەرماوین پێم ووت ئێوە قورسایتان بخەنە کوردستانی تورکیاوە و کوردستانی عێراق چۆڵ نیەو ئێوەش خەباتی تێدا بکەن و ئێوە سودی لیٚ وەربگرن بەلاٚم خەباتان بگوازنەوە بۆ کوردستانی تورکیا لە کوردستانی عێراق ئیشوکاری ئێوە نیەو جەماوەری کوردستان بەهەموو کەموکوریەکەوە رەئی بۆ حزبەکانی کوردستانی عێراق دەدات نەك پەکەکە و زۆر شتم بۆباس کرد ئەو بیرکردنەوەیە غەلەتە وە وتم من حزبی سۆسیالیست شتێك خۆی باوەری پیٚ نەبێت ناچێتە ژێر هیچ بارێك و هیچ شەرێکەوە بەبیٚ بەرنامەیەك پاشان بەجێمان هێشت و گەراینەوە بارەگای خۆمان، لە۱۰/۲۹ لەفرۆکەخانەی نێودەولەتی سوریا لەدیمەشق لەسەعات (٦)ی ی ئێوارە پێشوازیمان لەمام جەلال کرد کەلەلەندەنەوە گەرابوەوە بۆ سوریا کە کاك عدنان موفتی و کاك نەجات ئەحمەدعەزیز ئاغاو وکاك مەلا یاسین ی لەگەڵ بوو لەهۆلی شەرەف ئیسراحەتێك کراو پاشان بۆمالی مام جەلال لەسەعات (۷) منیش گەرامەوە بۆ بارەگای خۆمان لەدیمەشق، لە۱۰/۳۰ لەشام بزین سەری سەفارەتی ئەلمانیامان داو پاشان چوینە گازینۆی تلە تلە کەلەسالی ۱۹۷٥ مام جەلال یەکێتی نیشتمانی لەویٚ دامەزراندوەو بەیانەکەیان خوێندوەتەوە پاشان چوینە ئوتێل شام و بۆ ئێوارەکەی لەگەڵ کاك عدنان موفتی چوینە بازارو زۆر گەراین ئەو شەوە زۆر خۆش بوو کاك عدنان بیٚ لایەن بوو بەلاٚم بەقەناعەتی من دوای ئەوەی پارتی رێگای نەدا لەقامیشلیەوە برواتەوە کوردستان و هەولێر دەبێتە یەکێتی بەلاٚم چاوەریٚ دەکات..کاك عدنان پیاوێکی باش و تیٚ گەیشتوو لەسەرخۆیە بەس لەسائیقی سەیارە لەسەرخۆنیە هەروەها ئامادەیی خۆی پیشان دا هاوکاری ئێمە بکات لەهەر لایەك بێت لەوەلاٚمی قسەیەکی مندا من لەوەش کەوتمە شك لەهەرلایەك بێت هەرلای یەکێتی دەبێت، لە۱۰/۳۱ لەبازار بوین لەشام

لەگەڵ کاك عبدالخالق زەنگەنەدا توشی کاك عدنان و کاك نەجات ئەحمد عزیز ئاغا بوین لەبازاردا بۆ ئێوارەکەی دەعوەتی کاك حەمیدحاجی دورویش سکرتێری حزبی دیموکراتی تەقەدومی کوردی سوریا بوین شەو لەچێشتخانەی شعار لەدەرەوەی شام بوو تەعاروفمان لەگەڵ چەند برادەرانیان کرد شەوێکی خۆش بوو...

هەرلە١٠/٣١ بارەگای معارەزەی عێراقی لەصلاح الدین تەقیەوەو نزیکەی (١٥)کەس کوژراو بریندااریش هەبوو زەرەری زۆربوو، لە١/١١/١٩٩٥ ،سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی بەشداریمان کرد لەناشتنی جەنازەی شێخ فتحی شقاق سکرتێری جیهادی ئیسلامی لەفەلەستین لەسەخری لوبنان لەرێگا کوشتبویان، شەوی ١-١١/٢ لەگەڵ مام جەلال کۆبونەوەمان هەبوو قسەمان لەسەر مەسەلەکان کرد، لە١١/٢ لەبارەگا بوم لەدیمەشق لەورۆژە دەرنەچوم ئیسراحەتم کرد، لە١٢/٣سەرلەبەیانی سەردانی کاك عدنان موفتی وکاك نەجات مان کرد لەئوتێل البوان وەلەسەعات (٥)ی هەمان رۆژ سەردانی کاك شێخ محمد بەرزنجی مان کرد لەگەڵ کاك صلاح کوری لەئەردەن و لیبیاوە هاتبون لەشارع خالیدبن وەلید بون بۆبەخێر هاتنیان، لە١١/٤ کاك عبداللە ئۆجەلان سێ جار ناردی بەدوامدا بۆدەعوەت لەجێگای خۆی پێم خۆش نەبوو بەلأم ئیحراج بوم کەچومە ئەویش دانیشتنەکەم پێخۆش نەبوو دانیشتم چونکە خەڵکی جۆربەجۆر تێکەڵ بون کەس هەرباسی لارون نەبوو ئەوەی دانیشتبون هەر یەکە پێ دەچو تەعبیر لە سیاسەتی دەوڵەتێك بکات لە ١١\٤ کاك عبداللە ئۆجەلان داوای کرد پێکەوە هەردوکمان قسەبکەین چوینە ژورێکی کەوە کاك عبداللە وتی (٣)لایەن واتە یەکێتی وسۆسیالیست و pkk رێکەوتنێك بکەین وتۆیش ببیتە بەرپرسی سەربازی هەرسێ هێزە هاوبەشەکە دوای ئەویش مام جلال تەلەفونی کرد بۆ نیوەرۆ لە ماڵی مام جەلال دعوەت دەبین من دەمزانی بە پێی قسە کانی ئۆجەلان کە پێشتر کردبوی

نەمدەزانی مام جەلال پێشتر گەیشتونەتە ئەنجامێك هەردولایانە ودەیانەوێت لەگەڵ
من قسە بکەن یانە پاشان هەرلایکیان دووجاری کە تەلەفونیان کردەوە منیش
ڕۆیشتم بۆ ماڵی مام جەلال لەوێ ئەوانە مام جەلال وکاك عبدالله ئۆجەلان ومن
کۆببینەوەو قسە بکەین پێکەوە وبریارێك بدەین و دژی پارتی شەربکەین هەرلە
کۆبونەوە دووقۆڵیەکەی من وئۆجەلان من ووتم ئێمە شەر ناکەین یەکێتی بریار لای
خۆیانەو مام جەلال خۆی لێرەیە بەلاَم بەشداری یەکێتی لەشەردا ئاسان نیەو ئێوە
شەری پارتیزانی دەکەن لەودۆڵ و چیایە بۆچیایەکی کەش بەلاَم یەکێتی ئەرزی
لەدەستەو سبەینێ تورکیا یارمەتی پارتی داو چیایەکی لێ گرت تەوازنی هێز
دەگۆڕێ ئەوکات تۆچی دەکەیت بۆیەکێتی لەبەر ئەوە ئاسان نیە یەکێتی بێتە ناو
شەرەوە ئەو لەوانە (٢٠)هەزار کەس بخاتە شەرەوە یادەچێت خۆی بۆ (٣)مانگ
مصاریفی شەردەبێت لەپێشەوە ئامادە بێت یەکێتیش ماوەیەکە لەشەردایەو ئەو
ئیمکانەتەی نیە بەو شێوەیە ئەگەر بۆخۆی بێت شەر بکات ئەوە شتێکی کەیە
بەلاَم کەپەکەکەی هاتە سەرلەشەرەکە ئاسان نیە بۆیەکێتی زۆر قسەم لەگەڵ کرد
وتم ئێمەش وەکو سۆسیالیست شەری پارتی ناکەین، لە١١/٥ لەدیمەشق لەبارەگای
خۆمان بوم تەلەفۆن کرا لەسەعات (١/٣٠)ی پاش نیوەرۆ لەلایەن کاك عبدالله
ئوجەلانەوە کەبرۆم بۆماڵی مام جەلال و لەوێ ئیشیان هەیە لەسەعات (٢)ی پاش
نیوەرۆ تەلەفۆنێکی کە کرایەوە لەماڵی مام جەلال منیش چوم بۆماڵی مام جەلال
لەدیمەشق مام جەلال و کاك عبدالله ئوجەلان و کاك عدنان موفتی وکاك نەجات
ئەحمەد عەزیزئاغاو کاك دکتۆر بەرهەم صالح کاك ئیبراهیم حاجی ملو لەوێ بون و
دەعوەتی مام جەلال بوین کامیراش لەوێ رەسمی دەگرت کاك نەجات ڕۆیشتبوە
بارەکۆنەکە بۆئەوەی لەرەسمەکە دەرنەچێت لەرەسمەکان زۆر دەترساو خۆی
دەشاردەوە مـن و کاك عدنان هەندێك تەعلیقشمان لێدا بۆئەترسیت بانگی

کامیراکەمان کرد ئەو خۆی دەشاردەوەو رەنگی تێك دەچوو دوای نان خواردن مام جەلال وکاك عبداللە ئۆجەلان هەڵسان داواشیان لە من کرد مام جەلال و کاك عبداللە ئۆجەلان و من چوینە ژورێك و قسەمان کرد لەسەر روداوەکان و چی بکەین باشە من شەخسی کۆبونەوەکەم پێخۆش نەبوو لەبەرچەند هۆیەك ئۆجەلان وتی ئەم ٣حزبە پێکەوە ئەتوانن زۆر گۆران بکەن پەیمانێکی ئیستراتیژی مۆر بکەین مسارق شەر هەموی pkk ئەیدات ئۆجەلان وتی چوار ملیۆن دۆلارم داناوە بۆ ئەوشەرە ئەگەر پێویستی بە پارەی کە کرد سەفەربلکێکی بۆ ئەکەم واتە حملەی پارە کۆکردنەوە لە ئەوروپا پاشان قسەو پێشنیارەکانی مام جەلال واقیعانەو باشبوو وەئامادە نەبوو بروانە ناو شەرەوە دژی پارتی لەگەڵ پەکەکە مام جەلال پێشنیاری کرد کە چارە سەرێکی ئاشتیانەی بۆ بدۆزنەوە باشترەوەتا مەجالی ئاشتی مابێت بەئاشتی هەوڵی بۆبدەین کاك عبداللە ئۆجەلان قسەکانی باش نەبو یاداوای ئەکرد یەکێتی وسۆسیالیست بچنە ناوشەرەکەوە وبەشەرحەسمی هەموو مەسەلەکان بکەین وپارتی لەسەرساحەکە وەدەربنێن وپەیمانێکی ئیستراتیژی مۆر بکەین مساریفی شەر هەموی لە سەر pkk وتی چوارملیۆن دۆلارم بۆ ئەوشەرەداناوە نزیکەی دووسەعات ونیو قسەمان کردو نەگەیشتینە ئەنجامێك کاك عبداللە ئۆجەلان دەیویست ئێمە پێکەوە بچینە شەرەوەو مصاریفی لەسەر ئەو بێت رەئی من و مام جەلال یەك بوو لەسەر روداوەکانی ئەمرۆی کوردستان من هەمان قسەی کۆبونەوەی دووقۆڵی من وکاك عبداللە ئۆجەلانی رۆژانی پێشوم دوبارەکردەوە دروست بونی حزبە کوردستانیەکان pkk و پارتی دیمکراتی کوردستان ویەکێتی نیشتمانی کوردستان حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان ئەمانە بۆشەری یەکتر کورد دروست بون یاماف کورد لە لای دەوڵەتە داگیرکەرەکانە ماف کورد لای دەوڵەتەکانە یا لای خۆمانە ئۆجەلان وتی خائینانی

ناوخۆ ترسناکترە لەو دوژمن بۆیە پاکردنەوەی ریزەکانی بزوتنەوەی کوردستان واجبە کاك ئیبراهیمی حاجی ملو ئەتوانیٚ کۆنترۆلی بادینان بکات نازانم ئەوان پێشتر چیان باس کردبوو واتە ئەو کۆبونەوەیە زۆر گرنگ بو بۆچارە نوسی کورد بە تایبەتی مام جەلال و کاك عبداللە ئۆجەلان کە خاوەنی دووهێزی گەورەو خاوەنی بریاربون لە کوردستان دا، وەکو شتێکی مێژویی ئەمرۆ بریاری یەکلای کەرەوە لە دەستی مام جەلال بو بونی شەر یانەبون ئەمرۆ کاك عبداللە ئۆجەلان پێشتریش داوای دەکرد کۆمیتەیەکی سەربازی لە هەرسیٚ لا دامەزرێت من بەرپرسی هەموی وەربگرم هەروەکو لەکۆنگرەی نەتەوەی لەهۆلەندە کاك زوبێر لە سەرداوای سەر کردایەتی pkk پێش کاك عصمەت شەریف داوایان لەمن کرد من نەم کرد لەوێش بە کاك عبداللە ئۆجەلانم وت من باوەرم بە شەرەکە نیە و نە بەشدار دەبین ونە مسئولیاتیش بۆشەری ناوخۆ وەرئەگرم کەبەراستی هەلومەجەکە زۆر حەساسە هەر بریارێك ئەقلومەنتیقی لەگەلٚ نەبێت دەبێتە هۆی کارەسات بۆ میللەتەکەمان مێژویش رەحم بە کەس ناکات بەلآم من ئەمرۆ لە ویژدانی خۆم ئارامم هەر چەندە مام جەلال زۆر بەویژدانەوە قسەی ئەکرد بەلآم منیش لەگەلٚ هەردوکیان تەئسیرم لە سەرئەو وئەم کاتە حەساسە زۆربو مام جەلال وتی رەئی تۆچیە منیش وتم رائی خۆم وتوە بەجەنابت ئەویش وتی نایکەین هەلساین و هاتینە دەرەوە، لە١٩٩٥/١١/٦ لەدیمەشق لەگەلٚ مامۆستا کەریم ئەحمەد پێکەوە بوین هەندێك قسەمان لەسەر روداوەکان کرد ئەویش لەهەولٚ دابوو لەنێوان پارتی و پەکەکە دا سکرتێری حزبی شیوعی کوردستان بوو، لە١١/٧ سەردانی سەفارەتی ئەلمانیامان کرد سەفیری ئەلمانیا داوای چاوپێکەوتنی pkk ی کرد بۆ بینین من وتم خۆیان زۆریان لای خۆتانە لەئەلمانیا وتی ئەمە مەسەلەیەکی سیاسیە ئێمەش باوەرمان بە ئێوە هەیە ئەوەش رای حکومەتی ئەلمانیای فیدرالە منیش بە کاك عبداللە

ئۆجەلانم وت ئەویش ژنێکی کەڵەگەتی لەگەڵ بو پێم وایە ئەو ژنەبوو لەنیرۆبی لە کاتی گرتنەکەیدا لەگەڵیدابووە کاك خەلیل ئاتاش بو کاك شێخ تایەر هەردوو مەوعیدەکەی بۆ رێکخستین لە مەکتەبی سۆسیالیست لە دیمەشق یەکیان دی کۆبونەوەیان کردو دوایش هەردولا سوپاسیان کردین و پاشان چوینە بازار هەندێك گەراین و چوینەوە بۆ مەکتەبی حزب، لەرۆژانی ۸تا۱۱/۱۱ هەر لەسوریا بوم سەرقاڵی ئیشوکار و پێشوازی میوان و کۆبونەوەی جۆربەجۆربوین، لە۱۲/۱۱ کاك شێخ محمد بەرزنجی و کاك صلاح کوری و کاك عبدالخالق زەنگەنەو کاك شۆرشی دکتۆرخالید و کاك عبدالوهاب تاڵەبانی و کاك حکمت عەزاوی و زۆری کەش سەردانیان کردم لەبارەگای حزب لەدیمەشق هەرهەمان رۆژ لەماڵەوە تامین خان بەتەلەفۆن قسەم کرد کەلەئەڵمانیا بوو، لە۱۳/۱۱ سەردانی کاك شێخ محمد بەرزنجیم کرد لەسوریا لەماڵەکەی قسەمان دەکرد رۆژێکی ساردوسەرمابوو دووعەرەبی ئیسلامی لەوێ بون پێ دەچوو خەڵکی مەغرب بن دژی کورد قسەیان دەکرد بەتایبەتی دژی مام جەلال ئەیانوت سەر بەئیسرائیل و یەهودیە ئەوان مەبەستیان هەموو کورد بوو بەلاَم لەوێ لەبەر کاك شێخ محمد کوردە جیایان دەکردەوە هەندێك من لەدەرەوەی قسەکانیان بوم دەیانوت لەمجەلەیەکدا خوێندومانەتەوە مام جەلال وتویەتی قورئان بەحوشتردا بنێرنەوە بۆ عەرەب هەرکات سەرکەوتین باکەری کوردی پێوە هیلاك نەبێت هەروەها دەیانوت مەسعودو جەلال هەردووکیان کافرن من قسەکانم زۆر پێ ناخۆشبوو کاك شێخ محمد دەیویست قسەکانی لەوێ کۆتایی پێ بهێنێ منیش لەدەرەوەی مناقەشەکەوە بوم بەلاَم چارم نەماو ووتم دوێنێ و پێرێ ئیسحاق رابین کوژرا لە ئیسرائیل لەسەر گۆری یەهودیەك دەیان قائیدی عەرەبی لەوێ بون و مەلیك حسێن دەستی ژنی ئیسحاق رابینی ماچ کردوحوسنی مبارەك ودەیانی دیکە بۆی دەگریان کورد کەس

شتی وای کردووه یابریارتان داوه دژی کورد بن حزبی بەعس دژمانەو قەومی دژمانە وا ئێوەش ئیسلامین دژمان بریارتان داوه کاك شێخ محمد هەوڵی دا کۆتایی پێ بهێنێ و پێی ووت ئێستا میوانم هەیە جارێکی کە دادەنشین و قسەی لەسەر دەکەین ئەوان رۆیشتن بەلأم ئەوەش رەئی راستەقینەیان بوو، لە١١/١٤ کاك عمربۆتانی سەردانی کردین و بروسکەی کاك مەسعودی هێنا لەسەر مەسەلەی ئاشتی خۆیان و پەکەکە و قسەمان کرد من ووتم دوای ئەو وەلأمەی ئێوەش چەند رۆژی پێشوو بە ئۆجەلانم وتوه پارتی ئاشتیتان لەگەڵ ناکات خۆت چی بەچاك دەزانی بیکە من قسەی تێدا ناکەم من ئەو ماوەیە خۆم ماندوو کرد وادیاربوو برادەرانی ئێوە بەشێوەیەکی کە لێیمان تێ گەیشتون..هەر لە١١/١٤ (٧)حزبە کوردستانیەکە کۆبونەوە لەبارەگای سۆسیالیست لەدیمەشق بۆقسەکردن و یەك رەئی لەسەر روداوەکان و قسەیش لەگەڵ لایەنە عێراقیەکان بکەین حزبی شیوعی کاك کەریم ئەحمەد وئەبوسیروان بون لەزەحمەتکێشان کاك عبدالخالق زەنگەنە بوو لەبزوتنەوەی ئیسلامی مامۆستا شێخ محمد بەرزنجی بوو لەسۆسیالیست من و کاك برزو بوین بۆئەوەی یەك هەڵوێست هەبێت لەسەر روداوەکان و هەوڵی ئاشتی و هەنگاونان بەرەو روداوەکان و ئاگامان لەیەك بێت لەکۆبونەوەکانداو جارجار تالێرەین کۆبونەوە بکرێت و حزبە کوردستانیەکان، لە١١/١٥ لەدیمەشق بوین بەتەمای دەرەوە بوم مەجال نەبوو ئەوەندە میوان هەبوو منیش ئیشم زۆربوو. هەرلە١١/١٥ وەفدی ئەمریکی و تورکی و بەریتانی لەئەنقەرەوە لەگەڵ پارتی و یەکێتی دا لەهەوڵی ئاشتیدا بون، لە١١/١٦ لەدیمەشق بوین مامۆستا مەلاناصح گەیشتەوە لامان من بەتەنها ئەمرۆ دەگەرام لەشام و صالحیە زۆرخۆشبوو هەستم بەئازادی دەکرد کەمن چەند ساڵە نەم توانیوە بەتەنها بگەرێم یائیشی دن وابووە ، لە١١/١٧ لەدیمەشق بوم کاك شمس الدین موفتی و کاك عبدالخالق زەنگەنەو کاك

عبدالوهاب تاڵەبانی و چەند برادەری کە سەردانیان کردم و هەندێك قسەمان کرد لەسەربارودۆخەکەو وەزعەئاڵۆزەکان پاشان سەردانی کاك شێخ محمد بەرزنجی مان کرد و پاشان گەرامەوە بۆبارەگا و خەریکی خوێندەوە بوم، لە١١/١٨ لەگەڵ مامۆستا مەلاناصح پێکەوە بوین هەندێك گەراین لەدیمەشق، لە١١/١٩ نیوەرۆ دەعوەتی کاك عمربۆتانی بوین لەچێشتخانەی سەلام کاك عبدالخالق زەنگەنەو کاك شمس الدین موفتی وکاك مەلاناصح یش لەوێ بون باسی سۆسیالیست و پارتی و کاك عمرو ئەوبرادەرانە کرا..کاك عمر وتی من ئەگەر لەگەڵ سۆسیالیست بهاتایەم دەبوو وەکو عارف روشدی خۆم و جانتاکەم بهاتایەم بەلاّم ئێستا لێرەم و ئیشم بەپارتی نیەی پارتی ئیشی بەمنە وەحەز دەکەم پارتی ئێستا نەقلم بکات بۆئەوەی منیش واز لەپارتی بهێنم بەلاّم کاك عمر لەزۆریان لەسۆسیالیستە کۆنەکان باشتربوو دژمان نەبوو لەسۆسیالیستە کۆنەکان یەکەم کاك عدنان و دوەم کاك عمربۆتانی و کاك شێخ محمد شاکەلی و کاك شیروان باش بون بەلاّم لەبەر مەصالح دویاهەرچی لەگەڵ حزب نەمانەوە چونەلای پارتی ویەکێتی (١-کاك رسول مامند ٢-ماموستا شیخ محمدی شاکەلی ٣-کاك شیروان شیروەندی ٤-کاك عدنان موفتی ٥-کاك عادل مراد )بۆ ناویەکێتی و(١- خالە سید کاکە ٢-ماموستاسەعد عبداللە ٣-کاك عمر بۆتانی ٤-کاك قادر جباری ٥-کاك نزامەدین گلی ٦- ماموستا ئەمین قادر) بۆ ناو پارتی وەکاك دکتۆرمحمود بێ لایەن مایەوە (١-مامۆستا مەلا ناسیح ٢-خالە حاجی ٣- محمدی حاجی محمود) مانەوە جارێکی کەش حزبیان رێکخستەوە بێگومان هەرلایەك هەندێك کادری رێکخستن وپێشمەرگەیان لەگەڵ خۆیان برد بەلاّم کەسوکاری شەهیدان وزۆربەی زۆری کادرو رێکخستنەکانی حزب نە بە پارە و نەبەمسئولیەت نەکەوتنە دوایان هەرچەندە دەلاّلی زۆریشان بۆکردن بۆئەوەی یەکێتی وپارتی دەست لە شانیان بدەن پێیان بڵێن کوری باشن بەلاّم زۆری کادرە

دڵسۆزەکان بۆ برێك پارە بیرو باوەرو خوێنی شەهیدەکانیان وحزبکەی خۆیان نەگۆریەوە بەرگریان لێکردو رێبازە پیرۆزەکەی شەهیدان وسەیدا صالح یوسفییان درێژە پێدا زۆریان حەزیان دەکرد دوای خۆیان کە چونە لای یەکێتی وپارتی حزب نەمێنێ بەڵام هەندێکیان حەزیان دەکرد حزب بە لاوازی هە بێت بۆ ئەوەی جارجار پارتی ویەکێتی پێ بترسێنن وبڵێن ئەگەر پارەو ئەحترامیان جارجار کەم دە بێتەوە واتە زۆریان لەوێش هەرنانی حزبی سۆسیالیست ئەخۆن بەڵام هەندێکیان پێیان خۆش بو ئەگەر لەبەر هەر زروفێك بوە لەگەڵ حزب نەماون بەڵام پێیان خۆشە حزب بەردەوام بێت تائەوانیش هەلومەرجێکی لەباریان بۆبرەخسێ وبگەرێنەوە ناوحزبی خۆیان حزب هەر بەحزبی خۆیانی ئەزانن بەنهێنی چییان پێ بکرێت پشتیوانی لەحزب ئەکەن چەندجاریش قسەمان کردوە هاندەرێکی باش بون بۆمن زۆرجار خەڵکی حزبی وباشیان بۆناردوین، لە٢٠/١١ چاوەرێ ی فیزەم دەکرد سەردانی سەفارەتی ئەڵمانیام کرد دوا کەوتبوو منیش بریارم دا بگەرێمەوە بۆکوردستان کاك ئەبوسیروانی حزبی شیوعی تەلەفۆنی بۆکردم وتی بیستومە دەرۆیتەوە من داوات لێ دەکەم مەرۆردوە سەبرت هەبێت زۆر موجامەلەی کردم وزۆرداوای کرد نەگەرێمەوە بەسوعبەتەوە ووتی چەند ساڵە لەکوردستانی ئێستا بامانگێك ئیسراحەت بکەیت منیش بەتەمای سەفەری سوئێدم لەپێش تۆیشەوە لێرەم چاوەرێش دەکەم ئێوەش چاوەرێ بکەن و سەبرتان هەبێت تۆلەوشاخە سەبرت هەبرو بۆلەم شامە سەبرت نیە منیش ووتم باشە بابزانین چۆن دەبێت لەسەعات (١٢) قسەی لەگەڵ کردم کاك ئەبوسیروان... هەرلە٢٠/١١ سەعات (٢)ی پاش نیوەرۆ دەعوەتی کاك دانا ئەحمەد مەجید بوین لەماڵی خۆیان لەدیمەشق پاشان گەرامەوە بۆ مەکتەبی خۆمان لەمساکن بەرزە لەسەعات (٤/٣٠) ئەبویاسر لەحزبی شیوعی تەلەفۆنی بۆکردم و وتی ئەبوسیروان دوای قسەکردن لەگەڵ تۆدا

رۆیشتوەتەوە بۆماڵەوە لەسەعات (٣)ی پاش نیوەڕۆ لەڕێگا کۆچی دوای کردووە بەراستی زۆرم پێ ناخۆش بوو وتی ئێستا لەخەستەخانەی (ابن النفیس)ە لەشام پاشان دکتۆر حامید تەلەفۆنی کرد کەئاگاداری جیهازی خۆمان بکەم وئاگاداری کوردستان بکەن کەشتێکی وا روی داوە بۆ جەنازەکەی وتی چونکە جیهازی خۆمان تاسەینێ نایەنە سەرخەت منیش ئاگاداری جیهازی خۆمانم کرد ئەوانیش ئاگاداری مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعیان کردبوو پاشان منیش لەگەڵ مامۆستاملا ناصیح و برادەران چوین بۆسەردانی بارەگای حزبی شیوعی بۆناردنەوەی جەنازەکەی چۆن بێت وابریار درا کە بەفرۆکە بۆقامیشلی و لەوێشەوە بەرێ ی بکەن، لە١١/٢١ میوانمان هەبوو لەدیمەشق سەرتاڵی ئیشوکاربوین لەورۆژانەدا هەروا قسەیان بلاو کردبوەوە بۆئێمە کەئۆجەلانمان دیوەو پارتی ڕێگا نادات من لەدهۆکەوە بگەرێمەوە بۆ کوردستان منیش زۆرم لاسەیربوو وتم باوەر ناکەم چەند جارێك هەرباسیان کرد منیش وتم دەرۆم بائەوان رێگام نەدەن دەگەرێمەوە بۆئێرە و پاشان لەئێرانەوە دەگەرێمەوە بەلام ئەوە ئیعلانی شەرە لای پارتیەوە ئەگەر شتی والەگەڵ من بکەن ئەوکات ئێمەش حەقی خۆمانە هەرچی بکەین بەلام من بەقسە باوەرم نەکرد کاك عبدالخالق وئەوان وتیان پێمان باشە بروسکەیەك بکەیت بۆکاك مەسعود بارزانی منیش بروسکەم بۆکرد کە دەگەرێمەوە ئەویش زوو وەلامی دابوەوەو ئاگاداری هەموو بەرپرسانی دهۆك و لقی یەکی کرد بوو پێشوازیم لێ بکەن و زۆر بەوپەری ئیحترامەوە کاك مەسعود وەلامی دابومەوە هەتا ئەشیاشم پێ بوو پێشمەرگەی یەکێتی بۆیان نەئەهاتەوە مام جەلال دای بە من لە قامشلی بو من بروسکەم بۆکاك مسعود بارزانی کرد جوابی دامەوە وێنەیەکی بە لقی یەکی دهۆك دابو بۆ هاوکاریمان منیش بە مام جەلالم وت بۆ هێنانەوەی ئەشیاکان بەلام دوای سورییەکان وەرەقەیان نەکرد بۆبردنەوەی شتەکان چونکە

هەموی کەلوپەلی سەربازی بون من بە مام جەلالم وت گەیشت هەندێکتان بۆ ئەنێرم ...مام جەلال وتی کەی ئەوەجیاوازی هەیە مام جەلال زۆر دەست کراوەیە زۆریش یارمەتی من وحزبی سۆسیالیستی داوە لەوەختێکدا باسی هەموی ئەکەم تانوسینی ئەمرۆشم لە ٢٢-١١-١٩٩٥ لەکوردستان کەس دەستکراوەی لەپارە بەخشندەیدا وەکو مام جلال نیە بێ ئەوەی منەتت بەسەردابکات ئەوپارەیە پارەی کوردوشۆرش وحکومەتە ماف هەموئەوکەسانەیە کەخەباتیان کردوە خۆلەکوردستان زۆری کەش هەیە پارەی دەستکەوتوەو بە کەسیش نادات بابە مقابیل یامنەت وەکو خێر حسابی ئەکات هیوادارم هەموو کەس وەکومام جەلال بێت مام جەلالیش ئەگەر زیاتر لە ئێستاش دەسەلاتی هەبو هەروابێت، لەشەوی ٢٢-١١/٢٣ سەعات (١١)ی شەو لەشام دەرچوین من و مامۆستامەلا ناصح وکاک بەرزۆ سەعات (١١)ی سەرلەبەیانی، گەیشتینە قامیشلی هەزار کیلۆمەتر بوو بە(١٢) سەعات گەیشتین لەوێش سەردانی کاك محمد منصورمان کردو عەقیدعمرو عەقید سلێمان وئەوانەش هاوکاری زۆریان کردین وەنوێنەری پارتی کاك محمودگەرگەری سەردانی کردین ورۆژی ١١/٢٣بەسەیارەی کاك ئەبوعەلی بوزە زۆرلەگەڵمان ماندوبو چوین بۆ سەرئاوەکە لای قامیشلی، لە١١/٢٤ لەسەر ئاوەکە برادەرانی پارتی پێشوازیەکی گەرمیان لێ کردین لەگەڵ لقی دهۆکی سۆسیالیست دەرچوین و لەسەعات (٣/٣٠)ی پاش نیوەرۆ کاك هوشیار بامرنی وبرادەرانی خۆمان و کاك شوکری نیرۆیی بەرپرسی علاقاتی لقی یەکی پارتی و کۆمەڵێك لەئەندامانی لقیان و هەندێك لەبرادەرانی خۆمان لەسلێمانیەوە هاتبون و لەسەر ئاوی دیجلە پێشوازیان لێ کردین وشەو گەیشتینە دهۆك لەقصر دهۆك دابەزین، لە١١/٢٥ سەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی سەردانی پارێزگای دهۆك مان کردکە کاك عبدالعزیز تەیب پارێزگاربوو پێ ی وتین ئۆجەلانتان دی وتم بەڵێ وەکاك شەوکەت شێخ بەزدین لەوێ بوو

چونکه جاری پێشو سەردانی پارێزگامان نەکردبوو پاشان سەردانی لقی دهۆکی حزبمان کرد خانویان بۆگیرابووبارەگایەکی باشیان دانابوو بەشەکانیان جیاکردبوەوە... وەلەسەعات (١١)ی سەرلەبەیانی هەمان ڕۆژ سەردانی کاك نێچیرمان کردو سوپاسمان کرد بۆئەو هاوکاری کردن ودانانی بارەگا بۆلق و لەو سەفەرەی ئێمە هاوکاریان کردوین کاك عەزەدین بەرواری وکاك حسین دزەییش لەوێ بون دیسانەوە کاك نێچیر پرسیاری لێ کردین و وتی ئۆجەلانتان دی وتم بەڵێ شەری pkk وپارتی گەرم بو بەلاّم ئەگەر پارتی لەهەمووشت ناحەقی کردبێت ئەم جارە pkk زۆریش ناحەقی بە پارتی کرد من بەکاك عبداللە ئۆجەلان یشم وت لەسوریا لە ناو باخەکەی لەسەعات (١)ی پاش نیوەڕۆ لەدهۆك دەرچوین وبۆسەعات (٨)ی شەو گەیشتینە هەولێر بەلاّم کاك نێچیرڤان و ئەوان ئەو ڕۆژە رویان باش نەبوو نەمزانی کێشەی شەری پەکەکەو خۆیانە یالە ئاستی ئێمەیە چونکە هەندێك هەواڵیان دابونێ گوایە ئێمە دژی ئەوان بەرەیەك دەکەینەوە لەگەڵ پەکەکە دا و دوای دەرکەوت کاك فرانسۆ باسی کردبوو لای وەفدی حزبمان ئێمە هەوڵەکانمان بۆ راگرتنی شەربو رۆژانەش لەرێگای کاك عمربۆتانی وە ئالو گۆری برۆسکە هەبو لە نێوان من وکاك مسعود بارزانی و کاك عبداللە ئۆجەلان بۆچونەکانی هەردولام دەگەیاندە یەك لە١١/٢٦ مامۆستاچەتۆبەرپرسی پەیوەندی یەکێتی سەردانی کردین هەروەها کۆمەڵێك لەدۆست و ناسراوەکانی شاری هەولێر سەردانیان کردین بۆبەخێر هاتنەوەمان، لە١١/٢٧ هەر لەهەولێر بوین، لە١١/٢٨ لەهەولێر دەعوەتی مام جەلال بوین لەماڵی خۆی، لە١١/٢٩ هەرلەهەولێر بوین حزبی زەحمەتکێشان و بزوتنەوەی ئیسلامی ویەکگرتوی ئیسلامی و پارتی کارو کۆمۆنیست و پەرلەمانتارەکان بەجیاجیا سەردانیان کردین، لە١١/٣٠ لەمەکتەبی سیاسی لەهەولێر خەریکی ئیشوکارەکان بوین، لە١٩٩٥/١٢/١ لەمەکتەبی سیاسی

بوین لەهەولێر خەریکی ئیشوکاربوین، لە١٢/٢ لەهەولێرەوە گەڕامەوە بۆسلێمانی، لەڕۆژەکانی ٣و١٢/٤ هەرلەسلێمانی بوم میوانمان زۆربوو بۆبەخێرهاتنەوە و سەردان هاتبون، لە١٢/٥ چومە شارەزوورو شەو لەگوڵەخانە بوین لەماڵی کاك عەلی، لە١٢/٦ چوینە پرسەی خاڵۆ عەلی ئەحمەد لەتەپەرێزینە پاشان گەراینەوە بۆگوڵەخانە وەفدێکی بزوتنەوە هاتنە سەردانمان بۆ بەخێرهاتنەوە، لە١٢/٧ لەگوڵەخانەوە گەرامەوە بۆ سلێمانی، لە١٢/٨ لەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاربوین، لە١٢/٩ هەرلەسلێمانی بوین لە هەڵەبجەو سیروان بزوتنەوەو پارتی شەریان بوو لەسیروان بارەگای پارتیان گرتبوو کوژراویش هەبوو، لەرۆژانی ١٠تا١٢/١٤ هەرلەسلێمانی بوم سەرقاڵی ئیشوکارەکان بوین، لە١٢/١٥ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزب هەبوو لەسلێمانی، لە١٢/١٦ هەربەردەوام تاسەعات (١١)ی شەوی ١٧–١٢/١٨ کۆبونەوەکە کۆتایی پێهات، لە١٢/١٨ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی هەبوو بۆنەتیجەی کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی لەو رۆژانەدا بزوتنەوەی ئیسلامی هەندێك کێشەیان بۆپێشمەرگەی سۆسیالیست دروست دەکرد بۆدۆستو لایەنگرانی حزب پارتیش هەروا بەلاَم بزوتنەوە خراپ تر چەند جارێکیش ئاگاداری ئێرانمان کردبوو کەتەسەروفاتیان باش نەبو ناچاربوین هێزێك پێشمەرگە بنێرینە ئەو سنورەو مەسەلەی گومرك هەبوو ئەوان دەستیان بەسەر گومرکی تەوێڵەدا گرتبوو بریارمان دا ئەگەر ئەوان مەسەلەی گومرك جێ بەجێ نەکەن ئەوەئێمە گومرك بۆخۆمان دانێین چەند رۆژێك بوو هێزەکە لەوێ بوو کاك محمد دۆلاَشی هەرخەریك بوو لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی دا هەردوایان دەخست ئێرانیەکان زانیان مەسەلەکە جدیە ئێمە بریارمان داوە ئەگەر گومرگ هاوبەشی سۆسیالیست وبزوتنەوە ئەوە سۆسیالیست بەتەنها گومرگ دادەنێت ئێرانیەکان هاتبون و وادیاربووئاگاداری بزوتنەوەشیان کردبوو کەچارەسەری بکەن باشبوو بەنیوەچڵ

چارەسەر کرا چونکە شەرلە سەرگومرگ عەیب نەبو لەبەرئەوە یەکێتی وپارتی چەند ساڵە شەریانە بزوتنەوەو یەکێتی ئەوچەندرۆژەش بزوتنەوەو پارتی چەند شەرو پێکدادان لە نێوانیاندا رویداوە هەموشی لەسەرگومرگە واتە شەرلەسەر گومرگ حەلاڵە بۆیە ئێمەش بریارماندا لەسەرگومرگ شەر بکەین لەگەڵ هەرلایەنێکدا زوڵمان لێ بکات هەموو دنیا لەسەر پارە ودەسەلات شەرئەکات چ نەوت بێت یابازرگانی بەلام بۆ ئێمە گومرگ شتێکی حەیاتیە بۆیە لە سەر ژیان وهێزی پێشمەرگەو حزب شەر بە باشترین چارەسەر ئەزانین، لە١٢/١٩ چوینە سەیدصادق و بۆمەلاوەیسە بۆپرسەی کاك تۆفیق و پاشان گەراینەوە گوڵەخانە و کۆبونەوەیەکمان بەبەرپرسەکانکان کرد کەئەو هێزە بۆئەوە کۆکراوەتەوەو مەبەستەکەش بێ شەر جێ بەجێ بووە ئێمەش وامان پێ خۆشە بلاوە بکات و دوای ئەوەش کۆبونەوەیەکمان بەپێشمەرگەکان کرد کە(٩٠٠)پێشمەرگە ئامادەبون لەوێ جگە لەوەش لەرەبایەو بارەگاکان وجێگاکان بون هەروەها خەریکی کارەبای شارەزوور بوین بیهێنینەوە ناوچەکە تاسەید صادق کارەبا هەبوو ئێمە بەپارەی خۆمان کارەبامان لەسەید صادقەوە هێنابۆ گوڵەخانە ئیترهێزەکەشمان بلاوە پێ کرد پارتی وایان دەزانی بۆئەوانە بزوتنەوەش وایان دەزانی بۆئەوانە لەراستی دا بزوتنەوە شەری پێ دەفرۆشتین وملی نەدەدایە هەندێك شت نەك پارتی .. پارتی دیاربوو هەرچیمان لەگەڵ دەکردن بۆبزوتنەوە وایان دەزانی پارتی واجبیەتی پارتیش لەبەر ئەوەی شەری بولەگەڵ یەکێتی هەموو شتی بزوتنەوەی قبوڵ ئەکرد چونکە پارتی لاوازبو لەشارەزور وهەورامان ئەوان وایان دەزانی واجی خۆیان بەجێ هێناوە لەوکاتەشدا ئەگەر شەری ئێمە بوایە ئەوان لەوە دەترسان یەکێتیش پەلاماری ناوچەکە بدات و کەڵك لەو فرسەتە وەربگرێت پاش کۆبونەوە گەراینەوە بۆ سلێمانی، لە١٢/٢١ لەسلێمانی چومە تەپەتۆڵەکە بۆپرسەی باوکی مەلا ئیبراهیم

و بۆپرسەی برای حمەی حسێن دەمانچە لەسیروان پاشان چوینە بارەگای سیروان و گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١٢/٢٢ لەسلێمانیەوە چومە زەرایەن و هەڵەبجەی تازە بۆماڵی عمری حاجی عەلی و پاشان چومە بێسەڵمێن بۆماڵی حاجی عەلی حمەی محمود بۆمەسەلەی سوڵح کردن و گەراینەوە سلێمانی، لە١٢/٢٣ کۆبونەوەی پەیوەندیەکان هەبوو پاشان چوین بۆ دەربەندیخان و ماڵی کاك محمدحاجی محمود هارونی بۆ پۆنگەڵە، لە١٢/٢٣ هەلیکۆپتەرێکی عێراق رای کرد بۆ هەولێرو تەسلیم بەیەکێتی نیشتمانی بوو، لە١٢/٢٤ چوینە پرسەی محمودی حاجی ئالی لە لالیخان گوندێکە لای پێبازەو پاشان چوینە ئاوایی حاجی حسن بۆپرسە و گەراینەوە بۆدەربەندیخان و بۆسلێمانی و چوینە قەلاچۆلان ئاهەنگی دەرچونی کۆلیژی سەربازی هەبوو یەکیتی نشتمانی کوردستان ئێمەشیان دەعوەت کردبوو، لە١٢/٢٥ لەسلێمانی بوین چوینە پرسەی فائیق ابراهیم بەگ لە تەپەسەرقەڵەو گەراینەوە بۆسلێمانی و بەرێ کەوتم بۆهەولێرکۆبونەوەی سەرکردایەتی سیاسی (٧) حزبەکە هەبوو، لە١٢/٢٦ لەهەولێر بوم سەردانی ئەنجومەنی وەزیران لای کاك کۆسرەت سەرۆکی حکومەتی هەرێمم کرد، لە١٢/٢٧ بەشی کۆمەلایەتی کۆبونەوەیان هەبوو ئێمەش بەشدار بوین لەو دانیشتنە و لەسەرکارەکانیان قسەمان کرد، لەرۆژانی ٢٨و١٢/٢٩ هەرلەهەولێر بوم خەریکی ئیشوکاری حزب بوین، لە١٢/٣٠ هەولیان دا کەوەفدێکی ئێران دێت بۆکوردستان ئێران خۆشیان ئاگاداری ئێمەیان کرد کەگرنگی بدەین بەوەفدەکە کەلەهەموو دەزگاکانی ئێران پێکهاتووە بەقیادەی حاجی ئاغای محمدی بۆهەولێرو دهۆك و سلێمانی وئەوناوچانە دێن و خەڵك دەبینێ و قسە دەکات لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان ئەمەش بوو بەفرسەتێك بۆ خۆپیشاندانی حزبەکان لەبەرچاوی ئێران، لە١٢/٣٠ لەهەولێرەوە بۆ صلاح الدین و شەقلاوەو خەلیفان و دیانەو گەلاڵەو چۆمان وحاجی عمران و هەندێك ئەولاتریش

ڕێگامان نەبوو بەدەمی وەفدی ئێران بۆ کوردستان سەدان سەیارەو هەزاران جەماوەری ناوچەکان هاتبونە سەرجادە پارتی لافیتەو هەموو شت نوسرابوو پارتی و بزوتنەوە ی ئیسلامی وحزبی سۆسیالیست لافیتە وشیعارات، لەچۆمان ودیانەو ئالای زەردو شین و سپی هەڵواسرابوون لەهەموو لایە یەکێتی نەبێ کاک مەسعود خۆی لەنێوان دیانەو جندیاندا وەستابوو کاک نێچیروان و هەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسیان لەحاجی عمران بون لە حاجی ئاقای محمدی نوێنەری کۆماری ئیسلامی ئێران ئێمەش پێشوازیمان کرد لەحاجی ئاغای محمدی و گەراینەوە لەصلاح الدین لەبارەگای پارتی خواحافیزیمان لێکردن و ئیتر نەوەستاین وگەراینەوە بۆهەولێر ئاغای حاجی محمدی نوێنەری رابەریتی بووهاتبوو بۆ کوردستان بەرپرسان لەئیتلاعات ولەسوپاو هەموو دەزگاکانی لەگەڵ بوو ئەوان بەتەمای سەردان بۆدهۆك ومانەوە بون ئێمە گەراینەوە بۆهەولێر وەفدەکە ی ئێران لای کاك مسعودوپارتی لە صلاح ئەلدین مایەوە، لە١٢/٣١ لەهەولێربوین لەماڵەکەم بۆ ئیسراحەت ساڵێکی پر لەئاشوبمان بەرێ کرد و ساڵێکی نوێ هات یا پێمان نایە ساڵێکی نوێ وە ساڵی ١٩٩٥ ساڵێکی پر لەشەرو کوشتارو ناخۆشی بوو پرلەکارەسات بوو چاوەرێی ساڵێکی نادریار بوین،

## ساڵی ١٩٩٦ و رووداوەکانی

لە١/١/١٩٩٦ لەهەولێر بوم پێمان نایە ساڵێکی نادیارو ساڵێکی کەوە و ساڵی ١٩٩٥ مان بەرێ کردو چوینە ساڵی تازەوە... مرۆڤ دڵی خۆشە پێ دەنێتە ساڵی تازەوە بەڵام دوولایەنەیە ساڵێك لەتەمەن بەرێ دەکات و پێ دەنێتە ساڵێکی پر لەجەنجالی ئامێزو پر دەردە سەری ئەو دنیا بێ وەفایە یامرۆڤە بێوەفاکانی ئەوجیهانە ئێمەی کوردیش لەو دونیا تێنەگەیشتوین ودواکەوتوی ئەم جیهانە پان وبەرینە لەسوچێکیدا هەڵواسراوین و ساڵێکی پر لەناهامەتی و ماڵ وێرانیمان بەرێ

کردو پێمان نایە ساڵێکی نادیاری کەوەو بەرچاو تاریکی ئەوجەهنەوە لەجیاتی
دیاری بۆمناڵان جەنازەی باوك کوژراو کەسوکاریان بۆ دەنێرینەوە کورد بەدەستی
کورد بە چەك وفیشکی ولاتانی پێشکەوتو... سەری ساڵ بۆمناڵە چاوگەشەکانی
کورد دور لەهەموو ژیانێکی مناڵانی جیهان بۆیە من شەخسی نەدڵم بەساڵی رابردوو
خۆش بوو وەنەدڵم بەساڵی داهاتوو خۆشە هەروەکو رۆژەکانی ئاسایی مانگ وساڵ
ورۆژ جیاوازیەکی بۆئێمە نیە چونکە بەراستی کورد رۆژی رەش چاوەرێ ی دەکات
ئەگەر بێتوو لایەنە سیاسیەکان چاو بەرابوردوی چەندساڵە بەتایبەتی لە ١٩٩٢
و١٩٩٣و٩٤و٩٥ وەچاوی پێدا نەخشێننەوە رووبەرووی ترسناکی زۆرتر
دەبینەوە... هەرئەمرۆ لەمەکتەبی سیاسی حزب بوم لەهەولێر هیوامان خواست
کەساڵی ١٩٩٦ ساڵێکی خێرو خۆشی بێت بۆگەلانی جیهان بەگشتی و گەلی کورد
بەتایبەتی وەکو مرۆڤی ئەودونیایە بژین هەرچەندە بە ساڵێکی پرلە شەرو
کوشتارومال وێرانیەوە پێمان نایە ساڵی ١٩٩٦وە مەسەلەیەکی کورد هەیە ساڵ
ساڵی مەیمونەوە ئەوەڵی ئاخری چۆنە،ساردی زستان لە سەرەتاوە دیارە لە١/٢
لەهەولێربوم لەدوای نیوەرۆ لەدەروازەی شاری هەولێر چاوەری هاتنی حاجی
ئاغای محمدی بوین بۆشاری هەولێر دوای سەردانی بۆدهۆك و تا ئیبراهیم خەلیل
چوبوو... ئەورۆژە سۆسیالیست و بزوتنەوەی ئیسلامی چربون لەسەیتەرەی
پارتی وەسنابون لەرێگایان ئێمەش لەدەروازەی شار یەکێتیش هەزاران کەسی
هێنابووە سەرجادەکان سەدان سەیارە لەسۆسیالیست و بزوتنەوەئیسلامی وحزبی
شیوعی هاتبون بەلام لەدوای یەکێتی کەئالای سەوز بووئیتر ئالای شین بوو لەناو
جەماوەرەکەدا زۆربەباشی دەرکەوت... لەوێ یەکێتی بەناوی حکومەتی هەرێم
وبەرەسمی پێشوازیان لێ کردو بەشێوەی نیزامی زۆر گرنگ بوو پێشوازیەکە..
گرنگ بوو قەبارەی حزبی سۆسیالیست زۆر دەرکەوت لایەن لەچۆمانەوە بەتایبەتی

ناوشاری هەولێر قورسایی حزب پاشان ئێمە گەراینەوە بارەگای خۆمان لەهەولێر حاجی ئاغاو برادەرانی لەگەڵ یەکێتی رۆیشتن میوانی ئەوان بون، لە۱/۳ یەکێتی لەهەولێر جەماوەریان کۆکردبوەوەو ئالآی سەوزیان پێ بوو بەئێمە‌یان نەوتبوو کە حاجی ئاغای محمدی قسەدەکات و جەماوەر کۆدەبێتەوەو لافیتە نوسین و ئەوشتانە دەکرێ ئێمەش ئاگامان لێنەبوو لەوێ ئێرانیەکانیش بەئێمەیان نەوت کەشتێکی واهەیە من گەرامەوە بۆبارەگاو ئەو رۆژەش هەر نەرۆیشتم لەوێ قسەی کردلە پارێزگای هەولێر حاجی ئاغا باسی باران بارانیشی کردلەوکاتەدا باران نەباریبوو خەڵکی تالوکەی بوو ئەو بارانەش سودی هەبوو خەڵکی ناویان نابو ئاغای بارانی قسەکانی حاجی ئاغا باشبوو پارتی و یەکێتی هەریەکە دەیویست پیشانی بدات لەوێ کە بەهێزترە واش بوو یەکێتی لەروی هێزو لەروی رێکخستنی کاروبارەوە وەکو حکومەت کاریان دەکرد ئێرانیەکان وتیان پارتی عەشایەرە بەلآم یەکێتی حکومەتە چونکە ئەو هەڵسوکەوتەی یەکێتی هەڵسوکەوتی حکومەت نەك حزبێك، لە۱/۳ حاجی ئاغای محمدی و وەفدە هاورێکەی و کۆمەڵێك لەبەرپرسانی یەکێتی سەردانی مەکتەبی سیاسی حزبیان کرد لەهەولێر ئێمە بەگەرمی پێشوازیان لێ کردن وادیاربوو شەو لەگەڵ حزبی شیوعی و یەکگرتووی ئیسلامی و حزبی زەحمەتکێشان و لایەکانی کەش کۆبوبوەو قسەیان کردبوو، لە۱/٤ لەهەولێرەوە بەرێگای قوشتەپە بەرێ کەوتین بەرەو سلێمانی لەگەڵ وەفدەکە هەرلەقوشتەپەوە ئالآی شین لەچەمەرگەو کۆیەو رێگای بێستانەی نێوان کۆیە سلێمانی لەرانیەشەوە لقی راپەرین هاتبونە ئەوناوەو لەدوکانەوە تاشاری سلێمانی هەزاران کەسی سۆسیالیست لەسەرجادە بوو بەتایبەتی لەدوکان جەماوەرێکی زۆری سۆسیالیست لەسەرجادە بون بەئالآی شینەوە کەهاتین کاك جەبار فرمانیش لەوێ بوو بەلآم پێیان خۆش نەبوو ئەو جەماوەرەی سۆسیالیست لەوێیە و هەرلەوێش هەواڵیان

دامیٚ کەقسەی بەرێکخستنەکانی یەکێتی ووتوە بۆبەقەدەر سۆسیالیست خەڵکتان نەهاتوەتە سەرجادە پرسی بوی کیٚ مەسئولی سۆسیالیستە لەدوکان ئەوکاتەکاك سەلام رەئوف بەرپرسی حزب بوو .. لەرێگای چنارۆك سەیارەیەکی پێشمەرگەی ئێمە وەرگەرا جگە لەتێك چونی سەیارەکەو پێشمەرگەیەکسان رانی شکاو چەند پێشمەرگەش بریندار بون مام جەلالیش لەدەروازەی شارو بزوتنەوەی ئیسلامی پێشوازیان کرد لەگەڵ سۆسیالیست دا هەروەها سەیارەیەکسان دەعمی کرد لەسلێمانی وەسەیارەیەکی بزوتنەوەش دای لەدایکی وەستا حسام خۆشتبووی دایکی پێشمەرگەیەکی سۆسیالیست بوو پاشان چوینە ئوتێل ئەبوسەنا ئێرانیەکان ئاغای حاجی هاشم لەویٚ لەگەڵ مام جەلال موجامەلەی یەکیان دەکرد دەزانم لەوەپێش رەئیان چۆن بوو پێم وتن من ووتم ئاشتان ببێتەوە نەك بەو شێوەی ئێستا لەوێش کاك جەبار باسی کردو وتی لەسەرجادە جەماوەرێکی زۆرتان لەویٚ بوو منیش ووتم ئەوەش بەهاوکاری یەکێتی ومام جەلالە ئێمەش توانیمان ئەو هەنگاوە بنێین وجەماوەری حزب وای لیٚ بێت ووتی نا ئەگەر خۆتان نەبن خۆکەس بۆتان کۆناکاتەوە هەر لەوسەعاتەوە زانیم یەکیٚ لەکادرەکانمان دەکوژن لەوسنورە هەر هاتمەوە بە (٣) کەسیانم ووت ئاگاتان لەخۆتان بێت دەتانکوژن وەلە کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی دووپاتم کردەوە کەیەکیٚ لەبرادەرانمان دەکوژن ئاگایان لەخۆیان بێت، من خۆم دەزانم گەشە بکەیت بەهێز بیت ئەیەڵن وکێشەت بۆدروست ئەکەن لاوازبیت هەر کێشەت بۆدروست ئەکەن کەسێك باحزبێکان دەوێت وەکو توتی هەرچیان وت بیلێتەوەو شایەتی ناحەقیشان بۆبدەن لە١/٤ حاجی ئاغای محمدی و وەفدەکە سەردانیان کردین لەماڵەوە پێشوازی گەرمان کردو پاشان باس لەپەیوەندی نێوان ئێران و سۆسیالیست و هاوکاری ئێران بۆ سۆسیالیست کراو هەروەها هاوکاری کۆماری ئیسلامی دووپات کردەوە بۆ حزب و

بۆگەلی کوردستان و شەو میوانی مام جەلال بون لەقەلاچۆلان، لە ١/٥ لەسلێمانی لەپێشا مام جەلال قسەی کردو زۆر باسی حاجی ئاغای کرد، جەماوەرێکی زۆر کۆبوبونەوە لەبەر دەرکی سەرا رەنگی شین دووهەم بوو لەدوای یەکێتی پاشان حاجی ئاغای محمدی قسەی کرد مام جلال داوای لە کاك قادر عزیز کرد قسەی کرد پاشان لەگەلْ وەفدەکە رۆیشتین بۆهەڵبجە لەعەربەت و سەیدصادق هەموو ئەوناوە بەتایبەتی هەموو سۆسیالیست هاتبوە سەرجادەکە بەئالآی شین و حاجی ئاغای محمدی دابەزی بۆلایان و لەسەیتەرەی گامێش تەپەش یەکێتی گەرانەوە ئێمەش رۆیشتین لەنزیك سەیتەرەی سۆسیالیست مامۆستا مەلا عوسمان ومامۆستامەلا عەلی وئەوانی کەش هەموویان لەوێ بون ماموستا عەلی باپیرو کاك نوری حەمەعلی لەپارتی پێکەوە بون لەگردەنازێ هەمووی سۆسیالیست بوو دابەزی و لە لەقەدەفەری و تەپەرێزینە وناو هەڵبجەش کە متر نەبوو لەپارتی و بزوتنەوەش ئەگەر زیاتر بون حاجی ئاغا محمدی قسەی کردو منیش شمشێرکم بەدیاری دایەو لەقسەکانی دا سوپاسی مامۆستا مەلا عوسمان و بزوتنەوەو سۆسیالیست و کاك مەسعودو پارتی و مام جەلال و یەکێتی کردو سوپاسی گەلی کوردی بەگشتی کرد لەدوای نیوەرۆش بۆگردی گۆو بۆخورمالْ لەرێگاسۆسیالیست هاتبونە سەرجادە لەتەپەتۆڵەکەو تەپی سەفاو ناوخورمالْ وتەوێڵەش بەرێمان کرد تاسەر سنوری شوشمێ و گەراینەوە لەوێش دەوڵەتی ئێران بەرەسمی پێشوازیان لەحاجی ئاغا کرد پاشان ئێمە گەراینەوە بۆسلێمانی ئەم وەفدەی کۆماری ئیسلامی لە حاجی عمران تا سەیتەرەی شاوەیس حکومەتی پارتیە لە شاوەیسەوە تا سەیتەرەکەی سیدصادق و هەڵبجە حکومەتی یەکێتی بو لەگامێش تەبە بۆ تەپەرێزینە سۆسیالیست بو لە پردی زەڵم بۆ تەوێڵە حکومەتی بزوتنەوەی ئیسلامی بو هەرلایەك دەگەیشتە سنوری خۆی خوا حافیزی ئەکردو ئەگەرایەوە لە

هەموو کوردستان تەنها سۆسیالیست لەحاجی عمرانەوە بۆ هەوێرو سلێمانی و هەڵەبجەو تەوێڵە ئەو ماوەیە چوار سەیارەی سۆسیالیست دەعمی کردو دایکی پێشمەرگەیەکمان تیاچوو سەری دووقوتابیمان بریندار بوو لەسەیارەدا بوون لەکاتی سەرجادە، لە١/٦ لەسلێمانی بوین سەرقاڵی ئیشوکاربوین، لە١/٧ چوینە پرسەی برای کاك سالار عەزیز پرسەی ئەحمەد رۆستەم چەرمەگا ئەو وەفدە ئەوەی چاوەڕێی لێکراو ئەوەی لایەنەکان و جەماوەر بەتەمای بون هیچیان نەکردو هیچیان بۆکەس نەکرد تەنها ئەوەبوو وەکو شتێکی ئیعلامی بەدنیا بڵێن کەوا کورد هەر لەگەڵ ئێرانەو ئەو پێشوازیە گەرمە لەلایەن هەموو هێزە سیاسیەکانەوە لێکراوەو جڵەوی ناوچەکە هەر کات بمانەوێت بەدەستمانەوەیەو وەڵامێك بوو بۆئەمریکا لەوکاتەدا چەندجار وەفدیان هاتبووە ناوچەکە شتێکی سیاسی و ئیعلامی بوو بۆخۆیان لەنزیکیشەوە وەزعەکەیان زیاتر بینی شتێکی کەنەبوو، لە١/٨ لەسلێمانی بوم لەماڵەوە خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوم، لە١/٩ لەسلێمانیەوە چومە زەرایەن و بۆگوندی میرەدێ و ئەحمەد برنە بۆمەسەلەی سوڵح کاك محمدحاجی محمود هارونی و کاك مارف ئاغای گەلاڵیش لەوێ بون پاشان چومە هەڵەبجەی تازە بۆپرسەی کوری حمەی حاجی عەلی سەمین لەهەڵەبجەی تازە لەدوژمنایەتی کوژرابوو پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١/١٠ هەرلەسلێمانی بوم، لە١/١١چومە سەیدصادق و سەردانی لقی حزبمان کردو پاشان چومە ناڵپارێزو پێنجوێن وباشماخ و بۆمەریوان ودوای نیوەرۆیش لەگەڵ کاك بارام وکوری مامۆستا عبدالکریم عەنەبی ومامۆستا عوسمان هەورامی بۆ کاری فەرهەنگی بۆکرماشان دەرۆیشت بەرێمانکرد چوینە سنە بۆماڵەوە، لە١/١٢ لەسنە بوم لەماڵەوە بەرپرسانی ئێران سەردانیان کردم و قسە لەسەر وەزعەکان کرا، لە١/١٣ هەر لەسنە بوم ، لە١/١٤ رێکەوتنێکی بازرگانی لەنێوان و حزب و ئێران مۆرکرا و دەست بەکاربون لەهەموو جۆرە

کالآیەك، لە١/١٥ رۆژێکی ساردبوو بەفرو سەرمابوو لەگەڵ کاك بارام و کاك عەتاو کاك پشتیوان چوینە سەقزو بۆکان ومیاندواو مهابادو نەغەدەو پاشان گەراینەوە بۆ سنە شەوماڵەوەمان لەئەڵمانیاوە تەلەفۆنیان کردو هێشتا هەر ئیشەکەیان تەواو نەبوبوو، لە١/١٧ چومە مەریوان و خانویەکیان گرتبوو بۆبارەگای علاقاتی مەریوان لەکانی دینارەوە گواستیانەوە بۆ مەریوان شەو گەراینەوە کانی دینارو لەماڵی کاك بارام مەلا عبدالله بوین، لە١/١٨ چومەوە مەریوان و سەردانی بارەگام کردو کاری بازرگانیش دەستی پێکردبوو شەش سەیارە لەباشماغەوە گەیشتبووە سنوری پێنجوێن کاری بازرگانی ئێمە بۆ هەرزان کردنی شت بوو لەشارەکان بۆخەڵکی نەك بەتەمای ئەوە بوین کەحزب سودی لێ دەست بکەوێت ئێمەش دووسێ کەسمان بۆدیاری کرد بۆئەوکارە بکات، لە١/١٩ لەمەریوان بوم بەفری زۆر دەباری دونیا زۆرساردبوو گەراینەوە بۆ سنە، لە١/٢٠له سنە بوم سەردانی ئوستانداریم کردو قسە لەسەر وەزعەکان کران.. هەرئەمرۆ فەلەستینیەکان بۆیەکەم جار هەڵبژاردنیان کرد لەسنوری حکومی زاتی خۆیان بۆ پەرلەمان یامجلیسی وەتەنی یاتەشریعی کەبریار بوو (٨٤)کەس لەو مجلیسە بێت و دەبێتە خاوەنی بریاری سیاسی ئەو ولآتە، لە١/٢١ یەکی رەمەزان بوو بەرۆژووبوم تەلەفزیۆنی ئێران لەسنە لەسەرهاوکاری نێوان تەلەفزیۆنی سۆسیالیست و تەلەفزیۆنی ئێران قسەمان کردو هەردوو بەرێوەبەری تەلەفزیۆنی سۆسیالیست و تەلەفزیۆنی ئێران لەسنە قسەیان کردو گەیشتنە کۆمەڵێك بریاری باش.. وەبۆئێوارەکەشی کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ بەرپرسانی شار تاسەعات (١٢)ی شەو هەر بەردەوام بوین لەئوستانداری لای ئاغای رەحیمی لەروی ئابوری و راگەیاندن و بازرگانی و سیاسی قسەکراو لەزۆرشت گەیشتینە یەك و وەعدی زۆریان دا بۆیارمەتی کورد و حزب بەلآم پێ دەچێت هەرقسە بێت شتێکی لێ دەرنەچێت ئەوە بۆچونی ئەورۆژەم بوو بەلآم هەندێکیان

کرد دوای نیوەڕۆی ئەوڕۆژە چومە ناوشار هەندێك گەرام دووەمی جاریش پۆلیس داوای ئیجازەی سەیارەی لێ دەکردین سەیارەکە عێراقی بوو هی خۆمان ئیجازەش هەرعێراقی بوو کابرا وتی ئیجازەی عێراق ناخوات ووتم جیاوازیەك هەیە لەنێوان ئیجازەی عێراق و ئێرانی ووتی ئەی چۆن ئەو عێراقە سۆسیالیستەو ئەم ئێرانە ئیسلامیە ووتم ئەی جیاوازی لەنێوان جادەو فلکەکان هەیە لەئێران وەکو بەریتانیا لای راستەوە لێ دەخورن سوکانەو جادەکە بەپێچەوانەوە دەخولێنەوە ئەوجا تێگەیشت و وتی بەڵام ئەم ولاتە ولاتی قانونە دەبێت هەبێت کابرا وازی لێ هێناین، لە١/٢٤ هەرلەسنە بوم لەماڵەوە، لە١/٢٥ لەسنەوە چومە مەریوان زۆر ماندوبوین ئیشەکان وەکو پێویست جێ بەجێ نەکران وەکۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ فەرمانداری مەریوان لەسەر مەسەلەی سنورو رێگا نەگرتن لەخەڵکی هەژارو کردنەوەی سنور بۆکاری بازرگانی بەپێ ی رێکەوتن لەسەری رێکەوتبوین لەسنەو پێشتر لەتهران لەگەڵ بازرگانانی مەریوانیش هەرقسەمان کرد واتە سۆسیالیست بەرپرس نەبوو لەکوردستان چی رودەدات چونکە نەلەحکومەتی یەکێتی و پارتیدا نەبوو هەریەکەش سنوری دەسەلاتی حاکمیەتی خۆی دیاربوو بەلام سیاسەتی یەکێتی سیاسەتێکی تەنگ بین و نزیك بین بوو سەری لەسیاسەتی ناوچەیی دەرنەکردبوو هەموو هێلکەکانی لەزەمیلەی تورکیاوهەموو ئیعتمادی لەسەرتورکیابو بوو زۆرباوەری بە رۆژئاواهەبوو هەرچی هەبوو لەسەر ئەو بینای کردبوو دژایەتی هەموو لایەنەکانی و دژایەتی ئێران و دژایەتی عێراق و دور کەوتنەوە لەسوریا هەموی لەبەر رازی کردنی دڵی ئەمریکابوو ئێمە ئەزانین ئەمریکا زورگرنگە بەتایبەتی بۆکورد چونکە ئەمریکا خاوەنی بریاری سیاسیە لە جیهاندا تەنها ئەمریکاش لەداهاتودا ئەتوانێ عێراق وکورد رزگار بکات چونکەصدام و رژێمی بەعس نە بەهێزی بەرهەڵستکاری عێراقی لەدەرەوەی ولات ونە بەهێزی کوردی

لەکوردستانەوە ئەروخێت تەنها ئومێدێك ئەمریکا بگاتە قەناعەت بۆ روخاندنی صدام هەربۆیە ئەمریکاش یەکێتی روبەروی تورکیا کردبونەوەو هەمووشتەکان دەبێت تورك لێی رازی بێت و بریاری کۆتایی لێ بدات... گەمارۆی توند لەسەر ئەو ناوچانە بوو لەژێر دەسەلاتی یەکێتیدا بووعێراق گەمارۆی لەسەر دانابوو پارتی گەمارۆی لەسەر دانابوو ئێرانیش هەروا گەمارۆی لەسەردانابوو هەمووشی بۆسیاسەتی هەڵەی یەکێتی دەگەرایەوە ئێمەش لەگەڵ ئەوان ترش ببوبن پرسیاریان اەکەس نەدەکرد ئێمە چیمان پێ دەکرێت خۆیان بەئارەزووی خۆیان بریاریان دەدا ئەو هەنگاوانەی یەکێتی هەر خەتەر نەبون لەسەرخۆیان بەڵکو لەسەر ئێمەش خەتەرن چەندجار قسەمان دەکردو شتمان دەوت بەلام ئەوان قەناعەتی خۆیان هەبوو گوێیان بۆقسەی کەس نەدەگرت ئێمەش ناچار لەهەر لایەك شتێکمان پێ بکرایە بۆکەم کردنەوەی باری قورسی ئابوری و ژیانی خەڵکی دەمان کرد لەئاردو سوتەمەنی کەدووشتی سەرەکی بون لەو زستانەدا بەوەش مشکیلەمان هەبوو ئێمە ئەوشتانەی دەمان هێنا ئێرانیش داوای کالای دەکرد یەکێتی رێگای ئێمەی نەدەدا بۆناردنی کالایەك کەئەوان پێویستیان بوو ئەوە یەکێك بوو لەکێشەکان کەئێمە نەتوانین لەکاری بازرگانی دا هەنگاوی عەمەلی بنێین یاخاوی پیشاندان لەگەڵ ولاتانی ناوچەکە لەبەغدادەوە رۆژانە نەوت و هەمو جۆرە شتێك دەگەیشتە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی پارتی لەکفریەوە بۆدوز (٣٠) کیلۆمەترە منالێکی بچوك یاکەسێك دەبوو بڕواتە دەربەندیخان و سلێمانی و هەولێرو دهۆك و فائیدەوبۆموصڵ و بەغدادو پاشان بگەرێتەوە بۆ کەرکوك و دوز لەرێگای خۆیشیەوە لەدهۆکەوە بگەرێتەوە بۆ کفری هەموو رێگاکان بەسترابون بەلام رێگای سنوری پارتی کرابوەوە هەروەها سوتەمەنی لەدهۆکەوە گومرك دەکراو کابرا دەی هێنا بەشەراکەتی پارتی و بەزیاد دەیفرۆشتەوە لەسلێمانی یەکێتی ببونە بەخدری

شازو سوڵحیان لەگەڵ کەس نەدەکردو ئێمەش توش ببوین بەبۆنەی ئەوانەوە ئەو هەموو هەوڵەمان دەدا هیچ نەبێت فەردەی ئارد بە(٩٠٠)دینار تۆزێك بێتە خوارێ و کەم بێتەوە بۆئەوەی خەڵکی بتوانێ بژێ ئەوەش لەنێوان یەکێتی و ئێران دا بۆمان نەدەکرا، بۆیە من هەرچی سەیری ئەو ئەقلیەتەی یەکێتی ئەکەم وابروات کاڵەك بە ئەژنۆ ئەشکێنێت خۆشی وئیمەش ومیللەتەکەش توشی زەرەر ئەکات، لە١/٢٦ ئیشەکانمان بەهەر شێوە بوو کران و لەدەستی رزگارمان بوو، لە١/٢٧ هەرلەمەریوان بوین، لە١/٢٨ لەمەریوانەوە گەراینەوە بۆ باشماغ و پێنجوێن و ناڵپارێزو سەیدصادق و سلێمانی زۆرماندوبوین ئەو چەند رۆژە، لە١/٢٩ لەسلێمانی چومە هەولێر لەرێگا بارانێکی زۆربوو دنیاسارد بوو، لە١/٣٠ لەمەکتەبی سیاسی بوم لەهەولێر کاك دارای حاجی ئیبراهیم چەرمەگا سەردانی کردین ئێمە مەشغوڵی ئیشوکاری حزب و ئەو رێکەوتنامەی لەگەڵ پارتی کردبومان بۆهێنانی ئازووقەو سوتەمەنی و پێویستەکانی لە دهوك وە بۆ سلیمانی بەڵام هیچ هەنگاوێکی ئیجابی لای پارتیەوە نەنرابوو یەکجار نەبێت هەندێك ئازوقەو سوتەمەنیان هێنابوو وەکو ئەوەی خێرمان پێ بکەن وەرەقەیان کردبوو ئەوەش نامەم بۆکاك نێچیرڤان بارزانی نارد ئەو بۆی کردین ئەگەرنەو نەیکردایەت ئەوەشمان بۆنەدەکرا پاش شەش رۆژ دواکەوتن وسەیارە لەسەر حیسابی حزب و زۆر شتی کە نەیان کردو رێگایان نەداین ئەولاشمان وەستاو لەرێگای قاچاخ لەعێراقەوە یەکێتی رێگای نەدەداو دەبوو هەرچی بهێنیت تەسلیم بەئەوانی بکەیت سێ ساڵ بوو داوای یەك بەنزینخانەمان کردبوو موافەقەتیان بۆنەدەکردین لەو سلێمانیە گەورەیەدا کاتێك موافەقەتیان کرد دەیانوت هەرحەفتەی حصەی چەند هەزار لیتر بدەن بەقائیمقام یا حصەی پارێزگای تێدابێت سەرانە بدەین یا لە٥٠٪ بۆ یەکێتی وایان دەزانی ئێمە لە رەبایەدا گیراوین بە ئێستاشەوە موافەقەتی بەنزینخانەیەك لە هەولێرو سلێمانی

لەیەکەم رۆژەوە کەکاك کۆسرەت بوو بە سەرۆکی حکومەت داوامان لیَ کردوە کاك کۆسرەت لەسەر داواکەی حزبی سۆسیالیست موافەقەتی کردبوو بەنامەی مام جەلال هەربۆ بەنزینخانە بەلاّم خواو خۆشیان و خۆشمان ئەزانین لە حکومەتی کاك کۆسرەت لەحکومەتی کاك دکتۆر بەرهەم لە حکومەتی کاك عمر فەتاح وبە ئێستاشەوە بۆیان نەکردین لەبەر ئەوەی حصەی مەسئولینی یەکێتی وبەتایبەتی پارێزگاوشارەوانی سلێمانی تێدا نەبوو جارێك کاك دکتۆر بەرهەم سەرۆکی حکومەت بوو تکای لە شارەوانی ئەکرد پێم وت کاك بەرهەم ئەوە نایەنێت نامانەوێت حزبی سۆسیالیستی هاوپەیمان شەخصی من و پەیوەندی شەخسی و بیَ دەسەلاّتیش نەبوین ئەوە حالّمانە خوا رەحم بەو میللەتە هەژارە بکات سەدان بەنزینخانە دانرا چونکە خەلّکەکە بۆ کاسبی بو حصەی کاکی بەرپرسیش مسۆگەربوو ئەوانەش دەبە نەوت وبەنزین لە سەرجادە دەفرۆشن حصەی برادەرانی ئەبێت تیادابێت ...ئێمە وازمان لیَ هێنا مایەوە ئێران ئەویش یەکێتی ووتیان ئەوەی سوتەمەنیەکە دەبێت لەپارێزگاوە دابەش بکرێت هەر بەهەمان نرخ کەدانراوەو گۆرانی تێدا نەکرێت وازمان لەویش هێنا و خۆمان دایە دەستی قەدەر، لە١/٣١ لەهەولێر بوم لەمەکتەبی سیاسی کۆبونەوەمان هەبوو لە زەحمەتکێشان کاك قادرعەزیزو برادەران هاتن و ئێمەش لەویَ بوین هەموو بێزار بوین لەو وەزعەی کەهەیە قسەی زۆرکرا لەسەر یەکێتی و پارتی و خۆمان و هەموو لایەك و لەسەر کوردستان و عێراق و ناوچەکە واتە ئەو ولاّتانەی دەوروبەرمان و ئەوروپاو ئەمریکاش رەئی زۆری دانیشتوان وابوو نێوان یەکێتی و پارتی کەیەکێتی هەلّەی هەیەوکاری خراپی هەیە بەلاّم پارتی حزبێکی کوردەواری و خۆبەزلزان و هەرکات دەستی بروات رێگای هیچ لایەنێکی سیاسی یاکەسێکی سیاسی نادات لەکوردستان ئەوەی تەسلیمی نەبێت زۆری دانیشتوان لەهەردوو حزبی سۆسیالیست و زەحمەتکێشان ئەوە رەئیان بوو

لەسەرپارتی بەلاّم رەئی من جیابوو چونکە پارتی لەسەرقسەی خۆی پێی دائەگرت وبەرگری لەدۆستەکانی خۆشی ئەکرد، لە١/٢/١٩٩٦ سەردانی مام جەلالم کرد لەبارەگای خۆی لەهەولێرو لەسەرداوای مام جەلال وەلاّمی ئیجابی ئێرانم بەنامە گەیاند بە مام جەلال و ئەویش وەلاّمی دانەوە بەئیجابی و بە نامە من و هەڤالاّن گەراینەوە مەکتەبی سیاسی خۆمان لەهەولێر، لە٢/٢ هەر لەهەولێر بوم خەریکی ئیشوکاری حزب بوین، لە٢/٣ لەهەولێر بوم رەمەزان بوو بۆ بەربانگ کردن دەعوەتی مام جەلال بوین لەماڵی خۆی لەشاری هەولێر، لە٢/٤ لەهەولێربوم، لە٢/٥ لەهەولێرەوە گەرامەوە بۆسلێمانی ، لە ٢/٦ لەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاری حزب بوین کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ لقی سلێمانی دا... بەبۆنەی رۆژی سەرکەوتنی کۆماری ئیسلامی ئێران لە(٢٢) بەهمەن هەموو لایەنەکان دەعوەت کرابون بۆ تەهران پارتی و شیوعی و زەحمەتکێشان وسۆسیالیست و پارێزگاران و یەکێتی و کۆمەڵێك عەشائیرو پارێزگارەکان، لە١/٧ بەیانی زوو بەرێ کەوتین وەفدێکی حزبی سۆسیالیست و یەکێتی لەدەربەندیخانەوە بۆمەیدان و بۆپەروێزخان واتە پارێزگارەکان سەر سنوری عێراق ئێران لەپەروێزخان و لەوێ بەرەسمی پێشوازی کراین و پاشان بەرێ کەوتین بەپاس سواری پاس بوین لە ناو پاسەکان کاك سەعدی ئەحمەد پیرە بو بە کاك حیدەر فەیلی وت وەرە سەرکورسیە بچوکەکان کاك حیدەر وتی کاك سەعدی نارۆمە سەرکورسیە بچوکەکە ئەوپاسە هی ئێرانە خۆکۆبونەوەی یەکێتی وپارتی نیە بلێن حزبە بچوکەکان حصەیان کەمە نارۆم وەفدەکە حزبی وعشائیرو مەلاو شێخ وهەموی تێدابوو دەتوت کەشتیەکەی نوحە بۆ قصر شیرین و بۆ کرماشان و لەوێشەوە بەفرۆکە بۆتەهران ولەهوتێل ئازادی دابەزین بۆ ئیسراحەت دکتۆر ئەحمەد چەلەبیش لەوێبوو لەو لاشەوە لەحاجی عمرانەوە وەفدی پارتی و بزوتنەوەی ئیسلامی و حزب الله و زۆری کەش

هاتبون و هەموو لەوێ بون لەهوتێل ئینقلاب لەتەهران، لە ٢/٩ سەردانی مەرقەدی ئیمام خومەینیمان کردو گوڵمان لەسەر دانراو پاشان سەردانی گۆرستانی هەڵەبجەمان کرد لەتەهران بۆ نوێژی هەینیش چوینە جامیعەی تەهران و لەوێ نوێژمان کرد ئاغای خامەنەئی پێش نوێژی کردو ناوی کوردو ئەو وەفدەی لەوێ بوین هێناو پشتیوانی خۆیانی پیشان داو لەوکاتەدا ئەوەی سەرنجی منی راکێشا کاك قادرعەزیز بوو خۆی کرد بەنەخۆش بردیانە ژورێك هەرلەلای جامیعە زۆری کەش لەوانە هەر نوێژیان نەکردبوو توش ببون لەوانە کاك عبدالرزاق ساڤ ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی عێراق لەوێ نوێژی کرد لەخۆشی دا هەروەها کاك یەعقوب وکاك یۆنادەمی بزوتنەوەی ئاشوریش لەریزی نوێژکەران بون شتێکی سەیر بوو من زۆر تێبینم دەکرد کە کەس وەکو کاك قادرعەزیز خۆی نەکرد بە نەخۆش و هەر لەدەرگای جامیعەکەوە بەخشکەیی خۆیان دزی یەوە بۆئێوارەش کاك قادر هەرخۆی کردبوو بەنەخۆش ئاغای خامەنەئی قسەی زۆر باشی لەسەر کوردو گەلانی عێراق کرد بۆ ئێوارەکەی سەردانی خانەی فەرهەنگی مان کردو بۆنانی ئێوارەش کە (١٩)ی رەمەزان بوو لای ئاغای تەخسیری مەدەنی دەعوەت بوین ئاغای تەخسیری مەدەنی بەخێرهاتنی ئامادەبوانی کردو دوای ئەویش کاك مەلا غەنی لەبزوتنەوەی ئیسلامی قسەی کردو قسەکانی فری بەسەر ئەو دانیشتنەو وەلامی ئاغای تەخسیری مەدەنیەوە نەبوو لەوە خراپ تریش هەربەناوی بزوتنەوەوە قسەی کرد ئەو ترسا نەوەك یەکێکی یەکێتی زوو قسەبکات هەریەکە لەئاستی خۆی قسەیەکی کرد کاك دکتۆرفوئاد معصوم قسەی کردو نوێنەری پارتی قسەی کردو کاك عبدالرزاق صافی بەورودی خۆی دەناساند ئاغای تەخسیر مەدەنی پیاوێکی تەمەن (٧٥) ساڵەی ریش سپی بوو وادیاربوو لەکەربەلاو نەجەف، بووکاتی خۆی کاك عبدالرزاق پێ ی ووت من لەبنەماڵەیەکی ئاینی نەجەفم..هەر وتی نەجەف کابرا

قسەی لەگەڵ دەکردو زۆر بەوردی گوێ ی بۆ گرتبوو وتم کاك عبدالرزاق ئێستا پێ ی دەڵێم ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی عێراقە پاشان شەو گەراینەوە بۆهوتێل ئینقلاب لەخیابانی تەڵەقانی، لە١٠/٢ چووینە مجلیسی شورای ئیسلامی لەوێش لای ئاغای دکتور عەلی لاریجانی پێشتر جێگری وەزیری دەرەوەی کۆماری ئیسلامی بوو لەئەوروپا ئەویش قسەی بۆکردین و وتیان کات کەمەو یەك کەس لەجیاتی هەموی قسە بکات لە جیاتی وەفدی کوردستان سەید محمد باقرحکیم قسەی کردو کاك دکتور فوئاد معصوم داوای لەمن کرد قسە بکەم منیش وتم جەنابت لەجیاتی هەموومان قسە بکە دکتۆر فوئاد هەڵسایەوەو قسەی کرد ئەو داوا گشتیانەی کە کورد هەبوو باسی کردو نامەیەکی حزبی سۆسیالیست درایەو داوای بەردانی ئەو سەبازە عێراقیانەی لەشەری عێراق ئێران گیراون بەریان بدەن و هاوکاری بۆ کوردی عێراق و دوایی نوێنەری پارتی وەفدی جیابون بە قسەی دکتور فوئاد معصوم رازی نەبون و نوێنەری پارتی هەندێك قسەی کردوو دوای ئەوەش بەرەو رێگای کەرەج چوین بۆلای کارگەی دروست کردنی سەیارە لەو بەرەوە چۆن ئاسنکە دەکرێت بەمەکینەداو تادەگاتە ئەوجێگایەی کە بۆیاخی دەکەن کەس تاقەتی نەبوو سەیری بکات کاك ئازادقەرەداغی ووتی ئەمە چیە ئێمەیان بۆهێناوە کاك سلێمان قەساب وتی بەکابرای رێگا پیشان دەرمان ووتی بۆ جێگای ئەم سەیارەو کاری خزمەت گوزاری وئەوانەمان مەبەن ووتی بۆکوێ وتی لەکوێ ئار.بی.جی و تۆپ و قومبەلەو چەك دروست دەکرێت شتی وێرانکار بۆئێمە باشە بۆئەوێمان بەرن لەوێش زۆر گەراین کارگەکە گەورە بوو هەموی خۆیان دروستیان دەکرد جگە لەمەکینەکەی کۆری بوو وەفدەکە زۆرو بۆربوو ناخۆش بوو یەکێ لەکێشەکانمان ئەوەبوو هەمومان لەیەك هوتێل بوین سەرەتا پارتی کەهاتن یەکێتی یان بینی وتیان لێرە نابین وادیاربووبەرپرسان زۆرقسەیان کرد تاگەیشتنە

ئەوەی قەناعەتیان کرد لەوێ بن ئێمە لەگەڵ یەکێتی هاتبوین پێکەوە لەیەك ڕێگاوە پارتی خێسەیان لێ دەکردین تاچوینە لایان و بەخێرهاتنمان کردن دەبوو لای هەردوولا دانیشین پارتی لەسەر مێزێك و یەکێتی لەسەر مێزێك بون یەکێتی هەوڵیان دەدا کاك عمر فەتاح مەرحەبای دەکردن و قسەی لەگەڵ دەکردن بەڵام ئەوان نەسەلام و نەکەلام دادەنیشتن وهیچیان نەدەوت لەسەر مێزی نان خواردن من زۆر تێبینی هەردوولام دەکرد برادەرانی پارتی خۆیان دەپاراست بەڵام یەکێتی ئاسایی بون یەکێك لەسەیارەکان بگۆرایە لەولا سوار نەدەبوو ئەو چەند ڕۆژە گیرمان خواردبوو ئەو کەسانەش عەشائیرو مەلاو ئەندام پەرلەمان و پارێزگار هەمووی هاتبون ئەوانیش پێکەوە قسەیان نەدەکرد سەرۆك عەشیرەنی یەکێتی وپارتی ومەلای هەردوولاو شێخ لە هەردوولا ئەوانیش پێکەوە قسەیان نەدەکرد هەردوو حزب اللەیش کاك شێخ محمد خالید بارزانی وکاك شێخ ئەدهەم بارزانیش پێکەوە قسەیان نەدەکرد من و ماموستا مەلاعەلی عبدولعزیز داوامان لە کاك شێخ محمدخالید وکاك شێخ ئەدهەم بارزانی کرد هەردوولاش قبولیان کرد ئاشت بونەوە پێکەوە کۆبوینەوە ئێمەش لەنێوانیان بوین بزوتنەوەش هەر لەگەڵ یەکێتی قسەیان نەدەکرد، لە٢/١١ کە ڕێکەوتی (٢٢) بەهمەن بوو ساڵرۆژی سەرکەوتنی کۆماری ئیسلامی دەکات لەمەیدانی ئازادی شار جەماوەرێکی زۆر کۆبووەوەو ئاغای رەفسنجانی سەرۆك کۆمار قسەی کرد لەتەنیشت جێگای قسە کردنی ئەوەوە سەفیرانی وڵاتان دەعوەت کرابون و جێگایان بۆئێمەش دانابوو لەوێ قسەی لەسەر کۆماری ئیسلامی و وەزعی ناوچەکەو دنیا کردو باسی گەلانی عێراقی کردو ئێمەش کامیرامان پێ بوو هەرچەندە قەدەغەبوو بەڵام رەسمان گرت لەوێ هەلیکوپتەریش پاسەوانی دەکرد زیاتر لە(٣) سەعاتمان پێ چوو مقابەلەی تەلەفزیونی زۆر لەوانەی لەوێ بون کران شەویش لەتەفزیۆنی ئێران پیشانی داو

کورد لەکوێیەوە بون هەروەها ئیسلامی ئەمریکاش هاتبون ئەویش قسەی کرد لەوێ پاشان گەراینەوەو سەردانی پێشانگای فرۆکەمان کرد کە چەندین جۆری فرۆکەی کۆن و تازەو خۆشیان بۆیاخ وچاکی دەکەنەوە و زۆر جێگایان پیشان داین سا روخی شهابی ٢یان پیشاندابن و ئێوارەش دەعوەتی سوپای پاسداران بوین لەقصری پیرۆزە لەمەقەری قەرارگای رەمەزان پێشوازی کراین لەلایەن جێگری قەرارگای رەمەزانەوە سەرتیپ ئەحمەدی فروزندە برای وەزیری دیفاعی ئێرانیش بوومحمدی فروزندە ئەویش لەوێ قسەی کردو نانی ئێوارەمان لای ئەوان خواردو لەسەر وەزعی کوردستان و عێراق قسەکراو سەید محمد باقرالحکیم قسەی کردلەباتی هەمو حزبە عربیەکان منیش لە باتی حزبە کوردستانیە کان قسەم کردو پاشان گەراینەوە جێگای ئیسراحەتی خۆمان شەو قسەم لەگەڵ برادەران کرد لەسوئید لەسەر وەزعەکانی کوردستان و ئەوانیش لەدەرەوە چی بکەن، لە٢/١٢ سەردانی ماڵی شاو مۆزەخانەی سەربازی و گەنجینەی ئێرانمان کردن شتی زۆر عەجایب و گرنگی لێبوو زۆرگەراین و ئێوارەش لەهوتێل مەرمەرە دەعوەتی وەزارەتی ئیتلاعات بوین معاونی وەزیر ئاغای پورمحمدی لامان بوودوای نان خواردن قسەکراو سەیدمحمد باقرالحکیم وئاغای شێخ عاسیفی حزبی دەعوە قسەی کردو داوایش لەمن کرا قسە بکەم منیش بۆ ئیحترام داوام لەدکتۆر فوئاد کرد قسە بکات ئەو قسەی کرد پاشان ئاغای پورمحمدی قسەی زۆری کردو وەعدی زۆریشی دا بۆکوردستان و بۆعێراق هاوکاری بکەن و یارمەتی بدەن بەلأم دوای ئەوە شتێکی وانەکرا هەستی پێ بکەین بەلأم کۆماری ئیسلامی لەهەموو بوارەکاندا زۆریارمەتی وهاوکاری کوردی کردووە، لە٢/١٣ وەفدەکە کەنزیکەی (١٠٠) کەس دەبوو گەرانەوە بۆ کرماشان بەفرۆکەو ئەوانی کەش بۆ ئورمیە بەفرۆکە گەرانەوە من بەتەمای سەفەری دەرەوە بوم چومە ئوتێل لالە لەتەهران لەگەڵ کاك سلێمان

قەساب دا وتی من لەگەڵتا دێمە سوریا من شارەزام نەوەك شتێ روبدا من هاوکاریت دەکەم و من لەوێ دەبم بروسکەیەك هات لەمەکتەبی سیاسیەوە کەسەعات (١)ی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ٢/١٣ تەقە لە کاك سەلام ڕەوف( سەلامە سور) کراوە لەسلێمانی لای مزگەوتی عبداللە لوتفی و شەهید بووەو برایەکی و یەکێك لەحیمایەکانی بریندار بووە بەراستی بۆئێمە کارەسات بوو زۆرناخۆشبوو هێشتا شوێنی خاڵەحاجی سارێژ نەبووە کاك سەلامیش بڕواتە سەری هەرساڵێك یەکێکمان لەسەرکردایەتی شەهید بکەن بەناحەق بەلام لەگەڵ هەواڵەکەدا هیچ گومانم لەوە نەبوو کەیەکێتی شەهیدی کردووە هەرلەوێش بەکاك شێخ عبدالکریم شەدەڵەم وت کەئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوو بەرپرسی عیلانات بوو ئەویش کاك سەلامی دەناسی کاك شێخ عبدالکریم وتی ئەگەر یەکێتی شتی وای کردبێت خراپە بەلام ووتی باتەحقیق بکەین باشترە جارێك بریار مەدەن کێیەوکام لایەنە بەلام من خۆم لام رون بوو بەبریاری کاك جەبار جێ بەجێ کردنی کاك شێخ جعفر کراوەو کێ کردویەتی ئەوە لەبریندارەکان و لەخەڵکی ئەو گەڕەکە وفیتەرێکیش کوژرابوو لەبرای فیتەرەکەو ئەوانەی لەوناوە بوون زانیاریمان کۆدەکردەوە و لەسەرچاوەی تایبەتی خۆشمانەوە هەوڵمان بۆدا بۆزیاتر رون بونەوەی کارەکەو تاوانباران کێن... حزبی سۆسیالیست لەپێشکەش کردنی شەهید قاڵبووە بەلام لەدوای ئەو هەموو گێروگرفتە هاتە رێگای و جارێکی کە توانی خۆی رێك بخاتەوەو ئاسان نەبوو هەروا دەستی لێ بوەشێنرێت و خەڵکی بەناحەق شەهید بکەن بۆئەوەی جەماوەری ئەو حزبە بترسێنن یاکەم بکەنەوە یاحزب نەتوانێ بەرگری لەئەندامەکانی خۆی بکات هەرهەمان رۆژیش هەندێك خەڵکی سەربەرەوتی کۆمۆنیست چون لای تەلەفزیۆنی سۆسیالیست موزاهەرەیان کردبوو ویستبویان برۆنە ناو تەلەفزیۆنەوە پێشمەرگەکانیش تەقەیان لێ کردبون و چەند کەسێکیان

لیٚ بریندار کرابوو ئەوانیش هاندرابون بۆ شێواندنی مەسەلەکە لەئێمە من ئاگاداری کۆمیتەی سەرکرداتی ومەکتەبی سیاسیم کردو پێم وتن دوای ئەوەی تەحقیقتان کرد کەئەگەر هەمووشتان کوژراون دەبێت ئەوکەسەی ئەو کارەی کردووەکاک سەلامی بەناحەق شەهید کردووە بیکوژنەوە لەتۆڵەی ئەو شەهیدەدا بیٚ گویٚ دان واتا هەرچی دەبێت یانابێت چونکە کاک سەلام هەر لەتەمەنیی کەمەوە یاهەر لەگەنجێتیەوە لەگەڵ بزوتنەوە بووە بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان و پاشان بووە بەپێشمەرگە لەحزب و لەساڵەکانی ١٩٨١ بەبرینداری لەشەرێك لای قەرەچەتان دەگیرێت و(٢٠) ساڵ حکومی بەسەردا دەدرێت و لەساڵی ١٩٨٩ بەرلێبوردنی گشتی دەکەوێت و بەردەبێت لەسجن دوای دەرچونی لەسجن یەکسەر پەیوەندی دەکاتەوە و دەست بەکاردەکات.. ئەندامی ناوچەی دوکان و پاشان ئەندامی بەرەی کوردستانی لەدوکان و بەرپرسی ناوچەی دوکان و لەکۆنفرانیس بۆبەئەندامی لقی سلێمانی و لەکۆنگرەش لە١٥تا١٩/١١/١٩٩٤ بوو بەئەندامی کۆمیتەی ناوەندی وماوەیەك لێپرسراوی لقی کەرکوك و ماوەیەك لقی راپەرین و پاشان جێگری مەکتەبی رێکخستنی ناوەندی حزب لەزۆر کۆرو سیمنارو کۆبونەوەی جەماوەری و مێزگەردی تەلەفزیۆنی وەکو کادرێکی لێهاتوو بەتواناای حزب دیارو رۆڵی گرنگی خۆی هەبووە وەکادرێکی ناسراوی حزب و جێگای باوەری جەماوەری حزب و لەناوچەی جافەتی وخەڵکی گوندی موغاغ سەربەدوکان بوو... شەهید بونی کاك سەلام کەلینێکی گەورە بوو لەرێکخستنەکانی حزب و هەروەها حزب کادرێکی بەتواناو لێهاتوی خۆی لەدەست داو حەقی بوو تەحقیقی تەواویش بکات بۆئەوەی تاوانباران بدۆزینەوە دوای ئەوەی چەند لیژنەیەك لەگەڵ یەکێتی و ئاسایش دروست کران هەر ئەمرۆ سبەینیٚ یان دەکرد بۆمان رون بوەوە کەدلێر صالح میرزایەو هەمان قاتیل شکمان هەبوو لەشەهید کردنی کاك جەمال حەلاو خاڵە

حاجی دا.. دلێرو دووکەسی کە بوون یەکێتی خۆیان دوایان دەخست بۆ لەبیر بردنەوەو کۆن بونی مەسەلەکە مەفرەزەی تایبەتی حزب دەستگیریان کرد لەبازاردا بردیانە بارەگای حزب لەسورێن دوای ئەوەی ئیعترافی لەسەر شەهید جەمال حەلاو و شەهید سەلام رەوف کرد هەروەها وەرەقەی یەکێتی وئیتلاعاتی ئێرانیشی پێبوو بۆهاتو چۆو هاوکاری بکرێت وادیاربوو خەڵکی بۆ ئێرانیش کوشتبوو زۆریش بێ منەتانە قسەی کردبوو گوایە ئەو بۆخۆی نەیکردووە بۆیەکێتی کردووە تەنها جەمالی حەلاو بۆخۆی کردووە چونکە لەسەر خزمی خۆی بووە ئەو تۆڵەو تۆڵە سەندنەوەیە لەدوای راپەرین لەشار دەستی پێکرد ودەیانویست خەڵکی پێ بترسێنن بەڵام دۆستی یەکێتی بوین و لەیەك سەنگەربوین پێکەوە بڕیاری وا لەسەر قیادەمان بدرێت بۆیە لەتۆڵەی شەهید سەلام و شەهید جەمالی حەلاو شەهیدانی کەدا بەسزای گەل و شۆرشیان گەیان و رەوانەی قولایی جەهەنمیان کرد و جەنازەکەشیان بۆکەسوکاری ناردەوە یەکێتیش هەندێك هەرەشەو چاو سورکردنەوەیان لەبرادەرانی ئێمەیان کردبوو کاك عەتا سەروی چوبو بۆلای برادەرانی پارتی لە هەڵەبجە بێ ئاگاداری لێپرسراوانی حزبمان پارتیش ئامادەی خۆیان پیشان دابوو بۆشەریش پشتیوانی بکەن و (١٠)هەزار فیشەکیان بەکاك عەتادا ناردبوو بۆبرادەرانی ئێمەو سەردانیان کردبوو بروسکەیان بۆهاتبوو بەهەموشێوەیەك پشتیوانیان لێ بکەن مامۆستا مەلا عەلیش ئەو وەکو دۆستێك ئامادەیی خۆیانی پیشان دابوو بۆهەموو هاوکاریەك وتاشەرو بەرگری کردن و هاوکاری سۆسیالیست بکەن چونکە ئەوان لە شەردابون حەزیان دەکردئیمەش برۆینە ناو شەرەکەوە من ئەوەم بیست بەتایبەتی وەرگرتنی فیشەك لەپارتی و خوێندنەوەی ئەو وەزعە لەلایەن پارتیەوە ئاگاداری برادەرانی خۆمانم کرد ماوەیەك سەرکردایەتی خۆدور بگرن لەشار بەڵام نەچنە سەنگەری پارتی و شەری

یەکێتی بکەن لەولاشەوە بروسکەم بۆمام جەلال کردو مام جەلال مەسەلەکەی ڕاگرت بەلاّم کاك کۆسرەت یش هەولّی هێمنی وئارامی دابو کە کێشە بۆ سۆسیالیست دروست نەکەن دەیانویست مافی مرۆڤ لەسەر ئێمە تاقی بکەنەوە بەهەر حالّ غەدرێکیان لیّ کردین لەحسێنی شەهیدیش هەروا کراوە خالّەحاجی و کاك سەلام و کاك جەمالی حەلاوکاك عبدالملیك..خالّەحاجی تائێستا رون نیە کیّ کوشتویەتی بەلاّم سەرە داومان دەستکەوتوە بەلاّم ئەو سیانەی یان مەعلومە و هەرسێکیان دلێری صالّح میرزا سەرقافلّەی تێروریستەکان و ئەو دەستە تیرۆریستە بووە هەتا چەند خەلّکی ناو یەکێتی خۆیانی بەو شێوەکوشتوە و لەناوی بردووە بەلاّم نەدەبوو یەکێتی ئەوکارە لەگەلّ ئێمەدا بکەن بەو شێوەیە کە حزبی حاکم بن ئێمە تائەوکاتە شەریان لەگەلّ عێراق کردبوو ئێمەش لەگەلّیان بەشداربوین لەهەموو حالّەتەکاندا زەرەرێکی گەورەیان لەسۆسیالیستدا و زەرەریان لەخۆشیان دا کەجەماوەری سۆسیالیست رەئی گۆری لەسەر یەکێتی ئەگەر یەکێتی دۆستمانە بۆهەر سالّێك یەکێکمان لیّ دەکوژیّ بەناحەق واتە یەکێتی ناتوانیّ تاسەر لەسەر سیاسەتێك دۆستانە یاپێچەوانەی رابوەستیّ هەموو شتەکانیان عەشوایەو بیّ بەرنامەو مەزاجی و رۆژێك باشین و رۆژێك ناتانناسین ئیمە ئەمانزانی هەرچیمان لە سلێمانی شەهید دەبێت هەر یەکێتیە ئەوانیش نەبن هەر یەکێتی لیّی بەرپرسە چونکە ئاسایشی شار لەدەستی ئەوانەو ئەوان بالاّ دەستن لە سلێمانی... ئەوان وابیر ئەکەنەوە لە شاخن وشەری یەکێتی وسۆسیالیستە بەئەقلّی شاخەوە بیر ئەکەنەوە بەلاّم کاك کۆسرەت هەلّوێستی زۆر باشبوو لەو کێشەیەدا هەمو کەسێك کۆمەلّێك حزبێك دەولّەتێك تەنانەت عەشیرەتێك بەرنامەی هەیە لەگەلّ دۆستەکان لەگەلّ ناحەزەکانی لەگەلّ دوژمنەکانی ریز بەندێك دروست ئەکات قۆناغەکان دیاری ئەکات بەلاّم خوائەزانیّ یەکێتی هیچیان ناکات وادیارە ئەوان میللەتەکە باش

ئەناسن من خۆم بەدۆستی یەکێتی ئەزانم پێم خۆش نیە یەکێتی خۆی تۆشی ئەو کارانە بکات چونکە لەکۆتاییە خۆیان زەرەر ئەکەن ئەگەرلەگەڵ دۆستەکانی خۆیان راست نەبن دۆست و دوژمنی خۆیان جیا نەکەنەوە.
لە١٩٩٦/٢/١٤لەتەهران بوم لەهوتێل لالە خەریکی ئیشوکاردکان بوین لەبەرگرانی هوتێل لالە نەمانتوانی لەوێ بین چوینە هوتێل قناری لەخیابانی فریمەت بەرۆژوبوم ئێوارە لەهوتێل بوم کاك ئەحمەد شەریف لەوێ بوو قسەمان کرد بەڵام کاك سلێمان فرسەتی ئێمەی نەدا قسەبکەین، لە٢/١٥ هەرلەتەفران بوم، لە٢/١٦ رۆژی قودس بوو لەتەهران خۆپیشاندان بوو ئێمەش هەندێك لەبازار گەراین و هەندێك شتمان کری بەرۆژووبوم ئەمرۆ لەکوردستان پرسەی کاك سەلام و سەرقەبران بوو برادەرانیشمان لەئینزاردا بون ئاگادارم کردن خۆیان دووربگرن تاوەزعەکە ئارام دەبێتەوە لەو ماوەیەش چەند جارێك هەوڵی کوشتنی چەندکاردێکی حزبیان دابوو هەرلەوکاتەدا، لە٢/١٧ لەتەهران بوم بەتەنها زۆر گەرام بەرۆژو بوم ئێوارەش دەعوەتی مامۆستا نازم بوم لەئوتێل، لە٢/١٨ هەرلەتەهران بوم کاك ئارام کوری کاك رەسول لەلەندەن گەرابوەوە لەوێ بو چاوم پێکەوت پێم خۆشبوو کورێکی باش و ئاقڵ و بەفام بوو..هەرئەمرۆ کاك جواد عەتار کەلەساڵانی ١٩٨١و١٩٨٢و١٩٨٣ لەکوردستان بوو ئەندامی مەکتەبی سیاسی رێکخراوی (العمل الاسلامی) بوو سەردانی کردین و لەلای شێخ محمد مودەریسەوە هاتبووە لامان، لە٢/١٩ هەرلەتەهران بوین، لە٢/٢٠ هەرلەتەهران بوین و لەوەزارەتی ناوخۆوە داوایان کرد سەردانیان بکەین کەرۆیشتم چاوم کەوت بە بەرپرسی کاروباری دەرەوە لەوەزارەتی ناوخۆ داوای لێکردم کەهاوکاریان بکەین بۆیادی هەڵەبجە کەبەنیازبون لەکوردستان و لەئەوروپاش یادی بکەنەوە... هەرئەمرۆش رۆژی جەژنی رەمەزانی پیرۆزبوو منیش لەتەهران بوم، لە٢/٢١ هەرلەوەزارەتی ناوخۆ

کۆبونـــەوەمان هـــەبوو لەســـەر بەرنامـــەی هاوبەشـــی کۆمـــاری ئیـــسلامی و حزبـــی سۆسیالیست لەسـەر یـادی سـالْرۆژی هەڵەبجـە، لـە٢/٢٢ سـەرلەبەیانی کـاك جـواد جعفری سەردانی کردین لەئوتێل لەتەهران بزورگ بۆخواحافیزی وپاشان برادەرانی ئیدارەش لەگەڵمان هاتن بۆ فرۆکەخانە ئاغای مـستەوفیان زۆرمانـدوبوو لەگەڵمانـدا لەسەعات (٢)ی پاش نیوەرۆ فرۆکە هەڵساو بەدووسەعات ونیو گەیشتینە دیمەشـق لەفرۆکەخانە کاك سلێمان کەلەبـەرمن هـاتبوو لـەوێ گلدرایـەوە دەبـوو مـن هـەوڵی بۆبدەم بۆبەردانی هێشتا هیچیان نەوتبوو بەکاك سلێمان وتـی بـەخوا ئـەوە شـەقی دکتۆر محمودە ووتم بۆ ووتی سـاڵی ١٩٧٩و ١٩٨١ بـوو هەوێیـەکم دروسـت کردبـوو بۆژن خوشکی کـاك جـەلال حـاجی حـسێن لـە سـەر داوای کـاك دکتۆرمحمـود بـۆیم کردوە لەوکاتەوە گیرۆدەی ئەو وەزعە بوم وتائێـستاش هـەروا بەردەوامـە لەسـەرم وتی ژنەکە بۆخۆی کێشەی نیە ومنـیش لێـرە تـوش بـوم.. ووتم بەرقیـەت نیـە زۆر هەولْم دا بۆئەوەی بەرقیەی هەبێت وتی مـن پاسـەپۆرتی ئـەوروپیم پێیـە بەرقیـەی ناوێت وتۆئاگات لەخۆت بێت لەوێ ئـەویان گلدایـەوەو لەشـام بروسـکەمان بـۆ جـێ بەجێ کردو دوای دوو رۆژ و پاشان وتیان وەلا حجزی لەسەرەو دەبێت بگیرێت کاك سـلێمان رازی بـوو بـەوەی کەبرواتـەوە و نەیەتـە شـام مـن پێـشتر پـێم وت بـروات باشترە دوای پـێ ی رازی بوو بەلام ئەمنی سوریا پێی رازی نەبوو هێنایان بۆ شـارو گرتیان زۆر لەگەڵی ماندو بـوین لەسـوریا...دوای هـەولێکی زۆر لەمەکتـەبی عمـل و کـاك دانـاو کـاك عبـدوالرزاق کـۆیی و کـاك حیکمـەت عـەزاوی ومـام جـەلالیش هـەر بروسکەی کردبووخۆشمان هەرلەهەولْدا بوین تانـەجاتی بـدەین ترسـاندبویان بـەلام هەر لەقسەی خۆی نەکـەوتبوو ئـەو چـەند رۆژە ئێمـە ئیـسراحەتمان نـەکردبوو مـن رۆیشتمەوە مەکتەب و کاك سمیر برای کاك بەهمەن حسێن هات بۆلام و پاشان کاك دانای برازای کاك مەلائەحمەد بانی خێلانی و کاك خەلیل ژن برای کاك دارای حاجی

ئیبراهیمی چەرمەگا سەری فرۆکەخانەمان دا هەمان شەو زۆر لەگەڵیان ماندوبوین کاك عبدالرزاق کۆیی لەهەمووان زیاتر ماندوبوو لەگەڵ کاك سلێمان قەساب و ئێمەدا، لە٢/٢٣ لەگەڵ کاك شمس الدین مفتی وکاك دانائەحمەد مەجید پێکەوە بوین و پاشان لەگەڵ کاك عبدالرزاق چوین بۆفرۆکەخانە، لە٢/٢٤ لەدیمەشق بوین هەرخەریکی هەوڵدان بوین و میوانمان زۆربوو، لە٢/٢٥ هەرلەدیمەشق خەریکی هەوڵدان بوین بۆ بەردانی کاك سلێمان وادیاربوو فریای نەکەوین حوکم بدرێت، لە٢/٢٦ لەدیمەشق خانویەکمان گرت چونکە خانوەکەمان ماوەی تەواوببوو تازەی بکەینەوە، لە٢/٢٧ لەگەڵ کاك شۆرشی شەهید دکتۆرخالید سەردانی سەفارەتی ئەڵمانیامان کرد، لە٢/٢٨هەر لەدیمەشق بوین میوانمان هەبوو، لە٢/٢٩ لەدیمەشق بوین سەرقاڵی ئیشوکاری بوین پاشان چوینە سەفارەتی فەرەنساو قسەمان زۆر لەسەر روداوەکان و پەیوەندی حزب و فەرەنسا کرد، لە١٩٩٦/٣/١ هەرلەدیمەشق بوین، لەرۆژانی ٢و٣/٣ هەر لەدیمەشق بوین، لە٣/٤ هەرلەدیمەشق بوین کاك بەهرۆز گەلاڵی سەردانی کردین پاشان ئێمەش سەردانی بارەگای پارتیمان کرد لەدیمەشق، لە٣/٥ هەرلەدیمەشق بوین، لە٣/٦ لەدیمەشق فیزەی ئەڵمانیام وەرگرت لەسەفارەتی فەرەنساو هەر ئەمرۆش کاك سلێمان بەربوو هاتەوە بۆ رۆژی دوایی (٥) سەروپێی کری وچاکی کردو بردیەوە بۆ سجنەکە بۆئەوانەی ببون بەناسراوی لەسجنەکە پاش ئەوە لە ٣/١١ کاك سلێمان بەرێ کەوت بۆ سوئیدو ئەو کێشەمان لەکۆڵ بوەوە کەماوەیەك بوو مەشغوڵی بوین ئەو ماوەیە من هەر لەدیمەشق بوم، لە٣/١٤ لەئوتێل شام دانیشتبوم جێگایەکی خۆش بوو چونکە هەموو جادەو فلکەکە لەبەردەمت دایە لەسەرەوە، لە٣/١٥ هەر لەسوریا بوم خەریکی ئیشوکارەکان بوم وەهەر ئەمرۆ لەمیسر سەرۆکی زانکۆی ئەزهەر لەقاهیرە شێخ جادر الحق کۆچی دوای کرد سەرۆکی میسر حوسنی مبارك بەشداری کرد لەناشتنی

جەنازەی، لە٣/١٦ یادی هەڵەبجە بوو میوان و خەڵکی زۆرم لابوو لەسوریا، لە٣/١٧ لەدیمەشق بوم مامۆستا کەریم ئەحمەد سکرتێری حزبی شیوعی سەردانی کردم وەهەر ئەمرۆلەسەر شانۆگەری بزوتنەوەی ئیسلامی و پارتی لەهەڵەبجە شەریان ببوو، لە٣/١٨ لەدیمەشق بوم وەفدێکی حزبی شیوعی سەردانی کردین کاک دکتۆر حامید بەرپرسی مەکتەب و کاک تۆماتۆما ئەندامی سەرکردایەتی بۆ گۆرینەوەی بیرورا لەسەر روداوەکانی کوردستان و ناوچەکە دوای نیوەرۆش کاک شەمعۆن ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزوتنەوەی ئاشوری سەردانی کردین و لەسەر روداوەکان قسەمان کرد، لە٣/١٩ هەرلەدیمەشق بوم سەردانی سەفارەتی بەریتانیامان کردو سکرتێری یەکەم جۆن رینمان بینی و قسەمان لەسەر مەسەلەی ئاشتی لەکوردستان و پەیوەندی هەردوولاش کرد، لە٣/٢٠ لەدیمەشق بوم یادی (٥) ساڵەی ئازاد کردنی شاری کەرکوك بوو هەرئەمرۆ سەردانی مەکتەب عمل وەتەنیمان کرد لەدیمەشق و پاشان گەراینەوە بۆ مەکتەبی خۆمان، لە٣/٢١ لەشام هەندێك گەراین جەژنی نەورۆز لەسوریا ناویان ناوە جەژنی دار نالێن جەژنی کوردە، لەرۆژانی ٢٢تا٣/٢٤ هەر لەشام بوم سەرقاڵی ئیشوکاری رۆژانە بووم، لە٣/٢٥ لەگەڵ کاک دانائەحمەد مەجیدو کاك بەهرۆز گلاڵی دا سەردانی ئوتێل شاممان کردو ئێوارەش دەعوەتی کاك محمد حبوبی بوین لەماڵی کاك تالب شیب کۆن وەزیری دەرەوەی عێراق بوو لە ١٩٦٠کان لەسوریا دانیشتبوین من وکاك شمس الدین موفتی و کاك دکتۆر ئەحمەد موسوی و کاك نجم الدین موفتی قسەی زۆرمان کرد لەسەر زۆر مەسەلە بەلاّم قسەکردن لەشام هەموی هەرقسەیە هەروایە ئەمرۆش کاك عبدالله ئۆجەلان چەند جارێك داوای چاوپێکەوتنی کرد مەجالمان نەبوو دوامان خست بۆکاتێکی کە، لە٣/٢٦ لەدیمەشق بوین لەگەڵ سەفارەتی فەرەنسی کۆبونەوەمان هەبوو هەرئەمرۆ کاك عمربۆتانی نوێنەری پارتی لەدیمەشق سەردانی کردین لەسەر

مەسەلەی ئاشتی و بروسکەیەکی کاك مەسعودی بۆمن هێنابوو پێم ووت کاك عمر
هەردوولا پێویستیان بەوەخت هەیە نەك بەئاشتی بۆیە من ئیتر زۆر پێم خۆش نیە
قسە لەمەسەلەیەك بکەم کەسیان باوەریان پێ ی نیە وادیاربوو خۆیان
پەیوەندیەکیان پێکەوە دروست کردبوو لەدەرەوە، لە۳/۲۷ کاك ئەبو سیبا یا
حکمت عەزاوی ئەندامی قیادەی قوتری و بەرپرسی رێکخراوی شەعبی لەمەکتەبی
حزب سەردانی کردین و دەربارەی دۆستایەتی و پەیوەندی برایانەی هەردوولاو
حزبی بەعس و حزبی سۆسیالیست قسەمان کردو ئامادەیی خۆی بۆهەر هاوکاریەك
پیشان دا.. هەرئەمرۆ کاك عمربۆتانی بۆ خواحافیزی سەردانی کردین لەمەکتەبی
حزب، لە۳/۲۸ هەرلەدیمەشق بوم لەگەڵ کاك دانای ئەحمد مجید چوینە
فرۆکەخانەی دەولی سوریا لەسەر داوای مجلیسی ئەعلاو پێشوازیمان لە السید
محمدباقر الحکیم کرد وەخەڵکێکی زۆریش هاتبون بۆ پێشوازی بەلام بێ
سەروبەربون ئێمە دانیشتبوین داوایان دەکرد چۆڵی بکەین هەموی هەڵسا بەلام
ئێمە لەوێ زۆر چاوەرێمان کرد کاك عمربۆتانی هەڵسا پێم ناخۆشبوو کاك دانا
هەرلەوێ بوو زۆرباش بوو پاشان کاك عمر وکاك دانا کە هەردو کیان نوێنەری
هەردوو حزبی شەرکەر بون لە سوریا ئەوانیش قسەیان نەدەکرد پێکەوە هەرلەوێ
وامان کرد هەردوکیان قسەیان کردو هەتا جگەرەشیان گۆریەوە هەرباش بوو
لەکوردستان شەربوو لەوێ بائەوان قسەبکەن کاك دانا قسەی دەکرد بەلام کاك عمر
خۆی دەپاراست سەید حەکیم بۆکۆبونەوە هاتبوو بۆسوریا لەوکاتە مەلیك حسێن
بەهاوکاری ئەمریکا مەسەلەی فیدرالی تەرح کردبوو داوای لەمعارەزەی عێراقی
دەکرد و داوایان لە(۷)ی حزبەکەش کردبوو بۆ ئەردەن وسوریاو ئێرانیش بۆخاو
کردنەوە یالەباربردنی ئەو هەولەی ئەردەن دەیانویست کۆبونەوەیەك لەشام پێك
بهێنن دژی ئەو کۆبونەوەیە هەرچەندە فیدرالیەکەی مەلیك حسێن بەوشێوەیە بوو

کەخۆی دەیویست کوردستان دوو موقاتەعە بێت لەنێوان پارتی و یەکێتی ناوی نەهێنابون وەعێراق (٧) هەرێم بێت بەلاَم ئەوە سیاسەتی ئەمریکابوو.. پاشان ئێمە لەفرۆکەخانە گەراینەوە لەشام هەندێك دانیشتین بەهەرحالّ بوو فیزەمان بۆکاك برزو وەرگرت لەسەفارەتی فەرنسا لەدیمەشق، لە٣/٣٠ لەسەعات (٥)ی سەرلەبەیانی لەگەلّ کاك برزووکاك عبدالرزاق و ئەو برادەرانەی کەچوینە فرۆکەخانەی دیمەشق خواحافیزمان لیّ کردن بەنیازی سەفەری ئەلّمانیا ئەوان گەرانەوەو ئێمەش سەعات (٧)ی بەیانی لەفرۆکە سەرکەوتین بەلاَم دوای هەندێك جولاَن خەلەلێکی تێکەوت و کوژایەوە وتیان بەس نەبوو لەهەوا نەکوژایەوە زۆر مەشغولّی کردین وادیاربوو مەکینەی هەلّسابوو دەستیان کرد بەداگرتن و تەیارەکەیان بۆ گۆرین تەیارەکەی کەش ئەویش وتی نەفەری تەواوم نیە لەحەلەب دەوەستم وادیاربوو بەنزینشیان پێنەبوو لەحەلەب وەری گرت و لەرحلەی (٤٣١) گۆرا بۆ رحلەی (٤٧٠) لەسەعات (٧) بۆ (٩) گۆریان و لەسەعات (١٠) لەحەلەب دەرچوین و لەسەعات (٢)ی پاش نیوەرۆ بەکاتی سوریا بە(٤) سەعات گەیشتینە شاری بەرلین و لەفرۆکەخانەی لەبەرلین لەلایەن کاك سلێمان لەسوئیدەوە هاتبوو هەروەها کاك تەها وکاك صلاح یاسین وکاك عەلی لەفرۆکەخانە پێشوازیان لیّ کردین و پاشان چوینە مالّی کاك تەها یاسین زۆر خزمەتی کردین لەگەلّمان ماندوبوو ، لە٣/٣١ لەمالّی کاك عەلی بوین منالّەکانمان تامین خان و رێژین و ئارین لەئاوەوە درێژدن هاتن بۆلامان کەلەمانگی ١٩٩٣/٣ نەم دیبون، لە١٩٩٦/٤/١ سەری ناوشارو سەنتەری بەرلین مان داو گەراین لەگەلّ مالّ و منالّدا، لە٤/٢ هەرلەبەرلین بوم هەندێك گەراین، لە٤/٣ لەبەرلین بوم دەعوەتی کاك یوسف بوین وەلە دیمەشق کۆبونەوەی معارەزەی عێراق هەبوو مام جەلالیش لەکۆبونەوەکە بوو پارتیش کاك نێچیرڤان بارزانی و کاك سامیان ناردبوو کاك نەوشیروان مستەفاش

لەوێ بوو لەکۆبونەوەکان حەرەکە ئیسلامیەکان و حزبی شیوعی عێراقیان دەرکردبوو نەیان هێشتبوو بەشداری بکەن هەرچی حزبی عەرەبی بون سێ چوار کەس بەشداربون پارتی ویەکێتی داکۆکیان لەسەر کەس وهیچ حزبی کوردی هاوسەنگەرو دۆستیان نەکردبوو کەئەوەش کارێکی خراپ بوو بۆ خۆشیان بەتەنها لەوێ هیچیان پێ نەدەکرا حزبی شیوعی بەیانێکی توندی لەسەر دەرکردن ئێران و سوریاش بەشداری کۆبونەوەکیان کردبوو پاشان کاك نەوشیروان و کاك نێچیرڤان کۆبونەوەیەکی بێ ئەنجامیان کردبوو لەوێ ئەو کۆبونەوەیە تەنها بۆلەبار بردنی کۆبونەوەکانی یاتەرحی مەلیك حسێن بوو لەئەردەن ئەمریکاومەلیك حسێن تەرحێکی کردبو کە عێراق لەدوای نەمانی صدام حسێن بکرێت بە حەوت فیدراڵی لە چوار چێوەی عێراقدا بێت ، لە٤/٤ ئێوارەکەی دەعوەتی کاك دکتۆر کەمال فوئاد بوم لەبەرلین لە چێشتخانەی کوردستان خاوەنەکەی ناوی دکتۆر حەسەن بو خەڵکی شاری سنەی کوردستانی ئێران بوو واتە کوردی ئێران بوو ئێمە لەوێ قسەمان زۆرکرد لەسەر روداوەکان کاك دکتۆر کەمال پیاوێکی شارەزاو مێژونوس و بەدوای کەلەپورو شارستانی کوردی دا دەگەرێت و نوسینی لەوبابەتەی لەسەر زۆر شت هەیە پیاوێکی ناسك و بیرکردنەوەی لەژێر تەئسیری ئەوروپای لەسەرە زۆر بەسەراحەت قسەدەکات بێ موجامەلە، لە٤/٥ هەرلەبەرلین بوم و لەماڵەوە دەرنەچوم، لە٤/٦ لەبەرلینی رۆژهەلات بوین چوینە سەیری دیوارەکەی بەرلین لەوجێگایانەی مابوو دیوارەکە لەزۆر جێگا شەش مەتر بەرزبوو بەتەلی درکاوی وکارەبای لەسەرو باخیان لەنێوان دروست کردبوو بۆئەوەی شورایەکی وادروست بکەن کەئیتر بیر لەیەك ئەڵمان نەکرێتەوە... ئەڵمانیای شەرقی یارۆژهەلاتی و کۆمۆنیستی زیاتر لە(٧٠) ساڵ دەستی ئەو خەڵکەیان بریبوو تائەو کاتەی سیسمتی مارکسیەت یاشیوعیەت لەبەریەك هەڵتەکێنراو بەجارێك لەروی سیاسی و ئابوریەوە

تـەپی و میللـەتێکی وا رەش و روت و برسـی هاتـە دنیایـەکی کـەوە هـەتا لـەناو مالـەکانیان قەدەغـەبوو یارادیۆی هـیچ ولاتێکیـان وەرنـەدەگرد جگـە لەسـۆڤیەت ئەوەی خۆی پیٚ ی خۆشبوو هەمووشت لەمرۆڤ قەدەغەبوو هەتا ئـەو پەنجەرانـەی لەخانوەکانیاندا روی لەبەرلینی غـەربی بـوو کەدابـەش کـراوە گرتویانـە بۆئـەوەی قسە لەگـەڵ یـەك نەکـەن و هاتوچـۆ نـەمێنێ لەنێوانیانـدا ئەگـەر سـەیری بـەرلینی رۆژئاوا بکەیت و بـەرلینی رۆژهـەلات جیـاوازی زۆر لـە بـەرلینی رۆژهـەلاتی دەبـینی جادەی تەپیو خانوی خـراپ و سـەیارەی خـراپ و نـەبونی وەسـیلەی گواسـتنەوەو کەرەسەی ژیان و پێویستی رۆژانە لەجادەیەکی دورودرێژ تەلـەفۆنێکی تێـدا نـەبوو بەلاّم بەرلینی خۆرئاوا میترۆ لەژێر زەمین و لەسەریـشەوە قیتـارو پـاس و ئـەنواعی وەسیلەی گواستنەوەو گەیاندن هـەبوو هەرچـەندە تەلـەفۆنی سـەرجادەو زۆرشـتی کەش کەخزمەت بەمیللەت دەکات بەلاّم ئـەم هـەموو مـاڵ وێرانیـەیان هـەبوو بـەلاّم دەبابەی باش و تەیارەی باش و چەکی بەکۆمـەڵ کـوژی بـاش و ئەوانـەیان زۆربـوو هەتا تەقینەوەی کیمیاوی خۆیان چـیرنۆمبیڵ لەچـەند شـونێك لەسـۆڤیەتی جـاران جگە لەنەخۆشی بۆ خۆشیان و بۆ دنیایـان هێنـابوو هـەتا ئەوچـایەی لـەودەرمان و کیمیاویەی بەرکەوت نوێنەرانی حکومەتی هەرێمی کوردسـتان ویـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان وپـارتی دیمکراتـی کوردسـتان هێنایـان بـۆ کوردسـتان وفرۆشـتیان بەخـەڵکی و زۆری توشـی نەخۆشـی مـاڵ وێرانـی کـرد ئێمـە بەدرێـژایی ئـەو رۆژە رەسمی ئەو جێگایانەمان گرت هەروەها رەسمی مـالّی هیتلـەرمان گـرت و رەسمـی یەکەم دەبابەو دووهەم دەبابە کەهاتبونە بەرلین رەسمی گـیران و جێگـای مـانۆری سەربازی سوپای ئەڵمان لەکاتی هیتلەرداو زۆر جێگای مێژویی کەشمان بینی و زۆر لەوجل و بەرگی سەربازی نەجمەو کـلاّوو دوربـینی شـەوو رۆژو زۆر شـتی سـەربازی ئەڵمانیای رۆژهەلاّتی لـەبازار دەفرۆشـراو خـەڵکی وەکـو عەنتیکـە دەیـان کـری بـۆ

سەیرکردن ئاڵای ئەڵمانیای رۆژهەلآت بەئەستێرەکەوە لەناوبازار خەڵکی بەسەریدا دەگەران و هاتووچۆیان دەکرد لەژێر پێلاو دایان نابوو کاك یوسف ئەو رۆژە هەموو ئەو شتانەی بۆ وێنە گرتین لەتەلەفزیۆنی سۆسیالیست لەکوردستان بلآو کرانەوە زۆر داس و چەکوش بە یەك مارك دەفرۆشرا دەردەکەوێت هەرچی دیکتاتۆریەت و زۆرو کوشتن و برین و دیواری تەلبەندو کارەباو چاڵ و ترساندن و تۆقاندن ناتوانێ بەسەر ئیرادەی گەلدا سەربکەوێت و ئیرادەی گەلی ئەڵمان یاهەردوو ئەڵمان زۆر لەوهەموو دیکتاتۆرە بەهێزتربوو وەلەدیواری بەرلین بەهێزتربوو تێك وپێکی داو بەسەریەکی تەپاندو تێکەڵ بونەوە کە(٤٥)ساڵ بوو برا لەبراکرابوو کورودایك لەیەك کرابوو خزم و هەموو شتێك تەنانەت ئاووهەواشەیان لەیەك حەرام کرابوو بەلآم هەمویان تێك شکاندو ئیرادەی گەل بەسەریا سەرکەوت و ئێستا بووە بەئەڵمانیای یەکگرتووی فیدرالی وا(٧)ساڵە بۆ (١٠)ساڵی کەش هێشتا بۆیان چاك ناکرێتەوە شوێنەواری وێرانی ئەڵمانیای شەرقی وەکو ئەڵمانیای رۆژئاوای لێ نایەتەوە لەهەموو رویەکەوە بەلآم لەمۆسکۆفیچ و لاداو مارسیدیس و باشترین سەیارە بۆئەوانیش خەریکن نایبیننەوە دوای (٤٥)ساڵ بونەتەوە بەیەك ئەڵمان و بەیەك بەرلین کەهیڵمەت کۆڵ دەوری هەبوو، لە٤/٧ لەبەرلین بوم لەگەڵ ماڵ و مناڵ لەبازار دەگەراین و هەروا سەیری ئەو گۆرانە گەورەیەمان دەکرد بەسەر ئەڵمان یابەرلین دا هاتبوو، لە٤/٩ لەبەرلینەوە چوینە شاری گۆتن گن لەگەڵ کاك یادگار لەوێش چاوچێکەوتنێکی رۆژنامە گەریمان هەبوو بەتەمای سەردانی مامۆستا کەریم ئەحمەد بوین رێك نەکەوت برۆین لەماڵەوە نەبون، لە٤/١٠ لەشاری گۆتن گن زۆر گەراین لەگەڵ ماڵەوەدا پاشان گەراینەوە بۆ بەرلین، لە٤/١١ لەگەڵ ماڵەوەدا لەبەرلین بوین زۆر گەراین و زۆرجێگامان بینی بەرلین شارێکی بەرفراوانەو گەورەیەو (٥)ملیۆن کەسی لێ دەژێ خۆی بۆشار دروست کراوە کاتی خۆی رێك و پێك

کراوەو وەسیلەی گواستنەوەی بەچەند شێوە هەیە وەکو قیتاری سەرزەوی و قیتاری ژێر زەوی و پاس و تەکسی وئاویش لەناوشار وەکو جادەکان واش قەڵەباڵغ و کەشتی بچوك و گەورەشی بەشێوەی رێك وپێك قات قات دێتە خوارەوە لەئاوەکەوە واتە کەسێك بڕواتە بازار یابگەڕێتەوە دەتوانێ لەژێر زەوی یادەتوانێ لەسەرجادە یادەتوانێ بەناو ئاودا هاتوچۆی خۆی بکات بۆ زۆربای قورس بەکەشتی بۆگەرەکەکانی دەگوازێرنەوە لەهەموو رویەکەوە تەکاملی شارەو شارێکی مێژوییە وەکو واشنتۆن و پاریس و لەندەن بەڵام بەرلین توشی دووشەری جیهانی بەتایبەتی شەری دووهەم و وێران کردنی بەرلین و دابەش کردنی بەڵام کەمترنیە لەوشارانەی باسمان کردن، لە٤/١٢ لەبەرلینەوە بەرێ کەوتین بۆدرێزدن و ولایەتێك و بۆ نۆرنبێگ و بۆ شاری میونغ سەعات (١١)ی شەو گەیشتین کاك شاخەوان وکاك ئازاد و کاك جەمال و کاك کۆچەر چاوەرێیان دەکردین لەمیونغ شەو سەعات (١٢)ی شەو چوینە ماڵی کاك شاخەوان ساڵەیی، لە٤/١٣ کۆبونەوەیەکیان لە میونغ لەمەڵبەندی کوردستان لەوشارە بۆساز کردم کاك شاخەوان ئەوبرادەرانە و خەڵکی باش هاتبون لەسەعات (٥/٣٠) بۆسەعات(٨/٣٠) ئەو ئێوارەیە بەردەوام بوو لەسەر زۆرشت قسەمان کرد کەئەوکات جێگای باس بوبێت و وەڵامی هەموو پرسیارەکانم دایەوە کەکردبویان پاشان گەراینەوە دەعوەتی برادەرانی کوردی تورکیا بوین کاك حەسەن و کاك خالیدو دەریاخان تەرجومەی زۆری کۆبونەوەکەشی بەئەڵمانی کردو پاشان شەو گەراینەوە ماڵی کاك شاخەوان، لە٤/١٤ لەماڵی کاك شاخەوان بوین و خەڵکی زۆر هاتنە سەردانمان و قسەشمان لەسەر زۆرشت کرد کاك شاخەوان وماڵەوە یان سمیر خان زۆرلەگەڵمان ماندبون لەوێ، لە٤/١٥ هەرلەماڵی کاك شاخەوان بوین لەمیونغ کاك محمود کانەبی ئاغای دزەیی و کاك کەمال چاورەش و زۆری کەش هاتنە سەردانمان قسەمان زۆرلەسەر روداوەکان کردو بۆ نیوەرۆش

لەماڵی کاك ئازادحاجی فارس دەعوەت بوین کاك ئازاد حاجی فارس خەڵکی شاری کفریە لە ساڵی هەشتاکان ئەندامی علاقاتی سۆسیالیست بو لە کرماشان و ئێوارەش لەماڵی کاك شوان زۆراب زاوای کاك فەرەیدون دارتاش بوین لەمیونخ، کاك فریدون خۆشی لەوێ بو، لە٤/١٧ لەمیونخەوە بەقیتار گەراینەوە بۆ بەرلین لەسەعات(١)ی پاش نیوەرۆ بەرێ کەوتین و لەسەعات(٨/١٦) گەیشتینە بەرلین، لە٤/١٨ لەبەرلین بوین کاك جمیل محمد قادر لەسوئیدەوە هات و گەیشتە لامان، لە٤/١٩ لەبەرلینەوە بەرێ کەوتین بۆ بەلجیکا لەسەعات (٢) گەیشتینە شاری برۆکسل و لەوێش میوانی تەلەفزۆنی (مید)بوین و ئێوارەکەشی مونازەرەیەکی تەلەفزیۆنیمان هەبوو لەسەر روداوەکانی کوردستان من قسەم کرد لەسەر شەری ناوخۆ کەسەرەتای لەلێدانی سۆسیالیستەوە دەستی پێکردووە پاشان دوای من کاك جەمیل قسەی کردو کاك کاروان وکاك کامەران و چەند کەسێکی کە لەوێ بوون لەسەعات ٩/٣٠ بۆ سەعات ١١/٣٠ی شەو بەردەوام بوو پاشان گەراینەوە برۆسکل، لە٤/٢٠ چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیم هەبوو دووسەعات بەتەنها لەگەڵ کاك باهرۆزدا(کاك بەکر شوانی) لەسەر زۆر روداو قسەم کردو زۆرپرسیاری کرد لەسەر روداوەکان و لەسەر وەزعی کوردستان و ناوچەکەو جیهان و سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بەکورد پاش تەواو بونی بەرێ کەوتین بۆهۆڵەندا بۆسەردانی برادەران کاك رائید کەریم بەرپرسی رێکخراو کاك لوقمان بەرپرسی کۆنی ناوچەی زاخۆو مامۆستا لەتیف برای شەهید مامۆستاشەریف مولود و زۆری کەی برادەران لەوێ بون لەوێش کۆبونەوەمان پێ کردن و قسەمان بۆکردن لەسەر روداوەکان و سیاسەتی حزب لەوبارودۆخەدا پاشان لەسەعات (٢)ی پاش نیوەرۆ لەهۆڵەندا دەرچوین لەسەعات (١٠)س شەو گەیشتینە بەرلین لەگەڵ کاك جەمیل و کاك کامەران، لە٤/٢٢ لەقونسلیەی سوئید لەئەڵمانیا فیزەی (١٨)رۆژی سوئیدمان وەرگرت و

گەراینەوە..لەسەعات (٣)ی پاش نیوەرۆ لەبەرلین دەرچوین لەگەڵ کاک جەمیل و کاک کامەران چوینە سەردەریای بەڵتیك کەنێوان ئەڵمانیاو سوئیددا دەریای باڵتیك لەچیرۆك و رۆمانەکانداو بەتایبەتی عەزیز نەسین لام غەریب نەبوو ئەوناوە لەوێ بەگشتی پەرینەوە پاشان لەسەعات(٢)ی پاش نیوەرۆ گەیشتینە ستۆکلهم بۆماڵی کاک جەمیل واتە لەسەعات (٣)ی رۆژی ٤/٢٢ لەبەرلین بەرێ کەوتین و لەسەعات (٢)ی پاش نیوەرۆ گەیشتینە سوئید بێ وەستان، لە٤/٢٣ کاک سامان گەرمیانی ومامۆستا پشکۆو کاک حمەئاوات هەمویان سەردانیان کردین بۆبەخێرهاتن... هەرئەمرۆش لەکوردستان وەفدی ئەمریکی چاویان بەیەکێتی کەوتبوو دوای سەردانی پارتی لەصلاح الدین هەروا بۆمەسەلەی ئاشتی بەردەوامن لەکوردستان، لە٤/٢٤ سەردانی کاک ئەحمەدقادر منەوەر باوکی کاک عوسمان لەسوئید کرد بەبۆنەی پرسەی کاک عوسمانەوەو پاشان سەردانی کاک فەرەیدون وکاک بەختیاروحەمەی محی الدینم کرد بەبۆنەی پرسەی کاک جەلال برایەوە پاشان گەراینەوە کاک مەلا ئەحمەدی بانی خێلآن سەردانی کردین چەندکەسی کەش سەردانی کردین و دوای نیوەرۆش کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ رێکخراوی سوئیددا دوای نیوەرۆش کۆمەڵێك خەڵکی کە هاتنە سەردانمان، لە٤/٢٥ سەردانی ماڵی کاک حمەی فەرەجم کردو بۆلای خێزانی مولازم کەریم بەبۆنەی پرسەکەیانەوە چومە ماڵیان و پاشان سەردانی کاک محمود ئاغای کاکەزیادم کردو لەوێش لەسەر زۆرمەسەلە قسەمان کرد بۆسەعات (٤)ی ئێوارە سەردانی کۆمەڵەی کوردیم کرد لەسوئید لەوێش گفتوگۆکراو قسەلەسەر زۆرمەسەلە کرا کابرایەکی لێبوو سەربەپارتی بوو خۆی پێ نەگیراو بەرگری لەپارتی دەکرد من مەسەلە واقیعەکانم باس دەکرد بەتایبەتی هاوکاری نێوان پارتی و عێراق لەوکاتەدا هەبوو هاتوچۆیان لەگەڵ عێراق نکۆڵی لێ دەکرد و دەربارەی رەفتاری یەکێتیش قسەم کرد

کەئەوانیش خروقاتیان زۆربووە لەسەر روداوەکان بەلاّم نوێنەری یەکێتی قسەی نەکردو خۆی گرتبوو ئەویش بەرگری لەپارتی دەکرد کوردی عێراق نەبوو پێ دەچوو سوری بووە تاسەعات (٣/٣٠)ی ئێوارەش هەر قسەکراو وەلاّمی ئەو پرسیارانەم دایەوە کەئەوان کردبویان،لە٤/٢٦ سەردانی بارەگای یەکێتیمان کرد لەستۆکلّهم لەوێش قسەکراو موناقەشە لەسەر زۆرشت کراو رەخنە لەسیاسەتی یەکێتی گیراو لەسەر تەسەروفاتی ئەوان لەوێش پرسیار و وەلاّمی زۆرهەبوو پاشان سەردانی کاك قادری حاجی عەلیمان کرد نەخۆش بوو لەوێش هەندێك دانیشتین و گەراینەوە پاشان سەردانی مالّی کاك کۆسرەت م کرد و پاشان سەری کاك شێخ عوسمان خالیدیم دا لەمالّەوەو کاك تاهیرشم بینی کەلەکۆنەوە نەم بینیبوون کاك شێخ عوسمان ومالّەوەو منالّەکانی لەسەرەتای سەرکەوتنی شۆرشی گەلانی ئێرانەوەئەوکاتە من لەسنورەکانی پاوەو مەریوان وبانەوسەردەشت بوم بەتایبە تی مەریوان خەلّکی ئەوناوچانە زۆریان خزمەت کردوم بەلاّم کاك شێخ عوسمانی خالیدی وکاك منصوری شاترنەبی ومام رۆستەمی دزلّی لەکاتی بریندارى دەستی چەپم کاك شێخ عوسمان زۆریان عەزیەت کێشاوە لەگەلّ مندا هەموو خەلّکی ناوچەی مەریوان داوای لێ بوردنیان لی ئەکەم ناوی هەمویان لێرەدا جێگای نابێتەوە کاك حامید حاجی غالیش لەوێ بوو هەولّم دا سەردانی مالّی کاك جەلال حاجی حسێن کەلّوەش بدەم وادیاربوو بۆم رێك نەکەوت شەولەمالّی کاك حامید حاجی غالی بوین وادیاربوو بەدەستی ناهێیەخانەوە گیری خواردبوو جاران ناهی زۆر فەقیربوو بەلاّم ئەمجارە دیم بەدەستی ناهێیەوە گیری خواردبوو ئەو شەوەش لەگەلّ کاك حامید قسەی کۆن و رابردومان زۆرباس کردو زەمی خەلّکمان زۆر کرد کورەکەی کاك حامید کەچاوی بەر لوغم کەتبوو زۆرم پێ ناخۆش بوو گەنجێکی رێك وپێك چاوی لەدەست دابوو، لە٤/٢٨ سەردانی مالّی کاك صالّح سورمان کرد

کەپێشمەرگەیەکی کۆن و ئازاو دڵسۆزبوو لەوسەفەرە لەگەڵ کاک جەمیل پێکەوە بوین گەراینەوە ستۆکلهم پارتیش کەپێشتر هەوڵیان دابوو من نەگەمە سوئیدو ئەو رۆژەی کەزانیبویان من کۆر دەگرم هەمان رۆژ کۆرێکیان سازکردبوو بۆکاک جەوهەرناميق بۆئەوەی خەڵکی کەم بێت بۆ کۆرەکەی ئێمە بەلام من زۆر بەئاسایی گرتم و خۆشم رۆیشتم بۆکۆرەکەیان ئەو نیو سەعات پێش من دەستی پێکردبوو لەوێ دانیشتم لایان سەیربوو ئەوان کۆریان گرتووە خەڵکی نەیەتە لای ئێمەو من چوم بۆکۆرەکەیان پێ دەچوو منیان بەبێ ئاگا زانی بێت پاشان گەراینەوە چاخانەی هۆڵەکە کاك ئەبوتارا وکاك ئەبوسەرباز و کاك ئەبورائیدو چەند برادەری کەشیان هاتبون کۆرەکەی ئێمەش لەسەعات (٢/٣٠) دەستی پێکرد کاك حمە ئاوات و کاك ئاری کاکەیی و خوناوخان لەسەر شانۆکە کۆرەکەیان بە رێوەدەبرد وەرێکخراوی سۆسیالیست سەرپەرشتی هەموو کارە کانی دەکرد تاسەعات (٥/٣٠) بەردەوام بووقسەم کردوپاشان پرسیاری جۆربەجۆرکراو وەلامی هەموویم دایەوەو زۆر بەتێروتەسەلی قسە لەسەر روداوەکان کران کەئەوکات جێگای باس بون پاشان چوینە گازینۆیەك دانیشتین لەگەڵ ئەو برادەرانەی کەبەشداربون وەکو کاك ئەبو تاراو کاك ئەبوسەربازو کاك ئەبو رائیدو کاك سامان گەرمیانی و کاك جەمیل و کاك ئاری کاکەیی و زۆری کەش لەوێ بون بۆ ئێوارەش چوینە مالی کاك سامان گەرمیانی ولەوێش قسەمان لەسەر روداوەکان کرد شەو گەراینەوە بۆمالی کاك جەمیل محمدقادر، لە٤/٢٩ لەبەشی علاقاتی پەرلەمانی سوئید کۆبونەوەیەکمان لەگەڵ سەرۆکی فراکسۆنی چەپەکان لەپەرلەمانی سوئیدی کرد کەچەند کەسێك لەئەندامانی پەرلەمان و بەئامادەبونی کاك جەمیل و کاك جەمال و خوناوخان بۆماوەی دووسەعات لەسەر مەسەلە جیاجیاکان و ئابلۆقەی ئابوری لەسەرعێراق و کوردو سوئیدو کوردو حزب و پەرلەمانی سوئیدی قسەی لەسەرکران

پاشان سەردانی کاك هەردی و خێزانی شەهید کاك قادر شۆرشمان کرد هەرهەمان ڕۆژ سەردانی بارەگای پارتیمان کرد لەستۆکلهم کاك تەها بەرواری لەوێ بوو لەوێش زۆرمەسەلەکان باس کران و باسی ئەوەشمان کرد کەبۆچونی پارتی دژی هەمولایەك هەڵەیە و بەتایبەتی هاوکاری عێراق و تورکیایەو ئاشکرایە لەسەرحسابی کورد ئەگەر بۆچارەسەری کێشەی کورد بێت لەگەڵ عێراق ئەوە هەمووومان پێکەوە ئەتوانین شتێك بکەین کاك تەها بەرواری گە نجێکی وشیار بوو تەفاومی قسەکانی دەکرد بەلأم ئیلتزامی حزبی هەبو ئیشارەتم دایە زۆر مەسەلەی کەش پاشان چوینە ماڵی کاك ئاری کاکەیی و لەوێ بوین لەگەڵ کاك حمەئاوات پاشان گەراینەوە بۆماڵی کاك جەمیل تاسەعات (٤)ی سەرلەبەیانی قسەمان کردو مەجالی نوستنمان نەبوو، لە٤/٣٠ بەتەمای سەردانی ماڵی کاك فارس باوا بوین لەکاتێك لەکۆنگرەی یەکگرتن و(١١)ی پارتی کاك فارس لەوێ بوو ڕێگایان نەدا دەربچێت لەکۆنگرەدا کاك فارس هەرزانی کەئێمە خەریکی ڕێکخستنەوەی ئیشوکاری سۆسیالیستین لەڕێگای کاك جەمیل محمدقادرەوە چەند جارێك داوای بینینی منی کرد هەر لەوڕۆژانەدا ڕێك نەدەکەوت دووجار سەریی لێداین و مەوعیدی قسەکردن دانرابوو شەوێك چوینە هەولێرلەماڵی خۆیان قسەمان کردو پاشان دووبەشی قسەمان کرد لەسەر زۆر ڕوداوی ئەوکاتەو باسی ئەوەی کرد کەپارتی ڕێگایان نەداوە دەربچێت بەلأم وتی من لەدەرەوەش لەسەرمیلاکی سۆسیالیست بوم و ئێستاش دەمەوێت ئیش بکەین و خەڵکی زۆریش ئامادە دەکەم و باسی ئەوەی کرد کەپارتی وماڵی بارزانی شتیان لەبیر ناچێت و ئەوە هەمووی تۆڵەی کۆنە لە کاك فارس دەکرێتەوە وتی لە نەمسا تەقە کراوە لە کاك مسعود بارزانی لە لایەن عێراقەوە کاك ئازاد بەرواری وکاك پیرۆتی تێدا برینداربوە کاك فارس وتی من ئاگام لێ نەبوە بەلأم گومانیان لەمن بوە هەر لەبەر ئەوەش نەیان هێشت من خۆم هەڵبژێرم و دەربچم

بریاری دا ئەویش لەحزبی سۆسیالیست ئیش بکات و رەئی کۆتایی خۆشی لەسەر سۆسیالیست بدات و سەفەرێکی دەرەوەی هەیەو دەگەرێتەوە ئیعلانی دەکات لەگەڵ حزبی سۆسیالیست ئیش بکات و لەکاتەوە میلاکی سۆسیالیستە وەباس نەکرێت تالەسەفەرەکەی دەگەرێتەوە ئێمەش هەروەکو پیاوێکی تێکۆشەر لەدوای ئەوەی دوای کۆچی دوای کرد سەردانی ماڵ ومناڵەکەیان بدەین لەسوئید ئەوەبوو لە٤/٣٠ لەسوئیدولەشاری ستۆکلهم سەردانمان کردن پاشان گەراینەوەو دەعوەتی کاك ئەبوتارا بوین لەگەڵ کاك جەمیل و کاك مەلا ئەحمەدی بانی خێلانی لەوێش مجلسێکی باش بووکەکۆمەلێك لەو کوردانەی ئەو شارەمان بینی بەهۆی کاك ئەبوتاراوە ئەو فرسەتەی بۆ رەخساندین قسەی زۆر لەسەر روداوەکان کراو بەرەو کوێ دەروات بەراستی دانیشتنەکە سودبەخش بوو بۆمن کاك دکتۆر وشیارو کاك فاتیح رەسولیش لەوێ بون پاشان گەراینەوە ستۆکۆڵهم بۆماڵی کاك سەربەست حاجی ئیبراهیم و پاشان گەراینەوە کۆبونەوەی رێکخراوی سوئیدمان هەبوو تاسەعات (٢)ی شەو هەر لەکۆبونەوە بوین، لە١٩٩٦/٥/١ لەشاری ستۆکۆڵهم بوین لەسوئید سەردانی مەرکەزی شارمان کرد بەبۆنەی یەکی ئایارەوە ئاهەنگیان هەبوو لەوێ هەندێك سۆسیال دیموکرات و چەپەکان لەوێ بون بۆنیوەرۆیش لەماڵی کاك خورشید بوین پاشان چوینە ماڵی کاك سەربەست پاشان لەسەعات (٥)ی ئێوارە چوینە پرسەی دایکی کاك عبدالرزاق فەیلی کۆمەلێك ناسراوی لێبوو وەکاك دکتۆر رەمزی ودکتور مالیك ئەوانش لەوێ بون پاشان بەرەو دانیمارك بەرێ کەوتین بۆشاری ئاری گوش و چوینە ماڵی کاك جەمال هەر هەمان رۆژ سەردانی ماڵی خالەرەحیم باوکی خالە حاجیمان کرد لەخەستەخانەو پاشان گەراینەوە بۆماڵی کاك جەمال، لە٥/٢ جارێکی کە سەردانی ماڵی خالە رەحیم مان کرد خەڵکی زۆر سەردانیان دەکردین برادەرانی خۆشمان وردە وردە کۆدەبونەوەو برادەرانی سوئید

هاتن و برادەرانی پارتی کاك شێخ محمد سەری لێ داین و کاك بەختیارو کاك دکتۆربەکر و برادەرانی یەکێتیش هەموو سەردانیان کردین، لە٣/٥ برادەران هەر سەردانیان دەکردین بەنیازی کۆنفرانسی لقی ئەوروپای حزب بوین لەسەعات (١٠)ی سەرلەبەیانی ٣/٥ کۆنفرانسی لقی ئەوروپای حزب لەشاری ئارهۆش(ARHUS)ی دانیمارکی بەزمانی کوردی و دانیمارکی بەدەقیقەیەك وەستان بۆگیانی پاکی شەهیدان دەستی بەکارەکانی خۆی کرد و پاشان من قسەم بۆکردن لەسەر هەموو بابەتەکانی پێش خستنی لقی ئەوروپا لەروی رێکخستن و پەیوەندی قسەی لەسەرکراو هەموو ئەندامانی کۆنفرانسەکە کەپێهاتبون لەرێکخراوی هۆڵەنداو رێکخراوی سوئیدو رێکخراوی دانیمارك ورێکخراوی ئەڵمانیاو رێکخراوی بەریتانیا لەسەر زۆری مەسەلەکان قسەکران و (٣٥) کەس نوێنەری رێکخراوەکانی حزب بەشداربون و کاك جەمال هەڵبژێرا بەمەسئولی لقی ئەوروپاو مەسئول رێکخراوەکان هەموو هەڵبژێران و کاك ئاری کاکەیش بەئەندامی کارگێری لقی ئەوروپا دەست بەکاربون و لەسەعات (١٢)ی شەو سەرکەوتوانە کۆتایی بەکۆنفرانسەکە هات، لە٥/٥ سەردانی خاڵەرەحیم وچەند کەسێکی کەشمان کردو کچێکی بچکۆلەش کەسۆسیالیست بووناوی راژان ئازادبوو هاتبوو بۆلام شکاتی لەباوکودایکی دەکرد کەرێگای لێ دەگرن سۆسیالیست بێت زۆریش بەجدی وەری گرتبوو تەمەنی نزیکەی (٦)ساڵ بوو پاشان لەگەڵ کاك ئازادرەحیم و برادەرانی سوئید دا گەراینەوە لەشاری هاوسی دانیمارکیەوە بۆ سەرئاوپەرینەوە لەدەریای فردیس هاون بۆشاری ئیتوبۆری و سەعات (٨)ی بەیانی گەیشتینە ستۆکۆڵهم برادەران ماڵی خۆیان لێ تێك چوبوو سەعات و نیوێ لەناو ستۆکۆڵهم گەران و پاشان چوینە ماڵی کاك ئاری کاکەیی و لەوێ ئیسراحەتمان کردوپاشان چوین بۆماڵی کاك جەمیل واتە لەسەعات (٩/٣٠)ی رۆژی ٦/٥ گەیشتینە ماڵی کاك ئاری کاکەیی دوای

نیـوەڕۆیش کـاک عمـری شـێخ مـوس سـەردانی کـردین و لەسـەر ڕوداوەکـان و زۆر وەزعی کوردستان و ناوچەکە قسەمان کـردو بۆچـونەکان زۆر لەیەکـەوە نزیـك بـون کاك عمر پیاوێکی باش و ڕۆشنبیرو شەخسیاتێکی کوردی لەکوردی سـوریاو لەگـەڵ یـەکێتی دابـوو ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی یـەکێتی بـوو لەشـاخ تـادوای ١٩٨٥ ئەوانـەش و ئێـستاش هـەر سـەربەیەکێتی و دانیـشتووە وەکـو بـێ لایـەنێك و شەخـسیاتێکی کـوردی لەشـاری سـتۆکۆڵهم ی سـوئید وپیـاوێکی سیاسـیەو سـەر لەهەلومەرجەکانی دنیا دەردەکات ڕاوبۆچونی تایبەتی خۆی هەیە لەسەر مەسەلەی کورد، لە٧/٥/١٩٩٦ سەردانی ماڵی کاك ئازادی پاسۆکمان کرد و کاك ئاراس وەلـی لەوێ بوو بۆ بەسەرکردنەوەیان چونکە لەگـەڵ کـاك ئـازاد ماوەیـەك پێکـەوە بـوین لەچیای سورێن پاشان چوینە شەریکەیەکی ڕادیۆ کـەجیهازو زۆرشـتیان دەفرۆشـت ڕادیۆمان لێ کری بوو ناوی شەریکەکە (ELFA) بوو، لە٨/٥ سەردانی مـاڵی کـاك حمەئاوات و پاشـان سـەری مـاڵی کـاك ئەمجـەد شـاکەلی مانـدا و چـەند کەسـێکی کەمان بەسەر کردەوە چونکە بەتـەمای گەڕانـەوە بوم، لـە٩/٥لەشـاری سـتۆکۆڵهم سەردانی بارەگای سۆسیال دیموکراتی سوئیدمان کردو چاومان بە خاتو ئنـا لینـدە سکرتێری گشتی سۆسیال دیمکراتی سۆئیدی و کۆنی فرنـسنون ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی وشەخـسی دووهـەم ومەسـئولی پەیوەنـدی دەولـی سۆسـیال دیمـوکراتی سـوئیدی ئەنتـە ناشـنال کـەوت و بۆمـاوەی سـەعات ونیوێـك قـسەمان لەسـەر زۆر مەسەلە کـرد بەتایبـەتی مەسـەلەی کـوردو کێشەی شـەڕی نـاوخۆو چارەسـەری و پەیوەندی حزب و سۆسیال دیموکرات قسەمان کرد کاك جەمیل وکاك ئاری کاکـەیی لەو کۆبونەوەیە بەشداربون پاشان گەڕاینەوە جێگای ئیسراحەتی خۆمان و چاومان کەوت بە خاتو مۆنیکا ئەنـدەر سـون بەرپرسـی ئـەمنی حزبـی سۆسـیال دیمکراتـی سوئیدی و بۆدوای نیوەڕۆ برادەرانی یەکێتی دیموکراتی کوردستان وکـاك کـاروان و

کاك محمد نەزیف و کاك ئیسماعیل سەردانیان کردین و لەگەڵ ئەوانیش کۆبوینەوەو قسەلەسەر زۆرشت کرا وەبۆ سـەعات (٢/٣٠)ی پـاش نیـوەرۆ کـاك جـەمیل و کـاك کامەران و کاك مەریوان و خوناوخان بەرێیان کردم ولەو سەفەرەش کـاك جـەمیل و خوناوخان زۆر زەحمەتیان کێشا لەگەڵماندا خۆم پێم خۆش بـوو بـەقیتار هاتوچۆ بکەم بۆشارەزا بون لەمحەتەی قیتار بەرێ کەوتم لەستۆکۆڵهم لەو سەفەرە بەقیتارو بۆسەر دەریای بەڵیتك بـەقیتار چوینە باخیرەیەکـەوەو بۆئـەڵمانیا بەچوارسـەعات لەئاوەکـە پەرینــەوە بــەری ئــەڵمانیا ئــەو هــەموو ســەفەرەم کــرد کــەس داوای پەساپۆرتی لێ نەکردم لەگەرانەوەدا هەر بـەزۆر دامـان بـەکۆنترۆڵ کـەمۆرێکی لێدا هاتومەتەوە ئەڵمانیا لەسەعات (٩/٣٠)ی ١٩٩٦/٥/١١ گەیشتینە بەرلین کـاك عـەلی چاوەرێ ی دەکردم تاگەیشتم و گەراینەوە ماڵی کاك تەها یاسـین بـە(١٧) سـەعات قیتار لەستۆکۆڵهمەوە بێ وەستان بۆ بەرلین گەیشتین و شەویش لەو فارغۆنەی من سوئیدێك و هندیەك پێکـەوە بـوین پاشـان فەلەسـتینیەك هـات و تەوقـەمان لەگـەڵ کردو قسەمان دەکرد لەگەڵ هەریـەك لـە گانـدی دا لەیـەك حـاڵی دەبـوین، لـە٥/١١ لەبەرلین بوین، لە٥/١٢ بەسەیارەی کاك تەها لەبەرلینەوە چوین بۆ کەمپی سـپیکاو ئەلیوزەوە بۆلای مناڵەکانمان لەکەمپ بون تامین خـان و رێـژین و ئـارین مـن لایـان مامــەوە لــەوێ، لــە٥/١٣ هــەرلایان بـوم لەکـەمپ...ئـەمرۆ٥/١٣ یـادی راپــەرینی شــارەزوور و هەڵەبجـە و کـۆنترۆڵی ناوچـەکە لەلایـەن هێـزی سۆسیالیسـتەوە بـوو سەیدصـادق و سـیروان و خورمـاڵ و جـادە گشتیەکان پـاك کرایـەوە لـەرژێم کەلـە ١٩٨٧/٥/١٣دا کرا، لە٥/١٤ هەرلەوێ بوم پێشمەرگەیەکی کۆنی سۆسیالیست نـاوی شاهۆ بوو لەسەر جیهازی شـەقلاوە بـوو هـات و سـەردانی کـردم، لـە٥/١٥ هـەر لـە کەمپەکە بوم لایمناڵەکان، لە٥/١٦ هەرلەوێ بوم، لە٥/١٧ لەگەڵ مناڵەکان چوینە شـارێکی نزیـك بـەناوی ئـەیرودە لـەئاوەوە چـوین زۆر گـەراین تـائێوارەو پاشـان

گەراینەوە بۆ هایمەکە مناڵەکانی لێبو، لە١٨/٥ لەگەڵ مناڵەکان چوینە دەلەبرودەو لەویّ خوا حافیزم لیّ کردن زۆرناخۆش بوو بەجێم هێشتن بەو وەزعەوە کچەکەمان رێژین دەیوت ئەوە بۆ کاکەم دێت دائیم دایکم هەر ئەگریّ وکاکەم ئەروات هەر ئەگریّ ئیتر لەوێوە بۆ بەرلین بەریّ کەوتم بەچوار سەعات گەیشتمە بەرلین و چومە ماڵی کاک تەهاو کاک عمری مام تۆفیق وکاک جەباریش هاتبون بۆلام بۆ سەردان ئەو شەوەش ناخۆش نەبوو، لەشەوی ١٨-١٩/٥/١٩٩٦ لەگەڵ کاک برزو و کاک یوسف و کاک صلاح زۆر گەراین و وێنەی هەندێك شوێنمان گرت، لە٢٠/٥ لەگەڵ کاک فائیق و کاک مەنمی دا زۆر گەراین و چوینە بورجەکەی بەرلین کە (٢٦٤) مەتر بەرزە کاتی خۆی بروجی موخابەراتی ئەڵمانیای شەرقی یا روسیەکان بووە پاشان چوینە ماڵی کاک فائیق و شەو لەویّ بوین، لە٢١/٥ لەماڵی کاک فائیق بوین لەبەرلین و پاشان چوینە ماڵی کاک تەهاو لەوێشەوە چوینە فرۆکەخانەی بەرلین لەگەڵ کاک فائیق و کاک تەهاو کاک عمر پاڵەوان و کاک صلاح بۆ بەریّ کردنم هاتنە فرۆکەخانە لەسەعات (٨/٥٥) دەقیقە ترانزێتمان هەبوو لەسەعات (٣/١٠) دەقیقە بەکاتی ئەڵمانیا گەیشتینە فرۆکەخانەی دیمەشق لەسوریا کاک عبدالرزاق و کاک عمرو کاک بەهرۆز لەفرۆکەخانە چاوەرێیان دەکرد پاشان گەراینەوە بۆ شام، لە٢٢/٥ سەعات (٥)ی سەرلەبەیانی گەیشتینەوە بارەگای دیمەشق پێش نیوەرۆ برادەرانی مەکتەبی یەکێتی سەردانیان کردم و پاشان کاک شمس الدین موفتی سەردانی کردم هەروەها لەحزبە چەپەکان کاک شێخ موس و کاک مەلا ئەحمەد سەردانیان کردم قسەی دۆستانە کرا... هەرئەمرۆ منیش سەردانی کاک کەریم خان و کاک شێخ لەتیف م کرد کەلەحەج هاتبونەوە لەگەڵ کاک حسێن ئاغای سورکی ئەو گەرابوەوە بۆ کوردستان لەرێگای دهۆکەوە ئەوان لەشام مابونەوە، لە٢٣/٥ میوانێکی زۆر سەردانیان کردین لەدیمەشق، لە٢٤/٥ بۆ نیوەرۆکەی دەعوەت بوین لەماڵی کاک

عبدالرزاق لەگەڵ کاك کەریم خان و کاك شێخ لەتیف برادەرانی کەش لەوێ بون وەبۆ ئێوارەکەی دەعوەتی کاك دانا ئەحمەد مەجید بوین لەدیمەشق لەبارێکی خۆش دانیشتبوین ئەوان لەحەج هاتبونەوە و مەشروبیان دەخواردەوە بەلاّم من نەم دەخواردەوە ووتم ئێستا هەریەکێ بەشێوەیەك لەیەك تێ دەگەین قسەی زۆر خۆش و باسی جۆربەجۆر کرا، لەرۆژی ١٩٩٦/٥/٢٥ دەعوەتی کاك شمس الدین موفتی بوین لەگەڵ کاك کەریم خان و کاك شێخ لەتیف لەپێشتخانەی کەمال پاشان سەردانی سەفارەتی ئێرانم کرد لەدیمەشق، لە٥/٢٦ لەدیمەشق بوم کاك دکتۆر فوئاد جەلال سەردانی کردین کاك فەلاح و کاك ئاشتی لەوێ بون، لە٥/٢٧ وەفدێکی یەکێتی چوە صلاح الدین بۆ گفتوگۆ لەگەڵ پارتی دا کەبریتی بون لە (کاك دکتۆر فوئاد معصوم و کاك دکتۆر کەمال فوئادو کاك ئەرسەلان بایز ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و کاك عدنان موفتی ئەندامی سەرکردایەتی) بۆ کردنەوەی گفتوگۆو شکاندنی ئەو بن بەستەی هەبوو چونە صلاح الدین لەگەڵ مەکتەبی سیاسی پارتی دا کەبریتی بون لە(کاك سامی عبدالرحمن و کاك دکتۆر جرجیس حەسەن و کاك فرانسۆ هەریری و کاك فرسەت ئەحمەد) دانیشتن پارتی هیچ پێشوازیەکی وای لێنەکردن و زۆر ئەهەمیتەتی نەدانێ و شتێکی تازەشیان بەوەفدەکەش نەوت یەکێتی لای خۆیەوە بەدڵسۆزی بۆ مەسەلەکان دەرۆیشت و دەست پێشخەری دەکرد بەلاّم پارتی بەلاوازی یەکێتی هەڵی دەسەنگاند ئەو هەنگاوەی یەکێتی باشبوو بەلاّم ئەو هەوڵەی لەگەڵ پارتی لەگەڵ خەڵکی هەوڵی بدایە بۆ ئەوان سودی زیاتر دەبوو چونکە پارتی ئەو جۆرە کارانەی لەیەکێتی نەدەکری و زۆری کەش لەویابەتەی کرد یەکێتی بەلاّم پارتی هەر گوێ ی بۆنەگرت، لە٥/٢٨ سەردانی سەفارەتی ئەڵمانیامان کرد لەدیمەشق لەسەر وەزعەکان و پەیوەندی دوقۆڵی قسەمان کرد بۆ دوای نیوەرۆ چاوپێکەوتنمان هەبوو لەگەڵ رادیۆی (صوت العراق)

دا لەدیمەشق، لە٢٩/٥ سەردانی سەفارەتی فەرەنسامان کرد لەدیمەشق، لە٣٠/٥ سەردانی سەفارەتی دانیمارك و سوئیدمان کرد لەدیمەشق وەلەسەعات (٢)ی پاش نیوەرۆ دەعوەت بوین لەبارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی لەدیمەشق، لە٣١/٥ سەردانی ناوچەی پیشەسازی شام مان کردو نیوەرۆیش لای کاك ئاشتی بوین، لە١/٦/١٩٩٦ بەبۆنەی یادی (٢٠)ساڵەی یەکێتیەوە سەردانی بارەگای یەکێتیمان کرد لەدیمەشق بۆپیرۆزبایی، لە٢/٦ سەردانی سەفارەتی لیبیامان کرد لەدیمەشق سەفیرمان بینی و قسەمان کرد لەسەر مەسەلەکانی ئەوکاتەو پەیوەندی دووقۆڵی لیبیاو حزب، لە٣/٦ دەعوەت بوین لەسەفارەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەدیمەشق، لە٤/٦ سەردانی هەندێك جێگای کۆنمان کرد لەشام وێنەمان گرت، لە٥/٦ سەردانی هجرەت و جوازاتمان کرد بۆ تازە کردنەوەی خروجیەی پەساپۆرت بدەنێ لەبرامیکەی دیمەشق لەگەڵ کاك بەهرۆز ئەندامی علاقاتی حزب بەراستی زۆریان عەزیەت داین لەسەعات (٩)ی سەرلەبەیانی تا سەعات (١)ی پاش نیوەرۆ هێنایان و بردینان داوای دووسێ هەزار لیرەش بەرتیلیان دەکرد لەپۆلیسەکەی دەرگاوە بە (٢٠) لیرە تا عەمیدەکە بە(٥٠٠) لیرە داوایان دەکرد ئیشە کەیان دوا دەخستین زیاتر لە(١٠)جار سەرو خواریان پێ کردین لەو ژوور بۆئەو ژوورو هەریەکە بۆلای یەکێکی کەی دەناردین ئەوەیان لەقاتی پێنجەم بوو زۆر کابرایەکی فاسدو بێ قەدربوو دەیوت ئێستا جێ بەجێ ی دەکەم پاشان دەیوت ئێوە بۆ هاتون ئەو پەساپۆرتە بۆئێرانیە ئێوە حەقی گرتنتان هەیەو حەقە سجن بکرێن زۆر قسەی نابەجێ ی کرد نازانین حکومەت فاسدی ئیداری بووە نازانم حکومەتێکی وا ئەو حکومەتە بەو شێوەیە بروات و کاری بەرێوە بروات بەراستی دەڵێن ئاشی نەزان خوا دەیگێرێ ئەوانەش هەروایەو کەس دژیان نیە دائیرەکان وکار بەدەستانی حکومەت دەتوانی بەپارە هەموویشیان پێ بکەیت زۆر بەئاشکرا و بێ پەردەو بێ

شەرم کردن داوای بەرتیل دەکەن هەر ئیمزای دەکات دەڵێت مەساری تەنانەت یەك لیرەش وەردەگرن ئەگەر وابروات بێ چارەسەر ئاسان نیە درێژەدان بەو نیزامەو بەو شێوەیە لەهەموو دائیرەکان وایە نەك هەرلەلایەك معامەلە لەدوکان دەکەیت دەڵێن بە (٥٠)لیرە لەدوای معامەلەی لێ دەکەیتەوە دەڵێ بە(٢٥) لیرە یابە (٢٠)لیرە شتی راست ناڵێن تەکسی دزیت لێ دەکات پێت ئەڵێت عەداد لێ نادات عەدادیش (٥)لیرە زیاد هەرنەبوو دوولیرەت لێ وەردەگرێت ئەو رۆژە مەوعیدشمان هەبوو ئەوانیش زۆر دوایان خستین دەبوو تەوایشی بکەین لەبەر سەفەرمان زەرەرو عەزیەتیان دام وە لەسەعات (٣)ی پاش نیوەرۆی ٦/٥ حەرەکەی وفاقی ئیسلامی شێخ جەمال وەکیل سەردانی کردین و باسی پەیوەندی هەردوولاو معارەزەی عێراقی کرا، لە٦/٦ لەسەعات (٣)ی پاش نیوەرۆ کاك شمس الدین موفتی سەردانی کردین وەلەسەعات (٤) لەگەڵ کاك عبدالرزاق وکاك بەهرۆزوکاك عمرو کاك ئاشتی و کاك صلاح چوینە فرۆکەخانەی نێودەوڵەتی دیمەشق لەوێش هێڵی ئێران زۆر درەنگ بەرێ دەکەوت زۆرماندویان دەکردین لەسەعات (٧/٣٠) بەفرۆکەیەکی ئیرباس لەفرۆکەکانی عێراق بون لەشەری کەنداوی دووهەم بۆئێران هەڵهاتبون چونکە بۆیاخ کرابون لەژێریدا نوسرابوو خگوگ الجویە العراقیە (٧٥٠)کەسی لێ سواربوو بەڵام باری لەوە زیاتری لێ بارکرابوو بەدووسەعات ونیوگەیشتینە تەهران و لەوێش بۆسەعات (١٢) نەجاتمان بوو پاشان چوینە ئوتێل لەسەعات چوار بۆسەعات یەکی شەو (٩)سەعات دەبوو چاوەرێ بکەین و بوەستین جگەلە دووسەعات ونیوی رێگا ئەوەش هەرزۆری ماندو کردین لەسەعات (١١)وە کاك خەلیل و مامۆستا مەلاناصح لەفرۆکەخانەی تەهران چاوەرێیان دەکرد مامۆستا زۆر ماندوبیوو نەدەبوو ئەو بهاتایە کاك عەقید محی الدین لەپارتی پارێزگاران و کاك مەلا یاسین لەبزوتنەوەی ئیسلامی ئەوانیش بۆسالڕۆژی ئیمام لەتەهران بون،

له٦/٧ کاك ئاغامراد هات و دەعوەتی کردین وشەولای ئەو بوین، لە٦/٨ لەئوتێل ئەتڵەس بوین چوینە سەردانی برادەرانی بەرپرسانی ئێران... سەعات (٧) ئێوارە لەتەهران دەرچوین لەگەڵ مامۆستامەلا ناصح بەسەیارەی بچوك رێگاکە دورو ناخۆشبوو سەعات (٤/٣٠)ی سەرلەبەیانی گەیشتینە سنە، لە٦/٩ لەسنە بوین میوانمان هەبوو زۆریش ماندوبوین کاك سەلام گۆمەشینی وکاك سابیر فەقیانی لەوێبون، لە٦/١٠ کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ بەرپرسانی ئۆستانداری سنە ئێوارەش لای ئەوان دەعوەت بوین قسەلەسەر هاوکاری وزۆرشت کرا، لە٦/١١ لەسنە بوین برادەرانی گەرانەوە بۆ کوردستان من و کاك خەلیل لەوێ ماینەوە ئەو رۆژەش لەبازار زۆر گەراین، لە٦/١٢ هەرلەسنە بوین کۆبونەوەمان هەبوو لەسنە، لە٦/١٣ بۆیەکەمجار بناغەی مزگەوتی حسێنیە لەسلێمانی بۆ شیعەکان دانرا بەئامادەبونی مام جەلال و نوێنەری سەید حەکیم شێخ عەلی مولاناو نوێنەری هەموو حزبەکان و نوێنەری کۆماری ئیسلامی ئێران ئەوەش یەکێ بوو لەکارە بەپەلەکانی یەکێتی خۆباشە نەهێشتنی حەساسیەت لەنێوان ئەو دوو مەزهەبەدا بۆئیسلام بەڵام یەکێتی بۆکاری سیاسی یاباوەریان پێنیە چونکە ساڵێك پێش ئەوە شەریان دەکردن و ئێستا حسێنیە دروست دەکەن ئەوەش دەتوانێ بەزۆر شێوە تەحلیل بکرێت لەبەر ئێران ولەبەر سەید محمدباقرالحکیمە قسەیەکی خێریان لای ئێران بۆ بکات یاخود دور بینی یەکێتیە لەنەمانی صدام و رژێمی بەعس مجلیسی ئەعلا دەسەڵات لەعێراق دەگرێتە دەست بەشی زۆری ئەدات بە یەکێتی هەر خۆیان وحوا ئەزانێ بەڵام دە حسێنیە بکەنەوە بەئاسانی رای ئێران ناگۆرن، لە٦/١٤ لەسنەوە بەرێ کەوتین بۆ مەریوان و باشماغ و پێنجوێن و ناڵپارێزو لەسەرەوەی شانەدەریەوە لەچەمی دەلوجەوە بۆگوڵەخانە چوین، لە ٦/١٥ لەگوڵەخانە بوین میوانمان زۆرهەبوو، لە٦/١٦ چوینە گێڵەك پرسەی هاولاتی (تەها محمد ئەمین) کەپارتی

کوشـــتبویان بـــەبیانوی ئـــەوەی لایـــەنگری یەکێتیـــە خـــستبویانە دەریاچـــەی دەربەندیخانەوە دوای چەند ڕۆژ دۆزیانەوە پاشان چوینە کیشەدەری بۆپرسەیەی ژنێك بـە نـاوی فخریـە خێزانـی کـاك ئیراهیمـی محمـودی یـارۆیس کەزۆرخزمـەتی کردبوین لەڕۆژانی ناخۆشی و پێشمەرگایەتیدا پاشان چەند جێگای کەش گـەراین و سەردانی ماسۆستا مەلا عەلی مەسەکانمان کرد کەتەمەنی (١٢٨)ساڵ بـوو پیـاوێکی باش وقسە خۆش و لەسەرخۆ بوو زۆر سودمان لێ وەرگرت، لە٦/١٧ چوینە سـەراو وسواری و ەوانەکان کانی پانکەو بۆسلێمانی و بۆسـەر گـۆری شـەهید کـاك سـەلام رەوف (سەلامە سور) ئەندامی سەرکردایەتی کەشەهید ببوو من لەکوردستان نەبوم و لەوێش قسەم کرد لەسەر گۆرەکەی جەماوەرێکی زۆری حـزب لـەوێ کۆبوبونـەوە پاشان سەردانی ماڵ ودایکی وخێزانی مان کرد دلێر صالح مـیرزا بەئـەمری یـەکێتی شـەهیدیان کردبـو بـە ناحـەق دۆسـت وهاوپـەیمان وهاوسـەنگەرو هاوشـەر هـاو راگەیاندنی یەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان بـوین بـەلام سـاڵی ئەنـدامێکی کۆمیتـەی ناوەندی یا کادرێکی پێشکەوتوی حزبیان بە ناحەق شەهید ئەکرد جگـە لـە بردنـی کەسانی سەر بەحزب بەتەماح وپارە یائینشقاق دروست کردن لـە نـاو ئێمـەو حـزب دۆستەکانی خۆیان پێشان سەردانی ماڵی شەهید محمدو شـەهیدبەکرم کـرد کەلـەو مـاوە شـەهید ببـوون ئـەوکات گەرامـەوە مـاڵی خۆمـان، لـە٦/١٨ لەسـلێمانی بـوم بەبۆنەی گەرانەوەمان میوانمـان زۆرهـەبوو، لـە٦/١٩ هەرلەسـلێمانی بـوم، لـە٦/٢٠ هەرلەسلێمانی بوم میوانمان زۆرهەبوو مەجالم نەبوو، لە٦/٢١ مام جەلال تـەلـەفۆنی بۆکردم بۆبەخێرهاتنەوەو باسی سەفەرەکەمان کرد، لـە٦/٢٢ هەرلەسـلێمانی بـوم، لە٦/٢٣ سـەردانی لقـی سـلێمانیم کـردو پاشـان چـومە پرسـەی حـاجی قـادر بـرای مستەفا فەنی کەدووکوری شەهید بون، لە٦/٢٤ لەسلێمانی بوم کـاك شـێخ محمـود کارێزە سەردانی کردین هەروەها کاك محمـود کوێخـا ئیـسماعیل تـەلان و کۆمـەڵێك

هونەرمەند حاجی مەکی سەردانیان کردین لەسەرفلیمی شێخ محمود قسەمان کردو بەتەمای ئەوەبوون لەئێران و چەند جێگای کە عەرزی بکەن پاشان بەڕێ کەوتین بۆ هەولێرو چوینە پرسەی کاك حسێن ئاغای سورکی کەلەرۆژی ١٩٩٦/٦/١٦ پارتی چوە سەریان و شەهیدیان کرد لەگوندی کەڵەکین پاشان سەردانی کاك عمرئاغامان کردو قسەش لەسەر زۆر مەسەلەی کەش کرا لەوێ، لە٦/٢٥ کەرۆژی شەهیدانی حزب بوو جەماوەری حزب و کەسوکاری شەهیدان لەهۆڵی میدیای شاری هەولێر یادی شەهیدان کرایەوەو هەموو لایەنەکان بەشداربون من قسەم کردو پاشان لایەنەکان وتاری خۆیان خوێندەوە، لە٦/٢٦ لەمەکتەبی سیاسی بوم لەهەولێر میوانێکی زۆر هاتبون بۆسەردانمان قسە لەسەر زۆر روداو کرا، لە٦/٢٧ هەرلەهەولێرم وەفدێکی یەکێتی کەبریتی بون لە( کاك دکتۆر فوئاد معصوم وکاك مولازم عمر و مامۆستا چەتۆ حەوێزی) سەردانیان کردین، لە٦/٢٨ کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی هەبوو لەماڵی مامۆستامەلا ناصح لەعەینکاوا لەسەر سەفەرەکەو روداوەکانی ئەو ماوەیەو دانانی بەرنامەی نوێ و کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزب، لە٦/٢٩ لەهەولێر بوم کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی درێژەی هەبوو، لە٦/٣٠ لەمەکتەبی سیاسی بوین لەهەولێر کاك جەمال وەکیل لەویفاقی ئیسلامی سەردانی کردین پاشان کاك شێخ محمد شاکەلی و کاك عبدالرحمان گۆمەشینی و زۆری کۆمەڵایەتی یەکێتی سەردانیان کردین بەبۆنەی گەرانەوەمان بۆ کوردستان، لە١٩٩٦/٧/١ لەهەولێر بوین کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ خوێندکاران و لاوان لەسەربناغەی کارکردن و کۆنگرەیان قسەمان کرد، لە٧/٢ هەرلەهەولێر بوین حزبی وەتەنی تورکمان سەردانیان کردین و قسەلەسەر روداوەکانی ئەمرۆی کوردستان و عێراق کرا من سەیری وەزعەکانم دەکرد بەرەو ئاڵۆزی دەروات ئەو رۆژەی لای مام جەلال بوم ووتی ئێمە رێگای ئێرانمان پێ ناگیرێت بۆدیموکرات ئەوەش راست بوو

چونكه ماوەيەك بوو ئێرانيەكان مەرجيان لەسەر يەكێتى هەبوو بەلأم نەيان وت ئێران بەتەماى لێدانى كۆيەيە من وەزعەكانم بەخەتەر هاتە بەرچاو هەولّم دەدا هەندێك قسە لەگەلّ مام جەلال بكەم هەرێگاى وانەدەبوو ياخود پىّ دەچوو مام جەلال هەندێك شتى پىّ خۆش نەبێت وەمام جەلال حەزناكات گوىّ ى لەقسەى ناخۆش بێت يەكىّ لەمشكيلەكان بوو بەمام جەلالم ووت عێراق پەلامارتان ئەدات و قبولّ ناكات بارەگاى INC دانێن و تەقە لەمخمورو گوێرو ئەوانە بكات مام جەلال وتى ئەمريكا رێگا نادات و دواجار وتى لەگەلّ كاك كۆسرەت قسەبكە، رۆژى ٧/٢ رۆژى دەرچونى يەكەمەكان يادەرچوانى زانكۆى صلاح الدين بوو مام جەلال و كاك كۆسرەت وزۆرى كە برادەرانى ئێمەش لەوىّ بون قسەكراو ئاهەنگ سازكرابوو لەو رۆژانەدا يەكێتى هەندێك غرورى پێوە دياربوو، لە٧/٣ سەردانى مەكتەبى سياسى يەكگرتووى ئيسلامى مان كردو پاشان سەردانى مەكتەبى سياسى يەكێتيمان كردو پاشان سەردانى ئەنجومەنى وەزيرانمان كرد لەلاى كاك كۆسرەت كەپێشتريش بە(٦) مانگ ئەو مەسەلەيەم لەگەلّ باس كرد كەپارتى و عێراق پەلامارى هەولێر دەدەن ئەم جارەش باسم كردو وتم كاك كۆسرەت ئەو وەزعەى ئێستا هەيە لەهەولێردا نامێنىّ و پارتى و عێراق پەلامارى هەولێر ئەدەن پێش ئەوە هەرچى روبدات پێم باشە هەندێك هەنگاو بنێن بۆئەو مەسەلەيە بەكورتى و بەكوردى لاى عێراق خاوكەنەوە چونكە هەولێر لاى عێراق ببوە جێگاى هەموو دژەكانى عێراق...
ووتى عێراق چى دەكات ووتم عێراق هيچ ناكات ووتى خۆى وەزعى خراپە ووتم ئێوە داواى شتى لىّ ناكەن ئێوە وابكەن هاوكارى پارتى نەكات دژى ئێوە وتى عێراق ناتوانىّ لەبەر ئەمريكا بێتە ناو هەولێر بەلأم لەوانەيە بەتۆپ و كاتيۆشا لەدورەوە هاوكارى پارتى بكات ووتم غەمى ئێوەم نيە غەمى خۆشمانە بەبۆنەى ئێوەوە توش دەبين ووتى باشە چى بكەين ووتم ئاگادارى عێراق بكە ووتى تۆ

بۆنایکەیت ووتم من ناتوانم بڵێم ئەوە رەئی یەکێتییە کاك کۆسرەت وتی بلێ رەئی یەکێتیە ووتم باشە لەرێگای کەسێکەوە ئاگاداری عێراقم کرد راسپاردە بە شەفەوی کە ئێوە بۆ ئەوەندە دژی یەکێتین و یەکێتی ئامادەیە گفتوگۆو هاتوچۆتان بکات لەسەر زۆر مەسەلە قسە بکەن هەر ئەو رۆژەو دوورۆژ دوای ئەوە ئاگاداری منیان کردەوە بەنامەك ئامادەن و رەئی کاك کۆسرەت و مام جەلال بێت بۆ ئەوەی یەك ببینین من وەڵامەکەم دایەوە بەکاك کۆسرەت دەیوت نامەکە لەکوێ وەو چۆن و وادیاربوو باوەریان بەوە نەبوو عێراق دێنە هەولێرمن نامەکەی عێراقم دا بەکاك کۆسرەت نامەکەی خوێندەوەو کاك کۆسرەت وتی گەر حکومەتی عێراق لاواز نەبێت ئەو نامەیە نانوسێت وتی نامەکە لای من بێت وتم بانامەکە لای خۆم بێت پێش روداوەکان دووجارو جارێك لە١٩٩٦/٧/٣ پێم وت کاك کۆسرەت چەند جارێك لای مام جەلال باسم کرد کەئێوە مەسئولیاتی خەڵکی و ناوچە رزگار کراوەکانتان لەسەر شانە دەبێت بیپارێزن پاراستنی هەربەشەر نابێت وەمن زۆر جارباسم کرد بەلاّم ئەوان قەناعەتی خۆیان چۆن بوو وایان دەکرد، لە٧/٤ لەهەولێر بوین لەعەینکاوا کۆبونەوەی راگەیاندنی حزب هەبوو لەگەڵ نوێنەری راگەیاندنی کەرکوك و سلێمانی و هەولێرو دهۆك دا تەلەفزیۆن و رادیۆ و رۆژنامەو گۆڤاری حزب کاك ئاسۆ حەسەن لەرۆژنامەی رێبازبوو زۆرقسەمان لەسەر شێوەی راگەیاندن چۆن دەبێت و چۆن دەکرێت و شێوەی بەرنامەکان و شتی گشتی راگەیاندن، لە٧/٦ لەهەولێربوین سەردانی بارەگای حزبی شیوعی کوردستانمان کردو قسە لەسەر روداوەکان کران و باسی ئەوەش کرا وەزعەکان گەیشتوەتە بن بەست و هەوڵێك بدرێت بۆچارەسەری ئەوکات هەر (٧) حزبەکە هەبوو بۆئەو مەبەستە هەنگاوی دەنا لەهەمان رۆژ سەردانی مەکتەبی سیاسی پارتی کاری سەربەخۆمان کردلەشاری هەولێر قسەلەسەر روداوەکان کران پارتی کار زیاتر سەربەپارتی بون بەتایبەتی

دوای شەهید بونی محمد حەلاق لەلاین یەکێتیەوە لەسەر ئەوەی بە دەستی پارتی شەو ئار.بی. جییان لە ماڵی مام جەلال داوە لەشاری کۆیە جگە لەدەرکردنی سەیارەو مومتەلەکاتی پارتی لە سنوری یەکێتی کەئەوانە قابیل بەکوشتنی محمد حەلاق وهاورێکانی نەبون بەتایبەتی لە سەیتەرەکە مرۆڤ دڵنیایە لەخۆی بەڵام لە ئەسڵدا کوشتنی محمد حەلاق جگە لەو تەسەروفاتانەی تازەی دژی یەکێتی تۆڵەی کۆنیان لێ کردەوە چونکە لە شەری ناوخۆی ١٩٨٢لە شەری باداوان لای باقلان محمد حەلاق هاوکاری سۆسیالیستیان کرد لەوشەرەدا لەگەل محمدعەلی مامند شەماڵ و سەرباز ئەحمەدکۆیی وچەند کەسێکی کەش کوژران پارتی کار زیاتر حەزیان بەدۆستایەتی پەکەکەش دەکرد بەلام دووشتی لەیەك جیاواز پێکەوە نەدەگونجان پارتی دژی پەکەکە بون و ئەوانیش لەو نێوانەدا چەند جارێك توشی کێشە بون جارێك لە ئۆبسالە لەسوئید لە دانیشتنێکی دۆستانەدا کاك محمودی مەلا عیزەت و کاك صلاح الدين موهتەدی و زۆری کەش کاك رەفیق صابر پارتی کار بو پرسیاری لەمن کرد وەزعی پارتی کار چۆنە منیش راستیەکەم پێ وت ... وتم پارتی کار نابێت بە حزب هۆکانیم پێوت پێی ناخۆشبوو ، لە٧/٧ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزب دەستی پێکرد لەمەکتەبی سیاسی لەسەر رووداوەکانی نێوان دوو کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی حزب و ئەو وەزعانەی ئەمرۆدا جێگای باس بون و باسی سەفەری من بۆ دەرەوەو نەتائیجی و باسی هاوکاری پارتی و عێراق و شەری نێوان یەکێتی و پارتی نزیکە چونکە نزیك بونەوەی یەکێتی و کۆماری ئیسلامی ئێران زەختی ئێران دژی حزبەکانی کوردستانی ئێران مەسەلەکان گەیشتوەتە بن بەست و بەرەو شەرێکی کە دەروات یاوەجبەی سێهەمی شەرو وەرگرتنی چەك لەعێراق و تورکیاو مل نەدانە ئاشتی لەلایەن پارتیەوە و دروست کردنی کێشە بۆ حزب لەلایەن پارتیەوە یەکێتیش هیچ

هەنگاوێکی نەدەنا بەتایبەتی لەروی ئیداری بۆچارەسەری کێشەکان و چاوەرێ کردنی یەکێتی و خۆدانە دەستی قەدەرو بەرەو ئێران وعێراق ومەسلەحەتی دوو دەوڵەتە دەبنە شەرکەری ئەو دوو حکومەتەی عێراق وئێران بەو مەعنایەی بەرژەوەندی حزبەکانیانی تێدایە ئەوەش بەرەو کارەساتمان دەبات کارکردنی پارتی لەکوردستان و ولاتانی ناوچەکەو هاتوچۆی گەرم لەگەڵ عێراق و پاڵەپەستۆی ئێران لەسەر یەکێتی بۆ داخستنی مەسەلەی رادیۆی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەسنوری یەکێتی دا وەراکێشاندنی یەکێتی بۆهەندێك مەسەلە کەباوەری پێ نەبێت و نەبونی یاکەم بونی ئیمکانیەتی حزبی سۆسیالیست ئەوەش بوە هۆی ئەوەی نەتوانێ هێزێکی باش و پرچەك دروست بکات بۆهەر گۆرانێك و بریاردان لەسەر قورسایی حزب بۆ سورێن و دروست کردنەوەی مەقەراتی کەو چاك کردن و تەعمیر کردنی مەقەرە کۆنەکان و چەکی قورس و شتی زیادە بۆ ئەو سنورە و مەکتەبی سیاسی تەنها ناوەکەی بێت و قورسایی حزب لەسورێن بێت هەروەها مەقەری شێنێ چاك بکرێتەوەو برادەران هەندێکیان باسی دۆڵی بالیسان و سماقولیان دەکرد من ئەو جێگایانەم پێ باش نەبووبۆخۆ پاراستن وئیعتمادمان لەسەرخۆمان بێت و زۆرشتی لەوبابەتە لەو ماوەیەدا هەنگاوی بۆ بنێین و چارەسەری کەش بدۆزینەوە چونکە پارتی دڵنیا بون لەئەوەی بێنە ناو هەولێر یەکەم کەس پەلاماری حزبی سۆسیالیست دەدات بەهۆی کۆنە سۆسیالیستەکانەوەسیاسەتی هەڵەی یەکێتی لەچارەسەری مەسەلەکان و هەموو باوەرێکی بەتورکیا و ئەمریکابوو رەئی ئێران لەسەر ناوچەکەو لایەنەکان و رەئی عێراق و رەئی سوریاو رەئی تورکیاش هەموومان باس کردو رێگا لەگەشە کردنی حزب لەهەموو لایەك دەگیرێت مەجال نادرێت تائەوکاتەش هەر لەحاڵەتی ئیستسنائی دەژیان و باوەری تەواومان هەبوو کەئەو وەزعە بەو شێوەیە نامێنێ و

حزبەکانیش هەرلەنێوان هەردوولادا راوح دەکەن و بیّ ئەوەی شتێکی ئاشکرا باس بکەن ئەوەش هەرئاسان نیە ئێمە لەلای پارتی و بزوتنەوەی ئیسلامی بەلایەنگری یەکێتی باسمان دەکەن ولای یەکێتی بەهی ئێران و لەئێران بەلایەکی کە هەریەکە کۆمەڵێك راوبۆچونی هەبوو لەسەرمان ئەوانە هەموی روبەروی ئێمە بوەتەوەو بەلاّم بەدڵنیایەوە ئەوە هەموی دەلالەت لە بیّ لایەنی سیاسەتی راستە قینەی حزبمان ئەکات فراوان بونی حەجم و قەبارەی حزبی سۆسیالیست جێگای باس بوو وەلەسیّ مانگی داهاتودا چی بکەین و چۆن هەنگاوی عەمەلی بهاوێژین لەسەر روداوەکان و دابەش کردنەوەی ئیشوکاری حزب لەسەر ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی وبەپیّ ی دەنگی کۆنگرەی حزب کاك خەلیل سەعیدو کاك ئازاد صابرمان هێنایە کۆمیتەی ناوەندی بەپلەی ئیحتیات بەپیّ ی دەنگی کۆنگرە ئیشوکار بەسەر هەڤاڵانی کۆمیتەی ناوەندی دا دابەش کرایەوەو چاوخشاندنەوە بەرێکخستنەکانی حزب و هێزی پێشمەرگەدا لەسەعات (٣)ی پاش نیوەڕۆی ٧/٩ کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی کۆتایی پیّ هات و بەلاغی کۆتایی کۆبونەوەکەش دەرچوو... وەلەسەعات (٤)دا وەفدێکی یەکێتی سەردانیان کردین کەبریتی بون لە مام جەلال و کاك دکتۆر فوئاد معصوم و کاك مولازم عمر و کاك چەتۆحەوێزی دەربارەی گۆڕانەکانی ئەو رۆی کوردستان و عێراق و ناوچەکە قسەکراو باسی پەیوەندیی دووقۆڵی هەردوولاکرا، لە٧/١٠ لەهەولێربوین لەمەکتەبی سیاسی خەریکی ئیشوکاربوین، لە٧/١١ لەهەولێر بوین کاك دکتۆر ئەحمەد موسەوی سەردانی کردین لەسوریاوە هاتبوو وەهەر هەمان رۆژ دوای نیوەرۆ سەردانی ماڵی کاك شێخ لەتیف بەرزنجی مان کرد لەهەولێر، لە٧/١٢ سەردانی کاك قادر عەزیزو کاك دکتۆر ئەحمەد موسەوی مان کردلەهەولێر، لە٧/١٣ لەهەولێرەوە گەرامەوە بۆسلێمانی کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ وەفدێکی ئێران دا، لە٧/١٤ کاك دکتۆر ئەحمەد موسەوی و کاك عبدالخالق

زەنگەنە میوانمان بون لەسلێمانی بەتەمای سەفەری هەڵەبجەش بوون، لە٧/١٥ لەسلێمانی بوم و برادەرانمان نارد بۆسەیدصادق و هەڵەبجە و ناوچەی شارەزوور، لە٧/١٦ هەرلەسلێمانی بوم، لەرۆژان ١٧و٧/١٨ هەرلەسلێمانی بوم خەریکی بابەتی رۆژنامەی رێبازی ئازادی و بلاو کراوەی ناوخۆی حزب بوم، لە٧/١٩ لەبارەگای چوارباغ بوم لەسلێمانی خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوم، لە٧/٢٠ لەسلێمانیەوە بەرەو شارەزوور بەرێ کەوتم سەرەتا چومە لقی شارەزوورو پاشان چومە ناوگردان بۆپرسەیەك و پاشان چومە گوڵەخان، لە٧/٢١ لەگوڵەخانە بوم وەفدێکی مەکتەبی سیاسی بزوتنەوەی ئیسلامی بەسەرپەرشتی مامۆستا مەلا عەلی عبدالعزیز هاتنە گوڵەخانە بۆسەردان و قسەکردن لەسەر روداوەکان و پەیوەندی هەردوولاو وەزعی گشتی کوردستان، لە٧/٢٢ چومە گوندی بانی شار بۆ پرسەی حمە سعید حمە سور کوری حاجی عمر و ماڵی حاجی ئەحمەدخوا کەرەم بۆ پرسە ماوەیەك بوو نەحۆش بوو بەهۆی ئاوی پیسەوە لەوگوندە پاشان چومە تەپی سەفابۆلای عبدالکریم بۆ پرسەی کورەکەی و پاشان چومە تەپەسەرقوڵکە و پاشان بۆ گردی گۆو نیوەرۆیش چومە سەرای سوبحان ئاغا بۆماڵی کاك عەتا ئەوانەش هەمووی کاری کۆمەڵایەتی بوو دەبوو من برۆم و بەسەریان بکەمەوە لەوکاتەدا من قەرزاری جەماوەری کوردستان بوم کە لە(١٥) ساڵی پێشمەرگایەتی دا خزمەتیان کردبوم، لە٧/٢٣ لەسەراوەوە گەرامەوە بۆگوڵەخانە خەریکی چاك کردنی بارەگاکان و کاری ئەوناوە بوین لەسەر بریارەکانی کۆبونەوەی کۆمیتەی ناوەندی ئیحتیاتی خۆمان لەوسنورەو لەوێش لەگەڵ پارتی کێشەمان هەبوو لەو سنورە، لە٧/٢٤ هەر لەگوڵەخانە بوم، لە٧/٢٥ سەردانی مام جەلالم کردو لەسەر زۆرشت قسەمان کردوەکو هاتنی سوپای پاسداران بۆ سەر بارەگاکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەکۆیە بەلام باسی هاتنی سوپای ئێرانی نەکرد ئەوەی بە من وت ناتوانین

ڕێگا بگرین لەهێزی ئێرانی بۆناو کوردستان بۆ سەر معارەزەی کوردستانی ئێران یا حزبی دیموکرات ئەوڕۆژە جموجۆڵێکی نائاسایی لەسەر سنورەکان هەبوو بەتایبەتی سنوری پەروێزخان و باشماغ و حاجی عمران زیاتر لە سنوری باشماغەوە،

یادی یۆبیلی زێرینی پارتی ومەترسیەکانی یەکێتی

سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٩٩٦/٧/٢٦ برادەرانی خۆمان ئاگاداریان کردم کەسەیارەیەکی زۆر بەبارەوە لەمەریوان و لەقصری شیرین و لەپەروێزخانەوە بەرەو سەرسنوری باشماغ پێنجوێن و سەرسنوری پەروێزخان وبۆسەر سنوری حاجی عمران خانە وەستان و قەرارگای حەمزەو قەرارگای رەمەزان و سوپای پاسدارانیان لەگەڵ دایە ڕۆژی هەینی یان دانابوو کەسەر سنورەکان چۆڵەو خەڵکی کەمتر لێ بە.. سەعات (١٢)ی هەمان ڕۆژ وتیان لۆریەکی زۆر بەبارو لاندکرۆز بەچادر داپۆشراون تۆپ و کاتیۆشاو دۆشکاو زۆری تری لەسەرەو لەدەربەندیخان بەرەو عەربەت و سلێمانی و لەسەیدصادق گەیشتنە ناوشارو لە شەستیکەوە بۆ مەعەسکەر سەلام بەناوی باری مجلیسی ئەعلای ئیسلامیەوە بەراستی زۆرم لاسەیر بوو ئەگەر بریارێکی واهەیە سوپای ولاتێکی کە بۆکوردستان دەعوەت بکرێت نابێت یەکێتی ئاگادارمان بکات کەشتێکی واهەیە یائێران بلێت شتێکی وامان کردووە زۆرم لاناخۆش بوومن ڕۆژێ پێش ئەوە لای مام جەلال بوم زۆرقسەمان لەسەرڕوداوەکان کرد بەلام مام جەلال ئەومەسەلەیەی باس نەکرد سەعات (٣)ی پاش نیوەڕۆ لەبارەگاوە گەرامەوە بۆ ماڵەوە لەفلکەی سەرچنار یەك سەعات وەستاین بۆ ڕەدبونی لۆری بەبار داپۆشراوی ئێرانی مرور ڕێگای سەیارەی ئێمەیان گرت بەرەو مەعەسکەر سەلام و بەناوی گرتنی کەرکوکەوە هێزی بەدر بەلام سەیارەکان باریان تێدابوو سائیقەکان زۆریان لەتوابینەکانی سوپای عێراق لەشەر ئێران گرتبونی و

لەویٚ بەردرابون پێیان دەوتن تەوابین لاندگرۆزەرەکان پاسداربون نەك بەدر ئەو هێزەی لەوسنورە ئێمە تێبینی مان کردن سوپای پاسداران و قەرارگای حەمزەی ئێرانی بون بەتۆپ و راجیمەو زۆرشتی کەوە وەلەسنوری حاجی عمرانیشەوە وەجەیەك سەیارە لەوێشەوە هاتبون نزیکەی (١٥٠٠) کەس دەبرن ئەوەی گەیشتبونە مەعەسکەر سەلام و ئەوناوە یەکێتی سەرقالْ بون ترافیکی جادە سەیارەی پاسداران وقەرار گای حەمزەی سەیدی شوهەدا قەرارگای رەمەزان بە قیادەی سەردار ئەحمەدی کازمی ولەلایەن یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە کاك فەرەیدون عبدالقادر ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەگەلْ بەرپرسانی هێزەکەی ئێران دا بوو هێزی ئێران شەو چونە سلسلە چیای هەیبەت سولْتان و هەندێك بەپیادە بۆسنوری تەق تەق وادیاربوو خەبەر بەدیموکراتی ئێران درابوو کەشتێکی واهەیە کەدوایی ئێرانیەکان بەیەکێتیان دەزانی چونکە هاتنی ئەوهێزە بەوشێوە جەماوەرو هەموو لایەکی نارەحەت کرد.. لەسەعات (٦)ی سەرلەبەیانیەوە لەچیای هەبیەت سولْتانەوە بەتۆپ و راجیمە لەبارەگاکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەسەر جادەی تەق تەق کۆیە دراو هێزەکانی ئێران نوێنەری یەکێتی شیان لەسەر سنورەوە سەیارەی یەکێتی لەپێشیانەوە بوو تامەعەسکەر سەلام لەولاشەوە هەروا تاهەیبەت سولْتان و لەولاشەوە لای پارتیەوە هاتبون هێزی پاسداران بوو بۆیە لای حاجی عمرانەوە هاتبون بۆئەوەی نەلێن هەر یەکێتیە و بلێن پارتی تێدایەو ئاگاداربوە هەرچەندە پارتی رێگای لیٚ گرتبون لە گەرانەوەدا بەلاْم نەیتوانیبوو تاخەلیفان و دۆلْی بالیسان هاتبونە دۆلْیٚ سماقولی راجیمەیان دانابوو هەوالْ بەزویی گەیشت و لەهەولێریشەوە بەجیهاز ئاگاداریان کردم کەژن و منالْی دیموکراتی ئێران دووسیٚ هەزار کەس بەرێگادا بەپێی پەتی و شپرزەیی بەرەو هەولێر و بەردەمی (UN) و (٧) حزبەکەوئەو ناوە دوزۆن و شەر

گەرمەولەبارەگای حزبی دیموکرات دراوەو حزبی دیموکرات ئاگادار بووەو هەر ئێوارە بارەگاکانی چۆڵ کردووە بەڵام مقاوەمە هەیەو ئێستا ڕێگای نێوان سلێمانی هەولێر براوەو پاسدار چوەتە ناوشاری کۆیەو کۆنترۆڵی کردووەو سەیتەرەی داناوە لەهەموو لایەکەوە شەرو تەقە هەیەو راجیمەو تۆپ لەبارەگاکانیان دەداو ئاگری گرتووەو بەرپرسانی یەکێتی وسەردار کازمی بەرپرسی قەرارگای حەمزەو سەردار جەعفەری و زۆری کەیان لەسەر هەیبەت سوڵتان دان و لەگەڵ بەرپرسانی یەکێتیدا لەسەعات (٩)ی سەرلەبەیانی قەرارگا کەبارەگایان لەسلێمانی بوو تەلەفۆنیان کرد بۆ علاقات کەمن ببینن منیش پێم وتن ئێستا مەجال نیەو سەعات (١٠) وتیان کارەکە زۆر زەروریە لەسەعات (٩/٣٠)ی سەرلەبەیانی ١٩٩٦/٧/٢٨ لەچواریاغ بوم ئاغای محمردی فرهادی پێشتر دەمناسی لەقەرارگای رەمەزان بوو لەگەڵ (٤-٥) کەسدا وادیاربوو لەقەرارگای حەمزە بون بەزەوقێکی زۆرەوە هاتن وتیان سەردار کازمی و سەردار جەعفەری وسەدارمجیدی سلاویان هەیەو خۆیان مەجالیان نەبووەو منیان ناردووە ئەم بەیانیە سەعات (٦) لەبارەگاکانی حزبی دیموکراتمان داوەو هەموان دەرکردون لەناوچەکەو مەبەستمان گرتنیان نەبووە تەنها لێدانیان و سوتاندنی بارەگاکاینان و زەربە لێدانیان لەشکری دوکانی یەکێتی نیشتمانی و کاك فەرەیدون عبدالقادریش لەوێن و ئێمە هاتوین ئاگادارتان بکەین بەیان دەرنەکەن و ئیدانەی ئێران ویەکێتی بکەن ئەگەر کاری وابکەن ئەوە دوژمنایەتی ئێران و یەکێتی نیشتمانی ئەکەن ئێوە دۆستی ئێمەن هەر لایەکی کە دەری بکات گرنگ نیە بەمەرجێك ئێوە بەیان دەرنەکەن لەسەرمان هەروەها وتی پارتیش هاوکاری کردوین و هێزێکمان لەرێگای پارتیەوە هاتووە پێم ووت پارتی بەیان دەرناکات ووتی نا ووتم دەری دەکات و باشترین بەڵگەش بۆپارتی ئێوەو یەکێتی زەرەرتان کرد لەم کارەتان ئێوە هەر ئەوەندە سودتان لێ وەرگرت کەچۆن تورك دێتە کوردستان

ئێوەش دەتوانن دەستان بگاتە معارەزەی خۆتـان بەدونیای بسەلمێنن کەکورد هاوکاریتان دەکات و نفوستان هەیە جگە لەوە سودتان وەرنەگرتووە وەلەهەندێك رووەوە زەرەرتـان کـردووە وەدڵنیـاش بـە پـارتی بـەیان دەردەکـات دژی ئەوکارەوهـەرگیز شـتی وا بۆپـارتی رێـك ناکـەوێ و زۆرهـەنگاوی کـەش دەنێـت برادەرانی خۆمان و ئێرانیەکانیش دەزانن رەئیەکانی من چۆن بوو لەسەر ئەو هاتنە بەوانم ووت یەکێتی ئەوەندە ئیسفادە دەکات مەگەر لەوفیشەك و چەکانەی هەندێك مایەوە بەجێ بلێن بۆیان لەوە زیاتر سودیان دەست ناکەوێت یەکێتی... پێم وتـن باشە ئێمە بەیان دەرناکەین و ئەوان رۆیشتن و منیش لەسەعات (١٢) رۆیشتمەوە بۆمەقەری تایبەتی خۆم بەگەیشتنی من وەفدێکی ئیتلاعات هاتن و ئەوانیش هەربۆ ئەوە هاتبون بەیان دەرنەکەین چونکە سۆسیالیست بەیانی دەرنەکردایە ئەوە هیچ حزبێك نەیدەوێرا ئەو کارە بکات وەئەگەر سۆسیالیست بکردایە ئەوە هەمووی بەیانی دەرنەکرد پێ دەچوو تەکلیف کرابون یالەلای یەکێتی نیشتمانیەوە داوایان لێ کرابوو ئاگاداری ئێمە بکەن ئەوانیش هەمان قسەوپاشان وتیان پارتیش رازی بووە بەهاوکاری ئەوانیش کراوە ئەو عەمەلیاتە دژی دیموکرات هێزێکمان لەحاجی عمرانەوە هاتووە من پێم ووتن پارتی بەیان دەرناکات وتیان نا ووتم دەری دەکات ووتیان ئاگادارمان کردون دەری نەکەن و خۆشیان بەشداربون و بەیان دەرناکەن ووتم ئەگەر دەریانکرد وتیان ئەگەر دەری بکەن رەدی توندمان دەبێت لەسەریان هەروەها وتبان ئەگەر پارتی بەیان لەسەر ئەو مەسەلەیە دەرنەکات ئەوە ئەیانەوێ لەگەڵ یەکێتی رێکەوێ بەلام من پێم وتن ئەوە بەئێوە دەڵێم یەکێتی توشی کێشە دەبێت لەهەموو رویەکەوە ئێوە توشتان کردووەو دوای لەبیریان مەکەن و بەجێیان بهێڵن قسەکانمان تەواو نەکردبوو ئەوکات رادیۆی پارتی سەعات (١/٣٠)ی پاش نیوەرۆ هەبوو وتمان رادیۆی پارتی بگرن برادەرانی ئێرانی هەرلەسەر قسەی خۆیان

سوربون مەکتەبی سیاسی پارتی لەسەر تەجاوزی پاسداران و داگیرکەری ئێران بۆسەر کوردستان و حزبی دیموکرات کردی بەهەراو فرمێسکی بۆئەرشت بۆیەکێتی خاکی عێراق و هەرەشە لەسەر دابەش کردنی عێراق و بۆحزبی دیموکرات و بۆخەڵکی عێراق و معارەزەی ئێران کە پارتی هیچ باوەری پێ نەبوو وەدژی کۆماری ئیسلامی وداوای لە (UN) و دونیاو ئەمریکاو هەموو رای گشتی کرد من بەش بەحاڵی خۆم بەیانەکەی پارتیم پێ باشبوو نەك بەو شێوەیەی پارتی ...
پارتی حەقی خۆی بوو دوژمنەکەی توشی ئەو کێشەیە بەهێنانی هێزی ئێران بێت و دەبێت سودی لێ وەربگرێ بۆ خۆی ئەگەر ئەو فرسەتە لەدەست بدات زەرەرەکە خۆی دەیکات بەئێرانیەکانم ووت ئێستاچی دەڵێن وتیان نازانین بەڵام بێ وەلام نابێت حزبی دیموکرات لەهەموو دونیا باسی کردووە ئەوە حەقی خۆیانە هەرچی بکەن و بڵێن بەلام ئەوەی لەجێ ی خۆی نەبوو ئەوەی باوەری پێ نەبوو ئەوەی فرمێسکی بۆدەرشت و لەسەریەکێتی کردی بەهەراو هاندانی دەزگای راگەیاندنەکان و هەندێك حزبی ژێر دەسەلاتی خۆی دژی یەکێتی وئێران زۆری حزبەکان و لیژنەی هاوکاری (٧) حزبەکەش بەیانێکیان دەرکرد لەوبارەیەوە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئاگاداری هێزی ئێرانی کرد بەپەلە کوردستان چۆڵ بکات مجلیسی ئەمن هەمان داوای کرد بەپەلە هێزەکانی ئێران کوردستان چۆڵ بکەن ..گەرانەوەی هێزەکەی ئێران لەحاجی عمرانەوە هاتبون لەجێگای خۆیانەوە گەرابونەوە لەخەلیفان پارتی رێگای لێ گرتبون ورێگای نەدابون لەحاجی عمرانەوە بگەرێنەوە لەوانەی قەرارگای رەمەزانیان دابوو جیهازەکانیان لێ سەندبون و قسەی زۆرو ئیهانەیان کردبون و گەراندبویانەوە لەرانیەو کێلێ وە بۆسەردەشت گەرابونەوە هەمان رۆژ لەبەحرکەش لای هەولێر لەبارەگای دیموکرات درابوو وەلەساعات (٦)ی ئێوارە هێزەکانی ئێران کەهەموی لەسنوری (١٥٠٠) کەس دەبون گەرانەوەو چەکە

قورسەکانشیان لەگەڵ خۆیان بردەوە لەقوڵی پێنجوێن و دەربەندیخان و سەردەشتەوە زەرەر لەبارەگای حزبی دیموکرات کەوت بەڵام دیموکرات لەروی مرۆڤایەتی و سیاسی و راگەیاندنەوە سودی وەرگرت و بێ دەنگی دیموکرات بۆماوەیەك جارێکی کە کەوتەوە سەر مانشێتی رۆژنامەکان و سەروتاری رادیۆکانی جیهان و پشتیوانی جەماوەری و لایەنەکان واتە زەرەرمەندی یەکەم من هەر لەسەرەتاوە باسم کرد یەکێتی نیشتمانی و پاشان ئێران بوو ئەوەش سودی یەکەمی پێ دەگات حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەو پارتیش بەکاری دەهێنێ بۆمەبەستی تایبەتی خۆی پارتی دوو هەنگی لەدارێکدا دۆزیوەتەوە ئەو یەکێتیەی دژی ئێرانی ئاخوندو تومەتی پاڵی سۆسیالیست ئەداو یابەپارتی دەوت کوردی ئێران دەکوژن و پاسدارموقەت ئێستا خۆیان بە بەرچاوی جەماوەری کوردستان و سەدان هەزارکەسی شارەکانی سلێمانی و کوردستان هێزی پاسدارانی ئێرانی بۆ سەر بارەگاکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەکۆیە هێنا بۆ شکاندنی پارتی و هارکاری ئێران دژی پارتی ئەو پەنا بردنە زۆر کارێکی خراپ بوو بەتایبەتی هێزێکی وەکو یەکێتی و زۆرشتی لەدەست دا لەمێژو خەبات و بەرنامەی خۆی پارتی وەکوهێزێکی دوژمنی یەکێتی نیشتمانی حەقی خۆی بولەوە زیاتریش دژی یەکێتی بکات فرسەتێکی زێرین بودەستی پارتی کەتبو ئەگەر ئەوە لەدەستی خۆی بدات مانای وایەلەسیاسەت شارەزانیە بەڵام یەکێتی لە دوای راپەرینی ئازاری ۱۹۹۱وەلە سیاسەتی ئەقلیمی سەری دەر نەدەکرد چونکە بە دەستی وڵاتانی ئەقلیمەوە گیرۆدە ببوو لەساڵی ۱۹۹۵پارتی توانی قەناعەت بە ئێران بکات هاوکاری پارتی کرد تۆپی ئێران لە هەڵەبجەو قەڵادزەو یەکێتی ئەدا هێزی پارتی لە نێوان حاجی عمران هەڵەبجەدا هاتوچۆی پێ ئەکرد بەناو شارو شارۆچکە کانی کۆماری ئیسلامیدا لەهەرلایەك بیویستایە هێزی پارتی لەهەڵەبجەرە دەبردە

پێنجوێن پارتی تاناڵپاریزی گرت هەرەشەی لە قەڵاجۆلان ئەکرد، لە ١٩٩٦/٨/٣١دا پارتی توانی سوپای عێراقی بهێنێتە هەولێرو یەکێتی دەربکات لەکوردستانەوە دەری بنێ تاسەر سنوری ئێران یەکێتی راونا لە١٩٩٧دا پارتی توانی قەناعەت بەتورکیا بکات هێزو دەبابەو فرۆکەی ئێف ١٦ ی تورکی وجەندرمەی تورکی بهێنێتە سماقولی وقەناعەت بەئەمریکا بکات دژی هاتنی تورکیا نەبێت وقەناعەت بە ئەمریکا بکات نەك هەر بێ دەنگ بێت لە هێنانی سوپای عێراقی لەلایەن پارتیەوە بۆ هەولێر بەڵکو چرای سەوزیشی پیشاندا کە بەئاسانی یەکێتی دەربکات بەلام بۆ چەند سەعاتێك جەیشی ئێرانی کۆشکی سپی و رێکخراری نەتەوە یەگرتوەکانً ومجلیسی ئەمنی نێودەولەتی بەیانیان دەرکرد ئینزاری ئێران کرا بەزویی کوردستان یاخاکی عێراق چۆڵ بکات ئەمانە یەکێتی نەیتوانی وە قەناعەت بەو دەولەتانە بکات شەری نەکەن پارتی قەناعەتی کرد بەو دەولەتانە شەر بۆ پارتی بکەن دژی یەکێتی من ئەم پرسیارە بۆ خوێنەر بەجێ دەهێڵم ئایە قسەی یەکێتیە خیانەتە پارتی کردویەتی یا یاخود سەردەرنەکردنی یەکێتیە لە سیاسەتی ئەقلیمی و نێودەولەتیە یاهێزێکی وەکو یەکێتی لەکوردستان وەدەربنرێت کام سیاسەتە کەپارتی رازی نەبو یەکێتی لەسەر سنورکانیش بێت بە ئیرانی دەوت ١٠٠کیلۆمەتر لەقولایی خاکی ئێراندا نەبێت پارتی قبول ناکات بەراجیمەش لەماڵەکانی ئۆردوگای سەیران بەنی لای بانە ئەدا بۆیە من رام وایە سەر دەرنەکردنی یەکێتیە زیاتر لەوەی یەکێتی بەپارتی ئەڵێت خیانەتە ،

لە١٩٩٦/٧/٢٨ لەسلێمانی بوین هەندێك پاشماوەی سەیارەی سوپای پاسداران ئێرانی مابونً دەگەرانەوەو هەندێك هێزی پاسداران لەناو کۆیە مابون ئەوانیش گەرانەوەو چۆڵیان کرد بەلام هێزی زۆرو سەیارەکانیان هەر رۆژی پێشوو گەرانەوە لەشکری دوکانی یەکێتیش لەسەعات (١٢)ی٧/٢٨ لەگەڵ پاشماوەی پاسداران

مـابون لەهەیبـەت سـولێتانەوە بـەرەو دوکـان لەگـەڵ کـاك فەرەیـدون عبـدالقادردا، گەرانـەوە ،لـە٧/٢٩ دواکەسـی ئێرانیـەکان لەکوردسـتان گەرانـەوە ئێـران پـارتیش هەموو دونیایان لیٚ ئاگادارو معـارەزەی ئێرانـی بـەحزبی دیموکراتیـشەوە لەهـەموو دونیا زۆر ئەوهێزەی ئێرانیان گـەورە کردبـوو لەحـەجمی خـۆی زیـاتر لـەو شـەوانە تەلەفزیۆنی ئێمە بەلای ئـەو هەوالانـەدا نەچـون بـەلاّم بـەیانی حـزب کەشـتێك بـلاّو کرابوەوە تەلەفۆن کرابوو وتبویان ئـەوە لەهـەموو دنیـا هەرایـەو دنیـا وێـران بـووە ئێوە ئاگاتان لـەو هەرایـە نیـە ئێمـە بلاّومـان نـەکردەوە بـەلاّم لای خۆمـان رەئـی خۆمـان دەوت کەهەنـدێك لەمەسـئولەکانیان تـا ٧/٣٠ هـەرمابون بـەپیٚ ی هـەواڵ لەهەندێك رەبایـەی دیمـوکرات پێشمەرگەی یـەکێتی چوبونە نـاو رەبایـەکان و لای دۆشکاکانیان بۆدووحاڵەت بۆئەوەی ئێران نەرواتـە سـەریان و وەهـەم ئـەوان تەقـە لەسەرجادەو هێزی ئێـران نەکـەن نـەئێران چـوە سـەر رەبایـەکانیان و نەئـەوانیش لەسـەر مەکتـەبی سیاسـیان تەقـەیان کـردو هـەروا بۆخـۆی مابونـەوە، لـە٧/٣٠ لەسلێمانی بوم سەرقاڵی ئیشوکاری رۆژانـەبوین، لـە٧/٣١ جـەماوەری شـارو زۆری کـەش بێـزاری ئـەو وەزعـە بـون، لـە١٩٩٦/٨/١ لەسـلێمانی بـوم بـەریٚ کـەوتین بۆهەڵەبجەی شەهید کۆبونەوەی هەردوو مەکتـەبی سیاسـی حزبـی سۆسیالیـست و بزوتنـەوەی ئیـسلامی هـەبوو بـەپێی بریاری پێشوولەمەکتەبی سیاسـی بزوتنـەوە لەهەڵەبجـەی شـەهید کۆبونـەوە دەسـتی پێکـرد لەسـەر پەیوەنـدی دووقـۆڵی و تازەکردنەوەی پەرلەمان چونکە پەرلەمان نەماوەو لەسـەر بەشـداربون لەحکومـەت لەگەڵ پارتی ویـەکێتی و لەسـەر نـاردنی وەفـدی هاوبـەش بـۆئێران بـەر لەئـەوەش پێشنیاریان کرددەسـەلاّتی پـارتی کـەم بکەینـەوە لـەو سـنورە یاجوابـان بکـەین وبرۆنەوە سنوری هەولێرو دەست گرتن بەسـەر پێنجوێن و هەڵەبجـەو سەیدصـادق ودەست گرتن بەسەر گومرکەکانداوداناني حکومەت لەوسنورە یـاخود دامەزرانـدنی

حکومـەتێك لـە هەڵەبجـە لـەدوای ئـازاد کردنـی پێنجـوێن لەیـەك دانـەوەی لەگـەڵ سیدصـادق ونالپـارێز بـۆ بزوتنەوەوسۆسیالیـست منـیش وتم باشـە بـەلام حـاجی عمرانـشی تێـدابێت ئەگـەر لێـرە یـەکێتی بـەبێ شـەر ئـەو ناوچـەی پێنجـوێن و سەیدصادقی دا بەئێمە بۆشەر بکەین لەپێشا قسەیان لەگەڵ بکەین ئێوەش لەپێشا قسە لەگەڵ پارتی بکەن حاجی عمران وچۆمان و گلاڵـە تادیانـە واز لـێ بهێـنن بـۆ سۆسیالیـست و بزوتنـەوە ئـەوکات بەقـسەچۆلیان کـرد باشـە نـەیان کـرد بـەزۆر و بەشـەر دەریـان بکـەین پێیـان چـۆڵ دەکـەین وئێـرانیش پێـشنیاریان کـردووە کەبزوتنـەوەو سۆسیالیـست ئـەو کـارە بکـەن سەرسـنورەکان هـەموی ئـەوان دەیپـارێزن لـە تەوێڵـەوە بـۆ کێلەشـین وەعـدیان داوە هاوکاریمـان دەکـەن ئـەوان دەیـانوت بەشـەر پـەلاماری پێنجـوێن و سەیدصـادق بـدەن مـن ووتم ئەگـەر ئـەوان شەرمان نەکەن بۆ ئێمە شەریان بکەین مامۆستا مەلا عەلی وتی پارتی قبوڵ ناکـات ووتم باشە ئەوان قبوڵ ناکەن خوا ئێمەی بۆگیانی یـەکێتی دروسـت نـەکردووە کـاك مـەلا ئەحمـەد وتـی یـەکێتی زاڵمـە و زاڵـم لـەقورئان دەفـەرمێت شـەری بکـەیت لەئەنجامـدا لەسـەر ئـەوە پێـك نـەهاتن بـەلام ئـەوان دەیـانوت باهێزەکـانی ئێمـە لەقەلادزەو گلاڵەو جێگاکانی کەوە بێتە ئـەم ناوچـەیەو پێکـەوە هێزێکـی هاوبـەش دروست بکەین وردە وردە دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرین ئەوان وەعدی تـەواویان لەئێران وەرگرتبوو لەگەڵ ئێمەش قسەیان کرد حاجی ئاغای محمدی دەیوت بـڕۆن لەگەڵ یەکێتی ببیرنەوە ئیدارەی ئیتلاعاتیش هەر رەئی وابوو بریـاری ئـەوەمان دا هەزار پێشمەرگەی هاوبەش دروست بکـەین دەیـانوت ئەگـەر یـەکێتی هێرشـی کـرد رێگای نەدەین وتمان ئەگەر پارتی هێرشی کرد وتیان حـەقمان نیـە ئێمـەش وتمـان هێز لەگامێش تەپە دادەنێین ئەگەر پارتی هێـرش بکـات بالەپێـشەوە لەگـەڵ ئێمـە توشی شەر نەبین تۆ لەگردەنازێ ئەو بپارێزین ئەوە واقیـع نیـە لەسـەر ئـەوە پێـك

هاتین ئێمە رێگا نەدەین یەکێتی هێرش بکات وئەوانیش رێگا نەدەن پارتی هێرش بکات نێوان سەیدصادق و هەڵەبجەدا لەسەر گومرك هەندێك پێك هاتین کەپارەی ئەو سێ مانگەی رابردومان بۆ رەد بکەنەوەو نوێنەرمان لەهەموو خاڵەکان هەبێت و بیر لەوە بکەینەوە لەکۆبونەویەکی کەدا بۆمەسەلەی پێنجوێن و سەیدصادق وحاجی عمران ودیانەش باس بکەین ئەو رۆژە ماندوبوین مامۆستا مەلا عوسمان یشمان دی ر قسەمان کرد بە(٦) سەعات کۆبونەوە ئەوکاتە گەیشتینە ئەوەی لەسەر هەندێك خاڵ رێك بکەوین و مەحزەر ئیمزا بکەین داوایان دەکرد بۆسۆسیالیست قائیمقامی وەرگرتووە یەکێتی قائیمقامی داوینەتێ وەرمان گرتووە لەیەکێتی کاتی خۆشی پارتی پێ ی وتین ئێمەش وتمان ئێوەش قائیمقامی زاخۆمان بدەنێ وەری دەگرین وتیان جا زاخۆ بدەین بۆ بەئێوە دەیدەین بۆبزوتنەوە لەئێوە موستەحەق ترو دڵسۆزترن بۆپارتی کاك فرانسۆو برادەرانی کەیان لەصلاح الدین باسیان کرد پاشان ئێمە شەو گەراینەوە بۆسلێمانی، لە٢/٨ لەسلێمانی بوم دوای نیوەرۆ سەردانی کاك شەوکەت حاجی مشیرم کرد کاك محمود سەنگاوی و کاك شێخ جەعفەریش لەوێ بون پاشان هەندێك بەسەیارە گەراین رۆژی هەینی بوو خەڵکی زۆر چوبونە دەرەوەی شار بیرم لەوە دەکردەوە کە(١٥) ساڵ لەوشاخە بوین ئەو جەماوەرە هەروەکو ئەمرۆ دەچونە سەیران وگەرانی قلیاسان و باخی بەختیاری و دەوروبەری شار و دوکان و زۆر شوێنی کەش لەکاتی ئێمە غەممان دەخوارد لەوشاخە شەورۆژمان هەراسان بوو ئەمانیش لەژێر دەستی بەعس دا بون هەروا دەرۆیشتن و هەندێکیان منەتیان بەسەرمان دەکرد لەخەفەتە خواردویەتیەوە لەبەر پێشمەرگەو کورد نەبێت بۆ دەخواتەوە کاك شەوت لەیەکێتی ومام جەلال عاجزببوو مام جەلال قسەی پێ وتبو چەند مانگێك بوداوای چاوپێکەوتنی مام جەلالی کردبو نەیان دەدی هەموو مسئولیاتیان لێوەرگرتبووەوە

پارەی حمایەکانیان بری بو لەوخانووەی لای مزگەوتی حاجی جمال دابو ماوەیەك نوسینگەی پەرلەمان بوپێیان وتبوچۆلی بکات کاك شەوکەت داوای کردکێشەیەکی وای هەیە لەگەلْ من وەکو رەفیق و خزم باسی بکەین وبریاری داوە وازلەیەکێتی بهێنی ناردویەتی بەدوای خزمەکانی دا بییان نیرێت بۆلای مامۆستا مەلاعەلی عبدوالعزیز کە دەیەوێت وەکو هاولاَتیەك بڕواتەوە تەپی سەفا لەگەلْ پارتی یش قسە بکات وەکوهاولاَتی سەیری بکەن کەس وکاری لەسەر یەکێتی نەگیریْ خۆشی برواتەوە دەرەوە بۆبەریتانیا لای منالەکانی منیش هاوکاری ورێنمای بکەم من زۆرم پیْ ناخۆشبوو زۆرقسەم لەگەلْ کرد لەحدودی ٢مانگ نەم هێشت بە هیچ لایەکدا بروات من لەسەر ئەومەسەلەیە نامەیەکیم بۆ مام جەلال نوسی و مام جەلال وەلاَمی نامەکەی دایەوە لەسەر کاك شەوکەت ئیجابی بو وتی کەهاتی قسەی لەسەرئەکەین من نەم هێشت کاك شەوکەت هیچ بریارێك بدات تائەو ٢-٣ مانگە مام جەلال قەناعەتی کرد ئاشتی بکاتەوەوسەفەر بکات ودوایش ئیشی بداتیْ بەلاَم ئەوماوەیە جێم نە هێشت، لە٨/٣ یادی لەدایك بونی پێغەمبەری ئیسلام محمد (د.خ) ئاهەنگێکمان ساز کرد لەمالی خۆمان لەسلێمانی نزیکەی (٣٠٠) کەسمان دەعوەت کرد لەمامۆستایان و پیاوانی شارو لایەنەکان و ئێرانیەکانیش لەویْ بون، لە٨/٤ لەسلێمانیەوە چومە هەولێر لەوکاتەدا یادی سالرۆژی حزب نزیك بوو خەریکی ئیشوکارەکان وخۆ ئامادە کردن بوین بۆ یادی حزب، لە٨/٥لەهەولێر بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوین، لە٨/٦لەهەولێر بوم کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی مان هەبوو لەسەر روداوەکان و وەزعە ئالۆزەکانی کوردستان و کۆبونەوەی بزوتنەوەی ئیسلامی و بەرنامەی داهاتوو یادی حزب لەهەولێر بکەینەوە هەروەها لەسلێمانیش بکرێتەوە و هەرلقەیش لەسنوری خۆی بیکاتەوە هەروەها باسی هێرشی پارتی بۆکەلەکن و ئالۆزی پەیوەندی پارتی و (٧) حزبەکەو هاتنی سوپای پاسداران بۆ

سـەر مەقـەراتی دیمـوکرات لەکۆیـەو زۆرباسـی کـە لەکۆبونەوەکـە کـرا هـەروەها کۆبونـەوەی مەکتـەبی سیاسـی تەئکیـدی کـردەوە لەسـەر بـەهێز کردنـی ناوچـەی سورێن و میری سوروئیحتیاتی خۆمان بکەین لەزۆر روەوەو هەولێش بدەین لەگـەڵ یـەکێتی دا قـسە بکـەین لەسـەر ئـەو پـارە ئـاڵۆزەی کوردسـتان و دور خـستنەوەی شـتومەکی زیادمـان بۆبنـاری سـورێن، ٨/٧ هەرلەهـەولێر بـوم خـەریکی ئیـشوکارو خۆمادە کردن بوین بۆ یـادی حـزب، لـە١٩٩٦/٨/٨ یـادی (٢٠)سـاڵەی دامەزرانـدنی حزبی سۆسیالیـست لـە لـەهۆڵی میدیا لەشـاری هـەولێر جـەماوەرێکی زۆری حـزب کۆبونەوە لەئەندام و دۆست و لایەنگرانی حزب و کەسوکاری شەهیدان و دەعـوەتی لایەنە سیاسـیەکان کرابـون و بـە وتـارو بروسـکە بەشداریان کـرد دوای کردنـەوەی ئاهەنگەکە بەدەقیقەیەك وەسـتان بۆگیـانی شـەهیدان و بـەخێرهاتنی میوانـەکان و لایەنە سیاسیەکان و سەرۆکی حکومەت و وەزیروکاربەدەستانی حکومەتی هـەرێمی کوردستان بەسرودی سۆسیالیستێن ناتوێینەوە دەستی پێکردو پاشـان مـن قـسەم کرد بەبۆنەی (٢٠)سـاڵ تەمـەنی پرلەخـەباتی حزبـی سۆسیالیـستەوە پاشـان کـاك کۆسرەت قسەی کرد بـەناوی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتانەوە قـسەی زۆر باشـی کردو ئاماژدی بۆمێژوی پر سەروەری حزبـی سۆسیالیـست و ئـەو هـەموو شـەهیدە کـردو ئیـشارەتی بـەوەدا کـەحزبی سۆسیالیـست حزبێکـی سیاسـی و جەماوەریـەو لەگـەڵ واقیعەکـەدا مامەڵـە دەکـات ئەگـەر خـاوەنی جـەماوەرو رەگ وریـشەی دانەکوتایـە بەئاسـانی سـەر نەدەکـەوت بەسـەر ئەوکۆسـپانەی هاتوەتـە رێگـای کۆمەڵێك کادری لەناو سـەرکردایەتی یـەکێتی و کۆمـەڵێك لەسـەرکردایەتی پـارتی و کۆمـەڵێك شـەهیدو حزبـی زەحمەتکێـشانی کوردسـتانی لـێ جیابوەتـەوە بـەڵام ئێستاش خاوەنی جەماوەری خۆی وسەدان کادرو هەزاران لایەنگری هەیە لەهـەموو شوێنێکی ئەو کوردستانەدا قسەکانی کـاك کۆسـرەت زۆر واقیعانـەو دڵسۆزانە بـوو

لەوکاتەدا بۆحزب پاشان کاك ئەحمەد عوینە لەحزبی شیوعی کوردستان بەناوی لیژنەی هاریکاری (٧)حزبی کوردستانیەوە ووتاری خوێندەوە ئەو کات پارتی کاریش چوبووە ناو لیژنەی هاریکاری دوای ئەوەی جارێکی کە دەرچون بەنامەی کاك مەسعود بارزانی وەرگیرانەوە لەلیژنەی هاریکاری جگەلە بروسکەی حزبی شیوعی عێراق و حزبی شیوعی کوردستان و حزبی زەحمەتکێشان و رێکخراوی عەمەلی ئیسلامی و مجلیسی ئەعلای ئیسلامی عێراق و حزب و رێکخراوی کەش بەشداری ئاهەنگەکە بون جگە لەپارتی دیموکراتی کوردستان بروسکەی ناردبوو بریاریشمان دا ئەگەر پارتی بروسکە نەدەن بەبۆنەی دامەزراندنی حزبەوە ئەوە ئێمەش بروسکەیان نەدەینێ و لەهیچ جێگایەکیش بەشداریان نەکەین، بروسکەی پارتی زۆر بەگرنگ هەڵسەنگان وادیارە ئەوەی دژمان دەکرا سیاسەتی سەروی پارتی نەبوو، ئاهەنگی ئەورۆژە هەموی لەتەلەفزیۆنی سۆسیالیست لەهەولێرو سلێمانی و هەڵەبجە لێ درایەوە بۆجەماوەر وەلە تەلەفزیۆنی یەکێتی و زەحمەتکێشان و حزبی شیوعی و یەکگرتووی ئیسلامیش لەهەولێرولەزۆری رۆژنامەکان لێ ی بلاوکرایەوە بۆئەوکاتە هەنگاوێکی نوێ و سیاسی و جەماوەری بوو بۆحزبی سۆسیالیست لەوهەلومەرجەدا هێزوتوانای سۆسیالیستی پیشان دۆست و ناحەزو دوژمن دا کۆبونەوەی جەماوەری زۆرو بەشداری هونەرمەندو نەوسەران و زۆری کەی شەخسیات و پیاوە ناسراوەکانی شاری هەولێرو مقابەلەی دەیان کەسی رۆشنبیروسیاسی لەسەر رۆژی شەهیدان و سەیدای نەمرودەوری بزوتنەوەی شۆرشگێری و بزوتنەوەی رۆشنبیری و رۆژنامەگەری و دەیان هەنگاوی کەدا کاك دکتۆر مارف خەزنەدار و کاك دکتۆر عەزەدین مستەفا رەسول و کاك مستەفا صالح کەریم و دکتور عبداللەعلیاوای و دەیانی کەش لەسەر حزب و مێژوی پرسەروەری حزب جگە لەچاوپێکەوتنی رۆژنامەگەری و تەلەفزیۆنی لایەنە سیاسیەکان

وشانۆگەری ئاهەنگەکە (٤) سەعات درێژەی کێشاو چەند پارچە شیعروگۆرانی لەخۆگرتبوو، لە٨/٩ هەولێربوم رۆژی هەینی بوو ئەو رۆژە دەرنەچوم بەلاّم لەوێش هەرخەریکی وەلاّم دانەوەی نامەو ئامادە کردنی بابەتەکان بوم بۆ بلاّوکراوەکانی حزب، لەرۆژانی ١٠و٨/١١ هەر لەهەولێر بوم خەریکی ئیشوکاری ئاسایی رۆژانە بوین بەلاّم چاوەڕێ ی ئەوە دەکرا شەڕێك یاجەولەیەك لەنێوان یەکێتی و پارتی دەست پێ بکاتەوە چونکە هاتووهاواری پارتی و پەیوەندی رۆژانەی لەگەڵ عێراق دا و هاتوچۆی یەکێتی وئێران و مەشق کردنی بەپەلەی هێزەکانی یەکێتی لەبارەگاکانیان و سەردان و کۆبونەوەکانیان ئەوانە هەموی نیشانەی جەولەیەکی کەی شەربون لەکوردستان دا، لە٨/١٢ هەرلەهەولێر بوم لەمەکتەبی سیاسی لەورۆژانەدا خۆپیشاندانی هێزی پارێزگاران بەناوی هێزی سەرچیاوەوهێزی سورکی دوای مەشق خۆپیشاندانیان کردو لەتەلەفزیۆنی پارێزگاران و یەکێتی بلاّو کرایەوەو زۆرباسی کرا، لە شەوی ١٢-٨/١٣ لەهەولێر بوم کۆمەڵێك لەنوسەران دەعوەت بون لای ئێمە لەعەینکاوا من خۆم مەشروبم نەدەخواردەوە بەلاّم تادرەنگ لەگەڵ میوانەکان دانیشتین کاك محمود زامدار زۆرقسە ی خوشی بۆکردین و لەگەڵ مامۆستاملا ناصیح وەزیاتر قسەیان ئەکرد شەوێکی ناخۆش نەبوو، لە٨/١٣ لەهەولێر بوم کاك عمرئاغا هاتە سەردانمان لەکوردا ئەو مشکیلەیە هەیە هەرلایەك تاخۆی نەگاتە قەناعەت بەقسەی کەس باوەر ناکات یاخۆی چی بوێت وادەکات کاك عمرئاغاش هەر لەسەدی بێخمەوە لەیارمەتی و هاوکاری و سەیارەو تەلەفۆنی نێودەولەتی و پارەو چەك تاتوانی یارمەتی پارتی دابوو هاوکاری کردبوون بەلاّم کاتێك پارتی لەکەڵەکینی دا و حسێن ئاغای شەهید کرد حزبەکان هەڵوێستیان وەرگرد دژی پارتی قسەیان دەکرد دوای ئەوەی ماوەیەك قسەمان کرد لەسەر روداوەکان و وەزعە ئاڵۆزەکان هەندێك لەقسەکان زەمی پارتی بون و وردە وردە

مەلامستەفابارزانیش کەوتە ناو من زۆرم پێ ناخۆشبوو باسی شەخسی مەلا مستەفای رەحمەتی بکەن چونکە لەهەموو حاڵەتێك دا پیاوێکی بەتوانا بووەو شۆرشگێر بووە لەناو مجلیس و قەرەباڵغی دا ئەوەندە باس بکرێت زۆربێزاربوم بەلاّم بارەگای خۆشمان بوو چارنەبوو هەندێك لەبرادەرانی خۆشمان بەقسەکانی سەریان ئەلەقاند هەرچەندە دوای بەتوندی رەخنەم لەبرادەرانی خۆمان گرت کەئەو شتانە دووبارە نەکەنەوە چونکە مەلا مستەفا ئێستا مردوەوتاتوانیویەتی شۆرشی کردووە پێ نەکراوە ئێتر پێویست ناکات ئێمە باسی بکەین باسی پارتی و سەرکردایەتی ئێستا جیاوازە لەگەڵ شەخسی بارزانی دا چونکەمەلا مستەفا هی هەموو کوردبووە نەك پارتی وەئێستا نەکورەکانی جێگای بارزانی ئەگرنەوەو نەپارتی دەبێتەوە بەپارتی جاران دەبێت لەیەك جیا بکرێتەوە ئیشی ئێمەش نیە دژی شەخسی مەلا مستەفا قسە بکەین ئەگەر پارتی وازمان لێ بهێنێ هەرچەندە برادەرانی ئێمە هەرگوێیان گرتبوو زۆری ... ئێمە ئەگەر دوژمنایەتی هەرلایەك بکەین لەسەر بەرنامەو بۆخۆمانی دەکەین نەك بۆلایەکی کە، لە٨/١٤ هەرلەهەولێر بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانەی خۆمان بوین، لە٨/١٥ هەرلەهەولێربوم پارتی کاری سەربەخۆ سەردانیان کردین و باسی زۆر مەسەلە کرا شەری پارتی و یەکێتیش زۆر نزیك بوەتەوەو پێ دەچێت شەرەکە زۆر نزیك بێت، لە٨/١٦ یادی (٥٠) ساڵەی پارتی بوو لەهەولێربوم گەراینەوە بۆسلێمانی لەرێگا لەهەیبەت سوڵتان لامان دا دەمزانی شەر دەبێت لەورۆژانەدا، لەشەوی ١٧-٨/١٨ لەسلێمانی بوم لقی راپەرین ئاگاداری کردین کەلەسەعات یەکی شەوەوە جەولەی سێ هەمی شەر لەنێوان پارتی و یەکێتی لەدۆڵی خانەقا لای رەواندوزەوە دەستی پێ کردووە یەکێتیش لای ئێمە شتی لەوبابەتەیان باس نەکردبوو من دەمزانی شەر دەبێتەوە پارتیش خۆی ئامادە دەکرد دوای یادی پارتی پەلاماری هەولێر بدات بەهاوکاری

عێراق نازانم ئەو هاوكاریە چۆن بوو یا ئەو هێرشە چۆن دەبوو پارتی بەبۆنەی ١٦ ئابەوە یادی (٥٠) ساڵەیان خۆی ئامادە كردبوو بۆهێرش یەكێتیش خۆی ئامادە دەكرد بەڵام یادی (٥٠) ساڵەو كۆنگرەی (١١)ی پارتیش هەردوكیان بۆشەر بون یەكێتیش دەترسا پارتی پەلاماری بدات ئەوكات سوپای پاسداران حەزیان لەپارتی نەبوو لەسەر ئەوئیهانەی خەلیفان لەسەرهێرشی یەكیەتی وپاسداران بۆسەر حزبی دیموكرات وشاری كۆیە و ئەو هەموو راگەیاندنەی پارتی دژی ئێران ونیازی دەرگەڵەیش كەسەر بەلەشكری پارتی و برازای كاك عیزەت سلێمان بەگ بوو بەخۆی لیواكەیەوە چوە لای یەكێتی و ناوچەكەشی تەسلیم كرد پارتی شكان و تۆپی ئێرانیش هاوكاری یەكێتی كردو پارتی لەسنوری چۆمان وحاجی عمران و دارسەلام و ناوچەكە دەركرابون و وەزعیان زۆر خراپ بوو یەكێتی لەوە بوو لەوكاتەدا پەلاماری صلاح الدین بدات لەهەولێرەوە بەڵام ئەوەی نەكرد عێراق پربوو لەیەكێتی هەروەها پەیوەندی دورودێژی پارتی و عێراق لە١٩٩١ وە قۆناغ قۆناغ هەروا دەرۆیشت و هەرواش شەرەكە بەردەوام بوو پارتی هاواری لێ هەڵسا هەركات بشكایە لەشەرەكان ئەوە شكاندنی خۆی دەدایە پاڵ لایەك ئەم جارە دایە پاڵ ئێران و هێرشی لەسەر ئێران و داوای لەدنیا كرد فریای بكەون هانوهاواریكی زۆری كردو یەكێتیش بێ ئەوەی پرسیار لەكەس بكەن هەروا بەردەوام و لەگەڵ ئێرانیش دا لەهاتوچۆدا بون و بەتەمای ناوچەی سیدەكان و برادۆست ودیانە بون لەیەكی بدەنەوە لەگەڵ حاجی عمران دا پارتیش زۆر شپرزەو هێزەكانیان زۆری لەبەریەك هەڵوەشابون لەوسنورەدا شینی پارتی بۆهەرەشەی ئێران لەسنوری عێراق و ناردنی وەفد بۆ سوریاوتوركیاو عێراق وناردنی چەندین نامەی پارتی بۆ بەغداد بەتایبەتی لەرۆژانی ٢٢و٨/٢٣ پارتی فرمێسكی بۆ هەریسەكە دەرشت نەك بۆحسێن یەكێتیش وای دەزانی دووهەنگی لەدارێكدا دۆزیوەتەوە لەگەڵ سوپای

پاسـداران و قـەرارگای حـەمزەو رەمـەزان دا بـەردەوام بـوون، توپخانـەی ئێـران بەخستی بۆردمـانی هیزەکـانی پـارتی دەکرد بەچاوساغی ورەسـەدی یـەکێتی لـە حاجی عمران چۆمان دەوروبەری بەدەیان پیشمەرگەی پارتی بونە قوربـانی شـەری ناوخۆ هێزی پارتی لە پەلوپوکەتبون شەریان پێ نەدەکرا لە ٧/١٨ لەسلێمانی بـوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوم پاشان سەردانی کاك شێخ محمود کارێزەمـان کـردو پاشان گەرانەوە بارەگای تایبەتی خۆم لەسلێمانی میوانی زۆرمـان هەبووکـەرێگای هەموو ئیشەکانی لێ دەگرتم وەزعی کوردستان زۆر ئالۆز بـوو هێزەکـانی عێـراقیش لەجموجۆڵدا بون لەو رۆژانەدا هەندێك شتی پێویستمان بەرێ کرد بۆبناری سـورێن، لە ٨/٢٠ هەرلەسلێمانی بوم هێزی یەکێتی بەهاوکاری تۆپخانەی سوپای پاسـداران حاجی عمران و قەسرێ و دۆڵی خانەقاو چۆمان و گلاڵـەو دارسـەلام وتانزیـك گـروی عمرئاغایان لەپارتی پاك کردەوەو پارتی شـکاو خـۆی دانـی بـە(١٠٠) کـوژراودا نـاو بەلام کوشتاری زۆرهەبوو پارتی بەجارێك زەندەقی چـوبوو زۆر ترسـابون و هـاواری لـێ بـەرزبوەوە و هێزەکانیـان زۆری ناوچـەکەیان چـۆڵ کردبـوو لەولاشـەوە هێـزی یەکێتی لەسـنوری قاسمەرەشـەوە بـۆ شـنۆو بـەرەو کێلەشـین و برادۆسـت و دۆڵـی گادەر وخریەنە ودۆڵی سالاریەومالی مەلاوبێرکمەو سیدەکان بەرێ کـەوتبون پـارتی نەی دەتوانی لەبـەردەم هێـزی یـەکێتی وتۆبخانـەی ئێرانـدا راوەسـتێ وبـەرەنگاری بکات هەواڵەکانم بـۆ دەهـات کـەعێراق بەتـەمای پـەلاماری شـاری هـەولێرە لەگـەڵ پارتی دا بەلام یەکێتی قەناعەتی نەدەکرد و نەیدەویست قەناعـەت بکـات، لـە ٨/٢١ لەسلێمانی بوم بەتەمای ئەوە بوین هێزێك بۆهەولێر بنێـرین چـونکە مـن دلنیـا بـوم شەر دەبێت و عێراق پەلاماری شاری هەولێر دەدات لەگەڵ پارتی بەلام .ئێمە وامان دانابوو لەخەتی لای عێراقەوە بەشداری شەربکەین لەگەڵ پارتیدا لەوکاتە لەشـەردا نەبوین و نەشمان دەویست بچینە ناوشەرەوە بەبێ ئەوەی بریاری شەرمان هـەبێت

ودۆستایەتی پارتیمان دەویست پێمان خۆشبوولەگەڵ پارتی زیاتر دۆستایەتی مان هەبێت بۆهەردوولاش باشتربوو، لە٨/٢٢ لەسلێمانی بوم چوینە پرسەی شێخ بابەعەلی کوری شێخ محمودی مەلیك کە لە لەسلێمانی بۆی دانانرابوو کەرۆژی پێشوو لەلەندەن کۆچی دوای کردبوو لەتەمەنی (٨٤) ساڵیدا کۆچی دوای کردبوو پیاوێکی رۆشنبیرو بەتواناو دەوری لەوەزارەتی حکومەتی عێراقدا بوو جێگای تایبەتی خۆی هەبوو جگە لەوەش کوری شێخ محمودی حەفیدبوو..هەر ئەمرۆ یەکێتی لەسنوری سیدەکان شکابوو کوشتاری نزیکەی (٥٠)کەس دەبوو وەگیراویشی هەبوو لەوانە قادربەگی برادۆست وسەرداری حسێن حەمەد ئاغای مێرگە سورو عەلی قەرەچەتانی وزۆری کەش پارتی ئەوەیکرد بەهەرایەکی زۆر لەسەر یەکێتی هێزەکەی یەکێتی لەو سنورە زیاتر هێزێکی عەشائیری بوو لەوەی هێزێکی رێکوپێك بێت هەر بۆیەش توشی ئەو شکاندنە هاتبوو وادیاربوو سەردانی خزم و کەسوکارە بلاوەی لێکردبون لەوناوە ئێران وەعدی دابوو بەتۆپخانە پشتیوانیان لێ بکات، لە٨/٢٣ لەسلێمانی بوم شەر لەناوچەی رەواندوز بەتوندی بەردەوام بوو یەکێتی هەندێك بەرزاییان بەرەو رەواندوزو سەری جوندیانیشان گرتبوو، لە٨/٢٤ هەرلەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانەی خۆم بوم، لە٨/٢٥ سەردانی ماڵی خاڵە حاجیم کرد کەهاتبونەوە پاشان سەردانی ناوچەی سلێمانی و یەکێتی ئافرەتان و یەکێتی خوێندکاران و لاوانی سۆسیالیست و بەشی شەهیدانم کرد بەلام شەر هەربەردەوام بوو، لە٨/٢٦ چومە هەڵەبجەی تازەو سەردانی قائیمقامیەت بۆلای کاك بێرون و تەلەفزیۆن و رادیۆی و فێرگەی سەربازیم کرد کە(٥٠٠) پێشمەرگە مەشقی دەکرد لەگەڵ ئەفسەرەکان کۆبوینەوەو قسەم بۆهەمویان کردو پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی ، لە٨/٢٧ ئاگاداری فەوجی (٣)ی پارێزگاریمان کرد کە(١٠٠) پێشمەرگە ئامادە بکات و سەرلەبەیانی رۆژی ٨/٢٨

بگەنە هەولێر بەدۆشکاو هاوان و چەکی پێویستی خۆیانەوە...هەرلە ٨/١٧ چومە دوکان و سەردانی مام کوێخا ئیسماعیل تەلانمان کرد و پاشان بەرەو هەیبەت سولتان و دوای ئیسراحەتێك لەچنارۆك بەرەو کۆیە بەرێ کەوتم و سەردانی مەڵبەندی(٧)ی یەکێتی مان کرد بۆلای کاك بەهرۆز گەلاڵی کەتازە ببوو بەبەرپرسی مەڵبەند کاك بەهرۆز دژی سۆسیالیست بوو لەناو یەکێتی دا دژایەتی زۆر دەکردین بەلام ئێمە وەکو بەرپرس دەبوو سەردانی بکەین کاك بەهرۆز یەکێك بوو لەو سۆسیالیستە کۆنانە لەناویەکێتیەوە دژمان بوو هەولی دەدا هیچ ئیشێکمان بۆ نەکرێت هەتا برادەرانی کۆنی یەکێتی سارد دەکردەوە کۆمەڵێك لەوانەی سۆسیالیست لەناو پارتی هەروابون واتە پارتیە کۆنەکان یا یەکێتیەکان باشتربون وئەوانیش لێیان بێزار بون کەئەوان نایەڵن ئیشەکانی سۆسیالیست بکرێت پاشان چوینە هەولێر بۆمەکتەبی سیاسی برادەران لەوێ بوون وتیان بەتەمای هێزێك بوین بۆلای قوشتەپە بەرامبەری شێراوەو ئەوناوە ئەم شەو کاك سابیر نەرۆیشتبوو کاك خورشید لەگەڵ هێزێك چونەتە سەر رێگای شێراوەو هەرئەوشەوە خۆم هێزێکی کەم نارد بۆ رێگای هەولێر کەرکوك لەوهاتوبن لای قوشتەپەوە...پاش نیوەرۆی ئەو رۆژە سەردانی کاك کۆسرەتم کرد لەبارەگای عیلاقات بووکەمن رۆیشتم باس هەرباسی لای حاجی عمران و دارسەلام و ئەو ناوەبوو پاشان من وتم کاك کۆسرەت بۆهەولێر هیچ کراوە وتی بۆ... ووتم عێراق تەحەشودی هەیە وتی دەزانم و هێزی باشمان ناردوەو ئێوەو حزبی شیوعی و زەحمەتکێشان هێزیان ناردوە ووتم ئەوە راستەو ئەمرۆیش هێزێکی ئێمەش لەسلێمانیەوە دەگاتە ئێرە بەلام عێراق و پارتی پێکەوە هێرش بکەن ئێمە دەزانین پارتی بەتەنها هیچی پێ ناکرێت بەلام عێراق بەشی ئێمەی ماوە.. وتی تازە ئەمریکایەکانم دیوەو مام جەلالیش تەئکیدی کردوەتەوە ئەمریکا رێگا بەعێراق نادات و لێ ی دەدات وئەوکات قازانجی خۆمانەو

ئەگەر لێ ی بدات دەبابەکانی بەجێ دەمێنێ ووتم راستە بەلاّم کێ دەڵێت وایە..ووتی دڵنیابە ووتم باشە ئێمە پێشمەرگە دەنێرینە لای گوێریش ئیتر من گەرامەوە بۆمەکتەبی سیاسی و پێشمەرگەمان نارد بۆ قوشتەپە، لە ٨/٢٨ لەهەولێر لەمەکتەبی سیاسی بوین وەفدێکی ئێران هاتبون وتیان وەزعەکە چۆنە واپارتی شکاون و زۆرشوێنیان بەجێ هێشتووە و عێراقیش خۆی ئامادە کردووە بۆپەلاماری هەولێر منیش پێم ووتن راستە بەلاّم ئێوە رەئتان چیە وتیان ئەگەر عێراق بێت دێتە هەولێر بەلاّم وتیان بەبێ ئاگاداری ئەمریکا نایەت چونکە ئەمریکا ئاگاداری یەکێتی کردووە ئەو جێگایانەی ئەو دووسێ رۆژە لە١٧تا٨/١٨ گیراوە چۆڵی بکەن یەکێتیش پێ ناچێت چۆڵی بکات رەئی هەردوو لامان لەیەك نزیك بوو کاك کۆسرەت ئاسایی نەبوو من قسەکانم لەگەڵ کرد وادیاربوو کۆبونەوەکەمان پێ بریبوو.. سەعات (١/٣٠)ی پاش نیوەرۆی ٨/٢٨ هێزەکەی فەوجی (٣) گەیشتە مەکتەبی سیاسی لەهەولێرو دوای نیوەرۆیش برادەرانی لقی دهۆك هاتبون بۆ سەردان ئێوارە چوینە ماڵەکەی من لەعینکاوا لەوێ بوین چاوەرێ ی وەزعەکە بوین مام جەلالیش تەئکیدی کردەوە کەئەمریکا رێگای عێراق نادات ئەگەر شتی وا بکات ئەوە خۆی تیا دەچێت دوای دڵنیای کردبوین بەتەواوی ئیعتمادی لەسەر ئەمریکا بوو ئەو شەوە من هەرچاوەرێ ی ئەوەبووم تەلەفۆن و جیهازمان بۆبکەن یاتەقە دەست پێ بکات لای عێراقەوە کاك کۆسرەت وتی لەوانەیە وەکو جاری پێشوو بەتۆپ و راجیمە عێراق لەدورەوە هاوکاری پارتی بکات بەلاّم بەهێزی پیادە ئەرە ئەمریکا رێگا نادات بریاربوو ئێوارە کۆبونەوەی لیژنەی هاریکاری بکرێت لەبارەگای لیژنەکە لەهەولێر، لە٨/٢٩ لەمەکتەبی سیاسی بوم لەهەولێر خەریکی ئیشوکارو میوان و رێکخستنی هێزوخۆئامادە کردن بوین من دڵنیا بوم شتێك رودەدات و عێراق پەلاماری هەولێرئەدات هەواڵی ناو پارتیم زۆربەوردی و رۆژانە بۆدەهات ها تووچۆو

بریارەکانیان زوو دەگەیشتە من کۆبونەوەی جیاجیام هەبوو لەمەکتەبی سیاسی و پێم وتن هەندێك شتی ئیحتیات بکەن و نانی زیاد بکەن... سەعات (٥)ی ئێوارە کۆبونەوەی لیژنەی هاریکاری قیادەی سیاسی بوو داوایان کرد منیش بڕۆم چونکە جێگری پەرلەمان و سەرۆکی فراکسۆنی سەوزیش بۆمەسەلەی تازە کردنەوەی پەرلەمان دێن لەکۆبونەوەش لەگەڵ بزوتنەوە بریارمان هەبوو رەئی نەدەین بۆتازە کردنەوەی پەرلەمان چونکە پەرلەمان مردوەو بۆگیانی خۆمانی زیندو بکەینەوە واتە شەرعیەتێك بۆهەردوولا بەکاری بهێنن دژمان زیاتر پارتی ئەوکارەی دەکرد بۆمەبەستی خۆی هەموو حزبەکان ئامادە بون لەکۆبونەوەکەدا قسە زۆر کرا لەسەر هێرشی هاوبەشی ئێران و یەکێتی لەقەسریَ و حاجی عمران رەئی جیا جیا هەبو لەدانیشتنەکەدا ئێمە رەئمان وابوو عێراق هێرش دەکات بەلاَم پارتی کار رەئیان وانەبوو کاك ئەبو حیکمەت وتی ئەگەر عێراق هێرشی کرد من دەستی خۆم دەبرم یالەسەر باڵی خۆم دەکەم ئێمە تەئکیدمان لەسەر هێرشی عێراق زۆر کردەوەو پێمان داگرت داوای ئەوەمان کرد موزەکەرەیەك بدەین بە(UN) دەربارەی هێرشی عێراق بۆسەر هەولێر بەلاَم پارتی کار دەیانوت ئەوە سیاسەتەو یەکێتی سودی لیَ وەردەگرێت بالەموزەکەرەکەدا بنوسین عێراق و ئێران هێرشمان بۆ دەهێنن مامۆستا کەریم ئەحمەد رەئی باشبوو بەلاَم کاك حەیدەر فەیلی رەدی قسەکەی مامۆستا کەریمی دایەوە ووتی یەکێتی هێزی ئێرانی هێناوەو لەقەصریَ شەری پیَ دەکات و هێزەکانی خۆی بۆحاجی عمران ناردوە ئێمە موزەکەرەکە بۆ بە(UN) بدەین نایدەین کاك قادرعەزیز رەئی باشبوو بۆمەسەلەی موزەکەرەکە لەهەمان کاتدا کاك نەجات ئەحمەدعەزیز ئاغا جێگری پەرلەمان و کاك حازم یوسفی سەرۆکی فراکسۆنی سەوزیش هاتنە ژورەوە بۆمەبەستی درێژ کردنەوەی پەرلەمان کاك عمرئاغا قسەی باشی کردوو زۆری ئامادەیی خۆی پیشان دا هەروەها مامۆستا

صلاح الدين و مامۆستا عەلی محمد یەکگرتوی ئیسلامی قسەی بەشیان کرد زۆر مناقەشە کرا من زۆر سوربوم لەسەر هاتنی عێراق پاشان کاك نەجات باسی ئەوەی کردو وتی وا ماوەی تەواوبونی پەرلەمان خەریکە کۆتایی دێت وپاێتی نایەت بۆهەولێر و هاتوین پرسی ئێوە دەکەین چی دەڵێن بۆتازە کردنەوەی، پێم وایە بەتەنها یەکگرتوی ئیسلامی وتیان سودی چیە تازە بکرێتەوە پەرلەمان..من بەکاك نەجات وکاك حازم ووت ئێمەوەکو سۆسیالیست نەك هەر تازە کردنەوەمان پێ باشە دژی تازە کردنەوەی پەرلەمانین کاك جەوهەر هەربەناوی پەرلەمانەوە لەلوبنان شتی وەرگرتوە لەسوریا بەناوی پەرلەمان و سەرۆکەوە پێشوازیان لێ کردووە ئێوەش هەروا ئەگەر پرس بەئێمە دەکەن نەخێر ونامانەوێت هەرگیز تازەی بکەینەوە بۆئەوەی شەرعیەت وەربگرن ودژمان بەکاری بهێنن کاك نەجات قسەکەی پێ ناخۆشبو وتی من پێم عەیب نیە بەیانی دەچم بۆشەقلاوە لەوێ تازە بکرێتەوە منیش ووتم کاك نەجات مەسەلە عیبەوئەوە نیە من لەگەڵ ئەوەنیم لەهۆڵی پەرلەمانیش، تازە بکرێتەوە چونکە بۆسودی خۆتان بەکاری دەهێنن ئەوەی راست بێت کەس پشتیوانی لەرەئیەکەی من نەدەکرد بەلام هەمویان رەئیەکەی منیان پێ باشبوو نەیان دەویست بلێن بەلام کاك قادرعەزیز لەگەڵ تازە کردنەوەبوو کاك نەجات و زۆریان کەوتنە مناقەشە لەگەڵ من وەکو ئەوەی من پەرلەمانم تێك دابێت من ووتم کاك نەجات ئێمە بەهەردوولاتان رازی بوین خەبات و ماندوبون و هەزاران شەهیدو (١٧-١٨) ساڵ شەونەخونی و یاری لەگەڵ مەرگ هەمومان تەسلیم بەیەکێتی و پارتی کرد کەزۆری کەش لەپەرلەمان و حکومەت ببون بەئەندام و وەزیر کەنەوت شجاعەی عێراقیان لەیەخەی خۆیان دابوو یارۆژێك عەرەقیان نەکردبوو بۆکورد لەکوردستاندا هاتونەتە سەرحازری رازی بوین پەرلەمان بن و حکومەت بن و حزبی قائیدبن و بەرووبومی کوردستان و دەرەوەو رێکخراوە

خێرخوازەکان هەموی بۆ ئەودوو لایەنە بون ئێمە بەهەموی رازی بوین ئێوە خۆتان پێ ی رازی نەبون وخۆتان تێکتاندا وەخۆتان شەرو کێشەشتان بۆئێمە دروست کردوەو ئێستا کەبریارتان داوە هەربیکەن بۆپرسی ئێمە دەکەن پارساڵ و ئەمسالیش گەر ئێمەش نەمان وتایە هەردوولاتان خۆتان دەدزیەوەو لەناو گوندەکانی نێوان هەردوولاتان کۆدەبونەوەو تازەتان دەکردەوە خۆتان بریارتان هەیە بۆبەئێمە شەرعیەت وەردەگرن فەرمون تازەی بکەنەوە لەسار موزەکەرەش رێك نەکەوتن کاك ئەبو حیکمەت و کاك حەیدەر فەیلی نەیان هێشت کاك حەیدەر دەیوت دەبێت بلێن یەکێتی هێزی ئێرانیان هێناوە بۆ عێراق هەرچەندە فریاش نەدەکەوت بائەمریکا بریاری دابوو بێ ئەنجام لەوکۆبونەوەیە هەلسان و گەراینەوە بۆ مەکتەبی سیاسی، لە۸/۳۰ لەهەولێر بوم کاك مولازم عەلی و هەندێك لەئەفسەرکانی پارتی وبەرپرسە سەربازییەکانیان لەئاسکی کەلکەك لەگەڵ بەرپرسە سەربازییەکانی عێراق کۆبونەوەیان هەبوو بۆدانانی بەرنامەی هاوبەش بۆسەر هەولێر بەپێی قسەی یەکێ لەئەفسەرەکانی پارتی مولازم شێخ تاهیر ئەحمەد برنە کەخۆی لەوێ بوو لەئاسکی کەلەك کاك نێچیرڤان بارزانی لەوێ بەرنامەیان دانابوو لەولاشەوە کاك نەجات ئەحمەد عەزیزئاغایان ئاگادار کردبووە بۆکۆبونەوەی پەرلەمان کاك خورشید هات و وتی ئێستا حزبی شیوعی ئاگاداریان کردوم لەبارەگای حزبی شیوعی لای خەبات و کەلەکی یاسین ئاغا ئاگادار کردووە کەئەوناوە چۆڵ بکەن پێشمەرگەی پارتی و دەبابەی عێراق تێکەڵن و ئێستا دەبابەی عێراق لەسەیتەرەی پارتیدان لەکەلەك ١٠٠ ٪ بەیانی هێرش دەکەن و ئاگاداری بارەگای بزوتنەوەی ئیسلامیشیان کردووە ئەوسنورە چۆڵ بکات پاشان هاتەوە وتی ئەوە حەرەکەی ئیسلامیشیان جواب کردووە و خەلکی لەموصلەوە گەرانەوە کەواهێزی عێراق بەزۆری لەموصلْ و کەرکوك بەرەو قوشتەپەو لەمەخمور

بەرەو هەولێرو لەگوێرەوە دێن هەندێك لەئەفسەرەکانی رێگای کەرکوك ناردبویان کەوا رێگای بێستانە وئەوناوەیان بۆدیاری بکەن هەواڵەکانی ناو جەیش هەروا دەهات بۆمان،

## ٣١ ی ئاب و روداوەکانی دوای خۆی ؟

لە٣٠/٨/١٩٩٦ جەیش تەحەروکی کردبوو جولاّبوو لەهەموو میحوەرەکان جل و بەرگی کور-یان دروری بوو بۆجاشەکانی لای موصڵ لەبەریان کردبرن بەناوی پارتیەوە تێکەڵ جەیش و پارتی بن(١٢) هەزار قات جلیان لەوماوەیە لای خەیاتە کوردەکانی موصڵ و کەرکوك دوری بوو بەهەندێك ئەفسەرو سەربازی کوردیان وتبوو ئەفسەرەکانی جەیش کەئەم حەفتە لەناو هەولێرو کوردستان دەبن وەکو مژدە بۆیان دەگەرێنەوە لای کەسوکاریان ئەوانەی سەربەرژێم بون ماڵ ومناڵیان بۆ کەرکوك و موصڵ بەناوی سەردانەوە دەنارد ماوەیەك پێش ئەوە عێراق داوای لەهەموو موستەشارە کۆنەکان کردبوومەفرەزە خاصەکان برۆن بۆ بەغداد هەمویان بەناوی نەخۆشیەوە چونە بەغداد من بەهەندێکیانم ووت ئەودی نەخۆشە وەرەقەی ئێرانی بۆدەکەین و بەسەیارەش دەینێرین هەردوامان دەخستن بەلاّم ئەوان هەر ئەیانوت نەخۆشیەکە لەبەغداد چارەسەر دەکران ئێمە ئاگاداری هەموو جموجۆلەکان بوین بەوردی ئەو شەو قسەمان لەگەڵ برادەرانمان کرد شەو تەلەفزیۆنی (مید) منازەرەیەکی هەبوو نوێنەری پارتی لەوێ بووکاك کەمال کەرکوکی وەکاك سلێمان قەساب بوو ئاگاداری کاك سلێمانم کرد کەئەم شەو تابەیانی لەوانەیە شەر دەست پێ بکات و ئێستا سوپای عێراق لەدەوری هەولێرە..لەسەعات (٤)ی پاش نیوەرۆی ٨/٣٠ سەردانی جادەی گوێرم کرد تائەو

گوندانەی نزیك رۆیشتم لەكانی قرژاڵەوە تێدەپەڕێت (٥-٦)كم رەبایەكان دەبابەیان لەدەوربوو بەدۆشكاو هاوان تەقەیان لەسەیارەكانی ئێمە كرد خەڵكی ئەو گوندانە لەسەر زەرامەت بون وتیان تائێستا تەقەیان نەكردووە لەكەس و ئەو دەبابانەش نەبون لەدەوری ئەو رەبایەدا لایان سەیربوو ترسان لەهێرش هەندێكیان ماڵ و منالیان خستە سەیارە و بەرەو هەولێر دەرۆیشتن پاشان ئێمە هێزێكمان ناردە ئەو رێگایە تەقەی زۆری لێكرابوو لەرەبایەكان و دەباباكانەوە جیهازیان كردو وتیان هێزێكی زۆر گەورە بێ لایت هاتووەو هەروا دێتە پێشەوە بۆلای رەبایەكان هێزەكەی ئێمە شوێنەكەی واكەوتبوو لەپێشی هەموویانەوە بوو كانی قرژاڵە لای باكوری ئەو جێگایە یارێگای گوێر كەوتبوو حزبی شیوعی لێبوو بەلام ئەوانەی ئێمە زۆر لەقولایی بون بەلام پەیوەندی هەر هەبوو شەو سەردانی كاك كۆسرەتم كرد كاك شێخ جەعفەریش لەوێ بوو پێم وتن چیتان كردوەو چی بەرنامەیەكتان هەیە وتیان هێزمان بۆهەموو جێگاكان ناردوە وتم هێزەكانتان لەروی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە چۆنە پاشان كاك كۆسرەت ووتی (١٧)هەزار چەكدارمان پێشمەرگە لەوسنورە هەیە و هێزی باشمان لەپێشەوە داناوە ئێمەش وەكو چیچان لەشار مقاوەمە دەكەین سێ چوارمانگ شەری كۆلان بەكۆلان ئەكەین كاك كۆسرەت وتی پارتی ویەكێتی ئێستا هێرش بكەن هەولێریان پێ ناگیرێ ووسێ جار تەئكیدم كردەوەو وتم هەنگاوی كەتان ناوە ئەویش تەئكیدی لەسەر ئەمریكا كردەوە كەرێگای عێراق نادات پاشان من رۆیشتمەوەو كاك خورشیدم ناردەوە بۆلای كاك كۆسرەت دەمویست تێ بگەم مقاوەمە تاكەی دەكرێت و تاكەی دەتوانرێت و پاشان بۆكوێ دەكشێینەوە بریاری واهەیە یانە بەلام بروسكەی مام جەلال بۆیان وتەئكیدی خۆیان ئەوەندە یەكێتی دڵنیا كردبوو كەهەلیكۆپتەری ئەمریكا بێت لەمەكتەبی سیاسی یەكێتی هەڵیان بگرێت و بیانبات ئەگەر كارگەیشتە ئەوەی

عیراق بێتە ناوشار چەند جارێك تەئكیدم لەكاك كۆسرەت كردەوە كاك دكتۆر فوئاد وكاك دكتۆر كەمال لەكوێن وتی لێرەن كەدەبوو هیچ نەبێت مەكتەبی سیاسی بگوازنەوە یا باریان بكەن لەگەڵ هێزی زیادو شتی قورس بەلام نەبوو من گەرامەوە بۆماڵەكەی خۆمان لەعینكاوە بۆئیسراحەت بەلام خۆم نەكردەوەو ئەوشەوەش نەخەوتم من لەهێرشی عێراق دەترسام خۆ شەری پارتیمان نەدەكردو شەرمان نەبوو لەگەڵ پارتیدا دەمزانی شتێك رودەدات نەك بەوتەبارەیەی كەروی دا هەرچاوەرێ بوم شەو گەرامەوە بۆبارەگای مەكتەبی سیاسی و جارێكی كە چومەوە لای، كاك كۆسرەت وتی هاورێیانی حزبی شیوعیش لەوێبون پێ دەچێت ئەوەی ئاسكی كەڵەكیان پێ وتوبێت ئێمە هەر چاوەرێ بوین لەسەعات (٤)ی سەرلەبەیانی ئاگامان لە تەڵقە تەنورە بوو لەخۆرئاوای شاری هەولێرەوە لەسەعات چوارونیو جیهازی ئێمە لەرێگای گوێرەوە پەیوەندیان كردو وتیان ئەوە (٢٠) دەقیقەیە شەرە لای ئێمەوەو قەسفی زۆرمان لەسەرەو شەر دەستی پێ كردووەو ترسی ئەوەمان هەیە رێگای مەفرەقەكەی كانی قرژاڵەوگوێر و هەولێرمان لێ بگرن چونكە دەبابەكان زۆر چونەتە پێشەوەو گەیشتونەتە ئۆردوگای كانی قرژاڵە وەلەشێراواو رێگای قوشتەپەش شەر دەستی پێكردوەو لەرێگای عوێنە ولە مخموریش لەسەعات (٥)ی بەیانی شەردەستی پێكردبوو برادەرانی ئێمە وتیان دۆشكاكەمان شكاوەو دەبابەش زۆر نزیكەو قەسفی زۆرمان لەسەرەو ژمارەی دەبابەكان زۆرەو لەتوانای ئێمە نیە نزیكەی (٤٠)دەبابە دەبێت و دەبابەش بەرەو كانی قرژاڵە بەخێرایی دەروات ئێمەش دەكشێینەوە.. وتمان بكشێنەوە دواوە پاش ماوەیەكی كەم پەیوەندیان كردەوەو وتیان لەگومركەكەی یەكێتیش كەسی لێ نەماوە پاشان وتیان لەمەفرەقەكەین مام غفورلەبەرپرسانی یەكێتیە (٦) كەسی لەگەڵدایەو وتویەتی دەبابە هاتووەتە سەرمان و كشاوینەتەوە منیش، سەیارەم

پێیەو لێرە ماومەتەوە ئێستا بڕۆینەوە ناوهەولێر لێرە هیچ ناکرێت نائەوە کرا سەعات نزیکەی (١١) بوو ئێمە گەیشتینەوە سەر جادە شەستیەکەی ناو هەولێر هەندێکمان بۆ مەکتەبی سیاسی و من چومە عەینکاوا دەبابە لەسەروی کانی قرژاڵەوە سەرکەوت بۆبەردەم عەینکاواو مەرکەزی مەشق وتۆپخانەی یەکێتی پۆلێك دەبابە هەرسەعات (٨)ی سەرلەبەیانی لەقوشتەپەو لەنزیك دارەتوو لەپەنای بنەسلاوەوە یەکسەر لای نەدا بۆکەسنەزان و چوە لای ئەو هێزەی پارتی و دەبابەکان ڕویان کردە هەولێرو وەستان کۆمەڵێك دەبابەش بەرەو بەحرەکەو لەپشتی عەینکاواوە سەردەکەوتن نزیکەی (٥٠) دەبابەش لەکانی قرژاڵەوە دەرچون بەرەو ناوهەلێرلە١٠٠مەتریەکەوە لەشەستیەکەوە لەجادەی موصڵەوە لەرێگای مخموریش هاتنە کارگەی قیرو بەرەو ناوهەولێر لەنێوان عەینکاواو هەولێریشەوە بەرەو قەلایەك دروست کرابوو هێشتا تەواو نەببوو دەهات و قەسفیش لەهەموو لایەکەوە هەبوو کاك خورشیدم ناردەوە لای کاك کۆسرەت گەڕایەوەو وتی کاك کۆسرەت لەوێ نەبو تەنها کاك سەعدی ئەحمد پیرە و چەند پێشمەرگای لەگەڵدا ماوە کاك سەعدی کلاشنکۆفێکی پێبوو.. کاك سەعدی لەگەڵیان چووە بۆسەربانەکان و وتی وا دامەزراوین ...وتم کار گەیشتە کاك سەعدی لەسەربان بێت ودامەزرابێت کلاشینکۆف پێ بێت بۆ سوپای عێراقی با چاوەڕێ نەبین ئیتر ئەزانم چی بکەم خۆم بریارئەدەم لە چارەنوسی خۆمان .. وتم بەرنامە چیە.. بەئیشارەتی دەست پێ ی ووتم ئەوە وەزعەکەیەو هیچی نەوتروە.. وتبوی ئێستا مام جەلال بروسکەی کردوە ئەگەر دووسەعاتی کە خۆیان رابگرن ئەوە ئەمریکا لێیان دەدات لەوکاتەشدا تەیارەی ئەمریکا دەگەران و هەموی چاوەڕێ ی ئەمریکامان دەکرد پاشان کاك خورشیدم ناردبۆلای (UN) و پۆلیسەکان لەعەینکاوا هاتەوەو وتی وتویانە ئێمە ناتوانین بلێین فرۆکە لەوهێزەی عێراق دەدات

ئێمە لێرە چاوەڕێ دەکەین هەرچی ڕوداوێك هەبێت ئاگاداری ئەوان ئەکەین و شتی وایان بەئێمە نەوتووە ئەویش وتبوی باشە ئێوە بۆلێرەن ئەم شارە لەعێراق ناپارێزن ئەویش وتبوی کەسێك بەبێ چەك دەتوانێ لامان بێت پاشان پێی وتبوو ئێوە پۆلیسی (UN) نین ئەویش وتبوی بەڵێ.. وتبوی ئەو ناوچەیە خەتی (٣٦)و پارێزراونیە وتبوی بەڵێ...وتبوی نابێت بیپارێزن وتبوی بەڵێ.. وتبوی ئەوە بەدەستی من نیە من ئەوەی لەسەرەوە نەیەت نایکەین و چاوەڕێ ی فەرمانی سەرەوە دەکەین ئێمەش لەمەترسیداین ئێستا نازانین چیمان بەسەر دێت کاك خورشیدیش گەڕایەوەو وتی پێ ناچێت ئەمریکاو هاوپەیمانی شتێك لەبەرنامەیان هەبێت چونکە کابرا قسەکانی بەوشێوە بوو منیش پێم ووت باشە برادەران ئاگادار بکەن لەبارەگا بن و کۆببنەوەو سەیارەکان ئامادە بکەن و کۆمپیوتەرو جیهازو ئەرشیف و ئەوانە بخەنە ناو سەیارەکان ئێمە تائێستا چاوەڕێی یەکێتی و ئەمریکامان کرد ئیتر خۆمان بڕیار دەدەین چی دەکەین بڕۆن تەلەفزیۆنیش باربکەن لەسەیارەیەك و سەیارەیەکمان کلاچی سوتابوو لای فیتەر بوو وتم ئەویش بهێنن و بیبەستن لەسەیارەیەك دوای ئەڵێن پێمان جێ هێشتن کاك خورشید بڕوات لەماڵی خۆیان ساوەرێکمان بۆ دروست بکەن بۆئەوەی شەو بتوانین بەرێگادا بڕۆین و پێشمەرگەش لەوێ دامەزرێنن و لەدەوری مەکتەبی سیاسیش تانەو شتانە رێك دەخەن بەکاك برزوم ووت سەیارەیەك ئامادە بکەن خۆشدان بڕۆینە لای ئەوان باکاك سەید قادریش بارەگاکەی عەینکاوا کۆبکاتەوە کلیلەکەی بدات، بەخاوەن ماڵەکە نەوەك بیشکێنن بەخەستی تۆپ لەماڵی مام جەلال و ناو عەینکاواو بۆپەرلەمان وئەنجومەنی وەزیران و مەڵبەندی (٣)ی یەکێتی و ئەوەی کورتی دەکرد بۆ قەلا و سەری دەکرد لەپەرلەمان و مەڵبەندی (٣)، هەموی لەبارەگای سۆسیالیست و دەوروبەری حەوشەو دیواری دەدا ئەوانەی ناردبوم بۆتەلەفزیۆن

قەسفی زۆریان لەسەربوو لەقەلاّ بەلاّم کارمەندەکان تەلەفزیۆنەکەیان لەماڵێك شاردبویانەوەو نەیانتوانی بوو تەلەفزیۆنەکە بهێنن گەرابونەوە بەلاّم شتەکانی مەکتەبی سیاسی هەندێکی مابوو ناردمان ئەوانیشیان هێنایەوە نائەوەمان کرد سەعات بوو بە(٢)ی پاش نیوەرۆو دەبابە گەیشتە پەرلەمان چەند گولە تۆپ بەری دیواری باڵەخانەی پەرلەمان کەوتبوو جادە ١٠٠مەتریەکە بۆئەنجومەنی وەزیران ناوشارئیتر دەبابە گەیشتبووە ناوشار کاك حەیدەر فەیلی ماوەیە لە دوای ٣١ی ئاب وتی چوم بۆلای بارەگای خۆمان تەماشام کرد دووجامانە سەر لەبەردەمیدا وەستابون و (٣) دەبابەش لەبەردەمیدا لای رێگای عەینکاوا لەسەر جادەکە وەستابون ووتم ئەودەبابانە دەبابەی عێراقیە وتی کۆن دەبابەی عێراقی چی هەندێك لەدەبابەکان ئالاّی زەردیان پێوە بوو دوای من گەرامەوە ماڵی کاك خورشید بۆئەوەی ساوەرەکە بخۆین و بکەوینە رێگا دوو پێشمەرگەمان نارد بۆلای رێگای دارەتوو قوشتەپە نەگەرانەوە کەوتبونە ناو دەبابە لەقەریەی زانکۆوە خۆیان کردبووبەماڵیکداو نەیانتوانی بوو بگەنەوە لای ئێمە بەکاك برزوم ووت بەرەو سنوری بنە سلاّوەو دارەتوو ئیترلەوێ دەزانین لەشار دەرچوین بەلاّم بگەینە سەر سنورێك کەبنە سلاّوەو دارەتوو دیاربێت سنوری شار لەوێ بەرەو ئەولا شەو دەردەچین بەلاّم بە رۆشنایی بگەین تائەوکاتە سەعات بوو بە(٢) دەبابەکانی لای کەسنەزان بەرەو ناوشار هاتن لەولاشەوە بۆلای هۆڵی میدیا دەبابە گەیشت ئێمەش نزیکەی (١٢) سەیارەو ئەو هێزەش کەلەوێ بون و لەگەڵ پێشمەرگەی دەستەکەی خۆم وکاك برزو سەیرم کرد کاك خورشید بیجامەی لەبەرە وتم ئەوە چیە وتی من بێم ماڵەکە ئاگیر دەکەن بیجامەیەکی خەت خەتی بازەی لەبەرکردبو بۆ تەسلیم بون ئەوکاتە قسەکانی مارکس وماوتیسونگ ولینین وئەوانم وەبیر هاتەو، کەئەڵێت کەسانی بۆرجوازی تەنگە نەفسن و بەبچوك ترین ئەزمە ترشی راراو

خۆبەدەستەوەدان لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیاندا منیش زۆر بەئاسایی وەرم گرت هەر وەکو ئەوەی پێمان باش بێت بەجێمان هێشت وتمان خۆمان بەجێمان هێشتوە وتی بزانم پارتی چی ئەکەن لەوێ بەشێوەی خۆشاردنەوە بمێنێتەوە تاشتێك روی دا ئاگادارمان بکاتەوەو چوین لەوجادە بۆئەوجادەو شەروتەقەش لەهەموولایەك بەردەوام بوو بەو جادەیەدا سەرکەوتین بەرەو لای ماڵی مام جەلال کاك عمرئاغای سورکی و کۆمەڵێکمان توش بون وتیان چی دەکەن کاك عمرئاغا بەتەمای لای ماڵی مام جەلال بوو منیش وەستام قسەم لەگەڵ کردن کاك عمرئاغا وتی شەربکەین چی بکەین وبەرەنگاری ئەوە بکەین ووتم ئەگەر لەگەڵ ئێمە دێن بەدرامانا وەرن هەندێك هاتن وادیاربوو ئەقڵیان نەی بریبوو گەرابونەوە ئێمە لەهەندێك کۆلانەوە بەرەو نەخۆشخانەی کۆماری یا ئەوەیان لەرێگای کۆیە -کەسنەزان دووجادە بون کۆمەڵێك سەیارە لەولاوە دەرۆیشتن کاك برزو کەوتە پێش ووتی لەوجادەیەوە وەرن کاك حمەی مولودمامە وتی لەدوای منەوە وەرن ئەگەر بەقسەی کاك حمەمان بکردایە دەکەوتینە کەمینەکەوە بەدوای کاك برزودا رۆشتین ئەوانەی لەوجادەکەوە رۆیشتن توشی تەقە بون و ئەوانەی ئێمە توش نەبوین ئێمە سەری لای خانوی وەزیرەکانماناداو بۆسەر جادەی سەدمەتریەکەو بەرەو زانکۆ یا قەریەی زانکۆ لەپشتەوە دووسێ ئافرەت هاواریان کرد وتیان ئەوە دەبابەیە لەپێشەوە ئێوە سۆسیالیستن بەلێ سێ ئافرەت کەوتنە پێشەوە بوبەتەقە یەکێ لە ئافرەتەکان بریندار بوو تەقەیان لێ کردین ئێمەش گەراینەوە ماڵی کاك محمدخاڵی کاك برزو لەوێ لاماندا و پێشمەرگەمان دامەزراند لەکۆلانەکان و خۆشمان لەوێ ئیسراحەتمان کرد خەڵکمان بۆناوشار ناردو پێشمەرگەشمان بۆلای باداوان نارد تائەو ئەم سەرو سەرەمان کرد هەواڵی ناوشار هاتەوە لەسەعات چوارونیو پارتیش لەدوای دەبابەوە گەیشتە ناوشار ئێمە لەماڵی کاك محمدباوکی کاك کرمانج پێشمەرگە بو جیهازی

راكاڵمان داداو پەیوەندیمان لەگەڵ هەموو جیهازەکانی حزب کرد هەموو خەمی ئێمەیان بو وتمان وەزعمان زور باشە مەعنەویەتمان زۆر باشە هێزەکەی پارتی لەبەر گەران بۆمالآن وتالآن ئاگایان لە هیچ نەبو بەلآم بۆتالآنی مالآن و هەندێکیان لەسەیارەکانی لەگەڵ حیمایەکانی کاك کۆسرەت توشی شەربون لەبیکابێکدا لێیان کوژراو هەواڵ هات کە هێزەکەی عێراق و پارتی سەعات (٥/٣٠) گەیشتنە بەردەم پەرلەمان بەلآم هەرتەقەی تۆپ و تەقەی پێشمەرگە هەبوو لەناوشاردا لە ەسەعات (٦)ی ئێوارە مەفەرەزەیەك كە ناردبومان بۆ تاقیب و یەك دووشارەزا هاتنەوەو وتیان تادەگاتە ئەوپەری شار کەسی تێدا نیە و چۆڵە بەلآم لەجادەی سەد مەتریەکەوە برۆینە ئەوبەر نەوەك دەبابە لای قەریەی زانکۆوە بێن وسەرەوەبگرن لەسەعات (٦/٣٠) لەجادەکە پەرینەوە ئەوکات هەر رۆژبوو بۆلای باداوان بنەسلآوەو دارەتوو بیرە ئاوەکان وئەو دەشتە دیاربوو دەدبابەکان بلآوەیان کردبوو لەدەشتەکەدا دیاربوون من لام ئاسان بوو لەو دەشتە پانەوە بۆشەر دەربازبون کاك هیوا گەرایەوەو تی (٥-٦) پێشمەرگەم دی قسەم لەگەڵ کردن وتیان یەکێتین و تەئکیدم کرد کەیەکێتین و لەگەڵ کاك کۆسرەت دان ویەکێکیان ناوی بورهانەو هەواڵی تۆیان پرسیوە ووتم باشە تەئکید بکە کەیەکێتین هاتنەوە وتیان کاك بورهانی سەعید سوفیە و هەواڵی کاك کۆسرەت بپرسەو بڵێ ئێمە لێرەین سەعات (٧/٣٠)بوو پێشمەرگەیەکی کاك هیوا روتی کاك کۆسرەت ناردویەتی وتویەتی ئێمەش لێرەین بائەوانیش بێنە ئێرە من و کاك، برزوو برادەران رۆیشتین سەیردەکەین هێزێکی زۆر لەوێیە کەچوینە لایان کاك، کۆسرەت وکاك مولازم عمر و کاك ئەرسەلان بایزو کاك سەعدی ئەحمەد پیرەو کاك مەلا بەختیارو زۆری کەش لەوێ بون سەیارەو چەك و قەرەباڵغ بون وتمان هەواڵتان وتیان وەلآ کاك دکتۆر فوئاد معصوم ودکتور کمال فوئاد ئەوان کەوتونەتە کەمین و تەقەیان

لیٚ كراوه كاك كمال موفتی ووتی ئیٚمه پیٚكهوه بوین ئیٚمه دهرچوین و ئاگامان لهوان نیه كاك عمر فهتاح و كاك كهمال فوئادوكاك دكتۆر فوئاد معصوم و هیٚرۆخان كهسیان دیارنین و ههوالی لای مالی مام جهلالمان نیه لهویٚ سائیقی پاسیٚك یاپیٚشمهرگهیهك ووتی جوتیٚ پیٚلاوم بدهنیٚ پیٚلاوهكانی خۆی ئهدیداس بو ههموكهس ئهیزانی ئهدیداس هی پیٚشمهرگهیه وبۆ ئهوباسه دهرۆم ئهگهر لهویٚ بون دهیان هیٚنم و ئهگهر لهویٚش نهبون دهگهریٚمهوه ئیتر كابرا رۆیشت نزیكهی یهك سهعاتی پیٚ چوو زۆر ئازایانه گهرایهوهو وتی ههموی پارتی لیٚ یهو كهسی لیٚ نهماوه پارتی و قیادهی عهسكهریش لهبهردهم پهرلهمان وهستاون و پارتیش خهریكی تالانیهو ههندیٚكیش لهگهلٚ من سواربون و وتویانه بۆعهلهمی زهردی پیٚوه نیه سهیارهكهت ههر لهویٚ بوین وتمان كاك كۆسرهت چی دهكهن و بهرنامهتان چیه ههرواش تهقه لهوناوه نزیك دهبوهوه لهسهرمان و چهند جاریٚك تهقه روی داو ئهوان شكان تاسهعات بوو به (٨/٣٠) هیٚشتا ههر دنیا رۆشن بوو مانگه شهویش بوو كاك كۆسرهت و برادهرانی بهرپرسانی یهكیٚتی قسهیان دهكرد من تیٚكهلی قسهكانیان نهبوم كاك كۆسرهت دهیوت من دهرناچم ولهههولیٚر دهبم وئهوه دكتۆر فوئادو دكتۆركهمال و كاك عمرفهتاح سیٚ ئهندامی مهكتهبی سیاسی و هیٚرۆخان دیارنین من چۆن برۆم و ئیٚرهش چۆلٚ بكهم لیٚره دهبم و سبهینیٚش هاتنه سهرمان شهر دهكهین زۆر ههولیان لهگهلٚ دابوو فائیدهی نهبوو كاك مهلا بهختیار و برادهرانی سهركردایهتی یهكیٚتی بهمنیان ووت كهقسه لهگهلٚ كاك كۆسرهت بكهم و قهناعهت بكات لهشار دهربچین وبهرهو ناوچهی دهوری ههولیٚر برۆین من بهكاك كۆسرهتم ووت چی دهكهیت كاك مهلابهختیار وتی كاك كۆسرهت ئهوه كاكهحهمه لهههكاری دهرچوهو درایش بهئازایهتی حیساب كراو خۆشی ماوهو هیٚزیٚكی باشی دروست كردووه بۆخۆنه ئیٚستاش باكاك كۆسرهت وابكات باشه، له١٩٧٨/٦/١توشی

شەری هەکاری بوین لە ١٩٧٨/٧/١٦بۆقەندیل ولە١٩٧٨/٧/٢٢گەیشتمەوە شارەزور لە١٩٧٨/٣/٢٥لەسۆرین بەرێ کەوتبوم بۆنۆکان لە ١٩٧٨/٤/١٧لە گۆرەشیرەوە بۆ هەکاری تا رۆژی ١٩٩٦/٨/٣١کاك مەلابەختیار بۆ یەکجاریش لە هیج بۆنەیەکدا باسی گەرانەوەی من لەگەڵ ئەو (٧) پێشمەرگەی کەدا لە ٨٠٠کەس ٨کەس دەرچوبوین بۆ باسی نەکرد تائەوئێوارەیە ئەو راستییەی درکاند من لەگەڵ کاك کۆسرەت قسەم کرد وتم کاك کۆسرەت لێرە تازە شتێك ناکرێت و ئەو هێزەش باتوشی شەر نەبێت ئێستا لێرەوە سوپای عێراق دووسێ فەیلەق هاتووە نزیکەی (٦٠٠) دەبابە هاتووەو ماوەیەکە پێشمەرگە ئیسراحەتی نەکردووە لەدوێنێ شەویشەوە لەشەر داین و مانەوەش لێرە سبەینێ هەموو ئەو هێزانە کۆدەکەنەوە سەرتان و هیچ ناکرێت کەزەرەر لەوان بدات دەچینە دەردوەو هێزەکانی ئێرەو هێزەکانی کەش هەموو رێك بخەنەوە ئەوکات دەتوانن بەرنامەی کە دانێن و پەلاماری هەولێر بدەن یاهەر هەنگاوێکی کەش وتم چەند پێشمەرگەن وتی ئەوەتا لەبەرچاوت چەند دەبێت ٦٠٠تا٧٠٠ دەبن وتم دوێنێ شەو وتت ١٧ هەزارە وتی وایە ...بابرۆین باشترە کاك کۆسرەت قەناعەتی کردو وتیان بانگی شارەزاکان بکەن کاك عوسمان بانی مارانی و مام غفوریان بانگ کرد کاك عوسمان وتی من پێشمەرگەم زۆرلانیەو زۆریان شەهیدو بریندارە خۆشم زۆرماندوم بانگی مام غفوریان کردو ئەویش سەیری ئەوهێزەی کردو ئەولە پێشەوە بێت و ئەویش توشی شتێك دەبێت بەبۆنەی ئەو هێزە ناشارەزایەوە و لەناوئەو هێزەش ئەو شارەزایە بانگ کران هەردووکیان سۆسیالیستی کۆن بون برادەرێکی قەوڵەویشیان بانگ کرد نەمزانی ناوی چیە وتی رێگای ئەم هێزە هەرنیەو هەموی کەمینە مام غفور ووتی لەقوشتەپەو دارەتوو تاکەسنەزان دەبابە بەریزی یەکدا وەستاوەو جونديش بەیەکەوە دەستی گرتووە بەیەکەوە لەو ناوە وەستاوە زۆر زەحمەتە ئەم هەموو

سەیارەو شتە ئەگەر ئەڵێن مـن دەرۆم و هـەموو تـاقی دەکەمـەود لـەرێگاش ئاگـام لێبوو برادەرانی یـەکێتی دەیانوت مامـە غەفـە دەیـەوێت خـۆی تێکـەڵ ئـەم هێـزە نـەکات و بـۆی دەربـچێت بـەخۆی و مەفرەزەکەیـەوە مـام غـەفور پیـاوێکی ئازاوبەتواناو بەدەسـتوبردو قـاڵبوی بۆتـەی خـەبات وشـەری پـارتیزانی ودڵسۆزو لـەخۆبوردووە بـەڵام جـاران حـەزی لەقـەرە بـاڵغ نـەبو مـن ووتم باسـەیارەکان دور بکەنەوەو هەندێك شارەزایش ئامادە بکەن چونکەشەو جەیش کۆدەبنـەوەو دەبابـە سریە سریە لەچەند جێگا شکیان لێ ی هەبێت کەمین دادەنێن بەڵام ئێمـە هێزێکـی زۆرین و شەردەکەین و دەرۆین کـاك مـولازم عمـر گـورج ووتـی زۆر راسـتەو دەبابـە بەبڵاوی شەو نامێنێتەوە کاك کەمال موفتیش وتی دەبابە کۆدەبێتـەوە ئـەو شـەوە کاك کەمالم زۆر بەهیمەت بینی ووتم من لەگەڵ (١٥) کەس لەپێشەرە دەرۆم بـەڵام (٣-٤)شارەزا هـەبێت بەدووسـێ تـاقم دەرۆیـن هەرچیش بـوو هـەموی بـەرەو لای جـادەی بێـستانەو چـەمرگە بـروات و نەگەرێتـەوە دواوە کـاك کۆسـرەت وتـی سـەیارەکان لەوکاتـەدا مارسیدسـێکی رەش لەبـەردەمی مـن وکـاك کۆسـرەت دا راوەستابوودەوری دەکردەوە کاك کۆسرەت وتی حەیف نیە ئەو سەیارە بسوتێنین بەتایبەتی جـامپۆو بابیـان سـوتێنین مـن ووتم بـۆ دەیـسوتێنن وەڵا مـن هـی خـۆم ناسوتێنم و ئێوەش مەی سوتێنن من رازینـیم بیـان سـوتێنن وتم بـێ لابـت و بـەگ لایت ئیش نەکات ووتم هەر دەیبەین ئێوەش ئەوانەی خۆتان دەربکەن باسەیارەکان خۆمان و جارجاریش پێشمەرگە بەپێ بروات تائـەو جێگـای ترسـی کـەمینی هەیـە یالـەدارەتوو تێپـەر دەبـین (١٠تـا١٥)کەسـی شـارەزاو منـیش بـە(١٥) کەسـەوە لەپێشەوە لەگەڵ شارەزاکان و جارجار بەسـەیارە بـەرێ کـەوتین هـەموو ماندوبون کەس نەدەکەوتە پێش منیش بۆشارەزایی برادەرێك هـات نـاوی شـەریف چاوشـین بوو ئەو زۆر ئازایانە وتی من لەپێشەوە دەچم و رێگاش شـارەزام و لـەپێش منـەوە

بەرێ کەوت واتە ئەم هێشت کاك کۆسرەت سەیارەکان بسوتێنێ سەیارە شکاوەکەی خۆشمان راکێشا و هێنامانەوە بەڵام هێزی (١٧) هەزاری پەراگەندەو ماندو زۆری روخابووکاك مەلابەختیاریش ئۆتۆمبیلی پێبوو وایەری بەگ لایتی دەرکردبوو ئیتر ئیشی نەکردبوو دەبوو گولۆپەکەی دەربکات ئێمە گولۆپەکەمان دەرکردبوو سەیارەکەیان ئیشی نەکردبوو بەئێمەشیان نەوت شتێکی وا هەیە من بە کاك مەلابەختیارم وت سەیارەکەتان پەکی کەوتوە وتی ناهیچ نیە واهاتین ئۆتۆمبیلێکی سپی بو وایەرەکەی دەرکرابوو ئیشی نەکردبو بەجێیان هێشتبوو لەنێوان بنەسلاوەو دارەتوو دۆشکای دەبابەکان لەدورەوە جارجار تەقەی دەکرد..
ئێمە لەسەعات (٩/٣٠)ی شەو لەباداوان بەرێ کەوتین یەکیتیش نزیکەی (٧٠٠) کەس دەبوون (٨٠ )سەیارەیان پێبوو هەمومان (٩٥) سەیارەمان پێبوو سۆسیالیست ١٢٠ پێشمەرگەو ١٢ سەیارە بوین زۆر رۆیشتین لەنریك دارەتوو کاك کۆسرەت وهەندێك رۆیشتبون ئێمەش دابرابوین کاك مولازم عمرو کاك مەلابەختیارو کاك برزو بەکاك برزوم وت تۆ مەیە تۆ لە هەولێر بمێنەرەوە پێی ناخۆشبوو وتی من هەر دێم هەلوێستی زۆر باشبوو جگە لەوەی کوری شەهید عەلی هەزارە بەلام لەدوای ئەو هەلۆێستە زیاتر رێزی لام هەبو واتە کاك خورشید وهەلۆێستی وکاك برزو وهەلۆێستی هەردوو بابەتەکە لەرۆژانی ناخوشدا دەردەکەوێت هەرچەندە ئەوشەوەش لای من هەر شەوە ئاسایەکان بوو بەلام ئەوەی من بیرم لێ ئەکردەوە پارتی ئازاوخاوەن بریارو بەجورئەتە لەگەڵ سوپای عێراقی پێکەوە شەربکەن دژی دوژمنەکەی خۆیان یەکێتی ... هێزەکەی ئێمەو یەکێتیش هەندێك وەستاین و نەمانزانی بەرەو کوێ رۆیشتون کە لەدارەتو دەرچوبوین ترس نەمابو سواری سیارە بوین دەرچوبوین بۆپشتی مۆرتکە بەلام لای دارەتوو رۆژهەلاتی دارەتوو بە(١٥٠)مەتر دور لەدارەتوو وتمان با(٤-٥)کەس بروات شارەزایەك بانگ بکات

بزانین دەبابە لەکوێ دایە کاك مەلابەختیارو(٤-٥) پێشمەرگە چون تائەوان لەدەرگای مالأنیاندا من و کاك مولازم عمرو کاك برزو ئەوانیش رۆیشتینە ناو ئۆردوگاکەو کابرا دەترسا نەدەهات کاك عمر لێ ی تورە بوودووسێ پانێ پێوەناو وتی قابیلە ئەم هەموو خەڵکە بەدیاری تۆوە دانیشین رێگاکە لەکوێیە تا لەگوندەکە دەردەچین یارێگای چەمرگە بانەکەوین بەسەر دەبابەکاندا بەرێ کەوتین وادیاربووئێمە لە کاك کۆسرەت بەجێ مابوین کاك کۆسرەت ئەوڵی منی پرسی بوو وتبویان جێماوە کاك کۆسرە ت وتبوی نابێت کەس بروات ئائەوان ئەگەن سەیارەیەکی ناردبوو بەدواماندا و خۆشیان وهێزەکەش وەستابون یەك سەعات ئێمە دواکەوتین تاگەیشتینە لایان کاك کۆسرەت بەجێ ی نەهێشتین بەراستی بەپیاوێکی ئازا هاتە بەرچاوم لەوێوە سەرکەوتین لەنێوان بێستانەو چەمرگەدا چوینە سەرجادەکە لەمۆرتکەوە بەرەو چەمرگە بەسەیارە رۆیشتن ئەوکاتە لەوێ لەناوشار بوم بە(٤٠)هەزار سەربازو(٣٠٠تا٤٠٠) دەبابە هێزەکەم دەبینی کەدوای دەرکەوت لەوەزیاتر بوو بە(٨)سەعات دەرچوین فیشەکمان پێ نەمابوو هەوڵمان دەدا توشی شەرنەبین لەگەڵ پارتی هێزەکە نزیکەی (٦٠٠ تا ٧٠٠) کەس دەبوین لەدەشتی هەونێرەوە رۆیشتین و لەسەعات (٢/٣٠)ی شەو گەیشتینە گوندی چەمرگە لەوێش پێشمەرگەی لێبوو واتە سەرلەبەیانی ١٩٩٦/٩/١ گەیشتینە چەمرگە ئەوە (٣١)ی ئاب و پارتی بون لەگەڵ کوردو پایتەختی حکومەنی هەرێم و ناوچەی ئازاد کراویان هەموو تەسلیم بەعێراق کرد بۆمەرامی خۆیان یامانەوەی پارتی خۆیان دەیانوت هەر ئەو رۆژەی ئێمە لەناوشاربوین یەکەم بارەگای حزبی سۆسیالیست بوو تالأن وویران کران و داگیریان کردبوو پارتی ی عێراق دابەشیان کردبوو معارەزەی عێراق بۆ رژێم و کوردستانی بۆپارتی پارتیش ئامانجی یەکەمیان بارەگای یەکێتی و تەسفیە کردنیان بوو دوهەم لەگەڵ حزبی سۆسیالیست ئەوکات

هیچ شەروهەرایەك و كێشەیەك نەبوو لەنێوان سۆسیالیست وپارتیدا بەپێچەوانەوە دۆستایەتی هەبوو هەرئەوەش بوو ئێمە لەناوشار خۆدەان لەشەری پارتی لادەدا..لەسەعات (٥) هەواڵیان هێنا کەپارتی بەسەیارە بارەگای ئێمە بار دەکەن من ووتم لەوانەیە سیاسەتی پارتی نەبێت و نابێت جارێك بریار بدەین لەسەری پارتی پاسەوانیان بۆ بارەگای پارتی کار لەپەنای ئێمە بۆبارەگاکەیان دانابوو بۆ بارەگای حزبی شیوعیان لەرێگای عەینکاوا پاسەوانیان دانابوو وە بارەگای زەحمەتکێش پارتی پاسەوانیان دانابوو وەبۆ یەکگرتوی ئیسلامیان دانابوو بەلام بارەگای ئێمەیان تالان کردو سوتاندیان و پەلاماری تەلەفزیۆنیان دابوین وکارمەندەکانیان گرتبوون و سجن و لێدان و بۆصلاح الدین هەروامان پیشان دەدا ئەوەش سیاسەتی پارتی نیە معارەزەی عێراقیش لەقوشتەپە زۆری کوژران و هەرماڵێك موخابراتی عێراق نەی دۆزیایەتەوە پارتی و لقی دوو چاوساغیان بون بۆیان دۆزینەوە یان بارەگای حزبی شیوعی تالان کرا نەك زۆر تەلەفزیۆنیان برا بەلام پارتی بۆی بژاردبون بەلام برادەران و هەوادارانی ئێمە دەگیران ئەو رۆژەش بەیانیەکەی لەچەمرگە خاوەن ماڵێك هات بەدواماندا ناوی کاك قاسم ئەحمەد کوری شەهید ئەحمەد بو لەساڵی ١٩٧٧-لە مانگی ٤-لەشەری دەشتیوی لای قەلادزە لەگەڵ شەهید سەعدی گچکە باوکی کاك قاسمی خانەخۆیمان شەهیدببوو لەگوندی چەمرگەی دەشتی هەولێر بون و سەربەسۆسیالیست بون من وکاك برزوعەلی هەژارو کاك شاخەوان عەباسی یەکێتی کاك شاخەوان وتی بە کاك قاسم ئەحمەدی خاوەن ماڵەکەمان لە سەر حسك زۆرمان گرتی وعەزیەتمان دایت وا ئێستاش پێکەوەین لەگەڵ سۆسیالیست خاوەن ماڵە کاك قاسم وتی خوا ئەکات ئێوە رێك دەبن ئێمە قەیدی نیە خواجەزای خێرتان بداتەوە و مامۆستا بەکرو کاك عبدالصمدیش جێگری پارێزگاری هەولێرلەوێ بون ئەو شەوە مانەوبوین من نەم

ناسیەوە جێگاکەش بچوك بوو وەکو کۆن وەبیرم هاتەوە کەچۆن لەماڵان دابەش

دەبوین ئەو بەیانیەش لام تازە نەبوو بەڵکو لام ئاسایی بوو دابەش دەبوین لەماڵان

چاو کتری رەش مامۆستا بەکر بێزاری بەدەموچاویەوە دیاربوو وتی من لە١٩٩١وە

کلاشنکۆف و (٦) مەخزەنەوە چومە هەولێرو ئێستاش بەهەمان کلاشنکۆف و (٦)

مەخزنەوەکەوە دەرچوم وەکو ئەو رۆژەی کەهاتمەوە هەولێر واتە هەرچی هەبو

بەجێ ی هێشت بوو سفر ببوەوە وەکو ئەورۆژەی کە چوین چوبوە هەولێر

لە١٩٩١/٣/١١ ئەوە لە١٩٩٦/٩/١ وەکو یەکی لێهاتوەتەوە پاشان چوینە لای کاك

کۆسرەت و برادەران کاك مولازم عمر وتی پێم باشە من و تۆ کاك مەلا بەختیار

برۆینەوە بۆسلێمانی و روداوەکان باس بکەین بۆمام جەلال وێم زۆرباشە بەڵام پێم

باشە کاك کۆسرەت لێرە نەبێت لێرە حیمایەو پێشمەرگە هەبێت نابێستانە بەڵام

لەدێگەڵەو لەهەیبەت سولتان خەتی بەرگری دروست بکرێت باشترە .. بونی کاك

کۆسرەت لێرە سودێکی وای نیە و ئێرە جێگای شەرنیە کاك کۆسرەت وتی ئێرە

چۆڵ بکەین خراپە ووتم چۆڵی مەکەن بەڵام خۆت لێرە مەبەو سردی نیە لەدێگەڵەو

هەیبەت سولتان لەوێ بیت پێشمەرگە لێرەش مقاوەمە دەکات و شەر لەوێ

دەکرێت نەك لێرە وادیاربوو نەیدەویست وابکات پاشان ئێمە رۆیشتین بۆلای مام

جەلال لەرێگا وتیان ئێستا مام جەلال وەزعی چۆنە کاك مولازم عمربوو وتی قابیلە

مام جەلال خەفەت بخوات ئەوە چەند ساڵە ماڵی مەلا مستەفا هەرباسی (٦٦)

وعێراق دەکەن ئێستا مام جەلال بەپارەش دەیکرێ شتی وای دەست نەدەکەوت

کەماڵی مەلا مستەفاو دەبابە پێکەوە شان بەشانی یەك پەلاماری یەکێتی و

پێشمەرگە رشاری هەولێر بدەن هەروەها وتی ئێستا پێ ی خۆشە ئەوانیش لەو

سەنگەرەدا بمێننەوە منیش لەگەڵ ئەوان چوین بۆلای مام جەلال من ئەوەندە

سەرنجی مام جەلالم کرد تەنها هەندێك بۆهێرۆخان نارەحەت بوو بەڵام دەری

نەدەبری وتی خەبەری هێرۆ کاك مەلا بەختیار وتی گیراوە مام جەلال لەوکاتەنەدا زۆر خۆراگرەو واش دەکات کەهەست نەکەن نارەحەتەو باسی روداوەکانمان کرد من نەم بیستبوو هێرۆخان گیرابێت کاك مەلابەختیار وتی گیراوە لە جیهازی پارتی گوێم لێبووە بەلاّم من ئاگام لیّ نەبوو وابزانم کاك سالار عەزیزیش لەویّ بوو من لەویّ بەمام جەلالم ووت ئاگاداری کاك کۆسرەت بکات کەچەمرگەو حاجی یوسیف و ئەو ناوە جێگای شەر نیەو خۆی بێتەوە هەیبەت سولّتان و ئەزمەڕگەلّەو هەیبەت سولّتان خەتی دیفاعی دروست بکەن چەند جارێك تەئکیدم لەوە کردەوە کەئەو ناوە جێگای شەرنیەو دوای ئەوقسانە من گەرامەوە سلێمانی بۆلای برادەرانی خۆمان ئەوە رۆژی ١٩٩٦/٩/١ بوو لەشاریش خەلّکی زۆر هاتبوو بەدەمانەوە لەهەموو لابەکەوە خەلّکی بێ تاوان لەشاری هەولێرشەهیدبوو حزبی شیوعی شەهیدیان هەبوو یەکێتی زیاتر لە(١٥٠) شەهیدیان هەبوو لەهەموو شەرەکاندا زەرەرێکی زۆر هەبوو زیاتر لە(١٢٥) دۆشکای یەکێتی بەجیّ مابوون بەملیۆن فیشەك و شتی کە و تۆپ و دەبابەو راجیمەو دوو مدەرەعە هەبوو دوایی مام جەلال داوای کرد چاکی بکەنەوە کەموکوریان هەبوو هەموی لەهەولێر بەجیّ مابوو وەزۆرشت گیرابون و بەجیّ مابون ئازوقەو پارەش لەبانقەکان جیّ مابون زەربەیەکی کاریگەرو چاوەروان نەکراوبرو لەبزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد درا لەوکاتەدا ئەمریکا هەندێك توندی کرد لەرژێم بەلاّم لەبەغداد نامەی سەرۆکی پارتی خوێندرایەوەو کەلە ١٩٩٦/٨/٢٢ بۆعێراقی و سەرۆکی عێراقی نوسیبوو داوای هێز دەکات ودەلّێت پارتی هێزیّ مقاوەمەی نەماوەو ناتوانیّ هیچ بکات وخاکی عێراق لەمەترسی دایەو لەلایەن ئێرانەوە هەرەشەی لیّ دەکرێت فریامان بکەون زۆر بەپەلە نامەکەی نوسیووە عێراقیش بۆئەوەی تاوانەکە بخاتە سەرپارتی نامەکەی لەرادیۆی بەغداد و تەلەفزیۆن و رۆژنامەکان بلاّوکردەوە ئەوەش زیاتر خەلّکی لیّ سەلّمینەوە من

گەرامــەوە لەگــەڵ برادەرانــی خۆمــان کۆبومــەوەو وتم ئەگــەر پاڕ ـروات پــەلاماری سلێمانیش دەدەن بۆیە هەرچی شتی قورس هەیە بەرێ ی بکەین بۆسورێن بــەلام وادیاربوو برادەرانمان هەر تاخیریان دەکرد ئێمە لەگەڵ ئەوە نەبوین توشــی شــەری پارتی ببین شەرمان لەگەڵ عێراق بوو نەك پارتی بەلام پارتی هیچ جیــاوازی نێــوان سۆسیالیــست و یــەکێتی نــەدەکرد و هــەوڵیان دابــوو هەنــدێك خــەڵکیان لــەناوی سۆسیالیــستەوە دروســت کردبــوو بەسۆسالیــست بۆمانــەوە لەگــەڵ پــارتی و لەولاشــەوە هەنــدێك ســەربەپارتی کەلەترســی یــەکێتی هەنــدێکیان هاتبونــە نــاو سۆسیالیــست ئەوانــەش دەوری خراپیــان هــەبوو پــێ دەچــور لەوساوەیــەدا چــەند کەسێکیان سسۆگەر کردبێــت کەچــونە دەرەوە ئــەبوو ئەوانــە بەێننەوە لای پــارتی بەلام ئێمە بەگشتی رەئیەکان سەرکردایەتی یەك بون لەسەر زۆر خــاڵ و سیاســەتی حزب یەك دوو کەسیان ناردبوە ناولقی دهۆکەوە خۆمان دەمانزانی وئاگامان هــەبوو کەهەندێك هەواڵ بادەستی دەکەوێت دەیدات بەپاراستنی پارتی ئەوانە لەناو هەموو حزبێك هەیە بەلام مــشکیلە ئەوەیە پــێ ی نــەزانی ئێمــە پێمــان دەزانــی و ئێمــەش لەلای ئەوان هەواڵەکانمان پێ دەگەیشت ئێمە دەمانویست هەموو لایەك تێبگەیەنن کــەپارتی دژی سۆسیالیــست نــین و دۆســتی هــەموو لایەکــە بــەلام دوای یــەکێتی راســتەوخۆ دژی سۆسیالیــست بــون و هەنــدێك لــەکادرەکانماز دوودڵ بــوون لــەوە بەلام من خۆم دوودڵ نەبوم کاك محمد دۆلاشی هەریەکەم رۆژ وتــی ئێمــەش لەگــەڵ ئێرانیەکان قسە بکەین و هەرچــی ســەیارەو شــتی زیادمــان هەیە بیبــەین و برۆینــە ئێرانەوە زۆر هەوڵی دا و زۆر محاوەلەی کرد لەو روەوە بــەلام ئێمە یەکــەم بریــاری شــەری پارتیمــان نــەبوو دووهــەم برادەرانمــان هــەر لــەدهۆك دادەلەبجە بلاوبــون و مەقــەراتمان بلاوبــون بــەلام تەلەفزیۆنــەکانمان دەرکردبــوو بــۆلای دێتمــان وسورێن لەگەڵ ئەشیای زیاددا وتبوم تۆپ ودۆشکاو زۆری کە بەرن بۆ سورێن لەسەیدصادق

کاك محمد دۆلاشی نەی هێشتبوو بەپێچەوانەوە ناردبوی بۆپێنجوێن کەئێمە بۆ میری سورمان ناردبوو هەندێك سەیارەش هەربۆ پێنجوێنیان ناردبوون ئەوانەی کاك محمد دۆلاشی راست بون بەلأم ئێمە تائەوکاتە پێویستمان بەوەبوو کەهەموو برادەرانمان بگەنە قەناعەت یاخەڵکیان بۆدانێین هەروەها پێویستمان بەکات هەبوو بۆئەو بردەرانەی زۆر دورن بۆدەرەوەو کۆکردنەوەی پێشمەرگە دۆلای سورێن و جەماوەری حزب لەرانیەو لەسلێمانیش زۆری رۆیشتبون لەدەربەندیخان و کەلارو باوەنور زۆریان بەرەو سنوری سەرتەك رۆیشتبون کارمەندانی تەلەفزیۆنیش لەمیری سورو ئەوناوە بون بەلأم وەختمان زۆر پێویست بوو بۆ ئەو دووەمێ خالأی باسمان کرد وەجێگای خۆقائیم کردن لەسورێن چونکە چۆڵ کردنی سورێن ورۆیشتن بۆدیوی ئێران بۆئێمە کارێکی قورس بوو ئێمە نەمان دەتوانی سورێن بە جێ بهێڵێن چونکە سورێن دەبوو بەکلیلی کردنەوەی ناوچەکان پارتیتر نەیان دەزانی هەر هەوڵی ئەوەیان ئەدا دەستمان نەگاتە سورێن نەیان زانیەو ئێمە دەرچوین لەهەولێربەراستی ئیمە نامانەویت توشی شەربین لەگەڵ پارتیدا برادەرانمان چونە لای بزوتنەوەی ئیسلامی کەئاگایان لەئێمە بێت لەهەولێر ئەوان بروسکەیان بۆکاك مەسعود کردبوو کاك مەسعودیش ئامادەی خۆی پیشان دابوروکەمن توشی کێشە نەیەم بەلأم ئایە من ئەوەندە بێ دەسەلأتم لەوجێگایانەدا بووەستم تادێنە سەرمان یاتەسلیم ببم باوەر ناکەم بەلأم ئەوان برایەتی خۆیان بەجێ هێنابوو وەزعەکان ئالۆزبون یەکێتی و لایەنەکان واتێ گەیشتبون رێکەوتنی پارتی و عێراق بۆهەموو کوردستانە بەلأم لەراستی دا تەنها بۆهەولێروشاری هەولێر بو نەك کوردستان بەلأم پارتی غرور کرد کەزیاتر برۆن خۆ ئەگەرپارتی لەوە زیاتر نەهاتایە ئەوە بۆ خۆشی و بۆیەکێتی و بۆهەموو لایەك باش بوو بەلأم تموحی پارتی و هەڵی دای نۆرێکەوێت وای دەزانی بەهێزوبازوی پارتی ئەو شەرانەی کردووە هەرچی جاش و ماش بوو

کۆیان کردبوەوە ئەوانەش بەحەیاتیان بۆکورد فیشەکێکیان نەتەقاندبوو سوپای تالآنیان لێ دروست کرابون مەکتەبی سیاسی پارتی تائەو سێ رۆژە بەرەسمی هەموو چەکدارو مەسئولینی خۆیان ئازاد کردبوو لەهەموو جۆرە تالآن و برۆیەکی کوردستان و ماڵی خەڵکی کوردستان هەتا ماڵی خۆشیان تالآن دەکردن و ماڵی ئەندام پەرلەمان و سەرکردایەتی خۆیان و سەیارەی پارتی لەو تالآنیە بێ بەش نەبوو ئەوەی توانیان و لەدەستیان هات لەهەولێر کردیان... معارەزەی تورکمانیان لەسەر بیناکەوە (٦) کەسیان هەڵدرابوەوە خوارەوە لای قەلا ئێمە ش هەرخەریکی خۆئامادە کردن و خۆپاراستن لەپارتی بەلآم پارتی درێغیان نەدەکرد لەتالآن هەر لەچەك کردنی پێشمەرگەو بردنی سەیارەو ماڵ و ئیهانەی برادەرانمان لەهەموو لایەك بەشەرەکەی ئەمریکا چەند سارۆخێکی لەخواروی عێراق دا ئەوە ئەوەیە کەدەڵێ (قاچی بریندارەو کلکی دەپێچێت) مجلیسی ئەمن کۆبونەوەو باسی خەتی (٣٢)یان دەکرد عێراق لەکوردستان پەلاماری داوە چ پەیوەندیەکی بەخواروی عێراقیەوە هەیە وادیاربوو لەساڵی ١٩٩١ ئەمریکا هەدەفی خۆی دەپێکابوو لەخواروی عێراق لێرە چرای سەوزی بەعێراق دا بۆهەولێرو بۆتەمێ کردنی یەکێتی کەزۆرلەگەڵ ئێران نەروات و لەولاشەوە مەبەستی خۆی بۆخواروی عێراق و پاراستنی سنوری سعودیەو دور خستنەوەی عێراق لەو سنورە واتە لەسعودیە ... ئەگەر ئەمریکا مەسەلەی کوردی لامەبەست بوایە لەکوردستانەوە لێیان دەدا هەریەکە کێشەیەکی تایبەتی خۆی هەبوو، یەکێتی لەغروری و گوێ نەگرتن و حسابی نادەقیق لەسەر ئەمریکاو تورکیاو ئەوانە وای دەزانی هەموو شتی کردووە لەسەر خەیاڵ ئەژیا یەکێتی... هەربۆیە هێزێکی گەورەو تۆکمەی، وەکو یەکێتی لەکوردستاندا بەو شێوەیە و هێنانی پاسداران غەڵەتی یەکێتی بوو، یەکێتی سەری لەسیاسەتی ناوچەکە دەرنەدەکرد، من ئەو رۆژە کەچومە لای مام جەلال و پاشان

شەو لەگەڵ کاك مولازم کەریم و کاك برزۆی عەلی هەژار لەگەڵ کاك کۆسرەت زۆر قسەم کرد کەعێراق پەلامارتان ئەدات وتی ئەمریکا نایەڵێ وتم غەمی ئێوەم نیە لەگەڵ مام نەفە لەسەر هەیبەت سوڵتانەوە بەدوربین سەیری مەونێر بکەن، وەڵامی من بەنامەیاکی حاجی عبد هاتەوە ئامۆزای صدام حسێن بۆ دانیشتن و رێکەوتن لەگەڵ یەکێتی کاك کۆسرەت وتی نامەکەم دایەو خوێندیەوە سەیری منی کردو وتی ئەگەر عێراق زەعیف نەبێت ئەو نامەیە دەنوسێ کاك کۆسرەت وتی با نامەکە لای من بێت منیش وتم با نامەکە لای من بێت چونکە من دڵنیام عێراق پەلاماری هەولێر ئەدات ئەو رۆژەی وتی باسەیارەکان بسوتێنین وتم کاك کۆسرەت چیم وت کاتی خۆی خستمەوە بیری لەوکاتەی کاك کوسرت وتی سەیارەکانی خۆمان بسوتێنین بانەکەوێتە دەستی ئەوانە ئەو کاتە چیم پێ وتی ئەمەش روی نەئەدا کاك کۆسرەت وتی تازە لەدەست دەرچوو واتە خستمەوە بیری من چەند مانگ پێش ئەو روداوە باسم کرد لەگەڵیان ئەوەش روی نەئەدا،

لە٢/٩/١٩٩٦ لەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکارەکان بوین و وەزعەکان زۆر ئاڵۆزبون (٥٠٠) پێشمەرگەمان لەبنکەی مەشق بون لەهەڵەبجەی تازە بەڵام چەکمان نەبوو بییان دەینێ مەشقەکەیان یەك مانگی مابوو پێش ئەو روداوانە هەوڵی چەکمان نەدابوو هێشتا لەوکاتەشدا ئەو چەکە کۆمەڵەمان دەست نەدەکەوت هەرچەك نەبوو فیشەك و پێویستەکانی هەبوو ئەو هێزەش باش بڕوبۆبدای سورێن یاهەرجێگایەك پێویست بێت، لە٣/٩ هەرلەسلێمانی بوین هەموو ئەوحزبانەی لەسلێمانی بون کۆبوینەوەو یاداشتنامەیەکمان دابە (UN) و داوامان لێ کردن کەرێگا نەدەن عێراق پەلاماری ناوچەکان بدات هەر ئەو رۆژەش کاك جەبار فرمان قسەی کرد لای دێگەڵەو وتی چەند رۆژێکی کە دەگەرێینەوە هەولێر بەڵام زەربەی

عێراق لەهێزەکان لەهەولێر روحیەتی زۆری شکاندبوو بەڵام یەکێتی و هەموو لایەك واتێ گەیشتبون سەرانسەر عێراق وپارتی رێکەوتون کەواشر نەبوو دوای زانیم کەهەر بۆهەولێربوە رادیۆو راگەیاندنی پارتیش لەهەموو لایەك دەستی پێ کردبوو، لە٤/٩/١٩٩٦ چومە سەیدصادق سەیرم کرد هەموو چەکە قورسەکان جگە لەیەك تۆپ نەبێ هەموویان بەسەیارەشەوە بۆ پێنجوێن بەرێ کردووە زۆرم پێ ناخۆش بوو چونکە من پێم وتبون بۆسورێنی بەرن و بۆئەوەی کەشەریشیان کردین جەبهەیەك مەر بۆخۆمان تە نها بین نەڵێن چونەتە ئێران لەگەڵ یەکێتیدا هەرخۆمان بین ونەڵێن یەکێتی چوەتە ئێران و ئەوانیش بۆ ئێران دەرۆن وە دەمویست هەرخۆمان لەسورێن بین هەم پشتیوانیش لەوێ والە ناوچەکە و خۆمان زیاتر بەهێز بکەین پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی و رام سپاردن کەخۆیان توشی شەر نەکەن لەگەڵ پارتی دا، لە٥/٩ لەسلێمانی بوم چاوەرێ ی رووداوەکانمان دەکرد، لە٦/٩ هەرلەسلێمانی بوین بۆشەوەکەی کاك قادرعەزیز نامەیەکی ناردبوو منیش وەڵامم دایەوە ونبوی با ئاگامان لەیەك بێت منیش وتم باشە ئەگەر شتێك بوو دەچینە سورێن کاك قادر وەڵامی دامەوە کەئەو نایەتە سورێن چونکە پارتی لەهەڵەبجەیە ودەچێتە جێگایەك کە ١٠٠ کم لەپارتیەوە دوربێت، وادیاربوو یەکێتی هەندێك شتی باس کردبێت لای کاك قادرو مەسەلەی دەرچون بۆئەوانە ئێمە هیچ لێ ی ئاگادار نەبوین من وەڵامی کاك قادرم دایەوە وتم بریارێك هەیە لەپارتیەوە وتی نا بەڵام وەزعەکان وادەروات پارتی هێرشی کردووە لای بێستانە، عێراق بەدەبابەو تۆپ و راجیمە لەپێشمەرگەی داوە، لە٧/٩ پارتی بەپشتیوانی تۆپخانەی عێراق هێرشی کردبوو بۆ جەمرگەو لای حاجی سوو بەرەو لای دێگەڵە یەکێتی سەربەتۆپی عێراق شەهیدی زۆر دابوو لەوێش مقاوەمەی پێ نەکراو بەرەو کۆیە دەگەرانەوە، لە٨/٩ پارتی هێرشی کردبوو بەرەو دێگەڵەو کۆیەو هەیبەت سوڵتان وەگرتبویان

مام جەلال تالای ئاسی وەتمان رۆیشتبوو هێزەکانی بەشپرزەیی دەبوو گەرابووەوە شەو کاك قادرعەزیز تەلەفۆنی کرد هەندێك قسەمان کرد وادیار بۆ یەکێتی قسەیان لەگەڵ کاك قادر کردبو ئێمەش بریارماندا برادەرانمان بەرەو لای پێنجوێن برۆن جەماوەرەکەو باقی پێشمەرگە بۆلای سورێن وسەیدصادق و ئەو هێزانەش لای ئێمە لەسلێمانی هەندێك هەبێت، لە٩/٩/١٩٩٦ سەرلەبەیانی بوو مام جەلال تەلەفۆنی کردو وتی عێراق لای چەمچەماڵ جموجۆڵی هەیە بەڵکو هێزێك بنێرنە لای تاسلۆجە منیش پێشمەرگەم نارد بۆلای تاسلۆجەو پاشان خۆشم رۆیشتم سەیرم کرد ئەوە هێزەکانی سکرتاریەت ولیوا تایبەتیەکان بەتانیان پێیەو ناوبانەتە بن دەستیان وبە پێ بەجادەدا مسافەیان وەرگرتوە بەرەو سلێمانی دێنەوە تاك تاكێك سەیارەش بەجادەکەدا بەرەو سلێمانی دەهات بە پەلە بەرێگای کەس نەدەوەستان هێزێکی پێشمەرگە لە دوکانەوە هەڵدەهات لە رێگادا ٢-٣ دۆشکەی ٥-١٤یان لە سەیارەکانی خۆیانیان دەکردەوە بە جێیان دەهێشت لە نێوان تاسلۆجە وسلێمانی دا پارتی هێشتا لە هەیبەت سوڵتان بون شەر نەبو برادەرانی ئێمە سەرکەوتبون بۆملەی تاسلوجە بەرەو روی ئەلایی و مەرکەزە کۆنە کە وتیان کەسی لێ نیە ووتم ئەی ئێوە خۆتان کەس نین.. وتیان بەڵێ ووتم لەوێ بن منیش خۆم چوم بەرەو دوکان هەرپێشمەرگە بوو بەرەو سلێمانی دەهاتەوە بەسەر رەو بەپێ ئێمە رۆیشتینە دوکان لای دارستانەکەی سەیتەرەی قەشقۆڵی دوکان کاك شاخەوان عەباس و کاك صلاح چاوشینم بینی لەگەڵ کۆمەڵێك لەبەرپرسانی یەکێتی سنوری هەولێر لاماندا وتیان وەزعەکە خراپەو کۆیە چۆڵی کردو خەڵکەکە بەرەو رانیە و خەڵکی رانیەش بەرەو سەردەشت و سەرسنورو سلێمانی دەروات..ووتم بەیانی من هاتوم هیچ نەبووە سەعات ببوو بە(٢)ی پاش نیوەرۆ ئەوسات کاك شاخەوان عەباس و برادەران وتیان بۆ وامان لێهات و هێزی ئێمە وای لێ بێت مقاوەمەی پێ

نەکرێ ولەبەردەم پارتی هەڵبێت وتم هێزی ئێوە لەبەرجەبەشی عێراقی هەڵدێت هەندێك دلخۆشیم دانەوە واشبوو عێراق پەلاماری داوەو شەری کردوە نەك پارتی ئەو شکاندنەی هەولێریش زوو ئیعادەی نەزەری لێ نەکرایەوە هەر نەوەستایەوە چونکە شەری عێراق ئاسان نیە ئەو هەموو تۆپ و ئیمکانەت و چەکەی هەیانە پێشمەرگەش بەکلاشنکۆف هەر ئەوەندەی پێ دەکرێت بەلام ئەوە بۆدلخۆشی ئەو پێشمەرگانە بوو کەشکابون لەراستیدا وانەبو بەڵکو سیاسەتی هەڵەی یەکێتی بوو غروری وتەنگ نەزەری و نەخوێندنەوەی روداوەکان وسەردەرنەکردنی یەکێتی لە سیاسەتی ئەقلیدی، ئەوخەڵکەو پێشمەرگەی یەکێتی دوچاری ئەو کارەساتە کرد ئەمرۆ پاشان من گەرامەوە تاسلۆجە برادەران لەسلێمانیەوە هاتن سەعات (٣)بوو وتیان شار چۆڵ بروەو کەسی لێ نەماوە تۆ چی دەکەیت لێرە منیش گەرامەوە وتیان ئەوە دووسێ خانو تەقێنرایەوە باسی کاك سالار پارێزگاری سلیمانی بو و کاك نەوشیروان ومالی ئەوان و مەڵبەندی سلێمانیان سوتاندو خەڵکی لەناوشار تەقەیان لەمەڵبەندی یەکێتی کردووەو لەناوشار خەڵکی بەدواى خەڵکی سەر بەیەکێتیدا دەگەرێن بیکوژێت منیش ووتم سەرێکی شار دەدەم سەعات (٤/٣٠) بوو چومە پرسەی کوری کاك عەلی حمە ئەمین وازۆڵی لەمزگەوتی سەلیم بەگ وادیاربوو یەکێتی ئاگاداری رێکخستنەکانی خۆی کردبوو کەلەشەوی ٨-١/٩ کەلەشاردەرچن و جەماوەر بەرەو چۆمان و ماوات و سنوری ئێران و پێنجوێن و باشماغ و سەیران بەندو سنوری سەرتەك و بێ لولە رۆیشتبون بەلام کەس بەئێمەی نەوتبوو وتمان لەوانەیە خەڵکەکە خۆی بترسێت بروات نەمانزانی ئاگادار کراون لەهەموو شاردەگەراین لەو سلێمانیە گەورەیەدا یەك کەس یەك سەیارە هەرلەبازاریش کەس نەبوو چوینە بەرەو پارێزگا کەسی لێ نەبوو وتم ئێستا پارێزگار کاك سالاری لێیە بەلام کەسی لێ نەبوو ووتم کاك سەید قادر ئەم دووسێ سەعاتە نەیەکێتی و

نەپارتی لیّ نیەو بۆ نارۆیت دووسیّ سەعات پاریزگاری شار بیت ذۆلەكاتیكی وادا نەبیت ریگامان نادەن... سەعات (٥)بوو برادەران وتیان لەدار دەرچین وتم باسەریکی لای مام جەلال بدەین و پاشان بۆگولەخانەو سوین وتیان دەلا پارتی وتویانە ئیمە بەرەو سلیمانی دیین باكەسی ئیوە نەیەت نەوەك لەریگادا توشی شەرو پیكادان بن ووتم خۆئیمە لەگەلّ پارتی شەرمان نیە وتیان وایان ونووە.. ووتم ئەوە سەرەتاكەیەتی دوژمنایەتی ئیمە پارتی لەهەولیر دەستیان پیّ كردوە والیرەش تادوینیّ خوا خوایان بوو ئیمە قسە نەكەین.. وتم باشە بابرۆینە قەلاچۆلان لای مام جەلال بزانین ئەوان چی دەكەن لەویّ بریاریك دەدەین خەریك برو سواربین سەعات (٥/٢٥)ی ١٩٩٦/٩/٩ بوو وتیان تەلەفزیۆنی یەكیتیان تەقاندەوە یەكیتی خۆیان تەقاندیانەوە زۆرم پیّ ناخۆش بوو وامزانی تەلەفزیۆنی خۆمانە ئەو ئار.بی.جی.یەیان بەمالی خۆمەوە ناوە.. وتم باشە بۆ بەئیمەیان نەوت من ئیستا لەگەلّ خۆمان بارمان دەكردو دەمان برد زۆرم پیّ ناخۆشبوو تەلەفزیۆن و شتی راگەیاندن لای من زۆرگرنگە لەهەموو شتیّ زیاترچونكە بۆ ئیستای كوردستان هەمو كەرەسەی راگەیاندن سەر بەهەرحزب ولایەن ودەزگایەك بیت گرنگ نیە لای من زەروریەتی راگەیاندنە كەچوینە سەر ئەزمر هەزاران كەس بەریگاوە بوو جادە ریگای نەبوو لەتەنگەرانەوە دەرچوین قەلاچۆلانیان ئاگر دەدا بەراستی زۆرم پیّ ناخۆشبوو زۆر ذرەخەت بوم چومە قەلاچۆلان ئەوەی لەویّ بوو وەكو سەرخۆش سەیری یەكی دەكردو كەس قسەی نەدەكرد لەچەند كەسم پرسی مام جەلال لەكوییە بەرەو سەر دەستیان رادەكیشا سەیارەی كاك شەوكەتم دی خۆی دیارنەبوو پرسیارمان دەكرد ئەویش لەسەیدصادق بوو كەس خەبەری نەدابویّ من ئەو كاتەم هەرگیز لەبیرناچیت ئەوەندە ناخۆشبوولام بەتایبەتی شەخسی مام جەلال توشی ئەو وەزعەیە بیت كارەسات بگاتە ئاستیك كەدوژمن بهیننە سەریەك

مام جەلال ئەوها موخەباتە ئێستا خۆی ماڵی خۆی وئەوهەمو مومتەلەکاتە ئاگر تێبەردات ناخۆش بو من بۆ شەری ناوخۆ پێم ناخۆشبوو بۆپارتیش پێم ناخۆشبوو بەو هەمو خەباتەوە زیاتر لە ٥٠ساڵ بە تێکۆشانی بارزانی رەحمەتیشەوە پەنا بەرێتە بەردژمن وبادە بەی عێراق بێتە سەرمان پێم ناخۆشبوو پارتی توشی ئەوکارەساتە ببێت چونکە هەموی کارەساتە بۆکورد نەسەرکەوتنی پارتیەونە ژێرکەوتنی یەکێتیە بەڵکو سەرکەوتنی دوژمنانی کوردە لە قەلاچۆلان لە چەند کەسمان پرسی وابزانم کاك بارام بوو هات وتی سەیارەکانی مام جەلال لەسەر سنورەکەی باشماغ بووە پیکابێکی سورو لانکرۆزێك رێگای دی سەیارەیان داو ئەوانیان لەسەر سنورەکەن و سەیارەی مامۆستا بەهادین نوری مان بینی بەرەو پێنجوێن رۆیشت بەلام لەسەروی چوارتاوە وەستابوو ئێمەش رێگامان گرت بۆلای پێنجوێن رێگاش نەبوو قەرەباڵغ بوو کەوتینە شەو غەمی ئەوەشمان هەبوو پارتی برۆنە ناڵپارێز زۆر بوین پێش ئەوەی لەسلێمانی دەرچین کاك جەمیل وتی رۆنی سەیارە بگۆرم یەك سەعات ونیو تاخیر بوین لەوێش تو سەعات (٧) چوینە قەلاچۆلان و لەوێش بۆ پێنجوێن بەئێمەیان ووت کەمام جەلال چوە بۆئێران لەسنوری باشماغەوە وادیاربوو لەرێگای کورەداوێ وبۆلای دوچۆمان و شانەخسێ رۆیشتبون ئێمە چوینە ناڵپارێز پاشان بۆکانی مانگاو بۆپێنجوێن کاك خەلیل وکاك محمد غفور وکاك محمد دۆلاشی وکاك سەیدقادر و کاك بەکرو هەموو برادەران کاك جەمیل و کاك برزو لەوێ بون چوینە بارەگا کاك خەلیل وتی یەکێتی هەموو چونەتە لای ئێرانیەکان و دەڵێن ئێوە وەرن ولێرە تائیعادەی کاری خۆتان دەکەنەوە پێشتر لە ١٩٩٦/٩/٧ ئێران ئاگاداری پارتی کردبوو لەهەڵەبجە کەبێش ئەوە سنوری لێ داخستبون نەی دەهێشت پارتی برواتە ئێرانەوە بەلام کاتێك پارتی هەولێری گردت یەکیتی شکان یەك سەر ئێران داوای لە پارتی کرد رێگای ئەدات و

ئامادەیە بۆهاوكاریان و سنوریان بۆدەكاتەوە و بابریندارەكانیان بنێرن ئێستا هەر ئەورۆژە بریندارى پارتى وەرگیران لەلایەن ئێرانەوە واتە ئێران یاكسەر بای داوەو پارتى وتبویان دێینەوە سەرسنورو هەموو شوێنەكان یەكێتى تەواو دەبێت و لەوقسانە وەلامى ئێرانشیان دایەوە لایان كاك خەلیل وكاك محمد دۆلاشى وكاك سەیدقادر وكاك محمد عفور زۆر هەولیان دا ئێمەش یەكسەر برۆین بەرەو ئێران..

ئێمەش زۆر شپرزە بوین ئەگەر من لەسورێن بومایە هەموو برادەرانیش برۆشتنایە پارتى زۆرحساسیەتى لەسەرمان وەرنەدەگرت بەلام من برۆیشتبا بەم سورێن و زۆر شتمان لەدەست دەچوو دەبوو من هەرچۆن بێت دەستم بگاتەوە سورێن شەو كاك بەكرى حاجى سەفرو كاك هەلۆوكاك قادر بێستانى وكاك خەلیل سەركانى وكاك ئەحمەد قەدەفەرى وكاك عەلى یش هاتن بۆ مەقەرى كۆمیتەى ناوچەى پێنجوێن لاى كاك مەلا لوقمان وبرادەرانى ناوچە بەلام ئەحمەدوعەلى وخەلیل بۆ تەسلم بونەوە هاتبون بە پارتى هەندێك لەبرادەرانى یەكێتى هاتن وتیان چیە مەسەلەكەو بۆواى بەسەرهات، وتم هەموى كاتیەو هیچ نیەو دەبێت سەبرمان هەبێت ماوەیەكى كورتە وتیان ئەوە پێشمەرگەمان داناوە ناوەستن و مقارەمەناكەن لەملەكەوەش هەندێك لەمەسئولەكانى یەكێتى هاتنە لاى من وتیان دێینە لاى ئێوە وتم كاكى برا ئێستا كەى وەختى ئەوەیە ئێمە ئامادەین هاوكاریتان بكەین تانەكاتەى هێزەكانى یەكێتى كۆدەبنەوەو برۆنەوە لایان زۆرقسەم لەگەلدا كردن و دلخۆشم كردن هەندێكیان لەگەل ئێمەدا بون ئەوشەوە لەپێنجوێن بوین بەبرادەرانم ووت دەچینەوە گولەخانە من بە كاك خەلیل و كاك محمد غفور وتمان لەپێنجوێن بن تاوەزعەكە دەكەوێت بەلایەكدا هەر چەندە خۆیان حەزیان دەكرد لە پێنجوێن بن بە قائیم تریان دەزانى ئێمە بەهۆى ئیشى زۆرەوە دواكەوتبوین یەك دوو رۆژنامەگەرى بەریتانى و هۆلەندى و زۆرى كەش هۆلەندیەك هات پەیدایارى كرد كەئەم

وەزعە چۆن دەبینی وتم دەبێت بەئاشتی چارەسەری کێشەی یەکێتی و پارتی بکرێت..وتی ئەوە یەکێتی بۆئێران ڕۆیشت و پارتیش دەستی بەسەر هەموو کوردستاندا دەگرێت ووتم یەکێتی (٤٠٠)هەزار ڕەئی هێناوەو عێراق یەکێتی شکاندوە نەك پارتی ئێستاش ئەوە موەقەتەو زۆری پێ ناچێت ئەگەر پارتی بیر لەوە بکاتەوە یەکێتی تەواو کردووە بەهەڵەدا چووە پارتی ئەگەر سیاسیانە بیر بکاتەوە ئێستا داوای ڕێکەوتن لەیەکێتی دەکات بۆئاشتی ئەگەر یەکێتی (٥٠٠) پێشمەرگەشی هەبێت پارتی ناتوانێ دژی بێت ولآتانی ناوچەکەو هەلومەرجەکە ئەو زەمینە لەبار نیە بۆپارتی و پارتیش بەتەنها ناتوانێ حوکمی کوردستان بکات و دەبێت ئاشتی بکات پارتیش هەڵەی کرد لەهەولێرەوە بەرەو سلێمانی هاتووە ئەوە ڕەئی ئەم ڕۆمە کە ١٩٩٦/٩/١٠ بووە لەپێنجوێن کەزۆرکەس لەوێ بون... من دەستم نەگەیشتە لای مام جەلال و برادەران پێم خۆش نەبوو بۆئێران بڕۆم و بەئاسانی ناوچەکەو بەتایبەتی سورێن چۆڵ بکەم لەپێنجوێنەوە هەندێك لەو برادەرانەم ناردەوە سەیدصادق و سلێمانی بەکۆمەڵێك ڕاسپاردەوە بۆئیشوکاری ناوشار بۆئەوەی ڕێکخستنەکان چەواشە نەبن وکاك جەمیل حەزی دەکرد لەگەڵ پارتی نزیك بین ونەڕۆینە دەرەوە وکاك برزۆشم ناردەوەو برادەرانی کەش ببینن و لەدوای نیوەڕۆ بەرێ کەوتین بۆملەکەوەو بۆکانی مانگاو بۆنزیك کەولۆس و پردی کەولۆس لەدورەوە عبداللهو ڕەمەزان و نەوزاد هاتن و ئیشارەتیان دا بگەڕێنەوە دواوە پارتی کەمینیان هەیەو ڕەئیان خراپە لەشانەدەری و ئەوناوەن لە١٩٩٦/٩/١٠ بوو ئێمەش گەراینەوە کانی مانگاو لامان دایەوە بۆ چەمی ڕەشان و بۆزان بەلآم پێش ئەوەی لەناڵپارێز بوین دووجار سەیارەی بزوتنەوەی ئیسلامی بۆتاقیب لەپێش هێزی پارتیەوە هاتن و لاندکرۆزێکی سپی و سوپەرێکی ١٩٨٢ بوو کاك محمد دۆلآشی ناسینی یەکێکیان بەکاکە حمەی ووت ئیشتان نیە بەلآم

بۆتاقیبی ئێمه هاتبون هەرلای ئێمەشدا دێوریان کردەوه بۆ دواوه بۆلای پارتی و
هەواڵەکانیان پێ دەگەیاندن لەجۆری چەك و ژمارەو ژمارەی سەیارەمان وخۆمان
هەواڵەکانیان بۆ چەندین جار دەبردەوه بۆپارتی ئەوەش بزوتنەوه دەیکرد بەلأم
جارەکانی که بەنهێنی دەیان کرد بەلأم ئەم جارەیان بەئاشکرا دەیان کرد وتیان
باکەمینیان بۆ دانێین لە ناڵپاریز بۆ پارتی بەتەئکید پارتی زەرەرێکی گەورەو
نەشمان دەهێشت برۆنە پێنجوێن ..وتم با ئەوه ئێمه دەست پێشخەر نەبین
هەرچەندە ئەوان دەستیان هەیه لەگرتن و تالأنی کردن وکوشتن رەمەزانیان چەك
کردبوو سەیارەکەیان لێ سەندبوو کاك نەوزاد رۆژبەیانی و ئەوانیان چەك
کردبووزۆریان عەزیەت دابون پاشان ئێمه لەدوای ئەوه چوینه تازەدێ و بۆلای
کانی سێف و چەمی توتمان و لەوناوه دامەزراین پێشمەرگەو بارەگایەکی گومرکمان
لەوێ هەبوو ئێواره کاك هوشیارو کاك خورشید هاتن و دەربارەی وەزعەکە
چارەسەری وەزعەکە ئەوان لەوێ قسەیان کردبوو بۆکەمینان داناوه برادەران
زۆرشتەکان و رەئی پارتیان لەمن دەشاردەوه هەر لەناڵپاریز کاك نەوزاد
رۆژبەیانیمان ناردەوه چەکیان پێبوو لەرێگا لێیان سەندبون چەکیان کردبون
وعەزیەتیان دابون لای شانەدەری بون لای ماڵی کاك سالاری کوێخا نصرالله یەکێ
لەبراکانی کاك مەسعود لەگەڵ سوپای دوودا بوو لەگەڵ کاك زەعیم عەلی و هەندێك
لەکۆنه سۆسیالیستەکانی لەگەڵ بوو بێ دەست وپێ سپی بون نەیان وێرابوو قسه
بکەن هەتا لەگەڵ برادەرانی ئێمه کاك سید عبداللەکەردزی حاجی لەسۆسیالیست
بون پێشتر ئێمه لەوێ عبداللەی برامیان بەگیرهێنابوو ئەویش وتبوی باشه
وەرەقەیەك بکەن برۆم بیان هێنمەوه خەریك بوو گلی بدەنەوه وتبویان ئێوەو
جەلالی فەرقتان نیه کاك دکتۆر رۆژ قسەی خراپی بەکاك جەمیل وتبوو ئەوانیش
چاوەرێ ی فەرمانی کاك نێچیرڤان بوو بەلأم ئەو برادەرانه کەسیان راستیەکانیان

باس نەدەکرد بۆمان هەتا رێگایان نەدابوو کاك خورشید وکاك هوشیار وکاك بىرزو وکاك جەمیل و برادەرانیش ببینن من ئاگاداری برادەرانم کرد هەموو شتەکان بەرنە هەندێك جێگا بیشارنەوەو وروودە وردە بارەگاکان چۆڵ بکەن لەهەمان رۆژدا واتە لە٩/١٠ پارتی هێزەکەیان بەرەو پێنجوێن لەلای ئێمەوە رۆیشتن ئێمە دەمانتوانی زەرەریان لێ بدەین بەلاَم هەرچاوەرێ ی کات بوین وەپێمان نەڵێن بەستراون بەیەکێتیەوە ئەوان رۆیشتن و برادەرانی ئێمەش رۆشتنەوە من دەمویست هەتا گەرانەوەی یەکێتی بۆ ناوچەکان ئێمە نەمان دەویست توشی شەر ببین لەگەڵ پارتیدا ئێمە هەرلە سورێن بین وەبگەرێنەوە لەو ماوەیەشدا زۆرێك لەبرادەرانی یەکێتی هەوڵیان ئەدا بێنە لای ئێمە بەلاَم ئێمە وەرمان نەدەگرتن وتمان ئەتوانن بمێننەوە هەندێکان نامەیان ناردبو کاك ئەحمەدقەدەفەری وعەلی بچکۆڵ یەکێتی بون تەسلیم بە پارتی بونەوە ئەوانیش تەسلیم ببنەوە ئێمە پێمان وتن کەس تەسلیم ناکەینەوە کێ تەسلیم ئەبێتەوە خۆی بروات‌ەوە خۆ ئێمە نەقلیات نین ئەو برادەرانە ئەم چەند دێرە بخوێننەوە خۆیان دەزانن وئەحمەدیش ئەزانێ ئەگەر حاشایان لێکرد ناوەکانیان بلاَوئەکەمەوە لای ئێمەوە دەهاتن و دەگەرانەوە مەفرەزەیەکی یەکێتی لەتوتمانەوە لای بارەگای ئێمەوە رۆیشتبون بەرەو ئێران پارتی هەرلەدوای سەعاتێك چوبونە پێنجوێن و راستەو خۆ پەلاماری بارەگای سۆسیالیستیان دابوو دەوریان گرتبوون دوای مەسئولەکانیان گرتبوو لەوێ هەندێك پێشمەرگەی ناوچە و چوارسەیارەو هەندێك دۆشکاکانم لەگەڵ سەیارەکان نەهێنا قورس بوو چوارلولە بوو ئەوانیان بردبوو لەگەڵ موەلیدەی کارەباو کەلوپەلی بارەگاو سەیارەی کاك خەلیل و کاك محمد غفورو هەرچی ئەشیای ماڵی خۆشیان وژن و ماڵیان لەناو سەیارەکاندا بوو بردبویان وەسەیارەکەی کاك حسێن خەلیفە کەنەخۆش بوو کارێکی زۆر نابە جێیان و نائاسایان کردبو پارتی قسەی

ناشیرین وتالآن وچەکردنی هەمو برادەرەکانمان دەمانچەکەشیان لە کاك حمەغفور سەندبو لەسەر دەمانچەکە بوو بەشەریان لە بەر چاوی برادەرەکانی ئێمە لە بارەگاکەدا قەناسەیان لە سەردڵی یەك دانابو پاشان نەوتیان کرد بە قەنەفەو کەلوپەلی ناو بارەگاکەیان سوتاندبو ویستبویان تەقە لە کاك مەلا لوقمان بکەن لەسەر کاك حمە غفور... پارتی بارەگای یەکێتی لە پێنجوێن نەیان سوتاند بەلآم مەقەری سۆسیالیستیان سوتاند لە پێنجوێن ... چەك کردن و تالآن کردن هێشتا بەوەش هەربرادەرانمان دەیانوت ئەوە رەئی سەرکردایەتی پارتی نیە وتمان لەهەولێرەوە دەستیان پێ کردووە تائێستاش زەعیم عەلی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتیەو ئەوانە هەمووی سەرکردایەتی پارتین کەی دە بێتە رە ئی سەرکردایەتی پارتی ئەوکاتەی تەواومان بکەن ،لە۱۱/۹ لەسەیدصادق لەپشتەوە پەرینەوەو چوینە گوڵەخانە بەلآم هێزێکی زۆربوین و پێشمەرگەی زۆر لەگوڵەخانەش هەبون پارتی ئەوەی هەیان بوو لای نەویَ وئەوناوە هەموو بناریان چۆڵ کردو بۆشار ئەوەش کارێکی باشبوو بۆئێمەو جێگرکردنی هێزەکانمان لەبنارەکان ئیتر ئێمە دەستمان گەیشتە بناری سورێن و وردە وردە پێشمەرگەمان بۆسورێن بەرێکرد پارتیش سەرگەرمی تالآن و بڕۆی کوردستان بوون دەست بەسەرا گرتنی بارەگای پێنجوێنی ئێمە زیاتر گوماناوی کرد واتا پارتی بەتەواوی لامان رون بوەوە کەدژمانە بەلآم کەپێویستمان بەوەخت هەبو هەروا خۆمان لێ هەڵە دەکرد وەکو ئەوەی لەگەڵ ئێمەیان نەبێت شارەزوورو ئەو ناوە چۆڵ ببون مامۆستا مەلا عوسمان داوای کردبوو من ببینیَ، لەشەوی ۱۰-۱۱/۹ لەماڵی کاك شێخ کەریم بوین لەتوتمان سەیری رێگای لای کانی چنارمان کرد شەویش کاك بارام هاتە لامان لای کانی چنارو پیرانە کۆن کە ماوەیەك شێخ محمودی حەفید لە ئەوگوندە پێش راپەرینی بەردەرکی سەرا بە رۆژی رەشی ٦ی ئەیلول ناسراوە

پێش شەری ئاو باریك لەوگوندە پارەی دروستكردووە .. سەیارەكانی حزبیش هەرلەوێ بون لەودۆڵە بون، لە٩/١٢ چومە گوڵەخانەو هەڵەبجەی شەهید بۆلای مامۆستا مەلاعوسمان و هەندێك قسەمان كردو مامۆستاش هەندێك ئایەتی هێنیایەوەو وتی خوا حەقی كەس بەسەركەسەوە نایەڵێت و غەدروزوڵمی جەلال گەیشتبوە حەدێك كەخوا هاتە جواب لەئاستی.. ووتم مامۆستا بەرەئی تۆكۆتایی هاتووە ئەو مەسەلەیە ووتی وەلا مەگەرئێران بییان هێنێتە سەر سنورەكان ئەگینا تازە ناتوانن وەكو جارانیان لێ بێتەوە.. ووتم مامۆستا بەرەئی من ئێستاش دەبێت هەرئاشتی بكەن وتی كاك مەسعود رەئی زۆر باشەو من بروسكەم بۆ كردووەو مەلاعەلی براشم رۆیشتووە چاوی پێ دەكەوێت ووتم مامۆستا خۆمان یائێمە تاوانمان نەكردووە تارەئیان باش بێت ئێمەش حزبێكین و بیروبۆچونی خۆمان هەیە.. ووتی راستە بەڵام ئێوە زۆرتر لای جەلالن.. ووتم ئێوەش لا پارتین ووتم مامۆستا حەز دەكەم تۆ ئاگادار بكەین بە كاك مسعود وپارتی بڵێت شەرمان پێ نەفرۆشن پارتی وازمان لێ بهێنێ و لەوێ بارەگای مەكتەبی سیاسیان تاڵان كردوین و لەهەولێر كارمەندەكانی تەلەفزیۆنیان بردووەو لەصلاح الدین هێزەكانی پارتی (پاراستن) تەعزیبی داون و بەزۆر تەلەفزیۆنیان لێ سەندون ولەسلێمانیش بارەگای تەلەفزیۆنیان داگیر كردوەو داوای بارەگاكانی كەش دەكەن و لەهەموو لایەك لەپێنجوێن هەرچی لەدەستیان هاتوە كردویانە بالەوەزیاتر عەزیەتمان نەدەن چونكە ناچار دەبین بەرگری لەخۆمان بكەین پاشان گەرامەوە مامۆستا مەلاعوسمان قسەكانی لەدڵسۆزی بو بۆمن، لە٩/١٣ لەگوڵەخانە بوین پێشمەرگەمان بەرێ دەكرد بۆ سورێن و چنارە بریاردرا سەیارەكانیش بنێرینە لای ملەخورد، لە٩/١٤ لەگوڵەخانە بوین تەیارەی ئەمریكا لەخوارووی عێراق دەسورانەوەو لەسەرخەتی (٣٢) كەقەدەغە كرا لەعێراق..عێراقیش (٦)موشەكی گرتە تەیارەی

ئەمریکی لەخوارووی عێراق خەتی (٣٢)، وەهەر لە٩/١٤ لەتەهرانەوە بروسکە هات کەبەپەلە بگەمە لایان ، لە٩/١٥ لەسەر داوای ئێران لەگوڵەخانەوە بەرێ کەوتم بۆئێران لەوکاتە سەفەری ئێران بۆمن ئاسان نەبوو بەبرادەرانم ووت بڵێن لەمیری سورە هەر بەتەنیا لەگەڵ کاك بارام بەپیکابەکەی حزب بەرێ کەوتین بۆخورماڵ و ئێلان پێ وملەخوردو بۆ سنە و پاشان بۆ کرماشان ولەوێوەوە بەتەیارە چوین بۆتەهران سەعات (٩/٣٠) گەیشتینە تەهران و شەو لەئوتێل مەرمەری تەهران میوان بوین، لە٩/١٦ لەتەهران بوم کۆبونەوەمان هەبوو تائێوارە ئەوان رەئیان وابوو ئەوە دووسەنگەرەو سەنگەری عێراق و پارتی بەکاری ئێمە نایەت وئێمە دەبێت لەسەنگەری بەرەی گەل و لەگەڵ یەکێتی و کۆماری ئیسلامی داین منیش گلەیم هەبوو لەکۆماری ئیسلامی و پێمان وتن وەگلەیمان هەبوو لەیەکێتی بەتایبەتی رۆژی ١٩٩٦/٩/٩ نەدەبوو لەخۆوە شتێك بکەین یاوەلامێك یاقسەیەکمان لەگەڵ بکەن ئەوان زۆر هەوڵیاندا من ووتم ئێستا بلاوین بارەگاکان و برادەرانمان ئەوان وتیان هەرچیتان فەوتا ئێمە تەعویزی دەکەینەوە.. وتمان بەقسە زۆرمان بۆباس کراوە ئێوەو یەکێتی هەرودوولا بەنوسین و بەکردەوە نەبێت ئێمە دژی پارتی ناچینە شەرەوە زۆرقسەکرا.. وتمان راستە پارتی دژمانە و بارەگای سوتاندوین و تەلەفزیۆنی بردوین هەرچی لەدەستیان هاتووە کردویانە بەلام ئێوەو یەکێتیش شتێکتان لەگەڵ ئێمە نەکردوە لەروی سیاسی و ئابوریەوە یەکێتی فەرقی ئێمەو ئەو حزبانەی دژیەتی ئەکات و نەی کردووە لەسەر ئەوە رێکەوتین پەلەمان لێ نەکەن تاخۆمان کۆدەکەینەوە وتیان نابێت بەهیچ شێوەیەك کاك مەسعودبارزانی ببینن و بچیت بۆئەوێ لەسەر ئەوە رێکەوتین کەئێمە بەشداری لەو حکومەتەی پارتی بەتەمابنە نەیکەین وەهاوکاریان نەکەین وەخۆشمانیان لێ بپارێزین تاکاتێ پێویست دەکات بەدرێژایی رۆژی ٩/١٦ و شەوەکەی و رۆژی دوایی

تاسەعات (١٠) هەرکۆبونەوەمان هەبوو بەلأم من نەچومە ژێر هیچ بریارێك بدەم ئاغای حاجی ئەحمەدی ئەمیری بەرپرسی بەرهەلستکارەکانی عێراقی وئاغای ئەمیری و هەمو بەرپرسانی ئیتلأعات پەیوەندیان بە عێراقەوە هەبوو ئاغای پەناهی ورزۆری کەیان هەندێکی کەم یارمەتیان داین وادیاربو داوای یەکێتی بو بە ئێمەیان دەوت پاشان بەفرۆکە گەراینەوە بۆ سنە و بۆمەریوان و بۆبارەگای حزب و پاشان سەردانی قەرارگامان کردوئەوانیش داوایان کرد بۆ نەغەدە کاری زۆر زەروری و چارەنوسی ناوچەکەی پێوە بەستراوە من نەچوم و گەرامەوە بۆدزلی و ملەخورد لەگەلٚ کاك بارام بۆئێلأن پیێ و پردی زەلم وبۆگولەخانە سەعات (٥)ی دوای نیوەرۆی رۆژی ٩/١٧ گەیشتمەوە گولەخانە لەجادەشەوە هاتمەوە برادەران کەس هەروایان زانی لەو ناوەم، لە٩/١٨ لەگولەخانە بوم کاك محی الدین رەحیم بەرپرسی لقی (١٢)ی پارتی هاتە گولەخانە بەلأم لەپێشا نامەی ناردبوو کەسەعات (٤) سەردانمان دەکات ئێمەش وتمان بابێت.. هات و وتی کاك مەسعود بروسکەی کردووەو ئەحوالٚتی پرسیوەو من هاتوم لەلایەن کاك نێچیرڤان و سەرکردایەتیەوە بۆئەوەی ئەم خالأنەت لەگەلٚ باس بکەم کەهاوکاری یەکێتی نەکەن ورێگای هاتوچۆو هاتنە خوارەوەیان لەسورێن و ناوی حمە زیادی هێنا سەرتیپی یەکێتی برادەرانی ئێمە لەکانی سێفەوە بەرێیان کردون بۆلای مەریوان و بەپێچەوانەشەوە کۆمەلێکیان لەشارەوە بەرەو سورێن نێراون و ئێوەش هێزتان بۆسەر هەموو کانیاوەکانی سورێن و بارەگاکانتان بەهێز کردووە وادیارە نیازی شەرتان هەیە ئەگینا بۆهێز دەنێرنە سورێن هەروەها وتی پارتی داوا دەکات ئێوە لەحکومەت بەشداری بکەن وجێگای باشتان بۆ دادەنێرێت و مەکتەبی سیاسی پارتی داوای وەفدی کردووە بۆئەو مەبەستەش سەردانیان بکات هەروەها خۆشی داوای کرد کەکۆبونەوەیەك لەگەلٚ کاك نێچیرڤان بارزانی دا بکەم.. پاش تەواو بونی قسەکانی

منیش پـێم ووت ئێمـه بەیـەك وەجبـه (٨٠٠)کەسـی ئێـوه بەخۆشـتەوه لەسلێمانی دەرمان کردووه لەکاتی شەردا جگە لە کەم و زۆری کەش کەهەرگیز ئێمە ئەوەنـدە یارمەتی یەکێتی مان نەداوە ...ئێمە چۆن کەسانی ئێوەمان دەرکـردووه ئێستاش کەسانی یەکێتی رومان تێ بکات دەری دەکەین... وتی کۆمەڵێ پێشمەرگەی ئێـوه لەچەمـچەماڵ وچـەمی ڕێزانـەوه بردویانـه دۆڵـی جافـەتی وسـەیارە وئـاڵای خۆتـان دۆێنێ هێناوەو بردووه بۆئێران... پێم ووت هەرچەند هەبێت ئێمه چۆن حەقمانـدا بەخۆمان پارتی بگوازینەوه هەروا یەکێتیش دەگوازینەوه .. وەدەربارەی بەشداری حکومەت ئێمه تائێستا باسمان نەکردووه ئـەوه پێویست بەکۆبونـەوەی کۆمیتـەی ناوەندی دەکات ووتی ئێستا زەروریـەو پەلەیـه ووتم ئاسـاییه دوای وەری دەگـرین تاکۆبونەوه نەکەین ناتوانین بریاری لەسەر بدەین وەسـەبارەت بەکۆبونـەوه لەگـەڵ کاك نێچیرڤان پێم باشه بەڵام ئێوه بارەگاکانی ئێمـەتان تـاڵان کـردووه و بـرادەری ئێمەتان گرتووەو سەیارەتان بردووەو پێشمەرگەتان چـەك کـردووه هـەرکات ئێـوه ئەوانەتان گێرایەوه ئەوکات قسەی لێ دەکـەین و ئێمـەش ئامـادەین هـەنگاودەنێین باپارتی نیازپاکی پیشان بدات ئەوکات ئێمەش هەنگاو دەنێین بەڵام حەز ئەکەم بـه کاك مەسعودو مەکتەبی سیاسی پارتی بڵێت ئێمه دوای ئەو هـەمو تـاوان وئیهانـه و تاڵان کردنەی حزب بێ دەنگ بوین بۆئەوەی نەڵێن بە دەستی ئەم لاوئـەولا وازمـان لێ نەهێنن وبریاری شەردەین زیان لە پارتی ئەدەین چی شمان پێ بکرێت دەیکەین خوشتان ئەزانن هەموشتمان لەدەسـت دێـت پاشـان گەرایـەوه لەوماوەیـه رادیـۆی یەکێتی کەوتەگـەر زۆرمـان پێخـۆش بـوو چـونکه هـەواڵیانمان نـەدەزانی، لـە٩/١٩ لەگوڵەخانه بوم میوانێکی زۆر روی تێ کـردین لەهـەموو لایەکـەوه قـسەمان لەسـەر روداوەکان کردو دڵسۆزی خۆیان پیشان دا بەتایبـه تـی هاورێیـانی حزبـی شـیوعی ومامو سـتا عـەلی زەنگەنـه وکـاك حەیـدەر فـەیلی وزۆری کـه شـیان دووجـار لـەو

رۆژانەدا سەردانیان کردین وەبرادەران بەتراکتۆرو سەیارە خەریکی گواستنەوەی شت بون بۆ مەقەرە کۆنەکانی سورێن و دانانی چەکی قورس و دۆشکا بۆجێگا بەرزەکان و رەبایەو پێشمەرگە جێگیربون لەزۆرجێگا..کاك ماجدبەگ و کاك بەهجەت عیزەت بەگ سەردانیان کردین لەوکاتەدا لایەنەکان سەردانی پارتیان دەکردو پیرۆزبایان لیٚ دەکردن مامۆستا کەریم ئەحمەد دەیوت الحمدالله شەر لەکوردستان نەماوەو وەزعەکە ئارامە یاعنی یەکێتی لیٚ نەماوە و پیرۆزبایی لەحکومەتی پارتی دەکردو سەردان بەردەوام بوو من بۆزیاتر هێمن کردنەوەی بارودۆخەکە چوم بۆراوە پۆر بەیەك سەیارە بەلاّم پۆرمان دەست نەکەوت خەلّکی زۆرلایان سەیربوومن لەوحالّەتەدا بۆراوە پۆر دەچم، هەرلە ٩/١٩ یەکێتی رون کردنەوەیەك یائینزارێك یا ئاگادار کردنەوەی لایەنەکان لەهاوکاری پارتی خۆیان بپارێزن دەرکردبوویەکگرتووی ئیسلامی وحزبی شیوعی کوردستان پەلەیان کرد لەو حکومەتەی پارتیدا چونکە ئەو دوو لایەنە یەك مانگ چاوەڕێیان بکردایە تایەکێتی دەگەرایەوەو هانی پارتیان نەدایە ئەوان سەبەب بون پارتی زوو حکومەت دروست بکات، پارتی خۆشیان جورئەتیان هەبوو بەلاّم حزبی شیوعی و یەکگرتوو هاندەربون بۆ دوو حکومەتی چونکە ئەگەر ئەوان پەلەیان نەکردایە رەنگە دوو حکومەت دروست نەبوایە، ئێمە تەلەفزیۆن و رادیۆو هەمومان راوەستاندبوو پارتی چەندجار داوایان کرد بۆ ئیشی پیٚ ناکەن ..پێمان وتن ئەوەی هەولێرمان بدەنەوە بائیشی پیٚ بکەین کاك قادرعەزیز لەگەلّ مام جەلال و برادەران رۆیشتبون بەقەدەر ئێمە زەختیان لیٚ نەکردبون و مەکتەبی سیاسیان هەرمابوو لەهەولێر کاك قادر دوو رۆژ پێش ٣١ی ئاب هەولێری بەجیٚ هێشتبوو بەلاّم من دوو رۆژ پێش ٣١ی ئاب هێزم بردبوو بۆ هەولێر لەسلێمانیەوە، لەشەوی ١٩-٩/٢٠ کاك نێچیرڤان بارزانی لەتەلەفزیۆن مقابلەی کردبوو رادیۆ قسەیان لەگەلّ کردبوو ئەویش وتبوی

سۆسیالیست حزب نیه و ئەوانەیان رۆیشتون وەکو ئەوەی مابێتەوە لای ئەوان زۆرقسەی کردبوو دژی سۆسیالیست بەلأم دوای برادەرانی پارتی کاك عارف و کاك بروسك و کاك محی الدین چەندجار هاتن و زۆریان نامەیان ناردو داوای لێبوردنیان کردبوو منیش ووتم بابینوسن ئەو قسانەی کاك نێچیرڤان رەئی پارتی نیە و رەئی خۆیەتی لەدوای ئەوەش کاك نێچیرڤان نامەیەکی نوسی و ئیعتزاری هێنابوەوە کە بەهەڵە تێ گەیشتووە ئەوقسانەکرا وە منیش نامەکەی کاك نێچیرڤانم بە نەزەری ئعتیبار وەرگرت پاشان (٤–٥) بروسکەی کاك مەسعود لەرێگای کاك محی الدین رەحیم و بزوتنەوەی ئیسلامیەوە گەیشتە من داوای چاوپێکەوتنی منیان دەکرد لەگەڵ کاك مەسعودا بەپێ ی بروسکەکانی کاك مەسعود بارزانی لەوماوەیەدا دوو وەفدی حزبی شیوعی سەردانیان کردین، لە٩/٢٠ کاك حەیدەر فەیلی ئەندامی هەردوو مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی عێراقی و کوردستانی بوو لەگەڵ مام قادر ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و مامۆستاعەلی زەنگەنە ویەك دوو هاورێ ی کەش بون زۆرقسەمان لەسەر روداوەکان کردو زۆربەرچاویان رون نەبوو لەسەر روداوەکان وتیان حەز دەکەین چاوت بەپارتی بکەوێت باشە بەلأم لەوەدا هەردوولا رەئمان یەکبوو کەبەشەر یەکێتی کۆتایی پێ نایەت و هەردەبێت ئاشتی بکرێت من بەکاك حەیدەرم ووت بەرەئی تۆ ئەوەی پارتی دەیڵێت بەسەرکردایەتی یەکێتی وایە ووتی ناوانیەو کەمیشیان بمێنێ نایەڵن ئەوان دەست بەسەر کوردستاندا بگرن من دوو دڵ نەبوم باوەرم وابوو کەلەماوەکی کورتدا یەکێتیش دەگەرێنەوە ناوچەکان چونکە پارتی حکومیان پێ نەدەکرا کاك مەسعود لەسلێمانی وهەولێر غروریەکی زۆری پێوە دیاربوو بەتایبەتی لەسەر شەخسی مام جەلال ویەکێتی زۆر ناواقعیانە بوون دەیوت ئەبێت یەکێتی بەبێ چەك بێنەوە ولە کوردستان لەگەڵیان دانانیشم دەبێت بێ چەك گفتوگۆیان لەگەڵ ئەکەم پێمان باشبوو وەفدێك سەردانی پارتی بکات

برادەرانمان لەهەولێرەوە هاتبون بریاردرا سەردانی پارتی بکرێت و وەفدێکمان نارد بۆ وەرگرتنی رەئیان ئێمە کاتمان زۆر پێویست بوو بەڵام پارتی تەنگی پێ هەڵچنیبوین و زۆر دەترسان لەسورێن و ناردنی پێشمەرگە بۆی ئێمە هیچ بریارمان نەبوو دژی پارتی و یەکێتی تەنها دەمانویست ناوچەکەو جێگای خۆمان بەهێز بکەین و شەرمان پێ نەفرۆشن، لە٩/٢١ مامۆستا مەلاعەلی نامەی ناردبوو کەسەردانیان بکەین و قسەیان لەگەڵ بکەین ئێمە لەسەر داوای بزوتنەوە چوینە هەڵەبجە و سەردانی مامۆستا مەلاعوسمان و برادەرانی بزوتنەوەم کرد لەوێ وتیان مامۆستاو کاك مەسعود بروسکەیان کردووە داوای چاوپێکەوتنی تۆ دەکەن منیش باسی خروقاتی پارتیم کرد دژمان و وەزعەکەمان بەدورودرێژی باس کرد بەڵام ئەوان زۆر لایەنگری پارتی بون و بەرگریان لەپارتی دەکرد لە٩/٢٢ لەگوڵەخانە بوم کاك محی الدین رەحیم لیستێکی دورودرێژی هێنابوو گوایە ئێمە (٥٠)پێشمەرگە لەکام بارەگاو (٢٠-٣٠) پێشمەرگەی فلان و.. ووتم کاك محی الدین تۆو پارتی لەسەر بارەگاکانی خۆمان محاسەبەمان ناکەن... سورێن لەتوتمانەو لەقوچی بەردەبەلەوە تا بانی شارو تائێرە گوڵەخانە و سەیتەرەکەو گردەکان پێشمەرگەی لێ یەو جیهازیان لایەو قسەش دەکەن و تەقەش دەکەن هاوان و دۆشکایان تاقی کردوەتەوە.. پاشان پێ ی ووتم تۆ بۆلەسلێمانی یاهەولێر دانانشیت منیش پێم ووت ئێوە لەهەولێر بارەگاکەتان سوتاندین.. وتی لەسلێمانی.. وتم لەسلێمانی پێم خۆش نیە.. وتی بۆلەکاتی جەلال لەوێ بویت.. ووتم یەکێتیش لەوێ بوو من لەهەولێر بوم زیاتر.. ووتی تۆلەگوڵەخانە و پێشمەرگە لەسورێن ئەوە تەحەدای پارتی و بارزانیە.. ووتم کاك محی الدین گوڵەخانە دێ ی خۆمانە ئێرە بوم باوکم لەم گوندە بووە وەپێم وت باکاك مەسعود بڕواتەوە بارزان مەعقوڵە بڵێین بۆ کاك مەسعود چوەتەوە گوندی خۆی لەبارزان بۆهەرکەسێك هەیە بڕواتەوە جێگای

ب پێری [illegible] ەبتی شتەکەی تۆ سیاسیەو مەسەلەکە وانیە، لە٩/٢٣ کاك هوشیار
ر [illegible] ەن لەمقابەلەی رادیۆیٚ دا دەیوت ئێمە بۆ چەند سەعاتێك ئیشمان
بەصدام حسێن بووەو ئێستا بەدوژمنی کوردی دەزانین و هیچ پەیوەندیەکمان
لەگەڵیدا نەماوە هەروەها کاك فرانسۆ هەریری لەزانکۆی صلاح الدین قسەی دەکردو
دەیوت چەند ساڵە کورد جاشی عێراق و صدام بووە بائەم جارەش عێراق جاشی
کورد بێت چی تێدایە لەو قسە بیٚ سەروبنەنەیان دەکردو هەمووشیان لەبیرچوبوو،
لە٩/٢٤ لەگوڵەخانە بوم هەرخەریکی ناردنی فیشەك و ئازوقە بوین بۆ سورێن
لەوکاتەدا ئێرانیش هەندێك یارمەتی داین بۆمەقەرات لەبەتانی و ئاردوشت
سەیارەکانمان ناردبوو بۆمڵەخورد لەویٚ بن تا وەزعەکە دەکەوێت بەلایەکدا بەلاّم
بزوتنەوەی ئیسلامی رێگای لیٚ گرتبون لەسەر داوای پارتی و نامەی
مامۆستامەلاعەلی خۆی رۆژێك بەرپرسێکی ئەوناوەی بزوتنەوە ناوی کاك
دڵشادگەرمیانی بوو هات و وتی ئەگەر نامەیەك بۆمامۆستا مەلاعەلی باپیر بنوسیت
ئێمە رێگای سەیارەکان ئەدەین منیش ووتم باشە نامەم نوسی بۆی و ئەویش
نامەی نوسی من بەهەڵەم دەزانی چونکە کێشەی زۆرهەیە لەناو خۆیاندا وادیاربوو
نامەکەی منیش وکاك عەلی باپیریان دابوو بەمامۆستا مەلاعەلی عبدالعزیز ئەویش
وتبوی بانەرۆن و رێگای مەدەن باعەلی باپیر رێگای بدات..مامۆستامەلاعەلی
عبدالعزیز جوابی ناردو وتی تۆ بۆنامەت بۆعەلی باپیر نوسیوە ئەوە وەکو بەرپرسی
ناوچەیەك وایە لای من ماوەی (١٠)رۆژ رێگای سەیارەکانیان نەداین لەسەر ئەوە
لەرێگاش کاك محمد دۆلاّشی وکاك سەیدقادر ئەندامانی مەکتەبی سیاسی چوبون
بۆدزلّی رێگایان نەدابون وەمناڵەکانی منیش گەرابونەوە بۆئێران لە وشکەناو
دووسەعات دەبێت بۆخورماڵ رێگایان نەدابون گەراندبویانەوە لەئێلاّپیٚ وە
بۆخورماڵ تاوەرەقەیان بۆبکەن ئەو هەڵسوکەوتەی بزوتنەوە ناحەقی دەکرد

ئێمەش ناردمان بلدۆزەر هات ڕێگای میری سورمان چاك كردو سەیارەكانمان ناردە میری سورو دەرەكۆرە، لە٩/٢٥ كاك محی الدین رەحیم نامەی ناردبوو بێت بۆگوڵەخانە وادیاربوو خەبەریان دابوو كەمن لەگوڵەخانە نەماوم و ڕۆیشتوم زۆر بەپەلە هاتبوو بۆگوڵەخانە منیش لەسەیارەكان دووسەیارەمان دانابوو هەموومان ناردبووە میری سور هاتە بەری ماڵ پێشمەرگەش دوربون هەرلەناو سەیارەكە دابەزی پەشۆكابوو وتی كاكە حمە لێرەیە یارۆیشتووە وتیان لێرەیە كەچوم تێك چوبوو وتم كاك محی الدین واتان زانی لێرەنیم بۆیە زۆر بەپەلە هاتیت كەخانوەكە زوو بگریت بۆبارەگای لقەكەت هەركات ڕۆیشتم ئەوكات دەنێرم بێت و خانووەكەت تەسلیم دەكەم و ئەوكات دەرۆم وتی نەوەڵا بەخواو مەبەست ئەوە نەبووەو وتویانە ڕۆیشتووە ئەوەی دووبارە كردەوەو وتی كاكە لەوانەیە من نەگەمە لایان دەست بەسەر ئەو بارەگایانەی ئێوەدا بگرن ووتم جابارەگا ماوە.. ووتی ئەوەی ماوە وتویانە تۆ ڕۆیشتویت وەئێستاش دوا بریاری پارتی ئەوەیە یا لەهەولێر یالەسلێمانی یابرۆیت بۆئێران دەچیت بۆسورێن خۆ ئێوە شەرتان لەگەڵ پارتی پێ ناكرێت ووتم بۆ پێمان ناكرێت .. وتم كاك محی الدین بەكاك مەسعوردیش بڵێت من وەك سۆسیالیست وابزانی شەر ناكەین.. شەر ئەكەین و شەری ئێوەشمان زۆرباش پێ دەكرێت واتێ بگەن یەكێتی ئەو هێزە گەورەیەتان شكاندوەو دەكردوە سۆسیالیست چی پێ ئەكرێت ئێمە هەمو شتمان پێ ئەكرێت واتە یەكێتی ئەوانیش دەگەڕێنەوە ئێوە ناتوانن بەوشێوەی دەتانەوێت بڕواتە سەر سۆسیالیست هیچ نەبێت نایەڵێ لەوناوچەیە ئیسراحەت بكەن و لەوە زیاتر عەزیەتمان مەدەن زۆر عەزیەتان ئەدەین وەئێمە ئێستا تەواوی سورێنمان بەدەستەوەیەو دەشتوانین ڕێگای پێنجوێن و هەڵەبجەش ببرین یا بشێوی بكەین و شتی كەش دەكەین تكایە لەوەزیاترمەیەنە سەرمان كاك سابیر فەقیانی لەوێ بوو دوای قسە كردن و

ڕێکەوتن لەسەر کارەکان ئەوانمان ناردەوە بۆهەولێر دەست بەکاری خۆیان بکەن لەگەڵ کاك هوشیاردا، لە٩/٢٦ چومە میری سورو دەرەکۆرەو ئەوناوە زۆرباش ناوچەکە قائیم کرابوو برادەران لەوێ سەرپەرشتی هێزەکانیان و ناوچەکەیان دەکرد ئێمەش شەو ماینەوە لایان زۆرباش و جێگای دڵخۆشی بون هێزی باش و چەکی باش و هەموو جێگا حەساسەکان پێشیان رەبایەو پێشمەرگەی لێ دانرابوو، لە٩/٢٨ کاك محی الدین رەحیم هاتەوە لامان و وتی کاك مەسعود داوای کردوە بۆ ٩/٣٠ میوانی بیت لەماڵی خۆی لەسەری رەش هەر ئەو لەوێ بوو کاك قاسم مەلا مستەفا کۆکۆیی سەرکردایەتی بزوتنەوەی ئیسلامی بروسکەی مامۆستا مەلاعەلی وکاك مەسعودی هێنابۆم داوای کرد کەسبەینێ برۆین بۆصلاح الدین ولەوێش سەری کاك مەسعود بدەین و لەوقسانە منیش وتم باشە قسەی لێ دەکەین بروسکەم بۆعیلاقاتی ئێران کرد کاك مەلاناصیح و کاك خەلیل و کاك محمد دۆلآشی و کاك محمد غەفور لەمەریوان بون لەتەهرانەوە (٤) بروسکە لەسەریەك هات و دەڵێت بەهیچ شێوەیەك رازی نین برۆیت بۆصلاح الدین لەتەهران و نەغەدەو کرماشانەوە پەیتا پەیتاش بروسکە دەهات کەمن نەرۆم کاك محمد دۆلآشی وکاك سەیدقادرو کاك خەلیل و کاك برزوش بروسکەیان کردبوو کەنەرۆم.. من ئەو کاتە کاك مەلا ناصح وکاك خەلیلم ناردبوو مام جەلالیان دیبوو نامەشی بۆمن نوسیبوو بەڵام رۆژی ٩/٢٥ ئینزاری پارتی بۆ نەبونی من لەگوڵەخانەو سورێن ئەوە خۆی بریاری شەربوو دژی سۆسیالیست، لە٩/٢٧ هەرلەگوڵەخانە بوین، لە٩/٢٨ کاك قاسم نوێنەری بزوتنەوە وکاك محی الدین نوێنەری پارتی هاتن بۆلام بۆگوڵەخانە منیش وەعدم دابرۆم بۆصلاح الدین کات بۆئێمە هێشتا زەرور بوو جگەلەوەش لەگەڵ یەکێتی شتێکی سەرکاغەزمان نەبوو وەلەگەڵ ئێرانیشدا هەروا منیش دەمویست تا کۆتایی هەوڵ بدەم توشی شەر نەبین لەگەڵ پارتیدا تەنها خۆم رازی بوم و چەند کەسێکی

کەم برۆین بۆ صلاح الدین نەحزبی سۆسالیست ونەئێران ونە یەکێتیمان نەدیبو حەتمەن ئەوان هەر پێیان خۆش نیە، سەرلەبەیانی رۆژی ٩/٢٩ بەهاوریێ ی کاك قاسم مەلا مستەفا کۆکۆیی لە بزوتنەوەی ئیسلامی وکاك محی الدین رەحیم و لەگەڵ چەند برادەرێکی خۆمان بەرێ کەوتین بۆ سلێمانی لەوێ کاك عارف تیفورمان بینی و کاك نوری پاشان کاك نوری بەرێ ی کردین و ئەوانمان دی و پاشان لەگەڵ کاك محی الدین وکاك قاسم رۆیشتینە شەقلاوەو پاشان چوینە م صلاح الدین و بۆبارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی مامۆستامەلا عەلی وزۆری سەرکردایەتی بزوتنەوە لەوێ بون شەو لەئوتێل بوین، لەرۆژی ١٩٩٦/٩/٣٠ یەکەم رۆژبوو کەمانگێ بە سەر روداوی ٣١ی/ ١٩٩٦/٨ لەگەڵ کاك مەلا عەلی و کاك مەلا ئەحمەدی ئێلآن پێ و کاك مەلا غەنی و خۆشمان و کاك محی الدین رەحیم چوینە سەری رەش کاك مەسعود و کاك سامی و کاك فرانسۆ هەریری وزۆری کەش پێشوازیان لێ کردین و دانیشتین مامۆستامەلا عەلی بەناوی منەوە هەندێك قسەی کرد بۆکاك مەسعود خوا حەقە یەك وشەی قسەی من نەبوو بەڵام مامۆستا قسەی کرد دەبوو قسەش نەکەم مامۆستامەلا عەلی زۆر دۆستمان بوو وەکو مام قسەی لەگەڵ من دەکرد لەکۆنەوە لەگەڵ باوکم پەیوەندیان هەبوو واتە مامۆستا حەقی خۆی دا بەناوی منیشەوە قسە بکات پاشان کاك محی الدینیش قسەی خۆی کرد وکاك مەسعود وتی کاك محی الدین ئەو جامانەت کێ بۆی پێچاویتەوە ووتی ئەحمەد بەڵخەیی باشترین عەدەدی جامانەیە یاجامانە دەپێچێتەوە کاك مەسعودیش روی کردە من و وتی رۆژی هەولێریش زۆر غەمی تۆم بووە مامۆستامەلا عەلیش بروسکەی بۆ کردوم ومنیش پێشتر بۆم کردووە کاك فرانسۆ وتی لەگەڵ یەکێتی پێکەوە دەرچون ئەم لەپێشیان بو منیش وتم بەڵێ لەگەڵ کاك کۆسرەت و برادەرانی یەکێتی پێکەوە رۆیشتینە چەمرگە کاك مەسعود وتی من

ئەوماوەیە هەرهەوالّم پرسیویت و هەرمحاوەلەم کردووە چاوم پێت بکەوێت دوای ئەوە سوپاسم کردو منیش قسەی خۆم کردوخروقاتی پارتی هەرلە ٣١ی ئابەوە تائەو رۆژەی چوینە لایان و هەتا مەکتەبی سیاسیمان مان دەستیان بەسەرداگرتبو کۆمەڵێك کەڕو لاڵیان تێکردبو کەرولاڵتان تیّ کردبو بۆ ئەوەی لێیان حاڵی نەبین یا لەیەك حاڵی نەبین دوای ئەوەی تالاّنتان کردووەو دانانی کەمین بۆخۆم کەبرای خۆتی لەگەڵ بووەو زەعیم عەلی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی بووە یابارەگای پێنجوێن وکەلارو تەلەفزیۆنی هەولێرو بینای تەلەفزیۆنی سلێمانی ئەوانە هەموی هەر رەئی قیادەی پارتی نەبوو ووتی نەوەلا رەئی مەرکەزی پارتی نەبووە.. ووتم باشە قسەی کاك نێچیرڤان لە هەموو دەزگا راگەیاندنەکانی پارتی بلاّو کراوە ئەوە رەئی پارتی و سەرکردایەتی پارتی نەبووە ..ووتی نا رەئی پارتی نیەو رەئی نێچیرڤان خۆی بووەو لەسەر ئەوەش قسەم لەگەڵ کردووەو وتبوی نامەم بۆ نوسیوە وداوای ئیعتزارم کردووە لیّ ی منیش ووتم راستە.. پاشان کاك مەسعود وتی بەرەئی تۆ یەکێتی چی دەکات و رەئی تۆ چیە وتم کاك مەسعود لەوانەیە رەئی من جیاوازبیّ وەکو رەئی ئێوە لەراگەیاندندا گوێم لێیەتی... وتم بەرەئی من ئێستا پارتی داوای ئاشتی بکات لەیەکێتی و مرونەت پیشان بدات بۆپارتی باشترە چونکە یەکێتی (٤٠٠)هەزار رەئی هێناوەو تەواو نابێت و هەلومەرجی ناوچەکەش ئەوە دەخوازێت تەنها رێگایەك بۆچارەسەر تەنها ئاشتی و ئاشتی دەتوانیّ چارەسەری کێشەکان بکات یەکێتی تەواو نابێت چونکە هێزێکی سیاسیە من رەئم وایە ...کاك مسعود وتی نابیّ جارێکی کە رازی نابین یەکێتی بەچەکەوە بێتەوە کوردستان من وتم ئەو مەسەلەیە لای من زۆربەقورس ئەیبینم واسەیری روداوەکان مەکە بیّ چەکی یەکێتی کاك مەسعود لەو رۆژەوە ئەو وەزعانە روی داوە ئێمە زیاتر گرنگیمان داوە بەچەك و دەوروپشتی خۆمان ئێستا یەکێتی چۆنی قبولّ دەکات

پاشان کاك سامی قسەی کرد لەوبارەیەوە زۆر لەسەرمەسەلەکان قسەمان کردو پاشان کاك مەسعود وتی ئەوە حکومەت دامەزراوەو جێگای ئێوەش دانراوەو هەموو لایەك پێکەوە بین و ئەو وەزعە بپارێزین و باسی پەیوەندی دوقۆڵیان کردو گەرانەوە ئەو کەلوپەلانەی کەپارتی بردویەتی بگەرێنەوە بۆ حزب لەماوەی چەند رۆژێکدا لیژنەیەك دانراوە لای پارتی کاك سامی عبدالرحمن هەر لای کاك مسعود لە کوبۆنەوەکەبوو... کاك سامی وتی هەموو ئەشیاکانی ئێوە باوەر ناکەم وەربگیرێتەوە بیبژێرین بۆتان تەعویزتان بدەنەوە چونکە بەهێزەکانی پارتیمان وتوە تا سێ رۆژ هەرچیتان گرت بۆخۆتان و لای سۆسیالیست کاك خورشید صادق لیژنەیەکی کەش بۆجێ بەجێ کردنی لەژێر چاودێری لیژنەیەکی کەش کە لە کاك عبداللە ئاگرین و کاك محی الدین رەحیم لەپارتی ویەکێك لەسۆسیالیست وتیان کۆبونەوەیەك بکەین بۆجێ بەجێ کردنی ئەو بریارانە منیش وتم گەرامەوە مەکتەبی سیاسی ئاگادار دەکەین کاك مەسعود داوای کرد هەرئەمرۆ دوای نیوەرۆ لەمەکتەبی سیاسی لەصلاح الدین کۆبونەوەکەی کەش بکرێت من وتم مەسەلەی حکومەت و پەیوەندی دووقۆڵی و هەموو خاڵەکان پەیوەندی دارە بە هەردولاوە بەستراوە بەگەرانەوەی ئەشیاکانی حزب ئێمە تەنها بۆئەو مەبەستەو لەسەر ئەوە قسە دەکەین، ئێمە لە٩/٢٤ یاداشتێکمان داونەتێ لەسەر هەڵوێستی پارتی و رای خۆمان نوسیوە بەشێك لەوکارانەی پارتی کردویەتی دژی سۆسیالیست نوسراوەو تەئکیدی دەکەینەوە بەجدی وەری بگرن و هاتنی ئێمەش بۆئێرە بەجدی وەربگرن هەمان رۆژ لەصلاح الدین کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی و ئێمە لەمەکتەبی سیاسی پارتی کرا ئێمە (٣) کەس بوین من و کاك دلزارو کاك رەمەزان ئەوانیش کاك سامی و کاك عبداللە ئاگرین و چەند کەسێکی کەیان لەسەرکردایەتی بون هەرچوین دانیشتین کاك سامی دوو کامێرای هێنابوو بۆئەوەی گفتوگۆ یاچاوپێکەوتن لەگەڵ

من بكەن چەند جارێك باسيان كرد كاك عبدالله ئاگرينيش هاتبووە پەنامەوە وتى ئەو چاوپێكەوتنە زۆر گرنگە ووتم گرنگى چيە بلێم ئەمن و ئيستخبارات لەهەولێر نيە.. بلێم پەلامارى هەولێرو دەبابەو سوپاى عێراق وپارتى حەقى خۆى بووە ياكاك سامى بلێ پارتى پێشوازى گەرميان لێ كردين لەهەولێر وتم ئەگەر پێتان باشە دەلێم پارتى و عێراق پێكەوە پەلامارى هەولێريان داو حكومەت و پەرلەمانيان تێك داو يەكەم كەسيش بارەگاى سۆسياليستيان سوتاندو تالآن كرد.. وتيان چۆن.. ووتم من ئەوە رەئى خۆمە دەيلێم هەركات ئێوە هەنگاوى ئيجابيتان نا بۆمەسەلەكان ئەوە منيش ئەوكات قسە دەكەم و دەلێم پارتى ئەو كارەيان كارێكى باش بووە ئەوەشيان خراپ بوە بەلآم ئێستا من نەقسەش دەكەم و نەدەشلێم كارى باشتان كردووە..كاك سامى وتى لاى كاك مەسعوديش وتم... وتى ئەو ئەشيايانەى ئێوە لاى كێيە وتمان لاى پارتيەو لاى فلآن و فلآن وتى وەلآ ئەوە زەحمەتە چونكە ئێمە دەبێت بيبژێرين چونكە بەهێزەكانى خۆمان ووتوە تا(٣) رۆژ هەرچيتان دەست كەوت بۆخۆتان شتى جەلال.. ووتم كاك سامى هى سۆسياليست هى يەكێتى نيە وهى سۆسياليستە.. وتى واى لێهاتووە بەلآم ئێمە لەماوەى (٤)رۆژدا هەموو شتەكان كۆدەكەينەوە يا تەعويزتان لەجياتى بۆدەكەينەوە كاك مەسعود جدى بوو بەلآم ئەوانى كە خاويان دەكردەوە بەرەئى ئێمە هەرچەندە هەردوايان دەخست ليژنە دەنراو ئێمە گەراينەوەو چومە هەولێر كاك خورشيدو كاك سابير و كاك هوشيارم بينى و قسەمان لەگەڵ كردن و ئيشوكاريان ديارى كراوكاك خورشيد چاودێرى بكات ئيتر ئێمە گەراينەوەو كاك دلزاريش مان بەجێ هێشت بۆهەندێك ئيشوكارو ئێمەش بەرەو كۆيەو دوكان وسلێمانى گەراينەوە شەو گەيشتينەوە سلێمانى ئاگادارى برادەرانى ناوشارم كرد چى بكەن و لەكۆبونەوە لەگەڵ كاك مەسعود مامۆستامەلا عەلى زۆر قسەو وەسفى

کاك مەسعودی کرد دژی مام جەلال قسەی دەکرد پێم ناخۆشبوو نەك هەربۆ کاك مەسعود مامۆستا پیاوێکی ئاینی و عالم و تەمەنێکی زۆرو ریشی سپی حەق نەبوو بەپێ ی تەمەنیش بێت لەگەڵ کاك مەسعود واقسەبکات هەرچەندە کاك مەسعود دەموچاوی پێ ی خۆش نەبوو وتی مامۆستا جەنابت لەمن بەتەمەن تریت کاك مسعود قسەکانی پێ خۆش نەبوو... من مامۆستام خۆش دەویست تارێگای ملەخوردی لێ نەگرتین و تائەو رۆژەش ئەو قسانەی کرد بەناوی منیشەوە هەرقسەی دەکرد کەخۆشم دانیشتبوم بەلاّم بۆئەوە قسەکانی دەکرد کەحەزی دەکرد کێشە بۆئێمە دروست نەبێت وکاك مەسعود بگاتە قەناعەت و هەردوولا بگەینە ئەنجامێك بەلاّم مامۆستا لەهەمو حالەتێکدا دەبێت یادەبوایە نەسیحەتی کەسانی کەی بکردایە ئەگەرلەگوێشی نەگرن واپیشان بدات کەنەسیحەتی دەکات چونکە مامۆستا لای من رەئی خۆی دەوت لەسەر پارتی وکاك مەسعودکە رەئیەکەی لەسەر کاك مسعود چیە... من رەئی خۆم ووت لەسەر مەسەلەکان ئیتر ئەوان چەند لایان پەسەند بوو ئەوە مشکیلەی من نەبوو من لەبەر رەئی پارتی وبە تایبەتی شەخسی کاك مسعود بارزانی بو وە مامۆستا مەلاعەلی و کاك محێدین رەحیم و رەئی برادەرانی خۆمان و رەئی خەڵکەکەش ئەو سەفەرەم کرد و فشاری کاك مەلاعەلی وەکو دۆستێك و کاك محی الدین رەحیم چونکە هەموو شتەکانی باس کردو وتی ئەگەر لەسلێمانی یاهەولێر دانەنیشیت لەگوڵەخانەو سورێنیش دامەنیشە یاسلێمانی و هەلێریا بۆئێران کاك محی الدین زۆری هەوڵدا بۆئەوەی زوو شتەکان جێ بەجێ بکرێت فائیدەی نەبوو هەندێکیان ئامادە کردبوو بەلاّم مەسەلەکە هەڵوێستی سیاسی لەسەر روداوەکان بوو ئەو تەعداو ئیهانەیەش پارتی لەماوەیەدا لەسەر سۆسیالیست و هەتاوەکو شەخسی لەسەرکردایەتیشیان دەکرد قابیلی قبوڵ نەبون و نەدەکرا لەوە زیاتر سەبر بکەین چونکە گەیشتبووە سەر ئێسقان جگە

لەتاوانی کەش کردبویان بەلاّم لەوانەبوو خەڵکی ناوسۆسیالیست زۆریان پەلەبوو لەو مەوعیدەی کەهەبوو زوتروهەتا ئێران و یەکێتی و زۆر لایەنی کەش چاوەڕێ ی هەڵوێستی ئێمە بون لەسەر روداوەکان ئێمە هیچ تەئیدێکی پارتیمان نەکردووە نەبەدەم یائەوەی چوین و نەپیرۆزبایشمان لێ کردن بەعەمەلیش دژی هەڵوێستەکان بوین ئەوانیش تالەدواجار پەشیمان بونەوەو زۆریان نەمەیان بۆمن نوسی و ئامادەیی خۆیان پیشان داو کاك بروسك و کاك عارف وزۆری کەیان هەوڵی بەردەوامی کاك محی الدینیش دەیانویست وەزعەکان لەگەڵمان چاك بکەنەوەو ئاڵۆزی و گرژیەکە خاو بکەنەوە لەگەڵماندا هەندێك مەقەریان بۆچۆڵ دەکردین و لەوبابەتە بەلاّم ئێمە نەمان دەتوانی زیاتر چاوەڕێیان بکەین، لە١/١٠/١٩٩٦ چومە گوڵەخانە میوان و خەڵکێکی زۆر لەوێ بون ئێمەش خەریکی ئیشوکار بوین و جادەش دەکرا لەدەرەکۆرە بزوتنەوەی ئیسلامی زۆر دژایەتیان دەکردین لەوچەند رۆژەدا هەتا رێگای هاتوچۆیان لێ دەبرین لەملەخوردەوە لەسەر داوای پارتی، لە٢/١٠ لەگوڵەخانەوە چومە ریشێن و بۆمیری سور بۆلای براەرانی مەکتەبی عەسکەری و پاشان بۆدەرەکۆرە ئەندامانی سەرکردایەتی لەوێ بون عەقەراتیش بەدرێژایی ناوچەکە دانرابوو لەبانی شارەوە تالای توتمان و قوچی بەردەبەل و جۆمەرەسی پێشمەرگەی لێ دامەزرابوو ئازوقەو بەتانی وچادر وخانوش دەکران لەوجێگایانەی پێویست بون هەروا بەردەوام دۆشکا سەردەخرانە سەرشاخ و تۆپ هەموی ئامادەو تەواو کرابون لەسورێن شەو لایان ماینەوە ...لەسورێن بەیادی جاران لەساڵی ١٩٧٦ وە لەوناوە بوین تا١٩٨٠ بارەگاوماڵی خۆم لەوێ بوو پاشان تا ١٩٨٨ و تا١٩٩١ هەرلەوێ ماینەوە و پاشان گەراینەوە ناوشاردوای راپەرینەکەو دوای ئەوەش تائەورۆژەو ئێستاش هەرلەوێ مەقەری لێ یە.. ئەوشەوە شەوێکی ناخۆش نەبوو جگە لەوەی ئازاد بوین لەوچیایە هەوایەکی پاکی ئەوکوێستانە خۆش

بوو..كاك محمد دۆلآشی و كاك سەيدقادر نامەيان نارد كەسەريان لێ بدەم لەمەريوان ئيشوكاريان زۆرەو ئەوان غەمی ئەوەيان بوو من لەو هاتوچۆيەدا توشی مشكيلەيەك ببم، لە١٠/٣ لەدەرە كۆرەوە بەرێ كەوتم بۆمبری سورو ريشێن وبۆ گوڵەخانە دوای كەمێك ئيسراحەت كاك بارام هات و وتی داوايان كردووە بۆئێران برۆيت لەدوای نيوەرۆ بەرێ كەوتم بۆ بۆئێلاپێ و وشكەناو و ملەخورد ودزلی ومەريوان وكانی دينار دوای ئەوەی هەمو شتمان بەبرادەرانی خۆمان ووت بەلآم برياری ئەوەمان دا ئيتر ئەگەر پارتی گێچەڵی پێ كردين دەستيان لێ بكەينەوەو شەريان بكەين بەلآم لەجێگای كاريگەريان واتە جێگای دەست ديار بێت ئەگەر ئەوان هەروا سوربون لەسەرمان دوای ئەوەی بريارمان داو خۆمان كۆكردەوە وتمان ئێستا بێ منەتين لەپارتی دێنە سەرمان شەريان دەكەين و دەشيان شكێنين بەتايبەتی لەسورێن زۆر ئامادەين بەلآم دەست پێشخەر نابين تائەوان دەست پێ دەكەن خومان لەشەری پارتی لادەين، لە١٠/٤ من وكاك خەليل و كاك بارام چوينە سنە و برادەرانی بەرپرسانی سنە سەردانيان كردين و زۆرنارەحەت بون لێمان و زۆرعاجز بون بۆئێمە چوين بۆ صلاح الدين و بۆ كۆبونەوەمان كردووە لەگەڵ لەگەل كاك مسعود بارزانی و پارتی و پارتی رۆيشتوە لەبەرەی گەل نەماوەو ئێمە هەڵەيەكی زۆر گەورەمان كردووە منيش باسم كرد كەچونی ئێمە كاری سياسيەو ئێمە تابكرێت بەئاشتيانە چارەسەری كێشەكان دەكەين ئەوان هەرسور بون لەسەر قسەی خۆيان من بەراستی زۆرم پێ ناخۆش بوو وتم كاكە ئێمە خۆمان برياری خۆمان ئەدەين وائێستاش دەگەرێمەوە بۆكوردستان و نەدژی پارتی دەبم و نەدژی يەكێتيش دەبم ئێمە حزبێكی سەربەخۆين وتيان مەبەستمان ئەوە نەبووەو ئێوە دۆستی ئێمەن بەتايبەتی شەخسی خۆت پيلانێكت بۆ دادەنێن وتيا بچی ئێمە غەمی تۆمان بووە وادياربوو من گەيشتبومە مەريوان خەبەريان بەمام جەلال دابوو

مام جەلالیش کاك شێخ محمد شاکەلی ناردبوو بۆسنە بۆلام قسەلەگەڵ من بکات لەسەر ئەو مەسەلانە وادیاربوو لەسنە لەیەك گۆرابوین و یەکمان نەدیبوو قەرارگای رەمەزان لەتەهران و لەنەغەدە لەدوای یەك تەلەفۆنیان بۆکردم هەرچی زووترە بگەمە نەغەدەو کۆبونەوەی زەروری هەیەو بەرپرسانی سنەش داوایان لێکردم هەرچۆن بووە مام جەلال ببینم باشەو قسە بکەین لەسەر روداوەکان هەرسێ لامان، لە٥/١٠ لەسنە وە چومە نەغەدە بۆبارەگای عیلاقاتی حزب لای مامۆستا سەلام گۆمەشینی وتی قەرارگا داوا دەکات چەند رۆژە لەگەڵ مەسئولی قەرارگا ئاغای مزگریان وتی ئاقای محمد جەعفەری سحرارای وئاغای سەردار مسجیدییش وتویانە زەرورە بێتە لامان هەرهەمان رۆژ کۆبوینەوە دوای ئەوەش لەقەرارگا پێیان ناخۆش بوو خۆیان پیشان دا کەمن رۆیشتومەتە صلاح الدین و کاك مسعودو پارتیم دیوە... وتم من دە گە رێمەوە هەرچی خۆمان بمانەوێت وائەکەین هەرچیش بکەین بە قەناعەتی خۆمان نەبێت نایکەین وا من دە گە رێمە وە قسەکانیان گۆری خۆشحاڵیان پیشاندا سۆسیالیست هەمیشە لەسەنگەری بەرگریدا بووەو ئێستاش هەروا لەسە نگەری بەرگریدا دەبن و لەسەر وەزعەکان وهاوکاری پارتی و عێراق و پەلاماری هەولێر و شەرەکان و ئێستاش وەزعەکان بەرەو کوێ دەروات قسەکرا لەهەموو رویەکەوەو ئەوان بەراشکاوی داوای هاوکاری نێوان سۆسیالیست و یەکێتیان کردو هاوکاری یەکێتی هاوکاری کۆماری ئیسلامیەو هێزە شۆرشگێرەکان پێکەوە بن وداوایان کرد سەری مام جەلال بدەم و لەنزیکەوە قسەلەسەر روداوەکان بکەین وئەوان ئامادەن هەموو هاوکاریەك بکەن و منیش ووتم ئێمە تائێستا پارتی درێغی نەکردوە لەسەرمان دژمان بوە بەڵام ئێمە هەر چاوەرێ ی ئەوە بوین خۆمان لەشەر دور بگرین وخۆشمان کۆبکەینەوەو دوربین لەشەر ئێمە بریاری شەرمان نەبووە لەسەرپارتی بەڵام پارتی پەلاماری بارەگای ئێمەی دا لە٨/٣١ وە لەشاری

هەولێروتا گەیشتە پێنجوێن وکفری درێغی لێ نەکردوین ئێمەش بێ ئەوەی ئێوە ببینین بریارمان داوە ئەگەر پارتی لەوەزیاتر دژمان بێت هیچیان لێ قبولْ ناکەین و رەدی توندویان ئەدەینەوە بەبێ ئەوەی لەگەلْ ئێوەو یەکێتی قسە بکەین ئێستاش تاپارتی دەست پێشخەری نەکات نامانەوێت شەر بکەین بەلاّم پارتی ئەوەی پێ کراوە دژی ئێمە لەهەموو رویەکەوە کردویانە لەسەرمان ئێمە بریاری بەرگریمان داوە دوای ئەوەی ئەوان خۆیان لەوە دەپاراست کەشتێك مۆر بکەین لەو رووەوە وتی لە١٠/٦ سەردار ئەحمەدی فروزەندەوئاغای ئەحمەد کازمی بەرپرسی قەرارگای حەمزەو ئەو برادەرانەی کەیان دەچنە لای مام جەلال و تۆیش لەوێ قسە دەکەین لەسەر روداوەکان، شەوی ٥-١٩٩٦/١٠/٦ لەمالّی مامۆستا سەلام بوین لەنەغەدە شەو مامۆستا نازم نوێنەری یەکێتی لەئێران سەردانی کردین و قسەمان کردو وتی کاك شێخ محمد شاکەلی بەدواتا هاتووەو ئێستاش تەلەفۆنی بۆمن کردووەو ئەو بۆسنە رۆیشتووەو تۆ بۆئێرە نەیزانیوە وتویەتی بەلْکو لەوێ لەجێگایەك دیاری بکات بۆ بینینم زەوریە منیش ووتم وەلاّ کۆبونەوە هەبووە لێرەو بەتەماشم بۆسبەینێ سەردانی زەلّێ بکەم بۆلای مام جەلال لەو رووەوە قسە بکەین لەسەر روداوەکان و شەویش مامۆستا شێخ محمد شاکەلی تەلەفۆنی کرد بەناوی مام جەلالەوە کەپێ ی خۆشە چاوی پێم بکەوێت مامۆستا نازم وتی ئێستا من ئاگاداری مام جەلال دەکەم من بەئێرانیەکانم وت ئەگەر من ئێستا برۆمە زەلّێ لەوانەیە پارتی پەلاماری هێزەکانمان بدات بەلاّم ئەوان هەرلەسەر داوای خۆیان سورن کەسەری زەلّێ بدەم لەسەعات (٨)ی سەرلەبەیانی لەنەغەدە و خانەو سەردەشت و قاسمەرەش قەرارگاش لەگەلْمان هات و لەقاسمەرەش ئێمەیان دناو هەلیکۆپتەرێك پێش ئێمە لەوێ نیشتبوەوەو بەرپرسانی ئێرانی چوبون بۆزەلّێ و نۆکان و لەزەلّێ لای مام جەلال بون لەسەر روداوەکان قسەمان کرد وادیاربوو زۆرکەس لەوێ گلەیی

لەسـەر ئێمـە کردبـوو هاوکـاری پـارتی دەکـەین یایـەکێتی وەهەریەکـە رەئـی بەشێوەیەك بوو مام جەلال وتی من رەئم هەروا بووە کەتۆ لەبـەرەی گـەل و حزبـی سۆسیالیـست لەبـەرەی جـەماوەرو یـەکێتی نیشتمانی هەمیـشە سـەنگەری بـووەو هەرواش بوەو هەرواش دەبێت و زۆر قسە لەسەر روداوەکـانی ئـەوکات کـران بـەلاّم مام جەلال نەشتێکی مەوزوعی لەگەڵ ئێمە باس کرد نەباسـی رێکـەوتنی دووقـۆڵی کرد نوێنەری ئێرانمانیش لەگەڵدابوو واتە شتێکی رونمان لانەبوو بەلاّم من پێم وتـن ئەگـەر هێـزی ئێـوە هەنـدێك بێتـەوە لەسـلێمانی جەماوەرەکـە خـۆی رادەپـەرێت لـەپارتی و زۆریـش لێیـان بێـزارن واش بـوو نـەك هەرلەسـلێمانی بـەڵکو هـەولێریش راستیەکەو هەیە من هەستم کـرد یـەکێتی بەتـەمای شـتێك هەیـە و ئێرانیـەکان زۆر شتیان لەگەڵ ئێمە باس کردبوو هەتا دابەش کردنی هێزەکان وادیاربوو مـام جـەلال زۆر بەحەزەرەوە قسەی لەگەڵ ئێمە دەکرد پاشان مام جەلال وتـی کـاك قادرعـەزیز لێرەیەو وتم پێم خۆشە ببینم کـاك قـادریش هـات وقسەمان کـردو کەکۆبونـەوەش بکەین لەهەموو رویەکەوە لەو کۆبونەوەیەدا قسە بکـەین کـاك قـادر وتـی بۆئێـستا کۆبونەوە نەکەین وشتێك ئامادە بکەین و بلاّوی نەکەینەوە تاوەختی دێـت مـن وتم بادوای بخەین مام جەلالیش وتی بۆ (١٤)ی مانگ لێـرە.. منـیش ووتم پـێ دەچـێت (١٤)ی مانگ لەسلێمانی بکەین مام جەلالیش وتی منیش هـەر رەئـم وایـە هـەروەها مـام جـەلال وتـی وادیـارە بـاوەرت بەکاکـە حمـەو سۆسیالیـست نیـە (١٤)ی مـانگ بێنەوە کاك قادر وتی باوەرم بەهەردوولاتان نیە..ووتم من وکاك قـادر رەئمـان وایـە ئێستا رێکەوین چونکە بەگرتن و ببینێ شـارێك گیرایـەوە یـەکێتی ایمـان پەشـیمان دەبێتەوە یەکێتی زوو دۆست و هاوپـەیمانی خـۆی لـە بـیر ئـەکات ئـەوەی لـەزەڵێ ئێستا ئەیلێت سەیدصادقی کەوتە دەست پەشیمان دەبێتەوە کاك قـادر وتـی وەلا راستە ببیستن هەندێك جێگا گیرایەوە ئیتر لەگەڵ ئێمـەدا هـیچ ناکـەن مـام جـەلال

وتی من دەبمە کەفیلی سۆسیالیست و یەکێتیش کەوا نابێت و بەدڵ هەمومان دەبێت بیری ئەو رۆژەی ئاگری قەلاچۆلان و زەڵێ و چادرو فەرەبالغیم دەکردەوە پێم ناخۆشبوو ئەوشەوە قسەی زۆرکرا هەر ئەو شەوەش ناردمان بەدوای هێزی شێنێ بارەگایان لەوێ بوو وتمان لەحەرەسیات وشتدا هاوکاری یەکێتی بکەن لەوناوە ، سەرلەبەیانی ١٩٩٦/١٠/٧ هەندێك قسەمان لەگەڵ مام جەلال کرد زۆر بەتەحەفوزەوە قسەی دەکرد وایدەزانی ئێمە بەقەناعەتەوە ئەو سەردانەمان نەکردووە زۆر لەهەموو شتێك خۆی دەپاراست و ئێمەش گەرابینەوە لەناوزەنگ و بۆتۆکان و قاسمەرەش و سەردەشت و بۆسنە، لە١٠/٨ لەسنەوە بەرێ کەوتم بۆمەریوان لەگەڵ کاك خەلیل و کاك بارام دا سەردانی قەرارگامان کردو وتیان کاك شەوکەت لەوناوەیەو خەریکی خۆئامادەکردن بون قەرارگاش هەمووشتی بۆئامادە کردبون پاشان چوینە بارەگای عیلاقاتی حزب لەمەریوان هەندێك لەبرادەرانی یەکێتی سەردانیان کردین ئێوارە لەماڵی کاك بارام بوم لەکانی دینار کاك شەوکەت وئاغای بەنی ئەحمەدوئاغای حورمەت و برادەرانی قەرارگا سەردانیان کردین و هەندێك سوعبەتمان کردو وتم کاك شەوکەت هاوکاری ئێران خراپەو ئەوانەی هاوکاری ئێران دەکەن دوژمنی کوردەو دژی حکومەتی هەرێم و پەرلەمان دەکەن کلکایەتی بۆئێران خۆی دەیزانی چی دەڵێم و قەرارگاش دەیانزانی نیوە شەو کاك شەوکەتم لەقەرارگا بینی ئەو شەوە ناخۆش نەبوو بەلام وەزعەکان بەگشتی ناخۆشبوون، لە١٠/٩ لەمەریوان و کانی دینار و قەرارگاو ئەوناوە بوین، لە١٠/١٠ لەمەریوان بوین رادیۆی یەکێتی خوێندیەوە کەمام جەلال پێشوازی لە محمدحاجی محمود کردووە لەزەڵێ وادیاربوو پارتی لەوە حەزەریان کردبوو ئەو هێزەیان ناردبوەوە ئەو ناوە ، لە١٠/١١ لەمەریوانەوە دووسەیارە باری بەتانی وئازوقەو فیشەکمان بردە کانی خەیاران و لەوێوە هێسترو شت هات و باریان کردوکاك محمد

دۆلاشی لەگەڵیدا گەرایەوە بۆمیری سورو ئێمە چوینە سەرسورێن لەگەڵ کاك مەلاعمرو برادەران سەیری ناوچەکەمان کردو شەر لەدەوری سنوری پێنجوێن کەم کەم هەبوو تۆپیش جارجار لەملەخوردەوە دەتەقی و هێزەکانی یەکێتی چوبونە پێشەوەو شەو گەرابونەوە دواوە ئێمەش گەراینەوە بۆ مەریوان بروسکەیەك هات کەپارتی لیوایەکی هێناوە بۆ دەوروبەری شیرەمەرو ئەوناوە ئەگەر فریا نەکەون ئەوان بەتەمای ئەوەن بۆپشتی بارەگاکانی ئێمەو بەرەو بانی شار برۆن ئێمە نەمان دەزانی کام رۆژو کەی یەکێتی هێرشی خۆی دەست پێ دەکات ئێمە وەلام مان دانەوە ئەگەر شتی وا هەیە کاك محمد دۆلاشی بەرێگاوەیە بریاری تەواوی پێیەو لەهەر حاڵەتێك دەبێت ئەوان سەرکەوتن بەدەست نەهێنن وئێوە دەستی خۆتانیان لێ بوەشێنن، لەشەوی ١١-١٢/١٠/١٩٩٦ مەکتەبی عەسکەری دابوی لەهێزەکانی پارتی ئەو هیزەی کە هاتبوە نێوان بانی شاری تازەو شیرەمەروبارەگا و شوێنەکانیان گیراو تەفروتونا کران، لە١٢/١٠ لە مەریوان بوم برادەرانی ئێمە چاوەرێ ی رەد فعلی پارتی بون و بەتەما بون هەموو هێزەکانی پارتی بێنە سەریان هەموو پێشمەرگەکانی ئێمە لەسەنگەر دامەزرابون بەدرێژایی ناوچەکە.. بروسکەم بۆهات کەلەهێزەکەی پارتی دراوەو دەست کەوت زۆر بوەو دەست بەسەر فەوجێکیاندا گیراوە لەلایەن سۆسیالیستەوە من ووتم دەگەرێمەوە لەسورێن و کانی خەیاران و چنارەوە پێشمەرگە لەوناوەیەو سەیارەکان بمانبات و چەکیشمان پێ نەبور یەك پێشمەرگەی بێ چەکم لەگەڵدا بووکاك سەرکەوت ئەوانم بەجێ هێشت بەتەنهاش هاتبوم هیچ نەبوو ئەوکات لەسورێنیش هەموو پێشمەرگەی سۆسیالیستی لێبوو کاك محمدی حمە سەعید توێڵەیی بەرپرسی یەکێتی بوو وتی منیش حەز ئەکەم لای ئێوەوە بێمەوە لەگەڵ تۆدا وتم زۆرباشە.. ووتی ئێوە وازوتر شەرتان دەست پێکردوەو دەست پێ دەکەن و برادەرانی ئێمەش جارێ هەردوای

ئەخەن باوەرم نیە یەکێتی بە ئاسانی بگەڕێتەوە کوردستان من لەگەڵ ئێوە دەبم کاك برزو وکاك محمد غەفور ئێمەیان تانزیك هەشەری لای کانی خەیاران برد ماوەیەك بوو بەپێ نەگەرابوم من و کاك محمدی حمەسعید تەوێڵەیی کە عاجز ببوو لە یە کێتی لە سەر بەرپرسی میحوەر کێشەیان هەبو هاتەلای ئێمە من وتم لەوکاتەدا بۆ خۆشت وئێمەش جوان نیە بێیتە لای سۆسیالیست لێرەبە تائیشەکانت لەگەڵ برادەرەکانی خۆت تەواو ئەکەیت ماڵی خۆتە چونکە کاك محمدی حمە سەعید پێشمەرگەی کۆن وتێکۆشەرێکی دڵسۆزی کوردایەتی وحزبەکەی خۆشی بوو برادەرو رەفیقمانە من هەر وەکو برادەرەکانی خۆم سەیرم دەکرد خۆم بەتەنها گەرامەوە لەگەڵ خۆم هێنامەوە من وکاك محمدویەك پێشمەرگەی کەش کاك سەرکەوت هەرچەندە هەر سێکمان چەکمان پێ نەبو لەکانی خەیارانەوە بۆ چنارە کاك حمەی حمەسەعید بەقەدەر خۆم باوەرم پێبوو پێشمەرگەی کۆن لای من رێزی زۆری هەبو لەهەر لایەنێك بوایە بەلام سەرکەوتین ودابەزین تاریکی کردو زۆریش بەناو ئەلغام دەسورانەوە رێگاشمان لێ ون بوو چەکمان پێ نەبوو بەلام هەموولایەکمان پێشمەرگەی سۆسیالیست بوو ماندوبوین لەوسەر چیایە خەوتین لەپشتی چنارەوە تابەیانی رۆژ بوەوە دابەزینە خوارەوە بۆناو چنارە چاومان لەکەمین و پێشمەرگەبوو لەوناوە ئێمە گەیشتین پێشمەرگە لە سەر کانیەکەی چنارەی سورێن لەدەرەکۆرەوە هات و جیهازەکان قسەیان کردو وتیان ئێوارە پارتی زۆر مەشغوڵ بون لەسەر جادەو کاك محی الدین هاتووەو وتویەتی دەبابەی عێراق دێت ئێوە دەبێ توزێ لەجادەکە دور بکەونەوە نەوەك توشی شەربن لەگەڵیان وادیاربوو کاك محی الدین زانیویەتی یەکێتی سوپای پاسدارانی ئێران وقەرارگای حەمزەو قەرارگای رەمەزان بە تۆپ و راجیمە و بە قیادەی سەر لەشکر ئەحمەدی کازمی لە شارباژێرەوە دوچۆمان ومەروێ وشانەدەرێ وچیای گمۆ

هێرشیان دەست پێ کردوە بۆ ئەوەی خۆیان دەربازبن هەروەها وتی هەواڵ هات کەشەر لەقەلاچۆلان و ئەزمر و ئەوناوەیەو ئێمەش سەری جادەکانمان گرت و کاك محی الدین بەعبداللە وبرادەرانی ئیمەی وتبوو تەقەمان لێ مەکەن عبداللەوبرادەرانیش وتبویان مادام تۆ لەوماوەیە هاوکاریت کردین تەقەشت لێ ناکەین و ئەگەر شتێك هەبێت هاوکاریت دەکەین وتبوی لەسەید صادق دەرم بکەن نەك یەکێتی لێ بێت وتی دەرمان کرد (١٢) سەیارە بون وتمان لەبەرتۆ نەبێت ئەوانەیان دەگرین چونکە ئێوە بریاری شەرتان داوە لەسەرمان ئەوان رۆیشتن سەیارەیەکیان هات بە(٩)کەسەوە گیراو جادەکەمان گرت و پێشمەرگەی پارتی بەرەو سەیدصادق وئەوانی کەشیان ملیان نایە دەریاچەی دەربەندیخان بەرەو هەڵەبجەی تازەو قەرەداغ و دەربەندیخان، لە١٠/١٣ پێشمەرگەی سۆسیالیست گەیشتە سەیدصادق و عەربەت و بەرەو سلێمانی یەکێتیش لەپێنجوێنەوە بەرەو ناڵپارێزو سەیدصادق وەلەلای قەڵادزەوە بۆلای رانیەو لەهەموو لایەك شەرگەرم بو بێ ئەوەی سۆسیالیست و یەکێتی تەنسیقیان هەبێت یائاگایان لە یەك بێت لەوشەرەدا کە تا ئێستاش زۆر لایەن وکەسانێك بە نەخشەی هاوبەشی بزانن بۆ پارتی شکا لەئەزمر کاك مەسعود خۆی لەوێ بوو کاك مەسعود بارزانی وزۆری قیادەی پارتی لەئەزمر بون لای سلێمانی پێشمەرگەی یەکێتیش بەرەو پێنجوێن و ناڵپارێزو سەیدصادق گەرانەوەو پارتی لەهەڵەبجە ئەوەی توانی پەریەوە لەدەریاچەی دەربەندیخان و لەچەمی زەڵمەوە بۆبەری شارەزوور لای هەڵەبجەی تازەو هەندێك فریای سلێمانی کەوت و هەندێك فریای دەربەندیخان و کەلار نەکەوت بەناوچەی گەرمیاندا بەپێ رۆیشتبون کەدوای زۆریان گیران لای سەنگاوو کفری زۆریان لە دەربەندیخان گیران (٥٣)پێشمەرگەی پارتی لە دەربەندیخان یەکێتی بە دیلی گولە بارانی کردن زۆریان لەعەشیرەتی شەمێرانی بون لەرانیەش ٤٥ کەس بە

هەمان شێوە گولە باران کران جەنازەکانیان ناردەوە بۆ صلاحەالدین ئەوە ورەی هێزەکانی پارتی دابەزاندو پارتی هێزی گەورەیان لەئەزمر شکان راستەو خۆ بەجادەی شەستی سلێمانی دا بەکاك مەسعودیشەوە گەرایەوە بۆکۆیەو هەولێرو پێشمەرگەش نیوەی بۆ چەمچەماڵ و ئەوناوە هێزی پارتی بەرەو چەمچەماڵ و سەیتەرەکەی چەمچەماڵ و لەولاشەوە بەرەو جەلولاو خانەقین و دوزخورماتوو یانزیك ترین رەبایەی عێراق لەکوێ بوو ئەوان دەگەیشتنە ئەو جێگایە زۆر شپرزە شکان و هەڵهاتن پێشمەرگەش لەلای عەربەتەوە گەیشتنە ناوشارو یەکێتیش بەقیادەی کاك کۆسرەت لەئەزمرەوە بۆناو سلێمانی و پارتیش بەقیادەی کاك مەسعود بۆ دوکان وکۆیەو بۆ هەولێر بەشێکی هێزەکانی سوپای پاسداران وقەرارگای حەمزە ورەمەزان بەقیادەی سەردار ئەحمەدی کازمی غەرماندەی قەرارگای حەمزە بەتوبخانەو راجیمەوە تا قەلاچۆلان و بە زۆری هێزی پارتی بۆچەمچەماڵ و پاشان سەیتەرەکەی بانی مەقان بۆناو کەرکوك ...یەکەم سەیارەی ئێرانی ئاغای مزگریانم ناسی لە نێوان تاسلوجەو کەڵەواناندا بەرەو دوکان دەرۆشتن و لەوێوە بۆهەولێر گەرانەوە بە شپرزەیی و هەندێکیان گەرابونەوە کۆیە.. لەسەیتەرەکەی چەمچەماڵ رێگایان نەدابوون تابریاریان بۆدێت و دوای ئەو قسانەی پارتی کە(٣)رۆژ ئیشیان بەعێراق بووەو دوای (٣٠)رۆژیش خۆیان پیا کردەوە لە١٢/١٠ ئەو هێزانەی پارتی بەرەو ناو کەرکوك رۆیشتن کاتێك سەیتەرە چاوەرێ ی ئەمربوو دووسەیارەی پێشمەرگە بەدوو دۆشکاوە لەتەکێ وە بەرەو چەمچەماڵ رۆیشتن ئەوان لەترسا خۆیان کردبونە ناو سەیتەرەکەدا وتبویان بێنە ئەودیوی سەیتەرەکە یەکێکیان وتبوی یەك سەیارە دۆشکای لەسەرە لەسەر ئەوە سەیتەرەکە دابوی لەجێگر لەشکرێکیان بەناوی زراری حاجی شێخ قادر کوری حاجی شیخ قادر ئەوەی کە لەشکری ئیسلامی دروست کردبوو کاتی خۆی چەك

کران و گیران و لێیان دا لەگەڵ یەکێکی کەشیان کەبەرپرسی پاراستنیان بوو لەویشیان دابوو قسەیان بەزۆریان وتبون هەرشتێك دەبێت هەڵدێن و لەئێمەشی تێك دەدەن بەهەرحاڵ لەناو کەرکوکیش مناڵ بەتەماتەو بەردو فیکە کردن بەهێزەکەی پارتی و قسەیان کردبو پارتیش زۆر بەشەرمەزاریەوە تێپەڕ بوون لەکەرکوك .. لەولاشەوە پارتی شکان لای رانیەوە بەرەو خەلیفان و شەقڵاوەوکۆیەو دیگەڵەو بەرە وناو هەولێر... پارتی لە هەولێرو صلاح الدینە وە بەرەوبادینان و موصل بەرێ کەوتبون ماڵ وخۆیان دەردەکرد.. پارتی کوشتاری زۆربوو لەوسنورانە بەتایبەتی رانیەو دەربەندیخان جگە لەوەی هەندێك بەناوی بزوتنەوەی ئیسلامیەوە لەهەڵەبجە مابونەوە لەژێر باڵی بزوتنەوەدا لەسنوری هەڵەبجە کۆتاییان پێهات و هەموویان کەوتنە لایەکەوە بەرەو لای هەولێر.. بەیانی زووبوو گەیشتمە ناو چنارە بۆلای برادەرانی پێشمەرگە وتیان ئێستا پێشمەرگە گەیشتوەتە سلێمانی و دەربەندیخان و رانیە هێزمان رۆیشتون هەرئەوەی مابونەوە جگە لەوەی پێویست بوو لەمەقەرات بن ئێمەش چوینە دەرەکۆرەو لەوێ بەسەیارە بۆگوڵەخانەو سەیتەرەکەو لەوێ هێزێکی هاوبەشمان ئامادە کرد کاك عەتا سەراوی وکاك تایەر گرێزەیی و ئەوانەمان بۆ هەڵەبجە بەرێ کرد کاك محمد حمەسعید داوای کرد منیش حەز ئەکەم لەگەڵ ئەوبرادەرانەدا برۆم بۆ هەڵەبجە لەو زیاتر خەڵك ئەناسم لەگەڵ ئەوان ناردمان بۆ هەڵەبجە چوینە سەیدصادق لەوێش هێزێکی کەمان لەوێ بوو پاشان هێزێکی کەی یەکێتی چوبون برادەرانمان هەندێکیان لەرێگابوون کاك محمد دۆڵاشی لەچەناخچیان پێمان لە بازیانە وە گەرابوەوە گەیشت لەلای گوڵەخانەوە گەرابونەوە دوو دۆشکای هێنابوو لەسەیارەکەیدا بوو ئێمەش چوینە سلێمانی و سەری پارێزگامان دا کاك کۆسرەت و کاك مولازم عمرو کاك سالاریش کە پارێزگاری سلیمانی یە گەیشتبووە مێزەکەی خۆی و لە پێشمەرگە نارازی بو بۆوادەکرێت و

بۆوا تەسەروفات دەگرێت کاك کۆسرەت هەندێك کاك سالار عەزیزی هێواش کردەوە و ئەو پێشمەرگەی شەری کردبوو پارتی شکابون پاشان هێز بەرێ کرا بۆلای کۆیەو دێگەڵە لەنزیك دێگەڵە عێراق ئاگاداری یەکێتی کردبوو لەوەولا برۆنە پێشەوە بەرەو هەولێر لێیان دەدەن و تۆپیشیان لەدەوری کۆیەو هێزەکانی یەکێتی دابوو، لە۱۰/۱٤ لەسلێمانیەوە چومە رانیەو سەردانی بارەگامان کردو پاشان بۆسەروچاوەو بۆدۆڵی بالیسان و لای بالیسان یەکێتی لێبوو شەربوو لەوێ لەخەتێ و لەزینە شێرو پشتی توتمەی سەروترەوە لەشەردا بون ئێمەش رۆیشتین کاك کۆسرەت لەوێ بوو هێرشمان بۆکردن ئەوان شکان و ئێمەش تالای دارو شەخسێك، هەبوو لای بناوێ شکان و بەدوایاندا تاگوندی ئالانە و ئەوناوە رۆیشتین بەلام زۆر مونەزەم نەبون ئێمە لەرۆیشتنەکەدا زۆری هەربەجادەدا رۆیشتین لەجیاتی ئەوەی هێز بەرەو سەرەوە بنێرین بەلام پارتی مقاوەمەیان بۆنەدەکراو هەڵدەهاتن ئێمەش رۆیشتین بەدوایاندا تابەرامبەری کۆرەك لای خەلیفان رۆیشتین شەو درەنگ بوو لای ئالانە لە دورەوە پارتی لەسەر شاخەکەوە هەندێك تەقەیان کرد پێشمەرگە دامەزران و ئێمەش گەراینەوە رانیەو شەو لەماڵی کاك خۆشەوی بوین لەگەڵ کاك کۆسرەت وکاك مولازم عمر و برادەرانی کە پاشان چوینە بارەگای رانیەو خەریکی ئیشوکارو وەزعی ناوچەکە بوین دوای نیوەرۆیش مام جەلال هاتە رانیەو لەبارەگای مەڵبەندی (۸) بوو ئێمەش چوین سەردانمان کردن زۆر قەرەباڵغ بوون هەندێك نەبرادەرانی ئێرانیش لەگەڵ مام جەلال لەوێ بون وەهەندێك رۆژنامەنوسی تورکی لەوێ بون مام جەلال قسەی لەگەڵ دەکردن ئیترئێمە هەڵساین برۆین مام جەلال وتی ئێمە ئێوارە لەماڵی سوارە ئاغاین لەسەرکەپکان حەز دەکەین ئێوەش بێنە ئەوێ و شەو لەوێ قسە دەکەین هەر لەوێ بوین کاك حەیدەر فەیلی وهاورێیانی حزبی شیوعی هاتبون لەوێش هەندێك قسەمان کردو ئەوانیش باسی ئەوەیان کرد کەپارتی لەهەولێرو

شەقلاوەو صلاح الدین پێشان مالی مەسئولەکان چۆڵیان کردووەو هەڵهاتون و بەرەو موصلّ و دهۆك دەرۆن و زۆر ورەیان روخاوە من هەڵسام وکاك حەیدەر گەرابونەوەو وتبویان محمدی حاجی محمود فلانمان دیوەو ئێرانی لەگەلّ بووە ووتم من میوان بوم لای یەکێتی و ئێرانی لەوێ بون وادیاربوو بۆتەئکیدی کەوای وتووە ئەو هەموو روداوە ئێمە نەرێکەوتن لەگەلّ ئێران و نەلەگەلّ یەکێتی مان نەبوو بەرنامەی هاوبەشمان نەبوو مەوعیدو پێکەوە هجومان نەبوو تەنها ئەوەبوو پارتی زۆر عزیەتی ئێمەیان دەداو ئێمەش خۆمان کۆدەکردەوە بۆ سورێن و بریارمان دابوو شەر نەکەین تا نەیەنە سەرمان ئێمە کەچوینە شەر پێشمەرگەی پارتی لای شیرەمەر شکان هیچ پەیوەندی و چاوەرێش نەبوین یەکێتی بێتە ناو شەرەکەوە ئێمە هەر بۆخۆمان بریارمان دا بێنە سەرمان بەرگری بکەین لەخۆمان لەسورێن واتە ئێمە دژی شەر بوین بەلام پارتی بە ناحەق شەری پێ دە فرۆشتین واتیّ گەیشتبون هێزێکی گەورەی وەکو یەکێتی یان شکاندوە ئەوە سۆسالیست لە گەلّ ئەوان پاك ئەکەینەوە سۆسیالیست لەبەر ئەوەی نە پارەمان هەبوو نەملکومالّ نە سەروەتی کوردستانمان لە دەست بو بۆیە ئێمە لە پارتی ویەکێتی باشتر شەرمان پێ ئەکرا وادەرکەوت پارتی بەعێراقەوە شەری پێ ئەکرێ و وایەکێتی نیشتمانیش بە ئێرانە وە شەری پێ ئەکرێ بەلام سۆسیالیست بە بێ هەر چوارلایان بۆ خۆی شەری پێ ئەکرێ لە هەردوو حزبی ناکۆك یەکێتی وپارتی سەرە تای شەر یەکێتی لە هەندێك ناوچە پاشە کشەی بەهێزی پارتی کرد لەکۆیە ورانیەو قەلا دزەو شەقلاوەو دۆلی بالەیان ورەواندزو تا پارتی خۆی کۆکردەوە بۆ شەر ئیتر مقابیلی یەك وەستان خەتی بەرگریان دروست کرد تاخۆیان ماندو بون پەنا بۆ ئێران وعێراق وتورکیا بەرن ئەودەولەتانە هاتنە ناو شەرەکەوە بە pkk شەوە بو بە ەراسۆن لە نێوان هەردولادا (٣)هەزار پێشمەرگەی یەکێتی لە شەر بوایە کە پارتی دەهات بە

هاوكاری سوپای عێراقی یا سوپای توركی یاخود یەكێ لەو دەوڵەتانە ئەو هێزە گەورەیەی یەكێتی دەشكا بێ ئەوەی تەقەی پێ بكرێت پارتیش (٣) هەزار پێشمەرگەی لە خەتی شەر بوایە دەیانوت یەكێتی هات بەهاوكاری یاپشتیوانی راجیمەو تۆپی ئێران یا فلأنە هێز پارتی هەڵدەهات شەری پێ نەدەكرا بەلأم ئەگەر هەردوولا هەر خۆیان بوایەن باشترین شەری دەسەو یەخەی یەكیان ئەكردو دەیانوت با پەرێزت پاك بێت واتە هەر چی دیل گیراوە بیان كوژن ئەمەی من دەینوسم سەدەیەكی بە سەردا تێنەپەریوە و(٥٠) ساڵ نابێت وزۆری بە سەردا بروات هەر ١٠ساڵی كەدەبێت ئەگەر خوایارمەتی دام واتە ئەم روداوە دڵتەزین وكارەسات هاوردانەی كوردستان كەسێك بمێنێ هەموی لە بیردەبێت بە تایبەتی ماراسۆنەكانی نێوان هەولێرو سلێمانی وكۆیەو دێگەڵەو رانیە وخەلیفان و رەواندزو چۆمان وسماقولی و شاوێس وهەولێرو كەسنەزان و زۆری كەو ناوچەكەدا لەدوایە هەردوو حزب بەسوپای دەوڵەتێك شەریان پێ ئەكرا،

هاوپەیمانێتی بۆ چی و لەكێ پێكهاتبوو؟

لە١٥/١٠/١٩٩٦ ئێوارەكەی چوینە سەركەپكان لەسۆسیالیست من و كاك محمد دۆلأشی لەیەكێتی نیشتمانی مام جەلال و كاك كۆسرەت و كاك مستەفا چاورەش وكاك مستەفای سەیدقادرو برادەرانی كەی یەكێتی لەوێ بون لە ساڵی كاك سوارە ئاغا بوین ، لە١٦/١٠ چوینە دۆڵی ئالانەو بالیسان و لای بناوێ و ئەوناوە گەراین وپاشان گەراینەوە ، لە١٧/١٠ چومە دۆڵی بالیسان بۆلای برادەران هەندێك هاوانیان لێ داین و شەوگەرامەوە بۆرانیە، لە١٨/١٠ چومە سەنگەسەرو دۆڵی شەهیدان و دۆڵی خانەقاو بۆ قەسرێ و چۆمان و گلاڵەو دارالسلام و زینوێ دارالسلام و بەروی حەسەن بەگ و گەروی هۆمەرئاغا پێشمەرگەمان لێ داناو لەرێگاش گەیشتینە كاك مستەفا چاورەش و كاك مستەفاسەیدقادر پێكەوە رۆیشتین لەو سنورەرە سەردانی

زۆر جێگامان کرد چوینە چۆمان وهەواڵ هات کەپارتی بەپشتیوانی تۆپخانەی عێراق پەلاماری کۆیەی داوەو بەرەو هەیبەت سوڵتان رۆیشتون و وەزعەکە لەوێوە خراپەو ئێمەش شەو گەراینەوە بۆرانیە هەموی چۆڵ بوو کەسی لێ نەماوەولقیش یەك حەرەس نەبێت کەسی لێ نیەو مەڵبەندی یەکێتی هەمووی چۆڵە جگە لەبارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی لەوێ بون وئەویش هەندێك عەشائیرو ئەوانەی سەیارەیان هەبوو لەترسی ئەوەی پارتی نەیبات چوبونە لای بارەگای بزوتنەوە پەنایان بدەن ئێمە زۆر گەراین لەناوشارو دەوروبەری شار کەسمان نەدی پاشان بەرەو قەلادزە رۆیشتین بێ ئەوەی بزانین چیەو هەر دەیانوت پارتی هات وکەسیش نەبوو چوینە قەلادزە وتیان پارتی لەرانیەیە وتمان کەس لەوێ نیەو ئێستا ئێمە هاتوین واتە شەوی ١٨–١٩/١٠ بەتەواوی ئەوناوە چۆڵ کران وئێمە چوینە قەلادزە ئەوێش چۆڵکرا بوو ئێمەش رۆیشتین بۆ شینێ بارەگامان لەوێ بوو بۆلای برادەرانی خۆمان بەلام پێشمەرگەی ئێمەو یەکێتی لەکانی شینکە شەو بەرگری دانراو لەزۆرجێگای کەش پێشمەرگە دانراو هێزی کۆیەش گەرانەوە دوکان و کاك کۆسرەت و برادەرانی یەکێتی لەوێش شەردەستی پێکرد بەگەرمی، لە١٩/١٠ پارتی جارێکی کە گەرانەوە رانیەو قەلادزەو ئەوناوە لەدوکان شەر گەرم بوو کاك کۆسرەت زۆرباش خۆی راگرتبو بە تەقدیری من ٢٥٠تا٣٠٠کەس لای کاك کۆسرەت مابو ئەویش زۆری پێشمەرگەی هەولێر بون جگە لە کاك مولازم عمرو کاك شێخ جەعفەر ئەوەی من ئاگام لێ بێت زۆری بەرپرسەکانی خەڵکی سلێمانی ناوشاریان چۆڵ کردبوو چوبونە ئەزمر رادیۆی پارتی کردبوی بەهەرایەکی زۆر، هەرلە١٩/١٠ سەری زەڵێم داو نامەیەکم بۆمام جەلال نوسی ئەگەر لێرە شتێك نیە من دەگەرێمەوە سورێن و لەوێوە هێزەکانمان کۆدەکەینەوەو بەرەنگاری پارتی دەبینەوە لەوسنورەوە ...مام جەلال وەلامی دامەوە کەپەلە نەکەم و لێرەش ئیشی بەمن

هەیە سبەینیٚ کۆبونەوەیەك ئەکەین، لە١٠/٢٠ ئێوارەکەی سەری زەڵێم دا کاك دکتۆر فوئادو کاك دکتۆرکەمال فوئادو برادەران لەویٚ بون پاشان گەرامەوە ووتم هەندێك چەکی قورس وەکو راجیمەو تۆپ و ئەوانەی هەبێت ئێمە پەلاماری قەڵادزە دەدەین وتیان باشە تۆ برۆ کاك مستەفا چاورەش ئەو نامەی بدەریٚ و ئەوانیش بێنە خوارەوەو لەویٚ بەرنامە دانێن و کاك مستەفای سەیدقادریش لەدەوری کێلیٚ یە و لەویٚ دەست پیٚ بکرێت و کاك کۆسرەت و ئەوانیش ئەم ئێوارەیە بەتەمای هێرشن پارتی هێزێکیان لەئەغجەلەرەوە ناردووەتە لای باینجان کەوتونەتە کەمینی کاك محمود سەنگاوی شکاون و کوشتاری زۆریان هەیە و ورەیان نەماوەو بەدوایانەوەن بۆلای قەڵاسێوکەو بۆلای تەق تەق منیش لەرێگا لەسونیٚ نامەکەم بۆکاك مستەفاچاورەش نارد لەگەڵ نامەیەکی خۆم لەوەڵامدا وتبوی ئێمە ماندوین و دوورۆژە ئیسراحەتمان نەکردوە ماندوین ونایەین ئەگەر شتێك بوو ئاگادارمان بکەن من چومە کانی شینەکە و سەید ئەحمەدیان هێزەکانی یەکێتی شەریان نەئەکرد رۆژی پێشۆ مام جەلال لە زەڵیٚ قسەی زۆری بە بەرپرسەکانی خۆیان وتبو هەموی داوای وەرەقەی ئێرانیان ئەکرد مام جەلال پێی ئەوتن بە ئێران ئەڵێم رێگاتان نەدات و وەرقەشتان بۆ نەکەن کاك عبداللە بۆروکاك محسین بایز لەویٚ بون هەردووکیان کۆن سۆسیالیست بون کاك عبداللە بۆر تا١٩٨٤ سۆسیالیست بو کاك محسین بایز تا ١٩٩٣ سۆسیالیست بو هەردوکیان ئازابون کاك محسین خوێندەواربو وە هەمیشەش شانازی بە مێژوی خۆیەوە لە ناو سۆسیالیست ئەکات هەردوو کیان سەرلەشکری یەکێتی بون بەڵام لەشکرەکەیان بڵاوەی لیٚ کردبو کاك عباللە بۆر ٧تا٨کەسی لەگەڵ بوو پر جێبێکی لاندرۆڤەری درێژی سەوز وکاك محسین بەلانگروزەری کۆنەکانەوە بەدۆشکەوە لەگەڵ بو بەڵام کاك محسین بایز دەوری لە کاك عبداللە بۆر زۆر زیاتربو لە هەموسەرلەشکرو بەرپرسەکانی یەکێتی ورەی

زیاتربو خۆشی ئازاتر هاتە بەرچاوی من کەس لە پێش کاك محسین نەبو لە شەرەکاندا رێگای ژاراوە سەنگەسەر پردەکە دۆڵە بەفرە کاك محسین رۆییشت و گرتی رێگاکەی بری تا ئێمە گەیشتینە لایان کاك بەهرۆز گەلاڵی ومەڵبەندەکەشی هەرلەوناوە بون کاك بەهرۆزیش سۆسیالیست بو کۆن دژی سۆسیالیستەکۆنە کانی ناویەکێتیش بو کاك عبداللەی مام عەلی لەوێبو کۆن سۆسیالیست بو شەو سەعات (١٢) مام جەلال ناردی بەدواما لەپشتی قەلآدزەوە منیش گەرامەوە بۆشینێ و زەڵێ چوم لە چادرەکەی خۆی و هێرۆخان لەوێ بوو وادیاربوو هەندێك قسەی هەبوو لەبەر ئەوەی من رەفیقم هەبوو کاك خورشید قسەکانی هەمو نەکرد بەلآم من لێ ی تێگەیشتم یەکەم جاربوو مام جەلال ببینم نارەحەت بێت لەدڵی خۆم وەعدم دا تارانیەو .هیران ئازاد دەکەین ئەگەر پێشمەرگەی یەکێتیش وەکو پێویست هاوکاری نەکەن بەرێگای هیزۆپ و بێستانەوە زۆر نارەحەت بوم سەیری مام جەلالم کرد زانیم چی لەدڵی دایە بەلآم بیری تەسەروفاتەکانی رابردوی یەکێتیم ئەکردەوە چەندیان عەزیەت دراوین بەلآم لە بەر ئەو وەزعە بەسەریان هاتوەو بەتایبەتی مام جەلالم قەت وا نەمدیوە بریارم دا تا هیران ونازە نین لە پارتی وەربگرمەوە ئەگەر خۆشم تیا چوم لەوماوەیەشدا پارتی زۆریان عەزیەت دام بە ناحەق ئەمە هێشتا مام جەلال قسە بۆمن ئەکات من لە لای خۆمەوە بریاری خۆم داو گۆیشم بۆ قسەکانی مام جەلال گرتبو کە ١٠٠٪ یەکێتی نیشتمانی وەکو رابردو ئەمەش هەمویان لەبیر ئەچێت نەك تاهیران ونازەنین ئازاد بکەم بۆ یەکێتی تێداحکومەت بن خۆشم تێدا بکوژرێم یەکێتی ساڵێك سەبر ناکات ودەچێتەوە سەر ئە قلیەتی پێشوی وەکو کابرای کوردە وتی با٨یش لە سەر٩بێت ئەوەش بۆ ئاغا بێت مام جەلال ووتی من بەتەمای سەفەرم بۆتورکیا بۆمەسەلەی ئاشتی و راگرتنی شەر ئە مریکایەکان و تورکەکان شەرەکەمان پێ رائەگرن ئەوکات هیچ ناکرێ دەبێت بە ئاسۆس و دۆڵی

جافەتی دا بڕۆینەوە بۆ سلیمانی ڕۆژی ١٠/٢٣ ئەگەر ئەوشوێنانە پێش وەستانی
شەر بگیرێتەوە زۆرباشە ووتم مام جەلال تۆ ئەو راجیمەو تۆپ وشتانەی هەیە
بیخەرە ئیحتیاری من یاهەرچیم ووت بیکەن ئەوانە هەموی من هەموی
وەردەگرمەوە دڵنیاش بە هاتوچۆش لە دوکانەوە دەبێت بەلآم ئەگەر هەوڵ بدرێت
یەك دوو ڕۆژ رێکەوتنەکە دوای بخەیت من پێویستم بە سێ ڕۆژ دەبێت من
وهێرۆخان وکاك خورشید ومام جەلال بوین لە چادرەکەی مام جەلال لە زەڵێ شەو
سەعات لە دەوری ١٢بۆ١ی شەوبو رێکەوتی ٢٠-١٠/٢١بوو پێم ووت دڵنیابە بەلآم
ئێمە هێزی خۆمان زۆرنیە نزیکەی (١٧٠)پێشمەرگەی سۆسیالیست لەوێ بون و مام
جەلال وتی تۆ بەرپرسی هەموو هێزەکان واتە هیزی پێشمەرگەی یەکێتیش دەبیت
بۆشەرەکان و نامەیەکی بۆهەموو هێزی پێشمەرگە و بەرپرسەکانی یەکێتی نوسی
کە محمد حاجی محمود هەرچی وت وا دەکەن و گوێ رایەڵی تەواوی دەکەن منیش
ووتم ئەوە پێویست ناکات بەلآم دڵنیابە و ئینشاالله بەدڵی هەموو لایەك دەبێت
بەلآم ئێوەش زۆر پەلە مەکەن بەهێزەوە قسە بکەن لەکۆبونەوەکان لەگەڵ
ئەمریکاو تورکیادا وتی ئەوەیان دەگەرێتەوە بۆئێوە وتم دڵنیابەو لەوێ پارتی
داواله تۆ ئەکەن شەر رابگریت کەهەرواش دەرچو پارتی داوایان کرد شەر رابگرین
مام جەلال لە تورکیاوە بروسکەی کرد بۆمان شەر رابگرین من ئەرامەوە، لە١٠/٢١
ناردمان هێزەکانی خۆمان کۆببێتەوەو هاتن ویەکێتیش کاك محسین بایز هات و
پاشان هێزی سکرتاریەتی مام جەلال و راجیمەو تۆپ و هاوانیان هێناو هاتن وتیان
چۆن دەڵێت وادەکەین کەبەراستی دەورێکی باشیان هەبوو وەکو هێزێك هەر ئەوەی
سکرتاریەت هێزی ئەساسی بوو ٨٠پێشمەرگەیان هەبو کەلەشکری وا هەبو تەنها
سەرلەشکرخۆی لەوێ بو کەسی لەگەڵ نەبو بەژمارە زۆربون چەکی قورسیان پێبوو
کاك هاشمی جیهاز بەرپرسی هێزەکەی سکرتاریەتی مام جەلال بو پیاوێکی

گوێرایەڵ وئاراش بو بەڵام کاك محسین بایز سەیارەیەك و دۆشكایەكی پێبوو دەوری کاریگەری هەبوو لەهەموو رویەكەوە لەوشەرەدا كاك محسین ٢سەیارەی گرت یەكێكیان دۆشكای لەسەربو پێش ئەوەی بگەینە ناو رانیە پێكەوە بوین كاك مستەفاچاورەش وكاك مستەفای سەید قادریش پێكەوە بون چوینە ناورانیە لای سنوری كێلێ وە كاك مستەفا سەیدقادر وئێرانیەكان بەتۆپی (١٢٠)دەیان لەدەوری قەلآدزەو هەی لەوكاتەدا ئاغای مجیدی قەرارگای رەمەزان هات و سەردانی كردین هەرخۆی بەتەنیابوو لەگەڵ كاك خورشید هاتن لەشێنێ وە لای یەكێتی بوو ووتی ئێمە ئامادەین پشتیوانی بكەین و بەتۆپ هاوكاریتان بكەین وتمان سوپاستان ئەكەین بەس لەوە ناچێت تۆپی ئێوە فریای ئێمە بكەوێت ووتی تا سێ رای بێستانە تۆپ دەگات واتە رێگای كۆیە و رانیەو سلێمانی وتم ئە توانی چوارپێنج تۆب بدەیت لە ئەو رەبایەی پشتی خەستەخانەكەی قەلآدزە رەبایەی سەر رێگای سەیدئەحمەدیان قەلآدزە وتی بەڵێ ئێستا لێ ی ئەدەم لێیداو پارتی هەڵهاتن برینداریان هەبو پاشان گەرایەوە وتی چی دەكەن وتمان وائێمەپەلاماری قەلآدزەو ژاراوە دەدەین لەسەعات (٩)ی سەرلەبەیانی لەسەر بەرنامەیەكی هاوبەش هێرشمان كرد لەقەلآدزەو لەسەید ئەحمەدیان بۆژاراوە من چومە ناو قەلآدزە لەگەڵ هێزەكەی خۆمان و سكرتاریەت دا لەناو قەلآدزە هەندێك پێشمەرگە هاتنە خوارەوە لەرێگای كێلێ و دارشمانەوە وتیان كاك مستەفای سەیدقادر وتویەتی نەروات تامنیش دێم و شارەزای جێگاكانم بەپێشمەرگەمان ووت بەدوایاندا برۆن تائێمە گەیشتینە قەلآدزەو چاوەرێ ی كاك مستەفای سەیدقادرمان ئەكرد كاك محسین رێگای سەنگەسەر قەلآدزەی بری بەرەو لای سەنگەسەرو ژاراوەو دۆڵە بەفرە ئێمەش لەداروشەخسەكەی خواروی قەلآدزەوە وتمان راجیمەكان تەقە لەدەربەندو ئەوناوە بكەن پارتی هەندێكیان بربون وفریای ژاراوە نەكەوتن بەرەو

ئاسۆس هەڵهاتن ناوی بەرپرسەکەیان حاجی ئاغابو لەبەری مەرگەشەوە پێشمەرگە
رۆیشتن من یەك چارەکێك وەستام تا کاك مستەفای سەید قادر لەسەروی ماڵەکان
لای خەستەخانە یا قوتابخانەیە هاتە لامان و لەوێ قسەمان کرد کەچۆن دەست پێ
بکەین گەیشتینە ناو قەلادزە خەڵك پرسیاریان کرد کە زانیان و ئێمەیان ناسی ئەو
پێشمەرگەیەی خۆی شاردبوەوە لە کاتی شەردا هاتنە دەرەوە ئیتر زوردەبوین و
لەوێشەوە چوینە ژاراوەو تۆپی ئێران دای لەجێگای ئێمە کەراجیمەکانمان لەپارتی
دەدا ووتم بابرۆین وئاگاداریان بکەین ئێستا لەژاراوە ئەدات بڵێن تۆپمان ناوێت بە
پێشمەرگە مان وت هێرش بکەن زۆرتر لەترسی تۆپی ئێران چونکە خەتەرتربو
لەپارتی بۆیە زۆری لەترسی تۆپی ئێران هێرشمان دەست پێکرد بەرەو سەنگەسەر
رۆیشتین و دەگەراین بەدوای بارەگاو شوێنیاندا سەیارەیەکیان جێ مابوو کاك
محسین چووە سەری و ئیشی پێکردو رایکێشاو ئێمەش هەندێك پێشمەرگەمان
بەجێمابون لەگەڵ کاك هیوادا لەدۆڵی بالیسان لای بناوێ ودۆڵی ئالانە ئەو دۆڵە
ئەوانیش هاتبونەوە بۆ پیرانەرەش وجەلکان ومەمکان وماخ وبزنان وئەیناوە لەوێ
زانیان ئێمە نەوێن و یەکێکیان هات و بەهۆی جیهازیشەوە ناردمان ئەوانیش هاتنە
سەنگەسەر ئێمە لەماڵێك لامان دا لەسەرەوە بەکاك محسینم وت هەندێك پێشمەرگە
بۆلای دۆڵی شەهیدان و کوپانان بنێرن و لەسەنگەسەر بوین کاك مستەفا
چاورەشیش گەیشتە لامان لەوێ وتیان پەلاماری کێوە رەش بدەین من وتم ئێستا
بۆ کێوەرەش ئاسان نیەو بائیسراحەت بکەین و پاشان هێزەکان دابەش دەکەین و
شەو پەلاماری بدرێت من وکاك شاخەوان عەباسی یەکێتی پێکەوە بوین لەهەموو
ئەو راکەو وەرەو شەرەدا چوینە تووەسوران کاك مستەفای سیدقادر و برادەران
بەرەو کێوەرەش چون لە کۆنە جادەیەك دێت لە رانیەوە بۆ دیوی تووەسوران
لەسەر شاخی کێوەرەشەوە من رازی نەبوم ئەوان سەرکەوتن رۆژبوو دوای

نیوەرۆش لەسەرەوە بەدۆشکاو هاوان و بی.کەی. سی تەقەیان لیٚ کردن و هەندێك پێشمەرگە بریندار بوون و گەرانەوە و هاتنەوە سەنگەسەر و لەویٚ بەتۆپ و (١٢٠) زۆریان لیٚ داین و زۆریش لەناوئۆردوگاکەیان دەدا و دووپێشمەرگە شەهیدبون وچواری کەش بریندار بون کاك عبداللە بۆرو زۆری کە گەرابونەوە بۆژاراوە و هەردوو کاك مستەفاش زۆر هەوڵیان لەگەڵم دا چۆڵی بکەین و بگەرێینەوە بۆدواوە تا تۆپەکان تەواو دەبێت وتم ئێمە بگەرێینەوە لەم کاتەدا هەموو پێشمەرگەش دەگەرێنەوە زۆر هەوڵیان دا سەیارەکانیان هێناو وتیان کاری زەرورمان هەیە منیش وامزانی شتێك روی داوە سواربوم ودەرچون نەوەستان تا لای ماڵی کاك کوێخا قادر پێم ناخۆشبوو منیان گەرانەوە بەڵام من لەویٚ مامەوە لەدەشتەکە پاشان چوینە ئەویٚ لای پردوجادەکەی ماڵی کوێخاقادری مەنگور سەیارەیەکی شلەخەجیٚ جێمابوو پارتی قەسفەکەیان زۆربو کاك محسین بایز بەتەنها لە سەردۆشکەی سەیارەکەی خۆی تەقەی ئەکرد تا ئەو سەیارەیەی هێنایەوە و لەپردەکە سیٚ هێزەکەش کۆبووەو لەژاراوەشەوە گەراینەوەو شەو چوینە ناوسەنگەسەرو لەویٚ هێزێك لەگەڵ کاك عبدالله بۆرو کاك رەفیق پارەزانی سەرمان خست بۆلای سەر کێوەرەش لەئاستی سەرکەپکان هەندێك هێزی کەش سەرخران بۆسەر چیاکەو وتمان تائەوان دەگەن ئێمەش برۆینەوە دۆڵە بەفرە بۆ کۆکردنەوەی هێزەکەو ئەم شەو ماندوین و فریاناکەوین حەرەسیات و پێشمەرگە لەسەنگەسەرو توەسوران دامەزران و ئێمەش گەراینەوە بۆدۆڵە بەفرەبۆ ئیسراحەت وتمان هێزهات خۆی دەرنەخات تائێوارە ئەو هێزەی ئێمە لەشێنیٚ هاتن و هێزی کەش هات تا عەسر نزیکەی (٨٠٠)پێشمەرگە لەویٚ کۆبونەوە جگە لەئەو هێزانەی لەویٚ بون کاك مستەفاچاورەش سەیرێکی ئەملاولای خۆی کردو وتی بە من پێشمەرگەی باش کۆبوەتەوە مام جەلالیش لێرە بوایە ئەوەندەی پێشمەرگەی بیٚ کۆنەدەکرایەوە

وتم كاك مستەفا ئاگات لە بانی بێت مام جەلال نەبێت ئەو هێزانە هەروا بەئاسانی کۆنەدەبونەوە من ئێستا رەنگە مام جەلال نەبوایە لێرە نەدەبوم وەکو حزبەکانی کە دۆستی یەکێتی دەبوین بەڵام لەم شەرە نەدەبوم لە وانەیە زەحمەتکێشان وپارێزگارانیش رەنگە هەروابن چاوەڕێمان ئەکرد زووخۆمان کۆکەینەوە بەڵام تائێوارە رادیۆی یەکێتی هاواری دەکرد کەهێزەکانی یەکێتی و زەحمەتکێشان و پارێزگاران لەوێ نەبون ئەو رۆژە واقەلاَدزەو ژاراوەو سەنگەسەرو تەرەسوران و بەرەو رانیەو کێوەرەش دەرۆن و بەهیچ شێوەیەك نەناو و نەباسی سۆسیالیستی نەدەکرد کەهەموو لایەك دەیزانی هێزی سۆسیالیست هێزێکی کاریگەرو کەم نەبوو چونکە لەوکاتەدا باسی لەشکری یەکێتی دەکرد کاك محسین بایز فەرماندەی لەشکربووخۆی و (١٠) پێشمەرگە ویەك سەیارە بوو لەپێشەوە بون کاك عبداللە بۆر خۆی و (٩)پێشمەرگەو یەك جێب بون کە دوولەشکری گەورە بون لەشکرەکانی کەش جگە لەسکرتاریەتی مام جەلال نزیکەی (٨٠) پێشمەرگەیان لەوێ بوون لەگەڵ کاك هاشم وکاك بورهانی تۆپخانە بەڵام هێزی سۆسیالیست نزیکەی (٢٠٠) پێشمەرگەی لەشەرەکەدا بون و بەهیچ شێوەیەك باسی نەدەکرا هەتا کاك مستەفا چاورەش ئیعتزاری هێنایەوەو لەبەری سەنگەسەر واتە لەرەبایە کۆنەکەی بەرامبەر گوندی دۆڵە بەفرە لە بەینی دارگوێزێك ودار تویەك بوین وتی نازانم کێ هەواڵەکانی داوە بەهەرحاڵ من زۆر گوێم نەدایە بەڵام برادەرانمان نارەحەت بون و یەکێتی خۆشیان پێیان شەرم بوو من شەخسی لەپێشەوە و ئەوان قسە ناکەن یا باسیان ناکەن من بەرەسمی بەرپرسی هەموو هێزەکان بوم هەموو هێزی زەحمەتکێشان و پارێزگاران ٢-٣ سەیارەی لاندگرۆز بون لە سەنگەسەر گولەو پارچە هاوان بە سەیارە لاندگرۆزە سەقف بەرزەکەیان کەوت بۆ سەیری ناوچەکە هاتبون نەك هێزی شەرکەر، لەشەوی ٢١-٢٢/١٠ دوای ئەو کارانە گەراینەوە دۆڵە بەفرەو شەویش

لەویٚ بوین بروسکەی مام جەلال هاتبوو بۆکاك مستەفا دەڵێت ئەگەر بۆتان ناکرێت ئێوە بگەرێنەوە لەویٚ وادیارە بۆتان ناکرێت کاك دکتۆرکەمال فوئاد وتی ئەگەر تۆ هەولٚ نەدەیت باوەر ناکەم برادەرانی ئێمە شتێکیان پێبکرێت ئەوە دروسیٚ رۆژە کاك کۆسرەت چاوەریٚ ی ئەوان ئەکات ئەمان هەر لە جێگای خۆیان نەجولاٚون مام جەلالیش سەفەر ئەکات چاوەریٚ ی هیمەتی تۆین دوای کاك مستەفا بروسکەی پیشان من داو منیش داوای کاتیۆشاوشتم کردبوو کاك دکتۆر کەمال فوئاد نامەی ناردبوو کەلەویٚ هەیە ئاگادارمان کردون کەلای تۆبن و کاك هاشم هات و دامان مەزراندن، لە١٠/٢٢ دوای نیوەرۆ هێزەکان بەهاوبەشی پارێزگارانیش لەگەلٚ بوو لەگەلٚ سیٚ لەشکری یەکێتی دا کاك محسین بۆلای دۆلی شەهیدان نێران و خۆی هەر دەهاتەوە بۆلای شەرەکەو کێوەرەش وەزۆر لەبرادەرانی سۆسیالیست لەویٚ بون و لەگەلٚ باقی هێزەکە و هەردووکاك مستەفاو من وکاك محسین بابزوبرادەرانی زەحمەتکێشان پێکەوە بوین، لەشەوی ٢٢-١٠/٢٣ لەسەعات (١١)ی شەو هێرش دەستی پێکرد و لەسەعات (١)ی شەو پارتی شکان بەلاٚم چۆن شکانێك قەت شتی وایان بەسەر نەهاتووە ئێمە هەوڵماندا بەسەیارە زوو بگەینە خراروی رانیە یارێگای چوارقورنە بگرین دۆشکاو سەیارەیەکمان لەگەڵدا بوو نەرێگای دەدایـن لەپێشەوە برۆین جادە خراپ بوو باران بوو وەنەرێگای دەدایـن تەقە بکەین چەندجارێك بەکاك محسینم وت سەیارەکەی لیٚ وەربگرن هەر رێگایان نەدەدا بەلاٚم ترسنۆك دیاربون لەدەربەندەکە پارتی پیاوێکیان کوشتبوو پیٚ دەچووعەشائیرو سائیق سەیارە بوبێت نەی بردبن کوشتبویان و سەیارەکەیان بردبوو لەژاراوەش سەیارەو تراکتۆرو پارەیان لەخەڵکی سەندبوو سەیارەی کابرایەکیان بردبوو بە(٥) هەزار دینار دابویانەوە هەروەها تراکتۆریان بردبوو بە(٧-٨)هەزار دینار دابویانەوە و خەڵکیان لەسەنگەسەر کوشتبوو ئەوەی لەدەستیان هاتبوو کردبویان(٢٥٠) سەیارەیان

لەخەڵکی رانیە سەندبوو کابرای دۆشکا لەپێشەوە بوو من چاوم لێبوو سەیارەکە
لەدەستی دەرچوو سەیارەکە لەتاسەی سەیتەرەکەی داو سەلەیەك دۆشکا
لەدەستی دەرچوو دای لەشاخەکە نزیك بوو هەموو گولەکان دەگەرانەوە دواوە
وایان زانی تەقە لەسەیارەکان کرا بوو بەتەقەیەك لەناو خۆمان (٢٠) دەقیقە
لەیەکمان داوە ئەوە تاخیری کردین حاجی حەیدەر جەباری چوارپێنج گولە بەر
تفەنگەکەی وجلەکانی کەوتبو من دابەزیم بەپێ بەرەو رانیە لەسەعات (٣/٣٠)
چوین و لەرێگا هەولم دا کەرێگایەك هەیە دەمانباتەوە فرقەی چوارقورنە کەس
بەمنی نەوت و هەر بەجادەدا رۆیشتین سەیارەیەك وەستابوو کاك محسین دابەزی
کەسی لەسەر نەبوو بەدۆشکایەکەوە وتی خۆ ئەم سەیارەیە هی پارتیە ووتم
زۆرباشە ئیشی پێ بکەو بزانە دۆشکەکەی ئیش دەکات تەقەی پێ کرد ووتم تەقە
لەو هێزەو لایتی سەیارانە بکەن کەدەرۆن لەخوارەوی رانیەوە پێش ئەوەی بگەینە
ناو رانیە (٤—٥) سەلەی بی.کەی.سی. کران ووتم ئەوە بارەگای بزوتنەوەیە ئەو
تەقانە دەکات تاهێزەکەی پارتی دەربازببێت مەوەستن برۆن گەیشتینە ناو رانیە
هەردوو کاك مستەفا وتیان بۆ مەلبەند ووتم وەختی نیە پێشمەرگە بنێرن و خۆمان
نەوەستین بۆ چوارقورنەو رێگای هیزۆپ و سلێمانی بکەینەوە زوو رۆژ بیێتەوە شەر
دەوەستێت و ئەوکات هیچ ناکرێت نەم هێشت لادەن بەلام زۆر هەولیان دا لادەین
بۆ مەلبەند وتم پێشمەرگە بنێرن بۆ حەرەساتی تادەگەرێینەوە ئێستا بزانن
گەیشتوینەتە رانیە جەماعەتی چوار مشقی ئەگەن بەلام هێزەکەی پارتی چۆن
شکابون سەر یان والێ شێوابو لە سەیارە دادەبەزین بە پێ هەڵدەهاتن وایان
دەزانی وا زوتر دەرباز ئەبن بەلام تۆپ و بەتایبەتی راجیمەکان و کاك بورهان
دەورێکی یەکجار کاریگەریان هەبوو لەسەر روداوەکان پارتی خراپ شکابون
هێزەکەی ئێمەش ماندو ببون و زۆریش ئەترسان لەدەربندی رانیە بەرێکی بچوك

لەناو پێڵاوەکەمدا بوچەند جارێك دەمویست لەمەجالێکدا پێڵاوەکانم بتەکێنم وبەردەکە لابەم دووسێ جار دانەویمەوە پێشمەرگە هەموی بەرەودواوە هەڵدە هاتن وایان دەزانی من لەبەر گولە خۆم دادەنەوینم بەردێکی تیژ چوبوە ناو گۆشتی قاچمەوە تاناو رانیە واتە لەدەربەنی رانیەوە تا ناو رانیە زۆر دورە ئەوبەردە هەر لەپێم دابو ئەترسام دانەومەوە بۆبەردەکە هێزەکە بەرەودوا هەڵبێت هەندێکیش وایان دەزانی لەبەرگولەدادەنەومەوە بەردەکە چوبووە ژێرپێمەوە پێڵاوەکەم هەر خوێن بو ئێمە خۆمان لەپێشەوە چوینە چوارقورنەو هەر نەوەستاین سەیارەیەکی لاندکرۆزی (١٩٨٤) جێ مابوو برادەرانی ئێمە هێنایان بۆ گرجان و ئەو گوندانە لە رێگا دەروات بۆ حاجی ئاواو سەروچاوە لە سێ رێیانی چوارقورنە سەروچاوە هێزوپ بەهەندێك پێشمەرگەم وت برۆن بەرەو سەروچاوەو شکارتە ودۆڵی بالیسان بەرپرسێکی یەکێتی ناوی کاك زیاد بو داوام لێکرد لەگەڵ ئەو هێزە بروات بەلام دوای ئاگاداربوم نەرۆشتبو لە کانی ماران لەوێش بەراجیمەم ووت تەقە بکات لەئاستی جادەی هیران وسکتان وکونەفلوسە کۆلکەرەش و هیزۆپ وتیان نابێ ووتم بەو شێوەیە لێدە دوای کەچوین گولەکان بە(٥-٦)مەتر سەرو کورتی کردبوو لەجادەکە لای قاقاوسکتان و ئەوناوە پاشان چوینە گوندی قەنتران ئەو گوندە کاتی خۆی چوم لەسەر جادەکە نوسرابوو فەوجی (٥٥)ی خەفیفە قەنتران یاشتێکی وا لەدوای راپەرین کاتی خۆی خەفیفە بوو لەدوای ئەوەش دیم نوسرابوو فەوجی (٥٥)ی لەشکری بتوێنی پارتی هەر لەوجێگایەدا. پەیوەندی جیهازکرا هێزی یەکێتی بون لای بناری کۆسرەت و ئەوناوە بون مامۆستا جەمالی حاجی محمد هەڵەبجەیی و کاك مەجیدحاجی عەلی و زۆری کەش بوون نزیکەی (٢٠) سەیارەشیان پێبوو وتیان پەلەمەکەن تائێمەش دێن لە سێ رێگای هیزۆپ هێزمان دابەش کردو مامۆستا جەمال و هێزەکەی ئێمەو هێزەکانی کەش بەرەو دۆڵی هیران

وتمـان تاپێتـان دەکرێـت بـەرەو لای شـەقلاوە بـرۆن پـارتی مقاوەمـەی نـەدەکرد جارجار بەهاوان و بی.کەی.سی لەدورەوە من و هەردوو کـاك مـستەفا وکـاك هاشـم نانی بەیانی مان لـە ماڵـەکانی هیـزوپ خـوارد  هەنـدێك لـەبرادەرانی خۆمـان چـونە سێرای بێستانە واتـە مـەفرەقی کۆیـەو سـلێمانی و رانیـە کەسـی لـێ نـەبوو پـارتی چـۆڵیان کردبـوو کۆمـەڵێك پێـشمەرگەمان نـارد بـۆ چـنارۆك پـارتی لـە روی چـیای هەیبەت سولتانەوە تەقەیان  لێ دەکـردن هەنـدێك سەیارەشـیان بەرکـەوتبوو دوای ئەوە کاك عوسمان حاجی محمودیش هـات بەهێزێکـەوە ئێمـە بـەجیهاز ئاگادارمـان کردن کەپارتی شـکاوەو ئێمـەش بـەرەو لای ئێـوە دێینـەوە ئێمـە بـەرەو لای کـاك کۆسـرەت بـەرێ کـەوتین و بـەکاك عوسمـان حـاجی محمـود و ئەوانیـشمان بـە هێزیەکـەوە لـە باداوانـەوە بـەرەو مـەفرەقی کۆیـە سـلێمانی دە هـاتن سـێ چـوار لانکروزەر ولۆریکی یش پێشمەرگەی تێدابو وایـان زانـی ئێمـە پـارتین زوو دێوریـان کـردەوەو گەرانـەوە بـەرەو کـاك کۆسـرەت وئـەوان هـەردووکاك مـستەفا بـەجیهازو بەبانگردن کە ئێمە بۆ لای ئێوە دێن تا تێمان گەیاندن  ئەوەندە پارتی ویەکێتی لە شەرەکان لەیەك ترسابون  نەك لەخۆیان چونکە لە شەری یەکتردا زۆر قارەمان بون ترسەکە لەوە بو کە هێزی دەوڵەتێکی کـەیان لەگـەڵ بێـت ماراسـۆنەکانیش عێـراق وئێران وتورکیایان بۆ گیانی یەکتریان دەهێنـا.. ووتم کـەبرادەرانی ئێمـە لەچـنارۆك لەپێشەوەن و سەربکەون بۆسەر هەیبەت سولتان ئێمـە بـۆلای گونـدێکی کـە هەیـە لەباداوان گوندی باقلان لەپێچەکەدا بوو هاتین و کاك کۆسرەت وکـاك مـولازم عمـرو کاك شێخ جەعفەرو زۆری کەش لەبەرپرسان لەوێ بون و تەقـەیان دەکـرد بـەهاوان وراجیمە بەرەو هەیبەت سولتان وکۆیـە لەبـەردەم گونـدی بـاقلان بـەکاك کۆسـرەتم ووت کەسەرکەوین بۆسەر هەیبەت سولتان ووتی نەوەلا لێرە پێویست ناکات وهێزی بۆسەرکەوتووە کاك جەبار فرمان لەسەرەوەیە لەکەلکـە سمـاق بـەلام دۆڵـی هـیران

ونازەنین ئەولاتر گرنگ نەبوو ئەولایە جی بهیلن بەلام هێزێکمان بۆسەروچاوەو دۆڵی
بالیسان دانابوو کاك زیادبوو یەکێتی نەرۆیشیتبون و برادەرانی ئێمەش تالای
سەروچاوەو شکارتە چوبون لەوناوە وەستابون تاهێزی کەمان ناردو ئێمە
گەراینەوە هیزۆپ وتمان نانێك بخۆین پارتی (٥٣) تفەنگی پێ کرن بون یاپارەکەی
لێ سەندبون دابەش بوین بەدوربین سەیرم کرد لەسماقولی گرتك بەلای هیزۆپدا
چەکدار دێن وادیاربوو دەیانویست بەرەو لای مەفرەقەکەی هیزۆپ بێن و بیگرن
لەجیهازەکانیان تێ گەیشتین پێشمەرگەمان ناردە سەر تەپەکان و پاشان
لەدەستەکەی خۆم چون بۆیان تاسماقولی و سەروچاوە هەڵهاتبون و دووجەنازەش
یەکێتی بون کوشتبونیان پارتی لەهێرشی پێشوو کەسێکیان ناوی سەرتیپ
یاشتێکی وابوو لەوێ پێشمەرگەمان داناو گەراینەوە سەری سکاتان و ئەولامان دا
وتیان وەلا ئێستا مامۆستا جەمال بریندار بوو بەهاوان لەوێ وەستابوو هەرچیمان
کرد هەروەستابوو ناردمانەوە رانیەو بۆ سلێمانی کاك حمە هەژارو کۆمەڵێك لەوێ
بون دەیانویست قەناعەت بەئێمە بکەن کە کاموسك وکۆنە فلۆسە هیران پێویست
ناکات کە ئەوێ پێویست ناکات پێمان وونن تاکوێ دەتوانن برۆن پاشان هێزەکەی
سکرتاریەتی مام جەلالم هێنایەوە مەفرەقی هیزۆپ و لەوێش هەندێکی کە تەقەیان
کردبۆ ئەو ناوە بەراجیمە و هەڵهاتن و پاك کرانەوە و بەدەردرێك رۆیشت کەهەرگیز
لەبیری نەچێتەوە ئەوەش هەموی لەخۆبایی بونی پارتی بوو ئێدەی بەزۆر
کردبەتەرەفی شەر.. مام جەلال بروسکەی کردبوو بۆمەکتەبی سیاسی یەکێتی
بۆراگرتنی شەرەکە من وەلامی مام جەلالم دایەوە کەدوو رۆژ دوای بذات چونکە
پارتی ناتوانن بەرگری بکەن لەشەقلاوەو خەلیفان و صلاح الدین و هەولێرش خۆیان
رابگرن ئەویش وەلامی دایەوە کە ئەمریکا و بەریتانیا و تورکیا داوا دەکەن وپارتی
ئەڵێت ئەوان شەر راناگرن ...لەدوای ئەوە گەراینەوە رانیەو سەردانی بارەگامان

کردو جەماوەری رانیە پێشوازی گەرمیان لێدەکردین بۆ دوای نیوەڕۆ گەراینەوە بۆسلێمانی و لەرێگا لای کانی وەتمان کاك جەبارفرمان و هێزێك چون بۆلای هێزەکانی کە لەدۆڵی هیران و بالیسان و لەولاشەوە هێز بەرەو دۆڵی خانەقا بەرێ کرا، لە۱۰/۲۳ عێراق ئاگاداری لای کۆیەو یەکێتی کرد بەرەو هەوایر نەرۆن و هەولێرش پارتی ماڵەکانیان چۆڵی کردبوو بەبێ تەقە دەمانتوانی زۆرجێگا ئازاد بکەین لەدەستی پارتی، لەشەوی ۲۳–۱۰/۲٤ بەئامادەبونی ئەمریکاو بەریتانیاو تورکیا شەری هەردوولا وەستا، لە۱۰/۲٤ چومە عەربەت و سەیدصادق و گەرامەوە بۆسلێمانی، لە۱۰/۲٥ لەسلێمانیەوە بەرێ کەوتم بۆکۆیەو سەردانی کاك کۆسرەت و کاك مولازم عمرو برادەرانی کەم کردوپاشان چومە رانیەو شەولەماڵی کاك ئاکۆی عەباس ئاغا بوین، لە۱۰/۲٦ لەمەقەری حزب بوم لەرانیە کاك جەبارفرمان و کاك مستەفای سەیدقادر سەردانیان کردین و پیرۆزبایی ئەو سەرکەوتنە گەورەیان لێ کردین پاشان ئێمە چوینە سەنگەسەرو قەلادزە و سونێ و شێنێ بۆبارەگای حزب لەشێنێ بۆلای برادەران لەوێ بون بەتەمای دروست کردنی خانو بوین، لە۱۰/۲۷ لەشێنێ بوم خەریکی دروست کردنی خانوو بوین ببارەگا لەمەرکەزە کۆنەکەی شێنێ لەسەعات (۱۰)ی سەرلەبەیانی کاك دکتۆرفوئاد معصوم و کاك ئەرسەلان بایز ئەندامانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەشێنێ سەردانیان کردین وەلەسەعات (۳)ی پاش نیوەرۆی هەمان رۆژ وەفدێکی پەرلەمانی کوردستان لەدەرەوەی وڵات سەردانیان کردین نوێنەری پەکەکەیش لەکوردستان لەگەڵیان بوو کاك کازم و کاك زوبێر ئایدەر سەرۆکی ئەنجومەنی راپەراندن و نەجدەت بولدان رەمیزی قرتان یا خەتاب و زۆری کەش بون قسەی زۆرکرا لەسەر روداوەکان و لەسەر مەسەلەی ئاشتی کوردستان قسە کرا وادیاربوو ئەوان هەندێك لایەنی پارتیان دەگرت لە پێشا سەری هەولێریان دابو، لە۱۰/۲۸ لەشێنێ بوم وەفدێکی یەکێتی و پارتی لەتورکیا

بەچاودێری ئەمریكاو بەشداری بەریتانیاو توركیا دەستیان بەوتووێژی خۆیان كرد لەئەنقەرە لەچاوپێكەوتن و قسەكرندا باسی ئەوە كرابوو كەلایەنەكان پارتی وتبوی بزوتنەوەی ئیسلامی و حزبی شیوعی با بەشداربن لەپرۆسەی ئاشتی خۆلەشەریش بەشدارنەبون بەلأم یەكێتی بەهیچ شێوەیەك باسی حزبی سۆسیالیست و هاوپەیمانەكانی خۆی نەكردبوو هەتا لەشەربەشدارن بائەوانیش بەشداربن وەختێك پارتی تەرحی دۆستەكانی خۆی كردبوو یاهاوپەیمان لەحكومەتەكەیان ئەوكات یەكێتیش باسی ئێمەیان كردبوو وتبویان ئەوان لەشەردان و بەشداربون بۆئاشتی نابێت ..نوێنەری پارتی لای دۆستی ئێمە قسەیان كردبوو دوای لەكاك كەمال فوئادم پرسی وتی باسێكی وانەكراوە كەئێوەش لەگفتوگۆدا بەشداربن دۆستەكانی یەكێتی لە شەر بەشداربون دۆستەكانی پارتی لە حكومەت وخێردا بەشداربون هەر لە١٠/٢٨ مام جەلال چاوی كەوت بە دكتۆر عەلی ئەكبر ولایەتی وەزیری دەرەوەی ئێران لەتەهران، لە١٠/٢٩ لەشێنێ بوم خەریكی خانوو كردن و دیداربوین بۆبارەگاو پاشان چومە ناوزەنگ و نۆكان بۆلای برادەرانی زەحمەتكێش كاك قادرعەزیز لەرەزائیە بوو كاك دكتۆر سەردارو هەندێك لەبرادەرانی كەیان لەوێ بون چوین سەردانمان كردن و گەراینەوە رۆژی پێشوو چوین لەناو زەنگ خانوو بكەین بۆبارەگا لەجێگای بارەگا كۆنەكان برادەرانی یەكێتی بەناوی بەشی زانیاری وكاك عمر فەتاح و كاك دكتۆر خەسرەووە كەلەوێ بون رێگایان نەداین واتە بەبرادەران و كاك خورشیدیان وتبوو لێرە خانوو مەكەن واتە ئەوەش دۆستایەتی... قاچاخچی لێبوو خەلكی جۆربەجۆری لێبوو بەلأم رێگایان نەدا ئێمە لەناوزەنگ خانووبكەین پێم ناخۆش بوو هەلوێستی یەكێتی وابێت لەسەرمان قسەكەی رۆژی ١٩٩٦/١٠/٦ زەلێم وەبیرهاتەوە كاك قادرعزیز وتی یەكێتی دووشار بگرێت یادوو بەرزایی ئێمە لەبیر دەكات و هەروا بیر دەكاتەوە ئیتر ئیشیان نەماوە...هەرلە١٠/٢٩ دوای

نیوەڕۆ قەرارگا سەردانیان کردین و شەویش لەماڵی کاك مینەی فەقێ عبدالله بوین بوو لەشێنێ کاك بارام وعەتاو پشتیوانی کورم هاتبون بۆسەردانمان زۆرم پێ ناخۆش بوو هاتبون بەبێ ئیش لەوناوەو ڕێگا دوورە لەسنەوە، لە١٠/٣٠ گەرامەوە بۆقەلادزەو ڕانیەوکۆیە لەوێ بارەگامان داناو لقی هەولێرو ناوچەی کۆیە دانرا پاشان سەردانی کاك کۆسرەتم کرد کاك مولازم عمرو برادەرانی کەش لەوێ بون شەو لای برادەرانی خۆمان بوین لەکۆیە، لە١٠/٣١ گەرامەوە بۆرانیەو پاشان بۆسلێمانی ئەم مانگە پربوو لەشەرو شۆرو کوشتن وبرین و جۆرە راونان وەکو یاری وابوو چونکە لە٨/٣١ تا ١٠/٢٣ چەندین گۆران لەکوردستان روی دا یەکێتی و پارتی و عێراق و سۆسیالیست و بزوتنەوەو زۆری کەش ئێران و ئەمریکاو تورکیا و بەریتانیاو شتی سەیروسەمەرە بوو، لە١٩٩٦/١١/١ لەسلێمانی بوم لەماڵەکەی خۆم بۆئیسراحەت برادەران لەسلێمانی خانویەکیان پەیدا کردبوو بۆئەو ماڵانەی ئێمە کەلەهەولێرەوە دەرکرابون یەکێتی تێ ی پێچابوین دەیوت چۆڵی بکەن خانووەکە خاوەنەکەیش خانوی موستەشار بوو ناوی جەلال چەرمەگا بوو لەبەغداد دادەنیشت برادەرانمانیان بەگیرهێنابوو، لە١١/٢ سەردانی کاك ئەحمەدی حاجی غالیم کرد بۆپرسەی ئەمجەدی برای شەهید ببوو لەوکاتە پارتی لەسلێدانی، ئەرمان ڕەوا بون خەڵکیان زۆر دەکوشت و دەستیان نەدەپاراست و ئەو(٥)کەسەی گیرابون لەسەر وەعدی مەسئولینی پارتی خزمیان تسلیم بەپارتی کرد بون کاك ئەمجەد خۆشی ژن برای باوکی کاك ئەنوەرحاجی عوسمانی قەویلەیی بووکاك ئەنوەر حاجی عوسمان ئامرسوپای رزگاری پارتی بوو لەماڵی ئەوان وخۆیان بردیان گولەبارانیان کردو جەنازەکەیان ناردەوە زۆری کەش نەیانتوانی بەرگری یاکەسێك بپارێزن ... پارتی ئەمری کوشتنی دابون لەسەر دووبارزانی لەشلێر کوژرابون ئەمجەدو ئەحمەد سۆیلەمیشی و سێ کەسی کە پێشمەرگەی کۆنی یەکێتی بون گولەباران کران،

له‌١١/٣ چومه‌ قه‌ده‌فه‌ری بۆپرسه‌ی كاك ئه‌حمه‌دحاجی محمود حارس كه‌له‌شه‌ری پارتی لای پێنجوێن شه‌هیدبوو زۆرم پێ ناخۆش بوو هه‌رچه‌نده‌ له‌شه‌ڕبوین له‌گه‌ڵ پارتی وئه‌ویش پارتی بوو به‌ڵام پێم ناخۆشبوو چونكه‌ كوڕێكی باشبوو كۆمه‌ڵێك منالی هه‌بزو كاك ئیبراهیم براشی هه‌زار واسیته‌ی كردبوو كه‌كاك مه‌سعود بروسكه‌یه‌كی بۆلێ بدات كه‌برای شه‌هید بووه‌و جێگری لیوا بووه‌ هه‌رخه‌ریكی واسیته‌ بوو تابروسكه‌یه‌كیان بۆلێدا به‌واسته‌ی كاك فه‌ره‌یدون جوانرۆیه‌ وه‌ بۆهه‌ركه‌س ده‌مرد یاده‌كوژرا بروسكه‌ی دابوو به‌ڵام بۆئه‌وانه‌ی ناوچه‌ی سلێمانی لێ ی نه‌دابوو پاشان من گه‌رامه‌وه‌ بۆسلێمانی، له‌١١/٤ بۆیادی ئه‌وچوار شه‌هیده‌ی یه‌كێتی وچله‌كه‌یان سه‌ردانی هه‌ڵه‌بجه‌ی تازه‌م كردو به‌شداریم كرد له‌وێده‌و وتاری حزب له‌وێ خوێندرایه‌وه‌ له‌لایه‌ن كاك عه‌تاوه‌، له‌١١/٥ له‌سلێمانی بوم كۆبونه‌وه‌مان هه‌بوو ئێواره‌ش له‌گه‌ڵ كاك شه‌وكه‌ت به‌سه‌یاره‌ سه‌رێكی ناوبازرمان داو گه‌راین و سه‌ری بازیان و ته‌كێمان داو سه‌ردانی پێشمه‌رگه‌مان كرد له‌وێ و گه‌راینه‌وه‌ بۆسلێمانی، له‌١١/٦ له‌سلێمانی بوم خه‌ریكی ئیشوكاری ئاسایی رۆژانه‌ بوین، له‌١١/٧ كۆبونه‌وه‌ی كۆمیته‌ی ناوه‌ندیمان هه‌بوو له‌سه‌ر روداوه‌كان و وه‌زعه‌ گشتیه‌كان و گۆرانكاریه‌كان و وه‌زعی حزب و په‌یوه‌ندی ناوه‌وه‌و ده‌ره‌وه‌ی حزب، له‌١١/٨ كۆبونه‌وه‌كه‌ سه‌رله‌به‌یانی كۆتایی پێهات و كۆمه‌ڵێك بریاری باشی لێ وه‌رگیراو زیاتر ده‌ست به‌كاربون و گرنگی دان به‌هێزی پێشمه‌رگه‌و دانانی میزانیه‌كی تایبه‌تی بۆیان هه‌ر له‌و ماوه‌یه‌ش عه‌فو بۆچه‌كداری پارتی ده‌ركرا له‌لایه‌ن مه‌كته‌بی عه‌سكه‌ریه‌وه‌ كه‌جارێكی كه‌ به‌شه‌ر ناگه‌رێنه‌و، سنوری هه‌ڵه‌بجه‌ وسلێمانی تا ١٠ ساڵی كه‌ش بگه‌رێنه‌وه‌ به‌قسه‌ رایان گرتبون گوایه‌ دێنه‌وه‌ سنوری هه‌ڵه‌بجه‌ وجێگاكانی كه‌ش، له‌١١/٩ له‌سلێمانی بوم خه‌ریكی ئیشوكاری ئاسایی رۆژانه‌ بوین، له‌١١/١٠ له‌سلێمانی بوم كۆبونه‌وه‌مان هه‌بوو: له‌١١/١١ كۆبونه‌وه‌ی

مەکتەبی سیاسیمان هەبوو لەسلێمانی بۆجێ بەجێ کردنی بڕیارەکانی کۆمیتەی ناوەندی، لە۱۱/۱۲ لەگەڵ برادەرانی سەرکردایەتی وکاك شەوکەت حاجی مشیرو چەند کەسێکی کە چوینە ئەحمەدئاوا بۆپرسەی خێزانی کاك عەلی باپیر لەوێ کۆبونەوە کرا کاك مەلاعەلی باپیر قسەی دژی مامۆستا مەلاعەلی عبدالعزیزو سەرکردایەتی بزوتنەوە کرد هەروەها دژی پارتی قسەی دەکرد وادیاربوو کاك کۆسرەتیش چوبوو بۆپرسەکەی بەلام کەرێگای سەیارەکانی ئێمەیان نەدابوو لەوشکەناوەوە یەکێتیش هەر زۆر بەهەڵە لەبزوتنەوە تێ گەیشتبون، لەرۆژانی ۱۳ تا۱۹۹٦/۱۱/۲۲ هەرلەسلێمانی و دەوروبەری بوم خەریکی ئیشوکاری رۆژانەی حزب بوم، لە۱۱/۱۷ لەسلێمانی بوم مامۆستا کەریم ئەحمەد سکرتێری حزبی شیوعی کوردستان و کاك حەمیدمەجید بەیاتی سکرتێری حزبی شیوعی عێراق و وەفدێکی هەردوو حزبی شیوعی سەردانیان کردین و لەسەر روداوەکان قسەمان کرد، لە۱۱/۲۳ لەسلێمانی بوم کاك قادرعەزیزو کاك عمرئاغای سورچی سەردانیان کردین و قسەی زۆرکرا لەسەر مەسەلەکان، لە۱۱/۲٤ هەرلەسلێمانی بوم مام جەلال و کاك دکتۆر کەمال فوئاد سەردانیان کردین وەبۆئێوارەی هەمان رۆژ کۆبونەوەی نێوان حزبەکانی بەشداربوو پێکەوە لەشەر دژی پارتی یادیفاع لەناوچەکان هەبوو یەکێتی داوای کرد ئەو حزبانەی عەمەلیەن پێکەوە لەیەك بەرەن بەلام ئەوەش بکرێت بەسیغەیەك واتە ناوی جەبهەی هاوپەیمانی یاشتێکی وای لێ بنێن و لەچوار چێوەیەکی سیاسی دا بێت باشترەو پرۆژەیەك ئامادە کرابوو کەلیژنەیەك دەست بەکاربن بۆکۆبونەوەی داهاتوو..یەکەم کۆبونەوە بوو کەبریار بوو لە ۱۹۹٦/۱۰/۱٤ لەزەلێ بکەین ئێمە وتمان لەسلێمانی دەیکەین هەردواکەوت روداوەکان زۆر شتی بۆچارەسەر کردین و کورتی کردەوە هەر ئەوە مابوو چۆن بکرێت و ناوی چی لێ بنێین، لە۱۱/۲٤ یەکەم کۆبونەوەی هاوپەیمانی دیموکراتی لەسلێمانی کرا

لەمەکتەبی سیاسی یەکێتی ئێمە نەماندەویست بەخواستی خۆمان نەبوو چوینە ناو شەرەوە بەزۆر پارتی پێ ی کردین بەلأم تائێستا توانیمان نەك هەر بەشەرو بەڵکو دەوری دیاری سۆسیالیست لەشەر هۆکاری زۆرشت بووپارتی زەرەری لەخۆی دا ئەوەندە لەئێمە من زۆر هەوڵم دا شەر نەبێت لەنێوان سۆسیالیست و پارتی دا بەلأم غروریەتی پارتی ئەوەندە عزیەتی داین بەزۆریش خستینە ناوشەرەکەوە هەر بۆیەش بریارمان دا شەری پارتی بکەین بەبریاری هاوبەشی نەبوو لەگەڵ یەکێتی هیچ شتێکی نوسین یا قسەکردنمان نەبو بەلأم هەموو لەشاخ برین لەشەر یەکمان گرتەوە من نەمدەزانی یەکێتی کام رۆژ هێرش دەکات لەگەڵ ئێران ئێمە لەراستی دا بەرگریمان لەخۆمان دەکرد بەلأم لەسلێمانی لەگەڵ یەکێتی و لایەنەکان یەکمان گرتەوە لەشەرەکان لە١١/٢٥ لەلەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکاری ئاسایی بوین، لە١١/٢٦ چومە سەیدصادق و گوڵەخانە پاشان چومە قانیجە و تەپەسەرقوڵە بۆ پرسە و ئەو مالأنەی لەو (١٥) ساڵە زۆر خزمەتیان کردبوین پاشان چومە هەڵەبجەو بۆبارەگای بزوتنەوەی ئیسلامی و پاشان چوینە مەڵبەندی یەکێتی و پاشان چوینە بارەگای ناوچەی حزب لەهەڵەبجە هەروەها چوینە هێزی زمناکۆ پاشان گەراینەوە بۆسلێمانی، لە١١/٢٧ چومە هەڵەبجەی تازە و نەسر بۆپرسەی حاجی سەعیدو پاشان چومە بێسەڵمێن بۆپرسەی میر ئەحمەد و پاشان گەرامەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی ٢٨تا١١/٣٠ هەر لەسلێمانی بوم خەریکی ئیشوکارو دەوام بوم لەبارەگای مەکتەبی سیاسی، لە١٩٩٦/١٢/١ وەفدێکی گەورەو بەرزی کۆمارى ئیسلامی ئێران سەردانیان کردین لەبارەگای تایبەتی خۆم لەسلێمانی، لە١٢/٢ هەرلەسلێمانی بوم وەفدێکی رۆشنبیران سەردانیان کردین هەرهەمان رۆژ لەگەڵ کاك قادرعەزیز دەعوەتی کاك عمرئاغا بوین، لە١٢/٣ چوینە سەیدصادق بۆپرسەی کاك حمە جەزای رەشید ئەحمەد سلێمان لەگردی شەریف و گەراینەوە بۆسلێمانی، لەرۆژانی

٥تا١٢/٨ هەرلەسلێمانی بوم خەریکی کاری تایبەتی حزب و هەندێك نوسین ئامادە بکەم بۆ رۆژنامە کەپێویست بوو، لە١٩٩٦\١٢/٩ بریار درا نەوتی عێراق بەرامبەر بەخۆراك بروات لەسەر بریاری ٩٨٦ی مجلیسی ئەمنی نێودەوڵەتی نەسەعات (٨) ی سەرلەبەیانی ئەو رۆژەوە لەدەریای سپی ناوەراست لەتورکیا نەوتی عێراق بەرێ کەوت بەرەو بازارەکانی جیهان پاش ئەوەی لەشەری دورهەمی کەنداوەوە راوەستابوو خەڵکی زۆری پێ خۆشبوو بۆهاتنی ئازوقە بۆخەڵکی کوردستان، لە١٢/١٠ هەروا نەوت دەرۆیشت و وەزعی بازار زۆرباش بوو شت نووقات هەرزان ببوو رەنگی خەڵکی شار گەشابونەوەو خەڵکی بەتەنەکەو بەفەردە ئاردورۆن و برنجی دەکری کە (٦-٧) ساڵ بوو بەکیلۆ برنج و رۆنیان دەکری، لەرۆژانی ١١تا١٩٩٦/١٢/١٤ هەرلەسلێمانی لەمەکتەبی سیاسی خەریکی ئیشوکاری رۆژانە بوین، لە١٢/١٥ کۆبونەوەی نائاسایی کۆمیتەی ناوەندی هەبوو بۆ هەندێك مەسەلە باس بکرێت منیش بەتەمای سەفەربوم و ئەوکات منیش بەرێ بکەوم بۆسەفەرەکەم هەرکەس ئیشوکاری خۆی بزانێ، لە١٢/١٦ لەسلێمانی بوم من و کاك قادرعەزیزو کاك عمرئاغا سەفەرمان هەبوو بۆئێران بەرێ کەوتین بۆ پەروێزخان و پاشان بۆقصری شیرین وکرماشان لەکرماشان کاك دکتۆر ئەحمەد چەلەبیشمان بینی لەدەرەوە بۆ کوردستان دەگەرایەوەو ئێمەش بەفرۆکە بەرەو تەهران بەرێ کەوتین لەسەعات (٣)ی پاش نیوەرۆ گەیشتینە تەهران و لەفرۆکەخانە پێشوازی کراین و لەئوتێل مارشیت بوین لەسەرجادەی وەلی عصر، لە١٢/١٧ لەتەهران بوین من وکاك قادر عزیزوکاك عمر ئاغای سورکی لەوەزارەتی ئیتلاعات چاومان کەوت بەبەرپرسی کەنداو لەوەزارەت، لە١٢/١٨ لەتەهران بوین سەردانی حاجی ئاغای محمدی مان کردوکۆبوینەوەو قسەی زۆر لەسەر روداوەکان کران و پەیوەندی هەردوولاش باس کرا لەجیاتی ئەوەی هاوکاریمان بکات دەیوت ئێوە بگەرێنەوە

بۆکوردستان کێشەی خۆتان لای یەکێتیە لەگەڵ یەکێتی چارەسەری کێشەی
خۆتان بکەن ئێمەش وتمان یەکێتی ئەوەی پێکراوە یارمەتی داوین و ئێستا
یارمەتیمان دەدات ئەیوت ئەوە کەمەو ئێوە برۆن داوا لەیەکێتی بکەن و هەموو
شتی لەگەڵ بەش بکەن وتمان خۆتان یارمەتیمان ئەدەن باشەو نایدەن بۆتێکمان
دەدەن لەگەڵ یەکێتیدا لەم کاتەش پێویستە ئێمە یەکگرتوو تربین لەسەر
روداوەکان.. وتی من مەبەستی ئەوەم نیە ئێوە دژی یەکێتی بن زۆر قسەمان
کردوماندو بوین بێ ئەنجام وادیاربوو ئەوان دژی یەکێتی بون کە ئەو هەمو
هاوکاریە بۆیەکیتی پێ دەچو سوپای پاسداران رێکەوتنی لەگەڵ یەکێتی کردبێت
بۆ لێدانی دیموکرات وپاسدارانیش لەسەر ئەو رێکەوتنە وپەیمانانەی پێشوی
پاسداران ویەکێتی بەلام ئێران بە ئێستاشەوە نایەوێت تەوازنی هێز لە نێوان پارتی
و یەکێتی دا بە لایەکدا بشکێتەوە جگە لەوەی جارجار لەلایەکیان عاجز دەبێت
کێشەیەکی کاتی بۆ دروست ئەکات چونکە ئەو تۆپ وراجیمانەی ئێران لە
مڵەخوردەوە دەیان تەقان بۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەمان راجیمە وتۆپ
بو بە هەمان سەیارەوە هەمان عەدەد راجیمە وتۆپ چیەکانی ساڵی ١٩٩٥بو
لەهەمان جێگادا لە مەڵەخورد پشتی زەڵم ئەوەی ٩٥ هەقالانی پارتی
رەسەدوچاوساغ بون بەلام ئەم ساڵی ٩٦ هەقالانی یەکێتی رەسەدو چاوساغ بون
ماوەیەکیش برایانی موسڵمانی بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق
رەسەدوچاوساغ بون هەموشیان ناوەکانم لایە لە هەردوو حزب وبزوتنەوەی
ئیسلامی ئەوکاکانەی رەسەد بون خۆشیان ئەم دێرانە بخوێننەوە دەزانن،
لە١٢/١٩ چوینە وەزارەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی لەتەهران و لەوێ کۆبوینەوە
لەگەڵ ئاغای فیروزنیا وئاقای محمدصادق بەرپرسی کەنداو لەوەزارەتی دەرەوە
لەسەر زۆر مەسەلە قسەمان کردو هاوکاری هەردوولاش وەهەروەمان رۆژ جارێکی

که قسەمان لەگەڵ حاجی ئاغای محمدی کردەوە لەسەر روداوەکان، لە١٢/٢٠ چوینە نەخۆشخانە لەتەهران بۆلای مامۆستا جەمال محمد کەلەرۆژی ١٩٩٣/١٠/٢٣ لەسکتان وکونە فلوسە کاموسەك کۆلکە رەش بریندار ببوو، لە١٢/٢١ سەردانی قەرارگای رەمەزانمان کرد لەتەهران وەلەقصری پیرۆزە کۆبونەوەمان هەبوو لەگەڵ ئاغای ئەحمەدی فروزندەو ئاغای جوادجەعفەری لەسەر روداوەکان قسەمان کرد وەلەسەر داوای بەرپرسانی سنە ومەسەلەی کاری بازرگانی گەراینەوەو چوینە فرۆکەخانە لەبەر زۆری بەفر لەسنە فرۆکە هەڵنەساو ئێمەش بەسەیارە چوینەوە بۆسنە ، لە١٢/٢٣ لەسنە بوین ، لە١٢/٢٤ لەسنە بوین دەعوەت بوین لەهاوینەهەواری ئاویدەر لای بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی ئێران، لە١٢/٢٥ کاك عمرئاغا گەرایەوە بۆسلێمانی من و کاك قادرعەزیزیش چوینە کرماشان و لەوێوە بەفرۆکە بۆتەهران، لەرۆژانی ٢٦و١٢/٢٧ لەتەهران بوین و ناوبازار گەراین ناخۆش نەبوو، لە١٢/٢٨ لەتەهران بوین کاك شەوکەت حاجی مشیریش لەوێ بوو هەندێك لەبازار گەراین و ئێوارەش کاك قادروکاك شەوکەت لای من دەعوەت بون زۆریش قسەکرا لەسەر روداوەکان.. هەرئەمرۆ ئەمریکا مام جەلال و کاك مەسعودی دەعوەت کردبوو بۆمەسەلەی ئاشتی ئەگەر کاك مەسعود بروات باشە ئەوە ئاشتیەکە دەبێت، لە١٢/٢٩ دەعوەتی کاك شمس الدین موفتی بوین لەچێشتخانەی شاکرفەتاح لەتەهران لەوەلی عصر، لە١٩٩٦/١٢/٣٠ لەتەهران بوین لەگەڵ کاك شەوکەت دەعوەت بوین لەماڵی ئاغای حسین ئەمیر بۆنانی نیوەرۆ هەرهەمان رۆژ ئاغای پەنایی سەردانی کردین لەئوتێل ئەتلەس هەروەها برادەرانی سوپا سەردانیان کردین ئاغای محمودی رەحیمی وئاغای بهرۆز، لە١٩٩٦/١٢/٣١ لەتەهران بوین لەئوتێل ئەتلەس پاشان چوینە بازارو زۆرگەراین دوا رۆژی ساڵی ١٩٩٦ بوو.. ئێوارەکەی لەگەڵ کاك شمس الدین موفتی و کاك قادرعەزیز دەعوەت بوین لەماڵی

کاك ئاغا مراد هەرئەورۆژە سەردانی ماڵی کاك زرارمان کرد لەتەهران چونکە نەمان توانی بۆدەعوەتەکەیان بچین داوامان کرد لێمان قبوڵ بکەن ئەو سەردانە...ساڵی ١٩٩٦ ساڵێکی پر لەروداوی سەیرو سەمەرەوگەورەترین تۆڵە سەندنەوەی شەری ناوخۆ روی دا بۆتێکدانی وەزعی کورد پەرلەمان و حکومەت پارتی گرتی لەگەڵ عێراقدا کەئەوە دەبو بەکارێکی خراپ دژی کوردوخۆشیانیان کردو ٥٣ ساڵ خەباتی پارتی توشی ئەوەبوو یەکێتی نیشتمانیش لەبەرامبەر پارتی وعێراقدا شکاو لەسەر ساحەی کوردستان بۆماوەی زیاتر لەمانگێ بۆسەر سنورەکان دەرکران و هاوپەیمانی کوردستان پێهات و پێکەوەش پارتیان شکاند لەزۆر ناوچەی کوردستان دەرکران ئەگەر عێراق رێگای بدایە هەولێرو زۆرجێگای کەش وەکو شەقلاوەو خەلیفان دەگیران بەلام عێراق لەلایەك و مەسەلەی ئاشتی لەئەنقەرە و ئەمریکاو بەریتانیا داوای راگرتنی شەریان کردو گۆرانی زۆرو ساڵێکی پر لەجەنجاڵمان بو.. دیلی کورد بەدەستی کورد دەکوژرا سەدان دیلی یەکتریان لابو لەزینداندا بون واتە زیندانی کورد لای پارتی ویەکێتی پربون لەزیندانی کورد ساڵی پرمەینەتی ١٩٩٦ کە ٣١ی ئاب وزۆری کەی تێدا رویدا بەرێ کردو پێمان نایە ساڵێکی کەی نادیارەوە ، گەورەترین روداو و دوژمنایەتی گەیشتە سەر ئێسقان پارتی دوای ٥٣ ساڵ خەبات و تێکۆشان ئامادە بێت لەسەر دەبابەی عێراق ئالای زەرد وئالای عێراق پەلاماری شاری هەولێر بدات بۆ شکاندنی دژەکەی خۆی یەکێتی کارەساتە، یەکێتی دەیوت پارتی خیانەتی کردوە بەلام من رام وانەبوو... من رام وابوو پارتی سەری لەسیاسەتی ناوچەیی وجیهانی دەرکردووەو یەکێتی کەم تەجروبەو غروری سەر لەسیاسەت دەرنەکردنی ناوچەی توشی ببوو، پارتی توانی لەساڵی ١٩٩٥ قەناعەت بەئێران بکات چەك و تۆپ و راجیمەو خاکی خۆی بۆ بکاتەوە هێزی چەکدار هاتووچۆ بکات و لەشەری خورماڵ و هەورامان و هەڵەبجە وشارەزوور پارتی و

بزوتنەوەی ئیسلامی یەکێتی بشکێنن و دەری بکەن و لەقەلأدزەش بەتۆپی ئێران وهاوکاری پارتی وبزوتنەوەی ئیسلامی قەلأدزە کوشتاری زۆری دا وەلەساڵی ١٩٩٦ سوپای عێراق بە ٨٠٠ دەبابە و ئەو هەموو هێزەوە بهێنێتە سەر هەولێر و یەکێتی تەفروتونا بکات و لەکوردستان دەری بکات وراوی بنێت وەلەساڵی ١٩٩٧ سوپای تورکی بهێنێتە دۆڵی سماقوڵی و یەکێتی پێ بشکێنێ من پێم وانیە ئەوانە هەموی هەر خیانەتە وەکو یەکێتی پێ ی لەسەر دادەگرێ من پێم وایە پارتی لەسیاسەتی ئەقلیمیدا سەر دەردەکات و ئەو دەوڵەتانەی قەناعەت پێ کرد شەری یەکێتی لەسەر پارتی بکەن بەلأم یەکێتی نەیتوانی قەناعەت بەو دەوڵەتانە بکات کەشەری خۆی نەکەن هێزێکی تۆکمەو گەورەی وەکو یەکێتی لەمێژوی خۆیدا بۆیەکەم جار بەو شێوە بشکێ ئەوەش هەموی باجی هەڵەکانی خۆی ئەدات هەمیشە ئیستراتیژیەت لە خزمەتی تاك تێك دەنێت خەتێکی رونی ئایدیۆلۆجیان نیە بونی مەرکەزی جیاجیا وکارکردن لەسەر روداوی رۆژو دەست نیشان نەکردنی دۆست و ناحەز ودوژمنەکانی خۆی هەرلایەك لە خانەی خۆیدا هۆکارە بۆ ئەو کارەساتانەی بە سەر یەکێتیدا هاتوە بۆیە یەکێتی پێویستی بە پیاچونەوەی سیاسەتی خۆی هەیە بەرای من لەورۆژانەی پارتی زۆربەی یاهەموکوردستان یان لەدەست بو دەوڵەتانیش شێوەی مامەڵەیان لەگەڵ یەکێتی گۆرابو جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکاو بەرپرسانی بەرزی ئەمریکا لەسلوپی تورکیا وەکوبەرپرسی یەکەمی کوردستان پێشوازیان لەکاك مسعود بارزانی کرد بەلأم یەکێتی ومام جەلال هەرچی هەوڵیان ئەدا جوابی تەلەفۆنیشان نەئەدانەوە دەعوەتی کاك نێچرڤان کرا بۆئەمریکا ونێرانیش هەرلەیەکەم رۆژەوە داوایان لەپارتی کرد ئامادەن بۆ هەمو هاوکاری پارتی بریندارەکانی پارتی بەرەوئێران بەرێ دەکران بەلأم سوپای پاسداران توشی هەندێك ئیلتیزامات ببوو لەگەڵ یەکێتیدا لەسەر هێرشە

هاوبەشەکەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان وسوپای پاسداران بۆسەرکۆیە وحزبی دیمکرات واتە دونیا مامەڵە لەگەڵ بەرژەوەندی وهێز ئەکەن هەروای ئەوگۆرانەش ئەمریکاش کۆبونەوەکەی کاك نێچرڤان بارزانی بۆئەمریکا دواخست ونەکرا چونکە یەکێتی گەرایەوەکوردستان وزۆرناوچەی خستەوە ژێردەستەڵاتی خۆی لەگەڵ پارتی بونەوە شەریك رای ولآتانی پەیوەندیدار گۆرا وەکویەك مامەڵەیان لەگەڵ یەکێتی وپارتی ئەکرد ساڵی ١٩٩٦مان بەرێ کرد بەلآم خوائەزانێ مەگەر هەرلایەنە کوردیەکان وخەڵکی کوردستان بزانن بەچ دەردی سەرییەك بەرێمانکرد باوەرناکەم بەئاسانی لەبیری بکەین.. مەگەر کەسێك ئەورووداوەی نەدی بێت یابێ عاربێت هیوادارم دووبارە نەبێتەوەو دەرسی لێوەر بگیرێت هەرچەندە باوەر ناکەم ئەم ئەقڵیەتە هەروا بەئاسانی بگەنە ئەنجامێك بەلآم لایەنی خێر هەربەردەوامە ... بەخواتان ئەسپێرم تابەرگێکی کەی ئەم کتێبە ئەگەر مەرگ بوار بدات وخوایارمەتی بدات ....

## کۆتایی بەرگی چوار

**محمد: حاجی مەحمود**

## من کێم ؟

**من سەربازێکی گوم ناوم**

**من هەمیشە بۆ تۆ سوتاوم**

**هەرئەوەشە لەکاروان بەجێ ماوم**

**من هەمیشە بۆ تۆ دەگریم**

**فرمێسك دێت لەچاوم**

**تائێستاش تۆ نازانیت من کێم و ...**

**چیە ناوم ...**

٨٦/

بۆ زۆر بەڕێز جەنابی کاک محمد حاجی محمود

لەپێشدا ڕێزو احترامێکی زۆرم هەیە لەحضور جەنابتان

بەهیوام شادو بالابن لەژینت.

براکەی عەزیزم:-

جەنابتان هەمیشە جێگەی ڕێزلێنانن و پیاوەتین

ئومێد دەکەم قەبولی ئەو ڕەجوونە لەمیانی مە بەم ئەرکە

پیرۆزە هەڵسن و چارەیەک بدۆزنەوە بۆ مەسەلەی

هادی حمە صالح وە بەتەمای وەلامی بن بۆ کردنی

لە تۆ چاوەڕوان دەکەم چونکە کوڕە لێک لە خزمەکانی

هاتوونە لای مە و تکلیفیان کردووە منیش بەتەمای

هەمەی برایانەی تۆم.

پێشتر خۆشتیانم

دڵسۆزتانم

الوزیرێک بستواتە

١٩٩١/٧/١٢.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
سکرتێری گشتی

الاتحاد الوطني الكردستاني
الامين العام

Patriotic Union of Kurdistan
Secretary General

برای خۆشەویستم کاکە عومەری بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادیی و خۆشیتانم داوایە و سڵاوم هەیە بۆ کاک د. محمود.

لەم کاتە ساتە مێژووییە، چارەنووس سازەدا، دڵنیام یادی
وەک تۆ یەک هەر دەستکەوتی کوردایەتی و شۆڕش و دواڕۆژی
کوردەواری دەخاتە بەرچاو، بەڵکو هەڤاڵایەتی و برایەتی
دێرینیش لەبیر ناکات. هەقە ئێمە و هەمووشمان بە ئەملی
بیروباوەڕی خۆمان، بە گوێرەی دەستکەوتی گەلەکەمان، بە ئەملی
بیروڕای شۆڕشگێڕانە و پێشکەوتنخوازانەی خۆمان
بڕیار بدەین و ڕەفتار بکەین و بیانخەینە سەرووی
حزبایەتی تەسکو و خۆویستنەوە. من بەش بە حاڵی
خۆم بەلاوە ئەوە گرنگە کە ڕێبازی ڕاست بچەسپێت و
و بیروڕای دروست سەرکەوێت و سەرەتاکانی گوشەدراد
بەخوێنی شەهیدانی خۆشەویستمان، شەهیدان عەلی و د. خالید و
کاک ڕەئووف و دەیانی تر، سەر بگرێت.

هیوام وایە لەوە دڵنیابن کە ئێمە بەلامانەوە گرنگ ئەمەیە
ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، ئەنجومەنی مافی چارەی خۆنووسین بێت
لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتدا (دژی دیکتاتۆریەت) و
ئەنجومەنی ڕزگاری و دیموکراسی و ئاشتی و ئاوەدان کردنەوە بێت.

جا لەم کاتوساتەدا پێویستە شۆڕشگێڕانی عەرەب تۆ

کە تەمەنی لاوێتی خۆیان لەسەر شۆڕش داناوە،

باشتر و دووربینانەتر بیر بکەنەوە لەسەر بناغەی

کوردایەتی و شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە ـ دەوڵی پارەچیو دەکری ـ

هەڵوێستێکی ڕاست و ڕەوا بگرن.

زۆر سڵاوم هەیە بۆ کاک د. محموودیش و حەز دەکەم

بستان بینم. بەڵام لە جیاتی من ئەلحاج بلی. کە کارێک

نەکات جارێکی تر (کورا سیکی) زیاتر بنووسێتەوە!!

بە کاک شەوکەتیش داهەندە بارەسپاردەم بۆ ناردوو

هیوادارم بە دڵتان بێت.

ئیتر هەر ژیا بن

برا و دڵسۆزتان

مام جەلال

جەلال.

کوردستانی عیراق

١٠/١/١٩٩٢

بۆ / هەموو ڕێکخستنە بەڕێزەکانی حزب لەدەرەوە و ناوەوەی وڵات

سڵاوێکی شۆڕشگێرانە .

هیوادارم سەرشەو بن .

هەڤاڵانی بەڕێز . نووسراوەیێ ، ویژدانی و دوور لەڕاستی و ڕەوالی حزبی ئاب عادل مراد لە مێژووی ١٩/ ٥/ ١٩٩١ و ٢٩/ ١١/ ١٩٩١ ئاراستەی کردوون تیبینی تان کردووە کۆمەلێ ئیتهاماتی زۆری تیدایە بۆ من و سکرتێری حزبیشی گرتۆتەوە کە لەواقیعدا دژی حزب

ئەو نیهجە ئەوە لە نتیجەی ئەوە هاتووە لە لەکۆبوونەوەی حزبیدا بە ئامادەبوونی چەند ئەندامی قیادەی حزب بەم گووت گیرانەکەی

چی بووەو نیهەتی حەلەتاندووە . ئەدەبوو ئیمزای بوون بەجاسوسی بکات و خۆی تسلیم بکات ئەوەتو دەرکەوت لەکۆنەوەبوو ئە -

هەروەها ئەگەر ڕاست بووجون پاشان بەشێوەی خاص ناردیان بۆ لندن و بە دەورەدیوی کە ئیتهاتم هەیەو سەرنجی هەموو هەڤاڵانی

ڕاکێشا . من قسەو ئیتهاتم زۆرە پێم خۆش نەبوو ئەم وەڵامەش بدەمەوە . پێم خۆشە لەوەزیاتر خۆی لە کوردستان نەبیری هەروەکو

قسەینە خۆی بوواردووە لە زروفی سەغلەتیدا .

بابیتەوە لە حەدوی مەینەت و نوستەی ناوەندی عارحەو مانەندە بکەین وەکو کورد ئەڵێ ( وەش وسێی لە بوار دەر ئەکەوی .

با بەپەلەقاژێ و مهاترات شتی ئەساسی ئەبیر نەباتەوە و ( گێزبەزمارە سابەر دیارە ) با لەڕووی بەشەری حەلی بکەین و ڕوونی

بکەینەوە بەجوزئەتەوە . ئەگینا ئەو اسلوبە بە تکتل و تخریب و خوپەسەندیە و شاردنەوەی حقیقەت ئومید ئەکەم ڕێکخستن و هەڤاڵەکانی

حزبیش لەوە بەرزترن بە قسەی ڕووت و بریقەدار باوەڕ بکەن و مەجال بدەن ڕیزەکان شتی بێ شخصیەتی و مندس تیی بکەویت یا ڕوون بیتەوە .

هەڤالستان

محمد ڕحیم ( خال حاجی )

وێنەی بۆ ئاک عادل مراد بۆ جورئەتی هاتنەوەو حەوارحە و مکانفە .

عادل مەیدەن لە ئاوی لیل ماسیگری ئاوەکە لەوە ڕونترە تو مەسەلەی تیابکەوی بەسەبی ویژدانی و تۆهمەت هەڵبەستن ثابیت

تو لە هاتیت لە لندن لای من دابەزیت لە نتیجەی عارحەی واقعی ئیتهات توانی ئەو مهاترانە بوی کە ڕاست نیە بەم اسلوبە .

بەڕێز مام محمد حاجی محمود لێ پرسراوی لقی سلێمانی

بەڕێزو سڵاو

پاش سلام - من هاونیشتمانی حسن مجید قاضی
هەڵکەوتەی دێی کانی دینگە عشرەتی خێلی یادا - کە لە دانیشتووی
منطقەی ناوچەی پەحوت - مدەی ٩ مانگە ترکی
٤٠ ساڵ لە تزیکی دێی ویرانە کراوەکەی خۆمانەوە نیشتەجێ
بووین - وە ئێستاکە ئەمانەوێ لە ئاوەدانی خۆماندا
لە تزیکی دێی ئاوەدان دێیەکی تازە بینا بکەین -
جا داوا لە شخصی جنابت ئەکەین بە جانبی خۆت
هەرچی ئەتوانی یارمەتیمان بدە بۆ ئاوەدانکردنەوەی
ئەو دێیە - لێرەش هەروەک شێکەوە نووسیمان بە
...٢ حد هوزەڵ ٧ ئاغای هوبە - بۆ ئاگاداری ئاو
گیرتوبیشتەوە -

حسن مجید قاضی

١١/٢/١٩٩٢

رۆژی شەممە ڕێکەوتی ٢٩/٢/١٩٩٢ لەبارەگـــای کارگێڕی سەرکردایەتی سیاســـــی پارێزگای سلێمانی و ، بە ئامادە بوونی دوو کارگێڕی بەرەو کۆمیسیونی چارە سەرکدنی کێشەی عەشایەرەکان و سەرۆك عەشیرەتەکانی کە پەیوەندیان بە کێشەکەوە هەیە کۆبوونەوەیەکی فراوانیان کرد بۆ چارەسەرکردن و نەهێشتنی کێشەی نێوان عەشیرەتەکان پاش گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە و ، بەشێوەیەکی فون و فـــــراوان کە زیاد لە شەش (٦) کات ژمێری خایاند توانرا بە هەوڵ وکۆششی هەموو لایەك کۆتاییەکی شێکارەکـــــی و سەرکەوتو بەو کێشەیە بهێنری و ، لەپاشاندا ڕێکەوتن نامەیکیش مۆر بکەن ٠٠ ڕێکەوتن نامەیەکــــی تایبەتە بە چارەسەرکردنی کێشەی نێوان عەشیرەتــــی گەلاڵی و وسوچانی ( شاتری ) کێشەکەش بریتی یە بەیەکدانانی ئەم دوو عەشیرەتەو ، لە ئەنجامدا ( ١١ ) کەس کوژراوەو ، ( ڕۆستەم محمد قـــــادر ) یش پەکی کەوتووە ئەو (١١) کوژراوە (٥) یان سەر بەعەشرەتی گەلاڵی و (٦) یان سەربەعەشیرەتـــی وسوچانی

ڕێکەوتن نامەکەش لەم خالانەی لا ی خوارەوەدا کودە بێتەوە ٠

١- هەریەك لەو عەشیرەتانە خوێنی کوژراوەکانی خۆیان بدەن ٠

٢- بو بارمەتی دانی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بەرەی کوردستانی بڕیاری دا ،کە وەك یارمەتــــــی (٤٠) چل هەزار دینار ببەخشێتە ڕۆستەم محمد قـــادر ٠

٣- بەلێن وەرگیریَ لە هەر دوو لا ( عەتا سەراوی ) و ( فتاح محمد قادر ) کە بە هیچ شێوەیەك جارێکی تر ئەم کێشەیە سەر هەلنەداتەوەو ، هەوڵ بدرێت کە بارو دوخەکە بگەڕێتەوە سەر دۆخی جارانی خـــۆی و بالی خوشەویستی و برایەتی تیا رەچاو بکرێـــــت ٠

٤- وینەیەك لەم ڕێکەوتن نامەیە بدرێتە سەرکردایەتی سیاسی و کارگـێر و کومیسونـــــــــی چارەسەرکردنی کێشەی عەشایەریەکان و نوێنەرانی لایەنەکە ٠

٥- ئەم سەرۆك عەشیرەتانەشی کە ئاگاداری ئەم ڕێکەوتن نامەیەن ئەگەر هاتوو جارێکی تـــــر بە بنچینە وانە وە ، ئەو کێشەیە زیندوو بکرێتەوە ئەوا بەتوندترین شێوە سزا بدریَ و ، کێشەکانـــــــی پێشویش بەسەر ئەولایەنەدا ئەشکێتەوە ٠

رۆژی شەممە ڕێکەوتی ١٩٩٢/٢/٢٩ لەبارەگـای کارگێڕی سەرکردایەتی سیاسـی پارێزگای سلێمانی و ، بە ئامادە بوونی دوو کارگێڕی بەرەو کۆمیسیونی چارە سەرکردنی کێشەی عەشایەرەکان و سەرۆک عەشیرەتەکانی کە پەیوەندیان بە کێشەکەوە هەیە کۆبوونەوەیەکی فراوانیان کرد بۆ چارەسەر کردن و نەهێشتنی کێشەی نێوان عەشیرەتەکان پاش گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە و ، بەشێوەیەکی فون و فـراوان کە زیاد لە شەش (٦) کات ژمێری خایاند توانرا بە هەول و کۆششی هەموو لایەک کوتاییەکی شێکارەکـی و سەرکەوتو بەو کێشەیە بهێنری و ، لەپاشاندا ڕێکەوتن نامەیکیش مۆر بکەن ٠٠ ڕێکەوتن نامەیەکـی تایبەتە بە چارەسەرکردنی کێشەی نێوان عەشیرەتـی گەلاڵی و سوچانی ( شاتری ) کێشەکەش بریتی یە بەیەکادانی ئەم دوو عەشیرەتەو ، لە ئەنجامدا ( ١١ ) کەس کوژراوەو ، ( ڕۆستەم محمد قـادر ) یش پەکی کەوتووە ئەو (١١) کوژراوە (٥) یان سەر بەعەشرەتی گەلاڵی و (٦) یان سەر بە عەشیرەتـی وسوچانی

ڕێکەوتن نامەکەش لەم خاڵانەی لا ی خوارەوەدا کودە بێتەوە ٠

١ـ هەریەک لەو عەشیرەتانە خوێنی کوژراوەکانی خۆیان بدەن ٠

٢ـ بو یارمەتی دانی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە بەرەی کوردستانی بڕیاری دا ،کە وەك یارمەتـی (٤٠) چل هەزار دینار ببەخشێتە ڕۆستەم محمد قـادر ٠

٣ـ بەلێن وەرگیری لە هەر دوو لا ( عەتا سەراوی ) و ( فتاح محمد قادر ) کە بە هیچ شیوەیەك جارێکی تر ئەم کێشەیە سەر هەلنەدا تەوەو ، هەول بدرێت کە بارو دوخەکە بگەرێتەوە سەر دوخی جارانی خـۆی و بالی خوشەویستی و برایەتی تیا رەجاو بکرێـت ٠

٤ـ وینەیەك لەم ڕێکەوتن نامەیە بدرێتە سەرکردایەتی سیاسی و کارگـێر و کومیسونـی چارەسەرکردنی کێشەی عەشایەریەکان و نوێنەرانی لایەنەکە ٠

٥ـ ئەم سەرۆك عەشیرەتانەشی کە ئاگاداری ئەم ڕێکەوتن نامەیەن ئەگەر هاتوو جارێکی تـر بە پێچە وانە وە ، ئەو کێشەیە زیندوو بکریتەوە ئەوا بەتوندترین شێوە سزا بدرێ و ، کێشەکانـی پێشویش بەسەر ئەولایەنەدا ئەشکێتەوە ٠

تەلاچوالان

1992/3/4

براگیان کاک محەمەد حاج مەحموودی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادی وسەرکەوتنتان داوایە وئیمەش باشین.

نامەکەتان گەیشت زۆر سوپاس. بەداخەوە خۆم ناتوانم بەشداری ئاهەنگەکەتان بکەم، بەڵام داوم کردووە یا ژەنەراڵ کەمال موفتی بنێت یا کۆلۆنێل شەوشێروان لەجیاتی من بێت.

لەپێشەوە شاد ئاواتەخوازی سەرکەوتنی ئاهەنگەکەتان بووەخوازم

ئیتر هەر بژی بو

برای دڵسۆزتان

مام جەلال

جەلال

قەلاچوالان

٦/٣/٩٩٢

برای خۆشەویستم کاک حەمە حاجی محمود بەرێز

سڵاوێکی گەرم

شادی و سەرکەوتنتانم داوایە

کاک نوری حەمە ساڵح خزمێکی نزیکی مامۆستا براهیم ئەحمەدە، خانوێکی بە کرێ گرتووە، ئێستەش ئاوەهێنێکی ئێوە کاک ئەحمەد قەیفرای لەو ڕوورەی دەچێتە سەری و داوای دەرچوونی لێ دەکات، تکایە وابکەن دازبالی بهێنێ چونکە خۆی خانوەکەی بە کرێ گرتووە لە خاوەنی خانوەکە.

شێر هەر شاد بو

برای دڵسۆزتان

مام جەلال

پەیمانگای هونەری سلیمانی
نوسینگەی عەمید

ژمارە : پ/ ٢٢٠
رۆژ : ٢٥/٣/١٩٩٢

بۆ/ بەریز کاک محمدی حاجي مەحمود

سلاویکي گەرم :

بەناوی ماموستایان و قوتابیان و کارگیراني پەیمانگاکەمانەوە زور سوپاسي ئەو هەول و کوششە گەورەیەت دەکەین بو ئامادەبونتان لە فیستوڤالەکەماندا هیوادارین پەیوەندیمان هەر بەردەوام بی و زیاتر دەست بەکاربین بو خزمەتي هەمولا یەکمان و خویندني بالا لەشارە خوشەکەماندا .

عبدالرحمن محمد رشید
عمید

٦-٧- ١٠٨

برای بەڕێزم کاک محمد حاجی محمود

سڵاوێکی گەرم

هیوام خۆشیتانە

لەو ئامادە بوونی خۆتان دیارە ئامانجیانە
کۆبوونەوەی کە بڕیار درا هەموو ژمارەکانی
بکەرنە ئێستا وە هەموو بیارە وە مەکتەبەکانیانە
بۆ بڵاو بکەنەوە . دەزگای سەربازی لە هەموو
ئەفسەرەکان پێک هاتووە بۆ سەرپەرشتی
کردنی هێزی سوپای کوردستان کە سەر
بە هیچ لایەک نییە بەربڕیارە هەموو شتە
عەسکەریەکانە کۆ بکەنەوە . وێنە هەر ئەوەمان
لە سەر پشتوانیانە بکەین . جا ئەگەر ئەزانن
ئەو بڕیارە مانە باشە نەبووە داوا بکەن
با سەرکردایەتی بەرە کۆ ببێتەوە وە ئەو
بڕیار هەڵبوەشێنێ وە جێگای بۆی باشە
ئەوە جێبەجێ ئەکەین .

دووبارە سڵاو مانە هەموو وە هاوڕێیان

براتان
عمر فتاح
٢/٢٥

حزبی سوسیالیستی کوردستانی / عێراق
مکتبی سیاسی

ژمارە/ ١٠٥٠ م
بەروار ١٩٩١/١٢/٢٢

بۆ/ لقی هەولێری ئێتۆشسەر
سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

ئەوا معاملەی ک.م فواد محمد معروف‌تان بۆ ئەنێرین تکایە معاملەی شەهید و ئەنفالە بەدناوکستان هیچ پەیوەندیێکیان بە کومیتەی گومرگەوە نیە ئەگەر لای خۆتان جێ بەجێ ئەبێ جێ بەجێیان بکەن .

ئێمە بۆ پێشەوە . . .

بۆ/ زۆر محترم و خۆشەویستم کاکە حمە

پاش سڵاوێکی گەرم هیوام خۆشیو سەرکەوتنتە وە

هیوادارم هەمیشە لە خۆشیابیت .

کتیبەکەتم پێگەیشت وە بە خوێندنەوەی زۆر پێ خۆشحاڵ

بوم وە ئومیدەوارم خونەی بەرێزت زیاد بیت و سەرکەوتو

بیت انشاالله بە خۆشیو کامەرانیت .

برات
یادگار جاف
مدیر گومرگی سلێمانی
٩٩٢/٢/٢٠

بسم الله الرحمن الرحيم

محافظة اربيـــل
الهيئة العليا لانتخابات المجلس
الوطني الكردستاني / العـــراق
العدد / ٢ / ب
التاريخ / ١٩٩٢/٤/١٨

بيـــــان ( ٢ )

بناء على صدور بيان الجبهة الكردستانية المرقم ( ٢ ) في ١٩٩٢/٤/١٥ والمتضمن تحديد يوم الاحد الموافق ١٩٩٢/٥/١٧ موعداً لاجراء الانتخابات في كردستان واستناداً الى احكام المادة ( ٢٦ ) من قانون المجلس الوطني لكردستان العراق رقـــم ( ١ لسنة ١٩٩٢ تقرر فتح باب الترشيح لمدة عشرة ايام اعتباراً من ١٩٩٢/٤/١٦ ولغايـــة نهاية الدوام الرسمي ليوم السبت الموافق ١٩٩٢/٤/٢٥ فعلى من تتوفر فيه الشـــروط تقديم قوائم المرشحين على نطاق كردستان العراق ومشفوعة بالوثائق المطلوبة في المـــادة ( ٢١ ) من قانون المجلس الوطني اعلاه بموجب استمارة خاصة اعدت لهذا الغرض لـــدى الهيئة العليا في اربيـــل .

القاضي
امير حويـــزي
رئيس اللجنة العليا لانتخابات المجلس الوطني
لكردستان ـ العراق

نسخة منه الى :ـ

الجبهة الكردستانية
الاحزاب السياسية والمنظمات الجماهيرية والمهنية
محافظات اربيل / سليمانية / دهوك /كركوك
المناطق الانتخابية /
محطات التلفزيون والاذاعة
الصحف المحلية

بسم الله الرحمن الرحيم

الجمهورية العراقية
وزارة الدفاع
(الديوان)

العدد/
التاريخ/

الاخ العزيز محمد الحاج محمود صولاخانة المحترم - عضو المكتب السياسي للحزب الاشتراكي الكردستاني

تحية وتقدير..

استلمنا رسالتكم التي حملها الاخوان ولا زلنا نؤكد على اجراء الحوار واذا مارغبتم في الحوار فنحن حاضرين للاستقبال في بغداد عاصمة العراق ... انتهز هذه الفرصة لأجدد شكري وتقديري لكم على مبادرتكم العراقية الوطنية سائلين الله تعالى ان يوفقنا جميعاً لما فيه خير العراق العظيم ولما يمكننا للعمل سوية لابعاد اي طرف اجنبي بين شعبنا في كردستان العراق سائلين العلي القدير أن يحفظ قائد العراق وشعب العراق بعربه وكرده واقلياته واديانه ومذاهبه

... ختاماً تقبلوا تحياتي لكم ولاخوانكم العراقيين من حزبكم .

الفريق الاول الركن
علي حسن المجيد
وزير الدفاع

٢١ نيسان ١٩٩٢

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

کۆماری عێراق

وەزارەتی بەرگری

(دیوان)

برای بەرێز محمد حاجی محمود

ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی سۆسیالیستی کوردستان

سلاو رێز ...

نامەکەتانمان وەرگرت لەوبرایانەی کەهێنابویان وەتائێستا تەئکید لەسەرگفتوگۆکەینەوە ئەگەر ئێوە ئارەزوتان هەبێت لەگفتوگو وەئێمە ئامادەین بۆ پێشوازی لە بەغدادی خۆتان پایتەختی عێراق، بەم بۆنەیەوە سوپاسی رێزی خۆمتان پێ رادەگەیەنم بۆ ئەو دەستپێشخەریە عێراقیە نیشتیمانیە بەداواکارم لەیەزدانی گەورە سەرکەوتومان بکات لەهەرچی ئاشتێ کەخێری عێراقی مەزنی تیابێت بۆئەوەی بتوانین پێکەوە ئیش بکەین بۆ دورخستنەوەی هەرلایەکی بێگانە لەگەلەکەمان لە کوردستانی عێراق ، وەداواکارم لەیەزدانی بەتوانا سەرکردەی عێراق وگەلی عێراق بپارێزێ بەعەرەب و کوردو کەمە نەتەوەو ئاین و مەزهەبەکانی .
لەکۆتایدا سلاوم بۆئێوەو بۆ برا عێراقیەکان لەحزبەکەتان قبولّ بکەن .

فەریقی یەکەمی روکن

علی حسن العجیب

وەزیری بەرگری

٢٣/نیسان/ی ١٩[illegible]١

KOMELEI
HUNERMENDANI
KURDSTAN

کۆمەڵەی هونەرمەندانی
کوردستان

KURDISTAN ARTISTS
SOCIETY

ژمارە / تایبەت

ڕۆژی / / / ١٩٩٠

---

(یەکبوونی هونەرمەندان لە پێناوی هونەرێکی باڵا بۆ کورد)

بۆ / بەڕێز محمدی حاجی محمود هارونی .... ئەندامی مەرکەزی پارتی هاوبەشی
حسـک و پاسـۆک

سـلاوی هونەروخەبات

بەڕێزان ئەمرو لەگۆڕەپانی کوردستانی ئازاددا ئاشکرایە لای هەموان کە هونەروئەدەب دەوری کاریگەری خۆیان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەگێڕن لەپێشخستنی ئاستی ڕۆشنبیری گەلـە ستەمدیدەکەمان هەڵبەتە پێویستی سەرشانی هەموولایەکە هەریەکە لای خۆیەوە جمکێکی مەسەلەکە بگـرێت.

کۆمەڵەی هونەرمەندانی کوردستان بەتەواوی لەخۆی دەبینێ بەوە داوای کۆمەک و یارمەتیتان لێ دەکات بۆ بەرەوپێشبردنی کاروبارە هونەرییەکان و ڕێکخراوەکەمان،

یارمەتیتان جێگای فەخرو شانازی یە.

کۆمەڵەی هونەرمەندانی کوردستان
دەستەی بـاڵا

بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی (بلدیة) بەکرەجۆ

ژمارە/ ١٢١

بەروار/ ٧/٥/٩٩٢

بۆ/ حزبی سۆشیالستی کوردستان / لقی سلێمانی

لەرێگای ڕێکخراوی بەکرەجۆی حزبی سۆشیالستی کوردستان

ب/ یارمەتی

==============

داوای یارمەتی لە حزبتان ئەکەین کەیارمەتی شارەوانیەکەمان بدەن بۆ چاک کردنەوەی سەیارەکانمان کەپێویستمان بەمبلغێک هەیە چونکە ئێستە لەتوانای شارەوانیەکەماندا نەبوە ئامین کردنی پارەی بۆ چاک کردنەوەیان هەروەها چاک کردنەوەی ئەم سەیارانە بۆ بەرژەوەندی گشتیە لە بەکرەجۆ هاوکاریمان لەگەڵ ماندا بۆ ئەم ئەرکە جێگای سوپاسێکی زۆرە هیوا دارین ئێوەش هەروەک لایەنە بەرێزەکانی کە جێ دەستان لەروی یارمەتیەوە دیار بێت ئیتر بۆ پێشەوە .

ئەشرەف شەریف نوراللـه

بەڕێوەبەری شارەوانی بەکرەجۆ

بسم الله الرحمن الرحيم

الأخ كمال حمه الحاج محمود المحترم

تحية احترام وتقدير وبعد :

١. راجعنا الأخوة الضباط بخصوص طيف وحدة/هلبا وكانت معاناتهم في نقطتين أساسيتين وهما :

أ. عدم وجود عمل لهم ..

ب. عدم صرف رواتبهم في مواعيدها المحددة .

٢. ولتلافي الإشكالات فقد تم الاتفاق مع الأخ كمال شيخ محمد في المكتب السياسي بجعل رواتبهم وحدة أمرية جديدة ويجري صرفها من قبلنا مباشرة نهاية كل شهر .

٣. لذا يرجى منكم الاستماع الى ملاحظاتهم وإبداء المساعدة لهم بقدر ما يتعلق الأمر بكم بصدد التدريب وجمع الأسلحة الثقيلة والأعتدة ومفيشتها

وأكون شاكراً لكم ..

ودمتم للنضال

اخوكم المقصر

عثمان رشاد المفتي

رانية ١٠/٥/٩٩٤

بەناوی خوای گەورەو میهرەبانەوە

پەیمانگای هونەری سلێمانی
نوسینگەی عمید

ژمارە/ ب/ ٤١
بروار ١٤/٥/١٩٩٢

**بە هیوای پەرلەمانێکی سەرکەوتو بۆ کوردستانی ئازیز**

بۆ / هەڤاڵی تێکۆشەر کاک محمدی حاجی محمود بەڕێز

سلاوێکی خۆشی گەرانەی پڕ لە زانستی و زانیاری:
بە خانازیەوە پێتان ڕادەگەیەنین کە پەیمانگاکەمان پەیمانگای هونەری سلێمانی هەموو پێویستەکانی تاقی کردنەوەی کۆتای ساڵی ئامادە کردوە و بەم بۆنەیەوە سوپاس و ڕێزی هەموو کارگێران و خوێندکارانی پەیمانگاکەمان لە یەکەیەکەی ئەندامان و کاربەدەستانی ئێوەی بەڕێز دەکەین کە دڵسۆزانە هەموو یارمەتیکتان بۆ ئامادەکردنی لە کۆمەکی پارە و دارایی و دڵنەوایی.
هەر سەرکەوتو بن بۆ خزمەتی کوردستان و دوا ڕۆژی خوێندکارە خۆشەویستەکانی خوێندنی باڵا

عبد الرحمن محمد رشید
عمیدی پەیمانگا
١٤/٥

وێنەیەک بۆ /
- بەڕێز کارگێری بەرەی کوردستانی تێکۆشەر/ بۆ ئاگاداری لەگەڵ ڕێزماندا.
- تەلەفزیۆنی گەلی کوردستانی تێکۆشەر/ بۆ بڵاوکردنەوە لەگەڵ ڕێزماندا.
- تەلەفزیۆنی کوردستانی/ تێکۆشەر/ بۆ بڵاوکردنەوە لەگەڵ ڕێزماندا
- سەرۆک بەشەکانی پەیمانگا / ٤
- لەدوەی اعلانات/ معهد

# وثيقة العهد الكوردي التأريخي المقدس

نحن الموقعون ادناه قاده الاحزاب المؤتلفه في الجبهه الكوردستانيه العراقيه بعد ان قمنا باصدار القانون رقم ( ١ ) لسنه ١٩٩٢ قانون المجلس الوطني لكردستان العراق، والقانون رقم ( ٢ ) لسنه ١٩٩٢ قانون انتخاب قائد الحركه التحرريه لكردستان العراق نعلن بهذا لشعب كوردستان العراق ونشهده على توقيعنا لوثيقه العهد الكوردي التأريخي المقدس المدرجه أدناه:

«بروح ملؤها الإخلاص لشعبنا والخضوع لإرادته المقدسه والاحترام... لاختياره الحر والديمقراطي، نعلن بهذا متحملين مسؤوليتنا التأريخيه امامه، وامام الاجيال الكوردستانيه القادمه. اننا نتعهد ان نعمل متكاتفين لبذل قصارى جهودنا، وطاقاتنا لانجاح هذه التجربه الديمقراطيه التي تحدث لاول مره في تاريخنا المعاصر. كما نتعهد بضمان سير الانتخابات بشكل هادئ وطبيعي بعيد عن كل ما يعكر صفوها أو يعرقل أو يشوه صحتها ونزاهتها وشرعيتها أو شرعيه عمليه فرز الاصوات، وأعلان النتائج كما نعلن احترامنا لنتائج الانتخابات والتزامنا التام بدون قيد أو شرط بكل ما ستسفر عنه وبقرارات المجلس الوطني الكوردستاني والقوانين التي سيشرعها ونتعهد بالعمل دون كلل أو وهن، على تنفيذ تلك القرارات والقوانين بكل دقه واخلاص ونعلن على رؤوس الاشهاد ان من يخالف منطوق هذه الوثيقه يستحق إدانه شعب كوردستان وأجياله القادمه، والله والشعب على ما نقوله شهيد.»

| التوقيع | التوقيع | التوقيع |
|---|---|---|
| د. محمود عثمان | مسعود البارزاني | جلال الطالباني |

التوقيع
عزيز محمد

| التوقيع | التوقيع | التوقيع |
|---|---|---|
| قادر عزيز | عبدالله ئاگرين | سامي عبدالرحمن |

التوقيع
يعقوب يوسف

أربيل ١٥/مايس/١٩٩٢

**خوێنەری ئازیز**

ئەمەی سەرەوە ئەو «بەڵێننامە مێژووییە پیرۆزەی کوردییە» کە لایەنەکانی ( بەرەی کوردستانی ) لە ١٥/مایسی/١٩٩٢ مۆریان کردووەو لە ژمارە ( ٥ ) رۆژی ١٩٩٢/٨/١٢ ی رۆژنامەی «الجبهه الكردستانيه - بەرەی کوردستانی» بڵاوکراوەتەوە.

دەبێ لایەنەکانی ( بەرەی کوردستانی ) بەو شەرە براکوژییەی کە روویداو ئێستاش لێرەو لەوێ ئاسەواری بەردەوامە چی بڵێنو ئایا ئەمەیان پێچەوانەی ئەو بەڵگە نامەیە نییە کە لە دوا دێرەکانیدا هاتووە «ان من يخالف منطوق هذه الوثيقه يستحق ادانه شعب كوردستان واجياله القادمه والله والشعب على مانقول شهيد».

# دەستەی باڵای سەرپەرشتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان ساڵی ۱۹۹۲

تکـــایـــە:

یەکێك لەم لیستانەی خوارەوە هەڵبژێرەو بەپێنووس دەست نیشانی بکە.

| لیستەی | لیستەی | لیستەی | لیستەی | لیستەی | لیستەی | لیستەی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| پارتی دیموکراتی کوردستان | حزبی سوسیالیستی کوردستان و پاسۆك (یەکگرتن) | گەل | دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان ، شیوعی و بێ لایەنەکان | ئیسلامی | دیموکراسی خوازە بێ لایەنەکان | یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان |

بسم الله الرحمن الرحيم

حزب البعث العربي الاشتراكي
القطر العراقي
قيادة مكتب تنظيم الشمال
قيادة فرع السليمانيــة

أمة عربية واحـدة
ذات رسالة خالدة

العدد / ١٦/ ١١٧٩
التاريخ ٢٥/ ٥ /١٩٩٢

الى / تنظيمات محافظات الشمال

م / معلومات

تحية رفاقية

علمنا مايلي :

١) بان المجرم محمد حاج محمود الملقب كوله خانـه عضو قيادي في حزب سو شياليست الكردستاني العميل له صلة مباشرة بالحكومة الايرانية وبشخص ( رفسنجاني ) وعند تحركاتـه داخل السليمانية ترافقه عدة سيارات لحمايتـه ٠

٢ ) المذكور اخذ يتحدث عن تزوير الانتخابات وبشكل علني مما جعل العناصر القياديـة في كلا الحزبين الفائزين بالانتخابات الديمقراطي الكردستاني والاتحاد الوطنـي العميلين غير مرتاحين من احاديثه واعماله ٠

٣) بتاريخ ١٩٩٢/٥/٢٤ ذهب المجرم ( قادر قادر ) عضو مايسمى بالفرع الرابع للديمقراطي الكردستاني الى مقر حزب سوشياليست لغرض التحدث مع المجرم محمد حاج محمود واعلامه بانهم غير مرتاحين لما يفعله ٠

للتفضل بالمعلومات مع التقـدير ٠٠

ودمتم للنضـال ٠٠

الرفيق
محمد محمود الدوري
امين سر قيادة فرع السليمانية وكالة
٢٥/ ٥ /١٩٩٢

نسخة منه الى /
مديرية امن محافظة السليمانية /للتفضل بالمعلومات مع التقدير ودمتم للنضال

حزبی سوسیالیستی کوردستان / عیراق — ژمارە/ ٦٩٦

لقی سلێمانی — بەروار/ ٧/ ٦/ ١٩٩٢

بۆ / هەموو کومیتە ناوچەکانی سەر بە لقی سلێمانی

سڵاوێکی گەرم

تکایە لە ڕۆژی ١٩٩٢/٦/٨ دەست بکەن بە ئاهەنگ گێڕان لە گەڵ برادەرانی هاوبیرو پارتی گەل بە مناسەبەتی یەکگرتنمان لە گەڵ برایانی پارتی گەل وە گرنگی تەواوی پێ بدەن .

شادو سەرکەوتوو بن .

وێنەی بۆ /

- فایلی تایبەت

---

پارتی دیموکراتی کوردستان — ژمارە ٤١٥

ل . ن . عەرەبوت — ڕۆژ ١٢/١٢ ٩٩٢

بۆ ڕێکخراوی عەرەبوتی حزبی سوسیالیستی هاوبەیا -

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

بەهیوای زیاتر پتەوکردنی گیانی بەرەی وەحدە پیادەی یەکێتی و برایەتی -

نووسراوتان ژمارە (١٢١) ڕۆژی ٢٨ | ٢ | ٩٩٢ دەربارەی ناوچەی قوتابیانی ولاداتی دیموکراتی کوردستان ئەوە حقی خۆیانە و هەموولایەک هەقیەتی زیاتر گەشتیار چالاک بکات بۆ ئەوەی سەرنجی ئەوەوە بانگێشی بەرەو ڕێکخراوە کە بێ خۆت و تکایە ئاگاداری ڕێکخراوی قوتابیان ولادانی سوسیالیستی بکەن بۆ تنسیق لە جێ لە لیواندا هەردوو ڕێکخراو کە داو هاوکاری بیەک بکەن و منافەسە بێ - هەر بیانە بکەین و خرابە بەکەن لە سەر یەکتر وە ئێمەش بەدەوری خۆمان ئاگاداری ناوچەی عەرەبەتی قوتابیانە ولادانی دیموکراتی کوردستان لە کۆیەی

ئێمە بۆ پێشەوە

کۆمیتەی باڵای گومرگی هاوبەش

ژمارە : ٥٨

رۆژ : ٢٠-٦-٩٢

( بەڵێن نامە )

من کە ( کوردۆ ) بەڵێن دەدەم کە ( شۆفڵی ) ژمارە / ٧٠

جۆری ( کاواساکی ) مۆدێلی ( ١٩٧٩ ) ڕەنگی ( زەرد ) وخاوەنەکەی

( حەیدەر ڕەشاد بارام ) بەبێ ئاگاداری بەڕێزتان ئەو ( شۆفڵە )

نەفرۆشێت و ڕەوانەی دەرەوەی نەکات بەپێچەوانەوە خۆم بە بەرپرسیار دەزانم و

ئامادەم مەبلەغی ( ٥٠.... ) ( پەنجا هەزار ) دینار بدەم بۆیە لەخوارەوە

ئیمزای دەکەم

کەفیل

ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان [illegible]

ناو / کوردۆ

دانیشتوی : —

ژمارەی هویە : —

خاوەنی ئۆلیاری

سالار محەمەد [illegible]

خاوەنی [illegible]

ناو / حەیدەر ڕەشاد بارام

دانیشتوی : کەلار

ژمارەی هویە ی جنسیەی عێراقی

ع/ ٧٤١٩٥٩

تێبینی : لە ٢٠-٢-٩٨٤ دەرچووە

١ - ژمارەی مەکینە DA ٦٤٠-٥٤٦٨٢٠

٢ - ژمارەی شاسی KLD ٧٠ - ٢٨٢٤

تەنها بۆ ماوەی ٢٠ سی ڕۆژ کاردەکات

حزبی سوسیالیستی کوردستانی عێراق

هەڤاڵی بەڕێز کاک محمد

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

هەڤاڵی بەڕێز وەکو ئاگادارن پێشی چەند مانگێک لەسەر بڕیاری

بەڕێزتان سەیارەیەکم کڕی بۆ ناوچەی جودرستا لەسەر ئەمر

قەبلەغەوە پێنج هەزار دینار مایەوە. لای بەڕێزتان

بەهۆی نەبوونی پارەوە، بۆتان سەرف نەکردووە.

لەم سەفەرەدا ئێستا زۆر پێویستم پێیەتی زۆر بێ پارەم

بەڵکو بەڕێزتان بفەرموون بۆم سەرف بکەنەوە

جێگای سوپاسم — هەر سەرکەوتوو بیت

هەڤاڵتان

شێخ بهاء الدین

١٩٩٢-٧-٦

حزبی سوسیالیستی کوردستان / عیراق — ژمارە / ٨٦٧

لقی سلیمانی — بەروار ٢٠/٧/١٩٩٢

بو / کومیتەی ناوچەی سلیمانی تیکوشەر

سلاویکی گەرم

لەگەل نووسراوماندا ژمارەی ١٤ چواردە باوەرنامەی هەڤالانتان بو ئەنیریندەوە کە لە خولی یەکەمی کادیران پیان دراوە کە لەمانە ٣ سی هەڤالیان بە پلەی یەکەم دەرچوون وە ١١ یانزدە هەڤالیان بە پلەی دووەم ، سوپاسیان ئەکەین کە توانیان خولەکە بە سەرکەوتووی تەواو بکەن • وە ئەم نەتیجەیە بهینن • هیوادارین ئەو زانیاریانەی وەریان گرتووە بو خزمەتی حزب بە کاری بهینن وە جالاکانە قواعدی حزبی پی دەولەمەند بکەن

هەر سەرکەوتوو بن

وینەیەک بو

- هەریەکیک لەم هەڤالانە لەگەل ریزمان بویان •
- فایلی تایبەت •

بەیاننامەی کۆبونەوەی یەکەمی

کۆمیتەی ناوەندی حزبی یەکگرتنی کوردستان

پاش کۆتایی هێنان بە کۆنگرەی یەکگرتنە کۆمیتەی ناوەندی حزبی یەکگرتنی کوردستان یەکەم کۆبونەوەی خۆی بەست کە تیایدا کارو باری کۆنگرەو ئاکامەکانی خرانە بەر لێکۆڵینەوە . لەم کۆبونەوەیەدا ئەنجومەنی سەرکردایەتی و ( المجلس الرئاسي ) مەکتەبی سیاسی حزب هەڵبژێردرا هەروەها کۆمیتەی ناوەندی لەسەر پێکهێنانی ئەنجومەنی ناوەندی ( المجلس المرکزي ) و دیاری کردنی کاتی بەستنی یەکەم کۆبونەوەی دووا ٠

ئەندامانی هەڵبژێرراو بۆ مەکتەبی سیاسی کە لەلایەن کۆمیتەی ناوەندییەوە دەستنیشان کراون بریتین لەم برایانە :-

١ ـ بروسکە نوری شاویس
٢ ـ سامی عبدالرحمن
٣ ـ عبدالله ئاگرین
٤ ـ قادر جەباری
٥ ـ دکتور مجید جعفر
٦ ـ محمد حاجی محمود
٧ ـ دکتور محمود عثمان
٨ ـ ملازم شوان
٩ ـ ملازم کریم

هەروەها کۆمیتەی ناوەندی لەهەمان کۆبونەوەدا ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی هەڵبژارد کە هەڵدەستن بەکارەکانی سەرۆکی حزب و ئەمینداری گشتی و جێگری سەرۆك ، تاکاتی بەستنی کۆبونەوەی داهاتوی کۆمیتەی ناوەندی کە ئەبێت لەماوەی چوار مانگ ئەمەریکات لەبەرواری ٣٠ / ٨ / ١٩٩٢ وە ٠

ئەو برایانەش بریتین لە : -

١ ـ ملازم شوان
٢ ـ دکتور محمود عثمان
٣ ـ سامی عبدالرحمن

کۆمیتەی ناوەندی لە کۆبونەوەکەیدا کۆمەڵێك بریاری دەرکرد کە پەیوەندی بە کارو باری (( حزبی یەکگرتنی کوردستان )) وە هەیە ٠

٣٠ / ٨ / ١٩٩٢

کۆمیتەی ناوەندی
حزبی یەکگرتنی کوردستان

١٩٩٢/٩/١٥

برای بەڕێزو خۆشەویستم
کاک محمد حاجی محمود
سەرزونگی گەرم
شادی و خۆشیتان داوایە
هەواڵی ماڵ و منداڵ و خزمان دەپرسین
براکانیان کاک بەرزان مجید و أکرم حسن
دەبانەوێت بچن بۆ ئێران کە تا
مەریوان چون کە ئەیانا تواننەوە بچنە
باختەران کە قاچی نوشی نەخۆشیەک
بوە وەزعی زۆر خراپە عیلاجی دەوێ
ناتوانێ بچێ بۆ بغداد کە کورێکی زۆر
باشە کە بەڵکو لای ئەنابیانەوە ئەمری
نفەرمون ~~[illegible]~~ وەرەقەی بۆ بکرێ
جێگەی سوپاسە
ــ صحة
هەر بژین
برای دڵسۆزتان
حاکم قادر

TÜRKMEN KARDEŞLİK PARTİSİ-IRAK

پارتی برایه‌تی تورکمانی عیراق

حزب الأخاء التركمان العراق

العدد/ ٤

الى / السيد. جمعه حاجي محمود المحترم التاريخ ١٠/ ١٠/ ١٩٩٢

بعد التحية

باسم حزبنا حزب الاخاء التركمان نتمنى لكم الموفقية لخدمة ابناء كردستان ممن شردوا من ديارهم بدون مأوى ولا مأكل ونبلغكم باسم حزبنا الذي تم تشكيله في كوردستان العراق بمساعدة ومؤازرة الخيرين من ابناء كوردستان البطلة نسألكم أن تمدوا لنا يدكم الكريمة وذلك بمساعدتنا بما يتوفر لديكم من اشكال المساعدات وتقبلوا فائق شكرنا وتقديرنا .....

العراق
محافظة السليمانية
محلة بختياري

سكرتير حزب الاخاء التركمان

حزبی یەکگرتنی کوردستان
دەزگای سەربازی

ژمارە / ۲۰
بەروار / ۱۹۹٤/۱۱/۷

بۆ / ئەم هێزانە

۲ / ئاگاداری

دەکاتیە ئەو بەرگە سەربازیانەی کە لای ئێوە بە زووترین کات بۆمان
رەوانە بکەنەوە چونکە زۆر پێویستمان پێی هەیە ..

جێگای سوپاسە

هێزەکان

۱- هێزی پێرەمەگرون
۲- هێزی ئازادی
۳- هێزی زمناکۆ
٤- هێزی قەرەداغ
٥- هێزی دیالە

وێنەیەک بۆ

۱- جیهازی لق ئاگاداریان بکەن
جێگای رێز و سوپاسە

لطیف مجید
لەجیاتی بەرپرسی دەزگای سەربازی

یەکێتی خوێندکاران و لاوانی سۆسیالیستی کوردستان

مەکتەبی سکرتاریەت

ژمارە / ٢١٢

بەروار ١٨/ ١١/ ١٩٦٥

ـ بڕیـــــــار ـ

لەبەر ڕۆشنایی کۆبوونەوەی نائاسایی مەکتەبی سکرتاریەتی ڕێکخراوەکەمان (ی٠خ٠ل٠س٠ک) لە ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی [illegible]/١١/١٩٦٥ وە لەبەر بەرژەوەندی ڕێکخراوەکە و نەسائرکەشەپێدانی ئەم بڕیارانەی لای خوارەوە بە تێکڕای دەنگ پەسەند کران

١ـ هەڤاڵ فاتح ڕەوف ـ شەرەفی کارگێڕی مەکتەبی سکرتاریەتی پێ سپێردرا .

٢ـ هەڤاڵ جاوید ئەنوەر / شەرەفی کارگێڕی مەکتەبی سکرتاریەتی پێ سپێردرا .

٣ـ محمد جلیل مجید / شەرەفی لێپرسراوەتی لقی سلێمانی پێ سپێردرا .

٤ـ لقی زانکۆی سەلاح الدین ـ کرا بە کۆمیتەی زانکۆی سەلاح الدین .

کە سەر بە لقی هەولێری خوێندکاران دەبێت کە هەڤاڵ ئیسماعیل حسن لێپرسراوی لقی هەولێرە

سکرتێری (ی٠خ٠ل٠س٠ک)

وێنەیەک بۆ

ـ مەکتەبی ناوەندی ڕێکخراوە پیشەییەکان ـ بۆ ئاگاداری بەڕێزتان

مکتبی ڕێکخستنی ناوەندی ـ بۆ ئاگاداری بەڕێزتان .

سەرجەم لقەکانی حیزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان ـ بۆ ئاگاداری بەڕێزتان .

سەرجەم لقەکانی (ی٠خ٠ل٠س٠ک) بۆ ئاگاداری و کارپێکردنی تکایە

سەرجەم هەڤالانی ناوبراو ـ بۆ دەست بەکاربوونتان .

فایلی تایبەت

کۆمیتەی پشتگیری
زانکۆی سلێمانی

٠٠١٥٨٩

بەروار ١٦ / ١١ / ١٩٩٧

| فلس | دینار | |
|---|---|---|
| — | ٤٠٠٠٠ | تەنها چل هەزار دینار |

بەڕێزو سوپاسەوە لە کاک محمد حاجی محمود / لە جیاتی [illegible] ، [illegible] دینارمان وەرگرت بۆ

تەنها ، چل هەزار دینار

پشتگیری زانکۆی سلێمانی .

سلێمانی

٢٠ / ١١ / ٩٩٢

بۆ برای خۆشەویست کاک حەمە

سڵاوێکی برایانە

ئەمڕۆ بڕیاری شاڵاودار کرام کە سەرکردایەتی
ی ن ک و دکتۆر فوئاد مەعسوم شاڵاوداری
لێپرسراوی مەڵبەندی کەرکوک کردوویان کردووە
کە بە ھیچ شێوەیەک تەعامول لەگەڵ
ھێزێکی بێگانە نەکەن وھەروەھا بە توندی
ڕاگرتنە لە نێوانیان لەگەڵ بێگانەکان
وھەروەھا داوایان کردووە
ئەھێڵن بارەگای کۆمەڵە بدەن
بسپێرن ، وە بوونی ئەمە کردن
ئەم بڕیارە کردووە بە پێوەندی بە
کاک مەسعود ساڵەیی کردووە .
بەڕاستی نازانم ھەوقەنی کاک مەسعود ساڵەیی
چییە ؟ منیش بە شی بە حاڵ خۆم
ناڕەزایی خۆم پیشاندا بە نامە
بۆ بەرەی کەرکوک و داوای حەمەی
گوێرکەم لێیان کرد ... بۆ شاڵاوداری و زۆر
سوپاس

برات

٢٠/١١/٩٢

بسم الله الرحمن الرحيم

جمهورية العراق
وزارة الدفاع
(الديوان)

الاخ محمد الحاج محمود ... المحترم
عضو قيادة حزب الوحدة الكردستاني

تحياتنا الاخوية وبعد .. نعتذر للتأخير الذي حصل لممثلكم لانشغالي بأمور رسمية خارج بغداد خلال هذه الفترة ... تسلمت رسالتكم التحريرية وأود ان أوكد لكم أن بغداد سوف لاتغلق ابوابها بوجه اي عراقي فكيف يكون الحال بالنسبة للعراقي الذي اعتبرناه صديقاً وموضع ثقة وانا شخصياً على ثقة تامة بكم وبرجال آخرين من شعبنا العراقي.. بالنسبة للقاء والتفاوض فأن اخي العزيز أبو عطا يعرف ان التفاوض اصبح مسألة ليست مثمرة في هذه المرحلة بسبب تكرارها يومياً من قبل الدولة والاحزاب الكردية ، فاذا كانت هناك نية صادقة من قبل حزب الوحدة الكردستاني للتفاوض فارجو ان تقدموا ورقة عمل موقعة من قبل الاحزاب المؤتلفة في حزب الوحدة الكردستاني كي استطيع عرضها على القيادة للقرار على المفاوضات من عدمها لاسيما وان حزب الوحدة الكردستاني هو لازال حزباً في الجبهة الكردستانية التي تحاورنا معها سابقاً مع رجائنا ان تكتبوا لنا الامور بصورة تفصيلية كي تكون الصورة واضحة أمامنا.
تقبلوا فائق التقدير والاحترام ودمتم.

الفريق الأول الركن
علي حسن المجيد
وزير الدفاع
ت٢ ٩٢
٢ح

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

کۆماری عێراق

وەزارەتی بەرگری

(دیوان

برای بەرێز محمد حاجی محمود

ئەندامی سەرکردایەتی حزبی یەکگرتنی کوردستان

سلاوبرایانە ....

داوای لێبوردن ئەکەین بۆ ئەو دواکەوتنەی کەرویدا لەگەڵ نێردوتانە بەهۆی سەرقاڵیمەوە
بەئیشوکاری فەرمی لەدەرەوەی بەغداد لەو ماوەیەدا ، نامەکەتانم وەرگرت و ئەمەوێ ئەوەت
پێرابگەیەنم کە بەغداد هەرگیز دەرگای داناخا بەرووی هەر عێراقیەك وەئەگەر ئەو عێراقیەش
ئێمە بەهاورێ و جێگای ممتمانە بێت وەم شەخسی خۆم متمانەی تەواوم هەیە بەتۆو بەپیاوانی
کە لەگەلی عێراق، سەبارەت بەچاو پێکەوتن و گفتوگۆ برای بەرێزم باوکی عەتا وەك ئەزانی
گفتوگۆ بووەتە شتێکی بێ بەرهەم لەم کاتەدا بەهۆی دووبارە بونەوەی ئۆرژانەی لەلایەن
دەوڵەت و حزبە کوردیەکانەوە، وەئەگەر نیەت پاکی هەبێت لەلایەن حزبی یەکگرتنی
کوردستانەوە بۆ گفتوگۆ تکام وایە بەنوسراوێك و بەواژۆی ئەو حزبانەی کەحزبی یەکگرتنی
کوردستانیان پێکهێناوە پێشکەشی بکەن بۆئەوەی بتوانم لەسەرکردایەتی باسی بکەم و بریاری
گفتوگۆی لەسەر بدرێ کەنیە لەبەرئەوەی حزبی یەکگرتن تائێستا حزبێکە لەبەرەی
کوردستانی کەگفتوگۆمان لەگەڵ کردن پێشتر، تکامان وایە شتەکانمام بەشێوەیەکی تەواو
دەستنیشان کراو بۆ بنوسن بۆ ئەوەی شتەکان رون بێت لامان .

سلاوڕێزمان قبوڵ بکەن و هەربژین

فەریقی یەکەمی روکن

علی حسن المجید

وەزیری بەرگری

٢٣/ت٢/ی ١٩٩٢

حزبی یەکگرتنی کوردستان

مەکتەبی سیاسی

ژمارە

بەروار / / ١٩٩

---

برایانی هێژا کاک حەمە و کاک قادر و کاک کەریم

سڵاو و ڕێزی برایانەی گەرم پێشکەشتان دەکەم و ئومێدەوارم هەمووتان بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بن.

دەربارەی کۆبوونەوەی م.س. پێشتر فکرمان دەکرد لە سلێمانی بگیرێ، بەڵام ئێستا کە هەندێک مەشاکل لێرە ڕوویداوە وەکو دەزانن بۆیە سەرناگرێ ئەم ڕۆژانە ئێوە بەجێ بهێڵین، هەرچەندە دەزگاکان هیچ قازانجێکیان نەکردووە. ئەمڕۆ قبض کارزان لە پۆلیس دەرچووە، برادەرانی هێزی بالەک ئوتومبێل و چەکەکانی کاک عبدالله شێخ وەسانیان لێ سەندن، پەیوەندیمان لەگەڵ هەر دووکیان لە مەقەڕی شەقڵاوەش دەرگیران، بەڵام کارەکە تەواو نەبووە.

لەبەر ئەم هۆیە مەزەندە ئەکەین کۆبوونەوەی م.س. لێرە واتە لە هەولێر بگیرێت، جا تکایە زۆر بە وریایی و هێواشی تەواو وەرن بۆ هەولێر بە تایبەتی کاکە حەمە کە ئەزانێ بە شێوەیەکی خاص موستەهدەفە. هەر دووها تکایە لە بەجێ کەسێکی چاک لەگەڵ خۆتان بهێنن مام جلال داوای کردووە بۆ مراسەعتی خۆی (تاخصیف).

ئێوە هەر بژین

٩٦/١١/٢٥

برایان

[illegible]

سامی

پارتی دیموکراتی کوردستان/ یەکگرتوو
مەکتەبی سیاسی
مەکتەبی ناوەندی ڕێکخستن

ژمارە: ٢٤١٦
ڕۆژ ١٩٩٢/١١/٢٩

---

بۆ / لقی ک.س /ی تێکۆشەر

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

بەپێی زانیاری گەیشتوو کاک (طاهر ملا علی) بەڕێوەبەری ئاسایشی پارێزگای کرکوک هەستاوە بەلابردنی چەند ئەفسەری ئاسایش و دانانی چەند خزمێکی خۆی لە شوێنی ئەوان وئەوانەی کە ناویان لە خوارەوە نووسراوە چەند کەسێکن لەوانەی کە لابراون وگوایە دڵسۆزترین و باشترین ئەفسەری پارتیمان بوون وهەروەها ملتزم و خاوەن هەڵوێستیش بوون. تکایە لەم مەسەلەیە بکۆڵنەوەو ئەوانەی لە شوێنیان دانراوون کێن وهەروەها ڕشتیتان لەسەر ئەوانەی کە دەرکراوون وئایا پێویست بوو کە دەربکرێن. لە ئەنجامیشدا ئاگادارمان بکەنەوە.

١- نقیب اکرم عبدالله، زیندانی سیاسی، لەم دوایە لە هەڵەبجە بوو.

٢- نقیب مهدی حمید، پێشمەرگەی هەردوو شۆڕشی ئەیلول و گولان بووە وبرازای شەهید مجید هەیبە.

نقیب عماد علی محمد، لە مانگی (٥) بەدواوە دوجار لەلایەن دەزگای زانیاری یەکێتی گیراوەو تعذیب دراوە.

ئیتر بۆ بینەوە.....

وێنەیەک بۆ /
- هەڤاڵی تێکۆشەر / کاک نوری حەمە علی/
بۆ هەمان مەبەست تکایە.

هـ/٢٩

# TÜRKMEN KARDEŞLİK PARTİSİ-IRAK

حزب الأخاء التركمان
العراق

پارتی برایه‌تی تورکمانی
عێراق

السيد محمد الحاج محمود الخرم

المسمى / ................ التاريخ ٥ / ١٢ / ١٩٩٢

بعد التحية

باسم حزبنا حزب الاخاء التركمان نتمنى لكم الموفقية لخدمة
ابناء كردستان ممن شردوا من ديارهم بدون مأوى ولا مأكل
وننا لكم باسم حزبنا الذي تم تشكيله في كوردستان العراق
بمساعدة و مؤازرة الخيريين من ابناء كوردستان البطلة نسألكم
أن تمدوا لنا يدكم الكريمة وذلك بمساعدتنا بما يتوفر لديكم
من اشكال المساعدات وتقبلوا فائق شكرنا وتقديرنا .....

کریکارانی جیهان، یەکگرن !

ژمارە / ١٠٣ / پ.گ.ئ

بەرواو ٢٧/ ١٢ / ١٩٩٢

هەڤالی بەڕیز،

کاک محەمەد، حاجی مەحمود

پاش ڕیزو سلاومان،

وەك ئاگادارن کە ماوەیەك لەمەوبەر دانیشتنێکی ڕەسمی لە نێوان بەڕێزتان و هاوڕێیانی کومیونی ئالادا سازدراو قسەوباسمان لەچەند مەسەلەی هاوبەش و چونیەتی تەنسیق کردن کرد، ئێستاش پاش ڕاگەیاندنی بەیاننامەی هەلوەشاندنەوەی پەنا و یەکگرتنی ئالاو زەحمەتکێشان، لە پێناو هەرچی پتەوترکردنی پەیوەندی هەردوولا، بەچاکی ئەزانین کە دانیشتنێکی ڕەسمی لە نێوان بەڕێزتان و هاوڕێیانی کومیوندا ئەنجام بدەین.

چاوەڕێی وەلامتان و دیاریکردنی شوێن و کاتی دانیشتنەکە ئەکەین...

ڕێزمان دووپات ئە و .... ئومێدمان سەرکەوتنتانە..

کومیونی عوثمادەکردن ... ئالای شورش

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

یانەی وەرزشی سلێمانی — ژمارە (٩)

بەشی جوانی لەش — بەروار ١٩/١٢/٩٦

بۆ بەڕێز / لەشجوانی بەتین و تێکۆشەر کاک (محمود حاجی محمد)

هەمیشە وەرزش بە یەکێک لە هۆ گرنگەکانی بەرەوپێشبردن دراوەتە قەڵەم، هەر لەبەر ئەوەیشـــە کە سەدەهای ساڵە میللەتان بایەخیان داوەتێ هەتا ببێت وولاتانی پێشکەوتوو کە شان بە شانی هۆیـــە بەرەوپێشبردنەکانی کە بەرەوپێشی دەبەن . ئێمەیش لەبەر ئەوەی هەست بەو کەڵکانەی دەکەیـــن وەک کورد . دەمانەوێت بە جدی خزمەتی خۆمان لەم بوارەدا دڵسۆزانە پێشکەشی نەوەی لاوی گەلە ـ کەمان بکەین وەها نیان بدەین کاتی بێکاری بە کەڵک دابین بکەین . چونکە وەرزش دەبێتە هۆی (لەشساغی) لەشساغیش دەبێتە هۆی بەپیتی بیرۆکەی پێ دەدات . جگە لەوەش گیانی لێپرسراوی هەرەوەزی کۆمەڵایەتی بەرزی مرۆڤ بەرووڕووبوونەوەشیانی تێدا دەچێنێ و گەشەی پێ دەدات ئنجا هەست کردن بەم کەڵکانە باڵی پێوەناین کە لەم بوارەدا بە دڵسۆزی بەشداری بکەین وەنەوەی ئێمە توانیمان بۆ ئەم مەبەستە پێویستە بە دەستی بهێنین توانیومانە (٨٠) هەشتا ئەندام لە خۆمـــــان گردبکەینەوە بە ڕێک و پێکی مەشقی ڕۆژانەیان پێ بکەین بەو توانا کەم و کورتەی هەمانە بۆ زانینی بەڕێزتان ئەندامان لە هەموو جۆرە توێژێکی چینەکانی تێدایە لە ڕۆشنبیران وەک پزیشک . ئەندازیار . مامۆستـاو قوتابی . کاسبکار و کرێکار . جا لەبەر ئەوەی بتوانین ئەم کارە بەرەوپێش و ئامانجەکانی بگەیەنیـــن داوامان لە بەڕێزتان یارمەتیدانی مادییە بۆ بەدەستهێنانی هۆیاکانی ئەم وەرزشـــە .

لەگەڵ ڕێز و سوپاسماندا

عبدالله احمد فهمی

لێپرسراوی جوانی لەش

یانەی وەرزشی سلێمانی

Patriotic Union of Kurdistan
Organization Center of
Sulaimaniyah

یەکێتی نیشتمانی کوردستان
مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی

ژمارە / ١٦ / ...
بەروار ٢٢ / ١٢ / ١٩٩٢

بۆ / لیژنەی پارێزگای حزبی یەکگرتنی هاوپەیمانی بەڕێز

بابەت / لێکۆڵینەوە

بەڕێزان ... لاتان ئاشکرایە کە ماوەیەك لەمەوپێش ڕووداوێك ڕوویدا لە نێوان پێشمەرگەکانی سەر بە بنکەی ئاڵپارێزی یەکێتیمان و مەفرەزەیەکی حزبی یەکگرتن کە لێپرسراوەکەیان ناوی (جمال دڵە سووری) بوو لە سەر بردنی پارەکە بووە هۆی ئەوەی کارەساتی دڵتەزێن ڕووبدات ..

ئێستاش وەکو ئاگادارین کە ناوبراو چەند جارێك کە مینی داناوە و دەیەوێت کەڕە کارەساتەکە دووبارە بکاتەوە " بۆیە داوا لە بەڕێزتان دەکەین کە لەگەڵ ناوبراو لە لایەن خۆتانەوە بانگی بکەن و ئاگاداری بکەنەوە واز لە کاری لەم لاو زیانبەخش بهێنێت کە پێچەوانەوە ڕەنگە کارەساتی ناخۆشتری لێ پەیدا ببێت و هەرخۆشی بەرپرسیار دەبێت ... لەگەڵ ڕێزو سوپاسماندا ...

هەر سەرکەوتوو بن

مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی
٢٢ / ١٢ / ١٩٩٢

وێنەیەك بۆ /
- لەشکری (پ.ك) ی بەڕێز (ی.ن.ك).
کاك (حەمەی حاجی محمود) ی بەڕێز..
- بەشی پەیوەندییەکان ...

بغداد
٢٧/١٢/١٩٩٤

الأخ الاستاذ سكرتير حزب الاشتراكي الكردستاني المحترم

تحية اخوية صادقة من الصميم
أرجو لسيادتكم شخصيا ولجميع العاملين في الحزب الاشتراكي الكردي
دوام التقدم والنصر الدائم على اعدائكم واعداء الشعب العراقي
بعربه واكراده بعد التحية والاحترام استلمت رسالتكم الكريمة المؤرخة
٢٢/١٢/١٩٩٤ بواسطة الأخ الشيخ (ج) واشكركم جزيل الشكر
على مشاعركم النبيلة وإن شاء الله نكون عند حسن ظنكم سيادتكم
استاذي العزيز بكل فخر واعتزاز اجيب على اسئلتكم ونرسل
لسيادتكم طيا معلومات خطيرة عن الاسلحة الراقية منها الصاروخية
والكيماوية والبايلوجية ونشكركم ثانية بخصوص عدم كتابة اسمي
على الرسائل هذا لطف منكم وإن شاء الله في رسائلنا القادمة
نرسل لسيادتكم تشكيلات الحرس الجمهوري وقيادة الفيلق
والبيانات وانواع الاسلحة الاخرى السرية واسماء ضباط
القيادة العامة للقوات المسلحة وفي الختام ارجو لقبول
فائق الشكر والاحترام ودمتم في رعاية المولى العلي القدير
والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

المخلص
((١٠٣))
قيادة قوات بغداد

بۆ / بەڕێز کاک محەمەدی حاجی مەحمود

سکرتێری گشتی حزبی سۆسیالیستی

سڵاوێکی گەرم ...

بەڕێز

من (خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی ئەمڕۆ) دەمەوێ

چاوم بە جەنابت بکەوێ بۆ هەندێ کاری پێویست

وە داواشی دەکەم دانیشتنەکەمان نهێنی و داخراو

بێت .

لەگەڵ ڕێزم



فریاد حەسەن

خاوەن ئیمتیازی

ڕۆژنامەی ئەمڕۆ

برای بەڕێزم کاکم حەمە :

سڵاوی شۆڕشگێڕان .

لەبارودۆخێکی دژواری وەک ئەمڕۆ لە نەداری و هەژاری
و بێ نەوتی و بێ ئاردی و بێ برنج و بێبەشکریدا ..
پیاو ئەگەر سواڵیشی بکات شتێکی ئاسایی یە ..
لەژێر باری نەدارییشدا ئێمەی نووسەران قەڵەمان
سست دەبێ ..

ئەگەر ئەم نفە پوونە یارمەتیەکم بۆ سەرف
بکەن .. قەرزداریتان دەبم ..

لەگەڵ ئەوپەڕی حورمەت ..

هەرماشانە
شێرزاد مەنیانی
سکرتێری نووسین
ڕۆژنامەی یەکگرتن
١٩٩٣/١١/١٢

٢/ أ ر

بە ناوی خوای گەورە

(*)

بۆ برای بەڕێز مامۆستا محمد حاجی محمود دهاروزی (کۆڵەخانە)

پاشما گەرمترین سڵاو و ڕێزی گەرمی برایانە

داواکارم لە خوای گەورە بتان پارێزێت لە ناخۆشی لە پیناوی

خزمەت بە کۆمەڵە هەژارەکەمان تا گەیشتن بە ئاوات و ئامانجەکانمان

ئەمەیش الحمدلله باشین

ڕێز و سڵاومان بۆ گشت برادەرانمان

مامۆستا محمد هەڵگری نامە مامۆستا عبدالله احمد محمد پێشمەرگەیەکی ٤٤ ساڵەیە

لای ئێمە ناوبراو تووشی حەقدەر بووە بە قەزا و قەدەر برایەکی خیشلێک لەدی

دەرچووە کوڕێکی ١٠ دە ساڵانی کوشتووە هەر لە گوندی مامۆستا ناسکان

ئیستا صلحیان کردووە بڕیار دراوە بە مبلغی ١٥ پانزە هەزار دینار جاهەر

وتووتان چاکە ئەزانن پێشمەرگە هیچی نییە ئەمەیش وەکو خیقیلی

هاوسەنگە یادی جنابتان مان کردەوە کە وا لەم وا جبە جیدی انسانیە

خۆتان بەشداری بکەن چونکە بنەماڵەی ئێوە هەمیشە بە ناو بانگ بووە

بۆ یارمەتی دانی هەژار و هەژاری کورد بە تایبەت بۆ ئەم جۆرە قەزایانە

هیوادارم بە پێی توانا یارمەتی ئەم برا پێشمەرگەیە بدەن

زۆر سوپاس هاوکاری هاوسەنگەریان ئەکەن

ئیش و خۆشیتان هاو قەڵەمی نادر هوراخی

١٩٩٦/١/١٩

رێکخراوی بێکاران لە کوردستان

بەروار ١ / ٢ / ٩٩٢
بلبشو /
ژمارە ١٨



لیژنەی بەڕێوەبردن
سلیمانی .

Unemployed Organization in Kurdistan

---

بۆ بەڕێز : کاک محمد حاجی محمود

سلاوێکی گەرم

دوا بە دوای دانیشتنەکەمان سەبارەت بە دەربڕینی ناهەمواری
خەڵک لە بێکاری و گرانی دروستبووە ، چاوەڕوانی ئەدار
کردنی قسە و باسەکانمانین کە لە سەر بڕیاری بەرپاکردنی
دانیشتنەکەمان خستە سلیمانی .
ئێمە ئامادەین ژوانێک دیاری بکەین بۆ قسە و باسیا

هەر سەرکەوتوو بن

لیژنەی بەڕێوەبردن
ر.ب.ك

## یەکگرتن بۆ سەرکەوتن

حزبی یەکگرتنی کوردستان — ژمارە/ ٥٥٠

کۆمیتەی پارێزگای سلێمانی — بەروار/ ٦/٦/٩٢

بەشی/

بۆ/ کۆمیتەی ئەزای بەڕێوەچی ئینگلیز شەر .

سلاوی یەکگرتن و سەرکەوتن

(بڕیار)

لە کۆبوونەوەی ڕۆژی (٢٢/ ٣/ ١٩٩٢) کۆمیتەمان بڕیاری دا کە
کاک (سەلام ڕەئوف) ئەندامی کۆمیتەی پارێزگای سلێمانی لێپرسراوی
یەکەمی کۆمیتەکەتان بێت .
بۆیە پێویستە هاوکاری تەواوی لەگەڵ بکەن بۆ سەرکەوتنی
ئیشوکارەکانتان . سەرکەوتوبن

( هەر سەربەرز بێ: کورد )

وێنەیەک بۆ/ کاک سەلام ڕەئوف بۆ پەیوەندی کردنت بە زووی بە
ئیشی تازەت وە ئاگادارکردنەوەمان .

بۆ/ مشرفی کۆمیتەی پارێزگا بۆ ئاگادارییتان .

کۆمیتەی پارێزگای سلێمانی

الجمهورية العراقية
وزارة الدفاع
(الديوان)

الأخ محمد الحاج محمود .. المحترم ـ عضو هيئة
قيادة حزب الوحدة ـ عضو المكتب السياسي للحزب

تحية اخوية وبعد ..

وصلت رسالتكم بيد الممثل الذي وصلنا .. لقد كنا خارج بغداد ولم نستطع اللقاء بممثلكم الا في يوم ٢٠ آذار ٩٢ . انتهز فرصة حلول عيد الفطر المبارك لاهنئك بهذه المناسبة كما واهنئك بمناسبة عيد ٢١ آذار هذه المناسبة التي انتفض بها الانسان الكردي ضد الظالم ونرجو ونأمل أن ينتفض اولاد كاوه الحداد ضد الظلم ومهما كان الظالم سواء كاتب الرسالة أو ميتران أو غيره .. وحقيقة ياأخي أبا عطا أنني استغربت كثيراً وكنت أتأمل أن تفرحني الكثير لكن تطرقكم الى موضوع تطبيق الفدرالية في شمال العراق العظيم ولابد أن اكون واضحاً تماماً كما عرفتني وكما هو ايماني بالعراق العظيم الموحد ونظرتي للحكم الذاتي ليس فيها خلل وطني واذا ماوجدت ثغرة او استغفال في قانون الحكم الذاتي فتجاوزها يتم بالحوار المرتكز على العراق الموحد .. أن تطبيق الحكم الذاتي هو مصدر قوة للعراقيين ويحقق لهم السعادة الدائمة والعيش بحريه والفدرالية ليس كذلك وهذا الموضوع لم اتشاور مع احد فيه لان ستراتيجية حزب البعث العربي الاشتراكي قد بنيت قبل استلام الحزب للسلطة في العراق لمنح الحكم الذاتي لشعبنا العراقي في كردستان العراق واذا كان لابد من الحوار الذي يرتكز على مابينتموه في رسالتكم (الفدرالية) ... فأن الله وايماننا بشعب العراق العظيم بعربه وكرده واقلياته وأديانه ومذاهبه سيعوضون عن مايريده أعداء العراق العظيم ومن يتوكل

بسم الله الرحمن الرحيم

جمهورية العراق
[illegible]
( الديوان )

على الله وعلى الشعب سوف لايخزيه الله لا في الدنيا ولا في الآخرة .. أخي الكريم أبا عطا المحترم .. ارجو من الله ان يوفقنا واياكم جميعاً لخدمة العراقيين وليس لتجزئة العراق كما يريدوه لنا اعدائنا جميعاً من صهاينة ويهود ومالنا الا بعضنا للبعض بعد الاتكال على الله .. وأرجو في هذه الرسالة ان أكون أكثر وضوحاً .. أن من قطع الحوار هي الجبهة الكردستانية بما فيها احزاب منضوية تحت رايتها واعادة الحوار هي وحدها التي تتحمل مسؤوليته كذلك .. ونحن قلنا ونؤكد ان بغداد فاتحة ابوابها للعراقيين جميعاً ولكل الخيرين والشرفاء في العالم وترحب بمن يدخلها مسالماً وتقاتل الى آخر قطرة من دمها العزيز الطاهر لمن يحاول ان يدخلها عنوةً أو يحاول اذلالها أو اذلال العراقيين الاماجد .. ادعو الله ان يوفقنا جميعاً لما فيه خير العراق ويبعدنا جميعاً عن الاصدقاء الاشرار الذين يضمرون الشر للعراق العظيم والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته .

الفريق الأول الركن
علي حسن المجيد
عضو مجلس قيادة الثورة - وزير الدفاع
٢٠ آذار ٩٢

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

کۆماری عێراق

وەزارەتی بەرگری

(دیوان)

برای بەڕێز محمد حاجی محمود

ئەندامی دەستەی سەرکردایەتی حزبی یەکگرتن — ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزب .

پاش سڵاوێکی برایانە ...

نامەکەتان بەو نوێنەرەی کەپیاتاندا رەوانە کردبوو گەیشتە دەستمان بەڵام لەبەر ئەوەی ادەرەوەی بەغداد بوین نەمانتوانی چاومان پێی بکەوێت هەتا ٢٠ ئازاری ١٩٩٢ ، وەبەبۆنەی هاتنی جەژنی رەمەزانی پیرۆزەوە ئەو هەلە دەقۆزمەوەو پیرۆزبایی جەژنت لێدەکەم هەروەها پیرۆزبایی جەژنی نەورۆز(٢١ ئازار)ت لێدەکەم ئەو بۆنەیەی کەتیایدا مرۆڤی کورد دژی زۆرداری راپەڕین هیوادارین کە نەوەکانی کاوەی ئاسنگەر هەمیشە دژی زۆرداری راپەڕین جا ئەو زۆردارە ئەگەر نوسەری نامەکەش بێت یان میتران یا هتد...، لەڕاستیدا براکەم باوکی عەتا زۆر سەرسام بوم لەکاتێکدا بەهیوای ئەوەبووم کە زۆر دڵ خۆشم کەی بەڵام باس کردنتان لەبابەتی چەسپاندنی فیدرالی لەباکوری عێراقی مەزندا پێویستە زۆر راشکاوانە بدوێم هەروەکو چۆن دەمناسیت و دەزانیت کەچەند باوەڕم بەعێراقی مەزنی یەکگرتووەیەو تێروانینم بۆ ئۆتۆنۆمی هیچ نارێکیەکی نیشتمانی تێدانیە وەئەگەر هەر کەلێنێك یان بێ ئاگاییەك هەبێت لەیاسای ئۆتۆنۆمی دا پێویستە بەسەریدا زاڵبین بەگفتوگۆی چڕوپڕ لەعێراقی یەکگرتوودا ، چەسپاندنی ئۆتۆنۆمی سەرچاوەی هێزەبۆ عێراقیەکان وەکامەرانیان بۆ دابین دەکات بۆئەوەی بە ئازادی بژین ،وە فیدرالی بەو شێوەیە نیە وئەو مەسەلەیەم لەگەڵ کەسدا تاوتێوم نەکردووە لەبەر ئەوە پێش ئەوەی حزبی بەعسی عەرەبی سۆسیالیستی دەسەڵات بگرێتە دەست لەعێراق ستراتیژیەتی حزبی بەعس وەها بنیاد نراوەکە ئۆتۆنۆمی ببەخشێ بۆگەلی عێراقی لەکوردستانی عێراقدا وەئەگەر وەها بێت پێویستە وتووێژەکان چڕ بکەینەوە لەسەر ئەوەی لەنامەکەندا ئاماژەتان پێکردبوو لەسەر فیدرالی ، باوەڕمان بەخواو بەگەلی عێراقی مەزن بەعەرەب و کوردوکەمە نەتەوەکان و ئاین و مەزهەبەکان هەیەو خواستی داگیرکەران پوچەڵ دەکەینەوە هەرکەسێکیش پشت بەخواو گەلەکەی ببەستێت ئەوە خوا نەلەدنیاو لە ئاخیرەتیشدا شەرمەزاری ناکات .. برای بەڕێزم باوکی عەتا داوا کارم لەخوا کەلەگەڵ ئێوەدا سەرکەوتومان بکات بۆ خزمەت کردنی گەلەکەمان نەوەك بۆ هەڵوەشاندنی گەلی عێراق کەداگیر کەرانی زایۆنیزم و جولەکە

خواستیانە وەئێمە بێجگە لەیەکتر دوای پەروەردەگار کەس شك نابەین، هیوادارم لەم نامەیەدا بتوانم زیاتر راشکاویم کە ئەوەی وتووێژی راگرت ئەوە بەرەی کوردستانی بوو کە ئەو حزبانەشی تێدا بوو وەژێر سایەیدا بوو وەگەرانەوە بۆگفتوگۆ تەنها ئەو بەرپرسە لێ ی وەئێمە وتومانەو دووپاتیشی ئەکەینەوە کە بەغداد دەرگای کرایەوە بۆ عێراقیەکان بەگشتی و بۆ هەمووکەسێکی بەشەرەف لەدونیا کە بەنیازپاکی دێتە ناوەوە، وەدەجەنگێن تادوا دڵۆپی خوێنمان دژی هەرکەسێك بیەوێت بەمەبەستی خراپەکاری بێتە ژوورە و هەوڵ بدات بۆ مل کەچ بونمان و مل کەچ کردنی عێراقیە بەئەمەکەکان . داواکارین لەیەزدان کەهەموو لایەك سەرکەوتوو بکات لەوەی کەخەیری عێراقی تیابێت وە بەدورمان بگرێت لە هاوڕێیەتی شەرەنگێزو ئەوانەی کەشەرخوازن وشەریان ئەوێ بۆ عێراقی مەزن .

والسلام علیکم ورحمه الله وبرکاته

فەریقی یەکەمی روکن

علی حسن المجید

ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش —وەزیری بەرگری

٢٠ /ئازاری/١٩٩٢

ژمارە/ ت
بەروار ٩٤/٥/٩
ک.ح / ١٠١٤٥ شەو

لە جەلالەوە

بۆ / کاکە محەمەد حاجی مەحمود

دوای سڵاو

هەروەکو دوێنێ نامەیەکم نارد بۆ نووسینی ئەو مەسەلەیە پێویستە

بە بینینی خۆت ئەو کاتە قەزیە سەبەبێکی لە نزیکترین زەمەندا

هەروەها وەڵامێکی کە ئاگادارین جار، بە گشتی [illegible] بالە نزیکیەوە

وەکو هەمیشە [illegible] زۆر کەسێکی لەگەڵ رێزو سڵاو هاندا

خوا ئاگات لێ بێت.

---

ڕێکخراوی گەشەپێدانی ئابووری کوردستان
مەڵبەندی گشتی

ژمارە/ ٦
بەروار/ ١٩٩٣/٨/٢

بەڕێز/ سەرکردایەتی حزبی یەکگرتنی کوردستان/ هەڤاڵی تێکۆشەر
((کاک محمد حاجی محمود))

بابەت/ سەردان

بەناوی مەڵبەندی گشتی ڕێکخراوی گەشەپێدانی ئابووری کوردستانەوە خۆشحاڵین کە سەردانی بەڕێزتان بکەین بۆ ڕوون کردنەوەی ئامانج و هۆی دامەزراندنی ڕێکخراوەکەمان وەکو ڕێکخراوێکی ئابووریەوە بە مەبەستی بوژاندنەوەی باری ئابووری کوردستان دامەزراوە لەو ڕوانگەیەوەکە بەڕێزتان بایەخێکی گەورەتان داوە بەو لایەنە گرنگە ئومێدەوارین کە ڕێکخراوەکەمان لە پشتگیری و یارمەتیتان بێ بەش نەبێت

هەر سەرکەوتووبن بۆ خزمەت کردنی گەلەکەمان

وێنەیەکی بۆ/
١- فایلی لیژنەی پەیوەندیەکان
٢- فایلی نێردراوەکان

حسام بەرزنجی

حزبی سۆسیالیستی کوردستان / عیراق — ژمارە/ ٦٩٠

لقی سلێمانی — بەروار/ ١٩٩٢/٦/٦

بۆ / کومیتەی ناوچەی دەربەندیخانی تێکۆشەر

سڵاوێکی گەرم

بۆ بەرژەوەندی حزب وە بۆ زیاتر بەهێز کردنی ناوچەو ڕێکخراوەکان کارگێری لق لە کۆبونەوەی

ڕۆژی ١٩٩٢/٦/٤ بڕیاری دا بە

١- دانانی هەڤاڵ محی الدین محمد حسن بە ئەندامی ناوچەتان وە لێپرسراوی ڕێکخراوی [illegible] بڕایەتی ،

٢- گواستنەوەی هەڤاڵ حسن حمە فرج لە ڕێکخراوی هەڵەبجەی تازەوە بۆ ڕێکخراوی [illegible] بڕایەتی ،

٣- گواستنەوەی هەڤاڵ هیوا حمە صالح لە ڕێکخراوی هەڵەبجەی تازەوە بۆ ڕێکخراوی [illegible] بڕایەتی

ئومێدەوارین ئەم بڕیارانە سود بەخش بێت ،

هەر دو سەرکەوتوو بن ،

وێنەی بۆ /

١- هێزی ئازادی تێکۆشەر کە کاک محی الدین فەرماندەی بەتالیون بو لە سنووری هێزەکەتان بۆ ئاگاداریتان تکایە ،

٢- هەڤاڵ محی الدین محمد حسن بۆ دەست بەکار بون بە زووی ،

٣- هەڤاڵ حسن حمە فرج بۆ هەمان مەبەست ،

٤- هەڤاڵ هیوا حمە صالح بۆ هەمان مەبەست ،

٥- فایلی تایبەت ،

بەڕێز و خۆشەویست کاک محمد حاجی محمود گیان

سڵاو و ڕێزی گەرمت ئاراستە دەکەم و هەواڵی تەندروستیت
پرسیار دەکەم. سڵاو و ڕێزم بۆ گشت لایەک.
برای بەڕێز هەڵگری نامەکان (کامل محمود رحیم) پ.م. قوماندۆ
فرعی قوەوە پاڵەوانی عێراقە لە یاری کۆنغ فو دا ئێستا
ئەیەوێت بڕوات بۆ سوریا بۆ پاڵەوانێتی ئاسیا لە یاری
کۆنغ فودا جا پێویستی بە یارمەتی جەنابتان هەیە بۆ
ئەوەی فریای پاڵەوانییەکە بکەوێت و پلەی باشی
بەدەست بهێنێت وە بە ناوی حزبی قوماندۆوە یاری دەکات
وە برادەران (ی.ن.ک) چەند جارێک بانگیان کردووە و پێیان وتووە
ئەیش و کاری لەگەڵ بکات بە ناوی ئێمە یارمەتی ئەدەین
جا لەبەر ئەوەی قوم جەنابم نەبوو بێنە خزمەتت ئەم
نامەیەم دا پێی تا بۆ ئەوەی جەنابت یارمەتی بدەیت و
بڕوات بۆ سوریا لەبەر ئەوەی کە دەعوەت کراوە لە لایەن
نادی یەکێتی ... کوردییەوە..

هیوادارم داواکارییەکانی جێبەجێ بکەیت.

برادەر دڵسۆزت

کەماڵ ئاشتی

٢٦/ ٦/ ٩٩٢

برای زۆر بەڕێزم کاکە حەمە

سڵاوێکی گەرم

خۆشی و شادیت هیوایە

ڕێزم بۆ برادەران هەیە.

کاکە من یەک سەعاتە لە هۆتێل گەڕاومەتەوە

زۆرم هەوڵ دا بە تەلەفۆن قسەت لەگەڵ

بکەم بەڵام مشغول دەبێ. بۆیە

وا ئەم چەند کەلیمەم بۆ نووسیت.

تکایە هەندێ قسەی تازەم پێیە بۆت

ئەگەر وێت بتبینم ئەمشەو.

چاوەڕوانی وەڵامم

هەر بژیت

برات

صالح

هۆتێلی حاجی [illegible]

١٩٩٣/٧/١٢

برای خوشەویستم کاک محمد حاجی محمود بیشکەش

سلاویکی برایانەی گەرم .

کاتی لە تلفزیون بینیم جنابت بەیانی یەکگرتنی هەردوو حزبت خویندەوە سوپاسی خوای گەورەم کرد و ناتوانم وەصفی کەم چەند خوشحالبوم . بێ گومان نەک هەر من بەلکو هەمو کوردیکی دلسوز بەم هەلویستە شاد و بەختەوەر بو .

ئەهمیەتی ئەم یەکگرتنە لەوەدا دیارە کە جەماوەر لە سەرتاسەری کوردستان خەریکی کەیف وشادی یە .

من تەنها ئەم هەلویستەی جنابت لە بیر ناکەم ولەم روژانە پیپروان دەنیرم بینە سەردانتان وانشاءالله لەم نزیکانە چاوم بە جنابت دەکەویت .
وگومانم نیە کە لە کونگرەی ١١ (یەکگرتن) هەمو شتێ سەرکەوتوانە تەواو دەبیت و بناغەیەکی تازەی مەحکەم بو ریبازی کوردایەتی دادەنریت .

ئیتر خوشیتان ،

براتان
مسعود بارزانی ٩٩٢/٨/١

برای بەڕێز و خۆشەویستم کاکە حەمە

وێڕای سڵاو و سەرکەوتنتان ئاواتمانە. سڵاو ڕێزمان بۆ هەڤالان بەگشتی و کاک سلێمان بەتایبەتی.

کاکە گیان: ئێمە لە سەفەرەکەمان گەڕاینەوە. سەفەرێکی باش و سەرکەوتوو بوو، چاوەڕوانی هاتنی ئێوەش بووین کەچی بەداخەوە بیستمان پارتی قیزەی پێ نەدان خوا خۆمان بگرێ!

لە و ڕۆژانە دێمە سلێمانی سەردانتان دەکەین و لە نزیکەوە قسە دەکەین.

برای بەڕێز: هەڵگری نووسراو کاک ئازاد حمد أمین خزمێکی ئێمەیە و دەیەوێ بچێتە ئێران بەڵکو ئەگەر بکرێ براده‌رانی خۆتان یارمەتی بدەن و بڕگێکی عبوری بۆ پەیدا بکەن. زۆر ممنون دەبین.

لە کۆتاییدا سڵاو ڕێزمان دووبارە دەکەینەوە

کاک بەهمەن و د. سەردار سڵاو ڕێزیان هەیە

براتان

قادر عەزیز

٧/٦

PATRIOTIC UNION OF KURDISTAN
SECRETARY GENERAL

١٩٩٣/٨/١٠

برای خۆشەویستم کاکە حەمەی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادمان و خۆشیتانم داوایە و ئێمەش باشین

نامەکەتان گەیشت: زۆر سوپاس بۆ لوتفتان برایانەتان.

وەک پێشتریش پێم گوتویت تۆ هەر برای ئێمەی، پەیگیریش لای
هەر برایە، یاری بێت هەر برای، هەر بە ڕەوشت و هەڵوێست
مەوقیفات دەگۆڕێت. بۆیە ئێمەش نەگۆڕاوین و
هەر لەسەر برایەتی و پەیمانی خۆمانین. هاتنە برایانی پەیگیرتنیش
دوای ئەوەی شێوە هەڵوێستی خۆتان گۆڕی، بە ئارەزووی
ئێمە نەبوو، بەڵکو بە زەغتی خۆیان: وە هەرچا بەقەی
ئێمەیان کردبێت، ئەمان هێشتووە بێت.

~~بۆ کەبرایەکەشتان~~ ما دام وایە پا جارێ لای خۆتان بێت
تا (المؤتمر الوطني العراقي الموحد) هەموو مەسەلەت و پارەکەشتان
دەدەینەوە، چونکە من ناحەزی زیان بگاتە ئێوە.

زۆر سوپاس بۆ هەڵوێستی برایانەشتان.

و هەر بژی بۆ
برای دڵسۆزتان
مام جەلال

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
مەکتەبەندی (٣)ی ڕێکخستنی هەولێر

ژمارە
بەروار

بۆ/ بەڕێز کاک حەمە حاجی محمود
بابەت/

سڵاوێکی شۆڕشگێرانە

برای بەڕێزم عمر طاهر لای
کاک عطا سەرداری لە سید صادق
گیراوە (بە ناوی تەرداری) تکایە
هیمەت بکە، بەڵکو بیدەنە
مەحکەمە ئەگەر شتێکی لە سەرە

مستەفا چەورەش

ڕانا

[illegible]
١٥/٨/٣٣

چونکە تۆ وەک پێشمەرگەیەکی فەرزەندی شۆڕشی نوێی
گەلەکەمان و وەک ئەندامێکی دێرینی ی.ن.ک کە لە
دامەزراندنیدا، لە هەڵکردنی ئاڵاکەیدا دەستێکی درێژت
هەبووە، ئەوا هەمیشە هەقی خۆتە بە سەربەرزانەوە هەیە
کە دەستی هەموو جۆرە پارچەیەکتان بۆ درێژ بکەین.
ئێستەش ئێوە وەک ئەندامێکی م.سیاسی یاری قیادیەکان
ئەتوانن هەمیشە دەورێکی باش بنوێنن لەم لە بەهێزکردنی
برایەتی و ٤٠ ساڵی کە ڕاستەوخۆ دەسپێشەی هەموو بەهێزبوونی
ی.ن.ک ـیش ـ وەهەم لە پاراستنی برایەتی خۆشمان.
هەرچۆنێ بێت خۆت باشتر ئەزانی کە من باوەڕی ئەواوم بە
ئازادی بیروباوەڕ و حزبایەتی برادەران هەیە، هەرچۆنێ بێت
ئێستەش [illegible] بگوترێ (الخیر فیما وقع) ئێوەش ئەتوانی
لە پۆستی تازەتاندا دەورێکی باش بنوێنیت لە هەموو
ڕوێکەوە.
بۆ خۆشم هیوادارم هەمیشە کارێ وابکەم (وچاکەم لە دەستبێت)
کە جێگەی ڕەزامەندی برایانی دڵسۆز و هاوخەباتی دێرینەکانی وەک تۆشمان بێت.

هەر خۆشبن و سەربەرز بن

برای دڵسۆزتان
مام جەلال

[illegible]

١٩٩٢/٩/٦

## ((بەیانی ڕێکخستنەوەی حزبی سۆسیالیست
## (((حسک)))

شکۆدارو بەردەوامی بۆ خەبات و تێکۆشانی حزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسک) حزبی سیدا صالح یوسفی ۰ خەلکی تێکۆشەری گەلەکەمان دلسۆزانی حزبمان، حزبی سۆسیالیستی کوردستان ـ عیراق ((حسک)) لەسەرەتای مانگی ٥/١٩٧٦دا ، وەلەروژانێکدا بالی رەشی ئاشوبەتی بەسەر خەلکی کوردستاندا کێشابوو، وەکو ڕێکخراوێکی دیموکراتی پێش کەوتوو خواز بەسەرکردایەتی مامۆستاو رابەر سیداصالح یوسفی، طاهر علی والی، علی عسکری و دکتۆر خالد وسعدی عزیزوعلی هەژاروکاردوگەلالی و قادر شورش، هاتنە چەقی میدانی خەبات و تێکۆشان. وەلەمانگی ٦ / ١٩٧٦دا، زیاتر فراوانترو بریاری دروست کردنەوەی شورش و دامەزراندنی مەفرەزە سەرەتاییەکان یان داولەکاتێکدا دوژمن نەك تەسەوری نەدەکردشورش دروست بێتەوە بەلکو چەند جاری باسی ئەوەیان دەکرد نەك پێشمەرگە بەلکو چەك داریش لە کوردستاندا دروست نابێتەوە بەلام (یەك سال و ٢مانگ) ی بەسەردا تێ نەپەری حزبمان باشترین لەرولەکانی خۆی ناردەوە چیاکانی کوردستان و ترووسکەی شاگری شورش ی نوی یان لە سەر لوتکەی چیاکان بەرز کردەوەو مژدەی بەفیرۆنەدانی خوێنی شەهیدان یان بەکەسوکاری شەهیدان دەگەیاند.

دەستیان کرد بە بەرگری لەبوونی گەلەکەمان و قەبارەی نەتەوایەتی و هۆشیار کردنەوەی جەماوەری خەلکی کوردستان ۰ حزبمان لەماوەی خەباتی بێ وچانی (١٥) سالی شاخ و (٢) سالی دوای ڕاپەرین و یەککگرتنی لەگەل پاسوك و گەل بو (١) سال ئەو حزبەهەر چەندە هەندێك لەسەرکردەکانی نەیان توانی وەکو پێویست سەر پەرشتی ئەو حزبە بکەن و هەمیشە دەستی ئەم لاو ئەولا بون و لەولا ئەوەپالەپەستۆ لەلایەن دوژمن و ناحەزانەوە لەسەری بوو ، بوونە هۆی ئەوەی هەندێك لە سەرکردایەتی ئەو حزبە بێ گوێدانە خوێنی هەزاران شەهید هەولی تالان و فرۆشتنی حزبیان خستەوە میدانی هەراج خانەوە، ئەوانە زوریان خەویان بە چالە کونەکانی خویانەوە ئەبینی و هەندێکیشیان بەند وای پلەو پایەدا ئەگەران ۰ بەلام ئەمانە سیاسەتی ناحەزانەو دوژمن کارانەی (ی ۰ ن ۰ لد) لەلایەك و لایەنەکانی بەرە لەلایەکی کەوە ئابلوقەی ئابووری و سیاسی و ئەمەلامنی ئەنانەت جوغرافیان لەسەر دانابن ، هەر هەموویان ئینی خۆیان دەکرد و ئەو هەموو فیداکاری یەی حزبیان لەبەرچاو نەدەگرد تا یەکگرتنەکەی پارتی و یەکگرتن لەسەر حسابی حزبی سوسیالست هەندێك کەس لە پارتی رسوا کرابوو کەوتنە معامەلەو فرۆشتنی حزب ئەگەر یەکگرتنی سالی پار نەبروایە دەبووە ئەبرە ماقولەکەو هەندێك لەسەرکردەشێتیبازییەکانی سوسیالیستیش کەپارەو پولیکیان کوکردبووە خاوەنی سەروەت بوون لەماوەی (٢) سال دا بو داپوشینی ئوقرەیان لێ بڕابوو ، یەکگرتنی یان چونەناو پارتی یان قبول کرد بەلام هەرروو پارتی پاشکەز بووەوە لەزوری خانەکان کە لەریکەوتن نامەدا هەیە ، هەر لەنائبی رەئیس و ژمارەی کومیتەی مرکزی و مەکتەبی سیاسی هەیە هتد ....

بۆیە ئیستا حزبی سوسیالیستی کوردستان داوا لەو خوشك و برایانەو هەموو ئەندام و پێشمەرگەو لایەنگرو دلسوزان وکەس وکاری شەهیدان بانگەهیشتی دەکات هەرچی زووترە لە هەر جیگاو شوینێك هەن پەیوەندی بکەن و یەکگرتنەوەو بریاری شورشگیرانەتان بدەن و داوای کونگرەی حزب بکەن و سەرکردایەتی یەکی لێ هاتوو هەلبژیرن و درێژە بە خەباتی (١٧) سالی رابردوو بدەن و مژدە بە شەهیدەکان و دلی کەس وکاری شەهیدان خوش بکەن و چونکە حزبی سوسیالیست حزبی جەماوەرو حزبی سەروەران و حزبی شەهیدان، حزبی قالبوی بوتەی خەبات و تێکوشان حزبی بارو دوخی ئەمروزی و بابەتی. حزبی سەیدا صالح یوسفی یە.

کومیتەی ئامادەیی ڕێکخستنەوەی حزبی سوسیالیستی کوردستان
(حسک)
٦/٩/١٩٩٣

الحزب الديمقراطي الكردستاني - العراق

مكتب الرئيس

برای بەڕێز کاک حەمەی حاجی محمود

سڵاو

پێشتا دوو سێ ڕۆژ حیمایەکانی

جەنابتان هەندێک داواکاریان هەبوو بەم

شێوەیە. نازانم بەڕێزتان ئاگادارن و ڕای

جەنابتان چیە.

١ - ٣٠ دەست جلی عەسکەری

٢ - ٣٠ پارچە چەک

جاتان

مسعود بارزانی

٩٢/٩/١٢

بەڕێز ... بارزانی [illegible]

قادر ... [illegible]

[illegible]

٩٢/٩/١٢

# حزبی سوسیالیستی کوردستان

(( بەیـــــــان ))

**ئەی خەلکی کوردستان**

**جەماوەری شاری هەولیر !**

**هەولیری سەلبەندی سوسیالیستەکان !**

**هەولیری شەهیدان علی هەزارو کاردو کەلالی و سەعدی گچکەو قادر شورش و ملازم جمال خوشناو احمد ئەفقی رەش و سەید سەلیم و عەولا سورو شینە بولی.**

**ئەوا جاریکی دیکەش نوتابیان و ئەندامان و بنەمالەی شەهیدان و ریبازی رابەرو ماموستای نامەزربەر سەیدا صالح یوسفی مژدەی دریژەدان بەریبازە پیروزەکەیان رادەگەیەنن ، بەم هەلویستە دلی سەرجەم ئەندامان و دلسوزانی حزبیان گەشاندەوەو شەرمەزاریان بو ئەوانە بەجی هیشت وەکوو (( شیره بەفرینە )) تواندەوە. دەیان وویست ئەو حزبەی خاوەنی هەزار شەهیدەو لەهەلو مەرجیکی میژوویی بابەتی هاتە ناو گورەپانی خەبات و تیکوشان بەرەو زیندە بەچال بەرن . بەلام حزبیک لەروژانیکی رەش و پرلەناشومیدی دا سەری هەلدابیت حزبیک لەناو جەرگەی جەماوەر هەلقولابیت بەک بەپیلان و بەو جورە کارانە لەناو ناچیت ، بەلکو روژ بە روژ بەرەو پیشەوە دەچیت زور لەو پیلانانە بەهیزتره .**

بەیانی روژی ٦/٩/١٩٩٣ کوبوونەوەی ئامادەیی و ریکخستنەوەی حزبی سوسیالیستی کوردستان بەهەلویستیکی مەبدەئی و میژوویی دەژمیردریت لەخەبات و تیکوشانی حزبی سوسیالیستدا ئیمە کومیتەی هەولیری حزبی سوسیالیستی کوردستان بەوپەری دلسوزی و شانازیەوە پەیمان تازە دەکەینەوە هەمیشە سەربازی ماندونەبوونی ریبازی حزب و ماموستاو رابەرمان سەیدا صالح یوسفی بین و لەجاران زیاتر پەرەبەخەبات و تیکوشان بدەین بەهاوکاری هەموو لایەنەکانی کوردستانی عیراق ، وە پاراستنی ئەودەستکەوتە مەزنەی گەلەکەمان و حکومەتی هەریمی کوردستان لەئەستوی هەموو لایەکمانە.

بەیانی ٦/ ئەیلول دەربرینە لەخواست و داوای جەماوەری حزبی سوسیالیستی کوردستان دەکان .

سلاو ریز بو شەهیدانی حزبمان

سلاو ریز بو شەهیدانی بزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلەکەمان

سلاو بوزیندانیە سیاسیەکان و ئەنفالوکیمیاوی و ئاوارەکان

مردن بو دوژمنان

کومیتەی لقی هەولیری
حزبی سوسیالیستی کوردستان
١٢/ئەیلولی /١٩٩٣

## (( بەیانی لقی سلێمانی حزبی سوسیالیستی کوردستان ـ حسك ـ ))

ئەی جەماوەری کوردستان .

تێکۆشەرانی شاری نەبەزان و ڕاپەڕین .

ئەندامان و لایەنگران و دۆستان و پێشمەرگە قارەمانەکان .

لە دوای ئەو گۆرانانەی لە ماوەی زیاتر لە (١) یەك ساڵ بەسەر ژیانی حزبمان حزبی سوسیالیستی کوردستاندا تووشی چەندین گیرو گرفت کرا لەلایەن هەندێك سەرکردایەتی نەبووی باوەڕ بەخۆ نەبوو لە ژێر بالەپەستوی هەندێك لایەنی ناتەرەف و بەرچاو تەنگی سەر ساحەی کوردایەتی ، بەڵام ڕۆڵە بەوەفا و دڵسۆزەکانی ئەو حزبەو قوتابیانی پەروەردەی قوتابخانەی شەهید سەید صالح یوسفی وطاهیری علی والی و ئەنوەری مجید سلطان و شێرکۆی شیخ علی و مام ئاراس و حسن حمە توتلە و ماموستا شریف و جمال ی حەلاو و شیخ عیسی و کەمال حاجی ابراهیم و محمود زەردوی و رەشەی کەچەو سالار جاف و عثمان کاکەرەش و حمە حسن و رؤوف خلیفە سعیدو احمد چەقزی و بیستونی شیخ علی و خەبات و ماموستا دلشاد و شەهید ئاراس و محمودی حمە تاتە و محمد علی اسماعیل و علا حاجی فریق و طاریق و عەمال و حمەی مامە سەعەو ابراهیم حاجی عبداللە و سەدان و هەزاران شەهیدی دیکەی گەلەکەمان زۆر لەو پیلانانە بەهێزترو بەتواناترن و بگات خەباتیان ، هەروا بەردەوام و بەردەوام دەبێت .

ئێمەی کومیتەی لقی سلێمانی حزبی سوسیالیستی کوردستان بەو پەڕی دڵسۆزی و شانازی یەوە بەرەو پیری بەیانی سەرکردایەتی ئامادەیی و ڕێکخستنەوەی حزبی سوسیالیستی کوردستان دەچین و پشتگیری دەکەین وەك هەنگاوێکی مێژووی و گرنگی خەباتی ئەم سەر دەمەی گەلەکەمان و حزبی دەزانین .

بەیانی ٦ / ٩ / ١٩٩٢ تەعبیر لە خواستو داوای جەماوەری گەلەکەمان بەگشتی و حزبی سوسیالیست بەتایبەتی ئەکات هەموو ڕاو بۆچوونی ئێمەشە .

هەر شکودار بێت ئالای شینی حزبی سوسیالیستی کوردستان حزبی شەهیدان .

بەرەو سەرکەوتن

کومیتەی لقی سلێمانی

حزبی سوسیالیستی کوردستان ـ عیراق

١٥ / ٩ / ١٩٩٢

Patriotic Union of Kurdistan

یەکیتی نیشتمانی کوردستان

Secretary General

سکرتیری گشتی

١٩٩٣/٩/٢٠

براگیان کاکە عومەری بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

سوپاس بۆ نامەی ٩/١٤تان

شادی و خۆشحاڵیتانم داوایە.

کە ئێوە گەیشتنە دەستم و ئەمەش دەڵێم:

داواکەتان زۆر حەق دەروایە. بۆیە من بەسەرچاو هەوڵی

خۆم بۆ دەدەن. تکام وایە ناوی دەیەکانم بۆ بنووسیت و

بنێریتی بەپەلە بۆ ئەوەی هەوڵی پێویستیان بۆ بدەم،

چونکە لەم ڕۆژانە هەندێ قانوونی تر دەردەچێت تاکو

هەوڵی بدەم شتێکیان بەرکەوێت.

هەرچۆنێ بێت، ئێوە هەمیشە وەک پێشمەرگەی دلێری

یەکەمین دەستەی پێشمەرگایەتی شۆڕشی نوێمان

کە لەکەمان هەقتان بەسەرمانەوە هەیە، بۆیە من

بۆ هەموو داخوازییەکی تایبەتی خۆتان و هەر ناوچەکە

شتان ئامادەم، بەگوێرەی توانا.

ئێوە هەر شاد بن

برای دڵسۆزتان

مام جەلال

ج.

((بەیانی کومیتەی ئامادەیی و ڕێکخستنەوەی حزبی سوسیالیستی کوردستان ـ عیراق ـ ))
(((حسك)))

جەماوەری بەشەرەفی گەلەکەمان
خەلکی تێکۆشەری کوردستان

ڕۆلە نەبەزەکانی حزبمان حزبی سوسیالیستی کوردستان، بەیانی مێژووی ١٩٩٣/٩/٦ لەکومیتەی ئامادەیی و ڕێکخستنەوەی حزبمان و بەدەمەوە هاتن و بڕوای تەواوی جەماوەری حزبمان و تەئید کردنی لەلایەن لقەکانی حزبمانە لەم هەلو مەرجە چارەنوس سازەدا ڕوداوێکی گرنگ و بابەتی و مێژوویی ئەو حزبە تێکۆشەرەو بەرگری لەئالوزی باری ئێستای کوردستان دەگرێت ئێمە بە پێچەوانەی ئەوانەی کەدەلێن خانەی (٣) سی هەم یاحزبی (٣) سی هەم یا بیرو بوچونی (٣) سی هەم جێگای نابێتەوە، بەلکو ئەمرو ئەو هەلو مەرجە زیاتر لەبارترە و جەماوەری تایبەتی خوی هەیە ٠ هەر ئەوەش جەماوەری حزبمان بەتایبەت و خەلکی کوردستان بەگشتی بەکارێکی گرنگ و ڕاگرتنی تەوازن لە کوردستاندا و ڕێگا نەدان لەشەرو پێکدادان جێگای ئومێدی جەماوەری کوردستانە ، وەختەر لەسەر هیچ حزب و ڕێکخراو و گروپێکی سیاسی دروست ناکات بەلکو جەماوەری حزبمان و ئەوانە بیرو بوچونی خانەی یا حزبی (٣) سی هەم یان هەیە دەتوانن بەئاسانی لەو چوارچێوەیە خویان ڕێکبخەن و دوستایەتی و برایەتی و هاوپەیمانی لەگەل هەردوو لایەنی حکومەتی هەرێم و یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان و لایەنەکانی بەرەی کوردستانی زیاتر بەرەوپێش بەرێت و هاوکاریان و هاوپەیمانی یان بکات و لەو ڕێگایەشەوە بو پاراستنی دەستکەوتە مێژوویی یەکەی خەلکی ڕاپەریوی کوردستان و بەهاوکاری بەرەی کوردستانی و پشتگیری لەحکومەتی هەرێم کارێکی نیشتمانی و نەتەوایەتی سەرشانی خوی دەزانی بو چەسپاندنی یاسا لەکوردستاندا ، چونکە بەبێ ی بوچونی حزب دامەزراندنی حکومەتی هەرێم ئاواتی دێرینەی گەلەکەمان و بەرهەمی خوێنی سەرجەم شەهیدانی گەلی کوردستان بەدەست هاتووە ،

جەماوەری گەلەکەمان پێشمەرگەو ئەندامان و لایەنگرو دوست و هاوکاری حزبمان ئێمە درێژە بەرێبازی شەهید سەیدا صالح یوسفی و (١٢) ئەندامی سەرکردایەتی و سەدان کادرو هەزاران پێشمەرگەی شەهیدەوە ئەدەین، هەر چون لەمانگی ١٩٧٦/٥ وە هاتە مەیدانی خەبات ئەمروش درێژە بەو خەباتە دەدات و تا ئەو حزبەش هەبێت خوێنی شەهیدان بەفیرو ناچێت و مژدەی پاراستنی خوێن و ڕێبازیان بە جەماوەر دەدات ڕێکخستنەوەی حزب لەسەر حسابی ئەو لایەن و حزبێك دیاری نیەو بەلکو جەماوەری خوی کە (١٢) سالە لە سەختترین خەباتدا تی پەڕیوە لەدوای ئەو پەرتو بلاوییەی کودەکاتەوەو دەی خاتە سەر ڕێبازی ڕەسەنی خوی ، بەرەو تەبایی و برایەتی حزبی سوسیالیستی کوردستان و هەموو لایەنەکانی بەرەی کوردستانی و دەرەوەی بەرەی کوردستانی و (I.N.C) و دامەزراندنی عیراقی دیموکرات و کوردستانێکی فیدرال ، بەرەو پتەو کردنی بەرەی کوردستانی چەسپاندنی یەکێتی لەئامانجەکانی حزبمان حزبی سوسیالیستی کوردستان با هەر گەشە داربێت ڕێبازی شەهیدان ٠

هەر شەکاوەبێت ئالای شەهنی حزبمان حزبی سوسیالیستی کوردستان ـ حسك ـ

کومیتەی ئامادەیی و ڕێکخستنەوەی
حزبی سوسیالیستی کوردستان ـ عیراق ـ
حزبی شەهیدان
٩/٢٥ / ١٩٩٣

ئەی جەماوەری بەشەرەفی کوردستان .

تێکۆشەرانی شاری گڵپەو ئاگر ، خەبات گێڕانی شاری بابا گوڕگوڕی خۆڕاگر .
ئەندامان ولایەنگران و دۆستان و پێشمەرگە گیان لەسەر دەستەکان ، ئەی ڕووناکبیرین و مامۆستاو قوتابی
و جوتیارو کاسبکارو هەموو توێژەکانی تری ناو کۆمەڵ . حزبی سۆسیالیستی کوردستان هەر لە
سەرەتای مانگی ١٩٧٦/٥ دا، لە ڕۆژانێکی سەخت و ناهەمواردا بڕیاری شۆڕشگێڕانەی خۆی دا بەرامبەر
بەگەلە ستەمدیدەکەی بەدروستکردنی ڕێکخراوێکی دیموکراتی بەهێز کەوتوو خواز بەسەرکردایەتی مامۆستای
نەمر سەیدا ساڵح یوسفی، وە لەمانگی ١٩٧٦/٦ مفرەزە سەرەتاییەکانیان دا تە چەقی خەبات و مژدەی
شۆڕشی نوێیان بەکەس و کاری شەهیدان گەیاند .

حزبمان (حسک) لەماوەی خەباتی (١٥) ساڵەی پێش و دووساڵی دوای ڕاپەڕین بەردەوام بوو لەووشیار
کردنەوەی جەماوەرو خەڵکی کوردستان و بەرگری کردن لەبوونی نەتەوایەتی گەلەکەمان لەماوەی ئەم
ساڵی ڕابووردوودا حزبمان تووشی چەندین کێشەو گرفت هات لەئەنجامی ئەو گۆڕانانەی کە بەسەری دا هات
لەلایەن هەندێک لەسەرکردەی لێ ئەماتوو وهەڵپەرست ، وەلەژێر بالادەستی هەندێک لایەنی ناتەبەرەوە و
بەرجاو تەنگی سەر ساحەی کوردایەتی . بەڵام ڕۆڵە بەوەفاکانی ئەم حزبە و شەهیدانی ئەم ڕێبازە پیرۆزە
وەکو شەهید سەیدا ساڵح یوسفی و شەهید مازم عەبدو شەهید تالب و شەهید شێخ جلال بیدەری و شەهید
شێخ عبیدو شەهید یونس ئەمبەرو شەهید کاکە سوورو شەهید ابراهیم و شەهید ساڵح جەباری و شەهید فاروق و
شەهید دلشاد ساڵح مامەیی و شەهید احمد هەڵەبجەیی و شەهید مریوان توفیق و شەهید گوهەرو شەهید تاریق
و شەهید اسعد ساڵح و شەهید سیروان محمود گوری ئەسپەیی و شەهید بەرزان علی ڕۆژ بەیانی و شەهید
یاسین جەباری و شەهید فریدون ناسراو بە فاروق گلی و شەهید محمد حسن مامەیی و شەهید حسن حەمەلاو
عزیز بەگ و هەزاران شەهیدی دیکەی گەلەکەمان کۆڵیان نەدا و لەم تەنگ و چەڵەمانە بەهێزتر بوون و بڕیاری
بەردەوام بوونی خەباتی ئەبەساوەی خۆیان دا لەسەر ڕێبازی سۆسیالیستی پیرۆز .

ئێمەی کۆمیتەی لقی کەرکوکی حزبی سۆسیالیستی کوردستان خۆمان بە بەرپرسیار دەزانین بەرامبەر
بەو شەهیدانەی کە بەخوێنی ئاڵیان ئەم ئازادییەیان هێناوەتە بەرهەم وەخۆیان لەپێناو حزب و گەلدا
بەخت کردووە ، بۆیە پاڵپشتی و پشتگیری خۆمان دەردەبڕین بەرامبەر بە بەیانی ١٩٩٣/٩/٦ ی سەرکردایەتی
ئامادەیی و ڕێکخستنەوەی حزبی سۆسیالیستی کوردستان وە بەوپەڕی شانازی یەوە خەباتمان گری دەدەینەوە
لە ڕیزەکانی حزب و بەڵێن دەدەین کە پێشمەرگەی بەوەفابین بەرامبەر حزب و گەلەکەمان بۆ پتەو
کردنی ڕیزەکانی گەل و نیشتمانەکەمان .

بەیانی ١٩٩٣/٩/٦ تەعبیر لە خواستوو داوای جەماوەری گەلەکەمان دەکات بەگشتی و خەڵکی ئەنفال کراوی
گەرمیان و زیندانە سیاسیەکان و ئاوارەو دەربەدەرەکانی شاری کەرکوکی خوێناوی و هەموو ئەندام و
لایەنگرو دۆستانی حزبمان دەکات بەتایبەتی .

با هەر شەکاوە بێت ئاڵای شینی حزبی سۆسیالیستی کوردستان ـ حسک ـ
سڵاو ڕێز بۆ هەموو شەهیدانی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلەکەمان .
نەمری و سەربەرزی بۆ حزبی سۆسیالیستی کوردستان ، حزبی شەهیدان .

کۆمیتەی لقی کەرکوک
حزبی سۆسیالیستی کوردستان ـ حسک ـ
١٩٩٣ / ٩ / ٢٩

زۆر بەڕێز. کاکە محمدی حاجی محمود.

بە هیوای سەرکەوتن.

بەڕێز کاکە محمد، خۆت سیاسییەکی گەورەی. ئەم وڵاتەت و ئاگادارە
لە هەر شتێک. کە لەم واقیعەدا. بەناچاری خزاوەتە ئەستۆمان. ئێمەش
کە لە پێشەوە لەو حاڵەی هەژارین و بەهۆی سیاسەتیشەوە. نەمانتوانیوە. وەک
پێویست بۆ خۆمان بژین. بۆیە لەم دۆخە وەرزانەدا، ناچار ئەبین، لە دەرگای
دەستگیرۆیی. دەستەکانمان بدەین. جا بەڕێزتان، یەکێکن لە سەرکردە
کوردی هەمیشە بە دڵسۆزی خۆم و گەل و پێشوەچوونەکەتان ئەزانم و چەندان جاریش
یارمەتیتان داوم و لە بیرم ناچێتەوە. ئێستەش، لە بەر بێ جێگەیی و دەست نەکەوتنی
خانووبەرێ. ناچار خانووێکم لە زەوییەکانی (حاجیة) دا دروست کردووە و
کەلوپەلی ناو ماڵم فرۆشتووە و چەندان دڵسۆزی تری وەک بەڕێزتان
کۆمەکیان کردووم. بەڵام هێشتا، خۆم تەواو نابێتەوە و پێویستم
بە پارە زۆر زۆرە. بۆیە هیوادارم - کە گەر ئەلوێ کێشەکەم بۆ
چارەسەر بکەیت. تا بتوانم سەرەخی خۆمی تیا بپارێزم. وازانم خۆشتان
پێتان باش نییە، نووسەرێکی (حسن)ی ئیتلۆشەر. دەستیان
بگاتەوە ئەم ژیانە ماڵ و منداڵی لەبەر بارێزن. وە دڵنیاشم
لە دڵسۆزییەی بەڕێزتان.

ئیتر تۆ بەشەوەو!

هیوای نوێ کورد.

ابوبکر علی. سەرۆەری.

١٩٩٣/١١/١

تێبینی/ نووسەروشاعیر ابوبکرعلی لەسلێمانی-
لەخۆپیشاندانێکدا بەدەستی پاسەوانەکانی
پارێزگاری سلێمانی (سالارعزیز) شەهید کرا

یەکێتیی نیشتمانی کوردستان

مەکتەبی سیاسی

ژمارە /

رۆژ /

۱۰۸

برای بەڕێزم کاکە حەمە

سلاوێکی گەرم، سەرکەوتنتان داوامانە.

ئێمەش باشین. سلاوی ڕێزم هەیە بۆ خالە حاجی و
برایانی تر بە گشتی.

هەڵگری نوسراو کاک (ایوب قادر رحمان) دۆستێکی
ئێمەیە و لە ئێران بە مهندس کیمیاوی دامەزراوە.
بەلام مشکلەی چوونە ئەودیوو و إقامەی
ئەوێی هەیە زۆر سوپاستان دەکەم
ئەگەر جەنابتان بتوانن یارمەتی بدەن
لەو بارەوە.

لەگەڵ ڕێزی دووبارەمدا

هێرش

۱۹۹۳/۱۱/۷

برانا

قادر عزیز

١١٨٠/ز
١١/٤
٨,٥

لە / بەڕێز مام جەلال
بۆ / کاک حمەی حاجی محمود
دوای سلاو

(١) تکایە هیممەت بکەن (١٥٠) پ-م ی باش بنێرن بۆ بازیان بۆ لای کاک عمر عبدالله بۆ دیفاع لەو قولە جەنە. زوو بێت باشترە.

(٢) گەر (پ-م) بێ چەکیان هابێت و پیاوی ئازاو بەوەرمن دەگرێ چەکیان بۆ پەیدا بکەین تکایە دەلام ...

حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان
مەکتەبی سیاسی

ژمارە / ١٦٣ أ
بەروار ٧ / ٤ / ١٩٩٦

بو / هەموو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی - بەرێز

سلاوێکی شورشگیرانە .

روژی ١٢ / ٤ / ١٩٩٦ کوبونەوەی کومیتەی ناوەندیمان هەیە لە هەولیر لەکاتژمیری ( ١٠ ) ی سەر لە بەیانی بو ئاگاداریتان ،

ئامادەبوونتان جیگای ریزمانە .

نیتر بو پیشەوە

((ئاگاداریەك لەلایەن مەكتەبی عەسكەری حزبی سوسیالیستی كوردستانەوە))

جەماوەری تێكۆشەری گەلەكەمان

خەڵكی هوشیاری شاری سلێمانی

لەكاتێكەوە حزبی سوسیالیست بڕیاری درێژە دان بە خەباتی نهێناوەی (١٧) ساڵەی لە ١٥ / ١١ / ١٩٩٢ ڕاگەیاند بەهەموو شێوەیەك دژایەتی حزب بەردەوامە لەژێر باڵی حكومەتی هەرێمی كوردستان دا دەركردنی سەدان سەرباز لە سوپای یەكگرتووی كوردستان و دەیان پۆلیس لە ئیدارەی محلی و لە گومرگ و لە هەموو دەستگا حكومیەكان لە موڵكی لە دائیرەكان پەلامار بۆ سەر مقرات و شەهید كردنی چەندین پێشمەرگە بە ناحەق وە لە كاتێكدا دوژمن نەی دەتوانی پێشمەرگەو تێكۆشەران لە شەڕی بەرام بەریدا لەناو بەرن ئێستا بە ئاسانی لە كوردستانی ئازادا بە ناحەق شەهیدیان دەكەن . لە ١١ ی ئازاریش شەهید كردنی سەركردەیەكی بەوەفای گەل و حزب خالە حاجی ئەندامی مەكتەبی سیاسی حزبی سوسیالیستی كوردستان وا جارێكی كەش كۆمەڵێك لە ئەفسەرو سەربازو پۆلیس سەر بە لیستی ئێمە لە پارێزگای دهۆك دەركراون تەنها لە بەر ئەوەی سوسیالستن ئەمەش بڕیارو ئەمەش ناوەكانە .

| ناوی سیانی | پلە |
|---|---|
| ١- امین سفر جومار | معاون امر فوج |
| ٢- عبدی اسلام علی | معاون امر سریە |
| ٣- رمزی شاهین احمد | امر فصیل |
| ٤- صالح محمد علی | امر فصیل |
| ٥- علی احمد حاجی | امر فصیل |
| ٦- صالح محمد اسماعیل | امر فصیل |
| ٧- سامی سفر جومار | امر حضیرە |
| ٨- علی ابراهیم حاجی | جندی |
| ٩- عمر ابراهیم طە | امر حضیرە |
| ١٠- جمیل احمد طە | جندی |
| ١١- عامر رزدی مصافی | شرطە حمایە |
| ١٢- سلیمان احمد یحیی | جندی |
| ١٣- علی محمد نایف | شرطە حمایە |
| ١٤- جاسم محمد طە | امر فصیل |
| ١٥- محمد پیر موسی | شرطە حمایە |
| ١٦- خلیل ابراهیم طە | شرطە حمایە |

مەكتەبی عەسكەری

حزبی سوسیالیستی كوردستان

حزبی سۆسیالیستی کوردستان
لقی هەولێر

ژمارە/ ٢٨
بەروار/ ١١/١٢/١٩٩٣

بۆ/ م.س.ی ... ح.س.ک بەڕێز

سڵاوی خەباتی سۆسیالیستی..

لەبەر رۆشنایی کۆبوونەوەی کۆمیتەی لقی هەولێر لە رۆژی ٢٨/١١/١٩٩٣ و
دوای لێکۆڵینەوەیەکی تێر وتەسەل و رەزامەندی کارگێڕ و ئەندامانی لق و بە
بە مەبەستی فراوانکردنی دەزگاکانی لق و پڕکردنەوەی بۆشاییەکان.
بڕیاریان دا بە دانانی هەڤاڵ محمد مصطفی حەشیە کە لە ساڵی ١٩٨١ەوە
پەیوەندی بە خەباتەوە کردووە و لە خەتە نهێنییەکانی ناو شاردا خەباتی
کردووە و بە بێ پچڕان لەگەڵ حزب بووە و لە رووی تواناشەوە ئێمە
تەزکیەی دەکەین، بە ئەندامی لق و لێپرسراوێتی رێکخراوە جەماوەرییەکانی
دەدرێتە ئەستۆ.. تکایە ئەم بڕیارەمان بە رەزامەندی خۆتان
لەگەڵ ئەوپەڕی رێزمان..

بەرزۆ عەلی هەژار
لێپرسراوی لقی هەولێر
١١/١٢/١٩٩٣

لقی هەولێر
K.S.P
حزبی سۆسیالیستی کوردستان

PATRIOTIC UNION OF KURDISTAN

یەکێتی نیشتمانی کوردستان

مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی

بەشی بێ سیم

ژمارە / تایبەت

بەروار ١٢ / ١٢ / ١٩٩٢

کات / ١١,٠٠ پێشنیوەڕۆ

لە: مام جەلالەوە

بۆ: ماڵە حاجی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

نەدەبوایە چەند سەرۆک هۆزێک کە دەبەکیان بدەن

نەدەبوایە دەستی پێشمەرگەکان لە هەڵبێ وە دەبێت

چونکە شەڕ و ئاژاوە گێڕی و زۆر زۆر زیان

هەیە بە حکومەت و احترامی یاسا و حکومەتی کوردستان

هەموو گیروگرفتێکمان چارە بکرێت ⊙ دوژمنان ئامادەن

دوژمنان خۆیان خۆشی شەڕ و گێچەڵ تاکات وەبێ

پێویستە ئەوەیش چەند جار هەڵنەگیرسێنین ⊙

جهازی مەڵبەندی ڕێکخستنی سلێمانی

(١)

الشيخ كامل الشيخ عبدالقادر حويزية
السليمانية / محلة شيخ عبدالقادر حويزية

بسم الله الرحمن الرحيم

التاريخ ١٤ / ١٢ / ١٩٩٣
تلفون ٢٦٣٩٦

بۆ هەڤاڵی تێکۆشەر جەنابی کاک محمدی حاجی محمود

سکرتێری حیزبی سۆسیالیستی کوردستان

پێشکەش

دوای سڵاو و رێزی بێ پایان و هیوای بەرزی و سەروەریتان لە خوای
گەورە و میهرەبان ، بەناوی خۆم و هەموو ساداتی کوردستان و
طوریقەی قادری یەوە داخوازیمان لە بەڕێزتان ئەوەیە کە ماوە مەدەن
ئیتر شەڕی براکوژی دووبارە بێتەوە و وەزعەمان لێ تێک
بچێ و جەماوەر بێ هیوا ببێ ، بەڵام زیاتر خوێنی کە لێ کورد
بێ هودە ئەڕژێ چونکە ئەخوا پێی خۆشە و وە ئە میللەتەکەمان
وە بانە پشکەوینە بەرتانەی دۆستـ ـتا و دوژمنانی وولاتەکەمان
ئێوە بەخوداتان ئەسپێرم والسلام علیکم

الشيخ كامل شيخ عبدالقادر حويليسه
خادم الفقراء والطريقة القادرية

بو/ دەرویش قائد مەنتیقەی سلیمانی

کاك (مسعود بارزانی) / ئەنجومەنی وەزیران

مەکتەبی سیاسی پارتی / وەزارەتی پیشمەرگە

١٢/١٢ ٩٦٣

لە/ مام جلال

بروسکەتان ٢٤٩١ پیویستە لیستی سەوز هەموو بریارەکانی سەروکایەتی حکومەت و وەزیری پیشمەرگە جی بەجی بکەن و هاوکاری تەواوی فەرماندەی مەنتیقەی سلیمانی بکەن.

بو/ وەزارەتی پیشمەرگە / محافظی سلیمانی

قیادەی مەنتیقەی سلیمانی / (مەسعود بارزانی)

لە/ سەروك وەزیران

١٢/١١ ٢٩٠

لەسەر روشنایی بروسکەی بەریز کاك (مەسعود بارزانی) چارەسەری ئەم کیشەیەی لیوای سلیمانی بکەن نابیت بەهیچ شیوەیەك کەس بتوانی هەیبەتی حکومەت بشکینیت.

ئەم بروسکەیە لەرۆژنامەی برایەتی ژمارە (١٨٢٢) ی رۆژی ١٩٩٣/١٢/١٦ دا بلاوکراوەتەوە

بو/قیادەی مەنتیقەی سلیمانی /کەرکوك /دهوك

هەولیر

لە/ جەبار فەرمان

١٩٩٣/١٢/١١

بروسکەتان ژمارە ١٦٠١ لە ١٢/١١ بە هەموو هیزو تواناتان کە هەیە بەرپەرچی ئەوکارەناهەموارەی هەموو جەماعەتەکەی بدەنەوە چونکە بێ حورمەتی بەرامبەر سوپای یەکگرتووی کوردستان نواندووە چی تان پی دەکری بیکەن لە تولەی داگیرکردنی لیوای/ ٢٤ وسریەکەتان پلانی سەرکەوتووانەی بو داریژن لە ئەنجامیش ئاگادارمان بکەنەوە.

ئەم بروسکەیە لەرۆژنامەی برایەتی ژمارە (١٨٢٢)ی رۆژی ١٩٩٣/١٢/١٦ دا بلاوکراوەتەوە.

خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکان کە لەلایەن ئەم لیژنانەوە پێشکەش کرا بوون بەگیانێکی دیموکراتیانە وە گفتوگویان لەسەر کراو بە تێکرای دەنگ لەلایەن ئامادە بوانەوە پەسەند کران و لەلایەن کونگرەوە چەندین بڕیارو ڕاسپاردەی گرنگ دەرکـــــران وەك ئـــەوەی بڕیـــاردرا :-

١- پشتگیری تـــەواو لە پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان و دەسکەوتەکانی بکرێت ·

٢- بڕیار درا شەڕی براکوژی لەژێر هەر ناوونیشانێـــك دابێ حـــەرام بکرێت ·

٣ بڕیار درا پشتگیری تەواو لە بەرەی کوردستانی و بزوتنەوەو گەشەپێدانی بکرێت ·

٤- هاوکاری تەواو لەگەل لایەنە سیاسیەکانی کوردستان بکرێت و برایەتی نێوانیان بپارێزرێت بەتایبەت یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستانی یەکگرتوو ·

٥- بڕیار درا دوستایەتی لەگەل دەولەتە دراوسێکان بەتایبەتی کوماری ئیسلامی ئێران و کوماری عەرەبی سوری پتەو بکرێت

٦- کونگرە بڕیاری دلنیایی لەسەر بەرزکردنەوەی دروشمی مافی چارە نوس کردەوە ·

٧- بڕیار درا هەولێکی جدی بدرێت بو چاك کردنی باری گوزەرانی خەلك و هەول دان بو بوژانەوەی ئابووری کوردستان ·

٨- هاوکاری دوستایەتی نێوان هێزە بەرهەلستکارەکانی عێراق و هێزە ئیسلامیەکان دووپات کرایەوە ·

دوابەدوای ئەوەش بە سەرپەرشتی و چاودێری بەڕێزان لیژنەی قەزایی ی شەرعی نێراو لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بو کونگرەو چەسپاندنی ڕەوابەتی کونگرە دەست کرا بە هەلبژاردنی کومیتەی ناوەندی تازە ، دوابەدوای ئەوەش کــە بـــە شێوەیەکی ئازادو سەربەست لە کەشێکی دیموکراسیانەدا هەرکەس لەسەر بڕیارو کونگرەو (مسوولیات) وبڕیاری بـــەحـــسی نوێنەرانی شەرعی هەلبژێران کە بەتێکرای دەنگ لە لایەن ئامادە بوان و ئەندامانی کونگرە بەڕێزکاك (محمدحاجی محمـــود) بەسکرتێری گشتی حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان هەلبژێرا، هەروەها لەسەر پێشنیاری بنەمالەو کەس و کـــاری شەهیدان و ڕێز لێنان لە هەفال ماموستا (ملاناصح) کەئاکە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری حزبە بە تێکرای دەنـــگ دەرا بەئەندامی لەخری کومیتەی ناوەندی حزب ، ئەمەو پالێوراوان کەژمارەیان (٥٠) پالێوراو بوو لەناویاندا تەنها (١٨) پالێـــوراو وەك پێویست بو کومیتەی ناوەندی حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان هەلبژێران وبڕیاری پاسایی لیژنەی قەزایی ی کونگرەی لێ درا ، وەلەسەعات (١١)ی بەیانی (١٩٩٤/١١/١٩) کونگرە کوتایی بەکارەکانی خوی هێناو لەئاهەنگی کوتایـــی لەری ورەسمێکی شکودار دا ساز درا، بەم شێوەیە سەرکەوتوانە کونگرەکە کوتایی پێ هات ، وە لەیەکەم کوبونەوەی کومیتـــەی ناوەندی تازەی حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستاندا کەلە ١٩٩٤/١١/٢٠ لەمەکتەبی سیاسی لە هەولێر گیرا لەکـــاتژمێر (١٠)ی سەرلە بەیانی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی هەلبژێران ·

سلاو لەگیانی پاکی شەهیدانی حزبمان و سەرجەم شەهیدانی کوردو کوردستان ··

سلاو لەزیندانە سیاسیەکان لەگشت خەنکی چەوساوەی کوردستان ·

سلاو لەکەس و کاری شەهیدان و ئەنفال و ئاوارەکان ·

سەرکەوتووبێ حکومەتی هەرێمی کوردستان ··

بەرزو شکودار بێت پاســـا ··

شەکاوەبێت ئالای شینی حزبمان حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان ·

بەیاننامەی کوتایی کونگرە ی
حزبی سوسیالیستی دیموکراتـــی کوردستان
١٩٩٤/١١/٢٢

# بانگەوازێك لە حزبەكانی كوردستانی باشوور

جەماوەری گەلی كوردستان

میللەتەكەمان بە پەرۆشەوە دەیڕوانیە ڕێككەوتنامەی تاران ( پدك - ینك ) و چاوەڕێی ئەوە بوون كە جارێكی تر شەڕی برا كوژی دووبارە نەبێتەوە ، دیارە ڕێككەوتنامەكەش شەڕی براكوژی حەرام كردو وەك ئاوات ئاسی لێوە كورد بەڵام ئەوەی جێگای داخە چەند ڕۆژێكە دیسان بارودۆخی كوردستان ڕوو لە شەڕو پێكدادانی تر دەڕوات . بۆیە ئێمە نوێنەرانی حزبەكانی كوردستان لە كۆبوونەوەیەكی تایبەتیدا بەپەرۆشەوە ، ئەم بارودۆخەمان بینجابوە كە دەستكەوتەكان دەخەنە بەردەم هەڕەشەو مەترسی گەورە كە لە ئەنجامی خەبات و خوێن و ڕاپەڕینی سەراسەری میللەتەكەمان بە دەست هاتووە .

جەماوەری كوردستان

ئێمە پێمان وایە ئەم دەستكەوتە تەنها بە گەلی كوردستان و هاریكاری دۆستەكانمان دەپارێزرێ و پێویستە جەماوەر دەوری سەرەكی خۆی ببینێ لە پاراستنی و سووردانان بۆ لەبار بردنی ئەم دەستكەوتە . دیارە جەماوەری گەلەكەمان لەبارو دۆخێكی ئەمنی زۆر خراپ و خەڵكیش لە خراپترین باروودۆخی گوزەراندایە بۆیە پێویستە داهاتی كوردستان بە گوێرەی كەساسانی نیشتیمانیەوە هۆكارێكی سەرەكی سەركەوتنی كابینەی نوێیە بگەڕێنەوە خەزێنەی حكومەت هەر لە ڕۆژی 1994/5/2 و بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەكی پسپۆڕی بێ لایەن پێكبهێنرێت .

جەماوەری گەلەكەمان

دیارە چەندین ڕێككەوتنامە لە تاران ( پدك - ینك ) و چەندین بڕیاری پەرلەمان و حكومەتی كوردستان و لیژنەكانی ئاشتی كردنەوە لە ئارادابووە بەڵام هەموو جارێك بەهۆی بەرژەوەندی تەسكی حزبایەتی پشتگوێ كراوە چارەنووس و ئەزموونی میللەتەكەمانی خستۆتە مەترسی و لەبار بردن هەر بۆیە پێویستە سەركردایەتی هەردوو حزب ڕێز لە ڕێككەوتنامەكانی خۆیان و ویستی جەماوەر و دەستكەوتە مێژووییەكانی گەلی كوردستان بگرن . وەبەستنی كۆنگرەی نیشتمانی كوردستان لە كات و سالی دیاری كراوی دا : لە 10-1995/1/15 وەرچەرخانێكی گرنگە لە دروست كردنی ڕای گشتی كوردستانی و بیر كردنی كێشە درێژەكان .

جەماوەری كوردستان

لەم بارودۆخە ناسكەدا بانگەواز دەدەین بە بازرگانەكانی شەڕ ئاوارەی داگیركەران و دوژمنانی گەلەكەمان بهێڵنە دی و دەستكەوتەكانی میللەتەكەمان بە فیڕۆ بدەن

- بژی ئاشتی
- نەفرەت لە شەڕ

1. حزبی سۆسیالیستی دیموكراتی كوردستان
2. پارتی پارێزگارانی كوردستان
3. بزوتنەوەی دیموكراتی ئاشوری
4. پارتی كاری سەربەخۆیی كوردستان
5. بزوتنەوەی ئیسلامی لە كوردستان
6. یەكگرتووی ئیسلامی كوردستان
7. حزبی ڕزگاری كوردستان
8. حزبی اتحادی تور كمانی
9. حزبی بیت نهرینی دیموكراتی
10. ڕێكخراوی تێكۆشانی ڕەنجدەرانی كوردستان
11. حزبی شیوعی كوردستان - عیراق
12. حزبی زەحمەتكێشانی كوردستان

هەولێر 1994/12/21

برای خۆشەویست کاک حەمەی حاجی محمود

سڵاو و ڕێز :

بە بۆنەی تەندروستی و سەرفرازی و سەرکەوتنی ئێوە و گشت دڵسۆزانی کوردستانە و مەسەلە ڕەواکەی.

دڵنیایە کە برای ئازیزی ئێمە و هەڤالانی پارتی ڕێز و تەقدیریانە هەیە وە جنابتان و هەڤالانتانە و حزبەکەتان بەگشتی ، بە هاوپەیمانێکی نیشتمانپەروەر دەناسیە لەم ڕێگەوە پیرۆزەدا لە پێناوی خزمەتی ئیستیقلال نایینەوەی گەلی کوردستانا.

ڕاسپاردەی ئۆتینەتانە گەیشت وە ئەنشاللە هەموو ئێیتیەکانە بە سەرکردایەتی پارتی دەگەیەنم وە دڵنیام کە پارتی دیمکراتی کوردستانە بە هەمان شێوەی ئیجابی لە سەر دۆستایەتی و پەیوەندییەکانی دەڕوا.

ئەو لێنانیدەی مەسەلەکانە لە کوردستانە وناوچەدا گەشتینم ، ئەوەی بادەتەوە سەر خۆمانە لە بزووتنەوەی کوردایەتیدا کە کاروباری ناوخۆی خۆمانە و گەلەکەمانە ڕێکی بخەیە.

زۆر سوپاسی بۆ سڵاو و بایەخداتانە بە پتەوکردنی پەیوەندی برایانەی دووقۆڵی پارتی و حزبی سۆسیالیست دیمکراتی کوردستانی . هەروەها دەیە . لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە پشتیوانتان بێ لە سەر ڕێگەی ڕاستی و خزمەتی گەل و چاکەی ئازادیدا.

برات

قادر عبدالله کاکەیی

صلاح الدین لە ٣/١٢/١٩٩٦

# بۆ/ بەڕێز سەرۆکایەتی پەرلەمانی کوردستان

## ب/ یاداشتنامە

بەسڵاوێکی گەرم

هەروەك بەڕێزتان پێ ئاگادارە کەوا چەند ڕۆژێکە شەڕو پێکدادان لە چەند شوێنی کوردستان بەرپابووە ، ئەوە لە کاتێکدا کە ئاتیستە شەڕی خۆکوژی چەندین جار لەلایەن پەرلەمانی کوردستانەوە تەحریم و تاوانبار کراوە دواجاریش لە ڕێککەوتنامە دووقۆڵیەکەی نێوان یەکێتی و پارتی خۆیان لە **1994/11/21** شەڕی نێوخۆ نەك هەر تەحریم کراوە بەڵکو پەنابردنیش بۆ ئەو شەڕە بە تاوانێکی نەتەوەیی گەورە لە قەڵەمدراوە .

جەماوەری کوردستان دوای ڕێککەوتنە دووقۆڵیەکە لە ڕێگەی پێك هێنانی کابینەی سێیەم چاوەڕێی ئەوەبوو کە باری گوزەرانیان چاك بکرێت و یاسا سەروەر بێت و سنورێك بۆ دزی و جەردەیی و تیرۆر دابنرێت کەچی بەداخەوە هێشتا مەرەکەبی ڕێککەوتنامەکە وشك نەبۆتەوە کە دەست کراوە بە ئاڵۆزکردنەوەی دۆخەکە ، کە ئەگەر بەزوویی هەموو لایەك ، بەتایبەتیش پەرلەمان و هێزە سیاسی و ئاشتیخوازەکان و جەماوەری دڵسۆزی گەلەکەمان نەکەونە خۆ ئەوا جەولەیەکی تری شەڕی خۆکوژی هەڕەشە لە دەسکەوتەکانمان دەکات .

پەرلەمانی کوردستان ئەمڕۆ باڵاترین دەسەڵاتی یاسا دانانە لە کوردستان و تاکە دەزگایە کە میللەت و حزبەکان بە دەنگیەوە بێن و دونیای دەرەوەش گوێی بۆ ڕادەگرێ ، بۆیە پەرلەمان ئەگەر بیەوێ و وەکو نوێنەری گەل هەڵس و کەوت بکات دەتوانێ سنورێکی بەپەلە بۆ ئەو مەترسیە دابنێت ئەویش لە ڕێگەی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە :-

1- دەرکردنی بانگەوازێك بۆ ڕاگرتنی دەستبەجێی شەڕو شۆڕ و تاوانبارکردنی شەڕەکە .

2- داواکردن لە سوپاو پۆلیس و ئاسایش و هەموو چەکدارەکانی تر بۆ ڕەتکردنەوەی شەڕەکە و دانانی بەشداریکردنیان بەتاوانێکی نەتەوەیی گەورە .

3- داواکردن لە جەماوەر بۆ وەستان دژ بەشەڕەکەو مانگرتن و خۆپیشاندانی سەرتاسەری ، بە تایبەتی لە شاری هەولێردا .

4- پەیوەندی کردن بەدەرەوەو زەخت کردن لەسەر هەردوو لا بۆ ڕاگرتنی شەڕەکە .

5- ئەگەر داواکاریەکانمان پشت گوێ خرا ، پێویستە پەرلەمان هەڵوێستی یەکلاکەرەوەی هەبێ لە بەرامبەر ئەم وەزعەدا .

ئێمە جارێکی تریش دووپاتی دەکەینەوە پەرلەمان ئەگەر بیەوێ دەتوانێ بەڕۆڵی خۆی هەڵسێ و حزبەکانی ئێمەش ئامادەیی هەموو جۆرە هاوکاری و هاریکاریەکە لەگەڵ پەرلەمانی کوردستاندا .

حزبەکانی کوردستانی باشور :-

1- حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان
2- پارتی بارزگارانی کوردستان
3- بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری
4- پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان
5- بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان
6- یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان
7- حزبی ڕزگاری کوردستان
8- حزبی اتحادی تورکمانی
9- حزبی بێت نهرین دیموکراتی
10- ڕێکخراوی تێکۆشانی ڕەنجدەرانی کوردستان
11- حزبی شیوعی کوردستان ـ عێراق
12- حزبی اتحادی تورکمانی عێراق
13- کۆمەڵەی نەتەوەی کورد
14- بزوتنەوەی دیموکراسیخوازان
15- حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان

هەولێر **1994/12/24**

IRAQI NATIONAL OLYMPIC COMMITTEE
IRAQI W.L. & B.B. FEDERATION
Baghdad - IRAQ

اللجنة الأولمبية الوطنية العراقية
الاتحاد العراقي المركزي لرفع الاثقال وبناء الاجسام
بغداد - العراق
اربيل

No./ — العدد

Date / /19 — التاريخ ٢٠/١٠/١٩٩٥

زۆر بەڕێز سکرتێری گشتی حزبی سۆشیال دیموکرات

بابەت / یارمەتی

سڵاوێکی وەرزشکارانە

داوا لە بەڕێزتان دەکەین کە لای بەڕێزتان یارمەتی
یاری زانیان (عزا رووف عزیز) بدەن ناو براو یەکێکە لە
پاڵەوانە پێشکەوتووەکانی عێراق ی نێودەوڵەتی لە بەرزکردنەوەی
قورسایی، جا ئێستا بەهۆی نەخۆشییەوە لە مەشق کردن
وەستاوە. هیوادارین کە بتوانن یارمەتی بدەن.

ئاواتمان سەرکەوتنی گەلی کوردە
لەگەڵ ڕێز و سڵاو

هاشم ملا محمود
ل. یەکێتی بەرزکردنەوەی
قورسایی و جوانی لەش
هەرێمی کوردستان
٢٢/١/١٩٩٥

به ناوی خوای به خشنده

بەڕێزو پێشەوا کاک محمد حاج محمود پێشکەش

پاشی سلام و چاو ماچ کردن بۆ جەرەکانمان و هەواڵ پرسین

لە شەو ڕابووە ئێوە چەند جار محمدیشی و خۆیشم

تەلەفونمان کرد هیچ کەسی هەڵی ناگرێت تەلەفونەکەتان

بێستە تەلەفونمان کرد بۆ بەغدا لەوێشیان بڕاوە

بۆیە ویستم بۆت بنووسم کە:

دوێنێ جماعەت لە ماڵی ئێوە هەڵسان هاتن بۆ ئێرە

وە ئێوانکە هەمە باسی کردووە وتیە پێیان خۆش

کە اتفاقیە کە ئێوان ئازە بکەن ئەوە و ئێمە پێشا هاوکاریمان

بکەین منیش وتم ئێمە اتفاقیەمان هەیە ئەگەر ئێوە هاوکاریان

بکەن والحاصل زۆر هەوڵیان دا کە ئەم بیانیە بنێرن هەردوکیان

بۆ ئێوە بۆ فەرماشتان لەگەڵ سەردار کە ئەمە دانیشین بزانم

تۆ چی ئەڵێیت وە ئایا بۆ ئێوە هیچ سوودی هەیە یان نە ؟

والسلام علیکم دڵسۆزتان علی عبدالعزیز محمد

٩٩٥/١/٢٦

بۆ بەڕێز کاک حەمەی حاجی محمود .

دڵی مەساڵا،

بەهیوای خۆشیتان . انشاالله موفق

و سەرکەوتوو بن .

نامەی جوانتان بەدەستم گەیشت

و سوپاسی لطفتان دەکەم .

نامەی پێویستم نووسیوە بۆ دهۆک

کە لەوەی فەرموتانە جێ بە جێ ببێت

بەیاننامەی دەفتەری سیاسیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

دەربارەی

# ڕەفتاریکی نادۆستانەی یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان

داوەنیشتمانە بەڕێزەکان!

حیزب و ڕێکخراوە ئێرانی و کوردستانی یەکان!

کۆڕ و کۆمەڵە سیاسی یە نێونەتەوەیی یەکان!

دەست تێوەردانی کۆماری ئیسلامیی ئێران لە کاروباری نێوخۆی کوردستانی عێراق دا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پەرە دەگرێ و بێ پەردەتر خۆی دەنوێنێ. ئەم ڕژیمە نەک هەر دوژمنی کوردی ئێران، بەڵکوو دوژمنی بزووتنەوەی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستانە. هەربۆیەش بە هەموو ڕێگایەک هەوڵ دەدا ئەم بزووتنەوەیە بێ ئیعتیبار بکا، دەست لە کاروباری وەر بدا و ئەگەر بکرا دەستەمۆی بکا، بەلارێی دا بەرێ و تووشی شکانی بکا.

ئەوە چەند مانگێکە کاربەدەستانی ئێران فشارێکی زۆریان خستۆتە سەر یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ ئەوەی ڕادیۆی دەنگی کوردستانی ئێرانەی پێ دابخەن. ڕاستی یەکەی ئەوەیە کە هەڵاڵانی یەکیەتیی نیشتمانی چەند جار داوایان لە ئێمە کرد کە بۆ خۆمان و بۆ پاراستنی بەناو مەسڵەحەتی یەکیەتیی نیشتمانی ڕادیۆکەمان دابخەین. بەڵام ئێمە نەچووینە ژێرباری ئەو داوایە و ڕوونمان کردەوە کە ئەو کارە نەک هەر بە زیانی حیزبی ئێمە و کوردی ئێرانە، بەڵکوو زەبر لە ئیعتیبار و ئابڕووی یەکیەتیی نیشتمانی و بزووتنەوەی کوردی عێراقیش دەدا و شوێنەواری ناڵەبار لە سەر پێوەندیی برایانەی خەڵکی ئەو دوو بەشەی کوردستانیش دادەنێ.

بە ڕواڵەت هەڵاڵانی یەکیەتی ئەو بۆچوونەیان پێ دروست بوو و ماوەیەک بوو داخوازی داخستنی ڕادیۆ بێ دەنگی لێ کرابوو. کەچی بەداخی گرانەوە ڕۆژی ١٣٧٣/١٢/٢٧ ( ١٩٩٥/٣/١٨ ) دەستەیەک پێشمەرگەی یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان دەوری بنکەی ڕادیۆی دەنگی کوردستانی ئێرانیان دا و بۆ ڕازی کردنی یەکێک لە سەرسەخت ترین دوژمنانی گەلی کورد ئەو ڕادیۆیەیان داخست.

ئێمە لە کاتێک دا پڕ بەدڵ لەو کردەوە غەیرە دۆستانەیەی یەکیەتیی نیشتمانی بەداخین، پێش هەموو شتێک داوا لە سەرکردایەتیی یەکیەتی دەکەین برایەتیی کوردی ئێران و عێراق بە وادە و بەڵێنی بەدرۆی ڕژیمی کۆماری ئیسلامی نەگۆڕێتەوە و دەسبەجێ دەستوور بدا پێشمەرگەکانی یەکیەتی دەوری بنکەی ڕادیۆ چۆڵ بکەن و ڕێگا بدەن ڕادیۆکەمان بڵاوکردنەوەی بەرنامەکانی دەست پێ بکاتەوە.

پاشان لە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بە تایبەتی لە کوردستانی ئێران و عێراق کە زیاتر گوێگری بەرنامەکانی ڕادیۆی دەنگی کوردستانی ئێرانن داوا دەکەین، هەرکامە بە ڕێگای خۆی دا داوا لە یەکیەتیی نیشتمانی بکەن کۆتایی بە داگیر کردنی بنکەی ڕادیۆی حیزبی دیموکرات بێنێ و نەچێتە ژێرباری فشاری کۆماری ئیسلامی.

هەر لەو کاتەدا لە کۆڕ و کۆمەڵە سیاسی یە نێونەتەوەیی یەکان داوا دەکەین فشار بخەنە سەر دەوڵەتی ئێران بۆ ئەوەی واز لە دەست تێوەردانی کاروباری نێوخۆی کوردستانی عێراق بێنێ و لەو ڕێگایەوە فشار لە سەر حیزبی ئێمە و ڕێکخراوەکانی دیکەی نێو بزووتنەوەی کوردی ئێرانیش کەم بکەنەوە.

گومان لەوەدا نیە، ئەگەر کۆماری ئیسلامی ئەو پیلانە دژی ئینسانی یەی هەروا بۆ بچێتە سەر، لە داهاتوودا بەهێندەوە ناوەستێ و دیسان فشار دەخاتە سەر ڕێکخراوەکانی نێو بزووتنەوەی کورد لە عێراق بۆ ئەوەی کاری نادرووست تر و نادۆستانەتر و تەنانەت نابەرپرسیارانەش، دەرهەق خەباتگێڕانی کوردی ئێران بکەن.

هیوادارین هەموو حیزب و ڕێکخراوە کوردستانی یەکان، بە تایبەتی لە کوردستانی عێراق دا دەنگی خۆیان بخەنە گەڵ دەنگی ئێمە و نارەزایی لەو کردەوەیەی یەکیەتیی نیشتمانیی کوردستان دەرببڕن. بێ گومان ڕاست کردنەوەی ئەو هەڵەیە پێش هەمووان بەقازانجی یەکیەتیی نیشتمانی تەواو دەبێ و ناهێڵێ ڕابردووی پڕ لە خەبات و تێکۆشانی یەکیەتی بە کردەوەیەکی وا ناڕەوا خەوشدار بێ.

بە ئاواتی هاودڵی و هاودەنگیی هەموو لایەک.

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

دەفتەری سیاسی

٧٣/١٢/٢٧ ( ٩٥/٣/١٨ )

برا گیان کاکە حەمە بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادمان و خۆشیتان داوایە

سوپاس بۆ نامەکەتان . وا دە هەزار دۆلارم بۆ ناردیت .

تاکو مانگی بەردەوامیش چاوم لێ تانەوە دەبیت . یادەوەر بکەن

من فەرمانی پێشمەرگەکانی ی.ن.ک و ح.س.د.ک / ناکەم.

ئێستە دیار بووەوە هێزەکانی ئاشبەتاڵ لە چوار قۆڵەوە پەلاماری

هەولێریان داوە ، بەڵام زۆر خراپ تێکشکاون . بەڕێز

لە قۆڵی شاوێس و پیرزین (٥٠) مەیتیان لێ بەجێماوە.

لە قۆڵی کەسنەزانیش پتر لە (٥٠) مەیتیان لێ بەجێماوە ،

لە هەموو قۆڵەکان کوژراویان لە بەینی (١٥٠ - ٢٠٠) کەسە !

کەماڵ کەسرەت دەڵێ وا لو بابو باپیرشیان تەحیان کردووە !!.

دیارە ئاگات لە قۆڵی پێنجوێن و سۆرین و ناوپارێزیش هەیە

لە دوێشت ئاشبەتاڵیان ئاگر داوە !!

وادیارە ئەو وڵاتە شکانەوەیان پێویست بوو

بەڵکو هۆشیان بێتەوە. سەرو ئاشتی قبووڵ بکەن!

ئەوە شتی سەرۆک مسعود !؟ وقارەمانە! بەڕێز کاکی!

ئیتر هەر شادبن

برای دڵسۆزتان

مام جەلال

٢٧ / ٣ / ١٩٩٥

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
سکرتێری گشتی

الاتحاد الوطني الكوردستاني
الامين العام

Patriotic Union of Kurdistan
secretary General

بۆ گیان کاکە هۆشیاری حاجی مەحمود(ی) بەڕێز

سڵاوێکی گەرم .

شادبووم بەهۆشیاریتانم دڵوایە .

زۆر سوپاس بۆ نامەی ١٩٩٠/٤/٦ تان وئەمەش وەرام :

١- ئێمە لەهەڵوێستی ئێوە زۆر ڕازی و مەمنونین . هەروەها
لەو نامەیە بە تێکڕا دەرتان خست کە ئاگاتان لەو
شتانە نەبووە . هەروەها ئامۆژگاری هەڤاڵانیشتان
بکەن بە [illegible] ئێوە هەنگاوی زۆر هەڵنەهێنن .

٢- پارتی سۆسیالیست لەسەر لاساری . لە تاڕیشی وەفدەکەیان
هەر لاسارە . وادیارە بەقسەی ئێوەش ناکەن ، بەڵکو هەر
بەقسەی عێراق دەکەن و بەس ! ئەویش کاری سوتاوە و
فرێتریش دەسوتێت !

٣- پەیوەندییان لەگەڵ د. مظفر و[illegible] نیشتەوە لەگەڵ
تورکیە شتێکی باشە . ڕاستییەکان باشتر ڕوون
دەبنەوە بۆیان .

٤- هەوڵدەن کۆنەسۆسیالیستەکانی لاوانی لەنێو ( ——— و ئاشتە ) بهێنیت و بڵاو
خۆتان . نەختێنەرجیان لەگەڵیان پێویستە .

ئێمە هەر برابو برادەسۆزتان
مام جەلال
جەلال

ئاگاداری
کۆبوونەوەکەمان ڕۆژی شەممە
لە [illegible] — [illegible] د. ئەحمەدیش [illegible] دێن .

بۆ برای بەڕێز و خۆشەویستم

کاک محمد حاجی محمود

سڵاوێکی گەرم

هیوادارین سەرکەوتوبن و هەواڵی برادەران

دەپرسم.

کاکە بە نیسبەت کاک فرهاد محمود و خێزانەکەی و

منداڵەکانی دەیانەوێت بچنە ئێران

بەڵکو ئەوەندەی دەکرێ ئەمەریفەمون

وەرەقەیان بۆ بکرێ . جێگەی سوپاسە

هەربژین

برای دڵسۆزتان

حاکم قادر

١٩٩٥/٤/٨

پارتی دیموکراتی کوردستان – یەکگرتوو — ژمارە/ ٢٠٠٩

لقی چوار — بەروار/ ١٩٩٥/٢/٨

بۆ/ م.س حزبی سۆسیالیستی کوردستانی بەڕێز

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

بە پێی ڕێککەوتنی کۆبوونەوەی فراوانی شەوی ٢٦/٢٧ /١٩٩٤/١٢ کە هەموو لایەنە سیاسیە کوردستانیەکانی
ناو شاری سلێمانی و کەسایەتیە کۆمەڵایەتیەکان و نوێنەری لیژنەی ماڤی مرۆڤ و مامۆستایانی
ئاینی بەشداریان تیا کرد بۆ ئەوەی سلێمانی شارستانیەتی شاری سلێمانی نەشێوێ و کوشتار لەو
شارەدا ڕوونەدات، یەکێک لە بڕیارەکانی ئەو کۆبوونەوەیە ئەوە بوو کە بارەگای مەکتەبی ڕاگەیاندنی
لقی/٤ پارتیمان بە کەرەسەکانیەوە خرایە ئەستۆی بەڕێزتان بۆ پارێزگاری کردنی لە تالانی
وە لە هەمان ئەووەدا ئالای ( حزبتان ) لە سەر بارەگا هەڵکرا .
وەک ئاگادار کراوین کە ( یەکێتی ) هەمیشی ئالاکەیان شکاندوون و دەستیان گرتووە بەسەر بارەگاکە
تکایە ئاگادارمان بکەنەوە لەوەی کە ئایا بە ڕەزامەندی بەڕێزتان [illegible] داگیریان
کردووە .

لەگەڵ ڕێزماندا ...

وێنەیەکی بۆ/
م. سەرۆکی بەڕێز
م.س بەڕێز
هەموو لایەنە سیاسیە بەڕێزەکانی کوردستان
[illegible] لە سلێمانی

بۆ ئاگاداری و هەڵوێست وەرگرتن

---

پارتی دیموکراتی کوردستان – یەکگرتوو — ژمارە/ ١١٧٧

لقی چوار — بەروار/ ١٩٩٥/٢/١٩

بۆ/ لقی شارەزووری حزبی سۆشیالیستی کوردستانی –

بەڕێز

سڵاوو ڕێزمان

بە خۆشحاڵیەوە هەواڵی گرتنەوەی بارەگای شری لقە [illegible]تانمان بە دەست
گەیشت ... هیوادارین هەنگاوێکی تر بێت بۆ پاراستنی گیانی برایەتی و خەبات و
هەوڵی هەموو لایەک لە پێناو ئاشتیەکی هەمیشەیی و سەرتاسەری کە لە سایەیدا
گەلەکەمان گوزەران و ژیانی بە ئاسودەیی بباتە سەر ...

[illegible] بۆ پێشەوە

وێنەیەکی بۆ/
قیادەی مەیدانی کەرکوک سلێمانی / بەڕێز
فایلی گشتی

لە/ محەمەدی حاجی مەحمودەوە

ژمارە/ .........

بۆ/ بەڕێز مام جەلال

بەروار/ ١٩٩٥/٤/٨

هەوڵ و تەقەلای حزبە کوردستانیەکان بەپەرۆشەوەبونی بەڕێزتان بۆ ئاشتی و تەبایی چارەسەری کێشەکان لەڕێگەی گفت و گۆوە تاکە ڕێگەیە بۆ نەهێشتنی شەڕوپێکدادانەکان کە تەنها ڕژێمی بەعس نەبێت کەس سوودی لێ وەرناگرێت . ئێمە پشتگیری تەواوی حزبەکانتان بۆ دووپات ئەکەینەوە بۆ ئەو هەوڵە خێرخوازانە چونکە ئەمڕۆ هەموو خەڵکی کوردستان و دۆستەکانی میللەتەکەمان چاوەڕوانی هیمەتی دڵسۆزانەتانن ، ئەو شەڕ ڕاگرتنە سەرەتای ئاشتی هەتا هەتا بێت ، مژدەی خۆشی بە خەڵکی کوردستان بدەن هەموو هەوڵ و تەقەلاکانیان دەخەینە پاڵی هەموو هەوڵ و تەقەلا خێرخوازەکانی بەڕێزتان ..

لەگەڵ ئەوپەری ڕێزماندا ..

١٩٩٥/٤/٨

لە محمدی حاجی محمودەوە

بۆ بەڕێز کاک مسعود بارزانی

سڵاوێکی گەرم

ڕاگرتنی شەڕو هەوڵو تەقالای حزبە کوردستانییەکان ڕاگەیاندنی لەلایەن بەڕێزتانەوە بۆ ئاشتی و تەبای و چارەسەری کێشەکان لەڕێگای گفتوگۆوە نیشانەی دڵسۆزی و بە بەرپرسێتیەوە بڕینی کێشەی میللەتەکەمانە و هەر ئەوەش تاکە ڕێگایە بۆ نەهێشتنی شەڕو پێکدادانەکان کە تەنها ڕێنی بەهەرنەبێت کەس سودی لێ وەرناگرێت ئێمە پشتگیری تەواوی حزبەکانتان بۆ دووپات دەکەینەوە بۆ ئەو هەوڵە خێرخوازانە چونکە ئەمڕۆ هەموو خەڵکی کوردستان و دۆستەکانی میللەتەکەمان چاوەڕوانی هەمیشی بەڕێزتانە ئەو شەڕ ڕاگرتنە سەرەتای ئاشتی یەکی یەکجاری بێت بۆ گەلەکەمان نەک هەر (١٥) ڕۆژ بەڵکو ئەساسێک بێت بۆ بنبڕ کردنی ئەو شەڕە ماڵ وێرانکارەی دووچاری خەڵکی کوردستان بووە و جەماوەری گەلەکەمان و کەسوکاری شەهیدان و خەڵکی ڕەشوڕووت و برسی کوردستان چاوەڕێی ئیمانین .

هەرشاد بن

برای بەڕێز و خۆشەویست کاک محمد حاجی محمود

زۆر بەڕێزەوە سڵاوم هەیە و هیوامان خۆشی و شادیتانە

کاک نەوشیروان زۆر ڕێزی هەیە بۆتان

زۆر سوپاسی بۆ دیاریەکەت بە دەستمان گەیشت

برادەران هەموو سڵاو ڕێزیان هەیە .

هەر بژی

برات

[illegible]

٨ / ١ / ٩٩٥

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
مەڵبەندی ڕێکخستنی ١ی شارەزوور

ژمارە / ٤٤٨
بەروار/ ١٩/ ٤/ ١٩٩٥

بۆ/ لقی شارەزووری حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستانی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

بابەت / پیرۆزبایی

بەڕێزان ... بەپێی نووسراوەکەتان ژمارە / ٥ لە ١٨ / ٤ / ١٩٩٥ ئاگادارمان دەکەن کە
لقی شارەزووری حزبتان کردۆتەوە بەو بۆنەیەوە بە ناوی مەڵبەندەکەمانەوە گەورەترین
پیرۆزبایتان لێ دەکەین وە هیواداریشین کردنەوەی لقەکەتان ببێتە هۆی زیاتر
بەرەوپێش بردنی پەیوەندیی نێوان هەردوولامان و بەهێزکردنی هاو
بەشەکانمان وە بەو پەیوەندییە بتوانین زیاتر خزمەتی گەلەکەمان و بزووتنەوەی
ڕزگاریخوازی گەلەکەمان بکەین ، ئاشتی ـ دیموکراتی ـ مافی مرۆڤ ـ مافی چارەی خۆنووسین
بەرقەرار بکەین وە هەموو کێشە و گرفتەکانی ناوچەکەمان بە دۆستانە و دڵسۆزانە
چارەسەر بکەین لەگەڵ ڕێزماندا دووبارە پیرۆزبایتان لێ دەکەین و هەروەها
وسەرکەوتوو بن ....... //// ....... ////

مەڵبەندی ڕێکخستنی ١ی شارەزوور

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
سکرتێری گشتی

الاتحاد الوطني الكوردستاني
الامين العام

Patriotic Union of Kurdistan
Secretary General

براگیان کاکە حەمەی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادی و سەرکەوتنتانم داوایە. ئێمەش
باشین. زۆر سوپاس بۆ نامەکانتان.
منیش هەندێ دەنگوباسم لا هەیە بە نامە
نانووسرێت بۆیە ئەگەر سبەی
بۆ شێوەی ورد نیشتە لەوکاتە ئەوەم بۆ ناخوێنراوە و
ئەوەم بۆ قسەکردن ئەوا زۆر باشی
دەبینیت.

سەربەرز بن

براکەی خۆتان
مام جەلال

١٩٩٠/٤/٢

یەکێتی نیشتمانی کوردستان — ژمارە/ ٤٩٧

مەڵبەندی ڕێکخستنی ١ی شارەزوور — بەروار/ ٢٧/ ٤/ ١٩٩٥

((بەشی پەیوەندییەکان))

بۆ/ حزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان/ لقی شارەزووری بەڕێز

سڵاو و کاروخەبات

بابەت/ داوای چاک کردن

بەڕێزان .. نووسراوەکەتان ژمارە/ ف لە بەرواری ٢٥ / ٤ / ١٩٩٥ کە ئاراستەی هەردوو (٢ ٠ م) مان ((فاضل احمد بەگ ـ عمر ڕەزلەیی)) کردووە کە سەردانی بارەگای کاک لقمان بکەن لە شاروچکەی سیدصادق بۆ کاری پێویست .

هەرچەند نازانین بانگ کردنەکەی بەڕێزتان بۆچ مەبەستێکە بووە .

ئەم نووسراوەمان ئاراستەی بەڕێزتان کرد هەرگیز گرفتێک هەر داواکارییەک بۆ هەڤاڵەکانی ئێمە ئەبێت لای ئێوەوە ، وا پێویستە بێنەکەی پەیوەندی بکەن بە مەڵبەندمانەوە (بەشی پەیوەندییەکان) نەک ڕاستەوخۆ نووسراو ئاراستەی پێشمەرگەو هەڤاڵەکانمان بکەن ئەمە گیانی تەبایی و هاوکاری نێوانمان زیاتر دەکات . خۆ ئەگەر وەک ئەم دوو هەڤاڵە خۆیان دەڵێن چەکی بەڕێزتانیان لایە و داوایان ئەکەنەوە ئەوە سەردەمی حزبی یەکگرتن بووە .

دووبارە داواکارمان وایە کێشەکانتان لە ڕێگای مەڵبەندەوە چارەسەر بکەن ...

لەگەڵ ڕێزماندا

مەڵبەندی ڕێکخستنی ١ی شارەزوور

**University of Sulaimani**

College of Agriculture

Dean... Bureau

زانكـۆی سلێمانی

كـۆلیجی كشتـوكاڵ

نـووسینگەی عـەمید

زمـــارە / ٢/١٦/٣٦٣

بـــەروار/٢٧ / ٤ /١٩٩٥

بـــو/ــ ھەڤالي بەریز كاك محمد حاجي محمـــود / سكرتیری حزبـــي

سوشیالیستي دیمكراتي كورد ســـــتان

ب/ــ یارمەتـــــي

======

باش ســــلاو ریزمــــــان :

ئیرخوازاني كولیجەكمان ھەلئەسیت بە سازداني خولیكي یاری توپی پی لـــە یـادی

شەھید بووني ئیرخوازانـــي جوانەمرگ ( شەم اكرم و خیلان عین الدین ) كە لە روزی

٣٠/٣/١٩٩٥ بە كارەساتي ئوتومبیل لە ریگای گەشتەكیاندا شەھید بوون . داواكارین

كەبەبی ی توانا یارمەتي ئیرخوازەكانمـــان بدەن بو سازدان وجیبەجی كردني ئەركـي

ئەم خـــــوله لەگەل ریـــــــزدا ....

خالد محمـد خـــال

راگری كولیجي كشتوكال بە وەكالەت

وینەیەك بــو/ــ

ــ نوسینگەی راگـــــــر ( )

ــ دوسیەی نوسراوی دەرکــردە .

گیلانی/ ٤/٢٦

سەرۆکایەتی زانکۆی سلیمانـــی
کولیجـــی کشـــتوکـــال
ـ نوسینگەی راگـــر ـ

ژمـارە / ٢/١٦/ ٢٦٤
بـــەروار / ٢٧/٤/١٩٩٥

بـــو/ـ هەڤالی بەریزکاک محمد حاجی محمـــود /سکرتیری حزبی سوشیالیستی دیمکراتی کورد ســـتان

ب/ـ یارمـــتی
====

باش سلاو ریزمـــان :

فیرخوازانی کولیجەکمان هەلمەتییت بە سازدانی خولیکی یاری توپی بسی لە یـــادی شەهید بوونی فیرخوازانی جوانەمەرگ ( شـەم اکرم و خیلان عین الدین ) کە لە روزی ٣٠/٣/٩٩٥ بە کارەساتی ئوتومبیل لە ریگای گشتەکیاندا شەهید بوون . داواکارین کە بەبی توانا یارمەتی فیرخوازەکانمان بدەن بو سازدان وجی بەجی کردنی ئەرکی ئەم خولـــە لەگەل ریـــزدا . . .

سامی قادر محمـــد
یاریدەدەری راگـــر

وینەیەك بـــو/ـ
ـ نوسینگەی راگـــر . . . . .
ـ دوسیەی نوسراوی دەرکـــردە .

برا گیان کاکە حەمە بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادی و خۆشیتانم داوەیە. سوپاس بۆ نامەکەتان و
ئەمەش وەڵامەکەیە :

١ - ئیمزاکردنی رێککەوتنەکە باشە بەمەرجێ تاکو «ئیلیکی»
تیابێت و بزووتنەوە لە پارتی دوور بخاتەوە.

٢ - چوونی لۆمانە سعوودیش خراپ نییە.

٣ - کە بە ئاشکرا زووتان کردن بینین بکەن) ئاگادارم
بکەرەوە تاکو دەفتەری دیار دیاری بکەین.

٤ - بۆ زانیاریتان هەوتان ئامۆژگاری لە بنجەیا
لە ناو بزووتنەوەمان ئیسلامیدا زۆر زۆر
لاوازن و زۆربەیان دژیەتی.

شێخ ابراهیم بە
برایانی دڵسۆزتان
عومەر لال

١٩٩٥/٤/٣٠

هەریمی کوردستان
پارێزگای سلێمانی
( کارگێری گشتی )

ژمارە / ٦٤١
بەروار/ ٢٠ /٥/ ١٩٩٥

بۆ / سەرۆکایەتی شارەوانی سلێمانی

لەبابەت / زەوی

---

حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان بەنوسراوی ژمارە ( ١٧٣ ) لە ١٥/٥/٩٩٥ داوا کاری دابین کردنی پارچە زەویەک ئەکەن لە شوێنێکی گونجاو بە مەبەستی بەنوێنخانەیەک بۆیان . تکایە اجراءاتی اصولی ـ یان بۆ بکەن بە هەماهەنگی لەگەل وەزارەتی شارەوانی و گەشت و گوزار .

سالار عزیز اسماعیل
پارێزگاری سلێمانی
١٨ /٥/ ١٩٩٥

وێنەی بۆ :ـ

---

ـ حزبی سوسیالیستی کوردستان / مەکتەبی ناوەندی پەیوەندیەکانی م.س/ نوسراوتان ( ١٧٣ ) لە ١٥/٥/ ١٩٩٥ بۆ سوراخ کردنی تکایە .

ـ قایمقامیەتی قەزای ناوەندی سلێمانی .

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
سکرتێری گشتی

الاتحاد الوطني الكوردستاني

الامين العام

**Patriotic Union of Kurdistan**
**Secretary General**

براگیان کاکە عەرەبی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادی و سەربەرزیتانم داوایە و ئێمەش باشین.

سوپاس بۆ نامەکەتان و ئەمەش وەڵام:

١- زۆرم پێ خۆشە کە ئەو ژمارەیە دینەوە لۆتان: هیوادارم هیمەت بکەن زۆرتریان بە تایبەتی کۆنە سۆشیالستەکان هەموویان بیهێنینەوە لای خۆتان.

٢- دوو نامەم نووسیوە بۆ کاک دانا: داشم نەفستووە تاکو بیخوێنێتەوە.

٣- زۆر مەمنوون دەبم ئەگەر کاک برزو لەگەڵ خۆی تەلەفۆنێکی سەتەلایتمان بۆ بهێنێتەوە.

ئیتر هەر بژی برابن

برادەری دڵسۆزتان
مام جەلال

جە.

١٩٩٥/٥/٢١

بسم الله الرحمن الرحيم

بۆ/ بەڕێزان کاک مسعود بارزانی و مام جەلال و مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ک) و (پ.د.ک)

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

خۆتان چاک دەزانن کە گەلە موسڵمانەکەمان زیاد لە نیو سەدەیە خەبات و جیهاد دەکات لە پێناوی ئازادی و ڕزگاری و سەرفرازی. وە لەم ڕێگەیەدا هەزاران شەهیدی پێشکەش کردووە و، چەندین جار تووشی ماڵ وێرانی و ئاوارەیی و دەربەدەری بووین، بە تایبەت لەم کاتەدا کە زرووفی مەحەلی و ئیقلیمی و دەولی گرنجاوە بۆ نزیک بوونەوە لەو ئامانجە پیرۆزەی گەلی کورد، لە کاتێک دا کە ڕژێمی گەندەڵی بەغدا ڕیسوا بووە و، بەشێک لەم نیشتمانە خۆشەویستەمان ئازاد بووە.

ئێمە وەک دوو لایەنی خاوەن خەبات و جیهادی کوردستان ئەم پەیامە بەم شێوەیەی خوارەوە دەخەینە بەردەستی هەردوولای بەڕێزتان. بەهیوای بەدەم هاتن و مامەڵەکردنی پڕ جیددی یەتیتان :

١- درێژکردنەوەی ماوەی هودنە (هدنة) بۆ ئەم مەبەستانەی لای خوارەوە :

أ- ئەنجامدانی ناقل کردنەوەی خوێندکاران و قوتابیانی کوردستان لە قۆناغی سەرەتایی یەوە تاوەکو قۆناغی زانکۆ.

ب- پاراستنی بەرو بوومی کشتوکاڵی هاووڵاتییان.

ج- سازکردنی زەمینەیەک بۆ ئاشتی هەمیشەیی.

٢- داواتان لێ دەکەین کە پەرلەمان پێش ١٩٩٥/٦/٤ز کۆبوونەوەی ڕەسمی خۆی ساز بدات بۆ درێژکردنەوەی تەمەنی پەرلەمان بۆ شەش مانگ. لەبەر ئەم ئامانجانەی لای خوارەوە :

أ- بۆ ئەوەی فەراغی قانونی و ئیداری لە کوردستان ڕوونەدات.

ب- هاوبەشی کردنی هەموو لایەنە نیشتمانپەروەرەکانی کوردستان بە یەکێک لەم دوو شێوەیە :

شێوەی یەکەم : کەم کردنەوەی ڕێژەی (نسبة) هەردوولاتان بۆ (٣٠٪)

شێوەی دووهەم : زیادکردنی (٥٠) پەنجا ئەندامی تری پەرلەمان.

ج- دامەزراندنی حکوومەتێکی هاوبەشی (إئتلافي) کوردستانی.

د- زەمینە خۆش کردن بۆ سەرژمێری و لیژنەیەکی باڵا بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی دووهەمی کوردستان.

لە کۆتایی دا ئومێدەوارین کە هەردوولاتان بەوپەڕی بەرپرسیارییەوە پەیامەکەمان قبوڵ بکەن.

بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان/عێراق

مەکتەبی سیاسی

حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان/عێراق

مەکتەبی سیاسی

١٩٩٥/٥/٢٣ز

بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

بەڕێز / مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان
بەڕێز / مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان

یاداشت

سڵاوێکی گەرم ..

لە پێناو خاو کردنەوەی کێشەی نێوان هەردوولاتان و وەکو کارێکی مرۆڤ دۆستانە هەر لەسەرەتای ئاگر بەستی یەکەمەوە، کۆشش دەکەین لە پێناو ئازاد کردنی ئەو دیل و گیراوانەی لەلای هەردوولاتان دەستگیر کراون و وەکو دەرئەنجامێکی ئەم شەڕە نەفرەت لێکراوەی کە ئەمە ساڵێك پترە بە ناڕەوایی بەسەر ئەم گەلە چارە ڕەشەدا سەپێنراوە و باجەکەی دەدا .

هەردوولاتشتان لە سەرەتاوە ئامادەیی خۆتان دەربڕی، بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم کارە خێرخوازییە . بەڵام کە کارێك کە پێشتر تواناغی ئەنجام دانی هەردوولاتان کارەکەتان بە نیوەچڵی جێ بەجێ کرد و ژمارەیەکی کەمی گیراوەکانتان ئازاد کرد ، بەڵام هێشتا ژمارەیەکی بەرچاو لە دیل و گیراوەکان لە زیندانەکانی هەردوولاتان ماوە وەکو زیندانەکانی ئاکرێ و معسکر سلام و ئاسایشی هەولێر و دهۆك و سلێمانی . بۆیە بە پێویستمان زانی جارێکی دیکەش داواتان لێ بکەینەوە کە ئەم گیراوانە ئازاد بکەن چونکە مانەوەیان لەم زیندانانەدا پێچەوانەی بڕیارەکانی خۆتانە بۆ ئازاد کردنیان و دژی ڕەچاو کردنی مافی مرۆڤە و دەبێتە مایەی بێزاری لەلایەن جەماوەری گەلەکەمان . بە تایبەتی دەنگ و باسی واهەیە کە ئەم گیراوانە لە هەل و مەرجێکی زۆر ناهەموار دەژین و سەرەڕای خراپی خۆراك و جێگایان دووچاری ئەشکەنجەش دەبنەوە و هەندێکیان بێ سەرو شوێنن و ئافرەتیشیان تیایە و بەم کارەشتان ناوبانگی هەردوو حیزبەکە و گەلی کوردستانیشمان دەزڕێنن .

لەبەر ئەوە بە ئەرکی سەرشانی خۆمان زانی کە ئەم یاداشتە ئاراستەی هەردوولاتان بکەین و بە ناوی هەر حەوت حیزبەکانمانەوە داواتان لێ بکەینەوە کە بە زووترین کات هەرچی دیل و گیراو ماوە لەلاتان لەهەر شوێنێکدا بن بەبێ مەرج ئازادیان بکەن و لەمەودواش هیچ هاونیشتمانییەك لەسەر بیروباوەڕی سیاسی دەستگیر نەکەن و سنوورێك دابنێن بۆ هەر جۆرە پێشێل کردنێکی مافی مرۆڤ لە کوردستان .

لەگەڵ ڕێزماندا

حەوت حیزبە کوردستانییەکە
١٩٩٥/٥/٢٠

## لەسەر رۆشنایی هاوپەیمانێتی پەیوەندی نێوان هەردوو حزبی کوردستانی

پارتی کرێکارانی کوردستان (*PKK*)بەسەرۆکایەتی هەڤاڵ(عبدللە ئوجەلان) وە حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان(*PSDK*)بەسەرۆکایەتی هەڤاڵ(محمد حاجی محمود) کە لە ١٩٩٥/١٠/١٥ لە دیمەشق ئیمزاکرا بوو .

بۆیە بەزەرورمان زانی بۆ پتەو کردنی پرۆتوکۆلەکە کەلەگەڵ هەل و مەرجی ئێستادا بگونجێ بەتایبەت ئەوپیلانە خەتەرناکەی لەسەر ناوچەکە هەیە بەتایبەت لەسەر کێشەی رەوای کورد بۆیە ئەم پرۆتوکۆلە بکرێت لەباروودۆخی ئێستای کوردستان کەوا حکومەتی تورکیا و پارتی هێرشێکی درندانەی کردۆتەسەر باشوری کوردستان و پارتی کرێکارانی کوردستان PKK بۆیەبریارمان دا بەتەواو کردن وجێ بەجێ کردنی پرۆتوکۆلی نێوان هەردو حزبی هاوپەیمان بەم خاڵانەی خوارەوە :-

١)هێرشی سوپای تورك لەسەر داوای پارتی **PDK** بەخیانەتی نیشتانی و نەتەوەیی دەزانین.

٢)یەك هەڵوێستی سیاسیمان دەبێت لەسەر رووداوەکانی کوردستان و ناوچەکەو دەرەوە.

٣) لەوکاتەدا کەسوپای تورك ی داگیرکەر بەداواکاری لەگەڵ پارتی دا هێرشی کردۆتە سەر باشوری کوردستان و پارتی کرێکارانی کوردستان **PKK** . حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی رای دەگەیەنێت بەشداری تەواو و خۆی بکات بۆ پاراستنی کوردستان لەهەمو رویەکەوە . شان بەشانی پارتی کرێکارانی کوردستان **PKK** .

٤) لەکاتی شەڕ هەردولا بارەگای یەکتر بەکاربهێنن.

٥) لەچوار چێوەی بەرنامەیەکی دارای بەردەوام بودجەیەك لەلایەن (**PKK**) ـەوە دابنرێت بۆ حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان لەکاتی شەڕ و ئاشتی دا .

٦) پاراستنی پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران و کۆماری عەرەبی سوری دا .

٧) پاراستنی دەستکەوتەکانی راپەرینی ساڵی ١٩٩١ لەکوردستان لەبەرنامەدا بێت .

٨)هاوکاری یەکتر بکرێت لەرووی راگەیاندن لەناو وولات و دەرەوەی وولات و بەرەو پێش بردنی.

٩) هاریکاری یەکتر بکرێت لەرووی تەکنیکی سەربازی و کەڵك وەرگرتن لەشارەزای هەردوولا.

١٠) کۆبونەوەی بەردەوام هەبێت بۆ پتەو کردنی پەیوەندی و ئاڵو گۆڕکردنی بیرورا لەناوەوە و دەرەوەی وولات پێکهێنانی کۆمیتەیەك لەهەردوولا بۆ راپەراندن وبەدواداچونی ئیشوکارەکان

١١) بەردەوام بون و وەستانی شەڕ بەئاگاداری و بڕیاری هەردولا دەبێت .

١٢)لەکاتی ئیمزاکردنی هەرپرۆتوکۆلێك لەگەڵ لایەنێکی تر بەئاگاداری یەکتر بێت دژبەبەرژەوەندی هیچ لایەك نەبێت .

حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان
PSDK
[signature]
-٥-٣١

پارتی کرێکارانی کوردستان
PKK
Osman Öcalan
[signature]

حزبی سۆسیالستی دیموکراتی کوردستان — ژمارە/ (١)

مەکتەبی عەسکەری — بەروار/ ٣/ ٦/ ١٩٩٥

بۆ/ فەوجی ١ + فەوجی ٢ + فەوجی ٣ + فەوجی ٤ + فەوجی ٥

سڵاوێکی گەرم

ئاگادارتان دەکەین کەوا وێنەی هەموو پێشمەرگەکانتان ڕەوانەی مەکتەبی عەسکەری بکەن بەمەبەستی تازەکردنەوەی پێناسی پێشمەرگایەتی لە ٣/ ٦ تا ١٠/ ٦/ ١٩٩٥ هەر کەسێک دوابکەوێت پێناسی بۆ تازە ناکرێتەوە .

نەمر بۆ پێشەوە

وێنەیەکی بۆ/

- هەموو فەوجەکان
- فایلی تایبەت

---

یەکێتی نیشتمانی کوردستان — ژمارە/ ١٤/ ٧٨٠

مەلبەندی ڕێکخستنی سلێمانی — ڕۆژ ٢٢/ ٥/ ١٩٩٥

بۆ/ لقی سلێمانی حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان بەڕێز

ب/ لقی (٤)ی کـرین .

بەڕێزان ... تکایە هاوکاریمان بکەن بە مەبەستی تەسلیم کردنەوەی مقری لقی (٤)ی کـرین بەئێمە ... هاوکاریتان جێگەی سوپاسە ..

د.د رمە ـە ر کە ویتـ ویـ ـن

لێپرسراوی مەلبەند

٢٢/ ٥/ ١٩٩٥

یەکێتیی نیشتمانیی
کوردستان

( P.U.K )

ژمارە / ٨٠٥
بەروار ١١ / ٦ / ١٩٩٥

مەڵبەندی (٩)ی ڕێکخستنی شارەزوور

بۆ / کۆمیتەی ڕێکخستنی سەید صادقی تێکۆشەر
سڵاوێکی گەرم
بابەت / لێکۆڵینەوە

هەڤالان .. ئاماژە بە نووسراوی حزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان / لقی شارەزوور ژمارە ١٠٢ لەبەرواری ١٠ / ٦ / ١٩٩٥ ئاگاداریان کردووین لەچەند کێشەیەکی ناوکابینەکانی ئاوارەکانی شانەدەری کە دوو (٢) هەڤالی خۆمان بە ناوی (محمد تەیتۆلی) و (ئاهیر علی) بەوە بەشێوەیەکی دیار و ئاشکرا ئیهانەو تەعدیەی هەڤالان و دۆستان و لایەنگرانی ئێوەیان کردووە . وە چەند جارێک ئاگاداری کۆمیتەی ڕێکخستنی شارەزوور (ئەنجوومەنیان) کردووە بۆ ئەو مەبەستە لە بەرئەوەی کێشەکە ئێستا لەسنووری کۆمیتەی ڕێکخستنی سەید صادق دایە . داواکارین ئەو دوو هەڤالە بانگ بکرێت و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکرێت بە ووردی وە لەئەنجامی لێکۆڵینەوەکە ئاگادارمان بکەنەوە بێ دواکەوتن ...

لەگەڵ ڕێزماندا

لێپرسراوی
مەڵبەندی ڕێکخستنی (٩)ی شارەزوور

وێنەیەک بۆ / ١- حزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان
لقی شارەزوور / ئاماژە بەنووسراوی سەرەوەتان .
٢- فایلی بەشی پەیوەندییەکان .

بسم الله الرحمن الرحيم

« وجاهدوا في الله حق جهاده »

بزووتنەوەی ئیسلامی
لە کوردستان / عێراق
مەڵبەندی یەک

ژمارە: ٤٥٠
بەروار: ١٩٩٥/٦/١٣

بۆ/ لقی ژمارە زدووی حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان

بابەت/ لێکۆڵینەوە

سڵاوێکی گەرم

بەڕێزان ئەمڕۆ سەرۆکی پارێزگاری پارتی دیموکراتی کوردستان بە نووسراوە
ژمارە (ت) ٤ ١٩٩٥/٦/١٢ ئاگاداریان کردین کە بەرێزی
١٩٩٥/٦/١٢ کاتژمێر (٥) پێنجی پاشنیوەڕۆ برادەرانی
(ع ن ك) لە گوندی (وەڵەسەت) ەوە بەرەو گوندەکانی
(ئازە دێشەر) (قەڵبەزە) هاتوون وە دەستیان کردووە بە
تەقە کردن ئەمانیش جوابیان داونەتەوە تکایە چی بابەتان
لە نزیکەوە لە برادەرانی مەڵبەندی ١/٩ ی ژمارە زدوور لە ڕاستی
هەواڵەکە ئاگادارمان بکەنەوە و چۆنیەتی دەست پێشخەری
لە کامەوە بووە. هەرچەندە لە هەواڵەکاندا تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان
لەو بارەیەوە شتێکی باس کرد، بەڵام پێویستە ئێمە بۆ بنبڕ
کردنی ئەم جۆرە کارانە هەوڵی جدی بدەین وە بۆ ئەو
مەبەستە دانیشتنێک بەرپا بدەین کە نوێنەری هەردوولا لەگەڵ
نوێنەری (ی د ک) و (ی ن ك) دانیشتنێکی بکرێت بە زووترین
کات.

هەربژین.

میرزا ... دارا
ئیدارە

١٩٩٥/٦/١٣

بو برایانی بەریزی حەوت حیزبەکەی کوردستان .
سلاویکی گەرم .

دوابەدوای بلاوبونەوەی پروژەی یەکیتی بو ئاشتی پارتی پروژەیەکی خوی بلاوکردەوە کەوا چاوەنوار دەکرا هاوکات لەگەلیدا زەمینەیەکی وەها خوش بکریت خەلکی کوردستان هەست بکەن کەبارودوخەکە بەرەو ئاشتی دەروات و بەتایبەتی کە اعلانی هودنەش کرابوو.

بەلام دیسان لەو کاتەدا هەروەك پیشەی هەمیشەیی خویان پارتی وەزعەکەیان بەرەو ئالوزی بردەوەو خروقاتەکانیان لەزیادبوون و پەرەسەندن دایەو دەیانەویت کوردستان بەرەو شەرو پیکدادانیکی تر بەرنەوە وەئەوەش بەشیکە لەوخروقاتە بەرچاوانەی لەم روژانەی دواییدا کردویانە بو ئاگاداری بەریزتان . (لەهەردن)

١- شەوی ٢-١٩٩٥/٦/٣ رومانەیەکی دەستییان فریدایە ناو بارەکای کومیتەی شەقلاوە/کە بووە هوی شەهید بوونی کارگیری کومیتە بەناوی (رزگار کاکو) وبریندار بوونی (ماموستا مەجید).

٢- شەوی ٩-١٩٩٥/٦/١٠ ناوچەی بنەسلاوەیان توپباران کرد .

٣- نیوارەی ١٩٩٥/٦/١٠ توپبارانی گوندی سیبەردانیان کرد کەبووە هوی شەهیدبوونی چوارهاولاتی و بریندار بونی شەش هاولاتی تر.

٤- شەوانی ٨-٩و ٩-١٩٩٥/٦/١٠ بەبەردەوامی بەBKC وقناص وچەکیتر تەقەیان لەسەنگەرەکانی یەکیتی کردووە لەمیحوەری هیران .

٥- روژی ١٩٩٥/٦/١١ سەعات ٤-٤.٥ ئیوارە توپبارانی سەنگەرەکانی یەکیتیان کردووە لەمحوەری هیران .

٦- سە ر لەئیوارەی روژی ١٩٩٥/٦/١١ بو ماوەی پتر لەسەعاتیك لەشاخی کورەکەوە گوندەکانی بیخال و کانی قوریان داودتە بەرتەقەی دوشکاو چەکیتر.

٧- سەعات ٢.٣٠ روژی ١٩٩٥/٦/١٢ هیزیکی پارتی پەلاماری سەنگەرەکانی یەکیتی یان داوە لە ناوچەی شارەزوور .

مەکتەبی سیاسی
یەکیتی ی نیشتمانی ی کوردستان
١٩٩٥/٦/١٣

پارتی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان

مەکتەبی سیاسی

ژمارە / ١٥٩

بەروار/ ٢٧/٤/١٩٩٥

بۆ/ ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەرێز

بابەت/ گەڕانەوە

ئەمانەی ئەو ناوانەی کە پۆلیسی گومرگ بوون لە سەر لیستی [illegible] کە لە بەرواری ١٤/١٢/٩٩٣ کە بە نووسراوی وەزارەتی ناوخۆ کە بە ژمارەی نووسراو ١٣٢٨ دەرکراون . وا لیستی ئەو ناوانە ئاراستەی بەرێزتان دەکەین تکایە بفەرموون بۆ جێ بەجێ کردنیان .

[illegible] بۆ/

[illegible]

| ژ | ناوی سیانی | پلەی خوێندن | شوێن | لەدایک بوون |
|---|---|---|---|---|
| ١- | رابەر صابر عبدالرحمن | ١ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ٢- | مظفر حسین احمد | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ٣- | محمود عبدالرحمن | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ٤- | کاروان محمد رسول | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ٥- | سالار سعید احمد | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ٦- | سەرهەنگ عمر فتاح | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ٧- | ابوبکر عبدالله قادر | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ٨- | حسین محمد صالح محمود | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ٩- | طه حسین احمد | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ١٠- | مریوان عمر محمد | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ١١- | لقمان علی عبدالله | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ١٢- | محمد امین نجم الدین | ٦ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ١٣- | کرمانج حمه فرج قادر | ٢ ناوەندی | سلێمانی | |
| ١٤- | نوزاد قادر صالح | ١ سەرەتایی | سلێمانی | |
| ١٥- | رزا کریم علی | ″ | ″ | |
| ١٦- | یاسین غفور صالح | ″ | ″ | |
| ١٧- | نادر حاجی کاکل | ″ | ″ | |
| ١٨- | حسین حسین قارەمانی | ″ | ″ | |
| ١٩- | [illegible] علی [illegible] | | | |
| ٢٠- | ئازاد عثمان عبدالرحمن | ″ | ″ | |
| ٢١- | کامران عمر عبید حمه سور | ″ | ″ | |
| ٢٢- | رفیق توفیق محمد | ″ | ″ | |
| ٢٣- | احمد حسین احمد ویس | ٦ سەرەتایی | | |
| ٢٤- | هیوا والی محمد | ٥ سەرەتایی | | |
| ٢٥- | حمه امین حسین محمد | ٥ سەرەتایی | | |
| ٢٦- | جمال محمد احمد | ٤ سەرەتایی | | |
| ٢٧- | قادر محمود احمد | ″ | ″ | |
| ٢٨- | طه حسن فتاح | ″ | ″ | |
| ٢٩- | ابراهیم حسین قادر | ٥ سەرەتایی | | |
| ٣٠- | ابراهیم عثمان سعید | ٢ ناوەندی | | |

بێ دەنگی لە ئاستی ڕووداوەکانی کوردستان سنووری هەیە

جەماوەری تێکۆشەری کوردستان

ئەوە زیاتر لە ساڵێکە شەڕێکی ماڵ وێران کەر باڵی ڕەشی بە سەر کوردستاندا کێشاوە بەرووبوومی کوردستان بەکەرەسەی شەڕ دەدرێت ... خەڵکی هەژار دەکوژرێت و موچەی ئەرمانبەران دەبڕێت ڕێگاشی بۆ دوژمنان خۆش دەکرێت جارێکی کە بگەڕێنەوە بۆ کوردستان و سوپای وڵاتانی بێگانە ئەراتین لە کوردستان بکەن. ماوەیەکی زۆرە ( ٧ ) حزبە کوردستانیەکە هەوڵی خۆیان خستوتە گەڕ بۆچارەسەرکردنی کێشەی نێوان هەردوو لایەنی شەڕکەر ( یەکێتی و پارتی ) وە چەند پرۆژەیەکی ئاشتیان داوە بەهەردوو لایەنی شەڕکەر کەدوا پرۆژەی ئاشتی (٧) حزبە کوردستانیەکە لەهەفتەی پێشوودا دایان بەهەردوولا یەکێتی ئیشتمانی وەڵامی بەقبوڵ کردنی هەر (٥) خاڵی ناو پرۆژەکەدا بووە ...

وەچەند جارێك هودنە لە سەردەستی ئەو حزبانە کراوە وەك حەڵەقەی وەصل لەنێوان هەردوولادا بەڵام لە شەوی $\frac{٧}{٨}$/٢/ ١٩٩٥ بۆ جارێکی تر شەڕ دەستی پێ کردەوە کەئەم جارە هەرە شەیەکی ترسناك لە ئازادی کوردستان دەکات ئەوەی مەبەستە لەلای ئێمە وەك ( ح . س . د . ك ) ئەوەیە کەدەبێت ( ٧ ) حزبەکوردستانیەکە لە سەر ئەو بارە ئاڵۆزو شەڕە خوێناویە هەموو چالاکیەکانی خۆیان لە ماوەی چەند مانگی ڕابردوودا بەبیانێك ئاشکرابکەن بۆ جەماوەری کوردستان وەدەست نیشانی لایەنی شەڕخواز بکەن چونکە بێ دەنگی لە ئاستی ئەو شەڕە ماڵ وێرانکەرەدا کە هەموو لایەك دەگرێتەوە ئەو کەشتیەی غەرق دەبێت و کەس لێی قوتار نابێت ... ئێمە وەك ( ح . س . د . ك ) داوا لە ( ٧ ) حزبەکە دەکەین هەڵوێستی خۆیان لەماوەی چالاکیەکانی یاندا ئاشکرابکەن چونکە کاتی ئەوە هاتووە هەموو لایەك ڕاستیەکان بخاتە ڕوو ئەگەر لە سەر ئەم هەڵوێستەش تووشی زەرەروزیان بین .

هیوادارین جی تر جاوەری دەکرێت بەیارێکردن بە مقەدەساتی میللەتەکەمان و بریسی کردنی خەڵکی کوردستان .

ڕاگەیاندنی ناوەندی

حزبی سوسیالستی دیموکراتی کوردستان

١١ / ٢ / ١٩٩٥

دفتر سیاسی
حزب دمکرات کردستان ایران

دەفتەری سیاسی
حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

1945 ١٣٢٤

Political Bureau
Democratic Party of Iranian Kurdistan

Date :
N° :

تاریخ :
شماره :

بۆ ئەو بەڕێزە مەکتەبی سیاسی پارتی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان
لە گەڵ سڵاوی شۆڕشگێرانە

٢٥ی گەلاوێژی ئەمساڵ ڕێکەوتی ١٦ی ئابی ١٩٩٥ پەنجایەمین ساڵرۆژی دامەزرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە. زۆرمان پێ خۆش بوو دەرفەتمان بۆ ڕەخسابا جێژنێکی بەشکۆ بەو بۆنەیەوە بگرین و نوێنەرانی هەموو حیزب و ڕێکخراوە دۆستەکان لەو جێژنەدا لە تەنیشت خۆمان ببینین.

ئێستا کە بەداخەوە هەل و مەرجی کوردستان و بەتایبەتی باری ئەمنی ڕێگای پێکهێنانی ئەو جێژنە نیشتمانی و نەتەوەیی یەمان پێ نادا، بەختیار دەبین ئەگەر لەو ڕۆژە پیرۆزە دا پەیامی هاوپێوەندی و پشتیوانیی ئێوە لە خەباتە ڕەواکەمان بخوێنینەوە.

هیوادارین پەیامی ئێوەمان پێش ٢٠ی گەلاوێژ (١١ی ئاب) بە دەست بگا. لە ئێستاوە لە هەستی هاوخەباتی و هاوپێوەندیتان سوپاس دەکەین.

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران
دەفتەری سیاسی
(١٩٩٥/٧/٢٤)١٣٧٤/٥/٢

لە: م.ب

ژمارە ١٠٦٥

بۆ: عارف / شۆرش / عدنان.

بەروار ٢٠/٢٦

بروسکەکانتان گەیشت سوپاس تاکاتێ دەرمانکردنا بە بروسکە
وەلامیانا ئیجابی بووەوە. لێ ئێمە پارەمەنگی هیچ لایەکانیان
وەمە بە سەقانا حەزدەولا بووە بە تەنها دژمانیوە نە بووە
وە ئامادەین بۆ هەموو جار کاریەکتان. بەلام بە هەرحال؟
ئێوە بزانن رەئی عامیانا چۆنە جگە لە هەموو ئاوەندی
بڕیار بەدەستیانا کێیەوە کێیانا زۆر سەربەرزی بن (ا)
ن وەکیان دژیانا وەسەرچاوەی داهاتیان لە
کوێوەیە وەزعی سیاسیو ئیداریانا چۆنە وەهێزی
عەسکەری پێشمەرگەیان چۆنە وە رێکخستنی ئاسایشیان
هەیە یانا. بە حەقیقەت ئەوا بکەنا ولامان بدەنەوە.

لە: د.ب

ژمارە ١٠٤٠

بۆ: قیادەی میدانی کەرکوک سلێمانی

بەروار: ١١/١٢

بروسکەکانتان گەیشت سوپاسێکتان دەکەین
دەلێنیاین کە ئێوە بەوەفان بۆ رێبازی پارتیو
بەرزانی. بەلام ئەمەکە ناهێرەکانتان ناردووە
بجەنابیانکەن بە دوو بەشەوە بەشی یەکەم
شۆرش و ٣ ئەندامی سوپاس سەرپەرشتی بکەن
بەشی دووەم عارف و فەریدون سەرپەرشتی
بکەن لە خشتەکانتان دابنێن لە سەنگەرەکانی
پێشمەرگەوە ئامادە بن بەپێی ئەو بەرنامەی
داتانناوە. ئاگاداری ئەوە بن کە
ببنە هێرشێکی ... بکەن
ئەو ... ئەوانەی کە ... دەکرێن
زیادیمان بکەن بۆچی ... کردنیان
با دەست بەکار بن.

# K.S.D.P

Kurdistan Socialist Democraty Party — حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان

Political Bureau — مەکتەبی سیاسی

No. / ژمارە / ٢٥١

Date / بەروار / ١٩٩٥-٨-٥

بسم الله الرحمن الرحیم

بۆ/ بەڕێز مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان - یەکگرتوو

سڵاوێکی گەرم

بەبۆنەی شەهید بوونی تێکۆشەری گەلەکەمان کاک ملازم کریم سەلام و وە پرسەو سەرەخۆشی -
تان لێ دەکەین و داوا لە خوای گەورە ئەکەین کە ئەوە ئاخری کارەسات بێت و شەهید بوونی
ملازم کریم نەبێتە کێشە لە ڕێگای ئاشتی و چارەسەری کێشەکان دا .
تەنها بە ئاشتی و برایەتی و پێکەوە ژیانی سیاسیانە و دەتوانرێت ڕێگای شەهیدداری
هەموو براکوژی ساڕێژ بکرێت و چی تر ڕۆڵەکانی گەلەکەمان لەدەست نەدەین .

انا لله وانا الیه راجعون

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

ژمارە/ تایبەت

بۆ/ بەڕێز م.س پارتی دیموکراتی کوردستان/ یەکگرتوو — بەروار/ ٨/٨/٩٩٥

بەڕێز م.س یەکێتی نیشتمانی کوردستان

السلام علیکم

ئاماژە بە دانیشتنی دوو قۆڵیمان (بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان/ عێراق و حزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان) کە لە ڕۆژی ٧/٨/٩٩٥ کرا کە یەکێک لە خاڵانە ئەو باسەی لێ کرا کە زوو چارەسەر بگیرێت بۆ داواکاریەکانی هاوڵاتیانی گوندەکانی دەوروبەری سید صادق بە تایبەتی (ئێستا تەپە گردە نازدار - تاپینە بوو) کە ڕۆژانە سکالایمان بۆ دێت لە دەربارەی دوورخستنەوەی هێزەکانی (پارتی و یەکێتی) لە یەکتر بوو، شایانی باسە کە دەمێکە هاوڵاتیانی ئەو دێیە کشاوەرزی خۆیان بە خۆیە دڵ دەدەن کە هێمنی لەو ناوچە پیادە بێت وە ئێمەش لە بەر بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندی ناوچەکە بە تایبەتی داواتان لێ دەکەین کە هێزەکانی (یەکێتی) ئامادەبن ئەو چۆڵ بکەن و بگەڕێنەوە سید صادق و هێزەکانی (پارتی) لە گردە نازدار بگەڕێنەوە بۆ قەرەدەفەری وە ئێمەش بەڵێن دەدەین کە لەم چارە هیچ لایەنێک نادەین کە ئەو ناوچانە بکاتە بەرە بۆ مقابیلەکردنی و مەفرەزەیەکی جادەیش لە مەفرەزەی سید صادق-ناوگردان. ئامێستەیە دادەنێین بۆ چاودێری کردنی ناوچەکە.

هیوادارین کە لایەنەکان هەردوولا داواکەمان قبوڵ بکرێت.

والسلام.

علی عبدالعزیز
بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان/ عێراق
٩٩٥/٨/٨

محمد حاجی محمود
حزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان
١٩٩٥-٨-٩

١٢٥٦

١٥ ٨ ٥

بەشی پەیوەندی یەکان ((نهێنی و تایبەت))

بەڕێز لقی حزبی سوشیالستی دیموکراتی کوردستان

سلاوێکی گەرم

بابەت/ زانیاری

بەڕێزان ..

لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە پێمان ڕاگەیاندین کە (تایەر گریزەیی)

ئێستا لە حزبی سوشیالست مەکتەب عەسکەری ح.م/ە ناو براود

دەیەوێت لە تولەی ((هەلوی)) زێن برای دا دەست لە کادرەکانی

یەکێتی بوەشێنێت ە پێمان باش بوو بەڕێزتان ئاگادار کەین و ئێوەش

(م. س) و (م. ح) ی بەڕێزتان ئاگادار کەن لەو بارەیەوە ...

لەگەل ڕێزماندا

## تیپی شانۆی زریان

هەڵەبجەی شەهید

ZRIAN ACTING TEAM

ژمارە / ١٨٤

بەروار / ٩٥/٨/١٩

بابەت / میوانداری

بۆ / هاتنی بەڕێز کاک محمدی حاجی محمود

سەرۆکێکی هونەری ..

هاتنی بەڕێز ئێمە ئەندامانی (تیپی شانۆی زریان) ی هەڵەبجەی شەهید ئەمانەوێت بێینە خزمەت بەڕێزت ئەگەر میوانداریمان قبوڵ بکەیت ..

لەگەڵ دیاری کردنی کاتی هاتنمان

زۆر سوپاس ..

سەرۆکی ئەنجومەنی تیپ

گۆران حەمەامین رەئووف

١٩٩٥/٨/١٩

## ڕاگەیاندنێك لە حزبە كوردستانی یەكانەوە

## دەربارەی پێكدادانی نێوان (پ.ك.ك) و (پ.د.ك)

---

لە كاتێكدا كە هەموو خەڵكی كوردستان و دۆستەكانی گەلەكەمان لە دەرەوە مژدەی بەدی كردنی ئاسۆی ئاشتیان لە كوردستاندا دەدا بە هەموو جیهان و ، بە ئومێدی هەرچی زووتر سارێژ بوونی برینەكانی سەر جەستەی گەلەكەمانیان بە ئاوات دەخواست ، ئا لەو كاتە ناسكەدا هەواڵی هەڵگیرسانی شەڕێكی تری كورد بە كورد درا بە گوێی خەڵكدا ، ئەویش بریتی یە لە پێكدادانی هێزەكانی پارتی كرێكارانی كوردستانی توركیا و پارتی دیموكراتی كوردستانی عێراق .

ئێمە لە كاتێكدا تحریم و تجریمی شەڕی ناوخۆی كورد بە كورد دەكەین هەر لایەنێك بۆی هەڵسابێ لە هەمان كاتدا داوا لە هەردوو لایەنی (پ.د.ك) و (پ.ك.ك) دەكەین كە هەرچی زووترە دەست لە بەكارهێنانی هێز هەڵگرن و كێشەكانیان بە ڕێگە چارەی ئاشتیانە یەك لا بكەنەوە ..

بژی ئاشتی و هێمنی

بمرێ شەڕ و ئاژاوەگێڕی

حزبە كوردستانی یەكان

١٩٩٥/٨/٢٨

بۆ/ هەڤاڵ و برای بەڕێزم کاکە حەمە

سلاو

کاکە گیانا لەسەر ئەو دەبەلیسەی جەنابت
فەرمووت بۆ یارمەتی دانم بۆ خانووەکی
کاکە گیان بڕوات بێت ئەمڕۆ ئاخر ڕۆژی
سوعیدەکەیە کە پارەکە تەسلیم بکەم تکایە
زۆر زەرورە و بڕوات بێت لە تۆ زیاتر
هیچ ڕونا کێکی تر شک نابەم. چاوەڕێی
جەنابتم

براتبچو

سەلام ئازری
١٩٩٦/٦/٢١

بۆ برای بەڕێز کاک محمد حاجی محمود پێشکەش

سڵاوێکی گەرم .

بە هیوای خۆشبەختیتانم و داوای کامەرانیتان

بۆ دەکەم .

زۆر سوپاس بۆ نامەکەتان و دڵنیام کە

جەنابت هەوڵی خێر ئەدەیت و داوای

سەرکەوتنت بۆ دەکەم .

بێ گومان ئەگەر ئەم شەڕەی نێوان پارتی

و یەکێتی نەبوایە قەت پەکەکە جورئەتیان نەدەکرد

ئەم تعدایە بکەن . و پێم وایە هەموولایەک دەزانی

مەبەستی ئەوەی پارتی نیە بەڵکو مەبەستی پەکەکە

هەمو پارتەکانی کوردستانی عێراقە . و دەیەوێت

خۆی بێتە حاکم . کەچی نەیتوانیوە لە کوردستانی

ترکیایش بستێ خاک رزگار بکات بەڵام دەیەوێت

لە کوردستانی عێراق فدراسیونی دیموکرات دابمەزرێنێ

ئایا ئەمە تعدا نیە لە هەمو کوردستانی عێراق .

ئەگەرچی دلنیام کە پێت استقلالی ئەم
دەزعە ناکەت وئەوەیشی حەزبەکەی زمان
لێنادەوت یەکە دلنیاییین لەوە . هەرەکانی
ضومان سکب دەکەین وە بە ئاسانی دەپیکا
وا بە کوچەلان ئەدەوی کە بزانی دونیا
دانیە وەک ئەو بوضوی تی گە لیشتووە .
ئێمە دەبێ بە عمل لەم نیەتە پێت
دلنیا بم ئەوەیشی بیم حەزشە بزانم جەناب
چونکە دەتوانی دلنیاتان بکەین .
زۆر سوپاس .

برات
مسعود بارزانی ٩٥/٩/٤

## ـ گەلی خۆراگری کوردستان

## ـ چین و توێژە زەحمەتکێش و ولاتپارێزەکان

ئەو شەڕەی ئێستای نێوان PKK وPDK، شەڕی ڕێبەرایەتی هارچەرخ و چین و توێژە زەحمەتکێش و ڕەنجدەرەکانی کوردستانە لە دژی سەرکردایەتی ئاغاو دەرەبەگە بەکرێگیراوو وابەستەکان بە داگیرکەرانی کوردستانەوە، و نابێت بە هیچ شێوەیەک وەکو شەڕانی ناوخۆیی ڕابردوو مەبەستگێرێت. لەم قۆناغەی ئێستاماندا کە شۆڕشی کوردستان لە وەرچەرخانێکی مەزن دایە و پێشەنگی شۆڕش، پارتی کرێکارانی کوردستان PKK، خەبات بۆ ئەوە دەکات کە کۆنگرەیەکی نەتەوەیی ببەسترێت و یەکێتی نەتەوەیی لە پراکتیکدا بە ئەنجام بگەیێنێت، و ئەو لیلی و ڕەوشە تەماوییەی ئەمڕۆ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی لە باشووردا پێوەی دەنالێت، دەرباز بکرێت و گەل بە ئامانجە پیرۆزەکانی بگات. گومانی تێدا نییە پێکهێنانی ئەمانە بە هیچ شێوەیەک ناکەوێتە خزمەت سەرکردایەتی فیودال و خۆفرۆشی PDK و داگیرکەرانی کوردستانەوە، هەر بۆیە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق وەک هۆڤێکی هارو بە پیلانی لە داگیرکەرانەوە داڕێژراو کەوتووەتە پەلەقاژە بە هەموو سۆزییەوە کار دەکات بۆ پووچەڵ کردنەوەی هەوڵەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی لە یەکێتی نەتەوەیی و هەنگاو نان بەرەو سەربەخۆیی.

گومانی تێدانییە ئەم شەڕە، زیاتر پەردەی لە سەر ڕووی ڕەشی بە کرێگیراوانی PDK هەڵمالی و پەیوەندییە وابەستەییەکانیانی لە گەڵ تورکیادا ئاشکراتر کرد، ئەوەتانی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ میت و کۆنترای تورکیای فاشی، دام و دەزگای شەڕی ئاروای پارتی دیموکرات بە هێز دەکەن و بە ڕێوە دەبەن، ئەوانیش هەر وەکو میت و کۆنترا، شەڕی سایکۆلۆژی و شەڕی ئاروای خۆیان دژی کەسانی وولاتپارێز لە باشووری کوردستان بەڕێوە دەبەن. و لە لایەکی تریشەوە بە ڕۆژی ڕووناک و هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە دەوڵەتی تورکیا بە هانای هێزە بەزیوەکانی PDKوە هاتووەو هێزی هەوایی و زەمینی و جبەخانەی بۆ خستۆتە کارو بۆ ئەمەش داگیرکەری تورکیا بە هەموو شێوەیەک هەوڵ دەدات تاکو PDK بتوانێت ئەرکە مێژوویییە نۆکەرایەتییەکەی خۆی پێک بهێنێت ولە ئاست فەرمانبەرییەکانی خۆی دابێت لە دژی سەرکەوتنی شۆڕشی کوردستان. هەر بۆیە بەبەردەوامی لە ڕێی هەوایی «هەلیکوپتەر» و زەمینییەوە هێزی پیادەو جبەخانە لە تورکیاوە دەگاتە PDK و دانیشتوانی بارزان و ئانیشکیش شاهیدی ئەم کارەن.

ئەم شەڕە بۆ جەماوەری گەلی کوردستانی باش ڕوون کردەوە کە دۆست و دوژمنانی گەلی کوردستان کێن، وکێیە دوژمنانی گەلەکەمان بالکێشی خاکی کوردستان دەکات و زۆر بە گەرمی و شێلگیرییەوە دەیانگرێتە ئامێزو جەستەی خوێناوی ولاتەکەمان دەخاتە ژێر پۆستاڵی داگیرکەرانەوە ڕەنجی دەیان ساڵەی شەهیدە سەروەرەکانمان دەخاتە دەست داگیرکەرانی کوردستان و ئیمپریالیزمەوە.

### . جەماوەری خۆراگرو شەهید پەروەری کوردستان

### . چینە زەحمەتکێش و کەس و لایەنە وولاتپارێزەکان

### . لاوانی شۆڕشگێڕو قارەمانانی کوردستان، خوێندکاران و ڕۆشنبیران

ئەم شەڕە، شەڕی ئێوەیە دژی ئیمپریالیزم و داگیرکەران و ئەلقە لە گوێکانیان. چەندین ساڵە بنەماڵەی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق بەری ڕەنج و خوێنی ڕۆڵە بە شەرەفەکانی ئێوە دەخاتە دەست داگیرکەران، ئەوانەی خوێنیان داوەو دەر بەدەرو ماڵوێران و برسی بوون، تەنیا ئێوەن. ئەوانەی لە هەر سات و شوێنێکدا ڕەنج و خوێنی ئێوەیان فرۆشتووە بوونەتە ئاغاو خاوەن ڕەنجی ئێوە، ئەو بنەماڵەیەو بازرگانان و جاسوس و ئاژانە نێونەتەوەییەکانی ناو پارتی دیموکراتن. PKK ئەو شەڕەی لە پێناوی ئێوەدا دەست پێ کردووە لە پێناوی ئێوەشدا ئامادەیە لە تێکرای بەرژەوەندییە حیزبییەکانی خۆی بدات، و لەوانەیە لەم شەڕەدا PKK وەک بەرژەوەندی حیزبایەتی‌زیانیش

ببینێت، بەڵام ئێمە لەو بڕوایەداین بەم شەرە ئێوەی جەماوەری بە شەرەفی کوردستان، سەرجەم چین و توێژە زەحمەتکێش و شۆڕشگێڕەکان، ڵاوانی شۆڕشگێڕو عەشیرەتە ولاتپارێزەکان دەستکەوتی مێژوویی و نیشتمانیتان چنگ دەکەوێت. هەر لە بەر ئەم هۆیەیە، PKK هەر هەنگاوێکی شۆڕشگێڕی خۆی بە پێی بەرژەوەندییەکانی ئێوە هێلکاری دەکات. بۆ ئەمە پێویستە ئێوەش لەم شەڕەدا ڕۆڵی خۆتان بە هەموو شێوەیەکی ماددی وەمەعنەوی و کرداری ببینن، چونکە شەڕی گەل تەنها بە هێزی گەل و پشتیوانی گەل سەردەکەوێت. لە سەر هەموو لایەکمان پێویستە کە ئەرکی مێژوویی خۆمان لە ئاست ڕەوتی پێشکەوتنەکانی شەڕی شۆڕشگێڕی ئەمڕۆی گەلەکەمان جێبەجێ بکەین و کاری ئەمڕۆ نەخەینە سبەی. دەبێت گەلی کوردستان تاکو دوایی خاوەنداریتی لەم شەڕە بکات. لە بەر ئەوەی ئەم شەڕە چارەنووس سازە و گشت کێشە مێژووییەکان یەکالا دەکاتەوەو بە قازانجی گەل دەیانشکێنێتەوە.

لێرەدا بانگەوازی پێشمەرگەکانی ئەم پارتە دەکەین کە دەست لەو شەڕە وەیشومەیە هەڵبگرن کە خزمەت بە داگیرکەران دەکات و چیتر خوێنی خۆیان نەکەنە قوربانی ئەو بنەماڵە خائینە، و لوولەی چەکی خۆیان ئاراستەی سنگی سەرکردە خائینەکەیان بکەن و ئیدی کاتی ئەوە هاتووە کە لە ناو ڕیزی گەل و شۆڕشی سەربەخۆیی کوردستاندا جێی خۆیان بگرن.

هەروەها بانگەوازی هەموو ئەو پارت و گرووپ و لایەنانە دەکەین کە بانگەشەی شۆڕشگێری و وولاتپارێزی و سەربەخۆیی دەکەن؛ لە بەرامبەرراستییەکانی مێژوو وشەڕی داگیرکەران و پاشڤەرۆییدا بێ دەنگ نەمێنن و ببنە خاوەن هەڵوێستێکی ڕادیکاڵی و شۆڕشگێڕانە، و لە دژی سەرجەم پیلان و کۆمپلۆکانی داگیرکەران و دوژمنانی گەلەکەمان ڕابوەستن. ئەمڕۆ لە هەر ڕۆژێکی دی زیاتر پێویستە گەلەکەمان و لایەنە وولاتپارێزو شۆڕشگێڕەکان لە دژی دوژمنانی گەل و شۆڕش، ڕیزەکانی خۆیان بێ سێ و دوو یەکبخەن بۆ هەنگاو نان بەرەو دوا سەرکەوتن و پێکهێنانی ئامانجی گەل لە سەربەخۆیی و ئازادیدا.

**. مردن و سەرشۆڕی بۆ داگیرکەران ونۆکەرە مێژووییەکانیان!**

**. سەرکەوێ شەڕی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان لە پێناوی سەربەخۆیی و ئازادی و یەکگرتنەوەدا!**

**. بژی *PKK*,*ARGK*, *ERNK*!**

**. سەروەری و نەمری بۆ شەهیدانی ڕێ ی سەربەخۆیی وسەرجەم مرۆڤایەتی!**

**. بژی سەرۆکی نەتەوەییمان ، سەرۆک *APO*!**

۱۹۹٥/۹/۷

**پارتی کرێکارانی کوردستان PKK**

**نوێنەرایەتی باشوور**

« بە سەربەستی بـژیم بەکۆیلەیی ناژیم »

ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لە کوردستان
هەولێر ـ شەقامی زانکۆ
ت :

KURDISH HUMAN RIGHTS ORGANIZATI
( K. H. R. O. )
Zanko Str. ARBIL, IRAQ
Tel :

بەیاننامەی ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لە کوردستان ـ لقی هەولێر ـ سەبارەت بە هەوڵی تیرۆرستان
بۆ سەر سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بەڕێز / کاک کۆسرەت .

ئەی کۆمەڵانی بەشەرەفی خەڵکی کوردستان

ئەی مرۆڤ دۆستان

ئەی دەنگی نارەزایی دژ بە تیرۆرستان

وا جارێکی تریش تیرۆرستان هەوڵ دەدەن دەستی ڕەش و چەپەڵی خۆیان سوور بکەن بە خوێنی نیشتمان پەروەران و دڵسۆزانی میللەتە ستەمدیدەکەمان ئەمەش لە کاتێکدا دەکرێت کەوا خەریکە هەواڵی ئاشتیخوازانو خەم لۆری گەلە مافزەوتکراوەکەمان بێتە بەرهەم لە ڕێگەی ڕێککەوتننامەی دبلنندا .

دیارە ئەم کارە تیرۆرستیانە دژ بە ئاسایی ترین مافەکانی مرۆڤ و یاساو داب و نەریت و هەستی نیشتمان پەروەرین وە لەکرداری دوژمنانی گەلی کوردە، ئەو دانەی کە نایانەوێت دەستکەوتە مەزنەکانی ئەم گەلە مافخوراوە بەردەوام بێت، ئەگەر نا ئەی چۆن هەوڵی تیرۆرکردنی کوڕێکی دڵسۆزو نیشتمان پەروەری وەک کاک کۆسرەت ڕەسول علی ـ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ لێک دەدرێتەوە لەم بارو دۆخە ناسکەی کە میللەتەکەمان پێی دا تێپەڕدەبێت .

ئێمە وەک ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لە کوردستان ـ لقی هەولێر ـ بە توندی نارەزایی خۆمان دەردەبڕین بەرامبەر بە ئەنجامدانی ئەم کارە تیرۆرستیە وە بەڵێنی ئەوە دەدەین کە هەرکاتێک ئەنجام دەرانی ئەم کارە تیرۆرستیەمان بۆ ئاشکرا بێت لەژێر هەر پەردەو پارتێک بێت ئەوا بە توندی ڕیسوایان دەکەین لەسەر ئاستی ناوخۆو دەرەکیدا .

بەرز بێ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بۆ پاراستنی یاساو بنەماکانی مافی مرۆڤ و بنبڕکردنی بەکبارەکی تیرۆرستان.

ڕێکخراوی مافی مرۆڤ لە کوردستان
لقی هەولێر
١٩٩٥/٦/٨

یەکێتیی نیشتمانیی
کوردستان
مەلبەندی ١ی ڕێکخستنی شارەزوور

ژمارە: ١٩٠١
بەروار: ١٢/ ٩ / ١٩٩٥

بۆ/ حزبی سۆشیالستی دیموکراتی کوردستان / لقی شارەزووری بەڕێز

سلاوێکی گەرم

بابەت/ چارەسەرکردنی کێشە

ئاماژە بە نووسراوی کومیتەی ڕێکخستنی پێنجوێن ژمارە ( ٥٢٤ ) لە بەرواری ١٢ / ٩ / ١٩٩٥ کە ئاگاداریان کردووین . لەسەر زنی (کانی سێف ) نوختەیەکی بەڕێزتانی لێیە کە لەبەر سراوی نوختەکەکان ((صالح ڕەشە )) زیاتر لە (٢٠٠ ) دووسەد وولاخ دارکار دەکەن لەوێ . زۆری ئەو وولاخ دارانە سەر بە ڕێکخستنەکانی ئێمەیە ناوبراو بە شێوەیەکی خراپ هەلسوکەوتیان لەگەڵ دەکات، مەرەی ئەوەش تەمەی نابەجێ بە (ن . ن . ن ) ئەڵێت . جا پێمان باشە بەڕێزتان بانگی بکەن و ڕێنمایی بکەن بۆ ئەوەی ئەو کارانەی ئەونە بێتە هۆی کارێکی خراپ لەسەر سەرزەکە ..

لەگەڵ ڕێزمان دا

مەلبەندی ١ی شارەزوور
ڕێکخستنی ١ی شارەزوور

و/ ١ـ بەشی پەیوەندییەکان .
٢ـ ک . ر . پێنجوێن ئاماژە بە نووسراوی
سەرەوەتان بۆ ئاگاداری تکایە .

## بروتوكول تعاون مشترك

احساسا منا بالمسؤولية التاريخية الملقاة على عاتقنا ، ومن منطلق الواجب الوطني والقومي ، وبعد تناول الواقع الراهن بكل تشعباته وتطوراته ومناقشة ظروف وضرورات مستلزمات هذه المرحلة التاريخية الحساسة وتقييم السياسات الداخلية والخارجية المؤثرة في القضية الكردية .

ولأهمية التعرف على هذه المرحلة واجتيازها بنجاح وبناء صورة للتعايش السلمي والسياسي على اسس وثوابت وطنية وديمقراطية، ولايماننا الراسخ بارادة الشعب الكردي . وقع حزبانا . حزب العمال الكردستاني ( PKK ) .والحزب الاشتراكي الديمقراطي الكردستاني ( حسدك ) وبروتوكول تعاون ثنائي وتضمن النقاط التالية :

١ ـ العلاقة بين الحزبين الشقيقين مبنية على اسس وطنية تصب في خدمة الكرد .

٢ ـ التنسيق الكامل في جميع المجالات السياسية . الاعلامية ، الاقتصادية .

٣ ـ التعاون الكامل في مجال فتح مراكز للتدريب العسكري .

٤ ـ يستفيد الطرفان من المقرات التابعة لكل منهما في كردستان والخارج .

٥ ـ الحفاظ على العلاقة الايجابية للحزبين مع الدول المجاورة ( الجمهورية العربية السورية و الجمهورية الاسلامية الايرانية ) .

٦ ـ يقف الحزبان ضد جميع العلاقات المبنية على أساس معاداة الشعب الكردي .

٧ ـ ينظر ( PKK ) الى الحزب الاشتراكي الديمقراطي الكردستاني على انه حزب مناضل من أجل الشعب الكردي خلال / ٢٠ / سنة الماضية .

٨ ـ ينظر ( حسدك ) الى حزب العمال الكردستاني ( PKK ) على انه حزب مناضل وأصيل يتمتع بقاعدة جماهيرية واسعة في كردستان .

٩ ـ يقوم حزب العمال الكردستاني ( PKK ) بمنح مساعدات مالية واعلامية وبدعم الحزب الاشتراكي الديمقراطي الكردستاني في المجالات السياسية .

١٠ ـ يبذل الطرفان جهودا مشتركة لأجل استتباب الأمن والسلام وحل المشاكل العالقة عن طريق المفاوضات والمناقشات في اطار المؤتمر الوطني الكردستاني

## پرۆتۆكۆلی هاوكاری هاوبەش

بەلەبەرچاوگرتنی ئەوبەرپرسیاریەتیە مێژوییەی لەئەستۆماندایەو لەروانگەی ئەركی نیشتمانی ونەتەوەییەوە وەپاش ئەو واقیعەی كەئێستا هەیە بەهەموو پەرەسەندنەكانیەوە وەوتووێژكردنی باروتۆخ و پێویستیەكانی ئەم قۆناغە مێژوییە هەستیارە و هەڵسەنگاندنی سیاسەتەكانی ناوخۆ و دەرەوە و كاریگەرەكانی سەر كێشەی كوردی .وەلەبەر گرنگی ناسینی ئەم قۆناغەو تێپەراندنی بەسەركەوتوانەو بنیادنانی وێنەی هاوژیانی ئاشتیانەو سیاسی لەسەر بنەماو نەگۆرە نیشتمانی و دیموكراتیەكان وەباوەربونمان بەئیرادەی گەلی كوردمان، پارتی كرێكارانی كوردستان (پەكەكە) لەگەڵ حزبی سۆسیالیست دیموكراتی كوردستان (حسدك) پرۆتۆكۆلی هاوكاری دوو لایەنەیان واژوو كرد كەلەم خاڵانە پێكهاتووە :

١–پەیوەندی نێوان دووپارتی برا لەسەر بنەمای نیشتمانی و خزمەتی كوردا بنیاد بنرێت .

٢–هەماهەنگی تەواو هەبێت لەسەرجەم بوارەكانی سیاسی و راگەیاندن و ئابوریدا.

٣–هاوكاری تەواو هەبێت لەبواری كردنەوەی مەڵبەندەكانی مەشقی سەربازی .

٤–هەردوولا سود لەبارەگاكانی یەكتر وەربگرن لەناو كوردستان و دەرەوەشدا .

٥–پەیوەندی پێزەتیڤی ولاّتانی دراوسێ بپارێزن (كۆماری عەرەبی سوریاو كۆماری ئیسلامی ئێران ).

٦–هەردوو حزب دژی ئەو پەیوەندیانە بن كەلەسەر بنەمای دژایەتی كردنی گەلی كوردە .

٧–(پەكەكە) تێروانینی بۆ حزبی سۆسیالیست دیموكراتی كوردستان ئەوە بێت كەلە(٢٠) ساڵی رابردوودا پارتێكی تێكۆشەربووە لەپێناو گەلی كوردا .

٨–(حسدك) تێروانینی بۆ پارتی كرێكارانی كوردستان (پەكەكە) ئەوە بێت كەپارتێكی تێكۆشەرەو بنكەیەكی جەماوەری بەرفراوانی هەیە لەكوردستاندا .

٩–پارتی كرێكارانی كوردستان (پەكەكە) هەڵدەستێت بەیارمەتیدانی مادی و راگەیاندنی و پشتگیری حزبی سۆسیالیست دەكات لەبواری سیاسی دا .

١٠–هەردوولا هەوڵەكانیان دەخەنە گەر لەپێناو بەرقەراربونی ئاسایش و ئاشتی و چارەسەر كردنی كێشە هەڵپەسێردراوەكان لەرێگای وتووێژو راوێژكاری لەچوارچێوەی كۆنگرەی نیشتمانی كوردستان .

١١–هەردوولا تێدەكۆشن لەپێناو بنیادنانی بەرەیەكی نیشتمانی دیموكراتی و فیدراڵی لەكوردستانی باشوردا .

| | |
|---|---|
| عەبدوڵا ئۆج ئالان | محمدحاجی محمود |
| سكرتێری گشتی پارتی كرێكارانی | سكرتێری گشتی حزبی سۆسیالیست |
| كوردستان (پەكەكە) | دیموكراتی كوردستان |

١٥–١٠–١٩٩٥

به ناوی خوای به خشنده و میهره بان

باریزگـــای سلیمانـــی — ژماره / ٨٠ / ١٧٧١
کارگیری خوجیتی — به رواز / ٢٨ / ١١ / ١٩٩٥ ز

مولکایه تــی — بو / به ریوه به رایه تی ناحیه ی عه ربه ت
بابه ت / کــری خانـــوو

---

خانوی ژماره (٣٦) ی عه ربه ت که سه ر به کارگیری خوجیتهانه له کانونی دووه می سالی ١٩٩٢ وه که حیزبی سوشیالیستـــی کوردستان تیایدا نیشته جی بووه تائیستا کریان نه داوه •
داوا کارین به زوترین کات ئاگادار بکریته وه بو دانی ئه و باره یـه که لایانه به هوی نزیک بوونه وه ی سه ری سال له گه ل ریزماندا •

شیرکو احمد فتاح
یاریده ده ری باریزگاری سلیمانی
/ ١١ / ١٩٩٥ ز

وینه یه ک بو /

---

حیزبی سوشیالیستی کوردستان تکی شاره زور بو کاری بیویست له گه ل ریزماندا
به ریوه به رایه تی مولکایه تی /

رزگار / ١٢ / ١١

٠٦٢٩٧

هەرێمی کوردستان

وەزارەتی تەندروستی و کاروباری کۆمەڵایەتی
فەرمانگەی تەندروستی پارێزگای سلێمانی
هۆیە : راگەیاندن

ژمارە /
بەروار / ١ / ١١ / ١٩٩٥

---

بۆ / بەڕێز تەلەفزیۆنی سۆشیالیست ـ کەنالی سلیمانی
بابەت / بەرنامەی زەنگ

وێڕای سڵاو .......

بەڕێزتان ئاگادار ئەکەین کە لەبەرنامەی (زەنگ) دا چاوپێکەوتن لەگەڵ خێزانێکی هەژاردا کراوەو داوا لەهاووڵاتیان کراوە یارمەتی ئەو خێزانە بدەن چونکە سەرۆکی خێزانەکە تووشی نەخۆشی سیل بووەو ئیتر چاک نابێتەوە کەئەمە .. خۆی لەخۆیدا هەڵەیەکی زانستی گەورەیەو نیشانەی بێ ئاگاییە چونکە نەخۆشی سیل ئێستا چارەسەری هەیەو مەڵبەندی چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی سیل بەو پەڕی چالاکی بووە لەخزمەتی هاووڵاتیاندایەو داو دەرمان و کەرەستەی پزیشکی بەئاسانی تیادەست ئەکەوێ .. جا بۆ چاک کردنەوەی ئەم هەڵەیەو بۆ بەفیڕۆنەچوونی ڕەنج و ماندووبوونی پزیشکان و کارمەندە بەڕێزەکانی ئەو مەڵبەندەو بۆ ئارام کردنەوەی خێزانەکەو تێکڕای هاووڵاتیان داواتان لێ ئەکەین لەکاتی بەرنامەوە تێبینی بەهەڵەکە چاک بکرێت و داوای لێبوردنیش لەمەڵبەندی قەلاچۆکردنی نەخۆشیەکانی سنگ بکرێ لەگەڵ ڕێزدا ..

د. نەوزاد سالح رەفعەت
بەڕێوەبەری گشتی
١٥ / ١١ / ١٩٩٥

وێنەیەک بۆ //

---

ـ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان ـ کەنالی سلێمانی
ـ تەلەفزیۆنی ئازادی ـ کەنالی سلیمانی
ـ راگەیاندن ..

حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان
دەزگای ڕاگەیاندن
بەرنامەی زەنگ

ژمارە/ ت
بەروار/ ١٨/ ١١/ ١٩٩٥

بۆ بەڕێز/ فەرمانگەی تەندروستی پارێزگای سلێمانی
(بەشی ڕاگەیاندن)

بابەت/ وەڵامی نووسراوتان ژمارە (٥٦٦٧)

سڵاو و ڕێزی بەرنامەی زەنگ

بۆ وەڵامی نووسراوی بەڕێزتان ژمارە (٥٦٦٧) لە ١٥/ ١١/ ١٩٩٥ ئاگادارتان ئەکەین کە بەرنامەکەمان بێ بەریبە لەو ڕەخنەیەی خراوەتە پاڵی، وە دەمانەوێ کە ئێوەی بەڕێز ڕەچاوی ئەم خاڵانەی لای خوارەوە بکەن :

١- ئێمە وەک هەوارێکی کە پارەی عیلاجی نییە ئەو چاوپێکەوتنەمان لەگەڵ ئەو نەخۆشەدا کردووە .
٢- لەو چاوپێکەوتنەدا ووشەی (لێرە چارەسەر دەکرێت) مان بەکارهێناوە هیوا دارین لەم هەفتەیەدا بە شێوەیەکی ورد بینتر تەماشای دەقی ئەو چاوپێکەوتنە بکەنەوە .
٣- بەرنامەی زەنگ بۆ هەوار و لێقەوماوانی کوردستانە بێ جیاوازی .
٤- حەزمان دەکرد دەزگاکەتان دەزگای ڕاگەیاندن هەر ئەبوایە یەک جاریش سوپاس نامەیەکی بناردایە بۆمان کە توانیومانە لە ١/ ٧ - ١/ ١٠/ ١٩٩٥ نزیکەی (١٦) نەشتەرگەری و کۆمەک بۆ ناردنی نەخۆش بۆ بەغداد کڕینی دەرمان و خوێن بۆ هەواران ئەنجام بدەین جگە لە خواردن .
٥- ئەمجارەش ورد تر بۆ بەرنامەکە بڕوانن و دەمانەوێ دەزگای ڕاگەیاندنتان داوای لێبووردن لە بەرنامەی زەنگ بکات .

لەگەڵ ڕێزماندا

بەختیار کوردی
بەڕێوەبەری بەرنامەی زەنگ

وێنەیەک بۆ/
ئەنجومەنی گەلی کوردستان - کەنالی سلێمانی
ئەنجومەنی ئازادی - کەنالی سلێمانی
ئەرشیفی تایبەت .

هەرێمی کوردستان                                                    ژمارە /

پارێزگای سلێمانی

( کارگێری گشتی )                                                    بەروار / ٧ /١٢/ ١٩٩٥

---

بۆ / حزبی سۆشیالیستی کوردستان / لقی شارەزوور

بابەت / ڕێگای یاسایی

---

بەپێی زانیاریمان هاوولاتی ( سالم سالم ڕشید ) کێشەیەکی هەیە لەگەڵ هاوولاتیان ( حاجی صالح محمد / یوسف حاجی عبدالله / حاجی عبداللە محمد ) لەباتی ئەوەی ڕێگای شوولی و یاسایی بگرێت چووە شکاتی لێ کردوون لای ( کومیتەی ناوچەی شارەزوور )ی سەر بە حزبەکەتان ئەوانیش بەمسوولەی ئاگادار کردنەوە ( تبلیغ )یان بۆ ناردوون بەسە ئامادە بوونیان لایان ڕۆژی ( ٣/١٢/١٩٩٥ ) ئەم ڕەفتارەش لە ڕۆڵی دەزگا دەوڵەتیەکان کەم ئەکاتەوە کە هەمیشە لەخزمەتی هاوولاتیاندان ئێمەش بە هیچ شێوەیەک ڕێگا نادەین کەس بۆ بارەگاکانی پاشگە بگرێت لەباتی گرتنی ڕێگا شوولی و یاسایی . تکایە کاری پێویست بکەن بەدووبارە نەبوونەوەی بۆ ئەوەی هاوولاتیان فێر بکەن لەسەری ( یاسادا ) کێشەکانیان چارەسەر بکەن - لەگەڵ ڕێزدا .

سالار عزیز اسماعیل

پارێزگاری سلێمانی

١٩٩٥ /١٢/

وێنەی بۆ :-

---

- حزبی سۆشیالیستی کوردستان / کومیتەی ناوچەی شارەزوور / بۆ هەمان مەبەست لەگەڵ ڕێزدا .

پارتی دیموکراتی کوردستان ـ یەکگرتوو
قیادەی مەیدانی کەرکووک سلێمانی

ژمارە / ١١٩٨
ڕۆژ/ ١٢/ ١٢/ ١٩٩٥

بۆ/ کۆمیتەی پارێزگای کەرکوك و سلێمانی
حزبی سۆشیالیست دیموکراتی کوردستان بەڕێز

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

لەبەر ئەوەی لەم کاتەدا ڕووداوەکان بەپەلە بەرەوە ئەچێت، بە پێویستی ئەزانین لەسەر ئەم ڕووداوانە ئاڵوگۆڕی بیر و ڕاکان بکەین و لە هەڵوێستی پارتیمان لەسەر ڕووداوەکان ئاگادارتان بکەینەوە، پێویستمان باشە کە بەڕێزتان لەسەر ئاستی لێپرسراوانی حزبە تێکۆشەرەکەتان لە هەردوو پارێزگای کەرکوك و سلێمانی وەفدێك بنێرنە لامان بۆ ئەو مەبەستە و ئیمەش لەڕۆژی ( ١٨/١٢/١٩٩٥ ) لە بارەگای ( ق٠م٠ك٠س ) چاوەڕوانی وەفدی بەڕێزتان ئەکەین، داوای سەرکەوتنتان بۆ ئەکەین.

ئیتر بۆ پێشەوە

نووری حمە علی

ح/ ق٠م٠ك٠س

وێنەیەك بۆ/

ـ م٠ بەڕێوەبەری نیشتمانیەکانی ( لقی ٣ و ٤ و ١٢ )
بۆ ئامادەبوونی نوێنەرتان لە کات و شوێنی دیاری کراو.

ـ فایلی گشتی.

برا گیان کاک حەمە بەرز

سلاوێکی گەرم

شادی و خۆشیتانم داوایە.

١- دەربارەی کۆنگرە قسەکەی جەنابت راستە. ٦٠٪ بۆ حکومەتی هەرێم و ئەوی تریش شێوەی بۆ سوشیالست و شێوەی بۆ بزوتنەوە.
پارتی هەقی نەبێت. بابراهیم خەلیل بەس بێت!!
بەتایبەتی کە حکومەتی هەرێم لە موزدر یارمەتی هەردوولاشتان دەدا!
گەر وانە بێت ئێمە ئەوەندە کۆنگرە زیاد دەکەین کەس تێیبەر نەکات!!

٢- ئێوە خۆتان لە بزوتنەوە نزیک بکەنەوە بەتایبەتی لەگەل پارتی ساردن. ئیمان بلێین ئەمە یە حقیقەتی پارتی. چاوی ی.ن.ک ی لێوە دیار نەبێت کەس ناهیلێت

٣- دەستانێکی شەر لەلایەن یەکەوە بە پرسوراوی ئێمەش بووە. پیمان باشە. بەلام پارتی دەیەوی بۆ ١٥ / رۆژ بێت
لە دوایەدا مامەلەی پێوە دەکات لەگەل تورک. شەرخەکەی باشترا بوو شەر دەکاتەوە. کەم بوو نەشەر نەئاشتی!

٤- سوریاش هەر سەفەری کوردی ئی ناخۆش. وا دیارە لە نێوان سوریە و ئێران دا تەنسیق هەیە!

٥- بە ئێرانیەکان بلێ: ئەتوانن خۆشیان لەگەل ی.ن.ک باسی مەسەلەی تەویلەکێکان دەکەن وە مەسەرەوە شمارەی ئێمەیە.

سلاوم هەیە بۆ هەموان
وە هەر تێر بە بۆ

براد لسۆزتان
مام جەلال

کەمال جوالدان

١٩٩٥/١٢/١٣

P.U.K

یەکێتی نیشتمانی کوردستان
مەڵبەندی (١) ی ڕێکخستنی سلێمانی

ژمارە /
ڕۆژ / / ١٩٩

بۆ برای خۆشەویستم بەڕێز کاک محمد

سڵاوێکی گەرم

بە هیوای خۆشی و شادیتانم و بەگەرمی هەواڵتان ئەپرسم.

نامەکەت گەیشت زۆر سوپاس بۆ هەوڵ و کۆششە دڵسۆزانەکەتان
ئەوا ناوی ئەو (٥) پێنج کەسەتان بۆ ئەنێرین کە لای برادەرانی
پارتی گیراون کە داوای بەردانیان ئەکەین لە بری ئەوانەی
کە ئێوە داوایانتان کردووە. دیارە ئێمە لەم چەند ڕۆژە
مامۆستا ئەمینی سەرکردایەتی پارتیمان بەردا بۆ ئەوەی
ئەوان عەلی چەلەبی بەربدەن کەچی جێ بەجێیان نەکرد
ئێستاش بە نیازین اسعد قادر بەربدەین هەروەها وایە
ئیتر ئەوانیش عەلی چەلەبی بەربدەن

١) علی عزیز سعید ناسراو بە علی چلبی
٢) جلال محمد علی ناسراو بە جلال سیرەمێرگی
٣) ڕزگار احمد قادر ناسراو بە ڕەزاوم
٤) نجم الدین اسماعیل باز
٥) انور رضا معروف

لێپرسراوی مەڵبەند
١٩٩٦/١/٨

عەلی مەحمود

هەوریزی

بەیاننامەیەك بە بۆنەی شەهید بوونی هەڤاڵی تێکۆشەر کاك سەلام ڕووف ئەندامی

کۆمیتەی ناوەندی حزبمان

جەماوەری بەشەرەفمەندی گەلی شۆڕشگێڕو بەئەمەگی کوردستان ، پێشمەرگە قارەمانەکانی
حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان .

کێ لە ئێوە ئاگای لە بیست ساڵ خەباتی بێ وچانی حزبە تێکۆشەرەکەتان نییە؟ کە هەزاران
شەهیدو قوربانی دان وسەدان داستان و ئەبەردو فیداکاری هێمای سەروەری بەتی ، دوای
ئەوەی کە کورد لە کوردستانی باشوور بۆ یەکەم جار بووە خاوەنی حکومەت و پەرلەمانی خۆی
کە ئەمە بەری ڕەنج و تێکۆشانی ئێوەی گەل بەگەل و زەحمەتکێش و حزبی سۆسیالیستی
دیموکراتی کوردستان و لایەنە سیاسییەکانی دیکەی سەر گۆڕەپانی خەباتە ، هەرچەندە
حزبی ئێمە وازی لە هەموو بەرژەوەندییەکی تەنگەبەری حزبایەتی هێناوە ، بەڵام مەخابن دوای
پێنج ساڵ ئازادی و حوکمی کورد لە کوردستانی فیدراڵدا تیرۆریستان دوژمنانی حزبی
شەهیدان بۆ چوارەم جارە دوای شەهید کردنی هەڤاڵی سەرکردە خالە حاجی و تێکۆشەرانی
ڕەوان شەهید جەمالی حەلاوو شەهید عبدالملك لە ناوجەرگەی شاری سلێمانی بەبەر چاوی
جەماوەرو لە کاتژمێر ٥ ی ١ پاش نیوەڕۆ بێ گوێدانە هیچ داب و نەریتێکی کوردانەو سل کردنەوە
لە دەزگاکانی حکومەتی هەرێم دەستێکی ڕەشی تیرۆریستان دوژمنانی گەل و شۆڕش شالاو
دەبەنە سەر هەڤاڵ سەلام ڕووف ناسراو بە سەلامە سوور ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبمان و
شەهیدی دەکەن لەگەڵ دوو پێشمەرگەی دا کە بریندار دەبن لە کاتی پەلاماری گورگەکاندا
هاوولاتییەك بە ناوی محمد سلام شەهید دەبێت ، کە هەڤاڵ سەلام پێشمەرگەیەکی دێرینی
حزبمان و تێکۆشەرێکی ناسراوی جەرگەی خەباتە هەڤاڵ سەلام لە .

١- ساڵی ١٩٦٥ لە گوندی موغاخ سەر بە ناوچەی سورداش لە خێزانێکی هەژاردا لەدایکبووە .

٢- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی خوێندووە .

٣- ساڵی ١٩٧٩ پەیوەندی کردووە بە ڕێکخستنەکانی حزبمانەوە لە ناوچەی دووکان
لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ دەبێتە پێشمەرگە لە هەرێمی ٤ .

٤- لە ساڵی ١٩٨١ لە شەڕێکی دەستەویەخەی نابەرانبەردا بریندار دەبێ و بەدیل دەگیرێت
لەلایەن ڕژێمی فاشی لەعسدا بە زیندانی هەتاهەتایی ( مؤبد) حوکم دەدرێت تا ساڵە
٢١ / ٩ / ١٩٨٨ پاش ٧ ساڵ زیندانی بە لێبوردنی گشتی ئازاد دەکرێت پاشان ڕاستەوخۆ پەیوەندی
دەکاتەوە بە ڕێکخستنەکانی حزبمانەوە لە ناوچەی دوکان پاشان دەکرێتە ئەندامی ناوچە لە
خەباتی نهێنی بەردەوام دەبێت تا ڕاپەڕینە مێژووییەکەی ١٩٩١ کە جوامێرانەو شێرانە
بەشداری دەکات لە ئازادکردنی دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمی بەعس و هوشیارانە خەباتی
خۆی درێژە پێ دەدات لە ڕیزەکانی حزبماندا و سەرکەوتنە پلەکانی حزبایەتی دەبڕێت و ڕۆڵێکی
گرنگی دەبێت لە ڕێکخستنەوەی حزب دوای بەیاننامە مێژووییەکەی ٦ / ٩ / ١٩٩٣ لەو دەمەدا دەبێتە
کارگێری لقی سلێمانی لە بەشی ڕێکخستن تا لە کۆنگرەی حزب لە ١٥ / ١١ / ١٩٩٤ شەرەفی
ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پێ دەبڕێت وەلە پاش کۆنگرە لەبەر چالاکی دەبێتە لێپرسراوی لقی
کەرکوکی حزبمان لە پاشان لەبەر لێهاتوویی دەبێتە لێپرسراوی مەکتەبی ڕێکخستنی ناوەندی
تا لە بەرواری ١٢ / ٢ / ١٩٩٦ شەهید دەکرێت لەلایەن تیرۆریستانەوە .

بۆ / لقی شارەزووری حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان
ب / ئاگادارکردن هاوپەیمانی بەڕێز

سلاوێکی گەرم /

هەڤالانی بەڕێز / لەلایەن بنکەی گومرگی ( دەرەمەر ) کە لە گامێشتەپەن ·
ئاگادارکراین کەبرادەرانی لای ئێوە کەلەو بنکەیەدایە سەیتەرەیان داناوە ·
لە هەر باریەک کە دێت مەبلەغی ( ١٠٠ ) سەد دینار دەسێنن واتە دووجار
گومرگە دەکرێن لای خۆتانەوە ئاگاداریان بکەن لەو بارەیەوە
هەر سەرکەوتوو بن ...

و / بەشی پەیوەندیەکان ·

راگەیەندراوی دەفتەری سیاسیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

# دیسان تیرور و دیسان جینایەت

گەلانی بەشەرەفی ئێران!

خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان!

کۆڕ و کۆمەڵە جیهانی یەکان!

ڕۆژی یەکشەممە ٢٧ی ڕەشەمەی ١٣٧٤ (١٧ی مارسی ١٩٩٦) لە کاتێک دا ژمارەیەک لە ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ئوردووگای «جێژنیکان» لە نزیک شاری هەولێری کوردستانی عیراق خەریکی یاریی فووتباڵ بوون و ژمارەیەکی زۆرتریش بۆ تەماشای یاری یەکە کۆببوونەوە، لە لایەن چەند تیرۆریستێکی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە کە بە سواری وانێت بارێکی تۆیۆتا بە لایان دا تێ پەڕین، درانە بەر دەسڕێژ و لە ئاکام دا ئەندامێکی لەمێژینەی حیزب بە ناوی «فەرامەرز کشوری» کە ڕۆڵەیەکی ئازەربایجانی بوو شەهید کرا و هەشت کەسی دیکەش بریندار بوون و ڕەوانەی نەخۆشخانەکانی هەولێر کران. بەداخەوە لە نەخۆشخانەی هەولێر سێ کەس لەو بریندارانەش بە ناوەکانی «طاهر عزیزی»، «عثمان رحیمی» و «محسن ابراهیم زادە» کە برینەکانیان سەنگین بوو، شەهید بوون.

ڕێژیمی تیرۆریست پەروەری کۆماری ئیسلامی لە حاڵێک دا ئەو جینایەتە بە دژی خەڵکی بێدیفاع و بێ چەک دەخوڵقێنێ، کە هەمووی چوار ڕۆژە دادستانی یەکێک لە وڵاتانی موعتەبەری دنیا بە تاوانی تیرۆری «دکتور شەرەفکەندی» سکرتێری گشتیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و هاوڕێیانی حوکمی نێونەتەوەیی گرتنی بۆ «علی فلاحیان» وەزیری دەزگای جاسووسیی ئەو ڕێژیمە دەرکردووە و لە کاتێک دا ڕووی دزێوی خۆی باشتر بۆ خەڵکی دنیا دەردەخا کە ڕیاکارانە ئیدیعا دەکا هیچ پێوەندیی یەکی بە تیرۆریزمەوە نیە و بۆ خۆی یەکێک لە قوربانیانی تیرۆریزمە.

هەرچی ڕۆژگار ڕادەبرێ باشتر دەردەکەوێ کە تیرۆریزم و ئینسانکوژی سرووشتێکی جیا نەکراو لە نێوەرۆکی کۆماری ئیسلامی یە و هەتا ئەو ڕێژیمە لەسەر کاربێ خەڵکی ئێران و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و تەنانەت سەرانسەری دنیاش لە چنگی شوێنەوارەکانی ئەو کردەوە پڕشەڕ و شوومەی بە ڕزگاریان نابێ. ئەم تیرۆرە لە ڕاستی دا وشیار کردنەوەیە کە بۆ ئەو هێز و لایەنانە کە ئێستاش بێهوودە هەوڵ دەدەن لە ڕێگای دیالۆگی ڕەخنە گرانەوە کۆماری ئیسلامی بێننە سەر ڕێگای ئەقڵ و مەنتیق و حورمەت دانان بۆ قانوون و ڕێ و شوێنەکانی جێگای پەسندی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی.

جێگای خۆشحاڵی ئەوەیە کە هەر بەدوای ئەنجامدانی ئەو کردەوە جینایەتکارانەیە دا تیرۆریستەکان لە لایەن پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان ـ یەکگرتووەوە گیراون و ڕەوانەی زیندان کراون. ئەگەرچی تا ئێستا ژمارە و ناو و ناسنامەی پیاوکوژەکان بۆ ئێمە ڕوون نیە، بەڵام ڕێز بۆ وشیاری و هەستی بەرپرسایەتیی ئەو پێشمەرگانە دادەنێین کە تیرۆریستەکانیان گرتوە و بە جیدیش لە ڕێبەرایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستان داوا دەکەین ئەو جینایەتکارانە هەرکەس بن و سەر بە هەر جێگایەک بن بە خەڵکی کوردستان بناسێنێ و بە سزای خەیانەتی خۆیانیان بگەیەنێ. گومان لەوە دانیە کە ئەو پیاوکوژانە لە هەر کوێ یەکەوە دەستووری ئەنجامدانی ئەو کارە پڕ شوورەیی یەیان پێ درابێ، یەکەمین فەرمان و ڕێ نوێنی یان لە لایەن دەزگای جاسووسیی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە پێ دراوە. هەر بۆیە پێویستە وەک هەنگاوێکی ئازایانە و شۆڕشگێڕانە ئەوانە سزای شیاوی کردەوەکەیان وەربگرن تا بەم جۆرە پێش بە دووپات بوونەوەی کردەوەکانی دەزگای جاسووسی و جینایەتی ڕێژیمی ئیسلامی بگیرێ.

ئێمە لە کاتێک دا ڕق و بێزاریمان بەرامبەر بەو کردەوە دڕندانەیەی کۆماری ئیسلامی دەردەبڕین، بە دڵەوە سەرەخۆشی لە کەس و کاری شەهیدەکان و هاوڕێ و هاوسەنگەرەکانیان دەکەین و سلامەتی و چاک بوونەوەی زووتر بۆ بریندارەکان بە ئاوات دەخوازین. هەر لەو کاتەدا چاوەڕوانیمان لە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی عیراق هەیە ئەو جۆرە کردەوانە مەحکووم بکەن و سنوورێک بۆ ڕەبازێنی بەکرێگیراوەکانی کۆماری ئیسلامی لە وڵاتەکەیان دا دابنێن.

شایانی باسە هەر سێ ڕۆژ پێشتریش لایەنگرێکی کۆمەڵە لە شاری سلێمانی کەوتە بەر دەسڕێژی چەکاوخۆرەکانی ڕێژیمی ئیسلامی و شەهید کرا. هیواداریین ئەو زنجیرە تیرۆرە و تاوانە بێتە مایەی ئەوە کە کۆڕ و کۆمەڵە جیهانی یەکان و کاربەدەستە دەوڵەتی یەکانی وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداری لە جیهان دا هەر جۆرە گومان و دوو دڵی یەک سەبارەت بە ئیمکانی ئاڵ و گۆڕ لە کردار و ڕەفتاری ڕێژیمی ئیسلامیی ئێران دا لە خۆیان دوور بخەنەوە و هەموو پێکەوە بۆ ڕیسوا کردن وتەریک خستنەوەی کۆماری ئیسلامی دەست بە کار بن.

نەمری بۆ گیانی شەهیدانی ڕۆژی ٢٧ی ڕەشەمەی ٧٤ و سەرشۆڕی بۆ ڕێژیمی تیرۆریست پەروەری کۆماری ئیسلامی.

دەفتەری سیاسیی

حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

(١٩٩٦/٣/١٨)١٣٧٤/١٢/٢٨

حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان

کونفرانسی لقی ئه ورویا ته کانیکی نوی به ریکخستنه کانی حزب ده دات

## به یانی کوتایی کونفرانسی حزب له ئه ورویا

له روژی ١٤\٥\١٩٩٦ له هول قوتابخانه ی زماتی داغارکی له شاری ئارهوس له کات ژمیری ٩ی به یانی به ئاماده بوونی هه فال محمد حاجی محمود سکرتیری حزب کونفرانسی ئه ورویا ده ستی پیکرد .سه ره تا به به خیر هاتنی هه فالان له لایه ن لقی ئه ورویاو باشان ده قیقه ك وه ستان بو گیانی پاکی شه هیدان.

له لایه ن هه فال سکرتیری حزب باسیك له سه ر وه زعی حزب به تایبه تی وکوردستان و ناوچه که به گشتی و رولی‌پیفراوی ریکخراوه کانی حزب له ده ره وه ی وولات و سوربون له سه ر ریبازی سه یدای نه مرو ٤٥٠٠ شه هیدو سه روه ریه کانی حزب کرا .

له لایه ن هه فالانه وه به تیروته سه لی باسی خاله لاوازه کان و جارسه رکردنی ودانانی به رنامه یه کی گرنگ بو داهاتوکرا وه سیاسه تی حزب ره جاوکرا له به رروشنایی کونگره ی دووهه م . کوبو نه وه کان تا کات ژمیری ١٢ شه وی٤\٥ _٥_١٩٩٦ دریژه ی کیشاو به نیکرایی ده نگ هه فال جمال عزیز به لیپرسراوی لق هه لبژیردراوله گه ل لیپرسراوی ریکخراوه کانی سوید وداغارك وئه لمانیاو هولنداو به ریتانیا ونرویج وه دوو کارگیر بو لق .

سه رکه وتوانه کونفرانس کوتایی به کوبونه وه کانی خوی هینا .هه فالان په یمانیان بو شه هیدان تازه کرده وه له سه ردریژه دان وسووربون له سه ر خه بات و تیکوشان بو وه ده ست هینانی ئامانجی گه له که مان .

لیره وه سلاو بو گیانی پاکی شه هیدانی حزب و گه ل ده نیرین.

نه سره وتن تا سه رکه وتن — لقی ئه ورویا

حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان

٥= ٥ = ١٩٩٦ داغارك

بسم الله الرحمن الرحيم

## ڕاگەیەنراوی کۆبوونەوەی سەرکردایەتی سیاسی لیژنەی هاریکاری نیشتمانی کوردستان

سەرکردایەتی سیاسی لیژنەی هاریکاری نیشتمانی کوردستان کۆبوونەوەی ئاسایی خۆی لە ڕۆژی چوارشەممەی بەرواری ١٩٩٦/٥/١٥ لە بارەگای لیژنە لە هەولێر بەست و لە چەند تەوەرەیەکدا بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان و عێراق و ناوچەکەی خستە بەر باس و لێکۆڵینەوە .

سەبارەت بە باری ئاڵۆزی ئەمڕۆی کوردستان و شەڕی ناوخۆ کە کارێکی خراپی کردۆتە سەر هەموو بوارەکانی ژیانی خەڵکی کە نائارامی و دابەزینی ئاستی بژێوی دیارترین ڕواڵەتیەتی ، بێ ئاکامیی هەوڵەکانی بەرقەرار کردنی ئاشتی لە ناوەوە و دەرەوەش دا ئەوەندەی دی دڵەڕاوکێ و نائومێدی لێ پەیدا بووە و تەنانەت لەم ڕۆژانەدا دۆخەکە بەرەو ئاڵۆزتر دەڕوات و خرۆشانت لە هەردوولاوە زیاد دەکات ، بە جۆرێکی وا مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت کە جەولەیەکی تازەی شەڕ چاوەڕوان دەکرێت ، کە ئەمەش پێچەوانەی ئەو بەڵێنانەیە کە بەناوەوە و دەرەوەیان داوە . ئەمە جگە لەو هەوڵانە گومان لێ کراوانەی لە ناوچەکەدا دەدرێن . لەبەرامبەر هەموو ئەمانەدا ، ڕێگە چارەی گونجاو نوێ بە تێرو تەسەلی باسی لێوەکرا و بڕیاری ( جدی ) شی لەبارەوە وەرگیرا .

سەبارەت بە نزیک بوونەوەی کۆتایی هاتنی ماوەی یاسایی پەرلەمانی کوردستانیش لە ١٩٩٦/٦/٤ ، کە تاکە دەزگایەکی شەرعی گەلەکەمانە و مایەی بەخشینی شەرعیەتە بە کێشەی ڕەوای گەلەکەمان لە دەزگا نێو دەوڵەتیەکان دا و ، دەزگایەکی هاوچەرخ و شارستانیەو دەستکەوتێکی هەرە گرنگی گەلەکەمانە کە بەرەنج و خەباتی بێ ووچانی چەندین ساڵە هاتۆتە کایەوە ، سەرکردایەتی سیاسی لیژنەی هاریکاری بڕیاری دا کە پشتگیری بکات لە درێژ کردنەوەی ماوەی یاسایی پەرلەمان ، بەمەرجێ درێژ کردنەوەکە نەکرێتە چەترێکی شەرعی بۆ ئەنجام دانی ناشەرعیەت و ، هەروەها هەوڵ بدرێت ئەم درێژ کردنەوەیە ڕێگە خۆشکەر بێت بۆ گێڕانەوەی ئاشتی و ئاسایی کردنەوەی دۆخەکە و هەروەها ببێتە مایەی خۆ سازدان بۆ هەڵبژاردنێکی دی پەرلەمان لە کوردستان دا .

سەبارەت بە وتووێژەکانی نێوان ڕژێم و (UN) یش لە بارەی جێ بەجێ کردنی بڕیاری ( ٩٨٦ ) ەوە بۆ فرۆشتنی بڕێک لە نەوتی عێراق بەرامبەر کڕینی خۆراک و دەرمان ، سەرکردایەتی سیاسیی لیژنەی هاریکاری جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارەی لە بەرژەوەندی گەلانی عێراق دا بینی و ئەگەری سەرنەکەوتنی دانوستانەکەی نێوان هەردوولاشی بە کارەسات پێشبینی کرد ، بۆیە لەم حاڵەتەدا سەرکردایەتی سیاسیی لیژنەی هاریکاری داوای سەپاندنی بڕیارەکە بەسەر ڕژێم دا دەکات لەلایەن دەزگا نێو دەوڵەتیەکان و لە پێناوی ڕزگار کردنی خەڵکی لەو مەینەتیانەی کە بەهۆی ئابڵوقە و برسێتیەوە تووشی هاتووە .

شایانی باسە دانیشتنەکە کە سێ سەعاتی خایاند بە بەشداری یەکی گەرم و گوڕ و لێکۆڵینەوەیەکی هەمە لایەنەوە سەرکەوتووانە کۆتایی بە کارەکانی هێنا .

سەرکردایەتی سیاسی
لیژنەی هاریکاری نیشتمانی کوردستان
هەولێر ١٩٩٦/٥/١٥

Irak Milli Türkmen Partisi
Iraqi National Turkman Party
الحزب الوطني التركماني العراقي

01/06/1996
Sayı:

بسم الله الرحمن الرحيم

الى /
حضرة الأخ الفاضل محمد حاجي محمود الأمين العام للحزب
الاشتراكي الديمقراطي الكردستاني المحترم .

تحية أخوية ، ابعث اليك شقيقي علي وحيد بصفته المشرف العام للحزب
ومسؤول الأعمال المؤتمر الثاني لحزبنا الذي سينعقد في أربيل بتاريخ ٢٠/٧/٩٦
واود أن اعلمك ببعض التغيرات السياسية التي حدثت في الآونة الأخيرة في
جمهورية تركيا وتوجد هنالك مواقف ايجابية لجانب حزبكم .
وهذا الموضوع سيوضحه لكم أخي علي بالتفصيل . وايضاً في الآونة
الأخيرة قد فتح حزبنا فرع في مدينة السليمانية وتم ترشيح السيد (فلاح توره ئاشنا)
مسؤولاً للفرع وحسب ما ذكر لنا السيد فلاح توره ئاشنا هاتفياً بوجود
نواقص في فرع سليمانية لحزبنا ارجو منك أن تتعاون معهم لسد
كافة نواقصهم حين مجيء في شهر تموز القادم ان شاء الله
ولكم جزيل الشكر والتقدير

اخوكم
حسن اوزمن

Kurdistan Soeialist Democraty Party الحزب الاشتراكي الديمقراطي الكردستاني - العراق

relation Office - Damascus مكتب العلاقات - دمشق

# «تصريح صحفي»

مرة أخرى يقوم الجيش التركي بتكرار جرائمه الوحشية بقصف أماكن عديدة من كردستان العراق بمروحياته ومدفعيته التي أدت إلى تهجير الآلاف من المواطنين الأبرياء والعزل من السلاح تحت ذريعة تواجد مقرات لحزب العمال الكردستاني PKK في المناطق المحررة من كردستان العراق.

وقد ترافق هذا القصف مع عودة الاستقرار وتمديد فترة للبرلمان الكردستاني ووقف القتال والحرب الإعلامية بين الحزبين المتحاربين الاتحاد الوطني الكردستاني والحزب الديمقراطي ... ستاني وندين بشدة هذه الجريمة النكراء والتي لم تكن لولا نظام الدكتاتور صدام حسين... و ... جميع الأحزاب الكردية وأحزاب المعارضة العراقية جميعاً أن ينظروا نظرة موضوعية لتوحيد صفوفهم وللتعاون فيما بينهم للوقوف يداً واحدة بوجه الهمجية التركية على كردستان العراق قبل أن يتطور الموقف ويتكرر مرة أخرى! ونناشد الأمم المتحدة والجامعة العربية والمنظمات الدولية والإنسانية وكذا الخيرين في أنحاء العالم بالإسراع لوقف العمليات العسكرية التركية على كردستان العراق وإدانتها.

مكتب العلاقات

للحزب الاشتراكي الديمقراطي الكردستاني - العراق

دمشق ١٦/٦/١٩٩٦

برای خۆشەویستم کاکە حەمەی تەبریز

سلاو و ڕێزێکی گەرم

شادی و خۆشیتانم داوایە.

زۆر بەخێر بێنەوە. کەی گەیشتنەوە
سلێمانیش تەلەفۆنێکم بۆ بکەن. بۆ ئەوەی
هەرچی زووە بتان بینم.

زۆرم لێ خۆشە کە سەفەرەکەتان
سەرکەوتوو بوو، خۆشم خەبەری دووتە
باشەکانی ئێوەم بیستوتەوە.

هەر شاد و سەرکەوتوو بن

برای کوردستان

مام جەلال

جـ

قەڵاچوالان

١٦/٦/١٩٩٦

Kurdistan Socialist Democraty Party — الحزب الاشتراكي الديمقراطي الكردستاني ـ العراق

relation Office - Damascus — مكتب العلاقات ، دمشق

بـۆ بەڕێزان / کاک محەممەد حاجی مەحموود و مەکتەبی سیاسی تێکۆشەر

سەڵاوی خەبات و تێکۆشان

لە ڕۆژی ١٩٩٦/٦/٦ لە مەکتەبی پەیوەندی حزبمان ـ دیمەشق بەڕێز کاک محەممەد حاجی مەحموود پێشوازی لە بەڕێزان ( شێخ جمال الوکیل ) سکرتێری گشتی ( حرکة الوفاق الاسلامی ـ العراق ) و بەڕێزان سید ریاض الموسوی ئەندامی شوورای ناوەنـــدی و بەرپرسیاری پەیوەندیەکانی مەکتەبیان محەممەد الجیزانی کرد ، وە باســـــی پەیوەندی هەردوو لا کراوە و هاوکاری کردن لەگەڵ مەکتەبی حزبمـان لە دیمەشـق لەو کاتەوە پەیوەندیمان زۆر باشەو زۆر یارمەتیمان دەدەن لە ڕووی ( فاکـس و چاپ و تصویر و کاری مەکتەبەوە ) .

ئەمڕۆ ٩٩٦/٦/٢٠ لەگەڵ بەڕێز شێخ جمال الوکیل دانیشتم و باسی ئەوەی کرد کـە لە هەولێر مەکتەبی عیلاقـات دەکەنەوە و نوێنەریان لەوێ دەهێنێتەوە .

داوا لە بەڕێزتان دەکەین کە بتوانن هاوکاریان بکەن، چونکە ئەوان لێرە زۆر هاوکاریمان دەکەن .

لەگــەڵ ڕێــزمـاندا

ئاشتی گەرمیانی

جێگری : لێپرسراوی مەکتەب

مكتب العلاقات

للحزب الاشتراكي الديمقراطي الكردستاني ـ العراق

٢٠ / ٦ /

ئەمەش فاکسی حرکة الوفاق الاسلامی ـ العراق ە لە دیمەشق لەڕێگای ئەو فاکسەوە هەرچــــی هەبێت پێمان دەگات .

برای خۆشەویستم کاک ملا محمد بابانی نێوڵان

سڵاوێکی گەرم

کاکی خۆم ئەوەبوو بڕیار بە لێتریمان بینی و بڕیار
بۆ تێکەوە دانیشتین بەڵام بە هۆی سەفەرکا
هەفتەوە بۆمان رێک نەکەوت ... ئیشاش
هەر ئەکەم چاوم پێت بکەوێت و دانیشتنێک
بکەین ... جا ئەگەر هەچانێک هەر بۆ ئاگاداری کاتان
عمری هەمەکی بکە تا هۆی عدلێک رێک نەخات،

چاوەڕوانی وەڵامم .

ئێوە خۆشیتان

برات
عارف تێمور
٢٠/٦/١٩٩٦

براگیان کاکە عومەری حاجی مەحموودی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادی و خۆشیتانم داوایە.

هەڵگری نامەکەم مامۆستا عادیلە، کوڕە
لەپێشتر لەماوەی سکرتارییەتەکەم لە زەڵێ،
ئێستە خەریکی تیجارەتە. دەیەوێ
هاتوچۆی ئێران بکات. بۆیە
داوادەکەم شێوەم کرد بۆ ئەوەی
بەڵکو هیممەتێکی بۆ بکەن بۆ هاتوچۆ
پسوولەیەکی بۆ بکەن. زۆر سوپاس.

هەر بژیت

برات دڵسۆزتان

مام جەلال

جەلال

[illegible]

1996/7/19

هەڤاڵ مدیری کارەبای سلێمانی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادمان و خۆشیتانم داوایە،

تکایە هاوکاری، هەڤاڵانی حسەدار بکەن

بۆ ئەوەی کارەبا بگەیێنە گوڵەخانە.

تکایە هیچ بیانوویەک قبووڵ مەکەن

بۆ پەکخستنی کارەکە.

چاوەڕوانی هیمەتی دڵسۆزانەتانم.

هەر بژین بۆ

برای دڵسۆزتان:

مام جەلال

١٩٩٦-٧-٢٤

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان
سکرتێری گشتی

الاتحاد الوطني الكوردستاني
الامين العام

**Patriotic Union of Kurdistan**
**secretary General**

براگیان کاکە حەمەی حاجی مەحمودی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادی و خۆشیتانم داوایە. سوپاس بۆ نامەکەتان.
ئێمە و خێزانی شەهید تایەر هاتەوەم، هەرچی داوایەکی
بووم جیابەجێ کرد.
خۆشم زۆر حەز دەکەم بتانبینم، چونکە هەندێ
قسە هەیە لە نزیکەوە دەمەوێ بۆتان باسی بکەم.
هەرچۆنێ بێت برایانی پارتی شەڕ دەفرۆشن:
وا دیارە خۆیان دەدەن بەقەلبەیەکدا!
جا گەر بەیانی سەعات ١٠،١٥ – ١١/ تەشریف بهێنن
ئەوا باشە، ئەگینا کەی گەڕانەوە لەوێ بە دیدارتان
شاد دەبین.

ئیتر هەر بژین بۆ

برای دڵسۆزتان
مام جەلال

٢٤ – ٧ – ١٩٩٦

# ڕاگەیەندراوی دەفتەری سیاسیی

# حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

هاونیشتمانە بەڕێزەکان !

خەڵکی بەشەرەفی کوردستان !

ئازادیخوازانی سەرانسەری جیهان !

هەروەک چاوەڕوان دەکرا و پێشتریش هۆشدارمان دابوو، ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیی پیلانی خائینانەی خۆی بۆ لێدانی بنکەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و بنەماڵەی کوردە ئاوارەکانی کوردستانی ئێران و بێ شێل کردنی حورمەتی خاکی وڵاتێکی دراوسێ دەست پێ کرد.

شەوی ٥ لەسەر ٦ی گەلاوێژی ١٣٧٥ ڕێکەوتی ٢٦ لەسەر ٢٧ی ژوئیەی ١٩٩٦ هێزێکی چەند هەزار کەسیی سوپای پاسدارانی ئێران بە هەموو جۆرە چەکێکی قورس وەک تۆپخانە، کاتیۆشا و تانکەوە لە سنووری مەریوانەوە هاتە نێو خاکی کوردستانی عێراق و هەر ئەو شەوە گەیشتە سلێمانی و لە دەم عسکر السلام» جێ گیر بوو کەمتر لە ٢٤ سەعات دوای گەیشتنی، بەرەو ناوچەی کۆیە کە بنکەی دەفتەری سیاسیی ئێمەی لێیە وەڕێ کەوت و شەوی ٢٨ی ژوئیە لە زۆر نوختەی ستراتیژیی دەوروبەری کۆیە دامەزرا.

هێزە پەلاماردەرەکان لە سەعات ٦/٥ی بەیانی ئەمڕۆ ٢٨ی ژوئیەوە بە دەستی تۆپ بارانی بنکەکانی حیزب و ئۆردووگای کوردە ئاوارە ئێرانییەکانی دەست پێ کردوە کە تا ئێستا بەردەوامە و لە سەعات ١٠ی ئەم بەیانییەشەوە پەلاماری زەمینیی دەست پێ کردوە و ئێستا شەڕێکی قورس لە نێوان پاسدارانی کۆنەپەرستیی ئێران و پێشمەرگەکانی حیزب بەردەوامە.

ئێمە لە کاتێک دا ئەو پەلامارە دڕندانەیە ئاشکرا دەکەین لە هەموو هاونیشتمانان، لە تێکڕای حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان و لە گشت کۆڕ و کۆمەڵە نێونەتەوەییەکان داوا دەکەین، بە هەر ڕێگایەک دا بۆیان دەکرێ بۆ ڕاگرتنی هێرشی ڕێژیمی ئێران تێ بکۆشن و نەهێڵن ئەو تاوانە دژی ئینسانییەی بەسەر دا تێ پەڕێ.

دەفتەری سیاسیی

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

١٣٧٥/٥/٧ (١٩٩٦/٧/٢٨)

حزبا سوسیالیستا دیموکراتا کوردستان
لقی دهـۆك

# بەیاننامە

## ئەی گەلێ ب شەرەفێ کوردستانێ...

پێنج سال ب سەر ژیێ هیڤیێت ڤی مللەتیدا بورین وهێشتا دیێژین ئەڤە خەونە..

پێنج سال بورین بسەر کوڤانێن شەهید ودایك وزاروکێت ئەنفالا، هێشتا ئەڤرۆ دیێژین خەونە. بەلێ راستە، خەونەوخەونەکا شیرینەو ب دلێ ئەڤایا دلدارانە بو وارەکێ رزگارو ئاڤاکری. ئەڤرۆ هێشتا خەلکێ ب شەرەفێ کوردستانێ تێهنا خوە نەشکاندیە ب فرەکا کوردینیێو ئازادیێ ل گرێ دوژمنکارا هلنگفتەڤە، ئەو دوژمنێن سەدان سالە خودان پیلانێن هەرفاندنێ بوون ژبۆ ئازادییا مللەتێ کورد. چونکە چۆ جارا مرۆڤایەتیێو ئازادیێو ڤیانا مللەتا ددلێ هەڤسوینێت مەدا نەهاتیە حەباندن. ئەڤجا دێ چەوا ئەڤرۆ پێ قایل بن، کوردان حوکمەتەك هەبیت، پەرلەمانەك هەلبژارتیێو مللەت حۆ ب خوە رێڤە بیت. نەخێر قەت وەنەکرینەو وەناکەن. لەوا پشتی سەرهلدانێ‌ژی مە گوت دیموکراتیەتە ئ خەلکێ کوردستانێ مافێ رەواییێ حۆ هەیە بژیت ئازادو سەرفراز... لێ دەهان رێکخراوێن هەرفاندنا ڤی دەسکەفتێ ل کوردستانا مە پێ دهێنە چاندن وبەلاڤکرن. لەوا ژی ئەڤرۆ رهێت مە کەفتینە ددەستێن دوژمنێن مەدا، ددەستێن کورد کوژادا.

## گەلێ هێژا ...

مخابن ئەڤرۆ رویدانەکا دی ل کوردستانا ئازادکریدا پەیدا بوو، ئەوژی فەرمانا پاسدارێن ئیرانیێیە ب سەر خەلکێ مشەختیێ کوردێن ئیرانیێو حزبا دیموکراتا کوردستانا ئیرانێ.. ل رۆژا ۱۹۹٦/۷/۲۸ هێزەکا مەزن ب هەمی حورێن چەك وتەقەمەنیێ ل دەڤەرا هەولێر و کویە هێرش برنە سەر بنگەهێن حزبا دیموکراتا کوردستانا ئیرانێو خەلکەکێ مەزن ژبەر ڤان هێرشێن دڕندانە دەربەدەربوون وبەرەف باژێرێ هەولێرێ هاتن. ئەڤجا هەر ئەڤەیە رەوشێ کوردان ئەڤ کنارێن کوردستانێ: هەر دەربەدەریو مشەختبونە.. ئەڤرۆژی ل کوردستانا ئازادکریدا هەر خەلکێ مە بهێتە کش کرن وکوشتن. ڤێ جارێ ئیرانی‌ژی چاف ل تورکیا کرو سۆبە نزانین هێرشا مەسز ژبو کێیەو دورا کیش پارچێیە؟

ڤیجا گەلێ بشەرەف؟ هەتا کەنگی کورد دێ دڤێ رەوشیدا ژین؟ نە ئاڤحو تەنایە ونە براکوژی راوەستیایەو دوو پارچەیی هەتا کەنگی؟. لەوا ژی دیێژین ئۆبال هەر شەرێن ناڤخۆنە ونە ئاکنجیبونا رەوشێ کوردستانا ئازادکرییە. ئەڤجا راگرتنا شەرێ براکوژیێ وبەر بەلاڤبوونا ئاشتیێ ئەڤ کنارێ کوردستانێ ئاواتێن ڤی مللەتیێیە ومکومبوونا باوەریێیە ب رێڤەبەریا کوردان.

بڤێ چەندێ پێدڤی‌یە ل سەر دەولەتێن هەڤپەیمان و .M.C.C ڤێ کفاشتنا لەشکەرێ هەڤ سنورا ل سەر مللەتێ کورد راکەن و وەنەکەن کوردستانا ئازادکری ببیتە قادا شەرێن دەولەتێن دەوروبەر و تێکدانا تەناهیا کوردان بکەن.

ئەم وەکو لقا دهۆکێ یا حزبا سوسیالیستا دیموکراتا کوردستان، نەرازینە ژڤان کارێن نارەوا دەر راستا خەلکێ کوردستانێ ول سەر ئاخا کوردستانا ئازادکریدا داخواز دکەین ب زویترین دەم هێرشێن ئیرانی بهێنە برین وراگرتن.

**سەرفرازیو سەرکەفتن بۆ گەلێ ب شەرەفێ کوردستانێ**

حزبا سوسیالیستا دیموکراتا کوردستان/ لقی دهۆك
دهۆك - ۱۹۹٦/۷/۳۱

بسم الله الرحمن الرحيم

لە کۆبونەوەی هاوبەشی نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و حزبی سۆشیالیست دیموکراتی کوردستان لە ڕۆژی پێنجشەممە ١٩٩٦/٨/١ ئەم چەند خاڵانە خرانە بەرباس و لێکۆڵینەوە و بڕیاری لەسەر درا ، لەسەر ڕۆشنایی ڕێککەوتن -نامەی ٩٥/٥ ی نێوان هەردوو حزبی هاوپەیمان .

١ - بڕیار درا لەماوەی یەک مانگدا هێزەکانی هەردوولا لەناوچەکانی دیاری کراودا کۆببنەوە بەهاوکاری هەردوولا .

٢ - هەردوولا بڕیارماندا پەرلەمان فراوان بکرێت و هەموو حزبەکانی تێدا بەشداربن ، وەیان هەڵبژاردنێکی پاسایی و دادگەرانە بکرێت ، چونکە درێژکردنەوەی پەرلەمان و شەرعیەت پێدانی شەرعیەت دانە بە هەڵگیرسانەوەی شەڕێکی تر لەکوردستان .

٣ - ناردنی نوێنەری هەردوولا بۆلای سەرکردایەتی ( پارتی ) و ( ی - ن - ک ) بۆ تێ گەیاندنی لە هەڵوێست و داواکاری هەردوولا وچارەسەری کێشەکانی کوردستان بەگشتی وشەڕی ناوخۆ بەتایبەتی .

٤ - هەردوو لا هەوڵ بدات بۆ بەدەست هێنانی ڕا و پشتگیری حزبەکانی نا و لیژنەی هاوکاری بۆ یەکخستنی هەڵوێست و بەهێزکردن و پاراستنی سەربە -خۆیی لیژنەکە .

٥ - بڕیار درا لیژنەیەکی باڵا دروست ببێ لەم بەڕێزانەی هەردوولا:-

| لەلایەن حزبی سۆشیالیستەوە ئەم بەڕێزانەن | لەلایەن بزووتنەوەوە ئەم بەڕێزانەن |
|---|---|
| أ- کاک محمد دولاشی | أ- ماموستا احمد کاکە محمود |
| ب- کاک عەتا سەراوی | ب- دکتور ابراهیم |
| ج- کاک ڕمضان دی کونی | ج- ماموستا محمد بازیانی |

٦ - بڕیار درا وەفدێکی هاوبەش لە سەرکردایەتی هەردوولا سەردانی جمهوری ئیسلامی بکات .

٧ - هەر مانگی جارێک کۆبونەوەی ( دوری ) بکرێت ، بێجگە لەبارودۆخی نائاسایی وهەر جارێک لەبارەگای لایەک بێت .

| لەلایەن حزبی سۆشیالیست | لەلایەن بزووتنەوەی ئیسلامی |
|---|---|
| کاک محمد حاجی محمود | ماموستا مەلا عەلی عبدالعزیز |
| کاک سەیدقادر جباری | ماموستا احمد کاکە محمود |
| کاک محمد دولاشی | کاک دکتور ابراهیم |
| کاک عەتا سەراوی | ماموستا محمد بازیانی |
| | ماموستا جلال جوهر |
| ١ /٨ /١٩٩٦ | ١ / ٨ /١٩٩٦ |

تێبینی /

یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی کوردستان
سکرتێری گشتی

الاتحاد الوطني الكوردستاني

الامين العام

**Patriotic Union of Kurdistan**
**secretary General**

براگیانی کاکە عەمەر بەڕێز
سڵاوێکی گەرم

شادی و خۆشیتانم داوایە،
زۆر سوپاس بۆ نامەکەتان و بروسکەکان.
منیش جلی عرضاتم بۆ ئامادە کردوە بیت
کە ویستت تاکو بۆتانی بنێرم بۆ تەدریبی
پێشمەرگەکانتان، اجا تکایە ئاگادارم بکەن
چەند پێشمەرگەتان کۆکردوەتەوە بۆ تەدریب
تاکو ئەوەندە جلو بنێرین و پاشان پێڵاویشیان
بۆ بنێرین.

ئیتر هەر شاد بو
برای دڵسۆزتان

مام جلال

تەسجیلات
٣/٨/١٩٩٦

پارتی دیموکراتی کوردستان
مەکتەبی سیاسی (٣)
سەرکردایەتی کەرکوک - سلێمانی

ژمارە: ٦٦٧
بەروار: ١٩٩٦/٨/٢٦

بۆ/ لقی شارەزووری حزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان شێکۆشەر

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

نووسراوتان ٢١٧ لە ١٩٩٦/٨/٢٣

هەروەکو ئێوەش و هەموو لایەکیش ئاگادارن کە ئێمەی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ڕۆژی ١٩٩٤/٥/١ وە جەلالییەکان شەڕێکی بە ناحەقیان بەسەرماندا سەپاندووە و ئێمەش بە حەقی خۆمانی دەزانین کە بەرگری لە کیانی پارتەکەمان و جەماوەرەکەمان بکەین، جگە لە شەڕی بەرپازی ڕۆژانە بە پێی ئەو زانیاریانەی کە بە دەستمان دەگات ئەو لایەنە چەندین پیلانی زەهراوی بۆ هەڤاڵانمان و بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتمان دادەڕێژێ، و بۆ بەرجەستەی ئەم کردارە نامرۆڤایەتیانەی ئەوان پێویستی بەر ئامانجە کە ڕوو بە ڕووی گشت ئەو پیلانانە ببینەوە. جا هەندێکی ئاشکرا بن یان نهێنی بن. ڕاستە ئێمە حزبتان ئەشناسین بە کەسی پاشڤاوە پاشین و کۆماشمان لەوەدا نەبوو بەڵام هەندی کار و هەڵسوکەوتیش هەیە بە تایبەتی لەم ڕۆژانەدا کە ئێمە وا لێ دەکات بیان خەینە ژێر چاودێری و لێکۆڵینەوە چونکە (بنك) هاتنا بۆ هەموو جۆرە کردارێکی نامرۆڤانە دەبات و دەیەوێت هەموو کەس و لایەنێکی کوردستانی تێکەڵ بە خیانەتکاری خۆیان بکەن. وە ئێمەش هەروەکو لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد ناچارین لە گشت هەڵسوکەوتەکانیان بپرسینەوە بە تایبەتی بڕوپاگەندەکانیان کە هەندی کیان باس لە سەر ئێوە گلاندنی ئێوە دەکات لەم شەڕە نەگریسە و پشتگیری کردنتان. هەرچەندە ئێمە زۆر باوەڕمان بەو بڕوپاگەندانە نیە بەڵام لێ پرسینەوە و هوشیاریش هەر بەستمانەوە بە تایبەتی لە کاتی ئەقام و ناموسوول. ئێمە هیچ تەوجیهاتێکمان خوانەخواستە دژ بە حزبتان و هەڤاڵانتان بۆ هەڤاڵانمان نەناردووە کە دژایەتی یان ناڕەحەتی بەرامبەر ئێوە بکەن و ممکنە لەم حاڵەتانەدا هەندی لە هەڤاڵانمان بە پێی ئەو بڕوپاگەندانەی جەلالی بۆ خۆیان هەڵوێستی شخصی یان هەبێت کە ئەمەش تەعبیر لە هەڵوێستی ئێمە ناکات و ئەوەش کە زیاتر ئەو وەزعەی دروست کردبێ ئەم چەند خاڵانەی لای خوارەوەیە.

١- کۆبوونەوەی لقە شێکۆشەرەکەتان لەگەڵ مەلبەندی ٦ شارەزووری جەلالییەکان و ڕاگەیاندنی اعلامی ئەوان کە پشتگیری لە هەموو کارەکانیان دەکەن. ئەمە لە لایەن هەڤاڵانەوە وا تەعبیر دەکرێت کە ئێوە بوونەتە پشتگیری هەڵوێستی جەلالییەکان لە دژی پارتیمان.

٢- ئەوڵی زیاد کردنی هێزەکانتان لە دەڤەری شارەزوور لەم کاتەدا کە ئێمە وەکو باسمان کرد هەموو حسابێکی خۆمانی بۆ دەکەین بە کارێکی باشی نازانین چونکە لە جیاتی زیاد کردنی هێز پێویستە مراعاتی باروودۆخی ناوچەی شارەزوور بکەن و هەوڵی ئەوە بدەن کە لەم دەورە بەرە هەندی خۆ پاراستن هەبێت بۆ ئەوەی هیچ ئەسی کەسێک نەڵێ ئەوا لەم کاتەدا (حسك) هێزی خۆیان بۆ پشتگیری کردن لە جەلالییەکان کۆ کردەوە.

٣- ئەو خرۆقاتانەی باستان کردوون بە لای ئێمەوە شتێکی ئاساییە کە ڕۆژانە نەک بە ئێوەی قەسدی بەڵکو بە هۆی بوونی زۆری چەکدار لە ناوچەکەدا ڕوودەدات کە ئەمە لە ئەسحوی هەڵوێستی شخصی دایە نەک پارتیمان و ئێمەش لە لایەن خۆمانەوە بە دوای ئەو ناوە و کێشانەدا دەڕۆین کە باستان لێوە کردووە.

هیوادارین کە هەمیشە تێ هاوبەشانەتی و ڕۆژانی ڕەشی ڕابوردوو لە یاد نەکەین و لە کۆتاییدا ڕێزمان هەیە بۆ گشت هەڤاڵانتان.

شتر بۆ پێشەوە...

(تکایە بۆ لاپەڕە ٢/)

حکومەتی هەریمی کوردستان / عیراق

وەزارەتی ناوخو
پاریزگای کەرکوک
( نوسینگەی تایبەت )

ژمارە : ١ / ٥٦
بەروار ٢٦ / ٨ / ١٩٩٦

بو/

بەریزان : مام جلال

- مەکتەبی سیاسی یەکیتی نیشتمانی کوردستان

- د . بەرهەم صالح

- لیژنەی هاریکاری

- بەرەی تورکمانی

دوای سلاو ریز

عزة الدوری لەمە روژی ( ٢٠ / ٨ تا ٢٤ / ٨ / ١٩٩٦ ) .
سەروکی عەشیرەتە کوردەکانی ناوچەی داقوق ، داوده ، طالەبانەکان ،
کاکەییەکان . کوکردوتەوە داوای لیی کردون ئەگەر قەومیەتی خویان
نەگورن و خویان نەکەن بە عەرەب لە شوینەکانی خویان دەریان دەکەن .

بو ئاگاداریتان لەگەل ریزدا .

جلال جوهر عزیز
پاریزگاری کەرکوک
٢٦ / ٨ / ١٩٩٦

زۆر بەڕێز کاک محەمەدی حاجی مەحمود / سکرتێری حیزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان

سڵاوی ڕێز

تەندروستی باش بۆ بەڕێزتان بە ئاوات ئەخوازم

هیوادارم هەمیشە ڕووەو سەرکەوتن بن

برای زۆر بەڕێز، وا کاک (سەرپاس حسین) کە

پ.م ەلای جەنابتان هاتە خزمەتت، ئەوە

پ.م ەیە کە ئەشەو تەلەفونم بۆ کردیت لەبارەیەوە

هیوادارم گیروگرفتەکەی بۆ حەل ئەبێت یان لای

جەنابت بێت یان جەنابت چی بە چاک ئەزانیت ئەگەر

لەبەرموودیت بۆی چۆن لەجێی ئەگەن

هەر بژی بۆ کوردو کوردستان

شادو سەرکەوتوو بن

برات

ئەندام پایە / محەمەدی حاجی عەنایەت

هەرێمی

٢/٩/٩٩٦

**ئەمە کە ڕێکی ڕەسمی حکومەتی هەرێمی کوردستان**

**لەم لیندوانەی دا..**

ئەمرۆ بەیانی یەکشەمە ڕێکەوتی ٢٨ / ٧ / ١٩٩٦ هێزەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران بارەگاکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیان لە نزیک شاری کۆیە تۆپباران کرد.

ئێمە وەکو حکومەتی هەرێمی کوردستانی عیراق نارەزایی و تووڕەیی خۆمان بەرامبەر ئەم جۆرە کارانەی ئێران و تورکیا دەردەبڕین و داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەکەین سنوورێک بۆ دەستتێوەردانی ئێران و تورکیا دابنێین.

---

برای بەڕێزم کاکە حەمە

خۆش و باش، نامەکەت گەیشت زۆر سوپاس بۆ خۆشی و دڵەنگی بوو ئەگینا دەهاتم.

من إنسحاب بۆ شوێنێک کە نزیکی پارتی بێ بە باش نازانم، هەتا ئێمە باش نیە ئێوەش نزیکی ناوچەکانی پارتی بکەون. ئێمە بەیانی زوو هەڵدەستین و بە پێوەندیتان ئێوە دەکەین، ئێمە باشە بەیانی بە یەکەوە سەردانێکی مام جەلالیش بکەین.

هەڤاڵ بەشیر

[signature, dated 1996]

کەرکوك شاری کوردستانە

هەم گەرمیانەو هەم کوێستانە

دوژمنان دەستی لێ مەدەن

جێگا پەنجەی شەهیدانە

قەرنێکە ئەم وڵاتە خوێنی لێ ئەچۆڕێ

دڵنیام ناحەزان لەئاستی یەك هەڵوێستی کورد ئەدۆڕێ

هەموو بستێکی ئەم خاکی کوردستانە

سەرتا پا جەستەی برینە

سارێژی ئەو برینە تەنها چیای حەمرینە

١٩٩٦/٩/١٨

بۆ: خۆشەویستم کاکە حەمە بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

شادی و سەرکەوتنتانم داوایە. ئێمەش وا خەریکی خۆسازدانەوەین.
ڕۆژ بە ڕۆژ کارەکانمان بەرەو باشتر دەچێت. هیوادارم تا چەند ڕۆژێکی تر لە خۆسازدانەوە ببینەوە و هەڵمەت بەرین.

باشە ئێوەش پەلە بکەن لە خۆسازدانەوە (لە هێنانەوەی دەرەوەی هەڤاڵەکانتان) (لە کۆکردنەوەی پێشمەرگەکانتان) لە بەرەو خەباتی زەمینی بردنی هەڤاڵەکانی ناو شارەکانتان.

باشە لەگەڵ خزمانیشی خەریک بن بۆ یارمەتی دانتان بە هەموو شێوەیەک. بەڵام:

گرنگترین شت هێز کۆکردنەوە و خۆڕاگرتن و هەڵمەت بردنە.
ئێمە - هەموومان پێکەوە - سەرکەوتنێکی سیاسی زۆر گەورەمان بەدەست هێناوە، پارتی شکستێکی سیاسی گەورەی بەدەست هێنا.
مەسعود بە تەواوی ڕیسوا بووە و خیانەتەکانی دەرکەوتن.
ڕاستە لە ڕووی عەسکەرییەوە شکستمان خوارد (وەبەڵام زۆر کوشندە نییە، ئێمە هەزاران پێشمەرگەمان ماوە) هەزارانی تریش ئەتوانین چەکدار بکەین. بۆیە پێویستە بادەری ئەو گۆڕانە بە سەرکەوتن هەر بێت.

خۆ گەر صدام لێمان بەری ئەوا (انتفاضە) دروست دەبێت و ئەویش مەسعود بەهادەر زیان دەمالێت.
دیارە ئێوەش دڵنیان کە ئێمە (ح.ش.د.ک) و (ی.ن.ک) و هەموو هێزەکانی عێراق پیلانەکانی صدام - مەسعود بەڵاوە نەگەڕدەزانین
وە یادی سەرکەوتنمان پێکەوە دەبێت و ناخۆشیەکان هەموو پێکەوە دەیخۆین

زۆر زۆر سڵاو بۆ برادەرانی تر

جەلال

برای هەبەریز کاک محمد حاجی محمود.

دوای سلاو

بە هیوای خوشیتان. سرفت بێ.

ئەم بار و دوخەی ئێستای کوردستان پێویستی بە هاوکاری
هەموو لایەک هەیە.

دیارە جەنابتان توزێک نیگەران بون لە قسەکانی من
لە سلیمانی. و نامەشتان بو کاک عارف نوسیوە
من دەکەم ئەو موضوعە بو جەنابتان باسی بکەم.
قسەکانی من رەد فعل بوە بو کارەکانی جەنابتان
کەوا تصور کرا خوتان بە ستوەوە بە ملال.
وبە تەمانی مصیری خوتان تێکەلە بەران بکەن
کە بە راستی جێگەی نیگەرانی ئێمە بو.

بو ئەوەی دلنیاتان بکەم کە ئێمە هیچ مشکلەمان
لەگەل جەنابتان نیە. من دەکەم بزانن کە ئێمە جو برایەتی
وهاوکاری حاضرین و تکای برایانەم ئەوەیە هەروەهای
ئەوە بکە و بە زووی وڵامان بدەرەوە بو ئەوەی
فەتکانی تر استفادە لەو وەضعە نەکەن. چاوەرێی
وڵامی جەنابتان دەکەم.

ئێرفرستا

برا
نێچیرڤان ادریس بارزانی

١٩٩٦/٩/٢٥

## بەیاننامەی حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان

## لەسەر ڕووداوەکانی ٣١ ی ئاب ی ١٩٩٦ ......

جەماوەری بەشەرەفی کوردستان ...

پێشمەرگە قارەمانەکان .. کادرو ئەندام و لایەنگر و دۆستانی حزب ..

حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان زیاتر لە دووسالی شەڕی براکوژی لە کوردستان دا سەرەڕای ئەوەی کە لە ئاست ڕووداوەکان دا لایەن بووە بەلام لەو شەڕە ناوخۆییەدا بێ لایەنی خۆی ئاشکرا کردووە و هەرچەندە سەرەتای ئەو ناکۆکییە لە کوردستان دا بە لێدان و پەلاماردانی بارەگاکانی حزبمان بووە لە شاری هەولێرو جێگاکانی تردا لە لایەن پارتییەوە لە کۆتایی سالی ١٩٩٢ دا بەلام لەگەل ئەوەشدا حزب هەمیشە هەول و تەقالای بۆ ئاشتی و تەبایی و برایەتی و چارەسەر کردنی سەرجەم کێشەکان بووە و لەو ڕێگایەشدا چاوپۆشی زۆری کردووە و لە پێناو بەرژەوەندی گشتی شدا دەسکەوتی تایبەتی خۆی وەلا وە ناوە . کاتێ ڕژێمی دیکتاتۆری بەغدا بە هاوکاری هێزەکانی پارتی پەلاماری شاری هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان دا .. زۆر لە خالە نادیارو شاراوەکان ئاشکرا بوون و کەوتنە ڕوو .. سەنگەری هاوکاریکردنی دیکتاتۆری بەغدا پەیدا بوو ، لەگەل ئەوەشدا حزبی سۆسیالیست وەکو کاری هەمیشەیی زۆر بە خۆراگری و پشوو درێژی و لەسەر خۆ وە هەنگاو دەهاوێت بۆ ئەوەی ئاشتی بەر قەرار بێت و ناحەزان بالبوورەی ئەوە لێ نەدەن کە حزبی سۆسیالیست لایەنە لە شەڕی ناوخۆی کوردستان دا ، جێگای وەبیر هێنانەوەیە کە پاش ئەو هەموو هاوکارییەی کە حزبی سۆسیالیست لە دوو سال و نیوی ڕابوردوودا بۆ ڕزگار کردن و دەرباز کردنی سەدان چەکداری پارتی لە دەست هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی و هەول دان بۆ ئازاد کردنی لایەن گیرانیان لە زیندان دا ..

سەرەڕای هەموو ئەو تەقالاو دلسۆزیانەی حزب بۆ ئاشتی کەچی پارتی هەرکە گەیشتەوە هەولێر .. هەولێر هێشتا تەواو داگیر نەکرا بوو بالەخانەی پەرلەمان بووە بارەگای ئەمن و مخابرات و بە چاوساغی پارتی پەلاماری بارەگای م . س ی حزب لە شاری هەولێر دا دراو تالان کراو دوا تر داگیر کرا ئەمە جگە لە گرتن و کوشتنی سەدان کەس لە هێزە بەرهەلستکارە عێراقییەکان و راوە دوونانی هێزەکانی حزب لە تەلەفزیۆنی سلێمانی و شارەزوور ، لە کەلارو پێنجوێن و چەک کردنی نزیکەی ١٠٠ پ.م لە ناوچە جیا جیاکان و دەست بەسەرا گرتنی کەل و پەل و کەرەسەکانی حزب و گرتنی کارمەندەکانی تەلەفزیۆنی هەولێرو بردنی ئامێری تەلەفزیۆنەکە لەلایەن پارتییەوەو دانانی بۆسە بۆ لێپرسراوانی حزب و سوکایەتی پێ کردنیان لە لایەن بەرپرسەکانی پارتییەوە وەکو ئەوەی کاری ئاسایی خۆیان بە جێ هێنابێت .

حزبی سۆسیالیست .. حزبی شەهیدان .. ئەو حزبەیە کە زیاتر لە ٢٠ سال خەبات دەکات بە حزبی نەزانن و وای لێ بێت ئەوانەی تەنانەت هاوەلەشیان بۆ کورد نەڕشتووە ئێستا بێنەوە ی نیشتمانی بە حزبی سۆسیالیست بفرۆشنەوە ..

لەگەل ئەو هەموو تاوانانەشدا کە خستیانە پال تاوانەکانی کەیان ، سکرتێری حزبمان بەو پەڕی لە خۆ بووردی و هێمنییەوە لە سەر داوای سەرۆکی پارتی سەردانی هاوینە هەواری سەلاحەدینی کردوو بە دەم کێشەکانەوە چوو ، بەلام هەر هەمان ڕۆژ بۆ جارێکی تر لەلایەن هێزەکانی پارتییەوە پەلاماری بارەگای کۆمیتەی ناوچەی پێنجوێنی حزب درایە وەو ئەوەی لەدەست مەلا زم علی ئەندامی م . س پارتی مابووەوە سوپای بەناو ڕزگاری تالانی کردوو سوکایەتیان بە خێزان و کەس وکاری پێشمەرگەکانی بارەگاکە کرد ، لە ١ / ١٠ شدا بەو بیانووەی کە پێشمەرگەی ی ن ک لەو سنوورەیە دەستیان بەسەر بارەگای حزبمان لە گوندی ( توتان ) دا گرت سەرەڕای هەموو ئەمانەش پارتی لە قسە کردنی سیاسەتی ڕۆژانەشیان دا خەباتی شەهیدان و مێژووی حزبمان پێ ڕەوا نەدەبینن و یەکێکو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەردەوام لە پەلا ن دا بوون بۆ هەقالانی حزبمان .. واتە حزبی سۆسیالیست دوای پێن دەنگی یەکێ درێژەو بە وورد بینی لە کارەکانی دا راو بۆچوونی خۆی لەسەر ڕووداوەکانی کوردستان بە ڕاشکاوی بە جەماوەری گەلەکەمان ڕای دەگەیەنێت کە ئێستا کێشەی کورد لە دووبەرەدا خۆی

دەبینێتەوە ; بەرەی میللەت و بەرەی دژی میللەت ئێمە رای دەگەیەنین لەگەڵ ھێزە بەرھەڵستکارەکانی کوردستانی عێراق لە ریزی پێشەوەی خەبات داین وە داواش لە پارتی دەکەین کە ھەرچی زووترە سەنگەری خۆی لە سەنگەری رژێمی دیکتاتۆری جیا بکاتەوە و بەزەیی بە مێژووی خۆیدا بێتەوە و چارەسەری کێشەکانی کوردستان تەنھا بە رێگای ئاشتی بکرێت و ئەو خەیاڵ پڵاوەی پارتی کە گوایە شەر لە کوردستاندا کۆتایی پێ ھاتووە بەلاوە بنێ و واقعیانە بیر بکاتەوە چونکە ئێستا سەرەتای شەرێکی نوێیە لە کوردستاندا و ھێزەکانی پارتی دوو رێگایان لە پێشە : یا ھێنانەوەی ھێزە چەکدارەکانی رژێمی عێراق بۆ بەرەکانی شەروو ھاوکاریان بۆ پاراستنی خۆیان ، یا دەبێت ئەو راستیانە بلێن کە ئەوان ناتوانن ئیدارەی کوردستان بکەن بەڵکو ھێزی پێشمەرگەی کوردستان رایان دەماڵێ و دەیان ھاوێژێتە جێگایەکی نادیارەوە ...

ئومێد دەکەین پارتی لەوە زیاتر مساومە لە سەر حسابی گەلەکەمان نەکات

حزبی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان داوا لە ھەموو رێکخستنەکانی دەکات بە شێوەیەکی گونجاو و لەگەڵ ھەل و مەرجی ئێستادا و بە پێی رێ نمایی نوێی رێکخستنەکان زیاتر دەست بە کاربن و پەیوەندی بە دەزگاکانی سەرووی خۆیانەوە بکەن و ھێزی پێشمەرگەی سوسیالست پەیوەندی بە بنکە نزیکەکانەوە بکەن و خۆیان رێک بخەنەوە لە ھێزی پێشمەرگەدا .

لە کۆتاییدا حزبمان جەخت لەسەر دامەزراندنی بەرەیەکی کوردستانی دەکاتەوە بۆ کۆکردنەوەی ھێزە کوردستانییەکان و یەک خستن و سازدانیان ..

نەمری و سەربەرزی بۆ خەباتی رەوای گەلەکەمان و شەھیدانی رێگای رزگاری کوردستان .

مەکتەبی سیاسی

حزبی سوسیالستی دیموکراتی کوردستان

١١ / ١٠ / ١٩٩٦

